# چەند تێکستێکی وەرگێڕاو



**نوسینی**

**کارل پۆپەر– ژۆلی سادا ژاندرۆن– ڤۆلتێر–کانت–مالکۆم هیملتۆن–کارل کۆهن–نیرا چانۆك–ستیوارت هیوز–بابەکی ئەحمەدی–حەمید عوزدانلو–رابرت هولاپ–هربرت مارکیوز–ئرنست کاسیرەر–بابەکی ئەحمەدی–ئرنست کاسیرەر–ئرنست کاسیەر–زیگمۆند باومان–چارلز چنگز–گلن ورد–حسین بششیریە–ژان فرانسوا لیوتار–هیوبرت دریفوس – بول رابینو–کیت ئانسل پیرسۆن–کیت ئانسل پیرسۆن–میشل فۆکۆ–جورج تەرابیشی–ئەریك فرۆم–ستیوارت هیوز–ستانلی بن**

**وەرگێڕانی**

**ڕێبین هەردی**


حکومەتی هەرێمی کوردستان

وەزارەتی ڕۆشنبیری

بەڕێوەبەرایەتی خانەی وەرگێران

**xaneywergeran@hotmail.com**



- ناوی کتێب : چەند تێکستێکی وەرگێڕاو
- نووسەر: چەند نوسەرێك
- وەرگێڕانی : ڕێبین هەردی
- پیتچنین : ڕێبین هەردی
- دیزاینی ناوەرۆك : زانا کەمال
- بەرگ : ئارام عەلی
- تیراژ : ١٠٠٠
- زنجیرە : ٢٢٣
- چاپخانە : کارۆ
- چاپ : چاپی یەکەم
- ژمارەی سپاردن : (٢١٩١) ساڵی (٢٠٠٨)




## پێڕست

# پێشەکی

یەکێك لە ڕۆشنبیرە ئێرانیەکان دەیگوت (لێرەدا بەپێی مانا قسەکان دەهێنمەوە) یەکێك لەئەرکە گرنگەکانی ڕۆشنبیر بەتایبەتی لەجیهانی سێهەمدا ئەوەیە لانیکەم کتێبێك یان دوان بۆ زمانی خۆی وەربگێڕێت. ئەم قسەیە تاڕادەیەکی زۆر ڕاستە، بەتایبەتی بۆ کۆمەڵگایەکی وەك ئێمە کە لەهەلومەرجی فەقیریەکی کوشندەی وەرگێڕاندا دەژی. ڕەنگە کتێبخانەی کوردی یەکێك بێت لەفەقیرترین ئەو کتێبخانانەی کەکەمترین کەرەسەی فکری و ئەدەبی و سیاسی..هتد بەخوێنەرانی دەبەخشێت. کتێبخانەیەکی هێندە فەقیر کە هیچ خوێنەرێك کە تەنها زمانی کورد دەزانێت، ناتوانێت شارەزای بوارێك لەبوارە کلتوریەکان بکات. پێویستی ئێمە بۆ وەرگێڕان لە زمانەکانی ترەوە، دەیانجار لەپێویستی ئێمە بەنوسەر گرنگتر و لەپێشترە. بەتایبەتی گەر ئەو ڕاستیە بزانین جیهانی هەنوکەمان لەهەموو ئاستەکانیدا، لەناوەڕۆکدا بەرهەمی نوسین و داهێنانی بیریارانی بوارە جیاوازەکان بووە. هیچ داهێنانێکی تازە نیە، گەر لەپشتیەوە نوسینێك، تیورەیەك، داهێنانێك نەبێت. جیهانی ئەمڕۆ تانوپۆی بە کتێب و نوسین دروستکراوە. بۆ گەلێکی وەك ئێمەش کە دەیەوێت لەمێژووی ئەم جیهانەدا بژی، هیچ ڕێگەیەك نیە جگە لەوەی هەوڵبدات لەڕێگەی وەرگێرانەوە پتر ناسین و شارەزای بۆ تیورە و کلتوری کۆمەڵگاکامی تر پەرەپێبدات. وەرگێران هەمیشە لەوە دەمانپارێزێت مێژوو لەسفرەوە دەستپێبکەین. چونکە لەگەڵ خۆیدا شارەزای و ئەزمنی گەلانی دیمان بۆ دەگوێزێتەوە کە بەشێوەیەك ئاسۆی هوشیاریمان فراواندەکات کە بتوانین باشتر و عەقلانیانەتر ژیانی هەنوکەی خۆمان بژین.

تاچەند کۆمەڵگایەك پرۆسەی وەرگێڕان تیاییا گەورەو فراوان بێت، هێندەش ئەگەری کرانەوەو هەڵکردنو قبولکردنی جیاوازی تیا فراوانتر دەبێت. ڕادەی کرانەوەو نەکرانەوەی کۆمەڵگاکان، پەیوەندیەکی تەنگاوتەنگی بەو ناسینو ڕاهاتنو قبولکردنی دیدو بۆچونی کلتورە جیاوزەکانەوە هەیە. تا ناسینی کۆمەڵگایەك بۆ بەرهەمو شێوازی بیرکردنەوەو دابونەریتەکانی کلتورەکانی دی فراوانتر بێت، تواناو ئەگەری تەحەمولکردنی جیاوازیو هەڵکردنو لێکبوردنی گەورەترو فراوانتر دەبێت. وەرگێران ئەو ئامرازەیە کە لەڕێگەیەوە کۆمەڵگایەك هەم ئاسۆکانی ناسینی خۆی تیا گەورەدەکات، هەم تواناکانی هەڵکردنو تەحەمولکردنی تیا پەرەپێدەدات. لەراستیدا چۆن نوسین دەلالەت لەتواناکانی قسەکردنی کۆمەڵگایەك و ئاستی پێشکەوتنی دەکات، هێندەش وەرگێڕان دەلالەت لەتواناکانی گوێ لێگرتن و ئاستی قبوڵکردنی جیاوازی لەناو ئەو کۆمەڵگایەدا دەکات. لەڕێگەی وەرگێڕان و خوێندنەوەی بەرهەمی کلتورەکانی دیەوە، فێردەبین زیاتر خاکی بین و خۆمان لە نەخۆشی دۆگمابوون و خۆ بەراستزانی بپارێزین. بەم مانایەش وەرگێڕان یەکێکە لە هەرە پێداویستیە سەرەکەیەکانی ئەم قۆناغەی ژیانی ڕۆشنبیریمان

خۆشبەختانە لەدوای ڕاپەڕینەوە جوڵەیەکی بەرچاوی وەرگێڕان لەکوردستاندا دەستی پێکردووە کە هێشتا لەسەرەتاکانێتی. چەندان دەزگا و گۆڤار و بڵاوکراوە لەم جوڵەیەدا بەشداریانکردووە و دەوریان هەبووە لەوەی لەبورای جیاوزادا وتار و کتێبیان وەرگێڕاوە. بەڵام ئەوەش ڕاستە کە ئەم هەوڵانە هێشتا لەسەرەتادان و هێشتا هەم لەرووی چونایەتی و هەم لەرووی چەندایەتیەوە کەمن. ئەمڕو لەهەموو کاتێك زیاتر پێویستمان بەسەرمایەگوزاری لەم بوارەی ژیانی کلتوریدا هەیە کە بۆ خوێنەرانی نەوەی تازە یەکجار پێویستە کە زوربەیان تەنها زمانی کوردی دەزانن.

ئەم کتێبە هەوڵدانێکی بچوکە لەم جوڵەیەدا..زوربەی ئەو وتارانەی لەم کتێبەدا کۆ کراونتەوە و لەکات و شوێنی جیاوازدا بڵاوکراونتەوە و هەندێکیشیان بۆ یەکەمجارە بڵاودەکرێنەوە. هیوادارم بەم کتێبە بەشداریەکی بچوکم لە بزوتنەوەی وەرگێڕاندا کردبێت کە لەهەر شتێکی دی زیاتر پێویستمان پێیەتی

**ڕێبین هەردی**



## لێکبوردن و بەرپرسیارێتیی فیکری

## *کارل پۆپەر*

سەرەتا لەوە ناچێت چیدی "لێکبوردن" کێشەیەك دروستبکات، لایەنیکەم لەوڵاتە دیموکراسیەکاندا، لەئەوروپاو ئەمریکای باکوورو ئوستورالیاو نیوزلەندادا. ئاشکرایە هەموو تاکەکەسێك لەکۆمەڵگا کراوەکانی رۆژئاوادا یان لەو کۆمەڵگایانەدا کە بەرەو کۆمەڵگای کراوە دەچن، خۆی لەهەڵوێستێکدا دەبینێتەوە کە لەلایەن کەسانی دیەوە جێی لێکبوردنەو هەموو کەسێك بەگشتی زۆر زیاتر لەوەی بڕوای بەدیموکراسی هەبێت بڕوای بە لێکبوردن هەیە، بێگومان خەڵکانێك کە باوەڕێکی بەتینو بەهێزیان بە لێکبوردن هەبێت، گرفتێکی جدی دەهێننە پێشێ: گرفتی ئەوەی ئایا لەپەیوەندی سۆزداریمان بەلێکبوردنەوە زۆر زیاتر لەپێویست نەڕۆیشتووین. چونکە ئێمە لەترسی ئەوەی وا دەرکەوین کە کەسانی لێبوردوو نین، وامان لێهاتووە ئارەزووی فراوانی لێکبوردن لەشێوە یاساییەکەیدا دەکەین، بۆ ئەوەی تەنانەت ئەوانەش بگرێتەوە کە کەسانی لێبوردو نین. ئەوانەی هەوڵی بڵاوکردنەوەی ئایدیۆلۆژیەکانی لێکنەبوردن دەدەن. ئەو ئایدیۆلۆژیانەی کە پەیڕەوی ئەو بنەمایە دەکەن کە دەڵێت ئەو لایەنگرەی لەگروپەکەی جیابێتەوە، دەبێت لەڕێی هێزەوە لەناوببرێت. ئەو ئایدیۆلۆژیانەی سەیری جیابووەکان، وەك کۆمەڵێك تاوانباردەکەن. ئالێرەشدا من ئەم مەسەلەیە وەك یەکێك لەمەترسیە ترسناکەکان سەیر دەکەم کە بەرەو روومان دەبێتەوە. ئەمەش نەك هەر لەڕووی تیوریەوە، بەڵکو لەڕوی پراکتیکشەوە. لێرەشدا دەمەوێ سەرنجتان بۆ ئەوە رابکێشم کە ئێمە بەهۆی زیادەڕوییمان لەبیرۆکەی لێکبوردندا، خۆمان لەبەردەم مەترسی لەناوبردنی ئازادیو لێکبوردندا دەبینینەوە.

لێرەدا نامەوێ بڵێم مەترسیەکە لەبەرچاوماندایە. بەڵام هاتنە سەر دەسەڵاتی دیکتاتۆریە تۆتالیتارە جیاوازەکانو دیکتاتوریەکانی لینینو موسولینیو ستالین-





سەرەڕای کەوتنی چیکۆسلۆفاکیای دیموکراسی لەساڵی ١٩٤٨داو داگیرکردنی لەساڵی ١٩٦٨داو کۆمەڵێك نمونەی دی، هەموو ئەمانە پیشاناندەدەن دەشێ چی رووبداو چۆنیش رووبدا. بێگومان ئەرکی ئێمەشە لەم رووداوانەوە فێر ببین: دەبێ لەمێژوو و لەهەڵەکانمانەوە فێربین.

لەراستیدا ئەو ترسە زیادەیەی هەمانە لەوەی ئێمەی کە بڕوامان بەلێکبوردن هەیە، رەنگە ببین بەکەسانێك کە لێبوردو نین، بۆتە هۆی هەڵوێستێکی هەڵەو پڕ مەترسی کە ناچارماندەکات لەهەموو شتێك ببورین، تەنانەت رەنگە لەکاری توندوتیژیش. بێگومان لێکبوردن بەرامبەر بە هەر شتێکیش کە چەند هەنگاوێکی کەم لەتوندوتیژیەوە دوورە. ئەم هەڵوێستە بەشێوەیەك لەشێوەکان قابیلی تێگەیشتنەو بگرە شایەنی سەرسام بوونیشە. چونکە لەو دیدەوە سەرچاوە دەگرێت کە لەپشت بناغەی سەرجەم بیرۆکەی لێکبوردنەوەیە: ئەو دیدەی دەڵێت ئێمە هەمووومان دەشێت هەڵەبینو بانگەشە بۆ هەڵەبکەین، ئەو دیدەی دەڵێت رەنگە من هەڵەبمو تۆ راست بکەیتو پێویستە خۆم وافێربکەم چۆن لەو هەستە ترسناکە هەڵخەڵەتێنە یان بەو بڕوایەی پێم دەڵێ: ئەوە منم هەمیشە لەسەر راستیم، خۆم بپارێزم چەند بەهێزیش بێت. چونکە تاچەند ئەم هەستە بەهێز بێت، ئەوا زیاتر ئەو مەترسیە شاراوەیە زیاد ئەکات سەبارەت بەوەی بەدەستی خۆم، خۆم نائومێد بکەم. هەروەها مەترسی ئەوەی خۆشم ببم بەدەمارگیرێکی لێنەبوردە.

کەس ئەم شتەی هێندەی ڤۆڵتێر بەڕوونی نەبینی،و کەسیش هێندەی ئەو بەجوانی دەرینەبڕی کاتێك نووسی (من لێرەدا ئازادانە قسەکان دەهێنمەوە)(١).

"لێکبوردن چیە؟ لێکبوردن دەرەنجامێکی لکاوە بەبوونی مرۆڤایەتیمانەوە. ئێمە هەموومان بەرهەمی لاوازیین. هەموومان لەرزیوینو هەڵەدەکەین، لەبەر ئەوە لێگەڕێ لەیەکدی ببورینو لەشێتی یەکدی بەرامبەر بەیەك بەشێوەیەکی دوولایەنە ببورین. ئەمەیە بنەمای یەکەمی یاسای سروشت و بنەمای یەکەمی سەرجەم مافەکانی مرۆڤ"

من زۆر بەم دەربڕینەی ڤۆڵتێر سەرسامم. بەڵگەکانی لێرەدا زۆر تۆکمەنو لەسەر ئەو دیدەی سوکرات دامەزراوە کە دەڵێت: "من دەزانم کە نازانم..زۆر بەکەمکوڕیش ئەمە دەزانم"(٢). زانینی ئەم راستیەش بەسە بۆ ئەوەی داوا لەیەکدی





بکەین بەشێوەیەکی دوولایەنە لەیەکدی ببورین. بەڵام گەر هێرشکرایە سەر بیرۆکەی لێکبوردن، ئەوا ئەمە بەتەنیا بەس نیە.

ڤولتێر بەڕوونی ئەوەی دەبینی کە دەبێت لێکبوردن دوولایەنە بێت: واتە دەبێت لەسەر بنەمای بەرامبەر (تقابل) بێت. بەڵام پێشبینی دروستبوونی کۆمەڵگایەکی دیموکراسی نەکرد کە لێکبوردن تیایدا دەبێت بە بنەمایەکی قبولکراو نەك هەر لەڕووی لێکبوردنی دینیەوە، بەڵکو لەڕوی لێکبوردنی سیاسیشەوە. هەروەها پێشبینی ئەوەی نەکرد کە لەکۆمەڵگایەکی وادا کەمایەتیەك دروستببێت، کە ئامادەنیە هیچ شتێك لەبەرامبەر ئەو لێکبوردنەدا پێشکەشبکات کە زۆرینە پێیدەبەخشێ: کەمایەتیەك کە قبوڵی بنەماکانی لێکنەبوردنو تیورەی پێویستی توندوتیژی دەکاتو بگرە هەندێکجار کاری توندوتیژیش دەکات. ئەوەندەش هۆمان لەبەردەستدایە کەوامان لێبکات بڕوا بەوە بهێنین ئەم کەمایەتیە گەر بۆ رۆژێکیش دەستی بەدەسەڵات بگات، ئەوا دیموکراسیو ئازادی قسەو لێکبوردن لەناودەبات.

گرفتەکەشمان لێرەدایە: ئایا دەبێت لەگەڵ ئەم کەمایەتیەدا لێبوردوو بین یان نا؟ ئەگەر لێیان نەبورین ئەوا وا دەردەکەوێت کە نکوڵی لەبیروباوەڕە تایبەتیەکانمان دەکەین. وا دەردەکەوێت کە پاشەکشێدەکەین لەبەردەم لێنەبوردنداو بەمشێوەیە دەبین بەکەسانی دوو ڕوو. ئەگەر لێشیان بوراین، ئەوا بەرپرسیار دەبین لەبەرامبەر نەمانی دیموکراسیو نەمانی لێکبوردندا.

بێگومان هیچ یەك لەو گەورە بیریارانەی بەرگری لەلێکبوردن دەکەن -لەئیراز مۆسەوە تا جۆن لۆكو ستیوارت میل- پێشبینی ئەگەری گەیشتن بەهەلۆێستێکی وا نالەباریان نەدەکرد. لەگەڵ ئەوەشدا دەبێت لێرەدا ئەوە بڵێم کە لۆكو میلو زوربەی ئەوانەش کە پەیڕەویانکردن، توانیان بەشێوەیەك پەرە بە تیورەی لێکبوردنو دیموکراسی بدەن کە بتوانرێت بەشێوەیەکی شایستە وەڵامی ئەم پرسیارە بدرێتەوە: لەم بارودۆخە تازەیەدا دەبێت چیبکرێت؟ ئەمەش لەبەر ئەوە بوو کە ئەوان لایان روون بوو، نابێت لێبووردن بێسنووربێت.

ئاشکرایە سەبارەت بەو هەلومەرجەی ئێستامان، وەڵامەکە لەفورمە پراکتیکیەکەیدا دەبێت بەمشێوەیە بێت: تا ئەوکاتەی ئەم کەمایەتیە لێنەبوردانەو وتوێژ دەکەنو تیورەکانیان وەك پێشنیارێکی عەقلانی بلاودەکەنەوە، پێویستە







لێگەڕێن بەوپەڕی ئازادیەوە ئەمکارە بکەن، بەڵام دەبێت سەرنجی ئەو راستیە بدەین کە لێکبوردن دەبێت لەسەر بنەمایەکی دوولایەنە بێت، و ئەرکی سەرشانیشمان سەبارەت بە لێکبوردن لەکەمایەتیەك لەکەمایەتیەکان دەبێت لەو خاڵەدا راوەستێت کە ئەو کەمایەتیە دەست بەکاری توندوتیژ دەکات. لێرەدا پرسیارێکی تازە دێتەپێشێ. ئاخۆ کەی وتوێژی عەقلانی تەواو دەبێتو کاری توندوتیژی دەست پێدەکات؟ چونکە ئەم مەسەلەیە لەڕووی پراکتیکیەوە بە ئاسانی بڕیاری لەسەر نادرێت.کاری توندوتیژی رەنگە لەشێوەی هاندان بۆ کاری توندوتیژ یان لەشێوەی دەسیسەیەکدا دەرکەوێت بۆ رمانی دیموکراسی دەستوری. بێگومان چ هاندان بۆ توندوتیژیو چ دەسیسە کردنیش بەئاسانی لەو جوولانانە جیاناکرێنەوە کە لێیدەبورین. ئەم مەسەلەیەش لەپەیوەندیدا بەیاساوە لەچاو زوربەی مەسەلەکانی تردا بەشتێکی رۆتین دادەنرێت. بۆ نمونە رەنگە ئەستەم بێت، کوشتنی بە ئەنقەست لەکوشتنی بێ ئەنقەست جیابکەینەوە، یان نەتوانین ناشایستەیی، لەوێرانکاری بەئەنقەست جیابکرێنەوە. من لێرەدا وای دەبینم هەلومەرجە مەعنەویو تیوریەکە لەڕووی مەبدەئیەوە زۆر روون بێت. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا زوربەی خەڵك هەستدەکەن، پێویستە لەکارەکانیاندا پەیڕەوی لێکبوردن بکەن، تا ئەو رادەیەی ئارەزووی بینینی جیاوازیان نامێنێت. بۆ نمونە لەنێوان حیزبێکی سیاسیدا (بەمانا دیموکراسیەکەی) وەك حیزبێك کە ئامادەیە رێساکانی دیموکراسی قبوڵبکات، تەنانەت گەر زورینەشی بەدەستنەهێنا، لەگەڵ حیزبێکی دیدا کە بەشێوەیەکی ئاشکرا یان نهێنی دەسیسە بۆ سڕینەوەی دیموکراسی دەکات، ئەگەر حیزبێکی لەمچەشنەش لەرێگەی دیموکراسی یان لەرێگەیەکی دیەوە بۆ ئەم ئامانجە دەگەڕێت، ئەوا ئەمە هیچ لەباسەکە ناگۆڕێت. چونکە لەناوبردنی دیموکراسی لەهەموو حاڵەتەکاندا دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی کاری توندوتیژو نابەرپرسیارانە. پێویستە لەسەر ئێمەش مل بۆ حیزبێکی وا نەدەین، تەنانەت گەر زۆرینەش پێکبهێنێت.

لەبەردەم ئەو پرسیارەشدا کە ئایا حیزبێکی لەمچەشنە مافی ئەوەی هەیە داوامان لێبکات لێبوردوو بین لەگەڵیدا؟ بڕوامولیە تیورەکان وەڵامێکی ئاشکرامان دەدەنەوە: نەخێر. ئێمە پێویستمان بە لێکبوردن نیە لەژێر هەڕەشەی لێکنەبوردنداو نابێ لێی ببورین، بە تایبەتی ئەگەر هەڕەشەکە مەترسیدار بێت.

بێگومان ئەرکی سەرشانمانەو دەتوانین تیورەی ئەو کەسانە پوچەڵبکەینەوە کە دەیانەوێت بەهانە بۆ کاری توندوتیژی بدۆزنەوە. ئەم تیوریانەش لەجەوهەردا بەردەوام لەیەکدەچن، سەرچاوەی ئەم تیۆرانە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو قسەیەی گوایە دیموکراسیو لێکبوردنەکەمان کەموکوڕە، و ئێمەش بووین یەکەمجار توندوتیژیمان بەکارهێناو بەدرێژایی سەردەمە جیاوازەکان بەکارمانهێناوە، و کەچی بانگەشەی ئەوە دەکەین لێبوردوین. بێگومان هەمیشە ئەم جۆرە لاف لێدانانە لەئارادایە.

هەرگیز ئەو قسەیەم لەیاد ناچێت، بەتایبەتی لەساڵەکانی ١٩١٨و ١٩١٩دا دەمبیست کە گوایە سەرمایەداری بەحوکمی توندوتیژی بەردەوامی، بەرپرسە لەژمارەیەك لەو قوربانیانەی کە رۆژانە دەدران و ژمارەیان زۆر زیاتر بوو لەقوربانیەکانی شۆڕشی سوشیالیزمی بەدرێژایی مێژووی خۆی. ئەوەشم لەیاد ناچێت بەدرێژایی چەند هەفتەیەك خودی خۆم بڕوام بەم خورافەیە کرد. بەڵام بەر لەوەی بگەمە تەمەنی ١٧ ساڵی ئەو هەلەم بۆ رەخسا بەچاوی خۆم ژمارەیەك لەقوربانیەکانی شۆڕشی سوشیالیزمی ببینم. ئەم ئەزموونەش وایلێکردم بۆ هەتاهەتایە رەخنەگرێکی توند بم دژی ئەمجۆرە قسانەو دژی هەموو ئەو سەرچاوانەش کە هەوڵدەدەن بەهانە بۆ بەکارهێنانی توندوتیژی بهێننەوە، ئیدی سەرچاوەکەی لەهەر لایەنێکەوە بێت. هەروەها تارادەیەك بیروڕام ئەو کاتە گۆڕی کە گوێم لە"گۆرینگ" بوو پاش هاتنە سەر حوکمی نازیەکان بەهۆی هەڵبژاردنێکی گشتیەوە، دەیگوت: ئیدی ئامادەیە پشتگیری هەموو سەربازێك لەسەربازەکانی هێزی گەردەلوول بکات کە ناچار دەبێت توندوتیژی بەکاربێنێت. دژی هەر کەسێك بێت، تەنانەت گەر هەڵەیەکی بچوکیشی کردو لەبری کەسی داواکراو و یەکێکی دی بەهەڵە دەستگیربکات. پاشان "شەوی خەنجەرە درێژەکان" هات. ئەو شەوەی نازیەکان بەر لەڕوودانی ناویان لێنابوو. ئەو شەوە بوو کە نازیەکان خەنجەرە درێژو دەمانچەو تفەنگەکانیان بەکارهێنا نەك دژی نەیارەکانیانو جوولەکەکان، بەڵکو دژی جەماوەریترین رابەرەکانی خۆیان (واتە) دژی نەیارەکانی هیتلەر کە لەریزی لایەنگرانی خۆیاندا بوون: لەوانەش رۆهەمو زوربەی هاورێکانی(٣). (ئەمانە بەراوردبکەن بەوەی چۆن (لەهەمان ئەو کاتانەداو بەدیاریکراوی پێش جەنگی جیهانی دووهەم بەماوەیەك) ستالین دادگاکانی بەکارهێنا بۆ لەناوبردنی حەرەسی کۆنو رابەرە شیوعیە کۆنەکانو پاش ئەمەش ژمارەیەك لەو







کەسانەی بەوپەڕی دڵسۆزیەوە خزمەتیان کردبوو. تا ئەو کاتەی چارەنووسی خۆشی —وەك هەندێك بڕوایانوایە- بەدەستی جەلادێك کۆتایی هات کە دژی دوژمنەکانی یارمەتی دابوو. هەروەها ئەمە بەراوردبکەن بەوەی چۆن رۆبسپێر دەسەڵاتی خۆی دژی هاورێکانی بەکارهێنا، تا دواجار خۆشی چارەنووسی لەبەردەم هەمان ئەو گرۆتینەدا کۆتایی پێهات (کە هاورێکانی خۆی بۆ راپێچ کردبوو).)

لێرەوە لەپاش ئەم رووداوانەی ئەڵمانیاوە، وازم لەپەیوەندی رەهای خۆم بە بنەماکانی ناتوندوتیژیەوە هێنا؛ چونکە بۆم ئاشکرابوو لێکبوردن سنوری هەیە. بەڵام ئەمڕۆ چۆن دەتوانین وەڵامی ئەو قسەڵۆکانە بدەینەوە کە دەڵێت ئێمەی لایەنگرانی دیموکراسیو ئێمەی کە پێمان دەگوترێت "سەرمایەداران"، یەکەم کەس بووین توندوتیژیمان بەکارهێناوەو هێشتاش تا ئەمڕۆ بەکاریدێنین؟

من پێمباشە وەڵامی ئەم قسەڵۆکانە بەقسەگەلێك بدەمەوە کە بڕوام بەراستی بوونیانە: پێموایە دەبێ داوا لەنەیارەکانمان بکەین پیشانمانبدەن لەکوێدا هەڵەمان کردووەو چۆن؟ من واقعێك لەبەرچاومدایە ئەویش ئەوەیە کۆمەڵگا رۆژئاواییە دیموکراسیەکانمان، ئەو کۆمەڵگایانانەن کە زیاتر لەهەر کۆمەڵگایەکی دی ئازادیو لێکبوردنو دادپەروەری تیایەو کەمتر توندوتیژی لەسەرجەم ئەو کۆمەڵگایانە تیایە کە دەیانناسین: جگە لەکۆمەڵگای ئەسکیمۆ بەر لەسەدەی بیستەم. ئەگەرچی لەم کۆمەڵگایەدا چەند حاڵەتێکی کوشتنی ئەنقەست و نائەنقەست هەبوو، بەڵام جگە لەمە هیچ شێوەیەکی دی توندوتیژی تێدا نەبوو. ئەسکیمۆکان بەگشتی بێ حکومەت دەژیانو رەنگە بتوانین تەفسیری نەبوونی توندوتیژی لەجیهانی ئەسکیمۆدا بەوەبکەین، کە ئەم گەلە لەجوگرافیەیەکی گەورەی زەویدا بلاو بوبۆوە.

پێشتر هەمیشە گوتوومە: من سەیری کۆمەڵگاکانمان وەك باشترین کۆمەڵگا کە تا ئێستا دروستبووە، دەکەم. بەتاوانیشی دەزانم مرۆڤ ئەم راستیە نەدرکێنێتو بەهەموو هێزیشیەوە نەیلێت. هەروەها پێویستە لەسەر مرۆڤ بەرەنگاری ئەو کەسانەبکات کە سوورن لەسەر ئەوەی هەندێك گەلی بچوك بەو بڕوایە نابەختەوەر بکەن کە گوایە ئێمە لەجیهانێکی ترسناکدا دەژین. لەجیهانێکدا کە لەدۆزەخی سەرمایەداری دەچێت. راستیەکەی ئەوەیە ئێمە لەجیهانێکی بێوێنەدا دەژین: جیهانێکی جوانو لەناو کۆمەڵگایەکی ئازادو کراوەو سەرسوڕهێنەردا. بێگومان

چاوەڕێی ئەوە دەکرێت بەپێی مۆدەی ئەم سەردەمە، شتێکی پێچەوانەی ئەمە بگوترێت. بگرە ئەمە ئەرکی رۆشنبیرە کە وا بکات- و رەخنە لەنەخۆشیەکانی کۆمەڵگاکەمانو لەستەمە کەڵەکە بوەکانی ناویو بەتایبەتی لەجیاوازیە ترسناکەکانی بگرێت (هەروەها هەڕەشەی رۆژی لەسێدارەدانمان لێبکرێت کاتێك لەسەر ئەو تاوانانە سزامان دەدەن کە کردوومانە). بەڵام من بڕواموایە هەموو ئەمانە هەڵەن.

راستە، زۆر راستە کەمایەتیەکی بچوك هەیە کە زۆر دەوڵەمەندە. بەڵام ئەمە چ زیانێکی بۆ منو تۆ هەیە؟ بگرە لەوە دەچێ زۆر راست بێت کە کەس بەهۆی دەوڵەمەندی ئەم کەمایەتیەوە دووچاری ناخۆشی نەبووە. ئەمە ئەگەر ئەو راستیە نەدرکێنین کە ژمارەیەك لەم کەمایەتیە بەشێکی زۆر لەسامانەکەی بۆ کۆمەڵێك شتی وەك دامەزراندنی زانکۆکانو پێشکەشکردنی دەرماڵەو پشتگیرکردنی پەروەردەو دامەزراندنی پەیمانگە پسپۆڕەکان لەبواری لێکۆڵینەوەی شێرپەنجەدا بەکاردەهێنێت...ئەمانەش تەنها چەند نمونەیەکن.

لەراستیدا گەرچی کۆمەڵگاکانی ئێمەو دیموکراسیەکەمان هێشتا لەکەماڵەوە دوورە، بەڵام بەتاکە کۆمەڵگایەك دەژمێرێت کە تا رادەیەکی زۆر ئازادی تێدایە، و هەوڵێکی زۆریش لەم کۆمەڵگایانەدا دەدرێت بۆ بەرژەوەندی فەقیرەکانو بڕێکی زۆریش یەکسانی لەبەردەم یاساداو بڕێکی زۆریش لێکبوردنی تیایە. بێگومان کۆمەڵگاکەمان هیشتا زۆر دوورە لەوەی کۆمەڵگایەکی کامڵبێت. چونکە هێشتا زۆر مادە بێهۆشکەرەکانو ئەلکهولو توتنی (کە خۆی لەخۆیدا بێهۆشکەرێکی ترسناکە) بەخراپی تیا بەکاردەهێنرێت. بەڵام زۆر زەحمەتە لەم گرفتانە رزگارمانبێت، مادام ئازادی ئەوەندە لامان خۆشەویستە.

لێرەدا رەنگە یەکێك وەڵامم بداتەوەو بڵێت: بەڵام ئەم مەسەلانە کۆمەڵێك نیشانەن کە ئاماژە بۆ ئەو بەدبەختیە دەکەن کە نەوە تازەکان دەیچێژن..بەدبەختیەك کە دەگەڕێتەوە بۆ جیاوازی کۆمەڵایەتیو بێکاری.؟ بەڵام ئەگەر ئێوە مەبەستتان لەجیاوازی کۆمەڵایەتی ئەوەیە کە هەندێك کەس سامانی زیاتریان لەکەسانی دی هەیە، ئەوا دەڵێم ئەم مەسەلەیە بەلای منەوە هیچ گرنگ نیە، مادام ئەو کەسانەی دی دەتوانن ژیانێکی ماقووڵ بژین. بەڵام سەبارەت بە بێکاری ئەوا ئەمە مەسەلەیەکی زۆر جیاوازە.







من دەزانم بێکاری شتێکی ترسناکەو نەخۆشیەکی کۆمەڵایەتی راستەقینەیەو بگرە لەهەموو ئەو گرفتە کۆمەڵایەتیانە ترسناکترە کە بەرەو رووومان دەبێتەوە. بێگومان ناشزانم چۆن ئەم نەخۆشیە ترسناکە چارەسەر دەکرێت. لەناو هاوڕێکانماندا ئابوریزانانی بەناوبانگ هەیە. بەڵام وابزانم پێویستناکات بڵێم چەند بۆ چارەسەرکردنی ئەم گرفتە، جیاوازیی بۆچون لەنێوانیاندا هەیە. لێرەدا من سەبارەت بەم گرفتە لایەنیکەم لەیەك شت دڵنیام (کە ئەویش ئەوەیە) گەر چارەسەرێکی زانراو بۆ بێکاری هەبوایە، ئەوا بێکاری نەدەما. چونکە هیچ حکومەتێك نیە هەلی وا لەکیس خۆیبدات کە دەرفەتی بردنەوەی هەڵبژاردنی بۆ مسۆگەر دەکات، کە ئەویش هەلی نەهێشتنی بێکاریە.

لێرەدا جارێکی دی دووبارەی دەکەمەوە، کۆمەڵگاکەمان دوورە لەوەی کامڵ بێت. بەڵام لەدیموکراسیە رۆژئاواییەکاندا پێشوازی لەهەموو ئەو وتووێژانە دەکرێت کە لەبارەی هەڵەی کۆمەڵگاکەمانەوە ئەنجامدەدرێنو بگرە هەنگاوی کردەییش دەنرێت بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانو بەدوای هەنگاوی دیشدا دەگەڕێت. حاڵەتێك کە لەسەرجەم دیموکراسیەکاندا زۆر زیاتر  روودەدات بەبەراورد لەگەڵ هەر سەردەمێکی تری رابردوودا. یان هەر کۆمەڵگایەکی دیدا.

هەوڵدەدەم لەبەرامبەر ئەو کەسانەشدا کە بڕوایانوایە دیموکراسیە رۆژئاواییەکان و لێکبوردنەکەمان کەموکووڕە، لەڕێی پرسیارێکەوە بە ویژدانەوە وەڵامبدەمەوە: ئایا دەکرێ دیموکراسیەکەمان بە دیسپۆنیزمێکی دەمامکدار بزانین، تەنانەت ئەگەر بەو شێوەیەش دەرکەوێت؟ دەکرێ وەڵامی ئەم پرسیارە بەمشێوەیە بدەینەوە.

با بۆ دیموکراسیەتی پراکتیزەکراو، دەسەڵاتی رای گشتی لەئەمەریکا بەنمونە بهێنینەوە. ئەم رای گشتیە بووە هۆی ئەوەی دەوڵەت نەتوانێت چەکی ئەتۆمی لەجەنگی کۆریاو ڤیتنامدا بەکاربهێنێ. . . لەکاتێکدا رەنگە بەکارهێنانی ئەو چەکە ببوایەتە هۆی سەرکەوتنی (ئەمەریکا)، نەك نیوە تێکشکانێك لەجەنگی یەکەمداو تێکشکانێکی تەواویش لەجەنگی ڤیتنامدا. هەر ئەم رای گشتیەش بووە هۆی دەست لەکار کێشانەوەی ریچارد نیسکۆن. ئاشکرایە رای گشتی ماوەیەکی دەوێت بۆ ئەوەی دروستببێت. بەڵام توانی بۆ یەکەمجار لەمێژووداو بێ هەڵبژاردن، جەنگێك راگرێت کە بەردەوامبوو..ئەویش تەنها لەرێگای ئەوەوە کە چیدی ئامادە نەبوو

پشتگیریبکات. من هیچ ڕووداوێکی هاوشێوە لەمێژوودا شکنابەم بووبێتە هۆی ئەم سەرکەوتنە کە دەتوانین ناوی بنێین دەرچونێکی ئەخلاقی لەجەنگ. ئەمە دەڵێین بەڵام بێئەوەی حوکم بەسەر ئەوەدا بدەین کە ئایا ڕای گشتی ڕاستە یان نا، بەتایبەتی گەر ئەوە لەبەرچاوبگرین کەچی لەباشوری ئاسیادا ڕوویدا، پاش ئەوەی ئەمەریکا لێیکشایەوە. ئەو نمونانەی لێرەدا دەیهێنمەوە بۆ ئەوەیە بەڵگە بۆ ئەوە بهێنمەوە کە دیموکراسیەت عەیب نیە.

نمونەکانم بۆ ئەوە نیە بڵێم هەمیشە ڕای گشتی ڕاستە یان لەو نمونانەدا کە هێنامەوە ڕاستیکرد. یان لەداهاتوودا ڕاستدەکات. چونکە ئەمە شتێکە ناتوانین لەبارەی هیچ ڕایەکەوە بیڵێین، جا چ گشتی بێ یان ڕای دەسەڵات بێت. مەبەستم لێرەدا ئەمە نیە. بەڵکو مەبەستم ئەو پرسیارەیە ئایا دیموکراسی عەیبە یان نا. ئەو بەڵگانەی هێنامەوە بەباشترین شێوە دەریدەخات کە دیموکراسی عەیب نیە. لێرەوە دەتوانین وەڵامی ئەو بەڵگە کلێشەییانە بدەینەوە کە ئەو کەمایەتیانەی بڕوایان بە بنەمای توندوتیژی هەیە، پشتی پێدەبەستن.

لێرەدا دەتوانین شتێکیش لەبارەی مەسەلەیەکەوە بدرکێنین کە زۆر گرنگیەکی کەمتری هەیە: لەسەرەتای پەنجاکانداو پاش پووچەڵ بوونەوەی تیورەی مێژوویی مارکسیزم، هەندێك شێوەی مارکسیزم گۆڕا بۆ ئەوەی ببێت بە چەند ڕەخنەیەکی ئاڵۆز سەبارەت بەخراپی جیهان و ژیان، بەتایبەتی بەهۆی ناچاری ژیان لەناو دۆزەخی "سەرمایەداریدا". بەمشێوەیەش لەبری پێشکەشکردنی تیورەیەکی دیاریکراو، دەستکرا بە بەرزکردنەوەی دروشمەکان... بەتایبەتی ئەوەی لەدەوری زاراوەی "نامۆبوون" دەخولێتەوە. ڕەخنەکەش ئەوەیە سەرمایەداری لەژیانی سروشتی خۆمان، نامۆمان دەکات و ژینگەی سروشتیمان لێدەسێنێت.

من ئەمڕۆ ئامادەم دان بەوەدا بنێم کە هەندێ بیناو شێوەی جیاوازی پەرەسەندنی "کۆشکسازی" (معماری) "بەتایبەتی ئەوەی دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی مارکس"، ترسناکەو ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو شێوازی بەرهەمهێنانەی —لێرەدا دەربڕینە مارکسیەکان بەکاردێنین- کە مارکس ناوینابوو سەرمایەداری. هەروەها ئامادەم دان بەوەدا بنێم کە ئەو هەلومەرجەی دەبوو کرێکاران لەسایەیدا کار بکەن،





زۆر ترسناکتر بوو. دان بەوەشدا دەنێم هەلومەرجی کار لەزۆر شوێندا خراپەو پێویستی بەچاککردن هەیە.. تەنانەت گەر تا ڕادەیەکیش لەهەموو شوێنەکاندا بڕێك چاك بووبێت.

بەڵام من ناتوانم مارکسیەکان بەجدی وەربگرم کاتێك بەهاتوهاوارەوە ڕەخنە لەمەیلی گشتی بەرەو نامۆبوون دەگرن...نامۆ بونمان لەژینگەی سروشتیمان، چونکە ئەم مەیلە یەکێکە لەمەیل یان ئاراستە بنەڕەتیەکانی ژیان.. یەکێکە لەئاراستەکانی پرۆسەی "خۆگونجان" (تأقلم).(بۆ نمونە) جینی یەکەم کە ژمارەی لەناو کۆمەڵێك ئەنزیماتدا زیادیکرد (بەو گریمانەوە کە شتێکی لەم شێوەیە ڕوویدابێت)، یەکەم شت بوو کە خۆی لەژینگەی سروشتی خۆی‌و لەبواری ژینگەی هەڵبژێراوی خۆی، نامۆ کرد..(ئەمەش) کاتێك لەرێگەی گۆڕانەوە کارەکانی خۆی بەوشێوەیە مەیسەر کرد کە ڕووکەشی تایبەتی خۆی لەئەنزیمات دروستبکات، کاتێکیش ئەمەی کرد، توانی ژینگەی تایبەتی خۆی دروستبکات: ژینگەیەك کە بێگومان زیاتر سەقامگیرە. ئەمەش ئەو شتەیە کە بەگشتی نامۆبوون دەیکات. بۆ نمونە کاتێك ئەمڕۆ ئێمە پاڵتۆیەکی چەرمی دژی باران لەرۆژێکی باراناویدا لەبەردەکەین یان پاڵتۆیەکی ئەستوور دژی ڕۆژێکی سارد یان جووتێ پێڵاو کاتێك ڕێگایەکی بەردەڵان دەبڕین (لەپێ دەکەین)، ئەوا ئێمە خۆمان لەژینگەی سروشتیمان، نامۆ* دەکەین بەهۆی بەدەستهێنانی ژینگەیەکی تایبەتەوە لەلایەن خۆمانەوە..ڕێك وەك حەلەزۆن دەیکات. ئەوەی لێرەدا مانایەکی زۆری هەیە، تەنها ئەوەیە ئایا پاڵتۆ چەرمەکە توانای گرتنی بارانی هەیە یان پێڵاوەکە نادڕێ..ئەگەر وابوو ئەوا بێگومان هەوڵدەدەین شتێکی باشتر لەوەمان دەستکەوێت. لەڕاستیدا مەسەلەی چاککردنی ئەو پێلاوەی لەپێی دەکەین، مەسەلەیەکی زۆر تایبەتیە (خصوصی): لەوجۆرە گرفتانەیە کە ژیان دەستەبەری چارەسەرکردنی بەهۆی گۆڕانکاری زیاترەوە دەکات.. واتە هەنگاوی تر بەرەو نامۆبوون و گواستنەوە. وەك ئەوەی گەچێکی پارێزەری حەب بۆ پاراستنی داوو دەرمان بەکاربێنین. بەڵام بەشێوەیەکی گشتی ڕەخنەگرتن لەنامۆبوون مەسەلەیەکی هیچوپووچە، و وەك ڕەخنەگرتن وایە لەنمایشکردن (استعراضات)و ددانی دروستکراوو کەرەستەی سارێژکردن و (اللحام). لەبری ئەوەی ئێمەی مرۆڤ دڵخۆشبین بەوەی دەستمان بەم شتانە گەیشتووە، ولەهەولی بەردەوامیشداین بۆ چاککردنیان،





بەتایبەتی ئەو کاتانەی کە پێوستیان بەچاککردن هەیە.

ئێستا بابگەڕێینەوە بۆ لێکبوردن: هەمیشە لێکبوردن و دیموکراسیو هەموو ئەو هەوڵە مەزنانەی بۆ چاککردنی هەلومەرجی ژیان بۆ هەموان دەیدەین، کۆمەڵێك هێرشی دەکرێتە سەر. بێگومان گەر ئەم هێرشانە لەسنووری رەخنەیەکی ماقووڵدا بوەستن، ئەوا دەبێت پێشوازیان لێبکەین. لەبەرامبەر ئەمەدا پێویستە گەر هەڵەبوو وەڵامی بدەینەوە، بەتایبەتی گەر لەلایەن ئەو کەس و گرووپانەوە بێت کە دەیانەوێت سوود لەلێکبوردن وەربگرن، بێئەوەی نیەتی ئەوەیان هەبێت شتێکی هاوتای لەبەرامبەردا پێشکەشبکەن، کە ئەویش پراکتیککردنی لێکبوردنە لەلایەن خۆیانەوە. کەسان و گروپێك کە داوای مافەکانی خۆیان دەکەن، بێ ئەوەی ئامادەبن دستەبەری مافەکانی ئەو کەسانە بکەن کە ئەمرۆ داوای مافە تایبەتیەکانی خۆیانیان لێدەکەن. لێرەوە لەم حاڵەتەشدا نەك هەر مافی ئەوەمان هەیە، بەڵکو ئەرکی سەرشانمانە نکووڵی لەلێکبوردن بۆکەسانێك بکەین کە دەسیسە بۆ لەناوبردنی لێکبوردن دەکەن. بەرپرسیارێتیشمان لەم ئاراستەیەدا زۆر گەورەیە.

لێرەدا پێویستە ئەم خاڵە بەمشێوەیە کورتبکەینەوە. ئێمە دەبێت بۆ ئەوەی بەرگری لەلێکبوردن دژی دوژمنەکانی لێکبوردن بکەین، پێویستە بەرگری لەدیموکراسیو دەزگاکانو دەستکەوتەکانی بکەین. بەڵام پێشنیاردەکەم بەشێوەیەك لەشێوەکان دوور تر بڕوانین.

ئەو لاوازیە راستەقینەیەی لەپشت دوو دڵیمانەوەیە لەبەرگریکردن لەدیموکراسیو لەوەی ناومناوە کۆمەڵگای کراوە دژی دوژمنەکانی... ئەو لاوازیەی لەپشت ترسی گەورەمانەوەیە لەوەی ببین بە کەسانی لینەبوردوو لەبەرامبەر ئەو کەسانەدا کە ئامادە نین لەگەڵماندا بیگۆڕنەوە، ئەم لاوازیە دەگەڕێتەوە بۆ ئەمە: لەراستیدا ئێمە ئەو وانەیە فێربووین کە ڤۆلتێر بەشێوەیەکی جوان دایڕشتبوو..ئەو وانەیەی ناوەڕۆکەکەی بریتیە لەوەی ئێمە قابلیی هەڵەکردنین، ئێمە بوونەوەرێکی مرۆیین و زۆرجاریش دەکەوینە هەڵەوە. هەستدەکەم زۆر کەس لەنێوماندا وا لەم بیرۆکەیە تێگەیشتوون کە هەمووشتێك رێکوپێکەو دەکرێت بەرگری لێبکرێت. وا لەم وانەیە تێگەیشتووین کە نەك هەر دەبێت بەیەکسانیو دادپەروەریەوە گوێ لەهەموو کەسێك بگرین، بەڵکو هەر هەڵوێستێك باشترە لەهەڵوێستێکی دیو بەتایبەتی باشتر







لەهەڵوێستەکانی ئێمە. هەروەها (وا لەم وانەیە گەیشتووین) کە بۆ ئەوەی عەقڵانی بین نەك هەر دەبێت لێبوردو و دۆگمایی نەبین، بەڵکو بەتەواوی بێلایەن بین، تەنانەت لەبەردەم خراپترین راکانیشدا. هەروەها دان بەوەشدا بنێین کە هەموو رایەك دەکرێت بەرگری لێبکرێو هەموو راکان یەکسانن، جا چ دیموکراسی بێ یان تۆتالیتاری..یان تەنانەت گەر وا هاتە پێشچاو ئەم رایە زۆر دڵڕەقانەو دۆگماییە. (هەموو ئەمانەش لەو بڕوایەوە کە) شتێك لەتوتالیتاریەتدا هەیە (بێگومان ئەمەش راستە) و تەنانەت شتێکیش لەوەدا هەیە کە فێری منالان بکەین چۆن دڵڕەق بن (بێگومان ئەمەش راست نیە).

ئەمە ئەو هەڵوێستەیە کە فەیلەسوفان ناوی "رێژەگەریی" لێدەنین. هەندێك کەس وا هەستدەکەن گەر بڕوامان بە بیرۆکەی "ئەگەری کەوتنە هەڵەوە" هەبێت، ئەوا دەبێت بە ناچاری قبوڵی رێژەگەری بکەین و بەڕێی ڤولتێردا بڕۆین کە دوو مەسەلەی بەجدی وەرگرت: ئەگەری کەوتنە هەڵەی مرۆڤەوەو لێکبوردن.

بەبڕوای من وەڵامدانەوەو پووچەڵکردنەوەی رێژەگەری مەسەلەیەکی زۆر گرنگە. مەسەلەیەکی زۆر ئاسانیشە. ئەگەری کەوتنە هەڵەی مرۆڤ، بەمانای ئەوە دێت ئێمە هەموومان دەشێت هەڵە بکەین و پێویستە لەسەرمان وا نەزانین ئەوەی لەبەرچاومان دەردەکەوێت، بریتیە لەهەموو هەقیقەت..یان لەڕووی ئەخلاقیەوە راستە، چونکە رەنگە هەقیقەت نەبێتو لەڕووی ئەخلاقیشەوە راست نەبێت.

بەڵام ئەمە پێویستی بەبوونی شتێك هەیە، وەك حەقیقەت و پێویستی بەبوونی کردارێکە کە لەڕووی ئەخلاقیەوە راستبێت، یان شتی لەمشێوەیە. بێگومان ئەگەری هەڵەکردن ئەوە دەسەپێنێت کە بەگشتی هەقیقەت و راستی گران بەدەستدێن، کەئەمەش بەمانای ئەوە دێت پێویستە هەمیشە ئامادەبین بۆ دۆزینەوەی ئەوەی هەڵەمانکردووە. لەلایەکی دیەوە ئەگەری هەڵەکردن ئەوە دەسەپێنێت کە دەتوانین بگەینە شوێنێك کە پتر لەهەقیقەت یان لەکۆمەڵگایەکی چاکەوە نزیکە. لەحاڵەتێکی واشدا ناتوانین خۆمان لەکردارو لەلایەنگری لایەنێك لەلایەنەکان بەدوور بگرین. چونکە بێکرداری خۆی لەخۆیدا جۆرێکە لەکردارو لێرەوە دەبێتە هۆی لایەنگیری بۆ لایەنێك. ئەوەی لەهەموو ئەمانەشەوە فێر دەبین ئەوەیە کە نابێت لەگەڕانی رەخنەیی (زۆر رەخنەیی)ماندا بۆ گەیشتن بەهەقیقەت رابوەستین، و پێویستە

بەردەوام هەوڵبدەین لەو کەسانەوە فێر بین کە تێڕوانینی جیاواز لەئێمەیان هەیە. ئەگەر بەشێوەیەکی جدی دەمانەوێت زیاتر لەهەقیقەتەوە نزیک بین و گەر دەمانەوێت باشترین شێوازی کارکردن بدۆزینەوە کە لەتواناماندایە پەیڕەوی بکەین، ئەوا پێویستە لەسەرمان هەوڵبدەین گوێ لەکەسانی دی بگرین و لێیانەوە فێربین. بەتایبەتی لەنەیارەکانمانەوە. لەبەر ئەم هۆیەش بەدیاریکراوی پێویستە لەسەرمان ڕێژەگەری رەتبکەینەوە.

رەنگە بکرێ هەموو ئەمانە بەمشێوەیە دابڕێژین: زۆر شتێکی جوانە مرۆڤ بڵێت"رەنگە من هەڵەبم و رەنگە تۆ راستبکەی". ئەگەر دوولایەنیش پێکەوە ئەمەیان گوت ئەوا رەنگە ئەمە بەس بێت، بۆ گەیشتن بە لێکبوردنێکی دوولایەنە و بۆ گەیشتن بە کۆمەڵگایەکی تەندروست. بەڵام بۆ خۆ دورگرتن لەرێژەگەری دەبێت شتێکی زیاتر لەمە بڵێین. ئەوەی پێویستە بیڵێین ئەمەیە:" رەنگە من هەڵەبم و رەنگە تۆ راست بکەیت، و رەنگە ئێمە بەهۆی وتوێژێکی عەقڵانیەوە لەبارەی شتەکانەوە بتوانین هەندێك لەهەڵەکانمان راستبکەینەوە. رەنگە پێکەوە بەجێگایەك بگەین کە لەهەقیقەت یان ئیشکردن بەشێوەیەکی راست نزیکترە ".

من وایدەبینم ئەم داڕشتنە زۆرگرنگەو دەمەوێت بۆ تەفسیرکردنی زیاتر قووڵبیمەوە. بۆ ئەمەش وەك پێشنیارێك لەمنەوە داڕشتنەکەی سەرەوە دابەشدەکەین، بەسەر سێ بەش یان سێ بنەمادا:

## بنەمای یەکەم

"رەنگە من هەڵەبم و رەنگە تۆ راستبکەیت"، رەنگە بتوانین بڵێین ئەم داڕشتنە داڕشتنێکی دی بیروڕاکانی ڤۆڵتێرە سەبارەت بە قابیلیەتی مرۆڤ بۆ کەوتنە ناو هەڵە یان ئارەزوو بۆ هەڵە، جا چ پەیوەندی بەهەقیقەتی گریمانەیەك لەگریمانەکانەوە بێت یان پەیوەندی بە باشترین کار —یان گونجاوترین کارەوە بێت- کەپێویستە بەرامبەر هەلومەرجێك لەهەلومەرجەکاندا پەیڕەویبکەین. ئەم بنەمایە بەئاشکرا پشتگیری لێکبوردن دەکات، وەك ڤۆلتێر دەیدی. بەڵام هەڵەیەکی گەورەیە وابزانین پشتگیری ڕێژەگەری دەکات. بەڵکو بەپێچەوانەوە ئەم بیرۆکەیە دوورە لەوەی ببێتە هۆی ئەوەی گەر من و تۆ جیاوازبین، رەنگە هەردوکمان پێکەوە راست بین- رەنگە







رایەکی راست و رایەکی هەڵە سەبارەت بە بابەتێك لەبابەتەکان هەبێت و لەراستیشدا رەنگە هەردوکمان هەڵەبین.

## بنەمای دووەم

"رەنگە بەهۆی لێکگەیشتنی عەقڵانیەوە لەبارەی شتەکانەوە هەندێك لەهەڵەکانمان راستبکەینەوە"

من وای دەبینم ئەم بنەمایەی دووهەم زۆر گرنگە. ئاشکراشە ئەم بنەمایە پێویستی بەبوونی لێکبوردنی پێشوەخت هەیە. سەرەتا ئەوە روونەکەمەوە مەبەستم لە"لێکگەیشتنی عەقڵانی لەبارەی شتەکان"وە چیە؟ مەبەستم لە وتوێژە لەسەر مەسەلەکان بەنیازی دۆزینەوەی ئەوەی راستەو ئەوەی هەڵەیە، ئەوەی هەقیقیەو ئەوەی ساختەیە. چاوپۆشینیش-مادام ئەمە شتێکی مومکینە بۆ مرۆڤ-لەو پرسیارەی کێ راستیکردوەو کێ هەڵە..ئەمەش پرسیارێکە بەلامانەوە دەلالەتێکی زۆری نیە. ئەمە ئەو وەسفەیە کە پێشنیاریدەکەم بۆ ئەو هەڵوێستەی لەئەنجامی وتوێژی عەقڵانیەوە دروستدەبێت. زۆر بەڕوونی دەڵێم کە قسەکردنو وتوێژی عەقڵانی دەبێتە هۆی هەڵوێستێك کە زۆر دوورە لەهەڵوێستی رێژەگەریو لەبنەمای "هەموو شتێك مومکینە"..هەڵوێستێك بەرەو گەڕان بەدوای هەقیقەتدا دەچێت و بەرەو کارکردن بەپێی توانا بۆ ئەو مەبەستە. ئەم بنەمایەی دووهەم بەباسکردنی لێکگەیشتنو بەسووربوونی لەسەر دەلالەتی وتوێژ (بێگومان بەدیاریکراوی وتوێژی عەقڵانی)، پێ لەسەر گرنگی رەهای زمانی مرۆییو بەکارهێنانی عەقڵانی دادەگرێت. بنەمای دووهەم ئەو بنەمایەی سەرچاوەی عەقڵی رەخنەگرە دەڵێت "قسەکردن لەبری شمشێر" یان بە دەربڕینێکی واقعی ترو تازە تر دەڵێ "زمان لەبری دەمانچەو قومبەلەو چەکی ئەتۆمی" بەکاربهێنن.

لێرەدا دەمەوێت لەگەڵ جەختکردنی زۆرم لەسەر پێویستی بەکارهێنانی زمان و وشەکان، پێ لەسەر ئەوە داگرم کە پێویستە لەسەرمان زمانێکی سادەو روون و ئاساییو خاکی بەکاربهێنن..زمانێك کە زۆر بە وردی زاراوە تەکنیکیەکان بەکاردێنێتو دەکرێت بەهۆیەوە هەموو خاڵێك بێ هیچ ئاڵۆزیەك، بەشێوازی جیاواز بخرێتە ڕوو..ئەمەش وا دەکات مەسەلەکان نەبەسترێنەوە بە بەکارهێنانی

تایبەتیمانەوە بۆ زمان. بەکورتی: زمانێك کە وشەکان تیایدا خۆیان نەبن بە پرس (قضیة). لەلایەکی دیەوە لامانوایە بەراستی وتوێژ- لێکگەیشتن بەهۆی زمانەوە- مەسەلەیەکی گرنگە. (چونکە) بێ زمان، بێ خستنە رووی نمونەکان، بێ پێشنیار و گریمانەو تیورەکان، هیچ شتێك نابێت بەناوی گەڕان بەدوای هەقیقەتدا. هەندێکجار رەنگە تێڕوانێنێکمان هەبێت یان تیورەیەك کە بیری داگیر کردووین، بێ ئەوەی هێشتا لەوشەکاندا دەرمان بڕیبێت، پاش ئەوە رەنگە لەوشەی وتراودا دایبڕێژێت.

سەرەتا وادێتە پێشچاومان کە جیاوازیەکی گەورە نیە لەنێوان ئەوەدا کە بیر دەکەینەوە —بەهەڵە- ئەمڕۆ پێنج شەمە ١٢ی ئازارە و لەنێوان ئەمەدا کە ئەمە بدرکێنین. بەڵام لەراستیدا جیاوازیەکە بەتەواوی لێرەدایە: کاتێك ئێمە ئەمە دەدرکێنین، ئەوا بیرەکەمان دەبێت بەشتێك لەدەرەوەی ئێمەو لێرەوە دەکرێ رەخنەی لێبگیرێ. بەڵام تاکاتی بیرۆکەیەك نەدرکێنراوە، ئەوا بەشێك دەبێت لەخودی خۆمان و لێرەوە ئەستەمە هەڵە یان راستیەکەی بزانین. بەدەربڕینێکی دی دەبینین یەکێك لەئەرکە بنەڕەتیەکانی زمان لەرووی گەڕان بەدوای هەقیقەتدا ئەوەیە، بیروباوەڕەکان دەخاتە بەر ئەگەری رەخنەوە، تەنانەت ئەگەر هیچ کەسێکی دیش ئامادە نەبێت. بەڵام گەر یەکێکی دی ئامادە بێت بەتایبەتی کەسێك کە بۆچوونی جیاواز لەئێمەی هەبێ، ئەوا ئەوسا زمان دەرفەتی ئەو جۆرە وتوێژە رەخنەیەمان بۆ دەڕەخسێنێ —بێ ئەوەی ئەمە لەزۆربەی حاڵەتەکاندا شتێکی زۆر گران بێت - کە یارمەتیماندەدات بۆ دورخستنەوەی ئەو هەڵە مرۆییانەی لەزەینی ڤۆڵتێردا هەبوو.

## بنەمای سێهەم

"ئەگەر بەشێوەیەکی عەقلانی  لێکتێگەیشتین، ئەوا رەنگە پێکەوە لەهەقیقەت نزیکببینەوە"

خاڵی سەرەکی لێرەدا بیرۆکەی نزیکبوونەوەیە لەهەقیقەت، تەنانەت ئەگەر ناکۆکیش بین.

لێرەدا زۆر گرنگە بتوانین لەیەکدیەوە فێربین، بۆ ئەوەی دواتر بزانین ئێمە هەڵە بووین.. تەنانەت ئەگەر دواجار رێکیش نەکەوین. زۆر گرنگە لەوتوێژێکی







عەقلانیدا زۆر زیاتر لەوەی پێویستە داوا نەکەین. لەمێژووی زانستەکانیشدا وتوێژی بەناوبانگ هەیە کە وتوێژکەرانی لەنێوان خۆیاندا نەگەیشتونەتە رێکەوتن. لەبەناوبانگترین ئەو وتوێژانەش لەسەدەی بیستەمدا، ئەو وتوێژەیە کە لەنێوان دوو گەورەترین زانای فیزیا لەم سەردەمەدا کرا: ئەلبێرت ئەینیشتاین و نیلس بوهلز٤".

ئەو وتوێژەی لەنێوان ئەم دوو زانایەدا کرا، بە هیچ رێکەوتنێك نەگەیشت. بگرە خراپتر لەمەش ئەوە بوو کە هەر دوولایەنی وتوێژەکە پارێزگاریان لەو هەڵویستانەی خۆیان کرد کە پێش وتوێژەکە هەیانبوو. ئەگەرچی "بۆهر" ناچاربوو هەندێك لەهەڵوێستەکانی دەستکاریبکات. بەڵام ئەوەی گرنگە هەر دوولایەنەکە توانیان بیروڕاکانیان باشتر روونبکەنەوە، و هەردووکیشیان توانیان دەستیان بە بەڵگەی تازەو زۆر گرنگبگات. لەنێوان ئەم بەڵگەهێنانەدا، بەڵگە هێنانەوەیەك هەیە کە ئەنیشتاین لەگەڵ دوو هاوکاری خۆیدا لەساڵی ١٩٣٥ لەباسێکدا بڵاویکردەوە..باسێك کە تا ئەمڕۆش و پاش تێپەڕینی ٤٦ ساڵ مۆرکی گەڕانی ئەزمونگەری (التنقیب التجریبی) پێوە دیارە. کەس نیە نکوڵی لەوە بکات کە دەتوانین زۆر شت تەنانەت لە وتوێژەکەوە فێربین کە بەئەنجامناگات و نابێتە هۆی گۆڕینی هەڵوێستی بەشداربوانی، بێگومان نمونەش زۆرە بۆ ئەو وتوێژانەی نەبۆتە هۆی نزیکبوونەوەی بەشداربوانی لەیەکدی یان تەنانەت رێکەوتنیان.

ئێستا بابگەڕێینەوە بۆ مەسەلەی لێکبوردن..ئێمە ئەم سێ بنەمایەمان لەزەینماندا دانا:

١)رەنگە من هەڵەبم و رەنگە تۆ راست بکەی.

٢)لێگەڕێ وتوێژێکی عەقلانی لەسەر شتەکان بکەین.

٣)رەنگە لەهەقیقەت نزیك بینەوە، تەنانەت ئەگەر رێکیش نەکەوین.

وەك بینیمان بنەمای یەکەم لەم بنەمایانەدا، لەگەڵ تێگەیشتنی سوکرات و ڤۆڵتێردا بۆ پێویستیمان بە زانین کۆك دێتەوە. بنەمای دووهەمیش پێ لەسەر دەلالەتی زمان و قسەی ئازاد دادەگرێ، تاکو ببێتە زمانحاڵی خۆی، بەمەش پەیوەندیەکی پتەوی بەلێکبوردنەوە دەبێت. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئاماژە بۆ سنووری قسەی ئازاد دەکات، بە تایبەتی لەپەیوەندیدا بەسنووری لێکبوردنەوە. پێویستە ئامانجی بریتی بێت لەگەیشتن بەوتوێژێکی عەقلانی، واتە بۆ دۆزینەوەی هەقیقەت

لەبری پێداگرتن لەسەر سەپاندنی ئارەزووەکان و بردنەوە لە وتووێژدا.

بنەمای سێهەمیش لەسەر ئەو بناغەیە وەستاوە کە ئێمە لەڕێی وتوێژەوە ڕەنگە لەهەقیقەت نزیکببینەوە، ئەگەرچی بەرێکەوتنیش نەگەین. ئاشکراشە ناتوانین لەهەقیقەت نزیکببینەوە، لەڕێی وتوێژ و بەهۆی لێکبوردنێکی دوولایەنەوە نەبێتو بەهۆی ئەو هەڵوێستە دوو لایەنەوە نەبێت کە دەڵێ ئەوەی لایەنەکەی دی دەیڵێت، لایەنیکەم شایەنی ئەوەیە گوێی لێگرین..بگرە ڕەنگە زۆر زیاتر لەگوێگرتن بەتەنها. لێکبوردن پێشمەرجی گەیشتنە بەم هەڵوێستەو پێشمەرجی ئەگەری گەیشتنە بە چاککردنێکی هاوتا و لەلایەن هەر دولاوەو دواجار (پێشمەرجی) نزیکبوونەوەیە لەهەقیقەت.

گەڕان بەدوای هەقیقەت و نزیکبونەوە لەهەقیقەت بەهۆی ڕەخنەیەکی دوولایەنەوە (متبادل) ناتوانێ ببێت، بەبێ بوونی ڕادەیەکی زۆری لێبوردنی دوولایەنە (متبادل). ڕێکەوتنیش بەشێوەیەکی ڕێژەیی گرنگ نیە لەپرۆسەی گەڕان بەدوای هەقیقەتدا؛ چونکە زۆر ئاسانە بۆمان، هەردوکمان پێکەوە هەڵەبین. ڕەنگە سەرجەم خەڵکیش بۆ ماوەیەکی درێژ لەسەر زۆر لەتیۆرە هەڵەکان ڕێکبکەون (وەك چۆن لەسیستەمی گەردوونی بە تلیمۆسدا وابوو). بگرە زۆرجار ڕوودەدات ڕێکەوتن ئەنجامی ترسە لەلێکنەبوردن و لەبڵاوبونەوەی توندو تیژی.

لەهەمانکاتدا وای دەبینم کە ئەم سێ بنەمایە، بەکورتی ئەو هەڵوێستە عەقڵیو ڕەخنەییە کورتدەکاتەوە کە بە بڕوای من بناغەی ئەخلاقە. هەروەها ئەمە هەڵوێستی زاناو میتودی زانستە کە زۆر بەسادەیی لەسەر بنەمایەك دروستدەبێت کەوادەکات وتوێژی ڕەخنەیی، لەپێناوی هەقیقەتدا بێت. جگە لەمەش ئەم سێ بنەمایە بەرەو لێکبوردنمان دەبات، بەڵام لەهەمانکاتدا بوونیان پێویستی بە بوونی پێشوەختی لێکبوردن هەیە. پێدەچێت بەدیهاتنی پێشکەوتنێکی ڕاستەقینە لەزانستەکاندا، بێ بوونی لێکبوردن مەحاڵ بێت. هەروەها بێ بوونی دڵنیایی تەواومان لەوەی دەتوانین بیروباوەڕەکانمان بەئاشکرا بڵاوبکەینەوە، جا دەرئەنجامی ئەو بیروباوەڕانە هەرچۆنێك بن. لێرەوە لێکبوردن و خۆبەختکردن لەپێناوی هەقیقەتدا، دوو بنەمای ئەخلاقین کە لەلایەك زانستەکان دادەمەزرێنێتو لەلایەکی دیەوە بەهۆی زانستەکانەوە بەرەو پێشەوەدەچێت. بەڵام دوو بنەماکەی دی بریتین





لەخاکیبوونی (تواضع) فکریو بەرپرسیاری فکری: سوربوون لەسەر ئەوەی ئێمە بیر لەخۆمان ناکەینەوە، بەڵکو بیر لەهەقیقەت دەکەینەوەو پاراستنی نزیکبوونەوەی ڕەخنەی لەسەرجەم گرفتەکان هەتا کۆتایی.

بێگومان زانای وامان هەیە کە لەڕووی فکریەوە خاکی نین و، بەو مانایەی مەبەستی منە بەرپرسیار نین، زانایانێك کە ناتوانن جگە لەخۆیان کە زۆرلایان بەنرخە، بیر لەهیچی دی بکەنەوەو بەهەموو توانایانەوە هەوڵدەدن هاوکاران و جەماوەرەکەیان سەرسامبکەن بەو توانایەی هەیانە. بەگشتی ئەمانە ڕیزی دووهەم لەزنجیرە پلەی زانستدا داگیردەکەن، تەنانەت گەر لەبەرزترین پلەی ئەم ڕیزەشدابن.

لێرەوە من نامەوێ زۆر زیادەڕەوییبکەم و بڵێم زانست بەتەواوی توانای هەیە قوتابیەکانی لەڕووی ئەخلاقیەوە ئایدیال بکات و ئەو هێرشە هاوچەرخەش کە دەکرێتە سەر زانست ئەم خاڵە گرنگەی لەبیر دەچێت. هەرچۆنێك بێت هەرگیز زانست لەوەدا شکست ناهێنێت وا لەقوتابیەکانی بکات زیاتر لێبوردوو بن لەگەڵ بیروڕاکانی دیدا (تەنانەت گەر وەك پێویستیش نەیانتوانی لێبوردە بن، لەزوربەی کاتەکاندا)؛ زانست لەهەوڵدانیدا بۆ نزیکبوونەوە لەهەقیقەت چەند پێوەرێکی دیاریکراو سەقامگیر دەکات، لەهەمانکاتدا وا لەقوتابیانی دەکات هوشیار بن بەوەی ڕەنگە هەرگیز ئەو خاڵە نەدۆزینەوە کە هەڵەمان تیادا کرد. لەڕاستیدا لەزانستدا دەسەڵاتێکی ڕەها نیە. گەورەترین زانایانی سروشت کە ناویان بریتیە لە: گالیلۆ، کپلەر، نیوتن، ئەنیشتاین، ڕازاوە فۆرد، بوهر، ئەرینگتۆن، جینز، هایزنبرگ، شرودینگر، و دیراك..هەموو ئەمانە جارێك یان دوان هەڵەیانکردوەو هەمووشیان دانیان بەهەڵەکانیاندا ناوە. لەگەڵ ئەمەشدا زانست پێشدەکەوێتو زیاترو زیاتر لەهەقیقەت نزیکدەبێتەوە. ئێمە لەهەڵەکانمان و لەڕاستکردنەوەی هەڵەکانمانەوە فێردەبین.

پێموایە دەکرێت شتێکی لەمچەشنەش لەبارەی ئەخلاقەوە بڵێین: لێرەشدا دەتوانین لەهەڵەکان و ڕاستکردنەوەی هەڵەکانمانەوە فێربین. نمونەشمان بۆ ئەمە ئەوەیە ئێمە لەڕۆژئاوادا پاش چەند سەدە لەلێکنەبوردن و توندوتیژی، فێربووین کە لێبوردوو بین و ڕقمان لەتوندوتیژی بێت.

ئەمە بەو مانایە نایەت کە لەهەندێکجاردا هەڵەی تازە ناکەین، ڕەنگە (ئەم





هەڵانەش بەهۆی ئەوەوە بێت) دەچینە ژێر کاریگەری هەندێك عادەتی تازەی باوەوە، یان هەندێك عادەتی رۆشنبیری تازە کە کاریگەریەکی زۆری هەیە، وەك تیرۆر یان رێژەگەری یان تەنانەت پیاهەڵدانی رەها بە لێکبوردندا. من زۆر لەم عادەتە تازە باوانە دەترسم کە زۆرجار زمانێکی بریقەداری تازە نەك لێکبورنێکی تازە، بانگەشەو داواکاری توندڕەوانە بەرهەمدێنێت. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا من پیرەمێردێکم لەتەمەنی ٧٩ساڵیدام و وەك دەزانن رقم لەعادەتە تازە باوەکانە: بەڵام ئومێدێکی گەورەم هەیە کە خۆشم ببمە دامەزرێنەری عادەتێکی تازەی باو: من خەون بەوەوە دەبینم خاکیبوونی فکری (تواضع الفكري) بکەم بە (مۆدەیەکی) باو. من بڕوامولیە هەموو زانا گەورەکان لەڕووی فکریەوە خاکیبوون، بەڵام ئەوەی دەمەوێت ئەوەیە یارمەتی ئەوەبدەم کە ئەم عادەتە لەناو نێوەندی تەکنیککارو رۆشنبیران و رۆژنامەنوسان و ئەوانەی پراکتیکی زانستدەکەن، سەقامگیر بێت. ئەوەی لەخەیاڵمدایە بە دیاریکراوی ئەم کارانەیە: پیاوانی پزیشکی، دادوەرو پارێزەران، بەشێوەیەکی گشتی، ئەندازیاران و بەشێوەیەکی زۆر گرانگتریش خزمەتکارە مەدەنیەکان —برادەرە ناشارستانیەکانمان وەك (چەرچڵ) ناوی لێنابوون- و سیاسیەکان.

لەراستیدا چەند بەڵگەیەکم لایە کە لەبەرژەوەندی ئەخلاقێکی پیشەیی تازەدایە، و دەمەوێت لێرەدا پێشکەشتانی بکەم، بۆ ئەوەی وتوێژێکی گشتی لەبارەیەوە بجووڵێنین. ئەم بەڵگانە پەیوەندیەکی پتەویان بە گرفتی لێکبوردنەوە هەیە. چونکە ئەو ئەخلاقە پیشەییە تازەیەی دەمەوێت بەرگری لێبکەم، ئەخلاقێکە دژی دەسەڵات، بەپێچەوانەی ئەوەوە کەناوی دەنێم ئەخلاقی پیشەیی کۆن. پێدەچێ دەسەڵات بەردەوام لێنەبوردوو بێت. لەم ئاراستەیەدا پێدەچێت جەنگیزخان حاڵەتێکی دەگمەن بێت، لایەنیکەم لەوەدا کە پەیوەندی بە لێکبوردنی دینیەوە هەیە.

ئەخلاقی پیشەیی کۆن —یان ئەوەی هەندێکتان پێی دەڵێن ئەخلاقی کۆن لای رۆشنبیران- وەك ئەخلاقی تازە، لەسەر بناغەی بیری هەقیقەت و عەقڵانیەت و بەرپرسیاری فیکری رادەوەستا. بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا بە ئاشکرا رێگەی بیرکردنەوە





لەهەقیقەت و عەقڵانیەت و بەرپرسیاری فیکری (لەهەردوو شێوەکەدا)، لەیەکدی جیاوازن.

بیرۆکەی ئایدیالی کۆن لەسەر بناغەی سەقامگیرکردنی هەقیقەت بەهۆی بەڵگەی لۆژیکیەوە راوەستابوو..ئەگەر بکرایە ئامانجی گەیشتن بەهەقیقەت بوو: گەیشتن بە (پاساوی کۆتایی بۆ هەر هەڵوێستێك)(٥) بۆ هەر تێزێکی راگەیەنراو.

بەڵام لەبەرامبەردا بیرۆکەی ئایدیالی شەخسی لەبەرزترین ئاستەکانیدا لەسەر بناغەی گەیشتن بە حیکمەت راوەستابوو. ئەگەرچی بە مانا سوکراتیەکەیشی نەبێت (حەکیم بەو خۆت بناسە —بزانە کە نازانیت- ئەمەیە ئامۆژگاریەکەی سوکرات). بەڵام ئەو حیکمەتەی پەیوەندی بەو ئەخلاقەوە هەیە کە ناومنا ئەخلاقی پیشەیی کۆن، زۆر لەمە جیاواز بوو. داواکاریەکانی لەسەر ئەم بنەمایە راوەستابوو (هەموو شتێك بزانە کە پەیوەندی بە بواری پسپۆڕیتەوە هەیە. شارەزا بە! ئەگەر بوارەکەت تەسك بێت، ئەوا خاوەن دەسەڵات دەبیت و لەبوارێکی تەسکدا دەبێتە پسپۆڕ. بەڵام گەر بوارەکەت فراوان بێت، ئەوا خاوەن دەسەڵات دەبیت لەبوارێکی فراواندا). دەبیت بە پسپۆڕێکی گەردوونی، پیاوێکی حەکیم و فەیلەسوف. لەهەموو حاڵەتەکانیشدا دەتوانێت، خاوەن دەسەڵات بێت لەو بوارەدا کە هەڵیدەبژێریت. تەنها ئەوەت لەسەرە بتوانیت بەهانە بۆ ئەو شتانە بهێنێتەوە کە دەیزانیت و بەڵگەیان بۆ بهێنیتەوە. پێویستە لەسەرت بەتەواوی بەرپرسیار بیت لەوەی دەیڵێیت، دەنا لەدەسەڵاتەکەتدا سوکایەتیت پێدەکرێتو دەبێت بە ساختەچیو پێویستە دەمامك لەسەرت لاببرێو لەڕێی سوکایەتی پێکردنتەوە لەلایەن خەڵکەوە سزا بدرێیت.

بەڵام گەر رەسەن و لێهاتوو بیت، ئەوا دەتوانی بەڵگە بۆ هەموو شتێك بهێنیتەوە و بەمشێوەیە ببیت بە خاوەن دەسەڵات —و گەر دەسەڵاتەکەشت دانی پیانرا کە دەسەڵاتە- ئەوا کەس ناتوانێت بەربەرەکانی دەسەڵاتەکەت بکات. گەر یەکێکیش هەڕەشەی لێکردی، ئەوا بێگومان هەڕەشەکەر لەلایەن هەموانەوە بەوشێوەیە رەفتاری لەگەڵ دەکرێت کە شایستەیەتی: رەفتاری لەگەڵ دەکرێت وەك ساختەچیەك، وەك فێڵبازێك و زۆر لەمەش خراپتر: وەك کەسێك رەفتاری لەگەڵ دەکرێت کە هەوڵدەدا ئەو دەزگایانە لەناوببات کەبنەمای سەرجەم پیشەکانی ترەو





هەوڵدەدات متمانەی جیهان بەو دەزگایانە لەناو بەرێت...لەکاتێکدا خودی کۆمەڵگا لەسەر بناغەی ئەو متمانەیە راوەستاوە.

ئەم ئەخلاقە کۆنەی وەسفمکرد، رێگەت لێدەگرێت هەڵە بکەیت. پێشتر هەر رێگەی پێنەدرابوو، بەگشتیش نەدەبەخشرا، لێرەوە هەرگیز نەدەکرا قبووڵبکرێ. دەبوو خاوەن دەسەڵات مرۆڤێك بێت لەسەروو مرۆڤەکانەوە..لەسەروو هەڵەکردنەوە بێت. لێرەدا پێویست ناکات پێتان بڵێم ئەم ئەخلاقە پیشەییە جۆرێکی لێکنەبوردوە، بەردەوامیش گەورەپیاوی وا هەبووە —وەك (ڤۆلتێرو برنادشۆ) دژی تێکۆشاون. بێگومان باشترین چەکیش کە لەپێناویدا بەکاریانهێنا، گاڵتەجاڕی بوو. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەشێکی زۆری ئەم ئەخلاقە هێشتا زیندووە. بۆ نمونە تەنها لەم دواییانەدا پیشەی پزیشکی وازی لەم شێوازەی ئەخلاق هێنا. بەڵام هێشتا لەناو جیهانی دادوەرەکاندا باڵادەستە..ئەگەر واش نەبوایە رەنگە ئەو هەڵە دادگاییە ترسناکەی لەم دوایانەدا روویدا، روونەدایە.(٦)

ئێستا پێموایە ئاشکرایە ئەوەی ناومنا "ئەخلاقی پیشەیی کۆن" ناتوانێت چیدی خۆی راگرێ. بناغەکانی ئەم ئەخلاقە هەرگیز مومکین نەبوو لەڕوی ئەخلاقیەوە قبوڵبکرێ، لەپاش شۆڕشی زانستیو ئەو گەشەسەندنە خێرایەی بەسەر زانیاریە زانستیەکان و لێکبوردندا هات، پاشەکشێیکرد. چیدی هیچکەس ناتوانێت بە تەنیا دەسەڵاتی رەهای لەبوارێك لەبوارەکانی زانستدا هەبێت. گەر بۆ کەسێك رێکەوت پسپۆڕێکی گەورە بێت، ئەوا دەبێت دڵنیابێت کە ناتوانێت بۆ هەمیشە پسپۆڕ بێت. بەتایبەتی قبولکردنی ئەو راستیەی کە زانست مۆرکێکی کاتی هەیە، یارمەتی رودانی گۆڕانێکی قوڵیکرد لەهەڵوێستی زانایاندا سەبارەت بە شێوازەکانی رەتکردنەوە.

لەم روانگەیەوە پێموایە قبولکردنی ئەخلاقی پیشەیی تازە، بووە بەشتێکی ناچاری. لەم بوارەشدا پێشنیاری ئەم بنەمایە دەکەم:

١-ئێمە دەزانین —بەشێوەیەکی کاتی- زۆر زیاتر لەو کەسەی زانستێکی گشتی دەزانێت.

٢-ئەمە تەنانەت بەسەر ئەو کەسانەشدا دەگونجێت کە هێشتا خۆیان بەپسپۆڕ دادەنێن. چونکە رەنگە هەر بوارێکی پسپۆڕی لەناوبچێت.





٣-زانیاریەکانمان ناتوانن کاتی نەبن، واتە یەقینی نین و کۆتاییان دێت. تەنها بێ ئاگایمان دەتوانێت بێ کۆتایی بێت. تەنها ئێستا دەزانین کەمن ئەو شتانەی دەیزانین:

ئەوە گەشەکردن و پەرەسەندنی زانیاریە، بەڵگە بۆ ئەوە دەهێنێتەوە کە سوکرات راستیدەکرد.

ئەم راستیانە ئەمڕۆ بوون بە بەشێك لەئەزموونی پراکتیکە رۆژانەیەکانی زوربەی زانایان.

٤-هەڵە هەموو رۆژێك دەکرێتو لەهەموو بوارەکانیشدا ئەو بیرۆکە کۆنەی دەیگوت خاوەن دەسەڵات دەتوانێت خۆی لەهەڵە بپارێزێتو بگرە لەسەرێتی وا بکات، پێویستە ئەمڕۆ دان بەوەدا بنێن کە بیرۆکەیەکی هەڵەیە. راستیەکی ترسناك ئەوەیە کە پێمان دەڵێت دەسەڵاتداران بەپێی ئەخلاقی کۆن لەنێوان خۆیاندا رێککەوتبوون بۆ ئەوەی هەڵەی یەکدی بشارنەوە.

٥-لێرەوەو لەم لایەنە پراکتیکەوەو لەو خاڵەوە کە ئێمە هەڵەی زۆر دەکەین، دەتوانین دەستبکەین بە ریفۆرمی ئەخلاقی: لەبەر ئەوەی راکردن لەهەڵە نیە، کەوابوو دەبێت هەڵوێستمان بەرامبەری بگۆڕێن. بێگومان هێشتا هەڵەی تاوانبار هەیە، هەڵەیەك کە دەکرێتو بێگومان دەبێت خۆمانی لێ لابدەین. هەروەها حاڵەتی وا هەیە کە سنورە مومکینەکان دەبەزێنێت. بەڵام زوربەی ئەو هەڵانەی دەیکەین ئەو هەڵانەن کە لەسروشتی مرۆیمانەوە دێن کە قابیلی هەڵەکردنە، یان لەبێ ئاگایمانەوە دێن کە ئەستەمە رزگارمانبێت لێی، یان لەو راستیەوە دێ کە بەپێی پێوست راهێنانمان نەکردووە لەسەر پراکتیکی رەخنە لەخۆگرتن. لەراستیشدا هەڵوێستی رەخنە لەخۆگرتنو پراکتیککردنی زۆر زەحمەتەو بەحاڵ بەشێك لەپەروەردەکردنمان پێکدەهێنێت.

٦-پێشنیاری ئەوە دەکەم وەسیەتی یەکەم لەناو وەسیەتی ئەخلاقە پیشەییە تازەکەمان ئەمە بێت (لەهەڵەکانتەوە خۆت فێر بکە).

هەندێك وانەی دیش هەیە کە دەکرێ لەمەوە سەرچاوە بگرێت: یەکەمیان ئەوەیە لێگەڕێین هەموان لەهەڵەکانمانەوە فێربین.

(دیارە) گرنگ نیە کێ هەڵەی کردووە: من یان دراوسێکەم. پێویستە هەموومان سەرەتا بە دوای هەڵە تایبەتیەکانماندا بگەڕێین. خۆ گەر دراوسێکەم سەرنجی بۆ





هەڵەیەك ڕاکێشام کە کردوومە، دەبێت سوپاسی بکەم. دەبێت ئەوەش فێربین کە لەپرۆسەی گەڕان بەدوای هەڵەدا، نابێت هەرگیز هەڵوێستێکی سوکایەتی پێکردن لەو کەسە وەربگرین کە هەڵەیکردووە، پاش ئەوەی کە دۆزیمانەوە.

پێویستە لەسەرمان هەوڵبدەین ئەو هەڵوێستە بەهێز بکەین کە دەڵێت: ئێمە هەموومان هاوکاری یەکین لەگەڕان بەدوای هەڵەکاندا. پێویستە هاوکاری یەك بکەین، چونکە تەنها هاوکاریکردنە، ڕێگە خۆشدەکات بۆ ئەوەی سەرجەم تێڕوانینەکان بۆ چارەسەر کردنی گرفتەکانمان کۆببنەوە. ئەمەش مەسەلەیەکی زۆر گرنگە. چونکە گەر هەر یەکێك لەئێمە لەگۆشەنیگای تایبەت و دیاریکراوی خۆیەوە لەدۆخی گشتی نزیك بێتەوەو، تەنها پشت ئەستوربێت بە چەك و جبەخانە عەقڵیە دیاریکراوەکانی خۆی، ئەوا ئیتر ئەستەمە هەر یەکێك بە تەنها لای خۆیەوە لەسەرچاوە ئەگەرەکانی هەڵە بگات. ئامانجی بنەڕەتی بریتیە لەدۆزینەوەی هەڵەکان و ڕاستکردنەوەیان بەخێراترین شێوە..واتە پێش ئەوەی زیانی زیاتر بخاتەوە. لێرەوە تاکە گوناهێك کە نابەخشرێت، گوناهی داپۆشینی هەڵەیەکە لەهەڵەکان و پێویستە لەسەریشمان ئەو پاڵنەرە بخەینەلاوە کە لەپشت ئەم داپۆشینانەوەیە. ئەم پاڵنەرانە بەهۆی ئەخلاقی کۆنەوە، زۆر بەهێز بوون.

پێویستە فێربین ڕەخنە لەخۆگرتن باشترەو ڕەخنەی دولایەنەش (متبادل) کە بەردەوام پێوستمان پێیەتی، بۆ ئەوەی فێربین چۆن ڕەخنە لەخۆمان بگرین، کەمتر نیە لەرەخنە لەخۆگرتن.

ئەگەر من خەون بە یۆتۆپیایەکی دیموکراسیەوە ببینم، ئەوا خەون بەیۆتۆپیایەکەوە دەبینم کە تیایدا دەکرێ پاڵێوراوێك بۆ کورسی نوێنەرایەتی ئومێدی بە بردنەوەی دەنگەکان بۆ خۆی هەبێت، کاتێك بەشانازیەوە ڕایدەگەیەنێت کە چۆن ۳۱ هەڵەی دۆزیوەتەوە، کە لەساڵی ڕابردودا کردویەتی و هەوڵیداوە ۱۳ یان ڕاستبکاتەوە، ئەمەش لەکاتێکدا کە ڕەقیبەکەی تەنها ۲۷ هەڵەی دۆزیوەتەوە..تەنانەت گەر ڕایگەیاند کە ئەویش توانیوێتی ۱۳ هەڵەیان ڕاستبکاتەوە. ڕەنگە لێرەشدا پێویست بەوە نەکات بڵێم ئەم یۆتۆپیایەیە، یۆتۆپیای لێکبوردنە.





## پەراوێزەکان

* لەڕاستیدا تێگەیشتنی پۆپەر بۆ نامۆبوون تارادەیەکی زۆر هەڵەیەو تێکەڵی دەکات لەگەڵ پرۆسەی خۆگونجاندنی مرۆڤ لەگەڵ هەلومەرجە سروشتیەکاندا، ئەوەی مارکسیەکان بەنامۆبوونی دادەنێن پەیوەندی بەدەسەڵات و نامۆبوونی دەسەڵاتەوە هەیە لەتاکە کەسێك.؟ مارکس نامۆبوونی بەو دۆخە دادەنا کە بەرهەمهێن پەیوەندی بە بەرهەمەوە نامێنێ و لەدەرەوەی حەزو ئارەزووەکانی بەرهەمهێنەوە ئاراستە دەکرێ، مارکس باس لەدۆخێك دەکات کە تیایدا بەرهەم پێویستی دروستدەکات، نەك پێویستی بەرهەم دروستبکات. واتە دۆخێك کە تیایدا بەرهەمهێنراو دەبێ بە شتێکی سەربەخۆ لەویستی بەرهەمهێن و ئاراستەی حەزو ئارەزووەکانی دەکات. پۆپەر بە وردی لەزاراوەی نامۆبوون نەگەیشتووە. (و.ك)

١- بگەڕێوە بۆ: ڤۆلتێر "فەرهەنگی فەلسەفی" بابەت "لێکبوردن" پاریس: چاپ ١٩٦٨

٢- بگەڕێوە بۆ کتێبی "کۆمەڵگای کراوەو دوژمنەکانی" بەرگی یەکەم. فەسڵی حەوتەم (لندن ١٩٤٥، ١٩٦٦)

٣- بۆ نمونە بگەڕێوە بۆ: وینستن چەرچل "جەنگی جیهانی دوهەم" بەرگی ١-٧٥-٧٩ (لندن ١٩٤٩-١٩٥٥)

٤- نیلس بوهر ئەم وتوێژە لەم وتارەدا کورت ئەکاتەوە "وتوێژ لەگەڵ ئەنیشتایندا لەبارەی گرفتە ئەبستمۆلۆجیەکان لەفیزیای ئەتۆمیدا" لەکتێبی "ئەلبێرت ئەنیشتاین فەیلەسوف —زانا" نوسینی بول- ئارسەر شیلب "کتێبخانەی فەیلەسوفە زیندووەکان" (ئیفانستۆن III ، ١٩٤٩)

٥- بگەڕێوە بۆ: ڕۆدولف کارناپ Der Logische Aufbau Der Welt (چاپی یەکەم- بەرلین ١٩٢٨)ز چاپی دوهەم، هامبورگ ١٩٦١). ڕستەی یەکەم لەبڕگەی یەکەمی تازە لەلاپەڕە x1x، هەروەها بگەڕێوە بۆ ئەو بەڵگەهێنانەوەی پەیوەندی بە میتۆدی ئەندازیاری سپینۆزاوە هەیە stamm baumrtige zuruck





Futirung) لەلاپەرە XVIII، لەناوەراستدا، و ئەو بیرۆکە نامۆیەی دەڵێ ئەم میتۆدە باش بوو لەفەلسەفەدا.

٦- بگەڕێوە بۆ لۆدۆفیك كنیدی لە Wicked Beyond Belief: the Luton murder case (لندن ١٩٨٠) بەتایبەتی بگەڕێوە بۆ بەشداری لۆرد دیفلین. بەڵام ئەم كتێبە كە ناكرێ باوەڕ بە هەمووی بهێنین، دەبێت بخوێنرێ؛ چونكە لەراستیدا یاسا لەدەرەوەی بڕوا پێ بەخشینە (بۆ نمونە بگەڕێوە بۆ بەشداری نوێنەر: بریان ماگی) هەمان حاڵەت بەسەر ئەو تاوانە دزێوەدا جێ بەجێ دەبێت.





## فەزیلەتی گشتی، فەزیلەتی تایبەتی:

## سنوری لێكبوردن

### نوسینی: ژۆلی سادا ژاندرۆن

پێدەچێ لێكبوردن پێدراوێكی بێ چەندوچونی عەقڵی و سیاسی و مافی ئازادیخوازی بێت. لەراستیدا ئێمە ئەوە بە بەڵگەنەویست دەزانین كە نابێ بیروڕا یان باوەڕێك بەسەر هیچ كەسێكدا بسەپێنرێ، یان ڕێگەی ئەوەی لێبگیرێ، هەموو كەسێك لەم بوارەدا خاوەن ئازادی هەڵبژاردنی رەهایە. دەوڵەت یان هیچ دەزگایەكی دی تەنانەت دینیش، مافی دەستێوەردانی لەمبارەیەوە نیە.

لەلایەكەوە بناغەی ئەم ئازادیە لەجیاوازیكردنی بواری گشتی و بواری تایبەتیدایە، واتە لەدەستنیشانكردنی ئەو سنورەی كە دەوڵەت دەتوانێ تیایدا بەشێوەیەكی ڕەوا یاسا دابنێت: بیروڕاكان وەك هەر شتێك كە بەسترابێت بە ئەخلاقەوە، لەبواری شتە تایبەتیەكاندایەو ناكرێ بە مەسەلەیەكی گشتی بناسرێ. لەلایەكی دیەوە ئازادی باوەڕو بیروڕا دەربڕین، ڕەگی لەناو مافێكدایە كە هەمان مافی مرۆڤ و كۆی مافە سروشتیە نەگۆڕەكانە كە زامنی ئازادی بیروڕا یان باوەڕی هەر مرۆڤێك (لایەنیكەم لەپێناسەدا) تەنها لەبەر مرۆڤبوونی دەكات. لێكبوردن لێرەدا زۆرتر پشتی بە چەمكی مافەكان یان ئازادی باوەڕو بیروڕا بەستووە، تا جیاوازی نێوان مەسەلەی گشتی و مەسەلەی تایبەتی. تەنانەت كاتێك دەوڵەت یان دەزگایەكی زەمینی یان مەزهەبی، پێبنێتە جێگایەكەوە كە جێگەی ئەو نیەو باوەڕ و بیروڕا بەسەر خەڵكیدا بسەپێنێ، سەرئەنجام ئەوان خاوەن ئەو ئازادیە هەمیشەییەن كە بەو شێوەیەی خۆیان بە ڕاستی دەزانن بڕیاربدەن و بە حوكمی ویژدانی خۆیان داوەریبكەن، جا ئیدی ئەو دەوڵەتەی حوكمیاندەكات هەر شێوەیەكی دەبێت با ببێت، دەوڵەت بەرپرسیاری پاراستنی ئەم ئازادیە بنەڕەتیەیە. لێرەوە لێكبوردن نەك بە ناونیشانی سیاسی و یاسایی، بەڵكو بە مانای ئەخلاقی بابەتی مرۆیی،





دەردەبڕێ. لێکبوردن دەبێت بە نیشانی هەلومەرجێك کە ئەویدی دەتوانێت بەشێوەیەکی جیاواز لەوەی ئێمە بیردەکەینەوە، بیربکاتەوەو، کاربکات و دەبێت بە ئاشکراکەری حورمەتی تاك بەتاکی مرۆڤەکان. بەمشێوەیە لێکبوردن دەبێت سیمای جۆرێك ئەخلاقی رۆژانە کە یەکەم بنەمای بریتیە لەئەنجامدانی ئەرکی مرۆڤ لەپاراستنی حورمەتی ئەوی دی لەهەموو روویەکەوە. کورتەی ماناو بنەما قبوڵکراوەکانی لێکبوردن بەهەمان ئەندازەی رەواداریێتیە سیاسی و یاسایی و ئەخلاقیەکانی، هەمەڕەنگ و جۆراوجۆرە.

لێکبوردن کە لەیەککاتدا بە فەزیلەتێکی گشتی و تایبەتی زانراوە، هەندێکجار ناسیاسی و جۆرێك مەسەلەی تایبەتیە لەپەیوەندیدا بە کەسێکی دیەوەو هەندێکجاریش وەك جۆرێك لەخەباتی سیاسی و کۆمەڵایەتی ناسراوە. بێگومان رووی دوهەمی لێکبوردن لەهەموو رووەکانی دی بەرچاوترە. لێکبوردن بەر لەهەر شتێك وەك مافێك دەردەکەوێت کە داوا دەکرێ: مافێك لەبەرامبەر توندڕەویە سیاسی یان مەزهەبیەکاندا و هەروەها لەبەرامبەر دەستێوەردانی دەوڵەت لەمەسەلە مەزهەبیەکان یان لەبواری مەسەلە تایبەتیەکاندا، کە هەر کاتێك: مافی تاکێك دەستدرێژی بکرێتە سەر، بۆی دەگەڕێنەوە. بەمشێوەیە لێکبوردن دەچێتە خزمەت خواستی جۆراوجۆرەوەو رەنگە خۆی هیچ سودێکی لێنەبینێت و لەرودانی ئەو خەباتە بەربڵاوانەدا کە تەنها بووە بە ئاڵای، وێنا یان دروشمێکی لێ بمێنێتەوە.

بە وتەی پۆل ریکۆر لێکبوردن بابەتێکی تەڵەئامێزە، هەم زۆر سادەیە و هەم زۆر گرانە، لەراستیدا شکاتکردن لەدەست لێنەبوردن یان "تەحەمولنەکردن"، بێ سەرنجدان لەو بەرپرسیارێتیە جۆراوجۆرانەی لەئەستۆی هەر کەسێکە، زۆر ئاسان دێتە پێشچاو. هەروەها دروستکردنی هاوئاهەنگی لەنێوان پێویستیە جۆراوجۆرە ئەخلاقی و یاسایی و سیاسی یان مەعنەویەکاندا، کە سەلمێنەری رەوایەتی لێکبوردنە، کارێکی زۆر زەحمەتە. لێکبوردن بیرۆکەیەکی چەند لایەنیە، لەبەرئەوەی وەڵامدەرەوەی پێداویستی جۆراوجۆرە، هەروەها لەبەرئەوەش کە رەنگە هەمیشە رووی پێچەوانەی لێکبوردن، واتە لێکنەبوردن و تەحەمولنەکردن هۆیەکانی لەناوبردنی لێکبوردن ئامادەبکەن، هەرچەند کە دەبێت بۆ جێگای لێکبوردن لەنێوان ئەو دوانەدا بگەڕێین.







ناسینی بیری لێکبوردن بەستراوە بەوەوەی کە سنورەکەی دەستنیشان بکەین و رێگرەکانی هەڵسەنگێنین. بەرگریکردنی بێ قەیدو شەرت لەلێکبوردن خۆی هەنگاونانە بۆ لەناوبردنی لێکبوردن: رێگەدان بەو بیروڕایانەی دژی لێکبوردنن و بەناوی لێکبوردنیشەوە رێگەدان بەو کارانەی کە مەبەستیان سنوردارکردن یان لەناوبردنی ئازادی دەربڕین و بیروڕاو باوەڕە، هیچ دەرئەنجامێکی جگە لەلەناوبردنی لێکبوردن نابێت. بەڵام ئایا زامنکردنی لێکبوردن بە لاوازکردنی، خۆی لەخۆیدا کارێکی تەحەمولنەکراو نیە؟ هاواری "تەحەمولنەکراو" هەمیشە مەسەلەی لێکبوردن دەهێنێتە پێشێ و پێویستی بەوە هەیە کارێك بە تەحەمولنەکراو بزانرێت بۆ ئەوەی دەرکەوتەکانی لێکنەبوردن باشتر ئاشکرا بێت. کردنی لێکبوردن بە بەهایەکی رەهاو بێسنوور، بە مانای ئەوەیە، هەلومەرجی رودانی لەناوبەرین. پێناسی لێکبوردن پێویستی بەوە هەیە شێوەی دەستنیشانکردنی لەسیستەمە فکرییەکاندا کە سەر بەهەلومەرجی مێژوویی جۆراوجۆرن تاوتوێ بکرێت: تاوتوێی ئەوەی کە سنوری لێکبوردن تاکوێ بێت و چ شتێك بە تەحەمولنەکراو دابنرێت؟

بەڵام مرۆڤ ئارەزوی ئەوەی هەیە کە هیچ سنورێك بۆ لێکبوردن قبوڵنەکات، بۆئەوەی باشتر بتوانێت بەرگری لەمافێك بکات کە بەپێی رێساو بەها ئەخلاقی یان سیاسیەکانی خۆی بە راستی دەزانێت. ئایا ئەمەش خۆی لەخۆیدا نیشانەی ئازادی و خودموختاری ئێمە نیە؟ بەمە پرسیارێکی دیش دێتە پێشەوە: ئایا لەم حاڵەتەدا ئەگەری ئەوە نیە کە هەڵبژاردنە ئەخلاقی و مەزهەبی یان سیاسیەکان هەموو لەیەك ئاستدا راوەستن و جۆرێك لەهاوئاستی بەهاکان دروستببێت، کە سەرچاوە لەیەکسانی یان باشتر بڵێین لەمافی یەکسان و نەبوونی جیاوازی بۆ هەر جۆرە بیروڕایەکەوە دەگرێت؟ ئەگەر لێکبوردن ناچارماندەکات کە رێزی هەموو بیروڕایەك بگرین و خۆمان لەهەڵسەنگاندن و سوك سەیرکردنیان بەدور بگرین، ئایا ئەو مەترسیەی تێدانیە کە لەپێشەوە ئەگەری هەر وتوێژێکی رەخنەگرانە، لەناوبەرین؟ لەم حاڵەتەدا لێکبوردن هەڵوێستێك دەبێت کە تیایدا هیچ راستیەك سەقامگیر نابێت و بەرگری لەهیچ شتێك جگە لەهەقیقەتی لێکبوردن ناکرێ. لێکبوردن پەیوەست دەبێت بە گومانکاریەوەو فۆرمی ناکۆکی ئامێزی ئەخلاقی نەهلیستیانە یان قوتابخانەی بێهودەیی لەبواری ئەخلاقیدا، بەخۆیەوە وەردەگرێت، لەراستیدا

لێکبوردن دەبێت بە فەزیلەتێکی پوچ. ئەو رستەیەی "کلۆدێل"مان لەبیرە کە دەیگوت: "لێکبوردن؟ بۆ لێکبوردن، چەند ماڵێکیش هەیە".

بیری لێکبوردن وەك فەزیلەتێك، تەنانەت گەر هەموانیش لەسەری رێککەوتین، ئەوەندە سادە نیە. پێدەچێ دەبێت یەکێك لەمانا سەرەتاییەکانی لێکبوردن وەلاوە نرێ: قسەکردن لەبارەی لێکبوردنەوە وەك فەزیلەتێکی ئەخلاقی و هاوتاکردنی لەگەڵ شێوەیەك یان دەربڕینێکی نەریتی رێزگرتن (لەوی دی)، هاوکات دەبێت لەگەڵ گۆڕانی تەنانەت بیری رێزگرتن و وازهێنان لەبیری لێکبوردن. ئەم قسەیە مانای چیە؟ واتە ئەو بابەتانەی کە رەنگە سەلمێنەری هەردوو چەمکەکە بن، یەکسان نین، ئێمە رێز لەیاسا دەگرین، بەڵام لەبارەیەوە لێبوردوو نابین. لەبەرامبەر بیروڕای ئەوانی دیدا لێبوردوو دەبین، بەڵام رێز لەخودی خۆیان کە جیاوازن لەبیروڕاکانیان دەگرین. لێرەوە دەشی رێزیان لێبگرین، بێ ئەوەی ئامادەی لێبوردن بین بەرامبەر بە بیروڕاکانیان. لەبارەی بابەتێکەوە کە ئازادو سەربەخۆ وەسفدەکرێت، واتە بیرێك لەبەرئەوەی کە بیرە "لێبوردوو" نابین (ئەگەر بمانەوێت وتەزاکانی کانت لەبارەی رێزەوە بهێنینەوە)، بەڵکو رێز لەکەس یان زیهنی سەربەخۆ دەگرین. لێرەوە تێکەڵکردنی رێزگرتن و لێکبوردن دەبێتە هۆی لەناوچونی بیری رێزگرتن کە وتەزایەکی ئەخلاقیە. یاسای ئەخلاقی ناچارماندەکات کە رێز لەکەس وەك مرۆڤێکی عاقڵ و سەربەخۆ بگرین، نەك ئەوەی لەبارەیەوە لێبوردوو بین. رێزگرتن لەم پێناسەیەدا حوکمێکی بڕاوەیە، نەك مەرجدارو ونەك دەستورێکی دوربینانە لەزۆرانبازیەکی دولایەنەدا. لەلایەکی دیەوە ئاشکرا نیە کە بنەمای لێکبوردن خەسڵەتی ئەخلاقی کەسایەتی بێت، واتە بنەماکەی مافێکی نەگۆڕ بێت کە ویژدانێك بۆ دەستنیشانکردنی رێگەو شێوازی خۆی هەیەتی. لێرەوە دەکرێ لێکبوردن لەسەر بنەمای تەکبیریی دەزگایی یان یاسایی و سیاسیەکان بونیاد بنرێت: لۆك لێکبوردن بەدەرئەنجامی جیاکردنەوەی دین لەدەوڵەت، دەزانێت، نەك بە دەرئەنجامی ئەو مافانەی کە بە ناچار بەستراون بە سروشتی مرۆڤەکانەوە. هێشتا زۆرمان ماوە بۆئەوەی بەچەمکی مافی مرۆڤ بگەین. دواجار بەیەکسانی زانینی لێکبوردن و رێزگرتن، بێگومان دەوری پەیوەندی دەسەڵات لەلێکبوردن دەگرێت و دەبێتە هۆی لەناوچونی رەهەندی مێژوویی و سیاسی لێکبوردن: ئایا لەهەر قۆناغێکی مێژوییدا







کە مەسەلەی لێکبوردن بەمەبەستی چاککردنەوەی پەیوەندیە ناهاوتاکانی دەسەڵات هاتۆتە پێشێ، مەبەست ناکۆکی نێوان هاوڵاتیان و فەرمانڕەوایان، یان لەنێوان هاوڵاتیان و ئەوانی دیدا یان گروپێك لەهاوڵاتیان لەگەڵ دەزگاکانی کەنیسەدا، نەبووە؟

مێژووی وشەی "لێکبوردن" بە تەنیا پیشاندەری ئاڵۆزی چەمکەکەیە. نوسەرانی کاسۆلیك لێکبوردن بەسەقامگیری لەئەزموندا و توانای تەحەمولکردنی خراپە، بەدبەختی یان بەڵا سروشتیەکان دەزانن. چاوگی Tollo (بە مانای بردن، تەحەمولکردن، بەرگەگرتن (لەزمانە لاتینیەکاندا وشەی "Tolerance"لەم چاوگەوە هاتوە"و.ف) بەمانای کارێکە کە مرۆڤ لەسەر خۆی ئەنجامیدەدات. زاراوەی پزیشکی تەحەمولکردنیش هەر ئەم مانایە دەبەخشێت: تەحەمولی جەستەیی بونەوەرێکی زیندوو، بە مانای توانای تەحەمولکردنی دەرمانێك، مادەیەکی کیمیایی یان فیزیایی دیاریکراوە، بەبێ ئەوەی زیانی پێبگەیەنێت. ئەم بەکارهێنانەی وشەی لێکبوردن، چەمکی کۆمەڵناسی "ئاستی تەحەمولی" دروستکردووە کە ئاشکراکەری توانای تاك یان گروپێکە لەتەحەمولکردنی کاریگەری ئەڵتراژینێکدا و نەگۆڕان لەژێر کاریگەریدا.

لێکبوردن سەرەتا پەیوەستە بە پەیوەندی مرۆڤ بە شتەکانەوەو بە گۆڕینی ماناکەشی، ئاشکراکەری پەیوەندی مرۆڤە بەوانی دیەوە، بەڵام هەر لەم مانایەدایە کە چەمکی تایبەتی خۆی دەدۆزێتەوە.

میراتی مانای یەکەم دولایەنی جیاواز بە مانای لێکبوردن دەبەخشێت کە لەپێناسی فەرهەنگی رۆبەردا بەمشێوەیە هاتووە: "لێکبوردن بریتیە لەوازهێنان لەئەمرو نەهیکردن لەحاڵەتێکدا کە توانای ئەنجامدانی هەبێت، لێکبوردن ئەو ئازادیەیە کە لەم وازهێنانەوە بەدەستدێت" ئەم پێناسەیە لایەنیکەم مەتەڵئامێزە: نەرونکراوەتەوە کە چ کەسێکی وازدەهێنێت، و نە چۆن ئەم وازهێنانە دەبێتە هۆی ئازادی. ئایا لێکبوردن ئیمتیازێکە کە لەشێوەی ئازادیەکی تەواو نیگەتیڤدا بەوی دی دەدرێت؟ پێناسی دوهەم لەبواری پەیوەندی کەسەوەیە بەویدیەوە، نەك لەبواری دەزگاکاندا: "هەلومەرجێك کە ئەگەری بیرکردنەوەو کارکردن بەشێوەیەکی جیا لەوەی ئێمە قبوڵمانە، دەڕەخسێنێت". لەم پێناسەیەدا کەمتر لە"قبوڵکردنی"

ئەویدی، سەرنج لەدەرکی دیدەکانی ئەوی دی لەروی هاوڕەنگی دەرونیەوە دەدرێت .ئەم بنەمایە، بنەمایەکی ئاڵۆزە.لەم پێناسەیەدا لێکبوردن ئیمتیازێکە بۆ "ئەویدی" لەلایەن کەسێکەوە کە بڕوایوایە هەقیقەت لای ئەوە. جۆرێك بەرگەگرتنی هەقیقەتە لەبەرامبەر هەڵەدا. لێرەدا ئەویدی" وەك "شێوازێکی بیرکردنەوە و کارکردن" وەسفدەکرێت. ئایا پێویستدەکات ئاماژە بۆ پێناسی فەرهەنگی فۆرتییر (بڵاوکردنەوەی ساڵی ١٦٩١ی میلادی)یش بکەین": (لێکبوردن (کرداری تێپەڕ): تەحەمولکردنی شتێك، شکاتنەکردن لێی، سزا نەدانێتی: دەبێت لێبوردوو بین لەبەرامبەر هەڵەی ئەو کەسانەی لەگەڵیاندا دەژین، لەشاری رۆما لەگەڵ عەرەق خۆرەکاندا لێبوردوون، بەڵام کارەکەیان ناسەلمێنن. کاتێك ناتوانین تەعەدا یان دەستدرێژیەك لەرەگەوە دەربهێنین، دەبێت لەگەڵیدا لێبوردوو بین. دەبێت لەگەڵ تاوانێکدا کە ناتوانین سزای بدەین، لێبوردوو بین". لێکبوردن جۆرێك بەرگەگرتنە کە مرۆڤ بەهۆیەوە یان شتێك، رەفتارێکی خراپ، هەڵەیەك تەحەمولدەکات، یان دەیشارێتەوە. عەرەق خۆرەکان تەحەمولدەکرێن، چونکە ناکرێ ئەو خراپکاریانەی کۆنترۆڵیاندەکات، لەناوببرێت. بێ هۆ نیە کە زۆرجار بێ دینی و فەحشایان بەیەك شت دادەنا. ئەگەر تەنها لەگەڵ خراپیدا لێبوردوو بین، چیدی لێکبوردن ناتوانێ خۆی فەزیلەتێك بێت: ئەوە چ جۆرە ئەخلاقێك دەبێت ئەگەر لێبوردوو بین لەگەڵ ئەو شتەدا کە دژی ئەخلاقە؟ لەبیرمان بێت کە ئەزموون و تەحەمول بۆ کەسێکە کە لێدەبورێ و هەق بەدەست ئەوە. دیارە قبوڵنەکردن بەمانای دەرکردن و ئەشکەنجەدان و ئازاردان نیە. بەڵام لێکبوردن، بێلایەنی نیە: ئەو شتەی لێبوردوو دەبین لەگەڵی، بەهیچ شێوەیەك، هەق دروست ناکات. رێگەدان، سەلماندن نیە. ئەو شتەی لێێ دەبورێ، دەچێتە ژێر باڵی هەقەوە و یاسا لەبەرامبەریدا بێدەنگ دەبێت. کاتێك لەشتێك دەبورێت، کە توانا یان جەسارەت بۆ رێگە لێگرتنی نیەو لەم حاڵەتەدا وەك "لێکبوردنگەری" مەحکوم دەکرێ، لێبوردن لەم حاڵەتەدا بە سستیەکی گوناهکارانە یان بێ هیمەتی ناودەنرێ.

پێناسی فەرهەنگی رۆبێر ئاشکراکەری دابڕانێکە: لەم پێناسەیەدا بە پەڕینەوە لەوازهێنانەوە بەرەو قبوڵکردن و هەروەها لەسڕینەوەی ماوەکانەوە، بەرەو قبوڵکردنی هەمەڕەنگی دەڕۆین. چیدی لێکبوردن ئەو مانایەی نابێت، بەڵکو دەبێت







بە بنەمایەکی پراکتیکی کە مرۆڤ بە پێی ئەوە لەچەند رویەکەوە تەسلیمی ئەویدی یان وردتر بڵێین تەسلیمی ئەویدی وەك کەسێك دەبێت، کە بیروڕاکانی لەگەڵ بیروڕاکانی ئەودا جیاواز و ناکۆکە. ئەو کەسەی لێدەبورێ، سود لەم لێبوردنە وەردەگرێ. لەم حاڵەتەدا لێکبوردن وەك ئیمبرتۆ جیانینی دەڵێ وەك "دروشمی ژیانی هاوبەش "دەناسرێت، کە نمونەکەی وتوێژو زمانی هاوبەشە کە مرۆڤ ناچار دەکا "قەبوڵی ئەویدی" بکات.

سەیر ئەوەیە ئەگەر ئەم پێناسەیە لەگەڵ پێناسی "لێکنەبوردن"دا بەراورد بکەین، وەك چۆل ریکۆر دەڵێ، روبەڕوی هەلومەرجێکی پێچەوانە دەبینەوە. لەم حاڵەتەدا رەفتاری تاك پیش رێسای هاوبەش و گشتی دەکەوێت و لێکنەبوردن بریتی دەبێت لە"حاڵەتی پێچەوانەی لێکبوردن (مەزهەبی یان دینیای)" و "مەیل بۆ تەحەمولنەکردن، مەحکومکردنی ئەوەی لەرەفتارو بیرڕای ئەوانی دیدا بەدڵی ئێمە نیە". ئەم پێناسەیەی لێکنەبوردن، هەمان ئاڵۆزی پێناسی لێکبوردنی هەیە. ئایا دەبێت لێکبوردن وەك دەستورێکی ئەخلاقی و سەر بەئەخلاقیات بزانرێت کە بناغەکەی لەبەهای کەس یان ویژداندایە؟ یان لێکبوردن دەرئەنجامی کۆمەڵی تەکبیری دەزگاییە کە دەتوانێ زامنی ئازادی و مافێك بێت کە مەرجەعە جیاوازەکانی دەسەڵات بە تاکەکانی دەبەخشن؟ ئایا لێکبوردن بناغەی یاسا عەلمانیەکانە، بەو هۆیەی کە پشت بەستووە بەمافە ئەخلاقیە دێرینەکان یان دەبێت بە بەرهەمی ئەو یاسایەی دابنێین؟

## تاوان دژی دەرونی مرۆڤ یان تاوانی زەمینی:

لێکبوردن هەمیشە بەشێکە لەکۆمەڵێك شتی دی کە ناتوانین لێی جیابیکەنەوە. کاتێك زانا دینیەکانی سەدەی سیانزەو دادگا شەرعیەکانی ئەو سەردەمە ئەو پرسیارەیان هێنایە پێشێ کە ئایا دەبێت مرۆڤ لەگەڵ بێ دیندا لێبوردوو بێت، کاتێك کە ئازادی دەربڕین وەك مافی مرۆڤ داوا دەکرا، کاتێك سەرنج لەتەکبیرە دەزگاییەکان دەدرا لەپەیوەندی لێکبوردن بەبازرگانی و ئاڵوگۆڕی ئابوریەوە، هەمیشە وشەی لێکبوردن یەك مانای نەدەبەخشی. بێگومان دەکرێ لێکبوردن بگەڕێینەوە بۆ سەردەمە دێرینەکان: ئایا لەهەمان کاتەوە کە کۆمەڵگا دامەزرا، پێویست نەبوو کە

بیروڕاو باوەڕو تیورەکان بەیەکەوە بگونجێن، بۆ ئەوەی پەیوەندی کۆمەڵایەتی لێك هەڵنەوەشێتەوە، بێ ئەوەی لەهەمانکاتدا پێویست بە دانانی ڕێسایەك بۆ لێکبوردن و سنورەکەی هەبێت؟ لەوێشەوە کە چونیەکی و یەك باوەڕی بوونی نەبوو، بەڵکو بیروڕا هەمەجۆر بوو، ئایا لێکبوردن کێشەیەك نەبوو کە دەبوو چارەسەربکرێت؟ ئەگەرچی ڤۆڵتێر ئەوەی دەسەلماند کە یۆنانیەکان و ڕۆمیەکان لێبوردوو بوون، بەڵام دەبێت سەرنج لەوە بدەین کە ئەوان وێنایەکی دروستیان بۆ لێکبوردن نەبوو: لێکبوردن بیرێکی نوێیە کە لەحاڵ و هەوای مەزهەبی ئەوروپای سەردەمی ڕێنسانسدا سەریهەڵدا.

بە کورتی دەڵێین مەسیحیەتی سەدەکانی ناوەڕاست، پاش قوستنەتین و بەهۆی باوەڕهێنانی ئیمپراتۆرەکانەوە، بوو بەدینی دەوڵەت، کەنیسە و دەوڵەت دوالیزمێکیان پێکدەهێنا کە لەناو دەرونی یەك کۆمەڵگادا جێگەیان هەبوو و ئەم کۆمەڵگایەش لەسەدەی نۆی میلادیەوە بەکۆمەڵگای مەسیحی ناودەبرا و ئەم دوو دەزگایەش (واتە کەنیسەو دەوڵەت) بەڕێوەبەرایەتی یەك سەرزەمینیان لەئەستۆ بوو. هەرچەندە لەسەرەتای سەدەی سیانزەدا هێواش هێواش نەتەوەکان بە خەبەر دێن و حکومەتی سەربەخۆ لەسنوری دەسەڵاتداریێتی پاپا بونیاد دەنێن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا یەکێتی مەزهەب بناغەی دەوڵەت و وڵات پێکدەهێنێ. بەڵام لەگەڵ ریفۆرمەکانی لوسەر و کالڤیندا، سەرجەم مەسیحیەتی ڕۆمی توشی سەرلێشێوانێکی بێوێنە دەبێت: بۆ یەکەمجار بێدنی (یان ئیرتیداد) دروستدەبێت کە بەردەوام و سەقامگیر دەبێت و کۆی سەرزەمینەکان دەگرێتەوە (ئاماژەیە بۆ ئەو وڵاتانەی کە یەکپارچە بوون بە لایەنگری ریفۆرم و بوون بە پرۆتستانتی. و). بێگومان بەر لەوەش ئیرتداد دروست بووبوو (گروپەکان یان جیابونەوەکانی وەك ئاریانیزم، دوناتیزم، ئالبیژوایی) کە بە توندی سەرکوتدەکرا (و پاشتر بەهۆی تەفتیشی بیروڕاکانەوە "ئەنگیزسیۆن" سەرکوتکرا) و جیابونەوەی کەنیسەی ئۆرسۆزکس، مەسیحیەتی بە شێوەیەکی بڕاوە کرد بە دوو بەشەوە. لەسەدەی شانزەدا زۆرێك لەکەنیسە لوسەری، زوینگلینی، کالڤینی، و ئینگلیکی، دەکەونە دژایەتی ئاشکرای کەنسەیی ڕۆم (کاسۆلیکی) و هەروەها ژمارەیەکی زۆر لەگروپ و بزوتنەوە مەزهەبیەکان بەشەوق و هەوڵێکی زۆرەوە بەشی خۆیان هەڕەشە لەریفۆرمی دینی دەکەن. جیهانێك لەکەنیسەکان،







گروپەکان و بزوتنەوە دینی و عیرفانیەکان، هەوڵ بۆ بەدەستهێنانی مافی ژیان دەدەن. مەسەلەی ناکۆکی مەزهەبی لەسەرتاسەری ئەوروپادا دێتە پێشەوەو بەدوای ئەمەشدا مەسەلەی لێکبوردن دێتە پێشەوە.

جیاوازی مەزهەبی چیدی لەدەرەوەی جیهانی مەسیحیەت و تەنها پەیوەندی بە نامەسیحیەکانەوە نیە، بەڵکو لەناو کۆمەڵگای مەسیحی ڕۆژئاوادا ڕوودەدات. ئەمە پیشاندەری دوو هەلومەرجی جیاوازە: لەکاتێکدا  بێباوەڕی (بە مەسیحیەت)، کە بە بڕوای کاسۆلیکەکان مەسەلەیەکە لەدەرەوەی باوەڕی ئەوانەو هاوسەنگی مەسیحیەت تێك نادات، ئیرتداد لەچاوی ئەواندا گەندەڵیە لەمەسیحیەتدا و بناغەکانی دەلەرزێنێ. لەکۆمەڵگایەکدا کە بناغەی یەکێتیە زەمینیەکەی، هاوشانی ئیمانی دینیە (ئەو ڕستە باوەی فەرەنسا دەلالەت لەمە دەکات: "یەك باوەڕ یەك یاسا، یەك شا")، بە باشی ئەوە دەردەخات کە یەکێتی باوەڕ، بناغەی یاساو یەکێتی دەسەڵاتی سەڵتەنەتە. هەر جیابونەوەیەکی مەزهەبی، وەك تەفرەقەیەکی زەمینی دەناسرێت و بە یاخیبوون دادەنرێ: مورتەدەکان تاوانبارن و بە مەترسیەك دادەنرێن هەم بۆ کەنیسەیەکان و هەم بۆ کۆمەڵگای مەدەنی.

مەسەلەی جیاوازی مەزهەبی، دوولایەنی هەیە: لەلایەکەوە ئیرتداد (کە دیارە تۆمەتی دوولایەنەی کاسۆلیك و پرۆتستانتەکانە دژی یەکدی، پرۆتستانتەکان کاسۆلیکەکان بە شێواندنی کەنیسەی سەرەتای مەسیحیەت و ناوەرۆکی کتێبی پیرۆز تاوانبار دەکەن) تاوانێکە دژی کەنیسەیەکان و هەروەها دژی سیاسەتمەداران، تەوەرەی سەرەکی یاساکانی تاوانی زەمینی و مەزهەبی، بناغەیەکی یاسایی —سیاسی تەواو دروستدەکات. لەلایەکی دیەوە بەپێی بەڵگاندنێکی مەزهەبی، یەکێتی باوەڕ مەرجی ئازادی دەرونیی مرۆڤەکانە: تەنها ئازاد بوونی تاك لەئارادا نیە، بەڵکو ئازادی سەرجەم کۆمەڵگا لەئارادایە. کەوابوو لەپێناوی بەرژەوەندی ئازادی هەموانە کە دەبێت تەماشای مەترسی شێمانەیی ئیرتداد بکرێ. بڕوا وایە کە دەبێت مورتەدەکان سزای دنیایی بدرێن، بۆ ئەوەی لەوکاتەدا کە دەرونیان ئازاد دەبێت، ئەرکی چاکەکاریش بووبێت بەپراکتیکی، کە یارمەتیدانی ئازادی ئەوانیدی، بەمەبەستی زامنکردنی ئازادی خود، دەیسەپێنێ. هەروەها بەمشێوەیە ئەرکی کۆمەڵایەتی پەیوەست بە بەرژەوەندی دنیایی تاکەکانی کۆمەڵگاوەشەوە،

ئەنجامدەدرێ. لەم حاڵەتەدا بەکارهێنانی مافە زەمینییەکان بۆ سزادانی تاوانە مەعنەویەکان و سودوەرگرتن لەدەسەڵاتی میرەکان لەم پێناوەدا، پێویست و رەوا دێتە پێشچاو.

ئەوە بەبیر دەهێنینەوە کە پرۆتستانتەکانیش بەمشێوەیە بیریاندەکردەوە: لوسەر سەرەتا لایەنگری ئازادی مەزهەب و دژی بەرپابوونی کەنیسەی دەوڵەتی بوو. بەڵام دوایی ئەڵمانیا دابەشبوو بۆ کۆمەڵێك شازادەنشینی کاسۆلیکی و پرۆتستانتی بەپێی رێسای "Cujus regio ejus religia" (لەهەر دەوڵەت یان شازادەنشنێکدا تەنها یەك مەزهەب دەتوانێ بوونی هەبێت، مەزهەبی میر). سیاسەتی وتوێژ کە زۆرتر لەلایەن بزوتنەوەی هیومانیزمەوە دەبرێتە پێشێ، ناتوانێت کەنیسە جیاوازەکان ئاشتبکاتەوە. لەفەرەنسادا حاڵەتی ئاشتبوونەوە کە بەهۆی فەرمانی نانتەوە (١٥٩٨) بەرپا دەبێت، کاریگەریەکی روو لەکەمبوونەوەی هەیەو ناتوانێ رێگە لەسیاسەتە تازەکانی ئازارو ئەشکەنجەدانی مورتەدەکان، بەکارهێنانی زۆر و ناچارکردن بە باوەڕهێنان، دورخستنوە و ناچارکردن بە پێشوازی لەشکرەکان، بگرێت. بەمشێوەیە پاش ریفۆرمی دینی، بۆ یەکەمجار دوابەدوای جیاوازیە چارەسەرنەکراوەکانی نێوان کاسۆلیك و پرۆتستانتەکان، مەسەلەی لێکبوردن لەمانای راستەقینەی خۆیدا بەشێوەیەکی توندوتیژ رادەگەیەنرێ: نەسیاسەتی وتوێژ (کە لەبنەڕەتدا لەساڵەکانی ١٥٣٠ و ١٥٥٥ پەرەیسەند) بەمەبەستی لایەنیکەمی گونجانی تیوری، رێکەوتنێکی رەوای نێوان لایەنەکان مسۆگەر دەکات و نە ئازارو ئەشکەنجەو بەکارهێنانی کرداری توند (بە شوێنێك دەگات).

لەبەرامبەر لێکنەبوردنی مەزهەبیدا کە دەڵێت هەرکەس هەندێك لەحوکمە شەرعیەکان قبوڵنەکات، بە زەروری نەفرەتلێکراو و دەرکراوە ("لەدەرەوەی کەنیسە ئازادی نیە") لێکنەبوردنی زەمینیە کە ئەگەری پێکەوەژیانی لایەنگرانی مەزهەبە جۆراوجۆرەکان لەیەك وڵاتدا قبوڵناکات. بەڵام هەروەها لێکنەبوردن وەك کارێکی خێرخوازانە دەردەکەوێت: تا ماوەیەکی زۆر لەیادی شەوی سن بارتلمیدا، مەراسمێك بەرپا دەکرێت. بە هەڵە وەرنەگیرێت، لەسەدەی شەشدا لایەنگرانی لێکبوردن، نەلایەنگری دەوڵەتی عەلمانین و نە نەیاری کەنیسە. هیشتا زۆرمان ماوە بۆ ئەوەی بە





رۆشنگەری بگەین. وتوێژەکان لەنێوان مەسیحیەکاندایە، ئەگەرچی چیدی یەکگرتوو نین. لێکبوردن سەرەتا مەسەلەیەکی مەزهەبیە، کە موفەسیرەکانی کتێبی پیرۆز رۆڵی سەرەکی تیا دەبینن. ماوەیەکی زۆر تێدەپەڕێ تا ئەم مەسەلەیە لەسنوری مەزهەب تێپەڕ دەکات و هاوهەنگاو دەبێت لەگەڵ بزوتنەوەی عەلمانیکردنی دەوڵەتدا.

دەبێت بە سەرنجدان لەم هەلومەرجە، تاوتوێی هۆیەکانی بەرگریکردن و دژایەتی لێکبوردن بکرێ، دەوڵەت چۆن دەتوانێ رێگە بە هەمەڕەنگی بیروباوەڕە مەزهەبیەکان بدات؟ ئایا ئەم هەمەڕەنگیە، مەزهەب لەرەگەوە هەڵناکێشێ؟ بەمشێوەیە بۆ یەکەمجار مەسەلەی لێکبوردن لەتۆمارکردنی یاساکانی پەیوەندیدار بە تاوانە مەزهەبیەکانەوە، واتە بە تێکەڵکردنی مافە زەمینی و کەنیسەییەکان، ئەنجامدەدرێت. لێکبوردن لەم روانگەیەوە مەسەلەی هەقیقەت، یان رونتر بڵێین مەسەلەی مەرجەعێك دەگرێتەوە کە لەروی شەرعیەوە توانای دەستنیشانکردنی هەقیقەتی هەیە. مەرجەعێك کە هەقیقەت لەدەست ئەودایەو خەڵکی پێ پەروەردە دەکات. ئەو گۆڕانانەی دواتر لەبیرۆکەی لێکبوردندا روودەدات، دەرئەنجامی ئەو هەڵبژاردنەیە کە بۆ دەستنیشانکردنی مەرجەعی هەقیقەت و داوەریکردن دەکرێ: ئایا ئەو مەرجەعە کەنیسەیە یان کتێبی پیرۆز، ویژدانی تاکە یان فەرمانی میرانی زەمینی؟

## لێکبوردن و هەقیقەت:

ئیرتداد (یان هەڵگەڕانەوە) بەر لەوەی نەزانین بێت، تاوانێکی گوناهکارانەیە. لەراستیدا پاش ئەوەی کتێبی پیرۆز هەقیقەتی بەپێی پێویست ئاشکراکرد و کەنیسە بڵاوی کردەوەو تەنانەت وەك کۆمەڵێ حوکمی بنەڕەتی گوتیەوە، چیدی ناکرێ نەزانین بکرێت بە بەهانە.

جیاوازی لەمەزهەبەدا تاوانە، چونکە بەڵگەی پێداگرتنی سەرسەختانەیە لەبڵندتر کردنی قسەی خود بەسەر قسەی خودادا. "سن تۆماس داکەن" یاساکانی پەیوەندیدار بە تاوانە مەزهەبیەکانەوە بەمشێوەیە روونەدەکاتەوە: ئیرتداد، بیرێکی هەڵەیەو لاڕێیە، راست نیە، چونکە نیشانەی راوەستانی ئەنقەستە لەبەرامبەر راستیدا، و لاڕێیە چونکە لەکەنیسە و خودا دور دەکەوێتەوە. "بۆسۆئە" ئیرتداد بە





تاوانی گۆڕینی هەقیقەت دەزانێت: بەردەوامی و نەگۆڕی حوکمەکان کە کەنیسە و نەریت زامنیدەکەن، پێوەری ڕاستیە. سەرەڕای ئەمانەش ئیرتداد تاوانێکە دژی مافە زەمینیەکان. هەرچەند زۆرتر بە سۆزانیەت بەراوردیانکردووە بەڵام سن تۆماس داکەن کردوێتی بە هاوتای "لێدانی پارەی تەزویر". لێدانی پارەی تەزویر نمونەی تاوانێکی زەمینیە. مورتەدەکان لەبەراوردکردندا، بە هەڵگەڕانەوەی پەیوەندیەکانی کۆمەڵگا، لەیەکی هەڵدەوەشێنن و ئەگەری ئازادی هەموان لەناو دەبەن. مورتەدەکان تاوانی سوکایەتیکردن بە خودایەتی (ئلوهیەت) -وەك تاوانی سوکایەتیکردن بە سەڵتەنەت لەعورفدا- ئەنجامدەدەن. لەبەرئەوە ڕەوایە کە سزای مەعنەوی، واتە تەکفیر و سزای دنیایی، واتە مردن بدرێن.

لەم دیدگایەوە هێنانە ئارای مەسەلەی لێکبوردن لایەنیکەم سەرسوڕهێنەر دەردەکەوێت. بەڵام سن تۆماس ڕێسایەك بۆ لێکبوردنی زەمینی، گونجاو لەگەڵ باڵادەستی نمونەی خوداییدا لەبەرچاو دەگرێت: ئەگەر خودای خێرو بەتوانا، ئیمکانی دروستبوونی خراپی لەجیهاندا دەدا، لەبەرئەوەیە کەسڕینەوەی هەموو خراپەکان دەبێتە هۆی لەناوبردنی زۆرێك لەچاکەکانیش. هاوسەنگی خودایی لەنێوان چاکەو خراپەدا، یەك لێپرسینەوەی مرۆییە. هەر میرێك دەبێت لەبەرامبەر هەندێك پەیمانشکێنیدا کە جۆرێك خراپیە، لێبوردوو بێت بۆ ئەوەی خۆی لەخراپی گەورەتری وەك ئاژاوە کۆمەڵایەتیەکان دوربگرێت، و ڕێگە بۆ هەندێك لەچاکیەکان خۆشبکات.

لەبەرامبەر ڕاستیەکەدا کە کەنیسەی مەرجەع وەك بنەمایەکی بابەتی و گشتگیر دەیهێنێتە پێش، بیرۆکەی لێکبوردن وك زەرورەتێکی پراکتیکی یان سیاسی دنیایی ڕوودەدات. لێکبوردن لەپێناوی ڕاستیدا جۆرێك بەرگەگرتنە لەبەرامبەر هەڵەی گوناهکارانەدا، و تەنهاش تا ئەوکاتە بەردەوام دەبێت کە ئەو هەڵەیە لەناو نەچوبێت. لێکبوردن ملدانە بۆ کەمترین خراپە. ئەم مانا سەرەتاییەی لێکبوردن ناتوانین لەبەرچاو نەگرین. ڕاو سن ئەتین چەند سەدە پاشتر لەبەرامبەر ئەنجومەنی نەتەوەیی (فەرەنسادا) وشەی پڕ ئالۆزی لێکبوردنی مەحکومکردو داوای سڕینەوەی لەراگەیاندنی مافەکانی مرۆڤدا کرد: وشەیەك کە "هاوڵاتیان وەك گوناهکاران، کە دەبەخشرێن، بە شایستەی بەزەیی دەزانێت" (وتار لەئەنجومەنی نەتەوەییدا، ٢٢ی





ئۆتی ١٧٨٩) مۆری ئەم خەسڵەتە بە لێکبوردنەوە مایەوە کە بەخشینی ئیمتیازێکە بە هەڵەکەران و نەك هەر بەرگری نیە لەمافی یەکسانی هاوڵاتیان، بەڵکو موداراکردنی ئەویدیەو، لێرەوە هەر ساتێك دەتوانێت فەرامۆشبکرێت.

بەڵام چەمکی ڕاستی بەناچار ئەوە ناهێنێتە پێشێ کە هەر دورکەوتنەوە یان گۆڕینێکی، پێویستی بە سزادانی دنیایی بێت. دەکرێ چاو لەسزادان بپۆشرێت و بەرگری لەمافی فرەیی مەزهەبەکان بکرێ و لەهەمانکاتدا لەبواری هەقیقەتدا پابەندبین بە یەك بنەمای بابەتی و گشتگیرەوە. هیومانیستەکانی سەردەمی ڕێنسانس بەمشێوەیە هەوڵدەدەن تاسەرلەنوێ یەکێتی بنەمای باوەڕ دروستبکەنەوە، و لەهەمانکاتدا بیگونجێنن لەگەڵ ئاشتی و لێکتێگەیشتنی زەمینی لەکۆمەڵگادا. هیومانیستەکان لەسەر بنەمای ڕێکەوتنی گروپە مەسیحیەکان لەچارەسەری لێکتێگەیشتنی جیاوازیەکاندا، زۆرتر پشت بە پەروەردەکردنی مورتەدەکان دەبەستن تا سەرکوتکردنیان، و جەخت لەکۆکردنەوەی حوکمە مەزهەبیەکان لەبنەما پراکتیکیەکان و باوەڕی سادەو زیندوو ودور لە وردبینیەکانی زانایانی مەزهەبی دەکەن. مارسیل فیسین و پیك دولامیراندول دەچنە پاڵ قوتابخانەی هیومانیستەکان کە ئامانجیان سەقامگیرکردنی ئاشتی و گونجانی مەزهەبی و مرۆیی و وتوێژی ئازادە. تەنانەت دەکرێ وەك نیکولا دۆکز ڕێکەوتنی ژمارەیەکی کەمی حەکیمەکانی دینە جیاوازەکان، بۆ ڕێکخستنی کۆمەڵێك بنەمای گشتی و هاوبەش لەبەرچاو بگرین، کە لەم حاڵەتەدا ڕێکەوتنی بیروڕای گشتی، دەبێتە هۆی ئاشتی و ڕێکەوتن لەنێوان پەیڕەوانی یەك دینی قبوڵکراوی خودادا.

کەوابوو جیاوازی مەزهەبەکان خۆی لەخۆیدا خراپ نیە: ئەم جیاوازیە لەکتێبی یۆتۆپیاشدا هەم سروشتی و هەم خواستی خودایە. بەڵام سەرەتا بەڵگاندنی (ئیستدلال) توماس مۆر بە قازانجی ئازادی مەزهەبی، بەڵگاندنێکی سیاسیە. ئۆتۆپۆس (حاکمی یۆتۆپیا) لەبەرئەوە ئازادی مەزهەبی بۆ ڕەعیتەکانی بە ڕەوا دادەنێت، چونکە دەزانێ ناکۆکی مەزهەبی وڵات بێتوانا دەکات. لێکبوردن لەخزمەتی هاوئاهەنگی نەتەوەییدایە، ئەگەر لەیۆتۆپیادا هەم باوەڕداری تازەو هەم مولحدی بێ خودا هەردوکیان مەحکومن، لەبەرئەوەیە کە حەماسەتی مەزهەبی یەکەمیان قابیلی لێبوردن نیەو بێ باوەڕی، دوهەمیشیان دەکات بە مرۆڤێکی نائەخلاقی و لەئەنجامدا





دەیکات بە بونەوەرێکی ناکۆمەڵایەتی. لەکتێبی یۆتۆپیادا بەرگری لەدەوڵەتی زەمینی یان نادینی ناکرێت، بەڵام ئەم کتێبە هۆگەلێك دەهێنێتەوە بە قازانجی ئەو "سیاسەتانەی" خوازیاری گرنگتربوونی بەرژوەندیەکانی کۆمەڵگایە، بەسەر یەکێتی مەزهەبیدا و پێشنیاری جۆرێك ئازادی بیروڕا و مەزهەب (گەرچی بە شێوەیەکی کاتی) دەکات، کە کاسۆلیکەکان و ریفۆرمیستە دینییەکان و بە گشتی هەموو ئازادیخوازێك دەگرێتەوە. میشل دۆلۆپیتاڵ بەرژەوەندیە نەتەوەییەکان کە دەبێت تەنها سەرقاڵیی دەوڵەت بێت، لەمەسەلەی هەقیقەتی مەزهەب جیادەکاتەوە. ژان بۆدۆن و بزوتنەوەی فکری ئەراستینی جیاکاری لەنێوان مەزهەب و دەوڵەتدا، بە قازانجی دوهەمیان دەکات و پەرە بەدەسەڵاتی حوکمڕانی سیاسی بەشێوەیەکی جێی سەرنج دەدا.

پێشتریش مارسێل دۆپادۆ لەکتێبی لایەنگری ئاشتی (١٣٢٤ی میلادی)دا، میری بە پێشەوای مەزهەبی وڵات دەناسی، و بڕوایوابوو کە دەبێت میر هەموو حوکمە یاساییەکان دابنێت. بە کورتی لێبوردن لەبارەی مورتەدەکانەوە بە تەواوی بەستراوە بە هەڵژاردنی میرەکان و بەرژەوەندیە تایبەتیەکانی دەوڵەتەوە.

قوتابخانەی هیومانیست هەمیشە جیاوازی گروپە دینیەکان بەشتێکی خراپ دەزانێت، خراپیەك کە دەبێت لێبوردوو بین بەرامبەری، تا ئەو کاتەی کە سازشکردنی مەزهەبی، کۆتایی پێدێنێت. لێکبوردن مەسەلەیەکی کاتیە، تەنانەت ئەگەر لەگەڵ ئەو رەخنەی هەقیقەتەدا بێتەوە کە زانایانی مەزهەبی کاسۆلیك دەیگرن. یەکەم بابەت کە دێتە پێشەوە یەکێتی گروپە جیاوازەکانی مەزهەبی کاسۆلیکیەو پاش رێکەوتنی سەرجەم کاسۆلیکەکان، یەکێتی لەگەڵ مەزهەبەکانی تردا دێتە پێشێ کە دەبێتە هۆی کۆبونەوەی مەزهەبە جیاوازەکان لەدینێکی پێکهاتەییدا (تەرکیبی)، دیارە لەژێر پەرچەمی باوەڕی مەسیحیدا. لەیۆتۆپیادا جیاوازی مەزهەبەکان، زیان لەیەکپارچەیی مەسیحیەت نادات، چونکە یۆتۆپیا دەوڵەتێکی نادینیە و تۆماس مۆر بە سەرنجدان لەئیرادەی خوداوەند کە مەزهەبە جیاوازەکان بەرەو یەکێتی بیروڕا دەبات، دەچێتە پاڵ بیری هیومانیستەکان کە خوازیاری ئاشتی مەزهەبین، لەگەڵ سەرکەوتنی مەسیحیەتدا. ئەم سازشکردنە، جیاوازیەکان لەناو دەبات و هەڵەی مورتەدەکان چاکدەکاتەوە، بەمشێوەیە زۆرتر





بەرگری لەلێتێگەیشتن دەکرێ تا لێکبوردن.

## نەریت، ئاشکراکەری هەقیقەت یان بەرهەمی دەسەڵات:

بەڵام دەکرێ تەعبیری هەقیقەت، وەك پێگەی هێزو دەسەڵاتی سیاسی، بە وەڵامدانەوەی بیرکردنەوەی جیاواز وەك تاوانێك بزانرێت. بۆسۆئەش وەك باسکال بڕوایوایە هەقیقەت نەگۆڕە: بەردەوامی و نەمری کەنیسە، پێوەری هەقیقەت و زامنی گشتگیری حوکمەکانی کەنیسەی رۆم (کاسۆلیك)ە. ئەم دەزگایە پارێزەری هەقیقەتە لەبەرامبەر هەر گۆڕانکاریەکدا، و بە زنجیرە پلەیی هەمیشەیی خۆی، خوازیاری فەرمانبەرداری پەیڕەوەکانێتی. هەر گۆڕانێك لەحوکمەکاندا، ئاشکراکەری هەڵەیە. کەوابوو ریفۆرمیستە مەزهەبیەکان کە تاوانبارن بە ئیرتداد، دەیانەوێت هەقیقەت وەك جێگەیەك بۆ دەسەڵات و هێز تەفسیربکەن. لەراستیدا لەدەزگای فکری ئەواندا کەنیسە پێگەی دەسەڵاتە: ئەوان دەڵێن کەنیسە بەرگری لەهەقیقەتێك دەکا کە هەقیقەتی دین و باوەڕ نیە، بەڵکو هەقیقەتی مەزهەبی فەرمانڕەوایە.

هانری باسناژ دۆبۆڤاڵ بەمشێوەیە دیکتاتۆریەتی قەشەکان مەحکومدەکات: ئەو قەشانەی خەڵکی دژی شازادەکان هاندەدەن و ناچار بە سەرپێچیکردن لەیاساکانی پاشاکانیان دەکەن و خۆیان دەبن بە ئەربابی مەسەلە دنیایەکان. ئەمانە نەزانی هاندەدەن و خورافات بڵاودەکەنەوە، بۆ ئەوەی باشتر تێنوێتی دەسەڵاتداریّتی خۆیان تێربکەن: گەندەڵی ئەخلاقی قەشەکان لەنێوان ئەو حوکمانەدا کە بەرگری لێدەکەن و واقعیەتی رەفتاریان، جیابونەوەیەکی گوناهکارانە دروستدەکات. لێرەدا لەیەکێتی سیاسی لەسەر بناغەی یەکێتی بیروڕا، دور دەکەوینەوە: مەزهەب رەنگە هۆکارێکی یاخیبوون و دارمانی دەزگا زەمینیەکان بێت.

ئەم رەخنەیە تازە نیە. سپینۆزاش بە تامەزۆرییەوە ئاماژەی بۆ کینتە کۆرچە دەکات کە بڕوایوایە: "هیچ ئامێرێك هێندەی خورافات بۆ حوکومەتکردن کاریگەر نیە ". بەڵام رەسانەیەتی سپینۆزا زۆرتر لەوەدا نیە کە زانایانی دینی لەبەر دەسەڵاتیان بەسەر خەڵکیدا مەحکومدەکات، بەڵکو لەوەدایە کە بناغەی ئەم دەسەڵاتە دەگەڕێنێتەوە بۆ پێکهاتەی سۆزداری مرۆڤ. پێکهاتەیەك کە بە قازانجی زانایانی دینی، رەگی لەناو خودی مرۆڤدایە. مرۆڤەکان بەپێی ماهیەتیان خورافین. خورافە





دەرئەنجامی ئەو ئامادەییە سۆزدارییەیە کە لەوەهمی دەسەڵاتدارێتی ئیرادەی کەس بەسەر خۆیەوە دروستدەبێت و مرۆڤەکان بەهۆیەوە هەر مەسەلەیەکی ناعەقلانی (بێئاگایی لەهۆکارە سروشتیەکان، "رەمزەکانی" کتێبی پیرۆز") بە شێوەیەکی بان عەقلانی (سیستەمی سروشت لەسەر بناغەی رێکخستنێکی ئامانجدار، ئیلهامە بان عەقلانیەکانی کتێبی پیرۆز) تەفسیردەکەن. لەبەرئەوەی بڕوایانوایە قەدەر کاریگەرترە لەهێزی خودی خۆیان، لەبەرئەوە لەنێوان ترس و ئومێددا دێن و دەچن، و پەنا بۆ دەسەڵاتێك دەبەن کە بڕوایان وایە بەهێزترە. کەوابوو ناسینی هەقیقەت بەر لەهەر شتێك بەستراوە بە رزگاربوون لەپێشداوەریەکانی زانایانی دینی، بەڵام پێویستی بە رزگاربوون لەسۆزە خەمناکەکانیش هەیە. تەنها لەوڵاتێکی ئازادا کە ئەگەری بەرخوردی ئازادانەی بیروڕاکان هەبێت، رزگابونێکی گشتی وا قابیلی وێناکردنە. لێکبوردن بەرلەوەی دەرئەنجامی فێرکردنی خەڵکی بێت، بەستراوە بە ئامادەیی دەزگاکان بۆ قبوڵکردن یان نەکردنی ئازادی بیروڕا. بەڵام سپینۆزا تەفسیرە نادروستەکانی زانایانی دینی بۆ کتێبی پیرۆزو گێڕانەوەی رەمزو دۆگماتیەتیەکان بۆ ئەو کتێبە کە بە تەواوی بێ بەریە لێی، وناساندنی بدعەتەکانی خۆیان وەك قسەکانی خوداش مەحکومدەکات. دانانی دۆگمە فەلسەفیەکان بە بەشێك لەکتێبی پیرۆزو خودا، وەك ئەوە وایە بە پێوەری راستیان بزانین: هەروەها ئەمکارە سەندنەوەی ئازادی فەلسەفاندن و سنوردار کردنی ئازادیە کۆمەڵایەتیەکانە.

## لێکبوردن و هەقیقەتی کتێبی پیرۆز:

ئەو هەقیقەتەی کتێبی پیرۆز ئاشکرایدەکات، خۆی دەبێتە بابەتی وتوێژێك لەبارەی لێکبوردنەوە. ئیساك لاپیرەر، ئۆربیل داکۆسنا، یان هۆبز بەر لەسپینۆزا تاوتوێی رەخنەگرانەی ئینجیلیان کرد. میتۆدی مێژوویی تەفسیرەکەی سپینوزا لەبارەی کتێبی پیرۆزەوە پیشانیدەدات، کە ئەم کتێبە هیچ حوکمێکی تیۆری بڕاوەی لە خۆیدا هەڵنەگرتووە، بەڵکو تەنها ناوەڕۆکی بریتیە لەتێزە ئەخلاقیە هەمەکیەکان و دەستوری کردارکردن بەپێی دادپەروەری و چاکەخوازی (وتاری مەزهەبی- سیاسی، تەماشای دەقی ژمارە ٩ بکەن.). رێسای تەفسیرکردنی کتێب بەهۆی خودی کتێبەوەو گەڕان بەدوای مانا نەك هەقیقەتەکەیدا، ئەگەری ئەوە







دەکاتەوە کە یاسای قابیلی وتوێژ نەکردنی کتێبی پیرۆز، لەرێگەی سەلماندنی بونیادە مێژوویەکەی، بسڕینەوە، ئەوکات ئیدی ئەرکی فێرکردنی هەقیقەت، دەبێتە ئەرکی تاك و تەنیای عەقڵ. سپینۆزا بەمشێوەیە بە سڕینەوەی ئەو دۆگمایەتیەی کە زانایانی دینی داویانەتە پاڵ کتێبی پیرۆز، نەك تەنها مەزهەب رزگاردەکات، بەڵکو فەلسەفەش ئازاد دەکات، چونکە ئەوە دەردەخات کە هیچ شتێك لەکتێبی پیرۆزدا نیە کە ناکۆك بێت لەگەڵ ئازادی بیروڕادا.

"پیرێ بیل"یش دەیەوێت دەست "بە تەفسیرێکی تازە بکات" و پشت بە "هەمەکیترینی ئەو بنەمایانە ببەستێ کە لێکۆڵینەوە زمانیەکان، رەخنەکان، و بیروڕای باو، دەتوانن بیخەنە بەردەستی مرۆڤ". بەمشێوەیە "هەر مانایەکی زمانی کە هەڵگری ناچارکردن بە ئەنجامدانی تاوانێك بێت، هەڵەیە". بیل بە توندی هێرشدەکاتە سەر ئەو تەفسیرەی ئەگوستین کە بە پشت بەستن بە وێنای میواندارێتی مەسیح (ئینجیلی لۆقا، چواردەهەم،٢٣) رەوایەتی بە بەکارهێنانی زۆر لەبەرامبەر مورتەدەکاندا دەدات ، و کۆی ئەو نەریتە مەزهەبیە بە پوچ دادەنێت کە بەپشت بەستن بە وێنای دانەو تاڵکە (ئەنجیلی مەتی، سیانزەهەم. ٢٤-٢٣) (و ئەمە خوازەیە کە بۆ جیاکردنەوەی باشەکان لەخراپەکان. و)، فەرمان بە سزادانی مورتەدەکان دەدەن. سن تۆماس، سن ئەگۆستین و تەنانەت لۆسەریش دەیانەوێت تاڵکە بژار بکەن، واتە مورتەدەکان —ئەگەر بکرێ لەگەڵ باوەڕدارانـدا جیابکرێنەوە- لەکۆمەڵگای مەدەنی دەریانبکەن و لەچاوەڕوانی هەڵسەنگاندنی رۆژی سزادا، لێیان نەبوورن (بەو شێوەیەی کە بۆ نمونە ئەراسم یا گرۆتیس تەفسیریدەکەن). فەرمانبەرانی باوەڕپێهێنانی خەڵکی، بە پشت بەستن بە مانای روکەشی ئەم وێنایە، تاوانەکانی خۆیان ئاراستە دەکەن. بیل سەرنجیان بۆ مانای کارەکەی خۆیان، بە مانای روکەشی سەرکوتکردنەکان، رادەکێشێ، ناچارکردن بە نیشتەجێ بوون و پێشوازی کردن لەلەشکرەکان، دەستبەسەراگرتنی داراییەکان، تاشینی موی سەرو سڕینەوەی مەرجەعە یاساییەکان، دورخستنەوە، دانپیانانەکان و باوەڕپێهێنانی بە زۆر، تاوانگەلێکن تەنانەت دژی دین و بەر لەگەندەڵکردنی مورتەدەکان لەرێ و رەسمی کەنیسەدا، زیان بە دین دەگەیەنێت. ئیلهامەکان دەبێت لەگەڵ روناکی سروشتدا بگونجێن، چونکە ئەم روناکیە خوداییە، و لێرەوە پێوەرێکە کە مانای روکەشی کتێبی

پیرۆز دەبێت لەگەڵیدا بگوجێت. بیل نکوڵی لەدۆگمەکان و بایەخیان دەکات و بەڵگاندنی باوەڕداران ڕەددەکاتەوەو ئەخلاقیبوونی کردار، بە پێوەری ڕەوایەتی دەزانێت. بەلام "جۆری تازەی تەفسیر" بەتەنیا وەلامێکە بۆ دیدی کەنیسەی بالادەست. بیل شێوەیەکی فەلسەفی تایبەت پێشکەشدەکات کە تیایدا شێوەیەکی تری بیرکردنەوە، جێگەی سیستماتیکی فکر دەگرێتەوە. بیل بە ئاماژەکردن بۆ دەزگا کاسۆلیکیەکان لەو ولاتانەدا کە لە کەمایتیدان،داوای گۆڕینی تێڕوانینەکان دەکات. دەزگای کاسۆلیکی تەنها لەجێگەیەکدا بەناوی هەقیقەتەوە بەرگری لەسەرکوتکردن دەکات، کە خۆی فەرمانڕوا بێت. لۆك دەگەڕێتەوە بۆ گۆڕانی دیدی دەسەلات و ئەو هەقیقەتەی بەرگری لێدەکات و ئەوە دەسەلمێنێ کە "هەر کەنیسەیەك بە بڕوای خۆی، مەسیحیەتی پەتییە، و بەبڕوای ئەوانیدیش هەڵەو ئیرتدادە. هەمو کەسێك بڕوایوایە ئەوەی خۆی بڕوای پێیەتی هەقیقەتەو هەرچیەکیش کە جیاوازە لەو، وەك هەڵە مەحکومدەکات" تۆمەتی ئیرتداد هەمیشە دولایەنیەو لەو ڕەوشەوە کە ناکرێ بەشێوەیەکی کامڵ و تەواو، مەسیحیەتی پەتی دەست نیشانبکرێت، کەوابوو گەر مافی سەرکوتکردن بە کەنیسەیەك بدرێت، ئەوا ناچارین هەمان ماف بە کەنیسەکانی دیش بدەین.

جیاوازی بەڵگاندنەکەی لۆك لەگەڵ بیلدا لەوەدایە کە بناغەکەی پەناگای نەزانی و لەهەمانکاتدا ڕەخنەگرتنە لەخۆڕسکی هوشیاری. ئێمە هیچ بیرێکی خۆڕسکمان نیە کە ببێتە هۆی هاودەنگی هەموان لەناسینی زاتی خوداوەنداو، کتێبی پیرۆزیش حوکمگەلێکی تیۆری کەم فێر دەکەن و لێرەوە سەلماندنی ئەو مەسەلانەی پەیوەندیان بە باوەڕەوە هەیە مومکین نیە. بەلگەکاندنی لۆك بۆ نایەقینبوونی مەزهەبەکان لەشوێنێکی دیدا وێنای سێ موستیلە(بۆ سێ مەزهەبە یەکتاپەرستیەکەو) بەبیر دەهێنێتەوە کە لیسنگ ڕونیکردۆتەوە: تەنانەت گەر قبوڵیبکەین کە یەکێك لەمەزهەبە یەکتاپەرستیەکان ڕاستە، مومکین نیە بەدڵنیاییەوە دەستنیشانی بکەین کە ئەو یەکە کامەیە. کەوابوو تەنها پێوەری هەقیقەت لێکبوردنی پەیڕەوانی ئەو مەزهەبەیە. ڤۆڵتێر هەر ئەم بەڵگاندنە بەشێوەیەکی دی دەهێنێتەوە و لەوتاری "لێکبوردن" لەئەنسکلۆپیدیادا (١٧٦٤) ئەوە دەسەلمێنێ کە "ئێمە هەمومان سەرتاپا بێ تواناو هەڵەین"، و داوامان لێدەکات کە "بێ عەقڵیەکانی" یەکدی بەشێوەیەکی







دولایەنە ببەخشین. لێکبوردن لێرەدا بەرلەوەی لەسەر بنەمای کۆمەڵی ئەرك بێت کە ویژدانی مرۆڤ وەك ئەخلاقی سروشتی دەیسپەێنێت، پشتی بە بەهرەی نەزانی مرۆڤ بەستووە کە دەبێتە هۆی پێویستی ناسینی مافی بیرکردنەوە بەشێوەیەکی دی. لێکبوردن، بەهای ئازادی دەباتە سەرو هەقیقەت و بەهای ئەخلاقی عەمەلیش دەباتە سەرو دۆگمەکانەوە.

هەروەها دەکرێت وەك لایبنیتز هونەری دیالۆگ ڕێکبخرێت، یان لەدیدی ستاتیکیەوە تەماشابکرێت. بیل هەمەڕەنگی هەقیقەت بەشێوەیەکی سۆزدارانە دەردەبڕێ: جوانی هاودەنگی دەنگە جیاوازەکان، هیچی لەجوانی تاك خوێندن کەمتر نیە. بەلام ئەگەرچی بیل قسە لەجیاوازی و هەمەڕەنگی لەولاتدا دەکات، بەلام بەڵگاندنی پەیوەندیدار بە ناهوشیاریشەوە لای ئەو دەدۆزینەوە. لەو شوێنەدا کە باسکال ئەم بەڵگاندنەی بە سودی ئەرکی فەرمانبەرداری مرۆڤ دەبینی، خودای نادیاری باسناژ دۆبڤاڵ ڕەوایەتی بۆ وتوێژی گشتی دەهێنایەوە: ئاڵۆزیەکانی کتێبی پیرۆز بەخواستی خودایە، بە قازانجی فرەیی حوکمەکان و مەزهەبەکان و هەروەها بەقازانجی بەرخوردی ئازادانەیانە. لەمڕووەوە دەتوانین بڵێین هەر وتوێژێك، بەرهەمهێنە: ئیرتیدادەکان "ئەنگێزەیەکی سودمەندن" کە هۆکانی هەوڵدان بۆ بەڵگاندن، بۆ لێکۆڵینەوەی ڤولتر و تەفسیری کتێبی پیرۆز، دەڕەخسێنن. ڕوبەڕوبونەوەی دۆگمە مەزهەبیە جیاوازەکان، دەبێتە هۆی ململانێی پەیڕەوانی مەزهەبەکان لەگەڵ یەکدیدا. بەکورتی "وتوێژی زانایان کە قازانجی زۆری بۆ خەڵکی هەیە و زۆر سودمەندە"، دەبێتە هۆی پێشکەوتنی هەقیقەت لەبەرامبەر خورافاتدا و ئەخلاقی پەیڕەوانیش بڵنددەکاتەوە. هەر ئەم بەڵگاندنەش لای هلوتیس و جان ستیوارت میل، ڕەنگدەداتەوە. بە کورتی چیدی بیرکردنەوە بە شێوەیەکی دی مەحکوم بە لەناوچوون نیەو لەکارێکی تاوان ئامێزەوە، دەبێت بە کارێکی سودمەندو دەبێت بە مەرجی پێویست بۆ بەدەستهێنانی هەقیقەت.

بەمشێوەیە زنجیرەەیك بەڵگاندن کە دەوری قبوڵکردنی بیرورا جیاوازەکان و سەلماندانی سودمەندیانی، تەنانەت بۆ خودی هەقیقەت لەئەستۆ گرتووە، دەبێتە جێنشینی بە تاوان زانینی ناهۆشیاری و بە کفر زانینی بیرکردنەوە بەشێوەیەکی دی. مەبەست لەو بەڵگاندنانەی بۆ سەلماندنی لێکبوردن دەهێنرێتەوە کە چیدی بە مانای

موداراکردنی هەڵەی گوناهکارانە نیە، بەڵکو مافی هەمەڕەنگی بیروڕا مەزهەبیەکانە، ئازادبوونە لەوتەزاکانی مەزهەبی پەتی و ئیرتداد. هەنوکە دەبێت تۆمەتی ئیرتداد بۆ ئەو کەسانە بگەڕێنینەوە کە ئەوانی دی سەرکوتدەکەن، نەك ئەوانەی کە دۆگمەکان دەگۆڕن: چیدی جیاوازی بیروڕا تاوان نیە، بەڵکو کردارێکی جیاوازە لەو دەستورە ئەخلاقیانەی کە بە رونی لەکتێبی پیرۆزدا دەربڕاوە یان ویژدانی مرۆڤ ئیلهامیان لێوە وەردەگرێ. کەوابوو ئەرسۆزکسی مانایەکی بنەڕەتی ئەخلاقی پەیدا دەکات، کە عەقڵی عەمەلی رۆڵێکی گرنگتری تیا دەبینێ. پاشان ئایا کاستلێۆن و لۆك و بیل ئەوەیان نەسەلماندووە کە سنوری نێوان ئیرتداد و ئەرسۆزۆکسی بەپێی دیدی ئەو کەسەی دەستنیشانی دەکات، بە تەواوی رێژەییە؟ بەمشێوەیە وێنای "مەزهەبی هەقیقی" دەگۆڕێت، بۆ قبولکردنی رێژەیی دین و باوەڕەکان. ئەزمونی ئازادیە مەزهەبی و بیروڕاکان، دەبێتە جێنشینی مەسەلەی هەقیقەتی دۆگمەکان.

## لەباوەڕەوە بۆ نیەت باشی:

دەکرێ لێکبوردن لەسەر بناغەی مافی پارێزراوی ئازادی بیروڕاو باوەڕ، و هەروەها لەسەر بناغەی هەنگاوە بنەڕەتیەکان دابمەزرێنرێ. بیل و لۆك بەشێوەی جیاواز بەرگری لەلێکبوردن دەکەن: بیل لێکبوردنی عەلمانی، لەمافەکان یان لەئازادی بیروڕا و باوەڕەوە بەدەست دەهێنێت. لۆك سەرەتا جیاوازی لەنێوان دەزگای دەوڵەتی و دەزگا کەنیسەیەکاندا دەکات، پاشان بواری ئازادی باوەڕ و بیروڕای فەردی روندەکاتەوە. لەنێوان ئەم دوو تێڕوانینەدا، چەند رێگەیەکی نێوەندی هەیە کە بەهۆیەوە لێکبوردن وەك شتێکی تەواو عەلمانی دەناسرێ. سەرەتا دەبێت ویژدانی مرۆڤ بەمەرجەعێکی سەربەخۆ بناسرێت و ئازادی پێبدرێت. بابەتی ئازادی بیروڕاو باوەڕ، تەوەرەی گفتوگۆیە لەبارەی لێکبوردنەوە، کە لەسەردەمی بزوتنەوەی ریفۆرمی دینیدا دەستی پێکرد. لەراستیدا مەزهەبی لوسەر بەرگری لەئازادی مەزهەب دەکات کە پاشان ناوی ئازادی بیروڕا و باوەڕ (یان ئازادی ویژدان)ی وەرگرت: بناغەی تیۆرەکەی لۆسەر لەسەر ئەوە دامەزراوە کە لەرێگەی ویستی ویژدانەوە نەبێت، ناکرێ مل بۆ هیچ یاسایەك بدرێت و ئەگەر مرۆڤ ویژدانی نەیار بێت، مەحکوم نابێت بە فەرمانبەرداری لەدەزگا شەرعی و زەمینیەکان. لۆسەر پاشان بووە







لایەنگری کەنیسەی دەوڵەتی. کالڤن بڕوای بەسەربەخۆی ویژدان هەبوو (کە دەبێت لەعەقڵ بە جیا بزانرێت کە بەهۆی کەوتنە خوارەوەی مرۆڤەوە، بەرەو گەندەڵبوون چووە) و لەهەمانکاتدا کتێبە پیرۆزەکانی، بە پێوەری کۆنکرێتی باوەڕ دەزانی. هەمووان دەستیان بە کتێبە پیرۆزەکان کە زۆر سادەو مەفهومن دەگات، ئەم کتێبانەش دەبێت بۆ هەر ویژدانێك بە پێوەری هەقیقەت دابنرێ.

پاشان کاستلێۆن و بیل و باسناژ دۆبۆڤات بابەتی ئازادی بیروڕاو باوەڕ درێژە پێدەدەن، بەڵام تا رادەیەك دەستکاریدەکەن. ئەمان حوکمی ویژدان لەحوکمی کتێبی پیرۆز بە بەرزتر دادەنێن. کاستلێۆن خوازیاری ئەزمونکردنی بێ قەیدو شەرتی کتێبی پیرۆزە بەهۆی عەقڵەوە: عەقڵ بەو شێوەیەی کالڤین دەڵێت، بەهۆی گوناهی سەرەتاییەوە بەتەواوی گەندەڵ نەبووە، بەڵکو چرایەك رێنماکردنی هاوبەشە کە توانای ئەوە بە مرۆڤەکان دەدات کە لەکتێبی پیرۆزدا، تێزی پێویست و روون بۆ ئازادی بدۆزنەوە. بیل، عەقڵ بە پێوەری هەمووان و رێسایەکی خۆڕسك دەزانێت بۆ جیاکردنەوەی راست و هەڵەو چاکەو خراپە. بیل هەروەها پشتیوانی لەمافەکانی ویژدانی تاکەکان لەبەرامبەر دەسەڵاتی کەنیسەی رۆمو لەبەرامبەر ئەو مەرجەعیەتەی کە بۆ کتێبی پیرۆزیان داناوە، دەکات: حوکمەکانی کتێبی پیرۆز دەبێت بە عەقڵدا تێپەڕێت بۆئەوەی بە رەوا بزانرێ. ئیلهامە سروشتیەکانی مرۆڤ کە لەشکڵی بەدیهییە ئەخلاقیەکاندا، راستیە بنەڕەتیەکانمان دەخاتە بەردەست، لەهەر مەرجەعێکی دی بڵندترە: روناکیە خوداییەکانن کە دەرونی ئێمە روناك دەکەنەوە، تەلقینگەلێکی نەوتراون کە خودا بەهۆیەوە یەکەم بنەماو ئەرکەکان، فێری مرۆڤەکان دەکات. گشتیبوونی ئەرکی فەرمانبەرداری لەویژدان، بناغەی مافی بەرامبەری ویژدانەکانەو رێگەدەدات کە هەر کەسێك ئەرکی فەرمانبەرداری لەحوکمی ویژدان لەبەرامبەر ئەوانی دیدا، قبوڵبکات. ناچارکردن لەدیندا چەند ناڕەوایە، هێندەش ناکاریگەرە. بەڵام مافەکانی ویژدان بێ بناغە نیە، بەڵکو ویژدان ئەرکیشی لەئەستۆیە: هەرکەس دەبی پەیڕەوی لەویژدانی خۆی بکات، چونکە ویژدان شتێکی خوداییە. بیل ئەگەری سەرکوتکردن و ئازار و ئەشکەنجەدان مەحکومدەکات و لێکبوردن لەسەر بناغەی کۆمەڵی ماف دادەمەزرێنێت کە هەر ویژدانێك خاوەنێتی، لەبەرئەمەیە کە بڕوایوایە ویژدانەکان ئەرکێکیان لەئەستۆیە و بایەخ و دەسەڵاتیان

لەدەسەڵاتی خوداوەندەوە هەڵدەقوڵێت.

تێڕوانی بیل ئەو قازانجەی هەیە کە "مافەکانی ویژدانی گوناهکار"یش دەهێنێتە پێشێ، بەمشێوەیە لەبنەڕەتدا لەگەڵ هەموو بیرێکدا ناکۆکە کەهەڵە بە تاوان دەزانێت یان هۆی نەزانی وەك ئەنگێزەی ئیرتداد قبوڵنەکات. لەراستیدا مافەکانی ویژدان کە بیل بەرگری لێدەکات، دەبێت بۆ هەموو ویژدانێك بێت، لەوانەش ویژدانی تاوانبار. مرۆڤەکان تەنها یەك پێوەری زیهنیان بۆ دەست نیشانکردنی هەقیقەت هەیە، کە ویژدانیانە و ناچارن ئەوەی ویژدانیان بە دروستی دەزانێت، قبوڵبکەن. ئەو چەمکی ویژدانەی بیل و بەشێوەیەکی دی لۆك رونیدەکەنەوە، جۆرێك زیهنگەری مەزهەبیە: راست دینی (یان مەسیحیەتی پەتی) زۆرتر باوەڕو راستگۆیی وەفاداریە تا دۆگماییەت. تەنها ئاماژەی هەستپێکراوی، هەستی دەرونی کەسە. مەسەلەی هەقیقەتی راست دینی لەپلەی دوهەمدا دێت، یان باشترە بڵێین زۆرتر پەیوەندی بەو کەسەوە هەیە کە قبوڵیدەکات. هەڵە لەورووە کە پەیوەندی بە بڕوای تایبەتی مرۆڤەوە هەیە، ناتوانرێت بە تاوان بژمێرێت، و تایبەتیبوونی بڕوا، مافی رەها بۆ ویژدانی مرۆڤ دروستدەکات، بۆئەوەی هەر باوەڕێك کە بەراستی بزانێت، قبوڵیبکات. بێباکی کە تەوەرەی سەرەکی تۆمەتبارکردنی بێدینی بوو، چیدی بە بنەمایەکی نەگۆڕ بۆبیروڕای تاکەکان ناژمێرێت: ئەگەر تەنها ئەوە خودایە کە دەتوانێت دڵی مرۆژەکان بخوێنێتەوە، کەوابوو هیچکەس ناتوانێت لە راستی و دروست بیرکردنەوەی کەسانی دی بەیەقین بگات، بەڵام دەبێت گریمانەکە لەسەر ئەمە دانێت. کەوابوو دەبێت هەندێك ماف بۆ ویژدانە خراپەکارەکان و بەشێوەیەکی گشتی بۆ هەموو ویژدانەکان، دابنرێت. چونکە سەلماندنی رەهایبوونی هەقیقەتی دیار، بۆ ئێمە مومکین نیە. ئەو ویژدانەی بە نیەت باشیەکی تەواوە، هەڵەدەکات، دەبێت خاوەن هەموو ئەو مافانە بێت کە کە هەر ویژدانێکی دروستکار، خاوەنێتی. بەمشێوەیە بیل رێسایەکی زیهنی بۆ راستگۆبوون و راستی دەکاتە ئەڵتەرناتیڤی رێسای بابەتیبوونی هەقیەقەتو لەئەنجامدا مەسەلەی نیەت باشتی دەکاتە ئەڵتەرناتیڤی مەسەلەی باوەڕ.

بەمشێوەیە گشتیبونی ئەرکی فەرمانبەردای لە ویژدان، دەبێتە بناغەیەك بۆ ئازادی مەزهەبی. بەڵام ئایا حاڵەتی وا نایەتە پێشێ کە هەر ئەم ویژدانە، ببێتە هۆی







هەڵەی ئەخلاقی؟ بەدەربڕینێکی تر چۆن دەکرێت بێ ویژدان، بیر لە ئازادی ویژدان بکرێتەوە؟. ئەگەرچی بیل بوونی نیەتی خراپ بە شتێکی ئەستەم نازانێت، بەڵام کانت ئەرکی پەیڕەویکردن لە ویژدان وەك "زانینێك کە دەبێتیە" شیدەکاتەوە. ئیلهامە مەزهەبیەکان یان دەسەڵاتە کەنیسەییەکان ناتوانن جێگەی هەقیقەتی ویژدانی بگرنەوە" ناتوانرێ یەقین سەبارەت بە هەقیقەتی دۆگمە مەزهەبیەکانو نەریتە دینیەکان بەدەستبهێنرێت. ناسینی یاساکانی ئەخلاق و ئەرکی فەرمانبەرداری بێمەرج لەو یاسایانە، ویژدان دەکاتە داوەری راستی کرداری مرۆڤ.

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا مەسەلەی لێکبوردن کۆتایی پێنایەت. دەتوانین جارێکی دی بە تاوتوێکردنی سنورەکانی لێکبوردن کە تەنها لەسەر بناغەی مافەکانی ویژدان بێت، باسەکە بەشێوەیەکی دی بهێنێنە ئاراوە. ئەم مافانە بەر رێگرێك دەکەون کە سیاسی و یاساییە. ئەگەر بەڕاستی دەبێ پێش هەموو شتێك پەیڕەوی حوکمی ویژدان بین، ئایا _وەك هۆبز سەرنجی بۆ چوو_ مەترسی بەناڕەوا زانینی کردار بە ئەرکی فەرمانبەردای عەلمانی نایەتە پێشەوە؟ ئەمەش جارێکی دی گۆڕانی دەسەڵاتە بە دەسەڵاتێکی دی، دانانی دەسەڵاتی ویژدان یان خودایە، لەبەرامبەر دەسەڵاتی فەرمانڕوادا. ئەم وتوێژەش بەتوندی سیاسیەو ئەو چەمکانەش کە ئازادیگەری سیاسی و ئابوری دروستیکردووە، ئامێرەکانین. لەم وتوێژەدا تاوتوێی ماف و ئەرکەکانی دولایەنەی فەرامانڕەوا و هاوڵاتیان، و هەروەها سنوری رەوای دەستێوەردانی فەرمانڕەوا لە کاروباری تاکەکاندا، دەکرێت. لێرەوە کەمتر سەرنج لە باوەڕی دەرونی و ویژدانی تاکەکان دەدرێت، و زۆرتر سەرنج لە پێگەی لەناو بەکارهێنانی دەزگاکانداو دیاریکردنی سنوری بواری گشتی و بواری تایبەتی دەدرێت. لەگەڵ ئەمەشدا مەسەلەی مافی جیاوازی بیرکردنەوەی مەزهەبی، جێگەی خۆی بەهاوبەشی بەرژەوەندی تایبەتی و گشتی لە پەیوەندیدا بە ئازادی بازرگانیەوە دەدات. ئەم ئازادیە رێك لەبەرئەوەی سەروکاری لەگەڵ سیاسەتدا نیە، وەك باشترین هۆکار بە قازانجی فرەیی لەبواری بیروڕادا، دەردەکەوێت

## سیستەمی سیاسەت، بێدینی لەگەڵ فەزیڵەتدا

ئایا کاتێك یاساکانی حکومەت ناکۆك بێت لەگەڵ حوکمەکانی ویژدانی مرۆڤدا، دەکرێ بەشێوەیەکی رەوا سەرپێچی لێبکرێت، و بە ناوی ئەوەی کە زۆردارانە و ستەمکارانەن، بێبیاخ بکرێن؟ لۆك ئەم مەسەلەیە بەرونی بەمشێویە دەردەبڕێت: ئازادی بیروڕاو باوەڕ زیاتر پەیوەستە بە هەست وسۆزی مەزهەبی مرۆڤەوە، کە بتوانرێت بکرێت بە بناغەیەك بۆ لێکبوردن. ئەو زیهنیەتەی خواستی ئازادی بیروڕا و باوەڕ لەژێر کاریگەریەکانیدایە، دەتوانێت بگۆڕێت بۆ هۆکاری هەڵوەشاندنەوەی پەیوەندیەکانی کۆمەڵگا. ویژدان ناتوانێت مەرجەعی دەستنیشانکردنی ئەرکی خەڵکی بێت.

لۆك مەسەلەی عەلمانیکردنی بواری گشتیو سپاردنی مەزهەب و باوەڕ بە بواری تایبەتی دەهێنێتە پێشێ، و لێکبوردن مانایەکی تازە پەیدا دەکاتو عەلمانی دەکرێت. بەمشێوەیە مەرجی جیابونەوەی کەنیسە لەدەوڵەت، بەسەرنجدان لەو دەورانەی هەریەکێك لەو دوانە هەیەتی، ئەو ئامانجانەی کە بەدوایەوەن، و ئەو هۆکارانەی لەبەردەستیاندایە، بۆ لێکبوردن بە پێویست دەزانرێت، دەوڵەت ئەنجومەنێکە کە دەرئەنجامی رێکەوتنی مرۆڤەکانە بۆ پاراستنی بەرژەوەندیە دنیایەکانیان، و بۆ ئازادیو موڵکایەتی سامان، کۆیان دەکاتەوە. سنوری دەسەڵاتی فەرمانڕەوایان ئامانجێك دیاریدەکات کە پاڵنەری دروستبوونی دەوڵەت بووە" فەرمانڕەوایان کە هەم هێزە گشتیەکانیان لەبەردەستدایە، دەبێت سزای هەموو دەستدرێژیەك بۆ یاساکانو بەرژەوەندیە دنیاییەکانی نەتەوە بدەن، بەڵام ناتوانن نە یاسا بۆ بیروڕا مەزهەبیەکانیان دابنێن، نە دەسەڵاتی ئەوەیان هەیە (هیچکەس تەنانەت بیروڕا ویژدانیەکانی خۆشی لەدەستدا نیە)، و نە مافی ئەوەیان هەیە: دۆگمە تیوریەکان لە بواری بەرژەوەندیە زەمینیەکانی نەتەوەدا، هیچ حوکمێکیان نیە. لێرەوە خەڵکی بەتەواوی خاوەن ئازادی مەزهەبو باوەڕن. لۆك کەنیسەکان وەك ئەنجومەنی تایبەتی دەناسێت کە ئامێرەکانی تەنها پەروەردە، قەناعەت پێکردن یان دەرکردنە لە ئەندامێتی کەنیسە: تەنها سەرقاڵی کەنیسەکان، رزگاری دەرونی باوەڕدارانە. کەوابوو ئازادی خەڵکی لەبواری بیروڕا مەزهەبیەکاندا، لەگەڵ ئەرکی فەرمانبەردای لەیاساکان







گونجاوە، و بەرژەوەندی گشتی بەپێوەری لێکبوردن دەناسرێت: تەنها بەرەچاوکردنی ئەم بەرژەوەندیانە، دەکرێت رێساگەلێك بۆ چاکەو خراپە دابنرێت. هەروەها فەرمانڕەوا دەتوانێت کەنیسەیەك کە بڵاوکەرەوەی کاروکردەوەگەلێکی ناکۆك بە بەرژەوەندی هاوبەشی هەموانە، قەدەغەبکات. ئەم بەڵگاندنە زۆر راست دەردەکەوێت، لۆك تەنانەت سنوری لێکبوردن بەم بەڵگاندنە دیاریدەکات: فەرمانڕەوا نە دەتوانێت لەگەڵ ئەو کاسۆلیکانەدا لێکبوردوو بێت کە لەبری فەرمانڕەوای عەلمانی، پەیڕەوی لە پاپا، واتە میرێکی بێگانە دەکەن، نە لەگەڵ ئەو بێدینانەدا کە نکوڵی لە بوونی خودا دەکەن، و وەفادار نین بەو پەیمانانەی کە بێگومان بنەماو بناغەی کۆمەڵگا پێکدەهێنن. کەوابوو مەسەلەکە ئەوەیە ئەو بڕوایانەی لەدیدی دەوڵەتەوە پێویستن، وئەو بڕوایانەی بۆ دەوڵەت گرنگ نین، دیاریبکەین. لەمبارەیەوە مەسەلەی ئەخلاق جێگەیەکی ناوەندی هەیە: ئایا هەندێك لەباوەڕەکان کارکردن بۆ فەزیڵەتێك کە بۆ چاکسازی کۆمەڵگا ناچاریە، سنوردار ناکات؟ هەموو بیروڕاکان بێلایەنو تایبەت نین بە بواری تایبەتی تاکەکەس. رۆسۆش وەك لۆك بێدینی مەحکومدەکات، بەڵام مەزهەب تایبەت بە بواری تایبەتی نازانێت. بەپێچەوانەوە بەبڕوای رۆسۆ مەزهەب لەوشوێنەدا کە دەبێتە هۆی فەزیڵەتی هاوڵاتیان، سەر بەبواری گشتیە. مەزهەبی عەلمانی بەدروستکردنی پەیوەندی لەنێوان مرۆڤەکاندا، وەك نمونەیەکی خەیاڵی و سۆزداری مۆری سەلماندن لە سازشێکی عەقلانی دەدات کە دروستکەری پەیمانی کۆمەڵایەتیە. مەزهەب پیرۆزی پەیمانی کۆمەڵایەتی بەهێزدەکات. دەوری سەرەکی مەزهەب خزمەتکردنی مەدەنیەتە لەرێگەی پابەندکردنی هاوڵاتیانەوە، بە ئەرکە ئەخلاقیەکان.

بیل لەبەرامبەر ئەوەدا کە جۆن ستیوارت میل ناوی دەنێت دەستوەردانی نارەوای دەوڵەت لەبواری تایبەتی خەڵکدا، وێنەی مرۆڤی خوانەناسی پاکی دانابوو. بەبڕوای بیل بێدینی ئەگەر لەسەر بناغەی سۆزداری و بەرژەوەندیەك بێت کە پەیڕەوکردنی فەزیڵەتێکی کۆمەڵایەتی بەرهەمبهێنێت، ناکۆك نیە لەگەڵ کۆمەڵایەتیبوندا. ئەگەر ئارەزوی مرۆڤەکان پتر رووی لەوە بێت کە پەیڕەوی لەهەستەکانی خۆیان بکەن تا فەرمانە ئەخلاقیەکان، _تەنانەت گەر فەرمانەکان لەویژدانیانەوە بەرهێنرابێت_ لەم حاڵەتەدا ئیدی دادپەروەری خودایی بوونی نابێت، تاکو ببێت بەهاندانی کرداری

چاك. فەزیلەت دەرئەنجامی خواستی قەدرزانی ئەوانی دیە لە ئێمە، دەرئەنجامی عیزەتی نەفس و بەرژەوەندی تایبەتی ئێمەیە. فەزیلەت رەزامەندیەکی رۆحی دەهێنێت کە تایبەتە بە رەچاوکردنی "یاساکانی شەرەفو شایستەیی". مرۆڤی بێدینیش وەك مەسیحی یان باوەڕدار بە دینە کۆنەکان، خاوەنی ئەخلاقی خودی و سروشتیە، بێدینی دەتوانێت لەگەڵ پاکێتیدا کۆببێتەوە، چونکە تەنها مەزهەب پاوانی رێسا ئەخلاقیەکانی نەکردووە. چیدی بەم مانایە بێدینی بەناوی ئەوەی دژی کۆمەڵگایە، شایەنی مەحکومکردن نیە، و دەکرێت لێکبوردن تەنانەت بۆ بێدینەکانیش بەکارهێنرێت.

## بازرگانی دارایی و بازرگانی بیروڕا

دەشێت بیروڕاکان کاتێك بەرەو بواری تایبەتی پاڵ پێوەدەنرێن، لەوکاتەدا کە لەگەڵ یەکدا ئاڵوگۆڕ دەکرێن، شێوەی رای گشتی وەربگرن. لەمڕووەوە دەکرێت ئازادی بازرگانی لەگەڵ ئاڵوگۆڕی بیروڕاکانو مافی بڵاوبونەوەی بیروڕاکاندا بە پێکەوەبەستراو بزانرێن. ئەم بەڵگاندنانە تادوا سنور ئازادیخوازانەیە. لێکبوردن لەم مانایەدا، دەبێت بەسیستەمێکی ئاڵوگۆڕ: ڤۆلتێر لەوتاری **"ویژدان" لە زاراوەنامە فەلسەفیەکانی** خۆیدا سودی بازرگانی ئەکاتە ئەڵتەرناتیڤی مافی ئازادی بیروڕاو باوەڕ، و هەروەها دەیکاتە ئەڵتەرناتیڤی مافی پاشا بۆ یاسادانان لەبارەی بیروڕاکانەوە. سودی بازرگانی قازانج بە ئازادی بیروڕا دەگەیەنێت، چونکە هاوئاهەنگە لەگەڵ بەرژەوەندیەکانی دەوڵەتدا، لەهەمانکاتدا ئازادی بیروڕاو باوەڕ لەڕوانگەی بەرژەوەندی گشتیەوە، دەگۆڕێت بۆ مەسەلەیەکی بێلایەن. "هیلۆتیوس"یش بڕوایوایە ئازادی رادەربڕین لەسەر بناغەی بەرژەوەندی گشتی دامەزراوە. بەبڕوای هیلۆتیس ئازادی دەربڕین هۆکاری بڵاوبونەوەی هەقیقەتە، و یارمەتی رونبونەوەی تاکەکان دەداتو ئەگەری پێشکەوتنی مرۆڤ دەڕەخسێنێت. جۆن ستیوارت میلیش پشت بە قازانجی ئەبستمۆلۆجی لێکبوردن دەبەستێت و دەڵێت: لەراستیدا رێگەگرتن لەهەر بیروڕایەك، لەگەڵ مەحرومکردنی مرۆڤایەتی لە هەقیقەتێك، یان (ئەگەر ئەو بیروڕایە راست نەبێت) بە مەحرومکردنی مرۆڤ لە "دەرککردنی رونتر و کاریگەری زیاتری هەقیقەت کە لەبەرکەوتنیدا بە هەڵە





بەرهەمدێت"، شتێك لەمرۆڤایەتی دەدزێت (لەبارەی ئازادیەوە.لا١٣٦). بیروڕای گشتی کاتێك فۆرمەلەبوو، جێگەی دادوەر یەیدادەکات، جا مەسەلەیەکی وەك روداوەکەی کالاس لەئارادا بێت، یان هەر بابەتێکی دی کە ناکۆکی نێوان لێکبوردن و دەمارگیری، دەوریان تیاییدا هەبێت.

لێکبوردن لە کیشەیەکی مەزهەبیەوە دەگۆڕێت بۆ کێشەیەکی ئابوری و لێرەوە مەسەلەی هەقیقەت دەبێتە لقێکی مەسەلەی ئابوری و سودبەخشی، و لێرەوە ئازادی بازرگانی لەگەڵ ئازادی بیروڕاو باوەڕ و مەزهەبیەکاندا لێکدەئاڵێن. لەمڕووەوە شاری ئەمستردام نمونەیەکی بەرجەستەیە. ئەو ستایشەی سپینۆزا لە "وتاری مەزهەبی_فەلسەفیدا" لەم شارەی دەکات، مانایەکی ئازایخوازانە وێنە دەکات کە لەسەر بناغەکەی، ئاڵوگۆڕی ئازاد، دڵنیاترین رێگرە لەدەستیوەردانە نابەجێکانی دەوڵەت و دەزگاکان (چ زەمینی یان شەرعی) لە مەسەلە تایبەتیەکانی هاوڵاتیاندا. ئایا ماکس فیبەر بازرگانی سودخوازانەی بەهۆکاری لێکبوردن لەبەرامبەر ئاراستەی توندی پاکێتی گروپی کالڤینیو باپتیستەکاندا، بەرەچاوکردنی بەرژەوەندیەکانی دەوڵەت نەدەزانی؟ ئەوەی کە بازرگانی دارایی بەقازانجی بیروڕاکانە، مەسەلەیکی کۆنی باوە، بەڵام ئەم مەسەلەیە لای ڤۆلتێر مانایەکی تایبەتی هەیە. ڤۆلتێر چیدی بیروڕاو باوەڕە مەزهەبیەکان بە مەسەلەیەکی تایبەتی نازانێت، بەڵکو لە بواری شتە بێلایەنەکاندا (نە گشتی و نە تایبەتی)دا دایاندەنێت.

لەگەڵ ئەمەشدا بەرگریکردن لە ئازادی وتن و بیر، تەنها بە پشتبەستن بە بەرژەوەندیە تایبەتیەکان ناکرێت.سپینۆزا پیشانیدەدات کە بەرژەوەندی تایبەتی لەگەڵ بەرژەوەندی گشتیدا ناکۆك نیە. تاکەکان بەهۆی پەیمانی کۆمەڵایەتیەوە چاو لەمافە سروشتیەکانی خۆیان بە قازانجی فەرمانڕەوایەك کەدەسەڵاتی هەموانی بەیەکەوە لەدەستدایە، دەپۆشن. بەڵام دەسەڵاتی رەهای ئەم فەرمانڕەوایە لەگەڵ مافی دەربڕین و بیرکردنەوەدا ناکۆك نیە. لەراستیدا ئەم مافە بەهیچ شێوەیەك قابیلی سپاردن بەهیچ کەسێك نیە، چونکە ئەم مافە بەشێکە لە سروشتی تاکەکان، واتە دەرئەنجامی هەستەکانیانە، و ناکرێت چاوپۆشیان لێبکرێتو هەروا مرۆڤ بمێنیتەوە. کەوابوو هیچ فەرمانڕوایەك توانای حوکمڕانی بەسەر دەروونو زمانی هاوڵاتیانی خۆیدا نیە. سپینۆزا لەمڕووەوە جیاوازی لەنێوان گوتار و کرداردا دەکات.





بۆ گۆتار تائەو شوێنەی وروژێنەری یاخیبوون نەبێت، ئازادی تەواو قبوڵدەکات، بەڵام لەبارەی کردارەوە چەند سنورێك قبوڵدەکات. رەخنەکردنی یاساکان تەنانەت دەکرێ بۆ خودی یاساکانیش سودمەند بێت، بەڵام تائەوە کاتەی فەرمانڕەوا یاسایەکی نەگۆڕیووە، دەبێ هەموان پەیڕەوی لێبکەن. بەمشێوەیە ئازادی بیروڕا هیچ مەترسیەکی بۆ دەوڵەتو وڵات نیە، بەڵکو مەرجی هێمنیو ئاسایشێتی.

تائێرە هێشتا لەچەمکی مافەکانی مرۆڤەوە دوریین کە بنەمای ئازادی ڕا دەربڕین، بەمافێکی هەمیشەییو دەرئەنجامی مافە سروشتیەکان دەزانێت. بەڵام ئەم مافە بەهیچ شێوەیەك لەگەڵ دەسەڵاتی تاکەکاندا یەکسان نیە، بەڵکو مافێکی عەقلانیە کە بناغەی کۆمەڵێك مافو ئەرکی بەلگەنەویستە، و لەحاڵەتێکدا فەرمانڕەوا سەرپێچیان لێبکات، تاکەکان مافی ئەوەیان هەیە، سەرپێچی لێبکەن. ئەو رێگرانەی لەساڵی ١٧٨٩ (شۆڕشی فەرەنسا) لەسەر ڕێی شکڵبەندی ئەم مافەدا ڕاوەستاوە، بێ پەیوەندی نیە بەلێکبوردنەوە. لەوانە رابۆ سن_ئیتین لێکبوردن مەحکومدەکات، بۆئەوەی باشتر بەرگری لە یەکسانی خەڵك لەبەرامبەر یاسادا بکات: لێکبوردن وەك گوتمان زۆرتر جۆرێك چاوپۆشیە لە هەڵە یان خراپەکاریەکانو ناکرێت بە یەکسانی مافەکانی هاوڵاتیان بزانرێت. لێکبوردن بەرلەوەی سەلماندنی یەکسانی مافەکانی هەموان بێت، سەلمێنەری نەبوونی مافێکە.

## چونیەکی و فرەیی کلتوری

مەسەلەی لێکبوردن بواری مەزهەبی_سیاسی بەجێدێڵێت و دەچێتە ناو بواری تازەترەوەو پەرەدەستێنێت. بەمشێوەیە لیو شتراوس سەرنج لەو رەهەندەی ئەم چەمکە دەدات، کە لەبنەڕەتدا کێشەئامێزە: ئەگەر لێکبوردن بۆ ئەوەی ببێت بەشتێکی پراکتیکی، دەبێت سنورێکی دیاریکراوی لەگەڵ ئەو شتانەدا هەبێت کە قابیلی لێبوردن نین، نەبوونی سنوری سروشتی لە تێزی لێکبوردندا دەبێتە هۆی مەحکومکردنی وەك مێژووگەری کە بۆ هەڵسەنگاندنی مافە پۆزەتیڤەکان، بایەخێکی رەهای نابێتو لێرەوە پشتبەستن بەمافی سروشتی بۆ دارشتنی بەهاکان، دەکاتە شتێکی پێویست. جێگرتنەوەی مافی سروشتیو مێژوویی، بیرۆکەی لێکبوردن بەو بیانوەی کە لەسەر بناغەی خۆی دانەمەزراوە، بێبایەخ دەکات. ئەگەر لەروانگەی





لیبڕالیەوە تەماشای لێکبوردن بکەین، دەکرێت ئاراستەکەری باروودۆخێکی دەسەڵاتخوازانە بێت. لەگەڵ ئەوەشدا کە ڤۆلتێر بیروڕاکان لەروانگەی ئازادی بازرگانیەوە بەمەسەلەیەکی بێلایەن دەزانێت، بەڵام ئایا دەبێت لەگەڵ نایەکسانیە کۆمەڵایەتیە_ ئابوریەکان وەك خراپیەکی زەروری، یا وەك رویەکی تری ئازادیەکی بێسنور، لێبوردو بین؟ لەم حاڵەتەدا لێکبوردن هەڵوێستێکی بێلایەن دەبێت کە بە وتەی مارکیوز دەچێتە خزمەت تونوتیژیەوەو زەمینەیەکی گونجاو بۆ لێکنەبوردن دەرەخسێنێت.

ئەوکاتە ئیدی سودخوازی سیستەمی بازرگانی، جیاوازی بواری تایبەتی و گشتی، یا سەرنجدان لە هێزی خەڵکی، نابێتە بناغەی بیرۆکەی لێکبوردن. راولز هەوڵیدەدا لێکبوردن لەسەر بناغەی یەکسانی سەرەتایی تاکەکان بونیاد بنێت کە لە "سەرپۆشی نەزانیدا" پەیمان لەگەڵ یەك دەبەستن. لێکبوردن ناکۆك نیە لەگەڵ یەکسانیدا، بەڵکو خاڵێکی پشتبەستنی تیا دەدۆزێتەوەو دەبێتە بەشێك لەخودی تیورەی دادپەروەری. دەوری دەوڵەتیش گۆڕانی بەسەردا دێت: دەوڵەت دەتوانێت دەستخاتە کاروباری تاك و کۆمەڵەکانەوە، بۆئەوەی هاوسەنگی دولایانەیان لەپارێزگاریکردن لە فرەیی کۆمەڵگا جێگیربکات. بەڵام ئایا لەم حاڵەتەدا دەوڵەت هەروا بێلایەن دەمێنێتەوە؟ داواکردنی فرەیی لەدەوڵەت و لەهەمانکاتدا بێلایەنی، کارێك نیە بەئاسانی ئەنجامبدرێت. ئەگەر دەبێت دەوڵەت هەندێکجار بەقازانجی هەندێك گروپ، یان بەمەبەستی پارێزگاریکردن لە هاوسەنگی پەیوەندی نێوان گروپەکان دەستکاریبکات، ئەو مەترسیەی هەیە کە بێلایەنی خۆی لەدەستبدات. بەپێچەوانەوە ئەگەر دەوڵەت بێلایەن بمێنێتەوە، جیاوازی بیروڕاو باوەڕەکان یان گروپەکان لەکۆمەڵگای مەدەنیدا، دەکەونە مەترسیەوە. نیگڵ بەمشێوەیە کێشەی مەسەلەی لێکبوردن و سنورەکانی دەهێنێتە پێشێ. لەوتاری بەسودی نەتەوەگەریشدا رەخنە لە ئازادیگەری دەگرنو لێکبوردن لەسەر بناغەی مافی نەتەوەو کەمایەتیەکان دادەمەزرێنن، نەك لەسەر بناغەی قبوڵکردنی مافی تاکەکانو لەپێشبوونی تاك بەسەر گروپدا. فرە کلتوری واقعی توشی دژایەتیەك دەبێت، کە لەلایەك دەرئەنجامی سیاسەتەکانی شوناسە بۆ ناسینەوەی جیاوازیە کلتوریەکانی گروپە کۆمەڵایەتیەکان کە لەساڵاکانی ١٩٦٠ی میلادیەوە، خواستی کەمایەتیەکان (رەشەکان، هاوجنسبازان،

ژنان‌و..بە تایبەتی لەویلایەتە یەكگرتوەكانی ئەمەریكا) بووە، لەلایەكی دیەوە (بۆ نمونە لە فەڕەنسا) دەرئەنجامی لۆژیكێكی ئازادیگەرانەیە كە مافەكانی تاك بەپێشتر لەمافەكانی گروپ دەزانێت (شێوەی سیاسی دەوڵەت_نەتەوە نمونەیەكی بەرجەستەی بیرۆكەی هاوڵاتیبوونە لەسەر بناغەی جیابونەوەو تەنانەت رزگاربوونی تاك لە كۆتی ئەو گروپانەی لەناویدا دەژی). ئەگەر چەند كلتوریی تەنانەت لەنەریتی ئازادیگەریدا، جۆرێك راوەستانە كە رووی لەراكێشان و توانەوەی تاكەكانە لەناو كلتوری باڵادەستدا، ئەوا گۆڕانكاریەكانی دوایی پرسی لێكبوردن بەشێوەیەكی تازە هێناوەتە ئاراوە. مایكل ڤالترز لەمڕووەوە بیر لە لێكبوردنی پۆستمۆدێرنانە دەكاتەوە كە شوناس‌و جیاوازی گروپەكان دەسەلمێنێت، بەڵام لەهەمانكاتدا بەشێویەكی شاراوە تاكەكان ناچاردەكات، كە لەگەڵ بەشێكی هەرچی گەورەتردا چونیەك بن. پەیوەستبوونی تاك بە بوارە جیاوازەكانی شایەستەیی كلتوری، لەهەمانكاتدا مەرجی ئازادی و شێوەی نوێی لێكبوردنە.

مەسەلەی فرە كلتوریی لەئاستی نێونەتەوەیشدا لەئارادایە. رەخنەی سەنتەریزمی نەتەوەیی بەهۆی زانستی مرۆڤناسی هاوچەرخەوە، نكوڵی لەو بیرۆكەیە كردووە كە دەشێت لەنێوان كلتورەكاندا زنجیرە پلەیەك هەبێت. چونكە هەر كلتورێك بەشێویەكی تایبەتی سەربەخۆ لەو دیاردە یان پێوەرە بێگانانەی كە دەتوانن كاری لەسەر بكەن، پەرەدەستێنێت. ئەم رەخنەیە بەرگریكردنە لەیەكسانی كلتورەكان. بەڵام قبوڵكردنی مافی یەكسانی كلتورەكانیش لەدیدی گەردونیانەی بەرهەمی قوتابخانەی هیومانیست‌و رۆشنگەریەوە رەخنەكراوە، كە بەپێچەوانەی ئەم روانینەوە، بڵاوكەرەوەی بیرۆكەی مرۆڤایەتیەكە كە رێكخەری كۆی مافەكانی مرۆڤە وەك بڵندكەرەوەی خەسڵەتە كلتوری‌و مێژوویی یان كۆمەڵایەتیەكان. بێگومان ناكۆكی لێكبوردن لەگەڵ هەندێك شێوەی قۆتابخانەی هیومانیستیدا، سەیر دێتە پێشچاو. ئایا سەلماندنی خەسڵەتە كلتوریەكان‌و بەرگریكردن لەدیدی كلتورگەر، ناتوانێت بەو بنەما وێنەیانەی دروستیدەكات، بە بەهانەی قبوڵكردنی مافی بۆ هەموو تایبەتمەندیەك، رێگە بە تونوتیژترین شێوەكانی لێكنەبوردن بدات، و بگۆڕێت بۆ دژەكەی؟ رەنگە بەپێچەوانەوە بكرێت لەدیدی چونیەكی سەرتاپاگیرو گەردونیەوە، ئەو رەخنەیە بكرێت كە دەوری كلتورو مێژووو ناچاریەكانی







فەرامۆشكردووە، و دایاندەپۆشێت. لەكاتێكدا هەر ئەم شتانەیە مرۆڤەكان وەك بەرهەمی زنجیرەیەك كاروكردەی كۆمەڵایەتی‌و مێژوویی، بەشێوەیەكی ناچاری جیاواز لەیەك دەكات (هەروەها رەخنە لەچەمكی چونیەكی گەردونی و سەرتاپاگیر گیراوە كە خۆشی لەرووی مێژوویی‌و كلتوریەوە، جەبریە). لەگەڵ ئەمەشدا بەبیروڕای لیڤی شتراوس فۆرمەلەبونی مرۆڤایەتی و هەروەها ئەگەری پێشكەوتنی، بەستراوە بە پشتگیری لە كلتورە جیاوازەكان، و دەوری مەرجەعە نێونەتەوەیەكان رێك ئەوەیە كلتورە جیاوازەكان لەیەك نزیكبكەنەوە، بێئەوەی هیچ شێوە كلتورێكی تایبەتی بەلاوە لە شێوەكانی تری كلتور پێ باشتر بێت.

ئەو مانا جیاوازانەی بۆ لێكبوردن پێشكەشكراوە، ئاڵۆزیەكانی لەناونابات. ئەگەرچی دڵنیا نین كە توانیومانە دەست لەدوو حاڵەتی تواندنەوەی ناچاری تاكەكان (لەكلتورێك‌و كۆمەڵگایەكدا) یان دەركردنیان، هەڵبگرین، بەڵام لەهەموو حاڵەتەكاندا لێكبوردن زەروەرتێكی عەقلا نیە، و مەرجێكی داناییە و چیدی ئیمتیازێك نیە كە بۆ هەڵە یان كەموكوڕیەك لەبەرچاو بگیرێت. لێكبوردن لەمانا كۆنەكەی ئەوەی پاراستوە كە بەر لەهەر شتێك هەوڵێكە لەلایەن مرۆڤەوە بۆ خودی خۆی. مەسەلەكە چیدی بە تەنها ئەوە نیە كە تەحەمولی هەڵەیەك، عەیبێك، راكردن لە هەقیەقەتێكی بەڵگەنەویست یان مەرجەعێكی فەرمانڕەوا بگرین. ئەمەش خۆی گۆڕانێكی كەم نیە. ئەو كەسەی دەبورێت، خۆی سودی لێدەبینێت. بوران، هابەشیكردنی خراپبوون نیە. لێكبوردن بۆئەوەی چیدی مەسەلەیەكی ئەخلاقی یا فەزیلەتێكی بەزەبر نەبێت، دەبێ بەچەندان هەنگاوی سیاسی، بەزمانێكی هاوبەش دەركەوێت‌و پەرەبستێنێت.

وەرگێڕانی پێشەكی ئەم كتێبەی خوارەوە:

ژولی سادا- ژاندرۆن : تساهل در تاریخ اندیشه غرب. ت: عباس باقری .تهران، نشر نی١٣٧٨.

## ڤۆڵتێر

## لێبوردن لە بەرامبەر دەمارگیریدا

(لە زاروەی فەلسەفی: نوسینی ڤۆڵتێر"١". وتاری "لێکبوردن")

خەباتی ڤۆڵتێر لە پێناوی لێکبوردندا دەگەڕێتەوە بۆ روداوە دادوەریەکانی سالانی ٧٠-١٧٦ (کالاس"٢"، سیرۆن"٣"، و بە تایبەتی روداوی شوالیە دولابار"٤"). ئەگەرچی تەواوی بیری ڤۆڵتێر لە سالی ١٧٦٢وە سەرقالی لێکبوردن دەبێت، بەلام کتێبی وتارێك لەبارەی لێکبوردنەوە (١٧٦٣) بەرنامەیەکی درێژخایەنە بۆ وروژاندی رای گشتی بەقازانجی دژایەتیکردنی دەمارگیری. روداوەکەی کالاس کە لەسەرەتای نوسینەکەدا رونکراوەتەوەو لەکۆتایشدا ئاماژەی بۆ کراوەتەوە، هەر تەنها پەیوەندی بە یەکێك یان خێزانێکەوە نیە، و تەنهاش روداوێکی دادوەری نیە، بەلکو پەیوەندی بەسەرجەم مرۆڤایەتیەوە هەیە. چونکە ئاشکراکەری ئەو مەترسیەیە کە دەمارگیری و لێکنەبوردن بۆ هەموو مرۆڤەکانی هەیە. ڤۆڵتێر لەم نوسینەدا بەتوندی هێرشدەکاتە سەر کەنیسەی کاسۆلیك و بەخوازیاری دەسەلاتی دنیایی و دروستکەری زانا دینیە بێهودەکانی دەزانێت، کە دەرئەنجامەکەی لەم رستە توندو کورتەدا دەربڕیوە: مەسیحیەت، مێژووی "شانزە سەدە بەربەریەتە". رستەیەکی تری ڤۆڵتێریش دەناسین کە لەنامەیەکدا بەکاریهێناوە: خەبات لە پێناوی لێکبوردندا دەبێت، ئەم "نەنگیە لەناوببات". مەبەست لە نەنگی لەم رستەیەدا هەر شێوەیەکی دەمارگیری و بەتایبەتی پەڕگیریە لە مەسیحیەتدا.

مەبەست لەدەمارگیری بە وردی چیە؟ وتاری "دەمارگیری" لە ئەنسکلۆپیدیا (١٧٦٤)دا وەك گڕگرتنی خورافە پێناسیدەکات: "پەیوەندی نێوان دەمارگیری و خورافە وەك پەیوەندی هەلبزرکان و تا، یان توڕەییە" دەمارگیری نەخۆشیەکە بۆ چوارچێوەی کۆمەلایەتی، توندڕەویەکە کە هەڕەشەی لەناوبردنی لێدەکات. ئەم پێناسەیە پێچەوانەی ئەو نەریتەیە کە بێدینی بە نەخۆشی یان بەنەخۆشیەکی







ساری دەزانێت: بێدینی لەم پێناسەیەدا خۆی نەخۆشیەك نیە، بەلکو خودی دەمارگیری نەخۆشیە. دەمارگیری دەرئەنجامی زانا دینیەکان و ئەو دۆگمە زۆرانەیە کە دەبێتە هۆی خورافات و ئیحساساتی مەزهەبی و سەرکوتکردن. مەزهەبە هەبووەکان (بە دەر لە مەزهەبی "پیاوچاکان چینی") فاسدکردنی هەقیقەت، وکۆمەلێك فێلن بۆ فریودان و دیسپلینکردنی خەلکی. بەلام ئەگەر ڤۆلتێر لەو دەرەئەنجامانەدا کە وەریدەگرێ جیاوازی لەنێوان دەمارگیری و بێدینیدا دەکات، ئەوا بێدینی بە خاوەن هۆکاری سروشتی دەزانێت: گۆڕانی رەگەزی مرۆڤ و تەسکی دامێنی زانین، بەناچار مرۆڤەکان پال پێوە دەنێت بۆ وەرگرتنی بیروباوەڕە نایەقینیەکان. لەسەرو ئەو راستیە سنوردارانەوە کە ئێمەی مرۆڤ دەتوانین بەدەستی بهێنین، شتێك جگە لە بیروڕاکان، حیزبەکان، گروپەکان و "کۆمەلێك دودلی و هەلە" نیە (وتاری "گروپەکان"). بێدینی سروشتیە، چونکە دەرئەنجامی ماهیەتی سنورداری زیهنی ئێمەیەو لێرەوە شایستەی لێبوردنە. بەپێچەوانەوە دەمارگیری نەخۆشیە، چونکە بریتیە لەوەی تەنها خۆمان بە راست بزانین و لە پێناویشیدا دەست بۆ چەك بەرین. تەنها دەرمانێکی ئەم نەخۆشیە، زیهنی فەلسەفیە کە لە نزیکانەوە دەگوێزرێتەوە بۆ نزیکان و خوو و رەفتاری مرۆڤەکان نەرمدەکات و دەبێتە رێگر لە بەردەم توندڕەویە ناشایستەکاندا". لەبەر "سودی گشتیە" کە بەرگری لە لێکبوردن دەکرێ، نەك لەبەر ئازادی بیروڕاو باوەڕ، یان مافەکانی ویژدانی گوناهکار: بەرژەوەندی نەتەوەکان لێکبوردن دەسەپێنێت، چونکە ئەو نەتەوانەی لێکبوردنیان هەیە، ئەوانەن کە ئاشتی و لێکتێگەیشتنیان لە نێواندا هەیەو سامانی زۆر بەدەستدێنن. ئیمپراتۆریە گەورەکان فرەباوەڕنو لێکبوردنیان هەیە. باوەڕە مەزهەبیە جیاوازەکان بە دەرکەوتنی یەکتاپەرستی و رێکخستنی لە یەك کەنیسەدا، نەتواوەتەوە. مەزهەبە یەکتاپەرستەکان هەریەکەیان دابەشبوون بۆ کۆمەلێك گروپ و ئەم گروپانەش هەریەکەیان بەرگری لە هەقیقەتی جیاواز دەکەن، هەر لەبەرئەوە دەبێت هەموویان بانگهێشت بکەین بۆ لێکبوردن.

ڤۆلتێر وانە لە مێژووەوە وەردەگرێ: "ئەم جیاوازیە ترسناکانە کە چەند سەدەیەکی خایاندووە، وانەیەکی گرنگە سەبارەت بەوەی ئێمە دەبێ هەلەکانی یەکدی ببەخشین، جیاوازبوون بەدبەختی گەورەی رەگەزی مرۆڤەو لێکبوردنیش

تەنها ڕێگەچارەیەتی."

لێکبوردن فەزیلەتێکی مرۆیی و هەروەها کۆمەڵایەتییە، وتارێك لە بارەی لێکبوردنەوە بە"خەسڵەتی سروشتی" دادەنێت، لەکاتێکدا ئەنسکلۆپیدیا بە "خەسڵەتی مرۆڤبوونی" دادەنێت. هەروەها لێکبوردن فەزیلەتێکی ئەخلاقییەو لەمڕووەوە هاوشانی ئاسانگیریەو وەك چاوپۆشین و تەحەمولکردن و دڵسۆزی پێناسدەکرێت. بەڵام ئەگەر لێکبوردن تا ئاستی ڕەچاوکردنی گوناهباران بهێنینە خوارێ، ئایا نەمانگڕانۆتەوە بۆ مانا کۆنەکەی؟ ڤۆڵتێر ئەم مانایە بۆ لێکبوردن قایل نیە؛ چونکە نەزانی بەهرەی گشتیە، کەوابوو هەر مرۆڤێك دەبێ لەگەڵ ئەوانی دیدا لێبوردوو بێت. وتاری "لێکبوردن" بەم شێوەیە کۆتای دێت: "بەڵام ئاشکرایە ئێمە دەبێت هەموومان لەگەڵ یەکدیدا لێبوردوو بین، چونکە هەموومان بێتواناو سادەئەندێش و دوچاری گۆڕان و هەڵەین. ئایا ئەو چڵە نایەی کە با لەناو گڵ و قوڕاودا خەواندوێتی، دەتوانێت بەنایەکەی تەنیشتی کە بە ئاراستەی پێچەوانەی ئەوەوە خەوتووە بڵێت: "وەك من پێشبکەوە ئەی بێنەوا: ئەگینا دەیانەوێت تۆ لەزەوی هەڵکێشن و بتسوتێنن؟" لێکبوردن لەبەرئەوەی دوولایەنەیە، هاوکات دەبێت لەگەڵ چاوپۆشیندا و ئاشکراکەری پەیوەندی دەسەڵات نیە لە نێوان ئەو کەسەدا کە لێدەبورێ‌و ئەو کەسەی لێیبوراوە. لێکبوردن بە هەڵکێشانی دەمارگیری لەرەگەوە، دەبێت بە فەزیلەتێك کە زنجیرەیەك ئەرکی ئەخلاقی و کۆمەڵایەتی دروستدەکات و لە کۆمەڵێك پەیوەندی کۆمەڵایەتیدا دەردەکەوێت کە بەرژەوەندیەکانی تاکەکان لە ئاڵوگۆڕی ساماندا، واتە لە بازرگانیدا بەیەکەوە گرێدەدات. لەم ڕوانگەیەوە بۆرسەی لەندەن یەکێك لە ناوەندە گرنگەکانی لێکبوردنە: بۆرسە بە ئاسانکردنی ئاڵوگۆڕی سامان، ئازادی بیروڕا، واتە هاوتایبوونیان بڵاودەکاتەوە..

ڤۆڵتێر پیشنیاری دوو ڕێگە بۆ سەقامگیربوونی لێکبوردن دەکات: یەکێکیان چالاکی لەبواری بیروڕای گشتیدا، ئەویدیان کارکردنی فەرمانڕەوایان کە بە ڕێگەدان بە بیروڕای جۆراجۆر لە وڵاتدا، هێواش هێواش (هەوڵبدەن) ئیحساساتە مەزهەبیەکان خامۆشبکەن. ڤۆڵتێر ڕۆڵێکی گرنگ بۆ پڕوپاگەندە یان هوشیارکردنەوەی خەڵکی دادەنێت: ڕەوانی و فراوانی ئەو نوسینانەی سەبارەت بە ڕوداوە دادوەریەکانن، دەبێت بیروڕای گشتی ڕێکبکاتەوە، فۆرمەلەیانبکات، ڕونیانبکاتەوە، دەرگیریان بکات و ناچار







بەهەڵسەنگاندنیان بکات. "تەنها هیوای من بە هاواری گشتیە" (نامەیەك بۆ کۆنت دارژنتاڵ"٥"، ٧ ئۆتی ١٧٦٢): خەڵکی بەرهەمهاتووی ڕۆشنگەرین و دەکرێ بۆ خەباتکردن لەپێناوی لێکبوردندا دژی دەمارگیری، بهێنرێنە مەیدان. دەوری میرەکان بریتیە لەرێگرتن لەهەستە توندەکانی خەڵکی و ئەمەش بەدانانی کۆمەڵێك یاسا بۆ خۆلادان لە ئاژاوە مەزهەبیەکان و کۆتایهێنان بەخورافات دەکرێت. مەسەلەکە قەدەغەکردنی دینەکان نیە. ئەو ڕێگەیەی ڤۆڵتێر پێشنیاریدەکات، لەناوبردنی مەزهەبەکانی لەخۆنەگرتووە. ڤۆڵتێر خوانەناس نیە. خوانەناسی "دێوێکی ترسناکە" (وتاری "خوانەناس، خوانەناسی") وەك دەمارگیری کە هەموو پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکان لەیەك دەپچڕێنێ و بەهێزترین پایەی ئەخلاق وێراندەکات. میرەکان دەبێت ڕەواج بە خواناسی بدەن کە سەلمێنەری بوونێکی باڵاتر، خالق، فەرمانڕەوا، پاداشدەرو تۆڵەسێنە. لە دیدی ڕێبازە پۆزەتیڤیزمەکانەوە خواناسی، تاکە ڕێبازێکی پەتی و لێبوردووە. بەمشێوەیە دەبێت میرەکان چاودێری ڕێبازەکان بکەن: "لەهەر شوێنێك میر فەرمانڕەوای سیستەمی کەنیسە بووە، تەنانەت یەك ئاژاوەو تەفرقەیەك نەبینراوە. لەهەر شوێنێکیش کەنیسەیەکان بەتەواوی لەژێر فەرمانی میردا نەبوون، جگە لەکارەسات و ئاژاوە هیچی لێ بەرهەم نەهاتووە""٦". لێکبوردن بەرهەمی بەرنامەی درێژخایەنی میرەکانە و ئامانجیشی ڕێگرتنی هێواش هێواشە لە ڕێبازە پۆزەتیڤیزمەکان و ئەمەش لەگەڵ چەکی نادینی بوونی دەوڵەتدا هاوتا نیە. دەوڵەت نابێ بێلایەن بێت، بەڵکو دەبێت هاوکاری بەدیهاتنی مەزهەبی ڕاستەقینە بکات کە خواناسیە، لێکبوردن دەبێت ڕێگە بە گروپە جیاوازەکان (بێگومان وەفادارانی دەوڵەت) بدات کە سەرەتا هەموویان بەشێوەیەکی ئاشتیانە پێکەوە بژین، و پاشان بەناچارکردنیان بە پێکەوە ژیان لەژێر چاودێری میردا، هێواش هێواش تەفرقەکە لەناوبەرێت. ڤۆڵتێر بەپێچەوانەی بیلەوە ڕۆڵێکی کۆمەڵایەتی بۆ ئەو مەزهەبە دادەنێت کە لێکبوردن بڵاودەکاتەوەو بە پێچەوانەی لاکەوە خوازیاری فەرمانبەرداری کەنیسەیە لە دەوڵەت و ئەمەش بەتەنها زامنێکی لێکبوردن دەزانێت.

وتارێك لەبارەی لێکبوردنەوە بە "دوعاکردن بۆ خودا" کۆتای دێت، دوعایەك کە خودا لە بەرامبەر "سەرجەم بوونەوەرەکان، هەموو جیهانیەکان، هەموو

سەردەمەکان" و سەرجەم مرۆڤەکاندا دادەنێت کە "مەخلوقاتێکی سست و سەرگەردانن لە فەزای بێکۆتایدا و نادیار لە دیدی بونەوەرەکانی دیەوە". ئەو دوعایە گەڕانەوە بۆ خواناسی، واتە یەکەم مەزهەبی مرۆڤەکانە کە عەقلانیەتی پەتیەو ڕێبازە پۆزەتیڤیزمەکان لەڕێگەی زانستە مەزهەبی و میتافیزیکیەکانەوە لە شانۆ دەریکردبوو، بەلام هێشتا پاشماوەکانی لە بڕوابوون بە خودای مەزندا، لای هەندێك نەتەوەی شارستانی دەبینرێ. لێکبوردن بەرەو ئەم مەزهەبە سروشتیە دەڕوات کە ناوەڕۆکەکەی یەکێتی و برایەتی جیهانیە. لێکبوردن لەگەڵ ڤولتێردا ماناکەی پێشووی لەدەستدەدات: چیدی لێکبوردن نیشانەی سستی و بێ هیمەتی گۆناهئامێز نیە لە بەرامبەر خراپیدا تا خۆدورخستنەوە لێی کارێکی پێویست بێت، بەڵکو فەزیلەتێکی ئەخلاقی و کۆمەلایەتیە کە دەرئەنجامی ئاشتیخوازانەی دەبێت و بەشێوەیەکی ناکۆك گومانخوازی و خۆشبینی تێکەڵ بەیەکدی دەکات: تواناکانی مرۆڤ سنوردارە، بەلام دەبێت لێکبوردن و خوداناسی، پێشکەوتنی مێژوویی بە ئاراستەی پێشخستنی عەقلانیەت ئاسانبکات.

**(دەق)**

**(١)**

لێکبوردن چیە؟ خەسڵەتی تایبەتی مرۆڤە، ئێمەی مرۆڤ هەموومان تێکەڵێکین لە هەڵەو سستی، کەوابوو با نەزانی و بێعەقڵی یەکدی ببورین، ئەمە یەکەم یاسای سروشتە.

لە بۆرسەی ئەمستردام یان لەندەن یان بەسرەدا کە زەردەشتی، و بانیان"٧"، یەهودی، موسوڵمان، چینی خواپەرست بەرهمەن، ئۆرسۆزکس، کاسۆلیك، پرۆتستانت، هەر هەمویان پێکەوە مامەڵە دەکەن، خەنجەر بەروی یەکدا هەڵناکێشن بۆ ئەوەی یەکێکیان ئەویدی بێنێتە سەر دینەکەی خۆی. کەوابوو بۆچی ئێمە (مەسیحیەکان) پاش ئەنجومەنی نیقیە"٨" بەردەوام کوشتار لەگەڵ یەکدیدا دەکەین؟

کۆنستانتین"٩" لە سەرەتادا فەرمانێکی دەرکرد و هەموو ئاینزاکانی ئازادکرد، بەلام لەکۆتایدا هەموویانی سەرکوتکرد. پێش ئەو مەسیحیەکان تەنها لەبەرئەوە







ئازار دەدران و راوەدوو دەنران، چونکە هێواش هێواش دەبونە حیزبێکی دەرون وڵات. رۆمیەکان سەرجەم ئاینزاکانیان، تەنانەت ئاینزای یەهودو ئاینزای میسریەکانیان ئازاد کردبوو، لەگەڵ ئەوەشدا کە زۆر بەدزێویان دادەنا. بۆچی رۆم لە بەرامبەر ئەو ئاینزانەدا لێبوردوو بوو؟ چونکە مسریەکان و تەنانەت یەهودیەکانیش نەیاندەویست دینی کۆنی ئیمپراتۆری رۆم لەناوبەرن، زەمین و دەریاکانیان نەدەبڕی بۆ ئەوەی خەڵکی راکێشن بۆ دینی خۆیان، تەنها خەیاڵیان لای بەدەستهێنانی پارە بوو. بەلام بێگومان مەسیحیەکان دەیانویست دینی ئەوان فەرمانڕەوا بێت. یەهودیەکان نەیاندەویست کە پەیکەری ژۆپیتەر (خودای خوداکانی رۆم) لە ئۆروشلیم بێت، بەلام مەسیحیەکانیش نەیاندەویست کە ئەم پەیکەرە لە کاپیتۆل"١٠" (رۆم)دا ببینن. سن تۆماس"١١" بە نیەتی باشەوە دان بەوەدا دەنێت کە ئەگەر مەسیحیەکان ئیمپراتۆرەکان لانابەن، لەبەر ئەوەیە کە توانای ئەوەیان نیە، مەسیحیەکان بڕوایانوابوو دەبێت هەموو خەڵکی سەر زەوی ببن بە مەسیحی. لەبەرئەوە لەگەڵ سەرجەم خەڵکی زەویدا تا ئەو رۆژەی کە باوەڕ دەهێنن، دوژمنبوون.

جیاوازیەکانی مەسیحیەکان هەرچیەك بووبێت، لە نێوان خۆشیاندا لەگەڵێەکدا دوژمنبوون. یەکەم جیاوازی لەوەدا بوو کە ئایا دەبێ عیسای مەسیح بەخودا بزانن یان نا؟ ئەوانەی نکوڵیان لێدەکرد بە ناوی "نابیۆنی""١٢"ەوە تەکفیردەکران، و ئەمانیش ئەوانەی مەسیحیان دەپەرست تەکفیر دەکرد.

هەندێك لە مەسیحیەکان هاوبەشی دارایيان دەویست و دەیانگوت کە لە سەردەمی حواریەکاندا ئەم هاوبەشیە لە ئارادا بووە. نەیارەکانیان ناویان دەنان نیکۆلایی"١٣" و ناشرینترین تاوانەکانیان دەدایە پاڵیان.

گروپێکی دی لافی عرفانیبوونیان لێدەدا، ئەمانە بە غنوسی ناو دەبەن و بەتوندی دژایەتیاندەکەن. مارسیۆن"١٤" قسە لە تەسلیس دەکات، بە بتپەرستی ناودەبەن.

ترتۆلین، پراکساس، ئۆریژن، نوات، سایلیۆس، دونات"١٥" هەموویان پێش کونستانتین بەدەستی برا دینیەکانی خۆیان سەرکوتکران. سەردەمێکی درێژ بەسەر فەرمانڕەوی مەزهەبی مەسیحیەتدا بەهۆی کونستانینەوە نەڕۆیشتبوو کە ئاتانازیەکان"١٦" و ئۆسبیەکان"١٧" کەوتنە گیانی یەکدی و لەوساوە تا ئەمڕۆ

هەمیشە کەنیسەی مەسیحیەت لە خوێندا غەرقبووە.

ئەوەم قبوڵە کە گەلی یەهود زۆر دڕندە بوون. بێ بەزەییانە سەرجەم دانیشتوانی سەرزەمینێکی بچوکیان کە هیچ مافێکی زیاتر لە پاریس و لەندەنیان لەناویدا نەبوو، سەردەبڕی. بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا کاتێك نوعمان حەوتجار لە روباری ئۆردندا خۆی شت و نەخۆشی گەڕیەکەی چاك بۆوە، و بۆ قەدردانی لە ئەلیەسوع کە ئەم نهێنیەی بۆ ئاشکرا کردبوو، پێیگوت کە خودای یەهودیەکان بۆ سوپاسگوزاری ئەو دەپەرستێت، بەڵام ئازادە کە خودای پاشای وڵاتەکەی خۆشی بپەرستێ و داوای لە یەسوع کرد کە ڕێگەی ئەمەی بدات و پێغەمبەریش بێ هیچ دودڵیەك ڕێگەی پێدا. یەهودیەکان خوای خۆیان هەبوو کە دەیانپەرست، بەڵام هەرگیز سەریان لەوە نەدەسوڕما کە هەر گەلێکی دیش خودای خۆی هەبێت. بەکارێکی باشیان دەزانی کە شامۆس"١٨" سەرزەمینێکی بەمۆئابیتەکان"١٩" داوە بەو مەرجەی خودای ئەوانیش هەمان کار بکات. یەعقوب بۆ هێنانی کچانی بتپەرستێك، هەرگیز دودڵی لەخۆی پیشاننەدەدا. لابان خودای خۆی هەبوو، وەك چۆن یەعقوبیش خودای خۆی. ئەمانە نمونەی لێکبوردنن لەلایەن نالێبوردووترین و توندوتیژترین خەڵکی سەردەمی کۆنەوە، ئێمە لاسای توندوتیژیە توندەکانیان دەکەینەوە، نەك لاسای لێبوردن و دڵفراوانیان. پڕ ئاشکرایە هەر کەسێك مرۆڤێك، واتە براکەی خۆی سەرکوتبکات لەبەرئەوەی کە بیروڕای لەو جیاوازە، دیوێکی ترسناکە. کێشەکە لێرەدا نیە، بەڵام بۆچی حکومەت، داوەران و پاشاکان ئەو کەسانە سەرکوتدەکەن کە لەسەر دینی ئەوان نین؟ ئەگەر ئەم کەسانە کۆمەڵێك بێگانەی بەهێزبن، ئەوا بێگومان میرێك دەبێت بە هاوپەیمانیان. فرانسوای یەکەم (شای فەرەنسا) کە زۆر مەسیحی بوو، دژی شارلی پێنجەم (ئیمپراتۆری ژێرمەن، شای ئیسپانیا و سیسیل و..) کە زۆر کاسۆلیك بوو، لەگەڵ موسڵمانەکاندا یەکیگرت، وبۆ پشتیوانیکردن لە لۆسەریەکانی ئەڵمانیا لە یاخیبونەکەیاندا دژی ئیمپراتۆریەکەیان (شارلی پێنجەم)، پارەی پێدان. بەڵام وەك نەریتی باو، لۆسەریەکانی وڵاتەکەی خۆی لەئاگردا سوتان. لە ساکسدا"٢٠" لەبەر هۆی سیاسی پارەی بە پرۆتستانتەکان دەدا، لە پاریسیشدا هەر لەبەر هۆی سیاسی ئاگری تێبەردان. بەڵام دواجار چی روویدا؟ سەرکوتکردنەکان، تونرەوەکانی دروستکرد. زۆری پێنەچوو فەرەنسا پڕبوو لەپرۆتستانتی تازە. ئەمانە سەرەتا





دۆڕان، بەڵام پاشتر بردیانەوە. شەڕە ناوخۆیەکان دەستی پێکرد، پاشان سەن بارتلمی هاتە پێشەوەو لە دەرئەنجامدا ئەم گۆشەیەی جیهان بوو بە دۆزەخێکی خراپتر لەوەی کە پێشینان و ئەمرۆیەکان وەسفیانکردووە.

ئەی گەمژەکان کە هەرگیز بۆ پەرستنی ئەو خودایەی دروستیکردوون، دینێکی راستان نەبووە! ئەی بێنەوایان کە لە نوئاشیدەکان و پیاوچاکانی چین، پارسی و عاقڵەکانی دیەوە هیچ پەندێك فێرنەبوون! ئەی دێوەکان کە پێویستان بە خورافات هەیە،.. پێشتر ئەوەمان بە ئێوە گوتووەو چیدی هیچمان نیە پێتان بڵێین کە ئەگەر لە وڵاتی خۆتاندا دوو مەزهەبتان هەبێت، یەکتر سەردەبڕن. بەڵام ئەگەر سێ مەزهەبتان هەبێت، ئەوا هەموو لە ئاشتیدا دەژین. تەماشای تورکی گەورە (سوڵتانی عوسمانی) بکەن: ئەو حوکمڕانی بەسەر زەردەشتیەکان، بانیەکان، مەسیحیەکانی یۆنان، نەستوریەکان و رۆمیەکاندا دەکات، یەکەم کەس کە ئاژاوە بخاتەوە، تیر دەخەنە ناو کۆمیەوە"٢١"و هەموان ئیدی ئارامدەبنەوە.





## پەراوێزەکان

١-Voltaire (١٧٧٨٧-١٦٩٤) نوسەر و فەیلەسوفی فەرەنسی.

٢- Calas (١٧٦٢-٦٥) ڕوداوێکی دادوەری بەناوبانگە کە کەسێك بەناوی ژان کالاس (١٦٩٨-٦٤) بووە قوربانی. ئەو کەسێکی پرۆتستانت بوو، و بەناهەق تاوانبارکرا کە کوڕەکەی خۆی لەبەرئەوەی کە دەیەوێت ببێتە کاسۆلیك، کوشتووە. ڤۆڵتێر بەرگری لێدەکات تادواجار پاش مردنی لەساڵی ١٧٩٥دا ، ڕەدی ئیعتیباری بۆ دەکەنەوە.

٣- Sirven Paul Pierre پرۆتستانتێکی فەرەنسی کەهۆی نالێبوردنی(کاسۆلیکەکان) تاوانبارکرا کە کچەکەی خۆی بۆئەوەی نەبێتە کاسۆلیك کوشتووە. بە هەوڵ و خەباتی ڤۆڵتێر ڕەدی ئیعتباری بۆ کرایەوە.

٤) Jean Francois Fevr (Chevalier de la Barrre) نەجیبزادەیەك بوو کە بە بێدینی تاوانبارکرا و سەریان لە لەشی جیاکردەوە. بەهۆی خەباتی ڤۆلتێرەوە ئەنجومەنی نیشتیمانی (شۆڕش) فەرەنسا ڕەدی ئیعتباری بۆ کردەوە.

٥) comtr d argental

٦- ڕێگەی حەکیم، ڕێگەی خەڵکی.

٧- وشەیەکی تمولیە بەمانای بەشێك لەیەکێك لە کاستەکان (چینە کۆمەڵایەتیەکانی هند) کە بازرگانی گەورەیان لەبەردەستدا بوو.

٨) Dicee (نیکیە یان نیقیە=ئیسنیکی هەنوکە لە تورکیا) شارێك کەیەکەم ئەنجومەنی بریاردانی مەسیحیەت لە ساڵی ٣٢٥ میلادیدا، تیا دروستبوو؟

٩- Constantin ئیمپراتۆری ڕۆم، بونیادنەری ڕۆمی خۆرهەڵات (کنستانتیونوپل=ئەستەمبوڵی هەنوکە)

١٠- Capitol یەکێك لەحەوت گردەکەی شاری ڕۆم کە پەرستگای ژۆپیتر لەسەری دروستکراوە.

١١- سن تۆماس یەکێکە لەباوکانی کەنیسە

١٢-Ebionite ناوی گشتی هەموو ئەو کەسانەی دەبنە ئەندامی یەکێك لە گروپە مەسیحیەکان (بەتایبەتی لە سەدەی دوهەم و سێهەم لە ئاسیای بچوکدا)

١٣- Nicolaisme ئاینزایەکی غنوسی (عیرفانی) کە لەسەدەی یەکەمی





مەسیحیەتدا لایەنگرانی هەبوو.

١٤- مارسیۆن(٨٥-١٦٠) زانایەکی مەزهەبی مەسیحی کە بەهۆی تێزەکانیەوە تەکفیر کراو لەمەسیحیەت دەرکرا.

١٥- Donat, Sabellius, Novatien, Novat, Origene, Prans, Tertullien هەموویان لە گەورە ورۆحانیەکانی مەسیحیەت بوون کە بەهۆی بڕواکانیانەوە تەکفیر کران و ئازار و ئەشکەنجەیان بینیی.

١٦- Saint Athanase (٢٩٥-٣٧٣) ڕابەری کەنیسەی مەسیحەیەتی یۆنانی.

١٧- Euseb de Cesaree (٢٦٥-٣٤٠) نوسەر و یەکێك لە گەورەکانی مەسیحیەتی یۆنانی.

١٨- Chamos خودای عبرانیەکان.

١٩- Moabites خەڵکی دەوارنشینی ڕۆژهەڵاتی دەریای مردوو (سەدەی هەشتەمی پێش میلاد) کە خزمایەتیان لەگەڵ عبرانیەکاندا هەبوو، بەڵام هەمیشەش پێکەوە لە ناکۆکیدا بوون.

٢٠- یەکێك لەویلایەتەکانی ئەڵمانیا (بەئەڵمانی Sachsen) کە ناوەندی شارەکەی دێرسدە (Dersed).

٢١- Empaler سزادانێکی زۆر سەختو دڕندانە بوو کە بریتیبوو لە تیرێکی کانزایی یان دارێکیان دەکرد بە کۆمی تاوانباردا تا بچێتە ناوی و بچێتە سەرەوە تا ئەوکاتەی تاونبار دەمرێت.

سەرچاوەی ئەم وەرگێرانە:

ژولی سادا- ژاندرون: تساهل در تاريخ انديشه غرب. ت: عباس باقری — تهران: نشرنی ١٣٧٨.





## کانت

## ڕێنمای مرۆڤ لە بواری باوەڕدا

کانت لەم دەقەدا (کە دوای دەیهێنینەوە) ڕێسایەك بۆ بەدوکەوتنی بەکارهێنانی ویژدان لە بواری مەزهەبدا دەستنیشاندەکات. ئەم باسە بەگریمانەی حاڵەتێکی دوولایەنە دەستپێدەکات کە دادوەرێکی پشکنینی بیروڕاکان، کاتێك دەبێت لەبارەی "کەسێکەوە کە گوایا بێدینەو تاوانبارە بەبێباوەڕی" حوکمبدات، ڕوبەڕوی دەبێتەوە. مەسەلەکە لێرەدایە ببینین ئایا دادوەر بە حوکمدانی، پەیڕەوی ویژدانی خۆی کردووە یان بەپێچەوانەوە بێویژدانی کردووە؟ ئەو گرفتەی کانت هێناویەتیە پێشەوە پەیوەندی بە ماهیەتی ویژدان و ماهیەتی باوەڕەیە هەیە، ویژدان هێزێکی مرۆیی ڕەسەنە: هەموو کەسێك ویژدانی هەیە، بەڵام ڕەنگە لە بابەتێکی تایبەتدا بێویژدانی بکات. لە بنەڕەتدا مەبەست لە ویژدان لێرەدا هێزی هەڵسەنگاندنی ئەخلاقیە. ئەم قسەیە بەچ مانایەکە؟ کانت بەمشێوەیە ویژدان پێناسدەکات: "زانینێك کە خۆبەخۆ دەبێتیە". مەزهەب لە روی زیهنیەوە ناسینی سەرجەم ئەرکەکانی مرۆڤە وەك فەرمانەکانی خوداوەند. لێرەوە ویژدان نەك هەر ناسینی ئەم ئەرکانەیە، بەڵکو ڕێنمای بڕیارە ئەخلاقیەکانە کە شێوەی ئەنجامدانی کارە تایبەتیەکان دەستنیشاندەکات. ویژدان دادوەر یان دادگایەکی دەرونیە کە بە یاسای گشتی ئەخلاقەوە، دادوەری لەبارەی چونیەکی شێوەی ئەنجامدانی کارێکی تایبەت دەکات. وردتر بڵێین ئەگەر ئیدراك (نەك ویژدان) کارێك بە دادپەروەرانە لە قەڵەمبدات، ویژدانیش دەبێت بەر لە ئەنجامدانی ئەو کارە، لە دادپەروەریبوونی دڵنیابێت. ئەمەش پێویستی بنەمای بەڵگەنەویستی ویژدانی ئەخلاقیە. بە دەربڕینێکی تر دەکرێت ویژدانی ئەخلاقی بەهێزێکی دادوەری بناسرێت کە بەتاوتوێکردنی ئەوەی ئایا بە راستی کارەکانی بەپێی پێویست بە وردی هەڵسەنگاندووە، خۆی داوەری دەکات. لێرەوە بێویژدانی لە کارێکی دیاریکراودا، مانای







ئەوە نیە کە کەسەکە ئەو هێزەی نیە، بەڵکو بەو مانایەیە کە  لەئەنجامدانی کارەکەدا گوێی لە حوکمی ویژدان نەگرتووە. بە کورتی ویژدانی ئەخلاقی مرۆڤ ناچار بە ئەرکێکی بێ کۆت و بەند یان بنەمایەکی بێ نیاز بە بەڵگە دەکات کە ئەویش ئەوەیە، نابێ هیچ کارێك ئەنجامبدرێت کە مەترسی ئەوەی لێبکرێ نادادپەروەرانە بێت. دەبێ هەموو شێوەیەکی گومانکاری بخەینە لاوەو نابێ مەترسی ئەنجامدانی کارێکی نادادپەروەرانە قبوڵبکەین.

مەسەلەی دادوەری پشکنینی بیروڕا چی لێدێت؟ ئەگەر ئەم دادوەرە بێویژدانی کردووە، واتە گوێی بەحوکمی ویژدانی خۆی نەداوە، کەوابوو چۆن دادوەریکردووە؟ کانت دەڵێت پێوەری حوکمدانی دادوەری تەفتیش، باوەڕی بنەڕەتیەتی. ئەم باوەڕە دەرخەری مەزهەبێکی بەڵگەنەویستە، وەك کۆمەڵێك ڕەمزی باوەڕو سروتی تایبەت. مەزهەبی پشتبەستوو بە وەحی، فەرمان بە ئەنجامدانی کۆمەڵێك کاردەکات کە وەك فەرمانی خودایە. بەدەربڕینێکی تر باوەڕی بنەڕەتی ناچارکەرە، بەڵام نەك لەبەرئەوەی من ئەو فەرمانانە بێ سێودوو بە ئەرکی خۆم دەزانم، بەڵکو لەبەرئەوەی پێشتر تەسلیمی دەسەڵاتێکی دەرەکی (خودا) بووم کە فەرمانەکانی تەنها لەبەرئەوەی لەلایەن ئەوەوەیە، ناچاریە. کاتێك ئەرکی ئەخلاقی بەمشێوەیە دەهێنرێتە پێشێ، دوو کێشە دروستدەکات: لەلایەکەوە ویژدان چیدی مەرجەعی دیاریکرادنی چونیەکی یان ناچونیەکی شێوەی کرداری من و یاسای ئەخلاقی نیە، چیدی دەوری دادوەری نیەو سەربەخۆیی خۆی لەدەستدەدات. کەوابوو کردار لەروانگەی ئەزمونی مادیەوە، تەنها لەبەر نیەتی کەس، واتە بەپێی لایەنە مولزەمەکانی یاسای ئەخلاق  کە بە بڕاوە زانراوە، لە روی ئەخلاقیەوە دادپەروەرانەیە، نەك لە رووی کردارەوە. کەوابوو مەزهەبی وەحی کە نەك لەبەر ناچارکردنی دەرونی ویژدان بەهۆی یاسای ئەخلاقەوە، بەڵکو بەهۆی فەرمانی بوونەوەرێکی دەرەکیەوە خوازیاری فەرمانبەرداریە، ڕەچاوکردنی ئەخلاق ناکات بە شتێکی پێویست و یاسای ئەخلاقیش لەبەرئەوە دانانێت کە خۆبەخۆ پیرۆزە. باوەڕی پەتی،کە عەقڵ قبوڵکەرێتی و ویژدانی ئەخلاقی دەستنیشانکەرێتی، دەتوانێت بکەوێتە ناکۆکی لەگەڵ باوەڕی بنەڕەتیدا.

لەلایەکی دیەوە حاڵەتی دوولایەنی دادوەری پشکنینی بیروڕا، گفتوگۆ لە بارەی

پلەی وەحیەوە دەهێنێتە پێشێ. ئەزموون یان مێژوو ناتوانێت بەشێوەیەکی بڕاوە خوایبوونی ئیلهامێك بسەلمێنێ. ناتوانین بە بێگومان لەرێی وەحیەوە لە هەقیقەتی دۆگمەکان و سروتە سەقامگیرەکان دڵنیا بین. لەبەر ئەمەشە کە لەدیدی دینی عەقلانیەوە، حوکمەکانی مەزهەبی وەحی ئیختیاری و گریمانەین و بە زەرورەت پەیوەندی بەو ئەرکانەوە نیە کە بەحوکمی ویژدانی ئەخلاقی ناچار بە پەیڕەوکردنین، مرۆڤ ناتوانێت پەی بە خوداییبوونی هیچ تێزێك بەرێت بەهۆی چەمکەکان و توانا عەقلیەکانیەوە نەبێت، ئەگەرچی ئەو تێزانە بە تەواوی ئەخلاقی بن و جێی گومانیش نەبن. بەدەربڕینێکی دی دینی وەحی دەبێت بەجۆرێك تەفسیرو لێکبدرێتەوە کە لەگەڵ رێسا عەمەلیەکانی دینی عەقلی پەتیدا بگونجێت. بۆ ئەوەی تێبگەین ئەوکارەی دەمانەوێت ئەنجامیبدەین بە دڵنیاییەوە دادپەروەرانەیە، دەبێ تەنها بۆ ویژدانی ئەخلاقی خۆمان بگەڕێینەوە. ئەو دادوەرەی پشکنینی بیروڕا کە گیانی مرۆڤێك دەگرێت، تەنها فەرمان لە باوەڕی بنەڕەتیەوە وەردەگرێ (کانت دەڵێ "تەنانەت لەکاتی پێویستدا بە شەهیدبوون): لەبەرئەوە جورئەتی ئەوە دەکات کارێك بە ئەگەری کردنی گەورەترین نادادپەروەریەکان ئەنجامبدات. بەم مانایە دادوەری پشکنینی بیروڕا بێویژدانی دەکات، و ئەو مەترسیە قبوڵدەکات کە بە پێچەوانەی ئەرکی مرۆڤانەی خۆیەوە کە خۆی باوەڕی پێەتی کارێك ئەنجامبدات. ئەگەر ئەو بە فەرمانی "پلەکانی بەرزتر لەخۆی" دەست بۆ ئەوکارە بەرێت، ئەوا مەسەلەکە هەر هەمان حوکمی دەبێت. لەم حاڵەتەشدا ویژدانی ئەو، دوا مەرجەعە بۆ داوەری دادپەروەرانە بوون یان نەبوونی کارێك بە شێوەیەکی یەقینی.

کانت بە لێکۆڵینەوەی پەیوەندی نێوان مەزهەب و ئازادی، بەشێوەیەك لە شێوەکان بناغە دانەری رەخنەی مەزهەبیە. تا جەوهەری مەزهەب لەناو باوەڕی بنەڕەتیدا بێت، مەزهەب بەرەو خورافات دەچێت و وەك سوالکردن لە لوتفی خودای لێدێت، کە لەم حاڵەتەدا خەڵکی دەخاتە ژێر کۆنترۆڵی پێشەوایانی کەنیسەوە کە تەنها خاواندارێکی دەسەڵاتن لە بواری باوەڕداو بەسەر دەوڵەتیشدا دەسەڵاتیان هەیە، و ئەوان (خەڵکی) لە ئازادی ئەخلاقی بێبەشدەکەن. مەزهەبی وەحی تەنانەت هاوڵاتیان لەئەرکە مەدەنیەکانی خۆشیاندا بەهەڵەدا دەبات، بەپێچەوانەوە







"رۆشنگەران" دەیانەوێت مرۆڤ لەو حاڵەتی منالیە دەربهێنن کە بەبوونی ئەمحاڵەتە ناتوانن بەبێ رێنمایی ئەوانیدی، توانا عەقلیەکانی خۆیان بەکاربهێنن. ئازادی بەکارهێنانی گشتی و ئاشکرای عەقڵ، بۆ گەیشتن بەم مەبەستە، بەسە: بڵاوکردنەوەو پروپاگەندە، رۆشنگەری خەڵکیە ئەو وانایەیان دەداتێت، کە فێری ماف و ئەرکەکانی خۆیان ببن لەو دەوڵەتەدا کە لەناویدا دەژین. لە هەمانکاتدا فێربن عەقڵی خۆیان بەسەربەخۆ بەکاربهێنن. لێرەوە تاوتوێکردنی گریمانەی ویژدان لە بواری باوەڕی مەزهەبیدا، رەخنەی بەکارهێنانی گشتی و ئاشکرای عەقڵ و هەروەها پێناسی ئازادی هاوڵاتیانیش دەگرێتەوە: روناککردنەوە هاوڵاتیان نەك هەر بەستراوە بە ئازادی مەدەنیەوە، بەڵکو بەستراوە بە پەروەردە کردنیشیانەوە، (کانت وەڵامی ئەم رەخنەیە کە "ئەوان ئامادەیی پێویستیان بۆ ئازادی نیە" بە نەفی دەداتەوە و دەڵێ ئەم ئامادەبوونە خۆی لە پێشەوە پێویستی بە بەرقەراربوونی ئازادیە).

(دەق)

گریمان بۆ نمونە دەبێ دادوەرێکی پشکنینی بیروڕا کە سەخت پابەندی باوەڕی بنەڕەتی خۆیەتی، تا ئاستی شەهیدبوون لەکاتی پێویستدا، لەبارەی کەسێکەوە داوەری بکات کە دەگوترێت بێدین (بەڵام هاوڵاتیەکی باش) و بێباوەڕە. دەپرسین ئایا ئەم دادوەرە بە حوکمدانی ئەو هاوڵاتیە بە مردن، بە حوکمی ویژدانی خۆی (کە بە راست لە هەڵەدایە) حوکمیداوە، یان دەتوانین بە بێویژدانی تاوانباری بکەین، جاچ هەڵەی کردبێت، یان هوشیارانە نادادپەروەری کردبێت؟ چونکە دەکرێت پێی بگوترێت لەم حاڵەتانەدا هەرگیز ناتوانیت دڵنیابیت لەوەی کە بە تەواوی دادپەروەرانە کاریکردووە. بەراستی رەنگە ئەو لەو باوەڕەدا بێت کە ئیرادەی خواوەند بەشێوەیەکی سروشتی ئیلهامی پێکردوە (رەنگە بەپێی پەندی: ناچاریانکە کە بێنە ژورەوە) کە ئەرکی سەرشانێتی یان لایەنیکەم رێگەپێیداوە تا بێباوەڕی و بێباوەڕ، یەکسەر لەناوبەرێت. بەڵام ئایا بەراستی ئەوەندە باوەڕی بە هەقیقەتی ئەم حوکمە خوداییە کردووە، کە جورئەتی ئەوەی کردووە گیانی مرۆڤێك بەمشێوەیە بسێنێ؟ بێگومان سەندنی گیانی کەسێك لەبەر بیروڕاکانی، کارێکی نادادپەروەرانەیە، مەگەر ئەوەی (بمانەوێت بەرزترین چاوپۆشینی لە بەرامبەردا بکەین) ئیرادەی خوداوەند کە

ئەو توانیوێتی بەشێوەیەکی نائاسایی بە تەواوی بیناسێت، فەرمانێکی جیاواز لەوەی پێدابێت.

بەڵام ئەوەی کە خوداوەمد هەمیشە وا ئیرادەی کردبێت، تەنها پشتبەستووە بە بەڵگە مێژووییەکان و بەهیچ شێوەیەك بەڵگەنەویست نیە. حوکمەکانی وەحی لە رێی مرۆڤگەلێکەوە بەو گەیشتووەو ئەوانیش تەفسیریان کردووەو لێکیانداوەتەوە. بەڵام ئەو وای دادەنێ کە گوایا راستەوخۆ لەلایەن خوداوە بۆ ئەو هاتۆتە خوارێ (وەك ئەو فەرمانەی کە بە ئیبراهیم گەیشت بۆ ئەوەی کوڕەکەی وەك مەڕێك سەرببڕێ). لایەنیکەم ئەگەری ئەوە هەیە کە هەڵەیەك رویدابێت، بەڵام لەم حاڵەتەدا ئەو (واتە دادوەر) مەترسی ئەوە قبوڵدەکات کە باڵاترین پلەی نادادپەروەری ئەنجامبدات و دروست لەبەر ئەمەشە کە بێویژدانیدەکات. حوکمی مەسەلە لەبارەی هەر باوەڕێکی پشتبەستوو بەمێژوو یان نائاساییەکی دیش هەر ئەمەیە، و لەراستیدا هەمیشە ئەگەری هەڵە لەناویاندا هەیە، وبەسەرنجدان لەوەی کە رەنگە ئەوەی ئەم باوەڕە دروستیدەکات یان رێگەی پێدەدات نادادپەروەرانەیە، واتە بە پێچەوانەی ئەرکی مرۆڤانەوەیە کە دڵنیاییە، ئەم هەڵانە دەرئەنجامی سەرپێچیکردنە لە حوکمی ویژدان، نەك فەرمانبەرداری لە ویژدان.

لەسەرو ئەمەشەوە ئەگەر ئەوکارەی یاسای بەڵگەنەویستی وەحی فەرمانی پێداوە، خۆبەخۆ رێگەپێدراو بێت، ئەو پرسیارە دێتە پێشێ کە ئایا بەرپرسیارە گەورەکان یان پێشەوایانی رۆحانی دەتوانن بە پشتبەستن بە باوەڕەکانی خۆیان، وەك مەرجی بوونی باوەڕ (کە ئەگەر رەچاو نەکرێت، باوەڕ چۆنایەتی خۆی لە دەستدەدات)، بەسەر خەڵکیدا بسەپێنن؟ چونکە باوەڕێکی لەمچەشنە تەنها پشتی بەهۆ مێژووییەکان بەستووەو لەکاتێکدا کە بەپێی داوەری خەڵکی (لایەنیکەم ئەگەر خۆیان تاوتوێێ بکەن) هەمیشە ئەگەری ئەوە هەیە هەڵەی تیا کرابێت. وەك چۆن لە بەیانی کلاسیك باودا روویداوە. قەشە خەڵك ناچاردەکات لایەنیکەم لە دەرونی خۆیاندا دان بەشتێکدا بنێن کە بڕوایانوایە بە ئەندازەی باوەڕبوون بەخودا هەقیقەتی هەیە. واتە بە دەربڕینێکی تر لەبەرامبەر خوادادا دان بە شتێکدا بنێن کە بێگومان بەوشێوەیە نایناسن: وەك قبولکردنی رۆژێکی دیاریکراو بۆ عیبادەت وەك کارێکی مەزهەبی کە خودا خۆی ئەمری کردووە، یان بڕوابوون بە سمبولگەلێك







کە سەری لێدەرناکەن. لەم حاڵەتانەدا پلەی رۆحانی باڵاتر لەوان، بە سەپاندنی بڕوایەك بەسەر ئەوانی دیدا کە خۆی هەرگیز بڕوای بەو باوەڕە نیە، بە پێچەوانەی ویژدانی خۆیەوە کاریکردووە. لەبەرئەوە دەبێت لەرووی دادپەروەریەوە بیر لەوشتە بکاتەوە کە دەیەوێت ئەنجامیدەدات، چونکە دەبێ وەڵامدەرەوەی کۆی توندڕەویەکانی باوەڕێکی وا کۆیلانە بێت. رەنگە هەقیقەتێکیش لەو شتەدا هەبێت کە باوەڕیان پێیەتی، بەڵام لە باوەڕیاندا (یان لەو دانپیانانەی لە دەرونی خۆیاندا دانی پیا دەنێن) ئەگەری هەڵە هەیە، هەڵەیەك کە شایستەی مەحکومکردنە.

سەرچاوەی ئەم وەرگێڕانە:

ژولی سادا- ژاندرون: تساهل در تاریخ اندیشه غرب. ت: عباس باقری- تهران: نشرنی ١٣٧٨

## عەلمانیەت "١"

## نوسینی:مالکوم هیملتون

بەبڕوای تیۆرەسازانی مانا و هەموو ئەو تیۆرەسازانەی دی کە سەرچاوەی دین بەهەلومەرجی مرۆیی دەزانن، پرۆسەی عەلمانیەت لەکۆمەڵگا پیشەسازیەکاندا کێشەئامێزە. بەبڕوای بێرگر ئەگەر دین بەربەستێك لەبەرامبەر لەخۆنامۆبووندا دروستبکات، کەوابوو مەسەلەی عەلمانیەت چۆن مومکینە؟ زۆرێك لەبیریاران و لەوانە دۆرکهایم هەوڵیانداوە نکوڵی لەهەموو جۆرە عەلمانیەتێك بکەن. بەبڕوای ئەوان ئەم وەهمە بەهۆی سستبوونی شێوە تەقلیدیەکانی دینەوە، دروستبووە. ئەم بیریارانە دەڵێن کە لەبری شێوە تەقلیدیەکان، بەردەوام شێوازی تازە دروستدەبن. بەلاّم بێرگر نکوڵی لەواقیعیەتی عەلمانیەت ناکات و لەڕاستیدا بە یەکێك لەبەرجەستەترین تیۆرەسازانی ئەم دیاردەیە دەزانرێت. بەهەرحاڵ بەرلەوەی باسی تێڕوانینەکانی بێرگر بکەین، پێویستە باسێکی ئەم مەسەلەیە بکەین. لەم فەسڵەدا تێروانینی دیش لەبارەی پرۆسەی عەلمانیەتەوە لەبەرامبەر تیۆرەی بێرگردا دەهێنینەوە.

زۆرێك لەتیورەسازان بەتایبەتی نوسەرانی سەدەی نۆزدە، پێشبینی لەناوچوونی دینیان لەکۆمەڵگای مۆدێرندا کردبوو. وەك بینیمان تایلۆر، فرێزەر، مارکس و فرۆید، هەر هەموویان پێشبینی ئەوەیان کردبوو کە بە بالاّدەستبوونی زانست بەسەر شێوە بیرکردنەوەی کۆمەڵگای هاوچەرخدا، دین لەناودەچێت. بیریارانی تر کە بەشێوەیەکی وەزیفیتر تەماشای دینیان دەکرد، پێشبینی ئەوەیان دەکرد دین بەشێوە باو و تەقلیدیەکانی لەناو دەچێت و جێگەکەی بڕوایەك دەیگرێتەوە کە لەسەر بناغەی میتافیزیکی و موتەعالی نییە. کۆنت دینێکی تازەی لەسەر بناغەی بونیادە عەقلانی و زانستیەکان داهێنا، و گوتی ئەم دینە تازەیە جێگەی خاڵی دینی تەقلیدی پێشوو دەگرێتەوە. دۆرکهایم لەبەهاکانی شۆڕشی فەڕەنسیدا، دەستنیشانی







سەرەتاکانی دروستبوونی کردارێکی نوێ و هاوتای دینی کردبوو.

بەلاّم زۆریك لەبیریارە تازەترەکان ئەمجۆرە بیرکردنەوانەیان رەتکردەوە و بڕوایانوایە کە دین وەك رابردوو بە بەشێکی گرنگ لەکۆمەڵگای تازە دادەنرێت، ئەگەرچی بەگشتی ئەوەیان قبولەکە رەنگە شێوە تایبەتیەکانی دین گۆڕانێکی بەرچاوی بەسەردا بێت. بۆ نمونە بێلا (١٩٧١) بەلگاندنی کردووە کە چەمکی عەلمانیەت بەشێکە لەتیورەی کۆمەڵگای مۆدێرن کە لەبنەڕەتدا سەرچاوە لەکاردانەوەی بزوتنەوەی رۆشنگەری لەبەرامبەر بەنەریتی ئاینزای مەسیحیدا، دەگرێت، هەمان ئەو نەریتەی کە ئاراستە وەرگرتنێکی مەعریفی توندی هەیە و جەخت لەسەر باوەڕی بەفەرمی ناسراو دەکاتەوە. بەبڕوای بێلا تیورەی عەلمانیەت وەك ئەفسانەیەك کە لەرووی سۆزداریەوە تەفسیرێکی رێکخراو لەبارەی واقعەوە بەدەستەوە دەدات، تا ئەندازەیەك کرداری هەیە. لەدیدی بێلاوە خودی ئەم تیۆرەیە لەبری ئەوەی تیۆریەکی زانستی بێت، خۆی تێزێکی دینیە. بەبڕوای بێلا لەو ڕووەوە کە دین کرداری کۆمەلاّیەتی پێویستی لەسەرشانە، دوبارە ناوەندی سەرقالێیە کلتوریەکانی ئێمە دەگرێتەوە. زۆریك لەبیریارانی دی بەتایبەتی لەم سالاّنەی دواییدا بە سەرنجدان لەپەیدابوونی بزوتنەوە جۆراوجۆر و تازەکانی دین و بەتایبەتی بونیادگەری دینی، بە دەرئەنجامی هاوشێوە گەیشتوون (کریگن ١٩٨٨، داگلس١٩٨٣، گێلسنێر١٩٧٧، گلاك و بێلا ١٩٧٦ گریلی١٩٧٣، هادین١٩٨٧، لاکمان١٩٦٧ و ١٩٩٠، مارتین١٩٦٩ و ١٩٩١. ستارك و بین بریج١٩٨٥، و وتنۆ١٩٧٦). بەبڕوای هەندێك لەم بیریارانە سەرەڕای بوونی عەقلگەری و بناغە زانستی و تەکنەلۆژیەکانی کۆمەڵگای مۆدێرن، دین خەسڵەتی بڵندایەتی (تراسندنتاڵی) خۆی لەدەستنادات.

لەلایەکی دیەوە هەروا بەرگری لەتیۆرەی عەلمانیەت دەکرێت و بەلگەکانی نەیارانی دەکەونە بەر رەخنە، هەرچەندە هەندێك لەلایەنگرانی ئەم تیۆرەیە قبوڵیانە کە عەلمانیەت رەنگە پرۆسەیەکی ناچاری و لەسەر یەك ریتم نەبێت (بێرگر١٩٧٣، دابلێر ١٩٨١، ١٩٨٧، لیچیز١٩٩١، ویلسۆن١٩٨٢). هەندێکی دی ئەم پرۆسەیە زۆر بە ئالۆز دەزانن و بڕوایانوایە ئەم پرۆسەیە هەم بە ئاراستەی عەلمانیەتە و هەم لەبەرامبەر هێزە عەلمانیەکاندا بەرگریدەکات و تەنانەت دژایەتیشیان دەکات (کەمپێل ١٩٧٢، ١٩٧٨، ١٩٨١، مارتین ١٩٧٨، شروت ١٩٨٩).

ئەو مەسەلەیە کە ئایا کۆمەڵگای مۆدێرن عەلمانی بووە یان بە ئاراستەی عەلمانیبوونە، پەیوەندیەکی زۆری بەوەوە هەیە چ مانایەکمان بۆ دین هەیە. زوربەی وتوێژەکان لەبارەی عەلمانیەتەوە لەو راستیەوە سەرچاوە دەگرێت کە بیریارە جیاوازەکان، تێڕوانینی زۆر جیاوازیان بۆ دین هەیە. ویلسۆن (١٩٨٢) دەڵێت ئەوانەی سود لەپێناسە وەزیفیەکان وەردەگرن، ئاراستەیان بەرەو رەدکردنەوەی تیورەی عەلمانیەتە، لەکاتێکدا ئەوانەی پێناسە زاتیەکان بەکاردەهێنن، رەنگە زیاتر بەرگری لەم تیورەیە بکەن. هەندێکی دی ئەوەندە پێناسێکی گشتگیر بۆ دین دەکەن کە وەك لەفەسڵی یەکدا بینیمان، هەمیشە شتیك دەمێنێتەوە کە بە دین دابنرێت. بۆ ئەم نوسەرانە عەلمانیەت مومکین نییە. لێرەوە پێناسی مەسەلەی عەلمانیەت بەگشتی مومکین نییە. بەلام بەهەرجۆریك بێت وەك بینیمان ئەم پێناسە گشتگیرانە زۆر کێشەئامێزن.

تەنانەت کاتێك دین بەشێوەیەکی سنوردارتر پێناسبکرێت، نەگونجان لەبارەی مەسەلەی عەلمانیەتەوە هەروا دەمێنێتەوە. زۆرێك لەم نەگونجانانە لەو مەسەلەیەوە سەرچاوەدەگرن کەعەلمانیەت چیە (ئەم مەسەلەیە پەیوەندیەکی نزیکی بە پێناسی دینەوە هەیە). ئەم زاراوەیە بەشێوەی جۆراوجۆر بەکارهاتووە. شاینەر لەمبارەیەوە لێکۆلینەوەیەکی ئاماری سودمەندیکردووە (١٩٦٦) ئەو شەش مانا یان بەکارهێنانی بۆ ئەم زاراوەیە دۆزیوەتەوە. یەکەم مانا پەیوەندی بە لەناوچوونی دینەوە هەیە. بەو شێوەیەی کە رەمز و تێز و دەزگا دینیەکانی پێشوو بایەخ و پلەی خۆیان لەدەستدەدەن و لەدەرئەنجامدا رێگە بۆ کۆمەڵگایەکی بێ دین دەکرێتەوە. مانای دوهەم پەیوەندی بە هەرچی زیاتر گونجانەوە هەیە لەگەڵ "ئەم دنیایە"دا، بەو مانایەی کە لەم دنیایەدا سەرنجی خەڵکی لەسەر هۆکارە میتافیزیکیەکان لاچووە و بەرەو پێداویستیەکانی ژیانی دنیایی و مەسەلەکانی راکێشراوە. بەپێی ئەم مانایە پەیوەندیەکان و گروپە دینیەکان، لەگەڵ پەیوەندی و گروپە نادینیەکاندا تێکەڵدەبن، بەشێوەیەك ناکرێت لەیەك جیابکرێنەوە. عەلمانیەت لەسێهەم مانادا بەمانای جیابونەی دین و کۆمەڵگایە. لەم مانایەدا دین پاشەکشێدەکات بۆ بواری تایبەتی و تایبەت دەبێت بە ژیانی تایبەتی و خەسڵەتێکی راستەوخۆ دەرونی پەیدادەکات و بالادەستی بەسەر هەر لایەنیکی ژیانی کۆمەڵایەتی لەدەرەوەی بواری







دیندا لەدەستدەدات. عەلمانیەت لەمانای چوارهەمدا بەمانای جێگرتنەوەی شێوازە دینیەکانە لەجێی باوەڕ و دەزگا دینیەکان. لەم مانایەدا زانین، رەفتار و ئەو دەزگایانەی کە سەردەمانێك لەسەر بناغەی دەسەلاتی خودایی وێنادەکران، دەبن بە کۆمەڵێك دیاردەی دروستکراوی مرۆڤ و دەکەونە ژێر بەرپرسیارێتی مرۆڤەوە. لێرەدا لەبەرامبەر دینێکی بەمرۆڤیکراوداین. عەلمانیەت لەمانای پێنجەمدا بەمانای دامالینی پیرۆزیە لەدنیا. جیهان خەسڵەتی پیرۆزیی لەدەستدەدات و مرۆڤ و سروشت دەبنە بابەتی رونکردنەوەی هۆیی (علّي)ـ عەقلانی و دەستتێوەردان. لەم جیهانەدا هێزە میتافیزیکیەکان هیچ دەورێکیان نییە. دواجار عەلمانیەت بەمانای جوڵەیە لەکۆمەڵگای "پیرۆزەوە" بۆ کۆمەڵگای "دنیایی"، بەو مانایەی کۆمەڵگا واز لەهەمووجۆرە پابەندبوونێکی بە بەها و کردارە تەقلیدیەکانەوە دێنێ و هاوکات لەگەڵ قبوڵی گۆڕانکاریدا، هەموو بڕیار و کردارەکان لەسەر بناغەیەکی عەقلانی و سودخوازانە ئەنجامدەدات. ئاشکرایە ئەم مانایەی عەلمانیەت لەهەموو ماناکانی تر کە تەنها پەیوەندی بە جێگەی گۆڕاوی دینەوە هەیە لەکۆمەڵگادا، بەرفراوانترە.

ئاشکرایە ئەم مانا جیاوازانە بەهیچ شێوەیەك رەدکەرەوەی یەك نین. ئەم جیاوازیە لەمانای عەلمانیەتدا پەیوەندی بە جیاوازی مانای دینەوە هەیە، و دەگاتە ئەوەی شاینەر بەپەیڕەوکردنی لەمارتین (١٩٦٥) بلێت کە گونجاوترین دەرئەنجامێك کە لەم مەسەلەیەوە دەتوانرێ وەربگیرێ، ئەوەیە کە دەبێ راستەوخۆ واز لەم زاراوەیە بهێنرێت. پێدەچێ ئەم ئەنجامگیریە هێندە هەڵسەنگێنراو نەبێت. مانای سەرەکی ئەم زاراوەیە هەمان لەناوچوون و رەنگە ونبوونی ئەو باوەڕ و دەزگا دینیانە بێت کە پەیوەندیان بەمانای یەکەم و دوهەم و چوارهەم و پێنجەمەوە هەیە. پرۆسەکانی ئەم مەسەلەیە رەنگە لەگەڵ یەکدا جیاواز بن و ناسینی هەر یەکێکیان پێویستی بە لێکوڵینەوەی ئەزمونگەرانە هەیە، بەلام پێدەچێت کە دوا دەرئەنجامی هەموو ئەم پرۆسانە دەبێت هەر یەك شت بێت. عەلمانیەت بەم مانایە دەشێ رووبدات یان نەدات، و رەنگە پرۆسەیەکی بەردەوامبێت و نەبێت. ئەگەر ئەمجۆرە عەلمانیەتە رووبدات، شتێکی وەك مانای دوهەم دەبێت، کە هەمان تایبەتبوونی دینە و یان رەنگە وەك یەکێك لەلایەنەکانی مانای دوهەم دەرکەوێت.

بەهەرحاڵ پێویستناکات واز لەزاراوە یان چەمکی عەلمانیەت بهێنرێ. ئەوانەی

ویستویانە چەمکی عەلمانیەت لەریزبکەنە دەرەوە، هەندێکجار لەبەرئەوەی ئەم زاراوەیە وەك چەکێك بەدەست نەیارانی دینەوە بۆ لاوازکردنی بەکاردەهێنرێ،، بۆتە هۆی ئالۆزیەکی زۆر (مارتین ١٩٦٥). ئەم هەڵوێستە لەهەڵوێستی کەسانێك راستر نیە کە دەڵێن تێکەڵکردنی باسەکان لەم مەسەلەیەدا چەکی دەستی ئەو کەسانە بووە کە چەمکی عەلمانیەتی کۆمەڵگای هاوچەرخ، بە چەمکێکی گونجاو بۆ بیرکردنەوە نازانن.

ئەم قسەیە بە مانای ئەوە نییە چەمکی عەلمانیەت چەمکێکی سادە و رێکوڕەوانە، یان بۆ ناسینی وردتری لایەنە جیاوازەکانی، پێویستمان بەزاراوە و چەمکی دی نییە. لەمڕووەوە دابلێر (١٩٨١) زاراوەی "دین لابردنی "Laicisation" بۆ گێڕانەوە بۆ پرۆسەکانی داماڵینی پیرۆزی Desacralisation، جیاکردنەوە و جیگۆڕکێی چەمکە دینیەکان لەکۆمەڵگای هاوچەرخدا بەکاردەهێنێت و جیاکاری لەنێوان عەلمانیەت لەئاستی تاکەکەس، کۆمەڵگا و لەناو خودی دیندا دەکات (١٩٨٥،١٩٨٧).

بەهەرحاڵ جیاوازی تێڕوانین بۆ مەسەلەی عەلمانیەت، تەنها جیاوازی نییە لەسەر زاراوە و چەمکەکان. وتوێژێکی زۆر لەبارەی ئەو مەسەلەیەوە کراوە کە ئایا کۆمەڵگای هاوچەرخ لەکۆمەڵگای رابردوو کەمتر یان زۆرتر دینیە (دینیبوون بە هەموو مانایەکی). هەندێکجار بەڵگە دەهێنرێتەوە کە دەکرێت ئێمە تێڕوانینێکی دروستمان بۆ ماهیەتی دینی کۆمەڵگاکانی رابردوو نەبێت، چونکە لەرابردوشدا هێندەی ئەمڕۆ رەگەزی دژە دینی هەبووە. بەپێی ئەم بەڵگاندنە چەمکی "سەردەمی باوەڕ" وەهمێکە کە زۆرتر لەدەرئەنجامی گرنگیدان بە بیروڕا و ئاراستەکانی دەستەبژێرەکانی کۆمەڵگای رابردوو کە زانیاریەکی زیاترمان لەبارەیانەوە هەیە و گرنگینەدان بە خەڵکی ئاسایی، دروستبووە(گۆدریچ١٩٧٥، داگلس١٩٨٣). لەبەرامبەر ئەم تێڕوانینەدا نوسەرانی وەك ویلسۆن(١٩٨٢) وایان وەڵام داوەتەوە کە تێڕوانینێکی لەمچەشنە لەسەر ئەو گریمانەیە دامەزراوە کە عەلمانیەت هەمان داماڵینی مەسیحیەتە Dechristianisation. ئەم بانگەشەیە دەگاتە ئەو ئەنجامەی کە رابردوو هێندەی ئەمڕۆ لەلایەك دنیایی ولەلایەك دینیبوو، و لەراستیدا بەو بانگەشەیە دەگات کە رابردوو زیاتر لەمڕۆ مەسیحی نەبوو، لەدەرئەنجامیشدا ئەمڕۆ کەمتر لەرابردوو دینی نییە. بەڵام پاشماوەی بتپەرستی و "دینی عامیانە" لەکۆمەڵگا







بە روکەش مەسیحیەکاندا، بەڵگەی ئەوەیە کە خەسڵەتی دژە دینی ئەوان، لەکۆمەڵگا هاوچەرخەکان زیاتر بووە. دیارە سڕینەوەی بتپەرستی، دینی عامیانە و باوەڕ و کردارە جادویەکان لەسەردەمی رابردوودا بەو ناوەی کە دینی راستەقینە نین، وەك هەمان ئەو کارەی تێرنەر کردی، کارێکی ئەوەندە راست نیە. کارێکی وا بەمانای ئەوەیە سیستەمەکانی باوەڕ لەزۆربەی کۆمەڵگا سەرەتایەکاندا بەوتەزای "دین" دانەنێین، و ئەم وتەزایە بەبێهۆ تەنها بۆ دینە گەردونیەکانی وەك مەسیحیەت و بودایی و ئیسلام دابنێین. تەنانەت لەم حاڵەتەشدا زۆرینەی خەڵك تەفسیرێکی وا بۆ ئەم دینە گەورانە دەکەن، کە هێندە لەگەڵ مانای دینی جێی سەرنجی تێرنەردا ناگونجێ.

بەهەرحاڵ تیرنەر هەڵوێستێکی راستەوخۆ دژ بە عەلمانیەت ناگرێت. ئەو دەڵێت بیریارانی تەبا و نەیاری عەلمانیەت، هەردوکیان تا ئەندازەیەك راستدەکەن. لەسەردەمی دەرەبەگایەتیدا مەسیحیەتی کاسۆلیك جێی ئارەزووی چینی باڵا یان ئەرستۆکراتەکان بوو، بەڵام لەناو دیهاتیەکاندا هێندە دەسەڵاتی نەبوو. لەرابردوودا هیچ سەردەمێکی زێڕین نیە کە بکرێ وەك خاڵی بەرامبەر هەلومەرجی هەنوکە رابگیرێ. تەنها شتێك کە هەبوو سەردەمێکی دینی زێڕین بوو، بۆ دەستەبژێرەکانی کۆمەڵگا کە زۆرتر وەك هۆکارێکی عەقیدەتی بۆ پاراستنی مافی مولکایەتی و میرات کاریدەکرد. دین لەم قۆناغەدا یارمەتی چینی مولکداری دەدا، بۆئەوەی جنسیەت بەتایبەتی لەبارەی ژنانەوە کونترۆڵبکات، و سیستەمی دابەشکردنی دارایی لەسەر بناغەی سەرەتازایین Primogenitore بەهێزبکات، کە بەئاراستەی پاراستنی پاوانی مولکیەتی زەمین لەدەست ئەرستۆکراتەکاندا کاریدەکرد. دێهاتیە بێ زەمینەکان کەمتر راکێشانیان لەکاسۆلیسیزمدا دەبینی و بەرامبەری بێهودەیی و تەنانەت دوژمنیان پیشاندەدا، لەبری ئەوە لایەنگریی نەریتە ئیلحادیەکان یان عامیانەکان لەجۆری خورافی یان جادوویان دەکرد (هەروەها تەماشای ئابێرکۆمبی و ئەوانی دی بکەن ١٩٨٠).

تەنانەت بە قبوڵکردنی ئەگەری جیاوازی نێوان باوەڕ و کرداری دینی دێهاتیەکان و نەجیبزادەکان، بەو هۆیانەی کە لەسەرەوە هێناماناوە، بە سەختی دەکرێت ئەم جیاوازیانە وەك بەڵگەیەکی دژ بە تیورەی عەلمانیەت لەبەرچاو بگیرێت. ئەم

بەڵگاندنە کە کاریگەری مەسیحیەتی کاسۆلیکی لەسەردەمی دەرەبەگایەتیدا زۆرتر لەسەر بناغەی تێبینی گواستنەوەی مۆڵکایەتی بوو، تا ئەندازەیەکی زۆر جێی گومانە. هەرچەند ڕەنگە چینی موڵکداری ئەو قۆناغە سودی لەمەسیحیەتی کاسۆلیکی بەوشێوەیە وەرگرتبێ، بەڵام گوتنی ئەوەی کە لەبنەڕەتدا مەسیحیەت لەسەدەکانی ناوەڕاستدا ئەم دەورەی بینیووە، گومڕاکەر و یەکلایەنەیە. لەم ئاراستەیەدا هەرئەوەندە بەسە بیر لەئایینزای مەریەمی پاکیزە و قەدیسان بکەینەوە، بۆئەوەی لەوە تێبگەین مەسیحیەت وەك باوەڕ و کرداری خەڵکی پەسەند، چەند گرنگی هەبووە و چەند سەرنجی لەپەیوەندی دێهاتیەکان دەدا. وەك چۆن لەزۆرێك لەکۆمەڵگا دێهاتیەکانی ئەمڕۆدا بە تایبەتی لەجیهانی سێهەم و وڵاتە تازە پەرەسەندوەکاندا کاردەکات. وەك چۆن ئەمڕۆ مەسیحیەت بەگشتی لەپاڵ باوەڕ و کرداره ئیلحادی و عامیانەکاندا لەم ناوچانەدا ڕەونەقی هەیە، ڕەنگە لەئەوروپای سەردەمی فیودالیشدا هەر بەمشێوەیە پێکەوە ژیانی لەگەڵ ئیلحاد دینی عامیانەدا هەبوبێت.

بەڵگاندنێکی تری نەیارانی تیورەی عەلمانیەت جەخت لەسەر ڕەواجی زۆرێك لەعورفە تایبەتی و تاکانەییەکانی دەرەوەی بواری دینی ڕێکخراو دەکات، لەپەرستن و عیبادەتی تایبەتیەوە بگرە تا خورافات، لەگوێگرتن لەبەرنامە دینیەکانی رادیۆوە بگرە تا ئارەزووی دەستخوێندنەوە و خوێندنەوەی ئەستێرەی بەخت لەگۆڤارەکاندا. لێرەدا دوبارە مەسەلەی پێناسی دین دێتەوە پێشێ. ئەوانەی نکوڵی لەعەلمانیەت وەك خەسڵەتێکی تایبەتی کۆمەڵگای هاوچەرخدەکەن، ئارەزووی ئەوە دەکەن لایەنگری لەپێناسە گشتگیرەکان بۆ دین بکەن.

وەك وێلسۆن گوتوێتی(١٩٧٦) دوهەم مەسەلەی ئەم بەڵگاندنە ئەوەیە کە ئەگەر بڕوای دینی باڵادەست بەسەر چالاکیە تایبەتیەکاندا بەهیچ شێوەیەکی دەزگایی و گشتی دەرنەکەوێت، خودی ئەم مەسەلەیە بەڵگەی جێگەی لەرزیوی دینە لەکۆمەڵگای هاوچەرخدا. وێلسۆن ئەو ڕاستیە قبوڵدەکات کە لەراستیدا زۆرێك لەتاکەکان ڕەنگە باوەڕ یان کرداری دینی تایبەتی لەناو کۆمەڵگایەکی بەگشتی دنیاییدا بۆ خۆیان بپارێزن. بەبڕوای ئەو **عەلمانیەت "پرۆسەیەکە کە تیایدا دەزگاکان، کردارەکان و هوشیاری دینی، گرنگی کۆمەڵایەتی خۆیان لەدەستدەدەن"**





(١٩٦٦، لا١٤). لەدەستدانی گرنگی کۆمەڵایەتی، دەتوانێ قۆناغێك بێت تەنانەت بە ئاراستەی سڕینەوەی باوەڕی دینی تایبەتی.

دیارە دامێنی لەدەستچوون و لەدەستدانی گرنگی کۆمەڵایەتی دین، مەسەلەیەکی ئەزمونیە، بەڵام دۆزینەوەی ئامێرێکی جێی متمانە بۆ ئەندازەگیری ئەم مەسەلەیە کارێکی ئەستەمە. ئەندازەگیری دامێنی بڕوای دینی شەخسی یان تایبەتی، تەنانەت لەمەش دژوارترە. بەئاشکرا ئەو ئامارانەی پەیوەندی بە پەیوەستبونو ئامادەبوون لەکەنیسە هەیە، وەك دیاریکەری بڕوای دینی یان گرنگی دین لەژیانی کەسانێکدا کە لەکەنیسە ئامادەدەبن، جێی متمانە پێکردن نیە. بۆ نمونە لەویلایەتە یەکگرتوەکاندا ئامادەبوون لەکەنیسەدا زۆر لەئینگلتەرا و زۆربەی وڵاتانی ئەوروپا زیاترە، بەڵام ڕەنگە ئەمە لەبەرئەوە بێت لەوڵاتە یەکگرتووەکاندا ئامادەبوون لەکەنیسە زۆرتر لەئامادەبوون لەبەریتانیا، دەرخەری ئەندامێتی لەکۆمەڵ، لایەنگری بەها کۆمەڵایەتی و نەتەوەیەکان بێت و ئاماژە بێت بۆ ناوی باش (هێربێرگ ١٩٥٦، ویلسۆن ١٩٦٦، ١٩٨٢). پاشان کەنیسە و گروپە دینیە ئەمریکیەکان، تا ئەندازەیەك دنیاییبوون (لاکمان١٩٦٧،لا٣٦). لەلایەکی دیەوە هەڵسەنگاندنی باوەڕەکان ڕاستەوخۆ لەڕێگەی لێکۆڵینەوە ئاماریەکانەوە، ڕەنگە دەرئەنجامی گومڕاکەرانەی لێبکەوێتەوە. بۆ نمونە ئەگەر پرسیار لەخەڵکی دەربارەی ڕادەی بڕوابوونیان بەخودا بکرێت، وەڵامەکانیان زۆرتر ڕەنگە پیشاندەری ئەو مەسەلەیە بێت کە خەڵکی چ وەڵامێك بۆ ئەمجۆرە پرسیارانە بە گونجاو دادەنێن و فێربوون چۆن وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەنەوە، و ئەم وەڵامانە ڕەنگە لەبارەی باوەڕی شەخسی و دەروونی خۆیانەوە، زانیاریەکی هێندە سودمەند نەدات بەدەستەوە.

بەسەرنجدان لەم مەسەلانە، بەڵگە هەبووەکان زۆرتر لەقازانجی ئەو تێڕوانینانەن کە دین بەمانا هەمەکیەکەی لایەنیکەم تائەو شوێنەی پەیوەندی بە مەسیحیەکانەوە هەیە، لەکۆمەڵگا پیشەسازیەکانی ڕۆژئاوادا ڕوو لەلەناوچوونە. ئاکاوایوا (١٩٧٩) لەلێکۆڵینەوەی دراوەکانی پەیوەست بە ئەمەریکای لاتین و وڵاتەیەکگرتووەکان و ئەوروپا یان هەموو جیهانی مەسیحیەوە، بەو دەرئەنجامە دەگات کە "دینامیکیەتی کارکردنی دینی لەهەموو شوێنێکدا، سستبوونی دینی کەنیسەیی و کەمتازۆر هەمووجۆرە بڕوایەکی دینی و لەوانە بڕوابوون بە خودا، ئاشکرادەکات" (لا٣٨٧).





نمونەی ئەم لاوازیەی بڕوای دینی ئەوەیە کە دین لەوڵاتە پرۆتستانتەکانی باکوری ئەمەریکادا، زۆرتر روو لەلەناوچونە تا لەوڵاتە کاسۆلیکیەکانی ناوچەی دەریای سپی. بەهەرحاڵ هوڵەندا و بەلژیکا لایەنیکەم تا ئەم دواییانەش لاوازی دینی کەمتریان لەخۆیان پیشانداوە، و ویلایەتە یەکگرتووەکان رەنگە لەهەمووان کەمتر شایەتی لەناوچوونی مەسیحیەت بێت، دیارە لەسەر بناغەی ئامادەبوون لەکەنیسە و دیاریکەرە لێکچوەکانی دی، کە زۆر جێگەی متمانەش نین. لادێکان و ناوچە دێهاتیەکان دینیترن لەناوچە شاریەکان. ژنان لەپیاوان دینیترن و هەر بەمشێوەیە، ژنانی ماڵەوە لەژنانی ئیشکەر باوەڕدارترن. تەندروستان و لاوان لەتەمەن مامناوەندیەکان و چینی ناوەڕاست لەچینی کرێکار دینیترن. کرێکارانی پیشەسازی لەهەموو گروپ و چینە کۆمەڵایەتیەکانی دی، نادینیترن. لەناوچوونی باوەڕ و کارکردنە دینیەکان لەنێوان پرۆتستانت و کەلیمیەکاندا لەکاسۆلیکەکان زیاترە، ئەگەرچی پێدەچێ لەم بوارەدا کاسۆلیکەکانیش خەریکە لەپرۆتستانتەکان نزیکبەبنەوە.

تیورەکان و ئەو رونکردنەوانەی سەبارەت بە رەوتی گشتی بەئاراستەی عەلمانیەتن، بەر لەهەرکەسێك دەڵێن ئەم پرۆسەیە بەئاشکرا پەیوەندی بە پلەی پیشەسازیبوون و شاریبوونەوە هەیە، ئەگەرچی رەنگە ئەم پەیوەندیە ئەوەندە سادە و ئاشکرا نەبێت. پەیوەندی نێوان پیشەسازیبوون و عەلمانیەت بەهیچ شێوەیەك کامڵ نییە. بۆ نمونە ویلایەتە یەکگرتوەکان یەکێك لەپیشەسازیترین نەتەوەکانی دنیایە، بەڵام بەناچار عەلمانیترین میللەت نییە. عەلمانیەت دەرئەنجامی گۆڕانی کۆمەڵایەتی ئاڵۆزە کە هەم لەدەرئەنجامی پرۆسەی پیشەسازیبوون و شاریبوونەوە دروستبوون و هەم لەپەیوەندیدا بوون بەم پرۆسەیەوە و لەراستیدا هۆکاریبوون. هەر لەبەرئەمە بۆ ناسینی ئەوەی بۆچی عەلمانیەت روویدا، دەبێت روانگەیەکی مێژووی و تەتبیقی گەلێك فراوانتر بگرینەبەر.

رونکردنەوەی ئەم پرۆسەیە پەیوەندی بەوجۆرە تیورەیەوە هەیە کە کەسی رونکەرەوە لەبارەی دەوری دین لەکۆمەڵگادا قبوڵیدەکات. رونکردنەوە لەسەر بناغەی سستبوون یان لەناوچوونی دین، پەیوەندی بەوەوە هەیە ئەو کەسە لەبارەی هۆی دروستبوونی سەرەتایی دینەوە چ تێڕوانینێکی هەیە. ئەگەر دین وەك دەرئەنجام یان







کاردانەوە بەرامبەر بە مەحرومیەت و ستەمکاری روونکرێتەوە، رونکردنەوەی عەلمانیەت دەبەسترێتەوە بەپەرەسەندنی فراوانی و دیموکراسیەوە. ئەگەر دین بە دەرئەنجامی کەمی زانین بزانرێت، عەلمانیەت بە دەرئەنجامی پەرەسەندنی زانست دادەنرێت. ئەگەر دین بەبەرهەمی ترس و نادڵنیایی بزانرێت، عەلمانیەت بە دەرئەنجامی توانای روو لەزیادی ئێمە بۆ رونکردنەوە و کونترۆڵی جیهانی سروشتی دادەنرێت. ئەگەر دین وەك کاردانەوەیەکی نیوڕۆتیکی لەبەرامبەر هەلومەرجی ژیان لەئاستی گشتیدا دابنرێت، عەلمانیەت بەدەرئەنجامی ئەو واقعیەتە دادەنرێت کە ئێمە وەك رەگەزێك لەپرۆسەی پەرەسەندنماندا گەیشتوینەتە قۆناغی کامڵی. ئەگەر دین وەك هۆکارێکی رێکخەری کۆمەڵگا تەماشا بکرێت، عەلمانیەت بە دەرئەنجامی ئەو واقعیەتە دادەنرێت کە پێویستمان بە زنجیرەیەك بەهای گونجاوتر لەهەلومەرجی تازەدا هەیە. ئەگەر دین بە هۆکاری بەخشینی مانا بە بوونی مرۆڤ دابنرێت، ئەوا عەلمانیەت بە بەرهەمی قەیرانی مانا یان پرۆسەی گەڕان بەدوای رێگەیەکی تازەدا بۆ ئامادەکردنی مانایەکی گونجاوتر لەگەڵ هەلومەرجی هەبوودا دادەنرێت.

دواجار دەبێت بڵێین لەم مەسەلەیەوە وادەردەکەوێت کە ئەگەر تیورەیەکی قانعکەرمان لەبارەی دینەوە نەبێت، تیورەیەکی بەتەواوی قانعکەرمان لەبارەی عەلمانیەتیشەوە نابێت. پاشان گەر دەمانتوانی تێبگەین چ شتێك لەکۆمەڵگای هاوچەرخدایە کە بەئاراستەی لاوازکردنی دین کاردەکات، ئەوسا لەبارەی ئامادەبوون و دەسەڵاتی دینەوە لەرابردوودا و لەکۆمەڵگاکانی دیشدا، زانینێکی زیاترمان بەدەستدەهێنا. کەوابوو مەسەلەی عەلمانیەت گرنگیەکی تیوری دەستنیشانکەری هەیە.

عەلمانیەت ئەگەرچی پەیوەندی بە پیشەسازیبوون و شاریبوونەوە هەیە، بەڵام دەبێت ئەم پرۆسەیە بەپێی گۆڕانیکی کۆمەڵایەتی فراوانتر و بنچینەیتر لەبەرچاو بگرین، کە هەم لەم گۆڕانانەوە سەرچاوەیگرتووە و هەم بەهێزیاندەکات. رەنگە وەك فیبەر گوتویەتی تێڕوانینی باڵادەست ئەوەبێت کە پەرەسەندنی عەقڵانیەت لەرۆژئاوادا کلیلی تێگەیشتنی پرۆسەی عەلمانیەتە. ئەم تێڕوانینە ئەو واقعیەتە روونەدەکاتەوە کە وڵاتە پرۆتستانەکان زۆرتر لەوڵاتەکانی تر، لەژێر کاریگەری عەلمانیەتدان. ئەم پرۆسەیە دوو رووی هەیە کەبیریارانی جیاواز، جەختی جیاواز

لەسەر یەکێکیان دەکەن. لەرووی یەکەمەوە دەبێ بگوترێ هەندێك هۆکار هەن تایبەتن بە مەسیحیەت و بە بڕوای فیبەر بونەتە هۆی پرۆتستانیزم و بەتایبەتی پرۆتستانیزمی کالڤینی. لەلایەنی دوهەمەوە هەندێك هۆکار هەن کە تایبەت نین بە مەسیحیەت، بەڵکو پەیوەندیان بە گۆڕان و پەرەسەندنی شێوازەکانی بیرکردنەوە و شێوازەکانی بینین بۆ جیهان هەیە، و بە جەمسەرەکەی تری مەسیحیەت یان لەراستیدا دین بە مانا هەمەکیەکەی دادەنرێن.

بێرگەر لەشیکردنەوە کاریگەرەکەی خۆیدا (١٩٧٣) جەخت لەسەر کۆمەڵێك هۆکاردەکات، کە پەیوەندیان بەنەریتی مەسیحیەوە هەیە. ئەو باسی ئەم مەسەلەیە دەکات کە "نەریتی دینی رۆژئاوایی تا چ ئاستێك دەیتوانی تۆوی عەلمانیەت لەبواری خۆیدا، پەرشوبڵاو بکاتەوە" (لا١١٦). دیارە ئەمە بەو مانایە نیە کە بێرگەر بڕوایوایە مەسیحیەت مەیلێکی زاتی و خۆبەخۆی تێدایە بە ئاراستەی عەلمانیەت. بێرگەر ئەم راستیە قبوڵدەکات کە زۆرێك لەم هۆکارانەی لەم مەسەلانەدا دەستیان هەیە، پەیوەندیان بە نەریتی دینیەوە نیە، بەڵکو بەتەواوی هۆکاری کۆمەڵایەتی و ئابورین. بەهەرحاڵ بە بڕوای بێرگەر ئەم هۆکارانە بەمانایەکی تایبەت زیاتر کاریگەریان لەمەسیحیەت کردووە، تاکو لەدین بە مانای گشتی. ئەم هۆکارانە ئاراستەگەلێك دەهێننەئاراوە و بەهێزدەکەن کە لەناو خودی نەریتی مەسیحیەتدا بوونی هەیە. مەسیحیەت لەناو جۆرێك فەزای تایبەتی کۆمەڵایەتیدا مەیلێك بە ئاراستەی عەلمانیەت پیشاندەدا، بەهەرحاڵ لەدینەکانی تردا ئەگەر کۆمەڵگا شایەتی پەرەسەندن، پیشەسازیبوون و شاریبوون بێت، ئەم مەیلانە دروستنەدەبوون و لەدەرئەنجامدا ئەم دینانە روبەڕووی پرۆسەی عەلمانیەت نەدەبونەوە. لەمڕووەوە دەکرێ بگوترێ مەسیحیەت بەدەستی خۆی گۆڕی خۆی هەڵدەکەنێت.

بەبڕوای بێرگەر ئەم مەیلانەی تایبەت بە مەسیحیەت، پەیوەندیان بەرەگ و ریشەکانی لەکلیمیەتدا هەیە. ئەم مەیلانە لەدینی کاسۆلیکیدا "کۆنتڕۆلکرابوون"، بەڵام لەبزوتنەوەی پرۆتستانتی چاکسازی دینیدا ئازادکران. ئەم بزوتنەوەیە هاوکاتبوو لەگەڵ جۆرێك گۆڕانکاری لەبونیادی چینایەتی و جیگۆڕکێی فیودالیزمدا. هەر ئەم بزوتنەوەیە بوو کە هێزە عەلمانیەکانی لەناو مەسیحیەتدا رزگارکرد.

دیارە ئەم تیورەیە بە توندی بیرهێنەرەوەی ماکس فیبەرە. بێرگەر







لەشیکردنەوەکانی خۆیدا زۆر پەیڕەوی لەفیبەر دەکات. تەنها جیگۆڕکێیەك کە بێرگەر لەتێڕوانینی سەرەکی فیبەردا لەبارەی گۆڕانی مەسیحیەت و کۆمەڵگای ئەوروپاییەوە ئەنجامیدەدات، ئەوەیە کە لەبری "عەقلانیەت"ی فیبەر، سود لەزاراوەی "هێزە هاندەرەکانی عەلمانیەت" وەردەگرێ.

بیرگەر جەخت لەسەر مەیلی پەیوەندیدار بە عەقلانیەتی روو لەزیادبوون دەکات، کە فیبەر ناوی دەنێت "ئەفسانە دامالین لەدنیا". کلیمیەت، سیحر و سۆفیگەری و هاوشێوەکانی رەدکردبۆوە، و مەسیحیەتیش وەك کلیمیەت ئەم هەڵوێستەی وەك عەقلانیەتی ئەخلاقی قبوڵکرد. بەبڕوای فیبەر کەنیسەی مەسیحی سەرەتا، هەنگاوێکی روو لەدواوەی هەڵهێنابوو. لەڕاستیدا ئەم کەنیسەیە تاکانەیی خودایی کلیمیەتی کردبوو بە بتێك و تائەندازەیەك سۆفیگەری بەرپاکرد و رەگەزە سیحراوی و نهێنی ئامێزەکانی سەرلەنوێ لەناو مەسیحیەتدا هێنابووە ئاراوە. بەڵام هێزەکانی هاندەری عەقلانیەت لەمەسیحیەتدا بەهێزتربوون لەوەی یەکسەر لەناوبچن. ئەخلاقی ئەم دنیاییە لەنەریتی مەسیحیدا پارێزراو مایەوە. لەلایەکیدیەوە ماهیەتی بونیادگەرانەی مەسیحیەت، واتە ئارەزووی بۆ تواندنەوەی جیهان، لەسەرتاسەری سەدەکانی ناوەڕاستدا بەهۆی ئەو گروپانەوە پارێزراوبوو کە ئیلهام وئومێد و رینماییان لەم ئارەزووەوە بۆ شۆڕشکردن وەردەگرت. ماهیەتی ئەخلاقی سەرەتای مەسیحیەت و پەیوەندی بە دادپەروەریەوە، هەرگیز فەرامۆش نەکرابوو.

بەبڕوای فیبەر مەیلەکانی هاندەری عەقلانیەت لەمەسیحیەتدا بونە هۆی دروستبوونی پرۆتستانیزم بەتایبەتی کالڤینیزم، واتە هەمان ئەو دینەی کە بەبڕوای فیبەر لایەنیکەم لەڕووی عەقلانیەتی وێنەییەوە، بەعەقلانیترین شێوەی دینی لەمێژووی مرۆڤایەتیدا دادەنرێت. بەبڕوای بێرگەر هەر ئەم عەقلانیەتە پرۆتستانتیە، لەپشت عەلمانیەتەوە رادەوەستێت. لێرەوە پرۆتستانیزم پێشەکی عەلمانیەتە. "پرۆتستانیزم لەبەراورد بەکاسۆلیزمدا، بواری شتی پیرۆزی لەواقعدا زۆر کورتکردەوە" (بێرگەر،١٩٧٣،لا١١٧). پرۆتستانیزم رەهەندە نەریتی و ئاینیەکانی کاسۆلیسزمی تاڕادەیەکی زۆر سڕیەوە و نهێنی و مۆجیزە و جادوی دورخستەوە.

چەمكی خودای پرۆتستانیزم راستەوخۆ ترانسندنتاڵیە كە لەگەڵ ئەوەشدا جیهانی دروستكرد، بەتەواوی خۆی لێ دورخستەوە. بەبڕوای بێرگەر ئەم جیابوونەوە بنەڕەتیەی بواری پیرۆز و ناپیرۆز لەپرۆتستانیزمدا گەلێك گرنگە. پرۆتستانیزم پەیوەندی و بەركەوتنی نێوان خودا و مرۆڤی ئەوەندە كەمكردەوە كە پچڕانی ئەم زنجیرەیە، پێویستی بەهەوڵێكی زۆر نیە. ئەم مەیلەرەگ وریشەی لەیەكەمین گۆڕانكاریەكانی نەریتی مەسیحی- كلیمیەتدا هەیە: "دەبێ بۆ رەگ و ریشەكانی عەلمانیەت لەیەكەمین سەرچاوەكانی دینی ئیسرائیلی كۆندا بگەڕێین"(لا ١١٩). بەهەرحاڵ هەر ئەم بزوتنەوەیەی ژیاندنەوە و بەهێزكردنی دین بوو كە بە بزوتنەوەی ریفۆرمی دینی دادەنرێت، بەشێوەیەكی ناكۆكیئامێز تۆوی لەناوچونی دینی چاند.

هۆیەكی چارەنوسسازی دی ئەم مەسەلەیە كە لەناوەندی نەریتی مەسیحیدایە، ئەوجۆرە دەزگا دینیەیە كە مەسیحیەت دروستیكرد، واتە هەمان كەنیسە. ئەگەر بێرگەر لەمبارەیەوە راستی گوتبێت، ئەوا مەسەلەكە زۆر سەرسوڕهێنەر دەبێت، چونكە كاوتسكیش (١٩٢٥)بۆ سەركەوتنی مەزن و پەرەسەندنی مەسیحیەت لەسەرتاسەری جیهانی رۆمی و مانەوەی لەم جیهانەدا، جەخت لەسەر ئەم مەسەلەیە دەكات. بەبڕوای بێرگەر دەزگای كەنیسە دواجار كەوتە ئاراستەی عەلمانیەتەوە، چونكە ئەم دەزگایە هەڵگری جۆرێك پسپۆڕێتی بەزەبر و زاتی بوو. ئەم پسپۆڕێتیە خەسڵەتی هاوبەشی دین لەمێژووی دینەكاندا نەبوو. ماناكانی ئەم پسپۆڕێتیە ئەوەبوو كە دەكرێ بوارەكانی تری ژیان زیاتر بەبوارێكی جیاو ناپیرۆز بسپێرێتو، لەدەرئەنجامدا ئەو بوارانە لەسنوری دەسەڵاتی شتە پیرۆزەكان بهێنێتە دەرەوە. ئەمە بەو مانایەیە كە دەكرا بوارە نادینیەكانی تر بەئاسانی بخرێنە ناو پرۆسەی عەقلانیەت و بەكارهێنانی بیر و زانینی تازە و زانستەوە. بەمشێوەیە كەنیسەو دین رۆڵێكی كەمتر گرنگیان لەرێنمایكردنی ژیانو تەفسیری جیهاندا بینی، و كاریگەریەكانی زیاد لەجاران كەمدەبۆوە.

نەهێشتنی پاوانكردنی دەزگایەك بۆ بابەتە دینیەكان و پرۆسەی داماڵینی مەركەزیەتی دینی كە هاوڕێی پرۆتستانیزم بوو، لەبەهێزكردنی عەلمانیەتدا دەورێكی گرنگی هەبوو. ویلسۆنیش (١٩٦٦) لەمڕووەوە لەگەڵ بێرگەردا هاوڕایە، بەڵام بۆ ئەم







مەسەلەیە لەپرۆسەی عەلمانیەتدا تەنها دەور بەهۆیەكی گرنگنادات، بەڵكو بە دەرئەنجامی ئەم پرۆسەیەی دەزانێت. بەبڕوای ویلسۆن دەستەی (فرقە)متودیزم زۆر گرنگی لەپەرەسەندنی عەقلانیەت لەبەریتانیادا هەبوو، چونكە توانیبووی گروپە كرێكاریەكان بەلای خۆیدا رابكێشێ. لەدەرئەنجامدا ئەم دەستەیە، هەموو شتێكی لەنێوان گروپێكی كۆمەڵایەتی تازە لەدایكبوودا بەهێزكردبوو. ئەم دەستەیە دەستگەیشتن بە دیسپلینێكی دەرونی لەناو رێكخستنێكی كۆمەڵایەتی تازەدا بۆ ئەم گروپە ئاسانكردبوو، و ئەم دیسپلینە دەرونیەی كردبووە جێنشینی دیسپلینێكی دەرەكی كە ژیانی كۆمەڵایەتی تەقلیدی رێكدەخست، بەڵام لەئەنجامی شۆڕشی پیشەسازیەوە خەریكبوو لەناودەچوو.

بەهەرحاڵ فرەگەری دینی نەك هەر یارمەتی پەرەسەندنی عەقلانیبوونیدا، بەڵكو كاریگەریەكی راستەوخۆی كردە زۆرێك لەخەڵكی بۆئەوەی پشتبكەنە دین. ئەو هەلومەرجەی هەركەس دەیتوانی لەنێوان تەفسیر و دەزگا جیاواز و رەقیبە دینیەكاندا، كە بەوتەی بێرگەر لە"بازاڕی دین"دا پێكەوە ململانێیان دەكرد، یەك تەفسیرو دەزگا بۆ خۆی هەڵبژێرێ، لەدەرئەنجامدا دەبووە هۆی كەمبونەوە یان لەدەستدانی دەسەڵاتی دیدی دینی. ئەم هەلومەرجەی فرەیی دینی كە كەسێك دەیتوانی دینەكەی بۆخۆی هەڵبژێرێ، لەناواخندا هەمان ئەو هەلومەرجە بوو كە كەسێك دەیتوانی هیچ دینێك بۆخۆی هەڵنەبژێرێ. كاتێك تێزێك یان دەزگایەكی دینی بە دەركردنی تێز و دەزگاكانی دی باڵادەستی بەسەر كۆمەڵگادا پەیدادەكات، پەیدابوونی دیدگایەكی نادینی لەناو كۆمەڵگادا لەلایەن هیچ گروپێك یان كەسێكەوە تەحەمولناكات.

نابێت ئەوەمان لەبیر بچێت كە فرەگەری دینی لەوڕووەوە كە جۆرێك راكردنی دینی ناڕێكخراو بۆ نەیاران و چینی كرێكار دەڕەخسێنێت، تا ئەندازەیەك رێگەی لەگەشەكردنی پرۆسەی عەلمانیەت گرتووە. ویلسۆن ئەو واقعیەتە قبوڵدەكات، میتۆدیزم نەك هەر عەقلانیەتی بەهێزكرد، بەڵكو رووداوێكی گرنگی لەژیانەوەی دینی بەرێخست. لەگەڵ ئەمەشدا **فرەگەری لەدور مەودادا نەك دین، بەڵكو عەلمانیەت بەهێز دەكات. پرۆسەی عەلمانیەت قۆناغێك فرەگەری دینی بەجێهێشت و ئەمجۆرە فرەگەریە، دەبێ بە یەكێك لەلایەنە گرنگەكانی پرۆسەی عەلمانیەت بژمێرێت.**

تیۆرەی عەلمانیەتی بێرگەر ڤانعیپێکەرە و لەگەڵ ئەو راستیەدا دەگونجێ کە تەنها دنیایی مەسیحی و بەتایبەتی پرۆتستانیزمە کە زۆرترین پلەی عەلمانیەتی ئەزموونکردووە. بەڵام رەنگە بێرگەر زیاد لەسنور جەخت لەسەر هۆکارە دەرونیەکانی مەسیحیەت بکات. دەکرێ گرنگی دەزگایی کەنیسەیی و فرەگەری دینی قبوڵبکرێت، بەڵام قبوڵکردنی ئەو تێروانینەی عەلمانیەت دەرئەنجامی مەیلە زاتیەکانی مەسیحیەتە کە پاش کۆنترۆڵی هەزار و پێنج سەد ساڵەی کاسۆلیسیزم بەهۆی هەندیك گۆڕانی کۆمەڵایەتیەوە هەڵچووە، زۆر ئەستەمە. بەهەمانشێوە ئەو وتەیە راستە کە گۆڕانکاریە کۆمەڵایەتیەکان گرنگیەکی بنچینەییان هەیە، بەڵام ئەستەمە بتوانرێ بگوترێ ئەم گۆڕانکاریانە کاریگەریان لەسەر وڵات و کۆمەڵگا مەسیحیەکان زیاتر لەوڵاتانی دی کردووە. رەنگە بتوانرێ بگوترێ مەسیحیەت لەم گۆڕانە کۆمەڵایەتیانەدا کەمتازۆر دەوری هەبووە یان زەمینەسازی بۆکردووە یان نەیتوانیووە رێگەیان لێبگرێت. بەکورتی ئەم پەیوەندیە ئاڵۆزترە لەوەی تیۆرەی بێرگەر باسیدەکات.

ویلسۆن جەختێکی زۆرتر لەسەر ئەو هۆکارانە دەکات کە لەدەرەوەی نەریتی مەسیحین و باڵادەستن لەپرۆسەی عەلمانیەتدا. لێرەشدا گەشەکردنی عەقڵانیەتە کە دەوری سەرەکی دەبینێ، بەڵام وێلسۆنیش وەك زۆربەی ئەو نوسەرانەی جەخت لەسەر هۆکاری دەرەکی دەکەن، گرنگیەکی زۆر بۆ گەشەکردنی سەربەخۆی زانین و میتۆدی زانستی دادەنێت، نەك مەیلە زاتیەکانی مەسیحیەت. بەڵگاندنی ویلسۆن ئەوەیە کە پەرەسەندنی زانستی، تەفسیرە دینیەکانی بۆ دنیا لاوازکردووە. ویڵسۆن بەتایبەتی گرنگی بۆ میتۆدی زانستی لەبارەی کۆمەڵگاوە دادەنێت، هەمان ئەو هۆکارەی بێرگەریش لەلێکۆڵینەوەکانی دواییدا (١٩٧١) جەختی لەسەر دەکاتەوە. مژدەی هەزارەیی دین و توانای رەوایەتی دروستکردن و ئاراستەکردنی رێکخستنی کۆمەڵایەتیەکەی لاوازبووە.

لێرەشدا جیابونەوەی بوارە کۆمەڵایەتیەکان و پسپۆڕبوونی دەزگایی دین، گرنگییان هەیە. خەڵکی بۆ دادپەروەری و داواکاری هەلومەرجی باشتر، چیدی ڕووناکەنە کەنیسە و ژیانی ئەو دنیا، بەڵکو رودەکەنە دەزگا و پرۆسە سیاسیەکان. چاوەڕێی ئەوە لەدەوڵەت دەکرێت کە وەڵامی ئەم پێداویستیانە بداتەوە. هەنوکە





ئەنجومەنەکانی یاسارێژی و سیاسەتمەداران زیاد لەجاران رودەکەنە پێوەرە ئەخلاقیەکان، لەگرنگی دەوری کەنیسە لەپێناسکردن و ناساندنی ئەم پێوەرانە کەمبۆتەوە. گرنگترین دەورێك کە بۆ کەنیسە ماوەتەوە، ئەنجامدانی **نەریتی تێپەڕینە** (مەبەستی نوسەر نەریتی تەعمیدکردن، هاوسەرێتی و نەریتی ناشتنی مردووە) و تەنانەت ئەم دەورەی کەنیسەش رۆژ بە رۆژ گرنگی کەمتردەبێتەوە.

خاڵێکی سەرەکی دی کە ویلسۆن جەختی لەسەر دەکات (١٩٧٦، ١٩٨٢)، لەناوچوونی پەیوەندی کۆمەڵایەتیە لەناو فەزای تازەی شاردا و لەدەرئەنجامدا گۆڕان لەجێگە و خەسڵەتی چاودێری کۆمەڵایەتیدا. چاودێری کۆمەڵایەتی لەکۆمەڵگا راستەقینەکاندا بنەمایەکی ئەخلاقی و دینی هەیە، لەکاتێکدا لەدنیای عەقڵانی، تەکنیکی و بیرۆکراتی ئەمرۆدا چاودێری ناشەخسیە و ئەو بنەما ئەخلاقیەی پێشووی لەدەستداوە. لەناو فەزایەکی وادا دین گرنگی خۆی لەدەستدەدات و ئەو بەها گشتیانەی وەك نەریتی دینی بەیاندەکرێن، چیدی وەك رابردوو گرنگ نین.

بەڵام لەگەڵ گرنگی ئەم بەڵگانەدا هێشتا کەموکوریەکی بنەرەتی لەم پرۆسەیەدا بەرچاو دەکەوێت. ئەو پرۆسەیەی لەسەرەوە باسمانکرد، رەنگە دەورێکی لاوەکی هەبێت لەرونکردنەوەی عەلمانیەتدا و ئەو دەورە بنەڕەتیەی نەبێت. پەرەسەندنی تەفسیرە مادی و زانستیەکان لەبارەی جیهانەوە لەبری تەفسیرە دینیەکان، بەشێکە لەو پرۆسەی گۆڕانەی کە لەناوچوونی دینیش بەشێکە لێی. لەناوچوونی دین رویەکی تری ئەم گۆڕانەیە. پەرەسەندنی زانست بەهەمان ئەندازە کە هۆی لەناوچوونی دینە، کە لەناوچوونی دین یان لایەنیکەم لەناوچوونی هەندێك لەشێوەکانی دین، هۆی زەمینەسازی پەرەسەندنی زانست بوو. لەڕاستیدا پەرەسەندنی زانست و لەناچوونی دین، بەشێکن لەیەك پرۆسە. هەردووکیان دەرئەنجامی گۆڕانی زۆر بنەڕەتی و بونیادین.

بێگومان لێرەدا ئەوە جێگەی دودڵی نیە کە پەرەسەندنی زانست یارمەتی لاوازبوونی دینی داوە. لەوکاتەوەی زانست بایەخی پەیداکرد و بووە بناغەی زۆرێك لەلایەنەکانی ژیانی مرۆڤ، بە ویست و ناویست هەڕەشەی لەدیدگای دینی کرد. بەڵام ئەم مەسەلەیە ئەوەندە لەبەرئەوە نیە کە لەنێوان دیدی زانستی و دینیدا دژایەتیەك هەیە. وەك چۆن لەم کتێبەدا چەندانجار جەختمان لێکرد، دین لایەنیکەم بە





مانایەکی بنەڕەتی بەناچار وەڵامی هەمان جۆر پرسیار یان مەسەلە ناداتەوە کە بابەتی زانستە. دین بەناچار پەیوەندی بە پەیوەندی ئەزمونگەرانەی شتەکانەوە لەجیهانی سروشتیدا نیە. دین تەنها بەو پرسیارەوە سەرقاڵە کە بۆچی شتەکان بەو شێوەیە هەن. زانست دەتوانێت پێمان بڵێت کە جیهان بە چ شێوەیەك دروستکراوە، بەڵام وەڵامی ئەو پرسیارانەی کە پەیوەندی بە مانای جیهان و بوونی مرۆڤەوە هەیە، ناداتەوە. هەندێکجار دەگوترێت  زانست هیچ شتێکمان لەبارەی ئەو شتانەوە پێنالێت کە بەڕاستی دەمانەوێت بیزانین. ئەم مەسەلەیە پەیوەندی بەوەوە هەیە، بەڕاستی ئێمە دەمانەوێت چ شتگەلێك بزانین و وادەزانین کە قابیلی زانینن و وا دەرناکەون کە زانست دەتوانێت وەڵامێکی ئەم خواستانەی ئێمە بداتەوە. **خاڵی سەرەکی ئەوەیە کە زانست و دین بە ناچار دژیەك نین** ( بلا١٩٧١،ستارك وبین بریج١٩٨٥).

هەرچەند دین و زانست بە ناچار دژی یەك نین، بەڵام لەنەریتی ڕۆژئاواییدا بەناچار ئەم دژایەتیەیان دۆزیوەتەوە، چونکە تێزە دینیەکان لەم نەریتەدا هەوڵیداوە شتە ئەزمونیەکان نەك لەسەر بناغەی بەڵگە ئەزمونیەکان، بەڵکو لەسەر بناغەی کتێبی پیرۆز ڕونبکاتەوە. دین لەم هەوڵانەیدا بە ویست یان ناویست دەبێت شکستی خواردبێت. شکستی تەفسیرە دینیەکان لەبارەی هەلومەرجی زەوی لەناو مەنزومەی خۆریدا و پەرەسەندنی، نمونەی دیاری ئەم مەسەلەیەیە. لەئەنجامی ئەم هەوڵانەدا دین دەبوو تا ئەندازەیەك بایەخی خۆی لەدەستبدات.

ویلسۆن بە باشی ئاگای لەو خاڵانە هەیە، بەڵام دەرئەنجامی گونجاوی لێوە وەرناگرێت. بەبڕوای ویلسۆن مەسەلەکە تەنها ئەوەیە دین بایەخی خۆی لێسەندراوەتەوە. هەرچەند ڕەنگە ئەو مەسەلەیە ڕاستبێت، بەڵام خاڵی سەرەکی ئەوەیە ئەم مەسەلەیە پرۆسەیەکی بنەڕەتی نییە. لەم مەسەلەیەوە وا ئەنجامگیری ناکرێت کە پەرەسەندنی زانست خۆبەخۆ بۆتە هۆی لاوازبوونی دین یان تەنانەت مەسیحیەت. بەڕاستی هەندێك لەتێزە دینیەکان لاوازبوون، **بەڵام دیدی دینی بۆ جیهان ئەگەر تێزەکانی جێبەجێبکات یان بیگۆڕێت و چاکیبکات، بەناچار لاواز نابێت**. بۆ نمونە پەرەسەندنی ئەو نهێنی و شاراوانەی کە بەبڕوای هەندێك بیریار تێگەیشتن لەماناکەی، پێویستی بە تەفسیری دینی هەیە. خاڵی سەرەکی ئەوەیە





زانست لەچۆڵاییەوە دروستنابێت. ئاراستەوەرگرتنی ڕەخنەگرانە، کراوە و گومانکارانە کە خەسڵەتی زانستە، دیاردەیەکی تازەیە کە لەهەلومەرجێکی کۆمەڵایەتی و مێژوویی تایبەتدا دروستبووە، واتە هەمان ئەو هەلومەرجە کۆمەڵایەتی و مێژووییەی کە ڕێگەی عەلمانیەتی هەموار کردووە. ئەم دیاردەیە تەنها دەرئەنجامی کۆکردنەوەی بەردەوامی زانین و بەڵگە زانستیەکان لەبارەی جیهانی سروشتیەوە نیە. سەدان ساڵ بوو کە لەژێر باڵادەستی کاسۆلیسیزمی سەدەکانی ناوەڕاستدا، زانست کەم پێشدەکەوت. چونکە ئەم قۆناغە قبوڵکەری ئەندێشەی نوێ نەبوو و بە بەراوردیش لەگەڵ یۆنانی کلاسیکدا تازەگەری و ڕەسەنایەتیەکی فیکری کەمتری لەخۆی پیشاندەدا. تەنها لەسەرەتاکانی سەردەمی تازەدابوو، زانست یەکسەر سەری بڵندکردەوە.

مارکس و ئەنگڵز وایان بەڵگاندنکرد کە بەهۆی لەناوچوونی فیودالیزم و پەیدابوونی سەرمایەداریەوە، بەبوونی بزوتنەوەی ریفۆرمی دینی و ئەگەر بێرگەر دروستی گوتبێت تائەندازەیەك بەهۆی ئەم بزوتنەوەیەوە، کوتەکێکی گەورە بەر دیدی دینی لەبارەی جیهان و ڕەوایەتی ڕێکخستنی کۆمەڵایەتیەوە کەوت. سەرمایەداری لەگەڵ ئەوەدا کە دیدی دینی بۆخۆی پاراست، بناغەی مادی بیرکردنەوەی داڕشت. تەنها شۆڕشی مەزن و کۆتایی سەرمایەداری، واتە شۆڕشی فەرەنسا بوو کە توانی دیدی دینی ڕاستەوخۆ بخاتە لاوە. بەڵام شۆڕشەکانی سەرمایەداری ڕێگەی بۆ بیرکردنەوەی مادی و دەرکردنی شێوازەکانی بیرکردنەوەی دینی خۆشکرد. هەرئەم هۆکارە بوو، ئەگەری پەرەسەندنی زانستی ڕەخساند. ئەم قۆناغە لەهەموو بوارەکانی زانیندا شایەتی ڕێڕەوێکی زانستی بوو بۆ جیهان و پێشکەوتن. ئەمە هەمان ئەو سەردەمە بوو کە ئەگەری خوانەناسینی بۆ هەندێك کەس ڕەخساند.

لەبواری سیاسەتدا چیدی ئەوە نەك تێزە دینیەکان و کتێبی پیرۆز، بەڵکو هاوڵاتیان بوون کە ڕەوایەتیان بە حکومەت و ڕژێمەکان دەبەخشی. مافی خودایی شاکان دورخرایەوە. زیاد لەجاران وا وێنا دەکرا کە شتەکانی ئەم دنیایە پەیوەندی بە خودا یان دینەوە نیە. ڕێکخستنی کۆمەڵایەتی چیدی بە موقەدەری خودا نەدەزانرا، بەڵکو بە دەرئەنجامی پەیمانەکان، ڕێکەوتنەکان و بڕیاری مرۆڤەکان دەزانرا. بە





دەربڕینێکـی تـر ڕێبـازی بیرکردنـەوەی مـادی بـە هاوتـەریبی لەناوچـوونی دیـن پەرەیسەند. هەر ئەم هۆکاری لەناوچوونی دینە بوو، کە هەم ئەم ڕێبازەی ئاسانکرد و هەم دەرئەنجامی بوو.

بەهــەرحاڵ پرۆســەی عەلمانیــەت پرۆســەیەکی بــەردەوام و هــەموار نــەبوو. ڕوداوەکـانی ژیاندنـەوەی دیـنی و لەناوچـوونی چـەندانجار هاتنـە پێـشێ و کەوانـەی بڕوای دینی سەرەولێژی هەبووە. هەندێك لەبیریاران بەدوای لەناوچـوونی هەمەکیدا ڕۆیشتن. هەندێکی دی ئاستی فراوانتریـان بـینی و بـەو ئەنجامـە گەیـشتن کـە ڕەوتـی عەلمانیـەت بـە لوتکـەی خـۆی گەیـشتووە و هەنوکـە دەکرێـت ئامـاژە بەرجەسـتەکانی پەیــدابوونی دیـــن بدۆزینـــەوە. پەیـــدابوونی بزوتنـــەوە دینیـــە تازەکـــان و فەنـدەمینتالیزمی مەسـیحی، وەك بەڵگەیـەکی ئـەم گۆڕانـە دەهێنرێنـەوە. نمونـەی عەلمانیەت لەکۆمەڵگا جیاوازەکانی مرۆڤایەتیدا، نمونەیـەکی سەرڕاسـت یـان چونیەك نەبووە. پرۆسـەی عەلمانیـەت بەتونـدی لـەژێر کاریگـەری زەمینـەی کۆمەڵایـەتی یـان مێژووی دینی وڵاتێکدا کاردەکات.

دێیڤیـد مـارتین (١٩٧٨) کـە زۆرتـرین سـەرنجی لەنمونـە جیاوازەکـانی عەلمانیـەت داوە، گەرچی شیکردنەوەی خۆی لەسەر بنەمای پلەی فرەگەری دینی یان پاوانکردنی دینی لەکۆمـەڵگادا دامەزرانـدووە، بـەڵام لەڕونکردنەوەکـەی خۆیـدا جـۆری بـەربڵاوی گۆڕاوەکـان پێکـەوە دەلکـێنێ، لەوانـە: توانـای کەمایەتیـە دینیـەکان و پەرشـوبڵاوی جوگرافیاییەکـەی، پەیوەنـدی نێـوان گروپـە دینیـەکان، دەسـتەبژێرە فـەرمانڕەواکان، خەسڵەتی زاتی نەریتە جیاوازە دینیـەکان. ئـەو جـۆرە هەلومەرجـە سـەرەکیانەی کـە مارتین دەستنیشانی کردووە، بریتین لە: یەکەم، هەلومەرجی پاوانکردنی کامڵی دینی لەنـەریتی کاسـۆلیکیدا، دوهـەم، هەلومـەرجی دوو دیـنی کـە کەنیـسەی پرۆتـستانت ڕێکخراوی سەرەکیانە، بەڵام کەمایەتیەکی گـەورەی کاسـۆلیکەکانیش لـەخۆ دەگرێـت. سێهەم، هەلومەرجێکی فرەگەرتر کە ئینگلتەرا نمونەی ئاشکرایەتی، بەوشێوەیەی کـە کەنیـسەی دەوڵـەتی لـەپاڵ چـەندان جـۆری بـەرفراوانی گروپـە دینیـە نـاڕازی و جیاوازەکانی دیدا هەیە. چوارەهەم، فرەگەرترین هەلومەرج کـە تایبـەت بـە ویلایەتـە یـەکگرتوەکانی پرۆتـستانتە. پێنجـەم، هەلومـەرجی وڵاتـانی وەك ئەسـکەندناڤی و وڵاتانی ئەرسۆزۆکس دین کە کاسۆلیکەکان هیچ ئامادەبونێکیان تێدا نیە. مارتین مانا





ئاڵۆزەکانی دەوری گۆڕاوی دین لـەناو کۆمـەڵگادا و لەهەریـەکێك لـەم هەلومەرجانـەدا تاوتوێـدەکات و دوای ئـەو دەرئەنجامـە جیاوازانـە دەکـەوێت، کـە ئـەم دەورە گـۆڕاوە لەزۆرێك لەلایەنە گشتیەکان و ژیانی تایبەتیدا دەیخاتەوە.

ستارك و بین بریج (١٩٨٠،١٩٨٥) لەبارەی مەسەلەی گرنگی بـەردەوامی عەلمانیـەت و ژیاندنەوەی دیندا، بەڵگاندن دەکەن کە عەلمانیەت پرۆسەیەکی خـۆ سنوردارکەرە. ناکرێ شتێکی تازە لەڕوانگەی ئەواندا بدۆزرێتەوە. ئەم پرۆسەیە بەشێکە لەچـەرخی ئاسایی بزوتنەوەی دینی. پرۆسـەی گروپسازی کـە لەرێگەیـەوە گروپـەکان خەسـڵەتی جیابونـەوەیان لەدەسـتدەن و بەئاراسـتەی گـۆڕان بـۆ کەنیـسە دەجـوڵێن، بەشـێکە لەپرۆسـەی عەلمانیـەت. سـەرئەنجام کەنیـسەکان لەدەرئـەنجامی مـەیلیان بـۆ گـۆڕانی هەرچـی زیـاتر بەئاراسـتەی زۆرتـرین ئاسـتی دنیـاییبوون، دەبنـە هـۆی پەیـدابوونی گروپە دینیە ژیاوەکان یان گۆڕانە نوێیە بەدعەتکاریەکان. ستارك و بین بریج لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەو واقعیەتەیان قبوڵە کـە پەرەسـەندنی زانـست، عەلمانیـەتێکی تونـد و بێوێنــەی بــەدوادا دێــت، بــەڵام دەڵــێن زانــست نــاتوانێ پێداویــست و ئــارەزووە سەرەکیەکانی مرۆڤ جێبەجێ بکات. زانست ناتوانێ هەموو ڕەنج و نادادپەروەریـەکان لـەم جیهانـەدا لـەناو ببـات و نـاتوانێ ڕێگـەی دەربازبونێـك بـۆ لەناوچـونی فـەردی پیشکەشبکات و دواجار زانست توانای نیە مانا بە بوونی مرۆڤ ببەخشێت. لەڕوانگەی خەڵکیەوە ئەوە تەنها خودایە کە دەتوانێ ئـەمجۆرە کارانـە بکات. لێرەوە دیـن نـەك هــەر دەمێنێتــەوە و دوبــارە باڵادەســت دەبێتــەوە، بــەڵکو وێنــەی ترانــسندنتاڵی و میتافیزیکیشی دەپارێزێت. ڕەنگە دین زۆرتر وێنەی ڕێبازی نوێ بەخۆیـەوە بگرێـت، نەك ئەوەی کە دەستەکانی ژیاندنەوەی نەریتە بەجێماوەکان، دوبارە ڕەونـەق پەیدا بکەنەوە، چونکە ئەم دەستانە بەویست یان نەویست دەکەونـە بەرامبـەر هـەمان ئەو هێزانەی کە عەلمانیەتیان لەقۆناغی یەکەمـدا بـەبارهێناوە. بـە گشتی ڕێبـازە نوێکان کەموکوڕیـــەکانی نەریتـــەکانی پێـــشویان نیـــە، هـــەمان ئـــەو کەموکوڕیانـــەی لەجێبـەجێکردنی پێداویستیە مرۆییـەکان لەهەلومـەرجی کۆمەڵایـەتی گـۆڕاودا، بـێ دەسەڵاتی کردبوون.

سـتارك و بـین بـریج ئامـاژەی بـەردەوامی گرنگـی بنـەڕەتی دیـن و ئەگـەری بەهێزبونەوەی دوبـارەی دینیـان لـەو ڕاسـتیەدا دۆزیـەوە، کـە ئەوانـەی لەلێکۆڵینـەوە





کۆمەڵایەتیەکاندا پەیوەستبوون یان بڕوای دینی خۆیان پیشاناندەن، ڕەنگە زۆرتر جۆرێك ئارەزووی "پاش سروشتگەری Supernaturalism" ناتەقلیدی یان پەراوێزی وەك بەختگرتنەوە، یۆگا و چاودێری تراسندنتاڵی قبوڵبکەن یان پیشانبدەن. ئەو ئەمەریکیانەی لەخانووە نادینیەکاندا گەورەبوون، ڕەنگە پەیوەندیان بە ئەنجومەنێکی دینیەوە هەبێت. گەرچی ئەنجومەنە دینیە عەلمانیترەکان لەئەمەریکادا ڕوو لە لەناوچوونن، ئەنجومەنە کەمتر عەلمانیەکان لەناوچونێکی وا لەخۆیان پیشاناندەن. دواجار دەبێ بگوترێت کە دەیەکانی دوایی شایەتی پەیدابوونی سەدان بزوتنەوەی دینین.

ستارك و بین بریج ئەو بانگەشەیەی ویلسۆن(١٩٧٦) و فین (١٩٧٨) ڕەددەکەنەوە کە دەستە و ڕێبازە تازەکان لەبازاڕی دینیدا، بە شتێکی پەراوێزی و ناگرنگ دەژمێرێن. بەبڕوای ئەوان ئەم تێڕوانینە ناتوانێت گرنگی بە زەبری دینە تازەکان ببینێ و ڕەگی لەکورتبینی مەسیحی - کلیمیدا هەیە. ئەم تێڕوانینە هەروەها سەرچاوە لەجیانەکردنەوەی جۆری جیاوازی ڕێبازەکان لەیەکدی دەگرێت. ستارك و بین بریج دەڵێن بەبڕوای ئەوان ریبازێك کە لەسەر بناغەی جۆرێك بزوتنەوەی دینیە، گرنگی هەیە، نەك ئەو ڕێبازانەی کە هەردوکیان وەك ڕێبازی وەرگرەکان (audience cult)موشتەریەکان (client cult) ناوی دەهێنن. ڕێبازی وەرگرەکان ریکخراوێکی فەرمی نیە و جۆرێك چالاکی مەسرەفکردنە. تێز و بیرکردنەوەکانی ئەم ڕێبازە لەڕێگەی گۆڤارەکان، کتێبەکان و دەزگا گشتیەکانەوە بڵاو دەکرێتەوە و مەسرەفدەکرێت. نمونەی ئەم ڕێبازە، ئەو بەرنامە دینیە تایبەت و زۆر تەماشاکەرەیە کە لەکەناڵە تایبەتیەکانی تەلەفیزۆنەوە پەخشدەکرێن. بەڵام ڕێبازی موشتەریەکان ڕێکخراوترە، بەو شێوەیەی کە خزمەتە تایبەتیەکانی وەك تێزەکان، دەرمانەکان و لەم بابەتە شتانە، لەسەر بناغەی پەیوەندی تایبەتی نێوان موشتەری و دەرمانکەر پیشکەشدەکرێت، پەیوەندیەك کە پێویستی بەجۆرێك ڕێکخراوە لەلایەن دەرمانکەرەوە، بەڵام موشتەریەکان هیچ ڕێکخراوێکیان نیە. هەردوو ئەم ڕێبازە جیاوازن لەگەڵ بزوتنەوەی ڕێبازێکی تەواو ڕێکخراودا، چونکە ئەم بزوتنەوەیە گروپێکی تازەیە کە بەتەواوی لەدەرەوەی چوارچێوەی نەریتە دینیە کۆنتر و بەجێماوەکان کاردەکات. بەبڕوای ستارك و بین بریج مەیل بۆ تێکەڵکردنی





ئەو بزوتنەوانەی لەسەر بناغەی ڕێبازن، لەگەڵ ڕێبازی وەرگرەکان و موشتەریەکاندا، بۆتە هۆی ئەوەی هەندێك لەشیکەرەوان بە هەڵە هەموو بزوتنەوەکانی لەسەر بناغەی ڕێبازێك دروستبوون، بە دیاردەیەکی لاوەکی‌و پەراوێزی دابنێن.

ستارك و بین بریج سەلماندنی ئەزمونی تیورەکەیان بەشێوەی دو گریمانەی بەرهێنراو پێشکەشدەکەن، و پاشان ئەم گریمانانە لەگەڵ دراوە کۆکراوەکانیاندا تاقیدەکەنەوە. یەکەم گریمانە دەڵێت لەهەر شوێنێکدا کەنیسە باوەکان بەتوندی لاواز ببن، ڕێبازەکان زیاد دەکەن. چونکە لەم ناوچانەدا زۆرینەی خەڵك ڕەنگە بەهۆی جوڵەی جوگرافیایی، پەیوەندیەکانیان بە کەنیسەوە لەدەستبدەن و لەئەنجامدا دەتوانن بیرکردنەوەی تازە تاقیبکەنەوە. گریمانەی دوهەم دەڵێت لەو ناوچانەدا کە کەنیسە تەقلیدیەکان بەرێژە بەهێزن، گروپەکانی ژیاندنەوەی دینی زیاتر لەڕێبازە تازەکان پەیدا دەبن. ستارك و بین بریج گریمانەکانیان بە دراوە کۆکراوەکان دەسەلمێنن و بەو ئەنجامە دەگەن کە فۆرمەلەبوونی ڕێباز و دەستەکان، لایەنەکانی کارکردنی عەلمانیەت نین، بەڵکو کاردانەوەی جیاوازن. عەلمانیەت بەتوندی کەنیسە تەقلیدیەکانی لاوازکردووە، بەڵام کۆمەڵێکی نادینی بەرهەمنەهێناوە، عەلمانیەت تەنها توانیویێتی کۆمەڵی کەنیسە دروستبکات. تەنانەت لەو ناوچانەدا کە ئەندامێتی لەکەنیسەدا کەمە، بڕوابوون بە هێزە میتافیزیکیەکان هەروا توندە.

ڕەخنە لەستارك و بین بریج ئەوەیە، ئەو هاوبەستەییەی ئەوان دۆزیویانەتەوە هەرچەند بەهێزبێت، هێشتا ئەو ڕاستیە بە بەهێزی خۆیەوە ماوەتەوە کە ژمارەی ئەو کەسانەی لەڕێباز و دەستە تازەکاندا ئەندامن، زۆر کەم و ناگرنگن(بیبی و ویور١٩٨٥، لێچز١٩٩١، ڤالیس و بروس١٩٨٤). لەوەڵامدانەوەی ئەم ڕەخنەیەدا میلتۆن (١٩٩٣) دەریدەخات کە دەستەکان، ڕێبازەکان و بزوتنەوە دینیەکان لەویلایەتە یەکگرتووەکاندا ڕۆژ بە ڕۆژ زیاد دەکەن و گەرچی هەندێکیان لەناودەچن، بەڵام زوربەیان دەمێننەوە و ڕەونەق پەیدادەکەن. بەڵگاندنی میلتۆن ڕاستەوخۆ لەسەر بناغەی ژمارەی دەستە و ڕێبازە تازەکانە. بەهەرحاڵ وەك جۆن لیچز، ڤالیس و بروس دەڵێن ئامارە دیاریکەرەکان، پەیوەندی بەرادەی زیادبوونی ئەندامێتی لەناو





بزوتنەوە تازەکاندایە، لەبەرامبەر کەمبونەوەی ئەندامێتی لەئەنجومەن و گروپە دینیەکانی کە پەیوەستن بە روداوی دینی کۆنەوە. هەرئەم کەمبونەوەی ئەندامێتیە کە لەئەوروپا زۆر زیاترە لەزیادبوونی ئەندامێتی لەبزوتنەوە تازەکاندا. شیکردنەوەی ستارگ و بین بریج تەنانەت گەر لەبارەی ویلایەتە یەکگرتوەکانەوە راست بێت، کەمێك سەنتەریزمی نەتەوەیی پێوە دیارە.

ستارك و بین بریج کە پێشبینی ئەم رەخنەیەیان کردبوو، زۆر هەوڵدەدەن تا ئەوە بەبیر بهێننەوە کە وا بیرناکەنەوە گروپ و رێبازە تازەکان، ئەو چۆڵاییە پڕ بکەنەوە کە نەبوونی ئەندامێتی لەکەنیسەدا دروستیدەکات، بەڵکو دەیانەوێت دەریبخەن کە لەهەرکوێیەك خەڵکی جیابۆوە لەمەسیحیەت هەبێت، هەوڵگەلێك بۆ پڕکردنەوەی ئەم چۆڵاییە هەیە. ئەم تێڕوانینەش روبەڕوی ئەو رەخنەیەیان دەکاتەوە، کە دیار نیە ئەم هەوڵانە دەستکەوتێکی بەرچاویان هەبێت. ئەوان باسی ئەو مەسەلەیە ناکەن، بۆچی دینی وەرگرەکان و موشتەریەکان لەدەیەکانی دواییدا وەك قارچك لەهەموو شوێنێکدا روان. رەواجی ئەمجۆرە رێبازانە کە نمایشکەری شانۆی رۆحی جیهانی نوێن و نەك بزوتنەوەیەك بن لەسەر بناغەی دین، دودڵمان دەکات سەبارەت بە رەدکردنەوەی بانگەشەی ویلسۆن لەلایەن ستارك و بین بریجەوە. ویلسۆن بانگەشەیکردبوو کە هەر ئەم خەسڵەتی پەراوێزیی ئەم دیاردانەیە، دەبێتە هۆی ئەوەی دین بۆ پاراستنی هەرجۆرە دەسەڵاتێك بەسەر زیهنی خەڵکیدا دوچاری کێشە بێت. ستارك و بین بریج پەنا بۆ ئەو بانگەشەیە دەبەن کە ئێمە نازانین کام یەك لەم بزوتنەوە تازانە، یان رەنگە تەنها یەکێکیان لەئایندەدا بگەنە لوتکە، دروست وەك چۆن بزوتنەوە نوێکان لەرابردودا لوتکەیەکی وایان تاقیکردۆتەوە. بەهەرحاڵ ئەم مەسەلەیەش قابیلی تێڕامانە و خۆبەخۆ ناتوانێت تیورەکەی ئەوان بسەلمێنێ. پاشان وەك دابلێر (١٩٨٧) دەڵێت نابێ ئەوە فەرامۆشبکەین کە زۆربەی دینە گەردونیەکان، تەنها بە هاوکاری فەرمانڕەوایان توانیویانە لەناو خەڵکیدا رەگداکوتن. بەڵام ئەمڕۆ بونیادەکانی کۆمەڵگا ئەوەندە گۆڕانیان بەسەرهاتووە کە زۆر دورە پرۆسە میژووییەکان کە بوبونە هۆی بەهێزبوون و پەرەپێدانی هەندێك لەسیستەمە دینیەکان لەلایەن دەوڵەتەکانەوە دوبارە ببنەوە. تەنانەت گەر هەوڵێکی زۆریش لەلایەن کەس و گروپەکانەوە بۆ بەهێزبوونی دینە تازەکان بدرێت، دورە کە هیچ







یەك لەم هەوڵانە دەستکەوتێکی ئەوتۆ بەدەست بێنێت. بەسودوەرگرتن لەنمونەکەی بێرگەر(١٩٧١) دەبێ بگوترێ کە لەهەلومەرجی هەنوکەدا، هێزە میتافیزیکیەکان ناتوانن پلەیەکی باڵاتر لەشایعە بەدەست بێنن. رەنگە مەسەلەکە بەوشێوەیە بێت کەکێشەی کۆمەڵگای هاوچەرخ ئەوەیە، خەڵکی پێویستیان بەو جۆرە مژدانە هەیە کە دین بەشێوەیەکی تەقلیدی پێشکەشیدەکات، بەڵام لایەنی کۆنی ئەم مژدانە چیدی بەجێی متمانە دانانێن.

کەمپێلیش بەگشتی وەك ستارك و بین بریج جەخت لەسەر گرنگی بەزەبری بزوتنەوە تازە دامەزراوەکان لەسەر بناغەی دین دەکات (١٩٧٢ و ١٩٨٢). کەمپڵ هاوکات لەگەڵ لێکۆڵینەوە لەبارەی دەوری زەمینە کۆمەڵایەتیەکانی مەزهەبەکان دەڵێت، لەکاتێکدا مەزهەبە تایبەتیەکان بەگشتی تێپەڕن، زەمینەی کۆمەڵایەتی مەزهەب خەسڵەتی بەردەوامی کۆمەڵگایە. گەڕان (Seekershi)خەسڵەتی فەزای کۆمەڵایەتی مەزهەبە، و لەکۆمەڵگای هاوچەرخدا گۆڕانی ئاراستەی سەرەکی بە ئاراستەی روو وەرگێڕان لەپابەندبوون بە تێز و دۆگمە تایبەت و لەپێشەوە دیاریکراوەکان و روکردنە گەڕان یان بەدەربڕینێکی تر، بەهادانان بۆ پەرەسەندنی عەقڵی و رۆحی تاکەکەسی بوونی هەبووە. ئەم تێڕوانینەی کەمپێل بیرهێنەرەوەی "فەردگەری ئەبستمۆلۆژی" ڤالیسە(ڤالیس١٩٨٤). بەبڕوای کەمپێل عەقلگەری، عەلمانیەتی سەقامگیر بەهێزناکات، بەڵکو لەڕاستیدا خورافات و مەیلە نهێنی ئامێزەکان، رۆحی و عاریفانەکان لەکلتوری نوێدا تونددەکات. تەنانەت ئەوانەش کە باڵاتربوونی زانستیان قبوڵە، لەپلەیەکدا نین کە لەنێوان داعیە کلاسیکیەکان و بەدعەتکارەکاندا داوەریبکەن و رەنگە باوەڕ بە سەحنە فڕیوەکان، ئیدراکە سەرو هەستیەکان و جۆرەکانی تری باوەڕی نیمچە زانستی بهێنن. شروت (١٩٨٩) دەڵێت لەو روەوە کە خەسڵەتی زانست ناسینی ئەو واقعەیە کە ناتوانێ وەڵامی هەموو پرسیارەکان بداتەوە، ئەوا جێگە بۆ بیرکردنەوە جادویەکان دەهێڵێتەوە، چونکە ئەم بیرکردنەوانە دەتوانن بانگەشەبکەن کە ئەوەی زانست ناتوانێ روونیبکاتەوە، ئەوان دەتوانن رونیبکەنەوە. لەوڕووەوە کە خەڵکی جیهانبینی زانستی بە دڵ و بە گیان ناسەلمێنن، ئامادەن هەمووجۆرە باوەڕێکی جادویی و نهێنی قبوڵبکەن. ئەم باوەڕانە رەنگە زۆر فەردیانە و پەرشوبڵاو بن. بەبڕوای بیبی و پێۆر (١٩٨٥) ئەمە

لەبەرئەوەیە کە لەکۆمەڵگا پیشەسازیە هاوچەرخەکاندا، تاکەکان چەندانجۆر دەوری پسپۆڕی دەگرنە ئەستۆ کە سیستەمە ماناییە گشتگیرەکان ناتوانن هەقانیەت بە هەموویان بدەن.

لاکمان (١٩٦٧)یش دەڵێت خەسڵەتی کۆمەڵگا هاوچەرخەکان نەبوونی پێویستیە بەسیستەمە بەهاییە گشتگیرەکان، چونکە ئەم خەسڵەتانە پێویستیان بە رەوایەتی دینی نیە. دین دەبێت بە لایەنێك لەلایەنەکانی ژیانی تایبەتی و دەبێت بە هەڵبژاردنێك لەناو چەندان هەڵبژاردنی دیدا، ئەو هەڵبژاردنانەی دەکرێ بکرێن بە سیستەمێکی رازیکردنی شەخسی. هەر ئەم مەسەلەیە لاکمان رادەکێشێ بۆ ئەم بەڵگاندنە کە کۆمەڵگا مۆدێرنەکان شایەتی گۆڕانێکی قوڵن لەروکردنە دیندا، بەوشێوەیەی کە رویان لەو "بڵندبونەوە گەورانە" هەڵگرتووە کە سەروکاریان لەگەڵ شتەکانی ئەو دنیا و ژیان و مەرگدایە، و رویانکردۆتە "بڵندبونەوە بچوکەکان"ی ژیان کە سەروکاریان لەگەڵ بەدیهاتنی نەفس، راگەیاندنی بوون و ئازادیە شەخسیەکاندا هەیە (١٩٩٠).

بەڵگەکانی وەك بەڵگەی کەمپێل و لاکمان روبەروی هەمان ئەو تۆمەتانە دەبێتەوە کە ویلسۆن دژی ئەو کەسانە بەکاریدەهێنا کە تەماشای بزوتنەوە دەستەیەکان و رێبازەکان، وەك سەرچاوەی ژیانەوەی دین دەکەن. لەو روەوە کە ئەم بڵندبونەوە بچوکانە وەك هەندێك رێبازی بەرێژە ناسەقامگیر دەردەکەون، بە دوور دەزانرێ لەبەر پشتبەستن بە هەندێك رەگەزی جادویی بتوانن ببن بە شێوەگەلێکی سەرەکی دینی.

فین لەباسە دورودرێژەکەی خۆیدا سەبارەت بە عەلمانیەت (١٩٨١،١٩٧٨،١٩٧٢) جەخت لەسەر ئەم کەمی بەها گشتگیرانە و پێویستی بوونیان بۆ دروستکردنی سیستەمە کۆمەڵایەتیە تازەکان دەکات. دەبێ بۆ رەگ و ریشەی کارەکانی فین لەناو بەرخوردیدا لەگەڵ تیورەی وەزیفی دیندا بگەرێین، هەمان ئەو تیورەیەی دین بە هۆکاری سەرەکی رەوایەتی و گونجانی کۆمەڵگا دەزانێت. فین ئەو گریمانەیە رەد دەکاتەوە کە کۆمەڵگای مۆدێرنی وەك ویلایەتە یەکگرتووەکان، دەبێ لەگەڵ سیستەمە بەهاییە گشتگیرەکاندا بگونجێن، چونکە لەم کۆمەڵگایانەدا پێویستیەك بۆ رەوایەتی دینی و بۆ رێکخستنی کۆمەڵایەتی نیە. فین پرۆسەی عەلمانیەت بەپێی







سنوری نێوان پیرۆز و ناپیرۆز لەکۆمەڵگادا تاوتوێدەکات. بەبڕوای ئەو ئەم سنورە هەمان ئەوشتەیە کە دەستەکان، کۆمەڵەکان، دەزگاکان و تاکە کەسە جیاوازەکان دایدەنێن، بۆ ئەوەی مەبەستە جیاواز و تایبەتیەکانی خۆیان دەستنیشان بکەن. کەوابوو عەلمانیەت پرۆسەیەکی خەبات، وتوێژ و ململانێیە کە تیایدا، کارەکتەرە کۆمەڵایەتیەکان هەوڵدەدەن تێڕوانینە تایبەتیەکانی خۆیان بۆ واقع دەربڕن. ئەم پرۆسەیە پرۆسەیەکی خۆ بە خۆ و پەرەسەندنی نیە. پرۆسەی عەلمانیەت پرۆسەیەکی ئاڵۆز و ناکۆکئامێزە کە لەهەر قۆناغێکدا رەنگە ئامادەی قبوڵکردنی ئاراستەی ناکۆك بەیەك بێت. هەر لەبەر ئەمە ئەم پرۆسەیە قابیلی گەڕانەوەیە بۆ دواوە.

فین پێنج قۆناغ لەپرۆسەی عەلمانیەتدا دەستنیشان دەکات. یەکەم قۆناغ جیاوازبوونی دەور و دەزگا دینیەکانە کە لەدێر زەمانەوە دەستی پێکردووە و پەیدابوونی کەهەنوتی جیاواز بەشێکە لێی، ئەمجۆرە پسپۆڕیە دینیە لەسەرتاسەری مێژووی دیندا بەردەوامە. لەقۆناغی دوهەمدا سنوری نێوان مەسەلە دنیایی و دینیەکان دیاریدەکرێت. بەرلەوەی بواری دەسەڵاتی دەزگا مەزهەبی و دنیاییەکان دیاریبکرێت، بونیادە دنیاییەکان بەگشتی لەبونیادە دینیەکان جیابوبوونەوە. لەڕاستیدا ئەم دوو بونیادە هەرگیز بەشێوەیەکی کامڵ لەیەك جیانابنەوە، بەڵکو سنوری نێوانیان بە کەمڕەنگی دەمێنێتەوە. پرۆسەی عەلمانیەت رەنگە ئەو ئاڵۆزیە توندتربکات کە لەجیاکردنەوەی شتە پیرۆز و شتە ناپیرۆزەکاندایە. سێهەم قۆناغ هەڵگری فۆرمەلەبوونی رەمزە دینیە گشتیکراوەکانە کە زیاتر لەبەرژەوەندی رەگەزە جیاوازەکانی دروستکەری کۆمەڵگا دەڕۆن. لێرەدا فین ئاماژە بۆ ئەو گۆڕانە دەکات کە ناو دەنرێت "دینی مەدەنی" لەدەوروبەری ویلایەتە یەکگرتوەکاندا (بیلا١٩٦٧). لەقۆناغی چوارەمدا "پێناسکردنی هەلومەرج" کە تایبەتە بەکەمایەتیەکان و گروپە تاکانەکان، پەیدا دەبێت. لەم قۆناغەدا دەسەڵاتی سیاسی دنیایی دەبێت، بەڵام بواری پیرۆز پەرشوبڵاو دەبێتەوە و زۆرێك لەگروپەکان بەدوای رەوایەتی لەسەر بناغەی دینی دەبن. دواجار لەقۆناغی پێنجەمدا ژیانی فەردی و گشتی لەیەك جیادەبێتەوە.

دەکرێ ماهیەتی ناکۆکئامێزی ئەم پرۆسەیە لەقۆناغە جیاوازەکاندا ببینرێ.

پەیدابوونی دینی مەدەنی یەکێکە لەقۆناغەکانی ئەم پرۆسەیەیە و لەهەمانکاتدا جۆرێك روو وەرگێڕانە لەعەلمانیەت. دەوڵەت لەهەوڵدانیدا بۆ دیاریکردنی پێناس بۆ هەلومەرجەکان، هەوڵدەدات سەربەخۆیی دینی سەرکوتبکات و بواری دین و بەتایبەتی شێوە دەستەیەکان سنورداربکات، بەڵام لەهەمانکاتدا هەوڵدەدات دەسەڵاتی ناوەڕۆکەکان و بنەما پیرۆزەکان بۆ رەوایەتی بەخشین بەخۆی بەکاربهێنێت.

بەبڕوای فین وێنەیەك لەکلتوری دینی کە لەگەڵ کۆمەلگای مۆدێرندا زۆرترین گونجانی هەیە، ئەوشێوەیەیە کە بوارێکی سنوردراو بە شتە پیرۆزەکان دەدات، و پلەیەکی کەم لەگونجانی سیستەمە بەهاییە فەردی و گروپیەکان بەهێز دەکات. دینی نهێنیئامێز و پسپۆر باشترین رەنگدانەوەی ئەم کلتورە دینیەیە. دەکرێ ئەمجۆرە دینە بێ هیچ جۆرە ناکۆکیەك لەگەڵ دەوری کارکردنە رۆژانەیەکاندا بەکاربهێنرێ، چونکە چالاکیەکانی سنوردراوە بە زەمەن و جێگە و شت و مەسەلە زۆر تایبەتیەکان. ئەم دینە جۆرێك چالاکی جادویی و هەلێك بۆ سەرقاڵبوون بە مەسەلە ناعەقلانیەکانەوە لەبەرامبەر عەقلانیەتی سەپێنراو لەلایەن دەزگا فەرمی و بیرۆکرات و دەورەکانی ژیانی رۆژانەدا، بۆ ئەو کەسانەی باوەڕیان پێیە دەڕەخسێنێت. لێکۆڵینەوەیەکی دوایی کە خاڵەکانی جێی تێڕوانینی فین بەشێوەیەکی ئەزمونیی و هوشیارانە دەسەلمێنن (لۆهەرمەن ١٩٨٩)، دەریدەخات کە زوربەی پەیڕەوانی جادو و جادوگەری لەلەندەن و ناوچەکانی باشوری ئینگلتەرا خوێندنی باڵایان هەیە، و پسپۆران خاوەن هەلومەرجێکن کە پەروەردەی زانستیان دیووە و سەرقاڵی لێکۆڵینەوەی کیمیایی و پیشەسازی وەك کامپیوتەرن.

فین تەنانەت لەنوسەرانی وەك کەمپیل و ڤالیسیش زیاتر دەڕوات، چونکە جەخت لەسەر کۆمەڵێك کێشە دەکات کە روبەڕوی ئەو کلتورە دینیانە دەبێتەوە کە خاوەن سیستەمێکی بەهایی گشتگیرن. ئەم کلتورانە کە بوارێکی فراوان بەشتی پیرۆز دەدەن و داوای گونجانێکی توند لەنێوان بوارە تایبەتی و گروپیەکاندا دەکەن، کۆمەڵێك کێشەیان لەکۆمەلگای هاوچەرخدا بۆ خەڵکی دروستکردووە کە عەقلانیەتی تەکنیکی باڵادەستە بەسەریدا و ناکرێ لەرێگەی بەها گشتگیرەکانەوە یەکپارچەبکرێن. ئەمجۆرە کلتورە دینیە، کۆمەڵێك ململانێ و گرژی لەکۆمەلگای هاوچەرخدا دروستدەکەن.







بەبڕوای فین دین تەنانەت لەکۆمەلگای مۆدێرنیشدا دەتوانێت بمێنێتەوە، بەو مەرجەی دەور و خەسڵەتی خۆی بگۆڕێت . لەڕاستیدا عەلمانیەت شێوازێکی جیاوازی دین بەرهەمدەهێنێ کە لەگەڵ هەلومەرجی تازەدا دەگونجێت (بیکفۆرد ١٩٨٩، لا ١١٦).

"عەلمانیەت دین لەکۆمەلگای مۆدێرن ناکاتە دەرێ، بەڵکو جۆرێك دین نەشونما پێدەکات کە کارکردنی سەرەکی بۆ سەرتاسەری کۆمەلگا نیە. پەیوەندی نزیکی نێوان کۆمەلگا دنیاییەکان و هەندێك جۆری بڕوای دینی گروپی، سەرچاوە لەمەیل بۆ جیاکردنەوەی قوڵترین هاندەرەکان و باڵاترین بەها فەردیەکان لەبوارەکانی کرداری سیاسی و ئابوریەوە دەگرێت" (فین ١٩٧٢، لا ٣١).

شێوازەکەی فین گەلێك ئیمتیازی هەیە، بەتایبەتی جەختکردنی لەسەر عەلمانیەت وەك سنوری نێوان شتە پیرۆزەکان و دنیاییەکان کە خودی ئەم سنوربەندیە پەیوەندی بەململانێ کۆمەلایەتیەکانەوە هەیە، هەروەها جەختکردنی لەسەر ماهیەتی ئاڵۆز و زۆرجار دژ بەیەکی ئەم پرۆسەیە. بەهەرحاڵ کارەکەی فین جۆرێك کەموکوڕی تێدایە کە دەرئەنجامی وازهێنانی خۆویستانەیەتی لەپێناسەکردن و رونکردنەوەی زاراوەکان و چەمکەکان، یان دەرئەنجامی باسکردنی راستەوخۆیەتی بۆ باسە سەرەکیەکان. بە بڕوای فین هەر هەوڵێك بەئاراستەی پێناسەکردنی وردی دین یان عەلمانیەت، لەراستیدا رێگە لەرەنگدانەوەی مانا ئاڵۆز و زۆر جیاوازەکانی ئەم زاراوانە دەگرێت، کە لەژیانی رۆژانەی خەڵکیدا هەیانە. چونکە بە ئاشکرا مەبەستی ئەوەیە ئاڵۆزیەکانی ئەم مانایانە لەناوەخنی شیکردنەوەکەی خۆیدا، جێبکاتەوە. بەبڕوای فین هەر ئەم ئاڵۆزیانە زانیاری دیاریکراو لەبارەی ماهیەتی عەلمانیەتەوە بەدەستەوە دەدات، لەکاتێکدا "ئەو شیکەرەوانەی تەنها چەمکە روونەکان بە سنوری دیاریکراوەوە بەکاردەهێنن، لەم زانیاریانە مەحرومدەبن" (١٩٨٧، لا ٢٩). بە بڕوای فین ئەو وشانەی کە کارایی تەکنیکیان هەیە، سودێکی ئەوتۆیان بۆ تەفسیری لایەنە ناکۆکەکانی عەلمانیەت نیە. لەم بانگەشانەدا سەردەرگومیەکی فراوان دەبینرێت. رەنگە ئەوە راست بێت کە ئارەزووی سەقامگیرکردنی وردی چەمکەکان، رێگە لەدەستگەیشتن بە زانیاریە سەرەکیەکان بگرێت، بەڵام لێرەوە نابێت بەو دەرئەنجامە بگەین کە لەباسکردنی مەسەلەکانی عەلمانیەتدا، دەبێ سود لەوشەی ئاڵۆز و ناکۆکئامێز وەربگیرێت. فین ماهیەتی ناکۆکئامێزی عەلمانیەت لەگەڵ ماهیەتی

ناکۆکئامێزی ئەو چەمکانەی کە دەبێت ئەم پرۆسەیە وەسفبکەن و هەروەها لەگەڵ ئەو ناکۆکیانەی لەناو باس و تیورەکانی سەبارەت بە عەلمانیەتدا هەیە، تێکەڵدەکات. فین بێئەوەی خودی پرۆسەی عەلمانیەت بناسێت، لەکوێوە دەتوانێ بزانێت کە ناکۆکیەکان و نەبوونی ڕێکەوتن لەبارەی مانای عەلمانیەتەوە، دەتوانێ زانیاری سودمەند لەبارەی ئەم پرۆسەیەوە بەدەستەوەبدات؟ لەڕاستیدا تێگەیشتنی فین بۆ پرۆسەی عەلمانیەت زۆر ناواخنیە و ئەوەندە پەیوەندی بە جیابونەوەی شتە پیرۆزەکان لەشتە دنیاییەکان نیە، لەکاتێکدا ئەو ئەم جیابونەوەیە بە خەسڵەتی ئەم پرۆسەیە دەزانێت. ئەم چەمکە بەئاشکرا پەیوەندی بە پێناسە گشتیترەکانی دین لەمیتۆدی دۆرکهایمی و وەزیفیەکاندا هەیە، چەمکی فین ڕەگی لەم میتۆدانەدا هەیە و ئەگەرچی زۆر ڕەخنەش لەرونکردنەوەی وەزیفیانەی دین دەگرێت، بەڵام پەیوەندی بەم میتۆدانەوە ڕاستەوخۆ ناپچڕێنێت.

هەر ئەم ئاڵۆزی تێگەیشتنە لەکاری فیندایە کە کاریگەریەکی زۆر دەکاتە سەر دیاریکردنی خەسڵەتی پرۆسەی عەلمانیەت وەك پرۆسەیەکی ناکۆکئامێز و قابیلی گەڕانەوە بۆ دواوە. بۆ نمونە مەیلی گەڕانەوە لەعەلمانیەت لەقۆناغی سێهەمدا کە هاوڕێی پەیدابوونی دینی مەدەنیە، بەئاشکرا لەسەر بناغەی تێگەیشتنێکی گشتگیر بۆ دین ڕاوەستاوە. لەکاتێکدا لایەنە عەلمانیەکانی ئەم قۆناغە پێویستی بەتێگەیشتنێکی سنوردارتر هەیە. لەئەنجامدا دیار نیە ئایا فین دەیەوێت دەریبخات کە لەراستیدا پرۆسەی عەلمانیەت شتێکی ناکۆکئامێز و دولایەنەیە، یان دەیەوێت بڵێت کە بە لەبەرچاوگرتنی چەمکە جیاوازەکانی دین کە لەناو باسەکانی عەلمانیەتدا ڕەواجیان هەیە، ئەم پرۆسەیە خەسڵەتێکی وا ناکۆکئامێزی پەیداکردووە. ئێمە نازانین فین دەیەوێت ناسینی ئێمە بۆ پرۆسەی عەلمانیەت زیادبکات، یان دەیەوێت ناسینی ئێمە بۆ ئەو شتانەی لەبارەی ئەم پرۆسەیەوە گوتراوە، واتە باسە تیوریەکان و تیڕوانینەکان بۆ عەلمانیەت پەرەپێبدا. پێدەچێت فین لەکاردا زۆرتر کاری دوهەم ئەنجامبدات، تا کاری یەکەم. لێرەوە ڕەنگە کاری ئەو ڕۆشنگەرانە بێت، بەڵام پیشاندانی ئەوەی کارێکی دی ئەنجامدەدات، گومڕاکەرانەیە.

دواخاڵ کە دەبێ لەبارەی فینەوە بگوترێ ئەوەیە لێکۆڵینەوەکەی زۆرتر لەبارەی ویلایەتە یەکگرتوەکانەوە قابیلی بەکارهێنانە. لەراستیدا زوربەی باسەکانی سەبارەت







بەعەلمانیەت، پەیوەندیان بە جیهانی مەسیحی ڕۆژئاواوە هەیە، بەڵام لەبارەی ئەوەی کە وڵاتە نامەسیحی و نارۆژئاواییەکان تا چ ئەندازەیەك لەژێر کاریگەری ئەم پرۆسەیەدان و بۆچی؟ کەمتر باسکراوە. بەهەرحاڵ نوسەرانی کۆمەڵە وتارێك کە بەم دوایانە لەمبارەیەوە بلاوکراوەتەوە، لەبارەی ئەگەری ڕودانی پرۆسەی هاوشێوەی عەلمانیەت لەجیهانی نارۆژئاواییدا، بەگشتی دودڵبوون. پێررا دۆکوایرۆ (١٩٨٩) لەبارەی پەیدابوونی گروپە تازەکان و بەتایبەتی گروپی ئۆمباندا لەبەرازیل، دەڵێت کە ئەم گروپانە بەڵگەن دژی ئەو تیڕوانینەی کە پیشەسازیبوون و عەلمانیەت لەشوێنەکانی تردا وەك ڕۆژئاوا و جیهانی پێشکەوتوو، ڕوداوێکی هاوشێوە لەلەناوچوونی دین دروستدەدەکات. ئارێۆ ماند (١٩٨٩) دەریدەخات کە ئایدۆلۆژیای فەندەمینتالیزمی ئیسلامی لەشێوە جیاوازەکانیدا کە زوربەیان ڕەدی لیبرالیزم، ناسیۆنالیزم و سۆسیالیزم دەکەنەوە، گۆڕانێکی تازەیە کە بەپێچەوانەی چاوەڕوانیەوە عەلمانیەت و بیرکردنەوەی مادی، وەك کۆمەڵێك هێزی گەشەکردن دروستنەکردووە. بە بڕوای ریگان (١٩٨٩) لەمالیزیا فەندەمینتالیزمی ئیسلامی کۆپی بزوتنەوە دینیە تازەکانە کە لەرۆژئاوا پەیدابوون. ئەمجۆرە فەندەمینتالیزمە تێڕوانینێکی دینی تازەی لەبارەی کلتورەوە دروستکردوە کە بەگشتی کاری کردۆتە سەر هەموو لایەنەکانی ژیانی تازە. بە بڕوای ژول ڕوست (١٩٨٩) لەئەفریقادا کاردانەوە لەبەرامبەر گۆڕانە پیشەسازیەکاندا ڕەوتی نوێ و تازەی بەخۆوە گرتووە، بۆئەوەی لەڕێگەی تێکەڵکردنی بواری پیرۆزەوە لەژیانی ڕۆژانەدا هەستی یەکێتی دین و شوناسی کۆمەڵەیی لەخەڵکدا بە زیندوویی بهێڵێتەوە.

مارتین (١٩٩١) بە بەراوردکردنی ئەوروپا، ئەمەریکای باکور و خۆرهەڵاتی ناوەڕاست ئەو دەرئەنجامە وەردەگرێ کە عەلمانیەت دیاردەیەکی پتر ئەوروپیە و پەیوەندی بە ململانێی نێوان کەنیسەکان و هێزە دنیایەکان لەمێژووی ئەوروپا لەسەرەتای قۆناغی تازەدا هەیە، ئەم ململانێیانە کە دینیان لەرۆژئاوادا تارادەیەك لەبایەخ خستووە، لەجێگەیەکی دیدا ڕوياننەداوە. بەهەرحاڵ مارتین دەڵێت ئەم ململانێیانە هێشتا تەواونەبوون، ڕەنگە دین جارێکی دی جێگەی خۆی لەکۆمەڵگادا بکاتەوە.

هەرچەندە ڕەنگە بوونی بەڵگەی وا لەجیهانی سێهەم و ڕوو لەپێشکەوتندا

دودڵمان بکات لەوەی کە عەلمانیەت دەرئەنجامی ناچاری مۆدێرنە بوون و پیشەسازیبوونە، بەڵام ئەم ئەنجامگیریە هیچ بناغەیەکی راستی نیە. زۆرێك لەکۆمەڵگاکانی جیهانی سێهەم بەئەندازەی بەریتانیای ئەو سەردەمە پیشەسازی نەبوون، واتە هەمان ئەو کاتەی کە گروپی متودیزم و گروپە ناسازشکارەکانی دی لەنێوان چینی تازەی کرێکارانی پیشەسازیدا، لایەنگریەکی زۆریان پەیداکردبوو. ئەمڕۆ گروپی متۆدیزم یەکێك لەو گروپانەیە کە خێراترین دابەزینی لەناو گروپە مەسیحیەکاندا هەیە. مارتین (١٩٩١) لایەنگرانی تیورەی عەلمانیەت ئاگادار دەکاتەوە کە ئەوەندە پشت بەم بەڵگانە نەبەستن و توندبوونی بڕوای دینی لەئەوروپای باشوردا، وەك نەتەوەگەری لەبەرچاو نەگرن و رووە دینیەکەی بە ڕێکەوت نەزانن.

راستیەکەی ئەوەیە ئێمە هێشتا نازانین عەلمانیەت لەبنەڕەتدا دیاردەیەکی مەسیحیە و تایبەتە بە رۆژئاواو یان دەرئەنجامی پیشەسازیبوون یان پرۆسەیەکی بەرفراوانتری مۆدێرنەیە. هەر لێرەوە **ولاتە نامەسیحیەکان یان نارۆژئاواییەکان تەنها لەحاڵەتێکدا عەلمانیەت ئەزموونەکەن کە پیشەسازیبوونیان هاوڕێی رۆژئاواییبون یان مۆدێرنەیەك بێت لەسەر شێوازی رۆژئاوا.** ئەگەر عەلمانیەت دیاردەیەکی تایبەت بە مەسیحی بێت، بەدوور دەزانرێ کە ئەم ولاتانە ئەزموونیبکەن، چونکە رۆژئاوایبوون گەر روشبدات، دورە بەمانای مەسیحیبوون بێت.

سەرچاوە

ئەم وتارە وەرگێڕانی فەسڵی ١٥ی ئەم کتێبەی خوارەوەیە:

مالکوم هیملتون: جامعەشناسی دین. ت: محسن سولاسی. تهران، چاپ اول ١٣٧٧. موسسه فرهنگی انتشاراتی تبیان؟





## دیموکراسی چیە

### نوسینی: کارل کۆهن

#### ١-١ چەند پێناسێکی کورت بۆ دیموکراسی

دیموکراسی حکومەتکردنە بەهۆی خەڵکەوە. ئەمە پێناسێکە کە زوبەری کتێبەکانی فەرهەنگ هێناویانەتەوە و رەنگە پێناسێك بێت کە لەلایەن هەموانەوە سەلمێنراوە، و لەگەڵ رەگوریشەی زاراوەکەشدا دێتەوە:دمۆس خەڵکی،کراتئین: حکومەتکردن رەگوریشە یۆنانیەکانی ئەم زاراوەیەن. فەیلەسوفان و دەوڵەتمەردانی دێرین ئەم چەمکەیان بەشێویەکی تەواو راست بەکاردەهێنا. پریکلس دەیگوت: "حکومەتی ئێمە بە دیموکراسی ناودەبرێت، چونکە بەڕێوەبردنی لەدەستی زۆرینەدایە ، نەك کەمینە". ئەرستۆش پاش دیاریکردنی چەند جۆرێکی دیموکراسی، لەکۆتاییدا دەڵێت: "بەشێویەکی گشتی دەکرێ بگوترێت ئەو رژێمەی رێگە بەهەموو هاوڵاتیان نادات بەشداریبکەن، رژێمێکە لەسەر بناغەی حکومەتی کەمینە (ئۆلیگارشی) (ئۆلیگۆس= چەند کەس) دامەزراوە و ئەو رژێمەش کە رێگە بە بەشداریکردنی هەمووان دەدات، رژێمێکی دیموکراتیە"( سیاسەت، چوارهەم،٦). لەسەردەمێکی تازەتردا رستە بەناوبانگەکەی ئابراهام لینکلۆن: "حکومەتی خەڵکی، بەهۆی خەڵکیەوە و بۆ خەڵکی" ئاماژە بۆ هەمان بیرۆکە دەکات. دیموکراسی سیستەمێکە کە تیاییدا خەڵکی حکومەت بەسەر خۆیاندا دەکەن.

ئەو دەربڕینە کورتانەی پێدەچێت بۆ پێناسکردنی دیموکراسی بەکاردەبرێن، تەنانەت گەر بەرێکەوتنی گشتیش بێت، هێشتا بابەتەکە زۆر روناکەنەوە، چونکە دەیەوێت شتێك کە بەهیچ شێوەیەك سادە نیە، زیاد لەسنور سادەبکاتەوە. نمونەکانی تر بریتین لە: "حکومەتکردن لەسەر بناغەی رازیبوون"، "فەرمانڕوایی زۆرینە"، "حکومەت یان مافی یەکسان بۆ هەموان"، "دەسەلاتداریێتی جەماوەر" و لەم باباتە شتانە. ئەمجۆرە پێناسە کورت و سودمەندانە، بەشێوەیەکی گشتی هەڵە نین، بەڵام







ناتوانن جەوهەری بابەتەکە ئاشکرابکەن. هەرکاتێك پێناسێکی وا بەدیدێکی رەخنەگرانەوە بپشکنین، ناتەواوی ئاشکرا دەبێت. رازیبوونی کێ؟ رازیبوون لەبارەی چیەوە؟ مافی یەکسان لەچیدا؟ چ شتێك دەبێتە هۆی رازیبوون یان یەکسانی مافەکان؟ دەسەڵاتداریێتی چیە، و خەڵك کەی خاوەنێتی؟ فەرمانڕەوایی بەهۆی زۆرینەی چ کەسانێکەوە؟ ئایا فەرمانڕەوایی زۆرینە هەمیشە دیموکراتیانەیە، و ئایا بڕیارە دیموکراتیەکان هەمیشە پێویستی بە دەنگدانی زۆرینەیە؟. بێگومان جیاوازی لەنێوان حکومەت بۆ خەڵك و حکومەت بەهۆی خەڵکەوە هەیە، لەبارەی حکومەتێکەوە کە ئەمیانە و ئەویان نیە، چی دەتوانین بڵێین؟ لەکوێدا حکومەتی خەڵکی جێگە دەگرێت؟ پرسیاری لەمجۆرە گەلێك زۆرن. ئەگەر بمانەوێت بەشێوەیەکی روون و تەواو لەمەبەستی واقعی حوکمی راستی " دیموکراسی واتە حکومەت بەهۆی خەڵکەوە" تێبگەین، پێویستە لێکۆڵینەوەکە لەسەرەتاوە دەست پێبکەین.

#### ١-٢ هەڵەی حکومەتکردن بەسەر خوددا

دەڵێین لەدیموکراسیدا خەڵکی فەرمانڕوایی بەسەر خۆیاندا دەکەن، واتە خەڵکی فەرمانڕەوان. ئەم شێوە دەربڕینە لانیکەم لەدیدێکەوە، مەجازیە. چەمکەکانی "فەرمانڕەوایی" و "فەرمانڕەوا" رێژەیین: نەحکومەتی بێ فەرمانبەردار هەیە و نە فەرمانڕەوایی بێ رەعیەت. بەشێك لەو شتەی پەیوەندی بەدەوڵەتەوە هەیە بریتیە لە: توانای باڵادەستبوون، توانای ناچارکردنی تاکەکان ژێر دەسەڵات یان توانای هەنگاونان دژی ئیرادەی ئەوان. بەم مانایە خەڵکی ناتوانن خۆیان فەرمانڕوایی بکەن، ئەگەرچی هەندێك خەڵکی لەهەندێك بەشی تردا فەرمانڕەوایی دەکەن. جۆن ستیوارت میل لەساڵی ١٨٥٩دا نوسی: "هەنوکە زانراوە کە دەستەواژەکانی وەك "حکومەتی خەڵکی" و "دەسەڵاتی خەڵك بەسەر خۆیاندا" تەعبیر لەهەلومەرجی راستەقینە ناکات. ئەو "خەڵکەی" کە پراکتیکی دەسەڵات دەکەن، هەمیشە هەمان ئەو کەسانە نین کە دەسەڵاتیان بەسەردا دەکرێت.."(لەبارەی ئازادیەوە، فەسڵی یەکەم). ئەم بابەتە نزیکەی سەدەیەك دواتر بەدەربڕینەکانی ڤاڵتەر لیپمان توندتر بوو: "خەڵکی...ناتوانن حکومەت بەڕێوەبەرن. ناتوانن کارێك ئەنجامبدەن و

بەشێوەیەکی ئاسایی ناتوانن پرۆژەسازی و پێشنیاری یاسا پێویستەکان بکەن. جەماوەر ناتوانێت حکومەت بکات" (فەلسەفەی کۆمەڵگا،١٩٥٥،لا١٩٧). هیچکەس هێندەی گلادستۆن بەو ناسکیە ئاماژەی بۆ ئەم خاڵە نەکردووە: "ئەو ژمارە خەڵکەی کە بتوانن ناوی نەتەوەیان لێبنرێت، هەرگیز بەمانای وردی وشە حکومەتیان بەسەر خۆیاندا نەکردووە، پێدەچێت بەرزترین شتێك کە لەهەلومەرجی ژیانی مرۆییدا بەدەست بێت، ئەوەیە نەتەوە دەبێت فەرمانڕەواکانی خۆی هەڵبژێرێت، و لەهەلومەرجی هەڵبژێراویشدا رابەرەیەتی کارەکانیان بکات" (سەدەی نۆزدەهەم، ژوئیەی ١٨٧٨).

ئاشکرایە خەڵکی لەدنیای سیاسەتی پراکتیکیدا ناتوانن بەو مانایەی ئاماژەی بۆکرا، فەرمانڕەوایی بەسەر خۆیاندا بکەن. حکومەت رەنگە هەلبژێراوی خەڵکی بێت، بەڵام خەڵك یاساکان دانانێن، یان جێبەجێیبکەن. کێشانی هێڵێکی جیاکەرەوە لەنێوان فەرمانڕەوایان و فەرمانبەراندا لانیکەم لە کۆمەڵگا گەورەکاندا، کارێکی ئەستەم نیە. زۆرینەی خەڵك حکومەت ناکەن، بەڵکو حکومەتیان بەسەردا دەکرێت.

لەگەڵ ئەمەشدا چەمکی حوکمڕانی بەسەر خودا، چەمکێکی ساویلکانە نیە، و کاتێك سود لەم دەربڕینە بۆ وەسفکردنی هەندێك هەلومەرج وەردەگرین، پێدەچێت قسەکانمان مانایەك پەیدادەکەن. حکومەتی دیموکراتی، حکومەتی خۆبەڕێوەبردنە، حکومەتی خەڵکە بەدەستی خۆیان. لەهەندێك بواردا حکومەتێکی لەمچەشنەی بوونی هەیە. لەگەڵ ئەمەشدا گەر رەخنەکانی پێشوو بەجدی وەربگیرێت، خەڵکی ناتوانن حکومەت بەسەر خۆیاندا بکەن. چۆن دەبێت ئەم پارادۆکسە، چارەسەربکەین؟

تێبینی بەکارهێنانی زاراوەی "خۆ بەڕێوەبردن" لەبواری ناسیاسیدا بکەن. دەڵێین تاکەکەس بەزەبر خۆبەڕێوەبەرە، واتە تەنها خۆی بەسەر خۆیدا حوکمڕانیدەکات. لێرەشدا رەنگە ئەم بەکارهێنانە مەجازی بێت، چونکە هیچکەس ناتوانێت خۆی بخاتە ژێر دەسەڵاتەوە، ئەگەرچی دەکرێت وێنای ئەوەبکرێت کە توانستە بەرزەکانی بەسەر توانستە نزمەکانیدا باڵادەست-دیارە ئەگەر کێشانی هێڵێکی وا جیاکەرەوە، لەنێوان تواناکاندا شێکی شیاو بێت. لەگەڵ ئەمەشدا جیاکاری نێوان حوکمڕانی بەسەر خود و لەژێر حوکمڕانی کەسانی تر بووندا، بۆ هەر







تاکەکەسێك بەرزترین پلەی گرنگی داگیردەکات. دەرككردنی خۆبەڕێوەبردن لەم ئاستە شەخسیەدا، رەنگە وەك کلیلی چارەسەری پارادۆکسی فەرمانڕەوای کۆمەڵگا بەسەر خۆیدا بەکاربهێنرێت.

من وەك تاکێك کاتێك بەسەر خۆمدا فەرمانڕەوای دەکەم، کە لەژێر رابەرایەتی و چاودێری کەسێکی تردا نەبم. کاتێك فەرمان بەسەر خۆمدا دەکەم کە خۆم بڕیار بۆ ئەو ئامانجانە بدەم کە هەمە، و خۆم ئەو هۆکارانەی بۆ گەیشتن بەو ئامانجانە پێویستن هەڵبژێرم. هەر مرۆڤێك ئەم شێوەیەی دەسەڵاتدارێتی بەسەر خودا، لانیکەم لەهەندێك کاروباری ژیانی خۆیدا ئەزموندەکات. کەوابوو کێشەکە لەکوێدایە؟ پاردۆکسەکە لەو راستیەوە سەرچاوە دەگرێت کە کرداری "حکومەتکردن" مانایەکی دولایەنەی هەیە. لەلایەکەوە دەسەڵاتی حکومەتکردن، بەمانای هێزی دەسەڵاتدارێتی و ناچارکردنە، و لێرەوە پێویستی بە دابەشبوونە بەسەر فەرمانڕەوایان و فەرمانبەراندا. دەکرێت ئەمە ناوبنێین مانای ئیداری حکومەت. لەلایەکی دیشەوە، واتە لەمانایەکی قوڵتردا حکومەتکردن بریتیە لەداڕشتنی ئامانجەکان و ستراتیژیە سیاسیەکان و ئاراستە بەخشین بەتاکەکەسە حکومەتکراوەکان. ئەم مانایەی دوایی مانای سەرەکی کرداری "حکومەتکردن"ە کە لەوشەی لاتینی گوبرنارە، کە ئەمیش لەوشەی یۆنانی کۆبرنان بەمانای بەرەوپێشەوە بردن یا کەشتیوانیەوە وەرگیراوە. دەکرێ ئەمە بەمانای "رێنمایکاری" حکومەت ناوبنێین.

لەهەر کۆمەڵگایەکدا حکومەت دەشێت فەرمانبکات، قەدەغەبکات، باڵادەستی پەیدابکات، ئەمانە ئەرکە ئیداریەکانی حکومەتە کە راستەوخۆ لەژیانی رۆژانەدا ئەزموندەکرێن، و هەمان ئەو ئەرکانەشە کە جێی تێبینی ئەو کەسانەیە کە بەڵگە بۆ ئەوە دەهێننەوە کە کۆمەڵگا ناتوانێت حوکمڕانی بەسەر خۆیدا بکات. بەڵام مەسەلەی بنەڕەتیتر ئەوەیە کە هەرکەسێك حوکمڕانی بەسەر کۆمەڵگادا بکات، رابەرایەتی و رێنمایدەکات. کاتێك لە حکومەتدا ئەم ئەرکی رێنمایکردنە وەك بنەمایەکی گرنگ دەرکبکرێت، ئەوسا پارادۆکسی حوکمڕانی بەسەر خودا دەتوێتەوە و لەناودەچێت. حکومەت تا ئەوکاتەی لەرووی ئیداریەوە وێنابکرێت، هەلگری ناکۆکی خواستەکان و هەبوونی هەندێك لەژێردەستی هەندێکی دیدایە، ودەبێت

بەشێك بێت لەكۆمەڵگا، نەك هەموو كۆمەڵگا. بەڵام هەركاتێك حكومەت لەرووی ڕێنمایكردنەوە تەماشابكرێت، وەهەلگری دیاریكردنی ئەو ستراتیژ و ئامانجانە بێت كە ڕابەرایەتی ژیانی گروپی دەكەن، ڕەنگە گروپێكی كەم یان گروپێكی زۆر حكومەت بكەن. لەبنەڕەتدا دەشێت هەموو ئەندامەكانی هەر كۆمەڵگایەك، بەشداری لەدارشتنی ئەو ئامانجانەدا بكەن كە بەشێوەیەكی هاوبەش هەیانە. هەركاتێك هەموان یان زۆرینەی خەڵكی بەشداری لەم ئەركەدا بكەن، ئێمە ئەو كۆمەڵگایە بەدروستی بەكۆمەڵگایەكی خۆبەڕێوەبەر وەسفدەكەین.

### ٣-١ ناوەڕۆكی دیموكراسی

دیموكراسی جۆرێك حكومەتی كۆییە. لەبەرئەوە دەبێت بۆ دیاریكردنی چییەتی دیموكراسی، ئەمجۆرە حكومەتە كۆییە لەهەموو شێوەكانی تر جیابكەینەوە. ئەمكارەش خۆبەخۆ پێویستی بە ناسینی دامێنی فراوانی چەمكی كۆ یان كۆمەڵگایە. لەرووی پراكتیكیەوە سنورێك بۆ جۆری كۆمەڵگا مرۆییەكان نیە. ئەو مەبەستانەی مرۆڤەكان وەك كۆمەڵگایەك بەیەكەوە دەبەستێتەوە، ڕەنگە لەنێوان مەبەستە پەست و مەبەستەكانی كە جیهان ئەتەكێنن، ڕاوەستابێت. فراوانی كۆمەڵگاكانیش دەكرێ لەزۆر بچوكەوە بێت بۆ زۆر گەورە. مەرج نیە سنورەكانی كۆمەڵگا جوگرافی بن، بناغەی یەكێتی كۆمەڵگا دەشێت لەسەر پەیوەندیەكانی برایەتی، خێرخوازی، خزمایەتی، دینی یان ئابوری دامەزرابن. دەشێ ئەوەی لە كۆمەڵگایەكدا جێگەی ئارەزووی هەموو ئەندامەكانێتی، تێپەڕ و كاتی بن، یان نمایشی سەقامگیرترین و قوڵترین ئارەزوەكانیان بكات. لەبیركردنەوە لەو كۆمەڵگایەنی دەكرێت دیموكراسیان تیا بەرپابكرێت، گرنگترین شت ئەوەیە سەرنج تەنها بۆ دەوڵەت نەتەوەكان نەچێت. ئەمجۆرە كۆمەڵگایانە زۆر گرنگن و ئارەزوی ئێمەش بۆ تێگەیشتن لەشێوەی دیموكراسی تیایاندا، بەتەواوی قابیلی دەرككردنە. بەڵام هەر تیورەیەكی باوەڕپێكراوی دیموكراسی دەبێ بۆ هەموو جۆر و ئەندازەكانی كۆمەڵگاكان، كەلەسنوری دەوڵەت-نەتەوە زۆر زیاتر دەڕوات، ڕاست بێت. ئەو كۆمەڵگایانەی كە جۆر و ڕەهەندی زۆر جیاوازیان هەیە، دەتوانن بەشێوەیەكی دیموكراتیانە بەڕێوەبرێن.







چ شتێك حكومەتی دیموكراتی كۆمەڵایەتی دەكاتە شتێكی پێویست؟ لێرەشدا لێكچونی ژیانی كۆمەڵگایەك لەگەڵ ژیانی تاكەكەسدا، دەتوانێت هاوكاریمان بكات. تاكەكەس دەتوانێت لەهەڵبژاردنی ئامانجەكانیدا بەڕێوبەر بێت، دەتوانێت سەربەخۆ بێت و ڕابەرایەتی خۆی بكات. ئەمجۆرە خۆ ڕابەرایەتیكردن و سەربەخۆییە لە پێوەری نێوان تاكەكاندا، بە دیموكراسی ناودەبرێت.

دیموكراسی حكومەتكردنە بەدەستی خودی خەڵكەوە، چونكە سیستەمێكە كە تیاییدا خەڵك واتە ئەندامانی كۆمەڵگا، بەشداری لەدیاریكردنی ستراتیژی سیاسیدا بۆ كۆی كۆمەڵگادەكەن. ئەركی ڕێنماییكردنی حكومەت، گرنگیەكی سەرەكی بۆ ڕەهەندی خۆبەڕێوەبردن هەیە، هەر ئەم ڕاستیە ئەگەری بەشداری گروپێكی زۆری خەڵك لەم كاری ڕێنماییكردنە كە دیموكراسیە، دەردەخسێنێت.

چەمكی دیاریكردنی ستراتیژی بۆ كۆی كۆمەڵگا بەمانای چیە؟ ئاشكرایە ئەمە ئەركێك نیە كە ئەندامانی كۆمەڵگا بتوانن بۆ یەكجار ئەنجامیبدەن و وازی لێبهێنن. ستراتیژ بەردەوام دروستدەكرێتو بەرهەمدێنرێتەوە، بەڕێوەبردنی كۆمەڵگا پێویستی بەتێبینیكردنی بەردەوام هەیە. لێرەوە خۆ بەڕێوەبردن پێویستی بە زنجیرەیەك بڕیاری پێكەگرێدراو، بەگرنگی زیاتر یان كەمترەوە هەیە، و لەئەنجامی بەگەڕخستنی ئەم بڕیار و ئەم هەڵبژاردنانەیە كە بەشداریكردن لەدیاریكردنی ستراتیژدا، بەشێوەیەكی هەستپێكراوی لێدێت. كاتێك گرنگترین بڕیارە كۆمەڵایەتیەكان لەڕێی بەشداریكردنی هەموو ئەندامانەوە بەدەستدێت، ئەوا دەكرێ ئەو كۆمەڵگایە بە كۆمەڵگایەكی خۆبەڕێوەبەر دابنێن.

كام بڕیارانە بەگرنگتر دەژمێرێن، ئایا ئەوانەی كە دەبێت هەموو ئەندامەكانی كۆمەڵگا مافی دەنگدانیان تیاییدا هەبێت؟ وەڵامی سروشتی ئەوەیە كە دەبێت ئەندامانی كۆمەڵگا لەدانی ئەو بڕیارانەدا كە كار لەهەموویان دەكات، یان بەشێوەیەكی جدی كاریگەریان تێدەكات، بیروڕایان هەبێت. بەڵام ئەم بڕیارانە كامانەن؟ ئەم پرسیارە هیچ وەڵامێكی گشتی نیە. لەزۆرێك لەبوارە تایبەتیەكاندا، چیەتی كۆمەڵگا وەڵامی ڕوون و پێویستی ئەم پرسیارە دەداتەوە. ڕەنگە لەبوارەكانی تردا هیچ ڕێكەوتنێك نەبێت كە لەسەر بناغەكەی بەهۆی كۆمەڵگاوە بەشێوەیەكی فراوان باسی مەسەلەكان بكرێت. جیاوازی بیروڕا لەم مەسەلەیەدا، ڕەنگە دەرئەنجامی

ڕێنەکەوتن بێت لەسەر ئامانجە سەرەکیەکانی کۆمەڵگا، یا (ئەگەر لەسەر ئەم ئامانجانە ڕێکبەون) ڕەنگە جیاوازی بیروڕا لە ڕێنەکەوتن لەسەر ئەو مەسەلەیە بێت کە ئەگەر بڕیارە ئامانجی گەورەتر بەدی بێت، کام بوارانەی چالاکی دەبێت بکەونە ژێر دەسەڵاتی گشتیەوە. خودی ئەم پرسیارەش کە کاری ڕاستەقینەی کۆمەڵگا ڕاگەیشتنە بەکام یەك لە بابەتەکان، پرسیارێکی بەناچار وتوێژئامێزە.

خۆشبەختانە بۆ تێگەیشتن لەچیەتی سەرەکی خودی دیموکراسی پێویست ناکات وەڵامی ئەم پرسیارە بدرێتەوە. هەنوکە من پێناسێك بۆ دیموکراسی پێشکەشدەکەم و بڕواموایە دەبێت هەوڵ بۆ هەرچی زیاتر وردکردنەوەی ئەم پێناسەیە بدەم:

دیموکراسی حکومەتێکی کۆییە کە تیاییدا لەزۆر ڕووەوە ئەندامانی کۆمەڵگا بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ، بەشداری لەو بڕیارانەدا دەکەن کە پەیوەندی بەهەمویانەوە هەیە، یان دەتوانن بەشداریبکەن.

دەتوانین لەسەر ئەم بناغەیە تیورەیەکی هاوئاهەنگ بۆ دیموکراسی بونیاد بنێین. یەکەم هەنگاوی پێویست شیکردنەوەی هەرچی وردی بەشداریکردن و ڕەهەندەکانێتی. چونکە لەمکارەوە دوو تیر بەیەك نیشانە دەپێکین. یەکەم شیکردنەوەیەکی لەمچەشنە خودی چەمکی دیموکراسی زیاتر ڕوندەکاتەوە، چونکە بەشداریکردن بەیەکێك لە ڕەگەزە سەرەکیەکانی دیموکراسی دەزانرێت. دوهەم، تێگەیشتن لەوەی بەشداریکردن بەشێوەیکی بەدیهاتوو هەلگری چ شتگەلێکە، هەڵسەنگاندنی عەقلانیانەی پلەکانی دیموکراسی کە لەهەر کۆمەڵگایەکدا بەدیهاتووە شیاو دەکات.

ئەم وتراە وەرگێڕانی فەسڵی یەکەمی ئەم کتێبەی خوارەوەیە

کارل کۆهن: دموکراسی. ت:فریبرز مجیدی. شرکت سهامی نشر خوارزمی.چاپ اول .تهران ١٣٧٣





## کۆمەڵگای مەدەنی: مێژووی چەمکەکە

### نیرا چاندۆك

لەفەسڵی پێشودا بەڵگەمان هێنایەوە کە بێئاماژەکردن بۆ کۆمەڵگای مەدەنی، ناتوانرێت بەدروستی دەوڵەت شیبکرێتەوە. لەگەڵ ئەمەشدا لەتیورەی سیاسیدا هیچ ڕێکەوتنێك لەبارەی پێناسی کۆمەڵگای مەدەنیەوە نیە. لەدەرون و لەناو نەریتە فکریە جیاوازەکاندا لەبارەی مانای کۆمەڵگای مەدەنیەوە، بیروبۆچونی جیاواز هەبووە. لێرەوە ئەم چەمکە، چەمکێکی چەندلایەنە و ئاڵۆزە. ئەم چەمکە خاوەن ڕەهەندی مانای جیاوازە کە ئەم ڕەهەندانە لەسیستەمی فکری جیاوازەوە سەرچاوەیانگرتووە و لەهەندێك ڕووەوە لەیەکەوە نزیکن و لەهەندێك رووی دیەوە زۆر لەیەك دورن. دەکرێ هۆی ئەمە بگەڕێنرێتەوە بۆ ئەو ڕاستیەی کە لەقۆناغە مێژوویە جیاوازەکاندا، ڕەهەندی جیاوازی ئەم چەمکە باڵادەستبووە، و ئەمەش چەمکی کۆمەڵگای مەدەنی بەشێوەیەکی سەرەکی توشی گۆڕانکردووە.

هەرچەند باسی گەرموگوڕ لەبارەی کۆمەڵگای مەدەنیەوە هەیە، بەڵام ئەم باسانە خاوەن هاوئاهەنگیەکی بنەڕەتین، چونکە ئەگەرچی چەمکی کۆمەڵگای مەدەنی ڕەنگە ماهیەتێکی نەگوڕ و یەکتای نەبێت، بەڵام خاوەن چەند خەسڵەتێکی دیاریکراوە. هەریەك لەم خەسڵەتانە بۆتە ناوەندێك بۆ شکڵگرتن و وتوێژی فکری دی لەبارەی ئەم چەمکەوە. لێرەوە دەکرێت مێژووی چەمکی کۆمەڵگای مەدەنی بەپێی ڕیوایەتە بەرجەستەکان و ئەو کاردانەوانەی لەبەرامبەر ئەم ڕیوایەتانەدا ئەنجامدراوە، وێنە بکەین.

لێکۆڵینەوەی مێژوویی چەمکێکی تایبەت لەو ڕووەوە گرنگە کە یارمەتی ناسین و جیاکردنەوەی تێروانینە جیاواز و ناکۆکەکان لەبارەی ئەو چەمکەوە دەدات. لێکۆڵینەوەی مێژوویی چەمکێك مانا جیاوازەکانی ئەو چەمکە ڕووندەکاتەوە و ئەمەش خۆی دەرگایەکمان بۆ ناسینی ئەو چەمکە بۆ دەکاتەوە. بە تاوتوێکردنی





کۆی نەریتی تیورەی سیاسی لەگۆشەی چەمکێکی تایبەتەوە و بەناسینی کەموکوڕی چاکسازیەکانی رابردوو، دەکرێ رەگەزە چارەنوسساز و زیندووەکانی ئەو چەمکە تێکئاڵێنین و بە ناسین و تێڕوانینێکی تازە بۆ ئەو چەمکە بگەین.

لەگەڵ ئەوەشدا لێکۆڵینەوەی مێژووی چەمکێك هاوکاریمان دەکات بۆ ئەوەی هەڵەکانی رابردوو دوبارە نەکەینەوە. لێرەوە ئەم لێکۆڵینەوە مێژووییە یارمەتی رونکردنەوەی ئەو چەمکە بۆ مەبەستە سیاسییەکان دەدات، چونکە ئەگەرچی کۆمەڵگای مەدەنی لەدنیای هاوچەرخدا بووە بە چەمکێکی بنەڕەتی بۆ دارشتنی پرۆژە رادیکالەکان، بەڵام تێڕوانینێکی کەموکوڕ و تاکڕەهەندی و شیکاری بۆ ئەم چەمکە، دەتوانێ ببێتە هۆی ئاراستەیەکی سیاسی نادروست. ئەمە بەمانای ئەوەیە لەلێکۆڵینەوەی مێژوویی چەمکی کۆمەڵگای مەدەنیدا نەك هەر دەبێ تێڕوانینی دامەزرێنەران و لایەنگرانی هەمەرەنگی کۆمەڵگای مەدەنی، بەڵکو دەبێت تێڕوانینی رەخنەگرانی کۆمەڵگای مەدەنیش تاوتوێبکرێ. لێکۆڵینەوەی مێژووی چەمکێك وەك کارێکی فیکری و سیاسی گرنگیەکی زیندووی هەیە.

مێژووی چەمکەکە کە لەدێرەکانی خوارەوەدا دەهێنرێتەوە، هەڵبژاردراوە و بەهیچ شێوەیەك کۆی تیورەکانی کۆمەڵگای مەدەنی ناگرێتەوە. من بەپشتبەستن بەو تێڕوانینە سەرەکیانەی لەبارەی پەیوەندی دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنییەوە پێشکەشکراوون، هەوڵمداوە پەیوەستبوون و دابڕان لەچەمکی کۆمەڵگای مەدەنیدا تاوتوێبکەم. بەبڕوای من لێکۆڵینەوەی کۆمەڵگای مەدەنی تەنها لەپەیوەندیدا بە دەوڵەتەوە مانای هەیە.

## مێژووی تیوری

چەمکی کۆمەڵگای مەدەنی بۆ ماوەیەکی درێژ بەشێکبووە لەنەریتی فکری رۆژئاوا. ئەم نەریتە فکریە هاوکات لەگەڵ گۆڕانکاریە مادی، سیاسی، و فکریەکانی کۆمەڵگای رۆژئاوادا گۆڕانی بەسەرداهاتووە. ئەم نەریتە فکریە لەگەڵ گۆڕانکاریە مێژووییەکانی کۆمەڵگای رۆژئاوادا وەك پەیدابوونی دەسەڵاتی دنیایی و نامەزهەبی، پەرەسەندنی مۆڵکایەتی تایبەتی، پەیدابوونی کلتوری شار، لەناوچوونی دەوڵەتە دەسەڵاتدارە رەهاکان، پەیدابوونی بزوتنەوە دیموکراتیەکانی سەدەی نۆزدەهەم،





مەشروتیەتگەری نوێ و باڵادەستی یاسا، پەیوەندییەکی دانەبڕاوی هەیە. ئەم نەریتە فکریە بەر لەهەمووشتێك پەیوەندی لەگەڵ پەرەسەندنی ئابوری سەرمایەداری و لەدەرئەنجامدا جیابونەوەی ئابوری لەسیاسەت هەیە. بەمشێوەیە ئەم نەریتە فکریە بێ چەندوچوون پەیوەندییەکی توندوتۆڵی بەپەیدابوون و سەقامگیری سەرمایەدارییەوە هەیە.

ئەو وتەیەی کین راستە کە چەمکی کۆمەڵگای مەدەنی "بەر لەدەرکەوتنی بۆرژوازی هەبووەو بۆنمونە لەبیری سیاسی سەردەمی کلاسیك و ناوەڕاستدا بەباشی بڵاوبوو بووە و لەمەش گرنگتر ئەوەیە هەموو مانا سەرەتاییە تازەکانی ئەم چەمکە پەیوەندی بەمەسەلەی سیاسیو جۆر و شکڵی هەلومەرجی کونترۆڵ و رەوایەتی دەسەڵاتی دەوڵەتەوە هەیە". بەڵام وەك پاشتر دەریدەخەین بەر لەدەرکەوتنی کۆمەڵگای بۆرژوازی، چەمکی کۆمەڵگای مەدەنی بە وردیەکی ئەوتۆ بەکار نەدەهات. کۆمەڵگای مەدەنی تەنها کاتێکبوو بەچەمکێکی روون و گونجاو کە بواری مەدەنی بە باشی دروستبوو. دروستبوونی بواری مەدەنیش خۆی دەرئەنجامی سەقامگیری سەرمایەدارییبوو. ناوەندێتی کۆمەڵگای مەدەنی پەیوەندیەکی نزیکی بە دەرکەوتنی دەسەڵاتی سیاسی ناشەخسی و ناوەندێتی ژیانی ئابوریەوە لەکۆمەڵگای سەرمایەداریدا هەیە. بەبڕوای بۆبێۆ ئەم «زنجیرە بیروڕایە هاوکاتی دەرکەوتنی دنیای بۆرژوازیە: ناسینی مافی سروشتی تاکەکان و گروپە کۆمەڵایەتیەکان بەشێوەیەکی سەربەخۆ لەدەوڵەت، بەشێوەیەك کە دەسەڵاتی سیاسی سنورداربکات، و ناسینی بوارێك لەپەیوەندی نێوان تاکەکان وەك پەیوەندیە ئابوریە سەربەخۆکان کە رێکخستنیان پێویستی بە دەسەڵاتێکی سەرکوتکەرانە نیە».

سەرەڕای ئەمە لەنەریتی رۆژئاوادا ئەم زنجیرە بیروڕایە هاوکاتی ئەم مەسەلانەی خوارەوە بووە: مافە فەردیەکان بەتایبەتی مافی موڵکایەتی، پیرۆزی مافەکان و ئازادیە فەردیەکان، دەسەڵاتی بازاڕ، تاکگەری، و جیابونەوەی بواری گشتی لەبواری تایبەتی. جگە لەمەش ئەم بیروڕایانە پەیوەندی بەدەزگا و تێزە پەرلەمانیەکان و هەروەها بڕوابوون بە پێویستی کۆنترۆڵکردن و سنوردارکردنی دەسەڵاتی دەوڵەتەوە هەبووە. هەریەك لەم بیروڕایانە لەقۆناغی جیاوازی پەرەسەندنی چەمکی کۆمەڵگای مەدەنیدا روونبونەتەوە. هەریەکێکیشیان لەقۆناغی مێژووی جیاوازدا باڵادەستبوون.





بەڵام هەموویان پێکەوە یارمەتی ڕوونبوونەوەی خەسڵەتەکانی شتێکیان داوە کە دەکرێ ناوبنرێ «کۆمەڵگای مەدەنی». لەدێڕەکانی خوارەوەدا باسی ئەم خەسڵەتانە دەکەین.

لەرویەکەوە دەتوانرێ بگوترێ کۆمەڵگای مەدەنی لەبەرامبەر چەمکی ئەرستۆیی کوینونیا پۆلیتیکە (بەمانای کۆمەڵگای سیاسی) ڕادەوەستێت. کۆمەڵگای سیاسی لەروانگەی یۆنانیەکاندا لەسروشتی مرۆڤەوە سەرچاوەیدەگرت، چونکە مرۆڤ «ئاژەڵێکی سیاسی» و بونەوەرێکی سیاسی بوو. مرۆڤ عیزەتی نەفس و سروشتی ڕاستەقینەی خۆی لەبواری سیاسیدا بەدەست دێنێت، و لەبەرئەوە چالاکیە ناسیاسیەکانی لەپلەی دووهەمدا دەهات. بوونی بوارێکی تایبەتی یان نادەوڵەتی کە تیایدا تاکەکان بتوانن لەئەرکە گشتیەکانیان دوربکەونەوە یان بتوانرێ بەهۆیەوە سنور بۆ کۆمەڵگای سیاسی دابنرێت، شتێکی قابیلی وێناکردن نەبوو. ئەو بیرەش نەبوو کە تاکەکان دەبێ خاوەن مافی سەربەخۆ و پارێزگاریکراو بن.

ئەم تێڕوانینانە لەتیورەی یۆنانیەکاندا نەبوو. چونکە لەروانگەی ئەوانەوە تاك خۆبەخۆ بەشێك بوو لەپرۆسەی سیاسی، کە تاکەکان بەهۆیەوە تواناکانی خۆیان بەدیدێنن. مافی سەرەکی تاك بریتیبوو لەبەشداریکردن لەوتوێژی کۆمەڵگایەکدا کە ئەم خۆبەدیهاتنەی دەهێنایەدی. لەراستیدا ئەم مافە ئەرکێکی مەدەنیبوو.

ئەڵبەتە لەبنەڕەتدا چەمکی ئەرستۆیی «ئاژەڵی سیاسی» خەسڵەتێکی دەستەبژێرانەی هەبوو: «ئاژەڵی سیاسی» ئەرستۆ تاکێکی نێر، هاوڵاتی و دەوڵەمەند بوو. کەسانی دی وەك ژنان یان کۆیلەکان سەر بە ئویکۆس یان دنیایی تایبەتیبوون. ئویکۆس بەمانای بوارێکی تایبەتی و جیاواز لەکۆمەڵگای سیاسیبوو، بەڵام زەحمەتە بەشێوەیەکی سەرەتایی کۆمەڵگای مەدەنی بزانرێت، چونکە ئویکۆس بوارێکی پلەدوو بوو کە ئەو کەسانەی لەخۆدەگرت کە لەمافەکانی هاوڵاتیبوون بێبەشبوون. وەك دواتر دەبینین لەشکڵبەندیەکانی دواییدا ئەم بوارە خودی هاوڵاتیان لەخۆدەگرێت، و لەبری ئەوەی لەبەرامبەر کۆمەڵگای سیاسیدا بوارێکی پلەدوو بێت، بوارێکە کە تیایدا گرنگترین چالاکیەکانی کۆمەڵگا دروستدەبێت. لەکۆمەڵگای یۆنانیدا هیچجۆرە وینایەك بۆ ئازادی فەردی، وەك مافێکی زاتی و پارێزراوی مرۆڤ نەبوو. لەکاتێکدا ئەم مافە بەرجەستەترین ڕەگەزەکانی تێگەیشتنە سەرەتاییەکان بووە بۆ کۆمەڵگای







مەدەنی.

ڕۆمانیەکانیش چالاکی سیاسیان بە گرنگترین چالاکی تاك و بە ڕەمزی خود دروستکردنی تاکیان دەزانی. لەروانگەی ڕۆمانیەکانەوە دەوڵەت بەمانای کۆمەڵگای هاوڵاتیان بوو. لەگەڵ ئەوەشدا بەپەرەسەندنی یاسایی ڕۆمانی کە زامنی مافی فەردی و بەتایبەتی مافی مۆڵکایەتی دەکرد، شێوەیەکی سەرەتایی لەجیابونەوەی بواری تایبەتی لەبواری گشتی دروستبوو. مافە تایبەتیەکان ئاماژەی بۆ خێزان و بەڵگەی پەیوەندیدار بە ڕێکەوتنامەکان، مۆڵکایەتی و میرات دەکرد. لەڕاستیدا پەیدابوونی سیستەمێکی ئەخلاقی تاکگەریانە لەرۆمانی کۆندا پەیوەندی بە مۆڵکایەتی تایبەتی و مافی پاوانکردنی مولکایەتیەوە هەبوو. بەیاساییبوونی مۆڵکایەتی تایبەتی جیاکردنەوەیەکی چەمکی لەنێوان ڕەهەندی گشتی ژیانی تاك لەلایەك و پێداویستیە تایبەتیەکانی خۆی  کە هەنوکە ملکەچی مافی جیا و تایبەتی خۆی بوو، لەلایەکی دییەوە دروستکرد. ئەم مەسەلەیە بەفەرمی ناسرا کە تاك مافی ئەوەی هەیە خاوەن ژیانێکی سەربەخۆ لەکۆمەڵگای سیاسی بێت. ئەم جیابونەوەی بواری تایبەتی لەبواری گشتی، زەمینەی چەمکیی پێویستی بۆ دەرکەوتنی چەمکی کۆمەڵگای مەدەنی خۆشکرد.

کۆمەڵگای مەدەنی بەشێوەیەکی سەرەکی وەك چەمکێکی تازە، لەسەدەی هەڤدەهەم تا سەدەی نۆزدەهەمدا پەیدابوو. دەرکەوتنی ئەم چەمکە پێشکەوتنێکی گرنگبوو لەبواری مافەکانی پەیوەندیدار بەتاك، پەیوەندی تاك بە دەوڵەت و بەکەسانی دی کۆمەڵگاوە. کۆمەڵگای مەدەنی چەمکێکی نوێیە. چونکە ئاشکراکەری جیابونەوەی ڕوونی ژیانی مەدەنی و سیاسیە لەیەکدی، جیاکاریەك کە لەرابردوودا بەگشتی نەناسراوبوو. یەکەمین نیشانەکانی ئەم چەمکە تازەیە لەشکڵبەندیەکانی لۆك و هۆبزدا کە تیورەسازانی سەرەتایی نوێگەریبوون دەدۆزرێتەوە.

لەگەڵ ئەوەشدا جیاوازی کۆمەگای مەدەنی لەکۆمەڵگای سیاسی هێشتا ڕوون نیە. چونکە هۆبز و لۆك دوو سیفەتی مەدەنی و سیاسیان لەبری یەك بەکاردەهێنا: بۆ نمونە لۆك باسی «کۆمەڵگای مەدەنی یان سیاسی» و ڕوبەڕوبونەوەی «دۆخی سروشتی» و «دۆخی مەدەنی» دەکرد. بەشێوەیەکی سەرەکی ئەو ئاڵۆزیەی لەبەکارهێنانی چەمکی کۆمەڵگای مەدەنیدا هەبوو، دەگەڕایەوە بۆئەوەی ئەم چەمکە بۆ ئەو

مەبەستە بەکاردەهێنرا، کە شێوەیەکی تایبەت لەرێکخستنی کۆمەڵایەتی و سیاسی لەدۆخی سروشتی جیابکاتەوە. یەکەم: لەروانگەی ئەم تیورەسازانەوە کۆمەڵگای مەدەنی لەرووی چەمکەوە خاڵی بەرامبەر بە دۆخی سروشتی بوو. دوهەم: لەتیورەکانی پەیمانی کۆمەڵایەتیدا کۆمەڵگای مەدەنی دیاردەیەکی دروستکراوە. بەدەربڕینێکی تر دۆخی سروشتیە کە فەزای سروشتی تاکە و کۆمەڵگای مەدەنیش شتێکە کە دەبێت دروستبکرێت.

هەلومەرجی سروشتی دروستکراوی زیهنی تیورەسازانی پەیمانی کۆمەڵایەتی بوو، بۆ پیشاندانی ئەوەی کە تاك ئازادانە دەوڵەت قبوڵدەکات و هەروەها بۆ پیشاندانی ئەو مەسەلەیەی کە دەوڵەت لەسەر بناغەی رازیبوون دروستدەبێت. تیورەسازانی پەیمانی کۆمەڵایەتی لای خۆیان وا بیریان کردبۆوە کە ئەگەر هەوەس و ئارەزوەکانی مرۆڤ کۆنتڕۆڵنەکرێت، ژیان چ شکلێکی دەبێت. ئەوان ئەم دۆخەیان بەدۆخی سروشتی ناودەبرد. لەدیدی هۆبزەوە ئەم دۆخە هەم دۆخێکی پێش سیاسیبوو، هەم پێش مەدەنی. لەدیدی هۆبزەوە خەسڵەتی ئەم دۆخە جەنگی هەموانە دژی هەمووان. لەو دۆخەدا هەوەس و ئارەزووەکانی مرۆڤ ژیانی تاکەکان دەخەنە مەترسیەوە. لێرەوە ئاشتی و ئاسایشی مادی کاتێك دەستەبەر دەکرێت کە هەوەس و ئارەزوەکانی مرۆڤ بەهۆی دەسەڵاتدارێکی بەهێزەوە، کۆنتڕۆڵدەکرێت. تاکەکان بۆ زامنکردنی مافی ژیانی خۆیان، واز لەئازادیە سروشتیەکانی خۆیان دێنن و قبوڵی دروستبوونی کۆمەڵگایەکی یاسایی دەکەن. هۆبز ئەم کۆمەڵگا یاسارێژکراو و ئاشتیخوازە کە بە رازیبوون دروستدەبێت، ناودەنێت کۆمەڵگای مەدەنی. بەمشێوەیە پەیمانی کۆمەڵایەتی دەبێتە هۆی دروستبوونی کۆمەڵگای مەدەنی و سیاسی کە هەردوکیان لەرووی چەمکەوە لەبەرامبەر دۆخی سروشتیدا رادەوەستن.

بەبڕوای لۆك دۆخی سروشتی دۆخێکی توندوتیژ نەبوو، بەڵکو دۆخێکی کۆمەڵایەتی بوو کە خەسڵەتەکەی ئاڵوگۆڕی مەدەنی نێوان تاکە سەربەخۆ و ئازادەکان دروستیدەکات. دۆخی سروشتی وەك دۆخێك کە تیایدا تاکەکان لەسەر بناغەی یاسای سروشتی کاردەکەن، هەلومەرجێکی پێش سیاسی بوو، نەك هەلومەرجێکی پێش کۆمەڵایەتی. لەگەڵ ئەمەشدا بەپێی بەڵگاندنەکانی لۆك لەحاڵەتی نەبوونی مەرجێکی رێکخەر کە بتوانێ زامنی جێبەجێبوونی رێکەوتن و





پەیمانەکان بکات، پەیوەندی تاکەکان پێشبینی ناکرێت و لەدەرئەنجامدا مەترسیدار دەبێت. هەستی نەبوونی ئاسایشی گیانی و مادی بووە هۆی ئەوەی تاکەکان پەی بە گرنگیبوونی مەرجەعێکی یاسایی بەرن و لەدەرئەنجامدا دۆخی مەدەنی پێکبهێنن کە تیایدا خاوەن ئاسایش بن. لۆك بەڵگەی دەهێنایەوە کە کۆمەڵگا لەسروشتی مرۆییەوە سەرچاوە دەگرێت، بەڵام ئەم کۆمەڵگایە دەبێت بەهۆی پەیمانە کۆمەڵایەتیەکان و دەوڵەتەوە رێکبخرێت. تەنها کاتێك دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنی دروستبوون، ئازادیەکانی دۆخی سروشتی دەتوانن بێنە دی. لۆکیش وەك هۆبز دۆخی مەدەنی لەرووی چەمکەوە بە خاڵی بەرامبەر دۆخی سروشتی دەزانی.

کۆمەڵگای مەدەنی و سیاسی کە بە هۆی پەیمانی کۆمەڵایەتیەوە دروستدەبوو، زامنی مەدەنیەتی دەکرد، چونکە ئەم کۆمەڵگایە بەپێچەوانەی دۆخی سروشتیەوە ئازادی هەڵسەنگێنراو، ئاسایشی گیانی و مادی، و ژیانی عەقڵانی دەستەبەردەکرد. هەنوکە تاکەکان دەچنە ناو تۆڕێك پەیوەندی سەقامگیرەوە و مافی یەکدی بەفەرمی دەناسن و رێزیان لێدەگرن. بەمشێوەیە کۆمەڵگایەك دروستدەبوو کە تەنها کۆمەڵگایەکی سیاسی واقعی بوو کە تیاییدا تاکەکان بەهۆی پەیمانی دولایەنەوە، پێکەوە دەبەستران. هەروەها رازیبوون یان پەیمانی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگایەکی یاسایی پێکدەهێنا کە تیایدا ژیانی تاك، داراییەکانی و ئاسایشی دەیتوانی پارێزراو بێت. بەمشێوەیە کۆمەڵگای مەدەنی یەکسان بوو بە کۆمەڵگای سیاسی، بەڵام کۆمەڵگای سیاسی تەنها کاتێك دەیتوانی هەبێت کە مەدەنیەت لەپەیوەندی مرۆڤەکاندا بەهۆی پەیمانێکەوە زامندەکرا. لەبەرامبەردا مەدەنیەتیش تەنها بەهۆی دەسەڵاتی سیاسیەوە دەیتوانی بپارێزرێت.

جەختی هەردوو بیریار لەسەر مامەڵەی کۆمەڵایەتی و سیاسی رێکخراو، باسی ئەوە دەکات کە گواستنەوە لەدۆخی سروشتیەوە یان سوکێتاس ناتوراليس (کە تیایدا مرۆڤەکان ئازاد و یەکسان بوون) بۆ کۆمەڵگای مەدەنی یان سۆکێتاس کیویلیس (کە تیادا تاکەکان ئازادانە قبوڵی هەندێك سنوردارێتی بۆ ئازادی خۆیان دەکەن)، مەسەلەیەکی لۆژیکی و تەنانەت پێویستبوو. گەر وانەبوایە تاکەکان دەبوو باجێکی گەورە بدەن. ئەگەر ئەم رێسا و سنوردارێتیانە نەبوونایە، دڵەڕاوکێ و لەرزیووی باڵادەست دەبوو. تاکەکان یان دەبێت ئازادی رەها بەڵام بێ دڵنیایی دۆخی سروشتی،





یان ئازادی سنوردار بەڵام پڕ دڵنیایی لەکۆمەڵگای مەدەنیدا هەڵبژێرن. ئەوان بە ئاشکرا دوهەمیان هەڵبژارد.

لەورووەوە کە تیورەسازانی پەیمانی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگای مەدەنیان لەخاڵی بەرامبەر بەدۆخی سروشتیدا دادەنا، کۆمەڵگای مەدەنی و کۆمەڵگای سیاسیان تێکەڵ بەیەکترکرد. لەروانگەی ئەوانەوە تاکەکان هەرئەوەندەی لەدۆخی سروشتیەوە چونەدەرێ، دەچنە ناو کۆمەڵگای مەدەنی و سیاسیەوە. تێکەڵی کۆمەڵگای مەدەنی و سیاسی لەبەرهەمەکانی بیریارانی تریشدا دەبینین. بۆ نمونە بۆدن دەیگووت «دەوڵەت کۆمەڵگای مەدەنیە» و ئیمانۆئیل کانتیش دەیگووت «مرۆڤ دەبێت لەدۆخی سروشتی کە تیایدا هەرکەسێك بەپێی هەوەس و ئارەزوەکانی خۆی دەسوڕێتەوە، بێتە دەرێ و پەیوەندی بەکەسانی دیەوە بکات....مل بۆ سنورداریێتیەکی یاسایی و دەرەکی گشتیبدات...و بە دەربڕینێکی دی بەپلەی یەکەم بچێتە ناو دۆخی مەدەنیەوە».

مەسەلەیەکی تر ئەوەیە کە لەتیورەکانی پەیمانی کۆمەڵایەتیدا، کۆمەڵگای مەدەنی وەك خاڵی بەرامبەر دۆخی سروشتی، چەمکێکی دروستکراوە. لەتیورەی لۆکدا کۆمەڵگا سەرچاوە لەسروشتی مرۆڤەوە وەردەگرێت، بەڵام کۆمەڵگا بۆئەوەی بەردەوام بێت دەبێت کۆمەڵگایەکی مەدەنی بێت، واتە کۆمەڵگایەك بێت لەسەر بناغەی مەدەنیەت و هەنگاونانی دولایەنە راوەستابێت. کۆمەڵگایەکی یاسارێژ کە تیایدا تاکەکان سنورداریێتیەك بۆ مافی خۆیان قبوڵدەکەن و دۆخێکی سیاسی کە تیایدا تاکەکان ملکەچی یاسا مەدەنیەکان و پەیمانی دولایەنەن، شتێکە کە دەبێت هوشیارانە دروستبکرێت. بەمشێوەیە چەمکی ئەرۆستۆیی کوینونیا پۆلۆتیکە (یا کۆمەڵگای سیاسی) بەتەواوی پێچەوانە دەبێتەوە. لەڕوانگەی یۆنانیەکانەوە کۆمەڵگای مەدەنی\سیاسی مەسەلەیەکی سروشتیبوو، چونکە: بەتەواوی لەگەڵ سروشتی کۆمەڵایەتی مرۆڤدا (ئاژەڵی سیاسی) گونجاو بوو. بەڵام هەر ئەم کۆمەڵگا مەدەنیە لەروانگەی هۆبزەوە (لەبەرئەوەی خاڵی بەرامبەر دۆخی سروشتیە و لەرێگەی رێکەوتنی تاکەکانەوە بۆ دەرچوون لەدۆخی سروشتی دروستدەبێت) کۆمەڵگایەکی «دامەزراو یان دروستکراوە».

ئێستا قبولکردنی ئەو مەسەلەیەی تاکەکان بەشێوەیەکی هوشیارانە کۆمەڵگایەکی مەدەنی و کۆمەڵگایەکی سیاسی دروستدەکەن ، دەرئەنجامی زیندووی





دیارکراوی دەبێت. تاك لەتێڕوانینی ئەرستۆدا بۆ کوینیونیا پۆلیتیکا، توانای کەمی لەبەرامبەر کۆمەڵگای سیاسیدا هەیە، چونکە ئارەزوەکان و هەوەس و عەقڵی مرۆڤ بەشێوەیەکی سروشتی دەبێتە هۆی پەیدابوونی کۆمەڵگای سیاسی. بەڵام کاتێك تاکەکان بەشێوەی ئازادانە و هوشیارانە کۆمەڵگایەکی دروستکراو پێکدەهێنن، ئەوسا خۆبەخۆ خاوەن توانایەکی سەربەخۆ لەم کۆمەڵگا دروستکراوە دەبن. رازیبوونی تاکەکان گرنگیەکەی لەوەدایە، توانایی ئەو کەسانەی رازیدەبن پیشاندەدات. تاك لەتیورەکانی پەیمانی کۆمەڵایەتیدا خەسڵەتێکی عەقلانی هەیە و دەتوانێت لەوە تێبگات کە لەحاڵەتی نەبوونی خەسڵەتە یاساییەکاندا، پەیوەندییە مرۆییەکان توشی کێشە دەبن و ئاسایش مومکین نابێت. پرۆسەی رازیبوون، توانای سیاسی و کۆمەڵایەتی بە تاك دەبەخشێت، چونکە دەیکاتە خاوەن تیژ بینی و یەکسانی سیاسی. گرنگتر لەمە دروستکردنی کۆمەڵگایەکی مەدەنی\سیاسی دروستکراو، دەبێتە هۆی ئەوەی تاکە رازیبووەکان تا رادەیەك کۆنترۆڵیان بەسەر ئەم دروستکراوەی خۆیاندا (واتە کۆمەڵگای مەدەنی و سیاسی) هەبێت. ئەم کۆنترۆڵەش لەبەرئەوە قابیلی جێبەجێبوونە کە تاکەکان لەسەر بناغەی یاسای سروشتی، خاوەن مافی سروشتین.

تیورەسازانی پەیمانی کۆمەڵایەتی گۆڕانکاریەکی یاسایی گرنگیان هێنایە دی. ئەوان مافی سروشتی فەرمانڕەوایان سەندەوە و مافە سروشتیەکانیان لەسەر بناغەی یاسای سروشتی بەتاکەکان سپارد. ئەم مافە سروشتیانەیان بەهەمیشەیی و نەگۆڕ دەزانی کە قابیلی گواستنەوە نییە. لەهەر کۆمەڵگا و هەلومەرجێکدا تاکەکان لەبەر مرۆڤبوونی خۆیان، خاوەن ئەم مافانەن. ئەم مەسەلەیە دەرئەنجامی گرنگی بۆ چەمکی کۆمەڵگای مەدەنی هەبوو. تاکەکان بە دەستی خاڵی نەدەچونە ناو کۆمەڵگای مەدەنیەوە، بەڵکو ئەم مافانەیان لەگەڵ خۆیاندا دەبرد. یەکێك لەم مافانە، مافی هەڵبژاردنی شێوەی حکومەت بوو. بەڵام گرنگتر لەمە کاتێك حکومەت دروستبوو، وەزیفەی فەرمانڕەوا ئەوەبوو کە هەلومەرجی پێویست بۆ بەدیهاتن و بەردەوامبوونی مافی تاکەکان بێنێتەدی. لەڕاستیدا ئامانجی پەیمانی کۆمەڵایەتی، دروستکردنی کۆمەڵگایەك بوو، کە تیایدا مافی تاکەکان لەرێگەی رێکەوتنی دولایەنەوە پارێزراو بێت و بێتە دی. بەمشێوەیە ئەم مافانە بوونە هۆی سنورداربوونی دەسەڵاتی فەرمانڕەوا. نەك هەر ئەو دەوڵەتە مەشروتیەتەی کە





بەپێی بەڵگاندنەکانی لۆك بە هۆی تاکەکانەوە دروستدەبوو، بەڵکو ئەو دەوڵەتە دەسەڵاتدارەش کە بەپێی تێڕوانینی هۆبز لەلایەن تاکەکانەوە دروستدەکرا، سنوردار بوو. ئەم دەوڵەتانە بەهۆی مافی سروشتی تاکەکانەوە، سنوردار دەکرێن. بە دەربڕینێکی دی ڕەچاوکردنی مافەکانی تاك، بوو بە ئەرکی دەوڵەت و بەمشێوەیەش سنورداڕێتی بۆ دەوڵەت دروستکرد.

دیارە ئەم سنورداڕێتیانە لەتیورەکەی لۆکدا زۆر زیاترە. لۆك کە ڕاستەوخۆ پاش «شۆڕشی شکۆدار»ی ساڵی ١٦٨٨ تیورەکانی خۆی نوسی، مافی جۆراوجۆری، وەك مافی مۆڵکایەتی و گواستنەوەی دارایی و مافی ئازادی  بۆ تاك بە ڕەوا دانا. لەروانگەی لۆکەوە تاکەکان بۆ پاراستن و بەدیهاتنی ئەم مافانە، دەچنە ناو کۆمەڵگای مەدەنیەوە. لۆك و هیگڵیش پاش ئەو، بڕوایانوابوو ئەم مافانە تەنها لەکۆمەڵگایەکدا دەتوانێت بپارێزرێت کە ئەم مافانە بەفەرمی بناسێت و پشتیوانیەکی یاسایی بۆ دابینبکات. ئەم مافانە بەهۆی زەمانەتی کۆمەڵایەتی و سیاسیەوە، پیرۆزی ئەخلاقی و سیاسی بەدەستدێنن. لێرەوە ئەو دەوڵەتەی لۆك مەبەستی بوو، هەر لەسەرەتاوە دەوڵەتێکی مەشروتە بوو.

بەلام تەنانەت هۆبزیش بەپێچەوانەی تەفسیرە باوەکانەوە، چەند سنورداڕێتیەکی بۆ دەوڵەت دادەنا. ئەگەر کتێبەکەی بەقوڵتر بخوێنینەوە، دەتوانین ئەم سنورداڕێتیانە دیاریبکەین. لەروانگەی هۆبزەوە تاك خاوەن دوو زنجیرە مافە کە دەوڵەت دەبێت ڕێزیان لێبگرێت. یەکێکیان ئەوەیە دەوڵەت ناتوانێت مافی ژیانی تاك پێشێلبکات. هۆبز دەنوسێت «ئامانجی گوێڕایەڵی، پاراستنە» لەروانگەی هۆبزەوە نەك مافی زیندووبوون، بەڵکو مافی خاوەنداڕێتی بەرهەمەکانی گوزەرانی ژیان: وەك دەستگەیشتن بە کەرەسەی خۆراك و ئاو و دەرمانیش، دەگرێتەوە.

«ئەگەر فەرمانڕەوا فەرمان بەکەسێك بدات، ئەگەرچی دادپەروەرانەش مەحکومکرابێت، خۆی بکوژێ یان بریندار یان کەمئەندام بکات، یان بەرگری لەبەرامبەر هێرش و زەبری کەسانی دیدا نەکات، یان لەبەکارهێنانی خۆراك، هەوا، دەرمان  یان هەر شتێکی دی کە بۆ بەردەوامی ژیان پێویستە دەستهەڵگرێت، ئەو تاکە مافی سەرپێچیکردنی هەیە.

ئەگەر تاکێك لەرووی تاوانێکەوە کە ئەنجامیداوە، لەلایەن فەرمانڕەوا یان







نوێنەرەکەیەوە لێکۆڵینەوەی لەگەڵ بکرێت، ئەو تاکە بێ دڵنیابوون لەبەخشین و لێبوردن، ناچار نیە دان بە تاوانەکەیدا بنێت...چونکە ناتوانرێت بە ڕێکەوتن و پەیمان هیچکەس ناچاربکرێت خۆی تاوانبار بکات».

ئەم مافە تایبەتیە سنورداڕێتیەکی پۆزەتیف بۆ دەسەڵاتی فەرمانڕەوا دروستدەکات.

لەروانگەی هۆبزەوە تاکەکان خاوەن چەندان مافی نیگەتیڤیشن، واتە ئەو مافانەی لەحاڵەتی بێدەنگبوونی یاسادا مولکی تاکەکەسن: «ئازادیەکانی دی پەیوەندی بە بێدەنگبوونی یاساوە هەیە. لەحاڵەتێکدا کە فەرمانڕەوا هیچ یاسایەکی دانەناوە، تاك دەتوانێت بەپێی بڕوا و دیاریکردنی خۆی کاربکات». گرنگتر لەهەموو ئەمانە ئەوەیە، لای هۆبز گوێڕایەڵیش سنوری هەبوو : «گوێڕایەڵی خەڵکی لەفەرمانڕەوا تا کاتێك بەردەوامدەبێت کە هێشتا فەرمانڕەوا توانای پێویستی بۆ پارێزگاریکردن لەخەڵك هەبێت، چونکە تاکەکان  بەشێوەیەکی سروشتی خاوەن مافی پارێزگاریکردنن لەخۆیان و کاتێکیش هیچ کەسێکی دی ناتوانێت پارێزگاریان لێبکات، ناتوانرێ مافی ناوبراو بەهیچ پەیمان یان ڕێکەوتننامەیەك بە کەسێکی دی بسپێرێت».

کین دەڵێت « هۆبز بەهیچ شێوەیەك لایەنگری بەکارهێنانی بێ قەیدوشەرتی دەسەڵات نەبوو. بەبڕوای هۆبز فەرمانڕەوا دەبێت دەسەڵاتی خۆی بەپێی «یاسا سروشتیە» گشتی و هەمەکیەکان بەکاربهێنێت، یاساگەلێك کە سەندنی ژیان و ئامرازەکانی گوزەرانی ژیان، قەدەغە دەکات. ڕاستە هۆبز دان بە بوونی بوارێکی تایبەتی لەناو کۆمەڵگای مەدەنیدا دەنێت..بوارێك کە تاکەکان دەتوانن تیایدا هەندێك ئازادی نیگەتیڤیان هەبێت». بەڵام سەرەڕای ئەم تیڕوانینانە، کین بەو دەرئەنجامە دەگات کە ئەم سنورداڕێتیانە بۆ دەسەڵات زۆرتر ڕوکەشین، تا واقعی. لەروانینی "کین"ەوە هۆبز ئارەزووی دەوڵەتێکی ئاسایشی دەکات.

کین بەپێی پێویست بەها بۆ ئەو سنورداڕێتیانە دانانێ کە بنەمای پەیمانی کۆمەڵایەتی و یاسای سروشتی بۆ «مرۆڤی دروستکراوی» دروستدەکەن. لەلایەکەوە دەتوانرێ بگوترێ لەبەرئەوەی تاکەکان بۆ دروستکردنی دەوڵەتێك لەیەك کۆدەنەوە، خودی ئەم مەسەلەیە ئاشکراکەری چاوەڕوانی تایبەتیە لەبارەی ئەرکەکانی فەرمانڕەواوە. لەدیدی تیورەسازانی پەیمانی کۆمەڵایەتیدا ئەرکی دەوڵەت

دروستکردنی فەزایەکی یاسارێژکراو بوو، بۆ بەدیهاتنی راستەقینەی مافە سروشتیەکان. ئێستا لەبەرئەوەی ئەم مافانە ئەوەندە گرنگن کە تاکەکان بۆ بەدیهاتنیان دەستبەرداری چەند ئازادیەکی دی دەبن کە لەدۆخی سروشتیدا هەیانبوو، کەوابوو دەبێت فەرمانڕەوا ڕێز لەم مافامە بگرێت. ئەم مافانە پێش دەوڵەت کەوتوون و هەر لەبەرئەمەش دەبێت ڕێزیان لێبگیرێت. ئەگەر دەستدرێژیش بکرێتە سەر ئەم مافانە، دەکرێ دژی دەوڵەت بەکاربهێنرێن. لەراستیدا مافەکانی تاکەکان بووە بە ئەرکی فەرمانڕەوا و دەسەڵاتی فەرمانڕەوا سنوردار دەکات. دەوڵەتی ئاسایشی هۆبز بەهیچ شێوەیەك بێقەیدوشەرت نیە، بەڵکو دەوڵەتێکی سنووردارە.

بەئاشکرا تێکەڵکردنی کۆمەڵگای مەدەنی و کۆمەڵگای سیاسی لەتیورەکانی پەیمانی کۆمەڵایەتیدا دیارە. چونکە کۆمەڵگای مەدەنی و کۆمەڵگای سیاسی هەردوکیان پێکەوە لەبەرامبەر دۆخی سروشتیدا رادەوەستن. کۆمەڵگای مەدەنیش نەك لەبەرامبەر کۆمەڵگای سیاسیدا، بەڵکو لەگەڵیدا گونجاوە. لەو تیورانەدا جیاکردنەوەی کۆمەڵگای مەدەنی و سیاسی لەیەکدی بەشێوەیەکی شاراوە و ئاماژەپێکردنە، چونکە تاك خاوەن مافی سەربەخۆ لەفەرمانڕەوایە. تاکی خاوەن ماف لەفەزایەکدا دەژی کە تارادەیەك لەدەسەڵاتی سیاسی سەربەخۆیە. ئەم فەزایە کۆمەڵگای مەدەنیە. ئاشکرایە چۆن دەسەڵاتی سیاسی لەبواری مەدەنی جیادەبێتەوە، کە فەزای تایبەتی ئەم مافانەیە. ئەوەی پەیوەندی  لەنێوان دۆخی سروشتی، دروستکردنی کۆمەڵگای مەدەنی و کۆمەڵگای سیاسیو جیابونەوەی شاراوەی کۆمەڵگای مەدەنی و سیاسی لەیەکدی دروستدەکات، چەمکی مافی سروشتی هەمیشەیی و قابیلی دەستدرێژی نەکردنە. لەدواجاردا کۆمەڵگای سیاسی بەهۆی کۆمەڵگای مەدەنیەوە سنوردار دەکرێت. کۆمەڵگای مەدەنی فەزای هاوڵاتیانی خاوەن مافە. بەمشێوەیە چەمکی دۆخی سروشتی کە دروستکراوی زیهنی بیریارانی پەیمانی کۆمەڵایەتیە، دوو دەور دەبینێ: لەلایەکەوە ئاراستەی پێویستیبوونی فەرمانڕەوایەکی دەسەڵاتدار دەکات و لەلایەکی دیەوە بەهۆی مافە سروشتیەکانەوە، سنورێك بۆ دەسەڵاتی ئەم فەرمانڕەوایە دروستدەکات.

هەرچەندە ناکرێت بیریارانی پەیمانی کۆمەڵایەتی بەوردی بە بیریارانی کۆمەڵگای مەدەنی دابنرێن، بەڵام دەکرێت ناوەڕۆکە سەرەکیەکانی فۆرمی لیبڕالانەی







دوایی لەبارەی کۆمەڵگای مەدەنیەوە، لەتیورەکانی پەیمانی کۆمەڵایەتیدا بدۆزرێتەوە. یەکێك لەم ناوەڕۆکانە چەمکی تاکی خۆویستە کە بە دوای بەرژەوەندیەکانی خۆیدا دەگەڕێت. لەراستیدا مەك فرسۆن بڕوایوایە هۆبز یەکەم و بەرجەستەترین وتەبێژی تاکگەری نوێ بوو. تاکگەریش شتێکبوو کە دواتربوو بەپێشگریمانە بنەڕەتیەکانی بیرۆکەی کۆمەڵگای مەدەنی. چونکە چەمکی سەربەخۆیی و باڵادەستی تاکی عەقڵانی و هوشیار، بناغەی داواکاری بەدەستهێنانی سەربەخۆی تاکەکەسی لەدەوڵەت پێکدەهێنا.

ناوەڕۆکێکی دی ئەو بیرۆکەیەبوو کە تاك خاوەن کۆمەڵێك مافەو ئەم مافانە پێش دەوڵەت کەوتون و سەربەخۆییان لەدەوڵەت هەیە. لێرەدا گرنگترین مەسەلە، بیرۆکەی پیرۆزی موڵکایەتی تایبەتیە کە لۆك ئاماژەی بۆکردووە. لەراستیدا لۆك مەسەلەیەکی هێنایە پێشێ کە بوو بەیەکێك لەتەوەرە سەرەکیەکانی لیبڕالیزم: بناغەی هەرجۆرە ئازادیەك بریتیە لەمافی موڵکایەتی و گواستنەوەی دارایی. مافی موڵکایەتی لەگەڵ ئازادیدا یەکسانکراوە و لەراستیدا بووە بە بناغەی هەرجۆرە مافێك.

سێهەم ناوەڕۆك کە بیریارانی پەیمانی کۆمەڵایەتی بۆ بیرۆکەی کۆمەڵگای مەدەنیان زیادکرد، ئەوە بوو کە پەیوەندی تاکەکان بەیەکەوە و پەیوەندی تاکەکان بە دەوڵەتە، پەیوەندیەکی پەیمانئاسایە. ئەم بیریارانە مۆدێلێکیان بۆ مامەڵەی کۆمەڵایەتی لەنێوان تاکەکان و لەنێوان تاك و دەوڵەتدا پێشکەشکرد.

چوارهەمین یارمەتی بیریارانی پەیمانی کۆمەڵایەتی بریتیبوو لەهێنانە ئارای چەمکی حکومەتی سنوردار. حکومەتێك کە لەلایەکەوە بەهۆی ئەو مەسەلەیەوە سنوردار دەکرا کە مەخلوقی مرۆڤ بوو، لەلایەکی دیەوە بەهۆی ئەوەوە کە ئەرکی سەرەکی بریتیبوو لەپارێزگاریکردن لەو مافانەی تاك لەدۆخی سروشتیەوە لەگەڵ خۆیدا هێنابووی. بیریارانی سەرەتای تازەگەری لەلایەکەوە بە کردنی تاك بەگرنگترین رەگەزی گوتاری سیاسی، و لەلایەکی دیەوە بە هێنانەئارای ئەو مەسەلەیەی کە بواری مەدەنی بواری هاوڵاتیانی خاوەن مافە، چوارچێوەی پێویستیان بۆ گوتارێك..بۆ گفتوگۆیەك پێکهێنا کە جێگەی یەکەمی بە تاك داوە و بڕوای بەتوانای تاکە بۆ هەڵبژاردنی چارەنوسی خۆی. تیورەی سیاسی لەشێوە

مۆدێرنەکەیدا چەمکی دەوڵەتی وەك خاوەنی کۆی مافەکان ڕەدکردەوە و ئەم مافانەی بۆ تاك گواستەوە. بیریارانی پەیمانی کۆمەڵایەتیش یەکەم بنەماکانی ئەم شکڵبەندییەیان بەرپاکرد.

لەگەڵ ئەمەشدا تیۆرەی بناغەدانەرانی پەیمانی کۆمەڵایەتی، چەند کێشەیەکی مێژوویی هەیە. هۆبز و لۆك لەبری تیۆرەی مافی خودایی فەرمانڕەوا، تیۆرەی مافی سروشتیان هێنایە ئاراوە، بەڵام خودی فەرمانڕەوا لەناوەندی دەوڵەت وەك دەزگایەکی سیاسی ڕێکخراو، سەرچاوە لەرەخنەگرتنێکی قوڵەوە لەکۆمەڵگا دەگرێت. بێ فەرمانڕەوایەکی بەهێز، کۆمەڵگا توشی کێشە و چەرمەسەری دەبێت. تاکەکانی ئەم کۆمەڵگایە پێڕەوی پرۆژەیەکی خۆدروستکردنی بەربڵاو بەمانا هیگڵییەکەی نین. واتە گواستنەوە لەبەرژەوەندی لاوەکیەوە بۆ بەرژەوەندی گشتی. «هۆبز...هیچ چاوەڕوانیەکی ئەخلاقی یان عەقڵانی مەزنی لەبارەی سودوەرگرتنی تاکەکانەوە لەبارەی ئازادیەوە، لەسەردا نەبوو». بیریارانی پەیمانی کۆمەڵایەتی تاکی گوشەگیریان هێنایە ناو کۆمەڵگاوە، بەڵام چەمکسازی لەبارەی ئەم پرۆژەیە، واتە لەبارەی توانا و ماهیەتی خودی کۆمەڵگاوە، بە لیرالیەکانی دوایی سپێررا.

هەرچەند بیریارانی پەیمانی کۆمەڵایەتی ڕونکردنەوەی عەقڵانی و قانعکەرانەیان لەبارەی دەوڵەت و کۆمەڵگاوە پێشکەشکرد، بەڵام هەوڵەکانیان خەسڵەتێکی شەخسی هەبوو. دەکرێ یەکەمین و گرنگترین مەسەلەی تیۆرەکانی پەیمانی کۆمەڵایەتی، بەشێوەی چەمکسازی یاسای سروشتی و مافی سروشتی بزانرێت. لەروانگەی هۆبز و لۆکەوە مافی سروشتی لەیاسای سروشتیەوە سەرچاوەدەگرێت. بەپێی تەفسیری کەسانی وەك جان دانیش لەروانگەی لۆکەوە ئەم یاسا سروشتیە، دەرکەوتێکی زاتی خوداوەندە. جان گری بە قبوڵکردنی ئەم تەفسیرە دەنوسێت :

«لەروانگەی لۆکەوە مافە سروشتیەکان هەلگری هەلومەرجێکن کە بۆ پارێزگاریکردن لەپاراستنی ژیانی خود، پێویستیان بەبناغەی یاسا سروشتیە خودا پێدراوەکانە. بەپێی ئەم یاسایانە ئێمە مافی ئازادی و مۆڵکایەتیمان هەیە و هیچکەس ناتوانێت پیشێلیانبکات، بەڵام لەبەرئەوەی ئێمە موڵکی خوداین، کەوابوو ناتوانین بەشێوەیەکی کامڵ و هەمیشەیی دەستبەرداری ئازادی خۆمان بین...یان لەرێگەی خۆکوشتنەوە کۆتایی بە ژیانمان بێنین...ئەم دەزگا فکرییە کە تیایدا مافە







لیبراڵیەکانی مۆڵکایەتی لەچوارچێوەی خواناسی مەسیحیدا ڕەوایەتی وەردەگرێت، لەئینگلتەرادا تا سێ سەدە پاش بڵاوبونەوەی بەرهەمە سیاسیە سەرەکیەکانی لۆك، لەگەڵ لیبرالیزمدا تێکەڵبوو بوو».

بیریارانی یاسای سروشتی بڕوایانوابوو بەو بیرۆکەیەی تاکەکان بە پێی یاسای سروشتی خاوەن مافی تایبەتین، دەتوانن بەرەنگاری دەسەڵاتی ڕەها ببنەوە، ئەم یاسایەش لایەنیکەم لەروانگەی لۆکەوە خودا پێدراوانە بوو. بەڵام بیریارانی یاسای سروشتی ئەم یاسایەیان بە«بەڵگەنەویست و بەدیهی» دەزانی. ئەم یاسایە تایبەت نەبوو بە کۆمەڵگایەکی دیاریکراو، بەڵکو بەشێکبوو لەمرۆڤایەتی هەر تاکێك. قبوڵکردنی چەمکی یاسای سروشتی، سەرچاوە لەباوەڕێکی بێ چەندوچونەوە بەتێزێکی نامێژوویی لەبارەی یاسای سروشتیەوە دەگرێت. چەمکەکانی یاسا و ماف، چەمکی دڵخوازانەن، چونکە دروستکراوێکی زیهنین.

لەلایەکی دیشەوە تیۆرەکانی پەیمانی کۆمەڵایەتی خەسڵەتێکی شەخسی و دڵخوازانەیان هەبووە. پێویستی بوونی کۆمەڵگای مەدەنی و دەوڵەت، لەوێنایەکی گریمانەی و تێڕوانینێکی تیۆریەوە بۆ ماهیەتی مرۆڤ سەرچاوە دەگرێت. ئەم تێڕوانینەش لەتیۆرەیەکەوە بۆ تیۆرەیەکی دی دەگۆڕرا. بڕوابوون بە سەرچاوەی خودایی ئەم یاسایە و بە کۆمەڵگا و دەوڵەتێکی دروستکراو و ساختە، پاش ماوەیەکی کەم جێگەی خۆیدا بەرونکردنەوە «زانستیەکان» لەبارەی پەرەسەندنی کۆمەڵگا مرۆڤایەتیەکانەوە. بەمشێوەیەش فەلسەفەی تیۆری جێی خۆیدا بە«زانست»، کە تیایدا جێگەیەك بۆ چەمکی یاسای خودای هەمیشەیی و نەگۆڕ نەبوو.

سەرئەنجام ئەم تێڕوانینە تایبەتە لەبارەی دەوڵەت و شکڵگیری کۆمەڵگاوە نەك تەنها تێڕوانینێکی شەخسی و دڵخوازانە بوو، بەڵکو نامێژووییش بوو. ئەم تێڕوانینە لەوروەوە نامێژووی بوو کە ئەو دەوڵەت و کۆمەڵگایەی دروستدەکرا، لەڕووی شوێن و زەمەنەوە جێگەیەکی دیاریکراوی نەبوو. ڕونکردنەوەی مێژووی دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنی پێویستی بە تێڕوانینێکی وردتر هەیە، تێڕوانینێك کە لەڕووی مێژووییەوە بتوانێت دەوڵەتەکان لەناو جەرگەی کۆمەڵگا دیاریکراوەکاندا دابنێت. ئەم تێڕوانینە بۆ لێکۆڵینەوەی پەرەسەندنی کۆمەڵگاکان و دەوڵەتە جیاوازەکان و ڕونکردنەوەی جیاوازیەکانیان پێویستبوو. ئەم تێڕوانینە کە هەم ورد و هەم سەرنجی لەمێژوو

دەدا، بەهۆی ئابوری سیاسی کلاسیکییەوە پێشکەشکرا. وەك دواتر دەبینین ئابوری سیاسی کلاسیك، زانستی لەبری فەلسەفەی تیۆری داناو بیرۆکەی خۆبەڕێوەبردنی کۆمەلگای خستەبری بیرۆکەی شکلۆەرگرتنی کۆمەلگا لەرێگەی دەوڵەتەوە، و تێزی پەیوەستبوونی مافی تاکەکان بە پلەی پەرەسەندنی کۆمەلگاوەی، لەبری پەیوەستبوونی مافی تاکەکان بەیاسایەکی سروشتی هەمیشەیی و نەگۆڕەوە دانا.

## ئابوری سیاسی کلاسیك و کۆمەڵگای مەدەنی

قوتابخانەی ئابوری سیاسی کلاسیك کە لەسەدەی هەژدەدا پەیدابوو، بەرهەمی سەردەمی رۆشنگەری بوو. هەر لەبەر ئەمەش تەحەدای کۆی چەمکسازیە باوەکانی لەبارەی کۆمەلگا و دەوڵەتەوە دەکرد. کلارك دەڵێت:

«بزوتنەوەی رۆشنگەری بە راشکاوی بنەما سەرەکیەکانی رەوایەتی سیاسی و ئەخلاقی لەرژێمی دەسەڵاتی رەهادا خستە ژێر پرسیارەوە. بزوتنەوەی رۆشنگەری لەبری خوداوەند، عەقڵ و سروشتی بە بنەمای رێنمایکەری سیستەمی ئەخلاقی و کۆمەڵایەتی دانا، لەبری وەحی ئیلاهی، لیکۆڵینەوەی زانستی بەسەرچاوەی هەقیقەت وەرگرت و لەبری قەشە و فەیلەسوفان، زانایانی بە مەرجەعی دیارکردنی راست و ناڕاست دانا».

بزوتنەوەی رۆشنگەری بە باوەڕهینان بەعەقڵی مرۆڤ و بە پشتبەستن بەیاسارێژی دنیای کۆمەڵایەتی وەك دنیایی فیزیایی، ژیانی کۆمەڵایەتی بەسەربەخۆ لەزیهن و بیری مرۆڤ دانا.  لەروانگەی بیریارانی رۆشنگەریەوە ئەرکی زانست و زانین ناسینی ژیانی کۆمەڵایەتی بوو،  لەرێگەی عەقڵی مرۆڤەوە. دەستگەیشتن بە زانینی و ناسینی جێی باوەڕیش، لەبەرئەو هۆیە مومکینبوو، کە دنیا یاسارێژ بوو. هۆی بوونی زانستە کۆمەڵایەتیەکان، دۆزینەوەی ئەم یاسایانە بوو. زانستە تازەکان تاڕادەیەکی زۆر بەدوای دۆزینەوەی هەقیقەتی شاراوە لەپشت دیاردە ئاشکراکانەوە بوون. لەزانستە تازەکاندا هەوڵێکی زۆر بۆ دۆزینەوەی شێوازە ئاڵۆزەکان بۆ ئەنجامدانی ئەم ئەرکە درا. لەبەرئەوەش کە ناسین مومکین بوو، بەهەمان ئەندازە دەستگەیشتن بە زانستێکی بایەخدار کە بتوانێت دەستبکات بەشیکردنەوەو پێشبینی ورد مومکین بوو. لەسەر ئەم بناغەیە زانستە کۆمەڵایەتیەکان دەیانتوانی بەهاوکاری ئەم ئامرازە







دوبارەلێکراوانەوە، دەست بە شیکردنەوە و سەرلەنوێ بنیاتنانەوەی مێژووبکەن، و پێشبینی رەوتی شێمانەی کۆمەلگا مرۆییەکان بکەن.

ئابوری سیاسی بەپێچەوانەی فەلسەفەی تیۆریەوە، بانگەشەی زانستیبوونی دەکرد. ئابوری سیاسی تێڕوانینێکی مێژووی وردی لەبری تیڕوانینە هەبوەکان لەبارەی خاڵی دەرچوونی دەوڵەتەکان و کۆمەلگاکانەوە، هێنایە پێشێ. ئەم تێڕوانینە چیدی پێویستی بەوێنای گریمانەیی یان بەو بیرۆکەیە نەبوو کە یەك یاسای سروشتی گەردونی بەسەر هەموو مرۆڤەکاندا لەهەموو قۆناغە مێژویەکاندا، حوکمدەکات. ئەم تێڕوانینە دەیتوانی دەست بەشیکردنەوە، پێشبینی و وێنەکردنی کۆمەلگای جێی مەبەست ، لەسەر بنەمایەکی دی بکات کە زۆرتر سەرنجی لەسەر مێژووە.

زانایانی ئابوری سیاسی کلاسیك لەژێر کاریگەری دیدی رۆشنگەریدا، گۆڕانێکی بەرجەستەیان لەمیتۆدلۆجیا و شێوازی ناسینی کۆمەلگاکاندا دروستکرد. تێڕوانینی ئەم ئابوریناسانە پوختەی تێڕوانینی نوێگەری بوو کە بەپێی ئەم تێڕوانینە کۆمەلگا مرۆییەکان بەپێی یاساگەلێکی بنەڕەتی دەچنە پێشێ کە سەربەخۆن لەخواست و ئیرادەی مرۆڤ. ئەم ئابوریناسانە بڕوایانوابوو روداوە مێژووییەکان نە بەرهەمی یاسا خواییەکان، و نە بەرهەمی مەبەستەکانی مرۆڤن. ئادام فرگسۆن دەیگووت «تەنانەت لەسەردەمی رۆشنگەریدا هەر جوڵەیەك کە لەکۆمەلگایەکەوە بکرێت، بە یەك ئەندازە هاوڕێی بێئاگاییە لەئایندە. نەتەوەکان بێ ویستی خۆیان کۆمەلگاگەلێك پێکدەهێنن کە لەراستیدا بەرهەمی کاری مرۆڤە، بەڵام بەرهەمی هیچ پڕۆژەیەکی مرۆیی لەپێشەوە دیاریکراو نیە».ئەرکی زانستە کۆمەڵایەتیەکان دۆزینەوەی ئەو یاسایانەیە کە بەسەر پەرەسەندنی کۆمەلگا مرۆییەکاندا فەرمانڕەوان.

گەڕان بەدوای ئەم یاسایانە بووە هۆی ئەوەی زانایانی ئابوری سیاسی کلاسیك بەرەو تێڕوانینێکی مادیانە بۆ مێژوو بڕۆن. بەپێی ئەم قوتابخانەیە کۆمەلگاکان لەرێگەی ئەوەوە کە (میك) بە «چوار قۆناغ»ی پەرەسەندنی ناو دەنێت (راوچێتی، ئاژەڵداری، کشتوکاڵی و بازرگانی) بە پێشکەوتن و پەرەسەندن دەگەن. کۆمەلگای بازرگانی پیشاندەری دواهەمین یان کاملترین قۆناغی پەرەسەندنی رەگەزی مرۆڤە. دەبێ بۆ هۆکانی گواستنەوە لەقۆناغێکەوە بۆ قۆناغێکی دی، بەدوای گۆڕانکارییە

مادییەکاندا بگەڕێین، چونکە هەر قۆناغێك دەبێتە هۆی پەیدابوونی دابەشبوونی کاری ئاڵۆز، کە دەبووە هۆی پێشکەوتن و جیابونەوەی کۆمەڵایەتی. ئەم مەسەلەیە دەستکەوتی کۆمەڵایەتی زیاددەکرد و جوڵەی بەرەو قۆناغێکی پێشکەوتوتر، مومکین دەکرد.

شێوازی بەرهەمهێنان نەك هەر بە گرنگترین هۆکاری دیاریکردنی هەر قۆناغێکی پەرەسەندنی کۆمەڵگا دادەنرا، بەڵکو بە هۆی دەستنیشانکەری مۆڵکایەتی، حکومەت، بنەمای ئەخلاقی و دەزگا کۆمەڵایەتی و سیاسیەکانیش دادەنرا. ڕێکخستنی مادی کۆمەڵگا واتە شێوازی بەرهەمهێنان و ئاڵوگۆڕ و دابەشکردنی کاڵا لەناو کۆمەڵگادا، دەبووە هۆی پەیدابوونی خەسڵەتە کۆمەڵایەتیەکان و بنەما ئەخلاقیە گونجاوەکان. لێرەوە تێڕوانینی مادیانە بۆ مێژوو بۆ ناسینی ژیانی کۆمەڵایەتی و دەستکەوتەکانیان لەبوارە ئەخلاقی، کۆمەڵایەتی، کلتووری و شارستانیەکاندا، پێویست بوو. بە دەربڕینێکی دی دەکرێ هەر قۆناغێك لەپەرەسەندنی کۆمەڵگایەك بەپێی ڕێکخستنی سیستەمی بەرهەمهێنان و دابەشکردنی ئەو کۆمەڵگایە، بناسرێ و هەڵسەنگێنرێ.

ئێستا گەر کۆمەڵگاکان قۆناغگەلێك لەپێشکەوتنی ئابوری، کۆمەڵایەتی و ئەخلاقیان بەجێهێشتووە، وەهەریەك لەم قۆناغانەش پێشکەوتوترە لەقۆناغەکانی پێشوو، کەوابوو دەکرێ کۆمەڵگاکان بەپێی ئەو قۆناغەی کە تێیدان پۆلێنبکرێن. ئابوری سیاسی کلاسیك وەك تێڕوانینێکی نوێ بۆ کۆمەڵگا نەك هەر زانستێکی لەبارەی کۆمەڵگاوە دروستکرد، بەڵکو لەسەر ئەو گریمانەیە بوو کە ئەم زانستە سروشتگەلێکی گەردوونی دروستکردووە. عەقڵ، پێشکەوتنی مادی و پێشکەوتنی ئەخلاقی پۆلێنکراون، و کۆی ئەم پێوەرانە لەچەمکی کۆمەڵگای مەدەنیدا کۆدەکرێنەوە. بەدەربڕینێکی دی چەمکی کۆمەڵگای مەدەنی بوو بە پێوەرێك بۆ هەڵسەنگاندنی پلەی پێشکەوتنی کۆمەڵگاکان. ڕەنگە جێی سەرسوڕمانیش نەبێت کە ئەم شتە باشانەیان لەکۆمەڵگاکانی ڕۆژئاوادا بینی. لێرەوە کۆمەڵگای مەدەنی بوو بە ئامێری هەڵسەنگاندنی پێشکەوتن و پەرەسەندن، و کەسانی وەك ئادام فرگسۆن ئەو دەرئەنجامەیان وەرگرت کە کۆمەڵگا پێشکەوتوەکان خاوەن کۆمەڵگای مەدەنین، بەڵام کۆمەڵگا سەرەتاییەکان خاوەنی نین.





ئالێرەدا وەرچەرخانێکی مێژووی سەرنجراکێش دەبینرێت. کۆمەڵگای مەدەنی چیدی خاڵی بەرامبەر دۆخی سروشتی نیە (بەو شێوەیەی بیریارانی پەیمانی کۆمەڵایەتی وێنایان دەکرد)، بەڵکو خاڵی بەرامبەر دیسپۆتیزمی ڕۆژهەڵاتی و ڕۆژئاوایی و فیودالیزمە. کۆمەڵگا سەرەتاییەکان لەژێر دەسەڵاتی ستەمکاراندا دەژین، و بەڵام کۆمەڵگا مەدەنیەکان فەزایەك بۆ رکەبەرایەتی ئازاد و مامەڵەی کۆمەڵایەتی ئاشتیانە دەخوڵقێنن. لەروانگەی ئابوریناسانی سیاسی کلاسیکەوە، کۆمەڵگا پێشکەوتوەکان ئەو بەشە لەکۆمەڵگا ڕۆژئاواییەکانن کە گەیشتونەتە قۆناغی گەشەکردنی بازرگانی.

لێرەوە ئابوریناسانی سیاسی کلاسیك بەپێچەوانەی دامەزرێنەرانی پەیمانی کۆمەڵایەتیەوە، کۆمەڵگای مەدەنیان بە دیاردەیەکی دروستکراو نەدەزانی و بڕوایانوابوو پێشکەوتن و پەرەسەندنی کۆمەڵگاکان، دەبێتە هۆی پەیدابوونی کۆمەڵگای بازرگانی. لەراستیدا لەروانگەی ئەوانەوە کۆمەڵگای مەدەنی دواهەمین و پێشکەوتوترین قۆناغی مێژوویی بوو کە باسی قۆناغێکی بالاتری پەرەسەندن و پێشکەوتنی دەکرد. بۆ نمونە فرگسۆن لەکتێبەکەی خۆیدا لەبارەی مێژووی کۆمەڵگای مەدەنیەوە، پەرەسەندنی کۆمەڵگای لەشێوە سەرەتاییەکانی مامەڵەی مرۆییەوە بۆ قۆناغێکی بەرزتری پێشکەوتنی تاوتوێکردووە. فرگسۆن بەڵگە دێنێتەوە کە کۆمەڵگای مەدەنی هاورێی پێشکەوتنە ئەخلاقی و کلتوریەکان، دابەشبوونی کاری ئالۆز، پابەندبوون بە یاسایە. ئادەم فرگسۆن بەروونی وێنەی کۆمەڵگای بازرگانی دەکێشا. ئەم کۆمەڵگایە دەرخەری دواهەمین و کاملترین قۆناغی پەرەسەندنی مرۆڤ بوو. لەروانگەی فرگسۆنەوە « پەیدابوونی حکومەتی یاسا و پێشکەوتنی یاسا و بەرهەمهێنانی پیشەسازی، بەگشتی دەبێتە هۆی جموجوڵ لەکۆمەڵگا مەدەنیە تازەکاندا. لەم سەردەمی جیابونەوەیەدا جۆرێك زیندووی و ڕۆحی مەزنی داهێنان هەیە کە پێشتر لەسەردەمی دڕندایەتی (ئاژەڵداری) و سەردەمی بەربەریەتدا (شوانی و کشتوکاڵیدا) نەبوو». ڕێك لەم روانگەیەوەیە دەکرێت لەو وتەیەی مارکس بگەین کە دەڵێت سەرمایەداری لەبەرهەمەکانی ئابوریناسانی سیاسی کلاسیکدا، تەنها خاوەنی مێژووی رابردووە، نەك مێژووی داهاتوو. لەم روانگەیەوە سەرمایەداری لوتکەی هەوڵ و پێشکەوتنی مرۆڤ بوو.





ئـەم تێڕوانینـە بـۆ مێـژوو و ئـەو بڕوایـە کـە کۆمـەڵگا بـەپێی یاسـا و پرۆسـەی سەربەخۆ دەجوڵێت، دەرئەنجامی قوڵی بۆ شـیکردنەوەی دەوڵـەت و کۆمـەڵگا هـەبوو. ئەم تێڕوانینە بووە هۆی جیابونەوەی ئـابوری و سیاسـەت، بڵنـدتر بـوونی کۆمـەڵگای مەدەنی و دواجار دابەزینی گرنگی سیاسەت. ئەم مەسەلانە دواتر بوون بـە تـەوەرەی سەرەکی زۆرێك لەتیوره لیبراڵیەکان.

سەرچاوە

بەشێکە لەسێهەم فەسڵی ئەم کتێبەی خوارەوە

نیرا چانۆك: جامعه مدنی و دولت. ت: فریدون فاتمی\ وحید بزرگی. تهران، نشر مرکز چاپ اول١٣٧٧





## ڕەخنە لەکۆمەڵگای مێگەلی

ن: ستیوارت هیوز

و.ف: عزت الله فولادوند

چـەمکی کۆمـەڵگای مێگـەلی هێـواش هێـواش لەدەیـەکانی ١٩٥٠دا لەلایـەن ئـەو بیریارانەی ئەمریکاوە قبووڵکرا کە خاوەن ئاراستەیەکی تیۆریتر بوون. بڵاوبوونەوەی کتێبی "کۆمەڵی تەنیا" نووسینی دیڤید ریسمان لەناوەڕاستی سـەدەی بیسـتدا نـەك هەر ڕەنگدانـەوەی فـەزای بـەخۆدا چونەوە بـوو لـەو وڵاتـەدا، بـەڵکو بزوێنـەری ئـەو بەخۆدا چونەوەیەش بـوو. ڕەگـەزی هاوبەشـی ئـەم کتێبـە لەگـەڵ هەوڵـەکانی دوایـدا بریتیبـوو لەدۆزینـەوەو ئاشـکراکردنی ئـەو خەسـڵەتانەی ئـەمریکای هاوچـەرخ-و هەروەها کۆمەڵگا پیشەسازیە پێشکەوتوەکانی دی- کە لەدیاردەی سەرمایەداری تـەواو گەشەکردووی جیادەکردەوە.. ﴿واتە لەو سەرمایەداریەی﴾ خـاوەن پـۆلێنی چـینایەتی ئاشـکرای ئـەوتۆ بـوو کـە ڕەخنـەگرە کۆمەڵایەتیـەکانی ڕابـردوو- چ مارکسـی یـان نامارکـسی- بوونیـان بـە بەڵگەنەویـست دانـابوو. شـیکردنەوەی ئەمریکیـەکان بـۆ کۆمەڵگای مێگەلی، هەمیشە بەمەبەستی وەڵامدانـەوە نـەبوو. بـەڵام لەگـەڵ ئەوەشـدا ئەزموونی جەنگی سارد لەدەرەوەو، شێوەی بیرکردنەوەو کارکردنی سیناتۆر مـەکارتی لەناوەوە، تۆنێکی ئـەخلاقی بـەم شـیکردنەوانە دەبەخـشی. لایەنیکـەم گومـان لـەوەدا نەبوو کە پاڵنەرەکانی، جۆرێك نیگەرانی و هەستی سەرگەردانی فکریە.

زاراوەی "کۆمەڵگای مێگەلی" پڕ لەئاڵۆزیو بەمانای جیـاوازو نارۆشـن و زۆرجـار دژ بە یەکیش بەکاردەهێنرا. هەندێکجار مەبەست لـەم زاراوەیـە کۆمـەڵێك خـەڵکبوو کـە خـاوەن کەسـایەتی و تـاکێتی خۆیـان نـەبوون و هەنـدێکجاریش بـەمانای ئۆتۆماتیکیبوون و هەندێکجاری دی بەمانای باڵادەستی بیرۆکراسـیەت بـەکاردەهێنرا. بـەڵام توێـژەرەوانی کۆمـەڵگای مێگـەلی لەگـەڵ ئـەم زمانـە ئـاڵۆز و تەمومژاویەشـدا، لەچـەند خەسـڵەتێکدا یەکیاندەگرتـەوە. ئـەوەی لەدەوروبـەری خۆیـان دەیانـدی





هەلومەرجێکی چوونیەك و هاوڕەنگ بوو، بەڵام لەهەمانکاتدا دینامیکی: حاڵەتێك لە"رووت و قووتی" کۆمەڵایەتی کە هێواش هێواش چەمکی "هاوکۆمەڵی" تیا لەناو دەچوو. ﴿هەروەها هێواش هێواش﴾ تاکەکەس قەڵغانی کۆمەڵە نێوەندکارەکانی ﴿وسیگ﴾ لەدەستدەدا کە لەبەرامبەر گوشاری راستەوخۆو کۆنترۆڵکەری سەرچاوەکانی دەسەڵاتی سیاسیو ئابووریدا، پارێزگاریو پشتیوانی لێدەکرد(١).

لەفکری کۆمەڵایەتی رۆژئاوادا ئاگادارکردنەوە لەمەترسی "مێگەلەکان" شتێکی تازە نەبوو. پێشتر لەسەدەی نۆزدەدا پیاوانی وەك بۆرکهارت و نیتچەو تۆکڤیل و هێنری ئادامز، لەگەڵ هەموو جیاوازیەکیاندا، ئەم مەترسیەیان راگەیاندبوو. لەیەکەم نەوەی بیریارانی سەدەی بیستدا "ئۆرتێگایی گاست" قسەی لەسەر درێغی بۆ رابردوو کردبوو، سێ بیریاری ئیتالّی دیش "کرۆچە، مۆسکاو پاریتۆ" بەشێوەیەکی سیستماتیك و میتۆدی تر دەستیان بەشیکردنەوە کردبوو. بەڵام هەموو ئەمانە چ بەهۆی پێگەی کۆمەڵایەتی و چ بە هۆی هەڵوێستی فکریانەوە، خەڵکانێکی ئۆرستۆکراتی بوون و لەدابەزینی ئاست یان "هاوئاست" بوونی سەلیقەو بیروڕاکان کە بەهۆی بەخشینی مافی دەنگدان بە جەماوەرەوە روویدا بوو، بێزاربوون و کشابوونە دواوە. ئەو شتە تازەو مەزنەی لەڕەخنەی کۆمەڵگای مێگەلیدا لەناوەڕاستی سەدەی بیستدا هاتە گۆڕێ، سەرچاوەی ئیلهامی دیموکراسیانەی ئەم ڕەخنەیە بوو. ئەو کەسانەی لەدەیەکانی ١٩٥٠دا لەبارەی ئەمریکاوە دەیانوسی، پەڕینەوە بۆ هەلومەرجێکی پیشەسازی زۆر چڕبووەیان ﴿متمرکز﴾ بە شتێکی بڕاوە دەزانی و قبووڵیاندەکردو نەیاندەگوت کە پرۆسەی مۆدێرنبوون، رەنگە پێچەوانە بێتەوە یان ڕاوەستێت. مەبەستی ئەخلاقی ئەوان پاراستنی پاشماوەکانی کۆمەڵگایەك نەبوو کە لەسەر بناغەی پایەو پلەو ئیمتیازاتی کلتووریی دامەزراوە. ﴿بەڵکو﴾ دەیانویست بە ئاشکراکردنی ئەوەی مرۆڤی مێگەلی لەم پرۆسەیەدا چی لەدەستدایە، ﴿مرۆڤ﴾ لەخراپی بەرهەمەکانی ئازادی خۆی بیپارێزن.

ئەم مەسەلەیە لەبارەی زۆربەی ئەو بیریارانەوە راست بوو کە لەئەمریکا لەدایك بووبوون. کۆچکردووەکان گومانیان لەبارەی دیموکراسی سیاسیەوە هەبوو (لایەنیکەم بەو شێوەیەی کە لەچواردەوری خۆیاندا دەیاندی). و زووتر ئارەزووی ئەوەیاندەکرد لەڕووی ئایدۆلۆژیەوە باسەکان لەخاڵێکی مارکسیزمەوە دەست پێبکەن. بەڵام خاڵی







سەرسوڕهێنەر ئەوە بوو مارکسیزم واتە تاکە تیۆرەیەك کە لەڕوانگەی ئەوانەوە ماناو لۆژیکێکی هەبوو، هیچ نمونەیەکی مێژوویی پۆزەتیڤی پێشکەش نەدەکرد، و لەبری ئەمە لەجۆرێك نائومێدی و بێهیوایی گەورەوە سەرچاوەیدەگرت: بێهیوایی لەمێژووی دوایی لەستراتیژی ئەو حیزبانەوە ﴿سەرچاوەی دەگرت﴾ کە خۆیان بە میراتگری راستەقینەی مارکس دەزانی و بەتایبەتی بێهیوایی لەپرۆلیتاریا. ئەو چینەی کە ئەنگلز "بە میراتگری فەلسەفەی کلاسیك" ناویدەهێنان و ستایشی کردبوون، نەیتوانیبوو بەو جۆرە ڕەفتاربکات کە چاوەڕێی لێدەکرا. ئەم چینە ئاسودەیی لەژیاندا، لەکاری قارەمانانەو بەرهەمی هونەری ئاست نزم و دزێوی، لەبڵندبوونەوەی ئەندێشە، بەباشتر زانیبوو(٢).

لێرەوە لێکۆڵەرەوە کۆچکردووەکان کە لێکۆڵینەوەی کۆمەڵگای مێگەلیان کردبووە ئامانجی خۆیان، ڕەخنەی ئابووری پەیوەندیەکانی سەرمایەداریان کە لەسەدەی نۆزدەدا باوی هەبوو، گۆڕی بۆ رەخنەی کلتووری شارستانێتی بازرگانی کە بەرهەمی پیشەسازیە. لەشیکردنەوەکانیاندا ئەو گریمانەیە بە شاراوەیی هەبوو ﴿کە دەیگوت﴾ زۆربوونی نیعمەت بە تەنها بەس نیە. دەگوترا سەرمایەداری هەرچەند لەبەدیهاتنی ئامانجی سەدساڵەی سوشیالیزم کە لەناوبردنی فەقیریو سەختیە، نزیك بێتەوە (لەهەلومەرجی پڕ ڕەونەقی ١٩٥٠شدا ئەمە بەشتێکی دوور نەدەزانرا)، ئەوا دیسان هیچ گۆڕینێك لەکارەساتەکانی مرۆڤدا ڕوونادات. تا ئەو کاتەی مرۆڤ کار (ویاریکردن) بە "لەخۆنامۆ" و "بەشت بوو refied" بزانێت- تا ئەو کاتەی جیهان کورتبێتەوە بۆ Entfremdung rerdi nglichung، خەڵکی لەجیهانێکی لەمچەشنەدا مل بۆ "بە شتبوون" بدەن و هیچ نەڵێن، ﴿ئەوا﴾ بێهودەیە کەسێك تەنها دڵی بە گواستنەوەی رووکەشانەی موڵکیەتی ئامێرەکانی بەرهەمهێنان خۆش بێت. نمونەی ئەم مەسەلەیە یەکێتی سۆڤیەت بوو. رەخنەگرانی کۆمەڵگای مێگەلی گەرچی خوێندنەوەی زۆر جیاوازیان بۆ هەلومەرجی ژیان لەرووسیای هاوچەرخیاندا پێشکەشدەکرد، بەڵام هەموان لەسەر ئەوە کۆکبوون کە ئەگەر ئامانج مرۆڤێکی ڕەسەنترو ڕاستەقینەترە، ئەوا ئەم مەبەستە بەهیچ شێوەیەك لەوێ نەهاتۆتەدی.

لە"بەهیموت"یشدا بەتایبەتی لەو بەشانەدا کە پەیوەندی بەچینی کرێکارەوە هەیە، یەکێك لەپێشگریمانەکانی فرانتز نوێمان هەر ئەم شێوە هەڵسەنگاندنەی

ماهیەتی کۆمەڵگای پیشەسازی لەسەدەی بیستەمدا بوو. بەڵام تێڕوانینی نوێمان بە پلەی یەکەم خەسڵەتێکی یاسایی و ئابووری هەبوو، و ئەو تەنها بەڕێکەوت و بەشێوەیەکی گشتی شتێکی لەبارەی مەسەلەی کلتووری مێگەلیەوە دەگوت. هەلومەرجەکە بەمشێوەیە مایەوە تا ئەو کاتەی پیاوانێك کە ڕۆژگارێك هاوکاریدەکردن -واتە ماکس هۆرکهایمەر و تیۆرۆ ئادرنۆو هربرت مارکیوز- ویستیان پەیوەندی عەقلانیەتی تەکنەلۆژی بە بەهای هونەری و ئەخلاقیەکانی جەماوەری هاوچەرخەوە بدۆزنەوە. بەپێی ئەم تێڕوانینەی دوایی، فاشیزم نەك وەك جەمسەری دژ بە لیبرال دیموکراسی بەڵکو بە شێوەی "نمونەی کۆتای" ڕەوتێکی گشتی لەسەرتاسەری ڕۆژئاوای پیشەسازیدا، دەبینرا -"ڕەوتێك بەرەو دەسەڵاتی ناعەقلانی"(٣) دواتر ئادرنۆ مەسەلەکەی بەمشێوەیە دەربڕی "دەکرێت (بەدڕەفتاری فاشیزمی) توندو بێ وەستان و بێبەزەیی لە"جووڵەی ئەو جەستانەدا ببینین کە ماشێن لەخزمەتکارانی داوادەکات"(٤).

ئادرنۆو هۆرکهایمەرو مارکیوز و کەسانی وەك ئەوان، چەندان ماوە پێش بەجێهێشتنی ئەڵمانیا، لەدەرئەنجامە کلتووریەکانی شارستانێتی ماشێنی، تووشی دڵەڕاوکێ بووبوون. چوونیان بۆ ئەمریکا ئەم نیگەرانیانەی کرد بەشتێکی هەنوکەیی. ئەگەر جۆرێك چوونیەکی کلتووری بنەڕەتی هەبوو کە هەموو وڵاتە پیشەسازیە پێشکەوتوەکان تیایدا هاوبەشبوون، کەوابوو ئەمریکای دیموکراتی لەچ روویەکەوە لەڕایشی نازی دیسپۆتیزم، جیاواز بوو؟ ئەگەر نەزانین و دڵمردوویی ئایدیۆلۆژی و بیرکردنەوی کلێشەیی و تاك پەرستی، دەرکەوتە سیاسیە ناچارەکانی کۆمەڵگای مێگەلی بوو، کەوابوو چ شتێك مومکین بوو، ڕێگە لەوە بگرێت ئەمریکیەکان بەهەمان ئەو ڕێگەیەدا نەڕۆن کە ئەڵمانیەکان پیایدا ڕۆیشتبوون؟ ئایا ئەگەری ئەوە نەبوو کۆچکردوەکان ئەمجارە لەشێوەیەکی هێواشتڕو لەجل و بەرگێکی گۆڕاودا لەو وڵاتەی پەنایان بۆ بردووە، ڕووبەڕووی هەمان ئەو هێزە ترسناکانە ببنەوە کە لەوڵاتی خۆیان ڕاوی نابوون؟ دیارە ئەم پرسیارە کوشندانە، ئەوانی بۆ پشکینینی ئەو لایەنەنانەی کۆمەڵگای ئەمریکی ڕاکێشا کە پێدەچوو "ئامادەیی فاشیزمی" هەبێت:

واتە جۆرێکی نەرمتڕی ناچارکردنی کۆمەڵایەتی کە لەڕووی دەرئەنجامەوە،







هاوسەنگی تۆقاندن و توندوتیژی نازیەکان دەردەکەوت. ڕەفتارێك کە ریسمان پاشتڕ بە "ڕوو لەخاوەنداری نەبوون" ناوینا، لەوڵاتە یەکگرتووەکاندا لەباشترین هەلومەرجەکاندا، دەبینرا، ئادرنۆو هۆرکهایمەر لەکالیفۆرنیا نیشتەجێبوون و لەوێ ڕۆژانە، ئاشکرابوو کە خەڵکێکی سادە چۆن ملکەچی گوشارە ناسکتڕ، بەڵام کۆنتڕۆڵکەرانەی هاوشاریەکانی خۆیانن و هیچ هۆیەکیش نابینن بۆ ئەوەی شەرم لەمەبکەن. هەموو ئەمانە بە تەنیا بەس بوو بۆ ئەوەی کۆچکردووەکان ناچار بە بیرکردنەوەو تێفکرینبکات. هەستی بێ پشت و پەنای توندی شەخسیش، ئەم شتەی زیاددەکرد. لەئەوروپادا ڕۆشنبیران دەیانتوانی ژیانی تایبەتی خۆیان لەدەستی کلتووری گشتی بپارێزن و لەقەڵای حورمەت و پلەوپایەی خۆیاندا، دیاردە دزێوەکانی سەلیقەی جەماوەر لەخۆیان دووربگرن. بەڵام پاش ئەوەی چوونە ئەمریکا، دیوارەکان رمان و ڕووبەڕووی لێشاوێك شتی نزمبونەوەو بەهەمان ڕێژەش حاڵەتێکی جەنگاوەری توندیان پەیداکرد. ئەوەی لەئەوروپا هەستی "ئاڵۆزی سوکایەتیپێکردن" بوو، لەوڵاتە یەکگرتووەکاندا بوو بە هەستێکی "وەڕسی دوورو درێژو بێ کۆتایی"(٥).

لەگەڵ ئەمەشدا ئادرنۆ و هاوڕێکانی لەم لایەنەشدا وەك هەموو لایەنەکانی دی، ئەو خەباتەی دەستیان پێکردبوو، بەخەبات دەزانی لەدوو ئاراستەدا: لەهەمانکاتدا کە ڕەخنەیەکی توندیان ئاراستەی سەلیقەو دیدی مێگەلەکان دەکرد، بەڵام بە ئاشکرا دەیاندی کە بەرگریکردن لەبەهاکانی "کلتووری باڵای" تەقلیدی، بەس نیە. گوناهی جەماوەر نەبوو کە بەوشێوەیە ڕەفتاریدەکرد بەڵکو گوناههکە لەئەستۆی پەیوەندیە ئابووریەکانی دەسەڵاتدار بەسەر ژیانیاندا یان لەئەستۆی ئەو کەسانە بوو کە بەشێوەیەکی ڕێکخراو ژیانی کەسانی دیان دەستکاری دەکردو یاریان پێدەکرد. ڕەنگە هەر لەبەر ئەمەش هۆرکهایمەر و ئادرنۆ خۆیان لەبەکارهێنانی زاراوەی "کۆمەڵگای مێگەلی" دەپاراست و بە باشتریان دەزانی باسی "دنیای ژیانی بە بەڕێوەبەرایەتی کراو" Verwal tete welt بکەن. بە بڕوای ئەوان لەدنیایەکی لەمچەشنەدا چوونەپاڵ ئەو ڕەخنەگرە پارێزگارانەی کە شەیدایانە بە پارچە بەهاییە کلتووریەکانی رابردووەوە نووسابوون، کارێکی کۆنەپەرستانەیە. ئەمجۆرە ڕەخنەگرانە غافڵ لەوپرۆسە کۆمەڵایەتیانەی کلتووری راستەقینەی لێوە

دروستدەبێت، تووشی جۆرێك "بت دروستکردنی" تایبەت و و فێڵبازانە دەبوون، بەو مانایەی هونەرو ئەدەبیاتیان لەدەقی خۆبزوێنەری دەپچڕاندو رۆح و گیانیان لێدەسەندو بەمشێوەیەش وەك "کالا"یەکی دەستکەوت مامەڵەیان لەگەڵدەکرد. لەهەلومەرجێکی وادا مومکین نەبوو رەخنەگرێکی رەسەن و خاوەن هوشیاریەکی کامڵ، لایەنگری پەیڕەوانی رێبازی رۆح یان مەعنەوی بکات. جگە لەمەش لەبنەڕەتدا گومان هەبوو لەوەی ئایا بەڕاستی کلتوورێکی باڵا ماوە کە دەبێت بەرگری لێبکرێ. دەڵاڵانی کلتووری باڵا ئەوەندە ئارایش و "بێلایەن " یان کردبوو کە جگە لەکۆمەڵێك شتی پڕوپوچ، هیچی لێنەمابۆوە. "قوڵبوونەوەو چاودێریکردن لەسەر بنەمای خود"یش بەهیچ نەدەگەیی، تەنانەت قسەکردن لەبارەی ئەوەوەی کە لەچ شوێنێکدا هەڵە کراوە، مومکین بوو ببێت بە زۆربڵێی رووت، ئادرنۆ لەخەمناکترین هاواری نائومیدانەدا ئەو دەرئەنجامەی وەردەگرت کە "پاش ئاشڤیتز ئیدی بەربەریانە کەسێك شیعر بڵێت"(٦).

## گەڕانەوە بۆ هیگڵ

پێشگریمانەی سەرەکی کۆچکردووەکان لەرەخنەی کۆمەڵگای مێگەلیدا، جۆرێك جیهانبینی بێگانەو بەگشتی نەناسراو بوو بۆ ئەمریکیەکان: واتە تیۆرەی مارکسی کە بە گەڕانەوە بۆ سەرچاوە هیگڵیەکەی خۆی، تازە بوو بۆوە. لە١٩٢٣دا کە کتێبەکەی لۆکاش مێژوو و هوشیاریی چینایەتی چاپکرا "لەئەوروپای نێوەندیدا واتە لەناوەندی نەریتی مارکسیدا شتێك لە "دوبارە ژیانەوەی ئایدیالیزمی میتافیزیکی" روویدا بوو. لۆکاش لەژێر فشاری دیسپلینی حیزبی کۆمنیستدا لادەرێتی سەردمی لاوی خۆی رەتکردبۆوەو بەکردەوە روانگەی "قوتابخانەیی" ماتریالیزمی دیالەکتیکی قبوڵکردبوو، کە لەدەوری دەرئەنجامی میکانیکی یاسا نەگۆڕەکانی ئابووری دەسوڕایەوە. بەڵام نەیدەتوانی رێ لەوە بگرێت نووسینەکانی ژیانێکی سەربەخۆ لەخۆی بەرنەسەر. ناوبانگی مێژوو و هوشیاریی چینایەتی بەنهێنی زیادیدەکردو بڵاوبوونەوەی دەستنووسە ئابووریو فەلسەفیەکان لەسەرەتاکانی دەیەی ١٩٣٠دا کە مارکسی لاو تیایدا تێڕوانینی سەرەکی خۆی بۆ کۆمەڵگای مرۆڤایەتی ئاشکرا کردبوو، راستی قسەکانی پێشووی لۆکاشی دەسەلماند، ئاشکرا دەبوو ئەم رەخنەگرە ئەدەبی و







شۆڕشگێڕەی دوایی ﴿واتە لۆکاش﴾، ئەوەی مامۆستاکەی لەبواری ئایدیۆلۆژیادا نزیك هەشتا ساڵ پێش نووسی بووی، بەهۆی جۆرێك دووبارە بەرهەمهێنانەوە لەڕێی هاودڵیەوە، پێشبینی کردبوو(٧). ئادرنۆو هۆرکهایمەر بە دەگمەن ئاماژەیان بۆ دەستنووسەکانی پاریسی مارکس دەکرد و پەیوەندیان لەگەڵ لۆکاشدا ساردو زۆرجار دوژمنانە بوو، ئایدیالیزم بوونی خۆشیان قبووڵنەدەکرد، بەڵام سەرەڕای ئەم نکووڵیکردنانە، ئەگەر کەسێك لەڕوانگەیەکی فراوانترەوە سەیری بەرهەمەکانیانی بکردایە، ئاشکرادەبوو کە ئەوانیش سەرقاڵی هەمان تەفسیری تازەو زیهنی مارکسیزمن کە لەماوەی چل ساڵدا لەدەیەی ١٩٢٠ تا دەیەی ١٩٦٠ ئەو تیۆرەی گەیاندە جێگەیەکی فەلسەفی تازەو بڵندتر، بەپێی ئەم تێڕوانینە ئانتۆنیوگرامشی بە پێشڕەوێکی ئیتاڵیای تاکانە دەژمێرا و پیاوێکی نیمچە لیبراڵی وەك میرلۆپۆنتی بەپەیامهێنەری مارکسیزمی نوێی سەدەی بیستەم دادەنرا، واتە مارکسیزمیك کە دوورە لەبانگەشە زانستیەکانی کۆتایی سەدەی نۆزدە، و گەڕاوەتەوە بۆ سەرچاوە هیگڵیەکەی خۆی  لەسەرەتاکانی ئەم سەدەیەدا. ئەم ئایدۆلۆژیستانە چەمکی لەخۆنامۆبوونیان بەکلیلی شیکردنەوەی کۆمەڵگا دادەنا. لەخۆنامۆبوون چەمکێکی رێنمایکەر بوو کە ژمارەیەکی زۆر لەبیریارانی سەرەڕای ئەوپەڕی جیاوازیو هەمە رەنگیان، بەیەکەوە دەبەستەوە (چونکە نابێ لەبیرمانبچێ تەوەرەی دەستنووسەکانی مارکسی لاو باسی لەخۆنامۆبوونی کرێکار بووە. لەخۆنامۆبوون کەسەرەتا لای هیگڵ بەکارهاتبوو، پاشان لەبەرهەمی نیتچەو فرۆیدا ئاستێکی بەرفراوانتری وەرگرتبوو و دواجار گشتیبوونێکی لەڕووی مانای بەرپرسیاریەوە پەیداکردبوو کە بووبووە وەسفێك بۆ سەرجەم ژیان لەجیهانی هاوچەرخدا. مژدەیەکی لەخۆ هەڵگرتبوو بۆ ئەو کەسانەی لەپلەی "ئامانج" و "غایەت" دابەزێنراون،و بوون بە "ئامێر"و "هۆکار" و تەنانەت هەست بەو ستەمەش ناکەن کە لێیان دەکرێت، بۆ ئەوەی بتوانن لەمڕێگەیەوە مرۆڤبوونی خۆیان بدۆزنەوەو هوشیاربن بەوەی کە ڕەفتاری هەنووکەیی مرۆڤەکان، چ دژایەتیەکی خەمگینانە لەگەڵ توانا نەپشکوتوەکانیاندا هەیە.

سیمای باڵادەست لە"دەزگای لێکۆڵینەوەی کۆمەڵایەتیدا" کە لە١٩٢٣ لەفرانکفۆرتدا بونیادنرا، ماکس هۆرکهایمەر بوو. "دەزگا" کە پێداویستیە

ئابووریەکانی لەنووسینگەی داهاتی تایبەتیەوە دابیندەکراو لەگەڵ زانکۆی فرانکفۆرتدا کە خۆی کەمتر لەدە ساڵ پێشتر دامەزرابوو، جۆرێك پەیوەندی ئازادی هەبوو. سوربوو لەسەر ئەوەی دەبێت لەڕووی فکرو ئایدیۆلۆژیەوە سەربەخۆ بمێنێتەوەو مایەوە. مارکسیزم -دیارە بە تەفسیری جیاواز- خاڵی هاوبەش و هۆی پەیوەستبوونی هاوکارانی "دەزگا" بوو. ناویشی تەنها بەهۆی دووربینیەوە لەناونیشانی "دەزگادا" نەهاتبوو. بەڵام هەرچەند لێکۆڵینەوەکانی "دەزگا" زیاتر پەرەیدەسەند، کاریگەری فکری جیاواز دەهاتە گۆڕێو ئەو شوناسە سەرەکیە تەمومژاوی تر دەبوو(٨).

خاڵی هاوبەشی دی ڕەگوڕیشەی یەهوودی بوو، بەگشتی زۆربەی ئەندامە گرنگەکانی "دەزگا"، سەربە خێزانی یەهوودی دەوڵەمەندو جێگەگرتوو لەکۆمەڵگادا بوون، بەڵام وەك زۆربەی یەهوودیە ئەڵمانیەکان، یان باسی ئەم مەسەلەیەیان نەدەکرد یان ئەگەر شتێکیان دەگوت، ئازاریان دەچێژا. تا دەرکەوتنی هیتلەرو گواستنەوەی دەزگا بۆ ئەمەریکا هێشتا مەسەلەی "دژایەتیکردنی یەهوودی" یەکێك لەو سەرقاڵیە سەرەکیانەی ئەندامان نەبوو. تا ئەوکاتە ئیمتیازی سەرەکیان ئەوەبوو بە نوێنەری کەمایەتیەکی ئەنتەرناسیونال و ئازادیخواز لەکۆمەڵی زانکۆیی ئەڵمانیادا دادەنران: کەمایەتیەك کە سەرچاوەی ئاراستەکانی بۆ هانیەی فەرەنسی و خودی مارکس دەگەڕایەوە.

ناکرێ سەرەتای هاوکاریە سەرسوڕهێنەرو ئاوارتنەی ﴿اسپینائی﴾ هۆرکهایمەرو ئادرنۆ بە ئاسانی دەستنیشان بکرێت. ئەم دوانە لە١٩٢٢دا و یەك ساڵ پێش دامەزراندنی دەزگا، بەیەکدی ئاشنابوون، بەڵام پەیوەندی ڕەسمی ئادرنۆ بە "دەزگا"وە پاش پانزە ساڵ دەستی پێکرد. پێدەچێ ڕووداوی یەکیـّتی فکریان ڕووداوێکی لەسەرخۆ بووبێت و سەرئەنجام بە ئاستێك لەچوونیەکی گەیشتووە کە هۆرکهایمەر ڕێگەی بەخۆیدەدا راشکاوانە فەلسەفەکانی هەردووکیان بە "یەك" ﴿فەلسەفە﴾ رابگەیەنێ(٩). ئەمجۆرە لەپێکەوەژیان لەمێژووی فکردا بێەندازە کەم وێنەیە: ئەو نمونانەی کە ڕاستەوخۆ بە بیرماندا دێت کاری هاوبەشی "دیتوکڤیل و بومون" و مارکس و ئنگلزە. بەڵام لەم نمونانەدا ئاشکرابوو کە شەریکی بچوکتر کێیە. هەم لەو سەردەمەداو هەم لەدوایشدا ئاشکرا بوو کە یەکێکیان لەڕووی زیهنیەوە





بەسەر ئەوی دیدا باڵادەستە. بەڵام پەیوەندی هۆرکهایمەر و ئادرنۆ بەم ئاسانیانە نەبوو. ئادرنۆ زۆر زیاتر دەینووسیو هێواش هێواش ناوادرتر بوو، هۆرکهایمەر پرۆژە هاوبەشەکانیانی ڕێکدەخست و هاوکارەکەی ڕێزی لێدەگرت و توانای لێوەردەگرت، پێدەچێ نهێنی هاوڕێیەتی ئارام و خاڵی لەتێکچوون، کە هەم لەڕووی شەخسی و هەم لەڕووی فکریەوە قوڵبۆوە، جۆرێك دژایەتی خۆش گونجاو بوو لەڕووی خەسڵەتەوەو هەروەها جۆرێك دابەشکردنی ڕێکەوتانەی بەرپرسیارێتی بوو لەنێوانیاندا.

هۆرکهایمەر هەشت ساڵ لەئادرنۆ گەورەتر بوو. لە١٨٩٥دا لەدایك بووبوو، کوڕی یەکێك لەخاوەنانی کارخانە دەوڵەمەندەکانی شتوتگارت بوو. تازە خوێندنی دوای بەکەلۆریۆسی لەفەلسەفەدا تەواوکردبوو کە بوو بە یەکێك لەهاوکاران و بونیادنەرانی "دەزگا". لێرەوە لەسەرتاسەری ساڵەکانی باڵغبوندا پەیوەندی بە "دەزگا"وە هەبوو. لەڕاستیدا مێژووی کۆچی "دەزگا" لەگەڵ مێژووی کۆچکردنی ئەودا یەك شت بوو. لە١٩٣٠دا بەڕێوەبەرێتی دەزگاکەی بەدەستەوە گرت و کورسی مامۆستای "فەلسەفەی کۆمەڵایەتی" وەرگرت و بوو بە نوێنەری نەگۆڕی "دەزگا" لەلیژنەی زانستی زانکۆی فرانکفۆرتداو لەوکاتە بەدواوە وەك ڕابەری مەعنەوی "دەزگا"ی لێهات. هۆرکهایمەر وەك لەناونیشانی مامۆستاییەکەیدا دەردەکەوت، تێگەیشتن و تێڕوانینێکی نائاسایی بۆ فەلسەفە هەبوو کە هەڵگری ئیلتزامێکی پڕ حەماسەت بوو بۆ گۆڕانکاری کۆمەڵایەتی. هۆرکهایمەر بە کوشتنی ڕۆزا لۆکسۆمبۆرگ لە١٩١٩دا نمونەی ئایدیۆلۆژی خۆی لەدەستداو هەرگیز ڕابەرێکی سیاسی دی نەدۆزیەوە کە بەو شێوە هاودڵو بە تەواوی لەگەڵیدا بێت، ﴿هەروەها﴾ هۆرکهایمەر لەپەیڕەوکردنی تەفسیری مارکسیانەی ڕوداوەکانداو جەختی مارکسیانە لەیەکێتی تیۆرەو پراکتیك، بەردەوام بە سەقامگیری مایەوە.

پێدەچێ هۆرکهایمەر لەلاویدا زوو وەڕس و دڵتەنگ بووبێ و بەپێی پێویست بڕوای بەخۆی نەبووبێ، بەڵام لەدەیەی ١٩٣٠دا زیاتر بڕوای بەخۆی کردو هەرچەند تەمەنی گەورە دەبوو، ئەم سیفەتە تیایدا بەهێزتر دەبوو. ئەم گۆڕانە ڕەنگە بۆ ئەوە بگەڕێتەوە کە هۆرکهایمەر لە٢٩-١٩٢٨دا ماوەیەکی کورت لەژێر ﴿چارەسەی﴾ دەرونشیکاریدا بوو، هەر ئەمەش سوودی بەحاڵەتەکەی گەیاند. بەهەرحاڵ ئەو کەسایەتیەی کە دوور لەوڵات بە پایەو پلەیەکی بەرجەستە گەیشت، ڕێکخەرێکی





بەهێزو هەندێجار تەنانەت بی لێبوردن بوو.... هۆرکهایمەر هەرگیز نەیدەتوانی ئەو بیرانەی کە هەیبوو بە ئاسانی بخاتە سەر کاغەزو هەرچەند کەسایەتی بەهێزتر دەبوو، ئەم کارەی لا گرانتر دەبوو. لێرەوە بە تێپەڕبوونی زەمەن زۆرتر دەوری پاریزەرو پشتگیرو هاندەری هاوڕێ ئازیزەکەی﴿واتە ئادرنۆی﴾لەئەستۆگرتو﴿ئادرنۆ﴾ بوو کە فۆرمی کۆتایی بەو شتانە دەدا کە لەبارەیەوە گفتوگۆیان دەکرد.

تدی ئادرنۆ بەپێی وەسفی یەکێك لەهاوڕێ لاوەکانی مرۆڤێکی بێ پەروا ﴿بێ ئیحگیاگ﴾ بوو کە هەمیشە پێویستی بە پشت و پەنایەکی مرۆیانە هەبوو. "بێ پەروایی" لێرەدا بەمانای کەسێکە کە هەرگیز فێری یاسای یاریکردن لەناو جیهانی گەورەکاندا نەبووەو پەی بەو پێچوپەناو فێڵە دزێوانە نەبردووە کە کەسانەی دی بەهۆیەوە ژیان دەسوڕێنن و بەخراپی سوود لەخۆی وەردەگرن. ئادرنۆ درەنگ پەیوەندیکرد بە دەزگاوە و نەچووە ناو ململانێکانی ڕێکخستنیەوە. لەدوا ساتەکانی تەمەنیدا گەیشتە پلەی مامۆستایی، بەڵام بەشێوەی ڕۆتینی و ئاسایی زانکۆییەکان ڕەفتاری نەدەکرد و پێدەچوو لەو دەورە تازەیە ناڕەحەت و بێزار بێت. لەگەڵ ئەوەشدا لایەنیکەم لەچوار بواردا -فەلسەفە، مۆسیقاناسی، ڕەخنەی ئەدەبی و کۆمەڵناسیدا- جێگەیەکی بەرزی پەیداکرد، بەڵام تەنها لەدواهەمین دانەیاندا ﴿واتە لەبواری کۆمەڵناسیدا﴾ لەلایەن خاوەنانی پیشەکەوە بە تەواوی قبوڵکرا (کاتێ لەتەمەنێکی گەورەدا کرا بە سەرۆکی ئەنجومەنی کۆمەڵناسی ئەڵمانیا، وەکو منالّ لەخۆشیدا جێی بەخۆی نەدەگرت). لەسەرتاسەری ژیانی کارکردنیدا هەروا وەك مرۆڤێکی نامۆ ﴿غریب الحال﴾ لەپەراوێزی ریزی ڕۆشنبیراندا مایەوە(١٠).

ئادرنۆ لەنووسینەکانی سەردەمی ئاوارەیەتیدا، چەندجار ئاماژەی بۆ ژیانە "زیان پێگەیشتووە"کان beschadigtes کرد. بەڵام بە زەرورەت مەبەستی ژیانی خۆی نەبوو. ئەو کوڕی دایك و باوکێکی دەوڵەمەند بوو (باوکی لەفرانکفۆرتدا کاری بازرگانی شەرابی دەکرد) و منالّی و هەرزەکاری بە خۆشیەوە بردەسەر و حەزی لەچی کرد، کردی. مۆسیقاو هەستی جیهان- نیشتمانی لەو ئاو و هەوایەدا کە هەناسەی تیادەدا، بڵاوبوو (سەرئەنجام ناوی خێزانی دەگمەن و بێگانەی دایکی لەناوی باوکانەی "ویزن گرۆند" بە باشتر زانی. ئادرنۆ ناوی ئەفسەرێکی فەرەنسی







خەڵکی دورگەی کورس بوو کە گۆرانیبێژێکی ئەڵمانی هێنابوو). ئادرنۆ پاش خوێندنی ئاهەنگسازیو وەرگرتنی پلەی دکتۆرای فەلسەفە لەوڵاتدا، لەبیست و دوو ساڵیدا و لەساڵی ١٩٢٥دا چوو بۆ ڤێنا بۆ ئەوەی لەژێر دەستی (ئالبان برگ) کاربکات کە موریدی (ئارنۆلد شوئنبرگ) موسیقاری گەورە بوو. لەو شارەدا چووە ناو کۆڕی هاوڕێیانی شوئنبرگەوە -هەمان ئەو کەسانەی کە چەندان ساڵ دوای ئەوە لەکالیفۆرنیا لەگەڵیاندا ئاشنایەتی تازەکردەوە. لە١٩٢٨دا گەڕایەوە بۆ فرانکفۆرت و دووبارە ڕوویکردە فەلسەفە)، بەڵام هەمیشە فەیلەسوفێك بوو وەك نیچە مۆسیقا هەموو گۆشەو کەنارێکی ژیانی داگیرئەکرد. ئادرنۆ هەرگیز بێ پارە نەمایەوەو هەمیشە خاوەن خۆشەویستیو وەفاداری هاوڕێی گەورەو میهرەبانی ﴿واتە هۆرکهایمەر﴾ و وەفاداری و گەرموگوڕی تەواوی هاوسەرەکەی بوو. تا دوا ساتی ڕووداوە سەیرو دەردناکەکەی کە بووە هۆی مەرگی، توانی بەشێوەیەکی بێوێنەو بێ هیچ سازشکاریەك بەردەوامی بە ژیانی خۆی، لەجیهانی ئەندێشەدا بدات.

هۆرکهایمەرو ئادرنۆ کارەکەی خۆیان بە "تیۆرەیو ڕەخنەگرانە" ناساندو مەبەستیشیان شێوازێکی بیرکردنەوە بوو کە لەنەفیەوە بۆ نەفی دەچێ تا دواجار بابەت بە زنجیرەیەك کۆتەکی بە زەبرو هەمەلایەنە سنووردار یان کون کون دەکات. کەوابوو تیۆرەی ڕەخنەگرانە بەپێی ماهیەت و کردەوەی، ناسیستماتیك و بە ناچاریش دوژمنی هەموو بینایەکی فەلسەفی داخراو بوو (هۆرکهایمەر، بە گشتی هەمیشە وتارنووسینی لەریسالەیەکی ڕێکخراو بە باشتر دەزانیو ئادرنۆش زۆربەی جار).

تیۆرەی ڕەخنەگرانە زۆرتر لەڕووی شێوازی هێرشەوە قەرزاری هێگڵ بوو تا لەڕووی پەرەسەندنی کۆتاییەوە. ئادرنۆو هۆرکهایمەریش وەك زۆربەی هیگڵیە نوێکانی سەدەی بیستەم، زۆرتر بایەخ و ڕێزیان بۆ نووسەری لاوی بیر کراوەو بەزەبر شۆڕشگێڕی "فینومۆلۆژیای ڕۆح" دادەنا، تا بۆ ئەو مامۆستا پیرەی زانکۆی لین کە فەلسەفەی یاسا و فەلسەفەی مێژوو پۆلێن دەکردو بەمشێوەیەش بەجیاکاری لەنێوان هیگڵی پێشوو و هیگڵی دواییدا، ڕێگەی هیگڵیە چەپەکان و خودی مارکسیان گرتەبەر، بەو جیاوازیەوە کە بە تەواویو تەنها بۆ جیهانی فکری دەیەی ١٨٤٠ نەگەڕانەوە. لەو کاتەوە ئەوەندە ڕووداو لەمێژووی فکردا ڕوویدا بووکە کارێکی وا

شیاو نەبێت. ساتەوەختی خودهوشیاری پرۆلیتاریا هاتبوو ﴿هەروەها﴾ تێپەڕیش بوو. هەروەها ژمارەیەکی زۆر فەلسەفەی نوێ، هیگڵیان لەپایەی بەرزو یەکتای پێشووی خۆی هێنابووە خوارێ، هۆرکهایمەر سەرەتا لەژێر کاریگەری دوژمنی خوێنی هیگڵ لەڕووی فەلسەفەوە، واتە لەژێر کاریگەری شوپنهاوردا بوو. نزیکی دوای نیو سەدەش دیسانەوە وەك تێکشکێنەری وەهمەکانی مرۆڤ و سەرچاوەی دەروونشیکاری، ستایشیکرد. دیارە پاش شوپنهاوەر نەك هەر فرۆید، بەڵکو دێلتای دەهات و ڤیبەر و مانهایم و کۆی خواکانی فکری ئەڵمانی کە زۆربەیان بایەخیان بە هیگڵ نەدەدا(١١).

کەوابوو تیۆرەی رەخنەگرانە ناچار دەبوو لەگەڵ میراتی هیگڵ لەفکری کۆمەڵایەتی سەدەی دوایدا یەکبگرێو لەروداوی نەوەستاوی نەفیدا سوود لە"شێوازی هیگڵ، بۆ بان سیستەم ودژی سیستەمی هیگڵ" وەربگرێ. دەرئەنجامی ئەمکارە جۆرێکی تازەی دیالەکتیك بوو کە لەڕووی میتۆدیەوە تەنانەت لەدیالەکتیکی مارکس بونیاد هەڵتەکێنەرتر دەردەکەوتو جۆرێك "دیالەکتیکی بێ سێنتز"(١٢) بوو. ئادرنۆو هۆرکهایمەریش وەك مارکس بێزار بوون لەو تەجریدانەی کە میتافیزیك و ئایدیالیزمی ئەڵمانی جیهانیان لەژێر پەچەکەیدا دەشاردەوەو رەخنەیان لەهیگڵ دەگرت کە بۆچی پلەی یەکەمی بە بناس ﴿یان زیهن﴾ داوە. بەڵام لەهەمانکاتدا نەیاندەویست لەتوندڕەویەوە بەرەو بێباکی بڕۆن و بچنە جەمسەری پێچەوانەوەو تووشی هەڵەی ماتریالسمی عامیانە یان زانستخوازی درۆزنانە بن، ئەو تیورەیەی هێنابوویان بە هاوتاییەکی ناپایەدار لەنێوان ئەو دوو ئاستەدا دەهات و دەچوو: لەلایەك پێداگرتن لەوەی "شتەکان" بەر لەهوشیاربوونی ئێمە پێیان هەن، لەلایەکی دیش دەربڕینێکی ئاڵۆزو لوتکەیو بێئەندازە تەجریدیانە، بەمانای دوای ئادرنۆ و هۆرکهایمەر لەهەمان قاڵبی ئایدیالیستیو میتافیزیکیدا مانەوە. جگە لەمەش چونکە بە وردیو سەختگیریەکی زیاتر لەهیگڵ بڕوایانوابوو کە ناکرێ هیچ شتێك راستەوخۆ بناسرێ و هەر شتێك لەجیهانی سروشت یان دنیای مرۆڤدا شتێکی دی "ئانتی تز" یێتی، ئەوا تیۆرەی رەخنەگرانەش وەك بیرەکانی دوای فینگشتاین فرە لایەن و گران و ئاڵۆز بوو.

دوو زاراوەی بنەڕەتی -یەکێکیان بۆ ئافەرین گوتن و ئەوی دیان بۆ سوکایەتیکردن- بەردەوام لەنووسینەکانی هۆرکهایمەر و ئادرنۆدا دووبارە دەبۆوە:







یەکەمیان "عەقڵ" و دوهەمیان "پۆزەتیڤزم"، "عەقڵ" لەهەمان مانای نەریتی هیگڵیدا دەلالەتی لەچۆنایەتیەك دەکرد کە سەبژیکت ﴿خود﴾ و ئۆبژێکت ﴿بابەت﴾ بەزەبر تیایدا هاوبەشبوون، واتە "بنەمایەك لەخودی واقعیەتدا" ﴿یان ئەوەی کە هەیە﴾. پۆزەتڤیزم ناوێکی هاوبەشبوو بۆ هەموو ئەو ئاراستە فکریانەی کە خاوەنانی تیۆرەی رەخنەگرانە لەگەڵیاندا کۆك نەبوون. بیریارانی کۆمەڵایەتی سەرەتاکانی سەدەی ﴿بیست﴾ هەرچیەکیان بەدڵ نەبوایە، دەیانخستە ژێر زاراوەی "پۆزەتڤیزم"ەوە. ئادرنۆ و هۆرکهایمەر تەنانەت ئەم زاراوەیان بێ قەیدو شەرت بەکارهێنا. ماتریالیزم و "زانستی پەرستی"یان کە ئامانجی هێرشی رەخنەگرانی دەیەکانی ١٨٩٠ بوو، بەو تۆمەتەوە کە "پۆزەتیڤزم"ە ڕەت دەکردەوە:(١٣) سەرەڕای ئەمەش سەرجەم قوتابخانەی ناوگەرەکان ﴿الاسمیون﴾ نەریتی ئەزموونگەریان دەخستەسەر. بەمشێوەیە پۆزەتڤیزمی لۆژیکی یا پۆزەتفیسمی ئەزموونگەری دەیەکانی ١٩٢٠ و ١٩٣٠ ش لەلای ئەوان چارەنووسێکی باشتری لەو شێوە سادانەی ئەم جۆرە تیۆرانە نەبوو کە فەیلەسوفانی سەدەی بیستەم بۆ راستکردنەوەی دەستیان لێ هەڵماڵیبوو. هەموویان بە یەکسان بە دوژمنی "عەقڵ" دادەنران، چونکە هەموویان عەقڵیان بۆ ئاستی یەکێك لە"هێزە زیهنیەکان" دابەزاندبوو(١٤).

پێویست بە وتن ناکات کە بیریارانی تیۆرەی رەخنەگرانە رەوتی ناعەقڵانیشیان بەتوندی مەحکومدەکرد. دیدی ئادرنۆو هۆرکهایمەر سەبارەت بەهەر جێگەیەك - بەشێوەیەکی سەرەکیش ئەڵمانیای نازی- کە دوژمنانی عەقڵ لەوێ بووبوونە سەرچاوەی دەسەڵات (ئەو دوژمنانەی کە خۆیان رایاندەگەیاند کە دوژمنی عەقڵن) دیدێکی پڕ لەقێزکردنەوەو وەڕسی بوو. جارێکی دی لەناو هەلومەرجێکی لەمچەشنەدا دەیانبینی کە دەبێت لەدوو لاوە بجەنگن: رقیان لەشێوەی ئەڵمانی "بیرکردنەوە بەخوێن" زۆر زیاتر بوو، لەرێبازی ئەزموونگەری ئینگلیزیو ئەمەریکا. بەڵام لەهەمانکاتدا بڕوایانوابوو ئەم دوو شێوازەی جیهانبینی ئەوەندەی دەزانرا بە تەواوی لەجەمسەری دژ بەیەکدا نبن و رەنگیشە یەکێکیان دەرئەنجامی مێژووی ئەوی دیان بێت. بێوێنەترین و هەروەها ورژێنترین لایەنی بیرکردنەوەی ئادرنۆو هۆرکهایمەر، ئەو باوەڕە سەقامگیرەی ئەوان بوو ﴿کە دەیگوت﴾ بەربەریەتی تازەی سەدە بیستەم، کوڕی راستەوخۆی بزوتنەوەی رۆشنگەری سەدەی هەژدەیە.

لەوتارێکدا کە هۆرکهایمەر لەژێر ناونیشانی "تیۆرەی تەقلیدیو رەخنەگرانە" لەساڵی ١٩٣٧دا بە چاپی گەیاندو تیایدا دەستنیشانی بەرنامەی کاریکرد، هەموو ئەو شتانەی سەرەوە بەشێوەیەکی کورپەلەیی دەبینرا. سیفەتی "تەقلیدی" بەشێوەیەکی سەرەکی بەهەمان مانای "پۆزەتڤیزم" بەکاردەهێنرا. هۆرکهایمەر روونیدەکردەوە کە لەلێکۆڵینەوەی کۆمەڵگادا ئەزموونگەران و تیۆرەسازانی تەقلیدی تەنها لەرووکەشدا لەیەك جیاوازن، چونکە هەردووکیان لەبنەڕەتدا قایلن بەیەك مۆدێلی تیۆری، مۆدێلێك کە لەزانستە سروشتیەکان و بە پلەی یەکەمیش لەماتماتیکەوە وەرگیراوە. بەبڕوای هۆرکهایمەر ئەم "لۆگۆسە نەمرە" شێوازی ئیشکردنیانی دەستنیشان دەکرد. هۆرکهایمەرو ئادرنۆ خۆیان دوور لەژیانی دەوروبەریان دەگرت و لێکۆڵینەوەکانیان بەپێی دابەشکردنێکی پسپۆڕی ﴿تخصصی﴾ بەشبەشدەکرد. ئەڵبەتە بە وتەی هۆرکهایمەر پەیڕەوانی تیۆرەی رەخنەگرانە کاتێك دەستیان بە لێکۆڵینەوە دەکرد، هەوڵیاندەدا لەجیهانی مرۆڤ "لەناو جەرگەی رووداوە واقعیو کۆمەڵایەتیەکانەوە" تێبگەن، چونکە "فەرمانڕەوای ﴿ئەم جیهانە﴾ لەهەر گۆشەیەکدا، پەیوەندی بەهەلومەرجی عەقڵی ژیان"(١٥)وە هەبوو.

هۆرکهایمەر هەموو رۆشنبیرانی خۆی بانگدەکرد بۆ ئەوەی لەجێی "یاریە رۆشنبیریە بێ ئامانجەکان کە نیوەی شیعرە لەقاڵبی چەمکە هەمەکیەکانداو نیوەی ئاشکراکردنی حاڵەتە زیهنیەکان" بوو، تیۆرە کۆمەڵایەتیە تەقلیدیەکانیش هەرگیز لەو سنوورە تێنەدەپەڕی، لەجێی ئەمە بیری خۆیان ئاراستەی رزگارکردنی مرۆڤ و "گۆڕانی سەرجەم کۆمەڵگا" بکەن. هۆرکهایمەر ڕوونیدەکردەوە کە تا ئەو کاتەی مرۆڤەکان "وەك ئەندامی بوونەوەرێکی ئورگانیك" و خاڵی لەعەقڵ ئیشبکەن "،مومکین نیە عەقڵ لەلای خۆی شەفافیەت پەیدا بکات". کەوابوو بە پێی تیۆرەی رەخنەگرانە جیاوازی رۆڵی "زانستی" لێکۆڵەرەوە، لەگەڵ رۆڵی لێکۆڵەرەوە وەك هاوولاتیەك کە ماکس فیبەر سەختگیرانە جەختی لێدەکرد، بە تەواوی بێ مانا بوو ﴿چونکە﴾ یەکێتیو یەکپارچەیی مرۆڤانەی کاری فکری، پارچەپارچەو پەرش و بلاودەکردەوە. "لەبیرکردنەوەی ڕاستەقینەدا" لێکۆڵینەوەو بەهاو زانست و کردار بەشێوەیەکی لێك جیانەبۆوە تێك دەئالان. تەفسیر دەلالەتی "نەك تەنها بۆ ڕووداوێکی لۆژیکی دەکرد، بەڵکو هەروەها بۆ پرۆسەی مێژووش". لەدرێژەی





ئەمەشدا هەم.. بونیادی کۆمەڵایەتی.. و هەم پەیوەندی تیۆرەساز بە کۆمەڵگاوە" گۆڕانکاری بەسەردا دەهات. تەفسیرکەریش هاوڕێ لەگەڵ بابەتی تەفسیرکراودا دەگۆڕا(١٦).

هۆرکهایمەر، لەوتارێکی تردا کە پێشتر لەهەمان ساڵدا بلاوبۆوە بە ڕاشکاوانەتر جەختی لەپەیوەندی هاوتای دوو رۆڵی بیریار کردو نووسیبووی:

"کاتێ تاکەکەسێکی چالاك و خاوەن عەقڵێکی تەندروست هەلومەرجی نالەباری جیهان دەبینێت، ئارەزوو بۆ گۆڕینی دەبێتە بنەمایەکی رێنمایکەر کە بەهۆیەوە واقعیەتە پێدراوەکان رێکدەخات و لەشکڵی تیۆرەیەکدا دایدەڕێژێ. هەم میتۆدەکان و وتەزاکانو هەم گۆڕانەکانی تیۆرە، تەنها بەسەرنجدان لەهەڵوێست وەرگرتنی ئەو قابیلی تێگەیشتنە. وەك چۆن راست بیرکردنەوە بە راست ئیرادەگەریەوە بەستراوە، هێندەش راست ئیرادەگەری بە راست بیرکردنەوەوە بەستراوە"(١٧).

بەپێی ئەم پێناسەیەی رۆشنبیر کە تیایدا کردارو کار بە بنەما دادەنرا، ئەو چەپبوونەی کە بە ئیحساساتی ساویلکانەو بازاڕیەوە "بەوەندە وازیدەهێنا کە بە زمانێکی پڕ ستایش و ڕێزەوە هێزی خولقێنەری پرۆلیتاریا رابگەیەنێت، بە تاوانی "راکردن لەهەولی تیوری" مەحکومدەکرا. "خۆشبینی پیشەیی و "هەستی خۆشحاڵی" لە"پەیوەست بوون بە هێزێکی جیهانیەوە، دەشێ زۆر لە"سەردەمی شکستە وردوخاشکەرەکاندا" (وەك ئەو سەردەمەی هۆرکهایمەر ئەم شتانەی تیا دەنووسی) ببێتە هۆی نائومێدی. رەخنەگری کۆمەڵایەتی باشتربوو قبووڵیبکات کە رەنگە لەگۆشەگیری ئایدۆلۆژیدا، بۆ خۆی بەجێدەهێڵرێ. هەروەها نەدەبوو ئەو بیرکردنەوەیەی کە سەرچاوەی لەخۆ دوورخستنەوە لەئایدیۆلۆژیاوە وەردەگرت، لەگەڵ "یۆتۆپیا تەجریدیەکاندا" تێکەڵبکرێ. بیرکردنەوەیەکی لەم چەشنە بەدەر لەلێکچونی لەگەڵ وەهمدا ، بەهەر حاڵ لەسەر ئەو باوەڕە وەك بەرد پتەوە دامەزرابوو کە "تەنها یەك هەقیقەت" هەیەو "سیفەتە پۆزەتیڤەکانی راستگۆیو گونجانی دەروونیو عەقلانیەت و هەوڵدان بۆ ئاشتیو ئاسوودەییو ئازادیو خۆشەبەختی" مومکین نیە "بەهەمان مانا بگەڕێنرێتەوە بۆ تیۆرە یان کردارێکی تر"(١٨). هۆرکهایمەر دەیزانی باوەڕێکی لەمچەشنە بەمانای "لیبرالی نەبوونی" رۆح یان زیهنە Geist " رۆح یا زیهن دابڕاوو جیا لەژیانی کۆمەڵگا"و "لەسەرو ئەو

ژیانەوە" نەبوو، ئەم راستیەش لەگەڵ رۆڵی "ئازاد لەحەزو ئارەزوو" ی بیریار کە "رۆشنبیرانی لیبرالی" ئەوەندە بەهایان بۆ دادەنا، ناتەبا بوو. ئەرکی میانچێتی ﴿میانجیگری﴾ کە مانهایم بۆ فکری کۆمەڵایەتی دانابوو، بەئاشکرا لەگەڵ ئەو فۆرمە کۆنەدەبۆوە کە بیریارانی تیۆرەی رەخنەگرانە بە مەسەلەکانیان دەدا، لەهەمانکاتدا هۆرکهایمەر بڕوای بەوەش هەبوو کە رۆح یان زیهن لیبرالیشە، بەمانای رێگەنەدان بۆ بەرگەگرتنی (هەر جۆرە ناچارکردنێك لەدەرەوەو هەر جۆرە پیاچوونەوە ﴿یان بیر تازەکردنەوە﴾ بە دەرئەنجامە بەدەستهاتووەکاندا بە بێ خواستی ئیرادەی فلان یان فیسار دەسەڵات). ئادرنۆ هۆرکهایمەر بە درێژایی ٣٠ ساڵی دوایی کە روداوەکان ناچار بەتەنیایی و گۆشەگیریکردن، بەردەوام بە پەیوەندیەکی دیالەکتیکی لەنێوان لایەنە لیبرال و نالیبرالەکانی فکری خۆیاندا دەهاتن و دەچوون.

## ماکس هۆرکهایمەر و تئودرۆ ئادرنۆ: ساڵەکانی نیشتەجێ بوون لەئەمریکا

چوار ساڵ لەو ماوەیەدا کە فەیلەسووفانی فرانکفۆرت دوور لەوڵات لەئاوارەیدا بەسەریاندەبرد، پەرەو درێژەیان بەم سەرەتا تیۆریانە دەدا. بەهاتنی هیتلەر "دەزگای لێکۆڵینەوەی کۆمەڵایەتی" کە پێکهاتبوو لەکۆمەڵێ بیریاری بە رەچەڵەك یەهوودی و سەر بەمارکسیزم و نازیەکانیش بێ ئەندازە رقیان لەهەردووکی بوو، مەحکوم بە لەناوچوون بوو. لەمارسی ١٩٣٣دا چالاکیەکانی لەئەڵمانیادا کۆتایی پێهات. هۆرکهایمەر رایکرد بۆ سویس و مانگی دوایش ناوی لەناو  یەکەم گروپی مامۆستایانی زانکۆ کە رژێمی تازە دەری کردبوون، نووسرا.

"دەزگا"کە پاش ماوەیەکی کورت لەجنێف لەسەر بانگهێشتی زانکۆی کۆلۆمبیا ﴿لەشاری نیویۆرك﴾ لەساڵی ١٩٣٤دا چوو بۆ ئەمریکا، لەوێ ئادرنۆ کە نیو دەیەی لەئۆکسفۆردو لەندەندا بردبووە سەر، بە رەسمی لە١٩٣٨دا چوو بۆ کۆلۆمبیا. "دەرگاکە" بە هۆی نوسینگەی دەخلی تایبەتیەوە بەرێوەدەبرا کە بەرلەوەی نازیەکان دەستی بەسەردا بگرن، پارەکەی بەدووربینیەوە نرابوو بۆ دەرەوە. لەبەر ئەمە جوڵەیەکی هەبوو کە رێکخراوەکانی دی نەیانبوو. بەڵام ئەم ئاسانی سەفەرکردنە بەمانای ئاسانی گونجان نەبوو لەگەڵ دەوروبەری تازەدا. هۆرکهایمەرو







هاوکارانی لە"مۆرینك سایدهایتن" هەروا سەرسەختانە بە ئەورووپی مانەوە و تەنانەت هەندێکیان تا دواسات خۆیان لەچوون بۆ ئەمریکا دەدزیەوە. لقێکی "دەزگا" کە هێشتا لەپاریس بوو، بڵاوکراوەکانی دەزگای بەشێوەیەکی بەردەوام ئامادەو بڵاودەکردەوە. بەڵام هێشتا هەر بە زمانی ئەڵمانی.

بەڵام کەوتنی فەرانسا لە١٩٤٠داو یەك ساڵ و نیو دوای ئەوەش هاتنە ناوەوەی ئەمەریکا بۆ جەنگ، هەموو شتێکی گۆڕی. هۆرکهایمەرو هاوکارانی کە بینیان دوا پەیوەندیان بە ئەوروپا پچڕاوە، بەبێ ئارەزووی خۆیان بڕیاریاندا لەمەودوا بەرهەمەکانیان بە ئینگلیزی بڵاوبکەنەوە. هێشتا زۆر تێنەپەڕی بوو کە "دەزگا" تووشی زنجیرەیەك قەیرانی ناوخۆیی بوو، باری میزانیەو سەرمایەگوزاری سەرنەکەتوو، ناچاریکرد ژمارەی فەرمانبەرانی کەمبکاتەوەو چالاکیەکانیش سنووردار بکات. خۆشبەختانە پێویستی ئەمریکا بە پسپۆڕی مەسەلەکانی ئەڵمانیا لەکاتی جەنگدا، یارمەتی دەزگاکەیدا بۆ ئەوەی کێشەکانی چارەسەر بن. چەند کەسێك لەئەندامانی چوون بۆ واشنگتۆن و یەکێکیش لەیەکەمینی ئەم گرووپە فرانز نۆیمان بوو کە لەناوەڕاستی دەیەی ١٩٣٠دا پەیوەندی کردبوو  بە "دەزگا"وە. نووسەری "بەهیموت" ئەگەرچی لەئەندامە تازەکان بوو، بەڵام وەك دیاربوو لەوتوێژەکانی "دەزگا"دا رۆڵێکی بەرجەستەی دەبینی، پیاوێکی کەسایەتی بەهێز بوو و لەگەڵ هورکهایمەریشدا لەسەر تەفسیری نازیزم جیاوازی هەبوو. ﴿بەمشێوەیەش﴾ چ لەرووی ئایدۆلۆژی و چ لەڕووی رێکخستنەوە بوو بوو بەرەقیبی بەڕێوەبەری "دەزگا". رۆیشتنی ئەو بۆ واشنگتۆن رێگەی لەپێکدادانی ئەم دوو کەسایەتیە سەرسەختە گرت.

لەم بەینەدا هۆرکهایمەر ناچار بوو نیویۆرك بەجێ بهێڵێت. لەبەر نەخۆشی دڵ ناچار بوو بۆ ناوچەیەك بڕوا کە ئاو و هەوایەکی باشتری هەیە. لەساڵی ١٩٤١دا چوو بۆ کالیفۆرنیا- یان وردتر بۆ پسیفیك پلیسیدز- ئەو شوێنەی کە توماس مان نیشتەجێ بوو تیایدا. ئادرنۆش لەڕووی وەفاداریەوە بۆ هاوڕێکەی چوو بۆ ئەوێ و پاشماوەی (دەزگا)کەش لەمۆرێنگ ساید هایز هێواش هێواش وەریو وشك بوو(٩١)، بەمپێیە هۆرکهایمەر و ئادرنۆ ئەو نووسینانەی کە ئەمڕۆ ناویان لەبەر ناوی ئەوان زیندووە، لەکالیفۆرنیا نووسی، واتە جێگایەك کە کلتووری ئەڵمانیا لەئاوارەییدا

دەوڵەمەندترین پلەی بەدەستهێنا.

بە سەرنجدان لەوەی کە ئەو دوانە بە چ کەللە ڕەقیەکەوە بەمیراتی ئەوروپای خۆیانەوە نوسابوون و چ دوژمنایەتی وتوندیەکیان بەرامبەر کلتووری مێگەلی ئەمریکا پیشاندەدا، ڕەنگە وابزانرێ کە ئەزمونەکانیان لەئەمریکادا بە تەواوی نێگەتیڤ بوو، بەڵام داوەری کۆتایی ئادرنۆ بەوشێوەیە نەبوو، لەو بیرەوەریانەدا کەبەر لەمردنی بەساڵێك بڵاویکردەوە-و ڕەنگە تا ئەوکاتە نەرمتر بوو بوو- جەختی لەوشتانە کرد کە لەئەمریکیەکانەوە فێریبوون و بە قسەی خۆشی بۆتە هۆی چاککردنەوەی جۆرێك لەناهاوسەنگی لەبیرەکانیدا. ئادرنۆ بەیادی دێتەوە کە "گەرچی دوور لەهەستە ناسیونالیزمیەکان و غروری کلتووری" پێی خستبووە ئەمریکاوە، بەرهەمەکانی زیاد لەپێویست "ڕاستەوخۆ تیۆری" و تەنها بەلای تەفسیرو ڕاڤەکردندا دەچوو. بەڵام لەئەمریکادا بینی بووی کە خەڵکی بەردەوام داوای "بەڵگەو دەلیلی" لێدەکەن بۆ ئەو شتانەی کە گوتوێتی. یەکەم کار کە پێی سپێررا لێکۆڵینەوەی مۆسیقای جازبوو کە لەگەڵ سەلیقەی پەروەردەکراویدا بەتەواوی جیاواز بوو. بەڵام ئادرنۆ لەئەنجامی ئەم لێکۆڵینەوەیەدا دەستی بە چەمکی وەك "تاکگەری درۆینە" و "گەورەی" درۆزنانە گەیشت کە دواتر جێگەیەکی بەرجەستەی لەتیۆرە کۆمەڵایەتیەکەیدا بینی، بە گشتی وەکو نوێمان زانی کە لەوڵاتە یەکگرتووەکاندا جیاواز لەئەڵمانیا لەسەردەمی کۆماری ڤایماردا "شکلگرتنی دیموکراسیانە لەسەرتاسەری ژیاندا بڵاوبۆتەوە". بەڵام جگە لەزانینی ئەمە، بێگومان گومانی بوو کە ئەم شکڵ گرتنانە تا چەند ڕەنگدانەوەی ڕاستیە ژێرخانیەکانن و ئەم مەسەلەیەش بوو بە تەوەرەی سەرەکی بیرکردنەوەی لەساڵەکانی ئاوارەییدا. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا تەنانەت پاش کۆکردنەوەی سەرجەم لایەنە نێگەتیڤەکان، هەستی بەوەدەکرد کە لەڕووی فکریەوە قەرزاری ئەمریکایە. "بێهودە نیە گەر بگوترێ هەر هوشیاریەك لەم سەردەمەدا گەر ئەزموونی ئەمەریکای (ئەگەر بۆ دژایەتیکردنیش بووە) لەخۆیدا نەتوێنێتەوە، خاوەن ڕەگەزێکی کۆنەپەرستانەیە"(٢٠).

کتێبێك کە ئەم سەرقاڵیە تازانەی تیا دەرکەوت "کەسایەتی دەسەڵاتخواز" بوو کە ئەگەرچی لەڕووی پۆلێن و نوسینەوە بەدوا بەرهەمی سەرەکی ئادرنۆو هۆرکهایمەر لەرۆژانی ئاوارەییدا دەژمێرێت، یەکەم نووسین بوو کە سەرنجی





وەرگرێکی زۆری لەئەمریکادا بۆخۆی ڕاکێشاو جگە لەمەش کەمترین پێکدادانی لەگەڵ نەریتی ڕۆشنبیری ئەو وڵاتەدا هەبوو. لەبەر ئەوە لۆژیکیە گەر بەرهەمەکانی ئەو سەردەمەیان بەشێوەیەکی پێچەوانە شیبکەینەوەو هێواش هێواش بگەین بەو مەسەلانەی کەخاوەن زۆرترین ڕەهەندی ڕەخنەگرانەن.

لەساڵی ١٩٤٤دا دەستکرا بە نووسینی کەسایەتی دەسەڵاتخواز و لە١٩٥٠دا بڵاوکرایەوەو بەشێك بوو لەپرۆژەیەکی بەربڵاوتر لەژێر ناونیشانی "چەند لێکۆڵینەوەیەك لەبارەی پێشداوەریەوە". ئەندامانی "دەزگا" پێشتر ئاشنای ئەم جۆرە پرۆژانە ببوون. فراوانترین هەوڵی پێشوو لەو زەمینەیەدا زنجیرەیەك وتاری ئاسان بوو لەبارەی مەسەلەی خێزان و دەسەڵاتەوە. کەسایەتی دەسەڵاتخواز لەو ڕووەوە تازە بوو کە نوسەرانی ئەمریکیو کۆچکردوو(مهاجر)، هەروەها شێوازە ئەزموونگەریو تیۆریەکان، تیایدا لەپاڵ یەکەوە هاتبوون. ئەگەرچی هۆرکهایمەر بزوێنەری سەرەتای پرۆژەکە بوو، بەڵام بەشدار نەبوو لەلێکۆڵینەوەو نووسیندا. بەرپرسیاری ئەم مەلەسەیە لەڕووی شیکردنەوەی چەندایەتیو تاقیکردنەوەکان و چاوپێکەوتنەکاندا لەئەستۆی تیپێکی دەروونناسی لەدایکبووی ئەمریکاو نیشتەجێ لەبرکلی لەکالیفۆرنیا بوو. لەڕووی تەفسیرو ڕاڤەکردنی چۆنایەتیەوە لەئەستۆی خودی ئادرنۆ بوو. دواتر ئادرنۆ بیری دێتەوە کە "هاوکاری بە ڕۆحیەتی دیموکراسی" کە خەسڵەتی پرۆژەی ناوبراو بوو، "بە پێچەوانەی نەریتی زانکۆیی ئەوروپاوە" "بەرهەمدارترین شتێ" بوو کە لەئەمریکادا ئەزموونی کردبوو. ئادرنۆ بەتایبەتی بە ستایشەوە یادی یەکێك لەهاوکارانی دەکرد کە ناوی (ر.نویت سنفرد) بوو کە بەوردی سەرجەم داڕشتنە ئینگلیزیەکەی ئەوی ڕێکوپێك کردبوو(٢١).

گریمانەی سەرەکی لەکەسایەتی دەسەڵاتخوازدا ئەوە بوو کە لەوڵاتە یەکگرتووەکان -و سەرتاسەری جیهانی ڕۆژئاوادا جۆرێك "ئامادەیی فاشیزمی" هەیە کە لەتاکە کەسانێکی دیاریکراودا دەناسرێتەوە ﴾یان قابیلی دەستنیشانکردنە﴿. دەگوترا ئەمجۆرە لەپیاوان و ژنان شتێك لەخۆیان پیشاندەدەن کە لەزاراوەی دەرونشیکاریدا ڕەنگە ناوی "سێندروم Syndom ی دەسەڵاتخواز"ی لی بنرێ. ئەم سێندرومە لە"تێکەڵبوونی گرێی ئۆدیب لەگەڵ مازوشیزم و سادیزمدا سەرچاوە دەگرێو ئاشکراکەری ڕقێکی ناهوشیارانەیە لەباوك.. کە گۆڕاوە.. بۆ عەشقی"





بەهێزەکان و﴿رق﴾ لەکەسانی بێتواناو بێبەرگری. بەگشتی بۆ پاشەکەوتکردنێکی دەرونی، یەهوودی دەبێتە "جێنشینی باوکی رق لێهەلگیراو". و بەمپێیەش دەکرێ پێشبینیبکرێ کە "دژایەتیکردنی یەهوودیبوون گرنگترین ئاماژەو نیشانەی ئەم تێکچوونەیە ﴿دەرونیەیە﴾. نیشانەکانی دیش رووکردنە بیرکردنەوەی قالبیەو ئەوەی کە تاکەکەس چ لەسیاسەت و چ لەپڕوپاگەندەی بازرگانیدا بکەوێتە ژێر کاریگەری "لایەنە شەخسیەکان"ی وتار خوێندنەوە گشتیەکان، و هەروەها نکولێکردن لەهەموو شێوە ئامانجێکی یۆتۆپی(٢٢).

کەسایەتی دەسەلاتخواز لەکۆڕو کۆمەڵی زانستە کۆمەلایەتیەکانی ئەمریکادا بە فراوانی خوێندرایەوەو قسەی لەبارەوە کرا(٢٣)، تەنانەت ئەو کەسانەش کە ڕەخنەیان لەشێوازو دەرئەنجامەکانی دەگرت، دانیان بە هێزی بیرو وروژاندنی ئەم کتێبەدا دەنا. بەلام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا شتێکی سەرگەردانیکەر لەکتێبەکەدا هەبوو کە بە گشتی هیچ خوێنەرێك نەیدەتوانی بەوردی پەنجەی لەسەر دانێت. کتێبەکە شەش ساڵ بەدەستەوەبوو. ئەگەری ئەوەش هەبوو لەمە زیاتری پێ بچێت، گەر ئادرنۆ بڕیاری گەڕانەوەی بۆ ئەڵمانیا نەدایەو پەلەی لەهاوکارانی نەکردایە بۆ ئەوەی بێ چاکسازی و کورتکردنەوە کە بێگومان بەسوودی کتێبەکە تەواو دەبوو، پەلە لەتەواوکردنی کارەکە بکەن. لەسەردەمە ئارامترەکاندا تێپەڕینی کاتێکی ئاوەها جیاوازیەکی ئەوتۆی نەدەبوو. بەلام لەمحاڵەتەدا کتێبەکە لەفەزایەکی ئایدیۆلۆژیدا بلاوکرایەوە کە زۆر جیاواز بوو لەفەزای سەرەکی ﴿کە کتێبەکەی تیانووسراوە﴾ و وەك دەیڤید ریسمان لەڕووی گلەییەوە دەیگوت باسی گرفتی بیست ساڵ پێشی دەکرد. دژایەتیکردنی یەهوودی چیدی کێشەی رۆژ نەبوو. کەسێتی دەسەلاتخواز گەرچی لەهەمان ساڵدا بلاوبۆوەو کە جۆزیف مەکارتی دەستی بە کارە دزێوەکانی کرد، تەنها لەپەراوێزدا باسی مەترسی مێگەلبوونی دەکرد کە ئەو ﴿واتە مەکارتی﴾ بە سەرکەوتوویەوە، خراپ بەکاریدەهێنا. چوارچێوەی مەرجەعی کتێبەکە فاشیزمیك بوو بە شێوازی ئەوروپا، کە جیاوازیەکی ئاشکرای هەبوو لەو مەترسیانەی هەڕەشەی لەولاتە یەکگرتووەکان دەکرد(٢٤).

لەڕووی مەنهەجیشەوە رەخنەگران دەیانگوت نووسەرانی کتێبەکە لەهونەری نموونە وەرگرتندا هەڵەیان کردووەو ئاراستەیەك پیشاندەدەن بۆ لەبەرچاونەگرتنی







ئاستی خوێندن و پێگەی کۆمەلایەتی ئەو کەسانەی کە چاوپێکەوتنیان لەگەڵ کراوە یان تاقیکراونەتەوە. و لایەنە چوونایەتیەکەش تاڕادەیەك مەزاجیانە جێبەجێکراوە. وردبینانی دی بڕوایان وابوو کە ئەم کەموکووڕیانە، دەرئەنجامی "تێکەلکردنی" دوو مەنهەجی لێکۆڵینەوەی نەگونجاوە.

دیارە وەفاداری بۆ ئەو چەمکانەی لەفرۆیدەوە وەرگیراوە، لێکۆڵەرەوە ئەمریکی و کۆچکردووەکانی کە لەبەرهەمهێنانی کەسایەتی دەسەلاتخوازدا هاوکاریانکردبوو، بەیەکەوە گرێدەدا، بەلام ئاشکرا بوو بۆ نەهێشتنی جیاوازی نێوان کۆکردنەوەی دراوەکان و داڕشتنی تیورە، هەر ئەمە بەس نەبووە. ودواجار وا دەردەکەوت کە رۆشنبیری هورنەمەندو دەست زبری تیپەکەو لەوانی دی بالاو سەری گەورەتر، ئادرنۆیە. بەپێی نووسینی دوو رەخنەگر "بەداخەوە مەنهەجی سەرژمێری﴿احصائیەت﴾ لەدەوری مێردێکی گەمژەو فەقیردا دەردەکەوت، کەلە بەرامبەر بیرە داهێنەرەکانی هاوسەرەکەیدا تەنها دەزانێت بلێ "بەلێ ئازیزم.."(٢٥).

جیاوازیەکی نەناسراو لەڕووی ئایدیۆلۆژیەوە لەژێر ئەم پێکەوەگرێدانە کەموکوڕی میتۆدەکاندا هەبوو. لەکەسایەتی دەسەلاتخوازدا وشەی "دیموکراسی" وەك سیفەتی پێچەوانەی "فاشیزم" بەکاردەهێنرا کە وەك دیارە بەشێکە لەزمان و زاراوەکانی نووسەرە ئەمریکیەکانی کتێبەکە. بەلام ئادرنۆ کەسێ نەبوو کە بەپێی سروشتی خۆی سوود لەو وشەیە وەربگرێ‌و رەنگە لەجێی ئەوە بینوسیایە"سۆشیالیستی" یا "شۆڕشگێڕانە". هاوکارانی "دەزگای لێکۆڵینەوەی کۆمەلایەتی" بەردەوام لەپشتبەستن بە زاراوە مارکسیەکاندا رەزیلیان دەکردو پاش گواستنەوەی "دەزگا"ش بۆ ئەمەریکا ئارەزوو بۆ دەربڕینی مەبەستەکانیان لەقالبی "زمانی ئەوانی دیدا"، زیاتر لەجاران بوو(٢٦). ئادرنۆو هۆرکهایمەرو هاوکارانیان هەولیاندەدا لەژێر پاڵنەری ئەوەی ئەمڕۆ بەزیادەڕەوی لەخۆپاراستن دادەنرێ، پەیوەستبوونی هەقیقی خۆیان لەڕووی ئایدیۆلۆژیەوە بشارنەوە. لەبەر ئەوە مایەی سەرسوڕمان نیە کە خوێنەرە ئەمریکیەکان سەرگەردان دەبوون لەبەر ئەو ئەنجامگیریەی بەشێوەیەکی ناواخنی لەکەسایەتی دەسەلاتخوازدا شاراوەتەوە، و بە ئاسانی نەیاندەتوانی لەمەبەست و مانا شاراوەکانی تێبگەن.

نهێنی ئەم مەسەلەیە دەبوو بە یارمەتی بەرهەمەکانی دی ئادرنۆ، کە هاوکات

بەزمانی ئەڵمانی سەرقاڵی نووسینیان بوو بدۆزرێتەوە. هەروەها بەرهەمێکی تر بە ئینگلیزی هەبوو کە مومکین بوو یارمەتی لەناوبردنی بەدحاڵیبوونەکان بدات. لەساڵی ١٩٤٧دا کتێبێك بەناوی "عەقڵ گیران"ەوە لەهۆرکهایمەر بڵاوکرایەوە کە زنجیرەی ئەو وتارانەی لەخۆگرتبوو کە لەسێ ساڵی رابردوودا لەزانکۆی کۆڵۆمبیادا، وەك وانە گوتبوونیەوەو بەشێوەیەکی سەرەکیش هەمان ئەو بابەتانەی لەخۆگرتبوو کە نووسەر لەوتارە سەرەکیەکانیدا لەساڵی ١٩٣٧ باسی کردبوون. بەڵام ئەمجارە دەربڕینی بابەتەکە ساردو بێگیان بوو، شێوازی نوسینی هۆرکهایمەر بەهۆی گواستنە لەئەڵمانیەوە بۆ ئینگلیزی گەرمیو هێزی دیالەکتیکی پێشوی خۆی لەدەستدا بوو. عەقڵ گیران نە کاریگەری کردە سەر رەخنەگران و نە خوێنەرە ئاساییەکانیش و کاریگەری لەسەر ڕوشنبیرانی ئەمریکا، لەسفرەوە نزیکبوو.

هۆرکهایمەر رەنگە بە لەبەرچاوگرتنی وەرگرە ﴿مخاگب﴾ تازەکانی کتێب، نووکی هێرشی کردبووە سەر ئامانجە بەتایبەتی بەرجەستەکانی وڵاتە یەکگرتووەکان. ئاگاداری دەدا لەبارەی "روکردنی لیبرالیسم بەرەو لاربونەوە بەلای فاشیزمداو ئارەزووی نوێنەرە سیاسیە لیبرالەکان بۆ سازشکردن لەگەڵ دژەکانیدا" و بەبیریدەهێنایەوە کە ڕوانگەیەکی "وێنەیی" و "زیهنی" بۆ عەقڵ "یارمەتیمان نادات بۆ دیاریکردنی پێویستی هیچ ئامانجێك". بەڵگەی دەهێنایەوە کە ئەزموونگەرە لیبراڵەکان لەچارەسەرکردنی گرفتی "بەها" ﴿قیمە﴾دا بەسەرگەردانی دەمێننەوەو خەڵکی ئەمرۆ "بەهۆی خواردنی پاشماوەکانی ئەو بیرکردنەوانە، بەردەوامی بەژیانی خۆیان دەدەن" کە رۆژگارێك هەڵگری "چەند ڕەگەزێکی هەقیقەت" بوو، بەڵام ئەمرۆ "هێواش هێواش توانای دروستکردنی باوەڕهێنان"ی لەدەستداوە. لەم قسەو باسانەوە تا هێرشکردنێکی تەواو بۆ تاکە فەلسەفەیەکی خۆماڵی ئەمریکا؛ واتە پراگماتێزم.. تەنها یەك هەنگاو دووربوو. هۆرکهایمەر بڕوایوابوو پراگماتیزم هەوڵدەدا "هەموو بوارەکانی ژیان بکاتە ملکەچی نمونەی تاقیگا"و لەراستیدا ﴿پراگماتیزم﴾ "هاوتای پیشەسازی تازەیە کە کارخانە بە نمونەی ژیانی مرۆڤ دەزانێت". هۆرکهایمەر دەیگوت پراگماتیزمی جۆری ئەمریکی دیدی پۆزەتڤیزمی باڵادەست و "دەسەڵاتی سانسۆرکردنی" بە زانستەکان دەبەخشێت و "بنەمای کارخانەی تایبەت بە ئەندامانی یانە، بەسەر جیهانی بیرکردنەوەدا" گشتگیر







﴿تعمیم﴾ دەکات. ئەو والابوونەی پراگماتیزم پێوەی دەنازێت، هیچ نیە جگە لەڕەهایگەری ﴿مگلق گرایی﴾ فکری فەلسەفە پۆزەتفیسمەکانی دی. "لەرویەکیشەوە دۆگمایبوونی ناعەقلانی کەنیسە، عەقلانیترە لەرێبازێکی عەقڵی گەرموگوڕی لەمچەشنە کە لەعەقلانیەتی خۆشی زیاتر دەڕوا"(٢٧).

هۆرکهایمەر بڕوایوابوو پۆزەتڤیزم بە جلوبەرگی هەنووکەییەوە، پڕ یەکێ لەنیشانەکانی "بێتوانایی" گشتی و کلتوورە تا هۆکارێکی چارەسەرکردن. "رۆحی بابەتی"-واتە ئەو رۆحەی بەسەر "سەرجەم مەسەلەکانی ژیانی کۆمەڵایەتیدا" باڵادەستە- پەرستشکەری "پیشەسازیو تەکنەلۆژیاو ناسیونالیزمە، ﴿بێ ئەوەی خاوەن﴾ هیچ بنەمایەك بێ کە بتوانێت مانایەك بەم وتەزایانە ببەخشێت" و نیشانەی "گوشاری سیستەمێکی ئابووریە" کە هیچجۆرە "کەمکردنەوە یان راکردنێك" لەحوکمەکانی مومکین نیە.

سوودوەرگرتن لەجیهانی سروشت کەمکەم بە پلەیەك دەگات کە وێنای هیچ ئامانجێکی عەقڵی و لێرەوە هیچ سنوورێکی بۆ ناکرێت. ئەم جەختکردنە لەسەر جیاوازی نێوان مرۆڤ و سروشت- لەسەر دەسەڵاتی بێوێنەی جۆرێك گیاندار بەسەر هەموو رەگەزەکانی تردا- رەگەزێکی تازە بوو لەبیرکردنەوەی هۆرکهایمەرو ئادرنۆدا. رەگەزێك کە نەك هەر لەسەرتاسەری زۆربەی بەرهەمەکانیان لەقۆناغی نیشتەجێبوون لەئەمریکادا دەبینرا، بەڵکو بیست ساڵ دواترو لەکۆتاییەکانی دەیەی ١٩٦٠ بە هوشیاربوونی خەڵك لەواقعی ژیانی ژینگەی، راستی خۆی بەسەرکەوتوویەوە سەلماند(٢٨).

لەم ماوەیەدا ئادرنۆ سەرقاڵی نوسینی کتێبێك بوو کە تەنانەت زۆرتر لەبەرچاو ون بووبوو. ئەم کتێبە بەناوی ئەخلاقی بچوك لە١٩٤٤ وە تا ١٩٤٧ پارچە پارچە پۆلێنکراو دواجار لە١٩٥١دا- ئەویش تەنها بەزمانی ئەڵمانی بەچاپ گەیەندرا. ئادرنۆ بەبۆنەی پەنجاهەمین ساڵی لەدایکبوونی هۆرکهایمەر بەسەرنجدان لەوەی بەرپرسیاریە رێکخراویەکانی هاوڕێکەی لەپرۆژەی "لێکۆڵینەوەی لەبارەی پێشداوەریەوە" کارە هاوبەشەکانی نێوانیانی وەستاندبوو، بڕیاریدابوو کاتی خۆی بۆ بیرکردنەوە تایبەتیەکانی خۆی بەشێوەیەکی کاتی رێکبخات. لێرەوە کتێبەکەی "بە سوپاس" و "وەفاداریەوە" بێ ئەوەی ناوی خێزانی بهێنێ پێشکەش بە "ماکس"

کردبوو. ئەخلاقی بچوك بەپێی وتەی ئادرنۆ خۆی، جۆرێك وتوێژی دەروونی بووdialogve interieur. ئەو دەستەواژەو زاراوە فەرەنسیەکانی لەسەرتاسەری کتێبەکەدا بلاوبوونەوە، باسی لەقەرزاری نووسەر دەکرد بەرامبەر نەریتی فەرەنسی دەربڕینی بابەتەکان لەقالبی وتاری کورت و وشەگەلی کورت کە نیتچەش سودی لێوەرگرتبوو. هێڵی سەرەکی ﴾کتێبەکە﴿- ئەگەر لەبنەڕەتدا بشێ بڵێین هێڵێکی سەرەکی تێدایە- هەمان ژیان "ژیانی پێگەیشتوو" بوو کە لەناونیشانی فەرعیی کتێبەکەدا دەبینرا. ئادرنۆ روونیدەکردەوە کە رۆشنبیرانی کۆچکردوو ناسینێکی بەتایبەتی دەردناکیان لەم بابەتە هەیەو هەموویان بەدەر لەوەی ئاگایان لێبێت یان نا، زیانیان پێگەیشتووەو باشتر وایە دان بەم راستیەدا بنێن "بەر لەوەی لەپشت دەرگا داخراوەکانی کەرامەتیانەوە بێ بەزەییانە زیاتر تیایدا فێربین". رۆشنبیری کۆچکردوو چەندیش لەپیشەکەی خۆیدا یان لە لێخوڕینی ئوتومبێلدا هەست بە ئارامی دەسەلات بکات، دیسان هەر هەمیشە بەهەڵەدا دەچێت. تەنها شتێك کە یارمەتی دەدات "دیاریکردنی نەگۆڕی ئازاری خۆیو ئەوانی دیە". بە شیکردنەوەیەکی لەمچەشنە لایەنیکەم دەتوانێت لە"کوێربوونی" خۆی سەبارەت بە بەدبەختی خۆی، رزگاری بێت، ﴾لێرەدا﴿ ئادرنۆ قسەیەکی "برادلی" کە فەیلەسوفێکی هیگڵی سەر بە رەوتی ئینگلیزیە دەهێنێتەوە کە گوتبووی "لەجێگەیەکدا کە هەموو شتێ خراپە، بێگومان ناسینی و زانینی خراپترین باشە".

ئادرنۆ کە پلە بە پلە زیاتر قووڵایی رەنج و دڵەڕاوکێی خۆی دەپشکنی، وشەیەکی تازە دەهاتە ناو زمان و زاراوەکانیەوە، ئەم وشەیە "نەجات"ە یان بە ئەڵمانی Erlosung کە هەڵگری هەندێ مانای دینی مەسیحیە و لەسەرەتای ئەخلاقی بچوکدا بەکارهێنرابوو. لەوێدا نووسەر گوتبووی دەمەوێ بەناوی﴾ئەو شتەدا بگەڕێم﴿ کە رۆژگارێك بواری راستەقینەی فەلسەفە بووەو بەڵام هەنووکە "بیرچۆتەوە" و کەس بایەخی پێنادا. واتە بەناو "رێساکانی راست ژیاندا" بگەڕێم و لێی بکۆڵمەوە. دەیگوت چەندان ساڵ بەدوای رێسای لەمچەشنەدا بەناو کوێرەڕێی پێچاوپێچ و ناهەموارو چۆڵەکانی بیرکردنەوەی قووڵی خۆمدا هەنگاوم ناوەو سەرئەنجام بەم بڕوا پتەوە گەیشتووم، کە فەلسەفە بەرپرسیارە مەسەلەکان لەبەردەم نائومێدیدا "لەڕوانگەی نەجاتەوە" بخاتە ڕوو. لەمڕووەشەوە ئیدی "





بەگشتی مەسەلەی واقعیبوون یان واقعی نەبوونی" نەجات " گرنگ نیە"(٢٩).

★ ★ ★

ئادرنۆ هۆرکهایمەر بەرلەوەی بەرپرسیاریە نەگونجاوەکانیان لەیەکیان جیابکاتەوە، هاوکاریان لەنویسینی کتێبێکدا بەناوی "دیالەکتیکی رۆشنگەری"ەوە کردبوو. ئەم کتێبە بە ڕۆیشتنیان بۆ کالیفۆرنیا لە١٩٤١دا دەستی پێکردو لە١٩٩٤دا تەواو کرا، لوتکەی کاری فکری هاوبەشی نێوانیان بوو، لەهیچ کتێبێکی تریاندا ئەوەندە وێنایەکی ڕوون لەبارەی دوورترین ئاسۆ فکریەکانیانەوە نەدەبینرا. دیالەکتیکی رۆشنگەری بەردەوامی مەسەلەکانی لەو جێگەیەوە دەست پێدەکرد کە لەوتارەکانی دەیەی ١٩٣٠ وازی لێهێنرابوو. ﴾کتێبەکە﴿ بێ هیچ تێبینیو چاوپۆشینێك ئەو پێشگریمانانەی ئاشکرا دەکرد کە ژێرخانی کەسایەتی دەسەڵاتخواز و عەقڵ گیران بوو، بەڵام بەنیوە شاراوەیی مابۆوە و دواجار کلیلێکی بۆ کردنەوەی مەبەستە سەرەکیەکانی نووسەرانی بە دەستەوەدەدا. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا کتێبەکە لەپانزە ساڵی یەکەمدا تەنها لەناو هەندێ ناوەندی بچوکی پسپۆڕان و ئارەزومەنداندا ناسراو بوو، پاش چاپی ئەڵمانی لە١٩٤٧ لەئەمستردام هێشتا تا ١٩٦٩ کە لەئەڵمانیادا دووبارە چاپکرایەوە و تا ١٩٧٢ کە بۆ ئینگلیزی وەرگێڕا، لەبەردەست هەمواندا نەبوو.

مەحاڵ بوو لەخودی دەقەکەوە دیاری بکرێت کە کام بەشانە کێ نوسیوێتی. بەپێی ئەو رونکردنەوەی خۆیان داویانە "بەشێکی درێژیان پێکەوە داڕشتووە" بەڵام خوێنەر دەیتوانی هەستبکات کە لەهەر جێگەیەکدا پەخشانەکە وەك کۆتەکێك دێتە خوارێ، کاری هاوکارە پیرترەکەیەو لەهەر جێگەیەکیشدا ئاڵۆزو پێچ و پەنای تیایە نیشانەی هۆشیاری وردبینی و ناسکی ئادرنۆی تیا بەدی دەکرێت. کتێبەکە بەشێوەی زنجیرەیەك وتاری پێکەوە گرێدراو، رێك و فەسڵبەند کرابوو: سەرەتا باسێك لەبارەی چەمکی رۆشنگەری، پاشان رۆیشتن بۆ لای هومیرۆسو رۆیشتنێکی دی بەلای "دۆساد"دا، دوایی بەڵگە دوورو درێژەکانی بابەتە سەرەکیەکەو وەرگێراو لە"پیشەسازی کلتوور" و دژایەتیکردنی یەهوودەوەو دواجار بۆ کاملکردنی هەموو﴾ئەمانە﴿ کۆمەڵێك "یاداشت و پێشەکی" کە بەباشی دەیتوانی لەئەخلاقی بچوکدا جێگەی بێتەوە. بەڵگە هێنانەوەیان هەندێکجار دووبارەبوون، بەڵام

کاریگەریەکی کەڵەکە بوویان دروستدەکرد. تێڕوانینی نوسەرەکان سەبارەت بە مەسەلەی یەهوودیەکان زۆر رەنگی سەلیقەیەکی شەخسی هەبوو و زۆربەی ئەو مەسەلانەشی تەفسیر دەکرد کە لەکەسایەتی دەسەڵاتخواز دا بووبووە هۆی سەرگەردانی و تەنهاش بەسەرنجدان لەو رەخنانەی کە پێشتر ئاراستەی کەسایەتی دەسەڵاتخواز کرا، قابیلی تێگەیشتن بوو.

ئامانجی هۆرکهایمەر و ئادرنۆ وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارە بوو کە "بۆچی مرۆڤ لەجێی چوونەناو هەلومەرجێکی بە ڕاستی مرۆڤانەوە، لەجۆرێکی تازەی بەربەریەتدا غەرقبووە بەتایبەتی بۆچی رۆشنگەری تەسلیمی "خۆوێرانکردن" بووە. مەبەستی نوسەران لەرۆشنگەری شتێکی فراوانتر بوو لەبیرکردنەوەی پێشکەوتووخوازانەی سەدەی هەژدە. مەبەستیان سەرجەم پرۆسەی عەقلانیکردن یان "ئەفسانە داماڵین" لەجیهانی مۆدێرن بوو، کە سنوور و نەریتەکەی لەلایەن ماکس فیبەرەوە بەشێوەیەکی نەمرو فەرامۆشنەکراوە، دەست نیشان کرابوو. هۆرکهایمەر و ئادرنۆ دەیانگوت رۆشنگەری هەوڵیدابوو ئەفسانەکان لەناو ببات، بەڵام لەئەنجامدانی ئەمکارەدا خۆی بووبوو بە ئەفسانەیەك، ئەفسانەی "روونی درۆزنانە" بەپێی نووسینی ئەوان "تەنها شێوەی بیرکردنەوە کە بۆ تێکشکاندنی ئەفسانە "دەبێ ئەوەندە پتەو پۆلایین بێت" دواجار بەشوێنێك گەیشت کە شمشێری بەڕووی خۆیدا راکێشا. کەوابوو ئەرکی رۆشنبیری هاوچەرخ ئەوەبوو کە بۆ ئەوەی نەهێڵێ راستەوخۆ خیانەت لەمرۆڤەکان بکرێ، بەهۆی تێفکرینی دووبارە لەبارەی چەمکی رۆشنگەریەوە "ئومێدەکانی رابردوو" نەجات بدات(٣٠).

هۆرکهایمەر و ئادرنۆ بڕوایانوابوو رۆشنگەری بەپێی گشتیترین دەرکەوتەکانی جگە لەدەستکەوت و دەست بەسەراگرتن زیاتر نیە. ناسین بەپێی زمانی دەربڕینی زانستی –پۆزتفیزمی بەمانای دەست بەسەراگرتنی شتەکانە. "تەجرید، ئامێری کارکردنی رۆشنگەریە"و لەکاتی تێگەیشتنی شتەکاندا، بابەتەکانی کاری خۆی لەناودەبات. زاراوە سادەو زبرەکانی واقعیەتی دەسەڵاتی ئاشکرا دەکات. سەرتاسەری جیهان دەگۆڕێ بۆ "یەك حوکمی شیکاری دێوئاسا" کە "دراوە سادەکان" ﴿یا واقعیەتە سادەکان﴾ بە "موڵکی ڕەوای پیرۆز"﴿دادەنرێن﴾ و بەدوور لەکاریگەری رەخنەگرتن دادەنرێن(٣١).





هەموو ئەم باسانە لەبەرهەمەکانی تری هۆرکهایمەرو ئادرنۆدا دەدۆزرایەوە، بەڵام هەرگیز چ پێشترو چ دواتر، ئەم دەربڕینە سەرسەخت و سازش نەکەرەی وەرنەگرت. جگە لەمەش ئەو دوو تێپەڕینەوەی کە راستەوخۆ پاش پێشەکی دەهات، کتێبەکەی بەشێوەیەك هەنووکەیی دەکرد کە بە دەگمەن لەتیورەی رەخنەگرانەدا دەبینرا. لەتێپەڕینی یەکەمدا چیرۆکی تێپەڕینی ئۆدیسۆس بەکەشتی لەبەرامبەر دورگەی سێرینەکاندا دەهێنرایەوە. هۆرکهایمەر و ئادرنۆ ئەم ئەفسانەیەی هۆمیرۆسیان بە"نمایشێك بۆ وەسفی دیالەکتیکی رۆشنگەری" گۆڕی بوو. ئۆدیسۆس بەباشی هوشیاربوو بەئەفسوونی ئاوازی سێرینەکان، لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا دەیویست گوێی لەو ئاوازە بێت. لەبەر ئەوە فەرمانیدا کە بە ستوونی کەشتیەکەوە بیبەستنەوەو سەوڵ لێدەرانی –واتە هەمان "پرۆلیتارە نەرمو سازش کەرەکان"-بە چاوی بەستراوەو بێئاگا لەهەموو شتێك و بێماندوویی، سەوڵ لێبدەن و لەمەترسی تێپەڕن. ئەزمونی دوایی مرۆڤیش بەمشێوەیە بوو "زۆربەی مرۆڤەکان بێبەشکرابوون لەناسینی جوانیو خۆشەویستیو کەمایەتیەکیش کە خاوەن مافی ڕابەریکردنە "بە بەهای سووکایەتی پێکردن و کوشتنی غەریزەی داخوازی خۆشبەختی کامڵ و یەکپارچەو گشتی ﴿واتە بۆ هەموان﴾ بەو مافە گەیشتبوون. مێژووی شارستانێتی، مێژووی "دەسەڵاتی مرۆڤ بوو بەسەر خۆیدا" و "مێژووی نکوڵیکردن بوو لەخود"(٣٢). هۆرکهایمەرو ئادرنۆ بڕیاریاندابوو بەهەموو لێهاتووی خۆیانەوە لەدیالەکتیکدا، لەبەرامبەر ئەو شتەدا ڕابوەستن کە ماکس فیبەر بەناچاری ملی بۆ داو فرۆیدیش لە"شارستانیو ناخوشنودیەکانیدا" بە بەهای حەتمی کۆنترۆڵکردنی غەریزەی وێرانکاری مرۆڤی لەقەڵەمدا بوو.

لەدووهەم تێپەڕیندا مارکس دۆساد دەناسێنرا، بەڵام نەك بەو شێوەیەی کە چەند ساڵ دوای ئەوە ئالبێر کامۆ وەك پێش نموونەی ئەشکەنجە لەئوردوگاکانی مەرگدا ناساندی. بەڵکو وەك بەرجەستەکردنی بیرکردنەوە وروژێنەتری (تاکە کەسی بورژوازی رزگاربوو لەبەرپرسیاری". هۆرکهایمەر و ئادرنۆ دەیانگوت بزوتنەوەی رۆشنگەری سەدەی هەژدە توانای دۆزینەوەی بنەمایەکی بۆ داوەری ئەخلاقی نەبووە. رەنگە تیورەیەکی گشتی "سەقامگیرو هاوڕێك"ی هەبوو بێت، بەڵام کاتێك ویستی فۆرمەلەی "تێزە ئەخلاقیەکان" بکات، تەسلیمی پڕوپاگەندەو هەستی





رووکەشی بوو. تەنانـەت کانـت سـەرەڕای ئـەو وردبـینیو وریاییـەی لـەم مەسـەلەیەدا بەکاریهێناو لەگەڵ بوونی ئەو دەرئەنجامە "بالاو نزیك لەپارادوکسە"ی بەدەستیهێنا، لەهەوڵی ئەوەدا کە ئەرکی ڕێزی دوولایەنە لەیاسای عەقڵەوە بـەربهێنێت (ئیـستنتاج بکـات)، سـەرکەوتوو نـەبوو. میراتـی کانـت و هـاوبیرە عەقلانیـەکانی میتۆدەکـەی بـۆ ڕێکخستنی بورژوازی سـەدەی نـۆزدە شـتێکی سـەروو ئـەمری واقـع و هاوپـەیمانی یـان نەریت نەبوو. ئەوەی پەردەی لەسەر ئەمە هـەڵماڵی نیتـچە بـوو "کـە بـە هـەر چـوار دەوردا بە تەپڵ و زوڕناوە رایگەیاند کە مەحاڵە" بەپێی بنەمای عەقڵ (بەو مانایەی هاوچـەرخانی بەکاریانـدەهێنا) "هیـچجۆرە بەڵگەیـەکی بونیـادی بـۆ ڕەتکردنـەوەی پیـاوکوژی" بهێنرێتـەوە. نیتـچە بـەمکارەی خۆشـبینی ئـەخلاقی ساویلکانەو ئاسـانی بورژوازیو "دڵنیاییەك" کە "تەنها لەدووی دڵنەوایکردنە" ڕەتکردەوە. بەدەر لـەوەی مەبەستی هۆرکهایمەر و ئادرنۆ لەزاراوەی "نـەجات" چـی بـوو- زاراوەیـەك کـە هـەروا لەناو ئاڵۆزیدا ونبوو- بەڵام بێگومان دڵنەوایی یەکێك لەرەگەزو بەشەکانی نەبوو. بـە بـڕوای هـەردووکیان ئـەو "تێـزە بـێ بـەزەییو بـێ لێبوردنـەی" کـە رایدەگەیانـد ڕۆشنگەری جگە لەدەسەڵاتگەری هیچی دی نیە، بالاتر بوو(٣٣).

ئـادرنۆو هۆرکهایمـەر بـە ئانقەسـت باسـی کلتـووری مێگـەلیان وەك پیـشەسازی دەکرد، بـۆ ئـەوەی بڵێن کـە لایـەنی جـەماوەری بـوونی(کلتـوری مێگـەلی)، درۆزنانـەو دروستکراوە(٣٤) و نەك هەر بە هـیچ شـێوەیەك دیمـوکراتی نیـە، بـەڵکو ئاشـکراکەری واقعی دەسەڵاتخوازیە. ئەوان بڕوایانوابوو کە بەرهەمە هونەریە مەزنـەکانی رابـردوو بەرجەسـتەکردنی "هەقیقـەتێکی نیگـەتیڤ" بـووە و مۆسـیقای کلاسـیك بنـەماو ڕێـساکانی "شـێوازێکی بـێ کـەموکووڕو نزیـك لەکـەماڵیان" تـاقیکردبۆوە، بـەڵام پیشەسازی کلتووری هاوچـەرخ هونـەر بـۆ ئاسـتی "تەقلیـدێکی رەهـا" دادەبـەزێنێتو هەمان مۆر لەهـەموو شـتێکدەدات" و بـە وازهێنـان لەتراژیـدیا دەیـەوێت خـۆراك بـە هـەموان بگەیـەنێتو لـەڕووی "سـەرگەرمیە"وە ئامێرگـەلێك ئامادەبکات کـە "مـرۆڤ گاڵتـە بـەخۆی بکـات" و "دژێـك Purody لەمرۆڤایـەتی دابتاشـێ"(٣٥). لێـرەدا بـە ئاشـکراترین شـێوە کاریگـەری نیـشتەجێبوونی هۆرکهایمـەرو ئـادرنۆ لەئـەمریکادا بەرچاو دەکەوێت. لەو ماوەیەدا کە هەردووکیان دیالەکتیکی ڕۆشـنگەرییان دەنووسـی لەنزیك هالیودەوە دەژیان و لەگەڵ هەنـدێ کۆچـکردووی ئەڵمانیـدا هاتوچۆیاندەکرد







کە پەیوەندیان بە پیشەسازی فیلم دروستکردنەوە هەبوو. لەم هەلومەرجەدا ئاسایی بوو کە سینەما بە باشترین نمونەی ناچارکردنی شاراوە دابنێن کە "دنیـای ژیـانی بـە بەڕێوەبەرایەتیکراو ﴿مدیریت شدە﴾" لەسەر بناغەی دامەزراوە.

پیـشەسازی کلتـوور چـۆنێتی گـۆڕینی ڕۆشـنگەری بـۆ هەڵخەڵەتانـدن ﴿یـان فێڵکـردن﴾ ئاشـکرا دەکـردو، دژایـەتیکردنی یـەهوودیش دەریدەخـست. باسـی هۆرکهایمەرو ئادرنۆ لەمبارەیەوە نەك تەنها ناسکترین، بەڵکو وروژێنترین باسێك بـوو کـە لەقەڵـەمی کـۆچ کردووەکانـەوە دەڕژا. لـەڕووی توانـای خۆهەڵکێـشانیش ﴿عـرچ ئەنـدام﴾ لەبەرامبـەر بـڕوا بـێ دەردەسـەریەکانی ڕۆشـنبیرانی لیبرالـدا، تەنانـەت لەباسـەکانی "هانـا ئارنـت"یـش تێدەپـەڕی. نـاوەڕۆکی بەڵگەهێنانـەوەکانی فەیلەسـووفانی فرانکفـۆرت ئـەوە بـوو کـە تاکەکەسـی بـورژوازی ساویلکەو پابەنـدی نەریتـەکان، لەبـەر هـۆی "بـەهێز" وئەگەرچـی دان پیانـەنراو، رقـی لەیەهوودیـە. یەهوودی تەنها بەپێی بوونی خۆی داخی هاوشاریەکانی تـازە دەکاتـەوە کـە دەبیـنین لەئەنجامی دەسەڵاتکردن بەسـەر خۆیانـدا چ شـتگەلێکیان لەدەسـتداوە. یـەهوودی بـە حـوکمی جێگـە پەراوێزیەکـەی خـۆی، بیرهێنـەرەوەی ئـەو توانایانـە دەبێـت کـە مرۆڤەکان کاتێك واز لەماڤی خۆشبەخت بـوونی خۆیـان دەهێـنن، لەدەسـتیان دەچـێتە دەرەوە. "لیبرالیــزم ڕێگــەی موڵکیــەتی بەیەهوودیەکانــدا، بــەڵام توانــای فــەرمانڕەواییکردنی پێنــەدان". لـەجێی ئـەوەی دەسـەڵاتیان بـداتێ لـە"نمـایش و دەرکـەوتن"دا ئـازادیکردن، واتـە هـەمان ئـەو کـارەی کەئـەوانی دی خۆیـان لـەکردنی دەپاراسـت، هـەمان "دەنگدانـەوەی دەردنـاکی هێزێکـی بـالاتر.. کـە لەشـکاتکردندا دەردەکەوێت". ناڵەو گریانی هەمیشەیی یەهودیەکان، وەك گریان و پاڕانەوەی ژنانە. چونکە هەردووکیان لەو روەوە کە "هەزاران ساڵە" لەفـەرمانڕەوایکردن بێبەشبوون، لەبـەر "تـرس و لاوازی" "نزیکـی خۆیـان لەسروشـتەوە کـە پـەنای هەمیـشەیی سـتەملێکراوانە" بـەردەوام پاراسـتووەو بـیرەوەری "خۆشـیو خۆشـبەخت بـوونی بـێ دەسەڵاتیان" بە زینـدووی هێـشتۆتەوە. بـۆ ئـەو کەسـانەی کـە نـە یـەهوودی بـوون و نـەژن، تەنانـەت بـیری ئـەمجۆرە "خۆشـیە راسـتەقینەیە" تەحـەمولناکرێت. لێـرەوە کاتێك یەکێکی نازی لاسایی یەهوودیەکان دەکاتەوە، لەراستیدا ئەو حەسرەتەی کە بۆ ژیـانێکی سروشـتیترو ئـازادتر بـۆ دەرخـستنی پێکهێنـەرەکانی ویـژدانی لەدڵیـدا بـووە

بەڵام سەرکوتیکردووە، لەقاڵبی دوژمنێکی خەیاڵی خۆیدا دەکاتە دەرەوە(٣٦).

کەوابوو دژایەتیکردنی یەهوود لەحەقیقەتدا هیچ نەبوو، جگە لەدیارترین دەرکەوتەی هەمان ئایدۆلۆژیای هیومانیزم دامالین، کە رۆشنگەری بۆ ئاستی دابەزیبوو. بەڵگە بوو بۆ ئەوجۆرە "میکانیزمە کۆمەڵایەتیانەی" کە ئەزموونی تاکەکەسەکان بە تەنیایی، لەگەڵ یەهودیەکاندا بە تەنیایی هیچ رۆڵێکی تیا نەبوو." چۆنایەتی "هەموو ﴾شتێک﴿ یان هیچ"ی ئەو هەڵسەنگاندنانەی دەرئەنجامی دژایەتیکردنی یەهوودی بوو، بێئاوارتن (بێ ئیستسناء) "بەڵگەی بیرکردنەوەیەکی قاڵبیبوو". ئالێرەدا ئاشکرا دەبوو بۆچی دژایەتیکردنی یەهود ئەوەندە رۆڵێکی بەرجەستەی لەکەسایەتی دەسەڵاتخوازدا بینیبوو. هۆرکهایمەرو ئادرنۆ بەو ئەنجامە گەیشتبوون کە دژایەتیکردنی یەهوود روونترین بەڵگەی مومکینە بۆ رەفتاری بلیتی Behavior -tickft واتە ئارەزومەندی بۆ قبوولکردنی سەرلەبەری هەر بەرنامەیەک بێ جیاوازیو جیاکردنەوە کە نەک هەر خەسڵەتی کەسانی ئارەزوومەندی دەسەڵاتخوازیە، بەڵکو خەسڵەتی قوربانیە ئاساییەکانی ژیانی بە بەڕێوەبەرایەتیکراوە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا خودی ئەو راستیەی کە دژایەتیکردنی یەهوودی "تەنها وەک بەشێک لەبەرنامە ئەڵتەرناتیڤەکان" روویدەدا، ئومێدێکی بەهێزی" دروستدەکرد بۆ ئەوەی دواجار "رۆژێک..کەمکەم لەناوبچێت"(٣٧). دیالەکتیکی رۆشنگەری بەم تۆنە خۆشبین و پێشبینینەکراوە، کۆتاییدەهات.

کاتێک کتێبەکە لە١٩٦٩دا دووبارە چاپ کرایەوە، نووسەرانی رەوا بوو بڵێن بۆ پێشبینی لەناوچوونی لەسەرخۆی دژایەتیکردنی یەهوودی، راستیانکردووە. بەڵام ﴾لەپێشەکی چاپی تازەدا﴿ سووربوون لەسەر ئەوەی کە ورپاکردنەوەیان لەبارەی "گۆڕانی رۆشنگەریەوە بۆ پۆزەتفیزم" و هاوکات "بەیەک دانانی عەقڵ" لەگەڵ "مەسەلە زیانبەخشەکاندا بۆ رۆح"یش "بەتەواوی سەلمێنراوە". هۆرکهایمەرو ئادرنۆ لەبەرامبەر "جیهانێکی بە بەڕێوەبەرایەتیکراو"دا رووبەڕوبوون و تەنها دەیانتوانی خوازیاری "پشتیوانی لەپاشماوەکانی ئازادی" بن، هەرچەندە ئەم پاشماوەیە "لەبەرامبەر جوڵەی سەرەکی مێژوودا، بێچارەو کەنەفتەکار" بێتە پێشچاو(٣٨).





## ماکس هۆرکهایمەر و ئادرنۆ..سەرەتاکان پاش جەنگ

هۆرکهایمەرو ئادرنۆ سەرەڕای سەرسەختیو دوژمنایەتیان لەگەڵ کلتووری مێگەلی ئەمریکاداو وەفاداریان بۆ ئەوروپا، بەڵام بەو ئاسانیەی کە پێشبینیدەکرا، نەیانتوانی بڕیاری گەڕانەوە بۆ ئەڵمانیای پاش جەنگبدەن. کاری بەردەوامیان ﴾لەپرۆژەی﴿ "لەبارەی پێشداوەریەوە"، بووە هۆی ئەوەی ئارەزوویەکیان تیا دروستبکات بۆ لێکۆڵینەوە بە شێوازی ئەمەریکی کە برینی ئاسانەبوو. سێساڵ تێپەڕی تا یەکەم سەفەری هۆرکهایمەر بۆ زێدی خۆی روویدا. بۆنەی ئەم سەفەرە جەژنی سەد ساڵ دامەزراندنی پەرلەمانی فرانکفۆرت بوو. بەڕێوەبەری "دەزگای لێکۆڵینەوەی کۆمەڵایەتی" ﴾واتە هۆرکهایمەر﴿ پێشوازیەکی گەرمی لێکراوو زانکۆی فرانکفۆرتیش داوایان لێکرد، "دەزگاکە" دووبارە بگەڕێتەوە بۆ هەمان ئەو شارەی کە چارەکە سەدەیەک پێشتر تیای دامەزرابوو. جگە لەم ناسینە فەرمیەش، پێدەچوو نەوەی تازەی خوێندکارانی زانکۆ دەیانەوێت زیاتر شت بەتامەزرۆییەوە لەبارەی تیۆرەی رەخنەگرانەوە بزانن. ئەو وەرگرە خەیاڵیانەی کە هۆرکهایمەرو ئادرنۆ چەندان ساڵ بە ئەڵمانی بۆیان نووسیبوون، سەرئەنجام واقعیەتیان پەیدادەکرد. لە١٩٤٩دا کورسی مامۆستایی هۆرکهایمەر گەڕێنرایەوە بۆیو وانەکانی ﴾سخنرانی﴿ سەرکەوتنێکی بێوێنەیان بەدەستهێنا. یەک ساڵ دوای ﴾ئەمە﴿ "دەزگای لێکۆڵینەوەی کۆمەڵایەتی" -یان بە وتەی خوێندکارانی زانکۆ، "چاپخانەکەی مارکس"- لەفرانکفۆرتدا کرایەوە. ئەمجارە ئیدی ئادرنۆ بە بریکاری دەزگا دانراو پاش ماوەیەک کرا بە مامۆستای فەلسەفەو کۆمەڵناسی. ئەگەرچی ئەم دوانە لەماوەی دەیەی دوایدا چەندانجار بۆ وڵاتە یەکگرتووەکان چوون، بەڵام قورسایی چالاکیەکانیان بەتەواوی گواستبۆوە بۆ ئەملای ئۆقیانووسی ئەتڵەسی. "دەزگا"کە سەرکەوتنێکی بەدەستهێنابوو کە هیچ گروپێکی ئەڵمانی دامەزراو، بەدەستینەهێنابوو.. بەو مانایەی ماوەی نێوان کلتووری کۆماری ڤایمار و کلتووری سەردەمی پاش نازیزمی کە تازە دەژیایەوە، پڕکردبۆوە(٣٩).

لە١٩٥١دا هۆرکهایمەر بە سەرۆکی زانکۆی فرانکفۆرت هەڵبژێرا. هۆرکهایمەر یەکەم کەسی یەهوودی بوو کە بەم پایەو پلە بەرزە دەگەیشت. هەڵبژاردنی بە





دەنگی هاوکارانی، جگە لەوەی بەڵگەی کەمبوونەوەی دژایەتیکردنی یەهوودی بوو، هەروەها ئاشکراکەری جێگەی تازەی ئەو و ئادرنۆ بوو، وەك زینەتی کلتووری کۆماری فیدراڵی ئەڵمانیا کە هێشتا نەیدەتوانی لەجیهانی رۆشنبیریدا شانازی بە ژمارەیەکی کەمی ناوی درەوشاوە نەبێت، بەهیچی دیەوە بکات. پاش ئەوەی شەڕی سارد کەمێك خاوبۆوە، رەخنەگران سەرنجیاندا جۆرێك خۆپاراستنی ﴾احتیاگ﴿ ئایدۆلۆژی لەئاوازی رەخنەگرانەی فەیلەسووفاندا سەبارەت بە یەکێتی سوڤیەتو چین هەیە. بەڵام ئەم مەسەلەیە بە ڕاستی شتێکی تازە نەبوو. هۆرکهایمەرو ئادرنۆ بەردەوام جیاوازیان لەنێوان دیسپۆتیزمی ستالین یان ماو و ڕوانگەی خۆیان بۆ کاری مارکسیزمی دەکردو، لەزۆر زووەوە و تۆقاندنی کۆمنیستیان بەناوی ئازادیەوە، مەحکومکردبوو. ئەوەی لەبەرهەمەکانی دەیەکانی ١٩٥٠و ١٩٦٠ دا تازە بوو، ئەوە بوو کە هەنووکە دژایەتی خۆیان لەگەڵ پۆزەتڤیزمدا بەرەو مەسەلە دیاریکراو و هەستپێکراوەکانی ﴾مملوس﴿ میتۆدی زانستە کۆمەڵایەتیەکان دەبرد(٤٠).

ئادرنۆو هۆرکهایمەر هەمیشە لەڕابردوودا کاری خۆیان بەخەبات (لایەنیکەم) لەدوو بەرەدا دانابوو. بەڵام لەنیوەی دووهەمی سەدەی بیستدا سەرنجیان بۆ هەندێك جێگۆڕکێی هێزەکان لەبەرەی نەیاران ﴾مخالفان﴿ چوو. ئایدیالیزمی تەجریدی بەپێچەوانەی رابردووەوە چیدی دوژمنێکی بەهێز نەبوو. فەیلەسووفانی فرانکفۆرت بەهۆی پاشماوەی ئەو چۆڵەوانیە فکریەی دەرئەنجامی بێ بایەخبوونی بیرکردنەوەی باوی ئەڵمانی بوو، لەباشترین جێگەدا بوون بۆ ئەوەی ئەوشتانەی لەبارەی زانستە کۆمەڵایەتیە ئەزمونگەریەکانی ئەمەریکاوە دەیزانن، فێری خوێندکارانی پاش جەنگبکەن، بەڵام تەنها تا سنوورێك. هونەرە ئەمەریکیەکان ئەوەندە بەخێرایی ڕەواجیان پەیداکرد، کە هیچی نەمابوو بە تەواوی شانۆکە داگیربکەن و ئادرنۆو هۆرکهایمەریش فەرمانی راوەستانیاندا. هەستیانکرد ئەرکی سەر شانیانە رێسا بنەڕەتیەکانی تیۆرەی رەخنەگرانە بەشێوەیەکی کامڵتر دەرببڕن و دەستنیشانی بکەن کە ئەم تیۆرەیە لەچ روویەکەوە لەگەڵ بیرکردنەوە کۆمەڵایەتیەکانی دیدا دەگونجێتو لەچ روویەکیشەوە ناگونجێت. ئەمکارە بەشێوەیەکی سەرەکی کەوتە ئەستۆی ئادرنۆ. هۆرکهایمەر لەبەرپرسیارێتیە ئیداریەکانداغەرق و تەنانەت لەڕابردووش کەمتر دەینووسی. لەبەرئەمە هاوڕێ گەنجترەکە ناچاربوو لەدەمی





هەردووکیانەوە قسەبکات. ئەم کارەش ئادرنۆی گەیاندە پلەی پڕ بایەخترین و ناودارترین رۆشنبیر لەئەڵمانیادا. گێڕانەوەی دوورو درێژانەی ئەم دوا قۆناغەی ژیانی ئادرنۆ -واتە بیست ساڵ وتوێژ و وەڵامدانەوەی پاش جەنگ- لەتوانای ئەم کتێبەدا نیە. بەڵام پێویستە بۆ هەڵسەنگاندنی تیۆرەی رەخنەگرانە لەپاش دەرچوون لەگومناوی فکریو ونبوونی ئایدیۆلۆژی لەئەمەریکادا، بەکورتی باسی خەسڵەتەکانی بەرهەمەکانی ئادرنۆ لەم سەردەمەدا بکەین

★ ★ ★

لە١٩٦٦دا بەرگێکی گەورە بەناوی "دیالەکتیکی نیگەتیڤ"ەوە لەئادرنۆ بڵاوکرایەوە، کە زۆرکەس وایاندەزانی کۆکردنەوەو کورتەی فەلسەفەکەیەتی. ئەم کتێبەش دیسانەوە لەزنجیرەیەك وتاری درێژ پێکهاتبوو. نۆ وتاری رێکخراو و هەروەها پاکانەکردنی ئادرنۆ لەباوکە فەلسەفیەکانی بەتایبەتی لەنەریتی ئایدیالیزمی لەخۆگرتبوو، کە ئادرنۆ ئەگەرچی وەفادار مابۆوە بۆ زمان ودەربڕینی میتافیزیکی و نهێنیئامێزیان، بەڵام هەموو تەمەنی ﴾ئایدیالیزمی﴿ کردبووە ئامانجی هێرشەکانی. دیالەکتیکی نیگەتیڤ لەڕووی شێوازی نووسینەوە، گرانترین کتێبێك بوو کە ئادرنۆ تا ئەو رۆژە نووسیبوی. بەڵگاندنەکانی (ئیستدلال) نووسەر لەبری ئەوەی پێبەپێ هەنگاو بنێت "، بێوەستان و بەردەوام بە شێوەی کۆمەڵێك دەربڕینی دابڕاو بەرەو خوێنەر دەهاوێژرا. لەم دەربڕینانەدا هیچجۆرە ریتمێکی لۆژیکی بەرچاو نەدەکەوت" و وردیو ڕەوانی ڕستەسازیش، کەمی لۆژیکی پڕ نەدەکردەوە"(٤١). خودی ئادرنۆ دەیگوت کتێبەکەی بە پەیڕەوکردن لەنموونەی "دژە دراما anti-drama" یا "دژە پاڵەوان anti-hero" لەئەدەبیاتی هاوچەرخدا، جۆرێك "دژە سیستەم anti system" پێشکەشدەکات کە بە "هێزی" شتی زیهنی، "هەڵەی زهنیەت دەکوتێت"(٤٢).

"فەلسەفە کە رۆژگارێك بە بەجێهێڵراو ﴾متروك﴿ دەزانرا" بەردەوامی بەژیانیدا "چونکە ساتەوەختی جێبەجێبوونی ﴾یان بەواقعی بوونی﴿لەدەستچوو(٤٣).

بەم وشانە ئادرنۆ خوداحافیزی لەگەڵ کاری مارکسیزمیدا کرد، کە لەسەردەمی نائومێدیە گەورەکانی دەیەی ١٩٣٠دا بەردەوام لەدروستبووندا بوو. پرۆلیتاریا هیچ





سوودێکی لەمیراتی فەلسەفەی کلاسیك وەرنەگرتبوو کە مارکس و ئەنگلز مژدەیان دابوو، لەجێی ئەمە ژیانێکی بەڕێوەبەرایەتیکراو دروست بووبوو. کەوابوو فەلسەفە هێشتا هەر پێویست بوو، بەڵام فەلسەفەیەك کە لەسەرتاسەری پرۆسەی بیرکردنەوە لەقاڵبی چەمکە هەمەکیەکاندا، "ئەفسوون داماڵین" دەکات. فەلسەفەیەکی لەمچەشنە ئەگەرچی بەهیچ شێوەیەك خاوەنی چەمکێکی نەگۆڕ نەبوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هیچ لێکچوونێکی لەگەڵ ڕێژەگەری کارل مانهایم لەکۆمەڵناسیدا یان لە"بەرپرسیاری" خوازی سەقامگیری کەسێکی وەك سارتەردا نەبوو. ئادرنۆ ڕێژەگەری بە جۆری "گشتپەسەند"ی بیرکردنەوەی مادی دەزانیو ڕەدیدەکردەوەو بڕوایوابوو بونگەری ﴿وجودیەت﴾ بەشێوە فەرەنسیەکەی، وەك خودی سارتەریش دواجار دەستنیشانی کردووە، هێشتا "لەکۆت و بەندی ئایدیالزمدایە". نووسەری بوون و نەبوون ﴿واتە ژان پۆل سارتەر﴾ بە ڕاگەیاندنی چەمکی ئازادی ڕەهای هەڵبژاردن و بەپێچەوانەی نیەتی خۆیەوە، فەلسەفەی مەحکومکردبوو دوور لەعەقلانیەت بێت. تاکەکەس بە پێی تێڕوانینی سارتەر ناچار بەهەڵبژاردن بوو، بێئەوەی بزانێت چ شتێك بۆتە هۆی ئەو هەڵبژاردنە. بەڵام ئادرنۆ دەیگوت سارتەر دەبێت شانازی بەوەوە بکات کە لەشانۆگەریەکانیدا کە دەبوو بەرجەستەکردنی فەلسەفە ڕەسمیەکەی بن، پاڵەوانەکانی نەك وەك کۆمەڵی بکەری ئازادی، بەڵکو وەك زنجیرکراوەکان ڕەفتار دەکەن(٤٤).

بێگومان بوونگەرەکانیش ﴿وجودیەکان﴾ وەك ئادرنۆ بۆ هیگڵ و بە گشتی بۆ هیگڵی "فینۆمۆلۆژیا ڕۆح" گەڕابوونەوە. ئادرنۆ لەم دوا هەڵسەنگاندنەدا بۆ میراتی هیگڵ، نکوڵی لەقەرزاری خۆی بۆ هیگڵ نەدەکرد، بەڵام جەختی لەسەر ئەو لایەنانە دەکرد کە ڕەوتی دیالەکتیك لەبری ئەوەی لەو لایەنەوە ئیلهامی وەرگرتبێت، پێی سنووردار دەبوو. ئادرنۆ ئەم لایەنانەی بە تایبەتیی لەچەمکی هێگڵدا بۆ ڕۆحی جیهانی دەبینی و هەروەها لەتیۆرەی "ئەفسانەیی" (ئەگەرچی نادینیو دنیایی)ی "لۆژیکی دەروونی مەسەلەکان" کە هاوڕێ لەگەڵیدا ﴿واتە لەگەڵ چەمکی ڕۆحی جیهاندا﴾ دێت. ئادرنۆ دەیگوت دەرئەنجامی ئەم مەسەلەیە جەختکردن بووە لەسەر هەمەکیەکان ﴿کلیات﴾ بە بەهای فەرامۆشکردنی هەندەکیەکان ﴿جزئیات﴾..واتە جەختکردنی زیادەڕەویانە لەسەر شتێك کە دواجار بووە هۆی پەرەستنی کۆمەڵگا.







ئادرنۆ دەیگوت بە هۆی ئەمشێوە بەلگاندنەوە کەسێکی پۆزتڤیزمی وەك دۆرکهایم توانیویێتی ڕۆحی کۆمەلگای مرۆڤایەتی لەبری میتافیزیکی ڕۆحی جیهان دابنێت، و بەهۆیەوە بەسەر هیگڵدا سەربکەوێ. نووسەری فینۆمۆلۆژیای ڕۆح لە"پەروەردەی ساردو بێ چێژ، وەڕس" بوو، بەڵام لەفەلسەفەی مێژوودا کەوتە ناو هەمان ئەم هەڵانەوە کە پێشتر مەحکوومیکردبوون.﴾

هیگڵ بە پێداگرتن لەسەر جێگەی سەربەخۆی﴾ "ڕۆحی نەتەوەی" Volksgeist ڕەوایەتی بەخشی بە سەپاندنی دیسپۆنیزم بەسەر مرۆڤەکاندا و ئەمەش هەمان ئەو کارە بوو کە دواتر دۆرکهایم بەهۆی چەمکی "ڕێسا کۆمەڵیەکانەوە Collectivenorms" کردیو شپلنگەریش بەهۆی تیۆرەی "ڕۆح"ی هەر کلتوورێك. بەکورتی هیگڵ لەخەباتی مێژوونووسیندا لایەنی مەسەلە جێگرو نەگۆڕو یەکسانەکانی گرت، واتە ﴿لایەنی﴾ جۆرێك "هەمەکیەت totality" کە ڕزگاربوونی تیا بینیبوو، هەر لەبەرئەمەش تۆمەتی "میسیولوجیای مێژوو"ی بەسەردا دەسەپێت(٤٥).

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا ئادرنۆ نکوڵی لەوە نەدەکرد کە مێژوو ڕەوتێکی هەیە، و فکرو زیهنی فەلسەفیش توانای دیاریکردنی هەیە. بەڵام دەیگوت هیگڵ بەشێوەیەکی کۆنەپەرستانە سوودی لەوتەزای وەك ئازادیو دادپەروەری وەردەگرت، پێدەچوو ئادرنۆ سەرقاڵبوون بە فەلسەفەی تیورەی مێژووەوە بەکارێکی شایستە بزانێت، بەڵام بەدەرئەنجامگەلێکی جیاواز لەوەی لەخەیاڵی هیگڵدا بوو. چەند ساڵ پێش ئەمە ئادرنۆو هۆرکهایمەر لەیەك هەڵچوونی گەرموگوڕی هەستیارانەدا لەیەکێك لەپاشکۆکانی دیالەکتیکی ڕۆشنگەریدا نەخشەیەکی گشتیان لەدیدی خۆیانەوە بۆ ڕابردوو و ئایندە کێشابوو: لەمێژوودا بەمانا جدیەکەی، هەموو بیرکردنەوەو نەفیکردنەکانو ئاینزاو باوەڕە سیاسیەکان، تەنها تا ئەوکاتە سەرنج ڕاکێشەرن کە بتوانن ئومێدی سروشتی سەرکەوتنی مرۆڤ لەسەر زەوی یان جیهان، کەم یان زیادبکەن. عەقڵ ڕۆڵی یەکێك لەئامێرەکانی گونجاندن دەبینێت...مەکری عەقڵ لەگۆڕینی مرۆڤەکاندایە بۆ جانەوەرانێك کە خاوەن هێزی زیاترو بەربلاوترن، نەك لەدروستکردنی پەیوەندیەکی یەکسان لەنێوان بناس و بابەتی ناسیندا.

دەبێ تەفسیری فەلسەڤی مێژووی جیهان دەریخات کە دەسەڵاتی عەقلانی بەسەر

سروشتدا سەرەڕای هەموو لادانەکان و وەستانەکان، چۆن ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر سەردەکەوێت و سەرجەم خەسڵەتە مرۆڤایەتیەکان تێکەڵ بەیەك دەکات.. مرۆڤەکان یان یەکدی پارچە پارچە دەکەن، یان سەرجەم جانەوەرو گیاکانی گۆی زەوی لەگەڵ خۆیاندا دەبەن، و ئەگەر تا ئەو کاتەش زەوی بە پێی پێویست لاوبێت، ئەوا دەبێت هەموو شتێك لەئاستێکی زۆر نزمتردا، لەسەرەتاوە دەست پێبکرێتەوە"(٤٦).

کاتێك ئەم وشانە دەنووسران، هێشتا یەکەم بۆمبی ئەتۆمی نەتەقیبۆوەو هێشتا دوو دەیەی مابوو تا هەمووان بە مەترسیەکانی ژینگە هوشیاربن.

* * *

ئادرنۆ جگە لەوەی ڕێکخستن و دوا سیستەمی بە فەلسەفە فەرمیەکەی خۆی دەبەخشی، بە پێویستی زانی لەجلوبەرگی کۆمەڵناسیشدا کە بە تازەیی لەئەمەریکادا لەبەریکردبوو، دەست بە بەرگریکردن لەتیۆرەی ڕەخنەگرانە بکات و ڕوونیبکاتەوە. هەستی بەرپرسیاری فکری بەرەو ڕوبەڕووبوونەوەی وای رادەکێشا (لەوانە لەگەڵ کارل پۆپەر، شێواز ناسی زانستە کۆمەڵایەتیەکان) کە بەگەرموگوڕیەوە لەپێشەوە ڕێکدەخراوو خوێندکارانی ئەڵمانی هەمیشە چێژیان لێدەبینی. هەروەها ﴿ئەم هەستی بەرپرسیارە فکریە﴾ بەرەو هەڵسەنگاندنی دووبارەی "پۆزەتڤیزمە" بەرجەستەکانی وەك ماکس فیبەرو فینگشتاینی برد. وەڵامە باڵاکانی کە بەڵگەی بەرپرسیاری قوڵی فکری ئادرنۆ بوون، لەزنجیرە وتارێکدا لەبواری تیۆرەی کۆمەڵایەتیدا تۆمارکرا کە لەنێوان ساڵەکانی ١٩٥٥ و ١٩٦٦دا نووسراو بەزووی پاش مردنی بڵاوکرایەوە(٤٧). نیشانەکانی نیشتەجێبوونی ئادرنۆ لەوڵاتە یەکگرتووەکان لەهەموو شریتێکی ئەم وتارانەدا -لەوانە زاراوە ئینگلیزی و ئەمەریکیەکان کە لەداڕشتنەکانیدا پەرشوبڵاوبوون- بە ئاشکرا دەبینرا(٤٨).

سروشتی بوو کە لێرەشدا وەك رابردوو، پۆزەتڤیزم گرنگترین ئامانجی وەڵامەکانی ئادرنۆ بێت، بەڵام کاریگەری نیشتەجێبوونی دەساڵ لەوبەری ئۆقیانووسی ئەتڵەسدا، لێرەشدا ئاشکرا بوو. لەم زنجیرە وتارانەدا کە لەدەیەکانی ١٩٥٠ و ١٩٦٠دا نوسرابوون، داوەریکردن لەبارەی کەسەکانەوە، ناسکترو بە پێچ و پەناتربوو ﴿لەو﴾ وتانەی پێشووی فەیلەسووفانی فرانکفۆرت کە بە مەبەستی ڕاگەیاندنی بەرنامەی کارەکانیان ﴿دەیانگوت﴾، لێرەوە ئەگەرچی جەخت لەسەر ئەوجیاوازیە





قووڵەی بۆچوونی رابردوو لەسەر مەسەلەی بەها لەگەڵ فیبەردا دەکرایەوە، بەڵام ئەمجارە هاوڕێ بوو لەگەڵ ڕێزلێنانێکی تازەدا لەفیبەر. ئادرنۆ بڕوایوابوو چەمکی بەها لەئەخلاق و ستاتیکادا، لەنرخی ئاڵوگۆڕ لەئابووریدا وەرگیراوە. بە بڕوای ئادرنۆ سەرجەم ئەم مەسەلەیە وەك هاوسەنگیەك بوو، کە تیایدا کۆمەڵناسی ئامرازێکی یەدەکی ڕادەکێشاو و دەکرا وەلاوەبنرێت.

"دابەشکردنی دوالیزمی هەیەو دەبێت" نەك هەر "درۆ"، بەڵکو "لەڕووی مێژوویشەوە دەستوپێگیر" بوو. داوەریکردن لەبارەی هەرشتێکەوە "هەمیشە- بە ڕێگەپێدانی" خودی ئەو شتەوە ئەنجامدەدراو، بە پێچەوانەوەی بڕوای فیبەرەوە "هیچ بڕیارێکی ناعەقلانی لەلایەن بناسەوە" ﴿زیهن﴾ کۆی لایەنەکانی" نەدەگرتەوە. ئادرنۆ وەك دەکرا پێشبینیبکرێ ﴿بەمشێوەیە﴾ لەسەری دەڕواو دەیگوت کە ناسینی تەجریدیانەی کۆمەڵگا "تەنها دەشێ لەسەر تەوەرەی ئەم وێنایە ﴿تصور﴾ دروستبێت کە کۆمەڵگای پێکهاتە دروست، چۆنیە؟". ئەم ناسینەش سەرچاوە لەرەخنەکاری و "هوشیاری کۆمەڵایەتی لەدژایەتی و زەرووڕەت"ەوە وەردەگرێ. بەڵام ئادرنۆ لەگەڵ ئەم ڕەخنانەشدا قبووڵیدەکرد کاتێك سەیری نووسینەکانی خودی فیبەر دەکەین، دەبینین کە "ئاوێتەی جیاکاری بابەتیبوون و بەها ﴿واتە یان بابەتی یان بەها﴾ ی "مەرجدار" تر لەوە دەردەکەوێت کە بەپێی دروشمی کۆمەڵناسی مومکینە چاوەڕێیبکەین". بەرهەمەکانی فیبەریش دەتوانێت ببێتە بنەمایەك بۆ دووبارە بیرلێکردنەوە لەبارەی ئەو وتەزایانەوە کە وەك کۆمەڵێك دۆگما سەقامگیربوون"(٤٩).

ئادرنۆ هەر بەمشێوەیەش لەبارەی فینگشتاینەوە دانی بەوەدانا کە ئەو فەیلەسوفە ڤیناییە، لەتێڕامانیدا بۆ لۆژیك بەیارمەتی ئەو کەرەسە فکریانەی لەخودی لۆژیکەوە وەرگیراون، (ئازاری) کێشاوە. ئادرنۆ دەیگوت ئەم "بیرکەرەوەترین پۆزەتفیزمە" "هوشیاربووە بە سنوورەکانی لۆژیك" و بەمشێوەیەش بڵندی بەسەر ئەندامانی دی ئەڵقەی ڤینادا، سەلماندووەو گەیشتۆتە "بەردەرگەی هوشیاری دیالەکتیکیانە". بەڵام هوشیار نەبووە بەوەی هەر شتێك کە لەسنووری ئەزموونی حسی ڕووت تێپەڕی، خاوەن " خەرمانەیەکە لەدەستنیشان نەکردن ﴿عدم تعین﴾ و "هیچ شتێکی موجەرەد هەرگیز بەتەواوی ڕوون نیە" و هەر تەجریدێکی





لەمشێوەیەش "بەهۆی فرەیی ناوەڕۆکە مومکینەکانیەوە.. ناڕۆشنە"(٥٠) دیارە کورتەی قسەکانی فینگشتاینیش لە"لێکۆڵینەوە فەلسەفیەکاندا" لەمە زیاتر نەبوو، بەڵام پێدەچێت ئادرنۆ هەرگیز ئەو کتێبەی نەخوێندبۆوەو سەرچاوەکانی لەوتارەکاندا بە ڕوونی دەریدەخات کە تەنها فینگشتاین یەکەم و نووسەری "وتاری لۆژیکی- فەلسەفی" ناسیوە. کاتێك ئادرنۆ وا بەڕێزەوە باسی کتێبێکی دەکرد کە خودی نووسەرەکەی نیوەی پووچەڵکردبۆوە، ئەو پرسیارە دێتە پێشێ کە ئەگەر بەرهەمەکانی دوایی بناسیایە چی دەگوت ﴾کاتێك﴿ کە زۆربەی بابەتە دۆگمایی‌و سنوردارەکانی وتار تیایدا بەشێوەیەك پوختڕو وردترو لەدەقێکی تازەدا بەیاندەکرا. دەکرێ بەو ئەنجامەبگەین کە بە کەمتەرخەمی ئادرنۆ لەخوێندنەوەی لێکۆڵینەوە فەلسەفیەکاندا هەلێکی فکری مەزن لەدەستچوو، واتە ئەگەری هاوکاریکردنی دوو کەس لەباشترین بیریارانی سەدەی بیست بۆ دروستکردنی پردێك لەنێوان دوو نەریتی سەرەکی فەلسەفەدا، کە بەمەرگی فینگشتاین بە ناتەواوی مابۆوە.

ئادرنۆ مەسەلەکانی لەگەڵ نووسەری لێکۆڵینەوە فەلسەفیەکان بەشێوەیەکی کامڵ نەبڕانەوەو لێرەوە گەڕایەوە بۆ هەمان دیالەکتیك کە لەساڵەکانی نیشتەجێبوون لەئەمەریکادا بەدەست لێنەدراوی هێشتبوویەوە. ئادرنۆ رونیدەکردەوە کە ئایدیالیزم "رۆژگارێك لەڕابردوودا ستایشی تیورەسازی دەکردو مومکین بوو لەناوبچێت"، بەڵام ئەو "لایەنە"ی تیوری کە تیۆرەی رەخنەگرانە بەڵگەیەکێتی، بوونی هەروا پێویستە، بەبڕوای ئادرنۆ سەیرو لەوەدابوو کە ئەگەرچی پۆزەتڤیزمەکان تەسەوریاندەکرد شێوەی بیرکردنەوەی ئایدیالیزمیان بێبایەخکردووە، بەڵام لەبەر ئەوەی جەختیان لە"بکەری بناس" کردووە، ئەوا پتر لە ئایدیالیزمەوە نزیکتر بوون، تا لەبیریارانی تیۆرەی رەخنەگرانەوە. ئادرنۆ بەسەرسەختیەوە دەیگوت هەڵوێستی فکری ئەو سەرنج لەلایەنی واقعی و هەستپێکراوی شتەکان دەدا کە کۆمەڵناسی ناوەڕاستی سەدەی بیست لێی بێبەهرەیەو تەنانەت رستەسازیەکانیش ئەمە ئاشکرادەکەن. بۆ نموونە بەشێوەیەکی ئاسایی یاسا زانستیەکان بەمشێوەیە لەقاڵبی وشەکاندا دادەڕێژرێ کە "هەرکاتێ ئەلف، ئەوکاتە ب". بەڵام لەبیرکردنەوەی دیالەکتیکیدا قسە لەچوارچێوە مێژوویەکاندا دەکرێت،و مەسەلەکە بەمشێوەیە لەقاڵبی وشەکاندا دادەڕێژرێ "پاش ئەوەی کە ئەمە







روودەدات، ئەو شتە دەبێ پێویست ﴾لازم﴿ بێت". ئادرنۆ بڕوایوابوو تەنها شتێك پوزەتڤیزم قبووڵیبکات "دیاردە"یە، بەڵام پەیڕەوانی تیۆرەی رەخنەگرانە بڕوایەکی پتەویان بەوە هەیە کە لەژێر "دیاردە"وە شتێکی دی هەیە کە دەکرێت ناوی خود Wesen ی لێ بنێین، وتنی ئەم وتەزا تەقلیدترو تەجریدیترە لەهەموو شتێك، خۆی نیشانەی هەوڵێکە بۆ گەیشتن بەواقعێکی هەستپێکراو ﴾ملموس﴿ لەژێرو دوای دنیای دەرکەوتە رووکەشیەکان. ئادرنۆ روونیدەکردەوە کە جیاوازە یەکێك دیاردە مرۆڤایەتیەکان (وەك ئەو پەیڕەوانەی کۆمەڵناسی کە لەماکس فیبەرەوە سەرچاوەیانگرتووە) لەژێر وتەزای وەك "ئابڕوو" "بایەخ" و "پلەو پایە" و "پێگە"دا دابنێیت، یان (وەك خودی ئادرنۆ) هەوڵبدات ئەو دیاردانە لە"پەیوەندیە بەرجەستەکانی دەسەڵاتگەریەوە ﴾سلگهگری﴿ بەربهێنێت". ئادرنۆ بڕوایوابوو وتوێژ لەسەر هەڵبژاردنی فلان "دەزگای..."system of coordinates مومکینە " بەدوور لەبەهادانان" بزانرێت، بەڵام لەراستیدا پەیوەستە بە بناغەی تەسەورە جیاوازەکانەوە بۆ کۆمەڵگا، چونکە لەناو دەروونی شێوە بیرکردنەوەی "لۆژیکی- زانستی"دا، ناکۆکیە کۆمەڵایەتیە راستەقینەکان نابینرێن. لێرەشدا وەك وەڵامە رابردووەکانی ئادرنۆ و هۆرکهایمەر، دیسان هەموو شتێك دەگەڕێنرایەوە بۆ ئەم چەمکە هیگڵی-مارکسیە کە لەتەنیشت ئەو دراوانەی پەیوەستن بە ژیانی ئابووریەوە، هەقیقەتێکی شاراوە هەیە و"تەسەوری هەقیقەتی زانستی لەتەسەوری کۆمەڵگای راستەقینە جیانابێتەوە"(٥١).

★ ★ ★

هۆرکهایمەر لە١٩٥٨دا لەبەڕێوەبەرایەتی "دەزگای لێکۆڵینەوەی کۆمەڵایەتی" خانەنشینکراو لەو کاتەوە تاکاتی مردن لە١٩٧٣دا زۆربەی کاتەکانی لەبەشی ئیتاڵیایی سویسرادا و لەخانەیەکدا کە بەسەر دەریاچەی لۆگانۆدا دەیڕوانی، بردە سەر. بێگومان ئادرنۆ جێگەی ئەوی گرتەوە. بەڵام لەساتەوەختێکی سەختدا کە گوشاری باڵی توندڕەوی چەپی ئەڵمانیا، رۆژ بە رۆژ زیاتر دەبوو. تاکەکانی تازەترین نەوەی خوێندکاران، نە حسابیان بۆ فەیلەسووفانی فرانکفۆرت دەکردو نە هیچ تێگەتیشنێکیان بۆ سەختگیری‌و ناسکی فکری ئەوان هەبوو، ئەمجۆر نیگەرانیانەشیان بە خەسڵەتی بەشی باڵای چینی بۆرژوازی دەزانی. لاوە توندڕەوو تێکۆشەرەکان پاش

چەندجار داگیرکردنی بینای "دەزگا" لەنیسانی ١٩٦٩دا هێرشیان بۆ پۆلەکەی ئادرنۆ کرد. سێ کچی خوێندکار چوونە پێشەوەو سنگی خۆیان لەبەردەمیا رووتکردەوەو بە گاڵتەجاڕیەوە گوڵ و ماچیان بەسەر سەرا داباراندو پاشان بەهەمان بێ بەزەیی شێوەی هاوڕێکانیان، مەرگی ئەویان "وەك دەزگایەك" راگەیاند. گومانی تیانەبوو ئەم ڕووداوە جەزرەبەیەکی کوشندەی لەکەسێتیەکی ناسك و لاوازی وەك ئادرنۆداو ئیدی ئادرنۆ پاش ئەمە هەرگیز باش نەبۆوەو پاش پێنج مانگ بە هۆی جەڵدەی دڵەوە کۆچی دواییکرد(٥٢).

پاش مردنی ئادرنۆ خەڵکی لەدەرەوەی ئەڵمانیا، هێواش هێواش تێگەیشتن کە ژیانی فکری رۆژئاوا چ زیانێکی لێکەوتووە. بەڵام هۆی ئەمە هەندێکی لەئەستۆی خودی ئادرنۆ بوو کە سووربوو لەسەر ئەوەی بەزمانێکی "ئاڵۆزو رەمزی و دوور لەشێوە قسەی ئاساییەوە" بنووسێت. شێوازی فەرەنسایی نووسینەکانی پێشووی و هەروەها شێوازی ئەمەریکی لەبەرهەمەکانی پاش کۆچکردنەدا، کۆمەڵێك بەربەستی زمانی تایبەتی لەنووسینەکانیدا دروستدەکرد. بەڵام جگە لەمەش ئەو فۆرمەی کە بەئەنقەست لەنووسیندا هەڵیبژاردبوو "ئەوەندە وردەکاری هەبوو، ئەوەندەش لەسەر تەوەرەی وێنەی قسەکان دەسووڕایەوە کە دەگەیشتە ئاستی "ساختە (تصنع)" ی کامڵ، دیارە لایەنیکەم یەکێك لەخاوەن بیران بڕوایوابوو کە ئەم "چڕی"یا "گران"یە دەرکەوتی پێویستی "سەرسەختی" و "سازشنەکەری" فکری ئادرنۆ بوو. ئەو گوتوویێتی مەبەست لە"ژمارەی زۆری تەجریدەکان و گێڕانەوەکان" ﴿لەنووسینەکانی ئادرنۆ﴾دا "بە وردی ئەوە بووە.. کە ﴿ئەم شتانە﴾ بە بەراورد لەگەڵ ئاسانی موبتەزەلی" ﴿بابەتەکانی﴾ دەوروبەریان "بخوێنرێتەوە"و وەك "ئاگادارکردنەوەیەکی خوێنەر ﴿بوون﴾ سەبارەت بەو بەهایەی کە دەبێت لەپێناوی بیرکردنەوەی واقعیدا بیدەن". بەڵام رەخنەگرانی دی تەنانەت ئەوانەش کە ڕوانگەیەکی نەرمیان هەبووە، باسی ئەو دژایەتیەیان کردووە کە فەیلەسووفێکی ئەوەندە ئارەزوومەندی مۆسیقا، بە دارشتنێکی ئەوەندە بەتاڵ لەمۆسیقا قسەی نوسیووە. ئەوان هەروەها سەرنجیان لەوەداوە کە چەند جیاوازی هەیە لەنێوان ئادرنۆ وەك بەرگریکەرێك لەمرۆڤە ئاساییەکانی دیلی دەردو رەنج و "نەتوانینی ئادرنۆ لەهەڵکەندنی زرێیەك کە هیچکەس جگە لەکۆمەڵێك نوخبەی خوێنەران







توانای پشکنینیان نیە". ئەم "نەگونجانە لەنێوان شێوەو مانای پەیام"دا یەکەم گرفت لەو دوو گرفتە سەرگەردانکەرەیە، کە ئادرنۆ لەخۆی بەجێیهێشت(٥٣).

گرفتی دووهەم کە هۆرکهایمەریش تیایدا بەرپرسیار بوو، پەیوەندی بەوەوە هەبوو کە تاچەند فەیلەسووفانی فرانکفۆرت، پەیڕەوی لەفۆرم و شێوازی هیگڵ دەکەن. گومانی تیانەبوو کە لەوشەکان و رستەسازیدا، رەگیان بۆ ئەو قوتابخانەیە دەگەڕایەوە. سەرەڕای ئەمە دەبینرا کە بێ ئەوەی فشار لەخۆیان بکەن، بە ئاسانی لەفەلسەفەوە بۆ مێژوو یان ستاتیکا دەڕۆن و بە پێچەوانەوە، و لەمکارەشدا بە باشی سوود لەباشترین رەگەزەکانی ئەو بوارانە وەردەگرن و جگە لەمەش لەبواری تازەتری وەك دەروونناسیو کۆمەڵناسیشدا، دەستیان هەیە. تەنها لەئابووریدا بوو کە دەردەکەوت ئادرنۆ و هۆرکهایمەر پسپۆر نین تیایدا. فەیلەسووفانی فرانکفۆرت هەوڵیاندەدا لەبواری بەکارهێنانی میتۆدو دیالەکتیکیدا، لەتەسەوری گشتی دوور بکەونەوەو ئەوەی لەناو ئەم میتۆدە بە وشك و قاڵبیان دەزانی دووركەونەوەو وەك فینگشتاین لەچوارچێوەی پەیوەندیە دینامیکیەکاندا بیربکەنەوە، بەڵام لێرەشدا دیسان تا سنورێك. لەگەڵ ئەوەشدا کە زۆر شتیان لەقوتابخانەی هیگڵ و مارکس وەلاوە نابوو، و سەرەڕای تێگەیشتنە ئاڵۆزو فرە لایەنەی کە هەیانبوو، بەڵام هێشتا سەرسەختانە وازیان لەیەك لایەنی میراتی فەلسەفی خۆیان نەدەهێنا، واتە "بڕوای پتەو بەوەی دەکرێ "بونیادی گشتگیرو بونیادی بوون، بدۆزرێتەوە"(٥٤)...

**پەراوێزەکان:**


١- Bell, pp, ٢١-٢٥ Kornhauser, pp ٢٢, ٣٠, ١١٤-١١٥.

ئـەو نووسـینانەی کـە پەیوەنـدیان بـەم بابەتـەوە هەیـە لـە Munnvcci لێکۆڵراوەتەوە

٢- Shils, pp, ٢٤٩-٢٥٢.

٣- Jay (١٩٧٣), p. ١٦٦.

٤- Adorno (١٩٥١), p, ٦.

٥- Shils, p. ٢٥٨.

٦- Adorno (١٩٥٥)- English trans, pp, ٢٢-٢٣, ٢٣, ٢٤.

٧-لەبارەی سەرجەم ئەم بابەتەوە بگەڕێوە بۆ:

Lichtheim, pp, ٢ ١٩-٢١, ٣٨.

٨-وردو درشتی مێژووی ساڵە سەرەتاییەکانی دەزگاو ژیانی هۆرکهایمەرو ئادرنۆ بە دوورو درێژی لە(١٩٧٣) Juy (فەسڵی یەکەم)دا.

٩- Horkhimer (١٩٤٧). p. vil

١٠- Jur yen. Habermus in die zeit, september, ١٢ ١٩٦٩.

١١- Jay (١٩٧٣), pp. (٤١-٤٤); Horkheimer (١٩٦٢)- English truns, pp. ٦٤, ٧١.

١٢- Lichtheim, p. ١٤٠; Rusconi, p. ٢٤٥.

١٣-بگەڕێوە بۆ

Hushes, H, StuartConscidusess and society (New york, ١٩٥٨)

١٤- p. Horkhemer, Max, Eclipse of Reuson. ٥ (New york, ١٩٤٣).

١٥- Ibid, pp. ١٩١, ١٩٤, ١٩٧-١٩٩.

١٦- Ibid, pp, ٢٠٨-٢١١.

١٧- "Der neuste Anyriff.."- English trans, p. ١٦٢.







١٨- I bid, pp. ٢١٤, ٢١٩-٢٢٠, ٢٢٢.

١٩- Jay, Murtin, "The Diuleclecticul lmginutiom: A History of the Frankfurt school and the insitvte of social Research- ١٩٢٣ -١٩٥٠ (Boston ١٩٧٣). pp. ٢٩-٣١, ٣٧, ٤٠- ١١٣, ١١٤- ١٦٧, ١٦٩- ١٧٢.

٢٠- Adorno, in Fleming and Bailiyn, p. ٣٣٩-٣٧٠,٣٦٩,٣٦٧,٣٥١,٣٤٠.

٢١ Adorno, in Fleming and Builyn. p. ٣٥٨.

٢٢- Adorno et all. (١٩٥٠) pp. l, ٦٦٤, ٦٦٥, ٦٩٥, ٧٥٩ -٧٦٠.

٢٣- بەتایبەتی بگەڕێوە بۆ:

Christie and Johado.

٢٤- Riesman, pp. ٤٧٦ -٤٧٧.

٢٥- Hyman and shatsley. pp. ٦٩ -٧١, ٩١. ١٠٢ -١٠٤, ١١٤ -١١٥.

٢٦- Juy (١٩٧٣), pp. ٢٢٦-٢٢٧.

٢٧- Horkheimer (١٩٤٧) pp. ٧, ٢٠, ٣٤, ٥٠, ٧١, ٧٧-٧٩.

٢٨- Ibid, pp. ٨٥ .١٠٨ -١٠٩); Juy (١٩٧٣ pp ٢٥٦ -٢٥٧.

٢٩- Adorno (١٩٥١), pp. ١٤, ٤٤-٤٥, ١٤٥

٣٠- Ibid pp, ٧ ٤٨٠-٤٨١.

٣١- Horkheimer and Adorno (١٩٦٩)- English transe pp. ix, xi- xii- xv, ٤.

٣٢- Ibid. pp. ٩ .١٣, ٢٧ -٢٨.

٣٣- I bid, pp. ٣٤ -٣٦, ٥٤ -٥٧.

٣٤- Ibid, pp. ٨٥ -٨٦, ١١٨ -١١٩.

٣٥- Juy ١٩٧٣, p. ٢١٦.

٣٦- Horkheimer and Adorno ١٩٦٩ English truns. pp. ١٢٠, ١٣٠ -١٣١, ١٤١, ١٤٩, ١٥٣.

٣٧- Ibid pp. ١١٢, ١٧٢, ١٨٢, ١٨٧.

٣٨- Ibid. pp. ٢٠٠ -٢٠١, ٢٠٧.

٣٩- Ibid. (Prefuce to the new edition), pp. ix- x






٤٠-بۆ ئاگاداری لەوردو درشتی ئەم باسە بگەڕێوە بۆ:

Jay١٩٧٣, pp. (٢٨١ -٢٨٢, ٢٨٥, ٢٨٨- ٢٩٨.)

٤١- Rusconi, pp. ٢٠٧ -٢٠٨.

٤٢-" Adorno" in Lichtheim, p. ١٤١.

٤٣- Adorno theodor. W. Negative dialektik Frankfurt, ١٩٦٦ trans by sumuel and shierry Weber as prisms London, ١٩٦٧ p. xx.

٤٤-ڕاستی ئەم ڕستە سەرسوڕهێنەرە بەمشێوەیەیە:

" Philosophy, which once seemed obsolete" lived on, beceuse the moment to realize it was missed.

ڕەنگە مەبەست ئەوەبێت گەر فەلسەفە لەجیهانی تەجریداتەوە بێتە ناو بونیادی واقعی و عەمەلیەوە، و زانست و کردار دەبوون بەیەك شت، ئیدی پێویستی بە فەلسەفە نەدەما (و،ف)

هەستدەکەم مانای ئەم ڕستەیە ئەو تێزەی مارکسە کە بڕوایوایە لەو جێگەیەدا کە ناکۆکی چینایەتی نامێنێ، فەلسەفەش پێویست نیە. واتە مەبەستی ئادۆرنۆ لەبەدیهاتنی فەلسەفە پێدەچێ بەدیهاتنی کۆمەڵگای بێ چین و چەوساوە بێ (و. ك).

٤٥- Adorno (١٩٦٦ (٣, ١٣, ٣٦, ٤٩-٥٠.)- English trans. pp.

٤٦- Ibid pp. ٣١٦, ٣١٩, ٣٢٦, ٣٣٧n- ٣٣٨, ٣٥٧.

هەندێك گۆڕانكاریم لەوەرگێڕانە ئینگلیزیەكەدا كردووە.

٤٧- Horkheimer and Adorno ١٩٦٩ English truns. pp. ٢٢٢- ٢٢٤.

٤٨بگەڕێوە بۆ:

Adorno, theodor w, Aufsutze zur Gesellschaftsheoric, und methodoloyie Cfrunkfurt, ١٩٧٠)

ئەم وتارانە پاشتر لەم کتێبەدا چاپکران:

Adorno theodor w, Gesummelte schriften, vll (Sozioloyische Schriften I) (Frankfurt, ١٩٧٢)

بۆ ئاگاداری لەزەمینەی ئەم وتوێژانە بگەڕێوە بۆ:







Marx or Weber: Diulecticul methodoloyy". in Lichthein, pp. ٢٠٠-٢١٨.

٤٩-بۆ نموونە ئەم زاراوانە کە لەخوێندنەوەیەکی خێرادا بەرچاو دەکەون:

"heulthy sex life" "somlfun" "yo- yetteres" "Sociul resseurch" "teum" eeiddle- runge theory" "trial and error" "udministrative rescurch" "common senus"....

٥٠-" Zur Loyik der sofialwissenschaften" in Adorno ١٩٧٠ (). pp. ١٢٢-١٢٤.

٥١- Der Positivismusstreit in der deutschen sozioloyie" in itid, ١٦٩ pp. ١٨٩ -١٩٠, ٢٢٨,

٥٢-" Zur Logik..." ١١٨ in itide, p. "Der Positivismusstreiet" . in ibid, ١٧٢ pp. ١٧٥, ١٧٩, ١٩٧ -١٩٨, ٢١٤.

٥٣- Jay, Murtin "the permanent Exile of Theodor W. Adorno" ١٩٦٩ Midstreum xv Del pp. ٦٦-٦٧.

٥٤-" Adorno" in Lichthim pp. ١٣٢, ١٣٧ Jameson, p. xiii.

٥٥- Horkheimer (١٩٤٧, p. ١٢).

*ئەم وتارە وەرگێڕانی بەشێکە لەفەسڵی چوارهەمی ئەم کتێبەی خوارەوە.

هجرت اندیشه اجتماعی- هـ. ستیوارت هیوز. ت: عزت الله فردلادوند گرح نو- چاپ اول ١٣٧٦

## مارکس و دیموکراسی

**بابەکی ئەحمەدی**

دیموکراسی واتە حکومەتی خەڵکی یان بەمانایەکی رونتر حکومەتی زۆرینەی خەڵکی. بۆ ئێمە کە لەسەرەتای سەدەی بیست و یەکدا و پاش چەند دەیەیەك لەپەرەسەندنی سیستەمی سیاسی دیموکراتی (بە مانا نوێ لیبرالیەکەی) لەپانتای جیهاندا، دەژین (روسیا، وڵاتانی ئەوروپای شەرقی، وڵاتانی ئاسیای شەرقی و ئەمەریکای لاتین ئەم سیستەمەیان قبوڵکردووە)، مانای حکومەتی زۆرینەش خەسڵەتێکی وردتری وەرگرتووە: نەك تەنها دەوڵەتی پشتئەستور بە نوێنەرایەتی و قەتعەیتی رای هەمووان لەپیاوان و ژنان، و قەتعیەتی بە فەرمی ناسینی کۆی مافە سیاسیەکانی کەمایەتی و قبوڵکردنی مافە یەکسانەکانی ژنان و پیاوان و مافی تەواوی کەمایەتیە رەگەزی و نەتەوەیی و جنسیەکان و ئەوانی تر، بەڵکو پەیدابوونی «دەوڵەتی لایەنیکەم» واتە بچوکبونەوەی سنوری چالاکی دەوڵەت و چاودێری کۆمەڵگای مەدەنی بەسەریەوە، پەرەسەندنی دەزگا سەربەخۆکانی ئەم کۆمەڵگایە، گەشەسەندنی فەزا یان بواری گشتی کە سەربەخۆن لەدەوڵەت، پەیدابوونی دەزگاکانی راگەیاندنو هەواڵنێرە سەربەخۆکان لەدەوڵەت و دەزگاکانی پەروەردە و دەزگا کلتوریە سەربەخۆکان، جوڵە بەرەو بڕیاردانی راستەوخۆ، دۆزینەوەی ئەو رێگا و کارانەی کە سنورداری نوێنەرایەتی بە کۆمەڵێك خواستی راشکاوی دیاریکراو و رونی تاکەکان دەکەن، رونبونەوە و تەنکبونی سەرچاوەکانی داهاتی بەشی دەوڵەتی و بەرپرسیارێتی تەواوی ئەم بەشە و سەربەخۆی تەواوی هێزی دادوەری و ..هەموو ئەمانە بەشێکن لەوێنای دەوڵەتی دیموکراتی کە ئیدی بۆ ئێمە ئاشنایە. تەنانەت ئەگەر لەدەوڵەتێکیشدا بژین کە هێشتا زۆری ماوە بۆ ئەوەی دان بە هەموو ئەم مافانەدا بنێت. بەڵام هەر ئەم وێنایە بۆ دیموکراسی بۆ مارکس مومکین نەبوو. مارکس تەنانەت لەبارەی مەسەلە گەلێکەوە کە بۆ ئێمە چارەسەرکراوە بۆ نمونە رای گشتی، قبوڵی نەبوو کە دەکرێت ئەمانە لەچوارچێوەی کۆمەڵگای بۆرژوازی و







سیستەمی سەرمایەداریدا بەدەستبێت. مارکس بڕوایوابوو تەنانەت سادەترین مافی مرۆڤ، هەرکاتێك بەشێوەیەکی جدی بخرێتە بەرنامەی کارەوە و خەبات بۆ بەدیهاتنیان دەست پێبکرێ، سنورەکانی کۆمەڵگای هەبوو وسیستەمی سەرمایەداری بەجێدەهێڵرێ. هەر لەبەرئەمەش (ئەم هەوڵە) روبەروی بەرگری سەرمایەداران و دەوڵەتەکەیان دەبێتەوە. چ بگات بە مافە دیموکراتیە ئاڵۆزەکانی کە لەگەڵ بەرژەوەندی ئابوری سەرمایەداراندا لەناکۆکیدان. لەحاڵەتێکی وادا ململانێ بۆ ئەم مافانە، چوارچێوەی کۆمەڵگای بۆرژوازی لەناودەبات. مارکس تەنانەت باوەڕهێنان بە کارایی سیستەمی پەرلەمانی، بە «نەخۆشی و حەماقەت» ناودەبا. جێگەی پرسیارە کە وێنای خودی مارکس بۆ دیموکراسی چیبوو؟

مارکسیش قبوڵیبوو دیموکراسی واتە حکومەتی خەڵکی. ئەوەشی بە رازیبوونی تەواوە قبوڵدەکرد کە مانا وردەکەی بریتیە لەحکومەتی زۆرینەی خەڵکی. بەڵام تەنها تائێرە لەگەڵ مانای هەنوکەی دیموکراسیدا (کە لەقوڵایی خۆیدا چەمکێکی نوێ لیبراڵیە، بەڵام چینە کۆمەڵایەتیەکان لەپێناویدا خەباتیاندەکرد، بەتایبەتی چینی کرێکار لەپەیدابووویندا دەوری هەبووە) رێکدەکەوت. لێرە بەدواوە ئەو باسێکی دی دەهێنایە پێشێ. بەبڕوای مارکس حکومەتی زۆرینە، واتە حکومەتی پرۆلیتاریایی پیشەسازی کە لەلوتکەی بزوتنەوەی ستەملێکراوان و زەحمەتکێشانی کۆمەڵگادا راوەستاوە، و سەرەتا لەگەڵ ئەواندا کۆمەڵگا بەڕێوەدەبات. مارکس وەڵامی ئەو پرسیارەی (کە زۆرینە لەبنەڕەتدا چ پێویستیەکی بە حکومەت و حکومەتکردن هەیە؟)، بەمشێوەیە دەدایەوە کە لەقۆناغی گواستنەوەدا زۆرینە دەبێت پاشماوەی کۆمەڵگای چینایەتی لەناوببات و لەدەرئەنجامدا دەستبکات بە سەرکوتکردنی ئەو هێزە کۆمەڵایەتیانەی خوازیاری گەڕانەوەی سیستەمی چەوساندنەوەی چینایەتین (ئەمەش بناغەی تیورەکەیەتی لەبارەی دیکتاتۆری پرۆلیتاریاوە) و لێرەوە دەبێت دەوڵەتی لەدەستدابێت. بەڵام پاش ئەم قۆناغە چیدی پێویست بەحکومەت بەمانای ناسراوی وشە ناکات. هێزەکانی بەرهەمهێنان ئەوەندە پەرەیانسەندووە کە کەمێتی مادی لەناوبچێت، چینە بەرخۆرە کۆنەکانیش سەرکوتکراونو لێرەوە لەبری حکومەتی سیاسی، هونەری ئیدارەی کاروبارەکان دێتەپێشێ. لەو روەوە کە پرۆلیتاریا لەشۆڕشێکی جیهانی و بەردەوامدا دەسەڵاتی بەدەستهێناوە، لەبەرئەوە مەترسی

جەنگی دەرەکی و مەسەلەی بەرگریکردن لەوڵات و نەتەوەش نامێنێت (لەراستیدا خودی ئەمانەش لەناوچوون یان لەحاڵەتی لەناوچوندان). لەکۆمەڵگای ئایندەدا حکومەت بێمانا دەبێت. بەڵام تا ئەوکاتە واتە تا گەیشتن بەو بەهەشتە خەیاڵیە، قۆناغێکی گواستنەوە دەبێت کە زۆرینەی تاکەکانی کۆمەڵگا تیایدا چەکدارن و پێویستیەك بەسوپاو هێزێکی سەربازی وەك پەیکەرێکی جیا و سەربەخۆ لەخەڵك نیە، و ئەمەش خۆی جیاوازی هەستپێکراوی دەوڵەتی پرۆلیتاریاو دەوڵەتە لەکۆمەڵگای چینایەتیدا.

هەنوکە گەر واز لەگەمەی خەیاڵ لەبارەی ئەم کۆمەڵگایەی ئایندەوە بهێنین، دیسان ئەو مەسەلەیە دێتە پێشەوە کە لەروانگەی مارکسەوە تەنانەت لەم قۆناغی گواستەوەیەشدا، دیموکراسی وەك سیستەمێکی سیاسی تایبەت لەئارادا نیە، بەڵکو بە هەلومەرجێکی کۆمەڵایەتی دەگوترێت. لەم هەلومەرجەدا ئێمە هێشتا روبەروی سەرکوتی چینایەتی، توندوتیژی و شێوازە بەزۆر سەپێنراوەکانین و ئەمجارە زۆرینەی کۆمەڵگا بەناوی بەرژەوەندیەکانی خۆیەوە کاردەکات، واتە "دیکتاتۆری خۆی دەکات بە شتێکی پراکتیکی". جێی پرسیارە ئایا ئەم زۆرینەیە دەتوانێت تەحەمولی هێزە سیاسیە نەیارەکان بکات؟ ئایا هێزە نەیارەکان کە لەکەمایەتیشدان و دەسەڵاتی سیاسی و زۆرێك شتی دیان لەدەستداوە، دەتوانن حیزب دروستبکەن و چالاکی سیاسیبکەن؟ ئایا لەم کۆمەڵگایەدا کە شۆڕشگێڕان، واتە زۆرینە دەسەڵاتدارن حوکمیدەکەن، هیچ کەس مافی ئەوەی هەیە ئارەزووی سیستەمی کۆن بکات، یان بەشێوەی سیاسی بیهێنێتە پێشێ؟ پێدەچێت وەڵامی مارکس یەك «نا»ی گەورە و بڕاوە بێت. دیکتاتۆری پرۆلیتاریا، واتە ئەوەی کەسێك نەتوانێت ئارەزووی گەڕانەوە دەرببڕێت، چ بگات بەوەی بیەوێت چالاکی سیاسی بۆ بخاتەگەڕ. ئێمە ئەم دەربڕینەمان بەشێوەی جیاواز لەزمانی لینین، ستالین، ماو، ئەنوەر خواجە، کیم ئیل سونگ چاوچیسکۆ و پۆلپۆتیشەوە بیستووە. خاڵێکی ئاشکرا هەیە: مارکس هیچ وێنایەکی بۆ دیموکراسی بەمانای ئەمڕۆیی نەبوو، هەرکاتێکیش لایەنێکی دەهێنرایە پێشێ، بەتوندی دژی دەوەستا و بەراشکاوی دەیگوت کە دەوڵەتی دیموکراتی بۆرژوازی، دژایەتیەکی بەرجەستە و ئاشکرایە.

وێنا و تێڕوانینی مارکس بۆ دیموکراسی کۆمەڵایەتی بوو، نەك سیاسی. کاتێك







مۆڵکایەتی تایبەتی بەسەر ئامێرەکانی بەرهەمهێناندا لەناوبچێت، ململانێ نەمێنێت، بەرهەمهێنان لەسەر بناغەی هاوکاری خۆبەخشانەی بەرهەمهێنەرانی پێکەوە گرێدراو ریکبخرێت، کار چیدی هێزێکی بێگانە لەمرۆڤ نەبێت، کار بگۆڕێت بۆ لەزەت، بەرهەمە مادیە زیادەکان لەدەرەوەی رێساکانی بازاڕی ئازاد و لەسەر بناغەی بەرنامەرێژی عەقلانیانە دابەشبکرێن و... (ئەوکاتە) دیموکراسی دێتە پێشێ. گەر واش نەبێت ئەوا لەکۆمەڵگای چینایەتیدا، هەموو باسکردنێکی دیموکراسی «هەڵخەڵەتاندن» و لەباشترین حاڵەتدا خۆ هەڵخەڵاتاندنە. هەر باسێکیش کە دیموکراسی کورتبکاتەوە بۆ شێوەیەکی تایبەتی ژیانی سیاسی، ئایدۆلۆژیانەیە. واتە هەڵگێڕانەوەیە، هەڵگێڕانەوەی سەرەکی واقعیەتە. ئایا ئەم تێگەیشتنە ناڕونەی مارکس، تەنها زادەی رۆژگارێك بوو کە تیایدا دەژیا؟ وەڵامی ئەم پرسیارە ناتوانێت پۆزەتیف بێت. ئەگەر ئەو راستیە لەبەرچاوبگرین کە لەهەمان ئەو قۆناغەدا کە مارکس کارە فکری و تیوریەکانی خۆی دەبردە پێشێ، بیریارانێك هەبوون کە دیموکراسیان لەگەلێك رووی زۆرەوە بەمانای ئەمڕۆیی دەهێنایە پێشێ (تامس جفرسۆن، جیمیز مدیسۆن، جرمی بنتام، جیمز میل، جان ستیوارت میل، تامس پین، ئەلکسی دی تۆکڤیل..و)، سەرنجمان بۆ ئەوە دەچێ کە تیورەسازانی لیبڕاڵی نوێ ناویانناوە «کەموکوڕی دیدی سیاسی مارکس». ئایا تێگەیشتنی کەموکوڕی مارکس بۆ دیموکراسی، رەنگدانەوەی خەباتی هێشتا دواکەوتووی سەدەی نوزدەهەم بوو؟ دەکرێ بەشێوەیەکی پۆزەتیف وەڵامی ئەم پرسیارە بدرێتەوە. ئەزمونی چینی کرێکار لەرۆژگاری مارکسدا تێڕوانینێکی پێشکەوتووی بۆ دیموکراسی پێویست نەکردبوو. بەڵام لەهەمانکاتدا تیۆرەکانی مارکس لەبارەی دیموکراسیەوە جۆرێك ناوردبینی بوو لەئاستێکی فراواندا بۆ بەزموکاری سیاسی پێشکەوتووی ژیانی کۆمەڵایەتی. ئەوەندە بەسبوو مارکس لەو سنورانەی کە خۆی بۆ خۆی دروستیکردبوو، واتە «تیورەسازی بزوتنەوەی کرێکاری» بێتەدەرێ بۆئەوەی وەك میل و ئەوانی دی نیشانەکانی دەرکەوتنی دەوڵەتی دیموکراتی ببینێت. نەدەبوو تێگەیشتن لەدیموکراسی وەك شێوەیەکی روو لەپەرەسەندن، بۆ کەسێکی دیالەکتیکی زەحمەت بێت. ئایا ئەمە دەریناخات ئەو دیدەی لەسنوری ململانێی چینایەتیدا بمێنێتەوە، زیهن لەیەك فەزادا چالاکدەکات ( فەزایەکی تایبەت بۆ شێوەیەك لەدادپەروەری و یەکسانی)، بەڵام

دەبێتە هۆی ئەوەی زیهن لەفەزاکانی تردا بێجولەو بێچالاکی بێت؟

لێرەدا پرسیارێکی دی دێتەپێشێ: ئەگەر مارکس تێگەیشتنێکی وا ناروون و ڕەنگە دواکەوتووی لەبارەی مەسەلەیەکی گرنگی وەك دەوڵەتی دیموکراتی و مافی دیموکراتی هەبوو، لەمڕووەشەوە لەو کەسانەی کە خۆی ناوینابوون «تیورەسازانی بۆرژوا» دواکەوتوتر بوو، کەوابوو بۆچی ئێمە کاتی خۆمان بە خوێندنەوە و تێگەیشتنی بیرکردنەوەکانیەوە بەفیڕۆ دەدەین؟ ئایا لەدەرەوەی لەزەتی فێربوون و لەزەتی کاری تیوری و پێویستی تێگەیشتن لەدیدە مێژووییەکان و وردبوونەوە لەفەلسەفە سیاسیە جیاوازەکان، خوێندنەوەی بەرهەمەکانی مارکس لەبارەی دیموکراسی و مەسەلە سیاسیەکانەوە چ نرخێکی هەیە؟

هەستدەکەم ئێمە لەبەرئەوە بیر لەتێڕوانینی مارکس بۆ دیموکراسی بەهەمان مانای کۆمەڵایەتی دەکەینەوە و بەوردی تاوتوێی دەکەین کە: ١)بێ سەرنجدان لەتێڕوانینی مارکس بۆ دیموکراسی، بە هەمان مانای کۆمەڵایەتی، ناتوانین خاڵە گرنگ و ناوەندیەکانی بیرکردنەوە سیاسیەکانی بناسین، یەکێك لەم گرنگترین خاڵانە تێگەیشتنێتی بۆ «ئازادی مرۆیی»( ٢) بە سەرنجدان لەبیرکردنەوەکانی مارکس لەبارەی دیموکراسیەوە، کەموکوڕی تیۆری بزوتنەوەی سۆشیالیزمی سەردەمی مارکس کە خۆی بەرهەمی دواکەوتووی بزوتنەوەی پراکتیکی کرێکاری سەدەی نۆزدەهەم بوو، باشتر دەناسین. ٣) خودی باسی دیموکراسی دروست بەمانای ئەمڕۆیەکەی، داوامان لێدەکات بیر لەجۆرەکانی تێگەیشتن لەئازادی مرۆیی، ئازادی سیاسی و دیموکراسی بکەینەوە و بۆ ئەڵتەرناتیڤە جیاوازەکان، وەڵامی ئامادەمان هەبێت. ٤) گوتاری پۆستمۆدێرن جیاوازی لەنێوان ئازادی مرۆیی و چەمکی لیبڕاڵی نوێ بۆ دیموکراسی دەکات، ڕوونە باسە نزیکەکان لەم دیدگایەوە کە ئەڵبەتە باسەکەی مارکس کە بەهەر شێوەیەك بێت لەرەخنەگرانی مۆدێرنە بوو، دەتوانن هاوکاری پێشخستنی باسەکەبکەن ٥) تەفسیرێك بۆ دیدی مارکس هاوکاری پەیدابوونی «دیموکراسیە جەماوەریەکانی»کرد. دیارە ئەم تەفسیرە لینینیە لەگەڵ تێڕوانینی مارکسدا یەك شت نیە، بۆ نمونە باسەکەی مارکس لەبارەی خۆبەڕێوەبەری کرێکاران و بنەمای خودرزگاری چینی کرێکار بە بیر بهێنینەوە. ڕەخنەگرتن لەلینینزیم ناتوانێت، جیا لەتەفسیری لینین و لایەنگرانی بۆ ئەوەی خۆیان بە تیورەکانی







مارکسیان ناو دەهێنا، بچێتەپێشێ. دۆزینەوەی لایەنە هاوبەشەکانی تیورەکانی لینین و مارکس لەبارەی دیموکراسیەوە، هەرچەندە بۆ هاوڕێیانی مارکس کارێکی خۆش نەبێت، بەڵام کارێکی پێویستە. بە کورتی لەبارەی مەسەلەی گرنگی دیموکراسیەوە (کە هەستدەکەم زۆرینەی خوێنەرانم لەگەڵدا بن کە ئەگەر گرنگترین مەسەلەی سیاسی سەردەمی ئێمە نەبێت، ئەوا یەکێکە لەگرنگترینیان) ئێمە بە باسکردنی بیرکردنەوەکانی مارکس، باشتر دەتوانین ڕەگوریشەی دەسەڵاتخوازی لەسەدەی بیستدا بناسین.

بگەڕێینەوە بۆ وشەی دیموکراسی. ماناکەی بریتیە لە«حکومەتکردن بەهۆی خەڵکەوە». یەکەمجار لەسەدەی پێنجی پێش لەدایکبوونی مەسیحدا، لەنوسینەکانی هرۆدیتدا بەکارهێنرا و پێکهاتووە لەدوو وشەی ***Demos*** بەمانای خەڵك و ***Kratein*** بەمانای حکومەتکردن. یەکێك لەبەناوبانگترین پێناسەکانی دیموکراسی لەسەردەمی مارکسدا کە لەلایەن سیاسەتمەداری مەزنی لیبرالی ئەبراهام لینکلۆنەوە پێشکەشکراوە، بریتیە لە«حکومەتی خەڵکی بەهۆی خەڵکیەوە، بۆ خەڵکی». بە جەختکردن لەسەر حکومەتکردن، مانای وشەکە زیاتر ورد دەبێتەوە: دیموکراسی سیستەمێکی سیاسیە کە تیایدا کۆی خەڵکی، کۆی بڕیارە سەرەکیەکان لەمەسەلە گشتی و کۆمەڵایتیەکاندا دەدەن یان هاندەدرێن کە لەم بڕیارانەدا بەشداریەکی چالاکانەبکەن. بەشداری چالاك لەبڕیاردانەکاندا و قبولکردنی بەرپرسیاری هەموو بڕیارەکان، ئەگەر هاوکاتی ڕەچاوکردنی مافی کەسانی دی و بەتایبەتی نەیاران بێت و لەئەنجامی وتوێژی عەقلانیانە و ئازادانەدا بڕواتە پێشێ، ئەمە تەنانەت گرنگترە لەو دەرئەنجامانەی کە بڕیاری دروست بەرهەمیدێنێ و دەکرێ ئەوە ببینرێ کە لەزوربەی کاتەکاندا نزیك دەبێتەوە لەدەستگەیشتن بە دەرئەنجامی دروست. دیموکراسی لەسەر بناغەی ئەو پێشگریمانە سیاسی و فەلسەفیە دامەزراوە کە هەموو خەڵکی مافی ئەوەیان هەیە بەشداری لەو بڕیارانەدابکەن کە پەیوەندی بە چارەنوسی خۆیانەوە هەیە. هەرکەس بە قبولکردنی نزیکی یا چونیەکی چارەنوسی خۆی لەگەڵ ئەوانی دیدا، دەبێت بەمرۆڤی کۆمەڵایەتی و سیاسی، واتە دەبێت بەمرۆڤێك خاوەن مافی مرۆڤ و لەراستیدا هاوڵاتیەك. ناکرێ بڕیارێکی گشتی بدرێت، و مافی یەکسانی بڕیاردەران ڕەچاونەکرێت. لەو تیورە سیاسیەدا کە دیموکراسی بە ناوەندی باسی

خۆی دادەنێت، ئەم کێشەیە هەمیشە دێتە ئاراوە: پێدەچێت بیری ئەوەی کە کۆی خەڵکی بڕیار دەدەن، دیدێکی مەزن بێت، بەڵام چۆن بڕیاری جیاوازی تاکەکان دەتوانن لەبڕیارێکی کۆتاییدا پێکبێن؟ ڕێگەچارەی سادە و ئاسایی ئەمەیە: دیموکراسی لەسەر بناغەی ئیرادەی زۆرینە راوەستاوە. دەکرێ بڕیاری زۆرینە بەبڕیاری هەمووان یان کۆی کۆمەڵگا دابنرێت. لەگەڵ ئەوەشدا دیموکراسی لێرەدا ناوەستێت. مافی کەمایەتی لەبەرجەستەکردنی تێڕوانینی نەیاریدا و تەنانەت مافی کەمایەتی لەئەزمونکردنی سنورداری تێروانینەکانیدا تا ئەوکاتەی زیان بە بڕیاری زۆرینە نەگەیەنێت، مەسەلەیەکی گرنگە کە دەبێت رەچاوبکرێت"١".

نەیاریی مارکس لەگەڵ دیموکراسی سیاسیدا، تەنها پشت ئەستور نەبوو بە بەدبینی خۆی و بێزاری سۆشیالیستێکی شۆڕشگێڕ و رادیکال لەدەوڵەت و کۆمەڵگای بۆرژوازی. مارکس بۆ قسەکانی خۆی چەند بەڵگەیەکی هەبوو کە ئێمە دەبێت سەرنجیان لێبدەین. بەرگریکەرانی دیموکراسی، یەکسانی مافەکانی مرۆڤیان وەك یەکسانی بیروبۆچونەکان دەناساند. لەیەکسانی سیاسیەوە (بە تایبەتی لەیەکسانی هاوڵاتیان لەبەرامبەر یاسادا) ئەو دەرئەنجامەیان وەردەگرت کە لەکۆمەڵگای مۆدێرندا کۆی هاوڵاتیان یەکسانن. مارکس لەگەڵ  ئەم حوکمەی تیورەسازانی لیبڕاڵیدا نەبوو. ئەو سوربوو لەسەر ئەوەی یەکسانی سیاسی، یەکسانیەکی روکەشیە، نەك یەکسانیەکی واقعی. لەکۆمەڵگایەکدا کە دابەشبووە بۆ چینی جیاواز و ناکۆك، یەکسانی راستەقینە مومکین نیە. لەکۆمەڵگای چینایەتیدا بەشێکی سەرەکی سامانی کۆمەڵایەتی، لەرێگەی دابەشبوونی کاری کۆمەڵایەتیەوە دەگەڕێتەوە بۆ کەمایەتیەك، کەمایەتیەك کە کارناکات، زەحمەت ناکێشێت، تەنها ئامێرەکانی بەرهەمهێنانی خستۆتە دەست خۆی و درێژە بە وەبەرهێنانی کەسانی دی، واتە زۆرینەی کۆمەڵگا دەدات. لێرەدا یەکسانی راستەقینە، واتە یەکسانی مادی بوونی نیە. بەبڕوای مارکس دیموکراسی، واتە «کۆمەڵگایەك کە تیایدا بە باشترین شێوەی مومکین، یەکسانی کۆمەڵایەتی بەدەست هاتبێت». خودی مارکس لەگەڵێك شوێندا ئەمەی ناو دەنا «دیموکراسی کۆمەڵایەتی». لەهەمانکاتدا مارکس بە شێوازی رۆسۆ رەخنەی لەدیموکراسی ناڕاستەوخۆ دەگرت. دیموکراسی راستەقینە ناتوانێت لەسەر بناغەی را و نوێنەرایەتی راستەوخۆ بێت. چۆن من دەتوانم تەنانەت بۆ ماوەیەکی کورتیش







بووە، ئیرادەی خۆم بە کەسێکی دی بسپێرم؟ چۆن دەتوانم دڵنیابم کە هەر رایەکی ئەو (نوێنەرەی من) لەئایندەدا لەبارەی مەسەلەگەلێکەوە کە ئەمڕۆ بۆ من روون نین، تەنانەت ناشتوانم پێشبینیان بکەم، رای خودی من دەبێت؟"٢".

بەڵام کێشەی مارکس ئەو رەخنانە نەبوو کە لەتیورەی سیاسی دیموکراسی دەیگرت، ئەم رەخنانە گرنگن و هەموشیان بەرهەمی بیرکردنەوەی خۆی نەبوو، هەندێکیشیان تاهەنوکە لەئارادان. هەندێکیشیان پێدەچێت راست بن و ناکۆکیەکانی دیموکراسی روونددەکەنەوە. بەرگریکارانی دیموکراسیش بانگەشەی ئەوەناکەن کە ئەم تیورەیە هیچ کەموکوڕیەکی تێدا نیە. بانگەشەی ئەوان ئەوەیە  تیورەی دەوڵەتی دیموکراتی بەپێی ئەزمونی پراکتیکیەکەی لەنیوەی دوهەمی سەدەی بیستەمەوە تا هەنوکە، باشترین تیورەی سیاسیی مومکین بووە و زۆرترین ئازادی بۆ هاوڵاتیان دابینکردووە، ولەدەرئەنجامدا عەقڵانیترین بڕیاردانی مومکینکردووە. ئەم تیورەیە رێگە بۆ پەرەسەندنی خۆشی دەکاتەوە، و بەردەوام ئەگەری چاککردنەوەی هەڵەکان دروستدەکات. دیسان دەنوسم کە کێشەی مارکس رەخنەکانی نەبوو لەتیورەی دیموکراسی، کێشەی ئەو ئەوە بوو بەتەواوی و بە یەقینێکی تەواوەوە، ئەگەری بەدیهاتنی دەوڵەتی دیموکراتی بۆرژوازی رەد دەکردەوە و هیچ پەرەسەندن و ئایندەیەکی بۆ نەدەبینی. مارکس دیموکراسی وەك شتێکی کۆمەڵایەتی دیکتاتۆریەتی زۆرینە، یان بەوتەی خۆی دیکتاتۆری پرۆلیتاریا دەهێنایە پێشێ.

## تێڕوانینی مارکس بۆ دیموکراسی بۆرژوازی

دیموکراسی شێوەیەك یان سیستەمێکی سیاسیە کە لەرووی دیدی مێژووییەوە، هێندە بەگرنگ نەدەزانرا. رەنگە لەبەرئەوەی هەرگیز بۆ ماوەیەکی لەروانگەی مێژووییەوە درێژ بوونی نەبوو،  درێژەشی نەکێشاوە: «هەم لەرووی تیوری و هەم وەك چالاکیەکی کۆمەڵایەتی و سیاسی، لەزوربەی مێژوودا پایەکان رێسا بوون و دیموکراسیش ئاوارتن»"٣". بەکارهێنانی وشەی «دیموکراسی» یش تا سەرەتاکانی نیوەی دوهەمی سەدەی نۆزدە، ئەوەندە باو نەبوو. لەراستیدا ئەم وشەیە لەدوای شۆڕشەکانی ئەمەریکا و فەرانساوە، هاتە ناو ئەدەبیاتی کۆمەڵایەتیەوە. لەکاتێکدا لەفەڕەنسا لەسەرەتای سەدەی نۆزدەهەمدا، دیموکراتەکان بەمانای ریفۆرمخوازەکان

بوون، لەئینگلتەرادا بەمانای شۆڕشگێڕە رادیکاڵەکان، کەسانێك کە خوازیاری گۆڕانی خێرای ژیانی کۆمەڵایەتی بوون، بەکاردەهات. لەوێ دیموکراتەکان بە «ئەندامە مەترسیدارەکان» ناودەبران"٤". تا پێش شۆڕشی ١٨٤٨ ، دوو تێڕوانینی مانایی بۆ دیموکراسی پێشکەشدەکرا، هەردوکیشیان بەمانایەك لەشۆڕشی ١٧٨٩وە وەرگیرابوون. یەکێکیان بە مانا کلاسیك یان یۆنانیەکەی کە هەمان حکومەتکردنە بەهۆی خەڵکیەوە، ئەم مانایە سیاسی بوو چونکە جۆرێك حکومەتی دەهێنایە پێشێ کە تیایدا هاوڵاتیان بڕیاردەدەن و جێبەجێیدەکەن یان چاودێری جێبەجێکردنی دەکەن. سودوەرگرتن لەم مانایە لەو رۆژانەدا زۆر کەمبوو. ماناکەی تر باسی ناوەڕۆکی کۆمەڵایەتی ژیانێکی باشتر و دروستتر یان دادپەروەرانەتری هاوڵاتیانی دەکرد. زۆرتر باسی یەکسانی واقعی خەڵکی دەکرد و جەختی لەوە دەکرد کە ئەوان کاتێك بەمانای راستەقینەی وشە لەبەرامبەر یاسا و حکومەتدا خاوەن مافی یەکسانن، کە لەژیانی کۆمەڵایەتیشدا خاوەن توانای یەکسان بن و جیاوازیە چینایەتیەکان کەمڕەنگ بن. ئەڵبەتە بەپێی تێڕوانینی باو لەسەدەی نۆزدەهەمدا، لەناو کۆمەڵگایەکی واشدا پیاوانی باڵغ و یەکسان لەئەنجامی وتوێژ و ئاڵوگۆڕی بیروڕاکان و دواجار لەسەر بناغەی هەڵبژاردن (پشتئەستور بە رای زۆرینە)، بڕیارە سیاسی یان کۆمەڵایەتیەکان دەدەن. بەکارهێنانی ئەم مانایە بیرهێنەرەوەی رۆسۆ بوو. رۆسۆ لەکتێبی «لەبارەی سەرچاوەکانی نایەکسانی لەنێوان خەڵکدا» (١٧٥٥) نوسیبووی: «من قبوڵمە دوو جۆر نایەکسانی لەنێوان مرۆڤەکاندا هەیە. یەکێکیان ئەو نایەکسانیەی من ناویدەنێم جەستەیی یان سروشتی چونکە سروشت دروستیکردووە و لەجیاوازی نێوان تەمەن ، تەندروستی، هێزی جەستەیی، توانا فکری یان مەعنەویەکاندا دەبینرێت. ئەوی دیان ئەو نایەکسانیەیە کە دەکرێ ناوی بنرێ ئەخلاقی یان سیاسی، چونکە بە هۆی جۆرێك رێککەوتنەوە هەیە و بەهۆی رازیبوونی گشتیەوە دەمێنێتەوە، یا لایەنیکەم بەهۆی ئەوەوە ئاراستە دەکرێت. ئەم جیاوازیە، جیاوازیە لەئیمتیازاتدا کە هەندێك کەس بەهۆی چەوساندنەوەوە، باشتر لەوانی دی دەژین، دەوڵەمەندترن، بەناوبانگترن، بەهێزترن و یان تەنانەت لەهەلومەرجێکدان کە فەرمانبەرداری ئەوانی دی بەهۆی زۆرەوە بەدەست دێنن»"٥".

خاڵی گرنگ ئەوەیە لەهەردوو ماناکەی دیموکراسیدا بەر لە١٨٤٨، پەیوەندیەك





لەنێوان ئازادی و یەکسانیدا هەبوو. بەڵام لەشێوەی یەکەمدا هێڵ بەژێر ئازادی هاوڵاتیاندا دەهێنرا و ئەرکی حکومەت دەبوو بەوەی کە ئازادی خەڵکی لەدەستدرێژیە ناوەکی و دەرەکیەکان بپارێزێ. لەکاتێکدا لەشێوەی دوهەمدا هێڵ بەژێر یەکسانیدا دەهێنرا و پێ لەسەر ئەوە دادەگیرا کە ئەو کۆمەڵگایە بەڕاستی ئازاد و ئەو حکومەتە شایستەی ناوی دیموکراتیە کە تیایدا یەکسانی هاوڵاتیان مومکین و زامن بکات. تەفسیری دوهەم کە لەنێوان باڵی چەپی شۆڕشگێڕە فەرەنسیەکان و پەیڕەوانی بابۆفدا باوی هەبوو، رەگێکیشی لەبیرکردنەوەی رۆسۆدا بوو، بە قبوڵکردنی جیاوازی سروشتی نێوان مرۆڤەکان، باسی پێویستی یەکسانی تواناکانی هاوڵاتیانی دەکرد. ئەم تەفسیرە بە میرات بۆ نوسەری خۆشەویستی مارکسی لاو، واتە لۆرنز فۆن شتاین، بزوتنەوەی سۆسیالیستی و خودی مارکس مایەوە.

کانت کە ئەڵبەتە بەهیچ شێوەیەك دیدێکی نێگەتیڤی بۆبیرکردنەوەکانی رۆسۆ نەبوو، زۆریش سەرنجی لێدابوون، لەبەرامبەر ئەم تەفسیرەی دوهەمدا حوکمێکی تازەی پێشکەشکردبوو. کانت نوسی کە بوونی نایەکسانی لەنێوان خەڵکیدا «بەسەرچاوەی دەوڵەمەندی هەموو ئەو شتانەی کە خراپن و هەروەها هەموو ئەو شتانەی کە باشن، دادەنرێت»"٦". کانت رەهەندی هەمەڕەنگی جیاوازیەکان و لەدرەئەنجامدا نایەکسانیەکانی هێنایە پێشێ. لەگەڵ کانتدا بەئاسانی دەتوانرێ وتوێژ بکرێت، بەڵام نەك لەگەڵ دیدرۆدا کە لەپێشەکی «کۆمەڵگا» لەئەنسکلۆپیدیادا نوسیبووی، نایەکسانی لەقۆناغە جیاوازەکانی ژیانی کۆمەڵایەتیدا، وەك نایەکسانی دەورەکانی شانۆنامەیەکە. وەك چۆن ئەو نایەکسانیە شانۆییە بەکۆتایهاتنی شانۆکە تەواو دەبێت و ئیدی بوونی نامێنێت، واتە ئەکتەرەکان یەکسان دەبنەوە، ئەم نایەکسانیەش لەکۆتای ژیاندا تەواو دەبێت. بەڵام ژیان شانۆنامە نیە و هیچ شتێکیش لەو پڕوپاگەندە مەسیحیەی تەسلیم و زاهیدبوون، ناشرینتر نیە. ئەویش لەزمانی رۆشنگەرێکەوە. لەبەرامبەردا نایەکسانی لەبەردەم ژمارەیەك نوسەر لەماوەی ساڵەکانی ١٧٥٠ و ١٨٥٠دا و لەبەرامبەر خوێنەرەکانیشیاندا، لەئاستی مۆڵکایەتی تایبەتیدا دەهێنرایە پێشێ. دواجار کۆمەڵگای بێ موڵکایەتی تایبەتی قابیلی وێناکردن بوو، و لەناوبردنیشی بەئامانجی سیاسی سەرەکی دادەنرا. دوو شۆڕشی گەورەی فکری بە گریمانەی ئەگەری پەیدابوونی یەکسانی واقعی، هاوبەستەیی





مرۆیـی لەئەندیـشەی ئەوروپاییـدا رویـدا. یـەکێکیان ئـارەزووی رۆسـۆ بـۆ دوبـارە بەرپاکردنـەوەی یەکـسانی سـەرەتایی مرۆیـی و ئەویـدیان ئـارەزووی مـارکس بـۆ دروستکردنی کۆمەڵگای کۆمۆنیستی. لەم ناوەدا میلار، فۆن نشتاین، فرگسۆن، بـابۆف، سەن سیمۆن و فۆریە و هەندێك بیریاری تر، باسەکەیان بردبووە پێشێ.

یەکەم بەکارهێنانی دیموکراسی کە لـەباری ئـەم مانـا کۆمەڵایەتیـە رزگـاریبووە و کـەمتازۆر نزیکـە لـەمانای ئەمرۆییـەوە، دەگەڕایـەوە بـۆ شـێوەی حکومـەت و ژیـانی سیاسی، لەنوسـینەکانی جـان سـتیوارت میلدا دەدۆزرێتـەوە. میـل لەوتارێکدا لەسـاڵی ١٨٢٥دا لـەبارەی ئـازادی رۆژنامەگەریـەوە سـودی لەچـەمکی دیموکراسـی بـەمانا سیاسـیەکەی وەرگـرت، و جـارێکی دی لـەوتاری «رۆحـی سـەردەمدا» لەسـاڵی ١٨٣١دا دوبارەیکردەوە. بەڵام بەکارهێنانی هاوکات لەگەڵ رونکردنەوەدا، واتە ئاماژەی ورد بۆ دیموکراسی لەوتارێکدا هێنایـەوە کـە لەساڵی ١٨٣٣دا بـۆ رەخنـەگرتن لەبیرکردنـەوەی سیاسـی بینتـام بـەناوی «چـەند سـەرنجێك لەسـەر فەلـسەفەی بێنتـام» نوسـی. لـەم وتـارەدا دیموکراسـی وەك سیـستەمێکی سیاسـی پـشت ئەسـتور بـە مـافی یەکـسان لەهەڵبـژاردنی نوێنەرانـدا باسـدەکرێت"٧". ئـەم خاڵـە لـەوتارێکی گرنگیـدا بـەناوی «دیموکراسی و حکومـەت» وردکرایـەوە: «دیموکراسـیەکی عەقڵانیانـە ئـەوە نیـە کـە خـەڵکی تیایـدا حوکمبکـەن، بـەڵکو دەبـێ زەمانـەتی بـونی حکومـەتێکی باشیـشیان بدرێتێ»"٨".

بـەهای کارەکـەی میـل کاتێـك دەزانرێـت کـە ئـەوە بـەبیر بهێنینـەوە تەنانـەت ئەلەکـسی دی تـۆکڤیلیش دیموکراسـی بـەمانا کۆمەڵایەتیەکـەی دەهێنایـەئاراوە، و پەیوەندی لەنێوان یەکسانی کۆمەڵایەتی و دیموکراسیدا دەدۆزیەوە. تۆکڤیل لـەکتێبی دیموکراسی لەئەمەریکادا لەسەر بناغەی ئـەم تێڕوانینـە رۆیـشت، هەرچـەند لـۆژیکی باسـەکەی سـەرئەنجام شـیکردنەوەیەکی بـۆ دیموکراسـی پێـشکەشدەکرد بـەمانا سیاسیەکەی. ریمۆن ئارۆن نوسی: «تۆکڤیل وشـەی دیموکراسی زیـاتر بـۆ دیـاریکردنی جۆرێکی کۆمەڵگا بەکاردەهێنا تـا جۆرێکی دەسـەڵات...بـەبڕوای تۆکڤیـل دیموکراسـی بریتیە لەیەکسانکردنی هەلومەرجەکان. ئەو کۆمەڵگایە دیموکراتە کـە چیدی تیایدا ئەو جیاوازیانەی دەرئەنجامی پلەو چینەکانن بـوونی نیـە و کـۆی تاکـەکانی کۆمـەڵگا





لەرووی کۆمەڵایەتیەوە یەکسانن، ئەم یەکسانیەش بەمانایەك لـەرووی فکریـەوە نیـە کە شتێکی مەحاڵە، و یەکسانیش نیە لەرووی ئابوریەوە کە بەبڕوای تۆکڤیـل شـتێکی مـومکین نیـە. یەکـسانی یـان بەرابـەری کۆمەڵایـەتی، ماناکـەی ئەوەیـە جیاوازیـە بۆماوەکان لەرووی هەلومـەرجی کۆمەڵایەتیـەوە نـەبێت و هـەموو کارەکـان و هـەموو پلەو پایەکان و هەموو شانازیەکان لەبەردەستی هەمووانـدا بێت. کـەوابوو لەچـەمکی دیموکراسـیدا هـەم یەکسانی کۆمەڵایـەتی و هـەم مـەیل بـۆ یـەك شـکڵی شـێوەکان و ئاستەکانی ژیان هەیە»"٩". ئارۆن لـەوتاری «ئەلەکسی دی تۆکڤیل و کارل مـارکس»دا ئـەم خاڵـەی دوبـارە کردۆتـەوە: « تۆکڤیـل لەزوربـەی شـوێنەکاندا بـۆ دیموکراسـی هەلومەرجێکی کۆمەڵایەتی، نەك شکڵێکی حکومەتی لەبیردا بوو. تۆکڤیل دیموکراسی دژی ئەرسـتۆکراتیەت و رژێمـی پێـشوو کـە لەسـەر بناغـەی نایەکـسانی بـوو، بـەکاردەهێنا»"١٠". دەکرێـت دیـدی سـەرەکی تۆکڤیـل بەوشـێوەیە تەفـسیربکەین کـە یەکـسانی کۆمەڵایـەتی و حکومـەتی دیمـوکراتی دەبێـت بەیەکـەوە بوونیـان هـەبێت، بەدیهاتنی ئەم دوانەشی لەچوارچێوەی کۆمەڵگای هـەبوودا (کۆمـەڵگای سـەرمایەداری بەزەمانی مارکس) بەتەواوی بەشیاو (مومکین) دەزانی. تۆکڤیل بایـەخی بـەو کێشانە نەدەدا کە رۆسۆ هێنابویـە ئـاراوە، کـە پێیوابـوو درزێـك لـەنێوان یەکـسانی سیاسـی و هاوڵاتی لەگەڵ نایەکسانی کۆمەڵایەتیدا هەیە.

سودوەرگرتن لەمانای کۆمەڵایەتی دیموکراسی و وردنەبونەوە لەمانا سیاسیەکەی، لەنوسینەکانی پێشڕەوانی بزوتنـەوەی کرێکاری لەسـەدەی نۆزدەهەمـدا، بـە بەڵگـەی روونـەوە چـەندانجار زیـاتر لـەبیریارانی دی بـاوبوو. بـۆ نمونـە چارتیـستەکان دەرکـی دیموکراسـیان بـەمانای «بزوتنـەوەی جـەماوەری» دەکـرد. لەبەرهەمەکانیـشیاندا پەیوەنـدی نێـوان دیموکراسـی و «حکومـەتی خـەڵکی» نەدەخرایـە بـەر بـاس. ئـەنگلز لـەکتێبی «هەلومـەرجی چـینی کرێکـاری ئینگلتـەرا» (١٨٤٤)دا نوسـی «چارتیـستی ئینگلیزی لەدیدی سیاسیەوە کۆماریخوازێکە، هەرچـەند ئـەو بەدەگمـەن یـان هـەرگیز ئـەم وشـەیە بـەکاردەهێنێت، لەکاتێکـدا لایـەنگری حیزبـە کۆماریخوازەکـانی هـەموو وڵاتەکانـە و پێـی باشـترە کـە نـاوی خـۆی بنێـت دیمـوکرات. بـەڵام ئـەو زیـاد لەکۆماریخوازێکی رووتە و دیموکراسی بۆ ئەو تەنها مانایـەکی سیاسـی نیـە» (م ا-٤:٥١٨





)• چەند لاپەڕە دوای ئەوە نوسی: «دەکرێ لەم خاڵەدا جیاوازی نێوان دیموکراسی چارتیستەکان لەگەڵ هەموو دیموکراسی بۆرژوازی رابردوو بدۆزرێتەوە. چارتیست لەبنەڕەتدا ماهیەتێکی کۆمەڵایەتی هەیەو بەبزوتنەوەیەکی چینایەتی دەژمێرێت. (بەرنامەی) «شەش مادەیی» چارتیستی (کەلای پێشڕەوانی رادیکاڵی بۆرژوا لەحوکمی سەرەتا و کۆتایی هەموو شتێکدایە، ولەباشترین حاڵەتدا تەنها بە ریفۆرمێکی یاسایی دەزانرێت) بۆ پرۆلیتاریا تەنها ئامرازێکە لەرێگەی گەیشتن بە ئامانجەکانی بەردەمیدا. هاواری جەنگی چارتیستی کە زۆر باش دەربڕاوە، هەنوکە بەمشێوەیەیە: ئامرازی ئێمە دەسەڵاتی سیاسیە و ئامانجمان خوشبەختی کۆمەڵایەتیە» (م ا ٤:٥٢٤). لەدەقی سەرەوەدا ئاماژە بۆ بەرنامەی «شەش مادەیی»چارتیستی کراوە• گرنگترین و توندترین دروشمیان ریفۆرمی یاسای هەڵبژاردن بوو کە زۆرێك لەلیبڕاڵەکانیش لەگەڵیاندابوون. لەراستیدا ئەنگڵز ئەم دروشمانەی وەك «دروشمەکانی گواستنەوە» باسدەکرد و بڕوایوابوو خەبات بۆ بەدیهاتنی ئەم دروشمانە چوارچێوەی کۆمەڵگای باڵادەست دەگۆڕێت، و رێگە بۆ هێنانە ئارای دروشمی توندتر بەماهیەتێکی رونتری چینایەتیەوە دەکاتەوە. هەروەها دەقەکە رونیدەکاتەوە کە لەهەمان سەردەمدا وتوێژ لەبارەی جیاوازی دیموکراسی، وەك شتێکی سیاسی و وەك شتێکی کۆمەڵایەتی هەبووە، و لایەنگرانی مانای یەکەم رابردویەکی زیاتریان هەبووە. چونکە ئەنگلز باسی «دیموکراسی سیاسی بۆرژوازی رابردووی» کردووە.

دیموکراسی لەئەدەبیاتی سیاسی ئەڵمانیاشدا مانایەکی کۆمەڵایەتی هەبووە. ئەڵبەتە تاپێش شۆڕشی ١٨٤٨وشەی دیموکراسی ئەوەندە لەزمانی ئەڵمانیدا بەکار نەدەهات• ژمارەیەکی کەمی نوسەران کە بەکاریاندەهێنا، مەبەستیان لێی «دەسەڵاتی خەڵکی»بوو کە دەرخەری خواست و ئیرادەی زۆرینەی خەڵك بێت، و زۆرتر بە «بناغە و وبونیادی یەکسانی کۆمەڵایەتی تاکەکانیان» دەزانی. کریگەر لەکتێبی« چەمکی ئەڵمانی ئازادی»دا دەریخستووە کە وشەی دیموکراسی لەنوسینەکانی ئەرنۆڵد رۆگەدا هاومانای چەمکی «ریفۆرمی کۆمەڵایەتی» بوو، و رۆتکیش لە١٨٣٧دا دیموکراسی بە هەمان «دەسەڵاتدارێتی خەڵکی» زانیبوو، جەختیشی لەوە کردبوو کە پەرەسەندنی







کۆمەڵایەتی بەستراوە بەیەکسانی تاکەکان کە خاوەن مافی دەسەڵاتدارێتی بن. ویلهام شۆڵتز ئەم باسەی بە «خاوەن رۆحی لێکۆڵینەوەکانی تۆکڤیل» زانیووە و بڕوایوابوو بەدیهاتنی دەسپێرێت بەئایندە، واتە بە کاتێك کە ئامێرە کلتوریە پێویستیەکان ئامادەکرابن"١١". بەهەرحاڵ ئەم تێڕوانینە کۆمەڵایەتیە بۆ دیموکراسی، کاریکردبووە سەر بیرکردنەوەی هیگڵیە لاوەکان و مارکس. لەو رووەشەوە کە جەختی لەسەر پەیوەندی نێوان یەکسانی و ئازادی دەکرد، بۆ مارکس گرنگیەکی زیاتری هەبوو. مارکس بە خوێندنەوەی نوسینەکانی رۆسۆ ئەوە فێر بووبوو کە لەکۆمەڵگایەکی دامەزراو لەسەر بناغەی موڵکایەتی تایبەتی، ئازادی تەواو مومکین نیە. هەر باسێك لەبارەی ئازادیەوە، لەخزمەتی نایەکسانی ئابوریدایە. مارکس دەیگوت لەکۆمەڵگایەکدا کە لەسەر بناغەی تاکگەری خاوەن موڵك دامەزراوە، ئاراستە بەرەو یەکسانی کۆمەڵایەتی، بەناچار لەقۆناغەکانی یەکەمدا بەمانای پەرەسەندنی ئازادیەکان نابێت. ئەم خاڵە لەزیهنی مارکسدا جێگەیگرت و لێرەولەوێ بەشێوەی ئاماژە لەنوسینەکانیدا دەهێنرایەوە، تا دواجار لە«رەخنە لەبەرنامەی گۆتا»دا بەشێوەیەکی ورد دەربڕا. تێکشکانی سنورەکانی کۆمەڵگای هەبوو، بەهۆی بەردەوامی خەباتکردن بۆ ئازادی، وانەیەك بوو کە مارکس لەرۆسۆوە فێری بوو، لەباسەکەی ئێمەشدا گرنگیەکی زۆری هەیە"١٢".

بیرکردنەوە لەچەمکی کۆمەڵایەتی دیموکراسی، بەناچار ئەو خاڵە دەهێنێتە پێشێ کە ئازادی لەگەڵ دەسەڵاتی سیاسیدا ناگونجێ. لەنوسینە سەرەتاییەکانی مارکسدا، چەمکی دیموکراسی هەمان نەمانی دەوڵەتە. بۆ نمونە لە«پێشەکیەك بۆ رەخنە لەفەلسەفەی هەقی هیگڵ»دا دەخوێنینەوە: « فەرەنسیەکان لەسەردەمی مۆدێرندا تێگەیشتن کە لەدیموکراسیەکی واقعیدا، دەوڵەتی سیاسی لەناودەچێت» (م ا-٣:٣٠)"١٣". لەراستیدا لێرەدا وێنای مارکس هەرهەمان ئەو وێنایەیە، کە چەندان ساڵ دوای ئەوە لە بەرهەمەکانیدا لەبارەی کۆمۆنەی پاریسەوە هاتووە: لەناوچوونی دەوڵەت، دۆزینەوەی پێشەکیو هەلومەرجی پێویست بۆ لەناوچوونی موڵکایەتی تایبەتی، موڵکایەتی گشتی ئامێرەکانی بەرهەمهێنان لەلایەن بەرهەمهێنەرە پێکەوە گرێدراوەکانەوە. مارکس بەپێی ئەم تێروانینە بۆ دیموکراسی بە زمانێك کە لەژێر

کاریگەری رۆسۆدایە، ناکۆکی بنەڕەتی لەچەمکی سیاسی دیموکراسیدا دەدۆزیەوە، و بڕوایوابوو تا ئەوکاتەی لەزەمینەی واقعی چالاکی ئابوری کۆمەڵگای مۆدێرندا بونیادی نایەکسانی هەیە، پێشمەرجی پەیوەندی کۆمەڵایەتی و بەرهەمهێنان لەئارادایە، دەوڵەت وەك هێزێکی دەسەڵاتخواز بەسەر کۆمەڵگاوە، بەڵام لەخزمەت چینی باڵادەستدا بوونی دەبێت و تا ئەوکاتەش کە دەوڵەت هەبێت، ناکرێت باسی یەکسانی سیاسی بکرێت. مارکس وەك رۆسۆ بڕوایوابوو لەکۆمەڵگایەکدا کە لەسەر بناغەی نایەکسانی موڵکایەتی دامەزراوە، ئازادی بێسنور لەخەیاڵێك زیاتر نیە و بەدیهاتنی مومکین نیە. ئەو کەسانەی بڕواشیان پێیە (گریمان دەسەڵاتیش بگرنە دەست) ناچار دەبن لەبەرامبەر کەسانێکدا کە خوازیاری سنوردارکردنی یەکسانی و ئازادیەکانن رابوەستن، و لەپراکتیکدا ئازادیان سنورداربکەن.

مارکس لەرەخنەگرتنی بەندی ٣٠٩ی فەلسەفەی هەقی هیگڵدا و لەهەمان دەقی «پێشەکیەك بۆ رەخنەگرتن لەفەلسەفەی هەقی هیگڵ» ئاماژە بۆ جیابونەوەی ئەوانەی هەڵدەبژێرن و ئەوانەی هەڵبژێراون لەئەنجومەنەکانی بۆرژوازیدا دەکات، و تێڕوانینی رۆسۆ دوبارە دەکاتەوە کە بنەمای نوێنەرایەتی دەوڵەتی تازە، لەروانگەی وێنەییەوە روبەرووی کێشەیەکی چارەسەر هەڵنەگرە(م ا-١٢٤:٣، ن ا-١٩٣،١٩٤ )• چەندان ساڵ دوای ئەمە هەمان ئەم خاڵەی لە«جەنگی ناوخۆی فەڕەنسادا» دوبارە کردەوە: «لەبری ئەوەی هەر سێ یان شەش ساڵ بڕیار وەربگیرێ کە کام ئەندامی چینی باڵادەست نوێنەری درۆزنانەی خەڵکیە لەئەنجومەندا، هەڵبژاردنی گشتی لەکۆمۆنەدا کەوتە خزمەت خەڵکیەوە، خەڵکی لەکۆمۆنەکاندا فۆرمەلەبوو بوون، بەهەمانشێوە کە مافی رای فەردی دەچێتە خزمەت هەڵبژاردنی کرێکار یان بەڕێوەبەر لەپیشەی هەر خاوەن کارێکدا» (ب ن :٢١٠). ئەم دەقە دوبارەکردنەوەی بیرکردنەوەی رۆسۆیە کە لەفەسڵی پانزەی «پەیمانی کۆمەڵایەتی»دا نوسیوێتی: «دەسەڵاتدارێتی ناتوانرێ نوێنەرایەتی بکرێت، لەبەر هەمان هۆی کە ناتوانرێ (لەکەس)جیاو بێگانە بێت. دەسەڵاتدارێتی بەشێوەیەکی بونیادی لەخواستی گشتیدا شکڵوەردەگرێ، خواست ناتوانرێت نوێنەری هەبێت. خواست یان هەرئەوەیە (کە راستەوخۆ دەردەبڕێت) یان شتێکی ترە، رێگەیەکی نێوانی نیە. لێرەوە نوێنەرانی خەڵکی نوێنەریان نین و







ناتوانن ببن. ئەوان تەنها فەرمانبەری خەڵکن، ناتوانن لەبارەی هیچ شتێکەوە بڕیارێکی بڕاوە بدەن. هەر یاسایەك کە خودی تاکەکەس نەیسەلمێنێت، بێبایەخەو بە یاسا دانانرێت. خەڵکی ئینگلتەرا وادەزانن خەڵکێکی ئازادن، ئەمە هەڵەیەکی گەورەیە. ئەم خەڵکە تەنها لەکاتی هەڵبژاردنی ئەندامانی ئەنجومەندا ئازادن، هەرئەوەندەی ئەم ئەندامانە هەڵبژێران، خەڵکی کوێلەو هیچ دەبن. ئەو شێوەیەی خەڵکی ئینگلتەرا سود لەساتەوەختە کورتەکانی ئازادی خۆیان وەردەگرن، بەڕاستی پیشانیدەدات کە ئەوان شایەنی ئەوەن کە ئازادیش لەدەستبدەن»"١٤".

بونیادی فکر لەبارەی شێوەی سیاسیەوە لەرەخنەگرتنی مارکس لەهیگڵدا و ئەوەی مارکس لەبارەی کۆمۆنی پاریسەوە نوسی، یەك شتە. هەرچەندە نزیك سی ساڵ کەوتۆتە نێوانیانەوە. لەگەڵ ئەوەشدا کە لەم ماوەیەدا ئەزموونی گرنگ لەبواری پێشکەوتنی دیموکراسی لەئینگلتەرا و ویلایەتە یەکگرتووەکاندا بەدەستهاتبوو، بەڵام مارکس دیدی خۆی لەبارەی سنوردارێتی دیموکراسی بۆرژوازیەوە نەگۆڕی. ئەو هەروا بە سوربونەوە رایدەگەیاند نایەکسانی ئابوری، ئەگەری دەرکەوتنی یۆتۆپیای دیموکراسی بۆرژوازی نادات. هەرکاتێك شۆڕشی کۆمەڵایەتی رێگەی بۆ لەناوبردنی نایەکسانی واقعی، واتە مادی و ئابوری کردەوە، ئەوسا خەڵکی دەتوانن نوێنەرانی خۆیان هەڵبژێرن و لەهەر بابەتێکی تایبەتدا بۆ ئەو نوێنەرانە بگەڕێنەوە و رونکردنەوەیان لێ داوابکەن و لەهەرکاتێکیشدا کە ویستیان ئەو نوێنەرانە لابەرن. لەراستیدا مارکس نمونەی کۆمیتەکانی مانگرتنی کارخانە یان لەشێوەیەکی سیاسیتردا شورای کرێکارانی، وەك نمونەی دیموکراسی راستەوخۆ دەناساند• پێشتر لەفەسڵی شەشەمدا بینیمان مارکس جارێکیش شوراکانی رەدکردەوە، و باوەڕکردن بەم شورایانەی بە ورێنەی دیموکراتی وردە بۆرژوا ناونا. لێرەدا کارمان بەم خاڵە نیە، تەنها دەبێت جەخت لەوەبکەین کە تەنانەت بەگریمانەی بڕوای کامڵی مارکس بە شوراکان (کە دیارە شوراکان لەئامانجی دیموکراسی راستەوخۆوە نزیکترن لەپەرلەمانەکان)، ئەوا هێشتا ئەو مەسەلەیەی جێی سەرنجی مارکسە، چارەسەر نابێت•

گریمان من لەشورادا دەنگ بۆ یەکێك دەدەم و مافی ئەوەم هەیە لەسەر هەر

شتێکی تایبەت لێی بپرسم کە چۆن لەبری من بڕیاردەدات. دەتوانم لەهەرکاتێکدا ویستم و بەڕاستمزانی، لایبەرم. بەروکەش پێدەچێت ئەم «دیموکراسیە راستەوخۆیە» (بەوتەی نۆربرتۆ بۆبێۆ) دەتوانێت دەربڕی بەدیهاتنی ئازادانەی خواستی من بێت، تەنها بەمەرجێك. بەو مەرجەی پەیوەندی من و ئەو، پەیوەندی نێوان تاکێك و تاکێك بێت. هەرکاتێك من ئەوم لەئەنجامی هەڵبژاردنێکی گشتیدا هەڵبژارد، واتە ناچارم تەسلیمی هەڵبژاردنی زۆرینەی دەنگدەران بم. رەنگە من دەنگم بەو نەدابێت، تەنها بەپێی رێسای دیموکراسی تەسلیمی رای زۆرینە بووبم، ئەم خاڵە لەبارەی هەر گەڕانەوەیەکی من بۆ ئەو، و لێپرسینەوەم و لەبارەی لابردنیشیەوە راستە. هەموو ئەمانە لەچوارچێوەی ئیرادەی گشتیدا و بەپێی رای زۆرینە، روودەدەن. کەوابوو ئەو ئازادیە خەیاڵیەی مارکس و لایەنگرانی شوراکان لەپراکتیکدا بەتەسلیمبوون بە رەهەندی ناچاری قبوڵکردنی رای زۆرینە، کەمڕەنگ دەبێت و تەنانەت دەکرێ گریمانەی ئەوە بکرێت کە لەهەندێك حاڵەتدا بەتەواوی لەناوبچێت. ئەو خاڵەی کە من تەنانەت گەر یەکێك بم لەبەرامبەر هەمووانـدا، هێشتا خاوەن هەموو مافێکی کەمایەتیم، ئەڵبەتە دەربڕی مافێکی دیموکراتیە، بەڵام لەراستیدا لەجیابونەوەی خواست و ئیرادەی من لەبڕیارێك کە بەناوی زۆرینەوە وەردەگیرێت، کەمناکاتەوە. ئەو رەخنە سەرەکیەی لەپەرلەمانە بۆرژوازیەکان دەگیرێت، لەشوراکانیشدا وەك خۆی دەمێنێتەوە. من لەخواستی خۆم جیادەبمەوە، چونکە بنەمای نوێنەرایەتی و و بنەمای مافی زۆرینەم قبوڵکردووە. بونیادی شوراکان، هەمان ئەو «پەرلەمانتاریسم»ەیە کە مارکس نەفرەتی لێبوو، هەرچەندە شێوەکەی دیموکراتیترە. ئەوەی هەر ئەمشێوە دیموکراتیە دەبێتە هۆی چ کێشەگەلێك و تا چ سنورێك لەبڕیار وەرگرتنە خێراکاندا (بۆ نمونە لەروبەروبونەوەی سەربازی کە بەردەوام لەروانگەی مارکسدا گرنگبوون) یان لەپێشکەوتنی کارەکاندا کێشە دروستدەکات، بەناچار لەپراکتیکدا دەخرێتە ژێر پێوە. هەموو ئەمانە وەك چەندان مەسەلەی دی تەنها کاتێك دێتەپێشێ کە شوراکان بەڕاستی هەبن و چالاکیبکەن. لەپراکتیکدا شوراکان هەرگیز تەمەنێکی درێژیان نەبووە، هەرگیز جێی پەرلەمانیان نەگرتۆتەوە و هەر ئەمشێوە ناڕاستەوخۆیەی دیموکراسی (واتە پەرلەمان)، بە کاراترین شێوە ماوەتەوە، بەتایبەت لەو وڵات یان شارانەدا کە سەرژمێرێکی زۆریان هەیە، کە گەڕانەوە بۆ







وەکیل لەهەموو حاڵەتەکاندا مومکین نیە.

مارکس لەرەخنەکردنی رێبازی سیاسی هیگڵدا دەرئەنجامێکی وەرگرت کە تا کۆتایی ژیانی لەگەڵیدا مایەوە. لەناوچوونی موڵکایەتی تایبەتی ئامێرەکانی بەرهەمهێنان و لەناوچوونی دەوڵەت، بە مانای سەقامگیربوونی پەیوەندیەکی کۆمەڵایەتی تازەیە کە راستەوخۆ لەپەیوەندیەکانی پێشوو جیاوازن، و لەم پەیوەندیە تازانەدا ئەگەری یەکسانی کۆمەڵایەتی تاکەکان و لەدەرئەنجامدا ئەگەری بەدەستهێنانی ئازادی دەرخسێت. مارکس بەردەوام لەم مانا کۆمەڵایەتیەدا باسی دیموکراسی دەکرد و لەهەموو شوێنێکدا کێشەی دێرینی نامومکین بوونی یەکسانی سیاسی و کۆمەڵایەتی لەکۆمەڵگای چینایەتیدا، بەبیر دەهێنایەوە. مارکس بەدیهاتنی یەکسانی کاملی ئابوری و کۆمەڵایەتی لەکۆمەڵگای سەرمایەداریدا بە نامومکین دەبینی و کاتێك بەشێوەیەکی بڕاوە حوکمیدەدا (و مارکس مامۆستای حوکمە بڕاواکان بوو) کە دیموکراسی لەم کۆمەڵگایەدا بەدەستنایەت، مەبەستی ئەوەبوو دیموکراسی بەمانا کۆمەڵایەتیەکەی واتە یەکسانی کاملی ئابوری و کۆمەڵایەتی تاکەکان، لەچوارچێوە و لەناو پەیوەندی کۆمەڵایەتی و بەرهەمهێنانی سەرمایەداریدا نامومکینە. بەر لەمارکس ئادام فرگسۆن بەڕاشکاوی نوسیبووی کە بەبوونی سیستەمی کار لەکارگە و کارخانەکاندا، چیدی قسەکردن لەمرۆڤی ئازاد لەکۆمەڵگای مەدەنی هاوچەرخدا پتر لەنوکتەیەك دەچێت. فرگسۆن لە«مێژووی کۆمەڵگای مەدەنی»دا نوسیبووی : «ئێمە گەلێکی کۆیلەمان دروستکردووە و چیدی خاوەن هاوڵاتی ئازاد نین»"١٥". ئەم قسانە هی بیریارێکی سۆسیالیست نین، بەڵکو هی فەیلەسوفێکی لایەنگری هیوم ولۆکە. دەکرێ نمونەیەکی زۆر لەسەلماندنی بیریارانی ئەو رۆژگارە بۆ خەسڵەتی نائازادی ژیان لەکۆمەڵگای مۆدێرندا، بەتایبەتی کار لەم کۆمەڵگایەدا بهێنرێتەوە. کەوابوو هیچ جێگەی سەرسوڕمان نیە مارکسیش بە سەرنجدان لەباوەڕە سیاسیەکانی، ئەوەندە دوژمنایەتی بانگەشەکانی سەرمایەداری لەبارەی ئازادی و دیموکراسیەوە، لەخۆی پیشانبدات. هەلومەرجی بەراستی نامرۆڤانەی ژیانی چینی کرێکاری سەردەمی مارکس کە لەیەکەم بەرگی «سەرمایە»دا شەرحێکی ترسناککراوە و بەهەزاران بەڵگەی دەوڵەتی و فەرمی و نوسینەکانی بیریاران و نوسەرانی دی سەدەی نۆزدەهەم (کە هەموشیان بڕوای رادیکال و

سۆسیالیستیان نەبوو) دەسەلمێنرا، دەبووە هۆی ئەوەی مارکس بەدوژمنایەتیەوە تەماشای بانگەشەی ئازادیخوازی بۆرژواکان بکات"١٦".

مارکس بەتایبەتی پاش شکستی شۆڕشی ١٨٤٨، دیموکراسی بەمانای تێپەڕین لەکۆمەڵگای سەرمایەداری دەناسی و بڕوای بە بوونی دەوڵەتی دیموکراتی بۆرژوازی نەبوو. پێشتر ئەنگڵز لەساڵی ١٨٤٨دا لەوتاری «نمونەی تازەی کوشتار لەئەڵمانیادا» نوسیبووی: «دیموکراسی و کۆمۆنیزم تا ئەو جێگەیەی پەیوەندی بە چینی کرێکارەوە هەیە، یەك مانایان هەیە» (م ا ٦٤٧ ٤:). مەبەستی ئەنگڵز لەدیموکراسی بریتیبوو لەچڕبونەوەی دەسەڵاتی سیاسی لەدەستی زۆرینەی خەڵکیدا، بەمەبەستی دروستکردنی گۆڕانکاری کۆمەڵایەتی. ئەنگڵز لەنامەیەکدا بۆ «کۆمیتەی پەیوەندیە کۆمۆنیستیەکان» لەبرۆکسێل، نوسی: «شۆڕشی دیموکراتی، تەنها بەمانای شۆڕشی کۆمەڵایەتی پرۆلیتاریایە» (م ب:٢٧). ئەم قسانە تێڕوانینی ئەنگڵز و مارکس بۆ دیموکراسی، پیشاندەدەن. مارکس لە«چارتیستەکان»دا لەدەی ئوتی ١٨٥٢دا نوسی: «لەئینگلتەرادا مافی رای گشتی ئەوەیە کە چینی کرێکار دەسەڵاتی سیاسی بگرێتە دەست» (ب ت:٢٦٤) و هاوڕێ لەگەڵ ئەنگڵزدا لەمانیفیستدا نوسی: «یەکەم هەنگاوی شۆڕشی کرێکاری بریتیە لەهێنانە سەرەوەی چینی کرێکار بۆ جێگەی چینی باڵادەست و بەدەستهێنانی دیموکراسی» (م ا ٥٠٤ ٦:). بەبڕوای ئەو دیموکراسی واتە حکومەتی چینی کرێکار و لەئەنجامدا هیچ شێوەیەك حکومەتی دیموکراتی بۆرژوازی، قبوڵنەبوو. مارکس بەبیرهێنانەوەی خەسڵەتی روکەشی یەکسانی سیاسی لەکۆمەڵگای بۆرژوازیدا، بڕوایوابوو کە هەرجۆرە وێنایەکی دیموکراسی لەم کۆمەڵگایەدا ساوێلکانەیە.

مارکس لەنامەیەکدا بۆ ئەنگڵز (٨ی سپتامبری١٨٦٤) سیستەمی سیاسی ویلایەتە یەکگرتوەکانی وەك «نمونەی تەڵەکەبازی دیموکراتی» باسکرد (ا م:٢٠٢) و لە«هەژدەهەمی برۆمێر»دا ئەو دیدەی کە بەدیهاتنی دیموکراسی لەکۆمەڵگای بۆرژوازیدا بە مومکین دەزانێ، بە «نەخۆشی هیچ و پوچی پەرلەمانی» ناوهێنا و بە «نەخۆشیەکی زۆر تایبەتی» زانی کە «لەساڵی ١٨٤٨ وە لەسەرتاسەری ئەوروپادا بڵاوبۆتەوە... و هەرکەس توشی بێت، دەبێ بە کۆیلەی جیهانێکی خەیاڵی کە هەر







جۆرە هۆش، هەرجۆرە بیر و هەر جۆرە تێگەیشتنێکی بۆ جیهانی سەختی واقعی لێدەسێنێ» (ە ب:١٢٠،ب ا-١:٤٥٤). مارکس لە«ململانێی چینایەتی فەرەنسا»دا بوونی مافی دەنگدانی لەدەستوری بۆرژوازیدا، بەسەرچاوەی گەلێك دژایەتی دەزانی: «لەگەڵ هەموو ئەمانەدا ئەو دژایەتیە سەرەکیەی لەدەستوردا هەیە بریتیە لەرای گشتی: بە ڕای گشتی و هەڵبژاردن، هەمان ئەو چینانەی کە وەك پرۆلیتاریا و جوتیاران و وردە بۆرژواکان کە بڕیارە بەم یاسایە کۆیلایەتیان بۆ هەتا هەتایە بەردەوامبێت، دەبن بە خاوەن دەسەڵاتی سیاسی. لەکاتێکدا هەر ئەم یاسایە، زەمانەتی پێویست بۆ دەسەڵاتی سیاسی لەچینێك کە دەسەڵاتی کۆمەڵایەتی کۆنی پێ دەسپێرێ، واتە لەچینی بۆرژوازی درێغدەکات. ئەم یاسایە دەسەڵاتی سیاسی بۆرژوازی بە پێشبینی هەنگاوی دیموکراتی کە سەرکەوتنی چینە دوژمنەکانی بۆرژوازی لەهەر ساتەوەختێکدا مومکیندەکات، کۆنترۆڵدەکات و بەمشێوەیە بناغەکانی کۆمەڵگای بۆرژوازی لەهەر ساتەوەختێکدا دەخاتە بەردەم مەترسی ئەم هەنگاوانە. لەگروپێك (واتە پرۆلیتاریا، جوتیاران، وردە بۆرژواکان)داوا دەکات لەسنوری ئازادی سیاسی زیاتر نەڕۆن و لەگروپێکی دی (واتە لەبۆرژوازی) داوا دەکات کە بە رزگاربوونی کۆمەڵایەتی خۆی رازی بێت و داوای ژیانەوەی سیاسی نەکات» (ن گ:٦٣،ب ا-١:٢٣٦-٢٣٥)

## رەخنەگرتن لەدیدی مارکس بۆ دەوڵەتی دیموکراتی بۆرژوازی

لەروانگەی مارکسەوە دیموکراسی لەچوارچێوەی کۆمەڵگای بۆرژوازی و شێوەی بەرهەمهێنانی سەرمایەداریدا بەدەستنایەت. مارکس بەشێوەیەکی بڕاوە دەیگوت دیموکراسی بەمانا کۆمەڵایەتیەکەی، واتە یەکسانی تەواوی ئابوری و کۆمەڵایەتی تاکەکان لەچوارچێوە و لەناو پەیوەندیە کۆمەڵایەتی و بەرهەمهێنانی سەرمایەداریدا، مومکین نیە. خاڵەکە لێرەدایە کە لایەنگرێکی دیموکراسی بۆرژوازیش بانگەشەی ئەوە ناکات کە ئەم دیموکراسیە بەمانای یەکسانی کاملی کۆمەڵایەتیە، و ناڵێت کە بە بەرپاکردنی ئەمشێوە یەکسانیە سیاسیە و ئەم سیستەمە سیاسیە دیموکراتیە، نایەکسانی ئابوری لەناودەچێت. هەرکاتێك دیموکراسی بەمانای یەکسانی تەواو و رەهای تاکەکان بێت، یان بەیەکسانی کۆمەڵایەتی تەواو بناسین، نکوڵی لەوە ناکرێت کە لەهیچ حکومەتێکی دیموکراتی

هەبوودا و لەهیچ ئەزمونێکی دیموکراتی پاش مارکسدا بەدەستنەهاتووە. بەڵام چ کەسێك گوتوێتی قبوڵی دیموکراسی سیاسی و جێبەجێکردنی، بەمانای لەناوبردنی نایەکسانی مادی و ئابوریە؟

لایەنگرێکی دیموکراسی سیاسی یان بەوتەی مارکس دیموکراسی بۆرژوازی، دەڵێت ئەم شێوە سیاسیە باشترین ئەگەر، بۆ هەموو خەڵکی دەرەخسێنێت، بۆئەوەی بەشداری لەو بڕیارانەدابکەن کە پەیوەندی بەژیانی کۆمەڵایەتی خۆیانەوە هەیە. لەئەنجامدا رێگا بۆ دەستگەیشتن بەزۆرترین سنوری کارایی خۆشدەکات. دیموکراتی ئەمڕۆیی دەڵێت، ئەو بڕیارانەی لەم سیستەمە سیاسیەدا دەدرێت، زۆرتر لەگەڵ عەقڵی گشتیدا دەگونجێت. لەهەمانکاتدا هەرئەم لایەنگرەی دیموکراسی سیاسی دەڵێت ئەمشێوەیە واتە دیموکراسی پەرلەمانی، تا هەنوکە باشترین شێوەی ژیانی سیاسیبووە، بەڵام نە کامڵەو نە کۆتایی هەیە. یەکسانی هاوڵاتی لەبەرامبەر یاسادا زامندەکات، دەبێتە هۆی دابەشبونی هێزەکانی یاسادانان، جێبەجێکردن و دادوەری، یان لایەنیکەم رێگەی جوڵە بەرەو دابەشبونێکی وا دەکاتەوە، حکومەتی یاسا دادەمەزرێنێت، مافە مەدەنیەکان پەرەپێدەدا، ماڤ دەنگدانی هەموو ژنان و پیاوانی پێگەیشتوو قبوڵدەکات، تەمەنی دەنگدان لە٢١ وە کەمدەکاتەوە بۆ ١٨ (لەهەندێك حاڵەتدا کەمتریش) و تەنانەت لەچەمکی بەرپرسیاری هاوڵاتیانی عاقڵیشدا گۆڕانکاری دروستدەکات، لەم حاڵەتەشدا مافە کۆمەڵایەتیەکان پەرەپێدەدا (لەهەڵبژاردنی سیاسی ئینگلتەرادا لەناو خەستەخانە دەرونیەکانیشدا، رای «نەخۆشەکان»یش وەردەگیرێت). لەهەمانکاتدا شێوازە جیاوازەکانی خۆبەڕێوەبردن لەکارخانە و بەڕێوەبەرایەتیەکاندا تاقیدەکرێنەوە و تائەو شوێنەی کە لەگەڵ یاساکاندا بگونجێن، دیموکراسی کار تاقیدەکرێتەوە..بەدەربڕینێکی باشتر بە ئەزموونی دیموکراسی سیاسی، هێواش هێواش لەپرۆسەیەکی ریفۆرمی درێژخایەندا، ئەگەری پەرەسەندنی دیموکراسی کۆمەڵایەتیش دەرەخسێت. باجە روو لەزیادەکان سەبارەت بە دارایی و دەرامەت، یەکێکە لەهەزاران نمونە. ئەمانە بانگەشەکانی دیموکراتێکی ئەمڕۆییە، مارکسیش کە تەنانەت ئەم سنورەی پێشکەوتنی باس و پراکتیکی بە خەیاڵی دەزانی، کێشەی لەگەڵ ئەم وتوێژە فیکریەدا نییە، بەڵکو لەگەڵ بونەوەرێکی خەیاڵیدا وتوێژ دەکات کە گوایا دەڵێت دیموکراسی بەمانای یەکسانی







کامڵی مرۆییە.

کێشەی گەورەی لۆژیکی و سیاسی لەباسەکەی مارکسدا سەبارەت بە دیموکراسی ئەوەیە کە ئەو لەناموکین بوونی بەدیهاتنی یەکسانی کۆمەڵایەتی و ئابوریەوە لەچوارچێوەی کۆمەڵگای سەرمایەداریدا (گریمان مارکس راستدەکات و رەوتی ریفۆرمی درێژخایەن، دواجار ناتوانێت ببێ بە پەرەسەندنی دیموکراسی کۆمەڵایەتی)، بە ناموکین بوونی دەستگەیشتن بە دیموکراسی سیاسی دەگەیشت. لەراستیدا مارکس کاری بەسەر کێشەکانی چەمکی یەکسانی سیاسیەوە نەبوو، بەڵکو بەشێوەیەکی بڕاوانە و بە راشکاوی ئەگەری پەیدابوونی دەوڵەتی دیموکراتی بۆرژوازی رەد دەکردەوە. مارکس لەو راستیەوە کە لەسەردەمی ژیانی خۆیدا ئازادیەکانی و مافە سیاسیەکان یەکجار سنورداربوون و بەردەوام لەژێر هەڕەشەی پارێزگاران و کۆنەپەرستاندا بوون و لەژێر مەترسی لەناوچوندابوون، بەو دەرئەنجامە نادروستە گەیشت کە لەبنەڕەتدا لەچوارچێوەی کۆمەڵگای سەرمایەداری و سیستەمی بەرهەمهێنانی هەبوودا، دەستگەیشتن بە ئازادیە سیاسی و دیموکراتیەکان مومکین نیە. مارکس لەو خاڵەوە کە لەناکاو بەشێکی گەورە لەئازادیە سیاسیەکان پەیدانابن، بەو دەرئەنجامە گەیشت کە لەبنەڕەتدا دەوڵەتی دیموکراتی بۆرژوازی ناتوانێت پەیدا بێت. ئەو دەوڵەتی دیموکراتی بۆرژوازی بە دژایەتی لەپێناسدا دەزانی. ئەزمونی پراکتیکی و مێژوویی واتە ئەو پێوەرەی کە خۆی قبوڵیبوو، نادروستی ئەم قسانەی سەلماندووە.

ئەو هێنانەوەی لە«ململانێی چینایەتی لەفەرەنسادا» کە چەند لاپەڕەیەکی پێشوو بەشێکی پێشووم پێداخست، بەباشی پیشانیدەدات مارکس بچوکترین وێنای بۆئەوەی ئەمڕۆ لەزوربەی وڵاتەکانی جیهاندا روودەدات، نەبوو. ئەو چینە ستەملێکراوانەی ماڤ دەنگدانیان بەدەستهێناوە، نەبوون بەخاوەنی دەسەڵات، بەڵام بەشدارن تیایدا. واتە زۆرێك لەخواستەکانیان دێتەدی، و نوێنەریان لەناو دەوڵەت و ئەنجومەندا هەیە. بناغەکانی کۆمەڵگای بۆرژوازیش نەکەوتونەتە مەترسیەوە و بەدەر لەقەیرانە ئابوریەکان و گرفتارە سیاسیەکان، لەسەر هەمان ریتم دەڕوات کە مارکس چاوی پێی هەڵنەدەهات. بەرنامەی سیاسی بۆرژوازی لەلایەن ئەوانەوە کە هیچیان نیە،

بەشێوەی جۆراوجۆر قبوڵکراوە. حیزبگەلێك بە بناغەیەکی گەورەی کرێکاریەوە و بەرنامەی جۆراوجۆری سۆسیالیستیەوە دێنە سەرکار (وەك حیزبە سۆسیالیستەکان لەفەرەنسا، ئەلمانیا، ئیتالیا و ئیسپانیا و حیزبی کرێکاری ئینگلتەرا). ڕێکخراوە کرێکاریەکان هەندێکجار دەوری زۆر گەورە دەبینن (ئینگلتەرا لەدەیەی١٩٧٠دا). ئەو دوریانەی مارکس باسیدەکرد دروستنەبوو، بەڵکو هەزاران ڕێگە دروستبوون. لەکاتێکدا مارکس «واقعیەتی جیهانی سەرسەخت و توندوتیژی دەرەوەی» دەبینی و بەدروستی لەژیانی سیاسی سەردەمی خۆیدا، هێندە ئاماژەی بۆ یەکسانی سیاسی و هەڵبژاردنی ئازاد نەدەدۆزیەوە (لەو سەردەمەدا ماڤی دەنگدانی ژنان، خەونێکی مەحاڵ دەهاتە پێشچاو)، لەدیدی تیوریشەوە دەوڵەت دیموکراتی بۆرژوازی ڕەد دەکردەوە، ئەمەش خۆی هەڵەبوو. هەرچەندە ئەزموونی فاشیزم لەئەوروپا، پەیدابوونی پارێزگارانی نوێ یان بەوتەی تێری ئیگڵتۆن «شەوی دورودرێژ و تاریکی تاچەر-ڕێگان»"١٧" توانای شکانی دەستکەوتەکانی دیموکراسی پیشاندەدات، بەڵام مێژووی نیوەی دوهەمی سەدەی بیستەم پیشانیدەدات، کە دیموکراسی بەگشتی بەهێز و رووی لەپەرەسەندنە. واتە پانتایی ماڤە دیموکراتیەکان بەشێوەیەکی بەردەوام گەشەیکرد و کۆمەڵێك خاڵی تازە هاتە پێشەوە. بەدەر لەقابلیەتی شکانی هەندێك پێشنیار و هەندێك مەسەلەی پراکتیکی کە دێنە پێشەوە (مەسەلەی کۆچی نائەوروپیەکان بۆ ئەوروپا گەشەکردنی حیزبە راستڕەوە توندڕەوەکان لەئەوروپا)، دیسان سەرنجدەدەین کە سیستەمە دیموکراتەکان و باوەڕە لیبڕاڵیە نوێکان، توانایەکی زۆریان لەچارەسەرکردنی ئەو مەسەلانەدا هەیە کە روبەرویان دەبێتەوە. مارکس دەیگووت دیموکراسی بۆرژوازی تەنها بە سنورداركردنی نیازەکان دەتوانێت وەڵامی ئەو نیازانە بداتەوە و جگە لەرێگەی کەمکردنەوەی ماڤە مرۆییەکان، توانای زامنکردنی بەردەوامی خۆی نییە"١٨". ئەزموونی پراکتیکی ڕێك پێچەوانەی ئەم باوەڕەی مارکسی سەلماند. بەرهەمهێنانی بۆرژوازی بەوشێوەیەی مارکس بەباشی لەلێکۆڵینەوە ئابوریەکانی خۆیدا ئاماژەی بۆ کردووە، تەنها بۆ پێویستیی مادە دروستناکات، بەڵکو بۆ مادەش نیاز دروستدەکات. سەرمایەداری خەریکی پەرەسەندنی نیازەکانە. ئەمەش خەسڵەتی بنەڕەتی بەرهەمهێنانێتی. گرنگتر لەمە ئەوەیە، نەیدەتوانی وابێت گەر وەڵامی نیازە هەبوەکانی نەدایەوە. بیریارانی





قوتابخانەی فرانکفۆرت بیرهێنەرەوەی «نیازە ناڕاستەکان» بوون، بەتایبەتی تیۆدرۆ ئادرنۆ بەشیکردنەوەی پیشەسازی کلتور و کلتوری جەماوەری، ئەم خاڵەی بردۆتە پێشێ. دەکرێ درێژە بەم باسە بدرێت یان قبوڵبکرێ، بەڵام ئەو خاڵەی جێی سەرنجی مارکس بوو، ئەمە نەبوو. مارکس لەبنەڕەتدا نکوڵی لەتوانای وەڵامدانەوەی بۆرژوازی بە نیازەکان (چ راست یان هەڵە، غەریزەیی یان داهێنەرانە) دەکرد، (لەمەشدا) راستی نەدەکرد. رەخنەگرتن لەدیدی مارکس لەبارەی نامومکینبوونی بەدیهاتنی دیموکراتی بۆرژوازی، بەمانای قبوڵکردنی سیاسی ئەم دەوڵەتە نیە. ئەم دەوڵەت بابەتێکی واقعیە و مارکسیش ئەم واقعیەتەی دەرك نەکردبوو، بەڵام وتنی ئەوەی کە بابەتێکی واقعیە، هەرگیز ناتوانێت بەومانایە بێت کە بابەتێکی عەقڵانیانە، دروست و قابلی قبوڵکردنیشە. بۆ ئەمە دەبێت بەدوای وتوێژەکانی ئەمرۆدا بچین، لەئەزمونە هەبوەکان وردبینەوە و لەهەمووشی گرنگتر بە بیرکردنەوەی رەخنەگرانەوە، روبەرووی دەوڵەتە دیموکراتیەکانی سەرمایەداری ببینەوە. لەراستیدا رەخنەگرتن لەمارکس دەتوانێت هاوڕێ بێت لەگەڵ رەخنەی رادیکاڵ لەبنەما میتافیزیکیەکانی مۆدێرنە و عەقڵانیەت و تێڕوانینی لیبڕاڵە نوێکان بۆ ئازادی و دیموکراسی"١٩".

ئەو خاڵە کە مارکس ئەگەری دروستبوونی دەوڵەتی دیموکراتی بۆرژوازی نەفیدەکات، بەهیچ شێوەیەك بەرگری لێناکرێت. ئاینس هیلەر نزیك بیست ساڵ لەمەوپێش نوسیبووی: «یەکسانی لەبەرامبەر یاسادا هەرگیز لەدروشمێك زیاتر نەبووە، چونکە لەدژایەتیەکی هەمیشەییدایە لەگەڵ نایەکسانی موڵکایەتیدا. بۆ شاردنەوەی ئەم دژایەتیە بەردەوام سەربەخۆیی هێزی دادوەریان وەك زەمانەتێکی ڕێژەیی، هێنانەوەتە پێشێ. لەئاستی دروشمدا ئەم هێزە، لەهێزی جێبەجێکردن و یاسادانان سەربەخۆیە، بەڵام هەرگیز ناتوانێت بنەمای ئەو نایەکسانیە بریندرابکات. کۆی ئەو یاسایانەی پەیوەندیان بەم نمونەیەوە هەیە، ماڤی یەکسانی تاکەکان زامندەکەن، بەڵام ئەم مافانە ناتوانن جێبەجێبکەن، مەگەر لەرێگەیەکی نێگەتیڤەوە، واتە لەرێگەی قەدەغەکردنی هەندێك کرداری مرۆییەوە. حوکمە بەناوبانگەکەی ئاناتۆل فرانس کە هەر پێناسێکی یەکسانی گەر بە نەفی یان بە سلب پێناسبکرێت، شتێك نیە جگە لەئامرازێك بۆ قبوڵاندنی نایەکسانی، مانایەکی قوڵتری هەیە لەوەی





کە سەرەتا دەردەکەوێت."٢٠". ئاینس هیلەر وەك مارکسیەك هەروا خوازیاری هەموو شتێکبوو. ئەو یەکسانی یاسایی بەکامڵ نەدەزانی، زامنکردنەکانی بە بەس نەدەناسی و رەخنەی لەئازادی نێگەتیف هەبوو. لەراستیدا دەیگووت یا هەر ئێستا و هەر لێرەدا هەموو ئازادیەکان دەدەن، یان درۆ دەکەن. بەڵام دیموکراسی جگە لەپرۆسەی گۆڕانکاریەکی بەردەوام هیچیدی نیە. بەردەوام دۆزینەوەی زۆرتری بوارە نادیارەکانی ئازادی مرۆیی، بەردەوام چونە پێشەوە و زۆرتر ویستنە. یەکسانی لەبەرامبەر یاسادا ئامانجە، ئازادی نێگەتیف «ئازادبوون لە» بەس نیە، بەڵام هیلەر پێشنیاری کام ئەزموونی ئازادی پۆزەتیف بۆ ئێمە دەکات؟ دوبارەکردنەوەی ئەو مەسەلەیەی کە دیموکراسی لیبراڵی شتێکی کامڵ نیە، هیچ شتێك چارەسەرناکات، چونکە هیچ لیبراڵێکی راستەقینە بڕوای بەوەنیە کە دیموکراسی کامڵ بتوانێت بێتەدی، بەڵام دەڵێت هەرگیز نمونەیەك تا سنوری ئەم چەمکەی دیموکراسی و کارپێکردنی، هێندە نرخ و بەهای بۆ بیروبۆچوونی نەیار دانەناوە، نەبۆتە هۆی پەرەسەندنی بواری ماف و ئازادیەکان، نیازە تازەکانی مرۆڤی نەدۆزیوەتەوە و زامنی پێویستی بۆ دۆزینەوەی رێگەچارەی دی پێشکەشنەکردووە .چ سودێکی هەیە گەر رەخنە لەئازادی لیبراڵی بگرین، بەڵام تەنانەت نەتوانین باسکردنی ئازادی پۆزەتیف و شێوەی دیموکراسی، تۆزقاڵێك بەرینە پێشەوە یان رێگەچارەیەك پێشکەشبکەین؟ بۆچی دەبێت هێرشبکەینە سەر لیبراڵەکان کە بەر لەسەدەونیوێك یەکێك لەبیریارەکانیان، جۆن ستیوارت میل، حوکمێکی دەربڕی کە کۆمۆنیستەکان هەرگیز نەیانتوانی تەنانەت بیری لێبکەنەوە: «ئەگەر هەموو تاکەکانی مرۆڤ جگە لەیەك کەس، یەك بڕوایان هەبوو و تەنهاش یەك کەس نەیاری ئەوبڕوایەبوو، کاری ئەمانە بۆ ئەوەی دەنگی ئەم یەك کەسە سەرکوتبکەن، هەر هێندە ناهەق و ناڕاوەیە کە ئەگەر ئەو یەك کەسە توانای ئەوەی هەبێت، دەنگی کۆی مرۆڤەکانی دی سەرکوتبکات»."٢١".

مارکس بڕوایوابوو ئازادیەکان بەردەوام لەسیستەمی سەرمایەداریدا، لەژێر مەترسیدایە. کەوابوو لەبری پێشنیاری کۆمەڵێك سیاسەتی کرێکاری کە بەرگری لەئازادیە هەبوەکان بکات، پێشنیاری سیاسەتی جەنگی چین دژی چینێکی دی دەکرد. قسەکەی مارکس بەمانای ئەوەبوو: بۆ ئازادیەکان خەباتبکەین، بەڵام نەك بۆ ئازادیەکان، بەڵکو بۆ تێکشکانی چوارچێوەی کۆمەڵگای هەبوو. مارکس و ئەنگلز





بەشێوەیەکی ورد و کامڵ دەرکی خەسڵەتی دیموکراتی بۆرژوازییان نەکرد، کە بەهەرحاڵ خونچەکانی لەدەیەی ١٨٦٠دا لەحاڵەتی پشکوتندا بوو. هێشتا دەیەیەك بەسەر مردنی مارکسدا تێنەپەڕیبوو، کە سۆشیال دیموکراسی رێگەیەکی تازەی دیموکراسی دۆزیەوە. گرنگی ئازادیە بەدەستهاتووەکان بۆ کرێکاران چەندانجار زۆرتربوو لەوەی ئاگاداریەکانی تیورەسازی مەزن (واتە مارکس) بە جدی وەربگرن کە بەردەوام دەیگووت ئەمانە ئازادی نین"٢٢". بەرگریکردن لەمافە دیموکراتی و ئازادیەکان بەهۆی بزوتنەوەی کۆمەڵایەتی و سیاسی پرۆلیتاریاوە، دەبێتە هۆی پەرەسەندنی، تا ئەو شوێنەی کە زنجیرەیەك لەمافەکان و دەزگا دیموکراتیەکان دروستدەبن و ئەوندە بەربڵاو و گرنگن کە کرێکاران دەتوانن باسی «دەوڵەتی دیموکراتی بۆرژوازی» بکەن، چونکە لەناویدا دەژین. بەرگریکردن لەدیموکراسی سەرەتا بۆ فۆرمەلەبوونی جێبەجێکردنی سیاسەتی جەنگی چین دژی چین ئەنجامنادرێ، بەڵکو بۆ ژیانێکی باشتر ئەنجامدەدرێ. خەباتکردن بۆ دە سەعات کار لەرۆژێکدا لەرۆژانی ژیانی مارکسدا بۆ پیشاندانی بێتوانای بۆرژوازی نەبوو لەقبوڵکردنیدا، بۆ ئەوەبوو بەڕاستی کرێکاران بەلایەنی زۆرەوە دە سەعات لەرۆژێکدا کاربکەن و نەك زۆرتر، بۆ ئەوەش بوو کە رێگە بکرێتەوە بۆئەوەی بۆ هەشت سەعات کاری رۆژانە، خەباتێکی جدی دەست پێبکەن. کاتێك هەشت سەعات کار بەدەستهات، خەبات بۆ ٣٥ سەعات کار لەهەفتەدا دەستی پێکرد.

ئەڵبەتە مارکس نکوڵی لەگرنگی خەباتی دیموکراتی چینی کرێکار نەدەکرد. بەڵام لەو روەوە کە بەدەستهێنانی مافە دیموکراتیەکان، پەیوەندی و دەزگا دیموکراتیەکانی تەنها بەدەرئەنجامی خەباتی کرێکاران و چینە زەحمەتکێشەکانی دی دەبینی، هەمووشیانی تەنها بە قازانجی زەحمەتکێشان دەبینی، هەرگیز بڕواینەدەکرد ئەم ماف و پەیوەندیانە بچوکترین قازانجی بۆ بۆرژوازی هەبێت، کەوابوو بەو دەرئەنجامە گەیشت لەبنەڕەتدا بەدیهاتنیان لەکۆمەڵگای سەرمایەداری رکەبەرایەتیدا نامومکینە. مارکس گریمانەی ئەوەی دەکرد خەباتی دیموکراتی دەبێتە هۆی دەرکەوتنی رکەبەرایەتی زۆر توندی چینایەتی و شۆڕشی کۆمەڵایەتی کە لەئەنجامیدا کۆمەڵگای سەرمایەداری لەناودەچێت و هەموو ئەو شتانەی کرێکاران





داوایاندەکرد و کردبویانە ئامانجی خەباتی خۆیان، واتە مافەکان، دەزگاکان و ئازادیە دیموکراتیەکان لەکۆمەڵگای «پاش سەرمایەداریدا» بەدەستدێن. بەبڕوای مارکس کرێکاران و زەحمەتکێشانی دی تەنها کاتێك لەدەرئەنجامی واقعی دیموکراسی سیاسی بەهرەمەنددەبن، کە خۆیان دەسەڵاتی سیاسی بگرنەدەست. مارکس و رابەرانی بزوتنەوەی کرێکاری سەدەی نۆزدەهەم تا سەرەتای دەیەکانی ١٨٩٠ گرنگی واقعی دیموکراسی بۆرژوازیان دەرکنەکرد، بەڵام بەپێچەوانەی ئەوانەوە هەندێك تیورەسازی بەوتەی ئەوان بۆرژوازی، تێڕوانینێکیان لەبارەی دیموکراسیەوە پێشکەشکرد کە تاهەنوکەش جێی بایەخە. هاوڕێیەتی ئامانجە دیموکراتیەکان لەگەڵ بزوتنەوە و بیری ریفۆرمخوازدا، کاروباری دینامیکیەتی گۆڕانکاری بەردەوامی خستە بەرنامەی کاریانەوە. ئەڵبەتە بەراورد بە دەسکەوتەکانی ئەمڕۆ لەپەروەدەکردندا، پێشنیاری بیریارێکی وەك ماتیۆ ئارنۆڵد لەبارەی ریفۆرمی سیستەمی پەروەردەوە، هێندە پێشکەوتوو نایەتە بەرچاو. بەڵام ئەم سیستەمەی ئێستامان نەدەبوو گەر ئارنۆڵد لەساڵی ١٨٦١دا وتاری «پەروەوەردەی گشتی لەفەرانسادا»ی نەدەنووسی. بۆ بیریارێکی رادیکال کە هەموو دەزگایەکی کۆمەڵگا بەئامێری دەسەڵاتی چینی باڵادەست بزانێت، وشۆڕش وەك تاکە رێگەی چارەسەر دەردەکەوێت، دەبێت زۆر هوشیار بێت کە هێواش هێواش لەگرنگی ریفۆرمی کۆمەڵایەتی تێبگات (خودی مارکس لەچەند حاڵەتێکدا باسی گواستنەوەی ئاشتیانەی بۆ سۆشیالیزم کردووە، بەڵام روون نیە کە ئەم بۆچوونانە تا چەند جدیبوون و ئایا مارکس ئامادەبوو بە نەخشەی شۆڕشی پرۆلیتاریادا بچێتەوە یان نا). بەهەرحاڵ دیموکراتی، ریفۆرمخواز فێردەکات کە لەناو هەموو دەزگایەکدا، تەنانەت سوپا و بیرۆکراسیدا رێگەی دیموکراتیتر بدۆزێتەوە و پێشنیاربکات و هێواش هێواش کارەکە لەسەردەمێکی دوورودرێژتردا، بەڵام لەرووی دەرئەنجامەوە کەمتر قابیلی زیان پێگەیشتن، بەرەو پێشەوە بەرێت.

## هۆکانی کەموکوڕی تێڕوانینی مارکس بۆ دیموکراسی

ئەگەر ئەوەی تا ئێستا نوسیومە بەس بێت بۆئەوەی باسی کەموکوڕی جدی تیورەی مارکس لەبارەی شێوەکانی دەوڵەت و بەتایبەتی شێوەی دیموکراتی بکەین، دەبێ زیاتر باسی هۆکانی ئەم کەموکوڕیە لەدیدگای مارکسدا بکەین. پێدەچێت





بتوانین سێ هۆی سەرەکی بۆ ئەم مەسەلەیە بهێنینەوە:

هۆی یەکەم: دەکرێ کەموکوڕی مارکس لەبارەی دیموکراسیەوە لەخەسڵەتی ناتەواوی کاری فکری مارکس خۆیدا لەبارەی دەوڵەتەوە بەشێوەیەکی گشتی و دەوڵەتی بۆرژوازی بەشێوەیەکی تایبەتی ببینین. فیلیپ لاکۆ لابارت و ژان لۆك نانسی بڕوایانوایە بابەتی سیاسی، بەشی بیرلێنەکراوەی کاری مارکسە. ئەوان لەیەکەم بەرگی کتێبی «گەمەی سەرلەنوێی سیاسەت»دا نوسیویانە لەفکری مارکسدا «فەزایەکی چۆڵی سیاسی» هەیە، چونکە مارکس لەلێکۆڵینەوە فەلسەفیەکانی خۆیەوە، بەو دەرئەنجامە گەیشتبوو کە دەبێت تیۆرەی کۆمەڵایەتی لەسەر بناغەی ئابوری سیاسی، کە ئەگەری ناسینی کۆمەڵگای مەدەنی دەدات، بینابکرێت و لەئەنجامدا «سیاسەت هەروا بابەتێکی بیر لێنەکراوە لەکارەکانیدا مایەوە»"٢٣". لەم بوارەشدا تیورەی مارکس روبەروی کەموکوڕیەکی زۆر بۆوە. تەنانەت گەر ئەم حوکمەش بەمشێوە گشتیە کە پێشکەشکراوە قبوڵنەکەین، هێشتا ناتوانین نکوڵی لەوە بکەین مارکس نەیتوانی ئەوە لەرووی تیوریەوە بسەلمێنێت، کە ئەگەری دەرکەوتنی دەوڵەتی دیموکراتی بوونی نیە، و نەیتوانی وەڵامی ئەو پرسیارە بداتەوە بۆچی خەباتی دیموکراتی چینی کرێکار کە لەبواری بەرهەمهێناندا بۆتە هۆی گەلێك دەستکەوتی گرنگ بۆ ئەم چینە، لەبواری سیاسەتدا ناتوانێت ببێتە هۆی دیموکراتیزە بوونی زۆرێك لەدەزگا سیاسی و کۆمەڵایەتیەکان.

هۆی دووەم: باسی سەرەکی مارکس و ئەنگڵز لەبارەی شێوەکانی دەوڵەت و دیموکراسی، وەك کاردانەوەیەك لەبەرامبەر شکستە توندەکانی چینی کرێکار لەشۆڕشی ١٨٤٨دا فۆرمەلەبوو. دیارە لەبەرهەمەکانی پێشویاندا لەوانە لەمانیفێستدا وەك پێشتر بینیمان، ئەو دوانە بڕوایان بەدیموکراسی بۆرژوازی و دەرکەوتنی دەوڵەتی دیموکراتی بۆرژوازی نەبوو، بەڵام ئەزموونی بێئاکامی ئەم شۆڕشە، دەوری لەرزیوی بۆرژوازی لەسەرەتای شۆڕشدا و هاوڕێیەتی لەگەڵ کۆنەپەرستیدا لەنێوەی رێدا، ئاشکرابوونی «حکومەتی شمشێری رووت» لەئەوروپادا، سەرکوتی سەرسەختی بزوتنەوەی کرێکاری، هێندە جێگەی بۆ باسی دیموکراسی ئەم چینە بۆ سۆشیالیستەکان نەدەهێشتەوە. کاتێك ئەنجومەنی نەتەوەیی ئەڵمانیا لەهەمان ساڵی





شۆڕشدا کە زۆربەیان بۆرژوازی بوون، توانای ڕووبەڕووبوونەوەی یۆنکەرەکان و کۆنەپەرستانی نەبوو، بۆرژوازی خەباتی بۆ لانیکەمی داوا دیموکراتیەکان نەکرد، و دەسەڵاتی بە یۆنکەرەکان و سەڵتەنەت بەخشی، و تەنانەت دروشمی کۆماریشی نەهێنایەپێشێ، مارکس دەیتوانی چ ئومێدێکی بەم چینە هەبێت؟ ئەنگڵز لەوتارێکدا ٣١ مەی ١٨٤٨ هێرشیکردە سەر ئەنجومەنی نەتەوەیی و ترسی نوێنەرانی لەکۆنەپەرستان و ئەگەری سازشکردن لەگەڵیاندا دەربڕی (م ـ ا ٧:١٦). ئەنگڵز نوسی تەنانەت قسەیەکیش لەبارەی حکومەتی یاساوە لەئارادا نیە و «نوێنەرانی ترسنۆکی بۆرژوازی» لەگەڵ ستەمکاری کۆندا، ئاشتبونەتەوە. یان کاتێك لەفەرانسادا بەپێی شیکردنەوەی مارکس لەهەژدەهەمی برۆمێردا بۆرژوازی دەسەڵاتی بەخشی بە مرۆڤکوژانی بۆناپارت و سوپای کردە دەسەڵاتداری فەرانسا، ئیدی چ جێگەیەك بۆ باسکردنی دەوڵەتی دیموکراتی دەمێنێتەوە؟ لێرەوە تیورەسازێکی سۆسیالیستی ماڨ ئەوە بەخۆی دەدات، بڕوابوون بە دیموکراسی، بەفەرامۆشکردنی ئەزمونەکان و تێنەگەیشتنی دنیای توندوتیژی دەرەوە بزانێت. ئەزمونی ١٨٤٨ تاکە ئەزمونێکی شۆڕشگێڕانەی مارکس بوو تا پێش ڕوداوی کۆمۆنەی پاریس، (ئەم ئەزمونەش) هیچ بەڵگەیەکی بۆ بەرگریکردن لەتیورەی ئەگەری دەرکەوتنی دەوڵەتی دیموکراتی بۆرژوازی، بەدەستەوە نەدەدا. وەك ڕوداوەکانی بەهاری ١٨٧١ لەپاریسیشدا، هیچ بەڵگەیەکی بۆ سەلماندنی ئەو تیورەیە پێشکەشنەدەکرد. لەکۆمۆنەی کرێکاراندا نمونەگەلێکی دیموکراسیان دروستکرد و سیفەتی کرێکاریان دەخستە سەر هەر ئاماژەیەك بۆ ئازادی. پاش ئەوەش کە سەرکوتکردنی خوێناوی خەباتگێڕانی کۆمۆنە ڕوویدا. کوشتارە بێ دادگاکان، ئەشکەنجەکان و توندوتیژی دڕندانەی بۆرژوازی، چ جێگای ئومێدێکی بەدەوڵەتی دیموکراتی بۆرژوازی دەهێشتەوە؟ تیورەسازانی سۆسیالیست لەسەر بناغەی ئەزمونە مێژووییەکان، دەوڵەتی بۆرژوازیان بە دەوڵەتی سەرکوتکەر ناودەنا.

هۆی سێهەم: بەدەر لەسەرکوتکردنەکانی بۆرژوازی ئەوروپا، نمونەیەك لەدەوڵەتی دیموکراتی بۆرژوازی هەبوو، بەڵام مارکس بە جدی وەرینەدەگرت. لەویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکادا کۆمارێکی دیموکراتی لەسەر حوکمبوو. بەڵام مارکس لەبەرئەوەی تەماشای وڵاتە یەکگرتووەکانی وەك «کۆلۆنێکی ئابوری ئەوروپا»







دەکرد (س ـ ر ١:٧١٦) بایەخی بە بونیادە سیاسیەکەی نەدەدا. لەلایەکی دیەوە ئازادیە سیاسیەکان و مافەکانی تاکەکەس لەویلایەتە یەکگرتووەکاندا، دەرئەنجامی خەباتی چینی کرێکار نەبوو، هەر لەبەرئەمەش لەچاوی مارکسدا هیچ زەمانەتێك بۆ مانەوەیان نەبوو. لەهەمووی خراپتر ئەوەبوو کە لەئەمەریکادا کۆیلەیەتی هەبوو، وە مارکس بڕوایوابوو کە بێ کویلەیەتی، ویلایەتە یەکگرتووەکان لەنەخشەی جیهاندا دەسڕدرێتەوە. هەرچەندە کویلەیەتی لەناوچوو، بەڵام مافە مەدەنیەکانی ڕەشەکان، تا سەد ساڵ دوایش بەدەستنەهات. ئەمەریکا بە جیاوازی نەژادی یاساییەوە، ناشرینترین نمونەی نایەکسانی کۆمەڵایەتی و ئابوری پیشاندەدا و وەك دەوڵەتێکی دیموکراتی بۆرژوازی کە تیایدا ماڨ دەنگدانی گشتی بەدەستنەهاتبوو، زۆرتر نمونەیەکی کۆمیدی بوو. لەنمونەی کۆمارە ئەوروپییەکانیش کە لەبەرامبەر مارکسدابوون، یەکێکیان کۆماری دوهەمی فەرانسا بوو کە سوپا تیایدا دەورێکی گرنگی هەبوو، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا توانای ئەوەی نەبوو بەرگری لەخۆی بکات و لەبەرامبەر هێرشەکانی کۆنەپەرستان و بۆناپارتیستەکاندا لەرزۆك بووە و لەناوچووبوو، ئەویدیشیان کۆماری سێهەمی فەڕانسا بوو کە لەسەر بناغەی سەرکوتکردنی کۆمۆنەی دروستبوو بوو. لەهیچ یەکێکیاندا ماڨ دەنگدانی گشتی بەدەستنەهاتبوو، هێزە سیاسەکانی کۆنەپەرستان لەدەسەڵاتدا بەشداربوون و ماڨ ژنان و کەمایەتیە نەژادی و دینیەکان پێشێلدەکرا.

ئەم بەڵگانە نادروسن نین، بەڵام ناتوانن ئاراستەی کەموکوڕی ڕوانگەی مارکس بکەن. ئەگەر مێژوو نمونەیەکی نەخستبووە بەردەم مارکس، ئەوا لەبەردەم جۆن ستیوارت میلیشدا داینەنابوو. بێگومان میلیش خۆشحاڵ نەبوو بە سەرکوتی خوێناوی چینە زەحمەتکێشەکان لە١٨٤٨دا. ئەویش ئاگاداری کەموکوڕی ئەو دەوڵەتە بۆرژوازیانە بوو کە لەئارادا بوون. لەڕاستیدا نەبوونی نمونەیەکی واقعی ناتوانێت بەهانەیەکی باش بۆ تیورەسازێك بێت کە بەر لەهەر بیریارێکی تری سەدەی نۆزدە پێشبینیکردبوو. هەر ئەو جەختەی مارکس دەیکردە سەر خەباتی دیموکراتی، دەریدەخات کە چینی کرێکار سەبارەت بە مەسەلە پراکتیکیەکانی دیموکراسی تاچ ئەندازەیەك هەستیار بووە،و نەیدەتوانی بەرامبەر بە ستەمێك کە بەرامبەری دەکرێت، بێهودە بمێنێتەوە. گرنگی دەوڵەتی دیموکراتی کە تەنانەت تارادەیەك

وەلامدەرەوەی کۆمەلگا بێت، لەسەر بناغەی مافی مرۆڤ یان تەنانەت ئەو دیدانەی کە زۆریش کامڵ نین لەبارەی ئازادی مرۆییەوە دامەزرابێت، ئەوکاتە دەرکدەکرێت کە زەحمەتکێشان روبەرووی دەوڵەتێکی ستەمکاری پشتئەستور بە یاساکانی پێش سەرمایەداری، یان روبەرووی دیکتاتۆری سەربازی، دەوڵەتی پۆپۆلیستی یان فاشیستی ببنەوە. بەلام مارکس بە دیدێکی پەڕگیرانەوە بۆ دیموکراسی وەك ساختەکاری و هەڵخەڵەتاندن، جیاوازی دوو بونیادی سیاسی راستەوخۆ لەیەك جیاواز: یەکێکیان دەوڵەتی دیموکراسی و ئەوی دی دەوڵەتی ستەمکاری، فەرامۆشکرد. مارکس تەنانەت باسکردنی دەوڵەتی دیموکراتی بۆرژوازی بە بێسود ناودەنا، بەلام لەسەردەمێکی نەئەوەندە دور لەمارکسدا، ئەم باسە بەشێوەیەکی جدی لەنێوان چالاکانی ئەنتەرناسیۆنالی دوهەمدا دەستی پێکرد.

## خەباتی دیموکراتی

مارکس سەرەڕای کەموکوڕیە تیوریەکانی سەبارەت بە دیموکراسی بۆرژوازی، تا ئەو شوێنەی مەسەلەی خەباتی رۆژانەی چینی کرێکار دەهاتە پێشێ، تێگەیشتنێکی تەواو دروستی بۆ پێویستی بەرگریکردنی بێقەید و شەرتی کرێکاران، لەمافی چارە خۆنوسینی زەحمەتکێشان و خەباتەکەیاندا هەبوو. بەبڕوای مارکس کرێکاران ناتوانن بەئازادی خۆیان بگەن، مەگەر ئەو کاتەی لەریزی پێشەوەی بەرگریکردن لەئازادی چین و گروپە ستەملێکراوەکانی تردا رابوەستن. ئەمەش مومکین نیە مەگەر چینی کرێکار بزوتنەوەی سەربەخۆی چینایەتی خۆی رێکبخات. مەبەستی مارکس لەم سەربەخۆییە تەنها جەختکردن لەسەر رەهەندی ئاشکرای پێویستی سەربەخۆیی لەدروشم و رێنماییەکانی بۆرژوازی نەبوو، بەڵکو رەدکردنەوەی چونە ژێر کاریگەری چینەکانی دیشی دەگرتەوە. مارکس بڕوایوابوو هەموو زەحمەتکێشان دەبێت پەیڕەوی بەرنامەی سیاسی و دروشمەکانی چینی کرێکار بن و لەپشت ریزەکانی بزوتنەوەی کرێکاریەوە رابوەستن. لێرەشدا روانگەی مارکس لەبارەی خەباتی چین دژی چین، خۆی پیشاندەدات. مارکس بەرلەوەی گرنگی بە دیموکراتیزەبوونی دەزگا سیاسی و کۆمەلایەتیەکانی کۆمەلگا بدات، مەسەلەکەی زۆر بەئاسانی بریتیبوو لەدینامیکیەتی خودی خەباتی دیموکراتی، کە بەبڕاوی مارکس







دەبوو ببێتە هۆی دامەزراندنی دەوڵەتی شۆڕشگێرانەی کرێکاری.

مارکس چالاکی خۆی وەك دیموکراتێکی شۆڕشگێڕ دەست پێکردبوو، سەبارەت بەخەباتی دیموکراتی هەستیار بوو، بەلام تیورەکەی لەبارەی خەباتی چین دژی چین رێگەی نەدەدا لەدینامیکیەتی دەرونی هەر بزوتنەوەیەکی کۆمەلایەتی کە بەئاراستەی دیموکراتیزەبوونی دەزگا کۆمەلایەتیەکانە وردبێتەوە. لەنوسینە سەرەتاییەکانیدا لەبارەی ئازادی رادەربڕین و بلاوکراوەکاندا، ئەڵبەتە هێشتا ئەو دیدە چینایەتیە بالادەست نەبوو بوو، بۆ بەرگریکردن لەئازادی رادەربڕین، ریفۆرمە پێشنیارکراوەکانی رژێمی فردریکی ویلهلمی چوارەمی بە کۆنەپەرستانە هەڵدەسەنگاند، و بەتایبەتی رەخنەی لەو لیستی ریفۆرمانە دەگرت کە جەختی لەسانسۆری ئەو بابەتانە دەکرد کە لەگەڵ تەفسیری فەرمی دیندا ناکۆکن و ئەوەی بەبیردەهێنایەوە کە بەمشێوەیە نوسینەکانی سپینۆزا، کانت و فیختە دەبێت سانسۆربکرێن، چونکە لەسەر بناغەی جۆرێك ئازادی بیر لەبواری گوتاری دینیدا نوسراوون کە لەگەڵ تەفسیری فەرمیدا ناگونجێن. لەدیدی مارکسی لاودا ئەم نوسینانە جەخت لەسەربەخۆیی مرۆیی دەکەن، لەکاتێکدا دین پشتی بەملکەچی مرۆڤ بۆ خوداوەند بەستووە (مـ ١١٩١:١ـ١١٨). ئازادی دین دروشم و خواستی دروستکراوی بزوتنەوەی سۆسیالیستی نەبوو. پێشڕەوترین رۆشنگەران ئەم مەسەلەیەیان هێنابووەپێشێ و هەموشیان بە ناچار ماتریالیست و دژی دین نەبوون. رۆسۆ لەدوا فەسڵی «پەیمانی کۆمەلایەتی»دا دینی وەك پەیوەندی نێوان مرۆڤ و خودا، لەدینی کۆمەلایەتی یان دینی قەشەکان جیا کردبۆوە"٢٤". ئازادی دین لەشۆڕشی فەرەنسادا درەنگ و بەگران هاتەپێشێ، کاتێك تیرۆری یاکۆبینەکان بەسەرچوو، و سەرکوتکردنی خوێناوی کەنیسە تەواوبوو. شۆڕشی فەرەنسا لەگەڵ خۆیدا چەمکی جیابونەوەی دینی و دەوڵەتی لەگەڵ خۆیداهێنا. لەئەڵمانیادا ئەم خاڵە لەباسەکانی برۆنۆ بائیر لەبارەی یەهودیەکانەوە و بەتایبەتی لەوەلامی مارکسدا بۆ برۆنۆ بائیر، هاتە پێشەوە. لەگەڵ ئەوەشدا مارکس گرنگی بۆ ئازادی دین دادەنا، بەلام ئەم خاڵە لەمانیفێستدا وەك یەکێك لەبابەتەکانی بەرنامەی بەناوبانگی «دە مادەکە» نەهات. لەم تێکستەدا مارکس و ئەنگلز هۆکانی نەیارێتی خۆیان بۆ دین رونکردەوە و لەهەمانکاتدا نوسیان ئەو تۆمەتانەی بۆ سۆشیالیستەکان لەبارەی دینەوە دەکرێت،

بایەخی ئەوەیان نیە وەڵام بدرێنەوە» (م ـ ا ٦:٥٠٣). بەڵام چەندان ساڵ دوای ئەوە لە«رەخنەی بەرنامەی گۆتا»دا مارکس گەڕایەوە بۆ مەسەلەی ئازادی دین. لەم تێکستەشدا ئەو هەر وەك مارکسی لاوی بێ خوا، هەڵوێستێکی دژ بە دینی هەبوو، بە توندیش رەخنەی لەو خاڵە دەگرت کە لەبەرنامەی سۆسیال دیموکراتی ئەڵمانیادا هاتبوو «ئازادی هوشیاری و لەئەنجامدا ئازادی دین». مارکس نوسیبووی کە بەرنامەیەکی کرێکاری دەبێت بە راشکاوی رایگەیەنێت کە هەوڵدەدات هوشیاری لەدین ئازاد بکات، بەڵام پێدەچێت بەرنامەکە بیەوێت لەم خاڵەشدا هەنگاوێك نەچێتە ئەودیو سنورەکانی جێی قبوڵی بۆرژوازیەوە(ب ا۔٣:٢٩»).

مارکس لەدیدی تیوریەوە بەو دەرئەنجامە گەیشتبوو کە هیچ یەك لەمافە دیموکراتیەکان ناتوانن ناکۆکبن لەگەڵ بەرژەوەندیەکانی چینی کرێکاردا، لێرەوە جەختی لەسەربەخۆیی بزوتنەوەی کرێکاری لەخەباتی دیموکراتیدا دەکرد. خاڵێکی زۆر گرنگ لای مارکس ئەوەبوو، لەهەر هەلومەرجێکدا خەبات لەپێناوی بەدیهاتنی کام لەو مافە دیموکراتیانە دەتوانێت بەقازانجی کرێکاران تەواو بێت. مارکس بەرلەوەی لەدادپەروەری کۆمەڵایەتی و خەباتی بەردەوام دژی ستەم، بیر لەلایەنگرانی بەزەبری کرێکاران بکاتەوە، لەبیری پێشکەوتنی خودی بزوتنەوەی کرێکاریدا بوو. دەبێت لەم روانگەیەوە تەماشای سەرنجی مارکس بۆ مەسەلەی ژنان بکەین. مارکس هیچ بڕوای بەبزوتنەوەی سەربەخۆیی ژنان دژی ستەم لەکۆمەڵگای باوکسالاریدا نەبوو. مەسەلەکەی مارکس ئەوەبوو ژنان رێگەی رزگاری خۆیان لەبەرنامەی کرێکاریدا بدۆزنەوە و «لەپشت کرێکارانەوە رابوەستن». ژنی خەباتگێر لای مارکس ژنێك بوو کە لەحیزبە کرێکاریەکاندا، سەرەتا بۆ رزگاری چینی کرێکار و پاشان بۆ رزگاری خۆی خەباتدەکات. وەك چۆن ئەلئۆنوری کچی جارێك گوتبووی «ئێمە نەك وەك ژن، بەڵکو وەك پرۆلیتار رێکدەخرێین...بۆئێمە هیچ شتێك جگە لەبزوتنەوەی چینی کرێکار بوونی نیە»"٢٥". ئەبۆت و ڤالاس نوسیویانە «مارکس بایەخی بەهەلومەرجی ژنان لەکۆمەڵگەی باوکسالاریدا نەدەدا. مارکس بیروڕای پەیوەندیدار بە ئەخلاق، دادپەروەری و مافی یەکسانی، بەناوی بیروڕای بۆرژوازیەوە رەددەکردەوە. مەسەلەی جێی بایەخی مارکس بریتیبوو لەدۆزینەوەی رونکردنەوەیەك بۆ وەبەرهێنانی چینی کرێکار لەسەرمایەداریدا بەمەبەستی





روخاندنی ئەم سیستەمە، نەك ریفۆرمی ئەم هەلومەرجە. ئەو چەمکانەی مارکس بەکاریدەهێنێت، بێلایەن دێنە بەرچاو، بەڵام لەراستیدا کوێر جنسن""٢٦" .

ئایا دەکرێ لێرەشدا هۆی دیدی دواکەوتوانەی مارکس بگەڕێنینەوە بۆ نەبوونی بزوتنەوەی سەربەخۆی ژنان لەزوربەیساڵەکانی ژیانیدا؟ تەنها لەدوا ساتەکانی ژیانی مارکسدا بوو کە ئەم بزوتنەوەیە سەرەتاترین ئاماژەکانی پەیدابوونی خۆی دەرخست و مارکسیش بەتەواوی هیچ گوێی پێنەدەدا. بەرلەوەی مارکس کارە فکریەکانی دەست پێبکات، لەهەرەوەزیەکانی ئۆینیدا مەسەلەی ژنان هاتبووە پێشێ. چالاکەکانی ئەم هەرەوەرزیانە باسی رزگاری ژنانیان لەکاری ماڵەوە دەکرد. ئەوان چەندان ساڵ دوای ئەوە رەخنەیان لەچارتیستەکان هەبوو کە لەخەباتدا بۆ مافی رای گشتی، هەروا ژنانیان فەرامۆشکردووە"٢٧". لەدەیەی ١٨٣٠ ژنانی زۆرێك لەگروپەکانی خوارەوەی چینەکانی ناوەڕاستو کرێکار، بەرەو روی بیروڕاکانی ئۆین رۆیشتن. لەفەرەنساشدا فۆرێیە مەسەلەی رزگاری ژنانی هێنابووە پێشێ. فۆرێیە لەم مەسەلەیەدا ئەوەندە چووە پێشێ کە بەجورئەتەوە دەتوانرێ بگوترێت لەهەموو سەدەی نۆزدەهەمدا بزوتنەوەی سۆسیالیستی، شتێکی بۆ وتەکانی ئەو زیاد نەکرد. تەنانەت ئەمرۆش خوێنەری کتێبی «چوار جوڵە» شوباتی (١٨٠٨) لەتازەیی بابەتەکانی کتێبەکە لەبارەی دەوری کۆمەڵایەتی ژنان، سەری دەسوڕمێت. فۆریە ژنانی رەها لەمەسەلەی کار و هەلومەرجی کۆمەڵایەتی، بەڵکو وەك جنسێك کە ستەمی لێدەکرێت و مافە سەرەتاییەکانیشی لێ زەوتکراوە دەهێنایەپێشێ. مەسەلەکەی ئەو جیاوازی بوو، نەك چینایەتی. ئەو دەیگوت: «گۆڕانکاریەکان لەقۆناغێکی مێژوویدا بەردەوام بەهۆی بزوتنەوەی ژنانەوە بەرەو ئازادی دەستنیشاندەکرێت و نهێنی لەناوچوونی سیستەمی کۆمەڵایەتی لەشکستی بزوتنەوەی ئازادی ژناندا، شاراوەیە...پەرەسەندنی ئیمتیازەکانی ژنان، بنەمای پێشکەوتنی کۆمەڵایەتیە»"٢٨". فۆریە لەکۆتای تەمەنیدا جەختی لەهەلومەرجی ژێردەستی ئابوری ژنان دەکرد و پەیوەندی ئەم ژێردەستیە ئابوریەی بە ستەمکاری جنسیەوە، دەهێنایەئاراوە.

مارکس لە«مەسەلەی یەهودا» باسی کڕین و فرۆشی لەسەرمایەداریدا دەکرد(م ا





٣:١٧٢). لە«دەستنوسەکانی ١٨٤٤»دا لەئاماژەیەکی کورتدا رزگاری ژنانی بەستەوە بە پەرەسەندنی مێژووی کۆمەڵگاوە و نوسی کە لەکۆمەڵگای مۆدێرندا «ژن وەك بوونی سەربەخۆ و مرۆیی لەئارادا نیە، بەڵکو وەك غەنیمەت و کەنیزەیەك بۆ پیاو لەئارادایە» (د ف١٦٧، م ا٣:٢٩٥). مارکس لەخێزانی پیرۆزدا لەباسکردنی رۆمانی رازەکانی پاریسی ئێژن سۆدا کە بەستون لەبلاوکراوەکاندا بلاودەکرایەوە، پیشانیدەدا کە لەسەرمایەداریدا پەیوەندی پیاو بەژنەوە پەیوەندی سۆبژێکتی دانا و ئەندیشمەندە لەگەڵ ئۆبژێکتی بەشتبوودا و هەلومەرجی ژیانی ژن «هەلومەرجی هەبوو، بەلام نامرۆڤانەیە» (ا - ٤:١٩٥). هەلومەرجی ژیانی سۆزانی لەڕاستیدا هەلومەرجی گشتی ژیان و رێزی ژنانە. لەمانیفێستدا تێروانینی بۆرژوازی بۆ ژن وەك ئۆبژێکتێکی جنسی و وەك سۆزانی بوو، لەبەندێکی بەناوبانگدا مارکس لەتۆمەتی بۆرژوازیەکاندا بۆ کۆمۆنیستەکان کە دەیانەوێت هاوسەرێتی نەمێنێت و ژنان سۆشیالیست بکەن نوسی: «بۆرژوا وەك ئامێرێکی سادەی بەرهەمهێنان تەماشای ژن دەکات. ئەو گوێی لێدەبێت کە دەبێت ئامێرەکانی بەرهەمهێنان سودی بۆ هەمووان بێت، سروشتیە کە ناتوانێت بەو دەرئەنجامە زیاتر بگات کە ژنانیش چارەنوسێکی وایان دەبێت...بەلام هاوبەشی ژنان بەگشتی هەمیشە هەبووە، هاوسەرێتی بۆرژوازی هەمان هاوبەشی ژنانە» (م - ا ٦:٥٠٢) پاشان مارکس رەخنەیەکی توندی دژی ئەخلاقیاتی بۆرژوازی کە لەپشت پەردەی عیفەتی ژن و پیرۆزی خێزانەوە، لەپراکتیکدا بۆتە هۆی هاوبەشی ژنان هێنایە پێشێ. مانیفێست لەبارەی هەلومەرجی ژنانەوە لەکۆمەڵگای ئایندەدا بێدەنگ بوو، تەنهاش بەو حوکمە وازیهێنا کە «بە لەناوچوونی پەیوەندیەکانی بەرهەمهێنانی هەنوکە، خۆبەخۆ هاوبەشی ژنان کە دەرئەنجامی ئەم پەیوەندیانەیە لەناودەچێت». بەلام ئەوەی کە چ شتێك دەبێتە جێگری، ئەوا بەبێدەنگی مایەوە. وتوێژە سیاسی و کۆمەلایەتیەکانی پاش مارکسیش هیچ شتێکیان بۆئەم خاڵە زیاد نەکرد. بەلام باسە ئابوریەکانی زەمینەیەکی باشیان لەبارەی پەیوەندی کاری ماڵەوەی ژنان (کاری بێ دەستمایەی ژنان کە دەبێتە هۆی بەهای مەسرەف و بەهای ئاڵوگۆڕ دروستناکات، و لەئەنجامدا بە کاری بەرهەمهێنان ناژمێرێت) لەگەڵ چەمکی هەمەکی ستەملێکردنیاندا و لەئەنجامدا خەباتیاندا دەهێنێتە پێشێ"٢٩". ئەنگلز لەنامەیەکدا بۆ گرترۆد گیوم شك (٥ ژوینی ١٨٨٥)







نوسی «بەبڕوای من یەکسانی تەواوی ژن و پیاو کاتێك دەبێت بە واقع، کە وەبەرهێنانی هەریەکێکیان بەهۆی سەرمایەوە لەناوبچێت و کاری ماڵەوەش ببێت بە کارێکی گشتی»(م - ب ٣٦٤_٣٦٣). هەمان چیرۆکی کۆن دوبارە دەبێتەوە. ئازادی لەم کۆمەڵگایەدا بەدەستنایەت، ژن و پیاو دەبێت بۆئەم گۆڕانکاریەی کۆمەڵگا بجەنگن و لەوێشدا هەردوکیان ئازاد دەبن و لەگەڵ یەکدا مافی یەکسانیان دەبێت. بزوتنەوەی سەربەخۆی ژنان بێ سودە، گۆڕانکاری ئەم کۆمەڵگایە کاری چینی کرێکارە و بەس. ئاماژەکردن بۆ «کاری ماڵەوەی لەناوچوو»ش لەستایشی کۆمەڵگای ئایندەدا هاتووە.

زوربەی ئەندامانی ئەنتەرناسیۆنالی یەکەم و هەموو رابەرەکانی پیاو بوون. ئاراستەکانی لایەنگری پرۆدۆن بەتوندی دژی هێنانە پێشێی مەسەلەی ژن بوون بە «باسێکی لادەرانەیان» ناودەبرد. تەنانەت ناوی ئەنتەرناسیۆنالیسمیش پیاوانە بوو: *WorkingmensAssociation Internationail* بەلام پاش کۆمۆنەی پاریس، مەسەلەکە کەمێك گۆڕا. لەبەر دەوری بەرچاوی ژنان لەبەڕێوەبردنی کۆمۆنەدا، لەناو ناوەندە کرێکاریەکاندا، بایەخێکی تازە بە بزوتنەوەی ژنان دروستبوو. لەناو ئەنتەرناسیۆنالیزمیشدا، یەکەم بەشی ژنان لەئاڤریلی ١٨٧١دا، قبوڵکرا. هەروەها ڤیکتۆریا ودهاڵ و تێنسی کلافلین، لەنیویۆرك بەشی ژنانی سەر بە ئەنتەرناسیۆنالیزمیان دروستکرد. مارکس لەئەنجامی راوەرگرتندا لەبارەی ئەم بەشەوە لەگەڵ ئەم هەنگاوەدا بوو، بەمەرجێك «لەناکۆکیدا نەبێت لەگەڵ ئەو بەشانەدا کە لەهەردوو رەگەزەکە پێکهاتوون». بەئاشکرا دیارە ژنانێکی سادە کە لەکارەساتی ژنبوون تێگەیشتبوون، لەبەناوبانگترین پیاوی تیورەسازی بزوتنەوەی کرێکاری پێشکەوتوتر بوون. لەکۆتایی سەدەی نۆزدەهەمدا ئیدی ژنانێکی زۆر لەحیزبە کرێکاریەکاندا چالاکیاندەکرد. ئێمە ئاشنای هەندێك ناوی چالاکی ژنان و ئۆرگانە رابەریەکانیانین لەئەنتەرناسیۆنالیزمی دوهەمدا: رۆزا لۆکسمبۆرگ، کلارا زتکین، ئەلەکساندرا کۆلۆنتای،مینا گائۆتسکی و زۆرێکی تر. لەلایەکی دیەوە بزوتنەوەی ژنانیش چالاکبوون و نەدەکرا لەبەرچاو نەگیرێن"٣٠".

## خەباتی دیموکراتی لەبواری یاسای بۆرژوازیدا

یەکەم تێکست کە مارکس بڵاویکردەوە، نوسینێکی سیاسی بوو لەبەرگریکردن لەئازادی ڕادەربڕین و مافی بڵاوکردنەوە. مارکسی لاو ڕۆژنامەنوسی سیاسی بەکاری سەرەکی و پیشەیی خۆی دەزانی. مارکس لەنوسینە شۆڕشگێڕانەکان و لیبڕاڵیەکانیدا، توندڕەویێکە کە ئازادی ڕادەربڕین بەمەرجی سەلماندنی ئازادی و ئازادیش بەمەرجی سروشتی پێشکەوتنی کۆمەڵگای مرۆیی دادەنێت. کەسێك کە بەپێی نەریتی ڕۆشنگەری ڕەوایەتی یاساکان تا ئەو جێگەیە دەزانێت کە هەبونێتی ئازادی نەخاتە مەترسیەوە و دەڵێت «یاسا دەبێت لەگەڵ یاسا دەرونی چالاك و زیندووی مرۆڤەکاندا بگونجێت، واتە ڕەنگدانەوەی واقعیەتی ژیانی مرۆیی بێت» (م ـ ١ ١٣١:١ـ١٢٠). هەوڵدان بەئاراستەی گۆڕینی یاساکان، لەهەر ڕێگەیەکی یاساییەوە گەر بکرێت، ئەم دروشمە لەیەکەم نوسینە سیاسیەکانی مارکسدا بوو. لەساڵەکانی دواییدا مارکس لەسنوری هەڵبژاردن لەنێوان گروپە دەسیسەچی و بێباوەڕەکان بە خەباتی جەماوەری، ئەو گروپانەی کە بەهەرحاڵ ڕادیکاڵ و شۆڕشگێڕبوون و کۆمەڵگای باڵادەست و حکومەتی بۆرژوازیان بەتەواوی ڕەددەکردەوە (وەك لایەنگرانی بلانکی و یەکەم خانەی ئەنارشیستەکان)، و حیزبە کرێکاریەکاندا کە تاڕادەیەك ریفۆرمخوازبوون و گۆڕانکاری کۆمەڵگای باڵادەستیان دەبەستەوە بە کاری سیاسی دوورودرێژ و خەباتی دیموکراتیەوە (چارتیستەکان لەئینگلتەرا، لایەنگرانی ریفۆرمەکانی زەوی و زار لەویلایەتە یەکگرتووەکاندا)دا، ڕاوەستا. بەئاشکرا هەڵبژاردن بۆ مارکس زۆر گرانبوو، چونکە هەستی بەنزیکایەتی لەگەڵ ڕادیکاڵیەتی گروپە دەسیسەچیەکاندا دەکرد. لەهەمانکاتدا لەگەڵ شێوازەکانی ئەواندا کە دابڕاوبوو لەجەماوەر ناکۆك بوو. لەلایەکی دیەوە شێوازی چارتیستەکانی کە رووی لەجەماوەر بوو پەسەنددەکرد، و بەڵام ریفۆرمخوازیانی بەڕاست نەدەزانی. ئەو حیزبەی خودی مارکس تیایدا چالاك و بەیەکێك لەرابەرەکانی دەزانرا، واتە یانەی کۆمۆنیستەکان زیاد لەوە بچوك و لەئاستی خەباتکردندا (بەتایبەتی لەگەرماوگەرمی شۆڕشی ١٨٤٨دا) ناگرنگ بوو، کە بتوانرێت بەنمونەیەك بژمێرێت. ئاشکرایە مارکس لەو حیزبەدا هەوڵیدەدا هاوئاهەنگی لەنێوان ڕادیکالیزم و کاری پڕوپاگەندەدا، بە سەودای بەشداری چالاکی





جەماوەر لەخەباتی کۆمەڵایەتیدا دروستبکات، لەئەنجامدا لەهەردوو لاوە ڕەخنەدەکرا و تەنانەت هێرشی توندی دەکرایەسەر. ڕادیکاڵە ئەوروپیەکان، بلانکیەکان و خانە سەرەتاییەکانی گروپە ئەنارشیستیەکان، یانەی کۆمۆنیستەکان و بڵاوکراوەکەیان بە ریفۆرمخواز ناودەنا و بە تانە و تەشەرەوە گاڵتەیان بەوتارە توندڕەوەکانی دەکرد، کە لەم حاڵەتانەدا قەڵەم لەدەست ئیرادەی نوسەرانی دەچووە دەرەوە، و لەلایەن حیزبە کرێکاریە گەورەترەکانی دیشەوە، لەبنەرەتدا یانەیان هێندە بەجدی وەرنەدەگرت، ئەگەرچی مانیفێست لەناو چارتیستەکاندا، تاڕادەیەك بەناوبانگ بووبوو.

ئەم کێشە تیوری و پراکتیکیە لەکاری مارکسدا، لەدەیەکانی پاش شکستی شۆڕشی ١٨٤٨دا مایەوە، بەڵام قورسایی کاری درێژخایەنی سیاسی، بەردەوام سەنگینتر دەبوو. دیارە کێشەی سەرەکی هەر مایەوە چونکە مارکس هەرگیز تێڕوانینی سەرەکی خۆی لەبارەی خەباتی چین دژی چین و ڕادیکالیزمی شۆڕشگێڕانەی نەخستە لاوە، بەڵکو بە تێپەڕینی ڕۆژەکان، باوەڕەکانی ساڵانی لاوی تیایدا بەهێزتر بوون. کۆمۆنەی پاریس لەڕوانگەی مارکسەوە زیندووکەرەوەی هەموو ئەو یادەوەری و باوەڕانەی ١٨٤٨بوو. شکستی کۆمۆنەشی بەردەوام بە شکستی ١٨٤٨ بەراورددەکرد. بەڵام لەهەمانکاتدا دەیبینی کە لەپێشچاویدا واقعیەت و دەرکێکی تازە بۆ سیاسەت و ڕێکخستنی سیاسی پرۆلیتاریا، لەحاڵەتی دروستبوندایە. تەنانەت دەکرێت ڕەگوریشەی ئەم گۆڕانکاریە لەتێڕوانینەکانی مارکسدا بۆ پێش کۆمۆنیش بگەڕێنرێتەوە. دەیە دوورودرێژەکانی دەسەڵاتداریێتی کۆنەپەرستی لەئەوروپادا، ئەویشی بزواندبوو. لەخۆی دەپرسی ئایا بێتوانایی پرۆلیتاریا لەراکێشانی هاوپەیمانانیدا لەکاتی شۆڕشدا، ناگەڕێتەوە بۆ کەموکوڕیەك لەسیاسەتی شۆڕشگێڕانەیدا؟ بەهەرحاڵ مارکس پاش شکستی تراژیدیانەی کۆمۆنە، بەشێوەیەکی جدی بڕوای بەخەباتی سیاسی درێژخایەنی کرێکاران لەئاستی کۆمەڵگادا، بەمەبەستی بەدەستهێنانی شێوەیەك لەحکومەتی بۆرژوازی کە ململانێ لەگەڵیدا ئاسانتر بێت، دەوڵەتێك زۆرتر پابەندبێت بە یاساکانی خۆیەوە کە پێویستی بەهێزکردنی پایەکانی ڕەوایەتی خۆی، ڕێگرە لەتوندوتیژی و سەرکوتی بەربڵاوهێنا. دیارە لەم ناوەدا پەیدابوونی نەوەیەکی نوێ لەچالاکانی بزوتنەوەی کرێکاری کە هیچ





ئەزمونێکی راستەوخۆیان لەشۆڕشی١٨٤٨ نەبوو، وشکستی کۆمۆنەش کاریگەرییەکی زۆری کردبونە سەر، بێ کاریگەری نەبوو.

ئاماژەکانی مارکس بۆ خەباتی یاسایی پرۆلیتاریا، بۆ ئەو نەوەیە ئەوەندە رێگەچارە نەبوو. هەر لەبەرئەمە ئاراستەی لایەنگرانی مارکس لەحیزبە کرێکاریەکانی ئەڵمانیا و فەرانسادا، لەکەمایەتیدا بوون. مارکس لەژێر فشاری رووداوەکاندا ملی بۆ خەباتی دورودرێژی سیاسی دابوو، بەڵام هێشتا دروشمەکانی شۆڕشی لەدڵدا بەزیندووی هێشتبۆوە. مارکس خاوەن تیورەیەکی ورد نەبوو لەبارەی دیموکراسی بۆرژوازیەوە، ئەم کەموکوریەش لەوهەلومەرجەدا کە خەباتی دیموکراتی روو لەپەرەسەندن بوو، شتێکی بەرچاوبوو. خەبات بۆ بەدەستهێنانی شێوە دیموکراتیەکانی دەوڵەتی بۆرژوازی، لای نەوەی تازەی چالاکانی کرێکاری گرنگیەکی زۆری پەیدا کردبوو. ئەوان بەشێوەیەکی تایبەت خوازیاری دروستبوونی دەوڵەتی کۆماری لەئینگلتەرا، ئەڵمانیا و ئیتاڵیادا بوون. بەرهەمە کۆنەکانی مارکس هیچ وەڵامێکی سودبەخشی بۆ ئەوان پێنەبوو. لەهەژدەهەمی برۆمێردا مارکس نوسیبووی بەهۆی شکستی راپەڕینی ژوێنی کرێکارانەوە و هەنگاوە کونەپەرستانەی کۆماری بۆرژوازیەوە، ئاشکرابوو کە: «کۆماری بۆرژوازی تەنها بەمانای ستەمکاری رەهای چینێکە بەسەر چینێکی دیەوە و ئاشکرایکرد کە لەو وڵاتانەدا کە خاوەن ژیارێکی کۆن و پێکهاتەیەکی چینایەتی زۆر پەرەسەندویان هەیە، خاوەن هەلومەرجی مۆدێرنی «بەرهەمهێنان»، و بەهەرمەندن لەهوشیاریەکی مەعنەوەی کە بیرکردنەوە کلاسیکیەکانی بەهۆی هەوڵ و تەقەلای چەند سەدەیەکەوە لەناوخۆیدا توانۆتەوە، کۆمار بەشێوەیەکی گشتی تەنها قاڵبی گۆڕانکاری سیاسی کۆمەڵگای بۆرژوازیە، نەك قاڵبی پاراستنی هەلومەرجی هەبوو، وەکو بۆنمونە لەویلایەتە یەکگرتووەکاندا دەیبینین. لەوێ چینەکانی تا هەنوکە لەکۆمەڵگادا دروستبوون، هێشتا بەشێوەیەکی تەواو سەقامگیر نەبوون، بەپێچەوانەی کۆمەڵگای کۆنەوە، بەردەوام خەریکی گۆڕانی رەگەزە دروستکەرەکانی خۆیان و خەریکی جێگۆڕکێ پێکردنیانن لەگەڵ رەگەزە تازەکاندا. ئامێرەکانی بەرهەمهێنانی «مۆدێرن» لەبری ئەوەی دەرگیری مەسەلەی زیادبوونی سەرژمێریی راوەستاو بن، زۆرتر پارسەنگی کەمێتی سەرژمێر دەکەنەوە و لەئەنجامدا جوڵەی لاو و پڕ جۆشوخرۆشی بەرهەمهێنانی مادی، کە جیهانێکی تەڕ و







تازەی لەبەرامبەر خۆیدا هەیە کە دەبێ بەسەریدا زاڵ بێت، زەمان و هەلی پێویستی نەدۆزیوەتەوە بۆئەوەی جیهانی مەعنەوی کۆن لەناوبەرێت» (ه ب٢٥ـ٢٦، ب ١ ١:٤٠).

بەسەرنجدان لەو دەقەی سەرەوە رووندەبێتەوە، مارکس لەسەرەتای ١٨٥٢دا کاتێك هەژدەهەمی برۆمێری دەنووسی، (حکومەتی) کۆماری لەئەوروپادا بەشێوازی گواستنەوەیی دەوڵەتی بۆرژوازی دەبینی، و پەیدابوونی بۆ کاتێك دەگەڕانەوە کە چینی سەرمایەدار لاوازبووە و لەبەر توندبوونی خەباتی چینایەتی، هێزی خۆی لەدەستدابێت. کۆماریخوازی کۆن (واتە مارکس) لەو دەقەدا بەو دەرئەنجامە گەیشتبوو کە مەسەلەی گرنگتر لەمەسەلەی کۆماریی یان سەڵتەنەت هەن. مارکس شێوەی کۆماری بۆ بۆرژوازی لاو و روو لەپەرەسەندنی وەك بۆژوازی ویلایەتە یەکگرتووەکان بە دروستدەزانی، و بڕوایوابوو لەئەوروپای کۆماریشدا سەرکوتکەرە، و یاساگەلێك دەسەلمێنێت کە راستەوخۆ دژی کرێکارن. زیاد لەبیست ساڵ دوای ئەوە ئەنگڵز بێ سەرنجدان لەم خاڵە لەدەقەکەی مارکس، لەنامیلکەی «باکونینەکان لەپراکتیکدا» (١٨٧٣) لەبارەی ئیسپانیاوە نوسی: «(حکومەتی) کۆماری ئەگەرێك دەڕەخسێنێت، کە ئەم وڵاتە بتوانێت قۆناغە سەرەتاییەکانی پەرەسەندن خێراتر تێپەڕێنێت، و رێگرێکی زۆر بخاتە پشت سەری خۆیەوە، بەڵام ئەم ئەگەرە تەنها بە بەشداری سیاسی و چالاکی چینی کرێکار مومکین دەبێت» (١ ١٣٠:١ـ١٢٩). جارێکی دی ئەو خاڵە قبوڵکرابوو کە لەئەوروپای کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمدا وەك ئەوروپای سەرەتای ئەو سەدەیە، دەبێ خەبات بۆ (حکومەتی) کۆماری بکرێت. جیاوازی هەلومەرجی تازە ئەوەبوو، ئیدی جەخت لەسەر بەشداری کرێکاران لەخەباتی دیموکراتیدا نەك هەر تەنها وەك شتێکی مومکین، بەڵکو وەك شتێکی پێویست و چارەنوسساز دەکرا.

مارکس و ئەنگڵز پاش شکستی کۆمۆنە، بەهێزێکی زیاترەوە باسی گرنگی خەباتی یاساییانەی کرێکاران و پێویستی سودوەرگرتن لەدەزگا فەرمی و یاساییەکانی کۆمەڵگای بۆرژوازیان وەك ئەنجومەنە نەتەوەییەکان، لەروتی پێشکەوتنی چینی کرێکاردا دەکرد. بەر لەوان پرۆدۆن لەدوا بەرهەمی خۆیدا بەناوی «لەبارەی توانای سیاسی چینی کرێکارەوە» (١٨٦٥) گرنگی خەباتی یاسایی «وەك تەواوکەری خەباتە سەرتاسەریەکانی چینی کرێکار»ی دابوو بەگوێدا، بەڵام ئەم باسەی پرۆدۆن لەبەر

بوونی دیسپۆتیزمی بۆناپارتیستی لەفەرەنسادا، هیچ دەرئەنجامێکی ئەوتۆی نەدەبوو. لەدەیەی ١٨٧٠دا لەفەرانسا و ئەڵمانیادا چینی کرێکار هەم لەروانگەی ژمارەوە بەخێرایی گەشەیکرد، هەم خەباتی سیاسی بردەپێشەوە، و حیزبە کرێکاریەکان لەئاستی نەتەوەییدا بوون بە هێزی سیاسی جدی، و سروشتیە کە باسی خەباتی یاسایی کرێکاران گرنگی پەیدا کرد. مارکسیش لەنامەیەکدا بۆ کۆمیتەی برۆنشویك لەیەکەمی سپتامبری ١٨٧٠دا نوسیبووی کە لەئەنجامی شەڕی فەرانسا و پرۆسەوە، مێژوو چۆتە قۆناغێکی تازەوە و یەکێك لەخەسڵەتە دیارەکانی ئەم قۆناغە تازەیە گۆڕانی شێوەی خەباتی سیاسی کرێکارانە (ب ن:١٧٨ ـ ١٧٩). بەڵام هێشتا بەڕاشکاوی پرۆدۆن رونینەکردبۆوە کە ئەمشێوە تازەیە چیە. دەیەیەك دوای ئەمە هێواش هێواش ئاشکرابوو، کە مەبەستی مارکس خەباتی دیموکراتی بووە، و تەنانەت لەمەش زیاتر مارکس بیری لەخەباتی یاسایی و دەسبەسەراگرتنی یاسایی دەسەڵاتی دەوڵەت دەکردەوە.

مارکس لە١٨٨٠دا لە«پێشەکیەك بۆ بەرنامەی سیاسی حیزبی کرێکاری فەرەنسا» نوسی: «تایبەتیکردنی گشتی (ئامێرەکانی بەرهەمهێنان) بۆ پرۆلیتاریا، دەبێت لەرێگەی کۆی ئەو ئامرازانەوە ئەنجامبدرێت کە لەبەردەستیدایە. لەم ئامرازانە مافی رای گشتیە کە دەبێت بەوشێوەیەی کە تائێستا هەیبووە و ئامرازی تەڵەکەبازی چینی باڵادەستبووە، بچێتە دەرێ و ببێت بەئامرازی رزگاربوونی چینی کرێکار» (ب ن ٣٧٧ـ ٣٧٦). لێرە بەدواوە مارکس ئەو رێکخراوە سیاسیانەی بە بەهانەی جیاوازەوە بەشداریان لەخەباتی یاساییدا نەدەکرد، رەخنەدەکرد و ئەوانەی بە «پەیڕوانی سیاسەتی راکردن لەشانۆی جەنگ یان غەیبەتخوازی» ناودەهێنا. ئەنگڵزیش لەوتارێکدا «لەبارەی کاری سیاسی چینی کرێکارەوە» لە٢١ سپتامبری ١٨٧١دا نوسی کە غەیبەتخوازانێك کە سودوەرگرتن لەئامرازی پەرلەمانی و دەزگا بۆرژوازیە دیموکراتیەکان و خەباتی سیاسی، مەحکومدەکەن: "ئەوە لەبیر دەبەنەوە کە شۆڕش خۆی کردارێکی مەزنی سیاسیە" (ب ١ :٢ـ٢٤٦ـ ٢٤٥). مارکس و ئەنگلز پێشنیاریان بۆ رابەرانی سۆسیال دیموکراتی ئەڵمانیا دەکرد کە روداوی خەباتی هەڵبژاردنی ئەنجومەن و لەحاڵەتی سەرکەوتنیاندا خودی دەزگای ئەنجومەن، بگۆڕن بە مێزی





وتاربێژی خەباتی چینایەتی و پڕوپاگەندەی کرێکاری. ویلهلم لیکنشت و ئۆگست بیل لەخەباتی هەڵبژاردنی خۆیاندا پڕوپاگەندەی کاریگەریان دژی لکاندنی ئەلزاس و لۆراین بە ئەڵمانیاوە ئەنجامدا، کە لەلایەن مارکسەوە دەسەلمێنرا. نمونەیەکی تر چەندان ساڵ دوای مردنی مارکس، بە ئامادەبوونی کارل لیبکنشت لەئەنجومەنی ئەڵمانیادا و نەیارێتی ئەو لەگەڵ جەنگی١٩١٤دا، لەدرەوشاوەترین ساتەوەختەکانی مێژووی سۆشیالیزمە.

مارکس کە سەرەتا گومانی لەخەباتی یاسایی پرۆلیتاریا بوو، بەخێرایی بە جێگەیەك گەیشت کە رایگەیاند لەدیدی تیوریەوە ئەگەری گەیشتن بە سۆشیالیزم بە سودوەرگرتن لەئامرازی یاسایی و ئاشتیخوازانە رەد ناکرێتەوە. مارکس لەوتارەکەی خۆیدا لەئەنتەرناسیۆنالی یەکەم لەسپتامبەری ١٨٧٢دا لەئەمستردام رایگەیاند کە: «ئێمە دەزانین دەبێت بایەخێکی زۆر بە دەزگاکان، دابونەریتەکانی وڵاتە جیاوازەکان بدەین. ئەو خاڵەش نکوڵی لێناکەین کە لەوڵاتانی وەك ئەمەریکا، ئەنگلتەرا (ئەگەر ئاشنای دەزگاکانی هۆڵەنداش بومایە، رەنگە ناوی ئەویشم بخستایە سەر) کرێکاران دەتوانن بە ئامرازی ئاشتیخوازانە بە ئامانجی خۆیان بگەن» (ب ن:٣٢٤). شتێکی وەك ئەمەشی لەنامەیەکدا بۆ هێنری مایر هیندمەن لە٨ دیسامبەری ١٨٨٠دا لەبارەی ئینگلتەراوە دوبارە کردۆتەوە: «ئەگەر ئێوە بڵێن لەگەڵ رای حیزبەکەی مندا لەبارەی ئینگلتەراوە نین، من تەنها دەتوانم وا وەڵام بدەمەوە کە ئەو حیزبە شۆڕشێکی ئینگلیزی بەشتێکی پێویست نازانێت، بەڵکو بەپێی پێشینە مێژوویەکان بەروداوێکی مومکینی دەزانێت. ئەگەر پەرەسەندنی ناچاری لەئینگلتەرادا بەشۆڕش بگات، ئەم روداوە تەنها دەرئەنجامی هەڵەی چینە باڵادەستەکان نیە، بەڵکو هەڵەی چینی کرێکاریش دەبێت» (م ب:٣١٤). هەستدەکەم ئەو خوێنەرەی تائێرە لەگەڵ ئەم کتێبەدا بووە، بەتەواوی سەری سوڕمابێت. ئایا نوسەری ئەم قسانە هەر هەمان مارکسی شۆڕشگێڕە؟ هەمان قسەکەری پڕ جۆش و خرۆشی خەباتی چینایەتی و پڕوپاگەندەکەری ماندوونەناسی سیاسەتە شۆڕشگێرانەکانە کە دەنوسێت «هەڵەی» رودانی شۆڕش دەکەوێتە ئەستۆی چینی کرێکاری ئینگلتەراش؟ ئایا تیورەی شۆڕشی مارکس گۆڕانی بەسەردا نەهاتووە؟ چۆن دەکرێت پەرەسەندنی ناچاری سۆشیالیزم نەبێتە هۆی شۆڕش. هەنوکە دەبێ بپرسین





ئایا لەتیورەی شۆڕشی مارکسدا، ئەگەری پەرەسەندنی ئاشتیخوازانە بۆ سۆشیالیزم وەك ئاوارتەیەك دەردەكەوێت، خاڵی سەرەكیش بەردەوام پێویستی كرداری شۆڕشگێڕانەیە یان نا؟ مارکس مەرجەكەی بە سەرنجدان لەدەزگا سیاسیەكان داناوە. ئایا پاش چەند دەیەیەك لەسوكایەتی پێكردنی عەقڵ و زیهنی سیاسی، دواجار بەو دەرئەنجامە گەیشتبوو كە دەزگا سیاسیەكانی كۆمەڵگا، دیاریكەری ستراتیژی شۆڕشگێڕانە دەبن؟ ئەڵبەتە دەبێت ئەوە بڵێین مارکس لەوتارەكەی ئەمستردامدا ئەوەی گوتووە كە لەزۆربەی وڵاتە ئەوروپیەكاندا، بەكارهێنانی زۆر ناچاریە، لەنامەكەی بۆ مایەر هیندمەنیشدا نمونەی ئینگلتەرای یەكسەر لەبەرامبەر ئەڵمانیادا داناوە كە «لەوێ ستەمكاری سەربازی، شۆڕشی كردووە بەشتێكی پێویست» پێدەچێت لەروانگەی مارکسی پیرەوە بوونی دەزگایەكی بیرۆكراتی، سوپایی، كەمێتی نەریتەكان و دەزگا مەدەنیەكان، ئادابی دیموكراتی و یاسایی، لەگرنگترین هۆكارەكانن بۆ رودانی ناچارانەی شۆڕش، بە پێچەوانەوە بوونی دەوڵەت و دەزگا دیموكراتیەكان، دەتوانێت پێویستی شۆڕش بسڕێتەوە.

رەنگە پێویستی شۆڕش بسڕێتەوە، بەڵام پێویستی تێكشكانی دەزگای دەوڵەتی بۆرژوازی، قابیلی سڕینەوە نیە. لەهەر رێگەیەكەوە كرێكاران بەدەسەڵات بگەن، دەبێت گۆڕانكاری بنەڕەتی لەژیانی ئابوری و بەدوای ئەودا لەژیانی سیاسی و كۆمەڵایەتیدا، دروستبكەن. مارکس لەنامەیەكدا بۆ كۆگلمان (١٢ ئاڤریلی١٨٧١) بەڕاشكاوی جەختی لەم خاڵەكرد (م ب :٢٤٧). لەلایەكی دیەوە گەرچی مارکس بیری لەخەباتی یاسایی دەكردەوە، بەڵام ئاگاداری دەكردەوە كە كرێكاران دەبێت ئاگاداربن و نەكەونە داوی چونیەك بینیەوە ***(conformism)*** ئەوان دەبێت بەدوای سیاسەتی سەربەخۆی چینایەتی خۆیاندا بڕۆن و نەبن بە هاودەنگ یان پەیڕەوی بۆرژوازی. لە١٩٣٩دا ڤاڵتەر بنیامین لەیانزەهەمین تێزی «چەند تێزێك لەبارەی فەلسەفەی مێژووەوە» نوسی «چونیەكبینی كە لەسەرەتای پەیدابوونی سۆسیال دیموكراسیەوە بەش و پارچەیەك لەبنەماكانی بوو، نەك هەر تێكەڵ بە تاكتیكە سیاسیەكانی بووبوو، بەڵكو تێكەڵ بە دیدە ئابوریەكانیشی بوو بوو. ئەم چونیەكبینینە یەكێك لەهۆكانی تێكشكانی دوایشی بوو. هیچ شتێك هێندەی ئەم







تێڕوانینە لەشكستی چینی كرێكاری ئەڵمانیادا دەوری نەبوو كە خەریكە لەگەڵ روداوەكاندا دەڕواتە پێشێ. ئەم تێڕوانینە تەماشای پەرەسەندنی تەكنەلۆژیای وەك روداوێكی پێشكەوتوو دەكرد و وایدەزانی كە خۆشی لەگەڵیدا دەجولێت. لێرەوە تەنها هەنگاوێك مابوو تا ئەو تێڕوانینەی كە پێیوایە كاری پیشەسازی كە گوایە پەیوەندی بەگەشەكردنی تەكنەلۆژیاوە هەیە، دروستكەری دەستكەوتێكی سیاسیە. ئەخلاقی كاری كۆنی پرۆتستانتی، لەنێوان كرێكارە ئەڵمانیاكاندا لەشێوەیەكی زەمینیدا، دوبارە دەژیایەوە. بەرنامەی گۆتاش ئەم ئاڵۆزیەی پتر كردبوو و كاری وەك «سەرچاوەی هەموو سامانەكان و كلتورەكان» پێناسكردبوو. مارکس هەستی بە مەترسیەكە كردبوو و نەیارێتی خۆی راگەیاندبوو: «مرۆڤ كە موڵكداری هیچ شتێك نییە جگە لەكاری خۆی» بەشێوەیەكی ناچاری دەبێت بە «كۆیلەی كەسانێكی دی كە خۆیان كردووە بە موڵكدار». بەڵام ئاڵۆزیەكە تازە دروستبوو بوو، وە كەمێك دواتر جۆزف دیتزگن رایگەیاند «رزگاركەری جیهانی مۆدێرن ناوی كارە...ریفۆرمی كار دروستكەری سامانە و ئیتر توانای ئەوەی هەیە بەو ئامانجە بگات كە هیچ رزگاركەرێك پێشتر توانای گەیشتن پێی نەبووە» ئەم چەمكە موبتەزەلە ماركسیە بۆ ماهیەتی كار، ئەو مەسەلەیەی بەبێ چارەسەر دەخستە پشت خۆیەوە كە چۆن بەرهەمی كار دەتوانێ بە قازانجی كرێكارانێك بێت كە هێشتا خاوەنی نین• پێشكەوتنی تەنها لەدەسەڵاتگرتن بەسەر سروشتدا دەزانی و چاوی لەدواكەوتن و گەڕانەوە بۆ دواوەی كۆمەڵگا دادەخست. هەر لەسەرەتاوە بووبوو بەقسەكەری سروشتە تەكنەلۆژیەكان كە دواتر كەوتە ژێردەست فاشیسزم»"٣١". ناوكی سەرەكی تێڕوانینی مارکس لە«پێشەكیەك بۆ رەخنەی فەلسەفەی هەقی هیگڵ، پێشەكی» ئەوەبوو كە كرێكاران لەپەرەسەندنی كۆمەڵگای سەرمایەداری و ئیمتیازە مادی و مەعنەویەكانی مەحرومن، لەگەڵیدا ناگونجێن. ئەوان لەناو كۆمەڵگای مەدەنیدا دەژین، بەڵام موڵكی كۆمەڵگای مەدەنی نین. شێوازی ئەوان بۆ سودوەرگرتن لەئامرازە یاساییەكان نابێت ببێتە هۆی ئەو هەڵە تێگەیشتنەی كە بەبڕوای ئەوانە روداوی پەرەسەندنی كۆمەڵگای بۆرژوازی شەڕە، چونكە خەریكە بەدەسەڵاتیان دەگەیێنێت، تەواو بەپێچەوانەوە، ئەركی ئەوانە بەردەوام پیشانیبدەن كە رێگەیەك جگە لەوێرانكردنی

ئەم کۆمەڵگایە لەئارادا نیە. بەمشێوەیە وێرانی، ئەم ناوەڕۆکەی بیرکردنەوەی بنیامین، سەرچاوەی سەرەکی خۆی لەنوسینەکانی مارکسدا دەدۆزێتەوە.

چونیەکبینی ترسناکترین دەرئەنجامی یاساگەری و خەباتی یاساییە. کاتێك ئەنگڵز لەپێشەکی بۆ «خەباتی چینایەتی لەفەرەنسادا» (١٨٩٥) دەینوسی: «بەڵام هەرچیەك کە لەوڵاتەکانی دیدا روودەدات سۆسیال دیموکراسی لەئەڵمانیادا هەلومەرجێکی تایبەتی هەیە، و پێبەپێی ئەوەش لایەنیکەم لەئایندەی نزیکدا، ئەرکێکی تایبەتی هەیە. دوو ملیۆن دەنگ کە رەوانەی سنوقەکانی دەنگدانی دەکات، لەگەڵ ئەو ژنان و پیاوە لاوانەی کە لەپشتیانەوە راوەستاون، بەڵام مافی بەشداریکردن لەهەڵبژاردنیان بەدەستنەهێناوە، بە بەرزترین ژمارە و چڕترین جەماوەر و هێزێکی چارەنوسسازی لەشکری پرۆلیتاریای نێودەوڵەتی دەژمێرێن...ئەگەر هەلومەرجەکان بەمشێوەیە برۆنە پێشەوە، تا کۆتایی ئەم سەدەیە، ئێمە گروپگەلێکی مەزنی ناوەڕاستی کۆمەڵگا، وردە بۆرژوازی و جوتیارانی بچوك بەلای خۆماندا رادەکێشین و دەبین بە هێزێکی چارەنوسساز کە لەبەرامبەرماندا هەموو هێزەکانی دی، ناچارن کڕنوش بەرن»(ب ١ ٢٠١:١)، خراپترین شێوەکانی چونیەکبینی لەناو دەقی نوسینەکەیدا، خۆی حەشاردابوو. مەسەلەکە ئەوە نیە ئایا ئەنگڵز خەباتی یاسایی بە تاکتیك ناو دەبرد(کە هەر لەم پێشەکیەدا وای ناوناوە) یان مەبەست ستراتیژی دەستبەسەراگرتنی دەسەڵات بووە، بەڵکو مەسەلەکە ئەوەیە ئەنگڵز جەختی لەسەر نەك جیابونەوەی کرێکاران لەکۆمەڵگای مەدەنی، بەڵکو لەسەر چونیەکیان لەگەڵ هێزەکانی دیدا کردووە. ئەنگڵز رەوتی پێشکەوتنی کۆمەڵگای بەو هۆیەی کە بەبڕوای ئەو چینی کرێکار بە دەسەڵات دەگەیێنێت، قبوڵکردووە. تیورەیەك کە کەمێك دواتر برنشتاین پێشکەشیکرد و سەرەڕای ئەو هەموو ناڕازیبونانەی سەرەتا، لەدەرئەنجامدا لەلایەن رابەرانی ئەنتەرناسیۆنالیزمی دووهەمەوە قبوڵکرا، بەناونیشانی «ستراتیژی بڵاوبونەوە» لەساڵی ١٩١١دا لەلایەن کاوتسکیەوە راگەیەنرا، بەڕاستی کە هیچ ناکۆك نەبوو لەگەڵ رۆحی چونیەکبینی باسەکەی ئەنگڵزدا. لۆچۆ کۆڵتی بەدروستی نوسیویێتی: «سۆسیال دیموکراسی ئەڵمانیا لەئرفۆرت «رێگەی پەرلەمانی» هەڵبژارد، نەك لەبەرئەوەی وازی لەچەمکی چینایەتی دەوڵەت هێنابوو، بەڵکو لەبەرئەوەی





بڕوای دیترمنیستی و بڕاوەی بە پێشکەوتنی میکانیکی پەرەسەندنی ئابوری، دڵنیاییدەکرد کە بەدەستهێنانی دەسەڵات لەرێگەیەکی خۆبەخۆی سەقامگیر و ناچاری، رێگەیەکی ئارام، وەك پرۆسەی پەرەسەندنی سروشت، نزیکە»"٣٢". ئەم باسە بەئاماژەکردن بۆ دەقێك کە چەند دەیەیەك پێش کۆڵتی هەمان خاڵی هێنابووە پێشێ، کۆتایی پێدێنم. ڤاڵتەر بنیامین لە«چەند تێزێك لەبارەی فەلسەفەی مێژووەوە» کە پێشتریش چەند رستەیەکم لێهێنایەوە، نوسیبووی تیورەی سۆسیال دیموکراسی و تەنانەت کردارەکانی، بە چەمکێکی پێشکەوتن دروستبووبوو کە پێشکەوتنی بەناچاری پێناسدەکرد، شتێك کە خۆ بەخۆ لەراستەهێڵێکدا، بەرەو پێشەوە دەڕوات. بنیامین گوتبووی ئەم پێشنیارانە راستەوخۆ کێشەئامێزن و قابیلی رەخنەگرتنن، لەهەموو ئەمانەش گرنگتر "رەخنەگرتن لەم تێگەیشتنانە بۆ پەرەسەندن، دەبێ بناغەی هەموو رەخنەیەك لەخودی پەرەسەندن پێکبهێنن"٣٣".

## ئامانجی کرداری سیاسی

مارکس لەنامەیەکدا بۆ فردریش بلێت لە٢٣ نۆڤمبەری١٨٧١ نوسی"ئامانجی کۆتایی (*Endyweck*) بزوتنەوەی سیاسی چینی کرێکار، ئەڵبەتە بریتیە لەدەسبەسەراگرتنی دەسەڵاتی سیاسی لەلایەن ئەم چینەوە. ئەمەش بەشێوەیەکی سروشتی پێویستی بەوەیە کە رێکخستنی سیاسی چینی کرێکار، رێکخستنێك کە لەناو دەرونی خەباتی ئابوریەوە هەڵساوە، پێشتر بە ئاستێك لەکامڵبوون گەیشتبێت"(م ب٢٥٤). هەنوکە با ببینین کە «ئامانجی کۆتای» لەو رستانەی پێشەوەدا بە چ مانایەکە. مارکس و ئەنگڵز چەندانجار دەستبەسەراگرتنی دەسەڵاتی سیاسی بەهۆی چینی کرێکارەوە و تێکشکانی دەوڵەتی بۆرژوازیان بە پێشمەرجی گۆڕانکاری شۆڕشگێڕانەی کۆمەڵگا و تەنانەت بە «یەکەم هەنگاو» ناودەهێنا بۆ گەیشتن بە کۆمۆنیزم. چۆن مارکس توانیبووی شتێك کە خۆی وەك پێشمەرج و یەکەم هەنگاو بۆ گەیشتن بە ئامانجی گرنگتر پێناسیکردبوو، لەجێگەیەکی دیدا بە «ئامانجی کۆتایی» ناوبهێنێ؟ لەنێوان تەفسیرکەرانی بیرکردنەوەکانی مارکس و هەموو پەیڕەوانیشیدا، کەسێك لەگەڵ ئەو حوکمەدا ناکۆك نیە کە ئامانجی سەرەکی و کۆتایی بزوتنەوەی پرۆلیتاری لەناوبردنی دابەشکردنی کاری کۆمەڵایەتی، مۆڵکایەتی تایبەتی چینەکان





و درزی چینایەتی کۆمەڵگایە، کە (هەموو ئەمانەش) بەمانای دروستکردنی کۆمەڵگایەکە پشئەستور بە کاری بەرهەمهێنەرانی پێکەوەگرێدراو. دەستبەسەراگرتنی دەسەڵاتی سیاسی تەنها بەسەرنجدان لەم ئامانجە، مانای هەیە. بەدەربڕینێکی باشتر دەستبەسەراگرتنی دەسەڵاتی سیاسی بە ئامانجی کۆتایی بزوتنەوەکە ناناسرێت. کەوابوو مەبەستی مارکس لەبەکارهێنانی ئەم دەستەواژەیە چیبوو؟

ئەنگلز لە«مەسەلەی مەسکەن»دا نوسیوێتی «هەر حیزبێکی واقعی چینی کرێکار، لەچارتیستە ئینگلیزەکانەوە بەدواوە، سیاسەتی چینایەتی گرتۆتە پێش. واتە رێکخستنی پرۆلیتاریا وەك حیزبێکی سەربەخۆی سیاسی وەك مەرجی پێشەکی خەبات، و دیکتاتۆری پرۆلیتاریاش وەك ئامانجێکی خێرای ئەم خەباتە»(ب ا۔۲:۳۵٦) پێدەچێ ئەم وتەیە (ئێستا بەدەر لەوەی مانای دیکتاتۆری پرۆلیتاریا چییە) دەربڕینێکی باشتری تێڕوانینی مارکس بێت. لێرەدا ئامانجی دەستبەسەراگرتنی دەسەڵات لەڕاستیدا، بەئامانجی خێرا ناوبراوە، نەك بەئامانجی کۆتایی، پێدەچێت ئەمەش لەچوارچێوەی تیورەکانی مارکسدا دەربڕینێکی ورد بێت. ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ دەقی نامەکەی مارکس و لەرستەی «ئامانجی کۆتایی ***(Endyweck)*** بزوتنەوەی سیاسی چینی کرێکار، ئەڵبەتە دەستبەسەراگرتنی دەسەڵاتی سیاسیە بەهۆی ئەم چینەوە» وردبینەوە، رەنگە بتوانین بڵێین مەبەستی مارکس بە سەرنجدان لەوشەی «ئەڵبەتە» باشتر دەزانرێت: ئامانجی بزوتنەوەی سیاسی پرۆلیتاریا دەستبەسەراگرتنی دەسەڵاتە و ئامانجی بزوتنەوە کۆمەڵایەتیەکەشی، بونیادنانی کۆمۆنیزم. بزوتنەوە سیاسیەکە بە دەستبەسەراگرتنی دەسەڵات تەواو دەبێت، بەڵام هێشتا دەبێت زەمینەی گواستنەوە بۆ کۆمۆنیزم خۆشبکات. ئەم تەفسیرە بەشێوەیەك دروستە کە بتوانین بزوتنەوەی سیاسیی لەبزوتنەوەی کۆمەڵایەتی و ئابوری جیابکەینەوە. لەلایەکی دیەوە ئەگەر بزوتنەوەی سیاسی بە دەستبەسەراگرتنی دەسەڵات کۆتایی پێبێت، دیکتاتۆری پرۆلیتاریا چۆن دروستدەبێت؟ دەوڵەتی گواستنەوەی کرێکاران کام شکڵی سیاسی وەردەگرێت؟

بگەڕێینەوە بۆ نوسینەکانی مارکس. مارکس لەوتارێکدا کە لەبارەی یاسا دژی دزینی دار لەئۆکتۆبری ۱۸٤۲دا نوسیبووی، رەخنەی لەدیدێکی یاسایی گرت کە هەر







بابەتێکی تایبەتی کۆمەڵایەتی، بەهۆی خودی ئەو بابەتەوە تاوتوێدەکات و ناتوانێ بیبەستێت بەبابەتی سیاسیەوە. مارکس نوسی «دەبێت هەر مەسەلەیەکی تایبەتی مادی لەڕێگەی سیاسیەوە، واتە لەڕێگەی پەیوەندیکردنی بە کۆی عەقلانیەتی دەوڵەت و ئەخلاقی دەوڵەتەوە، حەلوفەسڵ بکرێت» (م ا ۱:۲٦۲ پەرەسەندنی ئەم تێڕوانینە لەنوسینەکانی دووساڵ دواتری مارکسدا، بەو دەرئەنجامە گەیشت کە بۆ چارسەرکردنی کێشەکانی ژیان کۆمەڵایەتی، دەبێت بونیادی سیاسی هەبوو تێك بشکێنرێت. لەوتارێکدا کە مارکس لەساڵی ۱۸٤٤دا لەوتوێژێکدا دژ بە رۆگە بەناوی «شای پرۆس و ریفۆرمی کۆمەڵایەتی» نوسی، جەختیکرد کە «هەر شۆڕشێك کۆمەڵگای کۆن دەسڕێتەوە، تا ئەو ئاستە شۆڕشێکی کۆمەڵایەتیە، هەر شۆڕشێکیش هێزە کۆنەکان دەروخێنێت و تا ئەم ئاستەش سیاسیە... شۆڕش بەگشتی بەروخانی دەسەڵاتە کۆنەکان و لەناوبردنی پەیوەندیە کۆنەکان، کردارێکی سیاسیە. بەڵام سۆشیالیزم ناتوانێت بێ شۆڕش بەدیبێت. پێویستی بەمکرداره سیاسیە هەیە، تا ئەو جێگەیەی کە پێویستی بەوێرانیو لەناوبردنە. بەڵام کاتێك چالاکیە رێکخراوەکانی دەستپێکرد، کاتێك کە بابەتی سەرەکی، رۆحەکەی، بێتە ئاراوە، سۆشیالیزم بەرگە سیاسیەکەی دادەکەنێت» (م ا ۳:۲۰٦۔۲۰٥). ئاشکرایە مارکس هەر لەهەمان سەرەتای کارەوە، دەستبەسەراگرتنی دەسەڵاتی سیاسی بە پێشمەرجی پەیدابوونی کۆمۆنیزم دەزانی. لەرستەکانی سەرەوەدا خاڵێکی گرنگ هەیە کە هاوکاریمان دەکات بۆئەوەی تەفسیری ئەو رستانە بکەین کە لەنامەکەی مارکسدا بۆ بلێت هاتووە: بەرگی سیاسی پاش دەستبەسەراگرتنی دەسەڵات، کاتێك گەوهەری سۆسیالیزم دێتە پێشێ، واتە خەسڵەتی کۆمەڵایەتیەکەی دێتە ئاراوە و گۆڕانکاریە کۆمەڵایەتیەکان دێنە ناو بەرنامەی کارەوە، دەخرێتە لاوە. واتە ئامانجی دەستبەسەراگرتنی دەسەڵاتی سیاسی بۆ بزوتنەوەی سیاسی کرێکاری کۆتاییە، بەڵام پاش دەستبەسەراگرتنی دەسەڵات چیدی بزوتنەوەی سیاسی بوونی نابێت. ئەوکاتە ئامانجی سەرەکی، یان رۆحی سۆسیالیزم، دێتە ئاراوە. چەندان ساڵ پێشتر لە«مەسەلەی یەهود»دا مارکس رزگاری سیاسی بە هەنگاوێك بەرەو پێشەوە دانابوو کە «دوا شکڵی رزگاری مرۆڤە لەچوارچێوەی سیستەمی هەبوودا، بەڵام دوا شکڵی رزگاری مرۆڤ نیە» (م ا ۳:۱٥٥)

بەبڕوای مارکس رزگاری لەبواری سیاسیدا بەدەستنایەت، هەرچەند لەوێدا دەست پێدەکات. بۆ رزگاری مرۆڤ دەبێت سیستەمی کۆمەڵایەتی و ئابوری بەشێوەیەکی کامڵ بگۆڕێت، و بە وتەی برنشتاین دەبێ سەرتاپای کۆمەڵگا نوێبێتەوە. ئەم کارە مومکین نیە، مەگەر پێشتر دەسەڵاتی سیاسی لەدەست کرێکاراندا بێت. مارکس لە«رێنمایی بۆ نوێنەران (ی ئەنتەرناسیۆنالیزم) لەکۆنگرەی ژنێڤ» لەسپتامبەری ١٨٦٦دا رایگەیاندبوو کە بۆ گۆڕانی بەرهەمهێنانی کۆمەڵایەتی بۆ سیستەمێکی فراوانتر و هاوئاهەنگتری کاری ئازاد و پێکەوەگرێدراو، گۆڕانکاری گشتی کۆمەڵایەتی پێویستن و ئەم گۆڕانکاریانەش لەهەلومەرجی گشتی کۆمەڵگادا روونادەن، مەگەر ئەوەی هێزە رێکخراوەکانی کۆمەڵگا، واتە هێزی دەوڵەتیی لەدەستی سەرمایەداران و موڵکدارە گەورەکان بستێنرێت و بگوێزرێتەوە بۆ خودی بەرهەمهێنەران» (ب ن ٩٤ـ٨٥) پێشتریش مارکس لە«پەیام بۆ ئەنتەرناسیۆنال»دا لەگەڵ ئاماژەکردن بۆ سەرکەوتنی خەبات بۆ دە سەعات کاری رۆژانەی  چینی کرێکاری ئینگلتەرا، باسی سەرکەوتنە مەزنەکانی ئایندەی کردبوو، لەهەمانکاتیشدا جەختی لەوە کردبوو کە دەستکەوتە ئابوریەکان بەس نین. مارکس گوتبووی لەورووەوە کە خاوەنانی زەوی و سەرمایە ئیمتیازەکانی خۆیان بۆ بەرگریکردن لەپاوانکردنە ئابوریەکانی خۆیان و پاراستنی ئەم پاوانکردنانە بەکاردەهێنن، ئەوا "دەستبەسەراگرتنی دەسەڵاتی سیاسی، ئەرکی مەزنی چینی کرێکارە" (ب ن:٨٠).





## پەراوێزەکان"


1-B. Holden. Undrerstanding Liberal Democracy, Oxford, 1987. E. Spitz, Majority Rule, Chatham,Nj,1984.

٢- لەمبارەیەوەو بۆ کێشە تیوریەکانی تری دیموکراسی تەماشای ئەم سەرچاوەیە بکەن:

ب. احمدی. "ناسازەهای دیموکراسی" لە " معمای مدرنیتە. تهران،١٣٧٧.

3- R.A. Dahl, Democracy and its Critics, Yale University, Press,1989, p.52.

4-R. Williams, Culture and Society, London, 1977, p.14.

5-j-J Rousseau, Du contrat social Paris,1978, p.298

٦- دەربڕینەکەی کانتم لەم سەرچاوەیەوە وەرگرتووە:

R. Dahrendorf, "on the origin of inequality among men", in: A. be teille ed, Social Inequality, London, 1987, p.16.

7-J.S. Mills, On Politics and Society, London, 1976, p.112.

8-ibid, p.182.

٩- ر. ارون، مراحل اساسی اندیشە در جامعە سیاسی، ترجمەی ب. پرهام، چاپ دوم، تهران،١٣٧٠، صص٢٤١-٢٤٢.

10-R. Aron, Essais sur les libertes, Paris, 1976, p. 21.

11- L. Krieger, The German idea of Freedom, Chicago Univerity Press,1975, pp 301-302-316-317-512.

12- G. Dellevolpe, Rosseau et marx, Paris, 1974.

١٣- لەمبارەیەوە تەماشای پێشەکی کۆلتی بۆ بەرهەمە سەرەتاییەکانی مارکس بکەن: ن ا: ٤٢-٤٣.

14- J-j. Rousseau, Du Contral Social, Parris, 1973, p.166.

١٥- ئەو هێنانانەوەیەم لە کتێبی ریفۆرمی دینی تا شۆڕشی پیشەسازی، کریستوفر هیل هێنایەوە. لەفەسڵی چوارهەم، بەشی چوارهەمی ئەم کتێبەدا شەرحێکی سەرنجراکێش لەبارەی چینی کرێکاری ئینگەلتەراوە هەیە:

C. Hill, Reformation to Industterial Revolution, London,1983, p.260.

16- E. Paul and others eds, Marxism and Liberalism, Oxford,1986.

17-T. Eagleton, "MarXism Without Marxism: Jaques Derrida and "Specters of marx" , in The Eagleton Reader,

ed, S. Regan, London, 1998, p. 260.
18- M. Levin, Marx, Engels and Liberal Democracy, 1989.
19-N. Bobbio, Democracy and Dictatorship, The Nature and Limits of State Power, treans. P. Keneally, Cambridge, 1989.
20- A. Heller and F. Marxim et democratie, Paris, 1981, P. 160.

٢١- ج. میل، رساله درباره ازادی، ترجمەی ج. شیخ الاسلامی، تهران ١٣٥٨، ص ٥٩.

22- P. Gay. The Dilemma of Democratic Socialism. New York, 1962.
A. Bergounioux and B.Manin, La social-democratie, ou le compromise, Paris, 1979.
23- ph. Lacoue-Labarhe and J-L. Nancy , Rejouer la politique, Paris, 1981, vol.1, pp20-21.
24-Rousseau, op. cit, pp.213-214.
25-B. Taylor, "Socialist feminism, utopian or scientific" in: R. Samuel ed, People s History and Socialist Theory, London, 1981, p.242.

٢٦- پ. ابوت. و ك. والاس، پێشەكیەك بۆ كۆمەڵناسی دیدە فەمنیستەكان، ترجمە م. خراسانی و ح. احمدی، تهران،١٣٧٦.

27-Taylor, op.  cit. p.242>
28-C. Fourier, Vers la liberte en amour, paris, 1975, p.109.
29-W. Scombe, "Houswife and her labour under capitalism" in: New Left Review,83,pp.3-24.
30-A. Mahaim and A. Holt and J.Heinen, Femmes et movement ouvrier, paris.1979.
31- W. Benjamin, lluminations, London,1973, pp. 260-261.
32-L. Colletti, From Rousseau to Lenin, trans. J.Merrington and J. White, London,1972, p.105.
33- Benjamin, op. cit. pp 262-263.





سەرچاوە

وەرگێڕانی بەشێكە لەفەسڵی حەوتەمی ئەم كتێبەی خوارەوە:

بابك احمدی: ماركس و سیاست مدرن. چاپ سوم ١٣٨١. تهران نشر مركز.





## بزوتنەوەی خوێندکاری







### خوێندنەوەی فکری ٦٨

حەمید عوزادانلو

"کۆمەڵگای نامۆ دەبێت لەشانۆی مێژوودا نەمێنێ، ئێمە سەرقاڵی

## دروستکردنی دنیایەکی تازە و ڕەسەنین..خەیاڵ خەریکە دەسەڵات دەگرێتە دەست"

### لەدروشمەکانی بزوتنەوەی خوێندکاری فەڕەنسا

کاتێك حکومەتی کۆمۆنەی پاریس لەئەنجامی کێشەکانی سەدەی ١٩ی ئەوروپادا تێکشکا و تاکە جێگەی بەرگری دژی دەسەڵاتی سەرکوتکەری بۆرژوازی رما، مارکس لەشوێنێکدا نوسی: "لەراستیدا دروستبونی کۆمۆنەی پاریس کۆی ئەو هێزانەی گەڕانەوە بۆ کۆمەڵگا کە بە هۆی دەوڵەتەوە تا ئەو کاتە لەپەیکەری کۆمەڵگا سەندرابوون. دەوڵەت واتە ئەو مشەخۆرەی کە لەسەر خوێنی کۆمەڵگا دەژی و جوڵە و پەرەسەندنی ئازادانەی ئیفلیجدەکات. هەر لەبەرئەوە دروستبوونی کۆمۆنە بەسەرچاوەی گۆڕانکاریەکی بنەڕەتی لەتازەکردنەوەی ژیانی کۆمەڵایەتی فەڕەنسادا دادەنرێت"[1]. کۆمۆنەی پاریس لەو سەردەمەدا لەدەوروبەری لاشەی قوربانیکراوی خۆیدا، خەرمانێکی درەوشاوەی لەبیری بەهێزی کۆمەڵایەتی بەجێهێشت. بێگومان بەشێك لەم وێنەیە بە هەمان ئەو بەهێز و توانایەی مەبەستی مارکس بوو، لەسەدەی بیستەمدا و بەدیاریکراوی لەبزوتنەوە خوێندکاریەکانی دەیەی ١٩٦٠ و سەرەتای دەیەی ١٩٧٠ دا دەرکەوت و بە ناوی بیری ٦٨ ەوە بووە ویردی سەر زمانی هەمووان. بەبڕوای نوسەر ئەوەی لەبەراوردکردنی ئەم بزوتنەوەیە و کۆمۆنی پاریسی سەدەی نۆزدەدا جۆرێك لەپەیوەندی دروستدەکات، ئەو هێڵە سوریالیەیە کە ئەڵقەی پەیوەندی نێوان بیری بۆدلێری سومبۆلیست لەسەنگەرەکانی شەقامەکانی ساڵی ١٨٤٧ و دیدی رەخنەگرانەی سوریالیستی خوێندکارە ناڕازیەکانی سەنگەرەکانی شەقامەکانی ساڵی ١٩٦٨ بووە، کە بیر و باوەڕەکانیان تێکەڵێك بوو لەمارکسیزم و فرۆیدیزم. بەدەربڕینێکی دی پەیوەندیەك بوو "لەنێوان بەرپرسیاری جوامێرانەی رۆمانسیزمی دوایی و ئامانجە فراوانەکانی گروپە خوێندکاریەکان کە دەیانتوانی لەیاخیبوونی کۆمەڵایەتیدا رایگەیێنن: "هەموو ئەو شتانە فەرامۆشبکەن کە فێریبوون و دەستبکەن بەخەیاڵکردنەوە"، و "مەرگ بۆ ریالیزمی سوشیالیزمی و بژی سوریالیزم"، "مەرگ بۆ ژدانۆڤ ستالینیستی". مەگەر ئەوە نەبوو کە سوریالیزم







شۆڕشگێڕانەترین سیاسەتەکانی راگەیاندبوو؟ بە گونجاندنی بەرپرسیاری مارکس بۆ گۆڕینی دنیا و بڕیاڕی رامبۆ بۆ گۆڕینی ژیان، "خوێندکارانیش" هەنوکە ئەرکی گۆڕینی واقعیان لەئەستۆی خۆیان نا"[2].

ئەگەرلەسەدەی نۆزدەدا واتە لەسەردەمی باڵادەستی کلتوری بۆرژوازی و سەرمایەداری شەپۆلی یەکەمدا، گروپە جیاوازەکان بە تەمای دژایەتیکردنی ئەم کلتورە وێرانکەرە بوون و تا رادەیەکیش لەمکارەدا سەرکەوتووبوون، سەرکەوتوو لەو ڕوەوە کە رەهەندەکانی بیرەکانیان لەو سەردەمەوە بە قۆناغی رەخنەگرانەی سەدەی بیستەم گەیشت. شەپۆلێك لەنارازایبوون لەنیوەی دوهەمی سەدەکەدا بەرامبەر بە "پیشەسازی کلتوور" کە بە تەمای دروستکردنی مرۆڤی چونیەك و تاك رەهەند بوو، دەستی پێکرد. ئەم نارازیبوونانە هاوکات بوو لەگەڵ مەترسیەکانی سەدەدا(سەدەی بیستەم) وەك تەقینەوەی ژمارەی دانیشتوان، وێرانی ژینگە، ئیغواکردن و هەڵخەڵەتاندن و ئەنجامدانی نفوزی دەرونی، و دواجار رەخنەگرتن دژی جەنگی ڤێتنام و بەدەستهێنانی ماڤ رەشپێستەکان. رەخنەگرتنێکی جدی کە پاش ئەو خۆشبینیەی دەرئەنجامی سەقامگیری چەند ساڵی دوای جەنگی جیهانی دوهەم بوو، (هەروەها) پاش دامرکانەوەی هەستەکانی دەیەی ١٩٥٠ کە بە دەیەی لاوە دورو ئەندێشەکان بە دوای کار و پیشەدا گەڕان بەناوبانگ بوو، بووشە هۆی وەرزێکی خەونی زستانانە، بۆ بیرە ئەنارشیسیت و رەخنەگرەکان، ئەمجارە لەرێگەی گروپە کلتوری - هونەریەکان، کرێکارانی دەستی، رەشەکان و خویندزانانەوە کە هێواش هێواش لەژێر چەرخی دانەکانی دەسەڵاتی سەرمایەداریدا لەت دەبوون، بڵندبۆوە[3].

هەر لەم ساڵانەدا بوو پاش ئاشکرابوونی تاوانەکانی ستالین لەروسیا و تێگەیشتن لەقوڵایی کارەساتی مرۆیی نازیزم لەئەڵمانیا، وەك ئاشڤێتز ***Auschuits***، رەخنەگرێك لەقوتابخانەی فرانکفۆرت نووسی: "پاش ئاشڤێتز، گوتنی شیعر بێ مانایە"[4]. ئێستا کاتی ئەوە هاتبوو کە تەحەدای ئەم شێوە "دیکتاتۆریە پیرەی" سیستەمی سەرمایەداری بکرێت. هەنوکە دەبوو خوێندکاران ئەم پراکتیکە جێبەجێبکەن[5].

خوێندکارە ناڕازیەکان هەر ئەوەندەی رژانە ناو شەقامەکان بۆ رەخنەگرتن لەوەی کە پێی دەگوترا ململانێ لەگەڵ پیشەسازی کلتوردا، رستەکەی هۆرکهایمەریان

بەدەستەواژەی تر نوسی و تەفسیری خۆیان بۆ ئەو رستەیە پێشکەشکرد: "هونەر مردووە، لێگەڕێن ژیانی ڕۆژانەی خۆمان بخولقێنین"، "عەشقبازیبکەن، نەك جەنگ"[٦]. لەراستیدا بزوتنەوەی خوێندکاری کە پاشتر بە "رەخنە کۆمەڵایەتیەکانی شەستەکان"[٧]ناوی دەرکرد، پریشکی جوڵەکەی بەدەرکردنی خوێندکارێکی ئەڵمانی - فەرەنسی ٢٣ ساڵە بە ناوی دانێل کوون -بندیکیت دەستی پێکرد کە بە بیانوی ئاژاوەگێڕی لەفەڕەنسا دەرکرا. نوسەرێك ئەوی بە ئازادیخوازێکی راستەقینە زانیووە کە لەبەرزترین پلەی ئەکتفیستدا بوو[٨] دانییل کۆن بندیت دەستپێکەری بزووتنەوەکە بوو لەزانکۆی نانتی فەرەنسیدا کە بەخێرایی زانکۆکانی تر و وڵاتەکانی تریشی گرتەوە. گاورین بۆ بەرگریکردن لەدانییل کۆن بندیت دەنوسێت کە بێگومان بۆرژوازیەکان و ستالینیستەکان هەرگیز نایبەخشن[٩]. بندیت وەك زیخێك لەپێڵاوی دیسپۆتیزمدا، چ لەجۆری کۆمنیستیەکەی یان لەجۆری ڕۆژئاواییەکەی، ڕێگر بوو لەجوڵەیان. پاش دەرکردنی بندیت، گروپی جیاواز کە تەنانەت ئەو کرێکارانەشی تێدا بوو کە پێیان دەگوترا یەخە رەشەکان ***Black Jachets*** و هەروەها گروپە نیمچە ئانارشیستەکان، ئەو رەشانەی کە بە دوای مافی خۆیاندا دەگەڕان، لایەنگرانی بزوتنەوەی مەدەنی ***Civil Rights*** و بزوتنەوەی ئاشتی، دەستیان بەشۆڕش کرد [١٠].

بزوتنەوەی خوێندکاری لەزەمانی خۆیدا، هاوکاتی دوو تەوژم بوو، یەکێکیان رەگێکی نیمچە مارکسیانەی هەبوو کە بە سودوەرگرتن لەمارکسیزم ئایدیالیزمی و حیزبی کۆمۆنیست، لەبەر دواکەوتووتن لەجوڵە بەرەو پێشەوە، خۆیان بە قەرزاری مارکسیزم دەزانی، رەگی دوهەمیش ئارەزوویەکی زۆری بۆ ڕێکنەخستن و هەروەها وێرانکردن هەبوو..هەر لەبەر ئەمەش بزووتنەوەکە، رەخنەگرتنی کەسانێکی وروژاندووە[١١].

تیری ئیگلتۆن لەئاماژەیەکی سوکایەتی پێکەردا بۆ ئەم بزووتنەوەیە، دەنوسێ: "لەساڵی ١٩٦٨ دا بزوتنەوەی خوێندکاری سەرتاسەری ئەوروپای گرتەوە. پۆلیس و سوپا لەشەقامەکاندا کەوتنە دژایەتی خوێندکارانێك کە بۆ مسۆگەرکردنی یەکێتی لەگەڵ چینی کرێکاردا، تێدەکۆشان. بزووتنەوەی خوێنکداری بێتوانا لەدەستەبەرکردنی رابەرێکی سیاسی گونجاو، لەبگرەو بێنە گومراهکەرەکانی





سوشیالیزم، ئەناشیزم و زویربوون و ئاشتی مناڵانەدا غەرقبوو، تا لەدەرئەنجامدا ناچار بە پاشە کشێکردن بوو. لەبەرئەوەوە پاش بونیادگەری ***Post sturcturomism*** بەرهەمی تێکەڵبوونی سەرخۆشی و سەرگەردانی، رزگاری و پەرتبوون، شادمانی گشتی و وێرانی، واتە بەرهەمی ١٩٦٨ بوو، پاش بونیادگەری کە توانای تێکشکاندنی بونیادەکانی دەسەڵاتی دەوڵەتی نەبوو، لەبری ئەمە ژێر و ژورکردنی بونیادەکانی زمانی کرد بە شتێکی مومکین[١٢].

هەرچەندە پێدەچێت دیدی ئیگلتۆن بەشێك لەهەقیقەتی تێدا بێت، لەژێر ئەو ناونیشانەدا کە بزوتنەوەکە لەڕ وەرگێڕان لەقسەکەر یان رابەرێکی بەرجەستە، جۆرێك لەشکستی خێرای قبوڵکرد و بیری ٦٨ نەیتوانی بەو شێوەیەی کە پێویستە گرنگی خۆی دەربخات، بەڵام لەبنەڕەتدا ئەو بەڵگەیەی لێرەدا دەهێنرێتەوە ئەوەیە کە بزووتنەوەی ناوبراو خۆی بەدوای دورکەوتنەوە لەرابەران وقسەکەرانی گەورە کە وەك حەکایەتی گەورە ***Metanarrative*** بانگەشەی زانینی هەقیقەتیان دەکرد، دوردەکەوتنەوە[١٣]. خوێندکارانی نارازیی لەگەڵ ئەوەشدا کە هەموو بەرهەمەکانی باکۆنین و مارکس و ئنگلزیان خوێندبۆوە. بەڵام وا بیریان دەکردەوە کە جێبەجێکردنی ئەو تەماعانەی لەدیدی ڕۆشنبیرانی مولتەزیمەوە کەوتۆتەوە، ئەنجامەکەی جگە لەدەسەڵات و سەرکوتکردنی بەردەوام شتێکی دی نابێت. کەوابوو دەکرێ مەزنەی ئەوەبکەین بزووتنەوەکە هەر لەسەرەتاوەو بەشێوەیەکی سوریالیستی مەرگی خۆی قبوڵکردبوو، هەر لەبەرئەمەش بە توندی شەیدای دیدی هونەری و سیاسی سوریالیزم بوو. خوێندکاران بە رووەرگێڕان لەقبوڵکردنی "قسەکەرێك" پیشانیاندەدا کە هەنوکە مرۆڤەکان نین دەسەڵات دەگرنە دەست، یان حیزبەکان نین کە چنگدەکەن بەدەسەڵاتدا، تەنانەت خوێندکارانیش نین، بەڵکو ئەوە خەیاڵە کە دەست بە کارێکی وادەکات. بێگومان ئەمە تاکە دەست بەسەراگرتنێکی دەسەڵاتە کە دەتوانێت رووبدا، بێئەوەی فەسادێکی بەدوادا بێت. هەر لەبەر ئەمەش تەنانەت مارکیوز دەورێکی دیاری لەم بزوتنەوەیەدا وەك رابەرێك هەبوو، بانگەشەی رابەرێتی رەددەکاتەوە. مارکیوز لەچاوپێکەوتنێکدا لەگەڵ برایان ماگی لەمبارەیەوە گوتوێتی: "من لەچالاکیەکانی شەستەکان و سەرەتای حەفتاکانی خوێنکاراندا، مورشید و پێشەوای خوێندکاران نەبووم. من تەنها هەندێك بیرو





بۆچوون کە لەو سەردەم و فەزایەدا پەرشوبڵاو بووبوونەوە، شکڵبەندی کرد و دەربڕی. ئەوەی خوێندکاران لەو ساڵانەدا بۆ دەربڕینی نارەزایی بەرامبەر بە کۆمەڵگایەك دەستیان بە چالاکیکرد کە هەر ڕۆژەی نایەکسانی و ستەم و دڵڕەقی و وێرانکەری گشتی دەردەخست، پێویستیان بەوە نەبوو دوای سیمایەکی شێوە باوکانە یان شێوە باپیرانە بکەون، خۆیان ئەم شتانەیان ئەزموونەدەکرد ولەپێش چاویاندا دەیانبینی"[١٤].

دیدی مارکیوز بەشێك لەبیری ٦٨ ئاشکرادەکات.لەلایەکەوە بێزاری گشتی لەپرۆسەی کەڵەکەکردنی مادی و نەبوونی ئیمان و ئیلتیزامی سیاسی لەدەیەی ١٩٥٠دا و لەلایەکی دیشەوە ئاماژە سەرەتاییەکانی ناسەقامگیری ئابوری لەسەرمایەداری ڕۆژئاوادا، هۆ و هۆکاری هاوبەشی نائارامیەکانی فراوانەکانی خوێندکارانی پێکدەهێنا. لەبەرئەمە دەرئەنجامی ئەم بزوتنەوانە، وەك لەلایەن یەکێك لەخوێندکارە توندڕەوەکانەوە پێشکەشکرابوو، "بانگەشەکردن بوو بۆ لەناوبردنی فەزای بۆرژوازی پەروەردە"[١٥]. بەشێکی تری هەقیقەتەکەش لەلایەن هابرماسەوە لەو ڕوانگەیەوە خراوەتەڕوو کە خوێندکارانی ٦٨ یەکێك لەڕەوتە گرنگەکانی نەریتی ڕۆشنگەری سیاسی بوون. ئەگەرچی هابرماس لەدرێژەی ڕێگەدا وازی لەهاوڕێیەتی بزووتنەوەکە هێنا[١٦]. بە بڕوای هابرماس خوێندکاران و نارازیبوونی ئەم نەوەیە، بە پێچەوانەی تێگەیشتنی هەڵەوە کە هەندێك نوسەر پێیان لەسەر داگرتووە، قڵپکەرەوەی میراتی ڕۆشنگەری نەبووە[١٧]. بەڵکو دەکرێ لەژێر کاریگەری دیدی هابرماسدا بگوترێ، ئەم گروپانە بە دوای گەڕانەوەی ئەو ئازادی و فەزیڵەتە لەدەستچووانەدا بوون کە لەئەنجامی سەقامگیربوونی سیستەمی تاك ڕەهەندی، ئازادی وەك یەکەم قوربانی لەکۆمەڵگا کردبووە دەرێ[١٨].

شۆڕشی خوێندکاری ٦٨ ناوبانگێکی بۆ بزوتنەوەکە پەیدا کرد. "شۆڕشەکە بەشکاتکردن لەسنورداریێتی ئازادی رادەربڕین لەفەزای زانکۆدا دەستی پێکرد، بەڵام زۆر زوو راکێشرا بۆ مەسەلەی گەورەتر: ماهیەتی زانکۆی نوێ و پەیوەندی بەکۆمەڵگاوە و جێگەی خوێندکاران لەزانکۆدا"[١٩]. دیارە لەنێو ئەم مەسەلانەدا جۆرێك لەرەخنەش لەمۆدێرنە و کلتورە چونیەککەرەکەی هەبوو کەخوێندکاران بە دروشمی "قەدەغەکردن، قەدەغەیە"[٢٠] لەیەککاتدا رەخنەیان لەکرداری







قەدەغەکردنە کلتوریەکانو زۆرداری سەرمایەداری دەوڵەتی و تایبەتی دەگرت. ناوەڕۆکی یەکێك لەدروشمەکانیان واتە "هەلومەرجی کارەساتاوی خوێندکاری" بەدوای ژیانێکی نوێدا دەگەڕا، کە لەهەلومەرجی سەرکوتکەرانەی سەرمایەداری دەوڵەتی و ئازاد دا بەدەست نەدەهات.

بزووتنەوەی نیمچە شۆڕشگێرانەی خوێندکاران، هێرشکردن بوو بۆ ئەو وێنایەی زانکۆ کە پێیان دەگووت کارخانەی زانینسازی ***Knowledge Factory***، ئیروینگ هاو لەبارەی زانکۆوە گوتبووی: "یاسایەك بۆ پەروەردەی بێمەبەستانە..کە بەشەوق و ئارەزووی وتوێژێك گەرم دەبێت کە بەبڕوای ئەوانەی زانکۆیی نین، بێ سودە و قابیلی تێگەیشتن نیە..پەنای بیروڕاکان، جێگەیەك کە تیاییدا دەتوانرێت کەسانێك ببینین وەك نمونەی دیسپلینی فکر و عەشق بۆ زانین، چالاکی تیادەکەن". بەبڕوای خوێندکاران ڕێك لەبەرئەوەی زانکۆکان لەو کاتەدا ئاڕاستەیەکی وایان وەرنەگرتووە کە هاوو گوتوێتی، ڕووی لەلاوازیکردووە. کەوابوو ئەم جێگایەی دووبارەکردنەوەی وتاربێژیە بی نرخەکان، دەبوو بە توندی رەخنە بکرێت، لەپێشچاوی ئەواندا زانکۆ دەزگایەکی بیرۆکراتی بوو کە بە تەواوی لەژێر دەسەڵاتی بەهاکانی کارخانە بازرگانیەکان و نوخبە کەمەکانی دەسەڵاتدایە. هیچ کەس نکوڵی لەوە ناکات زانکۆ نابێت لەژیانی کۆمەڵگای دەرەوە دوور بێت و وەك حەمامی عەقڵ، لەفەزای خۆی جیا بێت، بەڵام خوێندکاران و دواجار زۆرێك لەمامۆستایان دەڵێن بەهاکانی زانکۆ دەبێت راستەوخۆ لەبەهاکانی جیهانی بازرگانی، پارە و سیاسەت و هاوشێوەکانی جیا بێت و ئەگەر بڕیارە پێکدادانێك لەڕووی فکری و ئاینیەوە لەنێوان ئەم جیهانانەدا ڕووبدات، لەم حاڵەتەدا دەبێت زانکۆ بتوانێت وەك لیژنەیەکی سەربەخۆ و ئەندامێکی یەکسان، بەشداری لەم وتوێژەدا بکات.

دیارە هەندێك کەس لەمەش زیاتر دەڕۆن و فەزیلەتی جۆرێك لە"دەیر" بۆ زانکۆ قایلن و دەڵێن دەبێت لەجیهانێکێکدا کە هەر ڕۆژێك زیاتر دەچێتە ژێر دەسەڵاتی بەها کاسبکاری و سەربازیەکانەوە، بە تایبەتی ئومێدێکی زۆربە زانکۆ ببەسترێ، چونکە جێگەی پەروەردەکردنی بیروڕای جیاواز و گەشانەوەی زیاترە.

بزوتنەوەی خوێندکاری لەو سەردەمەدا بەهەر شێوەیەك بووە، چەندان مەسەلەی گرنگ و هێشتا چارەسەر نەکراوی خوێندنی باڵای لەکۆمەڵگا پیشەسازی و

دیموکراتیە تازەکاندا، هێنایە ناو بواری گشتیەوە، بۆ ئەوەی چارەسەرێکی بۆ بدۆزێتەوە. بەڵام بەهۆی بەدبینیەکەوە کە دەرئەنجامی میراتی رابردوو بوو، بە ئەندازەیەك جوڵەکەیان توندبوو کە بە توندی هێرشیاندەکردە سەر هەموو جۆرە وێنایەکی کونزەرڤاتیڤانە. لەمڕووەوە لەبەشێك لەم بزوتنەوە خوێندکاریانەدا کەسانێك لەجدیترین نەوەکانیان، هیچ بەهایەکیان بۆ فەیلەسوفانی فرانکفۆرت، وەك هۆرکهایمەر و ئادرنۆ دانەدەنا. تەنانەت بڕوایانوابوو ئەوانیش دەبێت وەك دەزگایەکی پاشماوەی ڕوداوی سەرمایەداری لەناوبچن.

ئەوان لەم چوار چێوەیەدا هاوڕێ لەگەل ڕەخنەکانی مارکیوزو تیمۆتی لێری ***Timuthu Leary*** دەیانویست دەسەڵاتی سیستەمی سەرمایەداری لەناو ببەن کە وەك مارێکی نۆ سەر (***Hydra***) لەهەموو شوێنێکدا ئامادەیە و چاودێرە. سوزان سونتاگ کە لەبارەی ڤالتەر بنیامینەوە کە یەکێکە لەرەخنەگرەکانی سەرمایەداری، گوتبووی کار و بەرهەمەکانی ڤاڵتەر بنیامین دۆزینەوەی ستاتیکای شکستە، دەتوانێت ئێمە لەو ڕاستیە ناسکە نزیکبکاتەوە کە هۆی دۆزینەوەی و سەر لەنوێ خوێندنەوەی بەرهەمەکانی بنیامین لەپاش شکستی بزووتنەوەی پێشڕەوی خوێندکاری ٦٨، جۆرێك ستاتیکای شکست و لاواندنەوەیەك بوو بۆ ئەم بزوتنەوەیە.

ناڕازیبوونی خوێندکاران بەشێوەی جیاواز، بەتەمای لەناوبردنی مۆنۆلۆگی فەرمی و تاك ڕەهەندانەی دەسەڵاتدارێتی حوکمکەرانی کۆمەڵگا بوو، ئەوەی دەبوو لەبری ئەمەش دابنرێت، جۆرێك خود بەڕێوەبردنە (***Self Management***) لەبەشە جیاوازەکاندا. بەڵام بزوتنەوەکە هیچ کاتێك بنەمای خۆ بەڕێوەبردنیان لەتیوریەوە نەکرد بەشتێکی پراکتیکی، بەڵام ئەم بیرۆکەیە کەوەك ئیلهامێکی هەمیشەیی، لەلایەن زیهنەکانەوە پێشوازی لێدەکرێت، هێشتاش دەتوانێت لایەنگرانی ڕاستەقینەی خۆی بدۆزێتەوە.

میراتی بەجێماو لەبزوتنەوەی خوێندکاری، لەژێر ناونیشانی "بیری ٦٨"دا لایەنیکەم لەهەلومەرجی پۆستمۆدێرندا، بەباشی قابیلی تێگەیشتن و دەرککردنە. ئەم بزوتنەوەیە خاڵێ دەرچونێکە بۆ وێنەی مرۆڤێك کە بە هێرشکردن بۆ سەر ئەو بونیادانەی بەسەریدا سەپێنراوە، بەرگری لە"فرەیی گوتار" دەکات. خوێندنەوەی بیری ٦٨ لەقۆناغی ئێستادا خاڵی ناسك ئاشکرادەکات، کە ڕەنگە ببێتە هۆی







لەناوچوونی برێك لەو بەدحاڵیبوونانەی بزوتنەوەکە دروستیکردووە. بێگومان وێرانکردن و لێکبوردنی سیاسی کۆتایەکانی شەستەکان کە هاوکاتبوو لەگەڵ بزوتنەوەی ڕەخنەگرانە لەزۆربەی وڵاتەکاندا، هەنوکە دەتوانێ لەپاڵ نکوڵیکردن لەدروشمی گەورە و بونیادشکێنانە، لەپاڵ نەیارێتی لەگەڵ چەمکە گەورەکان و ناوهێنانی "کۆتایی" بەسەر هەموو حەکایەتە هەقیقەت نماکاندا، جێگەیەك بکاتەوە تا گوتاری فرە و جیاواز دەربکەوێت، بێئەوەی بیەوێت نەخشە یان پرۆژەیەکی کۆتایی بۆ پێشکەشبکات. ڕەنگە لەمڕووەوە فردریك جیمسۆن راستبکات کە لەدۆزینەوەی پەیوەندی نێوان بزوتنەوەی ٦٨ و پۆستمۆدێرنیزمدا، پۆستمۆدێرنیزم وەك میراتی هەمان بزوتنەوە، وەك "ئەناشیزمی نوێ"[٢١] ناودەهێنێت. ئەم ئەنارشیزمە تازەیە رایدەگەێنێت، هەقیقەت لەهەموو شوێنێکدا هەیە و لەهیچ شوێنێکیشدا نیە. ئەم کردارخوازیە تەنها لەڕووی لۆژیکی دەرونیەوە قابیلی تێگەیشتنە.

لەکۆتاییدا و لەکۆی ئەو شتانەی لێرەدا بە کورتی باسکرا، دیسان دەگەڕێمەوە بۆ رستەکەی مارکس کە لەسەرەتای ئەم وتارەدا هێنامەوە، کە هەنوکە لەسەردەمی ئێمەدا ئەویش نەك لەبەردەم جەستەی کوژراوی کۆمۆنەی پاریسدا، بەڵکو لەبەردەم جەستەی کوژراوی بزوتنەوەی ٦٨دا، بیرۆکە گەلێك کۆبونەتەوە کە بەشێوەیەکی بە زەبر و بەهێز، بیرێکی بەهێزیان لەکردارخوازی و جوڵەی کۆمەڵایەتیان لەگەڵدایە. ئەم میراتە پاش شەستەکان لەزۆرێك لەبزوتنەوەکان و بزوتنەوە خوێندکاری و ناخوێندکاریەکانی وڵاتانی دیدا، کارتێکردن و کاریگەری خۆی پیشاندا[٢٢].

## پەراوێزەکان

***1-Marx، Engels and Linin. Anarchism and Anarcho Sandicalism، (Moscow: progress، 1974) p.56-57.***

٢-سی. و. ای. بیگزی: دادا و سوریالیزم، وەرگێڕانی حسین ئەفشار، (تاران، نشر مرکز، ١٣٧٥) ص٥٩.

٣-دێڤید هیڵد لەمبارەیەوە بە ئاماژەکردن بۆ قەیرانەکانی پاش ١٥ ساڵ

سەقامگیری دوای جەنگی جیهانی دووهەم، ئاماژە بۆ کۆمەڵی بەرهەمی سیاسی و فەلسەفی دەکات کە لەبەرامبەر ئەو کۆمەڵە شیکەرەوە سیاسیانەی دەیەی پەنجادا و تەنانەت سەرەتای دەیەی شەست بوو، کە بە گشتی هاوکاتی خۆشبینیەکی زۆر بوو لەبارەی یەکپارچەیی، ڕێکەوتن، سەقامگیری سیاسی و لەم بابەتە شتانە. ئەو بیرانەی لەبەرهەمەکانی ئاگادارە سییاسیەکانی کۆتایەکانی دەیەی شەست و سەرەتاکانی حەفتاکاندا دەردەکەوت، کۆمەڵێك چەمك بوون کە بە گشتی نەیاری بیرەکانی پێشوو بوون. بەرهەمی زانایانی زانستی سیاسی و کۆمەڵناسی سیاسی و فەیلەسوفەکان لەژێر کاریگەری قەیرانەکانی سەردەمدا، و سەرقاڵی شتگەلی وەك هۆکانی تێکشکانی ڕێکەوتن و گونجان، لاوازی بونیادی دیموکراسی سەرمایەداری و لەناوچوونی ئابوری کلتوریەکەی بوو بوو.

دیڤید هێڵد، مۆدێلەکانی دیموکراسی، ت: عباس مخبر (تاران، ڕۆشنگران، ١٣٦٩) ص٣٤٧-٣٤٥.

٤-بۆ ئاگاداری زیاتر لەبارەی دوو کەس لەبیریارانی قوتابخانەی فرانکفۆرت واتە هۆرکهایمەر و ئادرنۆ و پەیوەندی بیرکردنەوەیان بە بزوتنەوەی خوێندکاریەوە، بگەڕێوە بۆ: بابك احمدی، خاطرات ظلمت. (تهران، نشر مرکز، ١٣٧٦).

٥-ریمۆن ئارۆنی گەورە بیریاری سیاسی هاوچەرخ، لەبەرگی دوهەمی یادەوەریە سیاسیەکاندا لەو فەسڵەدا کە باسی ئایدۆلۆژیەکان دەکات، بۆ بەرگریکردن لەبزوتنەوەی خوێندکاری و ڕەخنەگرتن لەوەی کە ژمارەیەك لەئاگاداران بزوتنەوەی خوێندکاریان بە شێوەیەك لەبونیادگەری ئاڵتۆسری داناوە، بڕوای بە تێکەڵکردنی مارکسیزم و فرۆیدیزمە کە لەنمایشەکانی شەقامەکاندا بە ئاشکرا دەردەکەوت، بەجۆرێك کە بە بڕوای ئەو وەك چاودێرێك، هەر کاتێك خوێندکاران دەهاتنە ناو شەقامەکان، ئاڵتۆسیریەکان لەو سەریەوە رایاندەکرد. لۆسیان گۆڵدمانیش ئاماژە بۆ دروشمێکی خوێندکاران دژی بونییادگەری دەکات، کە لەپۆلێکدا لەسەر تەختە ڕەشەکە نوسرا بوو "گەمژەیینە! خۆ بونیادەکان نارژێنە ناو شەقامەکانەوە"، بگەڕێوە بۆ: لۆسیان گولدمان و دیگران. لوسیان گولدمان، گزیدە و ترجمە محمد جعفر پیندە، (تهران نشر چشمە، ١٣٧٦).

٦-هۆرکهایمەر بەسەرنجدان لەو روداوانەی کە بە هۆی خوێندکارە نارازیەکانەوە







ئەنجامدەدرا، زمانی ڕەخنەی کردەوە و گوتی: کاتێك من نمونەی رەخنەگرانەم دروستکرد، هیچ بیرم لەوەنەدەکردەوە کە ڕۆژێك بیانەوێت بە کۆکتێل مۆلۆتۆف بیهێنە دی. هۆرکهایمەر لەم دەیەدا چەندانجار دژی خوێندکاران ڕاوەستا، بۆ ئەوەی لایەنەکانی بەناو هەڵخەڵەتێنەرە زێدەڕەویەکانیان ئاشکرابکات. و پیشانیبدات کە دژ بە ئەمریکایی بوونیان، بە مانای لایەنگری توتالیتاریزمە. لەیەکێك لەم وتارانەدا یەکێك لەخوێندکاران هاوار دەکات: "هۆرکهایمەر تۆ وتیورە رەخنەگرانەکەت بەیەکەوە مردوون". لەپاڵ هۆرکهایمەردا سیمایەکی بەناوبانگی تری قوتابخانەی فرانکفۆرت، واتە هربرت مارکیوز، بەرگری لەمافی سروشتی نەیارێتی، یاسای نارازیبوون، و بیری مەزن دەکرد. هەروەها هابرماس کە تا ماوەیەکی زۆر لایەنگری ئەم بزوتنەوەیە بوو، لەکۆبونەوەیەکی خوێندکاران لەژوینی ١٩٦٧دا بەشداریەکی چالاکیکرد و لەگەڵیاندا لەبارەی ژێر و ژورکردنی سیستەمی پەروەردە و خواستە رادیکاڵیەکانی تریاندا تەبا بوو. ئەم کۆبوونەوەیە لەپاش کوشتنی بنواهە سۆرگ، ئەو خوێندکارە لاوەی کە لەخۆپیشاندانەکەی دژی سەفەری شای ئێران بۆ ئەڵمانیا کرا، بە گلولە کوژرا بوو، ئەنجامدرا و لەهەمانکاتدا گەورەترین کۆبوونەوەی خوێندکاری ئەڵمانیا و دەستپێکی بزوتنەوەی پێشڕەوی خوێندکاری بوو.

تەماشای ئەم سەرچاوەیەی خوارەوە بکەن: ستیوارت هیوز، هجرت اندیشە انتقادی، ترجمە عزت الله فولادوند (تهران، گرح نو، ١٣٧٦) ص ١٩٥ بە دواوە.

٧-تام. بۆتۆمر: منتقدان جامعە. ترجمە: محمد جواهر کلام (تهران، نشر سفیر، ١٣٦٩) ص١٠١.

*(New York & Loondon: ، Anarchism،8-Daniel Guerin*
*pp. 158-159.، 1970)،Monethly Review*
*p.159.،9-I bid*

١٠-شۆڕشی خوێندکاران لەشەستەکاندا ڕێکەوتی وەرچەرخانێکیش بوو لەهونەری مۆسیقای ڕۆژئاوادا کە بوو بووە هاوڕێی بزوتنەوە رەخنەگرەکان. لەم ڕووەوە دەکرێت ئاماژە بۆ گروپی بیتلەکان (*Beatles*) و لینگ ستۆنەر بکەین کە بەرهەمەکانیان لەلایەکەوە رەنگدانەوەی هەست بوو، لەلایەکی دیشەوە یەکێك لەهۆکارە کاریگەرەکان بوو لەگۆڕانی فەزای فکری و سۆزدارێتی بەشێك لەلاوان کە

لەشەستەکاندا بە شۆڕشەکەی خۆیان، ڕابەرێتی یەکێتی شورەویان لەبەرەی چەپدا ڕەتکردەوە، سیاسەتی ئەمریکایان لەڤێتنامدا ریسوا کرد و کلتوری قەڵەندەری و بێهودەییان بەرامبەر بە دیانەتەکان و قوتابخانە فەلسەفیەکانی ڕۆژهەڵات و بەکار هێنانی مادە بێهۆشکەرەکانیان، بە هێرشکردن بۆ مادیگەری ڕۆژئاوا، پەرە پێدا.

١١-لەپاڵ چەند ڕەخنەگرێکدا کە ناوی یەکێکیان لەوتارەکەدا هاتووە، دەبێ ئاماژە بۆ گلن تیندەریش بکرێت کە سەرەڕای هاوڕێیەتی لەگەڵ ئەم ڕەخنە روکەشانەدا، خوێندکاران و بزوتنەوەکەیان تاوانبار دەکات. بە بڕوای ئەو زۆرێك لەخوێندکاران و ڕەشەکان بە دەستێوەردان لەهەقانیەتی دەوڵەتدا، فێری وانە مەکیاڤیلیەت بوو بوون. چونکە ئەوان لەپێناوی ئاشتیدا هەڵومەرجی ئارمیان دەشێوان و بە مەبەستی بەدەستهێنانی عیزەت بۆ هەمووان، سوکایەتیان بە کەسانێك دەکرد کە لەسەر کورسی دەسەڵات بوون. تیندەر بە ئاماژە کردن بۆ ڕەخنەی خوێندکارانی ناڕازی لەئەمریکادا، کە ڕەخنەیان لەشێوازی جێبەجێکردنی دەستوری ئەمەریکی دەگرت، دەنوسێ: شێوازی توتالیتاری و دیموکراتی دووره لەڕۆح و بونیادی دەستوری ئەمریکاوە، بەڵام بینینی ئاماژەکانی لەهەستی خوێندکارانی خەباتگێڕ و ڕەشەکاندا، شتێکی ئەستەم نیە. بەهۆی شۆڕشە زانکۆییەکانەوە، چالاکی ئاسایی زانکۆکان شێوا و دەنگی نەیارە کپ کراوەکان و ئەو داواکاریانەی کە قابیلی جێبەجێکردن نین، هاتنە ئاراوە. کاری لەم شێوانە بە مانای قبوڵنەکردنی کێشەی جێگیری سنورداریتیەکان و دەرکی ماهیەتی نەبوونی ڕێکەوتنەکان و بڕیاردانەکانە. خوێندکارانی یاخی بانگەشەی ئەوەیان دەکرد ئەم شێوەیەی هەڕەشە کردن بە مەبەستی پاراستنی دۆخی باو و کۆی ئەو نادادپەروەری و نایەکسانیەی کە تێیدایە، هاتۆتە ئاراوە.

تەماشای ئەم سەرچاوەیەی خوارەوە بکەن: گلن تیندەر: تفکر سیاسی، ترجمە محمود صبری (تهران: علمی و فرهنگی، ١٣٧٣) ص ٧٤-٧٦.

١٢-تری ئیگڵتۆن ئەم دیدە نێگەتیڤە لەکتێبی "مقدمە بر نقد ادبی" ترجمە عەباس موخبر، دەهێنێتە ئارا و لێرەوە بەو دەرئەنجامە دەگات کە گێژاوی ناو پۆستمۆدێرنیش لەشکستی سیاسی ئەم بزوتنەوەیە بووە (واتە بزوتنەوەی ٦٨). ئەو لەیەکێك لەجیدیترین بەرهەمەکانی خۆیدا بەشێوەیەکی جێی سەرنج، پاشەکشێی کرد و مۆری سەلماندنی لەبەشێك لەرەخنەکانی شەستەکاندا، لایەنیکەم لەڕووی







هونەرییەوە.

تەماشای ئەم سەرچاوەیەی خوارەوە بکەن: (*Terry eagleton، the lideology of the Arthetic "London: Basill Blackwell، 1944"*).

١٣-بە بڕوای نوسەرێك ئەوەی کە خوێندکارانی ناڕازی، لەرابەرە مەزنەکان بە ناوی ڕۆشنبیران، دوردەکەوتنەوە، خۆی لەخۆیدا هەقیقەتێکی دی ئاشکرادەکات. ساڵی ١٩٦٨، بە بڕوای ئەو ساڵی کۆتایی ڕۆشنبیرانی گەورەیە و خوێندکاران ئەوانیان تا ئاستی قوتابیەك هێنایە خوارەوە. چیدی هیچ ڕۆشنبیرێك نەیدەتوانی بانگەشەی هەقیقەت زانین بۆ جەماوەر بکات.

تەماشای ئەم سەرچاوەیەی خوارەوە بکەن:

*David. Schalk-، "Are intellectuals a dying species?"، in Intellecuals in polittics، edited By، Jeremy Jennings ed، (London: Rouledge، 1997)، pp 271-289.*

١٤-برایان ماگی، اشنایی با فلسفه غرب، ترجمە عزت الله فولادوند، (تهران، خوارزمی، ١٣٧١)، ص ٩٧.

١٥-تام، باتامور، هـ. س. پ. ص١٠٩.

١٦-رتانە هالوب: هابرماس (نقد در حوزەعمومی) ترجمە حسين بشيريە، (تهران، نشر نی ١٣٧٥)

*17-Raymond Talid، Enemies of Hope، (London: Macmilan press، 1997)، pp51-67.*

*18-Hervert Marcuse، Negations Essays in Critical Theory، (Allen and the pengun press، 1969) in introduction.*

١٩-تام، ب. باتامور، هـ. س. پ. ص١٠٤.

٢٠-رامین جهانبگلو، نقل عقل مدرن، (تهران: نشر فرزان، ١٣٧٦)، ص ٣٣١.

*21-Barbara Goodwin، Using political ideas (New York: John Wiley press، 1992). P.142.*

٢٢-تەماشای ئەم سەرچاوەیەی خوارەوە بکەن:

محمد تقى قزلسفى، "در بر تك گويى" روزنامه ايران، ١٩ خرداد ١٣٧٧.

٢٣- فردريك جيمسۆن: "ماركسيزم و پست مدرنيسم" ترجمه احمد تدين، در پسامدرنيسم در بوته نقد، (تهران: نشر اگه، ١٣٧٥) ص٧٠-٤٤.

٢٤-ئاگنس هلر، لەپێشەکی کتێبی "هەلومەرجی پۆستمۆدێرن"دا، هاوکات لەگەڵ ئاماژەکردن بۆ ئەو مەسەلەیەی کە هەلومەرجی سیاسی پۆستمۆدێرن لەژێر کاریگەری ڕوداوەکانی شەستەکاندایە، باسی لێکچوونی بزوتنەوەی خوێندکاری ١٩٦٨ لەگەڵ جوڵەی خوێندکارانی ساڵەکانی ١٩٧٩-١٩٧٨ی ئێران دەکات و بە دەربڕینێکی تر جۆرێك لێکچوون لەهەڵوەشاندنی سیستەمی دەسەڵاتدا لەنێوان ئەم دوانەدا دەبینێ.

تەماشای ئەم سەرچاوەیە بکەن:

*The postmodern political condition*، *Agens Heller*، *(canbridge: plity press bas. 1 Black well*، *1988).*

تێبینی:

وەرگێڕانی بەشێکە لەفەسڵی یەکەمی ئەم کتێبەی خوارەوە

محمد تقى قزلسفلى: بازخوانى انديشه ٦٨. تهران. فرهنگ و انديشه. ١٣٧٧.

## دیموکراسی و بزوتنەوەی خوێندکاری

## وتوێژ لەگەڵ چەپەکاندا

## نوسینی: رابرت هۆلاپ

ڕەخنە سەرەتاییەکانی هابرماس لەسەر تیۆرەی ڕاڤەکردنی گادامێر، سەرەتا





لەساڵی ١٩٦٧دا لەگۆڤاری فەیلەسوفیشە روندشاو، بڵاوکرایەوە، دوهەم بەشداریکردنی هابرماس لەم وتوێژەدا لەساڵی ١٩٧٠دا لەنامیلکەیەکدا کە بەبۆنەی یادی لەدایکبوونی گادامیرەوە بڵاوکرایەوە دەرکەوت[1]. بەڵام ئەمە تەنها وتوێژێك نەبوو کە هابرماس بەدرێژایی ئەم ساڵانە بەشداری تێداکرد. ڕووبەڕووبونەوەی لەگەڵ بزوتنەوەی خوێندکاریدا گرنگتر، خێراتر و پڕ و جۆش و خرۆشتر بوو. بزوتنەوەی خوێندکاری لەئەڵمانیادا وەك وڵاتەکانی دی ڕۆژئاوا، بەرهەمی شەستەکان بوو. بزوتنەوەی خوێندکاری ئەڵمانیا کە بەپێگەیشتنی یەکەم نەوەی سەردەمی لەدایکبووی پاش جەنگ دەرکەوت، خاوەن هەمان هۆکار و ئارەزوو بوو کە بزوتنەوە هاوشێوەکانی لەوڵاتە پیشەسازیەکانی دیدا هەیانبوو. ناڕەزایبوونی گشتی لەپرۆسەی کەڵەکەکردنی مادی و نەبوونی ئیمان و ئیلتزامی سیاسی لەپەنجاکاندا و هەروەها یەکەم ئاماژەکانی ناسەقامگیری ئابوری لەسەرمایەداری ڕۆژئاوادا، هۆکار و هۆی هاوبەشی پەشێویە خوێندکاریە بەربڵاوەکانی پێکدەهێنا.

بەڵام دوو هۆی تایبەتیش لەئەڵمانیادا هەبوو. هۆی یەکەم و سەرەتایی رابردووی سەنگینی ناسیونال سۆسیالیزمی ئەڵمانیا بوو. بەدرێژایی ساڵەکانی سەر لەنوێ بیناکردنەوەی موعجیزە ئاسای ئابوری کە بەناوی "موعجیزەی ئابوری"یەوە بەناوبانگبوو، بەشێکی سەرەکی خەڵکی کارو کردەوەکانی ڕژێمی نازیان فەرامۆشکردبوو. بەڵام بەرپاکردنی دادگاکانی ئایشمەن لەساڵی ١٩٦١دا دادگاکانی ئاشڤێتز لەساڵی ١٩٦٣دا و بڵاوبونەوەی شانۆنامە جەماوەریەکان لەبارەی ڕایشی سێهەم و لەوانە درامای وروژێنەری ڕۆلف هۆخۆت لەژێر ناونیشانی "نوێنەر"دا، هوشیاری نەوەی تازەی سەبارەت بەپێشینەی فاشیستی ئەڵمانیا پەرەپیدا. دیارە ئەم نەوەیە چەندان پرسیاریان لەباوکان و دایکانی خۆیان هەبوو، کاتێکیش وەڵامی قانعکەریان پێنەدرایەوە، ململانێ دەستیپێکرد. ململانێی نەوەکان لەئەڵمانیادا شتێکی زیاد لەدوبارەکردنەوەی ململانێی هەمیشەیی و دێرینەی نێوان باوك و کوڕ و دایك و کچ بوو. ئەم ململانێیە ڕەهەندێکی سیاسی ئاشکرای پەیداکرد. هۆی دوهەم ئەوەبوو کە بزوتنەوەی خوێندکاری لەئەڵمانیادا بەشێك بوو لەتەوژمێکی بەر بڵاوی نەیارێتی کە بەناوی "نەیارانی دەرەوەی پەرلەمان" ناسرابوون. ڕەنگە گرنگترین هۆکاری کاریگەر لەدروستبوونی ئەم تەوژمەدا، یەکێکیان دروستبوونی کۆنگرەی





حیزبی سۆسیال دیموکراتی ئەڵمانیا لەساڵی ١٩٥٩دا بێت، کە بووە هۆی پیاچونەوە بەهەندێك لەبنەماکانی سوشیالیزمدا و ئەوبیدیان پێکهێنانی بەرە لەنێوان هەردوو حیزبی سەرەکی سۆشیال دیموکرات مەسیحی بێت کە لەساڵی ١٩٦٦ دا ڕوویدا. ئەو دەرئەنجامانەی گروپە پێشکەوتوخوازەکان لەم ڕووداوانە وەریانگرت، ئەوە بوو پەرلەمان چیدی جێگەی ئەوان نیە و گروپە بەراستی نەیارەکان، دەبوو خۆیان بخەنە دەرەوەی چوارچێوەی فەرمی حکومەتەوە[٢].

هابرماس هەستی بەهاودەردی لەگەڵ ئەم تێڕوانینە ئۆپزسیۆنیە بان پەرلەمانیەدا دەکرد. کەوابوو نەیارێتی هابرماس لەگەڵ ئەم تەوژمەدا بەمانای راستەقینەی وشە کورتدەبۆوە بۆ ڕێکنەکەوتنی لەگەڵ رەگەزەکان یان هەندێك لەشێوازەکانی بزوتنەوەی خوێندکاری. لەراستیدا هابرماس بەردەوام دەیگووت کە بەرگری لەئامانجە هەمەکیەکانی خوێندکاران کردووە و بەپێچەوانەی هەندێك لەتەفسیرکەرانەوە، هیچ کاتێك خۆی نەخستۆتە "دەرەوەی چوار چێوەی بزوتنەوەی خوێندکاری"(٣). هابرماس بەڵگەی باشی هەیە بۆ ئەوەی بەیەکێك لەلایەنگرانی ئارەزووەکانی خوێندکاران دابنرێت. بەگشتی زۆربەی چاودێرانی ژیانی سیاسی ئەڵمانیا لەشەستەکاندا چ کۆنزەرڤاتیڤەکان و چ چەپەکان، بەرهەمەکانی هابرماسیان بەیەکێك لەسەرچاوەکانی ئیلهامی بزوتنەوەی خوێندکاری داناوە. هابرماس خۆی وەك یەکێك لەبەناوبانگترین ئەندامانی نەوەی دوهەمی قوتابخانەی رەخنەگرانە، لەسەرتاسەری شەستەکاندا بەنوێنەری سەرەکی مارکسیزمی نادۆگمایی دادەنرا. یەکەم بەرهەمی سەرەکی هابرماس واتە کتێبی "گۆڕانی بونیادی بواری گشتی" بەشێوەیەکی بەربلاو خوێندرایەوە و لەلایەن چەپەکانەوە وتوێژی لەسەرکرا بەهاوکاری تیورەیەکی سیاسیی نەیاری رژێم دادەنرا. هابرماس لەوتوێژێکدا کە ساڵی ١٩٧٩ ئەنجامدرا، روداوەکانی سەردەمی نوسینی ئەو کتێبەی ژماردووە و لەوانە ئاماژەی بۆ دەرکردنی گروپی خوێندکارانی سۆشیالیستی ئەڵمانی (SDS) لەحیزبی سۆشیال دیموکرات کردووە. هابرماس هاوڕێ لەگەڵ گروپێکی بچوکی هاوکارە پێشکەوتوخوازەکانی خۆیدا بەمەبەستی دژایەتیکردنی ئەمجۆرە سڕینەوەیە لەحیزبی سۆشیال دیموکراتدا، "یەکێتی سۆشیالیستی" دروستکرد و گەرچی خۆی نکوڵی لەوەدەکات کە کتێبی "گۆڕانی بونیادی.." بەمەبەستی راکێشانی خوێندکاران





بەلای خوێندکارانی سۆشیالیستی ئەڵمانیادا نوسیووە، بەڵام خودی هابرماس ئەم کتێبە بەبەشێك لەپرۆژەیەکی سیاسی دەزانێت، بۆ شیکردنەوەی "لاوازیە خودیەکان" و ئەگەرە ترسناکەکانی کۆمەڵگای ئەڵمانیا(٤).

لێرەوە هێنانەئارای یەکێك لەئامانجە سەرەکیە سێ لایەنیەکانی بزوتنەوەی خوێندکاری، وەك بابەتی لێکۆڵینەوە لەکتێبی"گۆڕانی بونیادی"دا شتێکی ڕێکەوت نەبوو. باسەکەی هابرماس لەبارەی لەناوچوونی وتوێژی دیموکراتی راستەقینە و ئەو دەورەی کە دەزگا راگەیاندنە پاوانکراوەکان لەبێئاگاکردن و خۆشباوەڕ هێشتنەوەی زۆرینەی خەڵکدا دەیبینن، بەردەوامی رەخنەیەکە کە ئادرنۆ و هۆرکهایمەر لەکتێبی "دیالەکتیکی رۆشنگەری"دا پێشکەشیانکردووە. پێشوازیکردنی خوێندکاران لەم باسانە لەکۆتایەکانی شەستەکاندا، بووە هۆی ڕێپێوانی دەستەجەمعی دژی دەزگای بلاوکردنەوەی "شپرینگەر" کە یەکێکە لەگەورەترن و پارێزگارترین کارخانەکانی دەزگای بلاوکردنەوەی ئەڵمانیا و چاپکەری پڕ تراژترین رۆژنامەی نەخوێندەوارانە و پڕوپاگەندەی ئەو ولاتە، واتە بیلدتسایتونگە. ئەم رۆژنامەیە لەرەخنەکردنی خوێندکاراندا زۆر سەختگیر بوو، بێگومانیش ئەو پڕوپاگەندە زێدەڕەوانە کاریگەری کردە سەر ئەو توندو تیژیەیی کە لەساڵەکانی ١٩٦٧ و ١٩٦٨ دا ڕوویدا.

دووهەم بابەتی سەرەکی کە بزوتنەوەی خوێندکاری لەپێشچاوی دانابوو، مەسەلەی زانکۆکان و ریفۆرمی زانکۆیی بوو. زۆربەی راپەڕینە خوێندکاریەکان لەشەستەکاندا، ئامانجی هاوشێوەی هەبوو. بەڵام لەئەڵمانیادا ئەم مەسەلەیە لەبەر چەند هۆیەك گرنگیەکی زیاتری هەبوو. سیستەمی زانکۆیی سەرکوتکەر و دامەزراو لەسەر بناغەی زنجیرە پلەیەکی سەخت کە لەکۆتایی سەدەی نۆزدەهەم و سەرەتای سەدەی بیستەمدا لەئەڵمانیادا هەبوو، تەنها تا ئەندازەیەکی سنوردراو بەهۆی ریفۆرمی دوای جەنگەوە گۆڕابوو. سیستەمی زانکۆی ئەڵمانیا لەسەردەمی پاش جەنگدا کە لەبنەڕەتدا نادیموکراتی و بیرۆکراتیانە بوو، لەبری ئەوەی بەدوای سڕینەوە و لەناوبردنی ئەو نایەکسانیە کۆمەڵایەتی و پەروەردەیەدا بێت کە لەولاتدا هەبوو، ئاراستەی بەرەو پارێزگاریکردن و بەردەوامی ئەو نایەکسانیە بوو. هەروەها لەزۆرێك لەزانکۆکانی ئەڵمانیادا رابردووی فاشیزم سێبەرێکی شومی بەسەر زانکۆکاندا، کێشابوو. لەکاتێکدا کە ئەڵمانیای ڕۆژهەلات بەگشتی هەموو پایە و پلەی





خوێندنی باڵای لەفاشیزمەکانی رابردوو پاککردبۆوە، لەئەڵمانیای رۆژئاوادا نازیە کۆنەکان هەروا پایە و پلەی خۆیان پاراستبوو و تەنها لەهەلومەرجی پێویست و ناچاریدا، شێوازە پەروەردەیەکانی خۆیان و مەیلە سیاسیەکانیان لەزانکۆدا دەگۆڕی. لێرەوە خوێندکارە چەپەکانی شەستەکان هەستیان بەنارەزایی و ناخۆشنودیەکی گەورە بەرامبەر بەنەوەی مامۆستایانی پارێزگار و سەرسەختدەکرد. بەڵام هابرماس لەکۆتایی پەنجاکانەوە خوازیاری ریفۆرمی زانکۆیی بووبوو، هەروەهاش بەدرێژایی شەستەکان چالاکانە و بەئاشکرا بەرگری لەریفۆرمی دیموکراتیانە و پەروەردەیی دەکرد(٥).

## تۆمەتی فاشیزمی چەپێتی

روداوێك لەپەیوەندیدا بەسەرکوتکردنی سیاسی لەجیهانی سێهەمدا کە سێهەمین بواری گرنگی پێدانی بزوتنەوەی خوێنکاری ئەڵمانیا بوو، یەکەم روبەرووبوونەوەی نێوان هابرماس و هەندێك گروپی توندڕەوی وروژاند. ئەم روداوە لەشەستەکاندا لەبەرلینی رۆژئاوا کە یەکێك بوو لەناوەندەکانی نەیارێتی خوێندکاری، هاتە ئاراوە. لەساڵی ١٩٦٤دا چەندان رێپێوان بەمەبەستی سەرنج راکێشانی گشتی بۆ نادادپەروەریەکانی رژێمە دیکتاتۆریە راستڕەوەکان لەوڵاتانی جیهانی سێهەمدا، ئەنجامدرابوو. لەدیسامبری ١٩٦٤دا سەردانی موسا چومبێی سەرکۆماری دەوڵەتی کۆنگۆ کە بە بەرپرسیاری کوشتنی پاتریس لۆمۆمبا دادەنرا و هەروەها لەمارسی ١٩٦٥دا سەردانی لیژنەیەك لەبەر پرسیارانی ئەفریقای باشور، روبەرووی نارازیبوونی خوێندکاران بۆوە. بەدرێژایی دوو ساڵ پاش ئەمە، جەنگی ڤێتنام وەك گرنگترین بابەتی پەیوەندی دەرەکی لێهات و شاری بەرلین بوو بەشایەتی زنجیرەیەك رێپێوانی تورە دژی دەسەڵاتخوازی ئەمریکا لەئاسیای باکوری خۆرهەڵاتدا. کەوابوو فەزای سیاسی شاری بەرلین هەر لەپێشەوە خرۆشا بوو، لەم هەلومەرجەدا و لەکاتی سەردانی شای ئێران بۆ ئەو شارە لەدوهەمی ژوئنی ١٩٦٧دا، خوێندکاران جارێکی دی نارەزایی دەستەجەمعیان بەرپێخست. لەو پێکدانەدا کە لەنێوان لایەنگران و نەیارانی شادا روویدا، یەکێك لەخوێندکاران بەناوی بنۆ ئۆنسۆرگ بەدەستی پۆلیس بەسەختی بریندارکرا. ئەم خوێنکارە لەکاتی راکردن لەشانۆی رێپێوانەکە پێکرا(٦).





مەرگی ئۆنسۆرگ شەپۆلێك لەچالاکی خوێندکاری لەسەرتاسەری زانکۆکانی ئەڵمانیادا وروژاند. لەوروەوە کە ناوبراو لەشاری هانۆڤەر بەخاك سپێررا، کۆنگرەیەکی تایبەت بەناوی "زانکۆ و دیموکراسی" لەزانکۆی ئەو شارەدا بەرپاکرا و هابرماس یەکێك بوو لەو حەوت وتاربێژەی کە لەو کۆنگرەیەدا بانگهێشتکرابوون. وتاربێژیەکەی هابرماس بەهێرشێکی توند بۆ سەر دەوری رۆژنامەکان و حیزبە سیاسیەکانی ئەڵمانیا دەستیپێکرد. بەبڕوای هابرماس رۆژنامەکان خەباتێکی دژە رۆشنبیریان بەرپێخستبوو و حیزبە سیاسیەکانیش بەدورکەوتنەوە لەخوێندکاران، بووبوونە هاندەری رۆحیەتی نالێکبوردن و دیدێکی دەسەڵاتخوازانە. هەروەها هابرماس لەبارەی ئەو رووداوانەی هەفتەی پێشوو لەبەرلین رویدا بوو، زەنگی مەترسی لێدا. کاردانەوەی بەرپرسیاران بەرامبەر بەو رێپێوانە، پێشاندەری هەلومەرجێك بوو کە "بۆ یەکەمجار لەسەردەمی فاشیزمەوە، لەکۆماری فیدراڵیدا دەیبینین"(لا ١٣٨). پاشماوەی وتارەکەی هابرماس لەبارەی دەورێکەوەیە کە خوێندکاران دەتوانن لەناو ئۆپۆزسیۆنی دەرەوەی پەرلەماندا بیبینن. هابرماس ستایشی خوێندکاران وەك یەکێك لەرەوتە گرنگەکانی رۆشنگەری سیاسیدەکات. خوێندکاران لەوروەوە کە راستەوخۆ لەژێر کاریگەری و نفوزی گروپە بەرژەوەندیدارە ئابوریەکاندا نین، دەتوانن ئەرکی گرنگی پاسەدانی سەرکوتکردنی دیدی رەخنەگرانە بەهۆی رۆژنامەکان، حیزبە سیاسیەکان و حکومەتەوە بدەنەوە.

"ئەرکی ئۆپۆزسیۆنی خوێندکاری لەکۆماری فیدراڵیدا، قەرەبووکردنی نەبوونی دیدێکی تیوری و نەبوونی هەستیاریە لەبارەی سەردەرگومیەکاندا، نەبوونی دیدێکی بونیادی لەتەعبیرکردن و جێبەجێکردنی دەستوری دیموکراتی و پێویستی پەیرەویکردنی لەوڵاتدا، نەبوونی توانایی پێشبینی ئایندە و نەبوونی خەیاڵێکی بەهێز و بەکورتی قەرەبووکردنی غەفڵەتەکانی ئێمە بووە"(لا ١٣١).

لەگەڵ ئەمەشدا بەبڕوای هابرماس چالاکیە خوێندکاریەکان تارادەیەکی دیاریکراو دەتوانن پێشبکەون، و گەرچی هابرماس وردەکاریەکان روناکاتەوە، بەڵام بەگشتی "مەترسیە زیهنی و بابەتیەکانی" بزوتنەوەکە تاوتوێدەکات. مەترسیە بابەتیەکان هەر هەموویان پەیوەندی بەبونیادی زانکۆ وەك دەزگایەکی کۆمەڵایەتیەوە هەیە. زانکۆکان روبەڕوی کێشەیەکی گران بونەتەوە. یان ئەوەتا





دەتوانن توانای بەرهەمهێنانی خۆیان زیادبکەن و بەمشێوەیە خۆیان لەناو دەرونی سیستەمی کاری کۆمەڵایەتیدا تێکەڵبکەن و لەهەمانکاتدا خۆیان لەبواری گشتی سیاسی بەدوربگرن، و یان دەتوانن لەڕێگەی دیموکراتیکردنی خۆیانەوە، هەڵوێستەکانی خۆیان لەناو سیستەمی دیموکراسیدا دەربخەن. هابرماس بەهەڵبژاردنی ڕێگەی دوهەم بڕوایوایە خوێندکاران دەبێت پێ لەسەر هێنانە ناوەوەی مەسەلە سیاسیەکان لەناو پرۆسەی پەروەردەدا و هەقی بەشداریکردن لەبەڕێوبەرایەتی زانکۆکاندا دابگرن، و لەهەمانکاتدا خەبات دژی ئامێریکردنی پەروەردە وەك دەزگاگەلێك بۆ پەروەردەکردنی نوخبە کۆمەڵایەتیەکان بکەن. مەترسیە زیهنیەکان دەرئەنجامی کۆمەڵێك ناکۆکی و گرژیە، کە لەهوشیاری خوێندکاراندا هەیە. گرژی نێوان تیورە و پراکتیك دەتوانێت بگات بەیەکێك لەدوجەمسەری زیادەڕەوی لەبێهودەیدا یان پراکتیکگەری" ناپەرپرسیارانە. هەروەها ناکۆکی نێوان بەرپرسیاری و دەرگیری سیاسی و ئامادەکردنی پێشەکیەکانی بەدەستهێنانی کار و پایە و پلەش، دەتوانێت بەیەکێك لەم دوو ڕێگەیە بگات کە هەردوکیان بەیەك ئەندازە باش نین؛ یەکێکیان سازشکردنی بێئەندازە بۆ بەدەستهێنانی پایەوپلەو ئەویدیان نەفیکردن و ڕەدکردنەوەی تاوتوێکردنی ئەندێشمەندانە لەوانەکان و بابەتەکانی خوێندندا. دواجار ڕەنگە ناکۆکی لەنێوان پێویستی بۆ وەرگرتنی ئاراستەیەك لەژیانی گشتی و پراکتیکیداو مەیلە سنوردارەکانی زانستخوازانە، یان ببێتە هۆی ئاراستە وەرگرتن بەرەو کورتکردنەوەی مەسەلەکان بۆ چوار چێوەیەکی پۆزەتیفیزمانە، یان ببێتە هۆی سادەئەندێشی تیوری. لەمەش گرنگتر خوێندکاران دەبێت بەبیریان بێت کە لەهەلومەرجی ناشۆڕشگێڕی هەنوکەدا، ئامانجی سەرەکی و سەرەتایی ڕۆشنگەریبوونە، لەڕێگەی عەقڵ و بەلگاندنەوە نەك جولاندن و ڕوکردنە توندوتیژی.

وتاربێژیەکەی هابرماس لەکۆبونەوەی یادکردنەوەی شاری هانۆڤەردا، بەهیچ شێوەیەك دژی بزوتنەوەی خوێندکاری نەبوو. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەو سنورانەی کە بۆ خەباتی خوێندکاری لەچوار چێوەی پرۆسەی ڕزگاریخوازیدا دایدەنا، بەهەڕەشەیەك لەو چالاکیانەی کە کراوون یان لەبەردەستدان کە بکرێن دادەنران. ئەم دیدە لەوتاربێژی ڕۆدی دۆتچکەدا کە یەکێك بوو لەڕابەرانی بزوتنەوەی





خوێندکاری و لەکۆبوونەوەی هانۆڤەر لەڕۆژی ٩ی ژوێندا پێشکەشکرا، دەبینرا. ڕۆدی دۆتچکە وتارەکەی خۆی بەکورتە شیکردنەوەیەکی ئابوری لەبارەی پەیدا بوونی دینامیکیەتێکی تازە لەململانێی چینایەتی و لەپەیوەندی نێوان تیورە و پراکتیکدا کەبەهۆی هەولی سەرمایەداری بۆ زاڵبوون بەسەر ڕێگرەکانی کەڵەکەکردندا دروستبووە، دەستپێکرد. بەپێی تێڕوانینی دۆتچکە هەلومەرجی مادی بۆ چارەسەرکردنی ئەو کێشانەی پەیوەندی بەپێداویستیە مرۆییەکانەوە هەیە خۆشبووە، بەڵام مرۆڤەکان دەبێت کۆنترۆڵی شتەکان بگرنە دەست:

"هەموو شتێك پەیوەندی بەخواستی هوشیارانەی مرۆڤایەتیەوە هەیە بۆ ئەوەی دواجار هوشیار بێت بەرامبەر بەمێژوو، وەك شتێك کە خۆی دروستیکردووە و کۆنترۆڵ و دەستەمۆیبکات، لێرەوە دەبێت ڕوو لەپرۆفیسۆر هابرماس بکەین و بڵێین کە بابەتگەری نابەجێی ئێوە، وەکالەتێك کە دەبێت ڕەها بکرێت لەناودەبات"[٧].

دوتچکە بزوتنەوەی خوێندکاری بەکاردانەوەیەك لەبەرامبەر تازەکردنەوەی دەزگای سیستەمی پەروەردەی وڵاتە سەرمایەداریەکان، بەپێی پەیوەندیە ئابوریەکان دادەنێت. هەنگاوە ترسناکەکانی حکومەت دژی خوێندکاران، ئاشکراکەری گرنگی ئەم بزوتنەوە دژ بە دیسپۆتیزم و دیموکراتیەیە. بەبڕوای دۆتچکە هەنوکە ئەوەی بەر لەهەر شتێك پێویستە، کردارە. ئەو بەئاماژەیەکی ڕوون بۆ بەلگاندنەکانی هابرماس دەڵێت کە ڕۆشنگەری بەبێ پراکتیك، دەبێت بەوشەیەکی بێمانا. لەبەرئەمە دۆتچکە خوێندکاران بانگهێشتدەکات بۆ دروستکردنی هەماهەنگی لەخۆپیشاندان و ناڕازایی گشتی دژی یاسا لەناکاوەکانو حیزبی ڕاسترەوی ناسیۆنالیست (NPD) و جەنگی ڤێتنام[٨].

لەچەند ڕویەکەوە وتارە کورتەکەی دۆتچکە، وەڵامی شیکردنەوەکانی هابرماس بوو. بەڵام ئەوەی بۆ هابرماس زۆر ناڕاحەتکەر بوو، ڕەخنەی هەڵسەنگاندنی مێژوویی ئەو بۆ بزوتنەوەی خوێندکاری نەبوو، بەڵکو ئەوەی کە کاری سەرەڕۆیانە، جێگەی دید و زانین سەبارەت بەپرۆسە بابەتیەکانی کۆمەڵگا بگرێتەوە، زۆر جێگەی نیگەرانی بوو. بەدبەختانە وەڵامی هابرماس بۆ دۆتچکە لەنەبوونیدا درایەوە، چونکە دۆتچکە ناچار بوو هەرچی زوتر بگەڕێتەوە بۆ بەرلین. لەبەر ئەوە هابرماس وەڵامێکی زۆر توندی نەدایەوە. هابرماس بەئاشکرا لەو مەیلانەی ڕویان لەکرداری

ئانارشیستانە بوو، نیگەران بوو. هابرماس لەم خاڵەدا دووجۆر کاری وروژێنەرئاسا لەیەکدی جیادەکاتەوە: یەکێکیان "وروژاندنی نمایشی" کە مەبەستی سەرنجراکێشانە بۆ بەلگاندنە عەقڵی و رەواکانی خوێندکاران و ئەویدیان کە ئامانجی گۆڕینی دەسەڵاتی بالای دەزگای خوێندکاریە، بۆ دەسەڵاتێکی ئاشکرا. وروژاندنی جۆری دوهەم وەك یاریکردنە بەشێوازی تیرۆریزمانە و لەمڕۆوەوە بۆ بزوتنەوەی خوێندکاری ناڕەوایە.

هابرماس وەك چۆن خۆی غافڵناکات لەکۆی کرداره وروژێنەرئاساکانی دژ بەدیسپۆتیزم، هەروەها دژی کۆمەڵێك شێوازە کە خوێندکاران لەبارەی بەڕێوەبردن و کاری زانکۆوە دەیگرنەبەر. بانگەشەکردن بۆ "لەناوبردنی فەزای بۆرژوازی پەروەردە" لەلایەن یەکێك لەخوێندکارە توندڕەوەکانەوە، تا ئەو جێگەیە قبوڵدەکرێت کە ماناکەی بریتی بێت لەخستنەژێر رەخنەی وانە و بەرنامەکان، و پێشکەشکردنی کۆمەڵێك پێشنیار لەلایەن خوێندکارانەوە سەبارەت بەوانە و مامۆستاکان. بەڵام کردەی کۆنترۆڵکردنی فەزای وانەکان، لەڕێگەی هەمە پرسی لەناو خوێندکاراندا، ڕێگەیەکی ترسناك و کێشەئامێزە، چونکە ئازادی زانکۆ دەشێوێنێت. بەکورتی لێرەشدا وەك مەسەلەکانی تر، هابرماس بەدوای پەرەسەندن و پاراستنی توانا دیموکراتیەکانە کە بەشێوەیەکی کردەگی بوونیان هەیە.

بەبڕوای هابرماس ناوەڕۆکی وتارەکەی دۆتچکە، بانگهێشتکردنی خوێندکارانە بۆ کارێك کە دەبێتە هۆی کاردانەوەیەکی توندوتیژ لەلایەن حکومەتەوە، و لێرەوە دەبێتە ڕێگرێگ لەبەردەم ئەوەدا کە خوێندکاران ئەرکی سیاسی سەرەکی خۆیان لەبواری ڕۆشنگەریدا ببینن. دۆتچکە لەشوێنێکی وتارەکەیدا بەئاشکرا خوازیاری کۆبونەوەیە بەمەبەستی مانگرتن، واتە جۆرێك لەخۆپیشاندانی ناتوندوتیژ کە هابرماسیش بەرەوای دەزانێت. بەڵام هابرماس لەوە سەریسوڕماوە کە ئەگەر دۆتچکە خوازیاری کۆبونەوەو مانگرتنە، ئیدی بۆچی سێ چارەك کاتژێری تەواو سەرقاڵی رونکردنەوەو شەرحی "ئایدۆلۆژیای ئیرادەگەری" بوو. دواجار بۆچی وەفاداری خۆی بۆ بنەما ناتوندوتیژەکان، دەرنەبڕی. بەوتەی هابرماس "لەساڵی ١٨٤٨دا دەشیا هەڵوێستێکی تایبەتی لەمچەشنە بەسوشیالیزمی خەیاڵی" ناو ببەن، بەڵام لەهەلومەرجی ئێستادا ناکرێ جگە لە"فاشیزمی چەپڕەو" هیچ ناوێکی دی لێبنرێت







(وە من بۆ بەکارهێنانی ئەم زاراوەیە چەند هۆیەکم هەیە) (لا ١٤٨).

ئەو بەراوردانەی لەو وتەیەدا هەیە و بووە جێگەی مشتومڕێکی زۆر لەناو دەرونی بزوتنەوەی خوێندکاریدا، بەلایەنیکەمەوە چاوەڕواننەکراو بوو. لەئاستێکدا هابرماس بزوتنەوەی خوێندکاری بەراورددەکات بەبزوتنەوە ریفۆرمە کۆمەڵایەتیەکان کە مارکس و ئنگلز لەکتێبی "بەیاننامەی کۆمۆنیست"دا (١٨٤٧) بە"سۆشیالیستەکان و کۆمۆنیستە یۆتۆپی و رەخنەگرەکان" ناویدەهێنان. مارکس و ئنگلز لەو نوسینەدا بەتایبەتی ناوی سان سیمۆن، فەورریە و ئۆین دەهێنن، بەڵام هەموو شێوە هەوڵێکیان بۆ راکێشانی کۆمەڵگا بۆ شۆڕش کە پەیوەندییەکی توندوتۆڵی بەپرۆلیتارياوە نیە، لەم گروپەدا دادەنێن. ئەوەی ئەم سۆشیالیستە یۆتۆپیانە لەدۆخی بەر لەشۆڕشدا دەردەکەون و ئەرکی سەرەکیان رۆشنگەریە، خاڵێکی دیە کە وایان لێدەکات بەخوێندکاران بەراورد بکرێن. بەڵام مارکس و ئەنگلز جەخت لەوە دەکەن کە سۆشیالیستە خەیاڵیەکان، تەنها بەبەکارهێنانی هۆکاری ئاشتیخوازانە، بەدوای گۆڕانی کۆمەڵگاوەن وخۆیان لەکاری سیاسی و شۆڕشگێڕانە دوردەخەنەوە. ئەو ئەنگێزانەی هابرماس دەیخاتە پال دۆتچکە، ڕێك پێچەوانەی ئەم وەسفەن. "ئیرادەگەری" کە هابرماس دەیخاتە ژێر پرسیارەوە تەنها لەچەمکی "فاشیزمی چەپڕەودا" هەیە و هەمووبزوتنەوە جیاوازەکانی لاوانی راستڕەو لەسیەکاندا بەبیر دەهێنێتەوە، تەنها باسێکی روون کە لەقسەکانی هابرماسدا هەیە، ئەوەیە کە ئەو بەدەربڕینی خۆی توندکردن و گواستنەوە لەقۆناغی نمایشیەوە بۆ قۆناغی ورژاندنی توند تیژئامێز، مەحکومدەکات (لا ٩-١٤٦).

بەداخەوە مەسەلە سەرەکیەکانی جێی سەرنجی هابرماس لەوتارەکەدا و لەوەڵامی دۆتچکەدا، بەهۆی ئەم بەراوردە نابەجێیەی بزوتنەوەی خوێندکاری لەگەل فاشیزمدا، بەئاسانی ونبوو. رونکردنەوە و پاشەکشی ڕێژەیەکانی هابرماس لەهەڵوێستی ناوبراو، لەنامەیەکی تایبەتیدا کە هاوڕی لەگەل کۆی نوسینەکانی لەبارەی ناڕەزایی خوێندکاری و ریفۆڕمی زانکۆییەوە، لەساڵی ١٩٦٩دا بڵاوبۆوە، کۆمەکمان دەکات بۆ تێگەیشتن لەو بەراوردە بەروکەش نابەجێیە. هابرماس لەنامەیەکدا بۆ ئیریش فرایدی شاعیری بەناوبانگی ئەڵمانییا، ئەوە روونده‌کاتەوە لێکچونگەلێکی لەنێوان شێوازەکانی دۆتچکە و شێوازە سەرەتایەکانی فاشیزمی

ئیتاڵیادا دۆزیوەتەوە، بەتایبەتی نیگەرانە لەونبوونی ئامانجی سیاسی دیاریکراو (لەبزوتنەوەی خوێندکاریدا). ترسی هابرماس لەوەبوو کە پراکتیك تەنها لەبەر پراکتیك بێتە ئاراوە و چالاکی خوێندکاری بەئاراستەی مەبەست و خواستە راستڕەوەکان، پاڵ پێوەبنرێت. گەرچی ئەو دان بەوەدا دەنێت کە بەکارهێنانی زاراوەی "فاشیزمی چەپڕەو" موبەریری نیە، بەڵام بڕوایوایە کە بەکارهێنانی زاراوەیەکی وا کاریگەریەکی سودمەندی لەناچارکردنی رابەرانی بزوتنەوەی خوێندکاریدا ، بۆ پیاچوونەوە بەمەسەلەی توندو تیژیدا هەیە (لا ۱٤۱-۱٥۱). هابرماس لەنامەیەکدا بۆ گرۆسنەر نەرمیەکی زیاتر بەرامبەر بەدۆتچکە و خوێندکاران پیشاندەدات. بەوتەی خۆی لەکۆنفرانسی هانۆڤەردا دەرکی ئەوەی نەکردبوو کە شێوەی تازە لەکرداری وروژێنەرئامێز پێویستە، تا وتوێژ لەبارەی کۆمەڵێك مەسەلەوە کە بەزۆر لەبازنەی باسکردن سڕاونەتەوە. مومکین ببێت. بەڵام هابرماس هەرچەندە بەها و بایەخی رێژەیی هەندێك شێوازی خوێندکاری قبوڵدەکات و داوای لێبوردن لەبەکارهێنانی زاراوەی "فاشیزمی چەپڕەو" دەکات، بەڵام هەروا دژی تێڕوانینی هەندێك لەرابەرانی بزوتنەوەکەیە لەبارەی شکاندانی هەمەکی و نابەرپرسیارانەی یاساکان، و بەکارهێنانی توندوتیژی لەهەلومەرجی ناشۆڕشگێڕانەی هەنوکەدا، رەددەکاتەوە.(لا ۲-۱٥۱).

## شۆڕشی وەهمی و نەوەکانی

تێڕوانینە گشتیەکانی هابرماس بەدرێژایی ساڵی دوایی بۆ بەرگریکردن لەئامانجەکانی بزوتنەوەی خوێندکاری بوو. هابرماس لەوتەیەکدا کە لەنۆڤەمبەری ۱۹٦۷دا لەنیویۆرك پێشکەشیکرد، تەنانەت هەنگاوێکی دی هەڵهێنا بەرەو ئارەستەی پیاچونەوە بەهەڵسەنگاندنی پەلەی خۆیدا لەبارەی "فاشیزمی چەپڕەو"ەوە. ئەوەی سەردەمێك بەبڕوای ئەو بەشێوازی بەرەی راست دادەنرا، هەنوکە بەشێوەیەکی رەوا بۆ ڕوبەڕوبوونەوەی ئیمپریالیزم، تێکەڵ بەشێوازەکانی بەرگری لەوڵاتانی جیهانی سێهەمدا بووە، (لا ۷۷-۱٥۳). هابرماس لەمیزگردێکدا لەفرانکفۆرت لەفەوریەی ساڵی







دواییدا جارێکی دی ستایشی بزوتنەوەی خوێندکاری دەکات، و لەبەرامبەر تۆمەتی پۆتۆپیاگەری و خەیاڵاویدا بەرگری لێکرد. بەبڕوای هابرماس کەسانێك کە دەیانەوێت کۆمەڵگای پیشەسازی لەرێگەی شێوازە دیموکراتیەکانەوە بگۆڕن، بەهیچ شێوەیەك خەیاڵاوی نین و هاودەردیان لەگەڵ رەنج و ئازارەکانی جیهانی سێهەمدا، ئاشکراکەری هەستیاریەکی ئەخلاقی پێشکەوتووە کە پێداویستی تێگەیشتن و دەرکی ستەم و سەرکوتکردنە بەشێوەیەکی گشتی. هابرماس گەرچی دیدی رەخنەگرانەی خۆی هەروا دەپارێزێت، بەڵام هەڵوێستی لەمچەشنە بەئاشکرا و بەشێوەیەکی تەواو دەیخاتە بەرەی نەیارانی هەلومەرجی هەبووەوە (لا ۸٤-٤۷۸). پێدەچێ رووداوەکانی بەهار و هاوینی ساڵی ۱۹٦۸، ئەو گومانانەی کە هابرماس لەکۆنفرانسی هانۆڤەردا پیشانیدابوو، دوبارە زیندوو کردبێتەوە. تەقەکردن لەرۆدی دۆتچکە لەمانگی ئاڤریلدا کە نزیکبوو ببێتە هۆی مردنی و ئەو نارازییە ئاژاوەئامێزەی ئەم رووداوە وروژاندنی، هەر هەموویان هەڵسەنگاندنی سەرەتایی هابرماسیان لەبارەی سنوردارێتەکان و سنوری واقیعبینانەی چالاکی خوێندکاریەوە، دەسەلماند. لەمانگی مەی ۱۹٦۸دا نارەزایی خوێندکاریی لەپاریس سەرنجی هەموو جیهانی بەرەو خۆی راکێشا. لەزانکۆی فرانکفۆرت واتە زانکۆیەك کە هابرماس وانەی تیا دەگوتەوە، لەکۆتایی مانگی مەیدا هەلومەرجەکە بەشێوەیەکی چاوەڕواننەکراو بەتوندی گرژ بوو، وە خوێندکاران دەستیان بەسەر زانکۆدا گرت و ناویان گۆڕی بۆ "زانکۆی کارل مارکس" و خۆیان سەمیناریان تیا گرت. بەڵام کاتێك گروپێك لەنارازیان ئەرشیفی رەسمی زانکۆیان گرت، پۆلیس موداخەلەی کرد.

ئەمانە ئەو رووداوانە بوون کە ڕێك بەر لەدوهەمین بەرخوردی هابرماس لەگەڵ بزوتنەوەی خوێندکاریدا روویدا. هابرماس لەیەکێك لەکۆنفرانسەکانی یەکێتی خوێندکارانی ئەڵمانیادا (VDS). لەڕۆژی یەکەمی ژۆئیندا، پێنج باسی لەبارەی ئاراستە و ئامانجی بزوتنەوەی خوێندکاریەوە پێشکەشکرد و لەنوسخەی نوسراوی وتەکەیدا کە چەند ڕۆژ دوایی لەوتارێکدا لەیەکێك لەڕۆژنامە لیبڕالەکانی فرانکفۆرتەوە بەناوی "فرانکفۆرت رۆندشاو" بڵاوکرایەوە، باسی شەشەمیشی خستە سەر. لەپێشەکی ئەم وتارەدا هابرماس جارێکی دی تێڕوانینی خۆی لەمبارەیەوە بەروونی دەردەبڕێ کە بزوتنەوەی خوێندکاری گۆڕانێکی گرنگ و پێشکەوتوخواز

بووە لەکۆمەڵگای ئەڵمانیای پاش جەنگدا. ئەو ئاسۆیانەی بەهۆی ئەم بزوتنەوەیەوە دروستبووە، "تازە و جدی" و ئاماژە بۆ تواناکانی گۆڕانکاری لەکۆمەڵگا پیشەسازیەکاندا دەکەن. ئەو دیدانە هەڵگری بنەما پێویستەکانن بۆ ڕێکخستنی سۆشیالیستانەی پرۆسەی بەرهەمهێنان، بەدەر لەدەستتێوەردان لەلایەن دەزگا دەوڵەتیەکانەوە. بەڵام هابرماس ئاماژە بۆ چەند مەترسیەکیش دەکات و بەدوای رەگی ئەم مەترسیانەش لەلایەنگری نەریتێکدا دەگەڕێت کە خۆشباوەڕانە و دەمارگیرانە لەلایەن رابەرانی بزووتنەوەی خوێندکاریەوە، قبوڵکراوە و پەیڕەویی لێدەکرێت. (مەبەستیش لەم نەریتە بەئاشکرا نەریتی بیرکردنەوەی مارکسیە). ئەو ئاڕاستە دۆگماییەی هابرماس لەم بزوتنەوەیەدا دەیبینێت، بەهەڕەشەیەك بۆ ئامانجەکانی بزوتنەوەکەی دەژمێرێت و ئەگەری سەرکەوتنی سیاسی دەخاتە مەترسیەوە. لەبەرئەوە ئەگەرچی هابرماس بڕوایوایە باسەکانی خۆی کاردانەوەیەك بووە بەرامبەر بەڕووداوەکانی ئەم دواییانە، بەڵام لەهەمانکاتدا ئەم باسانە بەردەوامی و پەرەپێدانی هەمان ئەو تێڕوانینانەیە کە ساڵی پێشوو لەهانۆڤەر پێشکەشیکردبوو. دیارە ئەم تێڕوانینانەیە تەنانەت بەو شێوەیەی کە لەژۆێنی ١٩٦٨دا ڕاگەیەنران، بەتەواوی کامڵ و تەواو نەبوون و هابرماس دواتر لەچاوپێکەوتنێکدا ڕایگەیاند کە لەپشت هەر رستەیەکی ئەو تێڕوانین و باسانەوە، چیرۆکێك لەئارادا بووە[9]. لەگەڵ ئەمەشدا هەمان ئەو تێڕوانینانە، وێنایەکی باشتر بۆ جێگەی بزوتنەوەی خوێندکاری لەناو شیکردنەوەکانی هابرماسدا بۆ کۆمەڵگای ئەڵمانیای پاش جەنگ، و هەروەها لەناو کۆی مەیلە تیوریەکانی هابرماسدا بەدەستەوەدەدات.

یەکەم بەلگاندنی هابرماس ئەوەیە کە "ئامانجی یەکسەری نارەزاییە خوێندکاریەکان، بەسیاسیکردنی بواری گشتیە" (لا ١٨٩)[10]. ئەو بەلگاندنانەی بۆ بەرگریکردن لەم هەڵوێستە هێنراوەتەوە لەشیکردنەوەکانی کتێبی "گۆڕانی بونیادی بواری گشتی" و هەروەها لەشیکردنەوەی ئاسانترەکانی کتێبی "قەیرانی رەوایەتی"ەوە (١٩٧٣) وەرگیراوە[11].

هابرماس لەبەرهەمی یەکەمدا دەریدەخات چۆن بواری گشتی لیبڕاڵی کە تیایدا بیرەکان بەشێوەیەکی ئازادانە پێشکەشدەکران، بەهۆی هەلومەرجی تازەی سەرمایەداریەوە روو لەناوچوونە، هابرماس لەسەر بناغەی شیکردنەوەکانی







هۆرکهایمەر، ئادرنۆ و مارکیوز پیشانیدەدات چۆن لەناوچوونی بواری گشتی و تایبەتی، پەشێویەك دروستدەکات کە دەزگا راگەیاندنە گشتیەکان و دەزگا پڕوپاگەندەکان و پەرلەمانیەکان، سودی لێوەردەگرن. لەبەرهەمی دووهەمدا هابرماس دەڵێت کە لەکۆمەڵگا سەرمایەداریە پێشکەوتوەکاندا زەمینەی قەیران لەبواری ئابوری و دەزگای بەڕێوەبەرایەتیەوە، چووە بۆ بواری سیستەمی رەوایەتی بەخش. دەکرێ بەلگاندنەکانی هابرماس بەسادەترین شێوە بەمشێوەیەی خوارەوە دەربڕین: ململانێی بنەڕەتی لەکۆمەڵگای سەرمایەداریدا، سەرچاوەکەی هەمان دابەشکردنی نایەکسانی سامانە لەنێوان خەڵکیدا. بەڵام بەهۆی دەستتێوەردانی روو لەزیادی دەوڵەتەوە لەڕێکخستنی بازاڕدا و بەبەخشینی مافی سیاسی بەگشتی بەهەموو دانیشتوە پێگەیشتووەکان، ئەگەری ململانێ لەبارەی رەوایەتیەوە زیاددەکات. هۆی ئەم گۆڕانە سادەیە: نوێنەرانی دەوڵەت ئەگەرچی بەهۆی هەموو خەڵکەوە هەڵبژێراوون، بەڵام دەبێت بەزامنکردنی بەرژەوەندی ئابوری زیاتر بۆ بەشێکی بچوکی دانیشتوان کە بەردەوام بچوکتر دەبێتەوە، رەوایەتی بەچالاکی خۆیان بدەن.

رەوایەتی لەڕێگەی جیاوازەوە بەدەستدێت، لەوانە پاراستنی دیموکراسی روکەشی بێ بزواندنی بەشداریکردنی جەماوەر، پڕوپاگەندە بۆ ئەو ئایدۆلۆژیانەی کە وەفاداری جەماوەر رادەکێشن، و زامنکردنی وەفاداری بۆ ڕژێم لەڕێگەی دانی پارە یان زامنکردنی دەرفەتەکانەوە. بەبڕوای هابرماس بزوتنەوەی خوێندکاری گرنگیەکی زۆری هەیە، چونکە رەوایەتی کۆمەڵگای سەرمایەداری لەلاوازترین خاڵەکانیدا دەخاتە ژێر پرسیارەوە، ئەم بزوتنەوەیە پەردە لەسەر هەڵە ئایدۆلۆژیەکان هەڵدەماڵێت، هەوڵدان بۆ سەرگەرمکردن و دورخستنەوەی سەرنجی خەڵکی لەمەسەلە سەرەکیەکان رەخنە دەکات، و مەسەلە بنەڕەتیەکانی ئابوری و سیاسەت دەخاتە ژێر باسەوە. بزوتنەوەی خوێندکاری ئەم بەهانەیە قبوڵناکات کە تەنها خەبیرەکان دەتوانن لەبارەی مەسەلە ئابوری و سیاسیەکانەوە بڕیاربدەن، بەڵکو بەپێچەوانەوە خەرمانی ڕێز لەپسپۆرگەری، لەدەزگا بڕیاردەرە دەوڵەتیەکان دادەماڵێت و سیاسەتگوزاری دەکاتە بابەتی وتوێژی گشتی. بەمشێوەیە بزوتنەوەی خوێندکاری بۆ بەرانگاری ڕژێمێك کە سەرقاڵی رەعیەتپەروەریە دەچێتە مەیدان ، و دەیەوێت خواستی هاوڵاتیانی خۆی تەنها لەبواری تایبەتیدا سنورداربکات. بەکورتی

بزوتنەوەی خوێندکاری زۆر گرنگ و بنەڕەتیە، چونکە بواری گشتی کە سیاسەتی لێداماڵراوە، سەرلەنوێ سیاسی دەکاتەوە. هەر لەبەرئەمە زۆرێك لەئامانجی هێرشەکان و ڕەخنەکانی خوێندکاران، دەزگاگەلێکن کە وتوێژی گشتی کۆنترۆڵدەکەن. کاتێك هابرماس بەتایبەتی ئاماژە بۆ کارخانە گەورەکانی دەزگای بڵاوکردنەوە دەکات، مەبەستی گروپی بڵاوکراوەکانی شپرنگەرە کە خۆپیشاندانی خوێندکاری دژی ئەم بڵاوکراوانە لەدوای تەقەکردن لەرۆدی دۆتچکەوە، زیادیکرد. ڕۆژنامەکانی وەك بڵاوکراوەکانی شپرنگەر لەلایەکەوە زۆرینەی خەڵك لەبەشداریکردن لەو باسانەدا کە پەیوەندی بەمەسەلە واقعیەکانەوە هەیە، قەدەغە دەکات و لەلایەکی دیشەوە خەڵکی دژی خوێندکارانی ناڕازی کە بەدوای دروستکردنی وتوێژی گشتیەوەن هاندەدات. لەو ڕوانگەیەوە هابرماس بەرگری لەخەبات دژی دەزگای بڵاوکردنەوەی شپرینگەر دەکات کە یەکێك لەداهێنانەکانی خوێندکاران بوو، چونکە خەباتێکی لەمچەشنە زیان لەیەکێك لەخاڵە لاوازە سەرەکیەکانی سیستەم دەدات.

دوهەم باسی هابرماس پەیوەندی بەگرنگی مێژووی بزوتنەوەی خوێندکاریەوە هەیە. بەبڕوای هابرماس سەرکەوتنی چالاکیەکانی ئەم بزوتنەوەیە پەیوەندی بەدروستکردنی شێوازی تازەی ناڕازیبوونەوە هەیە. هابرماس سێ ڕەهەندی ئەم شێوازانە دەستنیشان دەکات:

١-ڕەهەندی یەکەم بەرگری ناتوندوتیژە کە بەتایبەتی لەسەردەمی بزوتنەوەی مافی مەدەنی لەئەمەریکادا دەرکەوت. ئەمجۆرە لەناڕازیبوون بەتایبەتی کاریگەرە، چونکە بەکەمترین مەترسی و هەوڵدان، پڕوپاگەندە دەگەیەنێتە بەرزترین ئاست.

٢-هابرماس لێکچوونی ناڕازیبوونی خوێندکاری لەگەڵ ڕەخنەی ڕەمزی لەکلتوری گشتی دەهێنێتەوە. پێدەچێ مەبەستی هابرماس لێرەدا "شانۆی شەقامی" یان "شانۆی چریکی"ە کە شێوە جیاوازەکانی کلتوری گشتین کە بابەتە قبوڵکراوەکانیان خستۆتە ژێر پرسیارەوە. ئەمجۆرە شێوە سیاسیە جیاوازانەی چالاکی کلتوری، کە لەمەیلە گشتیەکانی مۆدێرنیزمی هونەری و بەتایبەتی شێوەی سیاسی مۆدێرنیزمەوە وەك مۆدێرنیزمی برێخت و بیری نامۆبوونەوە سەرچاوەدەگرن، کوتەکێکی لەناکاو دەوەشێنن و پەردە لەسەر ماهیەتی داب و نەریتە باوەکان هەڵدەماڵن. کاریگەری ئەم شێوانە لەبەرئەوەیە کە لەهەمانکاتدا هەم گەمە و هەم







جدین. هابرماس بەچەکێکی بەهێزیان لەخەباتدا دەزانێت، ڕێك لەبەرئەوەی توندوتیژئامێز نین.

٣-هابرماس بەڵگە دێنێتەوە کە شێوازەکانی بزوتنەوەی خوێندکاری، تایبەتن بەگروپێکی تەمەنیەوە و پەیوەندیان بەشێوە دەروناسیەکانی بەرگریکردنەوە لەبەرامبەر نەوەی باواندا هەیە. کەوابوو بانگکردنی خوێندکاران بۆ گروپە تەمەنیەکانی دی تا پەیوەندیان پێوە بکەن، کارێکی بێهودەیە. تەنها کەسانێك کە تێگەیشتنێکی دروستیان بۆ کارەکانی خۆیان نیە و لەڕووی دەروننناسیەوە لەیەکێك لەقۆناغە پێشوەکانی پەرەسەندندا "ڕاوەستاوون"، ڕەنگە داواکاری لەمچەشنە قبوڵبکەن.

ئەم سێ ڕەهەندە واتە نەبوونی توندو تیژی، کرداری ڕەمزی و ڕەفتاری تایبەتی نەوەیەك بۆ هێرشکردنە سەر سیستەمی باو، زۆر گونجاون. چونکە ڕوبەڕووی پرۆسەی سیاسەت داماڵین دەبنە کە بۆ پاراستنی ڕەوایەتی لەکۆمەڵگا سەرمایەداریە پێشکەوتووەکاندا پێویستە.

هابرماس لەسێهەم باسی خۆیدا بۆ ڕەگی ناڕەزایی خوێندکاری نەك لەبواری ئابوریدا، بەڵکو لەبواری کۆمەڵایەتی — دەروننناسیدا دەگەڕێت. لەمباسەدا هابرماس لەگەڵ زۆرێك لەرابەرە بەرجەستەکانی بزوتنەوەی خوێندکاریدا، وەك دۆتچکەدا نیە کە نائارامیەکانی خوێندکاران دەگەڕێنیتەوە بۆ هۆکارە ئابوریەکان. بەپێی تێڕوانینی ڕابەرانی لەمچەشنە، سیستەمی پەروەردە لەکۆمەڵگای سەرمایەداریدا خاڵی لاوازی سیستەمی ئابوریە کە چارەسەری قەیرانەکانی خۆی لەڕێگەی موقەرەرات و سەرکوتکردنی ناوخۆیی و وەبەرهێنانی جیهانی سێهەمەوە دەکات. لێرەوە خوێندکاران لەناو جەرگەی هەنگاوە سەرکوتکەرەکاندان. دوو خاڵی گرنگی دی یەکێکیان جیهانی سێهەمە و ئەوی دیشیان پرۆلیتاریایە. هابرماس بەپێچەوانەوە بەڵگە دەهێنێتەوە کە خوێندکاران هێشتا یەکێك لەگروپە مومتازەکانی کۆمەڵگان. بزوتنەوەی خوێندکاری بەپێچەوانەی خەباتی ڕابردوو دژی دیسپۆتیزم، خەبات بۆ بەشێکی گەورەتری سامانناکات، بەڵکو لەخودی چەمکی ئیمتیازات و دەستکەوتەکان لەکۆمەڵگای پیشەسازیدا ناڕازیە. ناوەڕۆکی ناڕازیبوونی خوێندکاران، ڕێك دەرئەنجامی ئەوەیە کە ئەوان لەهەلومەرجی نەبوونی پێویستی ئابوریدا گەورەبوون

و هیچ ڕۆڵ و سودێك بۆ ئەخلاقیاتی بۆرژوازی و یان وردە بۆرژوازی قایل نین. خوێندکاران هەر لەبەرئەم رزگاریە لەپێداویستی خێرا، "هەستیاریەکی تازە"یان پەیداکردووە، و بەپێی ئەمەش نەهێنانە ئارای خەسڵەتە ئەخلاقیە بنەڕەتیەکانیان لەوتوێژی گشتیدا بەناڕەوا دەزانن. هابرماس ئاماژە بۆ بوارێکی تایبەتی دەکات کە ئەم خەسڵەتە تازەیە، بەشێوەیەکی کاریگەری کاری تیادەکات. لەکۆمەڵگا سەرمایەداریە پێشکەوتووەکاندا شێوەی پراکتیکی بەدەستهێنانی سامانی کۆمەڵایەتی، پەردە لەسەر نادروستی ئەو گریمانە ئەخلاقیە هەڵدەماڵێ کە پێیوایە پاداشتی ڕەنج و زەحمەت سامان و بەهێزیە. هابرماس بڕوایوایە بزوتنەوەی ناڕازیی خوێندکاران لەپەیوەندیدا بەبواری رەوایەتیەوە، دەتوانێت ناکۆکی نێوان واقیعیەتی سامان و ئایدۆلۆژیای کرێ و پاداشت لەکۆمەڵگای سەرمایەداریدا، توندتربکات.

لەکاتێکدا سێ بەڵگەی یەکەم لەبارەی ئامانجەکان، شێوازەکان و تواناکانی بزوتنەوەی خوێندکاریە، دوو بەڵگەی دوای ئاماژە بۆ کەموکوڕیەکانی ئەم بزوتنەوەیە لەئایدۆلۆژیا و لەپراکتیکدا دەکات. هابرماس لەبەڵگەی چوارەمدا دەڵێت کە خوێندکاران بڕوایان بەتیورەیەك لەبارەی کۆمەڵگاوە هەبوو کە یان گومانلێکراوە یان راست نیە، و لێرەوە نەیانتوانیوە شێوازە گونجاوە پراکتیکیەکان لەو تیورەیەوە وەربگرن. هابرماس ئاماژە بۆ سێ بواری دۆگمایی مارکسی دەکات کە خۆشباوەڕنە وەك بناغەی شیکردنەوەی کۆمەڵایەتی قبوڵکراوون.

١)بزوتنەوەی خوێندکاری تیورەیەکی بۆ قەیران قبوڵکردووە کە لەسەر بناغەی تیورەی نرخی کار دامەزراوە. مارکس لەتاوتوێکردن و شیکردنەوەی کالا لەکتێبی "سەرمایە"دا بڕوایوابوو کە نرخ بەهۆی ئەندازەی کاری ئەبستراکتەوە کە لەناو کالادایە، دەستنیشان دەکرێت. ئەندازەی کاری ئەبستراکتیش خۆی بەپێی زەمەن ئەندازە دەکرێت. هەرچی زەمەنی پێویست بۆ بەرهەمهێنانی کالا زیاتر بێت، ئەو کالایە نرخی زیاتر پەیدادەکات. زیادبوونی کارایی هۆکارەکانی بەرهەمهێنان (پێشکەوتنە تەکنیکیەکان، بەکارهێنانی سودمەندانەتری هێزی کار و لەم بابەتە) بەمانای کەمبوونەوەی نرخی کالا دەبێت. بەبڕوای مارکس قەیرانەکانی کۆمەڵگای سەرمایەداری کاتێك پەیدا دەبن کە سەرمایەداران ناچاردەبن بکەونە پێشبڕکێوە لەگەڵ یەکدیدا و لەدەرئەنجامی ئەمەشدا قازانج روو لەکزیبکات. لێرەوە تەنها





ڕێگەی بەدەستهێنانی قازانج بۆ سەرمایەدار، لەڕێگەی وەبەرهێنانی نرخی زیادەیە لەکرێکاران. سەرمایەدار تەنها لەبەرامبەر بەشێك لەنرخی دیاریکراوی کالادا، کرێ بەکرێکاردەدات، باقیەکەی کە نرخی زیادەیە دەچێت بۆ سەرمایەدار. لێرەوە کەمبونەوەی نرخی قازانج، بەشێکە لەنرخی کار و بەپێی تیورەی مارکسیستی دەبێتە هۆی پەیدابوونی قەیران لەڕەوتی کەڵەکەکردنی سەرمایە، رکود و بێکاری بەربلاو.

بەبڕوای هابرماس هەرچەندە ئەم تیورە و مەیلانە لەسەدەی نۆزدەهەمدا بەکارهێنانێکی سنوردراوی هەبوو، بەڵام ئەمڕۆ بایەخیان لەژێر پرسیاردایە. بەبڕوای هابرماس ئەمڕۆ هیچ جۆرە لێکۆڵینەوەیەکی ئەزمونیانە لەبارەی ئابوریەوە نیە کە لەسەر بناغەی تیورەی نرخی کاربێت. جگە لەمە دەستێوەردانی دەوڵەت، جێگریەکی بۆ سەرمایەداری بەرهەمهێناوە، کە پێدەچێت تیورەی قەیران لەمارکسیزمی ئەرسۆزێکسدا بێبایەخ بکات. کەمترین شتێك کە دەتوانین بیڵێین ئەوەیە بەردەوامی و جێگیری درێژخایەنی ئابوریەکانی سەرمایەداری، چیدی بەهۆی ئەو قەیرانانەوە هەڕەشەی لێناکرێت کە لەخەیاڵی مارکسدا بوو.

٢) بەبڕوای هابرماس بزوتنەوەی خوێندکاری تێڕوانینێکی مارکسی کۆنی بۆ ململانێی چینایەتی قبوڵکردووە. چینەکان بەشێوەی باو بەهۆی شێوەی پەیوەندیان بەئامێرەکانی بەرهەمهێنانەوە پێناسە دەکرێن. شیکردنەوەکانی مارکس بۆ کۆمەڵگای سەرمایەداری ئەو باوەڕەی تیا دروستکرد کە لەململانێی نێوان پرۆلیتاریا (چینێك کە هیچجۆرە دەسەلاتێکی کاریگەری بەسەر ئامێرەکانی بەرهەمهێناندا نیە، و دەبێت هێزی کاری خۆی بۆ دەستمایە بەسەرمایەدار بفرۆشێت) و بۆرژوازی (چینێك کە دەسەلاتی بەسەر ئامێرەکانی بەرهەمهێناندا هەیە، یان موڵکایەتی ئەو ئامێرانەی لەدەستدایە)، کلیلی تێگەیشتنی گۆڕانکاریە شۆڕشگێڕانەکانە. لەتیورەکەی مارکسدا پرۆلیتاریا تەنها چینێکە کە دەتوانێت سەرمایەداری سەرنگونبکات و شۆڕشی سوشیالیستی بەڕێبخات.

هابرماس ڕاستەوخۆ شیکردنەوە چینایەتیەکانی مارکس دەخاتە ژێر پرسیارەوە، بەڵام بەهەرحاڵ بەڵگە دێنێتەوە کە سەرمایەداری سەدەی بیستەم ڕێگەی هۆشمەندانەی بۆ لەناوبردنی ململانێی نێوان پرۆلیتاریا و بۆرژوازی دۆزیوەتەوە.





کوێ تواناکانی کۆمەڵگا لەدابەشکردنی سەرچاوەکانەوە بیگرە تا پڕوپاگەندە، بەکارهێنراوە بۆ ئەوەی ڕێگە لەدەرکەوتنی ململانێی چینایەتی بگرێت. ململانێ پەراوێزیەکان (هابرماس ڕەنگە بزوتنەوەی خوێندکاریش بەیەکێکیان دابنێت) ڕێك لەبەرئەوەی بوونەتە جێگەی لێکبوردن، بۆ سیستەمی سەرمایەداری مەترسی ئامێزنین. ئەو گروپانەی خاوەن ئیمتیاز نین وەك ڕەشەکانی ئەمەریکا، ناتوانن بەدەستهەڵگرتن لەهاوکاری هەڕەشە لەسیستەمەکە بکەن. ئەو گروپانەشی دەتوانن هەڕەشەیەکی لەمچەشنە دروستبکەن، بەهۆی خاوانداریتی ئیمتیازەوە، هەست بەوەفاداریدەکەن.

٣) هەروەها خوێندکاران لایەنگری تیورەیەکن کە سەقامگیری ڕێژەیی جیهانی یەکەم، بەوەبەرهێنانی جیهانی سێهەم دەزانێت. پێشتر بینیمان کە دۆتچکە بڕوای بەپەیوەندیەکی هۆ و هۆکاری لەنێوان وڵاتە پێشکەوتوەکانی ڕۆژئاوا و فەقیری نەتەوە دواکەوتوەکاندا هەیە. لەراستیدا ناڕەزایی بەرامبەر بەجەنگی ڤێتنام و دیداری رابەرانی رژێمە سەرکوتکەرەکان بۆ ئەڵمانیا، لەسەر بناغەی دەرگیری ئەڵمانیا لەم مەسەلانەدا، ئاراستە نەدەکرا، چونکە بەهەرحاڵ ئەڵمانیا بەلایەنی زۆرەوە ڕۆڵێکی ناڕاستەوخۆی لەم مەسەلانەدا هەبوو، بەڵکو بەهانەی ناڕازایبوون، بوونی پەیوەندیەکی وەبەرهێنانی بوو لەنێوان سەرمایەداری و جیهانی سێهەمدا.

هابرماس ماهیەتی ئەم پەیوەندیە دەخاتە ژێر پرسیارەوە. هابرماس قبوڵیدەکات کە لەڕووی مێژوویەوە ئیمپریالیزم بەرپرسیاری ئەو هەلومەرجەیە کە لەوڵاتەکانی جیهانی سێهەمدا پەیدابووە، بەڵام بڕوایوایە هەنوکە وەبەرهێنانی ئابوری رابردوو، جێگەی خۆی بەشێوازی جۆربەجۆری وابەستەیی لەنێوان ئەم نەتەوانەدا داوە. لەنەبوونی پەیوەندی کۆلۆنیالی راستەخۆدا، ئەوەی ماوەتەوە تورەیی و ئازاری ئەخلاقیە دژی جیهانی یەکەم. بزوتنەوەی خوێندکاری ئەم تورەیی و ئازارەی بەمیرات بۆ ماوەتەوە. ئەگەرچی ڕەنگە ئەم کاردانەوەیە ڕەوا بێت، بەڵام نابێت بەدەرئەنجامی وەبەرهێنانێکی (ئیستیسمار) بزانین کە ئیدی بوونی نیە.

قبوڵکردنی ئەم سێ هەڵوێستە، دەبێتە هۆی پەیدا بوونی سێ بەدحاڵیبوونی بنەڕەتی لەبزوتنەوەی خوێندکاریدا. یەکەم بەدحاڵیبوون ئەو وێنایەیە کە ناڕەزایبوونەکان بەشێکن لەشۆرشێك. هابرماس بڕوایوایە بەهیچ شێوەیەك







بەڵگەیەك بۆ ئەم بانگەشەیە لەئارادا نیە. ئەوەی پێداویستی شۆڕشە و بوونی نیە، تێڕوانینێکی زیهنیە بۆ هەلومەرجێك کە تەحەموولناکرێت. کەسانێك کە وادەزانن شۆڕش بەزودی ڕوودەدات، خۆیان هەڵدەخەڵەتێنن. دووهەم ئەوەیە خوێندکاران بەهەڵە باوەڕیانوایە کە لەخەباتەکانی خۆیاندا هاودەست و هاوڕێی بزوتنەوە دژ بەئیمپریالزم و شۆرشگێڕەکانی جیهانی سێهەمن. بەبڕوای هابرماس هەلومەرج و شێوازەکان و پێشگریمانەکانی ئەم دووجۆرە لەبزوتنەوەی ناڕازیی، بەهیچشێوەیەك بەیەك بەراورد ناکرێن.

هابرماس لەبەڵگاندنی پێنجەمی خۆیدا دەرئەنجامە خراپەکانی باسی چوارەم دەهێنێتە ئاراوە. شیکردنەوەی نادروستی هەلومەرجەکان، بۆتە هۆی بەکارهێنانی کۆمەڵێك شێوازی پراکتیکی کە خوێندکارانی گۆشەگیر و هێزە پشتیوانەکانی گۆڕانی دیموکراتی، بێتوانا کردووە. ڕابەرانی بزوتنەوەی خوێندکاری ڕەمزەکانیان لەگەڵ واقعیەتدا تێکەڵکردووە. هەڵگرتنی ئاڵای سور لەکاتی گونجاودا، دەتوانێ پرۆسەیەکی فکری تازە دروستبکات. بەڵام خوێندکاران نابێت هەڵخەڵەتێن و وابزانن کە لەحاڵەتی داگیرکردنی سەنگەرەکانی دوژمندان. نابێت داگیرکردنی زانکۆیەك لەڕێپێوانێکدا، لەگەڵ کودتایەکدا تێکەڵبکەین. ئەم تێکەڵکردنە لەنێوان واقع و ئارەزووەکاندا بۆتە هۆی شتێك کە هابرماس ناوی دەنێت "شۆڕشی وەهمی" کە تیایدا شێوە دروستەکانی ڕۆشنگەری، جێگەی خۆیان بەدەرگیری بێمانا دەدەن. دەرئەنجامی بەرخوردێکی لەمچەشنە لایەنگریە لەدروستکردنی ناکۆکی بەهەرشێوەیەك کە بووە. هاوکاری لەگەڵ ئەو گروپ یان دەستانەدا کە میانڕەون و قەدری ئازادیە هەبوەکان دەزانن، ڕەد دەکرێتەوە و لەبەرامبەریدا پڕوپاگەندە بۆ یەکێتیەکی وەهمی لەنێوان کرێکاران و خوێندکاراندا دەکرێت کە هیچ بناغەیەکی لەواقعدا نیە. بەمشێوەیە ئەو سنورداریانەی دەزگا واقعیە هەبووەکان بۆ چالاکی دروستیدەکەن، فەرامۆشدەکرێن. لەم نمایشە پێکەناویە شۆڕشگێڕانەدا، سێ سیما بەر لەهەموو شتێك خۆیان دەردەخەن. سیمای یەکەم، ئاژاوەگێڕە کە بەشێوەیەکی خۆپەرستانە دەژی و خۆی دەخاتە ناوجەرگەی چالاکی جەماوەریەوە، بەڵام لەهەمانکاتدا هەموو جۆرە پەیوەندیەکی بەواقعەوە لەدەستداوە. دووهەم سیما، سیمای ڕابەرە کە وەك چاوەدێرێکی هوشیار هیچ ئەزمونێکی پراکتیکی نیە و کاری

موریدەکانی خۆی بەهۆی بەڵگاندنی ئاڵۆز و تەماویەوە ئاراستەدەکات. دواجار هابرماس ئەو کەسانەی وەك مەتحکەرانی شۆڕشی وەهمی دەردەکەون و ناوەڕۆکی توندڕەوانەی دەورە پێشیویەکان سەر لەنوێ وەردەگرنەوە، بە"دەلقەکە"کانی نمایشی شۆڕشیان ناودەنێت. کەسانی وا هیچ بایەخێك بەدەرئەنجامە واقعیەکانی قسەکانی خۆیان نادەن.

دوا بەڵگاندنی هابرماس کە لەنوسخەی چاپکراو لەڕۆژنامەی ناوبراودا خراوەتە سەری، دەگەڕێتەوە بۆ بابەتێکی پۆزەتیڤتر ."شۆڕی وەهمی" دەبێت شێوە کارە درێژخایەنەکانی خۆی بگۆڕێت و پەیامی خۆی لەبواری ڕۆشنگەری جەماوەریدا بسەلمێنێت. بزوتنەوەی خوێندکاری دوو کاری هەڵخەڵەتێنەرانەی ئەنجامداوە. یەکێکیان ئەوەیە ئەم بزوتنەوەیە هەوڵەکانی دەوڵەتی بۆ پاراستنی ڕێکخستنێك کە لەسەر بناغەی خەسڵەتە قبوڵکراوەکانە، لەگەڵ سەرکوتکردنی ڕژێمە فاشیستیەکاندا تێکەڵکردووە. دووهەم ئەوەی بزوتنەوەی خوێندکاری زیادەڕەوی لەبارەی هێز و توانای خۆیەوە کردووە و لەوکاتانەدا کە کردارێکی ڕەمزی گونجاو و بەسبووە، پەنای بۆ زۆربردووە. هابرماس بانگەشەی بزوتنەوەی خوێندکاری دەکات کە بەگەڕانەوە بۆ تاکتیکە گونجاوەکان لەگەڵ هەلومەرجی واقیعدا، بگەڕێنەوە بۆ ئامانجە جێی ستایش و ئازادیخوازەکانی خۆیان، واتە سەرەتا دەبێت تێبگەن کە لەهەلومەرجی شۆڕشگێڕیدا نین. لێرەوە دەبێت ئەوان بەدروستی لەهەلومەرجی یاسایی ئۆپۆزسیۆنی دیموکرات لەکۆمەڵگای ئەڵمانیا و مافە یاساییەکانی تێبگەن و هەڵیسەنگێنن. ئەوان هەروەها دەبێت حسابی مێژووی ئەڵمانیای پاش جەنگ لەگەڵ رابردوودا جیابکەنەوە و سود لەو پێشکەوتنانە وەربگرن کە تەنانەت لەسەردەمی زیندوبونەوە و گەڕانەوەی سەرمایەداریدا بەدەستهاتووە. هەروەها خوێندکاران دەبێت هاوکاری لەگەڵ کەسانێکدا بکەن کە کار لەدەزگاکانی راگەیاندندا دەکەن و دەتوانن لەبلاوکردنەوەی پەیامەکەیاندا یارمەتیانبدەن. هەروەها لەگەڵ ڕێکخراوەکاندا کە ڕەنگە پشتگیری لەمانگرتنە سیاسیەکانیان بکەن. دواجار خوێندکاران دەبێت لەبارەی پەیوەندی نێوان تیورە و پراکتیکەوە بیر بکەنەوە، و لەبەر دروشمگەلێك کە بەبڕوای ئەوان لەئایندەدا جەماوەر دەیسەلمێنێت بەپەلە کارنەکەن.





## وەڵامی چەپە نوێکان

باسەکانی هابرماس لەفەزای سیاسی ناسکی ساڵی ١٩٦٨ دا، بەر لەوەی وەك جیاوازیەکی ناوخۆیی لەسەر شێوازەکانی کار و سیاسەتەکانی چەپ تەماشابکرێت، وەك ناڕەزاییەکی بنەڕەتی لەسەر بنەما تیوریەکان دانرا. بەشێك لەبزوتنەوەی رادیکاڵی خوێندکاری هابرماسیان بەخائین و ڕۆشنبیرێکی سەر بەسیستەمی جێگیر و لەبابەتی چەپە لیبراڵیەکان دانا کە لەبەرامبەر بەرخوردە رادیکاڵەکاندا، لەهەڵوێستەکانی خۆی پاشگەز دەبێتەوە. بەڵام نوسەرانی کتێبی "چەپ، وەڵامی هابرماس دەداتەوە" (١٩٦٨) کە زۆربەیان لەهاوکار و خوێندکارەکانی خۆی بوون، کاردانەوەیەکی نەرمتریان بەرامبەر بەهابرماس پیشاندا. ئەم کتێبە بەهێنانەوەی شەش بەڵگەکەی هابرماس دەستپێدەکات و پاشان پێشەکیەك و چواردە وەڵام بەدوایدا دێت. نوسەرانی ئەم کتێبە زۆربەیان لەئەندامە چالاکەکانی بزوتنەوەی خوێندکاری بوون. لەسەرنجە سەرەتایەکاندا کە بەقەڵەمی ئۆسکار نێگت نوسراوە، دەگوترێت هابرماس بڕیاربووە لەکۆتایی کتێبەکەدا وەڵامی خۆی بنووسێت، بەڵام پێدەچێت ئەوەندە لەرەخنە توندەکانی نوسەرانی کتێبەکە پەشۆکاوە، کە وازی لەمکارە هێناوە. نوسەری پێشەکێکە لەکۆتایدا هەوڵدەدات تا لەتوندی تێڕوانین و رەخنەکان بۆ هابرماس کەمبکاتەوە. ئەو دەڵێت کەسانێك کە ئاشنای بیری هابرماسن، دەزانن نوسەرانی ئەم کتێبە تا چ ئەندازەیەك قەرزاری خودی هابرماسن و بەهەرحاڵ باسەکانی کتێبەکە جگە لەوتوێژێکی گشتی لەبارەی جیاوازی واقعی چەپی نوێی ئەڵمانیاوە، هیچیترنیە. لەدرێژەی ئەمەدا جەخت لەوە دەکرێت کە ئەم کتێبە"دژی هابرماس نیە"، بەڵکو ئامانجی سەرەکی زۆرتر پاراستنی هابرماسە لەدۆستە درۆزنەکانی بەرەی راست، تا هێرشکردنە سەر خودی ئەو لەلایەن چەپەوە[١٢]. بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا شێوەی بەرخوردی رق ئامێزانەی هەندێك لەوتارەکانی ئەم کتێبە، نادروستی ئەمجۆرە دەربڕینانە ئاشکرادەکات.

دەکرێ ئەو رەخنانەی لەهابرماس گیراوە، بکەین بەسێ بەشەوە. بەگشتی هەموو نوسەرانی کتێبەکە رەخنە لەوەسفی هابرماس بۆ بزوتنەوەی خوێندکاری دەگرن. ئەوان بەتایبەتی ئاماژە بۆ وەسفە سوکایەتی پێکەرەکانی دەکەن. تێڕوانینی





هابرماس بۆ ئەوەی خوێندکاران گرفتاری وێنای مناڵانە، شێتی، خەیاڵی توندڕەو، بڕینی پەیوەندی بەواقعەوە و وەهمی خۆپەرستانەن، نەك تەنها بەسوکایەتیکردن دەژمێرێت، بەڵکو ئەمجۆرە وەسفانە بەشێکن لەنەریتی کۆنزەرڤاتیڤانە کە هەموو شێوە گۆڕانێکی پێشکەوتوخوازانە وەك ڕەفتارێکی نەشاز لەقەڵەمدەدات. بۆ نموونە کلاوس دۆرنەر ئاماژە بەوەدەکات کە خاوەنانی دەسەڵات هەمیشە بەمەبەستی ئەوەی شۆڕشگێڕان وەك نەخۆشی دەرونی و ناتەواو پیشانبدەن، ئەمجۆرە دەستەواژانەیان بۆ وەسفکردنیان بەکارهێناوە[١٣]. لەڕوانگەی سیستەمی جێگیرەوە، هەموو جۆرە هەنگاوێك بۆ سەرنگونکردنی هەلومەرجی باو، نا ماقوڵەو هەر جۆرە هەنگاوێکیش لەم ڕێگەیەدا، خۆی لەخۆیدا پێچەوانەی هزر و عەقڵە. هابرماس بەبەکارهێنانی ئەم وشانە ڕێگەیداوە لایەنگرانی کۆنزەرڤاتیڤی هەلومەرجی باو کە لەبنەڕەتدا هابرماس دژی تێڕوانینەکانیانە، سود لەباسەکانی ئەو بۆ خۆیان وەربگرن. هەروەها ئەو کاریکاتێرانەی هابرماس بۆ کەسایەتیە شۆڕشگێڕەکان (ئاژاوەگێڕ، ڕابەری فکری و دەلقەك) لەکۆتایی باسی پێنجەمدا دەیکێشێت، جێگەی ڕەخنەگرتنە. زۆربەی نوسەرانی کتێبەکە بڕوایانوایە ئەو زاراوانەی هابرماس بەکاریدێنێت، زیاد لەپێویست بۆ مەبەستەکانی ئەو تاڵن. ڕەخنەگرتنی جدی لەئامانج و مەسەلەکانی بزوتنەوەی خوێندکاری پێویست نیە بەزمانی "دوژمنان" بگوترێت. هەر ئەوەندەی هابرماس پەنای بۆ ئەم شێوانە بردووە، خۆی دەریدەخات کە هابرماس لەبزوتنەوەی خوێندکاری بێزارە و دەریدەخات ناونیشانی "فاشیزمی چەپڕەو" کە پێشتر بۆ وەسفی بزوتنەوەی خوێندکاری بەکاریهێناوە، ئەوەندە بێ مەبەست نەبووە.

دوهەم بواری ڕەخنەگرتن لەهابرماس پەیوەندی بەبەکارهێنانی سروشت و ڕۆڵی دەروناسانە، وەك قەدبڕێك بۆ خۆ دورخستنەوە لەشیکردنەوە مێژووی و سوسیۆلۆجیەکانەوە هەیە. لێرەدا تاوتوێی دوو بەڵگە لەبەڵگەکانی هابرماس دەکرێت. هابرماس لەبەڵگاندنی سێهەمی خۆیدا بەدوای ڕونکردنەوەی سەرچاوەکانی بزوتنەوەی خوێندکاریدا وەك کاردانەوەیەکی دەروونی بەرامبەر بەهەندێك لەخەسڵەتەکانی کۆمەڵگای سەرمایەداری دەگەڕێت، و بەمشێوەیە نکوڵی لەماهیەتی ئەم بزوتنەوەیە وەك بەشێکی ئابوری لەململانێی چینایەتی کردووە. ئەگەرچی لەبارەی جێگەی وردی خوێندکاران و زانکۆوە لەناو پرۆسەی هەمەکی سیستەمی





سەرمایەداریدا بۆچوونی جیاواز هەیە، بەڵام زۆربەی نوسەرانی کتێبی ناوبراو بڕوایانوایە هابرماس لایەنیکەم کێشەکەی زۆر سادە وەرگرتووە. تەنانەت ئەگەر قبوڵی ئەوەبکەین هابرماس بەدروستی بنەما سایکۆلۆجیەکانی نارەزایی خوێندکارانی دەرککردووە، وەك کلاوس ئۆفە دەڵێت، ئەمە بەمانای ئەوەنیە کە ئەو دەرئەنجامانەی هابرماس لەم باسەوە سەبارەت بەتواناکانی بزوتنەوەکە وەریدەگرێت، بەناچار دروستبێت[١٤]. بەکورتی ئۆفە بەڵگە دێنێتەوە کە کاریگەری بزوتنەوەکە پێویست ناکات کورتبکرێتەوە بۆ ڕۆشنگەری هەمەکی و یان بە سیاسیکردنی بواری گشتی، بەڵکو ئەم کاریگەریە پەیوەندی بەشیکردنەوەکانی خوێندکارانەوە هەیە بۆ هەلومەرج و چۆنێتی بەرخوردی بەشەکانی تری خەڵکی لەگەڵ خواست و کاردانەوەکانیاندا. وەك ئۆفە دەڵێت ئەو مەسەلانەی چەپی نوێ وروژاندوێتی، خاڵی دەرچوون و دەرئەنجامی سەرو هەرجۆرە وێنایەکی تاك ڕەهەندانەی سایکۆلۆجی کۆمەڵایەتی دەبێت.

لەلایەکی دیکەوە ڕونکردنەوە سایکۆلۆجیەکانی هابرماس لەبەڵگاندنی پێنجەمدا، باسی ئەوە دەکات کە چالاکی خوێندکاری ماهیەتێکی نیۆرۆتیکی و دەرونپەریشیانەی هەیە. بەشێوەیەکی گشتی هابرماس بەڵگە دێنێتەوە کە جۆرێ کرداری نارازیەکان، شێوەی پەرەسەندوویی نارەزایی تایبەتی گروپێکی تەمەنی تایبەتە و پابەندبوونی بەردەوام بەمجۆرە چالاکیانەوە، دەلالەت لەسیفەتی مناڵانە دەکات. لەگەڵ ئەمەشدا لەهەلومەرجێکدا کە پێدەچێت قەیراناوی بێت، سروشتە نیۆرۆتیەکیەکان، دەردەکەون. بەڵام یەکێك لەڕەخنەگرەکان بەناوی "فۆریۆ سروتی" بەڵگە دێنێتەوە کە ئەگەر وابوایە، واتە گەر نارازایی خوێندکاران بەڕاستی قابیلی کورتکردنەوە بوایە بۆ سرشتی دەروونی تایبەت لەرەفتارێکی نیرۆتیکیدا، ئایا خوێندکاران دەیانتوانی لەبوارەکانی تری کۆمەڵگادا ئەم هەموو سەرکەوتنە بەدەست بهێنن[١٥]. جگە لەمەش تەنانەت گەر جێگەیەکیش بۆ کاریگەری نەخۆشی دەرونی دابنێین، ئایا نابێت لەبری ڕەخنەگرتن لەو کەسانەی توشی ئەم پەشێویانە بوون، ئەو کۆمەڵگایە ڕەخنە بکەین کە بەرپرسیاری دروستبوونی ئەم پەشێویە دەرونیانەیە؟ لایەنیکەم هابرماس بە بەکارهێنانی ئەم قەدبڕە سایکۆلۆجیانە، لەبری شیکردنەوەی سیاسی توشی کەموکوڕی بووە. هابرماس بەقبولکردنی پێوەرە گومانلێکراوەکانی کۆمەڵناسی و





دەروونناسی بۆ نەخۆشی دەرونی و تەندروستی دەرونی بەشێوەیەکی نارەخنەگرانە، ئەو بەشداریەی کە خۆی لەدروستکردنی تیورەی  رەخنەگرانەی کۆمەڵگادا هەیبووە. بەفیڕۆ دەدات. تەنانەت گەر بایەخێکی ڕێژەیی بۆ شیکردنەوە سایکۆلۆجیۆکانی حالآتی دەرونی و دەرئەنجامەکانی ئەم حالآتانە دابنێین، ئەوا هێشتا تیورەکەی لەبارەی رەگوریشەی کۆمەڵایەتی حاڵەتە دەروونناسیەکان و دەرئەنجامەکانی، لەڕوانگەی شێواز و ئامانجەکانەوە کەموکوڕە.

رەنگە فراوانترین باسی رەخنەگرانە کە لەکتێبی "چەپ وەڵامی هابرماس دەداتەوە"دا هاتووە، پەیوەندی بەبایەخی روانگە و دیدی مارکسیانەی هابرماسەوە بێت. هابرماس بەڵگەی هێنابۆوە کە بزوتنەوەی خوێندکاری پابەندی میراتێکی سڕاوەیە کە میراتی سەدەی نۆزدەهەمە. گرنگترینی ئەم تێڕوانینانە یەکێکیان تیورەی قەیرانە کە لەسەر بناغەی نرخی کار، دوهەمیان وێنای ململانێی چینایەتیە، وەك بزوێنەری مێژوو، سێهەمیش بەیەکسان تەماشاکردنی بزوتنەوە نارازیەکانی جیهانی یەکەم و جیهانی سێهەم. یەکێکی دی لەرەخنەگران بەناوی ئەنسلم نوسیوس دەڵێت کە ڕێکخراوی بزوتنەوەی خوێندکاری (SDS) ئەم جۆرە تێڕوانینانە وەك پاشماوەی دۆگمە کۆمۆنیستیەکان رەددەکاتەوە، تەنانەت دێرینترین گروپی مارکسی بزوتنەوەی خوێندکاری، ئەم تێڕوانینە هەمەکیانە قبوڵناکات[١٦] لەراستیدا دەکرێ خاڵە سەرەکیەکانی بەڵگاندنەکانی هابرماس دژی ئەوەی ئەو بەهەڵوێستی سیاسی بزوتنەوەکەی دادەنێت، راستەوخۆ لەخودی بڵاوکراوەکانی ڕێکخراوی خوێندکاریەوە دەربهێنین. ئەو تیورەیەی کە پێیوایە وا بەستەیی ئابووریی راستەوخۆ چیدی گرنگیان لەتێڕوانینە ئەمڕۆییەکاندا بۆ ئیمپریالیزم نیە، لەشیکردنەوەکانی ڕێکخستنی خوێندکاریدا بۆ جەنگی ڤێتنام هێنراوەتەوە. هەروەها رەنگە گرنگترین بیری بزوێنەری بزوتنەوەی خوێندکاری ئەوە بوو بێت کە چیدی ململانێی چینایەتی لەناو جەرگەیی چالاکی شۆڕشگێڕانەدا نیە. دیارە دەبێت هابرماس ئاگای لەم تێڕوانینانە بەتەواوی هەبێت، چونکە تیورەکانی هربرت مارکیوز کە پاڵپشتی تیورەکانی هابرماس خۆیەتی، لەدروستکردن و پەروەردەکردنی چەمکی گروپە پەراوێزیەکاندا گەلێك کاریگەر بوو، وە هەر ئەم چەمکەش بەسەرچاوەی رەوایەتی تیوری چەپی نوێ دەژمێرێت. ستراتیژی بنەڕەتی لەکۆی







چالاکیەکانی بزوتنەوەی خوێندکاریدا لەخەبات دژی دەزگای بڵاوکردنەوەی شپرنگەرەوە بیگرە تا نارازایبوون دژی یاسا لەناکاوەکان، تەنها کاتێك مانا پەیدا دەکات کە ململانێ لەنێوان بۆرژوازی و پرۆلیتاریادا چیدی بەهۆکاری سەرەکی رزگاریخوازی دانەنێین.

زۆرێك لەنوسەرانی کتێبی ناوبراو نارەزایی لەگشتگیریەکانی هابرماس لەبارەی بزوتنەوەی خوێندکاریەوە دەردەبڕن. پیتر برۆکنەر سێ گۆڕانی سەرەکی کە یارمەتی دروستبوونی ڕێکخراوی خوێندکارانی داوە، بەمشێوەیە ڕووندەکاتەوە: یەکەم گەڕانەوەی سیستەمی سەرمایەداری لەئەڵمانیای پاش جەنگی جیهانی دوهەمدا، دوهەم گۆڕانی هەڵوێستی حیزبی سۆشیال دیموکرات لەنەیارێتی رژێمی باڵا دەستدا و سێهەم شۆڕش و یاخیبونەکانی دژ بەدەسەڵاتخوازی لەئاستی تاکدا[١٧]. پیتر برۆکنەر بڕوایوایە نابێت بەشێوەیەکی یەکسان بڕوای ئەندامانی ڕێکخراوی خوێندکارانی سۆشیالیستی ئەڵمانی و کار و ئامانجەکانیان هەڵسەنگێنین. رەخنەگرانی وەك هابرماس لەبارەی گونجان و هاوبەستەیی ریکخراوەیەوە کە کراوەتر و پڕ ناکۆکی ترە، زیادەڕەویدەکەن. رەخنەیەکی هاوشێوە لەسەرەتای وتاری نوسەرێکی تردا بەناوی "هربرت لدەر" هاتووە کە هابرماس تاوانبار دەکات بەقبوڵکردنی ئینفیعالی و نارەخنەگرانەی بەدحاڵیبونەکانی ڕۆژنامە بۆرژوازیەکان. بەپێی ئەم تێڕوانینانە هابرماس لەبری پێشکەشکردنی وێنەیەکی ورد بۆ پێکهاتەی کۆمەڵایەتی و چالاکیەکانی بزوتنەوەی خوێندکاری، هەمان ئەو چەمکە سواوانە دەسەلمێنێت کە بۆ بێبایەخ کردنی بزوتنەوە رەخنەگرە رەواکان، بەکار دەهێنرێن. ڕێکخراوی دیموکراتی بزوتنەوەی خوێندکاری و نەیارێتی بنەڕەتی لەگەڵ هەلومەرجی وەستاوی هەبوودا، وتوێژە تیوریەکانی فەرامۆشکراوە، و لەبری ئەوە گرنگی بەتوڕەیی سۆزدارانەی ڕێپێوانەکان و خۆپیشاندانە گشتیەکان دراوە[١٨].

بەڵام زۆرێك لەرەخنەگرانی هابرماس لەسەر ئەو باوەڕەن ئەو لەقسە گشتگیرەکانیدا و رەخنەگرتنی لەدۆگمایەتی ریکخراوی خوێندکاری، خۆشی گرفتاری هەندێك گریمانەی دۆگمایی یان لایەنیکەم ساویلکەنەیە. بۆ نموونە "ئۆکهارت کریپندرۆف" کە رەخنەگرێکی ترە، تێڕوانینی هابرماس بۆ سیاسەت بەتێڕوانینێکی کلاسیکی دەزانێت. لەسەر ئەم بناغەیە ئۆکهارت رونیدەکاتەوە بۆچی هابرماس

ناتوانێت لەتوانا سیاسیەکانی شێوازە تازەکانی ناڕازیبوون تێبگات و دەسەڵاتی بزوتنەوەی خوێندکاری بۆ ئەرکێکی لیبڕاڵی و پەروەردەیی و ڕۆشنگەری کورتدەکاتەوە. تێڕوانینی هابرماس بۆ فاشیزمیش سنورداره، چونکه ئەو تەنها شێوەی توندڕەوی ناسیونال سۆشیالیزم لەژێریدا دەهێنێتەوە[١٩]. رایمۆت ریشه (یەکێکی دی لەنوسەرانی کتێبەکە) هۆی شیکردنەوە سیاسیە کەموکوڕەکەی هابرماس، دەگەڕێنێتەوە بۆ لەبەر چاو نەگرتنی گرنگی و بەهای سیاسی کرداره نا عەقلانیەکان. بەبڕوای ئەو هەست و وێناکانی خوێندکاران کە خۆیان بەهاودەردی ویتکونگەکان و گروپە ستەم لێکراوەکانی جیهانی سێهەم دەزانن نەك هەر سودمەندە، بەڵکو پێداویستی پاراستن و بەردەوامی ناڕازیبوونی کاریگەر و دروستکەرە[٢٠]. زۆرێك لەرەخنەگرانی ناوبراو لەوانە نویسوس رەخنە لەو وتەیەی هابرماس دەگرن کە خوێندکاران واقع و سومبلەکانیان تێکەڵکردووە. نویسوس بێ نکوڵیکردن لەجیاوازی ئەم دوانە، بەڵگە دێنێتەوە کە جیاکردنەوەو جیاوازیکردنیان، بێ رەچاوکردنی ساتەوەختەکانی تێکەڵبوونیان، بەهەمان ئەندازە نادیالیکتیکە کە بەیەکسان تەماشاکردنیان[٢١].

لەپشت هەموو ئەم تێڕوانینانەوە تێزێك هەیە کە "نگت" لەپێشەکیەکەی خۆیدا بەئاشکرا دەریدەبڕێت، ئەویش ئەوەیە هابرماس هەروا پابەندی تێڕوانینێکی کلاسیکیە بۆ گۆڕانی شۆڕشگێڕانە[٢٢]. گەرچی ئەو بایەخ و بەهای شیکردنەوەی مارکس بۆ هەلومەرجی هەنوکەیی رەددەکاتەوە، بەڵام گریمانەی بنەڕەتی بیری هابرماس ئەوەیە کە شۆڕش بەناچار هەڵگری ململانێی چینایەتی بەشێوە کلاسیکیەکەی دەبێت. خوێندکاران تەنها دەتوانن بەئەرکی ڕۆشنگەری هەڵسن، چونکه ئەوان بەمانای دروستی وشە چین نین و ناتوانن ببن بەنوێنەری مێژوو، مارکس ئەو دەورەی بۆ پرۆلیتاریا دانابوو. یان دەکرێ بگوترێ چیدی هابرماس بڕوای بەهیچ نوێنەریك بۆ گۆڕانی واقعی لەمێژوودا نیە، یان ئەو بەشێوەیەکی شاراوە هەروا پابەندی تێڕوانینێکی کلاسیکیە بۆ شۆڕش. ئەگەر گریمانەی یەکەم راست بێت، لەمحاڵەتەدا هابرماس یان لیبڕالێکی ریفۆرمخوازە یان سۆشیالیستێکی نائومێدە. ئەگەر گریمانەی دوهەم راست بێت، ئەوا لەمحاڵەتەدا هابرماس هەروا پابەندی تێڕوانینێکی سواو یان وەهمی یۆتۆپیاییە. لەهەردوو حاڵەتدا دەکرێت







هابرماس بەکەموکوڕی لەجێبەجێکردنی تێڕوانینی خۆی بۆ شۆڕش لەگەڵ پێداویستی و هەلومەرجەکاندا تاوانبار بکەین.

## پیاچوونەوە بەماتریالیزمی مێژوویيدا

هەر چاودێرێکی بێلایەن دەبێت تاڕادەیەك دان بەراستی ئەو دوا رەخنانەی سەرەوەدا بنێت کە لەتێڕوانینی هابرماس گیراوە. بێگومان دەکرێت بەڵگاندن و تێڕوانینەکانی جێی رەخنەی هابرماس، لەنوسین و وتەکانی هەندێك لەرابەرانی بزوتنەوەی خوێندکاریدا بدۆزینەوە. بۆ نمونە ئەگەر سەیری بەرهەمەکانی دۆتچکە بکەین، دەبینین ئەو بەردەوام بەدوای دروستکردنی پەیوەندی لەنێوان خەباتە کۆمەڵایەتیەکانی ئەڵمانیا لەگەڵ بزوتنەوەکانی جیهانی سێهەمدا دەگەڕێت و زۆرێك لەگروپەکانی نزیك لەجۆرەکانی حیزبە کۆمۆنیستەکانەوە کە لایەنگری هێڵی فکری مائویستی، ترۆتسکیستی و یان مارکسیست – لینینی بوون، باسی نزیکی رودانی قەیرانیان لەسەرمایەداری و گرنگی بنەڕەتی پرۆلیتاریا دەکرد. بەڵام بەشێوەیەکی گشتی بزوتنەوەی خوێندکاری لەژێر کاریگەری بیروڕا نوێخوازەکاندا بوون، کە نەیاری دۆگمەکانی حیزبەجێگیرەکان و کۆمۆنیستە ئەرسۆزکسەکان بوون. لەراستیدا ناڕەزایی خوێندکاران بەهەمان ئەندازە کە لەژێر کاریگەری مارکس و ئنگلزدا بوو، لەژێر کاریگەری هەڵوێستە نائەرسۆزێکسەکانی قوتابخانەی فرانکفۆرتیشدا بوو. وەك "نگت" لەپێشەکی "چەپ وەڵامی هابرماس دەداتەوە"دا رایگەیاندووە و هەروەها ڕۆژنامەکان بەردەوام جەختیان لێدەکردەوە، هابرماس خۆی هەندێك لەسەرچاوە سەرەکیە فکریەکانی ڕێکخراوی خوێندکاری و ئیلهام بەخشی بووە. کەوابوو دەکرێ موداخەلەکانی لەدوو برگەی هەستیاری ژۆینی ١٩٦٧ و ١٩٦٨دا نەك هەر بەڕوبەڕووبونەوەی دیدە دۆگمایەکانی بزوتنەوەی خوێندکاری دابنرێت، بەڵکو دەکرێ ئەو موداخەلانە بەبەشێك لەوتوێژی فکری هابرماس لەگەڵ نەریتی مارکسیدا دابنرێت. بەتایبەتی دەبێت تێڕوانینەکانی هابرماس لەبارەی مارکسیزمەوە، هەم وەك دەرئەنجامی هەڵوێستە تیوریەکانی لەکۆتایی شەستەکاندا و هەم وەك بناغەی "پیاچونەوە بەماتریالیزمی مێژوویدا" لەبەرهەمەکانی حەفتاکانیدا دابنرێت.

ماتریالیزمی مێژووی پێویستی بەپیاچونەوە هەبوو، چونکە چوارچێوە تیوریەکەی بۆ سەلماندنی ئامانجە بەرزەفڕەکانی نەگونجاو دەهاتە بەرچاو. زاراوەی "ماتریالیزمی مێژوویی" گەرچی بەشێوەیەکی سەرەکی دەگێڕێتەوە بۆ مارکس، بەڵام زۆرتر ڕەنگە دروستکراوی ئەنگلز بێت. ئەنگلز لەپێشەکی "سۆشیالیزم: جۆری خەیاڵی یان جۆری زانستی"دا (١٨٩٢) هێناویەتیەوە کە ماتریالیزمی مێژوویی: "جەخت لەسەر ئەو پرۆسەیەی مێژوو دەکات کە بەدوای دوا هۆ و هێزی بزوێنەری مەزنی کۆی روداوە مێژووییە گرنگەکان لەپەرەسەندنی ئابوری کۆمەڵگا، لەگۆڕانەکانی سیمای بەرهەمهێنان و ئاڵوگۆڕ، لەدابەشکردنی کۆمەڵگا بۆ چینی دیاریکراو و لەململانێی نێوان ئەم چینانەدا، دەگەڕێ"[٢٣].

کەوابوو ماتریالیزمی مێژوویی هەم دژی تیورەی "ماتریالیزمی" ڕوت و سادەیە کە جەخت لەسەر یەکەمێتی مادە دەکات و هەم نەیاری تیورەی ئایدیالیزمی مێژووییە کە بەشێوەی فەلسەفەی هیگڵ، بواری بیر یان زیهنی مرۆڤ بەئەنگێزە و بزوێنەری پێشکەوتنی مێژوویی دادەنێت. ئەوەی لەپێناسەکەی ئەنگلزدا بۆ ماتریالیزمی مێژوویی دەردەکەوێت، ئەوەیە کە بناغەی ماتریالیزمی مێژوویی لەبواری ئابوریدایە. کەوابوو ماتریالیزمی مێژوویی تا ئەو شوێنە مادیگەرە کە بەرهەمهێنان و دوبارە بەرهەمهێنانەوەی ژیانی مادی، بەهۆکاری یەکەم لەتەفسیرکردنی ژیانی مرۆڤدا دادەنێت، و تا ئەو جێگەیە مێژووییە کە بڕوای بەپێشکەوتن و پەرەسەندنی جۆرە جیاوازەکانی ڕێکخستنی ئابوری کۆمەڵگا بەدرێژایی مێژوو هەیە و هۆکارێك دەدات بەدەستەوە کە بەهۆیەوە دەکرێ گۆڕان لەسیمای بەرهەمهێنانی ئابوریدا، وەك دەرئەنجامی ململانێی چینە جیاوازەکان روونبکرێتەوە.

بەناوبانگترین روونکردنەوەی مارکس لەبارەی ماتریالیزمی مێژووییەوە لە"پێشەکیەك بۆ رەخنەگرتن لەئابوری سیاسی"دا (١٨٥٩) هاتووە[٢٤]. لێرەدا مارکس پێشگریمانە هەمەکیە تیوریەکانی خۆی دەدات بەدەستەوە. مرۆڤەکان لەهەر کۆمەڵگایەکدا بەشێوەیەکی سەربەخۆ لەئیرادەی خۆیان لەناو دەرونی پەیوەندیەکانی بەرهەمهێناندا، هەنگاو دەنێن کە گونجاوە لەگەڵ قۆناغێکی تایبەت لەپەرەسەندنی هێزەکانی بەرهەمهێنانی مادیدا. مەبەستی مارکس لەهێزەکانی بەرهەمهێنان، هۆکارە







مادی و نامادیەکان، واتە کەرەستە خامەکان ئامێرەکانی بەرهەمهێنان و هێزەکانی کارە (کە هەموو داهێنانە روو لەزیادەکانی کارایی لەبەرهەمهێناندا دەگرێتەوە). لەڕاستیدا پەیوەندیەکانی بەرهەمهێنان  پەیوەندیەکانی موڵکایەتی یان کۆنترۆڵی کاریگەری تاکەکان بەسەر هێزەکانی بەرهەمهێناندا، و هەر لەو روەشەوە بەسەر هێزی کاری کەسانی دیدایە. پەیوەندی و هێزەکانی بەرهەمهێنان پێکەوە ژێر خانی ئابوری کۆمەڵگا پێکدەهێنن کە دیاریکەری شێوەکانی هوشیاری تاکەکان و هەروەها سەرخانی یاسایی و سیاسیە. بەم مانایە بناغەی مادی کۆمەڵگا یەکەم و بنەڕەتیە، لەکاتێکدا کە سەرخان و هوشیاری لاوەکیە. پێشکەوتنی مێژوویی بەپێی ململانێ بنەڕەتیەکان لەبناغەی ئابوریدا و چارەسەرکردنیان پێناسە دەکرێت. کاتێك هێزەکانی بەرهەمهێنان لەگەڵ پەیوەندیەکانی بەرهەمهێناندا دەکەونە دژایەتیەوەو پەیوەندیەکانی بەرهەمهێنان وەك ڕێگرێك لەبەردەم پەرەسەندنی زیاتری هێزەکانی بەرهەمهێناندا کاردەکەن، قۆناغێك لەئاژاوە و شۆڕشی کۆمەڵایەتی دێتە ئاراوە. چارەسەری دژایەتی نێوان هێزەکانی و پەیوەندیەکانی بەرهەمهێنان، سیمایەکی تازەی بەرهەمهێنان دروستدەکات کە تا قۆناغی دەستپێکردنی ململانێیەکی تازە بەردەوامدەبێت. تەنها بەدەرکەوتنی سۆشیالیزم دواجار "پێش مێژوویی" مرۆڤایەتی کۆتایی پێدێت.

هابرماس بەردەوام دیدێکی دوولایەنەی بەرامبەر ئەم تێڕوانینە بۆ ماتریالیزمی مێژوویی هەبووە. ئەو وێنەیەی تام راکمۆر بۆ گۆڕانی هێڵی بیری هابرماس کێشاوێتی، بەتەواوی هەڵە نیە. بەپێی ئەم وێنەیە هابرماس بەشێوەیەکی روو لەزیاد لەتیورەی ماتریالیزمی مێژوویی نائومێد دەبێت و دواجار بەتەواوی وازی لێدێنێت و لەبریدا تیورەی کرداری پەیوەندی، دەهێنێتە پێشێ[٢٥].

بەڵام وێنەیەکی وا ئەو خاڵە لەبەرچاو ناگرێت کە هابرماس هەمیشە دوراودور، خۆی بەهاوبیری مارکس زانیووە. لەهیچ شوێنێکدا تیورەی مارکسی بەراشکاوی و راستەوخۆ رەد ناکرێتەوە. هابرماس سەرەڕای هەندێك تێڕوانینی جیاوازی خۆی، بەڵام هیچ کاتێك خۆی نەخستە دەرەوەی ئەو نەریتە رەخنەگرانەیەی کە بەرەخنەگرتنی مارکس لەهیگڵ و فەلسەفەی ئایدیالیستی دەستپێدەکات و ئاڵۆزترین شێوەی بەردەوامی ئەم نەریتە دەتوانین لەنوسینە سەرەتاییەکان جۆرج لۆکاش و

بەرهەمەکانی قوتابخانەی فرانکفۆرتدا بدۆزینەوە. بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا هیچ کاتێکیش هابرماس خۆی بەپابەندی بنەماکانی ماتریالیزمی مێژوویی بەوشێوەیەی لەبەرهەمەکانی مارکسدا هاتووە، نەزانیووە. هابرماس بەتایبەتی وەك نەوەی یەکەمی قوتابخانەی فرانکفۆرت، بیری ژێرخانی ئابوری دەستنیشانکەر، رەددەکاتەوە. لەگەڵ ئەمەشدا هابرماس لەکۆمەڵە وتارێکدا بەناوی "پیاچونەوە بەماتریالیزمی مێژوویدا" (١٩٧٦) لەکاتێکدا کە بناغەی تیورەی ئابوری مارکس، واتە تیورەی نرخی کار رەد دەکاتەوە، دیسان بڕوایوایە کە "گۆڕانی بونیادە سروشتیەکان، هەروا بەستراوە هەم بەتەحەدا روو لەپەرەسەندنەکانی کە بەهۆی مەسەلە ئابوریە چاەسەنەکراوەکانی کۆی سیستەمەکەوە دێنەپێشێ، و هەم بەپرۆسەی پەروەردەکردنەوە کە کاردانەوەیەکن بەرامبەر بەو مەسەلانە"[٢٦]. ئەم تێڕوانینە ئاڵۆز و دولایەنیە، خەسڵەتی سەرەکی دیدی هابرماسە بۆ تیورەی مارکسی، تەنانەت لەبەرهەمەکانی دوایی خۆیدا کە دەوری مارکس تیاییدا ئەوەندە بەرجەستە نیە، هیچ کاتێك هەوڵنادات کاری خۆی لەنەریتی پێشکەوتوخوازانە کە بەمارکس دەست پێدەکات جیابکاتەوە.

هابرماس بەگشتی لەهەمان سەرەتای کاری خۆیدا تیورەی مارکسی بەتیورەیەکی تاك رەهەندی و نەگونجاو بۆ تاوتوێکردنی دیاردەکانی سەرمایەداری سەدەی بیستەم دادەنا، و بەهەرحاڵ وەك تیورەیەکی گشتی لەبارەی کۆمەڵگاوە، بەکەموکوڕی زانیووە. ئەم خاڵە بەتایبەتی لەکتێبێکدا بەناوی "تەکنەلۆژیا و زانست وەك تەکنەلۆژیا" (١٩٦٨) کە لەگەرمەی بزوتنەوەی خوێندکاریدا بڵاویکردەوە، بەئاشکرا دەبینرێ[٢٧]. هابرماس لەم کتێبەدا و لەنوسینەکانی تری کۆتایی شەستەکان و سەرەتای حەفتاکاندا، ئەم تێزە سەرەکیە دەهێنێتە پێشێ کە مارکس لەشیکردنەوەکانی خۆیدا بۆ کۆمەڵگای سەرمایەداری بەپێی پێویست بەشێوەیەکی ئەبستراکت کاری نەکردبوو. وتەزای کاری کۆمەڵایەتی کە ناو جەرگەی شیکردنەوەکانی مارکسی پێکدەهێنا، تەنها ڕەهەندێکی پێشکەوتنی مرۆڤ لەبەرچاو دەگرێت. هابرماس بۆ چاککردنەوەی ئەم تێڕوانینە چەمکەکانی "کار" و "مامەڵە" بۆ وەسفی کاملتری دوو ڕەهەندی پرۆسەی کۆمەڵایەتی بەکار دەهێنێت. هابرماس بەلگە دێنێتەوە کە مرۆڤ لەدوو ڕێگەوە پەرەدەسێنێ و پێشدەکەوێت: یەکێکیان







لەشێوەی ئیدراکێك لەپەیوەندیدا بەسروشتەوە کە ناوی دەنێت بەکار و ئەویدی لەشێوەیەکی ئەخلاقیدا لەپەیوەندی نێوان زیهنی مرۆڤەکان کە لەژێر ناوی مامەڵەدا دێت. هابرماس لەوڕووەوە کە شیکردنەوەکەی مارکس نا دروست نیە، بەڵکو کەموکوڕ و بەس نیە، چەمکی پیاچونەوە و چاکسازی بۆ وەسفی بەرخودی خۆی لەگەڵ بەرهەمەکانی مارکسدا دەهێنێتە پێشێ. بەپێچەوانەی مانای ژیانەوە یان ڕیفۆرم کە بەمانای گەڕانەوە بۆ شتێکە کە پەرەیسەندووە و پاشان گەندەڵبووە، و هەروەها بەپێچەوانەی چەمکی نوێکردنەوەو لەدایکبوونەوە، چەمکی چاکسازی و پیاچوونەوە بەمانای پڕۆژەیەکی تازەی بیرکردنەوەیە بۆ پاراستنی ئامانجی سەرەکی. ئامانجی هابرماس وەکو مارکس پێکهێنانی تیورەیەکی رزگاریخواز و گشتگیرە لەبارەی کۆمەڵگاوە، بەڵام هابرماس بەپێچەوانەی مارکسەوە، بڕوایوایە ئەگەر کۆمەڵگا و وتەزای کار، تەنها لەڕووی پەیوەندیان بەسروشتی دەرەکیەوە لەبەرچاو بگرین، ناتوانین بەئامانجێکی وا بگەین.

ئامانجی سەرەکی هابرماس لەپیاچونەوە بەماتریالیزمی مێژوویدا پیشاندانی ئەو خاڵەیە کە نەریتە کلتوریەکان و گۆڕانکاریە سروشتیەکان، خاوەن لۆژیکی پەرەسەندنی تایبەتی خۆیانن کە تەنها لەژێرخانی ئابوریەوە نەهاتوون. لەکاتێکدا مارکس پێشکەوتن و پەرەسەندنی بەدەرئەنجامی زیادبوونی کەمایەتی لەهێزەکانی بەرهەمهێنان و گۆڕانی چۆنایەتی لەپەیوەندیەکانی بەرهەمهێناندا دەزانی، ئەوا بەبڕوای هابرماس پەرەسەندن و پێشکەوتن لەبواری کردارەکانی پەیوەندیشدا روودەدات. یەکێك لەرەهەندە گرنگەکانی هەوڵی هابرماس لەپیاچونەوە بەماتریالیزمی مێژوویدا، رەخنەگرتنە لەوتەزای کاری کۆمەڵایەتی وەك هۆکاری دەستنیشانکەر لەکۆی مەسەلە مرۆییەکاندا. هەر لەبەرئەمە هابرماس زۆر جەخت لەسەر لێکۆڵینەوە مرۆڤناسیەکان لەبارەی رەوتی تێپەڕین لەنیمچە مرۆڤەوە بۆ مرۆڤی هوشیار دەکات. هابرماس لەم لێکۆڵینانەوە ئەو دەرئەنجامە وەردەگرێت کە لەراستیدا کاری کۆمەڵایەتی دەرخەری خەسڵەتی سەرەکی نێوان شیردەرە سەرەتاییەکان و نیمچە مرۆڤە. بەڵام پەیدا بوونی پەیوەندیە خێزانیەکان، واتە ئەو بونیادانەی کە هەڵگری خەسڵەتە کۆمەڵایەتیە نێوان زیهنەکانە، نیشانەی گواستنەوەیە بۆ مرۆڤی هوشیار. بەبڕوای هابرماس دوبارە بەرهەمهێنانەوەی ژیانی

مرۆیی، بەجۆرێکی تایبەتی کار و کاردانەوە دەست پێدەکات کە خاوەن کۆمەڵێك خەسڵەتە کە لەپێشەوە هەڵگری زمانە: "پایە و پلەی شێردەرە سەرەتاییەکان تاك ڕەهەندی بوو، هەر تاکێك دەیتوانی تەنها و تەنها پایە و پلەیەك لەهەموو بوارەکانی کارکردندا، داگیربکات. تەنها کاتێك تاکێك دەیتوانی پێگە و پایە و پلەی جیاواز لەخۆیدا کۆبکاتەوە و یان تاکە جیاوازەکان دەیانتوانی یەك پایە و پلە داگیربکەن، کە هاتوچۆی کۆمەڵایەتی لەنێوان ئەندامەکانی کۆمەڵێکدا کە خاوەن کاری تایبەتین، مومکین دەبوو"[٢٨].

بەهەرحاڵ دروستکردنی دەورە کۆمەڵایەتیەکان لەسەر بناغەی ناسینی نێوان زیهنیەکان، ڕەوایەتی ئەم دەورانەیە. مرۆڤەکان بەدەر لەوردەکاریەکانی کەسایەتی خۆیان، چاوەڕوانی سروشتی پەیدا دەکەن. ئالێرەدایە ئێمە شایەتی پەیدابوونی "پشتبەستن بەئەخلاقیات وەك ئەنگێزەی کارین"[٢٩]. هەر ئەم تایبەتمەندیە مرۆڤ لەدنیای کەسایەتی تاکانەیی و زۆرمەندانەی شێردەرە پلە یەکەکان دەهێنێتە دەرێ، و بەرەو دەرونی جیهانی کردار و کاردانەوە کۆمەڵایەتیە دروستکراوەکان لەرەمز و سیمبولەکان، ڕێنمایی دەکات.

سەرچاوەی ڕەگەزی مرۆڤ بۆ هابرماس لەو ڕووەوە زۆر گرنگە کە دەریدەخات پێشکەوتن و پەرەسەندنی مرۆڤ دەکرێ نەك بەپێی کار، بەڵکو بەپێی کرداری کۆمەڵایەتی دیاریبکرێت. پێشنیاری هابرماس ئەوەیە ماتریالیزمی مێژوویی ببەستینەوە بەپرۆسەی پێشکەوتنی ئەخلاقیات یان خەسڵەتە کۆمەڵایەتیەکان، نەك بەپرۆسەی پێشکەوتنی ئامێری. ئەو پرسیارەی ڕاستەوخۆ دێتە پێشێ ئەوەیە ئەو نمونانە لەکوێ بدۆزینەوە کە بتوانێت پێشکەوتنێکی وا بەروونی وەسفبکات. هابرماس بڕوایوایە بۆ ئەم پرسیارە، وەڵامێکی لەبواری سایکۆلۆژیای پێگەیشتوودا دۆزیوەتەوە. ئەو بەپشتبەستن بە بەرهەمەکانی ژان پیاژێ، لارنس کۆلبرگ و کەسانی دی، دیدێکی نەرمتر و لەهەمانکاتدا پێشکەوتوخوازانە تر بۆ مێژووی مرۆڤ پێشکەشدەکات کە هاوتای پەرەسەندنی تاکی مرۆڤە. لەسەر بناغەی پرۆژەکەی مارکس مناڵ لەڕێگەی قۆناغی جیاوازەوە گەشە دەکات: الف (قۆناغی پێکەوە ژیان، ب) قۆناغی خودسەنتەری یان خود ناوەندی، پ (قۆناغی کۆمەڵگا سەنتەری و بابەتگەری، ت) قۆناغی گشتگیری. بەدرێژای ئەم پرۆسەی گەشەکردن و پەرەسەندنی





مرۆڤە لەقۆناغێکەوە کە تیاییدا سنورێکی دیاریکراو بۆ زیهنیەتی تیا نیە، بەقۆناغێك دەگات کە تیاییدا "خود" دەتوانێ لەبارەی خۆی و بونیادە سروشتیەکانەوە، ئەندێشە بکات و بیر بکاتەوە. هابرماس بڕوایوایە دەکرێت ئەم چوارچێوە تیوریە، بۆ وەسفکردنی پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی بەکاربهێنرێت. بەبڕوای هابرماس لەنێوان وەسفی پەرەسەندنی نەفس و پەرەسەندنی جیهانبینیەکاندا، لێکچونگەلێك هەیە[٣٠]. گەرچی هابرماس بێئاگا نیە لەو کێشانەی گشتگیرکردنی چەمکەکان لەئاستی تاکەوە بۆ ئاستی کۆمەڵگا دەیهێنەپێشێ، بەڵام بڕوایوایە دەکرێ جیهانبینیەکان بۆ نمونە وەك پرۆسەی پەرەسەندن لەنمایشە ئەفسانەیەکانەوە بۆ شێوە گشتیەکانی ئاڵوگۆڕ و مامەڵە (بۆ نمونە لەنەریتی یەهودی - مەسیحیدا) و دواجار بۆ دیدی خودئەندێشانە کە خەسڵەتی جیهانی نوێیە، وەسفبکرێت.

بەدواداهاتنی جیهانبینیە جیاوازەکان تەنها دەرکەوتێکی پەرەسەندنی پەیوەندیە. هابرماس هەروەها لەسەر بناغەی شیکردنەوەی کردارەکانی ئاخاوتن، پرۆسەی پەرەسەندن و گەشەکردنی شوناسە فەردیەکان لەکۆمەڵگای قۆناغی بەردینی نوێوە تا کۆمەڵگایەکی ئایدیال کە هەر تاکێك بەهاوڵاتی جیهانی دەژمێرێت، وێنە دەکات. دەکرێت نمونەی پەرەسەندنێکی هاوشێوە لەبوارە یاسایی و ئەخلاقیەکاندا کە پێشتر تاوتوێکران، لەبەرچاو بگیرێت.

هابرماس بەڵگە دێنێتەوە کە ئەم سێ جۆرە پرۆسەی پێشکەوتنی مێژوویە — واتە لەبواری جیهانبینیەکان، شوناسی تاك و دەرکەوتەکانی یاسایی -ئەخلاقی- لەسەر بناغەی "بونیادەکانی پەیوەندی نێوان زیهنیەکانن کە بەهۆی زمانەوە سەقامگیر بوون"[٣١]. تیورەی کرداری پەیوەندی کە ئەمجۆرە بونیادانە ڕووندەکاتەوە، دەبێ وەك تەواوکەری تیورەی کرداری پەیوەندی ئاراستەکراو بەرەو ئامانج دابنرێت کە ماتریالیزمی مێژوویی لەسەر بناغەی دامەزراوە[٣٢].

پرۆسەی بەعەقڵانیبوون و پێشکەوتن لەهەر دوو بواردا ڕوو دەدەن، بەڵام جیاوازیەکی گرنگ لەنێوان پێشکەوتن لەهەردوو بواری باسکراودا هەیە. عەقڵانیبوون لەبواری کرداری پەیوەندیدا، بێگومان پەرەسەندنێکی پۆزەتیڤە، لەکاتێکدا عەقڵانیبوون لەبواری کاری عەقڵانی ئاراستەکراو بەرەو ئامانج، پێویستی بەبڕیاردانی ئامانجدار و ئامێرخوازانە هەیە. عەقڵانیەتی ڕوو لەزیاد لەم بوارەی

دواییدا، بەشێوەیەکی ئاسایی بەهۆکاری نامۆبوون و بیرۆکراتیبوونی جیهانی نوێ دەژمێرێت. بەڵام عەقلانیبوون لەبواری کرداری پەیوەندیدا بەمانای وەلاوەخستنی ئەو رەهەندانەی پەیوەندیە کە دەبێتە هۆی شێواندنی پەیوەندیەکان. ئەم رەهەندانە یان دەرونی و یان کۆمەڵایەتین. کەوابوو پێشکەوتن لەبواری کرداری پەیوەندیدا بەهەمانشێوەی پێشکەوتن لەبواری کاری عەقلانی ئاراستەکراو بەرەو ئامانجدا، ئەندازەگیری ناکرێت، بەڵکو دەبێ ئەم کرداره "لەسەر بناغەی رادەی گەشەکردنی بواری کرداری کۆگیرو هاوکات لەگەڵ دروستکردنی پەیوەندی و لیکتێگەیشتنی دور لەفرت و فێڵ"دا، ئەندازەگیری بکرێت. هابرماس تەنانەت بڕوایوایە ئەمجۆرە پێشکەوتنە سەرەکیترە لەپەرەسەندن لەبواری کرداری عەقلانی ئاراستەکراو بەرەو ئامانجدا و هەر لێرەوە ناوی دەنێ "خێرایی پێوەری پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی"[٣٣].

ئەمجۆرە بیرکردنەوانە لەبواری پەرەسەندنی کۆمەڵایەتیدا، چەندان ساڵ دوای ڕوبەڕوبونەوەی هابرماس لەگەڵ بزوتنەوەی خوێندکاریدا پێشکەشکرا. لەگەڵ ئەمەشدا ناکرێ بگوترێ ئەو لەهەمان سەردەمدا کاتێك رەخنەی لەدۆگماییەتی مارکسیانەی هەندێك لەپڕ هەراو هوریاترین رابەرانی بزوتنەوەی خوێندکاری دەگرت، ئەمجۆرە بیرکردنەوانەی لەسەردا نەبووە. ئامانجی ئەو لەکاردانەوە بەرامبەر بەشێوازەکان و پڕوپاگەندەی بزوتنەوەی ناڕازی خوێندکاران و هەم لەنەفیکردنی تێڕوانینی سنوردراوی ئەو بزوتنەوەیە بۆ پەرەسەندنی مێژوویی، ئەوە بوو کە لەسنوری تێڕوانینە باو و کلاسیکیەکان سەروتر بڕوات و هەڵوێستەکانی خۆی کە لەسەر بناغەی ڕێگەچارەی دیموکراتی بوو، ڕوونبکاتەوە. رەخنەی هابرماس لەبزوتنەوەی خوێندکاری لەسەر ئەو بڕوایە دامەزرابوو کە تێڕوانینی خوێندکاران بۆ گۆڕانکاریەکانی کۆمەڵگا پێشکەوتوەکانی ڕۆژئاوا و هەروەها بۆ وابەستەیی و کۆنترۆڵکردنی جیهانی سێهەم، قاڵبی و تەسکبینانەیە. ئەو دەورەی هابرماس بۆ خوێندکاران وەك پێشەنگی وتوێژی گشتی و ئازاد لەبارەی مەسەلە گشتی و ئاڵۆزەکانەوە داینابوو، بەبڕوای ئەو دەبووە هۆی ئەوەی تا بواری گشتی پاش قۆناغێك لەوەستان لەگفتوگۆ و باسی سیاسی واقعی و ئازاد، سەر لەنوێ رەونەق پەیدا بکاتەوە و سیاسی بێت. هێوای هابرماس ئەوە بوو بەمشێوەیەو بەپەنجە







خستنە سەر خاڵە لاوازەکانی حکومەت، رەوایتیەکەی بخاتە ژێر پرسیارەوە. دیارە دەرئەنجامی ئەم چالاکیانە، ئەنجامدانی شۆڕشی سۆشیالیستی نیە بەو شێوەیەی کە هەندێك لەرابەرانی بزوتنەوەی خوێندکاری چاوەڕێیان دەکرد، بەڵام رەنگە بەهۆی ئەم چالاکیانەوە پێشکەوتنێکی ڕێژەیی لەبواری کرداری پەیوەندی و کۆمەڵایەتیدا بێتە پێشەوە. بەسەرنجدان لەبیرکردنەوەکانی دوایی هابرماس لەماتریالیزمی مێژوویی، دەکرێت بگوترێت هابرماس بەدروستی لەوە تێگەیشتبوو کە هەلومەرج بۆ ڕوودانی شۆڕش و گواستنەوە بۆ شێوازێکی تازەی بەرهەمهێنان، بەئەندازەی پێویست سەخت و ناکۆکئامێز نەبوو بوو. رەنگە لەو کۆمەڵگایانەدا کە سیستەمی ئەخلاقی و یاسایی و شوناسی فەردی خۆی لەسەر بناغەی بنەما گشتیەکانی مرۆڤ دادەمەزرێنن، گونجاوتر ئەوە بێت کە جەخت لەسەر پێوەر و بنەما قبوڵکراوەکانی خۆی بکات.

پەراوێزەکان:

1-Zur logik der Sozialwissenschaften originally appeared as Beiheft 5 in the philosophischer Rundschau in february 1967; it was republished as a separate volume by suhrkamp in 1970. Habermass Die Universaitatsanspruch der
، Konrad Cramer،Hermeneutik appeared in Rudiger Bubner
، Hermeneutikund Dialektik (Mohr،and Reiner Wiehl (eds)
pp. 73-104.، 1970)،Tubingen

٢-لەبارەی بزوتنەوەی خوێندکاریەوە، بگەڕێوە بۆ :

die studentenbewegungen der ،see Gerhard baub
sechziger. Jahre in der bundesrepublik und westberlin (Pahl
student ، 1977); Margareth Kukuck، Cologne،– Rugenstein
und klassenkampf; studentenbewegun in der BRD seit 1967
1977); Karl-Heinz Lehnardt ، Hamburg،(Verlag Association
Politik zwischen Kopf und bauch; zur ،and Ludger Volmer
relevanz der personlichkeitsbildung in den politischen
konzepten der studenten bewegung in der BRD (Druckladen
1979); and Frank Wolff and Eberhard ، Bochum،Verlag
Windaus (eds) studentenbewegung 1967-69: protokolle und
1977).، Frankfurt،materialien (Verlag Roter Stern
3-peter Dews (ed.) Habermas; Autonomy and solidarity:
، 1986)، London،intervieews with jurgen Habermas (verso
p.80.
p.78.،4-ibid.

٥-بگەڕێوە بۆ یەکەم وتارەکانی:

،Protest bewegung und hochschulreform (suhrkamp
1969)،Frankfurt

کۆی نوسینەکانی هابرماس لەبارەی زانکۆ و خوێندکارانەوە، لەم کتێبەدا کۆکراوەتەوە.

pp. 44-68; and uwe ، studentenbewegungen،6-see baub
bergmann et al. Rebellion der studenten oder die neue
pp. 7-32.، 1968)، Hamburg،opposition (rowohlt
Geschichte ist machbar; texte uber das ،7-rudi dutschke
herrschende Falsche und die radikalitat des friedens friedens
p. 76.، 1980)، berlin،(wagenbach

ئەم کتێبە لەناواخنیدا وتار و نوسینە سیاسیەکانی دۆتچکەی لەدەیەی ١٩٦٠ و ١٩٧٠دا تێدایە.

٨-باسێکی دورودرێژتری لەبارەی تێڕوانینی دۆتچکەوە بۆ بزوتنەوەی





خوێندکاری و جەنگ و لەم بەرهەمەی خوارەوەدا بڵاوکرایەوە کە لەماوەی شەش مانگدا هەشت جار چاپ کرایەوە و زیاد لە١٥٠٠٠٠ ژمارەی لێفرۆشرا: Rebellion
.der studenteb (pp. 33-93)
p. 80.، Autonomy and Solidarity،9-Dews

١٠-هابرماس لێرەدا ئاماژە بۆ خوێندکارانی دوای ناوەندی و زانکۆ بەیەکەوە دەکات.

11-The stuctural Transformation of the public sphere: an
trans. Thomas ،inquiry into a Category of Bourgeois society
Burger with the assistance of Frederick Lawrence (MIT
، 1989). Jurgen Habermas، Mass، Cambridge،Press
، trans. Thomas Mc Carthy (Beacon،Legitimation Crisis
p. 134.، 1975)،Boston
in Die Linke antwortet ، "Einleitung" ،12-Oskar negt
، Frankfurt،Jurgen habermas (Europaische Veriagsanstait
p. 32.،1968)
Uber den Gebrauch klinischer begriffe ،13-Klaus Dorner
pp. 59-69.، in die Linke،in der politischen Diskussion
kapitalismus - Analyse als ،14-Claus Offe
pp. 108-9.، in die Linke،Selbsteinschuchterung
in Die ، "Ein Brief an Jurgen Habermas"،15-Furio Cerutti
p. 44.،linke
، in Die Linke، "praxis und Theorie"،16-Anselm Neususs
pp. 49-50.
"Die Geburt der Kritik aus dem Geist ،17-peter Bruckner
pp. 72-4.، in Die linke،des Geruchts"
"Revolutionare Strategie und ،18-Herbert Lederer
p. 114.، in Die Linke،liberales Maklertum"





"Zum Verhaltnis zwisch ،19-Ekkehart Krippendorff
in Die ،Inhalt und Form von Demonstrations Techniken"
169.، pp. 164،Linke
"Verteidigung der "neuen Sensibilitat" ،20-Reimut Reiche
pp. 102-3.، in Die linke،"
pp. 54-5.، "Praxis"،21-Neususs
pp. 17-32.، "Einleitung"،22-Negt
Marx Engels Werke ،23-Karl marx and Friedrich Engels
p.298.، Vol. 22، 1972)، Berlin،(Dierz Verlag
pp. 7-11.، Vol. 13،24-ibid.
Habermas on Historical Materialism ،25-Tom Rockmore
1989).، Bloomington،(Indiana University Press
Communication and the ،26-Quoted in Jurgen Habermas
(Beacon ، trans. Thomas Mc Carthy،Evolution of Society
p. 98.، 1979)، Boston،Press

**فەسڵەکانی دوو تا پێنج هەڵگری چوار وتاری سەرەکی کتێبی "پیاچوونەوە بەماتریالیزمی مێژوویی" (فرانکفۆرت ١٩٧٦) دایە.**

Technik und Wissenschaft als ،27-Jurgen Habermas
1968).، Frankfurt،"Ideologie" (Suhrkamp
p. 136.،28-Communication and the Evolution of Society
29-ibid.
p. 102.،30-ibid.
p. 116.،31-ibid.
32-"Moral development and ego identity" (pp. 69-94 of communication and the Evolution of society).

**هابرماس لەم وتارەدا بەدورودرێژی پەیوەندی گەشەکردنی کەسایەتی و تیورەی کرداری پەیوەندی، تاوتوێ دەکات. لێرەشدا پشت بەبەرهەمەکانی لۆرنس کلبرگ دەبەستێتز**
p. 120. ،33-Communication and the Evolution of Society







**تێبینی: ئەم بەشە وەرگێڕانی فەسڵێکی ئەم کتێبەی خوارەوەیە:**
**رابرت هولاپ: یورگن هابرماس (نقد در حوزه عمومی). تهران - نشر نی. چاپ اول ١٣٧٥.**

## مەسەلەی توند و تیژی و یاخیبوونی رادیکال

## نوسینی: هربرت مارکۆز

**ئەمڕۆ دەکرێ تەماشای یاخیبوونی رادیکال تەنها لەچوارچێوەیەکی جیهانیدا بکەین. گەر بمانەوێت بەتەنها سەرنجی لێبدەین، هەر لەسەرەتاوە ماهییەتەکەیمان شێواندووە. من بەدیدێکی جیهانیەوە بەڵام بەسەرنجدانی تایبەتی لەئەمەریکا، باس لەم مەسەلەیە دەکەم. دەزانن بەبڕوای من یاخیبوونی هەنوکەیی خوێندکاران، یەکێك لەهۆکارە سەرەکیەکانی گۆڕانکاریە: دیارە نەك هێزێکی شۆڕشگێڕی هەنوکەیی کە بەڕاگەیاندنی سەرزەنشتی منیان کردووە، بەڵکو وەك یەکێك**

لەبەهێزترین ئەو هۆکارانەی دەتوانن هێزە شۆڕشگێڕەکان دروستبکەن. لێرەوە یەکێك لەگرنگترین پێداویستیە ستراتیژیەکانی ئەم سالآنە ئەوەیە، کە یاخیبوونی خوێندکاران لەجێگە جیاوازەکاندا بەیەکەوە گرێبدەین. بەزەحمەت دەکرێ پەیوەندی نێوان یاخیبوونی خوێندکارانی ئەمەریکا و ئەلْمانیا بدۆزرێتەوە. یاخیبوونی خوێندکارانی ئەمەریکا تەنانەت ڕێکخستنێکی ناوەندی کاریگەری نییە، (بەلام) دەبێت بۆ جێگیرکردنی پەیوەندیەکی لەمچەشنە هەولْبدەین و گەر دەشبینن نمونەی ئەمەریکا دەهێنمەوە، تەنها لەبەر جێگیرکردنی پەیوەندیەکی لەمچەشنەیە. یاخیبوونی خوێندکاران لەئەمەریکا خۆی بەشێکە لەیاخیبوونێکی گەورەتر کە زۆرجار پێی دەگوترێت "چەپی نوێ".

سەرەتا دەبێت جیاوازییە سەرەکیەکانی چەپی تازە و چەپی کۆن بەکورتی روونبکەینەوە. چەپی تازە بەهەندێك ئاوارتنەوە زۆرتر مارکسی نوێن تا مارکسی ئاسایی، ئەم گروپە بەتوندی لەژێر کاریگەری مائویزم و بزوتنەوە شۆڕشگێڕەکانی جیهانی سێهەمدان. جگە لەمە لەناو ئەم چەپە تازانەدا مەیلی ئانارشیستی نوێ هەیە و بەبێباوەڕی قولْیان بەحیزبەکانی چەپی کۆن و ئایدیۆلۆژیەکانی دیاری دەکرێن. چەپە تازەکان دیسان بەهەندێك ئاوارتنەوە، تەنها چینی کرێکار بەهۆکاری شۆڕشگێڕ ناناسن. ناکرێ چەپە تازەکان بەشێوەی باو پۆلێن بکرێن و لەناو گروپە ڕۆشنبیرەکان، گروپی لایەنگرەکانی بزوتنەوەکانی ماڤی مەدەنی، لاوان و بەتایبەتی رادیکالترین رەگەزەکانی لاوان و کەسانێك کە لەسەیرکردنی یەکەمدا سیاسی نایەنە پێشچاو: واتە هیپپیەکان، دابنێین. دواتر باسی هیپپیەکان دەکەم. خالْی سەرنجڕاکێشەر ئەوەیە کە قسەکەرانی ئەم بزوتنەوەیە کەسانی گومانلێکراوی وەك شاعیرەکان، نوسەران و ڕۆشنبیران پێکیدەهێنن، نەك سیاسەتمەدارە تەقلیدیەکان.

ئەگەر تەماشای ئەو نەخشەیەبکەن کە بۆم وێنەکردن، دەیسەلمێنن ئەم هەلومەرجە بۆ مارکسیە کۆنەکان وەك کابوسێك وایە. ئێوە لێرەدا یاخیبوونێك دەبینن کە هیچ پەیوەندی بەهێزە شۆڕشگێڕە "کلاسیکیە"کانەوە نییە: بەلام کابوسێکە کە لەواقعەوە دێت. بەبڕوای من ئەم یاخیبوونە نائاساییانە، رەنگدانەوەی واقعی کۆمەلْگایەکی دیموکراسی ئۆتۆریتەری "لەحالْەتی هەولْداندایە" و ڕەنگدانەوەی ئەو شتەیە کە ناومناوە "کۆمەلْگای تاك رەهەند" کە خەسلْەتی





سەرەکی بریتیە لەوەی چینێکی بالآ دەست لەسەر بناغەی نیازە کۆنترۆلکراو و تێرکراوەکان کە خۆیان پاوانکردنی کاپیتالیزمی دروستدەکەن — ویژدانێکی کۆنترۆلْکراو و سەرکوتکراو — بەسەر کۆی کەرەسە و بناغە واقعیەکانی کۆمەلْگادا دەسەلآتیان هەیە. دەرئەنجامی ئەم یاخیبوونانە ئەوەیە لەکۆمەلْگایەکدا کە هۆکارە بابەتیەکانی بەم رادەیە ئاشکران، هۆکاری زیهنی بۆ دروستکردنی گۆڕانکاری ناچارانە نین. ئا لەم هەلومەرجەشدا یاخیبوون لەلایەن کەسانێکەوە ئەنجامدەدرێت، کە لەدەرەوەی سیستەمی جێگیرن. یەکەم گروپ کۆمەلْێکی بێبەشن کە تەنانەت کاپیتالیزمی پێشکەوتووش ناتوانێت و نایەوێت پێداویستیە زیندووەکانیان جێبەجێبکات. دوهەم گروپ جەمسەرەکەی تری کۆمەلْگا پێکدەهێنن، واتە چینێکی خۆشگوزەران کە ویژدان و غەریزەی کۆمەلآیەتیان لەکۆنترۆلْی کۆمەلْگا دەچێتەدەرێ. مەبەستم ئەو گروپە لەچینە کۆمەلآیەتیەکانە کە بەهۆی پێگە و خوێندنیان، هەقیقەتەکان و بونیادی هەمەکی هەقیقەتەکان دەناسن و ئەم ناسینەش بەزەحمەت بەدەستدێت. ئەم چینانە هوشیارن بەرامبەر ناکۆکیە روو لەزیادەکانی ئەم کۆمەلْگا بەڕوکەش دەولْەمەندە و هەروەها بەو باجەی ئەم کۆمەلْگا بەڕوکەش دەولْەمەندە، لەقوربانیانی وەردەگرێ. بەکورتی لەهەردوو ئەم جەمسەرەی کۆمەلْگادا یاخیبوون هەیە و دەمەوێت لێرەدا بەکورتی رونیانبکەمەوە:

چینی بێبەش: لەویلایەتە یەکگرتوەکاندا ئەم چینە بێبەشە بەگشتی لەکەمایەتیە نەتەوەیی و نەژادیەکان پێکدێت کە ڕێکخستنێکی سیاسی دروستیان نییە و زۆرجاریش ناکۆکی لەنێوان خۆیاندا هەیە (بۆ نمونە لەشارە گەورەکاندا پێکدادانێکی زۆر لەنێوان رەشەکان و پۆرتوریکۆیەکاندا هەیە). ئەم گروپە زۆرجار جێگەیەکیان لەدیاردەی بەرهەمهێناندا نییە، لێرەوە لەڕوانگەی تیۆرەی مارکسەوە ناکرێت بەچێنگەلێکی بەزەبر شۆڕشگێڕ بزانرێ — لایەنیکەم بێ یارمەتی کەسانی دی. بەلآم لەراستیدا بەدیدێکی جیهانییەوە چینی بێبەشی واقعی کە باری ئەم سیستەمەی بەسەر شانەوەیە، خەباتگێڕی ڕێگەی ئازادین دژی کۆلۆنیالی نوێ لەجیهانی سێهەمدا و دژی کۆلۆنیالیکردنن لەویلاتە یەکگرتووەکاندا . لێرەشدا هیچجۆرە وابەستەیی و پەیوەندیەك لەنێوان کەمایەتیە نەژادی و نەتەوەییەکان لەناوەندە گەورەکانی کۆمەلْگای سەرمایەداریدا و جەماوەری نوێی کۆلونیالیکراو کە





دژی ئەم کۆمەڵگایە خەباتدەکەن، نییە. دەکرێ ناوی ئەم گروپە بنێین پرۆلیتاریای نوێ کە ئەمڕۆکە بەمەترسیەکی واقعی بۆ کۆمەڵگای سەرمایەداری دەژمێرێت. ئەوەی تاچەند دەکرێ چینی کرێکاری ئەوروپا لەناو ئەم گروپە بێبەشەدا دابنێین، خۆی مەسەلەیەکە کە دەبێت بەجیا لێی بکۆڵینەوە و لێرەدا ناتوانم لێی بکۆڵمەوە و تەنها ئاماژە بۆ پرنسیپە گشتیەکانی دەکەم. لەبارەی چینی کرێکاری ویلایەتە یەکگرتووەکانەوە، دەبێ بگوترێت کە زوربەیان لەسیستەمی سەرمایەداریدا جێگەیەکیان هەیە، لەبەرئەوە ئارەزووی گۆڕانکاریەکی بنەڕەتی ناکەن، بەڵام هێشتا رەنگە نەتوانرێت لەبارەی چینی کرێکاری ئەوروپاوە هیچ بگوترێت.

چینی خۆشگوزەران: من چینی دوهەم کەدەستیانکردووە بەدژایەتی سیستەمی سەرمایەداری پێشکەوتوو، لەدوو بەشدا تاوتوێ دەکەم. ڕێگەمبدەن سەرەتا لەگروپێکەوە دەست پێبکەین کە پێیان دەگوترێت کرێکارانی تازە و تەکنیکیەکان، ئەندازیاران، پسپۆرەکان، زانایان و کەسانی دی کە دەستیان لەپرۆسەی بەرهەمهێناندا هەیە، ئەگەرچی ئەم گروپە جێگەیەکی تایبەتیان هەیە. لەلایەکەوە بەهۆی ئەو پێگە تایبەتیەوە کە ئەم گروپە هەیانە، ناوکی هێزێکی شۆڕشگێڕانەی بابەتی پێکدەهێنن و لەلایەکی دیەوە بۆ سیستەم وەك منداڵێکی نازدارن کە لەناوەڕۆکدا ویژدانی سیستەمەکە پێکدەهێنن. لێرەوە زاراوەی "چینی کرێکاری تازە" زاراوەیەکی نەگونجاوە.

بەشی دووهەم کە ئەمڕۆ بەتایبەتی دەمەوێت قسەیان لەبارەوەبکەم، یاخیبوونی خوێندکارانە بەمانای فراوانی وشە کە دەرکراوەکانیش دەگرێتەوە. تا ئەو جێگەیەی دەتوانم هەڵیسەنگێنم، جیاوازیەکی سەرەکی لەنێوان بزوتنەوەی خوێندکارانی ئەڵمانیا و ویلایەتە یەکگرتووەکان هەر لەم دەرکراوانەدایە. لەئەمەریکادا زۆرێك لەخوێندکاران کە یاخیبووی چالاکن، وازیان لەخوێندکاری هێناوە، بۆئەوەی هەموو کاتی خۆیان بۆ ڕێکخستنی ئەم یاخیبوونانە تەرخانبکەن. ئەم بابەتە ترسناکە، بەڵام لەناوەڕۆکدا فازانجیشی هەیە. من یاخیبوونی خوێندکاران لەژێر سێ ناونیشاندا تاوتوێدەکەم. یەکەم ئەوەی کە یاخیبوون دژی چییە، دوهەم ئەوەی بەچ شێوەیەکە و سێهەم ئەوەی ئاسۆی ئەم یاخیبوونە چیە؟

سەرەتا ئامانجی یاخیبوون چیە؟ ئەم پرسیارە دەبێ بەجدی وەربگیرێت، چونکە





روبەڕوی یاخیبونێك وەستاوین کە لەبەرامبەر کۆمەڵگایەکی دیموکراتی چالاك و بەبەرهەمدا راوەستاوە، کە لایەنیکەم لەهەلومەرجی ئێستادا تیرۆری تێدا نییە. جگە لەمەش ئەو خاڵەی لەویلایەتە یەکگرتووەکاندا روون و ئاشکرایە، ئەوەیە کە ئەم یاخیبوونە دژی زۆرینەی کۆمەڵگا و لەوانەش چینی کرێکار ئەنجامدەدرێت. ئەمە یاخیبوونێکە دژی فشاری بەردەوام و هەمەلایەنەی ئەم سیستەمە.. فشارێك کە بەهۆی دەسەڵاتی سەرکوتکەر و وێرانکاریەوە هەموو شتەکانی بەشێوەیەکی نامرۆڤانە سڕیوەتەوە، و کردوونی بەشتگەلێك کە کڕین و فرۆشتنیان گوزەران و ناوەڕۆکی ژیان پێکدەهێنێت، یاخیبوونێکە دژی ئەخلاقیات و "بەها" درۆزنەکانی ئەم سیستەمە و دژی تیرۆرەکانی دەرەوەی شارە گەورەکان. ئەم یاخیبوونانە سەرەتا وەك بزوتنەوەی مافی مەدەنی و پاشان وەك جەنگی ڤێتنام دەرکەوتن. لەبزوتنەوەی مافی مەدەنیدا خوێندکاران لەباکورەوە بۆ باشور رۆیشتن، تاکو یارمەتی رەشەکان بدەن مافی خۆیان وەربگرن. ئا لێرەدابوو خوێندکاران سیمای راستەقینەی ئەم سیستەمە دیموکراتەیان بینی، بینیان کە "شەریف"ەکان چی دەکەن، بینیان کە چۆن کوشتن و کوشتاری رەشەکان بێ سزادان دەبێت، لەکاتێکدا کە بکوژ بەتەواوی ناسراوە. ئەمە ئەزمونێکی راچڵەکێنەر بوو کە چالاکی سیاسی خوێندکاران و رۆشنبیرانی بەرێخست. لەچرکەی دوهەمدا ئەم یاخیبوونە لەگەڵ جەنگی ڤێتنامدا توندتر بوو. جەنگ بۆ خوێندکاران خودی واقعی کۆمەڵگای جێگیری ئاشکرادەکرد: پێویستی پەرەسەندنخوازی و دەستدرێژی کە لەخودی ئەم سیستەمەدا هەیە و ئەو درندایەتیەی لەدژی بزوتنەوەی ئازادیخوازەکان پیشانیدەدات.

بەداخەوە لێرەدا دەرفەتی ئەوەم نییە، تاوتوێی جەنگی ڤێتنام بکەم و ببینین کە جەنگی ئیمپریالیانەیە یان نا. لێرەدا تەنها ئاماژەیەکی کورتدەکەم، چونکە ئەمە مەسەلەیەکە هەمیشە بەرەو روماندەبێتەوە. ئەگەر ئیمپریالیزم بەمانا کۆنەکەی وەربگرین، ئەوا ئەم جەنگە ئیمپریالیانە نییە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەم مەسەلەیە سەرلەنوێ بووە بەمەسەلەیەکی توند. لەگۆڤاری نیوزویك لەژمارە حەوتی جولای ١٨٦٧دا دەخوێنینەوە کە ڤێتنام سەرمایەیەکی بیست ملیۆن دۆلاری پێکدەهێنێت و ئەم ژمارەیەش رۆژ بەرۆژ زیاد دەکات: لەگەڵ ئەمەشدا پێویست بەوە ناکات لێرەدا پێناسێکی تازە بۆ ئیمپریالیزم تاوتوێبکەین، چونکە قسەکەرانی دەوڵەتی ئەمەریکا





خۆیان ئەم کارەیانکردووە. ئامانجی ئەمەریکا لەڤێتنامدا ئەوەیە ڕێگە نەدات یەکێك لەگرنگترین ناوچە ستراتیژی و ئابوریەکانی جیهان بکەوێتە دەست کۆمۆنیستەکان. گرنگی جەنگی ڤێتنام بۆ هەموو خەباتە نەتەوەییەکانی سەرتاسەری زەوی بەهای خۆی هەیە، لەو ڕووەوە کە سەرکەوتنی ڤێتنامیەکان لەبەدەستهێنانی ئازادیدا، بزوتنەوە ئازادیخوازەکانی تری دنیا و ئەو شوێنانەی کە سەرمایەگوزاری گەورەی تیاکراوە، چالاکدەکات. ئەگەر ڤێتنام تەنها ڕەنگدانەوەی سیاسەتی دەرەوەی ئەمەریکا نەبێت، بەڵکو پەیوەندی بەخودی سیستەمەکەوە هەبێت، ڕەنگە خاڵی وەرچەرخانێك بێت لەم سیستەمەدا و ڕەنگە سەرەتای مردنی لەناو خۆیدا هەڵگرتبێت. چونکە لێرەدا ئاشکرا بووە کە ئیرادە و جەستەی مرۆیی بەفەقیرترین چەکەکانەوە، دەتوانێت دەرەقەتی گەورەترین سیستەمی وێرانکەری هەموو سەدە و سەردەمەکان بێت، ئەمە لەمێژوودا شتێکی تازەیە.

ئێستا با بگەڕێمەوە بۆ پرسیاری دوهەمی خۆم و تاوتوێی شێوەکانی ئەم یاخیبوونە بکەم. ئێمە قسە لەبارەی یاخیبوونی خوێندکارانەوە دەکەین، بەڵام دەبێت لەسەرەتادا بڵێم مەسەلەکە بەسیاسیبوونی زانکۆکان نییە، چونکە زانکۆکان لەپێشەوە سیاسیبوون. تەنها دەبێ ببینین بۆ نموونە زانستە سروشتیەکان و تەنانەت زانستی وەك ماتماتیك، تا چ ئەندازەیەك جێگەیان لەدیاردەی بەرهەمهێنان و ستراتیژی سەربازیدا هەیە. تەنها دەبێت ببینین زانستە سروشتیەکان و تەنانەت کۆمەڵناسی و دەروونناسی، لەرووی مادیەوە تا چەند پشتیان بەدەوڵەت و دەزگا گەورەکان بەستووە، و ببینین دەستێوەردانی دەوڵەت و دەزگا گەورەکان لەکۆنترۆڵی مرۆڤەکان و ڕێکخستنی بازاڕدا تا چ ئەندازەیەکە. لەمڕووەوە دەبێ بگوترێت زانکۆ خۆی دەزگایەکی سیاسیە و یاخیبوونی خوێندکاران بۆ دەرکردنی سیاسەتە لەزانکۆ، نەك بۆ سیاسیکردنی زانکۆ. پێویستە جێگەیەك بۆ ڕەخنەگرتن لەپاڵ بێلایەنی پۆزەتیڤدا کە بێلایەنیەکی درۆزنانەیە، لەبەرنامەی خوێندن و لەچوارچێوەی وتوێژە ڕۆشنبیریەکاندا بکەینەوە. هەر لەبەر ئەمەیە یەکێك لەداواکاریە سەرەکیەکانی یاخیبوونی خوێندکاران ئەوەیە گۆڕانێك لەبەرنامەی خوێندندا بکرێت کە جێگەی بیر و زانیاریە ڕەخنەگرەکان لەسەر بناغەی باسە ڕۆشنبیریەکان ببێتەوە، نەك تەنها وەك شێواویەك و هەراو هوریایەکی پرۆپاگەندانە. لەو





جێگایانەشدا کە ئەم ئەگەرە مومکین نەبووە، "زانکۆی ئازاد" و "زانکۆی ڕەخنەگرانە" لەدەرەوەی زانکۆ دروستبووە کە هەر ئێستا لەبێرکلی و ستانفۆرد و هەندێك زانکۆی خۆرهەڵاتدا دەبینرێت. لەم زانکۆ ئازادانەدا، دەورە و سیمینارگەلێك بەڕێدەخرێت کە ئەو شتانەی لەبەرنامەی ئاسایی خوێندندا باسناکرێت یان بەشێوەیەکی کەموکوڕ باسدەکرێ، دەخرێتە ژێر باسەوە: وەك مارکسیزم، دەرونشیکاری، ئیمپریالیزم، سیاسەتی دەرەکی لەجەنگی سارددا و ناوچە کەمایەتی نشینەکان.

شێوەیەکی تری یاخیبوونی خوێندکاران بەناوبانگە بەوانە وتنەوەکان، دانیشتنەکان و عەشقەکان. لێرەدا تەنها دەمەوێت ئاماژە بۆ دامێن و فشارە دەرونیەکانی یاخیبوونبکەم: فێرکردن و فێرکردنی ڕەخنەگرانە کە لەلایەکەوە پەیوەندی بەتیۆرەوە هەبێت و لەلایەکی دیشەوە پەیوەندی بەشتێکەوە هەبێت، کە تەنها دەکرێت ناوی بنرێ "کۆگای بوون" یان "ئەنجامدانی کاری هەر کەسێك بەدەستی خۆی". دواتر باسی فشارەکانی ئەم یاخیبوونە دەکەم، چونکە بەبڕوای من ئەوجۆرە لەپێکهاتەی شۆڕشی سیاسی و شۆڕشی جنسی، ئەخلاقێك پیشاندەدا کە بەبڕوای من یەکێك لەهۆکارە گرنگەکانی یاخیبوونە لەئەمەریکادا. ئاشکراترین دەرکەوتی ئەم فشارە دەرونیە، خۆپیشاندان — خۆپیشاندانی بێ چەکە — کە دروستبونیان پێویستی بەهیچ هەلێکی تایبەت نییە و دۆزینەوەی بەهانە بۆ دەستپێکردنیان، پێویست نییە. بەهانە و پێکدادان لەهەموو شوێنێکدا هەیە. پێویستناکات پێکدادانەکان کۆبکەینەوە، ئەگەر بشمانەوێت بەگەڕان نیشانەیان لێبگرین، لەراستیدا یاخیبوونمان شێواندووە، چونکە ئەمڕۆ یاخیبوون پێگەیەکی بەرگریکەری هەیە، نەك هێرشبەرانە. سەرنجی ئەم نمونانەی خوارەوە بدەن:

پەرەسەندنی جەنگی ڤێتنام، دیدارەکانی نوێنەرانی سیاسەتی جەنگ، مانگرتنی کارخانەییەکان کە تیایدا ناپاڵم و چەکی کیمیایی دروستدەکرێت. ئەم خۆپیشاندانانە، ڕێکخراو و یاساییین. ئایا ئەم خۆپیشاندانە یاساییانە، پێکدادانە لەگەڵ توندوتیژی بونیادیدا کە یاخیبوون ئاشکرایدەکات؟ وەڵامی من لەبارەی ویلایەتە یەکگرتوەکانەوە ڕاستە، بەڵام ئێوە دەتوانن لەگەڵ هەلومەرجی خۆتاندا بیگونجێنن. ناکرێت ئەم خۆپیشاندانانە تا ئەو کاتەی لەچوارچێوەی یاساییدا

ئەنجامدەدرێن، بەپێکدادان بزانرێت. بەڵام کاتێك لەچوارچێوەیەکی یاساییدا ئەنجامدران، لەراستیدا خۆیان تەسلیمی ئەو توندوتیژیە بونیادیە کردووە کە بەشێوەیەکی میکانیکی چوارچێوە یاساییەکەی دەستنیشانکردووە و تا ڕادەی خنکاندن سنورداریکردووە: وەك جێبەجێکردنی یاساگەلێك کە دەستدرێژی بۆ موڵکی تایبەتی و دەوڵەتی قەدەغە کردووە، یاسای پەیوەندیدار بەترافیکەوە، شێواندنی ئاسایش و لەم بابەتە. بەمشێوەیە ئەگەر خۆپیشاندانی ئارام، ئارامی بشێوێنێت یان دەستدرێژیەکی توند یان نەرم بکرێتە سەر موڵکە تایبەتیەکان، شتێکی یاسایی لەچرکەیەکدا دەبێت بەشتێکی نایاسایی. لەهەلومەرجێکی وادا پێکدادان لەگەڵ هێزەکانی دەوڵەت و توندوتیژی بونیادیدا، شتێکی ناچاریە — مەگەر یاخیبوون وەك دەربڕینێکی ئاشتیانە، ویژدانێکی ئارامکەرەوە و شایەتێکی لێبێت کە تەنها ئازادیەکان و مافەکانی هەلومەرجی باو دەبینێت. ئەمانە ئەزمونەکانی بزوتنەوەی مافی مەدەنی بوو: کە کەسانی دی توندوتیژی بەکاردەهێنن، کە کەسانی دی توندو تیژن، کە یاسا هەر لەسەرەتاوە لەبەرامبەر ئەم توندوتیژیەدا گومانلێکراوە. یاخیبوونی خوێندکارانیش ئەو کاتەی سیستەمی جێگیر خۆی لەژێر هەڕەشەیدا ببینێ، سەرئەنجامێکی ئاوای دەبێت. ئالێرەشدا ئیدی دەبێت یاخیبوون بڕیاری خۆیبدات: یاخیبوونی ئارام و زاهیدانە یان یاخیبوون وەك بەرگریکردن، واتە سەرپێچیکردن لەمافە مەدەنیەکان.

حەزدەکەم لەبارەی مافی بەرگریکردنەوە چەند قسەیەکبکەم، چونکە هەر کاتێك سەرنجدەدەم خەڵکی زانیاریەکی ئەوتۆیان لەم مەسەلەیەدا نییە کە مافی بەرگریکردن، یان سەرپێچیکردن لەمافە مەدەنیەکان، دەگەڕێتەوە بۆ یەکێك لەکۆنترین و پیرۆزترین رەگەزەکانی شارستانێتی ڕۆژئاوا، سەرسوڕمانم زیاتر و زیاتر دەکات. ئەو مەسەلەیەی کە مافو یاسایەك هەیە بالآترە لەیاسا دانراوەکان ، بەئەندازەی ئەم شارستانێتیە کۆنە. لێرەدا مەسەلەی بەرخوردی مافەکان لەئارادایە کە لەقۆناغی دواییدا لەهەر یاخیبوونێکی تایبەتدا دەردەکەوێت. چونکە لیژنەی فەرمانڕەوا پاوانی یاسایی توندوتیژی و مافە پۆزەتیڤەکان بۆ خۆی دەکات و تەنانەت بەئەرکی خۆی دەزانێت سود لەم توندوتیژیە بۆ بەرگریکردن لەخۆی وەربگرێت. بەپێچەوانەوە ناسین و سودوەرگرتن لەمافێکی بالآتر و ئەرکی بەرگریکردن واتە





سەرپێچی لەمافە مەدەنیەکان، یەکێك لەهێزە بزوێنەرەکان و توندوتیژیەکی بەزەبر ئازادیخوازە لەپەرەسەندنی مێژوویی ئازادیدا. ئەگەر ئەم مافی بەرگریکردنە نەدەبوو، وە ئەگەر یاسایەکی بالآتر لەبەرامبەر یاسادا نەدەکەوتە چالاکی، هەلومەرجی ئەمڕۆی ئێمە جیاوازیەکی لەگەڵ سەردەمی بەربەریەتدا نەدەبوو. لێرەوە من بڕواموایە چەمکی توندوتیژی دوو شێوە دەگرێتە خۆی: توندوتیژی بونیادی سیستەمەکە خۆی و توندوتیژی بەرگریکردن کە بەسەرنجدان لەیاسا دانراوەکان، شتێکی نایاساییە. وێنای یاسایبوونی توندوتیژی، خەیاڵێکی بێمانا و بێهودەیە. هیچ سیستەمێکی کۆمەڵایەتی تەنانەت ئازادترین سیستەمەکانیش، ناتوانێت توندوتیژی دژی خۆی بەیاسایی لەقەڵەمبدات. هەریەك لەم شێوانە، کردارێکی هەیە کە دەکەوێتە ناکۆکیەوە لەگەڵ ئەویدیدا. هەم توندوتیژی سەرکوتکەرانە هەیە و هەم توندوتیژی ئازادیخوازانە، هەم توندوتیژی بەرگریکردن لەژیان هەیە و هەم توندوتیژی دەستدرێژیکەر، هەردوو ئەم شێوەیەش وەك هێزی مێژوویی هەن و دەمێننەوە. لێرەوە هەر لەسەرەتاوە یاخیبوون لەزەمینەی توندوتیژیدا، جێگەی دەبێتەوە. مافەکان بەرامبەر بەیەك رادەوەستن و نەك بەشێوەیەکی ئەبستراکت، بەڵکو بەشێوەیەکی پراکتیکی. سەرلەنوێ بارودۆخی هەبوو مافی ئەوەی هەیە، سنوری یاساییبوون دیاریبکات. ئەم پێکدادانە لەنێوان ئەم دوو مافەدا، واتە پێکدادانی مافی بەرگریکردن و توندوتیژی بونیادی، هەمیشە مەترسی پێکدادانی خەڵك و دەوڵەتی بەدوادا دێت، مەگەر ئەوەی کە مافی ئازادیخوازی بکەینە قوربانی سیستەمی هەبوو، یان وەك رابردوو ژمارەی قوربانیەکانی هێزەکانی ڕژێمی هەبوو، لەقوربانیەکانی شۆڕشەکان زیاتر بێت. مانای ئەم قسانە ئەوەیە کە بانگهێشتکردن بۆ نەرمی و ئامۆژگاریکردن لەمبارەیەوە، توندوتیژی بونیادی هەبوو زیاددەکات. لەکۆمەڵگای پیشەسازی پاوانکەردا، ئەم توندوتیژیە بەشێوەیەکی بێوێنە لەدەسەڵاتدارێتیدا هەیە کە کۆی کۆمەڵگا دەخاتە ژێر کاریگەری خۆیەوە. مافی ئازادیخوازی کە لەدوای ئەم هەمەکێتیەوە دێت، مافێکی تایبەتیە (خصوصی). لێرەوە توندوتیژی وەك بەلآیەك لەنێوان توندوتیژی گشت و تایبەتدا یان لەنێوان گشتی و تایبەتیدا لێدێت و لەم بەلآیەشدا توندوتیژی تایبەتی تێکدەشکێت، مەگەر ئەوەی بتوانێت وەك مەیلێکی هاوبەشی گشتی خۆی لەبەرامبەر هێزی کۆمەڵگای هەبوودا





رابگرێ.

تا ئەوکاتەی یاخیبوون هێزی کۆمەڵایەتی مەیلێکی هاوبەشی گشتی لەگەڵدا نەبێت، مەسەلەی توندوتیژی مەسەلەیەکی تاکتیکی دەبێت. ئایا پێکدادان لەگەڵ دەسەڵاتەکاندا کە تیایدا هێزی بەرگریکردن لاواز دەبێت، دەتوانێ لەهەلومەرجێکی تایبەتدا هاوسەنگی هێزەکان بەبەرژەوەندی یاخیبوون بگۆڕێت؟ ئەو وەڵامەی کە زۆرجار بەم پرسیارە دەدرێتەوە، بێنرخە. ئەم وەڵامە دەڵێت لەکاتی ئەم پێکدانانەدا، "نەیارکراو" بەهێز دەبێت. (بەڵام) ئەم بەهێز بوونە، بێ ئەوەی پێویستی بەم پێکدانانە هەبێت، خۆبەخۆ بەردەوامە.

هەرجارێك یاخیبوون توندتر بێت، ئەم بەهێزبوونە روو دەدات و مەسەلەکە لێرەدا ئەوەیە کە ئەم دیاردەیە بۆ قۆناغێکی مامناوەندی بگوێزینەوە. کەوابوو هەڵسەنگاندنی هەلومەرجەکە، پەیوەندی بەکاتی پێکدادان و بەتایبەتی بەرنامە هەمەلایەنیە کلتوریەکان و رێکخستنی بەرگریکردنەوە، هەیە. با نمونەیەك لەویلایەتە یەکگرتووەکان بهێنمەوە. ئەم یاخیبوونانە، جەنگی ڤێتنام بەکوتەکێك بۆ سەر پەیکەری ئازادی و خودی ژیاندا دەزانن کە کار دەکاتە سەر کۆی کۆمەڵگا و هەموویان لەحاڵەتێکی بەرگریکردندا دادەنێت. بەڵام زۆرینەی خەڵکی هێشتا بەرگری لەدەوڵەت و جەنگ دەکەن، لەکاتێکدا یاخیبوون پەرش و بڵاوەو رێکخستنی ناوچەیی هەیە. شێوەیەك لەیاخیبوون کە هێشتا لێرەدا یاساییە، بێ ویست دەگۆڕێت بۆ سەرپێچی لەمافە مەدەنیەکان، وەك مانگرتن لەچونە سەر کار و رێکخستنی ئەم مانگرتنە، دەردەکەوێت. ئەمکارە نایاساییە، هەلومەرجەکە توندتر دەکات. لەلایەکیدیکەوە بەچالاکیە هەمەلایەنەکانی خوێندکاران لەناو خەڵکیدا، خۆپیشاندانەکان گەورەتر دەبن. ئەمە "کارێکی دەستەجەمعیە". خوێندکاران دەچن بۆ گەڕەکە فەقیرەکان تا دانیشتوانی ئەم ناوچانە هوشیاربکەنەوە و پێداویستیە رونەکانیان وەك نەبوونی سەرەتایترین هەلومەرجی تەندروستی و لەم بابەتە شتانە، لەناوببەن. خوێندکاران هەوڵدەدەن ئەم ئارەزووە هاوبەشانە رێکبخەن و لەهەمانکاتدا ویژدانی سیاسی دانیشتوانی ئەم ناوچانە، هوشیاربکەنەوە. ئەمکارەی خوێندکاران تەنها تایبەت نییە بەگەڕەکە پیس و نزمەکان. هەروەها خەباتی بەناوبانگی "دەقولباب"یش هەیە کە خوێندکاران و ژنانی ماڵەوە و مێردەکانیان





ئەگەر لەماڵەوە بن، لەوتوێژی جۆراوجۆردا، لەهەلومەرجی خۆیان ئاگادار دەکەنەوە. ئەم مەسەلەیە بەتایبەتی پێش هەڵبژاردن گرنگی هەیە. من زۆر جەخت لەوتوێژکردن لەگەڵ ژناندا دەکەم، چونکە بەگشتی دەرکەوتووە ژنان زۆرتر ئارەزووی وتوێژە مرۆییەکان دەکەن. چونکە هێشتا ژنان لەدیاردەی بەرهەمهێنانیدا نەتواونەتەوە و خۆشجێگە نەبوون. ئەمکارەی خوێندکاران زۆر زەحمەت و خاوە. ئایا سەردەکەون؟ سەرکەوتنیان قابیلی تەخمینە، بۆ نمونە بەسەرنجدان لەژمارەی ئەو دەنگانەی بەناو "نوێنەرانی ئاشتی" لەهەڵبژاردنە ناوچەیی، ویلایەتی و نەتەوەییەکاندا، بەدەستیدەهێنن.

ئەمرۆ لەیاخیبوەکاندا مەیلێك بۆ تیۆرە دەبینرێت کە وەك گوتم بەتایبەتی بۆ چەپی نوێ گرنگە کە سەرەتا بەگومان و دوودڵیەوە تەماشای ئایدۆلۆژیایان دەکرد. بەبڕوای من هەر رۆژێك رونتر لەرۆژی پێشوو دەبێت، کە هەر جۆرە گۆڕانێك لەسیستەمدا، پێویستی بەرابەڕی تیۆری هەیە. ئەمرۆ لەویلایەتە یەکگرتووەکاندا و لەیاخیبوونی خوێندکاراندا دەبینین کە نەك تەنها هەوڵ بۆ پڕکردنەوەی درزی نێوان چەپە نوێکان و کۆنەکان دەدرێ، بەڵکو هەوڵدەدرێت تیۆریەکی رەخنەگرانە بۆ کاپیتالیزمی هاوچەرخ لەسەر بناغەی مارکسیزمی نوێ دابڕێژرێ.

لێرەدا وەك دوا لایەنی یاخیبوون، دەمەوێت ئاماژە بۆ رەهەندێکی تازە لەناڕازیبوون بکەم کە لەپێکهاتەی شۆڕشی ئەخلاقی – جنسی و لەشۆڕشی سیاسی دروستبووە. وێنەیەك کە خۆم شایەتی بووم و بۆ ئێوەی دەگێڕمەوە، بۆ ئەوەی سەرنجبدەن چ جیاوازیەك هەیە لەنێوان ئەو روداوانەی لەویلایەتە یەکگرتووەکاندا روودەدەن و ئەو روداوانەی لێرە روو دەدەن. یەکێك لەخۆپیشاندانە گەورەکان دژی جەنگ، لەبرکلی بوو. پۆلیس ئەنجامدانی خۆپیشاندانەکەی ئازاد کردبوو، بەڵام رێگەی لەخۆپیشاندەرەکان گرتبوو بگەنە ئامانجەکەیان کە بریتی بوو لەهێڵی ئاسنینی سەربازی ئۆکلەند. مانای ئەم قسەیە ئەوەبوو کە لەخاڵێك بەدواوە بەهۆی سەرپێچیکردن لەفەرمانی پۆلیس، خۆپیشاندانەکە رەهەندێکی نایاسایی وەردەگرت. کاتێك هەزاران خوێندکار گەیشتنە خاڵی قەدەغەکراو، لەبەردەم خۆیاندا دە ریز پۆلیسی چەکداریان بەیۆنیفۆرمی خاکی و خودەی سەربازیەوە بینی. خۆپیشاندەران لەپۆلیسەکان نزیك دەبوونەوە و وەك هەمیشەش لەپێشیانەوە کەسانێك هەبوون کە





خۆپیشاندەرانیان هاندەدا کە نەوەستن و پۆلیسەکان ببڕن و بگەنە ئامانجەکەی خۆیان کە دیارە دەرئەنجامەکەی شکستێکی خوێناوی و بێدەرئەنجام دەبوو. لەناو خودی خۆپیشاندەرانیشدا هەندێك پەیدا بووبوون کە لەگەڵ چونە پێشەوەدا نەبوون، بەشێوەیەك کە خۆپیشاندەران سەرەتا دەبوو ئەمانە ببڕن و پاشان بگەن بەپۆلیسەکان. دیارە شتێکی لەم چەشنە رووی نەدا. پاش چەند دەقەیەکی پڕ ئاژاوە، هەزاران خۆپیشاندەر لەسەر زەوی دانیشتن و گیتار و هارمۆنیکاکانی خۆیان دەرهێناو دەستیانکرد بەلێدانیان و خۆپیشاندانەکە کۆتایی پێهات. رەنگە ئەمە لەبەرچاوی ئێوە بێمانا بێت، بەڵام بەبڕوای من لێرەدا یەکێتیەکی نائیرادی و بێ ڕێکخستن دروستبوو کە رەنگە کاریگەری لەدوژمنیش کردبێت.

چەند دەقیقەیەکیش باسی ئاسۆی یاخیبوون دەکەم. من هەرگیز یاخیبوونی ئەمڕۆی خوێندکارانم بەهێزە شۆڕشگێڕەکان تەفسیر نەکردووە و هیپیەکانیشم بە"میراتگری پرۆلیتاریا" نەبینیوە. تەنها بەرەی ئازادیخوازە نیشتمانیەکان لەوڵاتانی جیهانی سێهەمدا لەهەوڵێکی شۆڕشگێڕانەدان، بەڵام تەنانەت ئەمانەش بەتەنیا خۆیان بەمەترسیەك بۆ کاپیتالیزم ناژمێرێن. هەموو هێزەکانی یاخیبوون هەنوکە لەهەنگاوە سەرەتاییەکان و تەنها لەهەنگاوە سەرەتاییەکاندان — بەڵام ئەو هەنگاوە سەرەتاییانەی کە بۆ دروستکردنی ئەگەری قەیرانێك، پێویستن. بەرەی ئازادیخوازە نیشتیمانیەکان و شۆڕشی کەمایەتیەکانیش، یارمەتی ئەم قەیرانە دەدەن. ئەم یارمەتیەش نەك هەر سەربازیە، بەڵکو لەشێوەی هاوکاری ئەخلاقی و سیاسیشدایە: نەفیکردنی مرۆییانە و زیندووی سیستەمی هەبوو. بۆ دروستکردنی هەنگاوە سەرەتاییەکان و دواجار دروستکردنی قەیران، رەنگە بکرێ چینی کرێکاریش توشی گۆڕانێکی بنەڕەتی بکرێت بەڵام نابێت ئەوە شاراوە بێت کە لەم حاڵەتەدا دیار نییە، کە ئەم گۆڕانە بنەڕەتیە بەلای چەپدا دەبێت یان بەلای راستدا. مەترسی توندی فاشیزم و فاشیزمی نوێ، هێشتا بەتەواوی لەناونەچووە.

من قسە لەئەگەری قەیرانێك دەکەم، باسی قەیرانێکی کۆتایی ئەم سیستەمەم کرد، ئەو هێزانەی یارمەتی پەیدابوونی ئەم قەیرانە دەدەن، خۆی پێویستی بەوتوێژی ورد و فراوانە، بەبڕوای من دەبێ ئەم قەیرانە بەپێگەیشتنی کۆمەڵێك مەیلی بابەتی و زیهنی جیا لەیەك بزانرێت کە ماهیەتێکی ئابوری، سیاسی و







ئەخلاقیان هەیە و هەم لەرۆژئاوا و هەم لەخۆرهەڵاتدا بوونیان هەیە. ئەم هێزانە هێشتا لەسەر بناغەی بەرگریکردن ڕێکنەخراون و هێشتا لەوڵاتە سەرمایەداریە پێشکەوتووەکاندا، جەماوەر پایەی ئەم هێزانە پێك ناهێنن. تەنانەت کەمایەتیەکانیش ئێستا لەویلایەتە یەکگرتوەکاندا، لەقۆناغی سەرەتایی بەسیاسیبووندان. لەناو هەلومەرجێکی واشدا من بیر دەکەمەوە ئەرکی یاخیبوون ئەوەیە کە هوشیاری تاکەکان لەدەرەوەی گروپی کۆمەڵایەتی ئێمە رووناکبکاتەوە، چونکە ژیانی تاك بەتاکی ئێمە لەمەترسیدایە و ئەمڕۆ هەموومان سەر بەشتێکین کە ڤێبلن ناوی ناوە "کۆمەڵەی پایە"، واتە هەموو ئەوانەین کە لەژێر دەسەڵاتدارێتیدایین. دەبێ هەمووان لەسیاسەتە ترسناکە سەربازیەکان کە هێز و فشارەکەی هاوکاتی مەترسی نەمانی تەواو دەچێتە پێشێ، هوشیار بکەینەوە. دەبێت بزانن کە هێزەکانی بەرهەمهێنان بۆ زیادکردنی بەهرە و قازانج بەکاردەهێنرێن و جیهانی بەناو ئازاد، بۆ بەرگریکردن لەبەرژەوەندیەکانی خۆی سود لەدیکتاتۆری سەربازی و پۆلیسی وەردەگرێ. ئەم سیاسەتە بەهیچ شێوەیەك تۆتالیتاریزمی جەمسەرەکەی تر ئاراستە ناکات (مەبەستی نوسەر یەکێتی سۆڤێتی جارانە — و.ك) تۆتالیتاریزمێك کە دەکرێ چەندان شت دژی بگوترێتو دەبێ بگوترێ. بەڵام ئەم تۆتالیتاریزمە هێشتا پەرەسەندوخواز و دەستدرێژیکەر نەبووە و هێشتا لەژێر دەسەڵاتی سستی و فەقیریدایە کە ئەمە نەڤ هەقیقەتی خەبات دژی ئەم توتالیتاریزمە ناکات، بەڵام خەبات لەگەڵ چەپدا.

ئێستا ئەو ئازادی هوشیاریەی باسمکرد، درێژتر لەباسێك دێتە پێشچاو. ماناکەی واتە خۆپیشاندان بەمانای ئەدەبی، لەهەلومەرجی ئێستاشدا هەر دەبێت ئەم مانایە بدات. هەموو تاکەکان دەبێت ئارەزووی خۆیان بۆ ژیان، واتە خواستی خۆیان بۆ ژیان لەناو دنیایەکی ئارام و مرۆڤانەدا، پیشانبدەن. سیستەمی هەبوو بەپێچەوانەی ئەم ئاراستەیەوە دەجولێتەوە. ئەگەر خاوەنداریێتی وێنای هەڵە، هەڵەبێت، ئەوا ئامۆژگاری و بانگهێشتکردن بۆ ئارامی و ئاسانگرتن، زیانبەخشە، چونکە تەنها سود بەهەڵسوڕێنەرانی ئەم سیستەمە دەگەێنێت. راستیەکەی ئەوەیە خۆمان لەبەرامبەر سیستەمێکدا دەبینین کە لەسەرەتای فاشیزمەوە، بەکارەکانی خۆی نەڤ پێشکەوتنی مێژوویکردووە، سیستەمێك کە دژایەتیە دەرونیەکانی خۆی لەجەنگی نامرۆڤانە و

ناپێویستدا دەردەخات.. سیستەمێك كە پەرەسەندنی بەرهەمهێنانی وەك پەرەسەندنی وێرانكاری و بێهودەیی دەركەوتووە. سیستەمێكی لەم چەشنە هەرگیز پارێزراو نییە و هەر ئێستا لەسەرتاسەری دنیادا، لەبەرامبەر یاخیبوونەكان و تەنانەت یاخیبوونی خوێندكاراندا، بەرگری لەخۆی دەكات. ئەگەر گۆڕانكاریەكیش نەبینین، ئەوا دەبێت هەر درێژە بەخەبات بدەین. ئەگەر بمانەوێت وەك مرۆڤ بژین، كاربكەین و خۆشحاڵ بین، دەبێ بەرگریبكەین، چیدی ناتوانین ژیانێكی شاد و باشمان بەئاراستەی تەبا و یەكگرتوو لەگەڵ سیستەمدا هەبێت.

## پرسیار و وەڵامەكان:

ئەگەر دەڵێن پرۆلیتاریای جیهانی سێهەم، گرنگترین ئەو هێزانەن كە دەتوانن ئیمپریالیزم لەناو ببەن، كەوابوو دەبێت ئەمە لەناو بونیادی تیۆرەكەتاندا دابنێن. بەڵام ئێوە ئەم كارەتان نەكرد و لەتیۆرەی "مرۆڤی تاك ڕەهەندا" ئاماژەتان بۆ نەبوونی بكەری شۆڕشگێڕ كردووە و لەقسەكانیشتاندا لەبارەی بزوتنەوەی خوێندكارانەوە، گوتت كە بناغەیەكیان لەناو جەماوەردا نییە. یاخیبوون دەبێت بناغەكەی خۆی لەسەر پرۆلیتاریای جیهانی سێهەم دابنێت؟

ماركۆز: ئەم پەیوەندیە ئێستا لەواقعی بابەتیدا دروستبووە. سەرەتا ئاماژە بۆ ئەوە دەكەم كە هیچشتێك "لەدەرەوەی سەرمایەداری" نییە، تەنانەت سیستەمە سۆشیالیست و كۆمۆنیستەكانیش لەیەك سیستەمی جیهانیدان كە پەیوەندیان بەسەرمایەداریەوە هەیە. كەوابوو چەمكی "دەرەوە" زۆر ڕێژەیی دەبێت. بزوتنەوە ئازادیخوازیە نیشتمانیەكانی جیهانی سێهەم، خۆبەخۆ خاوەن ئەو هێزە شۆڕشگێڕانە نین، كە بتوانن سیستەمی سەرمایەداری پێشكەوتوو لەناو ببەن. ئەم هێزە شۆڕشگێڕە تەنها دەتوانێت لەیەكێتی هێزەكانی گۆڕانكاری لەناوەندی سەرمایەداری پێشكەوتوو، و هێزەكانی جیهانی سێهەم پێكبێت. كارێكی لەمچەشنەش زۆر گرانە. دیارە ئەوە زۆر سادەیە گەر بڵێین یاخیبوونی ڕۆشنبیران دەبێت بناغەكانی خۆی لەسەر بەرەی ئازادیخوازە نیشتیمانیەكان دابنێت. دروستكردنی پەیوەندیەكی وا رووینەداوە و تەنانەت دەستیشی پێنەكردووە. ڕێگری زۆر لەبەردەم ئەمەدا هەیە، جگە لەدوری ماوە، جیاوازی زمان و كلتور و شتی تر لەمەسەلە سەرەكیەكان.





ئەمانە رەگەزی تازەن كە دەبێت هەم لەتیۆریدا و هەم لەپراكتیكدا، لەبەرچاو بگیرێن.

بەبڕوای من پەیدابوونی هێزێكی شۆڕشگێڕی كاریگەر، تەنها لەپێكهاتەی ڕوداوەكانی جیهانی سێهەم لەگەڵ هێزە تەقینەرەوەكانی ناوەندی دنیای پێشكەوتوو مومكینە.

یاخیبوونی خوێندكاران ئاگادارە لەوەی كە ڕاكێشانی پشتگیری خەڵكی لەوڵاتە سەرمایەداریە پێشكەوتوەكاندا تا چ ئەندازەیەك ئەستەمە. لە وتوێژكردن لەگەڵ كرێكاراندا زۆرجار ئەم وەڵامەیان وەرگرتۆتەوە كە "نازانم باسی چی دەكەیت — هەلومەرجی من لەئێستادا لەهەموو كاتێك باشترە" تیرۆرەكانی ڤێتنام چ گرنگیەكی بۆ ئەم كرێكارە هەیە؟ وتوێژی مرۆڤانە هیچ دەرئەنجامێكی نییە، چونكە مرۆڤایەتی خۆی تیرۆر دروستدەكات؟

ماركۆز: كاتێك كرێكارێك دەڵێت هەلومەرجی من لەهەموو كاتێك باشترە، لەحاڵەتێكدا قسەكەی ڕاستە كە بیر و ڕەفتاری لەهەلومەرجێكی ناشۆڕشگێڕانەدا، وەك هەلومەرجێكی شۆڕشگێڕانە نەبێت. ئەركی ئێوە ئەوەیە كە سەرنجی بۆ بەهایەك ڕابكێشن كە بۆ ژیانی دزێوانەی خۆی دەیدات — زەحمەتی بەردەوامی ژیانی خۆی و بەدبەختی كەسانی دی بۆ ڕوونبكەنەوە. دواجار دەبێت بڕوا بهێنین كە لەسەرمایەداریەكی پێشكەوتوودا ناكرێت هێزە شۆڕشگێڕەكان بەهۆی فەقیری و بەدبەختیەوە، چالاكبكرێن، بەڵكو دەبێت سود لەبەرزكردنەوەی چاوەڕوانیەكان، بۆ ئاستی ژیانێكی باشتر و هوشیاركردنی ویژدانی كرێكارانی خوێندەوار و خاوەن مەرجەكان وەربگیرێ: پێشڕەوانی چینێكی تازەی كرێكاران یان بەشێكی تازە لەچینی كرێكاری كۆن.

دژایەتیە دەرونیەكانی سەرمایەداری، هەنوكە گەیشتوون بەدڕندانەترین و هەمەكیترین شێوەكانی خۆیان و دەكرێت سود لەهوشیاری تازە وەك هۆكارێك بۆ بەهرەوەرگرتن و چارەسەركردنی ئەم دژایەتیانە وەربگیرێ. لەبارەی وتوێژی مرۆڤانەشەوە دەبێ بڵێم بەڕاستی نابێت بڕوامان بەوە بێت، كە وتوێژی مرۆڤانە بەجێگەیەك ناگەن. پرسیارێك لەهەمووتان دەكەم: ئەگەر من بناغەی مرۆڤایەتی لەباسەكانی خۆم بكەمە دەرێ، ئیدی لەسەر چ بناغەیەك دەتوانم دژی سیستەمی





سەرمایەداری قسەبکەم؟ ئەگەر ئێوە تەنها لەچوارچێوەی لۆژیکی تەکنیکیدا وتوێژ بکەن و هەر لەسەرەتاوە چەمکی مێژووی باڵادەستی پێشوو کە لەسەر بناغەی نەفیکردنی سیستەمی هەبوو دامەزراوە، بسڕنەوە، بەسەرنجدان لەوەی کە ئەم سیستەمە مرۆڤانە نییە و بیری مرۆڤانە پەیوەندی بەنەفیکردنی ئەم سیستەمەوە هەیە- هەمیشە خۆتان روبەڕووی کۆمەڵێك پرسیار دەبینن کە ناتوانن وەڵامیبدەنەوە. بۆ نموونە بەڕاستی ترسمان لەچ شتێکی ئەم سیستەمە هەبێت؟ سیستەمێك کە هەمیشە سامانی کۆمەڵایەتی زیاددەکات و کۆی چینەکانی خەڵکی کە پێشتر لەفەقیری و بەدبەختیدا غەرق بووبوون، دەکاتە خاوەن ئۆتۆمبیل، تەلەفزیۆن و خانوو؟ بەڕاستی چ شتێکی ئەم سیستەمە ئەوەندە خراپە کە نرخی سەرنگونکردنی هەبێت؟ ئەگەر تەنها بەباسی مادی وازبهێنن و سود لەلایەنەکانی تری باسەکان وەرنەگرن، سودێکی ئەوتۆ وەرناگرن. دواجار دەبێت لەهەقیقەتێك تێبگەین کە لەقۆناغی فاشیزمدا، کە ڕەنگە ئێوە هێشتا لەدایکیش نەبووبن، تێی نەگەیشتین: وتوێژە مرۆیی و ئەخلاقیەکان تەنها ئایدیۆلۆژیاگەلێکی هەڵخەڵەتێنەر نین، بەڵکو هێزگەلێکن کە دەتوانن و دەبێت هێزە ناوەندیەکانی کۆمەڵگا پێك بهێنن. ئەگەر هەر لەسەرەتاوە ئەم وتوێژانە بسڕینەوە، لەڕاستیدا خۆمان لەبەرامبەر بەهێزترین باسەکانی بەرگریکەر لەهەلومەرجی باودا چەککردووە.

گریمان لەویلایەتە یەکگرتووەکان یاخیبوونەکان بتوانن بەسەر بونیادی هێزە جێگیرەکاندا سەرکەون، هەستدەکەن کاری داهێنەری یاخیبوون کە دەسەڵاتی دەوڵەت دەگرێتە دەست خۆی، لەچیدا دەبێت؟

ماركۆز: مەبەستتان ئەوەیە چۆن دەکرێ لەهەلومەرجی گریمانکراودا، کۆمەڵگایەکی ئازاد دروستبکرێ؟ بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە، پێویستمان بەچەندان کاتژمێر هەیە، تەنها شتێك دەڵێم، نابێت وا بزانین سەرکەوتنی یاخیبوونی خوێندکاران، ئێمە بەجێگەیەك دەگەیێنێت کە بتوانین بیر لەدروستکردنی کۆمەڵگایەکی ئازاد بکەینەوە. ئەگەر یاخیبوونی خوێندکاران لەگۆشەگیریدا بمێنێتەوە و نەتوانێت لەقاڵبی خۆی بێتە دەرەوە، و ئەگەر نەتوانێت ئەو چینە کۆمەڵایەتیانەی کە بەهۆی پێگەیانەوە لەناو دیاردەی کۆمەڵایەتی بەرهەمهێناندا دەورێکی سەرەکیان لەشۆڕشدا هەیە، ناچار بەجوڵەبکات، لەم حاڵەتەدا یاخیبوونی







خوێندکاران تەنها دەورێکی لاوەکی بینیووە. دەکرێ یاخیبوونی خوێندکاران بەناوکی شۆڕشێك دابنرێت، بەڵام خۆ بەناوکێك بەتەنها شۆڕش ناکرێت. ئەمڕۆ یاخیبوونی خوێندکاران توانای جۆراوجۆری بۆ لەناوبردنی سنووردارێتی خود و گۆڕانی هەڵوێستی رۆشنبیران هەیە، رۆشنبیرانی "بۆرژوازی" لەهەلومەرجێکی بێ دەرئەنجامەوە بۆ Paroledhonneurێك. بەڵام مانای ئەمە ئەوەیە کە سنورەکانی خۆمان بەجۆرێك بشکێنین یان فراوانبکەین تا ئەو جێگەیەی کە ئەو هێزە جۆراوجۆرانە لەخۆبگرێت کە لەرووی مادی و کلتوریەوە، بەکەڵکی شۆڕشێك دێن.

هەوڵدەدەم بابەتی بم. ببورن گەر پرسیارەکەی ئێوەم بەمانای هێزی فکری پۆزەتیف وەرگرتووە، من هێشتا بڕوام بەهێزی نەفیکردن هەیە و هەستدەکەم هەمیشە زۆر زوو بەهێزی پۆزەتیف دەگەین.

لەوتارەکەمدا ڕێگاکانی خوێندکارانم پیشاندا. بەر لەهەر شتێك دەبێ بۆ ئەو کەسانەی دەپرسن کردنی ئەو پرسیارە کە چ شتێك لەم کۆمەڵگایەدا خراپە شیاو نیە، روونبکرێتەوە کە ئەم پرسیارە دڕندانە و نامرۆڤانەیە. دەبێ ناچار بکرێن کە روداوەکانی دەوروبەری خۆیان ببینن، ببیستن و هەستی پێبکەن و دەبێ هەستبکەن کە فەرمانڕەواکانیان بەرازیبوون و بێدەنگی خەڵکی، چ کارەساتگەلێك لەو وڵاتەنەدا دروستدەکەن کە لەژێر دەسەڵاتی کۆمەڵگای سەرمایەداریدان. هەنگاوی دوای بەپێی کۆمەڵگا یان ناوچە، جیاواز دەبێت. بەدەربڕینێکی تر ئەگەر ئێوە "دیموکراسی" ویلایەتە یەکگرتووەکانتان هەبێت، هەلومەرجتان جیاوازە لەوەی "دیموکراسی" بۆ نمونە بەرلینتان هەبێت. هەریەك لەم حاڵەتە پێویستی بەهەنگاوی تایبەتی خۆی هەیە. من کاتێك لەئەمەریکادا بەدروستکەری دەزانم، کە جەنگی ڤێتنام بەچوونە دەرەوەی هێزەکانی ئەمەریکا کۆتایی پێبێت، واتە یاخیبوون سەرکەوێت. بەڵام ئەم هەنگاوە لەگەڵ ئەوەشدا کە هەنگاوێکی زۆر پۆزەتیف و دروستکەرە، بەڵام لەکۆمەڵگایەکی سۆشیالیستیدا بەکەڵکی هیچ نایەت. کەوابوو دەبێت هەنگاو بەهەنگاو بچینە پێشێ. ئەگەر ئێوە لەویلایەتە یەکگرتووەکاندا بڵێن "ئامانجی ئێمە بەرپاکردنی سۆشیالیزم و نەهێشتنی موڵکایەتی تایبەتی و سودوەرگرتنە لێی لەکۆنتڕۆڵی دەستەجەمعی و بەرهەمهێناندا" خەڵکی رادەکەن لێت. مانای ئەم کارە ئەوە نییە کە سۆشیالیزم هەڵەدەکات، بەپێچەوانەوە، بەڵکو ماناکەی ئەوەیە ئێمە

نەمانتوانیوە پێویستی سۆشیالیزم لەهوشیاریاندا روونبکەینەوە و ئەگەر نەمانەوێت تەسلیمی بەربەریەت بین و لەناوبچین، دەبێ واقعیەت بدەین بەم فکرەیە.

چۆن دەکرێت لەچینی کرێکاردا تواناگەلێك بناسینەوە کە خۆیان هەست بەپێویستیان ناکەن، کە ناچار بین سەرەتا پێویستیان بۆ ئەم توانایانە بۆ روونبکەینەوە، شتێك کە پێدەچێت لەناو سیستەمی هەنوکەدا، مومکین نەبێت؟ جگە لەمەش پێدەچێت خەڵکی سودیان لەو رەخنەیەی خۆتان لەبارەی تەحەمولکردنی هاوکاتی سەرکوتکردن وەرگرتبێت، و دەڵێن هەموو جۆرە تەحەمولێك، سەرکوتکەرە، بەشێوەیەك کە هەنوکە تەنانەت نەیاریتی لەگەڵ دەرئەنجامەکانی تێڕوانینەکانی خودی ئێوەدا لەناوچووە؟

مارکۆز: لەبارەی ناسینی تواناکانەوە، ناکرێ تەسەوری ئەوە بکرێت چۆن دەکرێت سیستەمێکی وا بەهێز و یەکپارچە، سەرنگونبکرێت، چونکە بچوکترین جوڵەکان بەهەموو هێزی خۆی تێکدەشکێنێ. ئەگەر وابوایە، کەوابوو ئەمە یەکەم سیستەمی کۆمەڵایەتی دەبوو کە لەمێژوودا بەنەمری دەمایەوە. من بڕواموایە کە درزەکانی ئەمڕۆ بەپێی پێویست قوڵن. دژایەتیە دەرونیەکانی ئەم سیستەمە توندترە لەهەر کاتێکی تر: یەکەم دژایەتی نێوان سامانی سەرسوڕهێنەری کۆمەڵایەتی لەلایەك و سودوەرگرتنی وێرانکەرانە و سەرکوتکەرانە لێی لەلایەکی دیەوە. دوهەم ئارەزووی ئۆتۆماتیکی بوون کە ئەگەر سەرمایەداری بیەوێت بەرهەمهێنانی پەرەپێبدات، دەبێت ئەم ئارەزووەی هەبێت. ئۆتۆماتیکیبوون بەئاراستەی سڕینەوەی هێزی کاری جەستەیی لەدیاردەی بەرهەمهێنان، دەچێتە پێشێ، ئەمەش بەبڕوای مارکس لەگەڵ مانەوەی سەرمایەداریدا لەئایندەی دوردا، گونجاو نییە. کەوابوو ناتوانرێ باسی پارێزگاریبوونی ئەم سیستەمە بکرێت.

هیوادارم وتارەکەم لەبارەی تەحەمولکردنەوە، ئەو بەدحاڵیبوونە دروستنەکات کە من رەتی هەموو جۆرە تەحەمولکردنێك دەکەمەوە. ئەمە بەبڕوای من زۆر ساویلکانەیە و نازانم چۆن ئەم تەفسیرە هاتۆتە ئاراوە. مەبەستم ئەوەبوو لەو بزوتنەوانەی کە سەرەڕای کردار، پڕوپاگەندە و هەراوهوریای زۆر ئەنجامدەدەن، بەئیحتیمالی زۆر دەکرێ بگوترێت کە دەبێتە هۆی زیادبوونی سەرکوتکردن و وێرانکردن. نابێت ئەم بزوتنەوانە لەچوارچێوەی دیموکراسیدا تەحەمولبکرێت.







سەرنج لەنمونەیەکی کلاسیکی بدەن: من بڕواموایە گەر لەکۆماری ڤایماردا یەکەم بزوتنەوەی نازیەکانیان کە تازە خەسڵەتەکانیان پیشاندەدا، تەحەمولنەکردایە و ئەگەر ئەم بزوتنەوەیە سودی لەبەهرەکانی ئەو دیموکراسیە وەرنەگرتایە، رەنگە ئەمڕۆ کارەساتەکانی جەنگی جیهانی دوهەم و کارەساتەکانی تری ئەم بزوتنەوەیە دروستنەبوایە. پێوەرێك لەکەناردا هەیە کە دەتوانین بڵێین: ئەگەر بمانەوێت ژیانی مرۆڤ بەپێشکەوتن و ئارامی ئارایشتبکەین، دەبێت تەحەمولی هەندێك بزوتنەوە نەکەین. ئەوەی بڵێن من تەحەمول بەهەموو شێوەیەك مەحکومدەکەم، بابەتێکە کە ناتوانم لێی تێبگەم.

لەبارەی پرسیاری یەکەمەوە: ئێمە ئەمڕۆ خۆمان لەهەلومەرجێکدا دەبینین کە زەرورەتی بابەتی گۆڕانکاری ئاشکرایە، بەڵام ئەو چین و گروپانەی دەبێت ئەم گۆڕانکاریە بەدی بێنن، پێویستیان بەم گۆڕانکاریە نییە. سەرەتا دەبێت میکانیزمێك کە ئەم پێویستیە لەناودەبات بسڕێتەوە کە ئەمەش خۆی پێویستی بەسڕینەوەی ئەم میکانیزمە هەیە. ئەمە دیالەکتیکێکە کە هیچ ڕێگەیەکی نییە.

ئایا هەستدەکەن چینی کرێکاری ئەوروپا دەتوانێت دەورێکی لەم گۆڕانکاریەدا هەبێت؟ یان ئێمە لەهەلومەرجێکداین کە شۆڕشی داهاتوو، شۆڕشێکی پرۆلیتاری نابێت و شۆڕشێکی مرۆڤانە دەبێت کە تیایدا بەهۆی سەندنەوەی دەسەڵات لەچینی سەرمایەدار، دەبێ کۆی بەزەبر بەشۆڕشگێڕ بزانرێت؟

مارکۆز: نەریتی سیاسی کرێکاری ئەوروپا کە هێشتا لەهەندێك وڵاتی ئەوروپیدا هەیە، سەردەمێك لەئەمەریکاشدا هەبوو، بەڵام هەنوکە لەناوچووە. بەڵام بێ لەبەرچاوگرتنی چەمکی ئاڵۆزی نەریتی سیاسی، وەڵامەکەی ئێوە پەیوەندی بەپرسیارێکی دیەوە هەیە کە ئەویش ئەوەیە: ئایا ئەو ئارەزوانەی لەویلایەتە یەکگرتووەکاندا باڵادەستبوون، لەئەوروپاشدا دەتوانن دۆخێکی لەمچەشنە وەربگرن، بەشێوەیەك کە ئەو ئارەزووە نەیارانەی بناغەیان لەسەر نەریتی سیاسی چینی کرێکاری ئەوروپا دامەزراوە، لەبەرامبەر ئەم ئارەزووە تازانەدا لەناوبچن یان نا. ئەمە پەیوەندی بەو کاتەوە هەیە کە چالاکی سیاسی دەستپێدەکات. ئەگەر لەدواجاردا قۆناغی ئەمریکاییبوون دەستپێبکات، ڕەنگە نەکرێ وێنای ئەمجۆرە دەورە شۆڕشگێڕیە بۆ چینی کرێکاری ئەوروپا بکرێت. بەڵام ئەگەر دۆخێك دەستپێبکات کە

ئەم ئارەزوانە هێشتا باڵادەست نەبووبن، بەشێوەیەك کە قۆناغەکانی گەشەکردنی سەرمایەداری ئەوروپا، وەك ئێستا بەتەواوی لەگەڵ قۆناغەکانی گەشەکردنی سەرمایەداری ئەمەریکادا جیاواز بێت، شانسێکی زیاتری دەبێت. ئایا ئابوری سەرمایەداری ئەوروپا بەتەواوی ڕێگەی ئابوری سەرمایەداری ئەمەریکا دەگرێتە بەر؟ ئایا نفوزی ئابوری ئەمەریکا لەئەوروپادا بەردەوام دەبێت یان لەخاڵێکدا رادەوەستێت؟

ئێوە باسی دواهەمین قەیرانی سەرمایەداریتان کرد کە هەم دەبێت هیواداربین رووبدات و هەم دەبێت لێی بترسین — چونکە ڕەنگە کرێکاران بەرەو فاشیزم راکێشێت. من هەستدەکەم فاشیزم دروست نابێت، چونکە پەیدا بوونی فاشیزم لە١٩٣٣دا پەیوەندی بەکۆمەڵگایەکەوە هەبوو کە وەك ئەمڕۆ چونیەك نەبووەو لەنوسینەکانیەوە کاریگەری دەکرایە سەر. لەلایەکیدیەوە پەرەسەندنی دوایی سەرمایەداری بەتایبەتی وەك درێژەی قوتابخانەی کینز پیشانیدەدات، تەنانەت گەر ئۆتۆماتیکی بوون لەبەرچاو بگرین، تیۆرەی کلاسیکی ئیمپریالیزم دامەزراوە. ئەم تیۆرەیە و هیواکانی، ئەمڕۆ گومانلێکراو دێنە پێشچاو. بەڵام ئایا دەزگاکان نەك جەماوەر، دژی ئێمە نین؟ ئایا هێزە ئینسانیەکان، لایەنگری ئێمە نابن؟

مارکۆز: هەموو تاکەکان بەزەبر لایەنگری ئێمەن. بەڵام ئایا دەتوانین سود لەم توانایە وەربگرین؟ فاشیزمی نوێ گەر دروستبێت، بەتەواوی جیاواز دەبێت لەگەڵ فاشیزمی کۆندا. مێژوو وا بەئاسانی دوبارە نابێتەوە. کاتێك بۆ نمونە باسی فاشیزم لەئەمەریکادا دەکەم، مەبەستم ئەوەیە، ئازادیە سیاسی و مەدەنیەکان ئەوەندە کەمدەکرێنەوە کە دواجار ڕۆژێك کۆنگرێس یاساگەلێکی سەرکوتکەرانە دادەڕێژێ کە دەسەڵاتێکی تەنفیزی زۆری دەبێت. واتە پێویستناکات بناغەی جەماوەری، لەتاکەکان پێکبێت کە بڕژێنە ناو شەقامەکانەوە و لەیەکدی بدەن، بەڵکو ڕەنگە خەڵکی هێواش هێواش بەتوانا دیموکراسیە هەبووەکان قانع بن، لەئەنجامیشدا دەسەڵاتی یاخیبوون کەمبێتەوە.

هەمیشە لەبەر ئەم بەدبینیە ترسناکەی کە هەمە، سەرزەنشتمدەکەن. بەڵام دەبێ بڵێم پاش قسەکەی ئێوە من خۆم بەخۆشبینێکی نامولتەزیم دەبینم کە چەندان ماوەیە لەواقع دورکەوتۆتەوە. من هەرگیز ناتوانم وێنای ئەوە بکەم کە







تەنانەت باشترین سەرمایەداریەکانیش، بتوانێت تا هەمیشە بەنەمری بمێنێتەوە. ئەو رەخنەیەی ئێوە لەئۆتۆماتیکی بونتان گرت، تەنها لەکاتێکدا راستە کە ئێوە ئۆتۆماتیکی بوون بەجیا لەهۆکارە کۆمەڵایەتیەکانی تر کە دەیگۆڕێت بەهێزێکی شۆڕشگێڕانە، لەبەرچاو بگریت: بۆ نمونە یەکەم: روون بونەوەی هوشیاریەکان، دوهەم: فێرکردن، بەتایبەتی "چینی کرێکاری تازە"، سێهەم: دارمانی دەرونی — ئەخلاقی (ئەمەش بەڵگەیەکی ترە بۆ ئەوەی کە بۆچی من بڕوامویە ئەخلاقیات ئیدی تەنها ئایدۆلۆژیایەك نییە) و چوارەم شتێك کە تا ئێستا قسەمان لەبارەیەوە نەکردووە کە ئەویش بوونی دنیایەکی ترە، واتە بلۆکی سۆڤیەت کە هەر ساتێك رکەبەرایەتی ئابوری خۆی لەگەڵ سەرمایەداریدا چڕتر دەکات. دەبێت ئەم پێویستیانە لەبەرچاو بگرین.

ئایا پێویست ناکات نەفیەکانی سیستەمی جێگیر، ئەناتۆمی بکەین؟ ئەگەر واش نەکەین ئایا ئێمە لەکەمایەتیدا نامێنینەوە لەکاتێکدا کە زۆرینە بەلەدەستدانی سیستەمی هەبوو، زۆر شت لەدەستدەدەن؟ تا چ ئاستێك دەبێت تەحەمولی ریفۆرمیستەکان و پیاچونەوە خوازان بکەین؟ ئایا سۆشیال دیموکراسی لەگۆڕانکاریدا دەورێکی پۆزەتیڤی هەیە؟

مارکۆز: لەبارەی ڕێگەچارەسەری بابەتیەوە، نازانم لەبەرلیندا چۆن دەشێت کارێکی وا ئەنجامبدرێت، چونکە ماوەیەکی کورت لێرە بووم. ئەگەر لەئەمەریکادا ئەم پرسیارەم لێکرایە بەقوتابیەکانم دەگووت: دەبێ دۆخێك دروستبکرێ کە ئیدی ئێوە ناچار نەبن کوڕەکانتان بۆ ڤێتنام بنێرن بۆ ئەوەی بکوژرێن، دەبێ کۆمەڵگایەك دروستبکرێ کە تیایدا چیدی لەگەڵ ڕەشەکان و پۆرتریکەکاندا وەك کەسانی چینی دوهەم رەفتار نەکرێت (ئەمڕۆ زۆۆرجار ئەوانە بەمرۆڤ دانانێن) و کۆمەڵگایەك کە تیایدا هەمووان نەك تەنها کوڕانی کەسانی دەوڵەمەند، بتوانن خاوەنی پەروەردەیەکی دروستبن. ئێمە دەتوانین بۆ دروستکردنی دۆخێکی وا، هەنگاوی ئارام بنێین. ڕەنگە ئەمە بەهەنگاوێکی پۆزەتیڤ نەزانن، بەڵام من بڕوامویە ئەمە بەڕاستی هەنگاوێکی پۆزەتیڤە و ئەم هەنگاوەش بەتایبەتی بۆ ئەو کەسانەی لەجەنگی ڤێتنام نارەحەتن، سودبەخشە.

من بڕوامویە نابێت کۆمەڵگای سۆڤیەت لەگەڵ کۆمەڵگای سەرمایەداری

پێشکەوتوودا، لەژێر ناوی "کۆمەڵگای پیشەسازی پێشکەوتوو" لەئاستێکدا دابنرێ و ئەم چەمکە لەبارەی بنەما سەرەکیەکانی ئەم دوو کۆمەڵگایەوە، دادپەروەرانە نییە. لەگەڵ ئەوەشدا جۆرێك هاوکاری لەنێوان یەکێتی سۆڤیەت و ویلایەتە یەکگرتووەکاندا هەیە کە دەکەوێتە سەرو واقعیەتی سیاسیەوە (ریال پۆلیتیك). پێدەچێ بەتەواوی پەیوەندی بەتیۆرەیەکی نامارکسیەوە هەبێت. ئەم تیۆریە بڕوایوایە هاوبەشی بەرژەوەندیەکان لەنێوان گەلە دەوڵەمەندەکاندا لەبەرامبەر گەلەفەقیرەکاندا هەیە، کە جیاوازی نێوان کۆمەڵگای سەرمایەداری و سۆشیالیزمی لەناوبردووە و هەردوکیان دەگرێتەوە.

لەئەمەریکادا ئەگەرپێشنیاری سۆشیالیزم وەك ڕێگەچارەیەك بکەن، وەڵام وەردەگرنەوە کە: "ئەگەر ڕێگەچارەی ئێوە ئەمەیە، کەوابوو هیچمان ناوێت. هەرچیەك ئێوە لەبارەی سیستەمی جێگیرەوە بیڵێن، بەڵام بارودۆخی ئێمە لەبارودۆخی خەڵکی یەکێتی سۆڤیەت و وڵاتە سۆشیالیستەکانی تر، باشترە". پاشان ئەستەمە تێیان بگەیێنیت ئەوەی لەیەکێتی سۆڤیەت و وڵاتەکانی دیدا روودەدات، بەڕاستی سۆشیالیزم نییە.

بەڕاستی وتوێژکردن لەگەڵ خەڵکێکی زۆردا، بێ سودە. قسەکردن لەگەڵ ئەمانەدا تەنها کات و وزە بەفیڕۆدانە. ئەمە مانای ئەوە نییە کە تەحەمولی ئەمانە نەکەین یان هێرشبەربین، بەڵکو ماناکەی ئەوەیە نابێت وتوێژ لەگەڵ ئەمانەدا بکرێت. ئەمە بەڕاستی شتێك نییە تەحەمول نەکرێت، چونکە ئاشکرایە لەم وتوێژەدا بەهیچ شتێك ناگەین.

ئێمە دەبێت کات و هێزی خۆمان بۆ ئەو چینانە بەکاربهێنین کە گوێ لەقسەکانمان دەگرن و هێشتا توانای بیرکردنەوەیان هەیە. کاری راستەقینەی خوێندکاران لێرەدا مومکینە، بەڵام بەبەرنامە: چونکە شێوازی تەلقینکردن، ئیدی سودی نییە.

لەبارەی پیاچونەوەخوازی کە لەپرسیاری پێشوودا باسکرا: پیاچونەوەخوازان کەسانێکن کە بیردەکەنەوە هاوکات لەگەڵ پاراستنی دەزگا هەبووەکاندا، دەتوانن کۆمەڵگا بگۆڕن. لەکاتێکدا زۆرێك لەخوێندکاران بڕوایان بەنەیارێتی دژی دەزگایی و سەر و پەرلەمانی هەیە.







مارکۆز: پێویستە لەجیاوازییە گرنگەکان تێبگەین: ڕێگەمبدەن شتێکی شەخسی بڵێم. ئەگەر مەبەستان پیاچونەوەخوازی حیزبی سۆشیال دیموکراتی ئەڵمانیایە، دەبێ بڵێم من لەسەرەتای خوێندنی سیاسیمەوە واتە لە١٩١٩وە، نەیاری ئەم حیزبەبووم. من لە١٩١٧ وە تا ١٩١٨ ئەندامی حیزبی سۆشیال دیموکرات بووم، بەڵام پاش کوشتنی رۆزا لۆکسۆمبرگ و کارل لایبنیخت، دەستم لەکار کێشایەوە و رەخنەم لەسیاسەتەکانی ئەم حیزبە گرتووە. نەك لەبەرئەوەی کە بڕواموایە لەچوارچێوەی سیستەمی هەنوکەدا ناتوانرێ کار بکرێت — چونکە ئێمەش هەر ئەو کارە دەکەین و بۆ دروستکردنی گۆڕانکاری لەناوەوە، سود لەبچوکترین تواناکانی سیستەم وەردەگرین — هۆی نەیارێتی من لەگەڵ حیزبی سۆشیال دیموکراتدا، ئەمە نەبوو. هۆکەی ئەوەبوو کە ئەم حیزبە هاوکاری کۆمەڵێ هێزی وێرانکەر و سەرکوتکەر دەکات.

لەساڵی ١٩١٨وە هەمیشە باسی هێزە چەپەکان لەحیزبی سۆشیال دیموکراتدا کراوە، بەڵام دەبینین کە ئەم چەپانە زیاتر و زیاتر نزیك دەبنەوە، تا ئەو جێگەیەی ئیدی هیچ شتێك لەچەپیان تیا نامێنێت، لەبەرئەوە دەبینین کە لایەنیکەم هەندێك کارە سەرەکیەکانی حیزب، ناتوانن بڕوا بەمن بهێنن.

ئایا گۆڕانکاریە کۆمەڵایەتیە سەرەکیەکان، وەك گۆڕانی بارودۆخی یەکێتی سۆڤیەت لەسەردەمی ستالینەوە بۆ بارودۆخی ئێستا، ناکرێن بەدەرئەنجامی ناچاری سیستەمەکە بزانرێت و ئایا ئەگەر جەنگی ڤێتنام کۆتایی پێبێت، ناکرێ ئەوەش بەبەدیهیات بزانرێ؟ ئایا دەکرێ مەسەلەی توندوتیژی تەنها بەمەسەلەیەکی تاکتیکی نەزانرێ و بگەڕێنرێتەوە بۆ بنەما ستراتیژی و مرۆییەکان؟ و ئایا ئایدیا پێشکەوتوخوازەکانی وەك لینینیزم مومکینە لابدەن (ئینحراف بکەن)؟

مارکۆز: لەوتارەکەمدا جەختم لەوەکرد کە لەبەرگریکردن و هێرشکردندا، توندوتیژی جیاواز بەکار دەهێنرێت. بۆ نمونە توندوتیژی پۆلیسی کە نیشانە لەتاوانبارێك دەگرێتەوە، چ لەرووی دەرەکی و چ لەرووی بونیادی غەریزیەوە، لەبنەڕەتەوە جیاوازە لەگەڵ ئەو توندوتیژیە پۆلیسیەی کە بەکێبڵ لەخۆپیشاندەرێك دەدات. هەردووکیان توندوتیژین، بەڵام کاری تەواو جیاوازیان هەیە.

هەموو ئەو شتانەی لێرەدا لەبارەی تاکەوە راستە، لەبارەی کۆمەڵگا و هێزیشەوە

راستە. بۆ نمونە توندوتیژی تیرۆری شۆڕشگێڕانە لەتیرۆری سپی پێستەکان بەتەواوی جیایە، چونکە تیرۆری شۆڕشگێڕانە لەرێگەی خولقاندنی کۆمەڵگایەکی ئازادا خۆی لەناو دەبات، لەکاتێکدا تیرۆری سپی پێستەکان وا نییە — تیرۆرێك کە لەبەرگریکردن لەڤێتنامی باکوریدا هەیە، لەبنەڕەتەوە جیاوازە لەو تیرۆرەی کە لەهێرشکردندا هەیە.

ئەوەی چۆن ڕێگە لەتیرۆری شۆڕشگێڕانە بگیرێت، بۆ ئەوەی نەبێت بەدڵڕەقی و درندەیی، ئەمە خۆی مەسەلەیەکی ترە. لەشۆڕشێکی راستەقینەدا هەمیشە رێگایەك بۆ ئەمکارە هەیە. لەسەرەتای شۆڕشی بەلشەفیەکاندا هیچ درندەییەك یان دڵڕەقیەك نەبووە، و ئەو تیرۆرەی دەکرا لەسنوری بەرگریکردن لەبەرامبەر هێزە هەبووەکاندا، تێنەدەپەری. کاتێك لەشۆڕشێکدا ئەمجۆرە تیرۆرە لەکرداردا دەبێت بەدڵڕەقی، درندەیی و ئەشکەنجەکردن، ئەوا ئەو کاتەیە کە شۆڕش لەرێگەی خۆی لایداوە.

## چەند پرسیارێکم هەیە:

یەکەم: ئایا نابێت سود لەو هەلانە وەربگرین کە دێنەپێشێ و پەیوەندی بەرێکخراوە هەبوەکانەوە بکەین، بەشێوەیەك بتوانین هوشیاری چینەکانی خوارەوەی ئەم رێکخراوانە، هوشیاربکەینەوە؟

دوهەم: لەبارەی هەقانیەتی بەرگریکردنەوە، لەوتارەکەتاندا لەبارەی تەحەمولکردنەوە، ئەمەتان بەتایبەتی ناوهێنا و لەکەوانەدا داتاننا، لەکاتێکدا ئێستا وەك بنەمایەکی دێرین باسیدەکەن. ئەم هەقانیەتە لەسەر چ بناغەیەکە؟ ئایا یادگاریەکی رۆمانسیە لەیاسا سروشتیەکان و یان لەسەر خۆی راوەستاوە و لەمحالەتەدا چۆن یاخیبوون دەتوانێت مافێك چالاکبکات کە سەرەتا دەبێت خۆی دروستیبکات؟

سێهەم: ئەوە سیاسەتە کە دەبێت رونکردنەوەی بیرەکان و روناککردنەوەی ویژدانەکان، لەرێگەی خۆپیشاندان و وتوێژەوە ئەنجامبدات. بەڵام چۆن دەکرێت یاخیبوونی ناچەکدارانە رێکبخرێت و بەو هەوڵەی کە بیرۆکراسی بۆ لەناوبردنی کاری جەستەیی ئەنجامیدەدات، چۆن دەکرێت نەرمیەك کە ئاشکرایە، بەکاربهێنرێ. یاخیبوونی ئێمە لەبنەڕەتدا بۆ پارێزگاریکردن لەمافە هەبووەکان دروستبووە، ئەو





مافانەی هەمیشە بەهۆی توندوتیژی دەوڵەت و دەستێوەردانەکانیەوە، دەستدرێژی دەکرێتە سەر. ڕەنگە ئێمە لەبری سودوەرگرتن لە"ماف بەرگریکردن"، خەریکە یاساکانی ئاستی خوارەوە دەکەینە قوربانی بەرگریکردن لەدەستوری سەرەکی. سەرەڕای ئەمە، ئەو بەڵگانەی دژی بنەماکانی نەرمین، ناکۆکن لەگەڵ ئەو هۆکارە مرۆییانەی کە گونجاون لەگەڵیدا.

مارکۆز: من بەکورتی وەڵامی پرسیارەکانی ئێوە دەدەمەوە.

ئەو دژایەتیەی باستانکرد، تەنها لەبەدحاڵیبوونێکەوە دێت. من نەمگوتووە سود لەنەرمی وەك بنەمایەکی ستراتیژی وەربگیرێ و ئامۆژگاریبکەین. من بە هیچشێوەیەك مرۆڤایەتی و نەرمیم بەهاوتا وەرنەگرتووە. بەپێچەوانەوە، من قسە لەهەلومەرجگەلێك دەکەم کە تیایدا مرۆڤایەتی بەتوندوتیژی کۆتاییدێت:

ئایا هەلومەرجێك هەیە کە تیایدا بکرێ لەگەڵ حیزبە هەبووەکاندا، گۆڕانکاری سیاسی ئەنجامبدرێ یان نا؟ ئەگەر پرسیارەکەی ئێوە بەمشێوەیە بکرێت، دەمگووت بەڵێ.

ئەمە بەڕاستی پرسیارێکی پراکتیکیە. ئەگەر لەهەڵسەنگاندنی بارودۆخی هەبوودا، بەئەزموون بەوە گەیشتن کە گروپ و رێکخراوی ناوچەیی هەن گوێ لەقسەکانتان دەگرن و دەیانەوێت ئەمکارە بکەن، کەوابوو دەبێت کاریان لەگەڵدا بکرێت. من تەنها گوتم ئەزمونەکانی من دەریدەخەن، مومکین نییە حیزبە سەرەکیە هەنوکەییەکان بتوانن گۆڕانێك ئەنجامبدەن و بەدبینی من لەمبارەیەوە هێشتا بەئەندازەی چل ساڵ پێشووە.

سەبارەت بەپرسیارەکەتان لەبارەی هەقانیەتی بەرگریەوە: ئەوەی لەوتارەکەمدا لەبارەی تەحەمولەوە، لەکەوانەدا هێنامەوە، تەنها لەبەر ئەوەبوو کە دەریبخەم زاراوەیەکی کۆنی تیورەی سیاسیە.

پرسیارەکەتان لەبارەی ئەوەوە کە ئایا ئەوانەی سود لەماف بەرگریکردن بۆ بەرژەوەندی خۆیان وەردەگرن، خۆیان بنەمایەك دروستناکەن کە لەسەر بناغەکەی لەبەرامبەر یاسا پۆزەتیڤەکاندا، بەرگریبکەن، مەسەلەیەکی زۆر سەرنجراکێشەرتان هێنایە ئاراوە. واتە ئایا ئەو جازبیەت و راکێشانەی لەماف بەرگریکردندا هەیە، ڕێژەیی نییە، و تەنها وەك بەرژەوەندی تایبەتی گروپێکی تایبەت، دەرناکەوێت؟





دەبێ ئاماژە بۆ ئەوە بکەم لەرووی مێژووییەوە، چەمکی بەرگریکردن ئەمە نییە. تیۆرەی هەڤانیەتی بەرگریکردن بەردەوام بڕوای بەوەبووە، جازبیەت و راکێشانی ئەم مافە بەرەو یاسای بالاتره کە نرخێکی جیهانی هەیە، واتە لەسنوری مافە فەردیەکان و بەرژەوەندی گروپێکی تایبەت، تێدەپەڕێ. بەلام بەڕاستی پەیوەندیەك لەنێوان مافی بەرگریکردن و یاسای سروشتیدا هەیە. ئێوە دەڵێن هەنوکە یاسایەکی جیهانی بالاتر نییە. من بڕواموایە کە هەیە. ئەمڕۆ ئیدی بەیاسای سروشتی ناوی نابەین، بەلام بڕواموایە گەر بڵێین ئەو شتەی رەوایەتی بەبەرگریکردنی ئێمە لەبەرامبەر سیستەمی هەبوودا دەدات، بەر لەبەرژەوەندی ڕێژەیی گروپێکی تایبەت و بەر لەشتێك کە خۆمان وەسفمان کردووە، دەتوانین پیشانیبدەین. ئەگەر قسە لەجازبیەت و راکێشانی مافی مرۆڤایەتی بۆ ئاشتی، مافی مرۆڤایەتی بۆ تاوانبارکردنی بەهرەوەرگرتن و گەڕان بەدوای قازانجدا دەکەین، تەنها لەسنوری بەرژەوەندی گروپێکی تایبەتدا قسەناکەین، بەڵکو باسی بەرژەوەندیگەلێك دەکەین کە وەك مافی جیهانین. لەبەر ئەمەیە ئەمڕۆ دەتوانین و دەبێت نرخ بۆ مافی بەرگریکردن زیاد لەمافێکی ڕێژەیی دابنێین.

سەبارەت بەوەش کە تەحەمول لەهەندێك هەلومەرجی تایبەتدا دەبێت بگۆڕێت بۆ هەندێك کرداری تایبەتی، ئەوا من بەتەواوی لەگەڵتا هاوڕام. لەوتارەکەمدا گوتم ماوەیەیەکی زۆرە لەبارودۆخێکداین کە وتوێژەکان دەبێتە هۆی خۆپیشاندان و کاری دیکە. بە بێئەوەی سەرنج لەنەرمی خۆپیشاندانەکانمان بدەین، دەبێ چاوەڕێبکەین کە خۆپیشاندانەکانمان ڕوبەڕوی توندوتیژی بونیادی ببنەوە. ناتوانین خۆمان بەو بیرە هەڵخەڵەتێنین کە لەبەرئەوەی خۆپیشاندانەکانمان ئارام و نەرمن، کەوابوو یاساین و هیچ روداوێکی خراپ روونادات. لەم ڕوانگەیەوە هیچ ڕێکخراوێکی گشتی بۆ "نەرمی مادی ئاشکرا" نییە، ئێمە دەبێت هەمیشە چاوەڕێی ئەوە بین کە سیستەمی جێگیر سود لەو توندوتیژیە بونیادیەی کە لەژێر دەستیدایە، دژی ئێمە وەربگرێ. هیچ پێویست ناکات ئێمە خۆپیشاندانێك بدۆزینەوە کە پێکدادانێکی وا توندوتیژ دروستناکات، چونکە لەحاڵی حازردا ئێمە ناچارین کە شکست بێنین. ئەگەر دروست گوێم لێ بووبێت، خۆپیشاندانێکی لەمچەشنە لەبەرلین ئەنجامدەدرێت و تاقیدەکرێنەوە. خۆتان دەزانن کە چی دەڵێم و پێویست ناکات زیاتر لەمبارەیەوە





قسەبکەم.

شتێك بەبڕوای من ترسناکە. ئێوە راستدەکەن کە بەڕاستی ئێمە بەرگری لەیاسا پۆزەتیڤە هەبووەکان دەکەین. ئەگەر لەدیموکراسیەکدا ئێمە بەرگری لەئازادیە مەدەنیەکان بکەین، لەڕاستیدا بەرگریمان لەیاساکانی سیستەمی هەبوو کردووە، بەلام بەداخەوە ئەمە زۆر سادەیە. بۆ نمونە پۆلیس و حوکمەکانیش لەو یاسا پۆزەتیڤانەن. بەشێوەیەکی گشتی دەتوانین بڵێین ئێمەومانان بەرگری لەدیموکراسی دەکەین، بەلام ئەمە بە هیچشێوەیەك گۆڕانێك لەو هەقیقەتەدا ناکات کە لەهەمانکاتدا هوشیارین کە دەستدرێژی دەکەینە سەر یاسا پۆزەتیڤەکان و بڕواشمانوایە راستدەکەین.

چەند پرسیار و سەرنج لەبارەی مەسەلەبابەتیەکانەوە:

لەبارەی کرێکارانەوە – دەوری چینی کرێکاری ئەوروپا جیاوازە لەدەوری چینی کرێکاری ئەمەریکا، چونکە ناکرێ ململانێی کرێکاران بگوێزینەوە بۆ ململانێی کەمایەتیەکان، چونکە لێرەدا ململانێیەك نییە. مانای ئەم قسەیە ئەوەیە دەکرێت چینی کرێکار رادیکالیزە بکرێت. لەبارەی زانکۆکانەوە – لەروی هەلومەرجی مێژووییەوە هەنوکە لەقۆناغێکداین کە ئازادی بەدەستهاتوو،بەشێکە لەتەحەمولێك کە هاوکاتی سەرکوتکردنە. چونکە زۆر روونە ئەمڕۆ هەرکەس بیەوێت دەتوانێت کۆلێجەکان و دامەزراوەکانی زانکۆیەك بکڕێت. کەوابوو ئەرکی ئێمە ئەوەیە زانکۆیەکی رەخنەگرانە دروستبکەین کە وەك زانکۆیەکی نەیار  کاربکات و پیشانیبدات ئاستی تەحەمولی ئێمە بەجێگەیەك گەیشتووە کە بەکارهێنانی نابەجێی زانین بەمەبەستی تێرکردنی ئامانجە نامرۆڤانە و وێرانکارەکان، تاوانبار دەکەین. ئایا ئێوە لەبلاوکراوەکانی خۆتاندا، پێشنیارێك بۆ ناوەندێکی پشتگیری بۆ بەکارهێنانی نابەجێی زانست و زانین دەکەن؟

لەبارەی خوێندکاران و رادیکاڵەکان لەپۆستی کاردا – چۆن خوێندکاران بە هێزێکی شۆڕشگێڕ دادەنێن، لەکاتێکدا ئەوان زانکۆیان واز لێهێناوە و لەلێواری غەرقبوون لەناو ژیانێکی بۆرژوازیدان؟ ئەوە گرنگ نییە ئێستا ئەوان بەچ جۆرێك ڕێکخراون، ئێمە لەئەوروپادا هەوڵدەدەین ڕێکخراوێکی وا دروستبکەین، بەڵکو گرنگ ئەوەیە پاش ئەوەی شەهادەکانیان وەرگرت، چۆن ڕێکدەخرێن؟.





مارکۆز: بەڕاستی ئەمە یەکێك لەگرفت ئامێزترین پرسیارەکانە و لەئەمەریکاشدا زۆر لێرە کێشەئامێزترە. لێرە کەسێك دەتوانێت بێئەوەی شەهادەیەك وەربگرێت، چەندان ساڵ بخوێنێت و لەزانکۆیەکەوە بچێت بۆ زانکۆیەکی تر، بەڵام لەئەمەریکادا ئەمکارە مومکین نییە. لەبری ئەمە ئەو کەسە دەبێت هەوڵ بدات کارێك پەیدا بکات و بەمشێوەیەش ڕۆژە خۆشەکانی یاخیبوونی خوێندکاری، کۆتایی پێدێت. لێرەوە ئەمە زۆر گرنگە کە ئەو کەسانەی لەسەردەمی خوێندکاریاندا لەناو ریزی یاخیبووەکاندا بوون، هەروا بەیاخیبوو بهێڵینەوە. چۆن ئەم کارە ئەنجامدەدرێت؟ دەبێ لەجێگەی جیاواز و بەشێوەی جیاواز کاری لەسەر بکرێت. بەڵام بەتایبەت بەسەرنجدان لەو دەورە یەکجار گرنگەی ڕۆشنبیران لە دیاردەی کۆمەڵایەتی بەرهەمهێنانی ئایندەدا هەیانە، بەردەوامی ئەمجۆرە نەیارێتیە پاش ڕۆژەکانی خوێندن، زۆر گرنگە.

من جیاوازی نێوان چینی کرێکاری ئەوروپا و ئەمەریکام باسکرد. لەگەڵ ئێوەدام. ناتوانم بڵێم سەرمایەداری ئەمەریکا، دژایەتیەکانی خۆی بۆ کەمایەتیەکان گواستۆتەوە. ئەم بابەتە پەیوەندی بەبارودۆخی هەنوکەیی سەرمایەداریەوە نییە. لەماوەیەکی درێژدا ناکرێت دژایەتیەکانی سەرمایەداری بۆ کەمایەتیەکان بگوازرێتەوە.

لەلایەکەوە بەرگری لەمافە هەبووەکان و لەوانە ئازادی خوێندن دەکەین. ئێمە دەبێت زۆر جەخت لەم ئازادی خوێندنە بکەین کە یەکێك لەرەگەزەکانی مافی خوێندکارانە بۆ وتوێژ و خۆپیشاندان — وتوێژ و خۆپیشاندان لەهەموو شارەکەیاندا، نەك تەنها لەپۆلەکانیاندا. لایەنیکەم لەئەمەریکادا ئەم مافە دەناسن و ئەمەش بەبەشێك لەئازادی خوێندن دادەنێن.

بەڵام سودی نابەجێ لەئازادی خوێندنیش وەردەگیرێ: سودوەرگرتنی نارێك لەزانست بەمەبەستی لەناوبردن و وێرانکردن، بەتایبەتی بۆ مەبەستی سەربازی، ڤێتنام نمونەیەکی سەرنجڕاکێشەرە. لەئەمەریکادا ئەوە روونبۆتەوە کە ژمارەیەك لەزانکۆکان چیدی لەشێوەی دەزگایەکدا نین کە لەگەڵ دەوڵەت و پیشەسازیەکاندا بن و مادەی زیندوو و کیمیاییان بۆ ئامادەبکەن. بەڕاستی ژمارەیەکی کەمی خەڵك ئەمکارەیان ئەنجامدا کە بێ هیچ یارمەتیەك دانیشتن و بابەتەکەیان هێناو برد







پاشان گروپێکیان پێکهێنا. لەگەڵ ئەوەشدا کە زۆر گرانە، بەڵام خەڵکی خەریکە سودوەرگرتنی نابەجێ لەزانست دەسەلمێنن و ڕێگرتن لەم بەکارهێنانە نابەجێیەش، بەڕاستی کارێکی گرنگە.

تێبینی:

مارکۆز ئەم وتارەی لەکۆڕێکدا لەبەرلین پێشکەش کردووە و لەم کتێبەی خوارەوەدا بلاوکراوەتەوە:

هربرت مارکوز. پنج گفتار. ت: دکتر محمود جزایری. چاپخانه کاویان، تهران بهمن ماه ١٣٤٩.

## مۆدێرنە و ڕۆشنگەری

## زیهنی رۆشنگەر

### ئرنست کاسیرەر

دالامبێر نامەی "بنەماکانی فەلسەفە" بە دیاریکردنی وێنەیەکی گشتی بۆ زیهنی سەدەی هەژدەهەم دەست پێدەکات. لەسەرەتای ئەم وێنەیەدا دەڵێت لەژیانی عەقڵی سێ سەدەی رابردوودا، هەمیشە ئاستی ناوەڕاستی سەدە گەڕانەوەیەکی گرنگبووە. رینسانس لەناوەڕاستی سەدەی پانزەدا دەست پێدەکات، ریفۆرمی مەزهەبی لەناوەڕاستی سەدەی شانزەدا دەگاتە لوتکەی

خۆی، و لەناوەڕاستی سەدەی حەڤدەهەمدا فەلسەفەی دیکارت سەرکەوتن بەدەستدێنێت و کۆی وێنەی جیهان دەگۆڕێت. ئایا لەسەدەی هەژدەهەمیشدا دەکرێ بزوتنەوەی هاوشێوەی ئەوانە دیاریبکرێت؟ ئەگەر وابێت چۆن ئاراستەو ئارەزووە گشتیەکانی ئەم بزوتنەوەیە وەسفبکەین؟ دالامبێر بەدوای ئەم بیرکردنەوەیەدا دەڕوات و دەنوسێت:

"ئەگەر ئێمە زیهنی ئەو سەدەیەی تیای دەژین بە وردی تاوتوێبکەین، ئەگەر ئەو رووداوانەی کە دەمانهەژێنن یان لایەنیکەم هزرمان بەخۆیانەوە خەریکدەکەن، ئەگەر نەریتەکان و دەستکەوتەکان و تەنانەت سەرگەرمیەکانی ئێمە تاوتوێبکرێن، ئەستەمە لەو خاڵە غافڵبین خەریکە لەهەندێك رووەوە گۆڕانێکی گرنگ لەتێڕوانینی ئێمەدا روبدات. خێرایی ئەم گۆڕانەش پێشانیدەدات کە گۆڕانێکی گەورەتریشمان لەپێشە. تەنها تێپەڕینی زەمەن دەریدەخات کە ئامانج و ماهیەت و سنوری ئەم شۆڕشە چیە و ئایندەکان باشتر لەئێمە کەموکوڕی و باشیەکانی دەناسن.. لەبەرئەمە سەدەی ئێمەیان بە سەدەی فەلسەفە بەفۆنتی گەورە راگەیاندووە..ئەگەر دۆخی هەنوکەیی زانینی خۆمان بێ هیچ مەبەستێك لەبەرچاوبگرین، ناکرێ نکوڵی لەوەبکرێت فەلسەفە لەناو ئێمەدا زۆر پێشکەوتووە. زانستی سروشتی رۆژبەرۆژ دەوڵەمەندتر دەبێت، ئەندازیاریی سنورەکانی خۆی فراوانکردووە و مەشخەڵی خۆی بەنزیکترین ناوچەکان، واتە زانستی فیزیا گەیاندووە، سیستەمی هەقیقی جیهان ناسراوەو پەرەیسەندووە و گەشەیکردووە..بەکورتی لەزەویەوە تا زوحەل، لەمێژووی فەلەکەوە تا مێژووی جانەوەران، فەلسەفەی سروشت گۆڕاوەو کەمتازۆر هەموو بوارەکانی دی زانستیش شێوەیەکی تازەیان بە خۆیانەوە وەرگرتووە.

لێکۆڵینەوەی سروشت خۆبەخۆ کارێکی سارد و بێزارکەرە، چونکە ئەو خۆشنودیەی لێوەی بەدەستدێت هەستێکی یەك ریتم و بەردەوام و بێ وەستانە، و لەکاتێکدا لەزەتەکانی ئەو کاتە بەهێزە کە بەدوای یەکدا بێت و لەناکاوبێت..لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا کەشفکردن و بەکارهێنانی شێوازێکی تازە لەبیرکردنەوەی فەلسەفیدا، ئەو جۆرە هەست و شەوقەی کە هاوڕێی دۆزینەوەیەکی تازەیە، ئەو بڵندبونەوەی بیرکردنەوە کە لەبینینی دیمەنی







جیهانی بوون لەناوماندا دروستدەبێت، هەموو ئەمانە جۆش و خرۆشێکی تازەی بە هزرەکان بەخشیوە کە بەهەموو ئاراستەکاندا بڵاودەبێتەوە و وەك روبارێك کە بەنداوەکەی خۆی شکاندبێت، هەرچیەك لەسەر رێگای بێت دەشواتەوە و لەگەڵ خۆیدا دەیبات..بەمشێوەیە لەبنەماکانی زانستە دنیاییەکانەوە بیگرە تا بنەماکانی وەحی دینی، لەمیتافیزیکەوە تا بابەتە زەوقیەکان، لەمۆسیقاوە تا ئەخلاق، لەوتوێژی سکۆلاریانەی حەکیمە ئیلاهیەکانەوە تا پرسەکانی بازرگانی، لەمافی فەرمانڕەوایانەوە تا مافەکانی خەڵك، لەیاساکانی سروشتەوە تا یاسا دانراوەکانی نەتەوەکان..هەمووشتێك باسدەکرێت، شیدەکرێتەوە یان لایەنیکەم ناوی هاتۆتە ئاراوە. بەرهەم و دەرئەنجامی ئەم خرۆشە گشتیەی هزرەکان ئەوە بووە کە تیشکی تازە خراوەتە سەر کۆمەڵێك بابەت و کۆمەڵێکی بابەتی دیش سێبەری کەوتۆتە سەر. رێك وەك چۆن بەهۆی داکشان‌وهەڵکشانی دەریاوە هەندێك شت لەکەناردا دەمێننەوە و هەندێکی دی دەچنە ناو ئاوەکەوە."

ئەمە قسەی یەکێك لەگرنگترین بیریاران و یەکێك لەقسەکەرانی بیرکردنەوەی ئەو سەردەمەیە. هەر لەبەرئەمەش ڕاستەوخۆ ماهیەت و ئاراستەی ژیانی فکری ئەو سەردەمە دەردەبڕێت. سەردەمی دالامبێر هەستدەکات بزوتنەوەیەکی گەورە بەرەو پێشەوە پاڵی پێوە دەنێت، بەڵام ئامادەنیە خۆی بەدەستەوەبدات و خۆی تەسلیمی ئەم هێزەبکات. دەیەوێت بزانێت ئەم فشارە لەکوێوە دێت و بۆ کوێ دەچێت، سەرچاوە و ئامانجی چیە؟ لەروانگەی ئەم سەردەمەوە ناسینی چالاکی خود، لێکۆڵینەوەی لەبارەی ئەوەی چی لەبیرکردنەوەدا روودەدات و بینینی ئەوەی لەپێشەوەیە، ئەرکی راستەقینە و بنەڕەتی بیرکردنەوە پێکدەهێنێت. بیرکردنەوە نەك تەنها ئامانجە تازە و نەناسراوەکان دەپشکنێت، بەڵکو دەیەوێت بزانێت بۆ کوێ دەڕوات، دەیەوێت خۆی رەوتی سەفەرەکەی دیاریبکات. بە شادیەکی نوێ و بە شەهامەتی دۆزینەوەوە روبەڕوی دنیا دەبێتەوە و هەر رۆژێك چاوەڕێیە پەردە لەسەر کۆمەڵێك نهێنی تازە لابرێت. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا تینوێتی زانین و تامەزرۆیی فکری ئەو تەنها رووی لەجیهانی دەرەوە نیە، ئەو پرسیارەی دی کە ماهیەت و هێزی خودی بیرکردنەوە چیە،

بیرکردنەوەی ئەم سەردەمە بە شەوقێکی زیاترەوە بۆ پشکنین هاندەدات. چەندانجار ئەوە دێتەپێشیٚ کە بیرکردنەوە لەو سەفەرە جیاوازانەی بۆ فراوانکردنی ئاسۆکانی واقعی بابەتی گرتوێتیە بەر، بگەڕێتەوە بۆ بنەماکەی خۆی. ئەلکسەندەر پۆپ ئەم هەستە رەگ داکوتاوەی ئەو سەردەمە لەدێرێکی پڕ مانادا کورتدەکاتەوە: "بابەتی راستەقینەی لێکۆڵینەوەی مرۆڤایەتی، خودی مرۆڤە". ئەم سەردەمە هەستدەکات لەناو دەرونی خۆیدا، هێزێکی تازە کەوتۆتە کار، بەلاٚم چالاکیەکانی خودی ئەم هێزە تەنانەت پتر لەبەرهەمەکانی ئەم چالاکیە ئەفسونیدەکات. نەك هەر شەیدای ئەنجامەکانی کار دەبێت، بەڵکو هەوڵدەدات سەر لەوشێوە رەوتەش دەربکات کە ئەم دەرەنجامانەی بەرهەمهێناوە. مەسەلەی پێشکەوتنی فکری لەسەرتاسەری سەدەی هەژدەهەمدا، لەژێر تیشکی ئەم روناکیەدا دەردەکەوێت. رەنگە چەمکی پێشکەوتنی فکری لەهیچ سەردەمێکدا هێندەی سەردەمی رۆشنگەری، رۆنەچوبێت. بەلاٚم گەر ئەم وێنایە تەنها بە مانای چەندایەتی و وەك فراوانبوونی بێکۆتایی دامێنی زانین رەچاوبکەین، هەڵەمانکردووە. هەمیشە جۆرێك دیاریکردنی چۆنایەتیش هاوکاتی پەرەسەندنی چەندایەتیە. گەڕانەوەی هەرچی دیاری بیرکردنەوە بۆ ناوەندی تایبەتی زانین، هاوکاتی پەلهاویشتنی لێکۆڵینەوەیە بۆ دەرەوەی بواری زانین. ئێمە بۆ بەدەستهێنانی دڵنیایی لەیەکێتی، فرەیی دەپشکنین، و پانتایی دامێنی زانین بەو ئومێدە بەبەڵگەنەویست قبوڵدەکەین کە ئەم پانتاییە رێگری بیرکردنەوەی ئێمە نابێت، بەڵکو بە پێچەوانەوە بیرکردنەوەی ئێمە دەگەڕێنێتەوە بۆ خۆی و بە خۆیەوە سەرقاڵیدەکات. چونکە چەندانجار دەبینین کە جیاوازی ئەو رێگایانەی بیرکردنەوەی ئێمە بۆ لەئامێزگرتنی هەموو واقعیەت دەیگرێتە بەر، جیاوازیەکی روکەشیە. راستە ئەم رێگایانە لەدیدی بابەتیەوە بەجیاواز لەیەکدی دێنە بەرچاو، بەلاٚم ئەم جیاوازیە بەمانای ناکۆکی نیە، بەڵکو هەموو وزەکان لەیەك ناوەندی هێزدا ئامادە دەکرێن. هەمەڕەنگی و جیاوازی شێوەکان هیچ نیە، جگە لەفراوانکردنی تەواوی هێزێکی دروستکەری چونیەك. کاتێك سەدەی هەژدەهەم دەیەوێت ئەم هێزە لەیەك وشەدا پێناسبکات، ناوی دەنێت "عەقلٚ". "عەقلٚ"







وەك ناوەندی یەکێتی بەخشی ئەم سەدەیەی لێدێت و دەربڕی هەموو ئەو شتانەیە کە ئەم سەدەیە دەیەوێت و بۆ بەدەستهێنانیان هەوڵبدات و بەدەستیشی دێنێت. بەلاٚم ئەگەر مێژوونوسی سەدەی هەژدەهەم هەر بەم وەسفە رازی بێت و بە سەرەتای دڵنیای باسەکەی خۆی بزانێت، توشی هەڵەبووە. چونکە لەو جێگەیەدا کە لەدیدی خودی سەدەکەوە کۆتایی روداوەکەیە، لەلای مێژوونوس سەرەتای باسەکەیەتی. لەو شوێنەدا کە پێدەچێت خودی سەدەکە بە وەلاٚم دەگات، بۆ مێژوونوس خودی مەسەلەکە دێتە ئاراوە. بڕواکردن بە یەکێتی و نەگۆڕی عەقلٚ بەسەر سەرتاسەری سەدەی هەژدەدا زاڵە. بۆ هەموو ویژدانێکی بیرکەرەوە، هەموو نەتەوەکان، هەموو قۆناغە مێژووییەکان، هەموو کلتورەکان، عەقلٚ هەر هەمان شتە کە هەبووە. دەکریٚ لەگۆڕانکاری دینەکان و نەریتەکان و بڕوا ئەخلاقیەکان و بیروباوەڕ و حوکمە تیوریەکان، ڕەگەزێکی پتەو و سەقامگیر دەربهێنرێت کە خۆبەخۆ نەمرە و بەم نەمریە خودی واقعی عەقلٚ ئاشکرادەکات. بۆ ماوەیەکی زۆر وشەی "عەقلٚ" سادەیی و راشکاوی خۆی لەدەستداوە، تەنانەت ئەگەر لەبنەڕەتدا لەگەلٚ ئامانجە بنەڕەتیەکانی فەلسەفەی رۆشنگەریدا هاوڕابین. ئێمە چیدی ناتوانین ئەم وشەیە بەبیٚ سەرنجدان لەمێژوو بەکاربهێنین و چەندانجار دەبینین کە مانای ئەم وشەیە گۆڕانی گرنگی بەسەردا هاتووە. ئەم دۆخە بەردەوام ئەوەمان بە بیردا دەهێنێتەوە کە زاراوەکانی "عەقلٚ" و "عەقلاٚنیەت" چیدی مانایەکیان نیە — تەنانەت بە مانای خەسڵەتە مێژووییە روتەکان. چەمکی هەمەکی وشەکە ئاڵۆزە، تەنها کاتێك رون و دیاردەبێت کە بەشە نزیك راستەکەی بۆ زیاد بکەین. دەبیٚ لەکوێی سەدەی هەژدەدا بۆ ئەم بەشە نزیکە بگەڕێین؟ ئەگەر ئەم سەدەیە حەزیدەکرد ناوی بنرێت "سەدەی عەقلٚ" یان "سەدەی فەلسەفە"، ئایا خەسڵەتی دیاری ئەم ناونیشانە لەچیدایە؟ وشەی "فەلسەفە" لێرەدا بە چ مانایەك بەکاردەهێنرێت؟ کارە تایبەتیەکانی چیە و چ ئامێرێکی بۆ ئەنجامدانی ئەم کارانە بە مەبەستی بیناکردنی کۆمەڵێك بۆچوون لەبارەی جیهان و مرۆڤە لەسەر بناغەیەکی پتەو، لەبەردەستدایە؟

ئەگەر ئەو وەلاٚمانەی سەدەی هەژدەهەم بەم پرسیارانەی داوەتەوە، لەگەلٚ

ئەو وەڵامانەدا بەراوردبکەین کە لەسەرەتاکانی کاری فکری ئەم سەردەمەدا باوبوو، بەجۆرێك جیاکردنەوەی نیگەتڤانە دەگەین. سەدەی حەڤدەهەم کاری واقعی فەلسەفەی بە بیناکردنی "سیستەم"ی فەلسەفی دەزانی. پێدەچوو زانینی "فەلسەفە"ی هەقیقی تەنها کاتێك بەدەست دێت کە فەلسەفە لەبەرزترین بوون و لەبەرزترین بێگومانی شهودیەوە دەست پێبکات، و بتوانێت نوری ئەم بێگومانیە بەسەر تەواوی بوونی لێوەرگیراو (اشتقاقی) و بەسەر هەموو زانینی لێوەرگیراو (اشتقاقی)دا بدرەوشێنێتەوە. ئەمکارە بە میتۆدی بورهان و بەرهێنانی لۆژیکی ئەنجامدەدرا کە کۆمەڵێك مەسەلەی تازە بۆ ئەو بێگومانیە بنەڕەتیە زیاددەکات و بەمشێوەیە ئەڵقە بە ئەڵقە هەموو زنجیرەی زانینی مومکین بەیەکەوە گرێدەدات. نەدەکرا هیچیەك لەئەڵقەکانی ئەم زنجیرەیە، لەگشت جیابکرێتەوە، هیچ یەکێکیان خۆ بە خۆ روون نەدەکرانەوە. تەنها رونکردنەوەی شیاو هەر هەمان "لێوەرگرتن" (اشتقاق)ی مەسەلەکە بوو، واتە بەرهێنانی ورد و رێکخراو کە بە هۆیەوە بکرێت هەر ئەڵقەیەك بگەڕێنرێتەوە بۆ بنەمای بوون، و بێگومان و ماوەی نێوان ئەڵقە و بنەماکە دیاربکرێت، و ژمارەی ئەو ئەڵقانەی دەکەونە نێوان بنەما و ئەڵقەکەوە بژمێرین. سەدەی هەژدەهەم ئەمجۆرە بورهان و بەرهێنانە دەخاتەلاوە. چیدی وەك دیکارت و مالبرانش یان لایبنیتز و سپینۆزا، بەدوای دەستگەیشتن بە پێویستی لۆژیکی کەماڵی رێکخراودا نیە. بەدوای چەمکێکی دی هەقیقەت و فەلسەفەدا دەگەڕێت کە کاری بریتیە لەفراوانکردنی سنورەکانی هەردوکیان و دەرهێنانی هەردوکیان بەشێوەیەکی نەرمتر و زیندوتر. بزوتنەوەی رۆشنگەری ئامانجی خۆی لەسەر پرۆژە و نمونەی زانستی سروشتی هاوچەرخەوە دروستدەکات.

هەوڵدان بۆ چارەسەری مەسەلەی سەرەکی میتۆدی فەلسەفی، پێویستی بە پشتبەستنە بە "ڕێساکانی بیرکردنەوەی فەلسەفی" نیوتن، نەك پەیڕەویکردنی "نامەیەك لەبارەی میتۆدەوە"ی دیکارت. دەرئەنجامی ئەم کارەش ئەوەیە فەلسەفە یەکسەر ئاراستەیەکی تەواو تازە پەیدا دەکات. چونکە میتۆدەکەی نیوتن بەرهێنانی رووت نیە، بەڵکو میتۆدێکی شیکاریە. نیوتن باسەکەی خۆی بە قایلبوون بە چەند بنەمایەکی دیاریکراو، چەند چەمکی گشتی و بەدیهی،





دەست پێناکات تا بەهۆی بەرهێنانی ئەبستراکتەوە رێگە بۆ گەیشتن بە زانین لەبارەی شتە هەندەکیەکان و شتە "واقعیەکان"ەوە ئامادەبکات. رێبەری نیوتن رێك پێچەوانەی ئەم ئاراستەیەیە. دیاردەکانی نیوتن پێدراوەکانی ئەزمونن، و بنەماکانیشی ئامانجی لێکۆڵینەوەکانێتی. ئەگەر ئەم بنەمایانە "بۆ سروشت" لەپێشن، ئەوا دەبێت دیاردەکانیش "بۆ ئێمە" لەپێش بن. لێرەوە میتۆدی راستەقینەی فیزیا هەرگیز ناتوانێت ئەوە بێت کە بیناکە لەسەر بناغەی شتێکی پێشینەیی خۆبەخۆ، لەسەر جۆرێك گریمانە دابنێین و دەرئەنجامە لۆژیکیە شاراوەکانی ئەو گریمانەیە، بەشێوەیەکی کامڵ لێوەربگرین. چونکە دەتوانین ئەمجۆرە گریمانانە چۆن دەمانەوێت دروستبکەین و بیگۆڕین، بایەخی لۆژیکی هەر هەموشیان لەرووی لۆژیکیەوە هەر یەك شتە. لەم بێگوێدانە لۆژیکیەوە، تەنها کاتێك دەکرێت بەرەو هەقیقەت و وردبینی زانستی فیزیا بڕۆین کە سەرە دەزووی ئەندازەگیری لەشوێنێکی دیدا بپشکنین. ناکرێت ئەبستراکتی زانستی یان "پێناسە"، وەك سەرەتایەك کە دورە لەئاڵۆزیەوە بەکاربهێنین، چونکە دەتوانین ئەم سەرەتایە تەنها لەئەزمون و بینینەوە بە دەست بێنین. ئەمە بەو مانایە نیە کە نیوتن و قوتابیەکانی لەنێوان ئەزمون و بیرکردنەوەدا — لەنێوان بواری واقعی رووت و بیرکردنەوەی پەتیدا — ناکۆکیەك دەبینین. ناکۆکیەکی وا لەشێوەی بایەخدان بە شتەکان، ئەو دوالیزمەی نێوان "پەیوەندیەکانی بیرکردنەوە" و "شتە واقعیەکان" کە لە"لێکۆڵینەوە لەبارەی تێگەیشتنی مرۆڤ"ی بەرهەمی هیومدا تێبینی دەکەین، لای بیریارانی پەیڕەوی نیوتن نادۆزرێتەوە. چونکە ئامانج و پێشگریمانەی لێکۆڵینەوەی نیوتنی بریتیە لەرێکخستن و یاسای هەمەکی لەجیهانی مادیدا. ئەمجۆرە یاسارێژیە بەو مانایەیە کە مەسەلە واقعیەکان، مادەی رووت نین، ناکرێ ئەوانە بە مشتێك رەگەزی لەیەکجیا بزانرێت، بە پێچەوانەوە لەسەرتاسەری مەسەلە واقعیەکاندا وێنەیەکی یەکسان تێبینی دەکرێت. ئەم وێنەیە لەبەڵگەنەویستە ماتماتیکی و لەریزکردنی شتەکان بەپێی ئەندازە و ژمارەدا دەردەکەوێت. بەڵام ناکرێت ئەم ریزبەندیانە لەچەمکێکی روتدا پێشبینی بکرێت، بەڵکو بونیان دەبێ لەناو خودی شتە واقعیەکاندا بسەلمێنرێت. کەوابوو میتۆدی لێکۆڵینەوە ئەوە نییە





کە لەچەمك و بنەما بەدیهیەکانەوە بەرەو دیاردەکان بجوڵێین، بەڵکو ئاراستەی جوڵە پێچەوانەی ئەمەیە. بینین دیاردەکانی زانست بەدەستەوە دەدات، ڕێسا و یاسا ئامانجی لێکۆڵینەوەیە.

ئەم ڕێکخستنە میتۆدۆلۆجیە تازەیە، بەشێوەیەکی کامڵ سیمای دیاری بیرکردنەوەی سەدەی هەژدەیە. بەهای سیستەم یان هەمان "ڕۆحیەتی سیستماتیك" نە فەرامۆش دەکرێتو نە بەجێدەمێنێ. بەڵام ئەم بەهایە لەعەشق بۆ سیستەم لەبەرخاتری سیستەم – یان "ڕۆحیەتی سیستەم دروستکردن" – بە وردی جیا دەبێتەوە. کۆی تیورەی زانینی سەدەی هەژدەهەم هەوڵدەدات ئەم جیاکاریە تۆمار بکات. دالامبێر لە"وتاری پێشەکیدا" بۆ ئەنسکلۆپیدیای فەرەنسا ئەم جیاکاریە دەکاتە ناوەندی بەڵگاندنەکانی خۆی، کۆندیاك لە"نامەیەك لەبارەی سیستەمەکانەوە" ئەم جیاکاریە ئاشکرا دەکات و ڕەوایەتی پێدەدات. کۆندیاك هەوڵدەدات سیستەمە گەورەکانی سەدەی حەڤدەهەم لەمەحەکی ڕەخنەی مێژوویی بدات و دەریبخات کە یەك بەیەکیان بێهودەن، چونکە لەبری ئەوەی بەشتە واقعیەکانەوە بنوسێن و چەمکەکانی خۆیان لەم واقعەوە وەربگرن، هەریەکێکیان چەمکێکی تایبەتیان تا ئاستی حوکمێکی دۆگمایی بەرزکردۆتەوە. لەبەرامبەر ئەو "ڕۆحی سیستەم دروستکردنەدا" هەنوکە ڕێکەوتنێکی تازە لەنێوان ڕۆحی "پۆزەتڤیزمی" و ڕۆحی "عەقلانیەتدا" (ڕاسیۆنال) پێویستە. شتە پۆزەتڤیزم و عەقلانیەکان دژی یەك نین، بەڵام پێکهاتنیان تەنها بەهۆی هۆکارێکی ڕاستەوە ڕوودەدات. ئێمە نابێت ڕێکخستن و یاسا و "عەقڵ" وەك ڕێسایەك بپشکنین کە تێگەیشتن و دەربڕینیان پتر لەدیاردەکان – وەك سەرەتایەك بۆ پێشبینی کردنیان– لەبەردەستدایە، بەڵکو دەبێت ئەم یاسا ڕێژیانە لەناو خودی دیاردەکاندا وەك پەیوەندی دەرونی نێوانیان بدۆزینەوە. هەروەها نابێت لەسەرەتاوە چاوەڕێی ئەوە بکەین ئەم "عەقڵە" بەشێوەی جۆرێك سیستەمی داخراو دەربکەوێت، بەڵکو دەبێ ڕێگە بدەین کە بە پێشکەوتنی زانینی ئێمە لەبارەی شتە واقعیەکانەوە، ئەم عەقڵە هێواش هێواش خۆی دەربخات و لەهەر هەنگاوێکدا ڕونتر و کاملتر بێت. لۆژیکێکی تازە کە بڕوامانوایە لەسەرتاسەری ڕەوتی زانینیدا بوونی هەیە و







لەسەر بناغەی ئەم بڕوایەش بەدوایدا دەگەڕێین، نە ئەو لۆژیکەی سکۆلائیستەکانە و نە چەمکێکی ماتماتیکی ڕووت، بەڵکو "لۆژیکی شتە واقعیەکانە". زیهن دەبێت لەبەردەم فرەیی دیاردەکاندا خۆی لەبیر بەرێتەوە و بەردەوام لەژێر سێبەریاندا پشکنینی خۆی بکات. چونکە دەتوانێت لەوە دڵنیا بێت کە گومڕاه نابێت، بەڵکو لێرەدایە کە هەقیقەت و پێوەری واقعی خۆی دەدۆزێتەوە. تەنها لەم ڕێگەیەوە پێکەوەبەستنی دولایەنەی هزر و بابەت، هەقیقەت و واقعیەت، بەڕاستی ڕودەدات، تەنها بەمشێوەیەیە کە دیالۆگی نێوان ئەم چەمکانە، کە مەرجی هەموو جۆرە زانینێکی زانستیە بەرهەمدێت.

ڕەوتی بیرکردنەوەی زانستی لەکاتی تازەبونەوەی ژیانیدا لەسەردەمی تازەدا، ئەو هۆ بەڵگەدارە دەخاتە بەردەست فەلسەفەی ڕۆشنگەری کە پێکهاتەی شتە "پۆزەتڤیزم" و "عەقلانیەکان" گریمانەیەکی ڕووت نیە، بەڵکو ئامانجێکی دیاریکراو و قابلی دەست پێڕاگەیشتنە، و ئامانجەکانی ئێمە شتێکە بە تەواوی دەتوانێ بێتە دی. فەلسەفەی ڕۆشنگەری لەڕەوتی پێشکەوتنی زانستی و ئەو قۆناغە جیاوازانەی کە ئەم زانستە گرتویێتیە بەر، بڕوای بەوە هەیە دەتوانێت ئامانجەکەی خۆی بەدەست بێنێت. چونکە ئەم فەلسەفەیە دەتوانێت لێرەدا هەنگاو بە هەنگاو بەدوای سەرکەوتنی ڕۆحی شیکاری تازەدا بڕوات. هەر ئەم ڕۆحە بوو کە لەماوەیەکی نەك زیاتر لەسەدە و نیوێك، هەر هەموو واقعی داگیر کردبوو، هەنوکەش پێدەچوو کاری مەزنی ڕاڤەکردنی فرەیی دیاردە سروشتیەکانی بۆ یەکێتی یەك ڕێسای هەمەکی، ئەنجامداوە. ئەم ڕێسا گەردونناسیە بەو شێوەیەی لەیاسایی ڕاکێشانی نیوتندا شاراوەیە، نەك بەرێکەوت بە دەستهاتووە و نە دەرئەنجامی تاقیکردنەوەی ڕێکەوت و هەندێکجارە. دۆزینەوەی ئەم یاسایە بەکارهێنانی وردی میتۆدی زانستی پیشاندەدات. نیوتن ئەو کارەی کە کپلەر و گالیلۆ دەستیان پێکردبوو، بە ئەنجام گەیاند. ئەم سێ ناوە نەك تەنها سێ پیاوی مەزنمان لەجیهانی زانستدا بە بیردا دێنێتەوە، بەڵکو نوێنەری سێ ڕوداوی مەزنن لەمێژووی زانستو بیرکردنەوەدا. کپلەر ڕەسدکردنی دیاردە ئاسمانیەکانی بە پلەیەك لەوردی گەیاند کە بەر لەو وێنەی نەبووە. کپلەر بە هەوڵێکی زۆر بە کۆمەڵێك یاسا

گەیشت کە شکڵی جوڵەی هەسارەکان وەسفدەکات و گونجانی نێوان ماوەی سوڕانەوەی هەسارەکان بە دەوری خۆرداو ماوەی هەریەکێکیان لەخۆرەوە، دیاریدەکات. بەڵام ئەم بینینەی واقعیەت تەنها هەنگاوی یەکەمە. گالیلۆ مەسەلەیەکی گرنگتر تێبینی دەکات: رای ئەو لەبارەی جوڵەوە ئاشکراکەری گەیشتنە بە رەهەندێکی فراوانتر و قوڵتری لۆژیکی چەمکە زانستیەکان. لێرەدا چیدی مەسەلەکە وەسفی مەیدانی دیاردە سروشتیەکان نیە. چەند ئەم مەیدانە فراوان و گرنگیش بێت، هەنوکە دەبێت بونیادی گشتی زانستی دینامیك، یان تیورەی خودی سروشت، دابڕێژرێت. گالیلۆ دەزانێت ئەمکارە تەنها بە بینینی راستەوخۆی سروشت ئەنجامنادرێت، بەڵکو دەبێ پشت بە هۆکانی ناسین ببەسترێت.

دیاردەکانی سروشت وەك کۆمەڵێك روداوی یەکدەست، بەشێوەی کۆمەڵێك هەمەکی یەکپارچە، خۆیان لەبەردەم هوشیاری ئێمەدا دادەنێن. هوشیاری تەنها روکەشی ئەم روداوانە وەردەگرێت و دەتوانێت لەهێلەگشتیەکانیدا و بەو شێوەیەی کە رودەدەن، وەسفبکات. بەڵام ئەمجۆرە وەسفکردنە بۆ رونکردنەوەی واقعی بەس نیە. چونکە رونکردنەوەی روداوێکی سروشتی تەنها ئەوەنیە کە تێبینی ئەوە بکەین ئەو دیاردەیە بە فلاَن و فیسار شێوە بوونی هەیە. مەرجی رونکردنەوەی واقعی بریتیە لەدیاریکردنی مەرجەکانی بوونی دیاردە و ناسینی ئەوەی بە وردی دیاردەکە چۆن بەو مەرجانەوە بەستراوەتەوە. ئەم مەرجە تەنها کاتێك دەتوانێت روبدات کە وێنەی یەکدەستی روداوەکە بەو شێوەیەی کە لەبەردەم هوشیاری‌و بینینی راستەوخۆدا دەردەکەوێت، شیبکەینەوە تا بۆ رەگەزە پێکهێنەرەکانی ورد بێتەوە. بە بڕوای گالیلۆ ئەم رەوتەی شیکردنەوە، پێشمەرجی هەر جۆرە زانینێکی وردە لەبارەی سروشتەوە. میتۆدی دروستبوونی چەمکە زانستیەکان لەهەمانکاتدا هەم شیکاریە و هەم پێکهاتەیی (ترکیبی)یە. تەنها بە دابەشکردنی روداوێکی سادە بۆ رەگەزە پێکهێنەرەکانی، و بە دروستکردنەوەی روداوەکە بەهۆی ئەم رەگەزانەوەیە کە دەتوانین لەروداوەکە تێبگەین. گالیلۆ بە دۆزینەوەی رەوتی ئاراستەی شکڵی هەڵدان (شتێکی هەڵدراو) نمونەی کلاسیکی ئەم رەوتەمان دەخاتە بەردەست. وێنەی





رەوتی هەڵدراو لەرووی بینینەوە راستەوخۆ نەدەکرا، واتە مومکین نەبوو ئەم رەوتە لەکەرەتە زۆرەکانی بینینی هەڵدراوەکاندا، تەجرید بکەن. دیارە بینین هەندێك خەسڵەتی گشتیمان دەداتێ، پێشانمان دەدات کە ئەو شتەی هەڵدەدرێت سەرەتا بەرز دەبێتەوە و پاشان دەکەوێتە خوارێ و لەمبابەتە، بەڵام رەوتە وردەکەی ناتوانین لەبینینەوە بەدەست بێنین. ئێمە کاتێك بە وێنەی راستەقینەی ماتماتیکی روداوێك دەگەین کە دیاردەکە بۆ مەرجە تایبەتیەکانی بگەڕێنینەوە. ئەمکارەش بە جیاکردنەوەی پۆلی ئەو مەرجانەی هاوکات پێکەوە کار لەروداوەکە دەکەن، دەستەبەر دەکرێت و بە لێکۆڵینەوە لەیاساکانی هەریەك لەم پۆلانە. هەرکاتێك دەرکەوت دیاردەی هەڵدان، دیاردەیەکی پێکهاتەییە کە دیاریکردنی پەیوەندی بە دوو هێزی جیاوازەوە — هێزی فڕێدانی یەکەم و هێزی قورسایی — هەیە، دەکرێ یاسای رەوتی ئاراستەی شتی هەڵدراو پەیدا بکرێت و زیادبوون و کەمبونەوەی خێراییەکەی دیاریبکرێت. لەم نمونە سادەیەیدا وەك پرۆژەی سەرەتای وێنەیەك، تێبینی تەواوی روداوی پەروەردەکردنی ئایندەی فیزیا و بونیادی میتۆدۆلۆجیە کامڵەکەی، دەکەین. تیورەکەی نیوتن هەموو ئەو خاڵانەی لێرەدا قابیلی دیاریکردنن، لەخۆیدا هەڵگرتووە و بە دوورو درێژ دەیسەلمێنێت. چونکە ئەم تیورەیە لەسەر بناغەی پێکەوە بەستنی دولایەنەی میتۆدە شیکاری و پێکهاتەییەکان دامەزراوە. نیوتن بینای کارەکەی لەسەر سێ یاساکەی کپلەر دادەمەزرێنێ. بەڵام تیورەکەی ئەو تەنها بە دەربڕینی ئەم یاسایانە بەپێی ئاشکراکردنی دەرئەنجامەکانی بینینی واقعیەتەوە راناوەستێت، بەڵکو هەوڵدەدات ئەم دەرئەنجامانە لەپێشگریمانەکانیەوە دەربهێنێت‌و دەریبخات کە ئەمانە دەرئەنجامی پێویستی کۆبونەوەی کۆمەڵێك مەرجی جیاوازن. هەریەك لەم پۆلەمەرجانە دەبێ دانە دانە تاوتوێبکرێن‌و دەوریان بناسرێت. بەمشێوەیە دەردەکەوێت دیاردەی جوڵەی هەسارەکان کە بە بڕوای کپلەر دیاردەیەکی سادە بوو، لەڕاستیدا بونیادێکی ئاڵۆزە. ئەم دیاردەیە بە دوو شێوەی سەرەکی لەیاساکانی سروشتدا راڤە دەکەن: یەکێکیان کەوتنە خوارەوەی ئازادی تەنەکان و ئەویدیان یاساکانی چەقە هێز. گالیلۆ و هۆیگنس هەردوو شێوەکەی یاسایان بە جیا تاوتوێکردووە

و بە وردی دەستنیشانیان کردبوو. هەنوکە مەسەلەکە ئەوەبوو کە ئەو دۆزینەوانە بە بنەمایەکی گشتگیر، ڕاڤە بکەن. دەستکەوتی گەورەی نیوتن هەر ئەم ڕاڤەکردنە بوو. ئەو کارەی ئەو ئەنجامی دا دۆزینەوەی واقعیەتێکی نەناسراو و کۆکردنەوەی کۆمەڵێك کەرەسەی تازە نەبوو، بەڵکو پتر بریتیبوو لەدەستکاری عەقڵیانەی کەرەسە ئەزمونیەکان. لەو کاتە بەدواوە چیدی ئێمە تەماشای بونیادی گەردون ناکەین، بەڵکو دەچینە ناویەوە. ئەو پرۆسەیە کاتێك دەکرێت کە ماتماتیك بەکاربهێنین و بابەتەکە بە شێوازی ماتماتیکی، شیبکەینەوە. لەو ڕووەوە کە تیورەی دیفرانسێلی نیوتن و حسابی "بێ سنور بچوکەکانی" لایبنیتس، هۆکارێکی گشتی بۆ ئەم کارە دەخەنە بەردەست، پێدەچێت بۆ یەکەمجار پیشاندرابێت کە سروشت بە تەواوی قابیلی تێگەیشتنە. زانستی سروشتی لەڕەوتی خۆیدا ماوەیەکی نادیار دەبڕێت، بەڵام ئاراستەکەی جێگیرە، چونکە سەرەتا و دەرئەنجامەکەی تەنها ماهیەتی جیهانی بابەتی دیاری ناکات، بەڵکو ماهیەت و هێزەکانی عەقڵیش دەستیان تیایدا هەیە.

فەلسەفەی سەدەی هەژدەهەم ئەم بابەتە تایبەتە، واتە پرۆژەی میتۆدۆلۆجیای فیزیای نیوتن، دەخاتە پێشچاوی خۆی، ئەگەرچی یەکسەر دەستدەکات بە گشتگیرکردنی. ئەم فەلسەفەیە قانع نیە بەوەی شیکردنەوە وەك ئامێرێکی عەقڵی زانینی ماتماتیکی و فیزیایی لەبەرچاو بگرێت، بەڵکو بڕوایوایە شیکردنەوە بە شێوەیەکی گشتی، ئامێری پێویست و ناچاری بیرکردنەوەیە. ئەم ڕوانگەیە لەناوەڕاستی سەدەدا سەردەکەوێت. فەیلەسوفەکان و قوتابخانە فەلسەفیەکان چەند لەبارەی ئەنجامەکانەوە لەگەڵ یەکدیدا جیاواز بن، لەم پێشەکیە ئەبستمۆلۆجیەدا، هاوڕان. "نامەیەك دەربارەی میتافیزیك"ی بەرهەمی ڤۆڵتێر، "گوتاری پێشەکی" بەرهەمی دالامبێر و "لێکۆڵینەوە لەبارەی بنەماکانی ئیلاهیاتی سروشتی و ئەخلاق"ی بەرهەمی کانت هەر هەموویان لەسەر ئەم خاڵەهاوڕان. هەموو ئەم بەرهەمانە میتۆدی ڕاستەقینەی میتافیزیك لەبنەڕەتدا بە هاوڕا دەزانن لەگەڵ ئەو میتۆدەدا کە نیوتن لەزانستی سروشتیدا بەکاریهێناو بەهۆیەوە بە کۆمەڵێك دەرئەنجامی دەوڵەمەند گەیشت. ڤۆڵتێر







دەڵێت مرۆڤ گەر بیەوێت تێبینی ژیانی شتەکان بکات و وەك چۆن بەراستی هەن بیانناسێت، ڕاستەوخۆ لەسنورداریێتی هێزە عەقڵیەکانی خۆی دەگات، وەك مرۆڤێکی نابینا کە دەبێت لەبارەی ماهیەتی ڕەنگەوە داوەری بکات. بەڵام شیکردنەوە هەر هەمان ئەو گۆچانەیە کە سروشتی میهرەبان بە مرۆڤی نابینای داوە. مرۆڤ بە هۆی ئەم ئامێرەوە دەتوانێت ڕێگای خۆی لەناو دیاردەکاندا بدۆزێتەوە و بەرەو پێشەوە بچێت و دەست بە دۆزینەوەی ڕێکخستن و ئارایشی شتەکان بکات، بۆ ئاراستە وەرگرتن لەپانتایی ژیان و زانیندا، هەر ئەوەندە بەسە. "ئێمە نابێت هەرگیز گریمانە دروستبکەین، هەرگیز نابێت بڵێین لێگەڕێ با کارەکە بە داهێنانی بنەمایەك بونیاد بنێین کە دەمانەوێت هەموو شتێك بەپێی ئەوانە ڕونبکەینەوە. لەبری ئەمە دەبێ بڵێین: لێگەڕێ شتەکان بە وردی شیبکەینەوە.. کاتێك ناتوانین هێمانۆمای ماتماتیك یان مەشخەڵی ئەزموون و فیزیا بەکاربێنین، ئاشکرایە کە ناتوانین تەنانەت یەك هەنگاویش بچینە پێشەوە". بەڵام لەبەرئەوەی ئەم ئامێرانەمان لەبەردەستدایە، دەتوانین و دەبێت بچینە ناو شەپۆلەخرۆشاوەکانی زانینەوە. دیارە دەبێت بۆ هەمیشە واز لەو ئومێدە بهێنین کە دەکرێت نهێنی کۆتایی شتەکان لەدڵیانەوە دەربهێنین و بەناو دڵی بوونی ڕەهای مادە یان ڕۆحی مرۆڤدا ڕۆبچین. بەڵام ئەگەر مەبەست لە(ناوکی دەرونی) هەمان ڕێکخستن و یاسا بێت، دەبینین کە ئەم ناوکەی سروشت بە هیچ شێوەیەك دوردەست نیە. دەتوانین لەم سنورەدا نیشتەجێبین و بۆ هەر ئاراستەیەك کە ویستمان بچینە پێشێ. دەسەڵات ئەوە نیە کە توانای ئەوەمان پێببەخشێت لەسنوری جیهانی ئەزمونی زیاتر بڕۆین، بەڵکو ئەوەیە فێرمان بکات هەست بە ئاسودەیی لەم جیهانەدا بکەین. لێرەشدا جارێکی دی گۆڕانێکی بەرجەستە لەچەمکی عەقڵدا بەراورد بە بەکارهێنانی لەسەدەی حەڤدەدا، ئاشکرا دەبێت، لەسیستەمە میتافیزکیە مەزنەکانی ئەو سەدەیەدا – سیستەمەکانی دیکارت و مالبرانش، لایبنیتسو سپینۆزا – عەقڵ بریتیە لەبواری "هەقیقەتە سەرمەدیەکان"، واتە ئەو هەقیقەتانەی لای زیهنی مرۆڤ و زیهنی خوداوەند، لای هەردوکیان بایەخی هەیە. هەموو ئەوانەی بەهۆی عەقڵەوە بیزانین، لەبەر هەمان هۆ "لای خوداوەند"یش دەیبینین و هەر

کارێکیش لەعەقڵەوە سەرچاوە بگرێت، بە مانای بەشداریکردنە لەخودی ئیلاهیدا و ڕێگەیەکە کە بە هۆیەوە دەستمان بە جیهانی مەعقول دەگات. سەدەی هەژدەهەم عەقڵ بە مانایەکی خاکیتر لەبەرچاو دەگرێت. عەقڵ چیدی بەرهەمی کۆی "وێناگەلێکی فتری" بەر لەهەر ئەزمونێك و ئاشکراکەری زاتی ڕەهای شتەکان نیە. هەنوکە عەقڵ شتێکی بەدەستهاتووە، نەك میراتێکی بەڵگەنەویست، چیدی کۆگای زیهنی مرۆیی نیە کە تیایدا هەقیقەت وەك پارچەی ئاڵتون کۆکرابێتەوە، عەقڵ ئەو هێزە فکریە ڕەسەنەیە کە بۆ دۆزینەوەو دیاریکردنی هەقیقەت، ڕێنمایمان دەکات. ئەم دیاریکردنەی هەقیقەت، ناوك و پێشگریمانەی پێویستی هەموو جۆرە بێگومانیەکی واقعیە. سەرجەم سەدەی هەژدە عەقڵ بەم مانایە دەناسێت، نەك وەك جەستەی پتەوی زانین و بنەماکان و ڕاستیەکان، بەڵکو بە مانای جۆرێك ووزە، جۆرێك هێز کە تەنها لەرووی بەرهەمەکانیەوە بە تەواوی قابیلی تێگەیشتنە. ئەوەی عەقڵ چیە و چی دەتوانێت بکات، هەرگیز بەهۆی دەرئەنجامەکانیەوە دەرناکەوێت، بەڵکو تەنها بەهۆی بەکارهێنانیەوە قابیلی ناسینە. گرنگترین بەکارهێنانیشی بریتیە لەبەستن و کردنەوە. عەقڵ واقعی رووت شیدەکاتەوە، هەموو پێدراوەکانی ئەزموون و هەموو ئەو شتانەی کە ئێمە بەپێی وەحی و نەریت و مەرجەعیەتەوە بڕوامان پێکردوون، لەبەرکەوتن بە عەقڵدا لەیەك هەڵدەوەشێن و عەقڵ ئۆقرە ناگرێت گەر هەموویان بۆ سادەترین ڕەگەزە دروستکەرەکانی، بۆ دوا بنەماکان باوەڕی ئێمە، شینەکاتەوە. پاش ئەم شیکردنەوەیە کاری بیناکردن دەست پێدەکات. عەقڵ ناتوانێت کاری خۆی بەهەمان پارچە پەرش و بڵاوانە کۆتای پێبێنێ، بەڵکو دەبێت بونیادێکی تازەیان لێ دروستبکات، هەمەکیەکی هەقیقی پێکبهێنێ. بەڵام لەو ڕوەوە کە عەقڵ ئەم هەمەکیە لەرووی ڕێساکانی خۆیەوە دروستدەکات و پارچەکانی لەناویدا پێکەوە ڕێکدەخات، (کەوابوو) لەبونیادی دروستکراوی خۆی، زانینی تەواو بەدەست دێنێت. عەقڵ ئەم بونیادە دەناسێت، چونکە دەتوانێت سەرجەمی بە تەرتیب کردنی یەك بەیەکی بەشەکانی سەرلەنوێ بینا بکاتەوە. چەمکی عەقڵ تەنها دەکرێ لەم جولەعەقڵیە دولایەنیەدا بە تەواوی دەستنیشان بکرێت، واتە بە مانای جۆرێك چەمکی





کردار، نەك بوون.

ئەم بڕوایە لەهەموو زەمینە کلتوریەکانی سەدەی هەژدەدا ڕەگی داکوتاوە. ئەو وتە بەناوبانگەی لیسینگ کە توانای ڕاستەقینەی عەقڵ دەبێت لەبەدەستهێنانی هەقیقەتدا ببینین، نەك لەخاوەنداریێتیدا، لەسەرتاسەری مێژووی سەدەی هەژدەدا، بونێکی لێکچووی هەیە. مۆنتیسیکۆ هەوڵدەدات جۆرێك ڕەوایەتی تیوری بۆ تینوێتی زانینی فتری ڕۆحی مرۆڤ ئامادە بکات — بۆ ئەو فزوڵیەتە فکریە بێ کۆتاییەی کە هەرگیز ڕێگە نادات ئێمە بە وێنای هەنوکەیی خۆمان ڕازی بین و ئێمە لەبیرکردنەوەیەکەوە بۆ بیرکردنەوەیەکی دی دەبات. مۆنتیسیکۆ دەڵێت: "ڕۆحی ئێمە بۆ بیرکردنەوە دروستبووە، واتە بۆ دەرککردن، بەڵام بونەوەرێکی وا دەبێت خاوەن فزوڵی بێت، چونکە وەك چۆن هەموو شتەکان زنجیرەیەك پێکدەهێنن کە تیایدا هەر بیرکردنەوەیەك پاش بیرکردنەوەیەکی دی دێت و پێش بیرکردنەوەیەکی دی جێگیر دەبێت، مرۆڤیش دەتوانێت یەکێك لەمانە ببینێت و ئارەزووی بینینی ئەوی دیانی نەبێت". شەهوەتی زانین کە موتەکەلیمە دۆگماکان بەناوی غروری فکریەوە قەدەغەیان کردبوو، هەنوکە بەیەکێك لەچۆنایەتیە پێویستەکانی ڕۆح ناودەنرێت و دیسانەوە بە ماڤ خۆی دەگات. ئامانجی سەرەکی کلتوری سەدەی هەژدەهەم بریتیە لەبەرگریکردن لەم شێوە بیرکردنەوەیە و بەهێزکردن و سەقامگیرکردنی.ئەو سەدەیە ئەرکی سەرەکی خۆی لەم جۆرە بیرکردنەوەیەدا دەبینێت، نەك تەنها لەکۆکردنەوە و فراوانکردنی زانیاریدا، لەئەنسکلۆپیدیای فەرەنساشدا کە وەك کۆگای ئەمجۆرە زانیاریانە بوو، هەر ئەم ئاراستە سەرەکیە بە ڕوونی دەبینرێت. خودی دیدرۆ کە بونیادنەری ئەنسکلۆپیدیا بوو، دەڵێت مەبەست لەم نوسینانە تەنها ئەوە نیە کە کۆمەڵێك زانین ئامادەبکات، بەڵکو ئەوەشە کە شێوەی بیرکردنەوەی باو بگۆڕێت. هوشیار بوون بەم ئەرکە بەناو هەموو هزری ئەو سەردەمەدا بڵاودەبێتەوەو دەبێتە هۆی دەرکەوتنی هەستی خرۆشێکی دەرونی تازە. تەنانەت ئارامترین و نەرمترین بیریاران، واتە "زانایان" (سیانیستە) واقعیەکان، دەبنە هاوڕێی ئەم بزوتنەوەیە. لەم ڕۆژانەدا ئەم زانایانە هێشتا بوێری ئەوە ناکەن ئامانجە کۆتاییەکانی بزوتنەوەکە ڕابگەیەنن، بەڵام





ناتوانن خۆیان لەدامێنی دەسەڵاتی بخەنە لاوە و بڕوایان وایە کە لەم بزوتنەوەیەدا ئایندەیەکی تازە بۆ رەگەزی مرۆڤ هەڵدێت. دۆکلۆر لەکتێبی "چەند بیرکردنەوەیەك لەبارەی نەریتەکانی ئەم سەدەیەوە" دەنوسێت: "من بڕواناکەم لەبارەی سەدەکەی خۆمەوە بێهودە بیردەکەمەوە، بەلاّم پێدەچێت جۆرێك جۆش و خرۆشی گشتی لەئارادا بێت کە بە پەروەردەی راستەقینە دەکرێ پێشکەوتنی، دەستنیشان یان خێرا بکرێت، چونکە مرۆڤ نایەوێت پەیڕەوی لەنەریتی باو بکات و بە چاوی بەستراوەوە بە فشاری هەر هێزێك کە لەو نەریتەدا حەشاردراوە، بەرەو پێشەوە پاڵی پێوەبنێت. مرۆڤ دەیەوێت ئەم هێزانە بناسێت و لەژێر تیشکی ئەم ناسینەدا بیانخاتە ژێر کۆنترۆڵی خۆیەوە. مرۆڤ حەزناکات بێهودە فڕێ بدرێتە ناو روداو و گێژەڵوکەی بیرکردنەوە تازەکان، بەڵکو پێی باشترە سوکانی بیرکردنەوە بە دەستەوە بگرێت و بەرەو مەبەستی دیاریکراو، رێنمایی بکات.

یەکەم هەنگاو کە سەدەی هەژدە لەم ئاراستەیەدا هاویشتی ئەوەبوو کە هێڵێکی جیاکەرەوەی روون لەنێوان رۆحی فەلسەفی و رۆحی ماتماتیکدا بپشکنێت. ئەمەش کارێکی ئەستەم و لەهەمانکاتدا ناکۆکیئامێز بوو. چونکە دوو ویستی جیاوازی بە روکەش ناکۆك بەیەك، دەبوو بەشێوەیەکی یەکسان تێر بکرێن. بڕین یان تەنانەت لاوازکردنی پەیوەندی نێوان ماتماتیك و فەلسەفە کارێکی نەکردە بوو، چونکە ماتماتیك "تاجی شانازی عەقڵی مرۆڤ" و مایەی دڵنیایی و زامنی واقعی ئەم عەقلەبوو. لەگەڵ ئەمەشدا هێواش هێواش ئەوە روون دەبۆوە کە لەم دەسەڵاتە سەربەخۆیەی ماتماتیکیشدا، سنورداریێتیەك هەیە، واتە ماتماتیك نمونەی عەقڵی مرۆڤە، بەلاّم لەهەمانکاتدا لەرووی ناوەرۆکەوە هەموو پانتایی عەقڵ پیشانانادات. لێرەدا جۆرێك بیرکردنەوەی نامۆ دروستدەبێت کە پێدەچێت لەدوو هێزی تەواوی بەرامبەر بەیەك وروژاوە. بیرکردنەوەی فەلسەفی هەوڵدەدات هەم خۆی لەدەسەلاّتی ماتماتیك رزگار بکات و لەلایەکی دیەوە هەوڵدەدات بەمکارە نکوڵی لەم دەسەلاّتە نەکات، بەڵکو لەروانگەیەکی دیەوە رەوایەتی پێببەخشێت. فەلسەفە لەهەردوو کاردا سەردەکەوێت، چونکە لەسەردەمی تازەدا شیکردنەوەی رووت لەمانا







بنەڕەتیەکەیدا بە ناونیشانی بناغەی بیرکردنەوەی ماتماتیکی دەناسرێت، لەهەمانکاتدا ئەمجۆرە شیکردنەوەیە رێك لەبەر بەکارهێنانی گشتی، لەسنوری بابەتی ماتماتیکی روت – لەسنوری چەندایەتی و ژمارەوە – تێدەپەڕێنرێت. دەکرێ لەهەمان سەدەی حەڤدەدا سەرەتای ئەم ڕێ و رەسمە دیاری بکرێت. باسکال لەکتێبی "لەبارەی رۆحی ئەندازیاریەوە" بە شێوەیەکی جدی هەوڵدەدات هێڵێکی ئاشکرا لەنێوان زانستی ماتماتیك و فەلسەفەدا بکێشێت و "رۆحی ئەندازیاری" لەبەرامبەر "رۆحی ناسکدا" دادەنێت و دەیەوێت پیشانیبدات کە ئەم دوو رۆحە، چۆن لەرووی بونیادەوە لەیەکجیاوازن. بەلاّم ئەم هێلەئاشکرا سنوریە، زۆر بە زووی پێشێلدەکرێ. بۆ نموونە فۆنتێل لەپێشەکی کتێبەکەیدا "لەبارەی سودی ماتماتیك و فیزیادا" دەنوسێت: "رۆحی ئەندازیاری تەنها تایبەت نیە بە ئەندازیاری کە نەتوانرێ لەئەندازیاری جیابکرێتەوەو لەبوارەکانی دیدا بەکاربهێنرێت. کتێبێك لەبارەی ئەخلاق، سیاسەت، رەخنەی ئەدەبی یان تەنانەت هونەری رەوانبێژیەوە ئەگەر بە رۆحی ئەندازیاری بنوسرێت زۆر جوانتر و کاملّتر دەبێت". سەدەی هەژدە رووبەروی ئەم کێشەیە دەبێتەوە و بەو دەرئەنجامە دەگات کە "رۆحی ئەندازیاری" مادام کە مەبەست لێی رۆحی شیکردنەوەی رووت بێت، لەرووی بەکارهێنانەوە بەهیچ شێوەیەك سنورێکی نیە و بەهیچ شێوەیەك نەبەستراوە بە بوارێکی تایبەتی زانینەوە.

هۆی ئەم حوکمە لەدوو ئاراستەی جیاوازدا دەپشکنن. شیکردنەوە کە تا ئەو کاتە هێزەکەی لەبواری ژمارە و چەندایەتیدا تاقیدەکرایەوە، لەلایەکەوە بۆ چارەسەری پرسەکانی دەروننانسی بەکاردەهێنن و لەلایەکی دیەوە بۆ چارەسەری پرسەکانی کۆمەڵناسی. لەهەردوو حاڵەتدا دەبوو پیشانیبدەن کە ئاسۆی تازە دەکرێتەوە و زەمینەیەکی تازە کە یەکجار گرنگە، دەکەوێتە بەردەست عەقڵ. ئەمکارەش کاتێك دەستەبەر دەکرێت کە عەقڵ فێربێت چۆن میتۆدی ئەناتۆمی شیکاری و سەرلەنوێ بونیادنانەوەی پێکهاتەیی لەو بوارەدا بەکاربهێنێت. بەلاّم پێدەچێت واقعیەتی دەروننانسی وەك پێدراوێکی ئەزمونی راستەوخۆ، مل بۆ هەوڵێکی لەم چەشنە نەدات. ئەم واقعیەتە بە زۆریەکی

بێئەندازەو بە هەمەڕەنگیەکی بێ کۆتاییەوە، بۆمان دەردەکەوێت. هیچ رەگەز و هیچ وێنەیەکی ئەزمونی دەروننناسی وەك ئەوی دی نیە و ناوەڕۆکەکەشی بەیەك ریتم دوبارە نابێتەوە. لەرووداوەکانی دەروننناسیدا هیچ دوو شەپۆلێك بە یەك شێوە دەرناکەون، وەك ئەوەی هەر شەپۆلێك لەهیچەوە دروستببێت و ترسی ئەوەش هەیە دوبارە لەهیچدا وون ببێت. لەگەڵ ئەمەشدا بەپێی تێڕوانینی باوی سەدەی هەژدە بۆ دەروننناسی، ئەم هەمەڕەنگیە رەهایە، ئەم جیاوازیە، لەوەهمێك زیاتر نیە. بە وردبینیەکی زیاتر دەردەکەوێت کە لەژێر گۆڕان و گۆڕانی بێ سنوری دیاردە دەروننناسیەکاندا، زەمینێکی پتەو و کۆمەڵێك رەگەزی سەقامگیر راوەستاوە. ئەرکی زانست ئەوەیە کە ئەو رەگەزانەی ئەزمونی راستەوخۆ غافڵ دەبێت لێیان، بدۆزێتەوە و بە روونی یەك بەیەکیان بخاتە بەرچاوی ئێمە. لەرووداوە دەروننناسیەکاندا هیچ جیاوازی و هەمەرەنگیەك بوونی نیە کە نەتوانرێ بە کۆمەڵێك پارچەی تەنیا راڤە نەکرێت، هیچ بونەکی (صیرورە)یەك لەئارادا نیە کە لەبوونی بەردەوامەوە سەرچاوەی نەگرتبێت. ئەگەر ئێمە بەدوای وێنەکانی دەروننناسیدا تا بنەماکان و سەرچاوەکانیان بچین، هەمیشە بەم یەکێتی و سادەییە دەگەین. سەدەی هەژدەهەم لەم بڕوایەدا هەنگاوێك لەمامۆستاکەی خۆی، لۆك، زیاتر دەڕوات. لۆك بەوە قانع بوو کە دوو سەرچاوەی سەرەکی بۆ دیاردە دەروونناسیەکان هەیە: سەرەڕای "هەست"، وێنەیەکی سەربەخۆ و قابلی راڤەنەکردنیش لەئەزمونی دەروننناسیدا هەیە کە لای لۆك "بیرکردنەوە"یە. بەڵام قوتابیان و پەیڕەوانی لۆك لەرێگەی جیاوازەوە هەوڵدەدەن ئەم دوالیزمە لەناوبەرن و بە بنەمایەکی یەکتا لەدەروننناسیدا بگەن. بارکلی و هیوم دوو زاراوەی "هەست" و "بیرکردنەوە" لە"هوشیاری"دا تێکدەئاڵێنن و هەوڵدەدەن دەریبخەن ئەم وشەیە هەم ئەزمونی دەرەکی و هەم ئەزمونی دەرونی ئێمە بە تەواوی لەخۆ دەگرێت و هەردوو دەستە پێدراوەکانی سروشت و پێدراوەکان هزری خودی ئێمە، ئاشکرا دەکات. کۆندیاك بڕوای وایە گرنگی ئەو بەسەر لۆکدا و ئەو هەنگاوەی لەلۆك زیاتری هەڵهێناوە بریتیە لەوەی میتۆدی گشتی لۆك دەپارێزێت و ئەم میتۆدە لەزەمینەیەکی تازەی فاکتە دەروننناسیەکاندا پەرەپێدەدا. هونەری شیکاری لۆك دەتوانێت ئەناتۆمی







خەیاڵەکان بکات، بەڵام پتر لەمە ناڕوات. ئەم شیکردنەوەیە پیشانیدەدات کە چۆن هەر بیرکردنەوەیەك، چەند ئاڵۆزیش بێت، لەکەرەسەی هەست و بیرکردنەوە پێکهاتووەو چۆن ئەم کەرەسانە دەبێت پێکەوە بگونجێنرێت تا وێنەی جیاوازی دیاردە دەروننناسیەکان بەدەست بێت. بەڵام وەك کۆندیاك پیشانیدەدات، لۆك لەسەر شیکردنەوەی وێنە دەروننناسیەکان دەوەستێتو بە سنوردارکردنی لێکۆڵینەوەکەی خۆی بەم وێنانە، ناچێتە ناو هەموو بواری رووداوەکان و چالاکیە دەروننناسیەکان یان بۆ سەرچاوەکانیان. کەوابوو لێرەدا زەمینەیەك هەیە بۆ لێکۆڵینەوە، بە زەخیرەیەکی زۆرەوە کە پێشتر هێندە لێی نەکۆڵیونەتەوە. لەدەروننناسی لۆکدا ئەو دوو دەستە چالاکیە دەروننناسیانە وازیان لێدەهێنرێت: ئەمانە هەمەکی رەسەن و قابیلی راڤەکردن نین، وەك پێدراوە سادەکان هەست پێدراوەکانی بینین، بیستن، لەمسکردن، چەشتن و بۆنکردن. بینین و بەراوردکردن، پاککردن، پێکهاتن، خواستن و ویستن لەروانگەی لۆکەوە کرداری تاکانە و سەربەخۆن کە تەنها لەئەزمونی سەربەخۆدا بونیان هەیە و قابیلی راڤەکردن نین بۆ شتێکی دی. بەڵام ئەم روانگەیە هەموو سودەکانی میتۆدی لێوەرگرتن (اشتقاق) لەناو دەبات. چونکە بوونی دەروننناسی وەك شتێکی چەند رەهەند کە قابلی راڤەکردن نیە، دەمێنێتەوە کە دەکرێ وێنە جوزئیەکانی وەسفبکرێت، بەڵام چیدی نە دەکرێت روونبکرێتەوە و نە دەکرێت لەچۆنایەتیە سادە سەرەتایەکانەوە وەربگیرێت. ئەگەر ئەم لێوەرگرتنە (اشتقاق) بە شتێکی جدی وەربگرین، کەوابوو ئەو رێبازەی لۆك لەبواری بیرکردنەوەکاندا بەکاری دێنێ، دەبێت لەبارەی هەموو کردارەکانی هزرەوە، بەکاربهێنرێت. هەروەها دەبێت دەربخرێت کە راستەوخۆیی ئەم بیرکردنەوانە شتێکی وەهمیە کە لەبەرامبەر شیکردنەوەی زانستیدا ناتوانێت خۆی رابگرێت. کردارە تاکانەکانی هزر کاتێك شیدەکرێنەوە، بەهیچ شێوەیەك رەسەن نین، بەڵکو لێوەرگیراو و ناڕاستەوخۆن. دەبێ بۆ ناسینی بونیاد و ماهیەتی راستەقینەی ئەم کردارانە، رەوتی دروستبونیان تاوتوێبکەین، دەبێ ببینین هزر چۆن لەکۆمەڵێك پێدراوی هەستی سادە کە وەریدەگرێت، هێواش هێواش توانای تێبینیکردنی ئەم دیاردانە و توانای بەراوردکردن و پاککردنەوە

و جیاکردنەوە و پێکهاتنیان پەیدا دەکات. ئامانجی "وتارێك لەبارەی هەستەکانەوە" کە بەرهەمی کۆندیاکە، هەر ئەمەیە. لێرەدا پێدەچێت میتۆدی شیکاری بە سەرکەوتنێکی تازە لەرونکردنەوەی زانستی سروشتیدا. هەنوکە جیهانە مادی و مەعنەویەکان بەحساب بە دەرگایەکی هاوبەش ڕاڤەکراوون و هەردوو جیهانەکە لەرەگەزی چونیەك دروستکراون و پێکهاتنیان بەپێی کۆمەڵێك یاسای چونیەك ئەنجامدراوە.

بەڵام سەرەڕای ئەم دوو جیهانەی واقع، جیهانێکی سێهەمیش هەیە کە دیسان نابێت بەهەمان شێوە بە دروستکراو لەپێدراوە هەستیە سادەکانی بزانین، بەڵکو دەبێت بە بنەماکانی بگەین. چونکە ڕاڤە کردنی ئەم واقعە بە حکومەتی یاسا و عەقڵ، تەنها بە لێکۆڵینەوە لەسەرچاوەکانی دەستەبەر دەکرێت. ئەم جیهانە سێهەمەی واقع هەمان ئەو شتەیە کە لەبونیادی کۆمەڵگا و دەوڵەتدا تێبینی دەکرێت. مرۆڤ لەجیهاندا دێتە دنیاوەو لەخوڵقاندن و فۆرمەلەکردنی ئەم جیهانەدا دەستی نیە، بەڵکو بە دەوری خۆیدا بەدروستکراوی دەیبینێت و چاوەڕوانی ئەوەی لێدەکرێت کە خۆی لەگەڵ سیستەمی هەبوودا بگونجێنێ. بەڵام لێرەشدا تەسلیم بوون و ڕازیبوون سنوری تایبەتی خۆی هەیە. هەر ئەوەندەی توانای بیرکردنەوە لەمرۆڤدا پەیدا بوو، بە ویست و ناویست لەبەرامبەر ئەم شێوەیەی واقعدا ڕادەپەڕێت و بۆ دادگای بیرکردنەوەی ڕادەکێشێت و بانگەشەی لەسەر هەق بوون و ڕەوایەتیەکەی دەخاتە ژێر ڕەخنەوە. کۆمەڵگاش دەبێت لەبەرامبەر لێکۆڵینەوەدا وەك واقعی مادی سەری تەسلیمبوون نەوی بکات. جارێکی دی شیکردنەوەی بابەت بۆ بەشە پێکهێنەرەکانی دەست پێدەکات، و ئیرادەی گشتی دەوڵەت بەشێوەیەك دەخاتە ژێر باسەوە وەك ئەوەی لەئیرادەی تاکەکان دروست بووبێت و لەسەر بناغەی یەکێتی ئەم ئیرادانە دروست بووبێت. تەنها لەسەر بناغەی ئەم گریمانە سەرەکیەیە کە ئێمە دەتوانین دەوڵەت وەك "چوارچێوەیەك" لەبەرچاو بگرین و هەمان ئەو میتۆدە لەبارەیەوە بەکاربهێنین کە سودەکەی لەدۆزینەوەی یاسای هەمەکی لەجیهانی مادیدا، سەلمێنراوە. هۆبز پێشتر ئەم کارەی کردبوو. بنەمای سەرەکی تیورە سیاسیەکەی، ئەوەی کە دەوڵەت جۆرێك "چوارچێوەیە"، ڕێك







بەم مانایەیە: واتە هەمان ئەو ڕەوتی بیرکردنەوەیەی ئێمە بۆ دیاریکردنی وردی ماهیەتی جیهانی واقعی ڕێنمایی دەکات، دەکرێت بێ دوو دڵی لەبارەی دەوڵەتیشەوە بەکاربهێنرێت. ئەو وتەیەی هۆبزیش کە بیرکردنەوە بەشێوەیەکی گشتی "حسابکردنە"و ئەوەی هەر حسابکردنێکیش یا کۆکردنەوەیە و یان دەرکردن، دیسان لەبارەی بیرکردنەوەی سیاسیەوە ڕاست دەردەچێت. ئەم بیرکردنەوەیەش دەبێت زنجیرەی پەیوەندی ئیرادە تاکەکەسیەکان پارچە پارچە بکات تا بە میتۆدی تایبەتی خۆی جارێکی دی پێکەوەیان بنێت. بەمشێوەیە هۆبز "دۆخی مەدەنی" دەگۆڕێت بۆ "دۆخی سروشتی" و لەئاستی بیرکردنەوەدا بە سڕینەوەی هەموو پەیوەندیەکانی ئیرادە تاکەکەسیەکان، جەنگی کاملی هەموویان یان "جەنگی هەموو دژی هەموو"ی بۆی دەمێنێتەوە. بەڵام هۆبز بەهۆی ئەم نەفیەوە، ناوەڕۆکی پۆزەتڤیزمی یاسای وڵات و بایەخی بێسنور و بێمەرجی ئەم یاسا هەڵدەهێنجێنێ. هۆبز ڕونیدەکاتەوە کە چۆن ئیرادەی دەوڵەت لەوێنەی پەیمانێکدا دەردەکەوێت، چونکە ئەم ئیرادەیە تەنها لەسەر بناغەی پەیمان ڕاوەستاوەو تەنها بەهۆی پەیمانەوە دەناسرێت. ئەمە هەمان ئەو زنجیرەیەیە کە ڕای هۆبز لەبارەی سروشتەوە بەڕای ئەو لەبارەی دەوڵەتەوە پێکەوە دەبەستێتەوە. ئەم ڕایانە بەکارهێنانە جیاوازەکانی گریمانە سەرەکیەکەی هۆبزن کە دەڵێت هزری مرۆڤ تەنها ئەو شتەی بەڕاستی ناسیووە کە بتوانێت لەرەگەزە سەرەکیەکانی دروستیبکات. کەوابوو هەر فۆرمەلەیەکی ڕاستگۆیانەی چەمکێك، هەر پێناسێکی کامڵ، دەبێ لەم خاڵەوە دەست پێبکات و تەنها دەتوانێت پێناسێکی "هۆکاریی" (علی) بێت. فەلسەفە بەشێوەیەکی گشتی بە بەرهەمی کۆی ئەمجۆرە پێناسە هۆکاریانە دەناسرێت، واتە فەلسەفە هیچ نیە جگە لەزانینێکی تەواو لەبارەی هۆکارەکان لەرێگەی هۆکانەوە، لەبارەی دەرەنجامەکانەوە لەرێگەی پێشەکیەکانی و مەرجەکانیەوە.

ڕای سەدەی هەژدەهەم لەبارەی دەوڵەت و کۆمەڵگاوە بەدەگمەن ناوەڕۆکی بۆچونەکەی هۆبز بێ چەند و چون قبوڵدەکات، بەڵام ئەو شێوەیەی کە هۆبز ئەم ناوەڕۆکەی تیا پێشکەش کرد، کاریگەرییەکی بەهێز و سەقامگیری هەبوو. بیرکردنەوەی سیاسی سەدەی هەژدەهەم لەسەر تیورەی پەیمان ڕاوەستاوە کە

گریمانە بنەڕەتیەکانی لەبیرکردنەوەی کلاسیکی و سەدەکانی ناوەڕاستەوە، وەرگیراوە. بەڵام سەدەی هەژدەهەم ئەم گریمانانە بەشێوەیەك کە نیشانەی کاریگەری تایبەتی تێڕوانینی زانستی جیهانیە لەسەردەمی تازەدا، پەروەردە دەکات و گۆڕانی بەسەردا دێنێت. لەم بوارەشدا میتۆدی شیکردنەوە و پێکهێنان، بەسەر مەیدانەکەدا زاڵە. کۆمەڵناسی لەسەر رووی نمونەی فیزیا و دەروونناسی شیکاری، بینا دەکرێت. کۆندیاك لە"نامەیەك لەبارەی سیستەمەکانەوە" دەڵێت میتۆدی کۆمەڵناسی ئەوەیە فێرمان بکات کۆمەڵگا وەك "چوارچێوەیەکی دروستکراو"ی پێکهاتوو لەکۆمەڵێك بەش بناسین کە بەشێوەیەکی دولایەنە کار لەیەك دەکەن. کۆی ئەم چوارچێوەیە دەبێ بەشێوەیەکی لێبێت کە هیچ چینێکی هاولاتیان بە ئیمتیازە تایبەتیەکانی خۆیان، هاوسەنگی و هاوئاهەنگی هەموو چوارچێوەکە تێکنەدەن، بەڵکو بە پێچەوانەوە هەموو بەرژەوەندییە تایبەتیەکان، لەخزمەتی کۆی کۆمەڵگادا بێت و ملکەچی ئەو بێت". فۆرمەلەکردنی بابەتەکە بەمشێوەیەیە، بە مانایەك پرسی کۆمەڵناسی دەگۆڕێت بۆ مەسەلەیەك لەزانستی ستاتیك (وەستاو). مۆنتیسیکۆ لە"رۆحی یاساکاندا" ئەم گۆڕانە بە بەرزترین ئەرکی خۆی دەزانێت. ئامانجی کتێبەکەی مۆنتیسیکۆ تەنها ئەوە نییە کە وەسفی شێوە و جۆرەکانی حکومەتی دیسپۆتیزم، پاشایەتی دەستوری و کۆماری بکات و بەشێوەیەکی ئەزمونی پێشکەشیان بکات، بەڵکو ئامانجێکی دی ئەوەیە ئەم شێوانەی حکومەت بەهۆی هێزە پێکهێنەرەکانیەوە دروستبکات. ئەگەر بمانەوێت ئەم هێزانە بە دروستی بەکاربێنین، ئەگەر بمانەوێت دەریبخەین چۆن ئەم هێزانە لەبونیادی حکومەتدا بەکاربهێنرێت کە مەرجی دابینکردنی زۆرترین رادەی ئازادی مسۆگەر بکات، دەبێت بیانناسین. بەو شێوەیەی مۆنتیسیکۆ هەوڵدەدات دەریبخات، ئەم ئازادیە تەنها کاتێك دەشێت کە هەر دەسەلاتێك بەهۆی دەسەلاتێکی دیەوە سنوردار و کۆنترۆڵ بکرێت. رای بەناوبانگی مۆنتیسیکۆ لەبارەی "جیاکردنەوەی دەسەلاتەکان" هیچ نیە جگە لەپەروەردەکردنی رێکخراو و بەکارهێنانی ئەم بنەما سەرەکیە. ئەم ڕایە دەیەوێت ئەو هاوسەنگیە ناسەقامگیرەی کە لەشێوە کەموکوڕەکانی دەوڵەتدا هەیە و روی ئاشکرای ئەم گرفتەیە، بەجۆرێك







هاوسەنگی سەقامگیر بگۆڕێت. هەروەها هەوڵدەدات پیشانی بدات کە لەنێوان یەك بەیەکی دەسەلاتەکاندا، چ جۆرە پەیوەندیەك هەبێت، بۆ ئەوەی هیچ یەکێکیان بەسەر ئەوی دیدا زاڵ نەبێت، و بە خونساکردنەوەی کێشی یەکدی، فراوانترین دەرفەت بۆ ئازادی دروستبکەن. ئەو ئامانجەی مۆنتیسیکۆ لەتیورەی دەوڵەتەکەیدا وێنەی دەکات، بەمشێوەیە ئامانجی "حکومەتی تێکەڵاوە" کە تیایدا بۆ رێگەگرتن لەدیسپۆتیزم، شێوەی تێکەڵاو بە وریایی و زیرەکیەکی واوە هەڵدەبژێرێت کە هەر ئەوەندەی دەسەلاتێك بە ئاراستەیەکدا کەوتە کار، هێزێکی بەرامبەر دەکەوێتە کار و بەمشێوەیە هاوسەنگی پێویست دەپارێزرێت. مۆنتیسیکۆ بڕوای وایە بەم پرۆسەیە دەتوانێت هەمەڕەنگی و جیاوازی گەورەی شێوە هەبوەکانی حکومەت، لەبونیادێکی عەقڵی پتەودا بگونجێت و لەم بونیادەشدا کارکردنیان لەژێر کۆنترۆڵ و ویستی مرۆڤدا بێت. ئەم بینا و ئارایشە سەرەکیە، ئامانجی مۆنتیسیکۆیە. لەپێشەکی "رۆحی یاساکاندا" دەنوسێت: "من بنەماگەلێکم داناوە و تێبینیم کردووە کە بابەتە جیاوازەکان دەڵێی خۆ بەخۆ پەیڕەوی لەم بنەمایە دەکەن. بینیومە مێژوەکانی هەموو نەتەوەکان هیچ نیە جگە لەکۆمەڵێك فەسڵی بەدوای یەکدا هاتوو. هەر یاسایەك پەیوەندی بە یاسایەکی دیەوە هەیە یان بە یاسایەکی گشتی ترەوە بەستراوەتەوە".

بەمشێوەیە لەم لقەی زانستیشدا میتۆدی عەقڵ هەمان میتۆدی زانستی سروشتی و دەروونناسیە. واتە لەفاکتی پتەوی دامەزراو لەسەر تێبینیکردنەوە دەست پێدەکات، بەڵام لەسنوری فاکتی روتدا نامێنێتەوە. تەنها هاوکاتبوونی ئەم فاکتانە، دەبێت ببێت بە جۆرێك حەدس، دەبێت لەپێکەوەبوونی ئەم فاکتانەوە لەسەرەتای کاردا، پاش تاوتوێکردنی وردتر، جۆرێك پەیوەستبوونی دولایەنە ئاشکرا بێت. بنەماگەلێك کە دەبێت لەهەموو جێگەیەکدا بۆیان بگەڕێین و بێ بوونیان هیچ زانینێکی راست لەهیچ بوارێکدا، مومکین نیە، سەرەتاگەلێك نین لەبواری بیرکردنەوەدا کە بەشێوەیەکی بێهودە هەڵبژێرابن و بەزۆر بەسەر تاقیکردنەوەی کراودا بسەپێنرێن و ئەزمون بەپێی پێویستیەکانی (ئەو بنەمایانە) بگۆڕێت. بنەماکان بریتین لەکۆمەڵێك هەلومەرجی هەمەکی کە

شیکردنەوەی کاملّی فاکتە دیارەکان، دەبێت پێیان بگات. کەوا بوو لەفیزیادا وەك دەروونناسی و سیاسەت، رەوتی بیرکردنەوە جوڵەیە لەبەشەوە بۆ هەمەکی، بەلاّم هەر ئەو جوڵەیەش مومکین نابێت مەگەر ئەو کاتەی هەر بەشێك وەك بەش ملکەچی رێسایەکی هەمەکی بووبێت، مەگەر ئەوەی لەسەرەتاوە هەمەکی لەبەشدا هەبوبێت. چەمکی "بنەما" خۆبەخۆ ئەو خەسڵەتە رەهایەی نیە کە لەسیستەمە میتافیزیکیە مەزنەکانی سەدەی حەڤدەدا دەرکەوت. هەنوکە ئیدی ئەم چەمکە بایەخێکی رێژەیی هەیە و تەنها پیشاندەری دوا خاڵی کاتیە کە رەوتی بیرکردنەوە پێیگەیشتووە — ئەویش بە کۆتی ئەو تێبینیەی کە ئەندێشە دەتوانێت واز لەم خاڵەش بهێنێت و تێیپەڕێنێت. لێرەوە رێژەگەری، بنەمای زانستی پشتی بە پایە و وێنەی زانین بەستووە، وەك چۆن مومکینە بابەتێك لەزانستێکدا وەك بنەما دەرکەوێت و هەمان بابەت لەزانستێکی دیدا وەك دەرئەنجام دەرکەوێت. "کەوابوو بەو دەرئەنجامە دەگەین کە سنوری پشکنینی بنەماکانی هەر زانستێك، بەپێی ماهیەتی خودی ئەو زانستە دیاری دەکرێت، واتە بەپێی ئەوەی ئەو زانستە تایبەتە لەکوێوە بە باسەکەی خۆی دەگات.. من بڕوامواییە لەم دۆخەدا ئەو بنەمایانەی کە جوڵەکەی خۆمانی لێوە دەست پێدەکەین، رەنگە خۆیان شتێکی ئەوتۆ نەبن مەگەر دەرئەنجامی زۆر دوری کۆمەڵێك بنەمای راست، کە بۆ ئێمە ئاشکرا نین، رەنگە هەر لەبەر ئەمەش پتر شایستەی ئەوەبن بە دەرئەنجام ناویان بەرین تا بە بنەماکان. بەلاّم پێویست ناکات کە ئەم دەرئەنجامانە خۆبەخۆ ناو بنێن بنەماکان، ئەوەندە بەسە بۆ ئێمە وابن". ئەمجۆرە رێژەگەریە لەسنوری خۆیدا مەترسیەکانی گۆمانکاری تێدا نیە، بەڵکو بە پێچەوانەوە تەنها دەرکەوتنی ئەو راستیەیە کە عەقڵ لەرەوتی بەردەوامی خۆیدا، رێگرێکی پتەو و سەخت ناناسێت و هەر ئامانجێکی روکەشی کە عەقڵ بە دەستی دێنێت، هیچ نیە جگە لەسەرەتای رێگەیەکی تازە.

بەمشێوەیە ئاشکرایە گەر ئێمە بیرکردنەوەی سەدەی هەژدە بە بیرکردنەوەی سەدەی حەڤدە هەڵسەنگێنین، هیچ درزێکی راستەقینە لەنێوان ئەم دوو قۆناغەدا نابینین. ئامانجی زانین بەشێوەیەکی بەردەوام و رێکخراو لەو پێشگریمانانە پێکدێت کە لۆژیك و تیورەی زانینی سەدەی حەڤدە — بەتایبەتی





لەبەرهەمەکانی دیکارت و لایبنیتسدا — بونیادیان نابوو. جیاوازی لەشێوەی بیرکردنەوەدا بە مانای ئەوە نییە جۆرێك گۆڕانی بنەڕەتی رویدابێت. ئەم گۆڕانە تەنها بە مانای گواستنەوەی جێگەی جەختکردنە. ئەم جەختکردنە بەردەوام لەهەمەکیەوە بەرەو بەش و لەبنەماکانەوە بەرەو دیاردەکان، دەجوڵێت. بەلاّم گریمانەی سەرەکی لەجێی خۆیدا دەمێنێتەوە — واتە ئەو گریمانەیەی کە لەنێوان دوو بواری بیرکردنەوەدا، ناکۆکی نیە، بەڵکو پەیوەندیەکی دولایەنە هەیە، مەگەر لەگومانکاری هیومدا کە پرۆسەیەکی تەواو جیاواز دەهێنێتە پێشیٚ. بڕوابوون بە عەقڵ لەهیچ حاڵەتێکدا زیانی پێناکەوێت. گریمانەی عەقلاّنی یەکێتی، بەسەر هزری ئەم سەردەمەدا زاڵە. چەمکی یەکێتی و چەمکی زانستی بەشێوەیەکی دولایەنە پێکەوە بەستراون. دالامبێر لەدووبارەکردنەوەی رستە سەرەتایەکانی "رێساکانی رەفتاری تێگەیشتن"ی بەرهەمی دیکارتدا دەڵێت: "هەموو زانستەکان پێکەوە هیچ نین مەگەر هوشیاری مرۆیی کە هەمیشە هەمان شتە کە هەبووە و هەمیشە لەگەڵ خودی خۆیدا هاوشوناس بووە، هەرچەندە ئەو بابەتەی کە هوشیاری تیا بەکاردێت جیاوازیش بێت". سەدەی حەڤدەهەم پتەوی دەرونی خۆی — بەتایبەتی پتەوی بینراو لەکلتوری کلاسیکی فەرەنسادا — قەرزاری ئەو هێز و سەقامگیریەیە کە لەنوسان بە گریمانەی یەکێتی و بلاّوبونەوەی بەکارهێنانی لەهەموو بوارەکانی زانین و ژیاندا، پیشاندەدات. ئەم گریمانەیە نەك لەزانستدا، بەڵکو لەدین و سیاسەت و ئەدەبیاتیشدا زاڵ بوو. "یەك پاشا، یەك یاسا، یەك دین"، ئەمە بوو دروشمی ئەو قۆناغەی باسی دەکەین. بە گەیشتنی سەدەی هەژدە زاڵبوونی رەهای بنەمای یەکێتی بە روکەش لاواز دەبێت و هەندێك سنورداریێتی قبوڵدەکات و خاکیتر دەبێت. بەلاّم ئەم گۆڕانکاریانە لەگەڵ ناوەڕۆکی بیرکردنەوەی سەدەکەدا پەیوەندی دروستناکات، چونکە یەکێتی بەخشین بە شتەکان هەروا بە دەوری سەرەکی عەقڵ دەناسرێت. رێکخستن و دیسپلینکردنی پێدراوەکانی ئەزمون بێ یەکێتی بەخشینی ورد، مومکین نییە. "ناسین"ی پۆلێك ئەزموون واتە دانانی بەشە دروستکەرەکانی لەپەیوەندیەکی وادا لەگەڵ یەکدی کە بە دەستپێکردن لەخاڵێکی دیاریکراوەوە، بکرێت بەپێی رێسایەکی هەمەکی لەهەر هەموویان





تێپەڕین. دیکارت پێشتر ئەمجۆرە ناسینە بەڵگاندنەی بەناوی پێوەری سەرەکی زانینی ماتماتیکیەوە سەقامگیر کردبوو. بەبڕوای دیکارت هەر کارێکی ماتماتیکی لەدوا شیکردنەوەدا دەیەوێت ڕێژەی نێوان چەندایەتیەکی نەناسراوو چەندایەتیە ناسراوەکان، دیاری بکات و ئەم ڕێژەیەش تەنها کاتێك بەوردی دیاریدەکرێت کە ناسراو و نەناسراو لە"ماهیەتی هاوبەشدا" بەشداربن. هەردوو ڕەگەزی ناسراو و نەناسراو دەبێت قابیلی ڕاڤەکردن بن بۆ چەندایەتیەك. لەمڕووەوە دەبێ بکرێ لەدووبارە بونەوەی یەکەیەکی ژمارەییدا، بەدەستبێن. بەمشێوەیە زانینی بەڵگاندنی لەجۆرێك ڕاڤەکردن بۆ بنەما دەچێت، واتە لەئاڵۆزەوە بۆ سادە و لەفرەیی روکەشیەوە بۆ یەکێتی سەرەکی، دەجوڵێت. بیرکردنەوەی سەدەی هەژدە بە توندی بەم میتۆدەوە دەنوسێت و هەوڵدەدات لەبواری فراوانتری زانیندا، بەکاری بهێنێت. بەمشێوەیە "حساب" (calculus) مانا ماتماتیکیە روتەکەی لەدەست دەدات. "حساب" تەنها لەگەڵ چەندایەتی و ژمارەکاندا ناگونجێت، بەڵکو لەبواری چەندایەتیەکانەوە دەچێتە ناو بواری چۆنایەتیەکانەوە. چونکە دەکرێ چۆنایەتیەکانیش لەپەیوەندیەکدا بەیەکەوە دابنرێن کە هەریەکێکیان لەوی دیەوە بە تەرتیبێکی ورد، وەربگیرێت. هەرکاتێك ئەم شتە دەستەبەر بکرێت، دیاریکردنی یاسا گشتیەکانی ئەم تەرتیبە ئەو توانایەمان پێدەبەخشێت، روانگەیەکی روونی هەموو دامێنی بایەخی ئەم یاسایانە بهێنینە پێشچاوی خۆمان. لێرەوە دامێنی چەمکی "حساب" لەگەڵ خودی چەمکی زانستدا بەیەك ئەندازە بڵاوە و لەهەر شوێنێکدا کە بکرێت هەلومەرجەکانی پۆلێك ئەزمون بەهۆی کۆمەڵێك پەیوەندی دیاریکراوەوە ڕاڤە بکرێن و لێرەوە بە تەواوی دیارییبکرێن، "حساب" بەکاردەهێنرێت. کوندیاك کە ئەم چەمکە زانستیە گشتیەی بۆ یەکەمجار لەوتاری "زمانی حسابدا" بەرونی فۆرمەلەکرد، لەدەروونناسیەکەیدا هەوڵیدا نمونەیەکی دیار و بەکارهێنانێکی پڕ بەرهەمی ئەم چەمکە بەدەستەوە بدات. لەلای کۆندیاك کە لایەنگری چەمکی دیکارتی دەرونی نامادی و رۆحانیە، گۆمانێك لەوەدا نیە کە تێڕوانینی راستەوخۆی ماتماتیکی بۆ ئەزمونە دەرونیەکان مومکین نیە، چونکە بەکارهێنانی راستەوخۆی چەمکەکانی چەندایەتی تەنها لەجێیەکدا بایەخی





هەیە کە خودی بابەتی پشکنین لەکۆمەڵێك بەش پێکهاتبێت و بکرێت بابەتەکە لەو بەشانە دروست بکرێت. ئەمکارەش تەنها لەبواری جەوهەرە جەستەیەکاندا قابیلی کردنە کە وەك بڵاوبنەوەی روت پێناسدەکرێت، نەك لەبواری جەوهەری بیرکەرەوە "قابیلی دابەشنەکردن". بەڵام ئەم روبەروبونەوە بنەڕەتی و نەگۆڕەی نێوان جەستە و دەرون، ناتوانێت ڕێگرێکی بەهێز بێت لەبەردەم بەکارهێنانی رووتی زانینی شیکاریدا. ئەم بەکارهێنانە، جیاوازیە مادیەکان فەرامۆش دەکات، چونکە بەهۆی ئەبستراکتی شێوەکەی و روکەشبونی ماهیەتی کارکردنیەوە، لەرووی ناوەڕۆکەوە بە هیچ گریمانەیەك سنوردار ناکرێت. تەنانەت گەر نەکرێ ئەزمونی دەرونی وەك ئەزمونی جەستەیی بۆ چەند بەشێك دابەشبکرێت، لەرووی خەیاڵەوە ئەم ئەزمونە بۆ ڕەگەزە پێکهێنەرەکانی شیدەکرێتەوە. بۆ ئەم مەبەستە ئەوەندە بەسە فرەیی روکەشیانەی ئەم دیاردەیە لەناوبەرین، لەو ڕێگەیەوە کە دەریبخەین ئەم ئەزمونە خوڵقاوێکی بەردەوامی سەرچاوەیەکی هاوبەشی هەموو دیاردە دەروونناسیەکانە. کۆندیاك بۆ بەڵگاندن ئەو نمونە بەناوبانگە دەهێنێتەوە کە دەکەوێتە ناوەندی دەروناسیەکەیەوە. واتە گریمانەی پەیکەرێکی مەڕمەڕی دەکات و رونیدەکاتەوە چۆن ئەم پەیکەرە هێواش هێواش زیندوو دەبێتەوە و لەسەرخۆ ناوەڕۆکێکی رۆحانی دەوڵەمەندتر پەیدا دەکات، چونکە یەك بەیەکی هەستەکان، چۆنایەتیە تایبەتیەکانی خۆیان لەسەر مەڕمەڕەکە دەکێشن.

کۆندیاك هەوڵدەدات دەریبخات کە زنجیرەی بەردەوامی "کاریگەریەکان" و تەرتیبی زەمەنی دەرکەوتنیان، بۆ دروستکردنی کۆی ئەزمونێکی دەرونی و دروستکردنی ئەم ئەزمونە بەهەموو دەوڵەمەندی و ناسکیەکانیەوە، بەسە. ئەگەر ئێمە بتوانین ئەزمونی دەرونی بەمشێوەیە دروستبکەین، لەهەمانکاتدا ئەم ئەزمونەمان بەهۆی چەمکی چەندایەتیشەوە، ڕاڤە کردووە. بەڵام هەموو ئەو شتانەی ئێمە ناوی دەنێین واقعی دەروونی و بەو ناونیشانەشەوە ئەزموونی بکەین، لەبنەڕەتدا دوبارەکردنەوە و گۆڕانی جۆرێك چۆنایەتی دیاریکراو دەریەت کە لەسادەترین تێگەیشتنی هەستیدا هەیە. تێگەیشتنی هەستی سنوری نێوان مەڕمەڕی بێگیان و بونەوەری زیندوە کە خاوەنی دەرون بێت.





بەڵام هەر ئەوەندە لەم سنورە تێپەڕی، چیدی پێویستمان بە گریمانەی زیاتر یان داهێنانێکی لەبنەڕەتدا تازە نیە. ئەوەی ئێمە بەشێوەیەکی باو بە توانا "مەزنترەکانی" هزری ناودەبەین و لەبەرامبەر هەستدا دایدەنێین، لەبنەڕەتدا تەنها گۆڕانی رەگەزی سەرەکی تێگەیشتنی هەستییە. بیرکردنەوە و داوەریکردن بەشێوەیەکی گشتی، ویستن و ئیرادەکردن بەشێوەیەکی گشتی، هەموو تواناکانی خەیاڵ و هەموو داهێنانە هونەریەکان، ئەگەر لەڕووی چۆنایەتیەوە تاوتوێبکرێن، هیچ شتێکی تازە و لەبنەڕەتدا جیاواز، بۆ ئەم رەگەزە سەرەکیە زیاد ناکەن. هزر نە شتێك دەخوڵقێنێ و نەشتێك دادەهێنێ، کاری هزر دوبارەکردنەوە و بینایە. بەڵام دەتوانێت لەم دوبارە کردنەوەیەدا دەسەڵاتێکی بەگشتی بێسنور لەخۆی پیشانبدات. ژیان دیاردەیەك تا هەر کوێیەك بووە پەرەپێدەدا، لەبێسنوری کات و شوێن تێدەپەڕێت، لەگەڵ ئەمەشدا لەدەرونی خۆیدا سەرقاڵی دروستکردنی شکڵی تازەیە. بەڵام هزر لەهەموو چالاکیەکانیدا تەنها سەرنج لەخۆی و "خەیالەسادەکانی" خۆی دەدات. ئەمانە کۆمەڵێك زەمینەی پتەون کە هەموو ئەو بینایەی هزر دروستی دەکات – چ لایەنە "دەرەکیەکان" و چ لایەنە دەرونیەکان – لەسەر ئەو دامەزراون و هزر هەرگیز ناتوانێت لەم زەمینە بچێتە دەرەوە.

هەوڵدانی کۆندیاك بۆ پیشاندانی ئەم مانایە کە واقعی دەرونی بەشێوەیەکی گشتی بریتیە لەگۆڕان و گۆڕانکاری تێگەیشتنی هەستی سادە، لەکتێبی "لەبارەی هزرەوە" بەرهەمی هلۆسیۆس، بەردەوام دەبێت. کاریگەری ئەم کتێبە لاوازە و ناداهێنەرە، بەسەر نوسینە فەلسەفیەکانی سەدەی هەژدەدا بەمشێوەیە روندەکرێتەوە کە ئەم کتێبە رەگەزێکی سەرەکی بیرکردنەوەی ئەو سەردەمە بە رونیەکی پڕ ماناوە، ئاشکرا دەکات، و تەنانەت لەم ئاستەشدا زیادەڕەوی دەکات و وێنەیەکی پڕوپوچی ئەو بیرکردنەوەیە پیشاندەدات. لەم زیادەڕەویەی هلۆسیۆسدا سنورداریێتی ئەبستۆلۆجی و مەترسی شاراوەی ئەمجۆرە بیرکردنەوەیە بە ئاشکرا دیارە. سنورداریێتیەکەی لەجۆرێك رەوتی بەیەك ریتم کردندایە کە دوور نیە نکوڵی لەدەوڵەمەندی هۆشیاری مرۆڤ بکات و بەجۆرێك بەرگی گۆڕینی لەبەرچاو بگرێت. بیرکردنەوەی شیکاری ئەم بەرگە گۆڕاوە لەبەر







دیاردە دەرونیەکان دادەکەنێت، ئەم دیاردانە رووت دەکاتەوەو بەمکارەش چونیەکییان لەروتیدا، لەبری فرەیی روکەشی و جیاوازی دەرونیان، ئاشکرا دەکات. جیاوازییە روکەشی و جیاوازی بەهاکانیان لەناو دەچێت. لەئەنجامدا لەبواری دیاردە دەرونیەکاندا چیدی ناکرێ باسی پلەی "مەزن" و "کەم" یان "بڵند" و "نزم" بکرێت. هەموو شتێك لەیەك ئاستدایە و لەرووی بەهاو بایەخەوە، یەکسانن. هلۆسیس ئەم هێڵی بیرکردنەوەیە بە تایبەتی لەبواری ئەخلاقدا دەباتە پێشێ. مەبەستی سەرەکی ئەو لەناوبردنی هەموو جیاوازیە دروستکراوەکانە کە رێکەوتن دروستیکردوون و بە توندی هەوڵی پاراستنی دەدەن. لەهەر شوێنێکدا کە ئەخلاقی کلاسیکی باسی پۆلێکی تایبەتی لەهەستە "ئەخلاقیەکان" دەکات، لەهەر شوێنێکدا ئەم ئەخلاقە جۆرێك "هەستی هاودەردی" رەسەن لای مرۆڤ دەدۆزێتەوە کە بەسەر شەهوەتە جەستەیی و خۆویستیەکانی مرۆڤدا زاڵ دەبێت و کۆنترۆڵیان دەکات، هلۆسیوس هەوڵدەدات پیشانیبدات ئەمجۆرە گریمانیە لەگەڵ واقعی سادەی هەست و کرداری مرۆییدا، نایەتەوە. هەر کەسێك بێ پێشداوەری لەم واقعە نزیك بێتەوە، دەبینێ ئەو دوالیزمە روکەشیە راست نیە. هەمیشە و لەهەموو شوێنێکدا هەمان وروژێنەری چونیەك دەبینێ. دەبینێ هەموو ئەو چۆنایەتیانەی بە لێبوردن و گەورەیی و فیداکاری ناودەبەین، جیاوازیان لەگەڵ ئارەزوە سەرەتاییەکانی سروشتی مرۆڤدا، لەگەڵ شەهوەتە "دزێوەکاندا"، تەنها لەناودایە نەك لەواقعدا. هیچ مەزنیەکی ئەخلاقی بڵندتر لەم ئاستە بوونی نییە، چونکە ئامانجەکانی ئیرادە چەند بڵندیش بن، و هەر بەهایەکی سەرو سروشتی سەرو هەستی کە ئیرادە وێنای بکات، ئەوا هەر مەیدانی کارەکەی هەمان بازنەی بەرتەسکی خۆویستی، زۆرویستن و لەخۆرازیبوونە. کۆمەڵگا لەسەرکوتکردنی ئەم ئارەزووە سەرەتایانەدا سەرناکەوێت، بەڵکو تەنها بڵندیان دەکاتەوە و تا ئەو جێگەیەی کە کۆمەڵگا کارکردنی خۆی دەناسێت، ئەمە دوا ئاستی چاوەڕوانی یان تکایە کە کۆمەڵگا کارکردنی خۆی دەناسێت، ئەمە دوا ئاستی چاوەڕوانی یان تکایە کە کۆمەڵگا لەتاکەکەسی بکات. لێکۆڵینەوەی تیوریش دەبێت هەر لەم دیدەوە ئەنجامبدرێت. بەبڕوای هلوسیۆس نە لەپۆلی بەها ئەخلاقیەکاندا پلەوپایەی

سەرەکی هەیە، و نە وێنەی تیوریش خاوەن پلەی بونیادیە. بە پێچەوانەوە هەموو ئەم جۆرە جیاوازیانە بەهەمان بێلایەنی هەست، راڤەدەکرێن. هێزەکانی هەڵسەنگاندن و ناسین، خەیاڵکردن و بیرەوەری، تێگەیشتن و عەقڵ، بەهیچ شێوەیەك هێزگەلێکی رەسەن و تایبەتمەندی دەروونی مرۆیی نین. لێرەشدا ئێمە دیسان توشی هەمان هەڵەبووین. واتە وا دەزانین لەپلەی تێگەیشتنی هەستی، سەروتر رۆیشتووین، لەکاتێکدا تەنها روکەشی ئەم هەستەمان کەمێك گۆڕییەوە. ئەو رەخنەیەی نکوڵی لەم گۆڕانە دەکات، لەجیاوازی تیوریش دەگیرێت. دەکرێ هەموو کردارەکانی هزر بە هەڵسەنگاندن راڤە بکەین و هەڵسەنگاندنیش هیچ نیە جگە لەتێگەیشتن لەچونیەکی و جیاوازی وێنا تاکانەییەکان. بەلاّم ناسینەوەی چونیەکی و جیاوازی، روداني کرداری هوشیاری رەسەن، بە پێشگریمانە وەردەگرێت کە لەگەڵ چۆنایەتی هەستیدا لەیەکدەچێت، یان چونیەکە. " من داوەریدەکەم یان تێدەگەم کە لەنێوان دوو شتدا ئەوەی من ناوی دەنێم "قۆڵ" کاریگەری لەسەر من جیاوازە لەو شتەی کە ناوی دەنێم "بست"، ئەو رەنگەش کە من ناوی "سوری" لێدەنێم کاریگەریەك لەچاوم دەکات جیاواز لەوەی کە ناوم ناوە "زەرد". کەوابوو لێرەوە دەگەمە ئەو ئەنجامەی کە لەم حاڵەتانەدا هەڵسەنگاندن هەمان دەرككردنە". وەك دەبینین لێرەدا بینای بەها ئەخلاقیەکان و بونیادی پلەلۆژیکیەکانی زانین، هەردوکیان وێران دەبن. هەردوو بونیادەکە تەخت دەبن، چونکە وادەزانرێت کە تاکە بینای پتەوی زانین بریتیە لەهەست.

هەڵەیە گەر وا بزانین ئەو دیدە سەرەکیەی هلۆسیوس دەریدەبڕێ، ناوەڕۆکێکی نمونەیی فەلسەفەی رۆشنگەریە. ئەمە هەڵەیەکە زۆر رودەدات. هەروەها هەڵەیە ئەم دیدە بە نمونەی بیرکردنەوەی نوسەرانی "ئەنسکلۆپیدیا"ی فەرەنسا بزانین. چونکە توندترین رەخنەکان لەکاری هلۆسیۆس هەر لەم قوتابخانە فکرییەوە ئەنجامدرا، و سەرچاوەی ئەم رەخنانەش باشترین هزرەکانی ئەدەبیاتی فەلسەڤی فەرەنسا بوون، وەك تۆگۆ و دیدرۆ. بەلاّم ناکرێت نکوڵی لەخاڵێك بکرێت کە ئەویش ئەوەیە لەکاری هلۆسیۆسیش وەك کۆندیاك، شێوازێکی تایبەت دەردەکەوێت کە خەسڵەتی تایبەت و دیاریکراوی







سەرتاسەری سەدەی هەژدەهەمە. لێرەدا ئێمە رووبەرووی شێوەیەك بیرکردنەوەین کەدەستکەوتە پۆزەتیڤ و سنورداریە دەرونیەکانی، سەرکەوتن و شکستەکانی، وەك ئەوە وایە لەپێشەوە لەچارەی نوسرابێت.

سەرچاوە

وەرگێڕانی بەشێکی فەسڵی یەکەمی ئەم کتێبەی خوارەوەیە: (ارنست کاسیرەر: فلسفه روشن اندیشی. ترجمه: نجف دریابندری. انتشارات خوارزمی چاپ اول. تهران اسفندماه ١٣٧٢.

## مۆدێرنەو فەلسەفەی ئەخلاق

### بابەکی ئەحمەدی

-١-

لەرۆژی ١٨ شەهریوری ١٣٧٦دا کچێکی هەشت ساڵە لەنەخۆشخانەی منداڵانەی موفیدی تاران کۆچی دواییکرد، ناوی ئارین گوڵشەنی بوو. رۆژی پێشوو بە سەد حاڵەتی شکاندنی ئێسقان و برینی قوڵ لەلەشیدا — نیشانەی لێدان و بریندارىو سوتان- لەحاڵەتی بێهۆشی تەواودا بۆ نەخۆشخانەکە هێنرا. کێشی تەنها ١٥ کیلۆ بوو و پەرەسەندنی ئێسکەکانیش لەسنوری منداڵێکی ٤ ساڵەدا راوەستابوو. کچەکە پاش جیابونەوەی دایكو باوکی، بە باوك و ژنە تازەکەی سپێردرا بوو، هەر هەموو ئەشکەنجەکانیشی لەخێزانی باوکیدا بینیبوو. پێشتر ئارین دوابەدوای جیابوونەوەی دایك و باوکی بەحوکمی دادگا نەك بە دایکە بەرپرسیار و تەندروستەکەی، بەڵکو بە باوکی سپێررا بوو کە پێشتر رابردوی تاوانکاری هەبووە و ئەمرۆش تاوانبارە بە "لێدان و بریندارکردنی زیاد لەسنور (سنورەکەی چ کەسێك دیاریدەکات؟) و شکاندنی هەردوو باڵی منداڵەکە". ئەم پەروەندە تاوانکاریە بۆتە هۆی ئەوەی دەنگی ژنانێك کە رەخنەیان لەنادادپەروەرانە بوونی یاسا هەبووەکانو بەتایبەتی رێساکانی "حەزانەت" هەیە ببیسترێت. لەراستیدا کەموکورىِ یاساکانی بەرگری لەمنداڵان ئاشکرا بووە. بابەتی لێکۆڵینەوەی دادگا پرسیاری جدی یان باشتر بڵێین مەترسیگەلێکی لەبارەی واقعیەتی تاڵی ژیانی کۆمەڵایەتیەوە وروژاندووە. منداڵانی ئێرانی تا چ سنورێك لەخێزانەکانی خۆیاندا خاوەن ماف و حورمەت و ئازادین؟ ژمارەی منداڵە ئەشکەنجەدراوەکانی دی کە هێشتا کارەساتەکانیان ئاشکرا نەبووە، چەندە؟ ئەو یاسا و رێسایانەی بەشێوەیەکی راشکاوانە و براوە، رێگری لە"لێدانو بریندار کردنی" منداڵان لەلایەن سەرپەرشتیارانەوە دەکەن، کامانەن و تا چ سنورێك کارایيان هەیە؟ لێرەدا ناتوانم بچمە ناو باسێکی سیاسی و یاساییەوە، ئەگەرچی







گرنگیەکی زۆری هەیە.

کاتێك هەواڵی مردنی ئارین گوڵشەنیم بیست، لەناو پیاچونەوە بە یاداشتەکانی ئەم نوسینەدا بووم و لەبەر هۆیەك هەواڵەکەم لەسەرەتای ئەم نوسینەدا دانا: دەنگی ئەشکەنجە دیدەی ئارینی بچوك لەو ژیانە کورت و پڕ ئازاردا کە بەسەریبرد، ئاوای ناڵەکانی کە لەدڵی دۆزەخێکەوە دەهات کە تیای دەژیا، تەنانەت بێدەنگیەکەی لەساتەوەختی ئەو مردنە ترسناکەی کە هەیبوو، دەنگی نوسەرێکی گەورەی سەدەی نۆزدەهەمی دەهێنایەوە یاد کە پێشتر دەمویست وتارەکە بە قسەکانی ئەو دەست پێبکەم.

لەفەسڵی چوارهەمی کتێبی پێنجەمی بەشی دووی رۆمانی برایانی کارامازۆفدا کە نوسینی فیۆدر دۆستۆفیسکیە، لەو بەشەدا کە ناوی "یاخیبوونە"، ئیڤان کارمازۆف لەگەڵ ئالیوشای برایدا کە فەشەیەکی جوان و دڵپاکە، وتوێژ دەکاتو هەوڵدەدات وەڵامی ئەو پرسیارەی بداتەوە کە لەبەرچی قبوڵی دنیاناکات. ئیڤان دەڵێت رقی لەوەیە وا پیشانبدەیت کە باشیت، " بە بڕوای من عەشقی مەسیحیانە بۆ مرۆڤەکان، لەسەر زەوی مۆجیزەیەکی مەحاڵە.. وا وێنای بکە من بێئەندازە ئازار دەبینم، بەڵام کەسێکی دی ناتوانێت هەرگیز تێبگات کە من چەند لەئازاردام. چونکە ئەو کەسێکی دیە و من نیە". مرۆڤ دەتوانێت دراوسێکانی بەشێوەیەکی ئەبستراکت خۆشبوێت، لەدوورەوە خوشویستنیان شتێکی مومکین، بەڵام لەنزیکەوە مەحاڵە. ئیڤان دەڵێت وای بەباش دەزانێت لەبری باسکردنی ئازار بە مانای هەمەکی و مرۆڤانە، باسی ئازاری منداڵان بکات. منداڵان بێگوناهن و ئەو ئازارەی دەیبینن بەهیچ لۆژیکێك قابیلی رەوایەتی پێدان نیە. بەڵام منداڵان توشی گەورەترین ئازارەکان دەبن. ئیڤان باسی پیاوێکی خوێندەوار و رۆشنبیر دەکات کە لەگەڵ هاوسەرەکەیدا بەداری درەختی غان لەمنداڵە حەوت ساڵەکەیان دەدەن. هەرچی زیاتر لەمنداڵەکەی دەدا، شەهوەتی لێدان تیایدا زیادیدەکرد. یەك دەقیقە، پێنج دەقیقە و دە دەقیقە لێیدەدا و بەردەوام درندەتر دەبوو. منداڵەکە ئەیناڵاند و دەیگوت "بابە.. بابە". بەرێکەوت کاری کابرا بە دادگا دەگات و پارێزەرەکەی بە رەخنەگرتنەوە گوتی "ئەمە مەسەلەیەکی سادەیە، رووداوێکی سادەی خێزانیە، باوکێك خەریکە منداڵەکەی پەروەردەدەکات. جێگەی شەرمە کارەکەی بەدادگا بگات".

ئیڤان بەردەوام دەبێت: "بەڵام گێڕانەوەی باشتر لەمەشم لەسەر منداڵان لایە". باوك و دایكێك كچە پێنج ساڵەكەی خۆیان ئەشكەنجە دەكرد. ئەم ئەشكەنجەدەرانە كاریان بەسەر خەڵكی دیەوە نیە، دڕندەیی ئەوان لەبەرامبەر منالآنـدا دەردەكەوێت: بەوردی ئەوە بێ بەرگریبوونی مناڵە كە وەسوەسەی ئەشكەنجەدەر دەكات. دڵنیایی فریشتەئاسای منالآن كە پەنایەكیان نیە، خوێنی پیسی ئەشكەنجەدەر دەهێنێتە جۆش. لەهەر مرۆڤێكدا جانەوەرێكی دڕندە هەیە". باوك و دایكەكە قامچیان لەكچەكە دەدا، جەستەیان دەئاوسان، لەسەرما و سەهۆڵبەنداندا لەئاودەستێكدا زیندانیان دەكرد، پاشەڕۆییان دەكرد بەدەموچاویدا و ناچاریان دەكرد لێی بخوات. مناڵەكە "لەو جێگە تاریك، پیس‌و ساردەدا بە مستە بچوكەكانی سنگی دەردناكی دەكوتا و فرمێسكە بێ رقەكانی ئاراستەی خوداوەندی ئازیز و میهرەبان دەكرد، تاكو پارێزگاری لێبكات". ئیڤان باسی منالێكی لادێیشی كرد كە رۆژێك لەبەرخاتری یاریكردن و لەروی بێ فكرییەوە، بەردێكی هاویشت و سەگی راوی ئاغاكەی بریندار كرد. ئاغا روتی كردەوە و فەرمانی بەسەگەكانی دا تا دوای بكەون و لەبەرامبەر چاوی دایكیدا، پارچە پارچەی بكەن. ئیڤان دەپرسێت "باشە ئاغا شایستەی چیە؟" و ئەلیوشا لەژێر لێوەوە دەڵێت "لەسێدارەدان". هەرچەند قەشە دڵپاكەكە خێرا لەقسەكەی خۆی پاشگەز دەبێتەوە، بەلأم بۆ ساتێك توانیبووی ببێتە هاودەردی دایكی كوڕەكە و لەتوندوتیژیەكدا كە وەلأمدانەوەی توندوتیژیەكی دیە، تێزەكەی مەسیحی لەبیر بچێتەوە و گوناهكار نەبەخشێت.

ئیڤان بەردەوام دوبارەیدەكاتەوە كە دەیەوێت "لەراستیەكان جیا نەبێتەوە" و راستی خراپەكاری مرۆڤ، واتە ئەو خاڵەی مرۆڤەكان خراپە هەڵدەبژێرن‌و ستەم لەهاوڕەگەزەكانی خۆیاندەكەن، دەهێنێتە پێشێ. ئەو دەڵێت ناتوانێت دەستنیشانی بكات "بۆچی جیهان بەمشێوەیەی كە هەیە، شكڵی وەرگرتووە". بەلأم هەستدەكات مرۆڤەكان لەبەرئەوەی مەیلیان بەلای خراپەدا هەیە، شایستەی سەرزەنشتن. لەلایەكی دیەوە دەبینێت لەراستیدا ئەوان سوچێكیان نیە، ئاوەها دەژین، لەبەرئەوەی ئاوەها دروستبوون. ئیڤان بە تەشەردان لەزانستباوەڕی سەردەمی خۆی دەڵێت "بە تێگەیشتنی ئەقلیدیسیە ناسك و زەمینیەكەم، هەموو ئەو شتەی دەیزانن ئەوەیە كە ئازار بوونی هەیە و هیچ كەسێكیش خەتای لەمەدا نیە". بە "پۆخڵەواتی







ئەقلیدیسیش" لەبارەی هۆ و هۆكارەوە، مەسەلەكە چارەسەر ناكرێت. ئیڤان ئارەزووی ئەوە دەكات سزایەك لەئارادا بێت، نەك لەئایندەیەكی دوردا، بەڵكو لەسەر زەوی. ئەو ئازار و دەردەی منالأن دەیچێژن، لەسەرو تێگەیشتنەوەیە. مرۆڤەكان بەهۆی بەشداریان لەگوناهدا، بۆ جێبەجێكردنی بەشی خۆیان لەهاوئاهەنگی ئەبەدیدا، بەهەر هۆیەكی عیرفانی و دینی بێت، گوناهكارن و دەبێ سزا بدرێن. بەلأم منالأن بۆچی؟ ئەوان خۆ بێگوناهن و بڕیارە مەلەكوتی ئاسمان بۆ ئەوان بێت. لەسەرو تێگەیشتنەوەیە منالأن ئازار ببینن. بابڵێین ئەشكەنجەدارانی منالأن لەدۆزەخدا سزا دەدرێن، بەلأم ئەی چارەنوسی ئەو كارەسات و ئەشكەنجانەی منالأن بینیویانە چی دەبێت؟ من چ كارم بە تۆڵەسەندنەوە لەو فرمێسكانە هەیە؟ "ئەگەر ئازارەكانی منالأن، رادەی ئەو ئازارانە زیاد بكات كە مرۆڤ پێویستە بۆ هەقیقەت بیبەخشێت، ئەو كاتە من ناڕەزایی دەردەبڕم و دەڵێم كە هەقیقەت شایەنی ئەم بەهایە نیە.. لام باشترە لەگەڵ ئازارێكی سزا نەدراو و توڕەییەك كە خۆی خواردۆتەوە بمێنمەوە. تەنانەت گەر لەسەر هەقیش نەبووبم. جگە لەمە داوای چ بەهایەكی گران بۆ هاوئاهەنگی دەكرێت. بەخشینی ئەم بەهایە لەسەرو توانای ئێمەوەیە. ناكرێت بۆچونە ناو هاوئاهەنگیەوە، بەهایەكی لەو چەشنە بدەین. لێرەوەیە من وازدەهێنم و بلیتی چونەژورەوەی خۆم دەگەڕێنمەوە. ئەگەر مرۆڤێكی بەشەرەف بم، ئەركی منە هەرچی زوتر بیگەڕێنمەوە. ئەمەش ئەو كارەیە كە من دەیكەم. ئەلیوشا وانیە من خودا قبوڵناكەم، بەڵكو من تەنها بە ئەدەبێكی تەواوەوە، بلیتەكەی بۆ دەگەڕێنمەوە". ئەلیوشا كە تەماشای كۆتایی دەكرد، گوتی "ئەمە یاخیبوونە".

بێگومان یاخیبوون سەرچاوەیەكی ئەخلاقی هەیە. ئیدی ئەم خاڵە پاش دۆستۆڤیسكی و ئەلبێر كامۆ روونە. لەبەشی چوارهەمی تاعونی نوسینی كامۆدا پارچەیەك هەیە لەمردنی منالێك بەهۆی تاعونەوە. لەم پارچە كورتەدا كە رونكردنەوەی گیاندانی بێئەندازە دەردناكی منالێكە و لەرووی تیورەی ئەدەبیەوە یەكێك لەجوانترین نوسینە ئەدەبیەكانی سەدەی بیستەمە، دكتۆر ریو و قەشە پانلو بە ئازار و نابڕوای و ترسەوە لەپاڵیدا وەسفدەكرێن: "بەلأم لەناكاو نەخۆشەكانی دی خامۆشبوون. ئەو كاتە دكتۆر تێگەیشت كە دەنگی منداڵەكە لاواز بووە، دیسان

لاوازتر بووەو بێدەنگبووە. لەدەوروبەری ئەودا ئاه و ناڵە دەستی پێدەکردەوە، بەڵام هێواشتر و وەك دەنگدانەوەیەکی دوردەستی ئەم نەبەردە کە کۆتایی پێهاتبوو. چونکە نەبەردەکە کۆتایی پێهاتبوو". ریو بەلای قەشەدا دەڕوات: "قەشەکە قۆڵی هێنایە پێشێ بۆ ئەوەی ڕێگەی لێبگرێت و پێی گووت: "سەبرکە دکتۆر!" ریو بە هەمان جوڵەی توڕەییەوە گەڕایەوەو بە توندوتیژیەوە ڤیژاندی بەسەریا: "ئاخ! ئێوە خۆتان باش دەزانن کە لایەنیکەم ئەم یەکەیان بێگوناهە". هاواری دکتۆرەکە، دەنگدانەوەی دەنگی ئیڤانە. مناڵەکە بەهۆی چارەنوسی شومەوە ئەشکەنجە دەبینێت و دەمرێت. ئەمجارە مرۆڤێك ئەشکەنجەی ناکات، بەڵام پێدەچێت چارەنوسە تاڵەکەی بێ هیچ بەزەییەك، مەرگێکی ئەشکەنجەئاسای لەچارەنوسی نوسیبێت. ریو دەچێتە حەوشە و لەروناکی بەربەیاندا لەژێر درەختە کورتە تۆزاویەکاندا دادەنیشێت. قەشەکە دەگاتە لای: "بۆ بەو توندوتیژیە قسەی لەگەڵمکرد؟ بۆ منیش ئەو دیمەنە قابیلی تەحەمولکردن نەبوو". ریو بەلای پانلۆدا گەڕایەوە و گوتی: "راستە. بمبورە. بەڵام هیلاکی جۆرێك شێتیە. لەم شارەدا چەندان کاتژمێر هەیە کە من تیایدا جگە لەیاخیبوون هیچ هەستێکی دیم نیە". ئەو کاتەی قەشە دەڵێت کە راستە، ئەم هەلومەرجە یاخیبوون ئاسایە، چونکە لەپێوەرەکانی ئێمەی تێپەڕاندووە، بەڵام رەنگە پێویست بەوە بکات ئەو شتەمان خۆشبوێت کە تێیناگەین، ریو لەوەڵامیدا دەڵێت: "نا، من تێگەیشتنێکی دیم بۆ عەشق هەیە، و تا مردن سیستەمێك رەددەکەمەوە کە منالأن ئەشکەنجەی تیا دەبینن ". لەم یاخیبونەوە بە پاردۆکسی ئیڤان کارمازۆف دەگەین کە هەستدەکەم گرنگترین پارادۆکسی ئەخلاقیە کە تا هەنوکە هێنراوەتە ئارا و تیورە ئەخلاقیەکانیش وەڵامێکیان بۆی نییە.

"ئیڤان بەحاڵەتێکی جدیەوە وتی یاخیبوون؟ بەداخەوە تۆ ناوی یاخیبونی لێدەنێیت. خەڵکی بە زەحمەت دەتوانن لەیاخیبووندا بژین و منیش دەمەوێت بژیم. بەڵام خۆت وەڵامم بدەرەوە. تەماشاکە! تەحەدات دەکەم، وەڵام بدەرەوە. وا بزانە سەرقاڵی بونیادنانی چارەنوسی مرۆڤی، ئامانجیشت ئەوەیە مرۆڤ خۆشبەخت بکەیت و دواجار ئارامی و ئاشتیان پێببەخشی. بەڵام بۆ ئەمکارە پێویست و ناچاریە، تەنها بونەوەرێکی لاوازو بچوك.. هەمان ئەو مناڵەی سنگی خۆی دەکوتی.. تا دەمی مەرگ ئەشکەنجە بکەیت و ئەو بینای خۆشبەختیە لەسەر بناغەی فرمێسکە







سزانەدراوەکەی ئەو بینا بکەیت. ئایا قەبوڵیدەکەیت بەو مەرجە ئەندازیاری ئەو بینایە بیت؟ پێمبڵێ و راستیش بڵێ. ئەلیوشا بەئارامی گوتی نا، من قەبوڵیناکەم. (ئیڤان گوتی) ئایا دەتوانی بڕوا بەو خاڵەبکەیت کە ئەو مرۆڤانەی دەتەوێت بیناکەیان بۆ دروستبکەیت، رێکبکەون کە خۆشبەختی خۆیان لەسەر بناغەی خوێنی سزانەدراوی، قوربانیەکی بچوك قەبوڵبکەن؟ بە قبوڵکردنیشی بۆ هەمیشە خۆشبەخت بمێننەوە؟". ئیڤان لەدرێژەی ئەم پاردۆکسەدا چیرۆکێك بۆ ئەلیوشا دەگێڕێتەوە کە خۆی نوسیویێتی. رەنگە ئەم پارچەیە بەناوبانگترین پارچە لەئەدەبیاتی سەدەی نۆزدەهەمی روسیادا بێت: "موفەتیشی مەزن". ئیڤان چیرۆکی گەڕانەوەی مەسیح بۆ زەوی، بۆ سۆیل لەسەردەمی پشکنینی بیروڕادا دەگێڕێتەوە: "موفەتیشی مەزن کە مەسیح دەستگیر دەکات لێی دەپرسێت: "بۆچی گەڕایتەوە؟". پاشان وێنەیەك لەژیانی مرۆڤەکان پێشکەشدەکات کە بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەرو سەیر لەروسیای سەدەی دوایی، واتە سەردەمی ستالین، ئۆردوگاکانو حکومەتی کۆمنیستیەوە نزیکە. بە ناوی یەکسانی و دادپەروەریەوە، بە پارچە نانێك تەنها ئەوەندە تێردەبن کە کار بکەن و جێگەیەك بۆ دادپەروەری راستەقینەو باشی ئەخلاقی نامێنێتەوە.

هەرچەندە دەکرێ بە سادەیی لەو وێنەیەدا کە موفەتیشی مەزن دروستیدەکات، روسیای سەدەی بیستەم ببینرێت، بەڵام ئەمە تەنها بەشێکە لەواقعی ژیانی مرۆڤی مۆدێرن لەسەردەمی ئێمەدا. لەراستیدا موفەتیش باسی مۆدێرنەو رۆژگاری مۆدێرن دەکات. باسی ئۆردوگاگەلێك دەکات کە لەوڵاتانی جگە لەروسیاش بەرپاکران. باسی رەنجی منالأنێك کە لەسەرتاسەری ئەم ئەستێرەیەدا ژیان، رەنجگەلێك کە ناتوانرێ هۆیەکیان بۆ بدۆزرێتەوە. ئەگەر ئەخلاقی پێشمۆدێرن دەیتوانی هەموو شتێك ببەستێتەوە بەچارەنوسێکی بالأتر لەئیرادەو عەقڵی مرۆڤەوە، (ئەوا) رۆژگاری مۆدێرن کە بەبانگەشەی سالاری عەقڵی مرۆڤەوە هاتۆتە مەیدانەوە، چۆن دەتوانێت ئەم هەموو کارەساتە ئاراستە بکات؟ پرسیاری ئیڤان لەبارەی بیناکردنی خۆشبەختی گشتییەوە، بەبەهای نادادپەروەری لەبەرامبەر لاوازترینو بێگوناهترین تاکەکان، بە ناچار وەڵام لەمێژووی ئەخلاقدا نادۆزێتەوە. ئەرستۆ بەوێناکەی خۆیەوە بۆ خۆشبەختی وەڵامێکی پێ نییە. کانتیش زیاتر سەرقاڵی کامڵبوونی روکەشی حوکمە

تراسندنتالەکانی خۆیەتی، نەك بیر لەوەڵامبکاتەوە. ئەم کێشەیە لەژیانی مۆدێرنەوە سەرچاوەی گرتووەو دەبێت لەناو دەروونی ئەم ژیانەشەوە بەدوای چارەسەریدا بگەڕێین، ئەگەر چارەسەرێك هەبێت.

-٢-

پرسیاری سەرەکی ئەخلاق، لەڕوانگەی زۆرێك لەنوسەرانی ئەمڕۆوە ئەوەیە: ئێمە دەبێت چۆن بژین؟ هەندێك پرسیارەکە بەمشێوەیە دادەڕێژن: ئایا دروستترین شێوەی ژیانکردن، بوونی هەیە؟ و ئەگەر هەشە، ئایا دەستمان پێیرادەگات؟ بەبڕوای بیریارانی پۆستمۆدێرن یەك شێوەی دروستی ژیان، ناتوانێ لەبەردەم هەمواندا بێت. حەکایەتی یەك ئەخلاقیش وەك حەکایەتە مەنەلۆگەکانی تری مۆدێرنە، کۆتایی پێهاتووە. بەپێچەوانەوە رۆشنگەران‌و کانت بۆ ئەم پرسیارە وەڵامێکی پۆزەتیڤیان هەبوو. لەهەنگاوی یەکەمدا ئەوەیان قبوڵدەکرد کە شێوەیەکی دروستی ژیان دەبێت لەبەردەم هەمواندا هەبێت و بەڵگەیان دەهێنایەوە کە ئەمشێوەیە پشتئەستوورە بە عەقڵی مرۆڤ و گەڕانی عەقلانی دەتوانێت هەموو مرۆڤەکان بە یەك دەرئەنجام بگەیەنێت. ئەوان پاش قبوڵکردنی بوونی شێوەیەکی دروستی ژیان، لەهەنگاوی دواییدا باسی ئەوەیان دەکرد کە ئەم شێوەیە چییە؟ زۆربەی بیریارانی رۆشنگەری بەر لەهەوڵدان بۆ دۆزینەوەی وەڵام و لەراستیدا بە ئاڕاستەی وەڵام، سەرەتا بە پێویستیان دەزانی تیورەیەك لەبارەی سروشت و ماهیەتی مرۆڤەوە پێشکەشبکەن، تا هەنوکەش هەندێك بیریار هەروا دەکەن. ئەلیسۆن جەگر لەکتێبی "سیاسەتی فەمەنیستی و ماهیەتی مرۆڤ" دا هەوڵیداوە رەهەندە جیاوازەکانی دەستپێکردن لەمجۆرە پێناسەیەوە رونبکاتەوە.

کاتێك وەك مرۆڤێکی مۆدێرن دەپرسین: "من چۆن دەبێت بژیم؟ لەگەڵ ئەوەشدا کە راناوی یەکەمی تاکەکەس بەکاردەهێنین، بەڵام لەراستیدا مەسەلەیەکی سەروتر لەتاکەکەس دەهێنینە پێشێ. هاوکات لەگەڵ ئەم پرسیارەدا رێنماییەك بۆ کەسانی دی (بەشێوەیەکی شاراوە) خۆی حەشارداوە. ئەگەر من بزانم چۆن دەبێت بژیم تێگەیشتووم کە دەبێت چۆن ژیان بکرێت. دۆزینەوەکەی من خۆی لەخۆیدا پیشانیدەدات کە کەسانی دیش دەبێت وەك من بژین. من لەرێگەیەکی عەقلانیەوە







بە ئەنجامێکی عاقلانە گەیشتووم و ئەم دەرئەنجامەش دەبێت بۆ هەمووان راست بێت. بەڵام لەراستیدا رێگاکە بەپێچەوانەوەیە. عەقلانیبوون و راستی شێوەی ژیانی من، کاتێك دەسەلمێنرێت کە بتوانێت وەك نمونەیەك لەبەردەم کەسانی دیدا رابوەستێت. کێشەکە لەوەدایە کە لەرۆژگاری مۆدێرندا و سەرەڕای عەقڵباوەڕیە بەهێزەکەی، رادەی لایەنی گەردوونی یان هەمەکی ئەو دەرئەنجامەی من پێیگەیشتووم، بەوردی روون نیە. کانت دەیگوت ئەوەی بۆ من لەرووی ئەخلاقیەوە راستە، بەشێوەیەکی لۆژیکی دەبێت بۆ هەموو کەسێك راست بێت، بەڵام بە ئاسانی دەکرێت هاوڕای ئەو بیریارانە بین کە بازنەی دروستی ئەو دەرئەنجامە سنوردار بۆ چەند گروپێکی مرۆڤ دەکەن. کەسانێك کە لەگەڵ مندا لەهەلومەرجی کۆمەڵایەتی، کلتوری، چینایەتی، نەتەوەیی، و ئیمانیدا.. هاوبەش و هاوڕان.

کێشەکە لەوەدایە "ئێمە" شتێکی بڕاوە و پێدراوێك نیە بۆ یەکجار و بۆ هەمیشە دەستنیشان بکرێت. من ئەندامی گروپی جیاوازم. دەتوانم بێخێزان یان خێزاندار بم، لەرێگەی پیشە یان رادەی خوێندەواریەوە سەر بەچین و گروپی کۆمەڵایەتی بم، لەرووی بڕوای سیاسیەوە لەگەڵ کەسانێکدا هاوڕێ و لەرووی بڕوای مەزهەبی یان بێباوەڕیەوە، لەگەڵ کەسانی دیدا هاوبەشبم. ئەندامی "ئێمە"یەکم کە لەهەندێك مەسەلەدا لەگەڵ ئەندامەکانی دیدا هاوبەشم. بەڵام لەهەمانکاتدا رۆڵی کۆمەڵایەتی دی قبوڵدەکەم کە یەکسەر دەمکات بە ئەندامی گروپی جیاواز، و لە"من"، "ئێمە"یەکی دی دروستدەکات. زۆر ئەوە دێتە پێشێ کە بنەمایەکی ئەخلاقی لەیەکێك لەم گروپانە قبوڵکراوە و لەگروپێکی دیدا رەدکراوەتەوە. ئەو شێوە ژیانەش کە لەنێوان ئەندامانی ئەم گروپەدا خواستراو و جێی بایەخە، لەلای ئەندامانی گروپەکەی دی قبوڵکراو نیە و دەبێت شێوازی جیاواز لەوە بگرێتە بەر. خودی ئەم راستیە پیشانیدەدات کە "من" ئەو سوبژێکتە تاکانەیە نیم کەلەفەلسەفەی دیکارت یان ئەخلاقی کالڤینیدا بە گریمانە وەردەگیرێت. لەمۆدێرنەدا "ئێمە" بەردەوام کێشە ئامێز بووە. ئەو هەموو هەوڵە بۆ چارەسەر و لەزۆربەی جاردا بۆ شاردنەوەی مەسەلەکە، سەرکەوتوونەبووە. هەنوکە لەسەردەمی پۆستمۆدێرندا، سەردەمی یەك رێگەچارە بۆ هەمووان بەسەرچووە. چیدی ناکرێت بەشێوەی دڵنیایی عەقڵباوەڕان، زۆربەی مارکسیەکان و زۆرێك لەمەزهەبەکان، باسی

یەك ڕێگە چارەی هەمەكی بكرێت كە بۆ هەموو كەس دروستبێت و وەڵامی هەموو مەسەلەكان بداتەوە.

ئێمە بەپێی سەرمەشقگەلێك، نموونەگەلێك بەراست دەزانین. بەپێی ئاسۆی هوشیاریەكی تایبەت، هەقیقەت دروستدەكەین یان وێنادەكەین. دیدی كرێكار و خاوەنكار، پیاو و ژن، بەڕوادار و بێبڕوا بۆ مەسەلەكان جیاوازە، چونكە پێش خەیاڵەكانیان لەیەك جیاوازە. شێوەی ژیان، نەخشەكێشان بۆ ژیان، جۆری ناسین، و ڕاڤەكردنیان جیاوازە. زۆری ڕەگەزە جیاواز و ناكۆكەكان دەبێتە هۆی ئەوەی نەتوانین تەنانەت باسی ئاراستە جونیەكەكانی تاكەكانی گروپێكیش بكەین. زۆربەی خەڵكی دەژین بێئەوەی بۆ ساتێكیش لەخۆیان بپرسن كام شێوەیە "دروستترە". بەڵام گەر ئەوە بە گریمانە وەربگرین كە لەبەر هەر هۆیەك بووە بیر لەم مەسەلەیە دەكەنەوە، ئەوا ئێمە ڕووبەرووی هەمەرەنگی بێسنوری وەڵامەكان دەبینەوە. پرسیاری ئەوەی "من چۆن دەبێت بژیم؟" دەبێ لەژێر سێبەری پرسیارێكی دیدا بێت: چ كەسێك و لەبەرچی ئەم پرسیارە دەهێنێتە پێشێ؟ چ شتێك لەپەیوەندی هەقیقەت بە ئاراستە وەرگرتن بەرەو ژیان، واتە لەپەیوەندی بوون بە نەخشەرێژی بۆ خود وەك بونەوەرێك تێدەگات؟ لەگەڵ پرسیاری لەم چەشنەدا كە چۆن دەبێ ژیان بكرێت، هەلومەرجی فەلسەفی، مێژوویی و كۆمەڵایەتی دێتە ئاراوە كە ڕێگە لەوەڵامێكی تاكانە و بڕاوە و دوا وەڵام دەگرێت.

لەمۆدێرنەدا لەلایەكەوە دژواری و پێداویستیەكانی ژیانی كۆمەڵایەتی، بەردەوام پێویستی بیركردنەوەی ئەخلاقی دەهێنێتە ئاراوە، و لەلایەكی دیشەوە بەشێوەیەكی بەردەوام لەئەگەری پێشكەشكردنی وەڵامێكی تاكانە بۆ هەر پرسیارێكی تایبەت كەمدەكاتەوە. هەمەڕەنگی و فرەیی ژیانەكان، ئەخلاقی تاكانەیان خستۆتە لاوە. سەرنجبدەین كە نوسەرانی ئەمڕۆ تا چ ڕادەیەك لەبارەی مەسەلەی سەرەكی ئەخلاقەوە، لەیەكدی جیاوازن. هەندێك هاوڕێیەتی بەگرنگترین مەسەلەی ئەخلاقی دادەنێن، هەندێك هاودەردی، هەندێك دڵنیایی و هەندێك بە دایكبوون، یەكێك باسی ئەخلاقی تیماركاری دەكات و ئەوی دی تاكە مەسەلەی ئەخلاقی بە خۆكوشتن دادەنێت. ئەم بیرورا جیاوازانە ڕێگەی باسی فەلسەفیان نەگرتووە، بەڵام بەرهەمی ئەم باسە بەردەوام ئەو دەرئەنجامەی بەهێزكردووە كە ئەخلاقی تاكانە و بڕاوە و





دوا ئەخلاق بوونی نیە، بە هەمانشێوەش ناكرێ لەبوونی مەسەلەیەكی ئەخلاقی سەرەكی دڵنیابین. مومكین نیە "كە ناوەڕۆكی سەرەكی ئەخلاق" وەك خاڵی ئەرشمیدس لەدەرەوەی ئەم جیهانە وێنابكەین و بە تاكە پشتی سەرەكی دابنێین.

ئەم ڕەهەندە ڕێژەگەریە لەزۆر حاڵەتی گرنگ و زیندوودا لەبەرامبەر پێویستی ژیانی مۆدێرن بۆ بوونی پێوەرێكی ئەخلاقی كە پشتی بەتیورەیەكی ئەخلاقی یەكتا بەستووە یان لایەنیكەم قبوڵكراو لەلایەن زۆرینەی خەڵكەوە، ڕادەوەستێت. لەلایەكەوە مەسەلەی ئێمە لەسەر ئەم هەسارەدا مەسەلەی مەرگ و ژیانە (ئەو دژواریانەی پەیوەندیان بە قەیرانی ژینگەوە هەیە، دەركەوتنی نەخۆشیگەلێكی وەك ئایدز، چاودێریكردنی زیادبوونی ژمارەی دانیشتوان، چەكە كۆكوژەكان و كیمیاییەكان و گەلێك مەسەلەی دی) لەلایەكی دیشەوە تەوەرەی عەقڵباوەڕیانەی ئەخلاقی یەكتا لەناوچووە، یان بەخێرایی ڕەوایەتی خۆی لەدەستدەدات. كاتێك فینگشتاین لەكۆنفرانسێكدا لەبارەی ئەخلاقەوە ڕایدەگەیاند: "من تەنها دەتوانم هەستی خۆم لەڕێگەی خوازەیەكەوە ڕابگەیەنم. ئەگەر كەسێك كتێبێك لەبارەی ئەخلاقەوە بنوسێت كە بەڕاستی كتێبێك بێت لەبارەی ئەخلاقەوە، ئەم كتێبە دەیتوانی وەك تەقینەوەیەك هەموو كتێبەكانی دی لەدنیادا وێرانبكات"، دەیویست جەخت لەسەر ڕەهەندی ناوەندی پێویستی دیدی ئەخلاقی بكات. فینگشتاین لەهەمانكاتدا دودڵبوو لەوەی كەسێك بتوانێت "كتێبێك لەبارەی ئەخلاقەوە بنوسێت كە بەڕاستی لەبارەی ئەخلاقەوە بێت". وەرگرتنی شێوەیەكی ئەخلاقی دروست یان تەنانەت شێوەی دروستتر لەوەی هەنوكە لەژیانی سیاسی و كۆمەڵایەتی مۆدێرندا قبوڵكراوە، پەیوەندی بە مەسەلەی سەرەكی مانەوەی مرۆڤەوە هەیە، بەڵام هەر ڕۆژێك زیاتر ئەوە ڕوون دەبێتەوە كە شێوەیەكی وا بونیادی، قابیلی دۆزینەوە نیە.

عەقڵباوەڕی مۆدێرن بە وتەی ئیچ. جی. ویڵز لەبری دروشمی كلاسیكی "دەبێ مرۆڤ ئەركی خۆی بزانێت و كاری پێبكات"، دروشمی "مرۆڤ دەبێ تێبگات و بەپێی تێگەیشتنی خۆی كاربكات"ی دانا. لەمۆدێرنەدا تێگەیشتنی عەقڵانی زۆر لەهەر ئەركێكی ئەخلاقی و ئاینی و دینی دی، سەرنجڕاكێشتر بوو. بەڵام فەلسەفەی عەقڵباوەڕ و مۆدێرن دواجار ئەركێكی تازەی دەخستە ئەستۆی مرۆڤ. ئەركێكی ئەخلاقی كە لەهەمان "مرۆڤ دەبێت تێبگات" وە دەستی پێدەكرد. لەهەلومەرجی





پۆستمۆدێرندا جارێکی دی مەسەلەی سەرەکی ئەرك کە لەراستیدا لەگریمانەی ئەگەری شێوەی دروستی ژیانەوە بۆ هەمووان سەرچاوە دەگرێت، خراوەتەلاوە. دیارە لەرودانی پەرەسەندنی مۆدێرنەشدا بەشێوەیەکی روو لەزیاد، شێوەی دروست کەم بایەخ دەبوو، وە تێگەیشتن لەشێوەی ئاساتر، کەم خەرجتر، لەبەردەستاتر، لەبری ئەو دادەنیشت. ئەمە بە مانای جێگرتنی عەقڵی پراکتیك بە مانای لایبنیتزی و کانتیەکەی لەبری شتێك بوو کە ماکس فیبەر ناوینابوو عەقڵئامێری. عەقڵێك کە سروشت بە سەرچاوەی کەرەسە و سود دەبینێت و رەوایەتی بە بەهرەکێشی مرۆڤ لەمرۆڤ دەدات.

دەکرێت تیورە ئەخلاقیەکان لەرەهەندی جیاوازەوە پۆلێنبکەین. لەدەیەکانی دواییدا هەمەرەنگی ئەم پۆلێنکردنانە بۆتە هۆی نوسینی کتێبگەلێکی گرنگ لەمێژووی ئەخلاقدا. یەکێك لەگرنگترین ئەم پۆلێنکردنانە دوالیزمی فکری فەلسەفی لەمەسەلەی ئەخلاقدا پیشاندەدات. جیاوازی لەنێوان دیدی تیولۆجیانە و دینتۆلۆجیانەدایە. تیورە تیولۆجیەکان لەسەر بناغەی ئەو پێشگریمانەیە دامەزراون کە هەم راستی و هەڵە و هەم سروشتی ئەخلاقی یان نائەخلاقی کردارەکان، دیدەکان و تیورە تایبەتیەکان بەستراوە بەو دەرئەنجامانەوە کە دەیخەنەوە. دەبێ سەرنجبدەین کە هەر کردارێك چی بەرهەمدێنێت، ئایا بە ئامانجێك دەگات یان ناگات، تا بتوانین لەرووی ئەخلاقیەوە هەڵیسەنگێنین. دیارە ئەو ئامانج و دەرئەنجامانەی بەپێوەرەکانی هەڵسەنگاندن دەژمێرێن، جیاوازن و فەیلەسوفان لەبارەیەوە هاوڕا نین. هەر ئەمەش بۆتە هۆی ئەوەی چەندان تیورەی ئەخلاقی تیۆلۆجیانە دروستببن. لای ئەرستۆ ئامانجی ژیانی مرۆڤ بریتیە لەeudaimonia یان "خۆشبەختی". بە بڕوای هیوم و میل ئەم ئامانجە سەرەکیە لەزەت، شادی و سود وەرگرتنە لەنیعمەتەکان. تیورە تیۆلۆجیەکان بەدەر لەو جیاوازیانەی لەبارەی ئامانج و دەرئەنجامەوە لەنێوانیاندا هەیە، لەیەك خاڵدا هاوڕان: هەر حوکمێکی ئەخلاقی دروستی خۆی لەرادەی نزیکیەوە لەئامانجەوە بەدەستدێنێت. لەبەرامبەر ئەمەدا تیورە گەلێکی دی هەن کە ناومانناون دێنتۆلۆجی. ئەو تیورانەی لەسەر ئەم بناغەیە دامەزراون، رایدەگەیەنن کە کردارە مرۆییەکان یان لەخۆیاندا راستن یان هەڵەن و ناکرێت بە پێی ئەو دەرئەنجامانەی







دروستیدەکەن، بەراست یان هەڵەیان دابنێین. دزی بەهەر جۆرێك بێت کارێکی ناڕاستو نائەخلاقیە، تەنانەت ئەگەر دز بەمکارەی بیەوێت ببێتە هۆی خۆشبەختی کەسێکی دی. "دەکالۆگ" یان دەفەرمانە بە ناوبانگەکەی کتێبی پیرۆز، نمونەیەك لەکۆمەڵێك حوکمی بڕاوەن کە رونیدەکەنەوە چ کارێك بە دروست بژمێرێت و چ کارێك بەهەڵە. هەوڵی کانت بونیادنانی میتافیزکیای ئەخلاق، بۆ دەستگەیشتن بە حوکمی بڕاوە و کۆتایی بوو کە بە پێی حوکمی عەقڵ، لەهەر قۆناغێکی مێژوویدا و بۆ هەر کەسێك، راستە و پێویستە جێبەجێ بکرێت. حوکمە دینتۆلۆجیەکان، پێویستی کردارگەلێك روندەکەنەوە و هاوئاهەنگن لەگەڵ یاساکان و رێسا بڕاوەکاندا: یاساکانی خوداوەند، یاساکانی ئەخلاق، یاساکانی سروشت و ئەوانی دیدا.

دەکرێت پۆلێنکردنی دیش بدۆزینەوە. یەکێك لەوانە جیاوازی نێوان دیدی خودی و دیدی بابەتیە. لایەنگرانی دیدی یەکەم لەراستیدا هەمان وتەی بەناوبانگی هامپیتی دامپتی لە"ئالیس لەسەر زەمینی سەیر و سەمەرە"دا دوبارەدەکەنەوە کە "کاتێك من وشەیەك بەکاردێنم، رێك ئەو مانایەی هەیە کە من بۆم هەڵبژاردووە، نە زۆرتر نە کەمتر". خودگەر جیهان بە پێی پێوەرەکانی خۆی دەناسێت، راڤەدەکات و لەبارەیەوە حوکمدەدات. ئەو بڕوایەی بەوە هەیە بڕواکانی خۆی پێوەری کۆتایی و ستانداردی دروستی و ناتەندروستی کردارەکان، تیورەکان و حوکمە ئەخلاقیەکانە. ئەوە هەستی کەسایەتی ئەو و نەخوازراوەکانی ئەو و پێویستی و ناپێویستیەکانی جێی قبوڵکردنی ئەوە کە دەستنیشانکەری دروست و نادروست و ئەخلاقی و نا ئەخلاقیە. لەراستیدا دیدەکانی ئەمڕۆی ئەخلاق کە لەسەر بناغەی رەدکردنەوەی بڕاوەی حوکمە دێنتۆلۆجیەکان دامەزراون، و وەك کاردانەوەیەك لەبەرامبەر عەقڵباوەڕی مۆدێرندا دروستبوون، دەکرێت تارادەیەك بەخودگەر ناوبرێن. دیارە بەو مەرجەی کە تاکی خودگەر بازنەی راستی ئەو دەرئەنجامە ئەخلاقیانەی بەدەستیهێناوە، تەنها بەکردارەکانی خۆی سنورداربکات و بە زاراوە "زیهنیگەرێکی رادیکال" بێت.

لەبەرامبەر ئەمەدا دیدی بابەتگەر هەیە کە بڕوای بە ستانداردە ئەخلاقیەکان و جۆرێك ژیانی ئەخلاقیە کە سەربەخۆ لە هەڵبژاردنە فەردی و کەسێتی و زیهنیەکانە. بابەتگەری مەترسی دیدی خودگەری لەئاژاوەی ئەخلاقیدا دەبینێت و

بەڵگەدێنێتەوە کە ئەگەر هەرکەس ڕێگەی هەبێت چی دەیەوێت بیکات، ئەو کات لەبەردەم مەترسی کەوتنە ناو نیهیلیزمەوەین. دۆستۆڤیسکی بە سەرنجدان لەم مەترسیە بوو کە دەیگووت هەر کاتێك وتەی کافرەکان قبوڵبکەین و بڵێین خوداوەند، ئەم باڵاترین هێزە دروستکەرەی پێویستە بابەتیانەی ئەخلاق بوونی نیە، ئەو کات ڕێگەمان دەبێت هەموو کارێك بکەین. بابەتگەر جەخت لەوە دەکات کە بە پێچەوانەی دیدی زیهنگەرەکانەوە، هەندێك کاری دیاریکراو ناتوانن باش‌و دروستبن (بۆ نمونە کوشتنی کەسێکی دی، دزی، دەستدرێژیکردنی جنسی) و ئەمەش حوکمێکی بڕاوەیە. وەك هەقیقەتێکی بابەتیە کە بەشێوەی فەرمان، حوکم یان یاسا دێت و هەموان دەبێت لەکرداردا جێبەجێی بکەن. لەراستیدا لەنێوان بابەتگەری و دینتۆلۆجیدا نزیکیەکی لۆژیکی هەیە. هەردووکیان لەیەك سەرەتاوە دەستپێدەکەن. بەڵام لەنێوان زیهنیگەری ڕادیکالانە کە بڕوای بەڕەسەنایەتی هەمەڕەنگی ڕەوایەتیە ئەخلاقیەکان هەیە، لەگەڵ دیدی تیۆلۆجیدا، ناتوانرێ هیچ هاوئاهەنگیەك بدۆزرێتەوە. چونکە لەدیدی زیهنیگەری ڕادیکاڵدا یەك ئامانجی دوایی و قابلی قبوڵی هەمووان، بوونی نییە.

تیورەی خودگەری ڕادیکاڵ ڕێگە بۆ دیدی ڕێژەگەریانە دەکاتەوە. لەبەرامبەردا بابەتگەری بە گشتی بە حوکمە دیۆنتۆلۆجیەکان واتە یاسا ئەخلاقیە یەکتاکان دەگات. دیارە دەشێت تیورەیەك هەم بابەتگەر بێت و هەم ڕێژەگەر. کۆمەڵگا و یاسا، دروستی یان نادروستی کرداری کوشتنی کەسێکی دی دیاریدەکەن. بەپێی هەلومەرجە کۆمەڵایەتیە – کلتوریە جیاوازەکان یاساکان جیاواز دەبن، بەڵام بەهەرشێوەیەك بووە جێبەجێکردنی یاساکان پێویستە. بەمانایەکی دی بەپێی هەلومەرجەکان و مەرجە تایبەتیەکان و لەسەر بناغەی دیدی ڕێژەگەریانە، دەکرێت یاساگەلێکی بابەتی و ڕەها دابڕێژرێ کە چیدی ملکەچی خودگەری و ڕێژەگەری نەبن، و جێبەجێکردنیان بەشێوەیەکی ڕەها پێویست بێت.

لێرەدا مەسەلەیەکی ئاڵۆز دێتەئاراوە. گریمان کردارێك بەپێی یاسا ڕێگە پێدراو یان پێویستە. کوشتنی کەسێکی دی لەپێناوی بەرگریکردن لەخود، لەخێزانی خود و تەنانەت لەپێناوی بەرگریکردن لەبێگوناهان، لەیاساکانی زوربەی وڵاتەکاندا ڕێگەپێدراوە. هەر بەمشێوەیە کوشتنی سەربازی دوژمن لەسەر بناغەی





ئاراستەکردنی سیاسی، کۆمەڵایەتی و سەربازی (ئەوەی کە من لەپێناوی بەرگریکردن لەوڵاتدا بەو کارە هەڵساوم) بە شێوەیەکی گشتی ڕێگەپێدراوە. ئایا کاری ئەو کۆمەڵە سەربازە ئەمریکییەی کە بەشداریان لەجەنگی ڤێتنامدا نەکرد و کۆچکردن و زیندانکردنیان لەکوشتنی خەڵکی بێگوناه پێباشتر بوو، کارێك کە بەپێی دیدی ڕەهاگەری و دینتۆلۆجیانە ڕەوا نییە، لەرووی ئەخلاقییەوە کارێکی نادروستبوو؟ ئایا سەرپێچیکردن لەحوکمگەلێکی وەك: "تۆ دەبێت لەکاتی جەنگدا خزمەت بە وڵاتەکەت بکەیت؟"، "تۆ دەبێت یارمەتی سەرکەوتنی سوپاکەی خۆت لەجەنگدا بدەیت"، "تۆ دەبێت سەربازی دوژمن بکوژی"، لەنمونەی ئەو سەربازانەی بەشداریان لەجەنگی ڤێتنامدا نەکرد، ئاژاوەیەکی ئەخلاقییە؟.

جگە لەمە ئایا هەمان ئەو حوکمە هەمەکی و ڕەها و دینتۆلۆجیانە، وەك حوکمی یاسا مەدەنیەکان لەرێگەی ڕاڤەکردنە شەخسیەکانەوە، واتە بەپێی تاوتوێکردنی ئەگەرە پراکتیکیەکانی بەدیهاتنی پێشگریمانەکانی ئێمەوە نیە کە دەرکدەکرێت و جێبەجێدەکرێت؟ چەمکی بەرگری لەخود کە دەکرێ ڕەوایەتی بە کوشتنی مرۆڤێکی دیش بدات، تەنها لەسەر بناغەی ڕاڤەکردنێکی تایبەت دەتوانێت لەبارەی جەنگەوە بەکار بهێنرێت؟ سەربازێکی ئیسرائیلی بڕوایوایە کوشتنی کەسێکی نارازی فەلەستینی، لەپێناوی بەرگریکردن لەئیسرائیل و هاوڵاتیانی ئیسرائیلدایە. ئایا ئێمە ناچارین بۆ داوەریکردن لەبارەی کاری بەرجەستەی ئەو سەربازەوە، واتە کوشتنی لاوێکی بێگوناه، بەراڤەکردنی ئەو بۆ "بنەمای" بەرگریکردن لەخود وازبهێنین؟ لەراستیدا دیدی زیهنیگەری ڕادیکال و ڕێژەگەر دەریدەخات کە سەرسەخترین حوکمە دینتۆلۆجی‌و ڕەهاکانیش، کۆمەڵێك حوکمی ڕاڤەیین. نوسینەکەی هانائارنێت "ئایشمان لەئۆرشەلیم"دا و پرۆژەکەی لەبارەی "دارزانی خراپەوە"، ئەم لایەنە ڕوندەکاتەوە. هەر کەسێك بەپێی تەسلیمبوون بە حوکمە ئەخلاقیە ڕەهاکان (لەراستیشدا بەپێی ڕاڤەکردنەکانی بۆ ئەو حوکمانە کە دەکرێت ڕاڤەکردنێك بن لەخزمەتی تاواندا)، دەکەونە هەڵوێستی هەڵبژاردنی خراپەوە. لەهەلومەرجی ئەخلاقی دینتۆلۆجیانەدا، بە پێچەوانەی ڕوکەشی زانستی و ڕەهاگەرانەی حوکمەکانیەوە، کرداری ڕاڤەکردن بەردەوامدەبێت. هەرکەسێك دەتوانێت ڕەوایەتی بۆ کارەکانی خۆی بدۆزێتەوە، و هەموانیش هەروا دەکەن.





بناغەی بڕوای ئەو کەسانەی لەوتوێژە ئەخلاقیەکاندا، "سروشتگەرن"، واتە ئەو بابەتگەرانەی کە بڕوایانوایە داوەریە ئەخلاقیەکان، دەرخەری "کۆمەڵێك راستین" لەبارەی جیهانەوە، بەهۆی دیدی هێرمۆنتیکی سەرەوە دەچیتە ژێر پرسیارەوە. سەربازێك کە دێهاتیەکی بێگوناهـ ناکوژێت، لەسەر راڤەکردنێك بۆ باشە و دیارە بۆ ئەنجامدانی ئەرك، خزمەتکردن بە وڵات و ئەمجۆرە شتانە، وا رەفتار دەکات. ئەم راڤەکردنانە ناگەڕێنەوە بۆ مەسەلە سروشتیەکان، بەڵکو دەگەڕێنەوە بۆ راڤەکردنی دی. دواجار هەڵسەنگاندنی ئێمە لەبارەی دروستی و نادروستی کاری سەربازە ئیسرائیلەکەوە کە فەڵەستینیەکە و سەربازە ئەمریکیەکە کە ڤێتنامیەکە و فەرمانبەری ئاشڤێتز کە یەهودیەکە دەکوژێت، بۆ راڤەکردنی ئێمە بۆ کوشتن و بۆ کاری تایبەتی

ئەو سەربازانە و بۆ ئەو راڤەکردنانەی بۆ رەوایەتیدان بە کارەکەیان کردویانە، دەگەڕێتەوە، نەك بۆ مەسەلە سروشتیەکان. نارازیبوونی من بۆ سزادانی لەسێدارەدان، دەکرێت لەبەرئەوە بێت کە توانای گەڕاندنەوەی نیە. واتە لەسەر بناغەی ئەو تێڕوانینە یان راڤەکردنەی من راوەستابێت کە ئەنجامدانی کارێکی کە نەتوانین بۆی بگەڕێینەوە و چاکیبکەین، ڕاست نیە. ئەگەر کەسێك لەسێدارە بدرێتو پاش مردنەکەی دەرکەوێت بێگوناهـ بووە، رێگەیەك بۆ گێڕانەوەی ژیان بۆ ئەو مرۆڤە نیە. لەسەر بناغەی ئەم تێڕوانینە، من حوکمێکی ئەخلاقی بۆ دژایەتیکردنی حوکمی لەسێدارەدان دەدەم.

-٣-

"پێدەچێت هەر پیشە و هەر لێکۆڵینەوەیەك، هەروەها هەر کردار و نەخشەیەك رووی لە باشە بێت. لێرەوەیە باشە وەك شتێك پێناسدەکرێت کە هەموو شتەکات رویان تێکردووە" کتێبێك کە پێدەچێت سەربەخۆترین تێکست بێت کە لەبارەی ئەخلاقەوە لە فەلسەفەی رۆژئاوا نوسراوە، بەم رستە راشکاو و بڕاوەیە دەست پێدەکات. ئەخلاقی نیکۆماخۆسی ئەرستۆ دەستپێکی تێڕوانینێکی باڵادەستە لە مێژووی ئەخلاقدا کە پێشتر بە "ئامانجخوازانە" ناومانهێنا. بەپێی ئەم تێڕوانینە هەموو کردارەکانی ئێمە رووی لە مەبەست، ئەنجام و ئامانجێکە (بە یۆنانی Telos).







هەموو یەکێك لەئێمە ژیانی خۆمان بەشێوەیەکی زانراو یان نەزانراو بەئاراستەی دەستگەیشتن بە ئامانجێك رێکدەخەین. ئەم ئامانجەش ئاراستەکەری دروستی یان نادروستی، ئەخلاقی یان نائەخلاقی کردارەکانمانە. ئەم پەیوەستبونەی ئامانج و ژیان، لەباسکردنی ئەخلاقدا یەکجار گرنگە، چونکە ئەوەش پیشاندەدات کە ژیانی کۆمەڵایەتی ئێمە بەستراوە بەئامانجێکەوە. ئەخلاق ئاشکراکەری ئاراستەوەرگرتنە فەردیەکانیو سیاسەت ئاشکراکەری ئاراستە وەرگرتنە کۆمەڵایەتیەکانی ئێمە بەرەو باشەن. لەئاستی ئەخلاقیدا ئەم باشیە لەچاوی ئێمەدا خۆشبەختیە(Eudaimonia) لەئاستی کۆمەڵایەتیشدا بەدەستهێنانی خۆشبەختیە لەکۆمەڵگایەکدا کە بەباشترین شێوە بەڕێوە دەبرێت. رەنگە لەبەر ئەم هۆیە بێت کە دەگوترێت ئەرستۆ کتێبی سیاسەتی وەك درێژە پێدانی بەرهەمەکانی لەبارەی ئەخلاقەوە نوسیوە.

پەیوەستبوونی سیاسەت و پرسی کۆمەڵایەتی لەناو خودی وشەی یۆنانی (ηολητικοο) دا ئاشکرایە. مرۆڤ وەك بونەوەرێکی کۆمەڵایەتی بەردەوام بەدوای دۆزینەوەی شێوەی دروستی ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتیەوەیە. شێوەیەك کە لەگەڵ وێناکانی مرۆڤدا بۆ خوشبەختی فەردی هاوئاهەنگ بێت. لە ئەخلاقی نیکۆماخۆسیشدا وەك هەر بەڵگەیەك کە لەژیانی فکریو کرمەڵایەتی یۆنانیەکاندا بەجێماوە، گریمانەی سەرەکی ئەوەیە مرۆڤ بونەوەرێکی کۆمەڵایەتیەو لەنێوان

بەرژەوەندیەکانی تاکەکەسو بەرژەوەندیەکانی کۆمەڵگادا هاوئاهەنگی هەیە. لەئەنجامدا داواکردنی خۆشبەختی لەلایەن تاکەکەسەوە، دەتوانێت بەمانای ئارەزوی خۆشبەختی بۆ گشت بێت. خۆشبەختی راستەقینەی تاکەکەس وەك یەکێك لەئەندامەکانی دەوڵەتشار، دەبێتەهۆی خوشبەختی کەسانی تریش. لەهەمان ئەو رستانەی یەکەمی کتێبەکەدا کە لەسەرەتادا هێنامانەوە پیشەسازی لەبەرامبەر تخنە بەمانای پیشە، هونەر هاتووە کە هاوکات لەگەڵ هەموو جۆرە لێکۆڵینەوەیەکی مرۆییدا وکردار و نەخشەیەکدا روو لە ئامانجێك بکەن. هیچ یەك لەمانە خەسڵەتێکی فەردیان نیە. گەڕان بەدوای باشەو خۆشبەختیدا بەشێوەیەکی ناچارانە خەسڵەتێکی کۆمەڵایەتی هەیە.

رەنگە لەبەرئەمە بێت ئەفلاتۆن هەرگیز دیالۆگێگی لەبارەی ئەخلاقەوە نەنوسی. لەکۆماردا کە باشترین جۆری حکومەت بۆ دەستگەیشتن بە باشترین جۆری

ژیانی مرۆڤ هێنراوەتە ئاراو بڕیارە کە دادپەروەری بناسرێت و پێناسبکرێت، باسەکە بەردەوام لەسنوری نێوان سیاسەت و ئەخلاقدا دەڕواتە پێشێ. ئەفلاتۆن زۆر باسی مەسەلە ئەخلاقیەکان دەکات، بەڵام بەشێوەیەکی پەرشوبڵاو و لەدیالۆگی جیاجیادا. لەدیالۆگی فیلبسدا سوکراتی بەتەمەن لەگەڵ دوو فەلەسوفی لاو پرۆتارخۆس و فیلیبسدا لەبارەی مەسەلەیەکی زۆر گرنگی فەلسەفەی ئەخلاقەوە قسەدەکەن. لەروانگەی فیلبس و پرۆتارخۆسەوە شتی باش بۆ هەموو گیانلەبەران چ مرۆڤ و چ ئاژەڵ مایەی لەزەت و

خۆشیە. سوکراتی ئەفلاتۆن ئەم رایە قبوڵناکاتو بڕوایوایە کە "باشی" لەبیرکردنەوە و زانایی و هێزی یادەوریەوە نزیکە: "ئیمە خەیاڵی دروست و هەڵسەنگاندنی عەقلانیانە بۆ هەرکەسێك کە بتوانێت سودیان لێوەربگرێت، بەباشتر و گرانبەهاتر لە خۆشی و لەزەت دەزانین". سوکرات بڕوایوایە ئەو چۆنایەتیە رۆحیەیی دەبێتەهۆی ئەوەی ژیانی مرۆڤ هاوڕێی شادی و خۆشبەختی بێت، زاناییە و خودی خۆشی ناتوانێت یەکسان بەباشی بێت. سوکرات دەڵێت ئەگەر کەسێك لەشادی بەهرەمەند بێت، بەڵام نازنێت کە شادە، خوشبەخت نابێت، و ئەگەر لەهێزی یادەوەریش بێبەش بێت، ئیدی وێنایەکی بۆ خۆشبەختی نابێت. چونکە بەبیریدا نایەتەوە کە سەردەمێك شاد بووە و سەردەمێکیش غەمگین. توانای بەراوردکردنیشی لەنێوانیاندا نابێت، وەك روەکەکان دەژی.

هەرئەم شکڵەی زانایی، عەقڵ و ناسینیش ئەگەر هاوڕێی لەزەت نەبن، بەکار نایەن و لەئەنجامدا ئەمانە خودی باشی نین. بانگەشەی سوکرات ئەوەیە کە ماوەی نێوان زانایی و باشی، چەندانجار لەماوەی نێوان لەزەت و باشی کورتترە. کۆی دیالۆگەکە بۆ سەلماندنی ئەم خاڵە تەرخانکراوە، و لە کۆتایدا لەکۆبەندی سوکراتدا دەخوێنینەوە کە نەمری یەکەم شتە کە لەباشەوە نزیکە، میانڕەوی و کەماڵ و بەسبوون لەپلەی دوهەمدان، عەقڵ و روناکبینی و خەیاڵی دروست لە پلەی سێهەمدان، و پلەی چوارهەمیش سەربە جیهانی رۆحە، واتە زانین و هونەر و خەیاڵی دروست و دواجار لەزەت لە پلەی پێنجەمدا دێت. ئەمانە فەزیڵەتەکانی مرۆڤن. بەڵام لەپارچەی ٤٢٨ی کۆماری ئەفلاتۆندا تەنها باسی چوار "فەزیڵەتی سەرەکی" کراوە: زانایی، ئازایەتی، میانڕەوی و دادپەروەری.







لەدیدی ئەرستۆوە مەسەلەی دۆزینەوەی فەزیڵەتەکانی مرۆڤ گرنگە. بەڵام ئەرستۆ بۆ دۆزینەوەی وەڵام رێگەیەکی دی دەگرێتەبەر، وهەوڵدەدات لەفەسڵەکانی چوارەم تا دوانزەهەمی کتێبی ئەخلاقی نیکۆماخۆسدا بیسەلمێنێت کە ئامانجی دروستی مرۆڤ، کە دەکرێت بە ئامانجێکی ئەخلاقی بزانرێن و بەدواداچوونی ببێتەهۆی ژیانی دروستی مرۆڤ خۆشبەختیە. تەنانەت هاورێیەتی، یان ئەو سیفەتانەی لە مرۆڤدا جێی ستایشن وەك ئازایەتی، میانڕەوی، راستگۆیی، دادپەوەروەری و لەمبابەتە شتانە، تەنها لەپەیوەندیە بە خۆشبەختیەوە مانا وەردەگرن. لەراستیدا ئەرستۆ زۆر سەرقاڵی ئەو خاڵە نیە کە خۆشبەختی چیە، و بەشتێکی کەمتازۆر بەدیهیو ئاشکرای دەزانێت. ئەرستۆ زیاتر لەو رێگەو شێوازانەی کە خەڵکی بۆ گەیشتن بە خۆشبەختی هەڵیدەبژێرن، قوڵدەبێتەوە. دیارە ئاشکرایە "خۆشبەختی" لەلای ئەرستۆ بەمانای حاڵەتی دەرونی نیە، و لەزەتو خۆشی بەنوێنەری وردی خۆشبەختی نازانرێن. خۆشبەختی ئامانجێکە کە هەلومەرجی ئەنتۆلۆجی مرۆڤ دیاریدەکات. شێوەیەك  لەژیانی ئێمە نزیکە لە خۆشبەختیەکەوە کە بەشی ئێمەو ئەوانی دی، واتە تاکەکانی دی دەوڵەتشار دەبێت. هەڵبژاردن یان دۆزینەوەی رێگەیەك کە رێنمایم بۆ حۆشبەختیبکات، لە حوکمی گەشانەوەی کەماڵی سیفەتی مرۆیی مندایە، و فەزیلەتی منیش هەر لەم هەڵبژاردنەدا شکڵوەردەگرێت. لەزەت یەکێك لە دەرئەنجامەکانی ئەم هەڵبژاردنەیە. رەنگە بکرێ بگوترێت پرسیاری سەرەکی ئەخلاقی ئەرستۆ بریتیە لە: من چۆن بژیم بەشێوەیەك بتوانم بڵێم باش و دروست ژیاوم، و توانا مرۆییەکانم تا بەرزترین ئاست پشکوتووە؟

لەلایەکی دیەوە بەهێنانە ئارای مەسەلەی ئامانج، جۆرێك کارکردن و دواجار ئاراستەکردنی کارەکان و بیرکردنەوەکانی ئێمەش دێتەئاراوە. مەگەر ئامانجی پزیشك گێڕانەوەی تەندروستی نەخۆش نیە؟ کەوابوو کاری پزیشکەکە بەم ئامانجە ئاراستە دەکرێت، تائەو جێگەیەی لەزوربەی حاڵەتەکاندا تەنانەت سەرنەکەوتنیشی نابێتە هۆی ئەوەی هێرشی بکرێتەسەر یان تۆمەتبار بکرێت. ئامانجی دروستکردنی کەشتی، سەفەرکردنە. سەفەر بەهەر دەرئەنجامێك بگات، تا ئەوکاتەی بەکەشتیەکی باشو چاك دروستکراودا ئەنجامدەدرێت، کاری دروستکەری کەشتی ئاراستە دەکرێت. هەوڵی مرۆڤ ئەگەر لەپێناوی خوشبەختی و باشیدا بێت، بەومانایەی مەبەستی خۆشبەختی

تاکەکەس و کۆمەڵگا بێت، هەوڵێکی ئاراستەکراو و ئەخلاقی. خۆشبەختی ئامانجێکە کە بونەوەرێکی ئەخلاقی بەدوایدا دەڕوات، و تەنهاش بۆ خودی خۆی داوای دەکات. ئەرستۆ پیشانیداوە ژیانێکی باش چالاکانە دەڕواتە پێشێ، کۆکەرەی سیفەتەکانی باشیە، خۆی ئامانجو مەبەستەو بڕیار نیە بەهەڵبژاردنی بەجێگەیەکی دی بگەین و شتێکی دی بەدەستبێنین. ئەوەی ئەرستۆ ناوینانەوە تەکبیرکردن، لەخزمەتی ئەم ئامانجەدایە. من بەردەوام دەبێت لەبارەی ئەو ڕێگایانەی بەرەو ئامانجم دەبەن، قوڵببمەوە. ئەم قوڵبونەوەو تەکبیرکردنە تیورییە، دواجار راستبوون و ناراستی ئامانجەکانم روندەکەنەوە. تەکبیرکردن بەپێی نمونە بەناوبانگەکەی ئەرستۆ وەك هێڵێکی چەماوەیە کە بۆ گونجان لەگەڵ شێوە پڕ پێچوپەناکاندا شکڵی خۆی دەگۆڕێت. گونجاندنی شێوازە جیاوازەکانی ژیان لەگەڵ یەکدا، وشێوەکانی ژیانی مرۆڤ پێکەوە بۆئەوەی ڕێگە بۆ هاوسەنگی سەرەکی، واتە دروست ژیان تاکەکەس و هەموان بکرێتەوە، کاریکە کە لەسەر بناغەی دۆگمەکان و ڕێسا نەگۆڕەکانەوە ئەنجامنادرێت. چەندانجار روودەدات کە خێرێك دەکەینە قوربانی خێرێکی دی. دیارە ژیانی دروست و باش ئامانجی دوایی ئێمەیە، بەڵام قابیلی زیان پێگەیاندنەو بەردەوام لەپێناوی گەیشتن بەم ژیانەدا هەوڵدەدەین، وهەندێکجاریش لەم رەوتەدا بۆ دواوە دەگەڕێینەوە.

ئەرستۆ بەپێچەوانەی ئەوەی لەسەرەتای کتێبەکەیدا دەردەکەوێت، خۆشبەختی بەخاڵێکی بەدیهی نازانێت. سەرنجبدەن کە بەبڕوای ئەرستۆ ئێمە ناتوانین باسی خۆشبەختی بەمانا ئەفلاتۆنیەکەی بکەین، و "خۆشبەختی بەمانای هەمەکی و گشتی" واتە بەمانایەك کە هەموان قبوڵیان بێت، بوونی نیە. ئەرستۆ لەئاماژەیەکی زمانناسیانەدا دەریدەخات وشەی eudaimoniaش لای هەموان یەك مانای نیەو لەزەمینەی جیاوازدا، ئاشکراکەری ئامانجی جیاوازە. مرۆڤی زانا باشی بە ئامانجی کۆتایی خۆی دادەنێتو لەگەڵ کەسانی زانای تردا لەبارەی پێناسێکەوە بەو ڕێکەوتنە دەگات کە باشی بۆ خودی خۆی داوادەکرێت. مرۆڤی داناو جیا و سەربەخۆ لە رووداوەی ساتەوەختەیەکانو ئەو ڕێکەوتنانەی لەژیانیدا دێنە پێشێ، خۆشبەختی لەگەڵ باشیدا بەیەکشت دەناسێت.

گەڕان بەدوای خۆشبەختیدا لەچالاکیەکانی مرۆڤدا بەرچاو دەکەوێت. عەقڵی







پراکتیکی کە لەسەرجەم مێژووی میتافیزیکدا لەگەڵ گەڕانی ئەخلاقیدا بەیەکشت دادەنرێت، سەرچاوەی لێرەوە وەرگرتووە. خواست و داواکردنی خۆشبەختی مەسەلەیەکی پراکتیکیو لەراستیدا چالاکیەکی مرۆییە. جۆرێك کرداری عەقلانیە کە کۆتاییو ئامانجێکی زیاتر لە بەدیهاتنی خواستەکان، ئارەزوەکانو غەریزەکانی مرۆڤ، داوادەکات. کاتێك لەباسەکەی ئەرستۆ لەبارەی فەزیڵەتەوە ورددەبینەوە، ئەم خاڵە باشتر روندەبێتەوە. فەزیڵەت گەڕانە بەدوای شتێکدا کە نیمانە، ئامانجێکە لەکۆتایی ڕێگاکەدا، شتێکی سەر بە ئایندەیە، بەڵام مانا بە ئەمڕۆی ئێمە دەبەخشێتو پاساوی پراکتیکی و عەقلانی بۆ چالاکیەکانمان دێنێتەوە. ئەرستۆ نالێت ئێمە دەبێت چیبکەین، بۆ ئەوەی بەخۆشبەختی بگەین. ئەرستۆ دەریدەخات کە راستی یان هەڵەی کردارێك بەستراوە بەوشتەوەی بەرهەمیدێنێت. دەبێ لەوە بکۆڵینەوە ئایا ئەم دەرئەنجامە هەنگاوێکە بەرەو پێشەوە لەپێناو بەدەستهێنانی خۆشبەختیدا بەمانا هەمەکیەکەی یان نا. چالاکیەکانی ئێمە لەخۆیاندا راست یان هەڵە نین، بەڵکو بەپێی ئەو دەرئەنجامانەی هەیانە راست یان هەڵەن. دەرئەنجامەکانیش پەیوەستن بەهەندێك هۆکاری تری جیاواز لە مەبەست نیتەکانی ئێمەوە. لەکتێبی دوهەمی ئەخلاقی نیکۆماخۆسدا فەزیڵەتی ئەخلاقی خراوەتە بەرباسو بەسروشتێکی مرۆیی دانراوە. سروشتێك کە لەهەڵبژاردنی هۆکاری پێویست بۆ گەیشتن بەئامانجی کۆتایی واتە خۆشبەختی، خۆی پیشاندەدات. فەزیڵەتی ئەخلاقی یەکێك لە خەسڵەتە سروشتیەکانی مرۆڤ نیە. هیچکەس بە فەزیڵەتەوە لەدایك نابێت: فەزیڵەت بەدەستدێتو دەبێت بەخەسڵەتێکی هەڵبژێرراوی ئێمە. ئێمە ئەم فەزیڵەتە بەهۆی پەروەردەوە بەدەستدێنین، چونکە هێواش هێواش فێردەبین کام هۆکارانە ڕێخۆشکەری خوشبەختی ئێمەن. فەزیڵەت دۆزینەوەی میانڕەوییە. دۆزینەوەی هاوئاهەنگیە لەنێوان هەلومەرجی هەبوداو هەلومەرجی مەبەستدا.

ئەرستۆ دەیویست بەدەر لەحاڵەتە دەرونیەکانی مرۆڤ، لەڕێگەی عەقلانیەتی فەلسەفیەوە ئامانجی ژیانی مرۆڤ بدۆزێتەوەو لەم ئاراستەیەشدا بە چەمکی خۆشبەختی گەیشت. ژمارەیەك لە لایەنگرانی دیدی ئامانجخوازانە لە ئەخلاقی مۆدێرندا، باسەکەیان بەرەو هەمان ئەو حاڵەتە دەرونیانە وەرگێڕا کە ئەرستۆ

خستبویە لەلاوە. لەدیدی بیریارانی رۆژگاری مۆدێرنەوە مەسەلەکە نەیدەتوانی لەگونجانی تاکەکەس و کۆمەڵگاوە دەست پێبکات کە لەلایەن ئەرستۆوە قبوڵکرابوو. لێرەوە کاری فەیلەسوفی ئەزمونگەری رۆژگاری مۆدێرن لەبواری ئەخلاقدا بەمشێوەیە دەربرا: من چۆن دەتوانم خۆشبەخت بم و تادوا سنور لەزەت لە ژیان وەربگرم و قازانج بکەم؟. ئیدی من واتە سۆبژێکتی زانا، بناس، سەربەخۆ و چەقگرتوو لەئارادا بوو. پرسیارەکە وادەهێنرایە ئارا: "ئێمە چۆن دەتوانین قازانج بکەین". تاکگەری موڵکدارانە لەئارادا بوو. دواسنوری شادی و قازانجکردن بە ئامانجی سەرەکی هەر مرۆڤێك دەزانرا. ئەگەر باسی بەرژەوەندی گشتیش لەئارادا بوایە، ئەوا نەك باسی واقعی دیموکراسی راستەوخۆو هاوئاهەنگی تەواوی هاوڵاتی ئازادو کۆمەڵگا، بەڵکو باسی هێزێکی نهێنیئامێز و غەیبی دەکرا. رێك وەك ئەو "دەستە غەیبیەی" ئادام سمیس لەباسە ئابوریەکانی خۆیدا بۆ بەرگریکردن لە کاروکردەوەی بازاڕی ئازاد، و"چاودێرێکی بێلایەن" کە لەباسە ئەخلاقیەکانی خۆیدا دەیهێنایە ئاراوە. تەنها کاتێك وێنای خۆمان لەدەرەوەی خۆمان بکەین دەتوانین بیر لەفەزیلەتە ئەخلاقیەکان بکەینەوە. لەدنیای واقعی رکەبەرایەتی سەرمایەداری و خەبات لەپێناوی مانەوەدا، گریمانیەکی لەمچەشنە مانایەکی نهێنی ئاشکرادەکات: هەموو کەسێك بەدوای قازانج و خۆشگوزەرانی خۆیەوەیە.

فەیلەسوفانی ئەخلاق لەنیوەی سەدەی هەژدەدا (کە بە ئەرکی خۆیان دەزانی وەڵامی ئەو چەمکەی هۆبز بدەنەوە کە مرۆڤی وەك بونەوەرێکی خۆویست و بەرژەوەندیخواز دەبنیی کە لەرێگەی دەسەلاتێکی رەهای حکومەتەوە نەبێت، نایەتە ژێربار) جەختیان لەسەر بوونی هەستی ئەخلاقی"Moral Sense" دەکرد. هەستێك کە دەکرێت لەرێگەیەوە جیاوازی نێوان خراپە و باشە باشە بزانرێت. لۆرد شافتەر بۆری و فەرانسیس هاچسن لە بەرجەستەترین ئەو بیریارانە بوون کە ئەم چەمکە ئاڵۆزەی هەستی ئەخلاقیان هێنایەئاراوە. ئەوە "هەستی دەرونیە" کە شتە جوان و ئەخلاقیەکان کاری تێدەکات و کاردانەوەی تیا دروستدەکەن. هەر بەهۆی ئەم هەستی دەرونیەشەوەیە کە مرۆڤ ئەوەی بەشێویەکی بەرجەستە لەبەرژەوەندی و قازانجێتی، دەناسێتەوە. مرۆڤ نەك بەهۆی عەقڵ و لۆژیکەوە بەڵکو بەهۆی ئەم هەستەوە، ژیانی ئەخلاقی دەگرێتەبەر. زانستی ئەخلاق دەبێت ئەو بابەتانە







تاوتوێبکات کە پەیوەندی بەهەستی ئەخلاقیەوە هەیە. چەمکی هەستی ئەخلاقی لەباسەکانی هیومدا درێژەی پێدرا. هیوم فەلسەفەی ئەخلاقی بە زانستی خەسڵەتی مرۆڤ دادەنا، و لەراستیدا سنورێکی ناوردبینی لەنێوان ئەخلاق و دەرونناسیدا دەکێشا. بەبڕوای هیوم لەژیانی پراکتیکی ئێمەدا ئەو باوەڕە بنەڕەتیانەی دەبنە هۆی پێشکەوتن، لەعەقڵەوە دروستنابن. ئەو باوەڕانەی خەڵکی بەشێوەیەکی پێشینە و بەشێوەیەکی هەستیاری پێیگەیشتوون و بە راستیان دەزانن، دەبنە سەرچاوەی ژیانی ئەخلاقی مرۆڤەکان. ئەو جیاوازیانەی ئێمە لەنێوان باشە و خراپەدا دایدەنێین، بەو وێنایەوە کەبۆ بابەتە سودمەندەکان هەمانە، دەرئەنجامی کاری عەقڵ نیە، بەڵکو دەرئەنجامی هەستی ئەخلاقی ئێمەیە.

لەدیدی جرمی بنتامەوە ..بایاشناسی یان زانستی ئەخلاق کە پاش مردنی بڵاوکرایەوە، لەزەت و رەنج هەمان ئەو مانا ئاساییانەی کە هەیە کە خەڵکی مەبەستیانە لێی. ئەمانە کۆمەڵێك پێدراوی دەرونین و لەو روشەوە کە مرۆڤ بەدوای زۆرترین لەزەتەوەیە و هەوڵدەدات تادوا سنوری شیاو لە رەنجی خۆی کەمبکاتەوە، پێویستی بە ئەخلاق دەبێت. سودخوزای رونکەرەوەی رێگە و شێوازێکە کە زۆرترین لەزەت مومکین دەکات. لەراستیدا حوکمی ئەخلاقی تاوتێوێکردنی رادەی زۆرترین لەزەت یان زۆرترین رەنجە کە بابەتی حوکمەکە بەرهەمیدێنێت. ئەم خاڵە لەوتاری بەناوباگی سودخوازی جۆن ستیوارت میلدا تاوتوێکراوە. ئەم وتارە لەچەند وتارێکی پێکەوەگرێدراو دروستبووە، هەرچەند تیاییدا چیدی ئەو شێوازە رەوان و درەخشانەی لەبارەی ئازادیەوە نابینرێت، بەڵام خاوەن خەسڵەتی راشکاوی و سادەیی دەربڕینە. حوکمی سەرەتایی میل زۆر بەناوبانگە: سودخوازی بڕوایوایە کردارەکانی مرۆڤ تا ئەو جێگەیە راست و شایستەیە کە بەئاراستەی زیادکردنی شادی بێت، لەو شوێنەشدا ناراست و ناپەسەندە کە بەئاراستەی کەمکردنەوەی شادی بێت. شادی ئامانجی ئەخلاقی هەموانە. سودخوازی سەرچاوەی هەموو مەسەلە سەرەکیەکانی ئەخلاقە، و دیارە دەبێ ئەمەش بەفراوانترین مانای خۆی وەربگرین کە لەسەر بناغەی بەرژەوەندی هەمیشەیی مرۆڤ دامەزراوە. راجر کریسپ لەکتێبی میل و سودخوازیدا دەنوسێت چەمکی سود بەدەر لەو گرنگیە زۆرەی لە باسی ئەخلاقی میلدا هەیەتی، زۆر ورد نەکراوەتەوە و باشترە لەبریئەم چەمکە سود لەچەمکی

خوشگوزەرانی (Welfare) رێك وەك بەو مانایەی کە ئەمڕۆ هەیەتی، وەربگرین. ئەوکاتەی تێزی ئەوپەڕی سود، بە ئەوپەڕی خوشگوزرانی بزانرێت، باشتر ئەو مانایە روندەبێتەوە کە میل مەبەستێتی. دەبێت ئەزمونی لەزەت، ملکەچی خۆشگوزەرانی بێت. خۆشگوزەرانی بەسەر لەزەتدا بالادەستە. کاتێك نەخۆشێکی جگەر لەزەت لەخواردنەوەی مەی وەردەگرێت، خۆشگوزەرانی خۆی دەخاتە مەترسیەوە. ئێمە بۆیە بەدوای لەزەتەوەین، چونکە وا هەستدەکەین سودی بۆ ئێمە هەیە. بەلام سود یان خۆشگوزەرانی بەپێی رێسایەکی جیاواز لە لەزەت دیاریدەکرێت. لە فەسلی دوهەمو سێهەمی سودخوازیدا میل باسی "هەستێکی سروشتی بەهێز" لە مرۆڤدا دەکات کە لەراستیدا هەستی کۆمەلایەتی مرۆڤە و ئارەزووە بۆ دروستکردنی یەکێتی لەگەڵ ئەوانی دیدا و ژیان لەم یەکێتی و هاوئاهەنگیەدا. لەراستیدا ژیانو هەستی کۆمەلایەتی ژیانی سروشتی مرۆڤە. ئەو ناتوانێت خۆی بەیەکێك لەئەندامەکانی هەمەکیەك ببینێتو هەرگیز ناتوانێت دواکاری خۆشگوزەرانی بۆ خۆی بە تێزی رەهاگەرانەی هەموو شتێك بۆ من، کۆتایی بێت. هرچەند کۆمەلگا زیاتر پێشبکەوێت و لە کەمی کەرەسە مادی و پێویستەکان کەمبێتەوە، تاکەکان زۆرتر تەبایی و بەرژەوەندی هاوبەشیان دەبێت. بەدەربڕینێکی دی خۆشگوزەرانی، شادی و سودوەرگرتن، بەرنامەی مۆدێرنەیە.

نیتچە رەخنەگری سەرسەختی مۆدێرنە، گاڵتە بەم وتەیەی میل دەکات. نیتچە لەپارچەی یەکەم و دوهەمی یەکەم وتاری جینالۆجیای ئەخلاقدا هەوڵی "هەندێك دەروونناسی ئینگلیزی" کە هەوڵدەدەن باشی لە سودو خۆشگوزەرانیەوە بەرهێنن، رەد دەکاتەوە. تەنها کەسێك کە خۆی لە خۆشگوزەرانیدا بژی، لەگەڵ ئەمجۆرە باشی و ئەخلاقەدا هاوڕا دەبێت. چەمکی ئەمڕۆیانەی باشی بەوشێوەیەی سودخوازان دەیهێننە ئاراوە، هیچ تازە نیە، و دروستکراوی ئەرستۆکرات و نەجیبزادەکانی سەدەکانی ناوەڕاستە. ئەوان خۆیان بە باش دەزانی، و هەوڵیاندەدا لەرێگەی پێناسی خۆیانەوە بۆ "باشی" خۆیان لەخەڵکی بێسەروبەر، واتە فەقیرەکان جیابکەنەوە. لە روبەروبەبونەوەی ئەم چەمکەی باشیدایە کە توڕەیی _ نەفرەت (Resssenitment) دروستدەبێت. هەستێك کە خەڵکانی بێدەسەلات بەرامبەر بەو کەسانە هەیانە کە لە پلەوپایەکانی دەسەلاتی کۆمەلایەتیدان. لەبەر هۆی کارکردنی





ئەم توڕەیی-نەفرەتەوەیە کە پۆلبینەکان، واتە خەڵکانی ئاسایی بەهاکانی خۆیان بونیاددەنێن، وتەنانەت شێوەیەکی سیستماتیکی پێدەبەشخن. ئەمڕۆ نەجیبزادە ئینگلیزیەکان لەبیریان چۆتەوە کە ئێمە دوو جۆر ئەخلاقمان هەیە: ئەخلاقی کۆیلەکانو ئەخلاقی ئاغاکان. لێرەوە زاراوەکان باشو خراپ، مانای ناکۆك بەیەك وەردەگرن. ئەخلاقی ئاغاکان دەسەلاتو رەسەنایەتیو پشبەستن بەخۆ بە باش دادەنێن، و کۆێلە هاودەردی و لێکبوردنو تەحەمول بە باش دەزانێت، واتە ئەو سیفەتانەی لە مەسیحیەتدا ستایشیانکراوە. کۆیلەکان سیستەمی بەهای خۆیان دروستدەکەن، و موسیحیەکان و سودخوازان و فەیلەسوفانی ئینگلیزی پلەبەندی بەهاکانی ورد دەکەنەوەو وادەزانن فۆرمیان بەسیستەمکی هەمەکیو گەردونی ئەخلاقی داوە. ئەوەش کە ئەم دوو زنجیرە بەهایە و ئەم دو شێوە دوالیزمەی باش و خراپە دەتوانێت لەناو دەرونی یەك کەسیشدا جەنگێك بەرپابکات، لەدیدی دەروناسە ئەخلاقیەکانەوە دور دەبێت. ئەمڕۆ لەناو "خەسڵەتە مەزنەکانی" مرۆڤیشدا، هەر ئەم جەنگە بێبەزەییانە لەئارادایە و چیدی جێگەیەك بۆ پەرەپێدانی ئەخلاقی رەهاو گەردوونی نەماوە.

نیتچە لەدوا فەسڵی "هەنوکە مرۆڤ"دا، واتە دوا کتێبێك کە ئامادەی کردبوو، دەپرسێت: "ئایا من دەرککراوم؟ ئەو شتەی پێناسی من دەکات، ئەو شتەی لەمرۆڤەکانی دی جیامدەکاتەوە، ئەوەیە کە دەمامکم لەسەر ئەخلاقی مەسیحی هەڵگرت؟". نیتچە گوتی کە گرنگترین کاری خۆی بەوە دەزانێت دواجار قسەیەك بکات کە ئەوانی دی خۆهەڵخەڵەتێنەرانەو تاوانکارانە لەبەرامبەریدا بێدەنگبوون. کوێربوون لەبەرامبەر ئەخلاقی مەسیحیدا، تاوانێکە دەرهەق بە ژیان. ئەمجۆرە ئەخلاقە دەبێت بخرێتە لاوە. زەردەشتی پێغەمبەر بوو کە "مەرگبارترین هەڵەکان، واتە ئەخلاقی داهێنابوو". ئەخلاقی درۆ، هەڵەو خواستی درۆ. بەلام خواستی خودی نیتچە کامەیە؟ دەڵێت "هەقیقەتێکی ترسناك": سەرلەنوێ پیاچونەوە بەسەرجەم بەهاکاندا. فەیلەسوف دەبێت بەهادانانی یەکلایەنە، لوسو بێتام بخاتە لاوە، دەوری خۆی بگۆڕێت، و چیدی ئەندازەگیری باشەو خراپە لەبواری بەهاکاندا نەمێنێتەوە. فەیلەسوف دەبێت لە "ئەخلاقی مێگەلی" خۆی بەدور بگرێت، و بچێتە ئەودیوی چاکەو خراپەوە. دەبێت بەهایەکی مەزنتر لە بەها ئەخلاقیە هەبوەکان بخولقێنێت،

یان لانیکەم هەواڵەکە بهێنێت: ئەخلاقی سەر بە مەزنە مرۆڤ.

سەرچاوە:

بەشێك لەفەسڵی دوهەمی ئەم کتێبە:

بابك احمدی: معمای مدرنیته. تهران. نشر مرکز. چاپ اول . ١٣٧٧".





## ئەفسانەی مەکیاڤیلی

## نوسینی: ئەڕنست کاسیرەر

لەسەرتاسەری مێژووی ئەدەبیاتدا چارەنووسی میری مەکیاڤیلی باشترین بەڵگەی ئـەو قـسەیەیە کـە دەڵێـت: "بـەختی هـەر کتێبێـك بەسـتراوە بـە ڕادەی خوێنەرەکانیـەوە"(١). ناوبـانگی کتێبەکـەی مـەکیاڤیلی بێوێنـە بـوو. ئـەم کتێبـە وتـارێکی لاهـوتی نـەبوو کـە تـەنها توێـژەوەکان بیخوێننـەوە و فەیلەسـوفانی سیاسـی ڕوونیبکەنـەوە. کتێبەکـە بـۆ تێرکردنـی فزوڵیـەتی فکـری نەدەخوێنرایـەوە. مـیری مـەکیاڤیلی لـە بەردەسـتی یەکـەم خوێنـەرەکانی خۆیـدا ڕاسـتەوخۆ دەخرایـە نـاو پراکتیکـەوە. ئـەم کتێبـە وەك چـەکێکی بـەهێز و ترسـناك لـە ململانـێ سیاسـیەکانی جیهانی نوێدا بەکارهێنرا. کاریگەریەکانی دیار و حاشاهەڵنەگر بـوو. بـەڵام ماناکـانی هەروا بە نهێنی مانەوە. تەنانـەت ئێـستاش و پـاش ئـەوەی کتێبەکـەی مـەکیاڤیلی لـە هەموو ڕویەکەوە تاوتوێکراوە و فەیلەسوفان و کۆمەڵناسان چەندان لێکۆڵینەوەیان لە بارەیەوە کردوە، هێشتاش نهێنیەکانی ئـەم کتێبـە بـە تـەواوی نـەزانراوە. سـەدە دوای سەدە و تەنانەت نەوە دوای نەوە هەڵسەنگاندن لە بارەی میرەوە نەك هەر دەگۆڕێت، بەڵکو بە تەواوی لنگەوقوچ دەبێتەوە. ئەم قسەیە لە بـارەی نوسەرەکەشیەوە ڕاسـتە. وێنەی مەکیاڤیلی لە مێژوودا بە هۆی خۆشەویستی و بوغزی حیزبیەوە، هەمـەڕەنگ و جۆراوجۆر بوە. لەبەرئەوە زۆر ئەستەمە لە پـشت ئـەم هـەموو بـیروڕا جیـاوازەوە سـەبارەت بـە مـەکیاڤیلی و کتێبەکـەی، سیمای ڕاسـتەقینەی ئـەم نوسـەرە و بابـەتی کتێبەکەی بناسین.

کاردانەوەی یەکەم جۆرێك لە ترس و تۆقین بوو. ماکولی لە سەرەتای وتارەکەیـدا لە بارەی مەکیاڤیلیەوە، نووسی:

"گومانم هەیـە هـیچ ناوێـك لـە مێـژووی ئەدەبیاتـدا هێنـدەی نـاوی ئـەو کەسـەی دەمانەوێت خەسڵەتی خۆی و نوسینەکانی تاوتوێبکـەین، ئەوەنـدە بـەدناو بێـت. ئـەو





زاراوانەی کە ئەویان پێ وەسفکردوە، دەلالەت لەوە دەکات کە ئەو شەیتان، ڕەگی خراپە، دۆزەرەوەی چاوچنۆکی و تۆڵەسەندنەوە و داهێنەری بنەڕەتی فرتوفێڵ بووە. وەك ئەوەی پێش بلاوبوونەوەی کتێبە بەدناوەکەی میر، هەرگیز هیچ مرۆڤێك ڕیاکار و ستەمکار و خائین نەبوە یان فەزیلەتێکی درۆزنانە و ئەنجامدانی تاوان لە پێناوی بەرژەوەندیدا لە ئارادا نەبوە.. لە ناوی خێزانی ئەو، نازناوێکیان دروستکرد بۆ مرۆڤێکی بێبار و ساختەچی و ناوە بچوکەکەشی بۆتە هاومانای شەیتان"(٢).

پاشان ئەم حوکمە هەڵگەڕایەوە، پاش قۆناغێك لە سەرزەنشتکردنی لەڕادەبەدەر، قۆناغێك لە ستایشکردنی زیادەڕەو دەستی پێکرد. تاوانبارکردن و زەمکردن جێگەی خۆیدا بە جۆرێك لە حورمەت و پەرستن. مەکیاڤیلی کە بەراوێژکاری ستەمکاران ناسرابوو، بوو بە شەهیدی ڕێگەی ئازادی. ئەو کە بەرجستەبووی شەیتان بوو، بوو بە قارەمان و قەدیس.

لە بارەی کەسێکی وەك مەکیاڤیلیەوە هەردوو تێڕوانینەکە کەموکوڕ و گومڕا کەرە. نالێین کتێبەکەی مەکیاڤیلی نابێ لە دیدی ئەخلاقیەوە بخوێنرێتەوە و هەڵسەنگێنرێ، لە بەرامبەر کتێبێکدا کە هێندە کاریگەری ئەخلاقی بەجێهێشتوە، هەڵسەنگاندنی ئەخلاقی ناچاریە و بگرە پێویستیشە. بەڵام نابێت بە زەمکردن یان دەستخۆشی، بە ناشرینکردن یان جوانکردن دەست بە هەڵسەنگاندن بکەین. لە بارەی مەکیاڤیلیەوە ڕەنگە لە هەر نوسەرێکی تر زیاتر پێویست بێت کە ئەو پەندەی سپینۆزامان لە یاد بێت: "نە گاڵتە پێکردن، نە نرخاندن، نە تاوانبارکردن و نە نەفرەتکردن، بەڵکو تێگەیشتن". بەرلەوەی میر و نوسەرەکەی هەڵەسەنگێنین، دەبێ هەوڵبدەین کە بابەتەکانی کتێبەکە تێبگەین. بەلام ئەو دوو ئەفسانەیەی بۆ مەکیاڤیلیان دروستکردوە، ڕێگرە لە بەردەم تێگەیشتنی بێلایەنەی کتێبەکەیدا. لە کاتی خوێندنەوەی میردا بەردەوام دەبێ بەرامبەر بەم دوو ئەفسانەیە هوشیار بین: یەکێکیان ئەفسانەی ڕق لە مەکیاڤیلی و ئەوی دیان ئەفسانەی عاشقبوونی مەکیاڤیلی. ئەفسانەی ڕق لە مەکیاڤیلی لە ئینگلتەرا و لە سەدەی حەڤدەدا دروستکرا. نەك هەر سیاسەتمەداران یان فەیلەسوفان بەڵکو هەروەها شاعیرە گەورەکانی ئینگلیزیش بەشداریان لە دروستکردنی ئەفسانەی مەکیاڤیلیدا کرد. ئەستەمە نوسەرێکی بەناوبانگ لە سەردەمی مەلیکە ئەلیزابێتدا بدۆزرێتەوە کە





ناوی مەکیاڤیلی نەبردبێ و تیۆرە سیاسیەکەی ئەوی هەڵنەسەنگاندبێ. ئەدوارد مایر لە کتێبەکەی خۆیدا "مەکیاڤیلی و شانۆنامەکانی سەردەمی ئەلیزابێت"(٣) دەریدەخات کە لە ئەدەبیاتی سەردەمی ئەلیزابێتدا ٣٩٥ جار ناوی مەکیاڤیلی هاتوە. لە شانۆنامەکانی مارلۆ، بنجۆنسۆن، شکسپیر، ڤێبستەر، بومۆنت و فلەچەردا مەکیاڤیلیسم(٥) لە هەموو شوێنێکدا بەرجەستەکەری فرتوفێڵ و ڕیاکاری و دلڕەقیە. خراپەکاری هەموو شانۆنامەیەك بە گشتی خۆی بە پەیڕەوی مەکیاڤیلی وەسف دەکات(٦). ڕەنگە بکرێ ڕاچڵەکێنەرترین دەربڕینی ئەم هەستە گشتیە لە مەنەلۆگی ڕیچارد، دۆك گلاوستەردا بدۆزرێتەوە کە لە بەشی سێهەمی شانۆنامەی شکسپیر، شا هێنری شەشەمدا، هاتوە:

بۆچی دەتوانم زەردەخەنە بکەم و بە زەردەخەنەوە مرۆڤ بکوژم
و نەقیزە لەو شتە بدەم کە دڵم تەنگ دەکات
گۆناکانم بە فرمێسکی درۆزنانە تەڕ دەکەم
و بە پێی هەلومەرج ڕەنگی خۆم دەگۆڕم
من بەر لە پەریە دەریایەکان، دەریاوانەکان لە دەریادا غەرق دەکەم
من بەر لە ئەژدیهای باسیلیسك(٧) بینەرەکانی خۆم دەکوژم
من دەوری وتاربێژ و.. بە تەنیا لە ئەستۆ دەگرم
لە تەڕدەستیدا، دەستی ئۆلیش لە پشتەوە دەبەستمەوە
و وەکو سینۆن(٨) تروایەکی تر داگیردەکەم
بۆقلەمون سیفەترم لە بۆقلەموون
لە گۆڕینی وێنەدا وەك ئەوەی لە پرۆتۆئۆس(٩) بەرمەوە
مەکیاڤیلی تاوانباریش بۆ قوتابخانە دەنێرم(١٠)

ئەوەی کە ڕیچاردی سێهەم باسی مەکیاڤیلی دەکات هەڵگەڕانەوەی تەرتیبی زەمەنی مێژوویيە. بەڵام هەڵگەڕانەوەی تەرتیبی زەمەنی مێژوویی نەجێی سەرنجی شکسپیر بوو، نە جێی سەرنجی تەماشاکەرانی. چونکە ئەو کاتەی شکسپیر شانۆنامەکەی دەنوسی، ناوی مەکیاڤیلی بە گشتی مێژوویی بوونی خۆی لە دەست دابوو، وە بۆ وەسفکردنی جۆرێکی بیرکردنەوە بەکاردەهات. تەنانەت دواتر وشەی مەکیاڤیلی یان مەکیاڤیلیزم هەمیشە بە خەرمانێك لە نەفرەت و ڕق دەورە درابوو.





له شانۆنامەیەکدا کە لیسینگ بە ناوی ئەمیلیا گالوتیەوە نوسیویێتی، مارینلی(١١) وەزیری ڕاوێژکاری میر، زۆرێك لە خەسڵەتەکانی مەکیاڤیلی ئەفسانەیی بەرجەستە دەکات. میر لە کۆتایی تراژیدیاکەدا هاواردەکات "بەس نیە کە پاشاکان مرۆڤن؟ ئایا دەبێ شەیتانەکانی خۆیان بخەنە جلوبەرگی دۆستانی شاوە؟"(١٢).

بەڵام سەرەڕای ئەم نەفرەت و بێزاریە هەرگیز تیۆرەکەی مەکیاڤیلی نەلەرزی. ئەم تیورەیە جێی سەرنجی سەرەکی ڕای گشتی بوو. سەیر لەوەدایە کە زۆربەی دوژمنە سوێندخواردوەکانی مەکیاڤیلی، سەرنجی گشتیان زیاتر بۆ ئەو ڕاکێشا. ڕق لە مەکیاڤیلی هەمیشە تێکەڵ بووبوو بە جۆرێك لە شەیدابوون و ڕێز. هەمان ئەو کەسانەی کە دیدگایان ڕێك پێچەوانەی ڕژێمی سیاسی مەکیاڤیلی بو، نەیانتوانی بلیمەتی سیاسی ئەو نەنرخێنن. یۆستۆس لیپسیۆس لە کتێبەکەی خۆیدا بە ناوی "سیاسەت"ەوە نووسی: "مەکیاڤیلی لەبەر هوشیاریەکی وا، سوك ناکەم. ئەو تیژبین و وردبین و زیرەکە"(١٣). لەم ڕووەوە جیاوازیەکی ئەوتۆ لە نێوان لایەنگرانی مەکیاڤیلی و سەرسەخترین نەیارەکانیدا نیە. ئەم یەکێتیە سەیرو سەمەرەیە یەکێك لە هۆکارە سەرەکیەکانی دەسەڵاتی نەمری مەکیاڤیلیزمە لە بیری سیاسی تازەدا. خودی مەکیاڤیلی مردبوو، بەڵام تیورەکەی بەردەوام لە بەرجەستەبوونی تازەدا ڕووی دەدا. بۆ نمونە مالرۆ لە سەرەتای شانۆنامەکەیدا "یەهودی مالتا" مەکیاڤیلی بەم شێوەیە دەناسێنێ:

گەرچی هەموان وا دەزانن مەکیاڤیلی مردوە
بەڵام ڕۆحی ئەو فڕی بۆ ئەوسەری ئۆڵپ
هەنوکە کە گیز(١٤) مردوە، ڕۆحی مەکیاڤیلی لە فەرەنساوە گەڕاوەتەوە
بۆ ئەوەی سەر لەم سەرزەمینە بدات و لەگەڵ دۆستەکانیدا گەمە و شەیتانبازی بکات
ڕەنگە ناوی من بۆ هەندێك کەس نەفرەت ئامێز بێت
بەڵام ئەوانەی کە عاشقی منن، من لە گەزەندی ئەوان دەپارێزن.
و لێگەڕێ ئەوانە بزانن کە من مەکیاڤیلیم
نرخ بۆ مرۆڤەکان دامەنێ و بەهایەك لە قسەکانیان مەدە
جێگەی ستایشی کەسانێکم کە زۆر ڕقیان لێمە





ئەگەرچی هەندێك کەس بە ڕاشکاوی خراپ باسی کتێبەکانم دەکەن
بەڵام هەر بەرهەمەکانم دەخوێننەوە تاکو دەستیان بە جێگەی پتۆس بگات
بەڵام هەر ئەوەندەی کە بەرهەمەکانم فڕێ دەدەن
پەیڕەوانم کە گەیشتونەتە پلەی باڵا، ئەوانە ژەهر دەرخوارد دەکەن

زۆری ویست تا ئەم وێنە ئەفسانەیەی مەکیاڤیلی بخرێتە لاوە، فەیلەسوفانی سەدەی حەڤدەهەم یەکەم کەسانێك بوون کە هێرشیان کردە سەر ئەم هەڵسەنگاندنە گشتیە. بیکۆن لە مەکیاڤیلیدا ڕۆحێکی ئاشنای دۆزیەوە. ئەو لە مەکیاڤیلیدا فەیلەسوفێکی دەبینی کە هەموو شێوازێکی لاهوتی خستبوە لاوە و هەوڵیدابوو سیاسەت بە شێوازی ئەزمونگەرانە بخوێنێتەوە. بیکۆن دەڵێ:

ئێمە قەرزارێکی گەورەی مەکیاڤیلی و نوسەرانی وەك ئەوین. ئەمانە بە ڕاشکاوی و ڕاستگۆییەوە ئەو شتانەیان ڕاگەیاندوە یان وەسف کردوە کە خەڵکی ئەنجامیدەدەن، نەك ئەو شتانەی کە دەبێ خەڵکی ئەنجامیبدەن(١٥).

بەڵام هێچ بیریارێکی گەورەی سەردەمی تازە هێندە سپینۆزا بۆ پیاچونەوە بە هەڵسەنگاندنی گشتی لە بارەی مەکیاڤیلیەوە و پاك کردنەوەی ناوی لە نەنگ و ڕیسوایی، هەوڵی نەداوە. سپینۆزا لە گەڕان بە دوای ئەم مەبەستەدا بە گریمانەیەکی سەیر گەیشت. ئەو دەبوو ئەو هەقیقەتە ڕوون بکاتەوە بۆچی مەکیاڤیلی کە ئەو وەك قارەمانی ئازادی دەیناسی، توانی کتێبێك بنوسێ کە هەڵگری ترسناکترین پەند و ڕێنماییەکانە بۆ ستەمکاران. سپینۆزا بەو دەرئەنجامە گەیشت کە میری مەکیاڤیلی تەنها بە پێی ئەم گریمانەیە دەتوانین تێبگەین کە کتێبەکە مانایەکی شاراوەی هەیە. سپینۆزا لە کتێبەکەی خۆیدا بە ناوی "وتارێك لە بارەی سیاسەتەوە" دەنوسێ:

"میرێك کە پاڵنەرێکی جگە لە شەهوەتی دەسەڵات نیە، دەبێ چ ئامێرێك بەکاربهێنێ بۆ ئەوەی دەسەڵاتی خۆی سەقامگیر بکات؟ مەکیاڤیلی زیرەك ئەم ئامێرانەی ڕونکردۆتەوە، بەڵام دیار نیە مەکیاڤیلی بە دوای چ مەبەستێکدا گەڕاوە.. ڕەنگە ویستبێتی دەریبخات خەڵکی ئازاد دەبی تا چەند وریا بن بەرامبەر بە بەخشینی ڕەهای چارەنوسی خۆیان بە دەستی یەك کەس.. چونکە ئەم کەسە دەبێ بەردەوام لە ترسی دەسیسەدا بژی، لەبەرئەوە ناچارە کە زۆرتر بە دوای قازانجی





خۆیدا بگەڕێ و لەبری ئەوەی بە دوای خێر و چاکەی خەڵکدا بگەڕێ، دژی ئەوان پیلان دابرێژێ. من لە بارەی مەکیاڤیلی دووربینەوە زیاتر لەسەر ئەو بڕوایەم، چونکە ئاشکرابوە کە ئەو خوازیاری ئازادی بوە و بۆ جێگیربوونی ئازادیش بە سودترین ڕێنمایی پێشکەش کردوە"(١٦).

سپینۆزا ئەم ڕایەی بە گومانەوە پێشکەشکردوە چونکە زۆر لە گریمانەکەی خۆی دڵنیا نەبوو. لە ڕاستیشدا لە خاڵێکدا هەڵە بوو. ئەو بە مانایەك لەژێر کاریگەری هەمان وەهمدا بوو کە هەوڵی دەدا لە ناوی ببات. چونکە لە دیدی سپینۆزادا مەکیاڤیلی نەك هەر نوسەرێکی زیرەك و وردبین، بەڵکو نوسەرێکی فێڵزانیش بوە. سپینۆزا مەکیاڤیلی بە مامۆستای ساختەکاری (تەزویر) دەناسێ. بەڵام ئەم هەڵسەنگاندنە تەبا نیە لەگەڵ واقعی مێژوویدا. ئەگەر مەکیاڤیلیزم بە مانای هەڵخەڵەتاندن و ڕیاییە، مەکیاڤیلی خۆی مەکیاڤیلیست نەبوو. چونکە ئەو هەرگیز هەڵخەڵەتێنەر و ڕیاکار نەبوو. کاتێك نامە بەناوبانگەکانی مەکیاڤیلی دەخوێنینەوە، سەرمان دەسوڕمێ. چونکە تیایدا کەسێك دەدۆزێتەوە کە تەواو جیاوازە لە وێنە باو و پێشداوەریەکانی ئێمە. مەکیاڤیلی کەسێکە کە بە ڕاشکاوی و بیری فراوان و تا ڕادەیەك بەبێ ڕیا و بێ پەروا قسە دەکات. ئەوەی لە بارەی مەکیاڤیلیەوە ڕاستە، لە بارەی مەکیاڤیلی نوسەریشەوە ڕاستە. ئەم مامۆستا گەورەیەی فێڵ و تەڵەکەبازی سیاسی، ڕەنگە یەکێك لە بێ ڕیاترین نوسەرانی سیاسی بێت. زۆرجار ئەو قسە بەناوبانگەی تالیران کە دەڵێ "وشەکانیان لەبەرئەوە بە مرۆڤ داوە تاکو بیری بشارێتەوە" وەك پێناسێکی واقعی هونەری دیبلۆماسی ستایش کردوە. ئەگەر ئەم قسەیە ڕاست بێت ئەوا مەکیاڤیلی هەموو شتێك بوە جگە لە دیبلۆمات. مەکیاڤیلی هەرگیز سیمای واقعی خۆی نەدەشاردەوە و بیروڕا و هەڵسەنگاندنەکانی پەنهان نەدەکرد. ئەو تێڕوانینی خۆی بە توندی و بێ پەردە دەردەبڕی. لە ڕوانگەی مەکیاڤیلیەوە جەسورانەترین قسە، باشترین قسەیە. تێڕوانینەکان و شێوازی نووسینی هیچ ئالۆزیەکی تیا نیە، ڕوون، و وردن.

بیریارانی سەدەی هەژدە، فەیلەسوفانی سەردەمی ڕۆشنگەری، بە دیدێکی دۆستانەترەوە تەماشای خەسڵەتەکانی مەکیاڤیلیان دەکرد. لە ڕوپەکەوە مەکیاڤیلی بە هاوپەیمانی سروشتی ئەوان دەردەکەوت. کاتێك ڤۆڵتێر دەستی بە هێرشەکەی





خۆی بۆ سەر کەنیسەی کاسۆلیك کرد و دروشمە بەناوبانگەکەی خۆی دژی کەنیسە بەرز کردەوە: "ئەم نەنگیە لەناوبەرین" دەیتوانی لەسەر ئەو باوەڕە بێت کە درێژەپێدەری کاری مەکیاڤیلیە. مەگەر مەکیاڤیلی نەیگوتوە کەنیسە بەرپرسیاری هەموو بەبەدختیەکانی ئیتالیایە؟ مەکیاڤیلی لە "وتارەکاندا" گوتبووی:

"ئێمەی ئیتالیایەکان یەکەم قەرزاریمان بۆ کەنیسەی ڕۆم و قەشەکان ئەوەیە کە ئەوان ئێمەیان فاسد و بێ دین کردوە. و جگە لەمەش قەرزاریەکی گەورەتری ئەوانیشمان لە ئەستۆیە کە ئەویش ئەوەیە ئەوان هۆی ڕاستەوخۆی وێرانی وڵاتی ئێمەن، بەو مانایەی کەنیسە وڵاتی ئێمەی بە پارچە پارچەیی هێشتۆتەوە"(١٧).

قسەی لەم چەشنە وەك ئاوێك بوو کە ڕژایە ناو ئاشی فەیلەسوفانی فەرەنسی سەدەی هەژدەوە. بەڵام ئەم فەیلەسوفانە هەرگیز نەیاندەتوانی جگە لەم خاڵانە، لە مەسەلەکانی تردا لەگەڵ تیورەکانی مەکیاڤیلیدا تەبا بن. ڤۆڵتێر لەو پێشەکیەدا کە بۆ کتێبی "وەڵامی مەکیاڤیلی" نوسینی فردریکی دوهەمی نووسی، باسی "مەکیاڤیلی ژەهراوی" دەکرد(١٨). فردریکی دوهەم کاتێك ئەم وتارەی نوسی کە وەلیعەهدی پرۆس بوو. ئەو لەم وتارەدا هەست و هەڵسەنگاندنی گشتی بیریارانی ڕۆشنگەری دەردەبڕی:

"شەهامەتی دەوێت کە بۆ بەرگریکردن لە مرۆڤایەتی دژی ئەم دێوە و ئەم دوژمنە دیارەی مرۆڤایەتی ڕاپەڕین و لە بەرامبەر سەفسەتە و بەڵگاندنە خراپەکارەکانیدا، خۆمان بە ئەقڵ و دادپەروەری چەکدار بکەین.. بۆ ئەوەی خوێنەری وتارەکەی منیش یەکسەر لوقاحێك وەربگرێ بۆ نەهێشتنی کاریگەری ئەو ژەهرەی کە لە میردا دەیدۆزێتەوە"(١٩).

ئەم بابەتانە لە ساڵی ١٧٣٩دا نوسرا، بەڵام لە نەوەی دواییدا ئاوازێکی تەواو جیاواز لە بارەی مەکیاڤیلیەوە بەکاردەهێنری. هەڵسەنگاندنی مەکیاڤیلی لە پڕێکدا دەگۆڕێت. هەردەر لە "چەند نامەیەك بۆ پێشخستنی مرۆڤایەتی"دا دەڵێت کە ناسینی میری مەکیاڤیلی وەك بەرهەمێکی هەجوئامێز یان زیانبەخش یان تێکەڵێك لەم دوانە، هەڵەیە. مەکیاڤیلی پیاوێکی کردار ڕاست و بینەرێکی وردبین و دۆستێکی دڵسۆزی وڵاتی خۆی بوە. لە هەر دێڕێکی کتێبەکەوە دەکرێ ئەوە بدۆزینەوە کە ئەو خیانەتەی لە دروشمی مرۆڤایەتی نەکردوە. ئەو هەڵەتێگەیشتنەی لە بارەی





کتێبەکەیەوە دروستبوو، لەبەرئەوە بوو کە هیچکەس لە جێگەی ڕاستەقینە و گونجاوی خۆیدا داینەنا. ئەم کتێبە نە بەرهەمێکی هەجوکەرە و نە دەقێکی ئەخلاقیە. میری مەکیاڤیلی شاکارێکی سیاسیە کە بۆ هاوچەرخانی مەکیاڤیلی نووسراوە. ئامانجی مەکیاڤیلی ئەوە نەبوە کە تیورەیەکی گشتی لە بواری سیاسەتدا پێشکەشبکات. ئەو تەنها نەریت، شێوەی بیرکردنەوە و کرداری سەردەمی خۆی وێنە کردوە. هیگڵ ئەم هەڵسەنگاندنەی هردەری قبوڵکرد و بە ئاوازێکی زۆر براوەترەوە لەم بارەیەوە قسەیکرد. هیگڵ یەکەم کەس بوو کە ستایشی مەکیاڤیلی کرد. بۆ تێگەیشتن لەم بابەتە پێویستە بە بیر خۆمان بهێنینەوە کە هیگڵ لە چ هەلومەرجێکی تایبەتدا دەستیکرد بە خوێندنەوەی تیۆرەی سیاسی مەکیاڤیلی. ئەم هەلومەرجە سەردەمی جەنگەکانی ناپلیۆن بوو، پاش ئەوەی کە فرانسیسی دوهەم وازی لە تەخت و تاجی ئیمپراتۆری ئەڵمانیا هێنابوو. لەناو هەلومەرجێکی وادا ڕوخانی سیاسی ئەڵمانیا بە ڕوداوێکی ئەنجامدراو دەزانرا. هێگڵ لە وتارێکی بڵاونەکراوەدا کە لە بارەی یاسای بنەڕەتی ئەڵمانیاوە لە ساڵی ١٨٠١دا نوسی بووی، باسەکەی خۆی بەم دەستەواژەیە دەست پێدەکات: "ئەڵمانیا چیدی وەك وڵاتێك بوونی نیە". هیگڵ لە هەلومەرجێکی ڕۆحی لەم چەشنەدا و لە هەلومەرجێکی سیاسی تەواو نائومێدکەردا، میری مەکیاڤیلی خوێندەوەو پێدەچێ کە کلیلی تێگەیشتنی ئەم بەرهەمە زۆر زەمکراو و مەتحکراوەی دۆزیوەتەوە. ئەو کە لە نێوان ژیانی گشتی ئەڵمانیا لە سەدەی نۆزدەدا و ژیانی نەتەوەیی ئیتالیا لە سەردەمی مەکیاڤیلیدا، لێکچوونێکی نزیك دەدۆزێتەوە، ئارەزوو و خەیاڵێکی بەرزەفڕی تازەی تیا زیندوو دەبێتەوە. هیگڵ دەیەوێت ببێتە مەکیاڤیلی دوهەم، واتە ببێتە مەکیاڤیلی سەردەمی خۆی. هیگڵ دەنوسێ:

ئەوکاتەی ئیتالیا لە بەدبەختیدا دەژیا و بە خێرایی بەرەو هەڵدێری ڕمان دەڕۆیشت و بووبوە مەیدانی جەنگی شازادە بێگانەکان، ئیتالیا هەم پێداویستیەکانی ئەم جەنگەی ئامادە کرد، هەم خۆی بووبوو بە نێچیریان و ئەڵمانیەکان و فەرە نسیەکان و سویسرایەکان تالانیان دەکرد و حکومەتە بێگانەکان چارەنووسیان دیاریدەکرد. لەناو گەرمەی ئەم هەستە قوڵەی بەدبەختی و نەفرەت و ئاژاوەو سەرلێشێواندا، سیاسەتمەدارێکی ئیتالیایی بە بیرکردنەوەیەکی هێمنانە بەو







دەرئەنجامە گەیشت کە ڕێگەی ڕزگاربوونی ئیتالیا، یەکگرتنێتی لە چوارچێوەی وڵاتێکدا. بەڵام زۆر ناعەقڵانی دەبێ ئەگەر بیرکردنەوەیەك کە بە هۆی بینینی هەلومەرجی ئیتالیاوە دروستبوە بە شێوەیەك تاوتوێ بکەین وەك ئەوەی کە کورتکراوەی بنەما ئەخلاقی و سیاسەیکان بێت، کە بە شێوەیەکی بێلایەنانە بە دەست هاتوە و دەگونجێ لە هەموو هەلومەرجێکدا بەکاربێت (و هەر لەبەرئەمەش لە هیچ هەلومەرجێکدا بەکارنایەت). خوێنەر دەبێ لە کاتی خوێندنەوەی میردا مێژووی ئیتالیای سەردەمی مەکیاڤیلی لەبەرچاو بێت، ئەوکاتە نەك هەر ئەم کتێبە ئاراستەی خۆی وەردەگرێ، بەڵکو وەك بەرهەم و تێڕوانینێکی ڕاستەقینە و درەوشاوەی بلیمەتێکی سیاسی ڕەسەن دەردەکەوێت کە خاوەن مەزنترین و باڵاترین زیهن بوە.

ئەمە هەنگاوێکی تازە بوو، هەم کارێکی ترسناك و سەرسوڕهێنەر، چونکە مەکیاڤیلیزم کە تا ئەوکاتە لە دەرەوەی جیهانی ئەخلاقدا بوو، هەنوکە لەناو سیستەمێکی ئایدیالیستیدا جێگەی دەگرت کە هەوڵیدەدا پارێزەری هەموو بەها ئەخلاقیەکان بێت. ئەوەی ڕویدا وەك ئەوە وابوو کە حەرامزادەیەك، ڕەوا بکەن(٢١).

هەمان ئاراستەش لە فەلسەفەی سیاسی فیختەدا دەبینرێ، لە ساڵی ١٨٠٧دا فیختە لە گۆڤاری "ڤستا"(٢٢) چاپی کونیگزبرگدا وتارێکی لە بارەی مەکیاڤیلیەوە نووسی(٢٣). وەك فیخنە خۆی ڕایگەیاندوە، تێبینیەکانی لە بارەی مەکیاڤلیەوە بۆ ئەو مەبەستە بوە کە "ناوبانگی پیاوێکی دروستکار لە ﴿بەدناوی﴾ ڕزگاربکات". ئەو فیختەیەی کە لێرەدا دەیبینین جیاوازیەکی زۆری لەگەڵ ئەو فیختەیدا هەیە کەلایەنگرێکی سەرسەختی ئەخلاقیە، بەڵام لە هەڵسەنگاندنیدا بۆ مەکیاڤیلی هیچ جۆرە سەختگیریەکی ئەخلاقی نابینین. ئەو واقعبینی مەکیاڤیلی ستایشدەکات و هەوڵدەدا لە هەموو تۆمەتێکی ئەخلاقی پاکیبکاتەوە. فیختە قبوڵیدەکات کە مەکیاڤیلی کافرێکی سەرسەخت بوە و بە ڕق و نەفرەتەوە باسی دینی مەسیحی کردوە، بەڵام ئەم مەسەلانە نە هەڵسەنگاندنی فیختە بۆ مەکیاڤیلی وەك بیریارێکی سیاسی دەگۆڕێت و نە ستایشی ئەو بۆ مەکیاڤیلی دەخاتە ژێر پرسیارەوە.

هەر ئەم تەفسیرە بۆ کتێبەکەی مەکیاڤیلی لە سەدەی ١٩دا ڕەواجی پەیداکرد. لێرە بەدواوە دەورەکان ئاڵوگۆڕیان بەسەردا هات. ناوی مەکیاڤیلی کە پێشتر وەك

جنێو وابوو، لە ناکاو بوو بە نازناوێکی جێی شانازی. دوو دەسەڵاتی بەهێزی فکری و کۆمەڵایەتی دەستیان لە گۆڕانی ئەم هەلومەرجەدا هەبوو. لە سەدەی نۆزدەدا زانستی مێژوو وردە وردە دەورێکی ڕێبەرایەتیکردنی بە دەستهێنا و پاش ماوەیەکی کەم جێگەی تەوژمە فکریەکانی دی گرتەوە یان بە گشتی هەموویانی خستە ژێر کاریگەری خۆیەوە. لەم ڕوانگە تازەیەوە ئەو هەڵسەنگاندنانەی پێشتر لە بارەی میری مەکیاڤیلیەوە کرابوو، چیدی قابیلی قبوڵکردن نەبوو. چونکە پێشینان بە تەواوی لە زەمینەی مێژوویی نوسینی کتێبەکە غافڵ بوبوون. لە لایەکی دیەوە لە سەرەتای سەدەی نۆزدەهەمەوە ناسیۆنالیزم بوو بوو بە دینەمۆ و بزوێنەری ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی. ئەم دوو بزوتنەوەیە ﴿واتە مێژووگەری و ناسیونالیزم﴾ کاریگەریەکی قوڵیان لەسەر ناسین و تێگەیشتنی تیۆرەی مەکیاڤیلی هەبوو. لە ئەدەبیاتی سەدەی حەڤدەدا مەکیاڤیلیان بە شەیتانی بەرجەستە وەسف دەکرد و پاشان لە لێکچواندنێکی سەیردا خودی شەیتان بە مەکیاڤیلیست ناوبانگی دەرکرد کە ئالودەی مەکیاڤیلیزم بوە(٢٤). بەڵام دوو سەد ساڵ دوای ئەمە، ئەم هەڵسەنگاندنە بە تەواوی هەڵگەڕایەوە. مەکیاڤیلی کە شەیتانی بەرجەستە بوو، هەنوکە پایە و پلەیەکی خودایی وەردەگرت. هەمیشە نیشتیمان پەروەرانی ئیتاڵیا بە تامەزرۆییەوە ئافەرینی دوا فەسڵی میریان دەکرد. کاتێك ڤیچۆریۆ ئەلفێری کتێبەکەی خۆی بە ناوی "میر و ئەدەبیات"ەوە بڵاوکردەوە، هیچ دودڵ نەبوو لە گوتنی "مەکیاڤیلی ئاسمانی". ئەو لە کتێبەکەی خۆیدا فەسڵێکی تایبەتی نووسی کە بە تەواوی لە قسە ئاگراویە بەناوبانگەکەی مەکیاڤیلی دەچوو کە لە بارەی ڕزگارکردنی ئیتاڵیاوە بوو لەژێر دەسەڵاتی بەربەریەکان(٢٥).

بەڵام من بڕواموایە کە مێژووگەری و ناسیۆنالیزم بەم بارەیەوە زۆرتر بونەتە هۆی سەرلێشێواندن و ئاڵۆزی توانای هەڵەسەنگاندنمان، لەبری ڕوناککردنەوەیان. لە سەردەمی هردەر و هیگڵەوە وایان پێگوتوین کە هەڵەیە "میر" وەك بەرهەمێکی سیستیماتیك بناسین و بە هەڵگری تیۆرەیەکی سیاسی بزانین. دەڵێن مەکیاڤیلی هەرگیز مەبەستی پێشکەشکردنی تیورەیەکی لەم چەشنە نەبوە و ئەم کتێبەی بۆ مەبەستێکی تایبەت و بۆ خوێنەرانێکی دیاریکراو نوسیوەو. ئەل. ئەرتۆر بۆرد لەو دەروازەی چاپەدا کە لە کتێبەکەی مەکیاڤیلیەوە ئامادەی کردوە، دەڵێت:





میر تەنها بۆ خوێندنەوەی ئیتاڵیەکان نووسراوە، ئەویش ئیتالیەکانی سەردەمێکی تایبەت ﴿واتە ئیتالیەکانی سەردەمی مەکیاڤیلی﴾ و لە ڕاستیدا دەکرێ لەمە زیاتر بڕۆین و بپرسین کە ئایا ئەم کتێبە بۆ هەموو ئیتاڵیایەکان نووسراوە(٢٦).

بەڵام ئایا بەڵگەیەك هەیە بیسەلمێنێ کە ئەم بڕوا باوە، ڕونکردنەوەیەکی دروستی تێڕوانینەکانی مەکیاڤیلی و مەبەستی سەرەکی ئەو بوە؟ ئایا مەکیاڤیلی هیچ جۆرە بەرزەفڕین و مەبەستێکی نەبووە جگە لەوەی تەنها قسەکەری ئیتاڵیا بێت؟ هەموو پەند وئامۆژگاریکانیشی تەنها بە کەڵکی ساتەوەختێکی تایبەتی مێژووی ئیتاڵیا دێت؟ ئایا مەکیاڤیلی خۆی بڕوای بەوە هەبوو کە هیچ یەك لە تێڕوانینەکانی لە ژیانی سیاسی نەوەکانی داهاتوودا و مەسەلەکانی ئەواندا، بەکار نایەت؟

بەڵام من نەمتوانیوە تەنانەت یەك بەڵگەی بڕاوە بۆ ئەم تێڕوانینە بدۆزمەوە. کاتێك بەم شێوەیە داوەری دەکەین، لەوە دەترسم کە نەوەکا توشی جۆرێك هەڵەی بینین بووبین. ئێمە لە بەردەم کردنی هەڵەیەکداین کە دەکرێ ناوی بنێین "هەڵەی مێژوونووس". ئێمە چەمکەکانی خۆمان بۆ مێژوو و شێوازی مێژوو، دەگێڕینەوە بۆ نوسەرێك کە ئەم چەمکانە بۆ ئەو نوسەرە، بە تەواوی نەناسراو بوە و ئەستەمە بتوانین بڵێین توانیوێتی لەو چەمکانە بگات. بۆ ئێمە بە تەواوی بوە بە شتێکی سروشتی کە هەموو شتێك لە زەمەن و شوێنی خۆیدا دابنێین و بە سەرنجدان لە پێشزەمینەکەی لێی تێبگەین. ئێمە بۆ تەفسیرکردنی کارەکانی مرۆڤ و دیاردە کلتوریەکان ئەم بنەمایە بە جۆرێك لە فەرمانی پێویست دەزانین. بە پێی ئەم بنەمایە لە بارەی تایبەتمەندی هەر دیاردەیەك و هەروەها ڕێژەییبوونی هەڵسەنگاندنی بابەتەکان، هەستێك لەناوماندا زیادی کردوە کە زیاد لە پێویست هەستیاری کردووین بەرامبەر بە شتەکان. هەر لەبەرئەوە چیدی بە زەحمەت دەوێرین حوکمێکی گشتی دەربکەین و بەدگومانین بەرامبەر بە هەموو فۆرمەلێکی ڕاشکاو و بڕاوە . گومان لەبوونی هەقیەتە نەمرەکان و بەها گەردونیەکان دەکەین. بەڵام مەکیاڤیلی و ڕینسانس ئەمجۆرە بیرکردنەوەیە بۆیان نامۆ بوو. هونەرمەندان و زانایان و فەیلەسوفانی سەردەمی ڕێنسانس. ڕێژگەری مێژوویان کە میتۆدێکی





تازەیە، نەدەناسی و هێشتا بڕوایان بە جوانی ڕەها و هەقیقەتی ڕەها هەبوو.

دەربارەی خودی مەکیاڤیلی هۆیەکی تایبەتی تر هەیە کە هەموو ئەم سنورداریێتی و کۆت و بەندانەی کە تەفسیرکارانی تازە بۆ تێزە سیاسیەکەی ئەو دایانناوە، پوچەڵ دەکاتەوە، مەکیاڤیلی مێژوونووسێکی گەورە بوو. بەڵام تێگەیشتنی ئەو بۆ مێژوو یەکجار جیاوازە لە تێگەیشتنی ئێمە بۆ مێژوو. ئەو زیاتر حەزی لە لایەنە وەستاوەکانی ژیانی سیاسی دەکرد، نەك لە لایەنە دینامیك و گۆڕاوەکەی. ئەو سەرنجی لە خەسڵەتە تایبەتیەکانی سەردەمێکی مێژوی نەدەدا، بەڵکو بە دوای لایەن و خەسڵەتە دوبارەبوەکانی مێژوەوە بوو. بە دوای دۆزینەوەی ئەو شتانەدا بوو کە لە هەموو سەردەمەکاندا یەکسانن ﴿و ناگۆڕێن﴾. شێوەی لێکۆڵینەوەی ئێمە لە بواری مێژوودا تاکگەریانەیە ﴿و اتە سەرنج لە لایەنە تایبەتمەندیەکانی ڕوداوێکی مێژووی دەدەین﴾ بەڵام شێوەی لێکۆڵینەوەی مێژووی مەکیاڤیلی هەمەکیگەریانە بوو. ئێمە بڕوامان وایە مێژوو هەرگیز دوبارە نابێتەوە، بەڵام ئەو بە پێچەوانەوە بڕوای وابوو کە مێژوو بەردەوام دوبارە دەبێتەوە، مەکیاڤیلی دەڵێت:

"هەر کەسێك ئێستا بە ڕابردوو بەراورد بکات بۆی دەردەکەوێت کە لە هەموو شارەکاندا و لە ناو هەموو نەتەوەکاندا هەر ئەم سۆز ئارەزوانە باڵادەست بوون کە هەمیشە و لە هەموو شوێنێکدا فەرمانڕەوا بوون. کەوابوو گەر یەکێك ڕوداوەکانی ڕابردوو بە وردی تاوتوێ بکات، بەئاسانی دەتوانێت پێشبینی ئایندەی هەر دەوڵەتێك بکات و هەر هەمان ئەو چارەسەریانە بەکاربهێنێت کە خەڵکی ڕابردوو لە بارودۆخی هاوشێوەدا کاریان هێناوە، بەڵام لەبەرئەوەی خوێنەران ئەم وانانە لەبەرچاو ناگرن یان تێیناگەن یان گەر ئەوان تێبگەن ڕەنگە بۆ فەرمانڕەویان ئاشکرا نەبێت، دەرئەنجامەکەی ئەوە دەبێت کە هەمان ئەو پەشێویانەی ﴿کە لە ڕابردوودا ڕوویان داوە﴾ دووبارە ڕوو بدەنەوە، ﴿و مێژوو دووبارە بێتەوە﴾(٢٧).کەوابوو یەکێك کە دەیەوێت پێشبینی ڕوداوەکانی ئایندە بکات، دەبێ هەمیشە سەیری ئەو شتانە بکات کە لە ڕابردوودا ڕویداوە، چونکە هەموو ڕوداوە مرۆییەکان چ ئەوانەی لە ئێستادا ڕوودەدەن و چ ئەوانەی کە دوایی ڕوودەدەن، هاوشێوەیەکی وردیان لە ڕابردوودا هەیە.

ئەمەش لەبەرئەوەیە کە هۆکاری ڕودانی ئەم ڕوداوانە مرۆڤەکانن کە هەمان سۆز







و خۆزگەیان هەیە کە هەمیشە هەیان بوە"(٢٨).

لەم دیدە وەستاوەوە بۆ مێژووی مرۆڤایەتی، ئەو دەرئەنجامە بەدەست دێت کە هەموو ڕوداوە مێژوویەکان دەتوانن بچنە جێی یەکدی. ڕوداوە مێژوویەکان لە ڕووی فیزیایەوە جێگەیەکی تایبەتیان لە فەزا و زەمەندا هەیە، بەڵام مانا و خەسڵەتەکانیان نەگۆڕە. کەوابوو ئەم بیریارە کە دەیتوانی پەند و تیۆرە سیاسیەکانی خۆی لە دوو توێی شەرحی کتێبەکەی تیتۆس لویدا پێشکەش بکات(٢٩)، بێگومان تێڕوانینێکی جیاواز لە تێڕوانینی مێژوونووسە تازەکانی بۆ مێژوو هەبوو کە بڕوایان وایە هەر سەردەمە و دەبێ بە پێوەرە تایبەتیەکانی ئەو سەردەمە بپێورێ. لە ڕوانگەی مەکیاڤیلیدا هەموو مرۆڤەکان و هەموو سەردەمەکان لە یەك ئاستدان. ئەو بچوکترین جیاوازی لە نێوان ئەو نمونانەی کە لە مێژووی یۆنان و ڕۆم و ئەوانەی کە لە مێژووی هاوچەرخی خۆیەوە دەیهێنێتەوە، ناکات.مەکیاڤیلی بە شێوەیەکی چونیەك باسی ئەسکەندەری گەورە، سیزار بورژیا و هانیبال و لۆدۆڤیکۆ ئەیل مۆرۆ(٣٠) دەکات و لە هەمان فەسڵدا کە باسی "میرنشینە تازەکان"ی ڕینسانس دەکات، باسی مۆسا و کورش، ڕۆمۆلۆس تزئیوسیش دەکات. تەنانەت هاوچەرخانی خودی مەکیاڤیلی، مێژوونووسە مەزنەکانی ڕێنسانس، تێبینی ئەم کەموکوڕیان لە شێوازی مێژوونووسی مەکیاڤیلیدا کردوەو ڕەخنەیان لێگرتوە، بە تایبەتی گیچاردینی(٣٤) لە بارەی ئەم کەموکوڕیەوە خاڵی سەرنج ڕاکێشەر و گونجاوی باسکردوە.

ئەگەر بیریارێکی لەم چەشنە بە نیازی دامەزراندنی تیۆرەیەکی تازە و دروستکەر، واتە زانستی واقعی سیاسەت بێت، بێگومان ناتوانێ ئەم زانستە کورت بکاتەوە بۆ هەندێك بابەتی تایبەت. گەرچی ڕەنگە ئەم قسەیە وا دەرکەوێت کە ناکۆکی ئامێزە (Paradoxical) بەڵام ڕەنگە بتوانرێ بگوترێ کە لە بارەی مەکیاڤیلیەوە هەستی مێژووناسی ئێمە تووشی نابینایی بوە و ناهێڵێ کە هەقیقەتی ڕووتی مێژوو ببینین. مەکیاڤیلی بەرهەمەکانی بە تەنها بۆ خەڵکی ئیتاڵیا نەنووسی، تەنانەت تەنها بۆ خەڵکی سەردەمی خۆشی نەنووسی، بەڵکو ئەو بۆ هەموو جیهانی نوسی و خەڵکی جیهانیش قسەکانی ئەویان گوێ لێبوو. ئەو گوێی لە هەڵسەنگاندنی ڕەخنەگرانی تازە بوایە لە بارەی بەرهەمەکانیەوە، هەرگیز نەیدەتوانی

تێڕوانینیەکانیان قبووڵبکات. ئەو شتەی ڕەخنەگرانی تازە لە مەکیاڤیلیدا ستایشیدەکەن، لای خۆی بە کەموکوڕی دەزانرا. مەکیاڤیلی بۆ بەرهەمەکەی خۆی هەمان بەهای دادەنا  کە توسیدۆس بۆ بەرهەمەکەی خۆی دایدەنا، واتە هەردووکیان وەك "سامانێکی نەمر" ﴿ی کلتوری مرۆیی﴾ تەماشای بەرهەمەکانی خۆیان دەکرد، نەك وەك شتێکی کاتی و تێپەڕ. لە ڕاستیدا مەکیاڤیلی زیاد لە سنور دڵنیابوو لەو هەڵسەنگاندنەی کە دەیکرد. ئەو عاشقی گشتگیریکردنە ﴿تەعمیم﴾ زۆر جەسورانەکان بوو. مەکیاڤیلی لەو چەند نمونە کەمەی کە لە مێژووی کۆن یان تازەوە دەیهێنێتەوە، یەکسەر دەرئەنجامی زۆر دوور وەردەگرێت. ئەگەر بمانەوێت دەرئەنجامەکانی تیۆرەکانی مەکیاڤیلی تێبگەین، دەبێ هەمیشە ئەم شێوازی بیرکردنەوە بەراوردکاری (قیاسی) و بەڵگاندنی بەراوردکارنە (بورهانی قیاسی)ی ئەومان لەیاد بێت. مەبەستی مەکیاڤیلی لە نوسینی میر ئەوە نەبوو ئەزموونە تایبەتیەکانی خۆی وەسفبکات و بۆ گروپێکی تایبەت قسە بکات. دیارە مەکیاڤیلی ئەزمونەکانی خۆی لە نوسینەکانیدا بەکارهێناوە. بۆ نمونە لە پێشەکی "وتارەکاندا" بە بۆندلۆمۆنتێ(٣٦) و کۆزیمۆ ڕۆچلایی(٣٧) هاوڕێیانی دەڵێت ئەو کتێبەی کە پێشکەشی ئەو دوانەی دەکات هەڵگری هەموو ئەو زانیاریە سیاسیانەیە کە لە ڕێگەی خوێندنەوەی زۆر و هەروەها ئەزموونی دوور و درێژی لە مەسەلەکانی جیهاندا، بە دەستی هێناوە، بەڵام ئەزموونی تا ڕادەیەك کەمی مەکیاڤیلی ئەو توانایەی پێ نەدەبەخشی کە بەرهەمێك لە پایە و پلە و گرنگی میردا بنوسێ. چونکە پێداویستی نوسینی کتێبێکی لەم چەشنە هەبوونی توانایەکی فکری تەواو جیاوازە، وەك توانستی بەراوردکاری و شیکردنەوەی لۆژیکی و هەبوونی زیهنێکی کۆکەرەوە.

پێشداوەریەکی دیش هەیە کە ڕێگەی لەوە گرتوە زۆرێك لە تەفسیرکەرە تازەکان، میر لەژێر تیشکی واقعی خۆیدا ببینن. زۆربەیان لێکۆڵینەوەکەی خۆیان بە تاوتوێکردنی ژیانی مەکیاڤیلی دەست پێدەکەن.. ئومێدیان وایە لە ژیاننامەی مەگیاڤیلیدا، کلیلی تێگەیشتن لە تیۆرە سیاسیەکەی بدۆزنەوە، ئەوان ئەوە بە بەدیهی دەزانن کە ناسینی تەواوی کەسی مەکیاڤیلی، بەسە بۆ بەدەستهێنانی بینینێکی تەواو بۆ بەرهەمەکانی. بە پێی ئەو لێکۆڵینەوانەی لەسەر ژیانی مەکیاڤیلی کراوە، مەکیاڤیلی سەردەمەکانی پێشوو، واتە مەکیاڤیلی "تاوانبار"ی شانۆنامەکانی سەردەمی ئەلیزابێت بە تەواوی ون بوە. هەنوکە مەکیاڤیلی بەو





شێوەیە دەبینین کە بە ڕاستی هەبوو، واتە پیاوێکی شەریف و ڕاستکردار، نیشتیمانپەروەر و خزمەتگوزارو هاوڕێی نیشتیمانەکەی، دۆستێکی بەوەفا، پیاوێکی فیداکار بۆ هاوسەر و منداڵەکانی(٣٨). بەڵام ئەگەر هەموو ئەم خەسڵەتە تایبەتیانەی مەکیاڤیلی لە کتێبەکەیدا بخوێنینەوە واتە لە میردا، ئەوا تووشی هەڵە دەبین و بە هۆی ئەمەشەوە هەم لە بینینی باشیە سەرەکیەکانی کتێبەکە و هەم لە بینینی لایەنە کەموکوڕەکانی غافڵ دەبین. زۆرجار نەك هەر زیادەڕەوی لە دیدی مێژوگەریانەدا، بەڵکو هەروەها زیادەوەڕی لە دیدی دەروناسیانەشدا، دەبێتە هۆی سەرلێشێواندن و ئاڵۆزی هەڵسەنگاندنەکانمان. نەوەکانی پێشو تێبینی خودی کتێبەکەیان دەکرد و ناوەڕۆکەکانیان دەخوێندەوە، بەڵام ئێمە لە دەروونشیکاری نوسەرەوە دەست پێدەکەین. زۆربەی تەفسیرکەرانی تازە لە بری ئەوەی  بیروڕاکانی مەکیاڤیلی ڕەخنە و شیبکەنەوە، بە دوای پاڵنەرەکانی مەکیاڤیلیدا دەگەڕێن بۆ نووسینی میر و هەوڵێکی سەیر دەدەن بۆ ئەوەی ئەم پاڵنەرانە ڕوونبکەنەوە. پرسیاری پاڵنەرەکانی نوسەری میر، بوە بە یەکێك لە گەرمترین وتوێژی ئەو بەرهەمانەی لەسەر مەکیاڤیلی نووسراون.

من نیازم نیە بچمە ناو وردەکاریەکانی ئەم باسەوە. پرسیاری پاڵنەرەکان، هەمیشە پرسیارێکی گرفتئامێز و مەترسیدارە. تەنها لە چەند حاڵەتێکی کەمدا دەکرێ بە یەقینی ڕەها بگەین. تەنانەت ئەگەر بکرێ بە شێوەیەکی ڕەزامەند و ڕوون، پاڵنەرەکانی نوسەرێك بۆ نووسینی بەرهەمێك دیاریبکەین، ئەم کارە یارمەتیەکی ئەوتۆمان بۆ تێگەیشتن لە بەرهەمەکە نادات. چونکە پاڵنەرەکانی نووسینی کتێبێك  یان ئەو مەبەستەی بۆی نووسراوە، خودی کتێبەکە نین. ئەوانە تەنها کۆمەڵێ هۆکاری ڕێکەوتن و یارمەتیمان نادەن بۆ تێگەیشتن لە مانای سیستیماتیکی بەرهەمەکە. زەمەنەکانی پێشوو تا ڕادەیەك کێشەیان لە ڕوی کەرەسە و زانیاری لە بارەی ژیانی نوسەران و دانەرانەوە هەبوە، بەڵام ڕەنگە ئێمە لە ڕووی زۆری ئەم زانیاریانەوە تووشی کێشەی زیهنی بووبین. ئێمە نامە تایبەتیەکانی مەکیاڤیلیمان خوێندۆتەوە، پێشینەی سیاسی ئەومان خاڵ بە خاڵ و موو بە وو خوێندۆتەوە، نەك هەر میر بەڵکو نوسینەکانی تری ئەویشمان خوێندۆتەوە، بەڵام کاتێك دەمانەوێت لە بارەی میرەوە هەم لە ڕووی مانای سیستیماتیکی و هەم لە ڕووی کاریگەری مێژووییەوە، داوەریەکی بڕاوە بکەین، خۆمان بە سەرلێشاوی دەدۆزینەوە.





زۆرێك لە مەكیاڤێلیناسان ئەوەندە لە وردەكاری ژیانیدا ونبوون كە توانای دەستگەیشتن بە هەمەكیان لە دەستداوە. ئەوان تاكە تاكەی درەختەكان دەبینن و توانای بینینی جەنگەڵیان نیە. ئەوان بۆ ڕزگاركردنی ناوبانگی مەكیاڤیلی، گرنگی كتێبەكەی دادەبەزێنن. یەكێك لە ژیاننامەنوسەكانی مەكیاڤیلی لەم دواییانەدا نوسیویێتی:

"لە كتێبی میردا چ شتێك هەیە كە ئەوەندە وتوێژ و سۆزی وروژاند؟ وەڵامی ئەم پرسیارە ئێستاش هەر ئەوەیە كە لە ڕاستیدا هەمیشە هەبوە: هیچ. لە میری مەكیاڤێلیدا هیچ شتێك بوونی نیە كە ئەم هەموو ڕق و سوكایەتیكردن و ترسە بوروژێنێ. هەروەها شتێكی تێدا نیە شایستەی ستایشی شەیدایانی بێت كە تەفسیری كار و ئامانجەكانی خۆیانیان تیا دەدۆزیەوە. میر و ئەو كارانەی بۆ میر پێشنیار دەكرێت تاكو ئەنجامیبدات و ئەو ئامانجەی كە فێری دەكرێت بۆ ئەوەی لەبەرچاوی بگرێت، هەموویان بەرهەمی سەردەمی مەكیاڤیلین و ئەو پەندەی كە مەكیاڤیلی دەیدات شتێكە كە ئەزموون فێری كردوە و لەو سەردەمەدا بە باشترین پەند دەزانرا و پەندێكی قابیلی تێگەیشتن و بەرێز بوو(٣٩).

ئەگەر ئەم حوكمە ڕاست بێت، ئەوا تا ڕادەیەكی زۆر سەرجەم ناوبانگی مەكیاڤیلی ئەنجامی هەڵە بوە. نەك مەكیاڤیلی خۆی، بەڵكو خوێنەرەكانی بوونە هۆی ناوبانگ دەركردنی و ئەوانیش تەنها لەسەر بناغەی تێنەگەیشتن لە مانای بەرهەمەكەی. بە بڕوای من ئاشكراكردنی ئەم مەسەلانە ڕاكردنێكی ناشیانەیە لە مەتەڵەكە (dilemma). ئەم مەتەڵە هەیە. لە نێوان تێزە سیاسیەكانی مەكیاڤیلی و خەسڵەتە كەسێتی و ئەخلاقیەكانیدا، ناكۆكیەكی ئاشكرا هەیە. ئێمە دەبێت بۆ ئەم كێشەیە بە دوای ڕونكردنەوەیەكی باشتردا بگەڕێین ، نەك ئەوەی نكوڵی لە ڕەسەنایەتی و گەردونی بوونی تیۆرەكانی مەكیاڤیلی بكەین. ئەگەر ئەم تەفسیرە ڕاست بوایە، دیارە دەمانتوانی مەكیاڤیلی بە پیاوێكی كۆمەڵایەتی وتەبێژی بەرژەوەندی سیاسی و نەتەوەیی تایبەت، بناسین. بەڵام ئێدی نەماندەتوانی ئەو بە دامەزرێنەری زانستی سیاسەتی تازە و بیریارێكی داهێنەری گەورە بزانین كە تێڕوانین و تیۆرەكانی ، جیهانی مۆدێرنیان هەڵگەڕانۆتەوە و بونیادی ڕێكخستنی كۆمەڵایەتیان هێناوەتە لەرزین.





## سەركەوتنی مەكیاڤیلیزم و دەرئەنجامەكانی

### مەكیاڤیلی و ڕینسانس

سەرەڕای جیاوازی بیروڕا لە بارەی میر و كەسایەتی مەكیاڤیلیەوە، لانیكەم لەسەر خاڵێك ڕێكەوتنی تەواو هەیە. هەموو نوسەران دەیسەلمێنن مەكیاڤیلی "كوڕی سەردەمی خۆیەتی" ئەو شایەتی جۆرێك ڕێنسانسە. بەڵام تا كاتێك تێگەیشتنێكی ڕوون و بێ ئالۆزیمان بۆ ڕینسانس نەبێت، ئەم قسەیە مانایەكی ئەوتۆی نابێت. لەمڕووەوە هەلومەرجەكە بە شێوەیەكی نائومێدانە، تێكەڵ و پێكەڵە. لەم دەیانەی دواییدا ئارەزووی لێكۆڵینەوە لە ڕینسانسن هێواش هێواش زیادیكردوە. هەنوكە زانیاری زۆر و سەرسوڕهێنەرمان لەبەردەستدایە، بەڵام سەرەڕای ئەو بەڵگە تازانەی كە مێژوونوسانی سیاسی و مێژوونووسانی ئەدەبیات، هونەر، فەلسەفە و دین كۆیان كردۆتەوە. هێشتا لە ڕووی پرسیاری سەرەكیەوە، واتە "مانای" ڕێنسانس، دەڵێی لە تاریكیدا دەژین. هیچ نوسەرێكی تازە ناتوانێ ئەو فۆرمەلە بەناوبانگانە دوبارە بكاتەوە كە یاكوب بۆركهارت هەوڵیدا بە هۆیانەوە شارستانیەتی ڕێنسانس، وەسفبكات. لە لایەكی دیەوە هەموو ئەو وەسفانەی كە ڕەخنەگرانی بۆركهارت پێشكەشیان كردوە، بە هەمان ئەندازەی فۆرمەلەكانی بۆركهارت جێگەی ڕەخنەن. زۆرێك لە لێكۆڵەرەوانەكان كە لە بوارەكانی خۆیاندا خاوەن پلەوپایەی بەرزن، بە نیاز بوون هەرچۆنێك بووە ئەم كێشەیە چارەسەر بكەن. ئەوان ئاگادارمان دەكەنەوە لە بەكارهێنانی زاراوەی ڕینسانسدا وریابین. لین تورندایك لە باسێك كە بەم تازانە لە بارەی ڕێنسانسەوە كردویێتی، دەنوسێ:"چ قازانجێكمان لە خستنە ژێر پرسیاری ڕێنسانس دەست دەكەوێت؟ هیچ كەس تا ئێستا بوونی ڕێنسانسی نەسەلماندوەو هیچ كەسیش بە ڕاستی هەوڵی نەداوە ئەم كارە بكات"(١).

بەڵام ئێمە نابێت تەنها باسی ناو و زاراوەكان بكەین. ئەوەی ڕێنسانس ناونیشانێكی وەهمی نیەو ئەم زاراوەیە بەسەر واقعێكی مێژووییدا دەگونجێ، شتێكی نكوڵی لێنەكراوە. ئەگەر پێویستمان بە سەلماندنی بوونی ئەو واقعە هەبوایە، ئەوا

هەر ئەوەندە بەس بوو کە ناوی دوو شایەتی کلاسیکی ڕێنسانس بهێنین و پشت بەم دوو بەڵگەیە ببەستین: کتێبەکەی گالیلۆ بە ناوی "وتوێژ لە بارەی دوو زانستی تازەوە" و کتێبەکەی مەکیاڤیلی بە ناوی "میر"ەوە. ڕەنگە سەرەتا دروستکردنی پەیوەندی لە نێوان ئەم دوو بەرهەمەدا نارەوا دەرکەوێت، چونکە ئەم دوو کتێبە بابەتی تەواو جیاواز لە یەك تاوتوێ دەکەن و سەر بە سەدەی جیاوازن. پیاوانێکیش نووسیویانە کە لە ڕووی بیرکردنەوە و ئارەزووی زانستی و توانست و کەسایەتیەوە، تەواو لە یەك جیاواز بوون. بەڵام ئەم دوو کتێبە سەرەڕای جیاوازیان، لایەنی هاوبەشیشیان هەیە. لەهەر دووکیاندا ئاراستەیەکی فکری تایبەت دەبینین کە ئەم دوو بەرهەمە وەك دوو ڕووداوی گەورە و زیندوو لە مێژووی شارستانیەتی تازەدا جیادەکاتەوە. لێکۆڵینەوە تازەکان دەریدەخەن کە هەم مەکیاڤیلی و هەم گالیلۆ، پێشڕەوانێکیان هەبووە. ئەم دوو بەرهەمە لە مێشکی نوسەرەکانیەوە بە ئامادەیی و زەڕە بە زەڕە و بە یەکجار نەهاتۆتە دەرێ، بەڵکو پێویستیان بە ڕێخۆشکردنی ورد و دوورو درێژ هەبووە. بەڵام هەموو ئەمانە لە نوێخوازی ئەم دوو کتێبە کەمناکەنەوە. ئەوەی گالیلۆ لە "وتوێژ لە بارەی دوو زانستی تازە" و مەکیاڤیلی لە کتێبی "میر"دا هێناویانەتە ئارا، بە ڕاستی "زانستی تازەن". گالیلۆ دەڵێت: "ئامانجی من دامەزراندنی زانستێکی زۆر تازەیە، کە بابەتێکی زۆر کۆن تاوتوێدەکات. ڕەنگە لە ﴿لێکۆڵینەوەی﴾ سروشتدا هیچ بابەتێك کۆنتر نەبێت لە مەسەلەی جوڵە، کە فەیلەسوفەکان چەندان کتێبیان لە بارەیەوە نووسیوە، کە نە ژمارەیان کەمە و نە قەبارەیان بچوکە. بەڵام سەرەڕای ئەمانە من لە ڕێگەی تاقیکردنەوەوە هەندێك خەسڵەتی جوڵەم دۆزیوەتەوە کە زانینیان پێویستە. تائێستاش کەسانی تر نە ئەم خەسڵەتانەیان دۆزیوەتەوە و نە سەلماندویانە"(٢). مەکیاڤیلیش بەگشتی لە جێگەیەکدا بوو، کە بتوانێ بەمشێوەیە باسی کتێبەکەی خۆی بکات. ڕێك بەو شێوەیەی کە دینامکیەتی گالیلۆ بوو بە \بناغەی زانستی مۆدێرنی سروشت ﴿فیزیای تازە﴾، میری مەکیاڤیلیش ڕێگەیەکی تازەی بۆ زانستی سیاسەت کردەوە.

دەبێ بۆ تێگەیشتن لە تازەیی ئەم دوو کتێبە، سەرەتا شیکردنەوەیەك بۆ بیرکردنەوەی سەدەکانی ناوەڕاست پێشکەشبکەین. ئەوەی ناتوانین بە مانایەکی تەواو ڕۆژمێریانە، ڕێنسانس لە سەدەکانی ناوەڕاست جیابکەینەوە، شتێکی ئاشکرایە.







سەدەی پانزە بە زنجیرەیەکی بێئەژماری دیار و نادیار، بەستراوە بە بیرکردنەوەی سکولاستیك و بە کلتوری سەدەکانی ناوەڕاستەوە. هیچ کاتێك لە بەردەوامی و پەیوەندی مێژووی مۆدێرنی ئەوروپادا، دابڕانێك ڕووی نەداوە. دۆزینەوەی خاڵێك لەم ڕەوتە مێژوویەدا کە تیایدا سەدەکانی ناوەڕاست "کۆتایی بێت" و سەردەمی تازە "دەستپێدەکات"، کارێکی مەحاڵە"(٣). بەڵام باسکردنی ئەم ڕاستیە پێویستی دۆزینەوەی هێڵێکی جیاکەرەوەی فکری لە نێوان سەدەکانی ناوەڕاست و سەردەمی تازەدا نەفی ناکات.

بیریارانی سەدەکانی ناوەڕاست لە ڕووی بیرکردنەوەوە سەر بە قوتابخانەی جیاواز بوون. لە نێوان ئەم بیریارانەدا: دیالەکتیکیەکان و عارفەکان، واقعیەکان و ناوگەرەکان ﴿اسمیین﴾ وتوێژی بێپایان ڕووی دەدا. بەڵام سەرەڕای بوونی ئەم قوتابخانانە، نێوەندێکی فکری هاوبەش هەبوو کە بە درێژایی چەندان سەدە بە نەگۆڕی مایەوە. ڕەنگە بۆ تێگەیشتن لە یەکێتی بیرکردنەوەی سەدەکانی ناوەڕاست ڕێگایەکی باشتر و ئاسانتر لە خوێندنەوەی ئەم دوو کتێبە نەبێت: "لە بارەی زنجیرە پلەی ئاسمانیەوە" و "لە بارەی زنجیرە پلەی کەنیسەییەوە". نوسەری ئەم دوو کتێبە نەناسراوە. لە سەدەکانی ناوەڕاستدا ئەم دوو بەرهەمەیان دەگەڕانەوە بۆ دیونیسیۆس ئاریپاگیتا(٤) کە موریدی قەدیس پۆلس بوو، هەر ئەویش کردبووی بە مەسیحی و غەسلی تەعمیدی کردبوو. بەڵام ئەمە لە ئەفسانەیەك زیاتر نیە. نوسەری ئەم کتێبانە ڕەنگە نۆ ئەفلاتۆنیەکی پەیڕەوی پرۆکلس بوبێ(٥). ئەم دوو بەرهەمە لەسەر بناغەی قبوڵکردنی تیۆرەی لافاو "emaanation"ی فلۆتین کە دامەزرێنەری قوتابخانەی نۆ ئەفلاتۆنیە، نووسراوون. بە پێی تیۆرەی لافاو دەبێ بۆ تێگەیشتن لەهەر شتێك بگەڕێینەوە بۆ بنەما سەرەتاییەکەی و دەبێ دەریبخەین بە چ ڕێگەیەك ئەم شتە لەم بنەمایەوە دەرچوە. بنەمای سەرەتایی کە هۆ و سەرچاوەی هەموو شتەکانە، یەکتایە و شتێکی ڕەهایە. ئەم یەکتاییە ڕەهایە، لەناو فرەیی شتەکاندا گەشە دەکات. ئەم گەشەکردنە پرۆسەیەکی پەرەسەندن بە مانای تازە نیە، بەڵکو پتر ڕەوتێکی ڕوو لە دوای هەیە. زنجیرێکی ئاڵتونی کۆی جیهانی پێکەوە گرێدراوە و بە سەقامگیری دەیهێڵێتەوە.

هومیرۆسیش لە پەرەگرافێکی بەناوبانگی ئەلیادەدا، باسی ئەم زنجیرە دەکات.

هەموو شتێك جا چ مادی بێت یان مەعنەوی، مەلایکەتە نزیکەکان، فریشتەکان، ئەسرافیل، کروبیەکان و هەموو خزمەتکارەکانی "legions" بارەگای ئاسمانی، مرۆڤ، سروشتی گیاندار، مادەی بێگیان، هەموو ئەمانە بەم زنجیرە ئاڵتونیەوە لە بەردەم خواوەندا بەند کراون. دوو زنجیرە پلەی جیاواز هەیە، یەکێکیان زنجیرە پلەی بوون و ئەوی دیان زنجیرە پلەی بەها. بەڵام ئەم دوانە ناکۆك نین لەگەڵ یەکدا. ئەم دوانە تەریب بە یەك و بە تەواوی لەگەڵ یەکدیدا هەماهەنگن. پلەی بەها، بەستراوە بە پلەی بوونەوە. ئەوەی کە لە خوارەوەی پەیژەی سەرەتاییەوە، واتە لە سەرچاوەی هەموو شتەکانەوە دوورتر بێت، هێندەش پلەی کەماڵی کەمتر دەبێت.

بە درێژایی سەدەکانی ناوەڕاست کتێبەکانی دیونیسیوسی درۆزنانەیان "لە بارەی زنجیرە پلەی ئاسمانی و لە بارەی زنجیرە پلەی کەنیساییەوە" بە شێوەیەکی فراوان و بە تامەزرۆییەوە دەخوێندەوە. ئەم دوو بەرهەمە لە سەرچاوە بنەڕەتیەکانی فەلسەفەی سکۆلاستیك بوون. ئەو سیستەمەی لەم دوو کتێبەدا دروستکرابوو، نەك هەر کاریکردە سەر بیرکردنەوەی خەڵکی، بەڵکو پەیوەندی لەگەڵ قوڵترین سۆزەکانی خەڵکیدا دەبەست. ئەم سیستەمە بە ڕێگەی جیاواز خۆی لە کۆی سیستەمە ئەخلاقی، دینی، زانستی و کۆمەڵایەتیەکاندا، دەردەخست. لە گەردونناسی ئەرستۆییدا خودا وەك "جوڵێنەری بێ جوڵە"ی گەردوون وەسفکراوە. ئەو سەرچاوەی غائی جوڵەیە. بەڵام خۆی لە سکوندا بەسەر دەبات. ئەو هێزی جوڵەی خۆی بۆ یەکەمجار دەگوێزێتەوە بۆ ئەو شتانەی کە لەو نزیکترن و هەر لەوێوە ئەم هێزە ڕەوتی ڕوو لە خواری خۆی دەسپێدەکات و بە پلەی جیاواز بە جیهانی ئێمە، بە زەمین و جیهانی خوار مانگ دەگات. بەڵام لە جیهانی ژێر مانگدا چیدی کەماڵی ئاسمانی نادۆزینەو جیهانی بەرین، جیهانی مادە ئاسمانیەکان، لە مادەیەکی نەمر کە هەرگیز لەناوناچێ، واتە لە ئەسیر یان ڕەگەزی پێنجەم دروستبووە، جوڵەی ئەم مادە ئاسمانیانە نەمرە. جیهانی ژێر مانگ جێگەی فەسادە، هەموو شتێك لەناودەچێ و خراپ دەبێت. هەر جوڵەیەك، پاشماوەیەك ڕادەوەستێت. جیاوازیەکی ئاشکرا لە نێوان جیهانی بەرین و جیهانی ژێرەوەدا هەیە. ئەم دوو جیهانە لە یەك مادە دروست نەبوون و پەیڕەوی لە یەك یاسای جوڵە ناکەن. هەر ئەم بنەمایەش بۆ بونیادی جیهانی سیاسی و کۆمەڵایەتیش ڕاستە. زنجیرە پلەیەکی کەنیسایی لە ژیانی







دینیدا دەبینین، لە پاپاوە کە لە لوتکەی کەنیسەدایە دەستپێدەکات و بەکاردینالەکان، سەرۆك قەشەکان و قەشەکان و ڕۆحانیە پلە نزمترەکان دەگات. لە دەوڵەتدا بەرزترین دەسەڵات لە بوونی ئیمپراتۆردا کۆبۆتەوە کە ئەویش ئەم دەسەڵاتە بۆ ژێر دەستەکانی خۆی واتە شازادەکان، دۆکەکان و خزمەتگوزارانی دی دەگوێزیتەوە. ئەم سیستەمە فیئودالیە هاوتا و سێبەری سیستەمی زنجیرە پلەیی هەمەکیە. ئەم سیستەمە فیئودالیە دەربڕین و ڕەمزی ئەم سیستەمە گەردونیە هەمەکیەیە کە خواوەند بەرپای کردوە و هەر لێرەوە سیستەمێکی نەمر و نەگۆڕە. سیستەمی فیئۆدالی لە سەرتاسەری سەدەکانی ناوەڕاستدا حوکمڕان بوو، وە هێزی خۆی لە هەموو بوارەکانی ژیانی مرۆڤدا پێشاندەدا. بەڵام لە یەکەم سەدەکانی ڕێنسانسدا، واتە لە سەدەکانی پانزەهەم و شانزەهەمدا، شێوەی ئەم سیستەمە گۆڕا. ئەم گۆڕانە لە ناکاو و بە یەکجار ڕوی نەدا. ئێمە دارمانی تەواو و سڕینەوە یان ڕەدکردنەوەی ئاشکرای بنەما سەرەکیەکانی بیرکردنەوەی سەدەی ناوەڕاستی، نابینین. بەڵام لەناو ئەم سیستەمە زنجیرە پلەییەدا کە ئەوەندە پتەو و سەقامگیر دەهاتە پێش چاو، درز لە دوای درزی دەرکەوت. ئەم سیستەمە لەناو نەچوو، بەڵام هێواش هێواش دیارنەما و بایەخی بێ چەند و چونی خۆی لە دەستدا. گەردوونناسی کۆپرنیکۆس جێگەی گەردوونناسی ئەرستۆیی گرتەوە. لە سیستەمی کۆپرنیکۆسدا چیدی جیاوازی لە نێوان جیهانی "بەرین" و جیهانی "ژێرەوە"دا نیە. جوڵەی هەموو مادەکان جا چ جوڵەی زەمین بێت یان جوڵەی مادە ئاسمانیەکان، پەیڕەوی لە ڕێساگەلێکی یەکسان دەکەن. جۆردانۆ برۆنۆ(٦) یەکەم بیریار بوو کە تەفسیرێکی میتافیزیکی بۆ سیستەمی کۆپرنیکۆس پێشکەشکرد. بە پێی باوەڕی جۆردانۆ برۆنۆ جیهان هەمەکیەکی بێ کۆتاییە کە سەرتاسەری ڕۆحی ئیلاهی پڕی کردۆتەوە و گیانداری دروستکردوە. لە گەردوندا هیچ خاڵێکی جیاکەرەوە بوونی نیە نە "سەرەوەیی" هەیەو نە "ژێرەوەیی". لە بواری سیاسیشدا سیستەمی فیئۆدالی هەڵوەشایەوە و بناغەکانی سست بوون. لە ئیتالیادا چوارچێوەی سیاسی تەواو جیاواز دەرکەوت. حکومەتە ستەمکارەکان لە سەردەمی ڕێنسانسدا یان لەسەر دەستی پیاوانی تەنیا کە فەرمانڕەوایانی مەزنی سەردەم بوون، جێگیر بوون یان لەسەر دەستی بنەماڵە گەورەکان بونیاد نران، وەك: بنەماڵەی ویسکۆنتی(٧) یان سفۆر تزاس(٨) لە میلان،

بنەماڵەی میدچی لە فلۆرانس و بنەماڵەی گۆنتزاگاس(٩) لە مانتۆئا(١٠).

## دەوڵەتی دنیایی مۆدێرن

ئەو وێنەیەی وەسفمان کرد، پێشزەمینەیەکی سیاسی و فکری هەمەکی دروستدەکات کە میری مەکیاڤیلی لەناویدا دروستبوو. ئەگەر لەم ڕوانگەیەشەوە تەماشای میری مەکیاڤیلی بکەین، ئەوا لە دەستنیشانکردنی ماناکەی و جێگەی ڕاستەقینەی لە گۆڕانی کلتوری ئەوروپادا، توشی هیچ کێشەیەك نابین. کاتێك مەکیاڤیلی نەخشەی کتێبەکەی دادەڕشت، نیوەندی قورسایی جیهانی سیاسی ئالوگۆڕی بەسەردا هاتبوو. هێزی سیاسی تازە لە شانۆی سیاسیدا دەرکەوتبوون کە دەبوو حسابیان بۆ بکرێت –هێزگەلێك کە بە تەواوی لە سیستەمی سەدەکانی ناوەڕاستدا نەناسراو بوون. کاتی خوێندنەوەی میری مەکیاڤیلی، لەوە سەرمان دەسوڕمێ کە تا چ ئەندازە هەموو بیرکردنەوەی مەکیاڤیلی لەسەر ئەم دیاردە تازەیە ڕاوەستاوە. هەرکاتێك باسی شێوە ئاساییەکانی حکومەت دەکات، وەك شارە کۆماریەکان یان سەڵتەنەتە میراتیەکان، ئەوا قسەی زۆر کورت و موختەرەسە. وەك ئەوەی هەموو ئەم شێوە کۆن و سەردەمێك جێی شانازیانەی حکومەت، بە سەختی بتوانن سەرنجی مەکیاڤیلی ڕابکێشن، وەك ئەوەی ئەم حکومەتانە لە ڕووی ئارەزووی زانستی مەکیاڤیلیەوە، شایەنی سەرنج لێدان نەبن. بەڵام کاتێك دەستدەکات بە وەسفی پیاوانی تازە و کاتێك "میری تازە Principality" شیدەکاتەوە، بە ئاوازێکی تەواو جیاواز قسەدەکات. ئەو نەك ئارەزومەند، بەڵکو شیفتە و شەیدا بوە. ئەم شەیدابوونە سەیر و سەمەرەیە لەهەر وشەیەکدا مەکیاڤیلی لە بارەی سزار بۆرژیاوە نوسیوێتی ، هەست پێدەکەین. شێوەی نووسینی مەکیاڤیلی لە وەسفی شێوازێکدا کە سزار بۆرژیا بەکاری دەهێنێ بۆ ئەوەی لە دەستی دوژمنەکانی ڕزگاری بێت، هەم لە ڕووی شێوازی نووسین و هەم لە ڕووی دەوڵەمەندی فکریەوە، باشترین نمونەی نوسینەکانی مەکیاڤلیە(١١). تەنانەت پاش ماوەیەکی زۆر لە کەوتنی سزار بۆرژیا، مەکیاڤیلی هێشتا هەر شەیدای دەوڵەتی تازە بوو. "دوکا ڤالنتینۆ" هەمیشە لە زیهنی مەکیاڤیلیدا وەك نمونەی کلاسیکی دەوڵەتی تازە مایەوە. ئەو بە ڕاشکاوی دان بەوەدا دەنێت کە ئەگەر بڕیار بێت خودی ئەو دەوڵەتێکی تازە بونیاد بنێت. هەمیشە





پەیڕەوی لە نمونەی سزار بۆرژیا دەکات(١٣).

ناکرێ ئەم قسانە تەنها وەك هاوسۆزی مەکیاڤیلی لەگەڵ سزار بۆرژیادا لێکدەینەوە. مەکیاڤیلی هۆیەکی نەبوو کە ئەوی خۆشبوێت، بەڵکو بە پێچەوانەوە هۆیەکی زۆری هەبوو بۆ ئەوەی لێی بترسێ. ئەو هەمیشە ڕەخنەی لە دەسەڵاتی دنیایی پاپ هەبوو، چونکە بۆ ژیانی سیاسی ئیتاڵیا بە گەورەترین مەترسی دەزانی. هیچ کەسیش هێندەی سزار بۆرژیا هەوڵی پەرەسەندنی دەسەڵاتی دنیایی کەنیسەی نەدابوو. سەرەڕای ئەمە مەکیاڤیلی زۆر باش ئاگایی لەوە بوو کە ئەگەر سیاسەتی سزار بۆرژیا سەرکەوتایە، وێرانی کۆماری فلۆرانسی بەدوادا دەهات. کەوابوو چۆن بوو کە سەرەڕای ئەم هەموو شتانە هێشتا مەکیاڤیلی ئەم دوژمنەی زادگاکەی خۆی نەك ستایش دەکرد، بەڵکو بە جۆرێك حورمەتەوە باسیدەکرد، حورمەتێك کە ڕەنگە هیچ کاتێك مێژوونوسێکی دی بۆ سزار بۆرژیا، هەستی پێ نەکردوە؟ بەڵام دەکرێ ئەوکاتە لەم کێشەیە تێبگەین کە ئەوەمان بیرکەوێتەوە ستایشی مەکیاڤیلی بۆ سزار بۆرژیا بۆ خودی سزار بۆرژیا نەبوە، بەڵکو بۆ ئەو دەوڵەتە تازەیە بووە کە دروستیکردوە. مەکیاڤیلی یەکەم بیریار بوو بە تەواوی لەوە تێگەیشت کە ئەم بونیادە سیاسیە تازەیە بە ڕاستی هەڵگری چ مانایەکە. ئەو سەرچاوەی ئەم بونیادە تازەیەی بینی بوو، هەروەها دەرئەنجامەکانیشی پێشبینی دەکرد. مەکیاڤیلی لە بیرکردنەوەی خۆیدا سەرجەم ڕەوتی ئایندەی ژیانی سیاسی ئەوروپایی لە پێشەوە دەبینی. واقیعبوونی ئەم بونیادە بوو کە ئەوی ناچار کرد تا شێوەی ئەم میرنشینە تازانە بە وردیەکی زۆر و بە شێوەیەکی هەمەلایەنە تاوتوێ بکات. مەکیاڤیلی تەواو هوشیار بوو بەوەی هەرکاتێك بەراوردێك لە نێوان تیۆرەکانی خۆی و ئەوانی پێشودا بکرێت، تیۆرەکەی ئەو بە نائاسایی دادەنرێ. هەر لەبەرئەمە داوای لێبوردنی لە نائاساییبوونی ڕەوتی بیرکردنەوەی دەکات. مەکیاڤیلی لە میردا دەنوسێ:

"هیچ کەس نابێت سەری لەوە بسوڕمێ کە لە لێکۆڵینەوەی میرنشینەکان، پاشایەتیەکان و ئەو دەوڵەتانەی خەسڵەتی تەواوو جیاوازیان هەیە، خەسڵەتە بەرجەستە و مەزنەکانیان بە نمونە بهێنمەوە.. لێرەوە دەڵێم کە لە میرنشینە تازەکاندا کە خودی میری تازە دروستیکردوە، پاراستنی فەرمانڕەواییەکەی کەم تا زۆر زەحمەتە و ڕوبەڕوبونەوەی لەگەڵ ئەم کێشەیە پەیوەستە بە توانا تایبەتیەکانی





خۆیەوە. لەبەرئەوەی ئەم کەسەی  لەجێگەی هاوڵاتیەکی سادەوە گەیشتووە بە پلەی میرێتی، ئەوا هەر ئەمە بەڵگەی دلاوەری و زیرەکی، یان لانیکەم بەختی باشی ئەوە و ڕەنگە هەر ئەم شتانەش یارمەتی بدەن بۆ ئەوەی بەسەر زۆرێك لەو گرفتانەی کە دێنە پێشی، زاڵ ببێ(١٤). مەکیاڤیلی بە سوکایەتیکردن و گاڵتەجاڕیەکی ئاشکراوە باسی ئەو دەوڵەتانە دەکات کە لەسەر نەریتی ڕووت یان بنەمای شەرع دامەزراون. مەکیاڤیلی ڕایدەگەیەنێ کە ئەو دەوڵەتانەی کەنیسە دروستی کردوون، بەختێکی زۆریان هەیە. چونکە یاسا کۆنەکانی شەرع و مەرجەعیەتێکی پیرۆز وەك سوپەرێك دەیانپارێزێت. لەم ڕووەوە حکومەتە دینسالاریەکان بە ئاسانی پارێزگاری لە خۆیان دەکەن. مەکیاڤیلی دەنوسێ:

"بەڵام لەبەرئەوەی ئەم حکومەتە دینسالارانە لەژێر سەرپەرشتی و ڕێنمایی ڕاستەوخۆی خوداوەندی مەزندان کە هەم بەرپای کردوون و هەم پارێزگاریانە، و لەبەرئەوەی کردارەکانی خودا لە سنوری تێگەیشتنی ئێمە زۆر بالاترە، کەوابوو بێ پەروایی و بێ شەرمی دەبێ گەر مرۆڤی فانی وابزانێ دەتوانێ ئەم مەسەلانە ڕوون بکاتەوە. لێرەوە وا باشترە کە لە چوونە ناو ئەم باسەوە بمبورن(١٥).

بۆ وروژاندنی ئارەزووی مەکیاڤیلی هیچ شتێك لەم شێوە ئارام و ئاشتیخوازانەی حکومەت پێویست نیە، ئەو پێویستی بە چوارچێوەیەکی سیاسی هەبوو کە بە زۆر دروستکرابێت و بە زۆریش بپارێزرێ.

بەڵام لایەنی سیاسی تاکە لایەنێکی تیۆرەکەی مەکیاڤیلی نیە. بۆ ئەوەی سەرجەم ئامانج و مەبەستی تیۆرەی مەکیاڤیلی تێبگەین، دەبێ لە ڕوانگەیەکی فراوانترەوە تێی بڕوانین. دەبێ بۆ دیدگا سیاسیەکەی، دیدگا فەلسەفیەکەشی زیاد بکەین. ئەم لایەنە لە تیۆرەکەی مەکیاڤیلی بە ناهەق، لەبەرچاو نەگیراوە. سیاسەتمەداران و کۆمەڵناسان و مێژوونووسان لەسەر شیکردنەوە و تەفسیر و ڕەخنەی میری مەکیاڤیلی لەگەڵ یەکدا پێشبڕکێیان

دەکرد. بەڵام لە کتێبە دەرسیەکانی مێژووی فەلسەفەی تازەدا هیچ فەسڵێك نیە کە تایبەت بێت بە تیۆرەی مەکیاڤیلی. ئەم مەسەلەیە لە ڕوویەکەوە قابیلی تێگەیشتنە. مەکیاڤیلی بە مانای کلاسیك و سەدەکانی ناوەڕاستی فەلسەفە، فەیلەسوف نەبوو. ئەو سیستەمێکی تیۆری نەبوو. تەنانەت سیستەمێکی سیاسیشی





پێشکەشنەکرد. لەگەڵ ئەمەشدا کتێبەکەی مەکیاڤیلی بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ کاریگەریەکی زۆری کردە سەر گۆڕانی سەرجەم بیرکردنەوەی فەلسەفی مۆدێرن. چونکە مەکیاڤیلی یەکەم کەس بوو کە سەرسەختانە و بێ چەندوچون لە کۆی نەریتی سکۆلاستیك بڕا و بناغەی ئەم نەریتەی تێکشکاند کە زنجیرە پلەیی بوو.

فەیلەسوفانی سەدەکانی ناوەڕاست بەردەوام ئەو قسەیەی پۆلیسی قەدیسیان دوبارە دەکردەوە کە هەموو دەسەڵاتێك لە خوداوەندەوەیە(١٦). سەرچاوەی خودایی دەوڵەت بە شێوەیەکی گشتی قبوڵ و سەلمێنراو بوو، تا سەرەتای سەردەمی مۆدێرنیش هێشتا ئەم تێزە بە هێزی خۆیەوە مابۆوە. بۆ نمونە ئەم تێزە لەوپەڕی کامڵبوونیدا لە تیۆرەکەی سوئارزدا(١٧) دەبینێتەوە(١٨). تەنانەت سەرسەخترین خەباتگێرانی سەربەخۆی و دەسەڵاتدارێتی دەسەڵاتی دنیایی، جورئەتی نکوڵی کردنیان لە تیزی دەسەڵاتدارێتی خودایی (theocrathc) نەبوو. بەڵام مەکیاڤیلی تەنانەت هێرشناکاتە سەر ئەم تێزە، بەڵکو تەنها فەرامۆشیدەکات و لەبەرچاوی ناگرێ. مەکیاڤیلی لەسەر بناغەی ئەزموونی سیاسی خۆی قسەدەکات. ئەزموونەکەشی فێری کردبوو کە دەسەڵاتی سیاسی ڕاستەقینە و واقعی هەموو شتێکە، بەڵام خودایی نیە. ئەو پیاوانێکی بینی بوو کە بونیادنەری "میرە تازەکان" بوون. ئەویش بە تامەزرۆییەوە شێوازەکانی ئەم میرانەی ﴾بۆ بە دەستهێنانی دەسەڵات و پاراستنی﴿ تاوتوێ کردبوو. ئەو بیرۆکەیەی کە دەسەڵاتی ئەم میرە تازانە لە لایەن خواوەندەوە بەم فەرمانڕەوایانە بەخشراوە، نەك هەر پوچ و بێمانا بوو، بەڵکو کفرکردن بوو. مەکیاڤیلی دەبوو وەك واقعبینێکی سیاسی بۆ یەکجار و بۆ هەمیشە بناغەی سیستەمی سەدەکانی ناوەڕاست بە تەواوی تورهەڵدات. بە بڕوای مەکیاڤیلی ئەو تێڕوانینەی کە پێیوایە پاشاکان لە لایەن خوداوەندەوە بە فەرمانڕەوایی گەیشتون، بەتەواوی پڕوپوچ بوو. مەکیاڤیلی لە فەسڵی پانزەهەمی میردا دەڵێت:

"ئەوەی ماوەتەوە ئەوەیە دەربیخەین میر چۆن دەبێت لەگەڵ ژێردەستان و دۆستانی خۆیدا ڕەفتار بکات. بەڵام لەبەرئەوەی لەم بوارەدا زۆر شت نوسراوە، ڕەنگە قسەکانی من لەم بارەیەوە بە لوتبەرزی لێکدەنەوە، بە تایبەتی کە تێڕوانینی من لە تێڕوانینی کەسانی دی زۆر جیاوازە. بەڵام لەبەرئەوەی تەنها بۆ ڕێنمایکردنی ئەو





کەسانە دەنووسم کە خوازیارین و لەبەرئەوەی کە لە نزیکەوە تەواو ئاشنای مەسەلە سیاسیەکان بووم، وام بە باشزانی مەسەلە سیاسیەکان بەوجۆرە پیشان بدەم کە بە ڕاستی هەن، نەك ئەوەی بە مۆدێلی خەیاڵی ئەو کۆمار و میرانەی کە هەرگیز بوونیان نەبوە و بوونیان نابێ، هێزی خەیاڵ (وەك چۆن هەندێك نوسەر کردوویانە) سەرسام بکەم(١٩).

مەکیاڤیلی پەیڕەوی لە شێوازە ئاسایی و باوەکانی دیالەکتیکی سکۆلاستیکی ناکات. ئەو هەرگیز لە بارەی تێزە سیاسی یان پەندە سیاسیەکانەوە، وتوێژ یان ئیستیدلال ناکات. بە بڕوای ئەو مەسەلەکانی واقعی ژیانی سیاسی، تاکە بەڵگاندنێکی بایەخدارە. هەر ئەوەندە بەسە ئاماژە بۆ "سروشتی شتەکان" بکەین، تا سیستەمی زنجیرە پلەیی کەنیسە و سیستەمی حکومەتی ڕۆحانیەکان، دابڕمێ.

لێرەشدا پەیوەندیەکی نزیك لە نێوان گەردونناسی تازە و سیاسەتی تازەی سەردەمی ڕێنسانسدا، دەبینین. لە هەردوکیاندا ﴿واتە لە گەردووناسی تازە و زانستی سیاسەتی تازەدا﴾ جیاوازی نێوان جیهانی ژێرەوە و جیهانی بەرین لەناوچوە. دیاردەکان هەم لە ئاستی سیستەمی فیزیایی و هەم لە ئاستی سیستەمی سیاسیدا هاوئاستن. مەکیاڤیلی بە هەمان زیهنیەتەوە لە بزوتنەوە سیاسیەکانی کۆڵیەوە، کە سەدەیەك دوای ئەوە گالیلۆ جوڵەی تەنەکانی لە کاتی کەوتنە خوارەوەدا خستە ژێر لێکۆڵینەوەوە. بەمشێوەیە مەکیاڤیلی بوو بە دامەزرێنەری جۆرێکی تازەی زانستی ستاتیکی (Statice) سیاسی و زانستی دینامیکی (dynamics) سیاسی.

لە لایەکی دیەوە ئەوە ڕاست نیە گەر بڵێین تاکە ئامانجی مەکیاڤیلی ئەوە بوە تا ئەو شوێنەی دەتوانێ، واقعە سیاسیەکان بە شێوەیەکی ورد و ڕاشکاو وەسفبکات. ئەگەر ئەمە تەنها مەبەستی ئەو بوایە، ئەوا دەبوو بە مێژوونووس، نەك بە تیۆریزەنی سیاسی. تیۆرە پێویستی بە زۆر شتی تر هەیە، تیۆرەیەك پێویستی بە بنەمایەکی دروستکەر هەیە کە شتە واقعیەکان کۆبکاتەوە و پێکەوە بیانگونجێنێ و یەکیان بخات. دەوڵەتی دنیایی چەندان وەخت پێش مەکیاڤیلی هەبووە. یەکێك لە سەرەتاترین نمونەکانی دنیاییبوون (Secularization)ی تەواوی ژیانی سیاسی، ئەو دەوڵەتەیە کە فردریکی دوهەم لە باشوری ئیتاڵیادا دروستی کردبوو. ئەم دەوڵەتە ٣٠٠ ساڵ بەرلەوەی مەکیاڤیلی کتێبەکەی بنووسێ، درووست بووبوو. ئەم







حکومەتە بە مانای مۆدێرن حکومەتێکی ڕەهای سەڵتەنەتی بوو کە خۆی بە تەواوی لە دەسەڵاتی کەنیسە ڕزگار کردبوو. کارگێڕانی ئەم دەوڵەتە نەك ڕۆحانیەکان، بەڵکو خەڵکی ناڕۆحانی هەبوو.مەسیحیەکان، یەهودیەکان و موسڵمانان بەشی لەبەڕێوەبردنی کاروبارەکانیدا هەبوو. هیچ کەسێك تەنها بە هۆی مەزهەبەکەیەوە، نەدەخرایە لاوە. لە دەربارى فردریکی دوهەمدا مەسەلەی چەوساندنەوەی نێوان مەزهەبەکان و ڕەگەزەکان، شتێکی نەناسراو بوو، ئەوەی گرنگی هەبوو بەرژەوەندیەکانی دەوڵەتی دنیایی یان دەوڵەتی زەمینی بوو.

ئەمە واقعێکی تەواو تازە بوو، واقعێك کە وێنەی لە شارستانێتی سەدەکانی ناوەڕاستدا نەبوو. بەڵام ئەم واقعە هێشتا دەربڕینی و ئاراستەی تیۆری خۆی نەدۆزیبۆوە. فردریکی دوهەمیان هەمیشە بە مورتەد دادەنا. کەنیسە دوجار ئەوی تەکفیر کرد. دانتێ بە دیاریکراوی ئافەرینی دەکرد و ئەوی بە نمونەی پاشایەکی مەزن دادەنا، بەڵام سەرەڕای ئەم هەستە، دانتێ لە کۆمێدی خواوەند: دۆزەخدا، ئەوی لە ڕیزی مورتەدەکان دانا و مەحکومی کردبوو بە ئاگری دۆزەخ. کتێبی یاسای فردریکی دوهەمیان بە "شوناسی بیرۆکراسی مۆدێرن" ناونا. ئەگەرچی فردریکی دوهەم لە کارە سیاسیەکانی خۆیدا تازەگەر بوو، بەڵام لە بیروڕاکانیدا بە هیچ شێوەیەك تازەگەر نەبوو. کاتێك باسی خۆی و سەرچاوەی ئیمپراتۆرەکەی دەکرد، قسەکانی قسەی مورتەد یان گومانکارێك نیە، بەڵکو قسەی عارفێکە. ئەو هەمیشە دەیگوت پەیوەندیەکی ڕاستەوخۆی بە خوداوە هەیە و هەر ئەم پەیوەندیەشە کە لە کۆت و بەندی دەسەڵات و خواستەکانی کەنیسە، ئازادیکردوە. ژیاننامەنووسی فردریکی دوهەم بیروڕا و هەستەکانی، بەمشێوەیە وەسفدەکات:

"خواستی خودا ئەو و تەنها ئەوی هەڵبژاردوە بۆ ئەوەی ڕاستەوخۆ لەسەر تەختی سەڵتەنەت دانیشێت. فەیزی خودایی دواکەس لە زنجیرەی هۆمونشتاوفن(٢١)ی لە خەرمانێکی ئەفسوناویەوە ئاڵاندبوو کە لە هەر فەرمانڕەوایەکی تر زۆر زیاتر سەرسوڕهێنەر و بینینیشی بۆ خەڵکی خاکی مومکین نەبوو. دورئەندێشی.. خواوەند، ئیمپراتۆری نەدەگرتەوە، بەڵکو خودا وەك عەقڵێکی باڵا لەودا بەرجەستە دەبوو. لێرەوە ئەویان ناونا "ڕابەری ڕێی عەقڵ"(٢٢).

## دین و سیاسەت

لە ڕوانگەی مەکیاڤیلیدا ئەمجۆرە تێڕوانینە عیرفانیانە بە تەواوی بێ مانا بووبوون. لە تیۆرەکەیدا هەموو ئایدیا و ئایدیالی حکومەتی ڕۆحانیەکان "theocratic" لە ڕەگەوە دەرهێنرابوون. بەڵام مەکیاڤیلی هەرگیز لایەنگری جیابوونەوەی سیاسەت لە دین نەبوو. ئەو دژی کەنیسە بوو، بەڵام دوژمنی دین نەبوو. بەڵکو بە پێچەوانەوە بڕوای وابوو دین یەکێك لە ڕەگەزە پێویستەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی مرۆڤە. بەڵام لە سیستەمی مەکیاڤیلیدا دین ناتوانێ لافی خاوەنداریێتی هەقیقەتێکی ڕەها و سەربەخۆ و دۆگمایی بکات. بەها و بایەخی دین، بە تەواوی بەستراوە بە دەسەڵاتیەوە لە ژیانی سیاسیدا. بەڵام بەم پێوەرە مەسیحیەت لە نزمترین پلەدا دێت. چونکە مەسیحیەت بە توندی دژی دلاوەری و ڕەشادەت و هەموو فەزیلەتە واقعیە سیاسیەکانە. مەسیحیەت پیاوان سست و ژنانی دەکات. مەکیاڤیلی دەڵێت "دینی ئێمە لە بری ئەوەی قارەمانەکان بگەێنێتە پلەی قەدیسی، کەسانێکی گەیاندۆتە ئەم پلەیە کە لاواز و زەبوون بوون". لە کاتێکدا "کافران ﴿لە ڕۆمی پێش سەرکەوتنی مەسیحیەتدا﴾ کەسانێکیان دەگەیاندە پلەی خودایی کە شان و شەوکەتی دنیاییان هەبوو، پیاوانی وەك فەرماندەکان و فەرمانڕەوایانی گەورەی وڵات"(٢٣). بە پێی تێڕوانینی مەکیاڤیلی بەکارهێنانی کافرانەی دین، تاکە بەکارهێنانی ئەقڵانی دینە. لە ڕۆمدا دین دەیتوانی لەبری ئەوەی سەرچاوەی لاوازی دەوڵەت بێت. ببێ بە سەرچاوەی سەرەکی مەزنێتی. ڕۆمیەکان هەمیشە سودیان لەدین بۆ ریفۆرمی دەوڵەت، بەدواداچوونی جەنگ و دروستکردنی ئاژەوە وەردەگرت(٢٤) . ئەوەی ئایا ئەوان ئەمکارەیان بە نیەتی خێر دەکرد یان حسابیان بۆ کردبوو، هیچ گرنگیەکی ئەوتۆی نیە. هەر ئەمەش هۆی عەقڵانیەتی مەزنی سیاسی، نۆماپۆ مپیلیۆس(٢٥) لە کاری سیاسیدا بوو. ئەو دەیگوت یاساکانی خۆی لە سەرچاوەیەکی میتافیزیکیەوە وەرگرتووە و خەڵکی قەناعەت پێکردبوو کەئەم یاسایانە بە هۆی وتوێژ لەگەڵ فریشتە ئەگریادا(٢٦) بۆی هاتۆتە خوارێ(٢٧) کەوابوو تەنانەت لە سیستەمی مەکیاڤیلیشدا، دین پێویستە. بەڵام دین چیدی ئامانجێك نیە لەناو خۆیدا، بەڵکو تەنها بوە بە ئامێرێك بە دەست فەرمانڕەوایانەوە. دین بناغە و بونیادی ژیانی







کۆمەڵایەتی مرۆڤ نیە، بەڵام چەکێکی بەهێزە لە ململانێ سیاسیەکاندا. ئەم چەکە دەبێ توانای خۆی لە کرداردا پیشانبدات. دینی بەرکار واتە دینێك کە لە جێی ڕێکخستنی جیهان، لێی رابکات و ڕووی لێ وەربگێڕێ، بۆتە هۆی ویرانی زۆرێك لە پاشاو دەوڵەتەکان. دین تەنها کاتێك باشە کە سامانێکی باش دروستبکات و سامانی باشیش بە گشتی هاوکاتی بەختی باش و سەرکەوتنە لە کارەکاندا(٢٨). لێرەدا دوا هەنگاو نراوە. دین چیدی هەڵگری هیچ پەیوەندیەك بە ڕێکخستنی تراسندنتالی شتەکانەوە نیە، هەموو بەها ڕۆحی و مەعنەویەکانی خۆی لە دەستداوە. پرۆسەی دنیاییبوون گەیشتووە بە ئامانجی خۆی، چونکە هەنوکە دەوڵەتی دنیایی نەك وەك واقعێك ناسراو (de facto)، بەڵکو بە شێوەیەکی یاسایی (de jure)یش بە ڕەسمی ناسراوە. دەوڵەتی دنیایی ڕەوایەتی بڕاوەی تیۆری خۆی بەدەستهێناوە.

تێبینی:

ئەم نوسینە وەرگێڕانی فەسڵی ١٠ و ١١ ی ئەم کتێبەی خوارەوەیە:

ارنست کاسیرر؛ئەفسانەی دەوڵەت. ت: یداللە موقن. انتشارات هومس. چاپ اول ١٣٧٧

## پێداویستیەکانی تیۆرەی تازە لەبارەی دەوڵەتەوە

## جیابوونەوەی دەوڵەت لە دین، میتافیزیکیاو ئەخلاق و شێوەکانی تری ژیانی کلتوری و مەترسیەکانی ئەم جیابوونەوەیە

نوسینی: ئرنست کاسیرەر

کۆی بەڵگاندنەکانی مەکیاڤیلی ڕوون و گونجاو و لۆژیکەکەشی بێ خەوشە. ئەگەر قبوڵی پێش گریمانەکانی بکەین، ناتوانین دەرئەنجامەکانی قبوڵنەکەین. لەگەڵ مەکیاڤیلیدا لەبەردەم دەرگای جیهانی مۆدێرندا ڕاوەستاوین. مەبەستی سەرەکی هاتۆتە دی بەو مانایەی دەوڵەت تەواو سەربەخۆی خۆی بەدەستهێناوە. بەڵام ئەم ئامانجە بە بەهایەکی زۆر بەدەستهاتووە. دەوڵەت بە تەواوی سەربەخۆیە، بەڵام لە هەمان کاتدا جیایە. چەقۆی تیژی بیری مەکیاڤیلی هەموو ئەو پەتانەی پچڕیووە کە نەوەکانی پێشوو دەوڵەتیان بە کۆی بوونی مرۆییەوە دەبەستەوە. جیهانی سیاسەت پەیوەندی خۆی نەك هەر بە دین یان میتافیزیکیاوە، بەڵکو بە شێوەکانی تری ژیانی ئەخلاقی و کلتوری مرۆڤەوە لەدەستداوە. جیهانی سیاسەت بە تاك و تەنیایی لە چۆڵاییدا هەڵواسراوە.

ناتوانرێ نکوڵی لەوە بکرێ کە ئەم جیابوونەوە تەواوە، هەڵگری دەرئەنجامی زۆر ترسناك بووە، فەرامۆشکردن و لەبەرچاونەگرتنی ئەم دەرئەنجامانە، سودێکی نیە. ئێمە دەبێ ڕوبەڕوو ئەم دەرئەنجامانە ببینین. دیارە نامەوێت بڵێم مەکیاڤیلی بە تەواوی هوشیار بووە بە دەرئەنجامەکانی تیۆرە سیاسیەکەی خۆی. لە مێژووی بیردا ئەوە شتێکی نائاسایی نیە کە بیریارێك تیۆرەیەك پێشکەشبکات و ئامانج و ماناکەی لە چاوی خۆی ونبووبێت. لێرەوە لەڕاستیدا دەبێ جیاوازی لە نێوان مەکیاڤیلی و مەکیاڤیلیزمدا بکەین. لە مەکیاڤیلیزمدا گەلێك شت هەیە کە مەکیاڤیلی نەیدەتوانی پێشبینیبکات. ئەو لەسەر بناغەی ئەزموونی خۆی، داوەری و قسەیی لەبارەی







ئەزموونی بەڕێوەبەری ﴿ئەنجومەنی فەرمانڕەوای﴾ دەوڵەتی فلۆرانسەوە دەکرد. مەکیاڤیلی بە تامەزرۆییەکی زۆرەوە دەرکەوتن و ڕوخانی "میرە تازەکانی" تاوتوێدەکرد. بەڵام ئەو حکومەتە ستەمکار و بچوکانەی ئیتاڵیای سەدەی شانزەهەم لە کوێ و سەڵتەنەتە ڕەهاکانی سەدەی حەڤدەهەم و شێوەکانی دیکتاتۆری مۆدێرن لە کوێ؟ ﴿مەکیاڤیلی ستایشی ئەو شێوازانەی دەکرد کە سزار بۆرژیا بۆ سەرکوتکردنی نەیارەکانی بەکاری دەهێنا، بەڵام ئەم شێوازانە بە بەراورد.. بەو شێوازە خراپکاریە سیاسیە زۆر پێشکەوتوانەی سەردەمی ئێمە، تەنها وەك یاریەکی منداڵانە دێنە پێشچاو، مەکیاڤیلیزم سیمای ڕاستەقینەو مەترسیە واقعیەکانی خۆی کاتێك پیشاندا.. ﴿کە شێوازەکانی﴾ لە شانۆیەکی فراوانتر و لە هەلومەرجێکی تەواو تازەدا بەکارهێنرا﴾ ڕەنگە بتوانین لەم ڕووەوە بڵێین کە دەرئەنجامەکانی تیۆرەکەی مەکیاڤیلی تا سەردەمی ئێمە ڕوون نەبووبوونەوە. هەنوکە پێدەچێ بکرێ مەکیاڤیلیزم لەناو ئاوێنەیەکی گەورەدا بخوێنینەوە.

هۆکارێکی دیش هەبوو کە ڕێگر بوو لە پێگەیشتنی تەواوی مەکیاڤیلیزم. لە سەدەکانی دوای مەکیاڤیلدا، واتە لە سەدەکانی حەڤدەو هەژدەدا، تێزەکانی ئەو دەورێکی گرنگیان لە ژیانی سیاسیدا بینی. بەڵام لە پراکتیکدا هێشتا هێزی عەقڵانی و ئەخلاقی مەزن لە ئارادا بوون کە نفوزی مەکیاڤیلیزمیان ڕادەگرت. بیریارانی سیاسی ئەم قۆناغە جگە لە هۆبز، هەموویان لایەنگری "تیۆرەی مافی سروشتی" لە بارەی دەوڵەتەوە بوون. گرۆتیوس، پۆفندرۆف، ڕۆسۆو لۆك تەماشای دەوڵەتیان وەك ئامرازێك دەکرد، نەك ئامانجێك لە خۆیدا. چەمکی دەوڵەتی تۆتالیتار لە ڕوانگەی ئەم بیریارانەدا، چەمکێکی نەناسراو بوو. لە ڕوانگەی ئەم بیریارانەدا هەمیشە بوارێك بۆ ژیانی فەردی و ئازادی فەردی هەبوو کە دەوڵەت مافی نەبوو دەستدرێژی بکاتەسەر. دەوڵەت و فەرمانڕەوا بە تەواوی لە یاسا سەربەخۆ بوون. بەڵام ئەم قسەیە تەنها بەو مانایە بوو کە ئەوان ئازادن لە ناچارکردنی یاسا، نەك ئەوەی کە مولزەم بە ڕەچاوکردنی ئەرکە ئەخلاقیەکان نین. بەڵام لە ناکاو لە سەرەتای سەدەی نۆزدەوە هەموو ئەم شتانە کەوتنە بەر گومان. ڕۆمانتیزم هێرشێکی توندی کردە سەر تیۆرەی مافە سروشتیەکان. نوسەران و فەیلەسوفانی ڕۆمانسی وەك باوەڕدارانی سەرسەختی "ڕۆحباوەڕی و مەعنەویەت" قسەیاندەکرد. بەڵام ڕێك ئەم ڕۆحباوەڕی

و مەعنەوییەتە میتافیزیکیە بوو، کە ڕێگەی بۆ ماتریالیزمی توندو خەباتگێڕ لە ژیانی سیاسیدا خۆشکرد. لەم بارەیەوە هەقیقەتی سەرنجڕاکێشەر و نائاسایی ئەوەیە کە بیریارانی ئایدیالیزمی سەدەی نۆزدەهەم وەکو فیختە و هیگڵ، بوون بە لایەنگری مەکیاڤیلی و بەرگریکەر لە مەکیاڤیلیزم. پاش دارمانی تیۆرەی مافە سروشتیەکان﴾لە بارەی دەوڵەتەوە﴿ دوا ڕێگر لە بەردەم سەرکەوتنی مەکیاڤیلیزمدا لاچوو. چیدی هێزێکی عەقڵانی یان ئەخلاقی نەبوو کە لە بەردەم مەکیاڤیلیزمدا ڕابوەستێت و هێوری بکاتەوە. سەرکەوتنی کامڵ بوو وە پێدەچوو کە هیچ هێزێکی نەیار توانای ڕوبەڕوبونەوەی نەبێت.

## مەسەلەی ئەخلاق لای مەکیاڤیلی:

لەو مەسەلەیەدا کە میری مەکیاڤیلی هەڵگری نائەخلاقیترین ڕێنماییەکانەو مەکیاڤیلی پێشنیاری هەموو جۆرە فرت و فێڵێك، پەیمانشکێنی و دڵڕەقیەك بۆ فەرمانڕەوا دەکات، هیچ جێی گومان نیە. بەڵام زۆرێك لە نوسەران بە ئەنقەست چاوی خۆیان لەم ڕاستیە حاشاهەڵنەگرە دەپۆشن و لەبری ڕونکردنەوەی، هەوڵی زۆر دەدەن بۆ ئەوەی نکوڵی لێبکەن. ئەوان دەڵێن ئەگەرچی ئەو هەنگاوانەی مەکیاڤیلی پێشنیاریدەکات، خۆی لە خۆیدا شایەنی ڕەخنەگرتنن، بەڵام مەبەست لەم هەنگاوانە تەنها "خێرو بەرژەوەندی گشتی"یە. فەرمانڕەوا دەبێت ڕێز لە خێرو بەرژەوەندی گشتی بگرێت. بەڵام لە کوێی میردا دەتوانرێ ئەم کۆت و بەندە زیهنیە پەیدا بکرێت؟ بە پێچەوانەوە میر بە شێوەیەکی تەواو جیاواز و ڕاشکاو قسەدەکات. کتێبەکە بە بێلایەنیەکی تەواوەوە، ئەو ڕێگاو ئامێرانە ڕوونەدەکاتەوە کە لە ڕێگەیانەوە دەکرێ دەسەڵاتی سیاسی بەدەست بهێنرێت و بپارێزرێ. بەڵام لە بارەی بەکارهێنانی دروستی ئەم دەسەڵاتەوە، وشەیەك چیە ناڵێت. کتێبەکە بەکارهێنانی ئەم دەسەڵاتە نابەستێتەوە بە لەبەرچاوگرتنی بەرژەوەندیەکانی وڵاتەوە. تەنها چەندان سەدە دوای مەکیاڤیلی، نیشتیمانپەروەرانی ئیتاڵیایی دەستیانکرد بە خوێندنەوەی کۆی ئایدیالیزمی سیاسی و نەتەوەیی خۆیان لە کتێبی مەکیاڤیلیدا. ئەلفێری دەڵێ لە یەك بە یەکی وشەکانی مەکیاڤیلیدا هەر ئەم ڕۆحە دەبینین، واتە ڕۆحی دادپەروەری، عەشقێکی حەماسی بۆ ئازادی، بەرزی خەسڵەت و







هەقیقەتخوازی. ئەو کەسەی کە بە دروستی لە بەرهەمەکەی مەکیاڤیلی تێبگات، دەبێ شەیدای ئازادی و عاشقی ڕۆشنگەری هەموو فەزیلەتە سیاسیەکان بێت(٣).

بەڵام ئەم وەڵامە جۆرێك شانازیکردنە، نەك وەڵامێکی تیۆری. ناکرێ میری مەکیاڤیلی بە وتارێکی ئەخلاقی یان کتێبێك لە بارەی فەزیلەتە سیاسیەکانەوە بزانرێت. لێرەدا پێویست ناکات بچینە ناو ئەو باسە وتوێژ ئامێزەوە کە ئایا دوا فەسڵی میر کە بانگەشەی بەناوبانگی مەکیاڤیلیە بۆ ڕزگاری ئیتاڵیا لەژێردەستی بەربەریەکان، بەشێکی دانەبڕاوی کتێبەکەیە یان دواتر بۆی زیادکراوە. زۆرێك لە توێژەرەوانی مۆدێرن بە شێوەیەك باسی کتێبی میری مەکیاڤیلیان کردوە، وەك ئەوەی کۆی کتێبەکە هیچ نەبێت جگە لە پێشەکیەك بۆ دوا فەسڵی کتێبەکە. وەك ئەوەی ئەم فەسڵە نەك لوتکەی بیرکردنەوەی سیاسی مەکیاڤیلیە، بەڵکو کورتکراوەشێتی. بەڵام بە بڕوای من ئەوان هەڵەن و تا ئەو شوێنەی کە لەم بارەیەوە دەزانم سەلماندنی ئەم بابەتە (onus probandi) لە ئەستۆی ئەو کەسانەیە کە بڕوایان پێیەتی، چونکە لە نێوان بابەتی فەسڵەکانی دی وەك هەمەکیەك و دوا فەسڵی کتێبەکەدا، جیاوازیەکی ئاشکرا هەم لە ڕووی بیرکردنەوەو هەم لە ڕووی شێوازی نوسینەوە هەیە. مەکیاڤیلی لە فەسڵەکانی دیدا بە زیهنێکی ئەوتۆ کراوەوە قسە دەکات، هەموو کەسێك دەتوانێ گوێی لێبگرێت و لە پێشنیارەکانی هەرچیەکی دەوێت، بەکاری بهێنێت. ئەو پێشنیارانە تەنها لەبەردەستی ئیتاڵیایەکاندا نیە، بەڵکو لەبەردەست ترسناکترین دوژمنەکانی ئیتاڵیاشدایە. مەکیاڤیلی لە فەسڵی سێهەمی میردا بە دورو درێژی باسی ئەو هەڵانەی کردوە کە لوی دوانزەهەم لە هێرشەکەیدا بۆ ئیتاڵیا، ئەنجامیداوە. ئەگەر لوی دوانزەهەم ئەو هەڵانەی نەکردایە، ئەوا هیچ کێشەیەکی لە گەیشتن بە ئامانجەکەیدا نەدەبوو کە بریتی بوو لە دەستەمۆکردن و کۆنترۆڵکردنی ئیتاڵیا. مەکیاڤیلی هەرگیز لە شیکردنەوەکانی خۆیدا بۆ کارە سیاسیەکان، نەدەکەوتە ژێر کاریگەری هەستی تایبەتی خۆی واتە ڕق و خۆشەویستیەوە. بە قسەی سپینۆزا مەکیاڤیلی بە شێوەیەك باسی کارە سیاسیەکان دەکات، وەك ئەوەی هێڵ و ڕووبەرو بارستە بن. ئەو هێرشی نەدەکردە سەر بنەما ئەخلاقیەکان، بەڵام بڕوای وابوو لە کاتی سەرقاڵبوون بە مەسەلەکانی ژیانی سیاسیەوە، ناتوانرێ سود لە بنەما ئەخلاقیەکان وەربگیرێ. مەکیاڤیلی بە جۆرێك

تەماشای ململانێ سیاسیەکانی دەکرد، وەك ئەوەی گەمەی شەترەنج بن. ئەو بە تەواوی ڕێساکانی گەمەکەی تاوتوێ کردبوو. بەڵام نیازی ئەوەی نەبوو کە ئەم ڕێسایانە بگۆڕێت یان ڕەخنەیان بکات. ئەزموونی سیاسی فێریان کردبوو کە گەمەی سیاسی هەرگیز بێ فرتوفێڵ و خیانەت و خراپەکاری ئەنجامنادرێ. ئەو ئەم شتانەی نە بە خراپ دادەنا و نە پێشنیاری ئەنجامدانیان دەکات. پرسیاری سەرەکی زیهنی مەیکیاڤیلی بریتی بوو لە دۆزینەوەی باشترین جوڵە، جوڵەیەك کە یاریەکە بەرێتەوە. کاتێك  قارەمانی شەترەنج دەست بە چنینێکی جەسورانە دەکات، یان کاتێك هەوڵدەدات بەرامبەرەکەی بە چەندان فێڵ و تەڵە هەڵبخەڵەتێنێ، دڵخۆش دەبین و ستایشی لێزانینی دەکەین. مەکیاڤیلیش کاتێك لە بەرامبەر شانۆ گۆڕاوەکانی ئەو نمایشە سیاسیە گەورانەدا ڕادەوەستا کە لە پێشچاویدا ئەنجامدەدرا، ڕێك ئەم هەستەی هەبوو. ئەو نەك هەر زۆر حەزی لە تەماشاکردنی دەکرد، بەڵکو شەیدای خودی یاریەکە دەبوو وە نەیدەتوانی بیروڕای خۆی لە بارەیەوە نەڵێت. هەندێکجار سەری خۆی بۆ جوڵەیەکی خراپ بادەداو هەندێك جاریش هاواری ئافەرینی لێ بەرز دەبۆوەو چەپڵەی لێدەدا. هەرگیز بە بیریا نەدەهات بپرسێ گەمەکەران کێن، ڕەنگە ئەرستۆکرات یان کۆماریخواز، ئیتالیەکان یان بەربەرەکان، شازادە یاساییەکان یان داگیرکەران بووبن. ئاشکرایە بۆ کەسێك کە حەزی لە خودی گەمەکەیە نەك هیچ شتێکی دی، هیچ جیاوازیەکی نیە گەمەکەران چ کەسانێکن. مەکیاڤیلی ئارەزووی لەوەیە فەرامۆشی بکات گەمەکە نەك بە داشەکانی شەترەنج، بەڵکو بە مرۆڤە ڕاستەقینەکان ئەنجامدەدرێ، مرۆڤگەلێك کە لە گۆشت و خوێنن و خۆشبەختی و بەدبەختیان بەستراوە بەم گەمەیەوە.

دیارە ئەوە ڕاستە کە لە دوا فەسڵی میردا، ئاراستە ساردو سڕەکەی مەکیاڤیلی جێگەی خۆی دەدات بە ئاراستەیەکی تەواو تازە. ئەو لەناکاو میتۆدی لۆژیکی خۆی واز لێدێنێ، شێوازی گوتارەکەی چیدی شیکاری نیە، بەڵکو وروژێنەرە. بێ هۆ نیە ئەم دوا فەسڵەیان بەراورد کردوە بە ئامۆژگاریەکەی ئیزۆکراتیس بۆ فیلیپ(٤) ڕەنگە ئێمە ئاوازی سۆزداریانەی دوا فەسڵی کتێبەکەمان لا باشتر بێت، لە ئاوازی ساردو بێلایەنی بەشەکانی تر. بەڵام ڕاست نیە وا بزانین مەکیاڤیلی بیرەکانی خۆی لەم کتێبەدا شاردۆتەوەو ئەوەی کە گوتوێتی، درۆ بوە. کتێبەکەی مەکیاڤیلی بێ ڕیایی و







ڕاستگۆیانەیە، لەسەر بناغەی تێڕوانینی خودی مەکیاڤیلی بۆ ماناو ئەرکی تیۆرەی سیاسەت نوسراوە. بەبڕوای مەکیاڤیلی کاری تیۆرەی سیاسەت دەبێ شیکردنەوەو وەسفکردن بێت، نەك سەرزەنشتکردن و ستایشکردن. هیچ کەسێك تا ئێستا گومانی لە نیشتیمانپەروەری مەکیاڤیلی نەکردوە. بەڵام نابێت مەکیاڤیلی فەیلەسوف لەگەڵ مەکیاڤیلی نیشتیمانپەروەردا، تێکەڵ بکەین.

میر بەرهەمی بیریارێکی سیاسیەو ئەویش بیریارێکی ڕادیکاڵ. زۆرێك لە لێکۆڵەرەوان دەیانەوێت ڕادیکاڵیزمی تیۆرەکەی مەکیاڤیلی فەرامۆشبکەن یان لانیکەم لە توندیەکەی کەمبکەنەوە. بە هۆی ئەو هەوڵانەوە کە بۆ پاکردنەوەی ناوی مەکیاڤیلی لە هەموو تۆمەتەکان داویانە، مانای کتێبەکەشیان تەمومژاوی و تاریك کردوە. ئەوان مەکیاڤیلیەکی بێ زمان و بێ ئازاریان وێنە کردوە کە لە هەمانکاتدا مەکیاڤیلیەکی بێ مایەیە. مەکیاڤیلی ڕاستەقینە زۆر مەترسیدارترە، لە مەکیاڤیلی ئەمانە، مەترسیدارتر لە ڕووی بیرەکانیەوە، نەك لە ڕووی خەسڵەتە شەخسیەکانیەوە. میانڕەوکردنی تیۆرەکەی،  بە مانای پوچەڵکردنەوەیەتی. وێنەی مەکیاڤیلی نەرم و میانڕەو، وێنەیەکی مێژوویی دروست نیە. ئەمە ئەفسانەیەکە بەپێی پێداویستی هەلومەرج دروستکراوەو هەر ئەوەندە لەگەڵ هەقیقەتی مێژووییدا ناکۆکە کە وێنەی مەکیاڤیلی "دێو سیفەت". مەکیاڤیلی کەسێك بوو  لە سازشکردن بێزار بوو. لە هەڵسەنگاندنەکانی خۆیدا لەبارەی کارە سیاسیەکانەوە، چەندانجار لە دودڵی و بێبڕیاری، ئاگادارمان دەکاتەوە. مەزنی و گەورەیی ڕۆم لەوەدا بوو کە لە ژیانی سیاسیدا، خۆی لە هەنگاوە نیوەیەکان دور ڕادەگرت(٥). تەنها دەوڵەتە لاوازەکان لە بڕیارەکانی خۆیان دودڵ دەبن و هەمیشەش دواکەوتن لە بڕیاردان شتێکی نەفرەت ئەنگێزە(٦) ڕاستە پیاوان بە شێوەیەکی گشتی بە دەگمەن دەزانن کە چۆن دەبێ بە تەواوی باش یان خراپ بن. بەڵام ڕێك لێرەدایە کە سیاسەتمەداری واقعی یان دەوڵەت پیاوی مەزن لە مرۆڤی مامناوەندی جیادەبێتەوە. سیاسەتمەداری واقعی ڕوو لە ئەنجامدانی ئەو تاوانانە وەرناگێڕێ کە مۆر و نیشانی مەزنێتیان پێوەیە. ڕەنگە سیاسەتمەدار زۆر کاری باش ئەنجامبدات، بەڵام کاتێك هەلومەرج پێویستی بە کارێکی جیاواز هەیە، دەبێ "خراپەکارێکی لێهاتوو" بێت(٧). ئا لێرەدایە کە گوێمان لە مەکیاڤیلی واقعی، نەك ڕێکەوتننامەیی دەبێت.

تەنانەت گەر ئەو تێڕوانینەش ڕاست بوایە کە هەموو پەندەکانی مەکیاڤیلی بە مەبەستی "بەرژەوەندی یان خێری گشتی" بووە، ئەو پرسیارە دێتە پێشێ کە چ کەسێك دەستنیشانی "خێری گشتی" دەکات؟ گومانی تیا نیە ئەو کەسە لە فەرمانڕەوا زیاتر، کەسی دی نیە. هەمیشەش ئەو ئەگەرە هەیە کە ئەو خێری گشتی و بەرژەوەندی تایبەتی بە یەك شت دابنێت. ئەو بەپێی ئەم بنەمایە کاردەکات: دەوڵەت منم. جگە لەمەش ئەگەر خێری گشتی هەموو ئەو کارانە ئاراستە بکات کە مەکیاڤیلی لە کتێبەکەی خۆیدا پێشنیاری دەکات، بەو مانایەی کە ئەگەر خێری گشتی بە بیانویەك بزانین بۆ تاوان و توندوتیژی و فرتوفێڵ، کەوابوو خێری گشتی بە ئەستەم لە خراپەی گشتی جیادەکرێتەوە.

بەڵام ئەوەی چۆن پیاوێکی شەریفی وەك مەکیاڤیلی بە زیهنێکی ڕوناکەوە، دەبێت بە لایەنگری "خراپەکاری لێهاتویانە"، ئەوا ئەمە یەکێکە لە مەتەڵە گەورەکان لە مێژووی شارستانێتی مرۆڤدا. ئەم مەتەڵە کاتێك ئاڵۆزتر دەبێت کە میر لەگەڵ نوسینەکانی تری مەکیاڤیلیدا بەراورد بکەین. لەم نوسینانەدا بابەتگەلی وا هەیە کە بە ئاشکرا ناکۆکە لەگەڵ ئەو تێڕوانینانەدا کە لە میردا شیکراونەتەوە. مەکیاڤیلی لە "تیزەکاندا" وەك کۆماریخوازێکی سەرسەخت قسەدەکات و لە ململانێی نێوان ئەرستۆکرات و خەڵکی ڕەش و ڕوتی ڕۆمدا، بە ئاشکرا هاودەردی خۆی بۆ خەڵکی ڕەش و ڕووت دەردەبڕێ و لە بەرامبەر ئەو تۆمەتەدا کە دەڵێت خەڵکی بێبارن و لە بیروڕاکانیاندا سەقامگیر نین، بەرگریان لێدەکات(٨) و ڕایدەگەیەنێت کە خەڵکی ڕەش و ڕووت بۆ پارێزگاریکردن لە ئازادی گشتی لە ئەرستۆکراتەکان مسۆگەرتر و دڵنیاترن(٩). ئەو بە نەغمەیەکی زۆر سوکایەتیکردنەوە باسی نەجیبزادەکان "gentiluomini" دەکات، واتە کەسانێك کە بە هۆی دەرامەتی موڵکەکانیانەوە لە بێکاری و بەتواناییدا دەژین.

مەکیاڤیلی دەڵێت ئەمجۆرە کەسانە لە هەر کۆمار یان وڵاتێکدا بن، زیانبەخشن. بەڵام لەمانە زیانبەخشتر ئەو کەسانەن کە لە موڵکەکانی خۆیاندا خاوەنی حەسار و بورج و قەڵان و نۆکەر و فەڕاشیان هەیە کە ملکەچ و گوێڕایەڵیانن. لە پاشایەتی ناپۆلی، ڕۆمانیاو لۆمباردیدا لەم دو چینە زۆر هەن. لێرەوە هەرگیز هیچ جۆرە حکومەتێکی ئازاد لەم ویلایەتانەدا بەرپا نەبووە. چونکە ئەم دوو چینە دوژمنی





سوێندخۆری هەموو جۆرە دەزگایەکی ئازادن(١٠). مەکیاڤیلی ڕایدەگەیەنێت گەر هەموو شتێك لەبەرچاو بگرین، ئەوا خەڵکی عەقڵانیتر و سەقامگیرترن لە میرێك(١١).

لە میردا شتێکی ئەوتۆ لەم بیروڕایانە، لە ئارادا نیە. هەڵخەڵەتێنەری سزار بۆرژیا ئەوەندە بەهێزە کە هەموو ئایدیا کۆماریخوازەکانی مەکیاڤیلی خستۆتە ژێر تیشکی خۆیەوە. شێوازەکانی سزار بۆرژیا بۆتە ناوەندی نادیاری بیرکردنەوەی سیاسی مەکیاڤیلی. بیری بە شێوەیەکی موگناتیسی بەرەو ئەم ناوەندە ڕادەکێشرێ. مەکیاڤیلی دەڵێت:

لە پیاچونەوە بە کار و ڕەفتارەکانی دۆکدا، شتێکی شایەنی سەرزەنشتکردن نابینم، بەڵکو بە پێچەوانەوە وەك پێشتر پێشنیارم کردوە، لێرەشدا دوبارە پێشنیار دەکەم کە کارەکانی دۆك ببێ بە نمونەیەك بۆ لاسایکردنەوەی هەموو ئەو کەسانەی کە بە هۆی شانس و بەختەوە بە دەسەڵات دەگەن یان بە هۆی سودوەرگرتن لە هێزی بازووی کەسانی دی. چونکە دۆك ڕۆحێکی مەزن پرۆژەو نەخشەی گەورەی لەسەردا بوو. ئەو نەیدەتوانی لەو هەلومەرجەدا بە شێوەیەکی دی ڕەفتار بکات، ئەگەر لە جێبەجێکردنی پرۆژەو نەخشەکانیشیدا سەرکەوتوو نەبوو، بە هۆی مەرگی لەناکاوی باوکیەوە بوو. لەو هەلومەرجە سەخت و نائومێدکەرەشداو لەو بارودۆخە قەیراناویدا، خودی ئەویش نەخۆش کەوتبوو"(١٢).

کاتێك مەکیاڤیلی سزار بۆرژیا سەرزەنشت دەکات، لەبەر بێڕەحمی و توندی و تاوانکاری و تەماعکاری سزار نیە، مەکیاڤیلی لە بواری سیاسیدا ئەم جۆرە کردارانە بە سەرزەنشت ئامێز نازانێت. ئەوەی لە سزار بۆرژیادا شایەنی ڕەخنە و سەرزەنشتکردنە، ئەو هەڵە گەورانەیە کە لە پیشەی سیاسی خۆیدا ئەنجامیدا. واتە ڕێگەیدا کە پاش مردنی ئەلکساندەری شەشەم، ژۆلیسی دوهەم کە دوژمنی سوێندخواردووی بوو، بە پلەی پاپایی هەڵبژێرێت.

چیرۆکێك دەگێڕنەوە کە پاش ئەوەی بە فەرمانی ناپلیۆن بۆناپارت، دۆك ئانژین لە سێدارە درا، تالێران هاواری کرد: "ئەمە لە تاوان خراپترە، چونکە ئەم کارە هەڵەیە". ئەگەر ئەم چیرۆکە ڕاست بێت، ئەوا دەبێ بگوترێ کە تالێران وەك موریدێکی واقعی میر قسەی کردوە. هەموو هەڵسەنگاندنەکانی مەکیاڤیلی سیاسین،





نەك ئەخلاقی. بە پێی هەڵسەنگاندنی مەکیاڤیلی ئەوەی لە کرداری سیاسەتمەدارێکدا جێگەی ڕەخنەو گازندەیەو شایەنی لێبوردن نیە، تاوانەکانی نیە، بەڵکو هەڵەکانێتی.

ئەوەی کۆماریخوازێك دەیتوانی دۆك ڤالانتینۆ بە قارەمان و نمونەی تیۆرەی سیاسی خۆی دابنیێ، شتێکی سەیر دەهاتە پێشچاو. چونکە لەژێر دەسەڵاتی فەرمانڕەوایی کەسێکی وەك سزار بۆرژیادا، چی بەسەر کۆمارەکانی ئیتاڵیاو دەزگا ئازادەکاندا دەهات؟ بەڵام دەکرێ بۆ ئەم ناکۆکیەی بیری مەکیاڤیلی دوو هۆ بهێنرێتەوە، یەکێکیان گشتی و ئەوی دیان تایبەتی. مەکیاڤیلی بڕوای وابوو هەموو بیرە سیاسیەکانی واقعبینانەن. بەڵام کاتێك دروشمە کۆماریخوازەکانی تاوتوێ دەکەین، هیچ لەم واقعبینیە نابینین. کۆماریخوازی مەکیاڤیلی زۆرتر ڕەهەندێکی "ئاکادیمی" هەیە تا ڕەهەندێکی پراکتیکی، زۆرتر گریمانکارانەیە (Speculative) تا واقعی. مەکیاڤیلی دڵسۆزانە و ڕاستگۆیانە خزمەتی دەوڵەتشاری فلۆرانسی کردبوو، وەك بەڕێوەبەر ﴾ی شورای فەرمانڕەوایی﴿ لەگەڵ بنەماڵەی میدچیدا جەنگی بوو. بەڵام کاتێك بنەماڵەی میدچی جارێکی دی دەسەڵاتیان گرتەوە دەست، مەکیاڤیلی هیوادار بوو کە ئیشەکەی خۆی بپارێزێ. ئەو هەوڵێکی زۆریدا بۆ ئەوەی لەگەڵ فەرمانڕەوا تازەکاندا، ئاشت بێتەوە، بە ئاسانی دەتوانین لەم مەسەلەیە تێبگەین. ئەو سوێندی وەفاداری بۆ هیچ بەرنامەیەکی سیاسی داڕێژراو نەخواردبوو. کۆمارخوازی مەکیاڤیلی سەرسەخت و وتوێژ هەڵنەگر نەبوو. مەکیاڤیلی دەیتوانی بە باوەشی کراوەوە، حکومەتی ئەرستۆکراتیش قبوڵبکات، چونکە هەرگیز لایەنگری ئاژاوەسالاری جەماوەری یان دەسەڵاتدارێتی خەڵکی ڕەش و ڕووت نەبوو. ئەو ڕایدەگەیەنێت بێ هۆ نیە کە دەنگی خەڵکیان بە دەنگی خودا شوبهاندوە(١٣). بەڵام لە لایەکی دیکەوە بڕوایوایە کە دروستکردنی دەزگای تازە لە وڵاتێکدا یان بونیادنانەوەی دەزگا کۆنەکان لەسەر بناغەیەکی تەواو تازە، دەبێ تەنها بە دەستی یەك کەس ئەنجامبدرێ(١٤). هیچ لە دەست خەڵك نایەت بەبێ ڕابەرێك(١٥).

تەنانەت ئەگەر مەکیاڤیلی ستایشی خەڵکی ڕەش و ڕووتی ڕۆم دەکات، ئەوا ئەمە بە مانای ئەوە نیە هەمان باوەڕی بەرامبەر بە دەسەڵاتی هاوڵاتیانی دەوڵەتێکی مۆدێرن، لە حکومەتکردن بەسەر خۆیاندا هەیە. مەکیاڤیلی بە پێچەوانەی بیریارانی







دی ڕینسانسەوە ئومێدێکی بە گەڕانەوەی ژیانی کلاسیکی نەبوو. ئەو بڕوای وابوو کە بونیادی کۆماری ڕۆم، لەسەر بناغەی فەزیلەتگەلێك بوە کە بۆ هەمیشە لەناوچوون. بە بڕوای مەکیاڤیلی هەوڵدان بۆ زیندوکردنەوەی ژیانی سیاسی قۆناغی کلاسیکی، خەونێکی بێهودەیە. زیهنی ئەو زیهنێکی ڕوون و تیژو سارد بوو، نەك زیهنێکی پەڕگیر و شەیداو هەژاوی وەك زیهنی کۆلادی رینتزی(١٦). لە ژیانی سەدەی پانزەی ئیتالیادا شتێك نەبوو ببێتە هۆی دڵگەرمی دروشمە کۆماریخوازانەکەی مەکیاڤیلی. ئەو وەك نیشتمانپەروەرێك هەستێکی هاودەردی زۆری بۆ هاوڵاتیانی هەبوو، بەڵام وەك فەیلەسوفێك لە بارەی ئەوانەوە سەختگیرانە هەڵیدەسەنگاندن و سوك تەماشای دەکردن. تەنها لە باکوری (ئەوروپا)دا دەیتوانی هەندێك نیشانەی عەشق بۆ ئازادی و فەزیلەتە کلاسیکیەکان ببینێ. دەبێ نەتەوەکانی باکوری ئەوروپا، تا ڕادەیەك لە دارمان پارێزراو بن، چونکە ئەوان فێری دابونەریتی فەرەنسی و ئیتاڵی و ئیسپانیەکان، واتە ئەم نەتەوە گەندەڵانەی جیهان، نەبوون(١٧). ئەم هەڵسەنگاندنەی مەکیاڤیلی لە بارەی سەردەمی خۆیەوە قابیلی پاشگەزبونەوە نەبوو. مەکیاڤیلی تەنانەت ئەوە قبوڵناکات کە ڕەنگە کەسانێك هەڵسەنگاندنەکەی ئەو ڕەت بکەنەوە. ئەو دەنوسێت:

"نازانم ئایا شایەنی ئەوەم بە یەکێك لەو کەسانە بژمێرێم کە خۆیان هەڵدەخەڵەتێنن، چونکە لەم وتارانەدا زیاد لە سنور ستایشی زەمەنی کلاسیکی ڕۆمەکان دەکەم، لە کاتێکدا ڕەخنە لە زەمانی خۆم دەگرم. لە ڕاستیشدا ئەگەر ئەو فەزیلەتانەی لەسەردەمی کلاسیکیدا باڵادەستبوون و ئەو کەموکوڕیانەی کە هەنوکە باڵادەستن، لە ڕۆژ ڕوناکتر نەبونایە، ئەوا لە بۆچونەکانمدا زۆرتر وریا دەبووم. بەڵام لەبەرئەوەی مەسەلەکە ئەوەندە دیارە کە هەموو کەسێك دەتوانێ بە چاو بیبینێ، کەوابوو دەبێ جەسوربم و ئەوەی بڕوام پێیەتی هەم لە بارەی سەردەمی کلاسیکی و هەم لە بارەی سەردەمی تازەوە، بە ئازادانە دەربڕم، بۆ ئەوەی زیهنی ئەو لاوانەی کە بە ڕێکەوت ئەم نوسینانەی منیان بەردەست دەکەوێت، نمونە مۆدێرنەکان وەلاوە نێن و هەرکاتێك هەلێك هاتە پێشەوە، ئامادەبن کە پەیڕەوی لە نمونەکانی قۆناغی کلاسیکی بکەن(١٨).

مەکیاڤیلی بە هیچ شێوەیەك لایەنگری میرە تازەکان ﴾یان حکومەتە تازە

ستەمکارەکان﴿ نەبوو. ئەو هەموو کەموکوڕی و خراپیەکانی دەدین، بەڵام بە بڕوای ئەو لە هەلومەرج و بارودۆخی ژیانی تازەدا، بوونی ئەم خراپیانە شتێکی ناچاری بوو. گومانی تیا نیە خودی مەکیاڤیلی بێزی لە زۆربەی ئەو هەنگاوانە کردۆتەوە کە بۆ فەرمانڕەواکانی دەوڵەتە تازەکان، پێشنیاری دەکرد. ئەو لە زۆر جێگەدا گوتویێتی ئەم هەنگاوانە چارەسەرگەلێکی بێ بەزەییانەن کە نەك هەر لە ڕوانگەی مەسیحیەکەوە، بەڵکو بەپێی ڕێساکانی ڕەفتاری هەموو شارستانیەتێك، قێزەونن. لەبەرئەوە هەرکەسێك گەر دەیەوێت خۆی لە ئەنجامدانی ئەمجۆرە کارانە بپارێزێ، باشترە کە پێ بنێتە ناو ژیانێکی تایبەتیەوە، نەك ئەوەی ببێ بە شاو لەسەر بناغەی ئەم جۆرە چارەسەرانە کە زیانی بۆ ڕەگەزی مرۆڤ هەیە، حکومەت بکات. بەڵام مەکیاڤیلی بە ڕوونی ئەوە زیاد دەکات کە هەرکەس نایەوێت لە شەقامی فەزیلەتە باشەکاندا بمێنێتەوە، بۆ مانەوەی خۆی پێ بنێتە ناو ئەم ڕێگا دزێوەوە(١٩). "یان سزار یان هیچ" یان دەبێ ژیانێکی تایبەتی و بێ زیان و بێ ئازار بگرینە بەر، یان دەبێ بچینە ناو چاڵی سیاسەتەوەو بۆ بەدەستهێنانی دەسەڵات بجەنگین و پاش بەدەستهێنانیشی بەبێ بەزەییانەترین و مسۆگەرترین هۆکارەکان، بیپارێزین، لە نێوان ئەم دوو ڕێگەیەدا، ڕێگەیەکی سێهەم نیە.

بەڵام کاتێك باسی "نائەخلاقی" بوونی (immoralism) مەکیاڤیلی دەکەین، نابێ ئەو زاراوەیە بە مانا تازەکەی تەفسیر بکەین. مەکیاڤیلی کردارەکانی مرۆڤ لە دیدی "ئەودیوی چاکەو خراپە" هەڵناسەنگێنێ. ئەو ئەخلاق سوك و ڕیسوا ناکات، بەڵام بایەخێکی ئەوتۆ بۆ مرۆڤەکان دانانێت. ئەگەر مەکیاڤیلی گومانکار بووە، ئەوا گومانەکەی زۆرتر بەرامبەر بە مرۆڤە تا بەرامبەر بە مەسەلە فەلسەفیەکان. باشترین بەڵگە بۆ ئەم گومانکاریە هەمیشەیی و ئەم بەدگومانیە بەرامبەر بە خەسڵەتی مرۆڤ، دەبێ لە کۆمیدیاکەیدا ، واتە ماندراگۆلا(٢٠)، بدۆزینەوە. ئەم شاکارەی ئەدەبیاتی کۆمیدی، ڕەنگە زۆر زیاتر لە هەموو نوسینە سیاسی و مێژووییەکانی مەکیاڤیلی، ئاشکرای هەڵسەنگاندنەکانی لە بارەی هاوچەرخەکانیەوە بکات. مەکیاڤیلی هیچ ئومێدێکی بە نەوەی خۆی و وڵاتەکەی نەبوو. لە میردا هەوڵدەدات ئەو باوەڕە لە زیهنی فەرمانڕەواکانی دەوڵەتە تازەکاندا جێگیر بکات کە مرۆڤەکان بە توندی لە ڕووی ئەخلاقیەوە داڕزاون. بەدگومانی بەرامبەر بە







خەسڵەتی مرۆڤ، بەشێکی جیانەکراوە لە عەقڵانیەتی سیاسی مەکیاڤیلی بوو. یەکەم مەرجی فەرمانڕەوایی کردنی مرۆڤ بریتیە لە ناسینی مرۆڤ. تا ئەوکاتەش کە خۆمان لە وەهمی "پاکی خۆڕسکی" مرۆڤ ڕزگار نەکردبێ، هەرگیز دەرکی مرۆڤ ناکەین. ڕەنگە وێنای پاکی خۆڕسکی مرۆڤ، زۆر مرۆڤ دۆستانەو خێرخوازانە بێت، بەڵام لە ژیانی سیاسیدا پوچی ئەم وێنایە سەلمێنراوە. مەکیاڤیلی دەڵێت ئەو کەسانەی لە بارەی حکومەتی مەدەنیەوە قسەیان کردوە، یەکەم بنەما کە دایاننابوەو هەموو مێژوونوسانیش سەلماندویانە، ئەوەیە هەرکەس دەیەوێت دەوڵەتێك بونیاد بنێو یاساگەلێکی گونجاو بۆ حکومەتەکەی دابڕێژێت، دەبێ ئەوە بە گریمانە وەربگرێ کە مرۆڤەکان بە شێوەیەکی خۆڕسك خراپن، و هەرکاتێك هەلێکی گونجاویان دەستبکەوێت، لە پیشاندانی خەسڵەتی خراپی خۆیاندا کەمتەرخەمی ناکەن(٢١).

ناتوانرێ بەدخەسڵەتی مرۆڤ بە یاساکان چارەسەر بکرێت، بەڵکو دەبێ لە ڕێگەی کرداری توندوتیژو زۆرەوە، چارەسەر بکرێت. لە ڕاستیدا بوونی یاساکان بۆ هەر وڵاتێك پێویستە، بەڵام فەرمانڕەوا دەبێت بورهانێکی قەناعەتپێکەرتریش بەکاربهێنێ. باشترین بناغە بۆ هەر دەوڵەتێکی کۆن یان تازە، یان تێکەڵێك لە هەردوکیان، یاساگەلی چاك و شمشێری تیژێتی. بەڵام لەبەر ئەوەی یاسای چاك بێ سەرەنێزە کاریگەری نیەو لە لایەکی دیکەوە خودی سەرەنێزە بایەخ بۆ ئەم یاسایانە پەیدا دەکات، کەوابوو لێرەدا زیاتر لەمە قسە لە یاساکان ناکەم، بەڵکو قسە لە بارەی هێزی چەکدارەوە دەکەم(٢٢). تەنانەت قەدیسەکان و پێغەمبەرانیش هەر ئەوەندەی بە دەسەڵات گەیشتن و بوون بە فەرمانڕەوا، هەر بە پێی ئەم بنەمایە کاریان کردوە. بێ بەکارهێنانی ئەم بنەمایە، واتە بێ بەکارهێنانی زۆر هەر لە سەرەتای کاریانەوە، لەناودەچوون. ساوونارۆلا(٢٣) نەیتوانی بە ئامانجی خۆی بگات، چونکە نە ئەو دەسەڵاتەی هەبوو ئەو کەسانە بە وەفاداری بۆ خۆی ڕابگرێ کە دابویانە پاڵی و نە توانی ئەو کەسانە ناچار بە قبوڵکردنی پەیامەکەی بکات کە نکوڵیان لێکردبوو. هەر لەبەر ئەم هۆیە هەموو ئەو پێغەمبەرانەی کە هێزێکی چەکدار پشتیوانیان بوو، پەیامی خۆیان بە سەرکەوتوویی ئەنجامدا، لە کاتێکدا ئەو پێغەمبەرانەی خاوەنی هێزی چەکداری نەبوون کە پشتی پێببەستن، شکستیان هێناو لەناوچوون(٢٤).

دیارە مەکیاڤیلی فەرمانڕەوای چاك و عەقلانی و شەریفی، لە فەرمانڕەوایانی خراپ و بێبەزەیی پێ باشتر بوو، ئەو ئیمپراتۆری وەك ماركۆس ئاۆرولیسی لە ئیمپراتۆری وەك نیرۆن، پێ باشتر بوو. بەڵام ئەگەر ئێوە كتێبێكتان نوسی كە تەنها فەرمانڕەوا چاك و دادپەروەرەكان لەبەرچاو بگرێ، ڕەنگە خودی كتێبەكە بەرهەمێكی مەزن بێت، بەڵام ئەم كتێبە خوێنەرانێكی ئەوتۆی نابێت. میرە چاك و دادپەروەرەكان ئاوارتەن نەك ڕێسا. هەموو كەسێك ئەوە قبوڵدەكات ئەو میرەی كە بە ئیمانە و بە ڕاستی و دروستی دەژی، چەند شایستەی ستایشكردنە، بەڵام لەم هەلومەرجەی ئێستادا، میر دەبێ هونەرێكی دیش فێرببێت: هونەری فرتوفێڵ و خیانەتكردن. مەكیاڤیلی لە میردا دەنوسێ:

"میرێك دەبێ بزانێت  لە كاتی پێویستدا چۆن دەبێت بە جانەوەرێكی دڕندەو چۆن دەبێت بە مرۆڤ. نوسەرانی سەردەمی كلاسیكی هەر ئەم بابەتەیان بە شێوەیەكی تەمومژاوی لە ئێمە گەیاندووە. ئەوان هێناویانەتەوە كە چۆن ئاشیل و ژمارەیەك میری تر لە سەردەمە كۆنەكاندا بۆ فێربوون نێرراوون بۆ لای چیرۆن سەنتور (Chiron the Centaur) كە بونەوەرێكی ئەفسانەییە نیوەی لەشی لە شێوەی ئەسپدایە و نیوەكەی تریشی لە شێوەی مرۆڤدا. لەبەرئەوەش كە فێركارەكەیان نیوەی مرۆڤ و نیوەكەی تریشی ئاژەڵ بوو، ڕەنگە بەم ڕێگەیە ئەوەیان فێركرابێت كە لاسایی هەردوو خەسڵەتەكە بكەنەوە. چونكە فەرمانڕەوا بێ خاوەندارێتی خەسڵەتێكی ئاژەڵی، ناتوانێ بۆ ماوەیەكی درێژ لەسەر دەسەڵات بمێنێتەوە. ئێستا كە سەلمێنرا  لە گرنگترین ئەركەكانی میر ئەوەیە فێربێت چۆن لە كاتی پێویستدا خەسڵەتی ئاژەڵی خۆی پیشانبدات، ئەوا دەبێ لەم بارەیەوە شێرو ڕێوی بكاتە نمونەی خۆی. چونكە شێر ئەوەندە فێڵزان نیە كە نەكەوێتە ناو تەڵەكانەوەو ڕێویش ئەوەندە هێزی نیە كە دەرەقەتی گورگ بێت، كەوابوو فەرمانڕەوا دەبێت ڕێوی بێت، بۆ ئەوەی تەڵەكان بدۆزێتەوە، شێریش بێت بۆ ئەوەی گورگەكان بترسێنێ"(٢٥).

ئەم شوبهاندنە بەناوبانگە، زۆر دیارو ڕونكەرەوەیە. دیارە مەكیاڤیلی نایەوێت بڵێ فێركاری فەرمانڕەوایان دەبێ ئاژەڵێكی دڕندە بێت. بەڵام فەرمانڕەوا دەبێ لەگەڵ مەسەلە ئاژەڵیەكاندا سەروكار پەیدا بكات و لە بینین و ڕووبەڕونەوەیان





ڕانەكات و ناوی هەقیقیان بهێنێت. لە سیاسەتدا مرۆڤایەتی بە تەنها هیچ كارێك ناباتە پێشەوە. لێرەوە فێركاری سیاسەت دەبێ هەم لە خەسڵەتی مرۆیی تێبگات و هەم لە خەسڵەتی ئاژەڵی: ئەو دەبێ نیوەی مرۆڤ و نیوەی ئاژەڵ بێت.

بەر لە مەكیاڤیلی هیچ نوسەرێكی سیاسی بەمشێوەیە لە بارەی سیاسەتەوە قسەی نەكردبوو. ئا لێرەدایە كە جیاوازی ڕوون و ئاشكراو هەمیشەیی تیۆرەی مەكیاڤیلی لەگەڵ تیۆرەكانی پێشی خۆیدا، چ نوسەرانی كلاسیك (یۆنان و ڕۆم) و چ نوسەرانی سەدەكانی ناوەڕاست، ئاشكرا دەبێت. پاسكال دەڵێت هەندێك وشە هەن كە بە شێوەیەكی لەناكاو و چاوەڕوان نەكراو، مانای كتێبەكە ڕوندەكەنەوە. هەر ئەوەندەی بەر ئەو وشانە بكەوین، ئیدی لە بارەی تایبەتمەندی كتێبەكەوە، هیچ گومانێكمان بۆ نامێنێتەوەو هەموو تەمومژەكان دەڕەوێنەوە. ئەو وتەیەی مەكیاڤیلی كە فێركاری فەرمانڕەوایان دەبێ نیوەی مرۆڤ و نیوەیان ئاژەڵ بێت، لەمجۆرە وتانەیە. ئەم وتەیە وەك بروسكەیەكی لەناكاو، ماهیەت و ئامانجی تیۆرەی سیاسی مەكیاڤیلی، ئاشكراو ڕوون دەكاتەوە. هیچ كەس هەرگیز گومانی لەوە نەبوە كە ژیانی سیاسی لە هەلومەرجی باودا، پڕ لە تاوان و خیانەت و خراپەكاریە. بەڵام بەر لە مەكیاڤیلی هیچ بیریارێك فێركردنی ئەم هونەرەی لە ئەستۆ نەگرتبوو. فەرمانڕەوایان ئەم كارانەیان ئەنجامدەدا، بەڵام كەسێك پەیدا نەبووبوو كە بیەوێت ئەم كارانەیان فێربكات. ئەوەی مەكیاڤیلی بەڵێنیداوە كە لە هونەری فێڵبازی و پەیمانشكێنی و بێڕەحمیدا ببێ بە فێركاری سیاسەتمەداران، بابەتێك بوو كە تا ئەوكاتە كەس دەستی بۆ نەبردبوو. ئەو لە فێركردنیشدا زۆر وردە. مەكیاڤیلی لە پەروەردەكردنی فەرمانڕەوادا، ڕێگەی هیچی گومان و دودڵیەك بە خۆی نادات، بە فەرمانڕەوا دەڵێت لەبەرئەوەی پیشاندانی توندوتیژی و بێڕەحمی پێویستن، كەوابوو دەبێ خێراو بێ تۆزقاڵێك بەزەیی، دەست بەكاری دڵڕەقانە بكرێت. لەم حاڵەت و تەنها لەم حاڵەتەدایە كە ئەوان بەدەرئەنجامی پێویست دەگەن. ئەم هەنگاوانە، توندوتیژی بەجێ و لە كاتی خۆیدان. تەسەوری هیچ سودێك لە دواخستنی هەنگاوەكە یان كەمكردنەوە لە توندیەكەی، ناكرێت. ئەم هەنگاوە دەبێت بڕاوەو بروسكە ئاساو بێ ڕەچاوكردنی هەستی مرۆڤانە ئەنجامبدرێ. داگیركەرێك كە سەڵتەنەتێكی داگیركردوە، نابێ بهێڵێ هیچ پیاو یان ژنێكی تر سەر بەرز بكاتەوە،





ئەو دەبێ هەموو ئەندامانی خێزانی فەرمانڕەوایی یاسایی، لەناوببات(٢٦). ڕەنگە هەموو ئەم کارانە بە قێزەون بزانرێ، بەڵام لە ژیانی سیاسیدا هێڵێکی جیاکەرەوە لە نێوان "فەزیلەت" و "دزێویدا" نیە. ئەم دوانە جێگەی خۆیان بەیەك دەدەن. ئەگەر هەموو شتێك لەبەرچاو بگرین، تێدەگەین هەندێك هەنگاو کە زۆر بە چاکە دەزانرێن، ئەگەر ئەنجامبدرێن، بۆ میر دەبنە هۆی خراپە، لە کاتێکدا ئەو کارانەی دی کە بە خراپە دەزانرێن، بۆ فەرمانڕەوا سودمەند دەبن(٢٧) لە سیاسەتدا هەموو شتەکان جێگەی خۆیان دەگۆڕنەوە، جوانی دەبێ بە ناشرین و ناشرین دەبێ بە جوان.

ئەوە ڕاستە کە هەندێك لە لێکۆڵەرەوان کاتێك لە بارەی مەکیاڤیلی و کتێبەکەیەوە لێکۆڵینەوە دەکەن، بەرهەمەکەی بە جۆرێکی دی دەبینن. بڕوایانوایە لە کتێبەکەی مەکیاڤیلیدا هیچ تازەگەریەکی واقعی نیە، و میر بەرهەمێکی ئاساییەو لە ئاست جۆرێکی ئاشنای بەرهەمی ئەدەبیدایە، ئەم لێکۆڵەرەوانە دڵنیامان دەکەن کە میر تەنها یەکێك لەو کتێبە بێ ئەژمارانە بووە کە لەژێر ناونیشانی جیاوازدا بۆ ڕێنمایی شاکان دەنوسرا. دەکرێ زۆر لەم جۆرە وتارانە لە نێوان بەرهەمە ئەدەبیەکانی سەدەکانی ناوەڕاست و ڕێنسانسدا بدۆزرێتەوە. لە نێوان ساڵەکانی ٨٠٠ و ١٧٠ ی میلادیدا نزیکەی هەزار کتێب لەبەردەستدا بوو کە بە شایان دەگوت چۆن ڕەفتار بکات تا "لە جێگەی بەرزی خۆیەوە ئاگایەکی ڕوونی لە شتەکان بێت". هەموو کەسێك ئەم بەرهەمانەی دەناسی و دەیخوێندەوە، وەك: لەبارەی دەزگای فەرماندەییەوە، لە بارەی ئەرکی مەقامی سەڵتەنەت، ڕێبازی میران. مەکیاڤیلی تەنها ناونیشانێکی بۆ ئەم لیستە دورو درێژە زیادکردوە. ئەوان بڕوایانوایە کتێبەکەی بە هیچ شێوەیەك تازەگەریەکی واقعی تێدا نیە، نە تازەگەری لە ئەندێشەدا و نە تازەگەری لە شێوازی نوسیندا(٢٨).

بەڵام دەکرێ لە بەرامبەر ئەم هەڵسەنگاندنەدا، دوو شایەت بهێنرێتەوە: یەکێکیان مەکیاڤیلی و ئەویدیشیان خوێنەرەکانی کتێبەکەی. مەکیاڤیلی بە قوڵایی بڕوای بە ڕەسەنایەتی بیروڕا سیاسیەکانی خۆی هەبوو. ئەو لە پێشەکی "تێزەکاندا" دەنوسێ: "بە هۆی ئارەزویەکەوە کە سروشت لە مندا چاندویێتی، بێئەوەی ڕێگە بە هیچ دڵەڕاوکێیەك بدەم، دەستم بە کارێك کردوە کە بڕوامایە بەرژەوەندی هەموانی







تێدایە، لێرەوە پێم ناوەتە ناو ڕێگەیەکی تازەوە کە هیچکەس پێش من پێی تێنەخستوە، ئەگەرچی ئەمە کارێکی تەواو ئەستەم و سەختە، بەڵام ڕەنگە کەسانێك کە بە دیدی لوتفەوە تەماشای هەوڵەکانم دەکەن، بەرهەمەکانم پەسەند بکەن"(٢٩).

ئەم ئومێدە نەبوو بە نائومێدی: خوێنەرانی بەرهەمەکانی مەکیاڤیلی بە پێی چاوەڕوانی ئەو هەڵسەنگاندنیان کرد. بەرهەمەکەی ئەویان نەك هەر لەلایەن لێکۆڵەرەوەکان و توێژەرەوەکانی زانستی سیاسەت خوێندرایەوە، بەڵکو بە شێوەیەکی بەرفراوان بڵاوبۆوە. بە ئەستەم دەکرێ سیاسەتمەدارێکی مەزنی تازە بدۆزرێتەوە کە کتێبەکەی مەکیاڤیلی نەناسیبێ و بە خوێندنەوەی ئەفسوون نەبووبێت. لە نێوان خوێنەران و ستایشکەرانی مەکیاڤیلیدا ناوی ئەم کەسانە هەیە: کاتاریاندۆ میدچی(٣٠)، چارلزی پێنجەم، ریشیلۆ(٣١)، کریستینا مەلیکەی سوید، ناپلیۆن بۆناپارت. بۆ ئەمانە میر شتێکی زیاد لە کتێبێك بوو، میر ڕێنماو ئەستێرەیەك بوو بۆ کارە سیاسیەکانیان.

ئەگەر میر لە ژمارەی ئەو بەرهەمە ئەدەبیانەدا بوایە کە بە تەواوی ناسراون، ئەوا کاریگەریە قوڵ و سەقامگیرەکەی، قابیلی تێگەیشتن نەبوو. ناپلیۆن بۆناپارت دەیگوت کە لە هەموو بەرهەمە سیاسیەکاندا تەنها بەرهەمەکانی مەکیاڤیلی شایستەی خوێندنەوەن. ئایا دەکرێ کەسانی وەك ریشیلۆ، کاتارینادۆ، میدچی و ناپلیۆن بوناپارت بە شەیدایانی بەرهەمگەلێکی وەك "ڕێبازی میران" نوسینی تۆماس ئەکویناس یان "لە بارەی دەزگاکانی فەرمانڕەوایانی مەسیحی" بەرهەمی ئەراسمۆس یان تلماك بەرهەمی فنلون، بزانرێ؟ بۆ ئەوەی جیاوازی ئاشکرای نێوان میری مەکیاڤیلی و بەرهەمی وەك "ڕێبازی میران" تێبگەین، پێویستمان بەوە نیە پشت بە هەڵسەنگاندنی تایبەتی خۆمان ببەستین، بەڵگەی باشتر و چاکتر لەبەردەستدان کە پیشانیدەدەن لە نێوان تیۆرەکانی مەکیاڤیلی و نوسەرانی سیاسی بەرلەودا، درزێکی واقعی هەیە، دیارە میر پێشڕەوانێکی هەیە، بەڵام چ کتێبێك هەیە کە پێشەنگی نەبووبێت؟ ڕەنگە لە نێوان میرو بەرهەمی نوسەرانی تردا، گەلێك لێکچوون بدۆزینەوە. لەچاپی بورت(٣٢)دا زۆربەی ئەم جۆرە لێکچونانە بەوردی کۆکراونەتەوەو لە پەراوێزەکانی کتێبەکەدا هاتوون. بەڵام لێکچونە ئەدەبیەکان، بە ناچاری لێکچونە فکریەکان ناسەلمێنن. بابەتی میر سەر بە "ئاو و هەوایەکی فکری"

ترە كە بە تەواوی لەگەڵ بابەتی بەرهەمی نوسەرانی پێش مەكیاڤیلیدا، جیاوازە.

ڕەنگە بكرێ ئەم جیاوازیە بە دوو وشەدا وەسفبكرێ: وتارە كلاسیكیەكانی وەك "لە بارەی فەرمانڕەوایان و یاساكان"، "لە بارەی سەڵتەنەتەوە"، "لە بارەی شاو ڕێبازی میر" وتارگەلێكی پەروەردەیی بوون كە بۆ سودی شازادەكان دەنوسران. بەڵام مەكیاڤیلی نە كارێكی وای لەسەر بوو، نە ئومێدی بە كارێكی لەم چەشنە هەبوو. كتێبەكەی مەكیاڤیلی باسی كۆمەڵێك مەسەلەی سەرلەبەر جیاوازی دەكرد. ئەم كتێبە تەنها بە فەرمانڕەوا دەڵێت چۆن دەسەڵات بەدەست بهێنێت وچۆنیش لە هەلومەرجی سەختدا بیپارێزێ. مەكیاڤیلی ئەوەندە ساویلكە نەبوو كە وا بزانێت فەرمانڕەوایان میرنشینە تازەكان، پیاوانی وەك سزار بۆرژیا، ئامادەبوون كە "پەروەردە" بكرێن. ئەو بەرهەمانەی كە پێش و دوای میر نوسران و بە ئاوێنەی شا ناودەبرێن، بڕوایان وایە وەك چۆن شا سەیری ئاوێنە دەكات و وێنەی خۆی دەبینێ، هەرواش لەم كتێبانەدا ئەرك و واجیباتی خۆی دەبینێ. بەڵام لە كوێی میری مەكیاڤیلیدا، شتی وا دەدۆزینەوە؟ لە كتێبەكەی ئەودا خودی زاراوەی "ئەرك" نەهاتووە.

## هونەری سیاسەت

بەڵام ئەگەر میر هەموو شتێكە جگە لە وتارێكی ئەخلاقی یان پەروەردەیی، ئەوا لەم قسەیەوە ناتوانرێ ئەو ئەنجامگیریە بكرێ یان بە بەڵگەیەك بزانرێ بۆ ئەوەی كە میر بەرهەمێكی ئەنتی ئەخلاقیە. ئەم كتێبە تەنها بەرهەمێكی هونەریە. لە كتێبێكی هونەریدا بەدوای ڕێساكانی ڕەفتاری ئەخلاقی یان ڕێساكانی خراپەو باشەدا ناگەڕێین. هەر ئەوەندە بەسە كتێبێكی هونەری پێمان بڵێت چ شتێك سودمەندو چ شتێك بێسودە. دەبێ یەك بە یەكی وشەكان لە میردا بەمشێوەیە بخوێنرێتەوەو تەفسیربكرێ. ئەم كتێبە نە هەڵگری دەستوری ئەخلاقیە بۆ فەرمانڕەوا، نە هانی دەدا ناپاكی و تاوان بكات. ڕووی قسەی كتێبەكە بە تایبەتی لە "میرنشینە تازەكانە" كە هەوڵدەدات بۆ پاراستن و پارێزگاری كردنی خۆیان لە بەرامبەر مەترسیەكاندا، ڕێنمایی پێویستیان بكات. ئەم مەترسیانە بە ئاشكرا زۆر گەورەترن لەو مەترسیانەی هەڕەشە لە دەوڵەتە ئاساییەكانی وەك دەوڵەتی قەشەیی یان سەڵتەنەتە میراتیەكان





دەكات. میرنشینە تازەكان دەبێ بۆ خۆپاراستن لەم مەترسیانە پەنا بۆ ئامێرو هۆكاری نائاسایی بەرن. بەڵام ئەگەر خراپە هێرشی كردبێتە سەر چوارچێوە سیاسیەكە، ئیدی زۆر درەنگە بۆ ئەوەی بە دوای چارەسەردا بگەڕێین. مەكیاڤیلی دەیەوێت بەراوردی هونەری سیاسەتمەدارێك لەگەڵ هونەری پزیشكێكی لێهاتوودا بكات. هونەری پزیشكی لە سێ بەش پێكهاتوە: دەستنیشانكردنی نەخۆشی، پێشبینی دەورەی نەخۆشیەكەو چارەسەركردنی. لەم سێ بەشەدا دەستنیشانكردنی دروستی نەخۆشیەكە، گرنگترین كارە. مەسەلەی سەرەكی ناسینی نەخۆشیەكەیە لە كاتی گونجاودا، بۆ ئەوەی بكرێت ڕوبەڕوی دەرئەنجامەكانی ببینەوە. ئەگەر لە دەستنیشانكردنی نەخۆشیەكەدا هەڵە بكەین یان لە كاتی خۆیدا نەخۆشیەكە دەستنیشان نەكەین، بارودۆخی نەخۆشەكە نائومێدكەر دەبێت. مەكیاڤیلی دەڵێت:

"پزیشكەكان باسی تایەكی سیلی ئێسقانی دەكەن كە تیماركردنی لە سەرەتای نەخۆشیەكەدا، كارێكی زەحمەت نیە، بەڵام دەستنیشان كردنی زەحمەتە. بەڵام بە تێپەڕینی كات لەبەرئەوەی نەخۆشیەكە دەستنیشان نەكراوەو تیمار نەكراوە، پەرەدەسێنێت و لێرەوە بە ئاسانی دەدۆزرێتەوە. بەڵام ئا لەم كاتەدا تیماركردنی نەخۆشیەكە زۆر ئەستەم دەبێت. هەر ئەمەش بەسەر چوارچێوە سیاسیەكاندا دێت. چونكە ئەو پریشك و ئاژاوانەی ڕەنگە لەهەر حكومەتێكدا ڕووبدەن، ئەگەر لە كاتی خۆیدا پێشبینی بكرێن، ئەوا بەرپێگرتنیان ئاسانە. پێشبینی كردنیشیان لە كاتی خۆیدا تەنها لەدەست پیاوانی لێزان و دوربین دێت. بەڵام ئەگەر ئاژاوەو پریشكەكان گەیشتنە ئەوەی دەركەون و بەو شێوەیە پەرەبسێنن كە هەموو كەسێك دەرئەنجامەكانی ببینێت، لەم قۆناغەدا بە دەگمەن چارەسەرێك بدۆزرێتەوە كە كاریگەریەكی بەهێزی هەبێت و بتوانێت ئاژاوەكان بنیشێنێتەوە"(٣٣).

هەموو پێشنیارەكانی مەكیاڤیلی دەبێ هەر بەم ڕۆحیەتەوە تەفسیر بكرێت. ئەو مەترسیگەلێك پێشبینی دەكات كە ڕەنگە شێوە جیاوازەكانی حكومەت بەرەو ڕووی ببنەوەو چارەسەریش بۆ ڕێگە لێگرتنیان دەدۆزێتەوە. مەكیاڤیلی بە فەرمانڕەوا دەڵێت چی بكات بۆ ئەوەی دەسەڵاتی خۆی بەرپا بكات و سەقامگیری بكات و چۆن خۆی لە ململانێ ناوخۆییەكان بپارێزێ و پێشبینی دەسیسەكان بكات و ڕێگەیان لێبگرێت. هەموو ئەم پەندانە "فەرمانی گریمانەیین" یان بە وتەی كانت "فەرمانی





لێهاتوویین" کانت دەڵێت:

لێرەدا ئەو پرسیارە لە ئارادا نیە کە ئایا ئامانجی خوازراو، عەقڵانی و باشە، بەڵکو مەسەلەکە ئەوەیە کە چی دەبێت بکرێت بۆ ئەوەی بە ئامانج بگەین؟ بۆ پزیشك "فەرمانی لێزانین" ئەوەیە کە نەخۆشەکەی خۆی تەندروست بکاتەوەو بۆ ژەهردەرخوار، "فەرمانی لێزانین" ئەوەیە کە دڵنیا بێت کە مردن حەتمیە. فەرمانەکانی لێزانین لە هەردوو حاڵەتەکەدا بەهایەکی یەکسانیان هەیە. هەر فەرمانێکی لێزانین بەکاردەهێنرێت بۆ ئەوەی بە تەواوی بە مەبەستی بگات"(٣٤).

ئەم قسانە بە وردی وەسفی ئاراستەی زیهنی مەکیاڤیلی و شێوازەکەی دەکەن. ئەو هەرگیز کارە سیاسیەکان ئافەرین یان تاوانبار ناکات، بەڵکو تەنها شیکارێکی وەسفیان بۆ پێشکەش دەکات، بە هەمان ئەو شێوەیەی پزیشکێك نیشانەکانی فلان نەخۆشی بۆ نەخۆش وەسف دەکات. لەم جۆرە شیکردنەوانەدا تەنها پەیوەندی بە ڕاستبوونی وەسفەکەوە دەکەین، نەك بەو شتانەوە کە وەسف کراون. تەنانەت دەکرێ لە خراپترین مەسەلەکان، وەسفێکی ڕاست و بەرز بە دەستەوە بدرێ. مەکیاڤیلی کارە سیاسیەکان بە هەمان شێوە تاوتوێ دەکات کە زانای کیمیا کاردانەوە کیمیاییەکانی پێ تاوتوێ دەکات. بێگومان زانای کیمیا کاتێك لە تاقیگەکەی خۆیدا ژەهرێکی بەهێز ئامادە دەکات، بەرپرسیار نیە لە دەرئەنجامەکانی ئەم ژەهرە. پزیشکێکی زیرەك دەتوانێ بەو ژەهرە گیانی کەسێك لە مردن ڕزگار بکات و بە پێچەوانەوە ئەگەر ئەو ژەهرە بەردەست تاوانکارێك بکەوێت، دەتوانێ مرۆڤێك بکوژێت. لە هەردوو حاڵەتەکەدا ناکرێت زانای کیمیا سەرزەنشت یان ستایش بکرێ. ئەگەر زانای کیمیا هەموو ئەو پرۆسانەمان فێر بکات کە بۆ ئامادەکردنی ژەهرەکە پێویستەو هاوکێشە کیمیاییەکەی بخاتە بەردەستمان، ئەوا بە باشترین شێوە ئەرکی خۆی جێبەجێ کردوە. میری مەکیاڤیلی هەڵگری زۆر مەسەلەی ترسناك و ژەهراویە، بەڵام ئەو بە ساردی و بێلایەنی زانایەکەوە، تەماشای ئەم مەسەلانە دەکات. مەکیاڤیلی ڕەچەتە سیاسیەکەی خۆی دەپێچێتەوە و پێشنیارە پێویستەکان پێشکەشدەکات. بەڵام چ کەسێك ئەم پێشنیارانە بەکاردەهێنێ و ئایا لە خزمەت ئامانجێکی باش یان خراپدا بەکاریان دێنێ، ئیدی ئەمە پەیوەندی بە مەکیاڤیلیەوە نیە.

ئەوەی مەکیاڤیلی ئارەزووی دەکرد پێناسی بکات تەنها زانستی تازەی سیاسەت







نەبوو، بەڵکو هونەری تازەی سیاسەتیش بوو. ئەو یەکەم نوسەری مۆدێرنە کە باسی "هونەری دەوڵەتداری" دەکات. ڕاستە بیرۆکەی هونەرێکی وا گەلێك دێرینە، بەڵام مەکیاڤیلی تەفسیرێکی تەواو تازە لەم بیرۆکە کۆنە دەدات بە دەستەوە. لە سەردەمی ئەفلاتونەوە هەموو بیریارە سیاسیە مەزنەکان جەختیان لەوە کردوە ناکرێ سیاسەت بەکارێکی ئاسایی دابنرێ، بەڵکو دەبێ ڕێساگەلێکی دیاریکراو و دەستنیشانکراو هەبێت کە ببێ بە ڕێنمای کارە سیاسیەکان. دەبێ تەکنیکی "techne" سیاسەت، لەدایك بێت. ئەفلاتون لە دیالۆگی گۆرگیاسدا، تیۆرەی خۆی لە بارەی دەوڵەتەوە لە بەرامبەر تیۆرەی سۆفیستەکان: پرۆتۆگۆراس، پرۆدیکوس و گورگیاسدا، دادەنێت. ئەفلاتون دەڵێت ئەم پیاوانە بۆ ڕەفتاری سیاسی ئێمە ڕێساگەلێکی زۆریان پێشکەش کردوە. بەڵام ئەم ڕێسایانە هیچ جۆرە ماناو بەهایەکی فەلسەفیان نیە، لەبەرئەوەی کە خاڵی سەرەکیان نەبینیوە. ئەم ڕێسایانە لە ڕێگەی تەجریدکردنی مەسەلە تایبەتیەکانەوە بەدەستهاتوون و پەیوەندیان بە ئامانجی لاوەکیەوە هەیە. لەبەرئەوە خاوەن خەسڵەتی سەرەکی تەکنیك نین، بەو مانایەی ئەم ڕێسایانە ڕەهەندی هەمەکی و گشتیان نیە. ئا لێرەدا جیاوازی بنەڕەتی و هەمیشەیی نێوان "تەکنیك"ی جێی مەبەستی ئەفلاتون و هونەری دەوڵەتداری "Arte dello stato" مەکیاڤیلی، تێدەگەین. "تەکنیك"ی جێی مەبەستی ئەفلاتون بە مانای هونەرێك نیە کە جێی مەبەستی مەکیاڤیلیە. ئەویان ناسینە (episteme) کە لەسەر بناغەی بنەما هەمەکیەکان دامەزراوەو ئەم بنەما هەمەکیانەش نەك تیۆری بەڵکو پراکتیکیشن، نەك تەنها لۆژیکی، بەڵکو ئەخلاقیشن. هیچکەس ناتوانێ بێ بوونی هوشیاری بەرامبەر بەم بنەمایانە، ببێ بە دەوڵەتمەدارێکی ڕاستەقینە. کەسێك ڕەنگە خۆی لە مەسەلە حەیاتیەکانی سیاسەتدا بە ئەزموون بزانێ، چونکە بە هۆی ئەزموونی دورو درێژەوە بیروڕای دروستی لە بارەی مەسەلە سیاسیەکانەوە بەدەستهێناوە. بەڵام ئەم مەسەلەیە نایکات بە فەرمانڕەوایەکی واقعی و یارمەتی نادات بۆ ئەوەی هەڵسەنگاندنێکی پتەو بکات، چونکە ئەو "تێگەیشتنێکی بۆ هۆ" نیە(٣٥).

ئەفلاتون و پەیڕەوانی هەوڵیاندا تیۆرەی دەوڵەتی دامەزراو لەسەر یاسا، پێشکەشبکەن. مەکیاڤیلی یەکەم کەس بوو تیۆرەیەکی پێشکەشکرد کە ئەم لایەنە تایبەتیەی ﴿واتە یاساییبونی دەوڵەت﴾ وەلاوە دەنا یان لە گرنگی کەمدەکردەوە. ئەو

هونەرە سیاسیەی مەکیاڤیلی پێشکەشی دەکرد، بە یەکسان لەبەردەم دەوڵەتی یاسایی و دەوڵەتی نایاساییدا بوو، وە بە کەڵکی هەردوکیان دەهات. خۆری حیکمەتی سیاسی مەکیاڤیلی هەم بەسەر میرە یاساییەکاندا دەدرەوشایەوە و هەم بەسەر داگیرکەران و ستەمکاراندا، هەم بەسەر فەرمانڕەوا دادپەروەرەکاندا دەدرەوشایەوەو هەم بەسەر زاڵمەکاندا. مەکیاڤیلی هەموو پەندەکانی خۆی لە کاروباری دەوڵەتدا، بە ئازادانەو سەخییانە پێشکەش بە هەمویان دەکات. نابێت مەکیاڤیلی لەبەر ئاراستە زیهنیەکەی، سەرزەنشت بکرێ. گەر بمانەوێت میر لە فۆرمۆلێکدا کورت بکەینەوە، ڕەنگە هیچ شتێك لەوە باشتر نەبێت کە پشت بە قسەکانی مێژوونووسێکی سەدەی نۆزدە ببەستین. هیپۆلیت تن(٣٦) لە پێشەکی کتێبەکەی خۆیدا: "مێژووی ئەدەبیاتی ئینگلیزی" دەڵێت کە مێژوونووس دەبێت بە هەمان شێوە باسی ڕەفتارەکانی مرۆڤ بکات کە زانای کیمیایی باسی پێکهاتە کیمیاییە جیاوازەکان دەکات. فەزیلەت و خراپی بەرهەمی وەك سۆلفات و شەکرن و دەبێ بە هەمان ڕۆحی زانستی ساردو بێلایەنەوە تاوتوێ بکرێن. شێوازی مەکیاڤیلی ڕێك هەر بەم شێوەیە بوو. بێگومان ئەویش هەستی تایبەتی خۆی و دروشمی سیاسی و ئارەزووی تایبەتی خۆی هەبوو، بەڵام ڕێگەی نەدەدا کە کار بکەنە سەر هەڵسەنگاندنی سیاسی خۆی. هەڵسەنگاندنی مەکیاڤیلی هەڵسەنگاندنی زانایەك و کارشناسێکی ژیانی سیاسی بوو. ئەگەر میر بە شێوەیەکی دی بخوێنینەوە و ئەگەر بە بەرهەمی پڕوپاگەندەکەرێکی سیاسی بناسین، جەوهەرەکەیمان لەدەستداوە.

## ڕەگەزی ئەفسانەیی لە فەلسەفەی سیاسی مەکیاڤیلیدا: بەخت

زانستی سیاسەتی مەکیاڤیلی و زانستی سروشتی گالیلۆ، لەسەر بنەمایەکی هاوبەش بونیاد نراون. ئەم دوانە لەسەر بنەمای تێزی هاوتەبایی و یەك ڕیتمی سروشت دامەزراون. سروشت هەمیشە هەر ئەمەیەو هەموو دیاردە سروشتیەکان پەیڕەوی لە یاساگەلێکی نەگۆڕو هەمیشەیی دەکەن. ئەم بنەمایە لە جیهانی فیزیاو گەردووناسیدا، بوە هۆی نەمانی جیاوازی لە نێوان جیهانی "بەرین" و جیهانی "ژێرەوە". هەموو دیاردە فیزیکیەکان لەسەر یەك ئاستن. ئەگەر فۆرمۆلێکمان دۆزیبێتەوە کە جوڵەی تاشە بەردێك وەسف دەکات، دەکرێ هەر هەمان فۆرمۆل بۆ





جوڵەی مانگ بەدەوری زەوی و جوڵەی دورترین ئەستێرەکانیش بەکاربهێنرێ. لە سیاسەتیشدا تێدەگەین هەموو قۆناغەکان بونیادێکی سەرەکی یەکسانیان هەیە. هەرکەسێك قۆناغێکی مێژوویی بناسێ، هەموو قۆناغەکانی ناسیووە. سیاسەتمەدارێك کە ڕوبەڕووی مەسەلەیەکی واقعی بۆتەوە، لە مێژوودا هەمیشە هاوشێوەی ئەو مەسەلەیە دەدۆزێتەوەو دەتوانێ بە بەراوردکردنیان، بە شێوەیەکی دروست مامەڵە بکات. ناسینی ڕابردوو، ڕێنمایەکی دڵنیاییکەرە. ئەو کەسەی دیدو تێڕوانینێکی ڕوونی بۆ ڕابردوو بەدەستهێناوە، دەزانێ چۆن دەست و پەنجە لەگەڵ هەنوکەدا نەرمبکات و چۆن خۆی ئامادە بکات بۆ ڕووبەڕوبونەوەی ڕوداوەکانی ئاینده. لێرەوە بۆ میر هیچ شتێك لەوە مەترسیدارتر نیە کە نمونەکانی مێژوو لەبەرچاو نەگرێت. مێژوو، کلیلی سیاسەتە، مەکیاڤیلی دەڵێت:

ئەگەر لەبری ئەوەی دەمەوێت لە بارەی میرنشین و میرەکان و ئەو دەوڵەتانەی کە بە تەواوی تازەن بیڵێم، دەستبکەم بە گواستنەوەی نمونەی ﴿پیاوە﴾ مەزن و دیارەکان، ئەوا نابێ بەلای هیچ کەسەوە سەیر بێت. چونکە بە شێوەیەکی گشتی ڕەگەزی مرۆڤ ئامادەیە پێبخاتە جێی پێی کەسانی دی و لاساییان بکاتەوە.. پیاوی عەقڵانی دەبێ هەمیشە بە ڕێگەی ئەو کەسایەتیە ناودارانەدا بڕوات کە کردارەکانیان شایستەی لاسایکردنەوەن. لێرەوە ئەگەر پیاوێکی عەقڵانی نەیتوانی شان لە شانیان بدات، ئەوا لایەنی کەم دەتوانێ لە هەندێك ڕووەوە وەك ئەوانی لێبێت(٣٧).

بەڵام لە بواری مێژوودا ئەم جۆرە لێکچونانە، سنورداریێتی دیاریکراوی خۆی هەیە. لە زانستی فیزیادا دەکرێ بە پێی ئەم بنەمایە بەڵگە بهێنرێتەوە کە هەمیشە هۆی چونیەك، دەرئەنجامی چونیەکیان هەیە، واتە دەکرێ بە یەقینێکی ڕەهاوە پێشبینی هاتنەدی ڕوداوێك لە ئایندەدا بکرێت: بۆ نمونە خۆرگیران و مانگگیران. بەڵام هەر ئەوەندەی ئەم بنەمایە لە بارەی مرۆڤەوە بەکارهات، لەناکاو ڕاستیبوونی دەکەوێتە بەر گومان. دەکرێ تا ڕادەیەك ڕوداوەکانی داهاتوو پێشبینی بکرێت، بەڵام ناکرێت پێشبینی ئاینده بکرێت. لێرەدا چاوەڕوانیەکانی ئێمە نایەنە دی و ئومێدەکانمان دەبن بە نائومێدی. تەنانەت باشترین هەنگاوی نەخشە بۆ داڕێژراوی ئێمەش، ناتوانن ئەو دەرئەنجامە پێویستەیان هەبێت. چۆن دەکرێ جیاوازی نێوان فیزیاو زانستی سیاسەت، ڕوون بکرێتەوە؟ ئایا دەبێ بنەمای دیتەرمنیزمی گەردوونی،





لە بواری سیاسەتدا وەلاوە بنرێ؟ ئایا دەبێ بگوترێ کە لە بواری سیاسەتدا، شتەکان قابیلی حسابکردن نین؟ و بە پێچەوانەی جیهانی فیزیاییەوە، جەبر بەسەر ڕوداوە سیاسیەکاندا باڵادەست نیەو لە جیهانی مرۆیی و کۆمەڵایەتیدا، بەختی پەتی حوکم دەکات؟

ئەم مەسەلەیە یەکێك لە کێشە گەورەکان بوو کە تیۆرەی سیاسی مەکیاڤیلی دەبوو چارەسەریبکات. لەمڕووەوە مەکیاڤیلی ئەزمونی سیاسی خۆی، لە ناکۆکیەکی ئاشکرادا دەبینیەوە لەگەڵ بنەما زانستیە گشتیەکانی خۆیدا. ئەزموون مەکیاڤیلی فێرکردبوو کە تەنانەت باشترین پەندی سیاسی، ناتوانێ کاریگەری لەسەر ڕوداوەکان هەبێت.

ڕوداوە سیاسیەکان ڕێگەی خۆیان دەگرنە بەر و هەموو ئارەزوو و مەبەستەکانی ئێمە، پوچەڵ دەکەنەوە. تەنانەت نەخشە زۆر زیرەك و لێهاتووەکانیش، لەبەردەم ئەگەری شکستدان، ڕەوتی ڕوداوەکان دەتوانێت بە شێوەیەکی کتوپڕو چاوەڕوان نەکراو، ئەو نەخشانە تێکبشکێنێ. پێدەچێ ئەم نادڵنیاییە لە کاروباری مرۆڤدا، کاری بونیادنانی زانستێکی سیاسەت نامومکین بکات. لێرەدا لە جیهانێکی ناپایەدار، ڕێك نەخراو و بێ ڕێسادا دەژین کە لەدژی هەموو هەوڵەکانی ئێمە بۆ حسابکردن و پێشبینی کردن، یاخی دەبێت.

مەکیاڤیلی ئەم ئەنتی نۆمیە (antinomy)ی بە ڕوونی دەبینی، بەڵام نەیدەتوانی چارەسەریبکات و تەنانەت نەیدەتوانی بە شێوەیەکی زانستی دەری ببڕێ. شێوازە لۆژیکی و عەقلانیەکەی لەم خاڵەدا ڕادەوەستا. مەکیاڤیلی ناچار بوو قبوڵیبکات کە عەقڵ فەرمانڕەوای کاروباری مرۆڤ نیەو لەبەرئەوەش ناکرێ وەسفی شتەکان بە تەواوی لە قاڵبی زاراوە عەقلانیەکاندا بکرێ. لێرەوە دەبێ بۆ وەسفکردنی ئەو شتانە پەنا بۆ هێزێکی تر ببرێ، هێزێکی نیمچە ئەفسانەیی. پێدەچێ "بەخت" فەرمانڕەوای کاروباری مرۆیی بێت و بەخت لە هەموو شتێك هەوەسبازترە. هەر هەوڵێك بۆ کورتکردنەوەی بۆ کۆمەڵێ ڕێسای دیاریکراو، مەحکوم بە شکستە. ئەگەر بەخت لە ژیانی سیاسیدا ڕەگەزێکی پێویست بێت، کەوابوو بێهودەیە بە تەمای بیناکردنی زانستی سیاسەت بین. قسەکردن لە "زانستی بەخت" ناکۆکی نێوان بابەت و مەحمولە.







ئا لێرەدا تیۆرەکەی مەکیاڤیلی بە خاڵێکی قەیراناوی گەیشتبوو. مەکیاڤیلی نەیدەتوانی ئەم کەموکوڕیە ئاشکرایە لە بیرکردنەوەی عەقلانیدا قبوڵبکات. زیهنی مەکیاڤیلی نەك هەر زیهنێکی ڕوون، بەڵکو زیهنێکی پڕ مایەو بەهێزیش بوو. ئەگەر بەخت دەوری ڕابەری لە کاروباری مرۆییدا دەبینێ، کەوابوو لە ئەستۆی بیریاری فەلسەفیە لەم دەورە تێبکات. هەر لەبەر ئەمە مەکیاڤیلی ناچار بوو لە میردا جێگەی فەسڵێکی تازە بکاتەوە، فەسڵێك کە لە سەرسوڕهێنەرترین فەسڵەکانی کتێبەکەیە. بەخت چیەو چ مانایەکی هەیە؟ بەخت چ پەیوەندیەکی بە هێزە مرۆییەکان و عەقڵ و ئیرادەی مرۆڤەوە هەیە؟

مەکیاڤیلی بە هیچ شێوەیەك تاکە بیریارێکی ڕێنسانس نەبوو کە دەست و پەنجەی لەگەڵ ئەم مەسەلەیەدا نەرمەدەکرد، چونکە بۆ بیریارانی ئەو سەردەمە خودی پرسیارەکە ئاشنا بوو. ئەم پرسیارە لە هەموو ڕەهەندەکانی ژیانی کلتوری ڕێنسانسدا، هاتبوە پێشێ. هونەرمەندان و فەیلەسوفان و زانایان بە تامەزرۆییەوە بە دوای دۆزینەوەی وەڵامێکدا دەگەڕان. ئەم بابەتە چەندان جار لە ئەدەبیات و شیعری ڕێنسانسدا، دوبارە دەبۆوە. لە هونەرە ستاتیکیەکاندا، سمبولگەلێکی بێ ئەژمار بۆ "بەخت" دەدۆزینەوە(٣٨). لە پشتی میدالیایەکدا کە سیمای سزار بۆرژیای تیا هەڵکەنرابوو، سومبولێکی وا هەبوو(٣٩)، بەڵام شێوەی مامەڵەکردنی مەکیاڤیلی لەگەڵ ئەم مەسەلەیەدا، جارێکی دی تازەگەری مەکیاڤیلی پیشاندەدات. مەکیاڤیلی بە پێی ئەو ئارەزوەی کە بەسەر زیهنیدا باڵادەست بوو، لە گۆشەی ژیانی کۆمەڵایەتیەوە تەماشای ئەم مەسەلەیە دەکات، نەك لە گۆشەی ژیانی تایبەتیەوە. بەخت دەبێت بە یەکێك لە جەمسەرەکانی فەلسەفەی مێژووی مەکیاڤیلی. دەسەڵاتی بەختە کە سەردەمێك ئەم و سەردەمێکی دی ئەو نەتەوەیە بەرەو پێشەوە دەبات و دەسەڵاتگرتنی بەسەر دنیادا بۆ مەیسەر دەکات.

مەکیاڤیلی لە پێشەکی کتێبی دوهەمی "تێزەکاندا" دەڵێت کە لە هەموو زەمانەکاندا، جیهان هەر بەم شێوەیە بووەو خراپەو چاکە هەر بەم ڕێژەیە بوونیان هەبووە. بەڵام هەندێکجار چاکەو خراپە بارەگای خۆیان گۆڕیوەو لە ئیمپراتۆریەتێکەوە بۆ ئیمپراتۆریەتێکی تر ڕۆیشتوون. فەزیلەت کە سەردەمێك وا دەزانرا لە ئاشورداجێگیرە، بۆ سەرزەمینی ماد ڕۆیشت و لەوێوە گەیشتە پارس و

دواجار هات بۆ ڕۆم و لەوێ مەنزڵی کرد. لەژێر هەتاودا هیچ شتێك نەگۆڕو جێگیر نەبووەو نابێت. خراپە جێی چاکە دەگرێتەوەو چاکەش جێی خراپە، یەکێکیان هەمیشە هۆیە بۆ ئەوی دیان. بەڵام ئەم قسەیە بە مانای ئەوە نیە، مرۆڤ واز لە تێکۆشان بهێنێت. تەسلیمبوون بە قەزاو قەدەر بۆ ژیانێکی چالاك، کارێکی کوشندەیە. تەنها ژیانێکی شایستەی مرۆڤ، ژیانێکی چالاکە.

ڕێنسانس لە ڕووی ئەندێشەو هەستەوە لەژێر کاریگەری بەهێزی تاڵع بینیدا بوو. جگە لە پیکۆ دلا میراندولا(٤٠). هیچ بیریارێکی ڕێنسانس نەیدەتوانی خۆی لەم کاریگەریە بپارێزێ یان بە سەریدا زاڵبێت. تەنانەت ژیانی کەسایەتیەکی گەورەو مەزنی وەك فیچینۆ(٤١) پڕ لە ترسی خورافی تالعبینی بوو(٤٢) تەنانەت مەکیاڤیلیش نەیتوانی بە تەواوی خۆی لە وێناکانی تاڵع بینی، ڕزگار بکات. مەکیاڤیلیش گونجاو لەگەڵ شێوە بیرکردنەوەی سەردەمەکەی و هاوچەرخەکانیدا، بیری دەکردەوەو قسەیدەکرد. مەکیاڤیلی لە "تێزەکان"دا دەڵێت زۆرجار چ لە مێژووی کلاسیکی و چ لە مێژووی سەردەمی تازەدا، دەبینم کە بەر لەوەی ڕوداوێکی ناخۆش ڕوو بدات، چەند نیشانەگەلێك لە ئاسمان دەرکەوتوە. ﴿وەك دەرکەوتنی ئەستێرەی کلکدار﴾ مەکیاڤیلی دان بە نەزانینی خۆی لە ڕونکردنەوەی ئەم جۆرە ڕوداوانەدا دەنێت، بەڵام نکوڵی لە خودی ڕوداوەکان ناکات(٤٣). بەڵام مەکیاڤیلی تەسلیمی هیچ جۆرە قەدەریەتێك نابێت. پەندی "مرۆڤ ملکەچی سوڕانەوەی ئەستێرەکانی بەختە" لە سەردەمی ڕێنسانسدا زۆر جار دەگوترایەوە(٤٤). بەڵام مەکیاڤیلی ئاراستەیەکی تازەی بەم پەندە بەخشی. بۆ زاڵبوون بەسەر کاریگەری شومی ئەستێرەکاندا، سەرەڕای عەقڵانیەت، سەقامگیری و هێزی ئیرادەش پێویستە. دەسەڵاتی بەخت، مەزن و گەورەیە، بەڵام دەکرێ لە بەرامبەریدا ڕابوەستێ. ئەگەر دەسەڵاتی بەخت وا دەردەکەوێت کە بەرگری لێناکرێت، ئەوا سوچی مرۆڤە کە هێزەکانی خۆی لە دژی بەکارناهێنێت یان ئەوەندە ترسنۆکە کە دژی بەخت چەك هەڵناگرێت. مەکیاڤیلی دەنوسێ:

"دەزانم کەسانێکی زۆر هەبوون و ئێستاش هەن بڕوایانوایە خوداوەند یان بەخت بەسەر مەسەلەکانی ئەم دنیایەدا فەرمانڕەوایە. هەلومەرجی جیهانیش بەو شێوەیەیە کە حیکمەتی مرۆیی هیچ دەسەڵاتێکی بەسەر کاروبارەکانیدا نیەو لێرەوە







بەو دەرئەنجامە دەگەن کەوا باشترە لە بارەی کاروباری جیهانەوە هیچ زەحمەتێك نەکێشین، بەڵکو لە حاڵەتی سروشتی خۆیاندا وازیان لێبهێنین.. لە ڕاستیدا منیش هەرکاتێك کاروباری جیهان بە شێوەیەکی جدی تاوتوێ دەکەم، بە گشتی هەر بە هەمان دەرئەنجام دەگەم. بەڵام ڕەنگە ئیرادەی ئازاد بە شێوەیەکی ڕەها لە ئێمە نەستێنرابێت. پێدەچێ بەخت تەنها نیوەی کارەکانی ئێمەی لەژێر دەستدا بێت و نیوەکەی تری تا ڕادەیەکی زۆر بۆ تەکبیری خودی ئێمە بەجێهێشتبێ.

دەکرێ بەخت بە ڕوبارێکی بە تەوژم بشوبهێنرێ کە لە کاتی لافاودا لە بەنداوەکانی خۆی تێدەپەڕێنێ و هەموو بەرگریەکان تێکدەشکێنێ. بەڵام نابێت لەم هەلومەرجە بتۆقێین و واز لە دروستکردنی بەنداو و جۆگەلە بهێنین. لە وەرزێکدا کە ئاو و هەوا گونجاوەو ڕوبارەکە لافاوی هەڵنەساندوە، دەبێ هەندێك هەنگاو بنرێت و ئەو ئامادەگیە بەدەست بهێنرێ کە هەرکاتێك ڕوبارەکە دوبارە لافاوی هەڵساندەوە، ئەگەر نەکرێت بە تەواوی ڕێگە لە ئاوەکە بگیرێت، لایەنی کەم بتوانرێ بۆ هەندێك جوگەلەی تر ڕەوانە بکرێت و لافاوی ئاوەکە تا ڕادەیەك کەمبکرێتەوە(٤٥).

ئەم ڕێگەچارەیە بە زمانی ئیستیعاری، شیعری یان ئەفسانەیی دەربڕاوە. بەڵام لەژێر پەردەی ئەم دەربڕینە ئەفسانەییەوە، ئەو ئاراستە زیهنیە دەدۆزینەوە کە فۆرمەلەی زیهنی مەکیاڤیلی کردوەو زیهنی تێرکردوە. چونکە ئەوەی مەکیاڤیلی لێرەدا دەیڵێت هیچ نیە جگە لە بەدنیاییکردنی (Secularizaiton) سمبولی بەخت. بەخت تەنانەت لە ئەدەبیاتی سەدەکانی ناوەڕاستدا، سمبولێکی ئاشنا بوو. بەڵام مەکیاڤیلی گۆڕانێکی مانای تایبەتی پێبەخشیوە. دەربڕینێکی کلاسیکی ئەو دەورەی بەخت لە سیستەمی بیرکردنەوەی سەدەکانی ناوەڕاستدا بینیوێتی، دەکرێ لە پارچەیەکی بەناوبانگی کتێبەکەی دانتێدا، واتە لە کتێبی دۆزەخدا، بدۆزینەوە. لەوێدا ڤێرژیل خەسڵەتی هەقیقی و دەوری بەخت، فێری دانتێ دەکات. ڤێرژیل ڕونی دەکاتەوە کە خەڵکی ڕاهاتوون بە شێوەیەك باسی بەخت بکەن، وەك ئەوەی بوونێکی سەربەخۆی هەبێت. بەڵام ئەم جۆرە وێنایە بۆ بەخت، تەنها دەرئەنجامی کوێربوونی مرۆڤە. هەرچی بەخت ئەنجامیدەدات نەك بەناوی خۆیەوە، بەڵکو بە ناوی هێزێکی بالاترەوە ئەنجامی دەدات. خەڵکی تا ئەو شوێنەی بەخت یاریان دەبێت، ستایشی دەکەن. بەڵام هەرکە بەهۆی بەختەوە زیانی پێبگات، دەست دەکەن

بە سەرزەنشتکردنی. هەردوو کارەکە ئەحمەقانەیە. بەخت نە دەکرێ سەرزەنشت بکرێ و نە دەکرێ ستایشبکرێ. چونکە بەخت خۆی دەسەڵاتی نیە، بەڵکو هۆکە بنەمایەکی باڵاترە. ئەگەر کار بکات ئەوا بە پێی ئیرادەی خوداوەندە کە ئەرکێکی لەو چەشنەی لە ژیانی مرۆڤدا، خستۆتە ئەستۆی. لێرەوە بەخت پلەیەکی باڵاتری هەیە لەوەی خەڵکی هەڵیدەسەنگێنن. بەخت لە سەرزەنشت و ستایشکردن، پارێزراوە(٤٦). لە وەسفەکەی مەکیاڤیلیدا ئەم ڕەگەزە مەسیحیە ون بوە. مەکیاڤیلی دەگەڕێتەوە بۆ وێنای یۆنان و ڕۆم بۆ بەخت. واتە دەگەڕێتەوە بۆ وێنا کافرانەکەی. مەکیاڤیلی ڕەگەزێکی بیرکردنەوەو هەست دەهێنێتە باسی باسکردنی بەختەوە کە بە تەواوی تازەیە. ئەو وێنایە ڕاستە کە بەخت فەرمانڕەوای کاروباری جیهانە، بەڵام تەنها نیوەی ڕاستیە. مرۆڤ ملکەچی بەخت نیەو کۆیلەی ڕەشەباو لافاوەکان نیە. مرۆڤ دەبێ خۆی ڕێگەی خۆی هەڵبژێرێ و لە دوتوێیدا بەرەو پێشەوە بچێت. ئەگەر مرۆڤ کەمتەرخەمی لە جێبەجێکردنی ئەرکەکانیدا بکات، بەخت لاواز و سوکی دەکات و بەجێی دەهێڵێ.

مەکیاڤیلی لە فەسڵی بیست و پێنجی میردا، ڕێساگەلێکی تاکتیکی بۆ ململانێکردن لەگەڵ بەختدا، ڕوون دەکاتەوە. ئەم ڕێسایانە زۆر ئاڵۆزن و بەکارهێنانیان بە شێوەیەکی دروست ئاسان نیە. چونکە ئەم ڕێسایانە دوو ڕەگەزی ناکۆك لەخۆ دەگرن. ئەو مرۆڤەی دەیەوێت لەم ململانێیەدا لەسەر پێی خۆی ڕاوەستێت، دەبێ لە سروشتی خۆیدا دوو سیفەتی ناکۆکی پێکەوە هەبێت. ئەو دەبێت هەم ترسنۆك و هەم ئازا، هەم وریا و هەم هەڵەشە بێت. تەنها بە پێکهاتەیەکی وا ناکۆکەوە، دەکرێ هیوامان بە سەرکەوتن لەم ململانێیەدا هەبێت. شێوازێکی یەکسان نیە بۆ ئەوەی بکرێ لە هەموو کاتێکدا، بەکاربهێنرێ. لە یەك ساتدا دەبێ هەم وریا بین و هەم هەڵەشە. دەبێ وەك پرۆتۆس(٤٧) بین و هەر ساتەو شکڵێکمان هەبێت. ئەم ئامادەییە لە نێوان خەڵکیدا زۆر دەگمەنە.

هیچ کەسێك چەند داناش بێت، ناتوانێ خۆی لەگەڵ هەموو گۆڕانەکاندا بگونجێنێ. چونکە مرۆڤ نازانێت چۆن بە پێچەوانەی شتێکەوە کە ڕەنگە بە سروشت ئارەزویەکی زۆری بۆ ئەنجامدانی هەبێ، ڕەفتار بکات. مرۆڤێکی دیش ناتوانێ خۆی بۆ وازهێنان لە کارێك هانبدات کە هەمیشە تیایدا سەرکەوتوو بوە. لەبەرئەوە







هەرکاتێك پێویست بێت مرۆڤێکی وریاو هێمن، گورجی و حاسم بوون لە خۆی پیشانبدات، نازانێت چۆن ئەم دەورە ببینێ و بە گشتی دەست لەسەر ئەژنۆ دادەنیشێ و هیچ کارێك ناکات. بەڵام گەر ئەو بیتوانیایە بە پێی هەلومەرج ڕەفتاری خۆی بگۆڕێت، ئیدی هۆیەك نەدەبوو بۆ ئەوەی گلەیی لە بەخت بکات کە بۆچی وازی لێهێناوە(٤٨).

ئەو کەسەی دژی بەخت دێتە مەیدانەوە، دەبێت دوو شێوەی جەنگ کردن بزانێت: هەم شێوەی جەنگی بەرگریکارانە و هەم شێوەی جەنگی هێرشبەرانە. ئەو دەبێت بە شێوەیەکی کتوپڕو چاوەڕوان نەکراو، لەم شێوە جەنگەوە بۆ ئەوی دیان بڕوات. مەکیاڤیلی خۆی زۆرتر لایەنگری جەنگی هێرشبەرانە بوو. ئەو دەڵێت: "باشترە مرۆڤ ئازابێت تا ترسنۆك. چونکە بەخت وەك ژنێکە. ئەو کەسانەی دەیانەوێت دەستی بەسەردا بگرن، دەبێ وەك جەنگاوەرێك بەرەو ڕووی ببنەوەو تەنگی پێهەڵچنن(٤٩).

ئەم مەکیاڤیلیەی کە تیۆرەی بەخت پێشکەشدەکات، دەڵێی ئەو کەسە نیە کە فەسڵی پێشووی نوسیوە. ئەوەی لە تیۆرەی بەختدا دەیدۆزینەوە شێوازی لۆژیکی و ڕوونی مەکیاڤیلی نیە، بەڵکو شێوازێکی خەیاڵاوی و هەژێنەرە. بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا تیۆرەی بەخت، بێ گرنگی فەلسەفی نیە. ئەم تیۆرەیە جۆرێك لادان نیە لە بابەتەکانی تری میر، بەڵکو پەیوەندی بە سەرجەم بەرهەمەکەوە هەیە. مەکیاڤیلی هەوڵدەدات خوێنەرانی کتێبەکەی قەناعەت پێبکات کە لە ململانێکردن لەگەڵ بەختدا، ئەوە بەس نیە کە تەنها پەنا بۆ چەمکە مادیەکان ببرێ. بێگومان مەکیاڤیلی گرنگیەکی کەمی بەم چەکانە نەدەدا، مەکیاڤیلی لە سەرتاسەری کتێبەکەی خۆیدا ئامۆژگاری میر دەکات لە هونەری جەنگ غافڵ نەبێت. میرێك دەبێت هەموو بیرکردنەوەو سەرنجی خۆی ئاراستەی هونەری جەنگ بکات(٥٠). ئەگەر جبەخانەکەی لە هەلومەرجێکی باشدا بێت، پێویست ناکات نیگەرانی هەڵسەنگاندنی جیهان بێت بۆ خۆی. میر هەمیشە دەبێ بە پێی ئەم بنەمایە کاربکات: گرنگ نیە کە نەفرەت بکەن، بەڵکو گرنگ ئەوەیە کە بترسن(٥١). ئەگەر جبەخانەی میر پڕبێت و هاوپەیمانی باشیشی هەبێت، ئەوا دەرەقەتی هەموو مەترسیەکان دێت. دەبێ لەوەش دڵنیا بێت کە تا ئەوکاتەی بەرقی سەرنێزەکەی،

حورمەتی لە دڵی خەڵکیدا بۆ دروستدەکات، ئەوا هاوپەیمانی باشیش دەبێت(٥٢).
لێرەدا مەکیاڤیلی وەك لایەنگری میلیتاریزم قسەدەکات و تەنانەت دەکرێ لە قسەکانیدا، یەکەم بەرگریکەری فەلسەفی میلیتاریزمی سەرسەخت و حاسم، بدۆزرێتەوە. مەکیاڤیلی وتارێکی تایبەتی لە بارەی هونەری جەنگەوە نوسی کە تیایدا زۆر لە وردەکاریە تەکنیکیەکانی جەنگ تاوتوێ دەکات، وەك ئەو مەترسیانەی کە بەکارهێنانی بەکرێگیراوان دروستی دەکات و پێویستی خزمەتی سەربازی بۆ هەموان و هەروەها گرنگی زیاتری پیادە بەسەر سوارەو تۆپخانەدا. بەڵام هەموو ئەم بابەتانە تەنها لە ڕووی ئاگاداربوون لە ژیانی مەکیاڤیلی، سەرنجڕاکێشەرن، بەڵام نرخێکی سەربازی و زانستیان نیە. مەکیاڤیلی لە وتارەکەی خۆیدا بەناوی تەکنیکی جەنگەوە تەنها توانی وەك ئاماتۆر ﴾هاوی﴿ێکی سادە قسەبکات. ئەزموونی لەم بوارەدا کەم و بە پێی پێویست نەبوو. پیاوێك کە تەنها چەند ساڵ فەرماندەی نیمچە سەربازیەکانی شاری فلۆرانس بوو، لە ئاستێکدا نیە کە بتوانێ وەك کارشناسی جەنگ قسەبکات و بیروڕا دەربڕێ. دەبێ بگوترێ کە وتاری تەکنیکی جەنگ بە بەراوردکردن بە کۆی بەرهەمەکانی، شتێکی ئەوتۆ نیە.

بەڵام لە بەرهەمەکانی مەکیاڤیلیدا شتێکی دی هەبوو کە زۆر گرنگتڕە لە هەموو ئەمانە. مەکیاڤیلی جۆرێك ستڕاتیژی تازەی کەشف کردبوو کە پشت ئەستورە بە چەکە زیهنیەکان، نەك ئامێرە فیزیکیەکان. هیچ نوسەرێك بەر لە مەکیاڤیلی دەستی بۆ فێرکردنی ئەم ستڕاتیژیە نەبردبوو. ئەم ستڕاتیژە لە دوو ڕەگەز پێکهاتبوو. ڕەگەزێکیان بەرهەمی زیهنێکی لۆژیکی، هێمن و ڕوون بوو، وە ڕەگەزەکەی دی دەستکەوتی پیاوێك بوو کە هەم ئەزمونێکی تایبەتی زۆری لە کاروباری دەوڵەتدا بەدەستهێنابوو و هەم ناسینێکی قوڵی بۆ سروشتی مرۆڤ هەبوو.





پەراوێزەکان:

١) Grotius
٢) Pufendorf
٣) Alfireri,deiprincipe edelle Iettere, Cap. VIII.
٤) L A.Burd notes in his edition of PRINCIPE,P... ٢٦٦.
٥) Discourses.Bk.II.chap.XXIIL
٦) Idem,BkII,chap.xv;bk.I,chap.XXXVIIL.
٧) Iden,Bk I.chap.XXXVIL.
٨) Iden, Bk I.chap.LVIIL.
٩) Iden, Bk I, chaps, IV,V.
١٠) Iden, Bk l,chap, LV.
١١) Iden, Bk I, chap. LV.
١٢) The prince, chap. VII (VI in Farneworth trans.is a misprint), cf, chap.XIIL farnewortransp. ٢٤٧,cf. p.٣٠٤.
١٣) Discourses, Bk I,chap. LVIII.
١٤) Iden, Bk I, chap. IX.
١٥) Iden, Bk I,chap. XLIV.
١٦) Coladi Rienzi.
١٧) Iden, Bk I, chap. LV.
١٨) Iden, Bk II, preface. thomson trans, p. ٩١.
١٩) Iden, Bk I, chap. XXVL.
٢٠) Mandragola
٢١) Iden, Bk I, chap. Ill
٢٢) The prince,chap. XIL.
٢٣) Savonarola.





Iden, chap.VL(٢٤

.١١,٣٤٠Iden, chap.XVIII,op. cit, (٢٥

Discoureses, Bk Ill chaps. IV,XXX.cf The (٢٦
.prince.chap.III

.The prince, chap.XV(٢٧

AIlan H. Gilbert. Machiavellis ‘prince’ and (٢٨
ltsForenunners. ‘The prince’ as a Typical Book’ de Reginine
(١٩٣٨principum’ (Duke University press,

.٣Thomson trank.p. (٢٩

.Gatarina de Medici(٣٠

.Richelieu(٣١

.Burt(٣٢

.f ٢٠٠The prince,chaplll,op, cit,,ll,(٣٣

Kant, Fundamental Princcipales of the Metaphysics of (٣٤
Morals. English trans. by T.K Abbort,Kants Critique of
th ed. New ٦reason and other Works an the Theory of Ethics (
.٢ ٣) p.١٩٢٧York and London, Longmans, Green and Co,

.B ٥٣٣plato, Republic, (٣٥

.Hippolyte Taime(٣٦

.f ١١,٢٢٣The Prince, VI,op.cit, (٣٧

٣٨-بۆ ئاگاداری زیاتر بگەڕێوە بۆ فەسڵی سێهەمی ئەم کتێبەی نوسەر:
E.Cassirer, Individnum und Kosmos in der Philosophie
der Renaissance ,‘Studien der Bibliothek Warburg’
.١٢٩-٧٧) X٩٢٧ ١(Leipzing B G. Teubner,

٣٩-دەکرێ وێنەی ئەم میدالیایە لەم کتێبەی خوارەوەدا بدۆزرێتەوە:
D.P.Ersking Muir, Machiavelli and His Times(New York,
.٥٠ ١). ١٩٣٦E. P. Dutton and Co.

.pico della Mianadola(٤٠





.Ficino(٤١

ff. and journal for the History of ١٠٥Cassirer,op,cit,pp.(٤٢
٣and ٢ideas.III, Nos,
.٣٤٦_٣١٩and ١٤٤-١٣٣،(١٩٤٢)

لە بارەی حەزی ڤیچینۆ بۆ تاڵعبینی، بگەڕێوە بۆ:
Paul Oskar Kristelle, The Philosophy of marsilio Ficino
.٣٤٦_٣١٠) pp,١٩٤٢(New York, Columbia Universiy press,

.Discourses, Bk l,chap. LVI(٤٣

Jacoob Burckhart, Die Kulnir Der Renaisance in (٤٤
ltahien. English trans by S.G.C. middiemore (New York,
.٢٦٩) p.١٩٣٧Oxford University press,

.ff٤١١The Prince, chap XXV,op, cit,II,(٤٥

.ff ٦٧Dantelnfemo,VII,(٤٦

.Proteus(٤٧

.٤١٤The Prince, chap, XXV op, cit,II,(٤٨

.٦ ٤١Iden,op,cit,II,(٤٩

.Hdem, chap,XVL(٥٠

Hdem,chap.XVII(٥١

"باشترە لە میر بترسن یان خۆشیان بوێت؟ ئەگەر لە نێوان ئەم دوانەدا ناچاربین یەکێك هەڵبژێرین، ئەوا دەبێ بڵێین کە باشترە لە میر بترسن"

.Iden, chap, XL(٥٢

تێبینی: ئەم نوسینە وەرگێڕانی فەسڵی دوانزەهەمی ئەم کتێبەی خوارەوەیە:

اسگورە دولت. ارنست کاسیرر. ت: یدالە موقن- تهران، هرمس ١٣٧٧.





## مۆدێرنە

## زیگمان باومان

### مۆدێرنە چییە؟

وشەی مۆدێرن لە سەدەی حەڤدەهەمدا هاتە ناو وتوێژی ڕۆشنبیرانی ڕۆژئاوای ئەورووپاوە (گەرچی لەسەدەی پانزەهەم بەدواوە بەشێوەی پەرشوبڵاو بەکارهێنراوە و سودی لێوەرگیراوە) لایەنی بەرجەستە و ئاشکرای ماناکەی شتێکی هاواتای "باو"، هەبوو یان (شتێکی خاوەن خاڵی دەرچوون یان سەرچاوەی کۆتای و هاوچەرخ) بوو. بەڵام زەمینەی دەرکەوتن و بەناوبانگبوون و بایەخی ڕوو لە زیادبوونی ئەم وشەیە ، ئەوە ئاشکرادەکات کە مانایەکی فراوانتر و قوڵتری لەمانا تەکنیکیەکەی هەیە. چۆنایەتیەك یان حاڵەتێك کە دەلالەت لە"هەبوونی خاڵی دەرچوونی هاوچەرخبوون" و "تازە خەڵقبوون" کە لەناکاو وەك بابەتێکی جێی سەرنجی لێهاتبوو، و بەروکەش گرنگ و بایەخێکی هەمەلایەنە و نایابی پەیداکردبوو. ئەم گرنگی و بایەخە لەو بەها ڕوو لە گۆڕانانەوە سەرچاوەیدەگرت کە هەنوکە بەپێچەوانەی سەدەکانی پێشووەوە، پشتگیری لە وتەزای"نوێ" و "تازە" لەبەرامبەر "کۆن" و "دێرین"دا دەکرد، نکوڵی لەهەرجۆرە دەسەڵات و بایەخێك بۆ ڕابردوو دەکرد، هیچ حورمەت و ڕێزێکی بۆ نەریت و ڕابردوو دانەدەنا، و پشتگیری لە ئارەزوو و ئامادەیی بۆ داهێنان و نوێکردنەوە و "ڕۆیشتن بەرەو ئەو شوێنانەدەکرد کە پێشتر کەس تەنانەت لە خەیاڵیشدا جورئەتی پێ تێنانی نەبوو". ئایدیای مۆدێرن ڕێك لەساتەوەختی هاتنی سەرکەوتوانە و شکۆمەندانەی خۆیەوە بۆ بواری گوتاری گشتی، کەوتە لەقاڵبدانی سەرلەنوێ و هێنانە ئارا و دوبارە نوسینەوەی دیاردەی "کۆن" وەك ڕوداوێکی بەجێهێڵراو و سڕاوەو بێکەڵك و پەککەوتە. ڕوداوێك کە بەڕاستی لەسەر لێواری لەبیرکردن و فەرامۆشی ڕاوەستاوە و دەبوو جێگەی خۆی بە دیاردەیەکی تازە و نوێبدات. ئایدیای مۆدێرن لەسەدەی حەڤدەهەمدا وەك







چەمکێکی پڕ لەحەماسەت و ئاکۆك، وەك ناوکی ململانێ و ڕکەبەرایەتی لەڕوداوی بەناوبانگی "خەبات و ململانێی دێرینەکان و مۆدێرنەکان" کە بەگشتی ماوەی سەدەیەك لەفەرەنسا و ئینگلتەرادا درێژەیکێشا، سەریدەرهێنا. هونەر و ئەدەبیات وەك یەکەم بواری ململانێی و مەیدانی ڕکەبەرایەتی دێرینەکان و مۆدێرنەکانی لێهات؛ دوا بەدوای دەستکەوتە بەرچاوەکانی زانایانی وەك نیوتن و دیکارت و ئامادەبوونی ئەنجومەنی سەڵتەنەتی لە ئینگلتەرا و ناوەندە فکریە کاریگەرەکان، بەڵام تارادەیەك پەرشوبڵاو لە فەرەنسادا، کە ئازایانە هیمەتیان بۆ پێشخستن و پەرەسەندنی باڵادەستی چاوەڕوانەنکراوی زانست و فەلسەفەکرد، دەبوو درەنگ یان زوو ئەم پرسیارە بێتە پێشەوە کە ئایا ئەم جوڵەو بازدانە بەرەو پێشەوە تەنها بەرهەمی هەوڵەکانی زانستبووە، یان کۆی بوارەکانی دی چالاکی مرۆیی بەشداریان تیاکردووە؟ بەتایبەتی داهێنانەکانی وەك وێنەکێشی و هۆنراوە. نەریتخوازان (وەك نیکۆلاس بۆلیئاو N. Boileau و ژتن دۆلافونتن لە فەرەنسا، سێر ویلیام تەمپڵ و جۆناتان سوئیفت لە ئینگلتەرا) بەرگریان لەو بڕوا دێرینە دەکرد کە دەکرێ لوتکەی دەستکەوتەکانی مرۆڤ لە یۆنان و ڕۆمی دێریندا بدۆزرێتەوە، و هەرچی دەستکەوت و کاڵا و بەرهەمە بەناچار دزێو و سوکەکانی نەوەکانی دوایشە، نەیدەتوانی جگە لەخەباتێکی بێهودە و بێبەرهەم بۆ نزیکبونەوە لە قۆناغی کەماڵ و پێگەیشتووی خۆی، هەوڵ یان هەنگاوێکی دی بنێت.

پێشتر ئەمجۆرە گریمانەیە بەشێوەیەکی ئاسایی وڕێکخراو پێشکەشدەکران و تاڕادەیەك بە ڕاستگۆ و هەقیقی دەزانران و هیچ جۆرە نەیارێتی یان ڕەخنەیەکیشی لێنەدەگیرا. بەڵام هەنوکە بە ئیلهاموەرگرتن لە دۆزینەوە سەرسوڕهێنەرەکانی زانستی تازە، دیدە ناکۆکەکان بڵاوبونەتەوە و پەرەیانسەندووە و ناوبانگ و بایەخیانوەرگرتووە. لەڕاستیدا بڕواداران و پارێزەرانی دیدە کلاسیکیەکان بە پەرەسەندی دێرینەکان - چەمکێك کە لەدیدی مۆدێرنەکانەوە هەمیشە هاوکاتی سوکایەتپێکردن و ئیهانەکردن و گاڵتەجاڕی بوو- دەژمێرران. شارل پرۆ و برنانەدۆ فۆنتێنلێ بە کەسانێك لەسەرسەخترین و پڕئاژاوەترین پارێزەرانی مۆدێرنە دەژمێرران کە دیدی و تێڕوانینی ئازایانەیان دەخستە ڕوو، ئەوەی متمانە ودڵنیای پێدەبەخشین بریتیبوو لە: یەکەم ئەو بڕوایەی کە لەبواری زانست و هەموو

بوارەکانی داهێنانی مەعنەویدا، نوێ چەندانجار لە کۆن (هەقیقیتر، بەسودتر، راستر و جوانترە)، دوهەم ئەوەی توانست، هێزی داهێنان و کارکردنی عەقڵ و لێزانی مرۆڤ بێکۆتاییە و دواجار ئەوەی کە مێژووی مرۆڤ، هەمیشە هەنگاوی رانەوەستاوە بەرەو سەرەوە و پێشەوە.

ململانێ لەنێوان مۆدێرنەکان و نەریتخوازاندا هەرگیز بەشێوەیەکی بڕاوە و بەشێوەیەك کە جێی ڕەزامەندی هەموو لایەك بێت نەخرا بەلایەکدا (سەدەیەك دوای ئەوە بزوتنەوەی رۆمانتیك بووە هۆی زیندوبوونەوەی بیروبۆچوون و بڕواگەلێك کە مۆدێرنەکان هەوڵیاندابوو بۆ یەکجار و بۆ هەمیشە رایبگرن). بەڵام ململانێی ناوبراو تەنها هەوڵێکی قوربانیکەرانە بوو، چونکە نوکی فەلسەفی مەسەلەکە لەئەنجامی هەنگاوە خێرا و پەلەکانی گۆرانکاری کلتوریەوە، خاوبوو بۆوە. دەکرێ ململانێی ناوبراو وەك دەربڕین یان تەعبیرێکی کورتی شۆڕشێك بزانرێت کە خەریکبوو لە زیهنیەتی ئەورووپیدا روویدەدا، دەربڕینێك بۆ هەستێکی نوێ و تێڕوانینێکی تازە بۆ دڵنیابوون و پشتبەستن بە خود، ئارەزو و ئامادەیی بۆ گەڕان و ئەزمونکردنی رێگەچارەی نافەرمی بۆ کێشەکان و نیگەرانیە هەبووەکان، بڕوابوون بەمەیلی روو لەزیادبوون بەرەو مێژووی مرۆڤ، ودڵنیایی روو لەزیاد بە توانای عەقڵی مرۆڤ. لەسەدەی نۆزدەهەمدا زیهنیەتی تازە دەرکەوتوو وەك دیاردەیەکی مۆدێرن وەسفدەکرا، و باڵادەستی ئەم زیهنیەتە بەیەکێك لەدەرئەنجام و نیشانە بڕاوە و دیاریکەرەکانی قۆناغی تازەی مۆدێرنە دەژمێررا.

دەکرێ مۆدێرنە بە باشترین شێوە بە سەردەمێك وەسفبکرێ کە خەسڵەتی سەرەکی بریتیە لە گۆڕانی هەمیشەیی - بەڵام سەردەمێك کە هوشیارە بەم خەسڵەتەی خۆی، سەردەمێك کە شێوە یاساییەکانی خۆی، داهێنانە مادی و مەعنەویەکانی خۆی، زانست و بڕواکانی خۆی بە روداوێکی دینامیکی و تێپەڕو گۆڕاو و ناسەقامگیر و نەبڕاوە دادەنێت، روداوگەلێك کە دەبێت تا "ئاگاداری دوایی" بڕوایان پێبهێنرێ و کاریان پێبکرێ، روداوگەلێك کە دواجار بایەخ وبەهای خۆیان لەدەستدەدەن و جێگەی خۆیان بە روداوی تازە و باشتر دەسپێرن. بەدەربڕینیکی تر مۆدێرنە سەردەم یان قۆناغێکە و هوشیارە بە مێژوویی بوونی خۆی. دەزگا مرۆییەکان بە روداوگەلێکی دروستکراو و خۆ خولقێنەر و ملکەچی پێشکەوتن و





باشتربوون دادەنرێن، تەنها لەحاڵەتێکدا دەکرێت پارێزگاریان لێبکرێت کە بتوانرێت خۆیان لەگەڵ روبەروبونەوەی خواستە ورد و سەختگیرەکانی عەقڵدا بگونجێنن و ئاراستەبکەن. ئەگەر توانای ئەم ئەزمونەشیان نەبێت، دەکرێت بخرێنەلاوە. دەکرێت جێگرتنەوەی پرۆژە تازەکان لەبری پرۆژە کۆنەکان، بە بزاوتێکی پێشکەوتوخوازانە بزانرێت، هەنگاوێکی تازە بەرەو فراوانبوون و زیادبوونی رەوتی پەرەسەندن و گەشەکردنی مرۆڤ.

پێشکەوتن لەبنەرەتدا هەنگاوێکی مرۆڤانەیە. پێشکەوتن هەڵگری بەکارهێنانی عەقڵی مرۆڤە لەبواری ئەرك یان پەیامی دروستکردنی دنیایەکی باشتر کە لەگەڵ پێداویستیە مرۆییەکاندا گونجاو بێت. هەموو ئەو شتانەی بە پێداویستی مرۆڤ دەستنیشان دەکرێن، یان بە هەلومەرج و بارودۆخی گونجاو لەگەڵ ژیانیدا دادەنرێن، لەپێش هەموو سەرنجەکانی دیەوەن: بەشی نامرۆیی جیهان (واتە سروشت) بەتەنیا هیچ چەمك و مانایەکی نیە، هەر مانا یان چەمکێکی کە بۆی دیاریبکرێت یان پێیبدرێت، تەنها بەهۆ و لەرووی ئەو سودوەرگرتنە مرۆییەوەیە کە لێی وەردەگیرێت. نەخشەکێشان و دروستکردنی رێکخستنێکی دروستکراو و عەقڵانی لەبارەی نیشتەجێگاو بوونی مرۆڤەوە هەڵبژاردنێکی ئیرادی نین، بەڵکو پێویستیەکە، هەلومەرجێکی ناچاری مرۆییە. چونکە جیهان بۆئەوەی جێگەیەکی قابیلی نیشتەجێبوون بێت، دەبێت لەرێگەی تەکنەلۆژیایەکی پشتبەستوو بەزانستەوە بۆ بەدیهێنانی پێداویستیەکانی مرۆڤ ، ئامادە بکرێت. لێرەوە زانست و بابەتەکانی بەکارهێنان و سودوەرگرتنی تەکنەلۆژی لەزانست، بە سەرچاوە و ئامرازە سەرەکیەکانی پێشکەوتنی سیاسی، کۆمەڵایەتی و کلتوری و ئەخلاقی دەژمێرێت. زانست و تەکنەلۆژی و بەکارهێنانەکانیان، هەم بەبەرهەمی زاڵبوونی مرۆڤ بەسەر سروشتدا و هەم بە داینامۆی دەژمێرێن. بۆ ئەورووپای مۆدێرن هوشیاربوون بە مێژوویی بوونی خود، شێوازەکانی ژیان، شێوەکانی ژیان و دەزگاکانی خۆی کە لەگەڵ مێژووییبوون، شێوازی ژیان و شێوەی ژیان و ئەو دەزگایانەی کە لەم دواییانەدا گرتبویە بەر، بەتەواوی جیاواز بوو، تەنها هەنگاوگەلێك بوون کە رێنمای ئەورووپای مۆدێرنی بەرەو هەلومەرج یان بارودۆخێکی بڵندتری تایبەت کرد. کلتورەکانی دی وەك کۆمەڵێك شکڵ تەماشادەکران کە بەشێوەیەکی کاتی لەپرۆسەی گەشەکردن و

پەرەسەندن راوەستاون و لەم هەلومەرجە "وەستاو و بەستوەشدا"، توشی دواكەوتوویی بوون و پرۆسەی گەشەكردن و پەرەسەندنیان دواخراوە و دواكەوتووە. ئەم بڕوایە بووە هۆی ئەوەی ئەوروپای مۆدێرن تایبەتمەندی یان خەسڵەتی بڕوابوون بە خۆی، وەك هەڵگر و كارگوزاری چارەنوسی مێژووی خۆی بدۆزێتەوە: لیژنەیەكی تەبشیری و پڕوپاگەندەی گشتی كە ئەركی بریتیبوو لەراگەیاندن، بڵاوكردنەوەی مژدەی عەقڵ و عەقلانیەت و راكێشانی بەشەكانی تری جیهان بۆ ئیمان و شكڵ و ژیانی ئەوروپایی. لەحاڵەتی دەركەوتنی بەرگیرشدا، كەسانێك كە دەبوو ئەم گۆڕانانەیان بەسەردا بێت، بە روداوی دواكەوتوو، سەرەتایی و قوربانیانی جەهل و خورافە دەژمێران و هەر لەپێشەوە نكوڵی لەتواناى عەقلانیان (بەتایبەتی دەسەڵاتی بڕیاردانیان لەبارەی ئەوەی چ شتێك بۆیان باشە) دەكرا. بەمشێوەیە سەردەمی مۆدێرن لە مێژووی ئەوروپادا (لەو وڵاتانەشدا كە پرۆسەی سەرەتای ئەوروپاییبونیان تەواوكردووە) سەردەمێكی حیزبی و مەسلەكی بوو، سەردەمێك كە خەسڵەتی سەرەكی بریتیبوو لە كۆلۆنیالیكردنی دنیایی نائەوروپی و دووبارەكردنەوەی جەنگە سەڵبی و كلتوریەكان كە ئامانجەكەی رووی لەنەریتە ناوچەیی، ئەتنی، رەگەزیی یان چینایەتی لەناو خودی كۆمەڵگا ئەوروپیەكاندا بوو.

دەوڵەتی مۆدێرن بەرپرسیاری كاركردن وئەركگەلێك بوو كە هەرگیز حوكمڕان و فەرمانڕەوایانی پێشوو بیریان لێ نەكردبۆوە و هەرگیز بە خەیاڵیاندا نەهاتبوو. دەوڵەتی مۆدێرن دەبوو رێكخستنێكی یەكتاو هاوئاهەنگ بۆ سنورگەلێكی بەرفراونو بوارە فراوانەكان جێبەجێبكات كە پێشتر بە هاوكاری شێوە كلتوریە ناوچەییەكانەوە ئەنجامدەدرا. سەرەڕای ئەمە دەوڵەتی مۆدێرن دەبوو داهێنان و پارێزگاری رێكخستنی كۆمەڵایەتی وەك بابەتێكی قابیلی بیرلێكردنەوە بكات، و وەك پرۆژەیەكی هوشیارانە، ورد وچاودێریكراو وبەڕیوبردنی رۆژانەی تەمشایبكات، نەك ئەوەی خۆی بە رەچاوكردن و سەرنجدان لەدابونەریت و ئیمتیازاتە نەریتیەكان، سنوردار بكات. (دەكرێ بگوترێت دەوڵەتی مۆدێرن دەبوو دەوری باخەوانی كۆمەڵگا بگرێتە ئەستۆ نەك پاسەوان) ئەرك و پەیامە تازەكان بریتیبوون لە یەكدەستكردنی یاسا و دەزگا یاساییەكانی لەپەیوەندیدا بەدەوڵەت و حكومەتەوە: هاوئاهانگكردن و بەگشتی بەڕێوەبردنی راستەوخۆی پرۆسەی پەروەردەی گشتی، دابینكردنی ئەوەلیەت و







لەپێشەوە بوونی دیسپلینێكی یاسایی یەكتا بەسەر هەموو شێوەكانی تری پەیمان و وەفاداری لاوەكیدا. هەر لەبەر ئەمەش دەوڵەتە مۆدێرنەكان بەگشتی كە سەرقاڵی پرۆسەی دروستكردنی نەتەوە بوون، شكڵ و قاڵبی دەوڵەتە نەتەوەییەكانی بەخۆیانەوە گرت، نەك شێوەی زنجیرەیی و سەڵتەنەتی. دەوڵەتە مۆدێرنەكان یەكێتی نەتەوەیان لەبەرامبەر جیاكاریە ئەتنیكیەكاندا بەهێزكردووە، ناسیۆنالیزمیان خستۆتە خزمەت دەسەڵاتی دەوڵەتەوە و پەرەسەندن و پێشخستنی بەرژەوەندیە نەتەوایەتیەكانیان، بە پێوەر و ئامانجی سیاسەتەكانی دەوڵەت ئەژماركردووە. هەر لەبەرئەمەشە دەوڵەتی مۆدێرن هەقی دەسەڵاتدارێتی كلاسیكی (وەك دێرینەیی و هەمیشەیی بوونی مافەكان) و دەسەڵاتدارێتی كاریزمی (كە لەسەر بناغەی چونایەتی و خەسڵەتە تایبەتیەكانی كەسایەتیەكی تایبەت و نایابی فەرمانڕەواییەكی دیاركراو ڕاوەستاوە) نەفیكردووە و خوازیاری رێكخستن و دیسپلین و ملكەچی لەو یاسا و فەرمانانەی خۆیەتی كە لەسەر بناغەی زەمینە فەرمی و یاسایی دامەزراون: واتە گەڕانەوە بۆ ئەو راستیەی یاسا و فەرمانەكان لەلایەن كەسانێكی خاوەن توانا و لەلایەن ناوەندەكانی بەڕێوبەرایەتی و پلە و پایەكانەوە دانەنراوە كە خاوەن مافی دەسەڵاتدارێتی و بەڕیوبردنی مەسەلە ناوچەیە دیاریكراوەكانن.

مۆدێرنە بەپێی هەموو پێوەرە مێژوویەكان (كە زۆرجار وەك "شارستانێتی مۆدێرن" ناوی دێت تا بەمشێوەیە جێگەی وەك تایپێكی سەربەخۆ لە رێكخراوە كۆمەڵایەتیی و كلتورییەكان لەناو شارستانیە كلاسیكییەكان، سەدەی ناوەراست و یان هاوچەرخدا دیاربێت)، بە سەركەوتنێكی درەوشاوە دەژمێرێت. مۆدێرنە یان شارستانی مۆدێرن بەر لەهەر شارستانیەتێكی ناسراوی تر، لەجێگەی هەمەكیبوون و گەردونیبوونی واقعی و رەسەن نزیكبۆتەوە. مۆدێرنە خەریكە دەبێت بە یەكەم شارستانیەتی گەردونی لەمێژوودا. دەكرێت دەوڵەتە دنیاییەكانی مۆدێرن لەرووی سیاسی و ئایدۆلۆژیەوە پۆلێنبكرێن و تەنانەت لەهەلومەرجێكی ناكۆكدا بەرامبەر یەك دابنرێن، بەڵام هەر هەموویان كۆدەنگن لەسەر پێشكەوتن و باڵاتربوونی شێوەی مۆدێرنی بەڕێوبردنی مەسەلە مرۆییەكان و سود لە \شێواز و ئامرازە مۆدێرنەكان بۆ سەقامگیری پێگەی خۆیان و بەدواداچوونی ئامانجەكانیان، وەردەگرن. پێدەچێت شێوەی مۆدێرنی ژیان هچ رەقیبێكی جدی لەو شێوانەدا نەدۆزێتەوە كە بۆتە هۆی

جیگۆڕکێ و جێگرتنەوەیان. سەرەڕای ئەمە ژیانی مۆدێرن لەروبەروبونەوە لەگەڵ ئەو کێشانەی روبەروی دەبۆوە، هەروەها لەروبەروبونەوەی مەسەلەکانی "پەرەسەندن"دا، هێندە سەرکەوتووبووە کە بۆتە هۆی بەهێزبوون و سەقامگیری بالآتربوونی جیهانبینی و هەڵوێستی پراگماتیك کە بە خەسڵەتە تایبەتیەکانی مۆدێرنە دەژمێرێن. لێرەوە مۆدێرنە بەشێوەیەکی ئاسایی وەك شکڵی ئایدیالی پرۆسەی پەرەسەندن و گەشەکردن وەسفدەکرێت. شارستانیەتی مۆدێرن کە خۆبەخۆ دینامیکی و چالاکە، بەردەوام شوناسی خۆی پاراستووە. شارستانیەت نوێ دروستکەری داهێنان و خولقاندنی بەردەوامە و بە پێچەوانەی شارستانیەتیەکانی ترەوە، توانا و قابیلیەتی روبەروبونەوەی داهێنەرانە و خولقێنەرانە خۆی بۆ ناکۆکی و هەڕەشە تازەکان لەدەستنەداوە. بەهاتنە ئارای شارستانیەتی مۆدێرن جیهان دابەشبوو بۆ دوو بەشی مۆدێرن و باقی جیهان کە روبەروی هەڕەشەی نوێکردنەوە بونەتەوە.

زوربەی نمونە تیوریەکانی مۆدێرنە، دینامیکیەت و جوڵەی دەروونی و قابلیەتی گۆڕان و خۆ پەرەسەندن یان چاککردنی خۆی، بەخەسڵەتی سەرەکی و سەرچاوەی کۆتایی بڵندبوون، و بالآتربوون و جەزابیەتی مۆدێرنە دەژمێرن. ئەم نمونانە لەو خاڵەشدا کۆدەنگن کە رونکردنەوە و شیکردنەوەی دینامیکیەت و جوڵەی ناوبراو، گرنگترین پەیام و ئەرکی هەر تیورەیەکی مۆدێرنەیە. زوربەی شیکەرەوان بەدانانی سەدەی نۆزدەهەم وەك خاڵی دەستپێکردنی شیکردنەوەکانی خۆیان، بەدوای دۆزینەوەی نهێنی دینامیکیەتی مۆدێرن بۆ ئازادی و رزگاربوونی کرداری مرۆیی لە رێگر و تابۆکانی دابونەریت و بەرپرسیاری کۆمەڵایەتی و بۆ ملکەچی پاوانخوازانەی بۆ پێوەری جێبەجێکردنی کاریگەری ئەرکەکان، دەگەڕان. بەدەربڕینە جوان و بێوێنەکەی کارل مارکس هەموو شتێکی جامد دەتوێتەوە و دەبێت بە دوکەڵ و حورمەتی هەر شتێکی پیرۆز، ئەتکدەکرێت. کاتێك دەسەڵاتی نەریت لاواز ونکوڵی لێکرا، هیچ شتێك ناتوانێت رێگە لەشەهامەتی مرۆڤەکان بۆ قبوڵکردنی پەیامە بەرزەفڕەکان و لەبەرچاوگرتنی شێوە کاریگەرەکان بۆ جێبەجێکردنیان بگرێت. هەنوکە هاوئاهەنگی و هاوسەنگی نێوان ئامراز و ئامانجەکانە کە ئەوە دیاریدەکات کام شێوە کردارە دەبێ هەڵبژێرێت. وەك تالکۆت پارسنۆزی زانای کۆمەڵناسی







ئەمەریکی گوتویێتی (تیورەکانی پارسنۆز لەسەر بناغەی تێڕوانینەکانی فردیناند تۆنیز بونیادنراوە) لە رۆژگاری مۆدێرندا شێوە کلاسیکیەکانی هەڵسەنگاندنی کارکردن و رەفتاری گەمەکەرەکان و کردارەکانیان پێچەوانە بۆتەوە. هەنوکە کردار "لەدەرەوەی بازنە" و سەربەخۆ لە کۆمەڵەی کۆمەڵایەتی- کلتوری ، کە کرداری ناوبراو تیایدا روودەدات هەڵدەسەنگێنرێ، و پێگەی کۆمەڵایەتی بابەتە مرۆییەکانیشی تەنها گونجاو لەگەڵ رێسا گشتیەکانی توانا و کارایی، هەڵدەسەنگێنرێن. لەبری ئەمە گەمەکەران بەپێی کارکردن و شێوەزای تایبەتی خۆیان بۆ جێبەجێکردن کە پەیوەندی بە پەیامی خێرای ئەوانەوە هەیە، هەڵدەسەنگێنرێن. نەك لەسەر بناغەی خەسڵەتە گشتیەکانی خود. ئەو شتەی گرنگی هەیە ئەوەیە چ شتێك ئەنجامدراوە یان لە دۆخی بەئەنجامبوندایە و چۆن و بەهۆی چ کەسێکەوە و بۆچی. هەڵبژاردنی کردار سەربەخۆ لە هەموو پێوەرەکانە- بۆنمونە وەفادارییەکان و پەیمانە شەخسیەکان، بەرپرسیاری و ئیلتیزاماتی سیاسی و سروشتە ئەخلاقیەکان کە پەیوەندی بە ئەنجامدانی پەیامە خێراکانەوە نییە.

لەراستیدا لە گوتاری تیوری مۆدێرنەدا شیتاڵکردن (تەفکیك) و دابەشبوون و جیابونەوە بە ناوەڕۆکی نەگۆڕ دادەنرێن. ماکس فیبەری کۆمەڵناسی ئەڵمانی بڕوایوابوو جیابونەوە و شیتاڵکردنی ئابوری و کارکردن لە بواری خێزان، بە کرداری سەرەکی ئابوری مۆدێرن دەژمێرێت. بەهۆی ئەم جیابونەوەیە بڕیارە ئابوریەکان لە فشاری پەیمانە ئەخلاقی و وەفاداریە شەخسیەکان رزگاری بووە کە ژیانی خێزانی بەڕێوە دەبرد و رێنمای دەکرد. دیارە بە دەربڕینێکی وردتر گرنگی ئەم جیابونەوەیە بەهۆی ئیمانوێل کانتەوە دەربڕا و نوسرا. زۆرێك لە تیوریزەنانی مۆدێرنە (لەهەمویان بەرجەستەتر یۆرگن هابرماس لە ئەڵمانیا و ئەرنست گلنەر لە بریتانیا) لەگێڕانەوەدا بۆ دابەشکردنە سێ رەهەندیەکانی کانت لەنێوان عەقڵی پەتی و عەقڵی پراکتیکی و عەقڵی داوەری (هەڵسەنگاندن)، جیابونەوە و سەربەخۆی دولایەنەی گوتارەکانی هەقیقەت، خەسڵەتە ئەخلاقیەکان و داوەری یان حوکمی ستاتیکی (بەدەر لە بوارەکانی زانست و ئەخلاقیات و هونەر) بە دیارترین و بڕاوەترین خەسڵەتی زیهنیەت و کارنامەی مۆدێرن دەزانن. دابەشکردنی کار و کارکردن و ئەرکە ئاڵۆزەکان بۆ ئەرکی بچوکتر، سادەتر و زیاتر قابیلی کۆنتڕۆڵکردن

کە بە ئادام سیمس دەستپێدەکات، بە بەهێزترین و بەرجەستەترین هۆکاری کارایی و داهێنانی مۆدێرن دەژمێرێت. ئەمیل دۆرکایمی کۆمەڵناسی فەرەنسی ساڵەکانی دەیەکانی ١٩٠٠، جەوهەر و هێزی بزوێنەری هەموو لایەنەکانی پەرەسەندن و گەشەکردنی مێژوویی، لەپرۆسەی دابەشکردنی کاری روو لەپێش و چەندانجار وردتر و ناسکتردا دەبینی. هەرچەند دابەشبوونی کار ئاڵۆزتر بێت، بەهەمان ئەندازە ئەرکەکان، کارەکان و کارکردنەکانیش سادەتر و راستەوخۆ تر دەبن. لێرەوە دەکرێت باشتر بەڕێوە ببرێن، ئیدی پسپۆڕان و کارشناسان کە لەهەنوکەدا دەتوانن بەتەواوی تەرکیز بکەنە سەر چارەسەرکردنی کێشەکان، بەشێوەیەکی کاریگەر دەتوانن جێبەجێی بکەن. راگەیاندنی تیۆروانینی تەکنیکی و کارشناسانە وەك نیشانەی بازرگانی ئابوری مۆدێرن، زانستی مۆدێرن، هونەر و سیاسەتی مۆدێرنی لێدێت.

کۆی بوارەکانی ژیانی مۆدێرن وەك فیبەر جەختی لێکردووە، ئارەزویەکی روو لەزیادیان بۆ عەقلانیبوون هەیە. کردار کاتێك عەقلانیە (بەمانا ئامێریەکەی عەقڵ) کە رووی لە ئامانجێکی روون و باش وەسفکراو و دیاریکراو بێت و دواجار لەسەر بناغەی حسابکردنی کارایی و بەسبوونی رێژەیی هۆکارە ئەڵتەرناتیڤەکان بۆ گەیشتن بەو ئامانجە بێت. کرداری عەقلانی لەژێر رێنمایی ئەنگیزە و ئامانجەکاندایە، و لە رووی بنەماکانەوە ملکەچی چاودێرکردنی ورد و هوشیارانە و راستکردنەوە و ریفۆرمە، و بەهۆی هیچ هێزێکەوە دیاری ناکرێت کە گەمەکەر یان بکەر هیچ جۆرە هوشیاری یان کۆنتڕۆڵێکی لەبارەیانەوە نییە. کرداری عەقلانیی بازنە و بواری جێبەجێکردن بۆ بواری ئامانجەکان و بواری ئامرازەکان دابەشدەکات و ئەوەشی رێنمایی دەکات تەنها هەوڵدانە بۆ هاوتاکردنی دووهەم (واتەبواری ئامرازەکان) لەبەرامبەر یەکەمدا(واتە بواری ئامانجەکان). کردار کاتێك عەقلانییە (لێرەشدا هەر بەمانا ئامێرییەکەی عەقڵ) کە هەڵگری بڕیاردان و هەڵبژاردن بێت، ئەگەرچی هەڵبژاردنێکی تایبەت لەلایەن گەمەکەرێکەوە قبولکراوترین بڕیار نەبێت یان تەنانەت هەڵەی پەتی بێت. لەراستیدا زوربەی هەڵبژاردنەکان لەئاستێکی ئایدیالدا ئەنجامنادرێن. رەنگە بەهۆی کەمی ناسین یان هەڵەوە، بەووردی حساب بۆ ئامڕازەکان یان هۆکارەکان نەکرابێت. لێرەوە چالاکی ئاراستەکراو بەرەو ئەرك یان پەیام، زۆر بەدەگمەن لە دەستکاری هۆکاری "ناپەتی" بەدوور دەبێت، واتە لە







دەستێوەردانی هۆکارە ناعەقلانیەکان کە پەیوەندی یان نزیکایەتیەکیان لەگەڵ پەیامی خێرا و لەبەردەستدا نییە، وەك رەفتار و خووی کۆنترۆڵنەکراوی گەمەکەر و وەفادارییە نەریتیەکان، هەستیاری و کاریگەریەك کەوەك رێگرێك دێنە پێشەوە، یان بەرپرسیاری لەبەرامبەر ئەو بەهایانەی دەستدەخەنە ناو جێبەجێبوونی کاریگەری پەیامێکی دیارکراوەوە. کەوابوو عەقلانیەت پتر جۆرێك مەیل و ئاراستە وەرگرتنە، تا جۆرێك واقعیەتی ئەنجامدراو یان تەواوبووی مۆدێرنە، مەیلێکی بەردەوام و هەمیشەیی کە لەهەموو بوارەکانی ژیانی کۆمەڵایەتیدا قابیلی دەستنیشانکردنە. بۆنمونە بەگونجان لەگەڵ تیۆڕوانینی فیبەردا دەزگا رێساریژەکانی سەر بە بەرپرسیاری کە بە شێوەیەکی ناشەخسی کاردەکەن، پەیڕەوی دابەشکردنی کاری ورد، زنجیر پلەی توندی فەرمانەکان و هاوئاهەنگکردنی وەسوەسەی لێهاتوویی شەخسیەکانی بکەرانن، لەگەڵ پێداویستیە مادی و بەرجەستەکاندا، بە شکڵی دیاریکراوی مۆدێرن و عەقلانی حکومەت دەژمێرێن.

دیارە لایەنێکی تری عەقلانیزم (راسیۆنالیزم) بریتیە لە سڕینەوە یان سەرکوتکردنی هەر شتێکی ناعەقلانی، هەر شتێك کە دەست لە کاری عەقڵەوە بدات و ببێتە هۆی کەمبونەوەی کارایی پراگماتیکی کردار. ئەم رەگەزە ناعەقلانیە لە رەفتاری مرۆڤدا ناوی شەهوەتە کە بە رێگری سەرەکی لەبەردەم فەرمانڕەوایی عەقڵدا دەژمێرێت. شارستانێتی مۆدێرن بەهەمان ئەندازەی لەرووی سەرکوتکردنی شەهوەتەوە گرنگە، بەهەمان ئەندازەش لەرووی گەشەکردن و پەرەسەندنی عەقلانیەتی رەفتاری مرۆڤیشەوە، سیمایەکی دیاری هەیە. رێکخراوە عەقلانیەکانی کۆمەڵگا بەر لەهەر بوارێکی دی لەبیری کرداری چاودێری و کەمکردنەوەی توندی، لەکارخستن و بە لاڕێدا بردنی ئاراستەی ئەنگێزە و تەوژمە غەریزیەکان و زەمینە پێشوییەکانە: شیکردنەوە و تاوتوێکردنی ورد و سەرتاپاگیری ئەم لایەنەی مۆدێرنە کە رویەکی بەرچاوو وروژێنەرە، بەرلەهەر شتێك تێکەڵ بە بەرهەمەکانی فرۆید بووە. بەپێی تیۆڕوانینی فرۆید شارستانێتی مۆدێرن "بنەمای واقعی"خستۆتە جێگەی "بنەمای لەزەت"، بنەمای واقع بە مەرجی پێویست بۆ پێکەوە ژیانی ئاشتیانە و ئاسایشانە دەژمێرێت، و بنەمای لەزەت زەمینە یان دەستمایەی سروشتی مرۆڤەکانە کە لەبەرامبەر بنەمای واقعدا رادەوەستێت. بەدەربڕینێکی عەمەلی ئەم

جێگرتنەوەیە بە مانای سنورداریێتیە: هەوڵدان و گەڕان بۆ بەختیاری لەئەنجامی سەرنجدان لەوەی چ شتێك بێ بەخشینی بەهایەکی زۆر بۆ وەرگرتنی هەوڵ و هەنگاوەکان وەك هەوڵێکی بەنرخ مومکینە، روبەروی رێگر و بەربەستگەلێك دەبێتەوە. ئاسایشیی رێژەیی تا ڕادەیەك بە بەها یان بە ئاڵوگۆڕکردن لەگەڵ لایەنیکەمی بەشێك لە ئازادی فەردی، بەدەست دێت. یەکێك لە خەسڵەتەکانی رەفتاری گونجاو لەگەڵ نمونەی شارستانیەتدا بریتیە لە خۆ سنوردارکردن، بەشێوەیەکی گشتی کۆمەڵگا لەشکڵی ویژدان یان هەستی فەردی و هوشیاری فەردی کە بەشێوەیەکی کۆمەڵایەتی دروستبوون و تاکەکەس بۆ سەرکوتکردنی ئەنگێزەکان کە رەنگە بکەونە ناکۆکی لەگەڵ خەسڵەتە کۆمەڵایەتیەکاندا هاندەدەن، (بنکەیەك لەناو شاری داگیرکراودا بەجێدەهێڵن).

فرۆید لە لێکۆڵینەوەکانی خۆیدا لەبارەی هەلومەرجی مۆدێرنەوە، لەژێر ناونیشانی "شارستانێتی و ناخۆشیەکانی" لەسەر ئەو بڕوایەیە کەشارستانێتی مۆدێرن بەناچار نارازیبوون و بەرگری دروستدەکات، و بەردەوامبوونی هەڵگری رەگەزی قەهر و ناچارکردنی زیهنی یان جەستەی (دەرونی یان فیزیایی)یە. ئەو وێنەیەی مۆدێرنە کە لە شیکردنەوەکانی فرۆیدەوە دێتە دەرێ، وێنەیەکی ئەوەندە ئاشتیئامێز، ئارام و میهرەبان نییە. فەرمانڕەوایی عەقڵ چەندان دەرئەنجامی زیانبەخشانەی (traumatic) دەرونناسیانەی هەیە. لەدیدی فەردیەوە عەقڵ ناتوانێت بەهرەیەکی نائاڵۆز بێت، چونکە بۆ بەشێك لە پێداویستیە مرۆییەکان گرنگی و بایەخێکی ئەوتۆی دانەناوە، ئەو پێداویستیانە بەکەم دەگرێت بە بێ نرخیان دەزانێت، و هیچ جۆرە سەرنجێك لەم پێداویستیانە نادات، و بەمشێوەیەش زەمینە بۆ لەناوبردنیان ئامادەدەکات. هەر لەبەرئەمەشە فەرمانڕەوایی عەقڵ هەمیشە بابەتی توڕەیی و بێزاری بووە و هیچ کاتێك ناتوانێ کامڵ بێت، لەئەنجامدا دەبێتە هۆی ئەوەی شۆرش دژی خۆی بکرێت. مرۆڤەکان کە ناچارن بەرگەی دەسەڵاتی دەسەڵاتداریێتیە سارد و بێ هەستەکانی بودجە و دەرئەنجامەکان بگرن، بەشێویەکی دوبارە لەپێناوی بەرگری لە هەست و سۆزە سەرکوتکراوەکان، ئەنگێزە سروشتی و پێویستی پەیوەندی مرۆیی رادەپەڕن.

دەکرێ تەفسیرێکی تر بۆ ناکۆکی دەرونی و کاریگەری ئاڵۆزی شارستانیەت







(بەتایبەت شارستانێتی مۆدێرن) لە تێڕوانینی فردریك نیتچەدا بۆ شۆڕشی ئێرتیجالی و غەریزەی دیونیزوسی وەك هەڕەشەیەکی هەمیشەیی بدۆزینەوە، شۆڕشێك کە چەندانجار روبەروی هەوڵی ئاپۆلۆنی بۆ دروستکردنی رێکخستنێکی جیهانی لۆژیکی، عەقلانی و هاوسەنگ و هاوئاهەنگ بۆتەوە. ئەم ناوەڕۆکە لە ریوایەتی فرۆیدی- نیتچەییەکەیدا بەشێوەیەکی راستەوخۆ یان ناراستەوخۆ لە هەموو ئەوجۆرە رەخنانەدا ئامادەیی هەیە کە لە مۆدێرنە گیراوە و مۆدێرنە بە پرۆژەیەکی بەرزەفڕ، بەلام لەزۆر ڕووەوە کەموکوڕو پێنەگەیشتوو دەزانێ کە ئامانجی عەقلانیکردنی هەموو لایەنەی رێکخستنی کۆمەلایەتی و رەفتاری فەردی مرۆڤە. بەتایبەتی دوو جۆر رەخنە لەهەموویان زیاتر گرنگە: یەکێك لەم رەخنانە (کە نوێنەرەکانی دەکرێ لە بواری جیاوازدا ببینین: لەوانە تیورەی "سیاسەتی مێگەلی"  ئەو تیورەزسازانەی کە ئیلهامیان لە "تیورەی دەستەبژێرەکان"ی دیلفرد دو پارتۆ وەرگرتووە، تیورەی "شۆڕشی مێگەلەکان"  کە بەهۆی خۆزی ئۆرتێگا دی کاستەوە بەناوبانگ بوو، وە تیورەی "یاسایی ئاسنینی ئۆلیگارشی"  کە بەهۆی رابرت میخلزەوە دارێژرا) دڵنیامان دەکات کە هەلومەرجی مۆدێرن بەپێچەوانەی ریتۆریقا و دەربڕینی بڕواداران بە عەقلانیەتی مۆدێرنە، بۆتە هۆی زیادبوونی سیاسەتی مێگەلی زیاد لە سنور ناعەقلانی و بەتوندی لەژیر کاریگەری ستاتیکادا دەبێت و لەبری پەرەسەندن و پێشکەوتنی هەڵبژاردە عەقلانیەکان، بۆتە هۆی دواکەوتن، و دواجار نەزۆکی عەقڵ. رەخنەیەکی دی (کە بەشێوەیەکی سەرەکی لەژێر کاریگەری نەریتی رەخنەگرانەی قوتابخانەی فرانکفۆرتدایە کە بە بەرهەمەکانی تیۆدۆرۆ ئادرنۆ و ماکس هۆرکهایمەر دەستی پێکرد، بەلام رەگوڕیشەی زۆرێك لەم بیروبۆچونانە دەگەڕێتەوە بۆ تیڕوانینەکانی جورج زیمیلی کۆمەڵناسی سەرەتاکانی سەدەی بیستەمی ئەڵمانیا) ناکۆکیە چارەسەر هەڵنەگرەکانی نێوان ئەنگێزە و تەوژمی پەیوەندیدار بەعەقلانیکردنی بونیادە دەزگاییەکانی بان تاکەکەس و مژدەی بونیادنراو لەسەر لەئەستۆنانی بڕیارە فەردیەکان بۆ ئەستۆی هەڵبژاردە عەقلانیە ئازادەکان، ئاشکرا دەکات.

بەکورتی بەرگری لەبەرامبەر عەقلانیبووندا، بەئەندازەی خودی عەقلانیبوون بە خەسڵەتی دیاری مۆدێرنە دەژمێرێت. مێژووی مۆدێرنە هاودەمی رەخنەگرتنە لە

زیادەرەویەکان، یان تەنانەت بێکاری، بێهودەیەکان و زیانە ئەنگێزەیەکانی و بەرزەفڕینە مێژووییەکانی (مۆدێرنە). لەپاڵ هەموو تەعبیرێکی رۆشنبیریدا لەبارەی شەوق و تامەزرۆی زۆر بۆ ئەو روانگە فکریی و ناوەرۆکە وروژێنەرانەی کە زانستی مۆدێرن، تێڕوانینی پسپۆری تەکنیکی و بەرژەوەندی سیاسی بەروی مرۆڤدا کردۆتەوە، هەمیشە ناڕازیبوون دژی لەناوچونی فەردی و هەستیاری و سۆزی رەسەنی مرۆڤ، ئەنجامدراوە. رەخنەگران لەبەرامبەر مژدەی مۆدێرندا بۆ داهێنانی شێوە مرۆڤێك کە خاوەن دەسەڵات بێت بۆ خەباتکردن لەپێناو دنیایەکی باشتر و میهرەبانتردا، بە خێرایی دڵنیایان کردووین کە تەنانەت گەر ئەم شێوانە بتوانن وەك یەك هەمەکی بەئازادی بگەن، ئەوا ئەندامە تاکەکانی ئەم هەمەکیە ناتوانن ئەمکارە ئەنجامبدەن. ئەوان بە زیندانبوون لە چوارچێوەی "کردارەکاندا" و بوون بە "چەرخی دانەکانی" ئامێر، توانای ئەنجامی هەڵبژاردنی راستەقینە و عەقڵانی لەدەستدەدەن. لەبەرامبەر بانگەشەی سود و خوازیاری رێگەچارە عەقڵانیەکاندا، رەخنەگران دەستیان بە بەرگریکردن لە بەها فەردیەکان، هەمەکیەك کە قابیلی دابەشکردن نیە، و مافی مرۆڤەکان بۆ جیاوازبوون، قابیلی پێشبینی نەکردن و تەنانەت ناعەقڵانیبوون کردووە. ئەنگێزە و تەوژمی عەقڵانیبوون یان بەدەستهاتنی عەقڵانیەتی مۆدێرن بە دروشمەکانی رۆمانتیکیەکانی سەرەتای سەدەی نۆزدەهەم دەستی پێکرد، قۆناغێکی دارمانی بەجێهێشت، و پاشان لەقاڵبی روداوە پێشڕەو و ئاڤانگاردی خەباتگێرانی سەرەتاکانی سەدەی بیستەم، دادایزم، سوریالیزم، تا بگەین بە کلتوری پۆستمۆدێرنی ئەمڕۆ (کە بێ رێسایی و نەبوونی بەهاکانی بە تەنها رێسای کلتوری زانیوەو بانگی هەموان بۆ بەرگریکردن لەبەرامبەر هەموو شێوە هەمەڕەنگەکانی دەسەڵاتدا دەکات، بەڵام تەنانەت توانای دروستکردن یان پێشکەشکردنی بنەمایەك بۆ کارکردنی خۆی نییە) سەری دەرهێنا. تەوژمی عەقڵانیبوونی مۆدێرن هاودەمی جۆرێك کلتوری ئۆپزسیۆن و ناڕازی بوو کە هەموو خەم و گرنگی خۆی بۆ بەرگریکردن لە ئازادی فەردی و ئەزموونی سۆزداری تەرخانکردبوو. لێرەوە راپەڕین و نارازیبوونی کلتوری دژی واقعیەتی کۆمەڵگا، ناکۆکی قابیلی ئاشتنەکردنەوەی بەڕاستی هەمیشەیی نێوان کاربەدەستە کۆمەڵایەتی و سیاسی و داهێنانی کلتوری پێشکەوتوو، چ لەبواری فەلسەفە، هونەر یان ئەدەبیاتدا،







بە بەرجەستەترین، سەرسوڕهێنەرترین و گێژکەرترین و پێدەچێ هەمیشەیترین، خەسڵەتی مۆدێرنە بژمێرێت.

یەکێك لە رونکردنەوەکانی ئەم پاردۆکسە دەکرێ لە بونیادی مۆدێرنی ژیانی رۆژانە و ئەزمونە فەردیەکاندا بدۆزینەوە. بەرجەستەترین خەسڵەتی ئەزمونی فەردی چەند پارچەیی و پەرشوبڵاویەتی. تاك لە کۆمەڵگای مۆدێرندا کە لەفەزایەکی قەرەباڵغی شاریدا راوەستاوە و ناچارە بەشێکی گەورەی ژیانی خۆی لەنیوان غەریبە و بێگانەکاندا بەسەربەرێت، ئەستەم و رەنگە مومکین نەبێت بۆی ئەزمونەکانی خۆی لە قاڵبی ئەزمونەکانی هەمەکیەکی ماناداردا تێکەڵبکات. زەمەن لەبواری ئاسۆی وێنەکراو بەهۆی ئەزمونە فەردییەکانەوە، دابەشدەبێت بۆ روداوگەلێك کە پەیوەندیان پێکەوە نیە، و شوێنیش بۆ کۆمەڵێ خاڵ و جێگەی زۆر پەیوەندیدار بەیەکەوە. ئەگەر پەیوەندیەك بوونی هەبێت کە دەلالەت لە پێکەوە گرێدانی دوولایەنە بکات کە لە هەمەکیەکدا پێکەوەیان دەبەستێتەوە و یەکیان دەخات، ئەوا پەیوەندیەکی لەم چەشنە تاکی تەماشاکەر لەبەرچاو ناگرێت و کەمترین بایەخی پێنادات، لەبری ئەمە روبەرووی قۆناغ و پارچەی کورت و سنوردار لەروی شوێنی درامای ناوبراو، دەبێتەوە. یەکەمجار شارل بۆدلێری شاعیر و رەخنەگری فەرەنسی ئاماژەی بۆ ئەو خاڵە کرد کە ئەزمونی مۆدێرن لەراستیدا دیمەنێکی تەماشایی ساتەوەختێکی تێپەرە. هونەر بەمەبەستی هاوهەنگاوی و هاوئاهەنگی لەگەڵ ئەزمونی مۆدێرندا دەبێت جیهان بەشێوەی دیاردەیەکی دابەشبوو، چەند پارچە، جیابۆوە، گواستنەوەیی، بزێو و تێپەڕ. وەك کۆمەڵێك "ساتی مەلەکردن" وێنە بکات.

وەك جۆرج زیمیل پیشانیداوە خەسڵەتی دیاری ئەزمونی مۆدێرن هاوئاهەنگی و پەیوەندیە لەنێوان شارستانێتی وەك بەرهەمێکی کلتوری گشتی و وردە دەستکەوتە کلتوریەکان کە تاکەکان توانای تیکەڵکردن و گونجانیانی لەگەڵ یەك و سودوەرگرتن لێیان وەك بەرژەوەندی بونیادی لە بیناکردنی شوناسەکانی خۆیاندا، هەیە. کۆی گشتی بەرهەمە کلتورییەکان چەندانجار فراوانترە لە توانای راکێشانی تاکەکان. ئەم راستییە لەلایەکەوە داهێنانی کلتوری لە کۆتوبەندی پەیوەندیەکانی بە ژیانی رۆژانەوە رزگاردەکاتو بەمشێوەیە ئەگەری پسپۆریبوون روو لە زیاد و بێ سنور و

هەروەها پەرەسەندنی بێ سنوری بوارە پسپۆڕیەکان ئامادە دەکات (هەر بەمشێوەیە پەلەی لۆگاریتمی لە ئاهەنگی پەرەسەندنی زانست، تەکنەلۆژیا و هونەرەکاندا چەندانجار لەپێشوو زیاتر ناکۆکیەکان توند دەکات). بەڵام لەلایەکی دیەوە پەیامی مەترسیداری جوتکردن و پێکەوەگرێدانی "ژیانە ماقوڵەکان" یان "ژیانە ماناداریەکان" بەجیا لە وردەکاریە پوچەکان و بەشە نامەفهومەکانی هەمەکیەکان و شوناسە نەناسراو یان نادیارەکان، دەخاتە ئەستۆی تاکەکان. تاکەکان هاوکات لەگەڵ قبوڵکردن و جێبەجێکردنی ئەم پەیامە مەترسیدارە، دەبێ بتوانن ئەو رەگەزانەی قابیلی بەراوردکردن نین، بەراوردبکەن و ئەو رەگەزانەی کە بەروکەش پەیوەندیان بەیەکەوە نییە، بەیەکەوە گرێبدەن. بۆ ئەم مەبەستە پێویستیان بە ستراتیژێك هەیە کە بەشێوەیەکی گشتی بەراوردکاری و جێبەجێکردن لەنێوان ئەزمونە زۆر جیاوازەکاندا بکات، و لەم رێگەیەشەوە ئەو ئەگەرە دێنێتە پێشێ تا تاکەکان هاوکات لەگەڵ لەبەرچاو نەگرتنی جیاوازییە چۆنایەتیەکانی نێوان ئامانجەکانی هەڵبژاردن، دەست بە هەڵبژاردن بکەن. بەمشێوەیە هێزی قسەکردن، زیهن یان عەقڵ (هێز یان توانای بیرکردنەوەی ئەبستراکت و وێنەیی) و پارە لەیەککاتدا بە بەرهەمی ناچاری و هۆکاری پێویست بۆ ژیان لە هەلومەرجی مۆدێرندا دەژمێرێن. هەردوو وتەزای پارە و عەقڵ تەنها رەهەندی چەندایەتی دیاردە ئەزمونیەکان تاوتوێدەکەن و لایەنە چۆنایەتیەکەی لەبەرچاو ناگرن.

ئەم خەسڵەتانە و خەسڵەتەکانی تری پەیوەندیدار بە ژینگەو جێگەی نیشتەجێبوونی مرۆڤەکان، لەسەرتاسەری قۆناغی مۆدێرندا بەردەوام بووە و بەردەوام هێزی خۆی زیاد کردووە. ئەم خەسڵەتانە تا ئەمڕۆش بە لایەنی دیاری کۆمەڵگا رۆژئاواییەکان و کۆمەڵگا بە رۆژئاوایبوەکان دەژمێرێن و تەنانەت لەحاڵەتی بڵاوبونەوەدان بۆ بەش و ناوچەکانی تری جیهان کە تا ئەم دوایانەش بە بەشێك لە ناوچە "کلاسیکیەکان" یان "پێش مۆدێرنە"کان دەژمێران. لەگەڵئەمەشدا هەندێك لە چاودێران بڕوایانوایە مۆدێرنە لەشکڵە کلاسیکیەکەی خۆیدا، رەوتی خۆی بڕیوە و قۆناغەکەی کۆتایی پێهاتووە و جێگەی خۆی بە شکڵبەندییەکی کۆمەڵایەتی- کلتوری دی سپاردووە یان لەحاڵەتی ئەوەدایە بیسپێرێت، سیمایەك کە چاودێڕانی ناوبراو ناویانناوە "پۆستمۆدێرنە". وەسف و پێناسەکانی ئەم بەناو شکڵبەندیە تازەیە





(بەمانای پیشاندانی تازەیی و نایابی و جیاوازی چۆنایەتی لەگەڵ مۆدێرنەدا) بەگشتی جیاوازییەکی ئەوتۆی لەگەڵ وەسفی سەرەوەدا بۆ مۆدێرنە و هەلومەرجی مۆدێرن نییە. بەڵام جیاوازییەکی بەرجەستە و بەرچاو هەیە کە بانگەشەکەرانی "کۆتایی مۆدێرنە" و سەرەتای پۆستمۆدێرنە هەوڵدەدەن تا بایەخی بانگەشەکانی خۆیانی لەسەری بونیاد بنێن، ئەم جیاوازیەش ئەوەیە کە : ئەگەر لەسەرتاسەری قۆناغی مۆدێرنەدا "پەرێشانی" "هاروهاجی" " بێ سەروبەری" "هەژان" "دڵەڕاوکێ" "دینامیکیەت" "مەلەکردن" "تێپەڕوکاتیبوون" ئاڵۆزی و چەند رەهەندی، هەمەڕەنگی و مەزاجیبوون، ئیرتیجالی و هەڵەشەیی و نەبوونی شتێکی بڕاوە کە بە خەسڵەتە جەوهەری و خودییەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی و تاکەکەسی دەژمێررا، بە هۆکاری بزوێنەر و ئازاربەخشی کاتی و تێپەڕ دادەنران کە دواجار دەکەوتنە ژێر کۆنترۆڵی مەیلی عەقلانیبوون و باڵادەستی عەقلانیەتەوە، هەنوکە ئیدی بە دیاردەی ناچاری و قابیلی هەڵنەکەندن و تێنەپەڕ دەژمێرران، نەك بە هۆکاری بزوێنەر. هەنوکە هەموو ئەوەیان قبوڵە کە: یەکەم پرۆسە مێژوویەکان ئامانج، مەبەست و یان ئاراستەیەکی دیاریکراویان نییە، دووهەم فرەیی و هەمەڕەنگی بەها و شێوەکانی ژیان دەمێننەوە، و سێهەم ناوەندەکانی دەسەڵاتی سیاسی بەتایبەتی حکومەتە ویلایەتییەکان، هەم سەرچاوەکان و هەم ئەو بەرزەفڕیانەی لەدەستداوە کە خەسڵەتی "سیفەتی باخەوانیە". پرۆژە هەمەگیر و هەمەلایەنەکان لەبارەی "کۆمەڵگای عەقلانیەوە" پڕۆژەکانی پەیوەندیدار بە ئەندازیاری کۆمەڵایەتی جیهانی و جەنگە سەلیبیە کلتوریەکان کە پشتیوانیان لێدەکرد، لەلێواری ڕیسوایی و بەدناویدان و هەر هەموویان خراونەتە لاوە. کەوتن و دارمانی رژێمە ئابوریە کۆمنیستیەکان و دەوڵەتە دەستێوەر دەرەکان لەهەموو بوارەکانی ژیانی مرۆڤدا، وێنەیەکی دیار و بەرچاوی ئەم مەیلەی کێشاوە.

سەرچاوە

مدرنیته و مدرنیسم: ترجمه و تدوین: حسین علی نوزری تهران، نقش جهان ١٣٧٨. ص٢٢.





# پۆستمۆدێرنیزم







## پۆستمۆدێرنیزم چییە؟*

## چارلز چنگز

سەردەمی مۆدێرن کە سەردەمێك بوو وا دەردەکەوت بۆ هەمیشە لە رووبەری مێژودا دەمێنێتەوە، بەخێرایی بەرەو ئەوە دەڕوا ببێت بە بەشێك لە رابردوو، دەچێتە ناو لاپەڕەکانی مێژووەوە و ئەرشیفدەکرێت، چیدی لەمێژوو و روبەریدا ئامادە نییە. پیشەسازیبوون بە خێرایی جێگەی خۆی بەسەردەمی پاش پیشەسازی دەدات، کارکردن لە کارخانەکاندا جێگەی خۆی بە کارکردن لەماڵەوە و لە ناو بەڕێوبەرایەتییەکانەوە دەدات. لە بواری هونەردا "نەریتی نوێ" دەبێتە هۆی پێکهاتەیەك لەنەریتە بێشومارەکان. تەنانەت کەسانێکیش کە تا هەنوکە خۆیان بە هونەرمەند و بیناسازی مۆدێرن دادەنێن، تەماشای دەوروبەری خۆیان دەکەن بۆ ئەوەی بزانن دەبێت بە دوای چ شێوازگەلێك و چ بەهاگەلێکدا بڕۆن.

سەردەمی پۆستمۆدێرن سەردەمی هەڵبژاردنە بێشومار و ڕوو لە زیادەکانە. سەردەمێکە ناکرێ هیچ روداوێکی ئەرسۆزۆکسی بە بێ خودهوشیاری و تەنز قبوڵبکرێت، چونکە هەموو نەریتەکان بۆ خۆیان نرخ و بەهایان هەیە. ئەمە خۆی تارادەیەك دەرئەنجامی ئەو شتەیە کە پێیدەڵێن: سەردەمی تەقینەوەی زانیاری، دەرکەوتنی زانینی رێکخراو و پەیوەندی جیهانی و سیبرنیتیك. نەك هەر دەوڵەمەندەکان بەڵکو هەموو هاوڵاتیان وەك کۆکەرەوە و موسافرانی زەمەنیان لێهاتووە، کە لەبەردەم فرەیی بابەتی هەڵبژاردندان. پۆلۆرالیزم ڕێبازی باڵادەستی سەردەمی ئێمە، هەم گەورەترین کێشە و هەم گەورەترین ئارامگایە: هەر پیاوێك دەبێت بە هاوڵاتیەکی گەردوونی و هەر ژنێك دەبێت بە کەسێکی ئازاد، ئاژاوە و دڵەڕاوکێ بەسەر حاڵەتە رۆحیەکانی تاکەکاندا زاڵدەبێت، و تاوان دەبێتە شێوەی باوی کلتوری جەماوەری.

ئەمە ئەو بەهایەیە ئێمە بۆ سەردەمی پۆستمۆدێرن دەیدەین، بەهایەك کە







هێندەی یەکڕەنگی، نەبوونی هەمەڕەنگی، دۆگماتیزم و فەقیری و نەگبەتی سەردەمی مۆدێرن، زەحمەت و گرانە. بەڵام سەرەڕای ئەو هەوڵە زۆرانەی کە لە ئێران و شوێنەکانی دیدا دەدرێت، گەڕانەوە بۆ کلتوری رابردوو، یان شێوەیەکی پیشەسازی، یان سەپاندنی مەزهەبێکی بونیادگەر یان جۆرێك رووداوی ئەرسۆزۆکسی مۆدێرنیزمی (یان مۆدێرنیزمی ئەرسۆزکس) نامومکینە. سیستمی پەیوەندی جیهانی و شێوەی بەرهەمهێنانی سیبرنیتیك، لەگەڵ دەرکەوتنی خۆیاندا پێداویستی تایبەتی خۆشیان دروستکردووە، ئەمانە جگە لەجەنگی ئەتۆمی، کۆمەڵێك رووداون کە قابیلی گۆڕان و گەڕانەوە بۆ دواوە نین.

تەحەداکردن بۆ دۆزینەوەی هاملێتی پۆستمۆدێرن، رووبەڕوبونەوەی ئەو کێشە و گرفتانەی دەرئەنجامی سامانن، بریتیە لە هەڵبژاردن و تێکەڵکردنی نەریتەکان بەشێوەیەکی هەڵبژاردە و وەرگرتنی هەندێك لایەنی رابردوو و ئێستا، کە پێدەچێ بۆ ئەم مەبەستە گونجاو دەرکەون. دەرئەنجام و بەرهەمی ئەمکارە ئەگەر سەرکەوتوو بێت، تێکەڵێکی سەرنجڕاکێشەرە لە نەریتەکان، و لە کاتێکیشدا سەرنەکەوێت شتێکی تێکەڵو پێکەڵ دەبێت. بە گشتی بەلەمە هەوایەکانی پۆستمۆدێرن رێگەی خۆیان لە هاتن و چوون لە نێوان پێکهاتەی داهێنان و لاسایکردنەوەی شێواودا گومکردووە، و توشی کارەساتدەبن، بەڵام هەندێکجار مژدەی مەزنی کلتورێکی فرەخواز بە ئازادیگەلێکی بێشومار، جێبەجێدەکەن.

پۆستمۆدێرنیزم لە بنەڕەتدا تێکەڵەیەکی گیراوەیە لەهەر جۆر نەریتێك لەگەڵ نەریتەکانی رابردوودا: هەم بەردەوامی مۆدێرنیزمە و هەم تێپەڕاندن و پەرەسەندنێتی. دەکرێ خەسڵەتی سەرەکی بەرهەمە پۆستمۆدێرنەکان لەکۆد و رەمزی چەند رەهەندی، ئاڵۆز، تەنزئامێز، هەجوەکان، هەڵبژاردنی هەمەرەنگو پەرشوبڵاو، و ناکۆکیو نابەردەوامی یان دابڕان لە نەریتەکاندا بدۆزینەوە، چونکە ئەم نەگونجانو ناچونیەکیانە دەوری هەموو فەزای پلۆرالیزمی ئێمەیانداوە. شێوازی تێکەڵەو هەمەرەنگی بەشەکانی، لەبەرامبەر کورتکردنەوەی ئایدۆلۆژیای مۆدێرنی دواییو هەموو ئەو رەقیبانەدا رادەوەستێ کە لەسەر بناغەی سەلیقە یان بنەمای دۆگمایی پاوانکراو راوەستاون.

ئەمە لایەنیکەم هەمان ئەو شتەیە کە من لەسەر بناغەکەی پۆستمۆدێرنیزم بە

بزوتنەوەیەکی کلتوریی‌و قۆناغێك یان سەردەمێکی مێژوویی دەزانم. بەڵام مانای ئەم زاراوەیە لەم پەنجاساڵەی دوایدا گۆڕانی زۆری بەسەردا هاتووە، و تەنها لە دەیەکانی ۱۹۹۰دا مانایەکی روونی پەیداکرد. هەندێك بەڕووداوێکی پێشکەوتوخوازو هەندێك بەڕووداوێکی کۆنەپەرستانەی دەزانن، کە شایەنی ڕەدکردنەوەیە. هەندێك لەبەر واقعیبوونی کۆمەڵایەتی‌و تەکنەلۆژیەکەی، بەرگری‌و پشتگیری لێدەکەن،و هەندێکیش وەك ڕووداوێکی کۆنەپەرستانە،و دژی فەلسەفەو ئاراستەکەر، مەحکومیدەکەن. تەنانەت لە زۆرێك شوێندا کە لەبەر ڕەهەندە شیزۆفرینیەکەی تاوانباریدەکەن، زۆرێك لەوانەی بەرگری لێدەکەن، ئەم کەموکوڕیە بە بەهای پۆزەتیڤی دادەنێن. هەندێك نوسەر هەڵسەنگاندنێکی نێگەتیڤیان بۆی هەیەو پێناسی ناخۆشی بۆدەکەن‌و جەخت لە ڕەهەندی ئاوساو پەرەسەندنی کۆنترۆڵنەکراوی دەکەن کە خەسڵەتی ئابووریی چەند لایەنەو فرەخوازە. بەڵام لێکۆڵینەوەی ئابووری‌و وردی بەڵگە هەبوەکان پیشانیدەدەن کە بەرهەمهێنانی سەرسوڕهێنەرو مەسرەڤی شێتئاسایانە، هەموو بوارەکانی ژیانی هاوچەرخی خستۆتە چنگی خۆیەوەو تایبەت نین بەبزوتنەوەیەکی تایبەتی.

یەکەمجار کە پێشگری "پاش" (Post) بە مانایەکی پۆزەتیڤ بەکارهێنرا بە هۆی لزلی فیدلەر لەساڵی ۱۹٦٥دا بوو کە وەك وتەیەکی سیحراوی‌و ئەفسوناوی بەکاریدەهێناو دەیبەستەوە بەو روداوە رادیکالانەی بە دژی کلتور دەژمێرێن: پاش هیومانیستی، پاش نێرینە، پاش سپی-، پاش قارەمان- پاش یەهود. ئەم ڕووداوە ئەنارشیستی‌و داهێنەرانە بە مەبەستی جیابوونەوە لەڕووداوە ئەرسۆزکسیەکان، ئەم هێرشە توندانە بۆ سەر دەستەبژێرخوازی مارکسیزمی، ئەکادمیزم‌و سەرکوتی پیوریتانی، لە راستیدا وەك ئەندریاس هۆیسن لە ۱۹۸٤دا پیشانیدا، بە ئاشکراکەری یەکەم بزوتنەوە وروژێنەرەکانی پۆستمۆدێرن دەژمێرێن. پێدەچێ فیدلەرو ئەوانی دی لە ساڵی ۱۹٦۰دا هەرگیز بە نیازی ئەوە نەبووبن ئەم باسانە بەمشێوەیە بکەن‌و ئەم نەریتە لەمجۆرە قاڵبەدا چەمکرێژی بکەن. بەدیهاتنی ئەم مەسەلەیە پێویستی بە کات بوو، دەبوو تا ساڵەکانی دەیەی ۱۹۷۰و دەرکەوتنی نوسین‌و بەرهەمەکانی ئیهاب حەسەن رابوەستین، واتە کاتێك ئەو بزوتنەوە رادیکالانەی سەردەمێك فیدلەر لە دەیەی ۱۹٦۰دا ستایشی کردبوو، کۆن بووبێت‌و مردنیان راگەیەنرا بێت.







ئیهاب حەسەن لە ناوەڕاستەکانی دەیەی ۱۹۷۰دا خۆی بە قسەکەری پۆستمۆدێرن راگەیاند. ئیهاب ئەم ناونیشانەی بەستەوە بە بۆچوون‌و بیروڕای ئەزمونگەری لە هونەرو فراتکنۆلۆژی لە بیناسازیدا: ویلیلم باروزو باکمینستەر فولەر، ئەنارشیزم، کۆنبوون/ بێدەنگی.. داماڵینی داهێنان/ تەفکیکیەت.."و بەیەك وشە روداوگەلێك کە من‌و کەسانی دی دواتر بە خەسڵەتەکانی "مۆدێرنەی دوایی"مان ناونا. لە ئەدەبیات‌و پاشتر لە فەلسەفەدا دوا بە دوای دەرکەوتن‌و نوسینەکانی لیوتارو ئارەزوو بۆ جێگرتنەوەی پۆستمۆدێرن لەبری بونیاشکێنی، ئەم زاراوەیە بەگشتی پەیوەندی نزیکی خۆی بەو شتەوە پاراست کە ئیهاب حەسەن ناوینا "نا بەردەوامی، دیارینەکردن، دەروون خودی، دەرون بونی". کتێبەکەی مارك. س. تایلۆر بە ناونیشانی سەرسوڕهێنەری "هەڵسەنگاندنی نادروست، یەك پۆستمۆدێرن/ یەك ئیلاهیات" بە بەرهەمە دیارەکانی ئەم ژانرە دەژمێرێت کە ئیلهامی لەبیروڕاکانی دێریداو بونیادشێکنیەوە وەرگرتووە.

هەروەها ئاراستەیەك لە فەلسەفەدا هەیە کە هەموو بیریارانی پۆست پۆزەتڤیزم بە پۆستمۆدێرن دادەنێت، ئەگەرچی تەنها خاڵی هاوبەشیان بریتیبێت لە نەفیکردنی پۆزەتڤیزمی لۆژیکی مۆدێرن. بەمشێوەیە دوو مانای تەواو جیاواز بۆ ئەم وشەیەو تێکەڵکردنێکی گشتی هەیە کە تەنها تایبەت نییە بە خەڵکی ئاسایی. ئەم ڕووداوانەو هەروەها پێشزەمینەکانی کۆنفرانسە جۆراو جۆرەکانی ئەم دواییە لە بارەی ئەم بابەتەوە، بووە هۆی نوسینی ئەم وتارە بچوکەی "پۆستمۆدێرنیزم چییە؟". ئەمە پرسیارو لە هەمانکاتدا وەڵامێکە کە من پێشکەشیدەکەم. لە ئەنجامی خوێندنەوەو لێکۆڵینەوەی قوڵترەوە، دەکرێت سەرنج لەوە بدەین گەشەکردن‌و پەرەسەندنی بەردەوام‌و جوڵەی هەمیشەیی ئەم دیاردەی خۆبەخۆ ئەوە دەسەلمێنێ کە پێشکەشکردنی وەڵامێکی بڕاوەو ڕوون بۆ ئەم پرسیارە نییە. لایەنیکەم تا ئەو کاتەی پەرەسەندن‌و گەشەکردنی رانەوەستا بێت، ئەمکارە عەمەلی‌و مومکین نییە.

کلتوری پۆستمۆدێرن لە سەرەتای منالی خۆیدا لە ساڵەکانی دەیەی ۱۹٦۰دا بەڕوداوێکی رادیکال‌و ڕەخنەگرانە دەژمێرا، هەڵوێستێکی کەمایەتی بوو کە بۆ نمونە لەلایەن هونەرمەندانی پۆپ‌و تیورەی پۆپ دژی دیدگای کورتکەرانەوەی هونەری مۆدێرن‌و ستاتیکای باڵادەست بەسەر دەزگاگەلێکی وەك مۆزەی هونەرە مۆدێرنەکاندا

وەرگیرا. لە بیناسازیدا تیپی *تێن*، *جین یاکۆبز*، *رابرت*و *نتۆری*و...هێرشەکانی خۆیان دژی بیناسازی مۆدێرنی ئۆرسێزێکس لەبەر دەستەبژێریەکەی، و لە ناوبردنی شارەکانو بیرۆکراسیەکەیو زمانە سادەکەی دەستپێکرد. بەدەستپێکردنی دەیەکانی ١٩٧٠ هاوکات لەگەڵ گەشەکردنو پەرەسەندنی ئەم نەریتانەو بەهێزبوونیانو رودانی گۆڕان تیایاندا، و داهێنانی وشەی پۆستمۆدێرنیزم وەك دەربڕینێك بۆ ناونان لە چەندان رووداو، هێواش هێواش ئەم بزوتنەوەیە رەهەندە رادیکالو رەخنەگرانەکەی سەردەمی منالّی خۆی لەدەستداو بەرەو پارێزگاری زیاتر رۆیشتو لە ئەنجامدابوو بە رووداوێکی عەقلانیو ئەکادیمی. زۆرێك لە لایەنگرانی دەیەکانی ١٩٦٠ وەك *ئەندی وارهۆڵ* بە راکێشان بەرەو بازاڕی هونەریو روکردنە کاری پڕوپاگەندەو پڕ دەرامەت، پەیامی رەخنەگرانەی خۆیان لەدەستدا. دواجار پۆستمۆدێرنیزم لە کارو پیشەی جیاوازو ناوەندی زانستیو ئەکادیمیو هەروەها لە ئاستێکی بەربلاوتر لە کۆی کۆمەلگادا قبولکرا، وەك باوکی خۆی واتە مۆدێرنیزمو برا رەقیبەکەی واتە مۆدێرنیزمی دوایی، بوو بە بەشێك لەدەزگا بالادەستە هەبووەکان. لەرەخنەی ئەدەبیشدا لەرووی مانابیەوە لەمانای خۆی لەنەریتە بیناسازیو هونەریەکان نزیکتر بۆوە.

*جان بارت*و *ئیمبرتۆ ئیکۆ* لەپاڵ نوسەرانی تردا، پۆستمۆدێنیزم بە جۆرێك نوسین دەزانن کە بۆ باسکردنی ناوەڕۆکە هەمیشەییو سەقامگیرەکان، سود لەشێوەکانی نەریت بە شێوەیەکی تەنزئامێزو خوازەیی یان بە شێوەی جیاواز وەردەگرێت. ئەمجۆرە نوسینە وەك *جان بارت* دەڵێت هاوکات لەگەڵ سەلماندی بایەخی مۆدێرنیزم — گۆڕانکاریەك لەجیهانبینیدا کە بە هۆی *نیتچە*، *ئەنیشتاین*، *فرۆید*و کەسانی دیەوە ئەنجامدرا- ، هیوادارە کە لەهۆکارو گوێگرە سنوردارەکان کە بە خەسڵەتی رۆمانە مۆدێرنیستەکان دەژمێرێت، زیاتر بڕوات:

"نوسەری پۆستمۆدێرنیستی ئایدیالو جێی مەبەستی من، باوکانی مۆدێرنیستی سەدەی بیستەم یان باوانی پێشمۆدێرنیستی سەدەی نۆزدەهەمی خۆیان، نە بەشێوەیەکی دروست نەفیدەکەنو نە بەشێوەیەکی دروست لاساییاندەکەنەوە. نوسەری پۆستمۆدێرن نیوەی یەکەمی سەدەی ئێمەی لەژێر پێدایە، نەك لە پشتی خۆیەوە. نوسەری پۆستمۆدێرن بێخزان بەرەو دامێنی ساوێلکەی ئەخلاقی یان





هونەری، یان کەوتنە ناو داوی نوسەری پڕوپوچەوە، یان بوونە کۆیلەی پارەپەرستنو بەرتیلوەرگرتن، بەوشێوەیەی لەشەقامی مدیسۆنکراودا باوە، یان توشی سادەگیو خاوی درۆزنانە یان واقیعیبوون، خوازیاری چیرۆکێکە کە چەندانجار زیاتر لەبەرهەمە سەر سوڕهێنەرە مۆدێرنیستەکانی دوایی (دیارە بە پێی هەڵسەنگاندنی من) وەك "چیرۆکگەلو دەقگەلێك بۆ هیچ"ی سامۆئیل بیکیت، یان "ئاگری کەمڕەنگ"ی ناباکۆف، خاوەن هێزی راکێشانی دیموکراتیانە بێت.

نوسەری پۆستمۆدێرنیستی ناتوانێ هیوادار بێت بە پێی موریدانی شەیدای *جیمز جویز*و *ئیرۆینگ ڤالاس* بگاتو پێبەپێی ئەوان بجوڵێت — پێویست ناکات باسی خەڵکە رەشوڕوتە نەخوێندەوارەکە بکەین کە دەزگاکانی راگەیاندن مێشکیانی شتۆتەوە. بەلام ئەو دەبێت هیوادارو خۆشحاڵبێت کە بە "ناوەندی مەسیحیەکانی سەرەتا"(بەتەعبیری تۆماس مان)بگات: واتە بەرزتر لە موریدانی پسپۆری هونەری بالاو پێشکەوتوو...رۆمانی داواکراوو ئایدیالی پۆستمۆدێرنیستی بە جۆرێك سەروتر لە ململانێی نێوان ریالیزمو دژی ریالیزم، فۆرمالیزمو ناوەڕۆکخوازی، ئەدەبیاتی روتو ئەدەبیاتی بەرپرسیار، چیرۆکەکانی ناوەندە ئەدەبیەکانو چیرۆکە پڕوپوچەکان.. سەردەردێنێ. وێنەی جێی مەبەستی من جازی باش یان مۆسیقای کلاسیکیە: تاك لەئەنجامی گوێگرتنی لەداوی یەكو بەردەوام، یان بەخوێندنەوەو لێکۆڵینەوەی وردی پارچەیەکی مۆسیقا، سەرنجی بۆ چەندان شتی زیادە دەچێت کە جاری یەکەم سەرنجی لێنەداون، بەلام جاری یەکەم دەتوانێت ئەوەندە هەڵخەڵەتێنەر بێتو تاکە کەس — نەك هەر تەنیا پسپۆرەکان — ئەوەندە هەستیاربکات کە تاکە کەس لە دووبارەکردنەوەی توشی سۆزێکی زۆربێت".

ئەم هەوڵدانو گەڕانە بۆ دۆزینەوەی گوێگرانی بەربلاوتر لە مەسیحە سەرتاییەکان، بیناسازانو هونەرمەندانی پۆستمۆدێرنزمی دەکاتە هاوتای مۆدێرنە دواییەکانو لە دڵەراوکێ سیحراویو شەیداکەرانەی کە ئیهاب حەسەن لە دەیەکانی ١٩٧٠دا وەسفیکردبوو، جیادەکاتەوە. دیارە گەلێك ئامانجی دیاریکراو تایبەتی تر هەیە کە ئاراستەیەکی تایبەتی بە پۆستمۆدێرنیزم دەدەن.

بەلام لەبەرئەوەی بەردەوام ماناو نەریتی پۆستمۆدێرنیزم دەگۆڕێت، لەبەرئەوە





نەك هەر دەبێت ئەم چەمکە پێناسبکرێت، بەڵکو پێویستە مێژووە زەمەنیو بوارە شوێنیەکانی دیاریبکرێت. بۆ ئەم مەسەلەیە من پۆستمۆدێرنیزم بە جۆرێك دوالیزمی ناکۆك یان ڕەمزدانانی دوالیزمی دەزانم کە لەناو یان ناونیشانی دوولایەنەو ناکۆکیدا شاراوەیە: بەردەوامی مۆدێرنەو بڵندبونەوە لێی. گونجاو لەگەڵ ئەم لۆژیکەدا "پۆستمۆدێرن"ی جێی سەرنجی حەسەن بەشێوەیەکی سەرەکی مۆدێرنی دواییە، واتە بەردەوامی مۆدێرنەیە لەشکڵە توندڕەوو زیادەڕەوەکەیدا. هەندێك لەنوسەرانی وەك بارتو ئیکو لەگەڵ ئەم پێناسەیەدا دەبن، وەك چۆن هەندێك نوسەرو ڕەخنەگری وەك حەسەنو لیوتار، قبوڵیناکەنو ڕەدیدەکەنەوە. لەمجۆرە ڕێکەوتنو ڕێنەکەوتنانەدا، تێگەیشتنو لێکتێنەگەیشتنانەدا جۆرێك دیالەکتیکی مارئاسا هەیە کە بزوتنەوەی ناوبراو بەردەوام پیشانیداوە، جێگەی گومانە بەر لە کۆتایی ئەم بزوتنەوەیە پێچوپەنای گەلێك زۆر لەم هەڵقەیەدا بدۆزینەوە. بەڵام دەتوانین لەیەك شت دڵنیابین ڕاگەیاندنی مردن، تا ئەو کاتەی مۆدێرنیزمەکانی تر لەناو نەچوون، هەنگاوێکی پەلەو خێرایە.

## پەراوێزەکان:

1-Jencks, The language of Post-Modern Archiecture (London, Academy Editions,1991).p.23.
2-Charles Newman, the Post-modern Aura, The Actof Fiction in an Age of Infation (Evanston IL:Norhwestern Universtiy press, 1985)
3- Lesti FLedLer, "The New Mutants" (1965) in the Collected Essays of Leslie Fiedeler, Vol. II (N.Y.:Stein & Day, 1970), and A Fiedler Reader (Stein & day,1977),





pp.189-210.
4-Andreas Huyssen, "Mapping the Postmodern" New German Critique, No.33, Fall 1984, devoted to Modernity and Postmodernity (Millwaukee: University of Fall 1984).
5- Ihab Hassan, "The Question of Postmodernism", in Harry R.Gravin, ed, Romanicism, Modernism (Lewisberg, Toronto &London: Bucknell Univrsity of Chicago press, 1980) pp.117-26.
6- Mark C.Taylor. ERRING: A Postmodern AlTheology (Univrsity of Chicago press, 1984).
7) John Barth, "The Literaure of Repenishment: Postmodernist Ficition" The Atlanntic, Jan.1980, pp. 65-71.& Umberto Eco, " Postnodernist Fiction" The Atlantic, Jan.1980, pp.65-71& Umberto Eco,"Postmodernism, Irony. The Enjoyable" in Postscript to the Name of the Rose (New York: Harcourt, Brace Jovanovich, 1984).
8- Barth, op. cit,pp.70-71>

**سەرچاوە**

پست مدرنیتەو پست مدرنیسم: ترجمەو تدوین: حسینعلی نوژری، تهران — نقش جهان ١٣٧٩ — ص ٩٨.

# پۆستۆدێرنیزم لەهەموو جێگەیەکدا هەیە

**گلن وارد**





زاراوەی پۆستمۆدێرنیزم سێ دەیە زیاترە بەشێوەیەکی بەرفراوان سودی لێوەردەگیرێت.، بەڵام تاڕادەیەك چیرۆکی بڵاوبونەوەی لەرێگەی کلتورەوە ئاڵۆزە. بەدەر لەهەندێك بەکارهێنانی سەرەتایی ئەم زاراوەیە (کەهەندێکیان دواتر لەم بەشەدا باسدەکەین) پۆستمۆدێرنیزم ژیانی خۆی بەشێوەیەکی سەرەکی وەك وتەزایەکی زانکۆیی و پەیوەست بە هەندێك گۆڕانکاری دیاریکراو لەبواری هونەردا دەست پێکرد، بەڵام بەخێرایی وەك زاراوەیەکی وەسفی بۆ هەموو جێگۆڕکێ و گۆڕانە پێشهاتووەکان لە کۆمەڵگا و کلتوری هاوچەرخدا بەکارهات. بۆ نمونە بانگەشەی ئەوەکرا جیهان باوەڕی خۆی بە پێشکەوتنی تەکنیکی لەدەستداوە. لەورووەوە کە باوەڕبوون و باوەڕهێنان بە پێشکەوتنی تەکنیکی، سەربەقۆناغی مێژووی دیاریکراوی "مۆدێرنیزمی دەزانرا، زاراوەی "پۆستمۆدێرنیست" وەك وەسفێکی گونجاو بۆ قۆناغێکی شومی تازە لەبەرچاو دەگیرا. بەڵام پۆستمۆدێرنیزم لەناوەڕاستی دەیەی ١٩٨٠دا بوو بە کەرەسەیەکی فەڕەنسی کە بەگشتی بەکەڵکی هەموو "کارێك" دەهات.

لەناوەراستی هەمان دەیەدا لەبەرنامەکانی شەوی درەنگی تەلەفیزیۆن، بەرنامە هونەریەکانی رادیۆ و لەپەڕەکانی رۆژنامەکاندا، بەردەوام باسی پۆستمۆدێرنیزم لەبوارە جیاوازەکاندا (وەك تەلارسازی، سیاسەت و ئەدبیات) دەکرا. زۆرجار ئەم باسانە هەڵگری چەندان هەوڵدان بوون بۆ تێگەیشتن لەماناکانی پۆستمۆدێرنیزم، یان وەك زاراوەیەکە مۆدی رۆژ و پڕ هەراوهوریا کە زۆر زوو گەشەیکردووە، رەد دەکردەوە.

ئەمڕۆ لێشاوی ئەو کتێبانەی پەیوەندیان بە پۆستمۆدێنزمەوە هەیە، جێگەی خۆی بە بارانێکی ئارامداوە و وتوێژە ئاگراویەکانی لەوبارەیەوە، گۆڕاوە بە هەڵسەنگاندنێکی جدی و هوشیارانە. ئەم زاراوەیە لەهەندێك شوێندا (بۆ نمونە لەجیهانی هونەردا) و ئەگەر نەڵێین ئەو بابەتانەش کە ئاماژەی بۆ دەکات، لەحاڵەتی فەرامۆشکردنی بەئەنقەستدان. لەهەمانکاتدا لەجیهانی رۆژئاوادا، چەند رەهەندێکی تیورەی پۆستمۆدێرن، لە لقەکانی زانستە مرۆییەکاندا ئاوێتەبوون.

لێرەوە پۆستمۆدێرنیزم بەشێوەیەك بەردەوام دەبێت کە ئێمە (دیارە بەکەمێك







زیادەڕەویەوە) دەتوانین بڵێین بووە بە بەشێك لە قسەوباسەکانی رۆژانەمان. ئەمە پیشانیدەدات کە بایەخی ئەوەیی هەیە سەرنجێکی ورد لە دەورەبەری بدەین.

## مانا چەندلایەنیەکان

دەکرێ تەماشای بواری دەرونشیکاری بکەین، زیگمۆند فرۆید وەك سیمای دامەزرێنەری ئەم زانستە بناسینو دەستبکەین بە ناساندنی کەرەسە چەمکیە سەرەکیەکانی. بەڵام ناکرێت بەهەمان ئاسانی باسی پۆستمۆدێرنیزم بکەین. پرستمۆدێرنیست هەمەکیەکی فکری بەمانای وردی وشە نیە. بزوتنەوەیەکی فکری یەکپارچە، بە ئامانج و روانگەیەکی بڕاوەوە نیە و خاوەنی تیورەساز و وەڵامدەرەوەیەکی باڵادەست نیە.

ئەمە لەبەرئەوەیە کە بەگشتی هەر لقێك لە فەلسەفە بیگرە تا خوێندنەوە کلتوریەکان، لە جوگرافیاوە تا مێژووی هونەر، هەر هەمویان ئەم وشەیەیان وەرگرتووە. هەریەك لەم بوارانە چەندان کتێب و بڵاوکراوەیان لە گۆشەنیگای دیدی خۆیانەوە لەبارەی ئەم بابەتەوە بەرهەمهێناوە، پۆستمۆدێرنیزمیان بە زمانی خۆیان پێناسکردووە. بەکورتی پۆستمۆدێرنیزم پەرەیسەندووە. پرستمۆدێرنیزم بە بەکارهێنانی لەبواری جیاوازدا و ئاماژەکردنی بۆ شتگەلێکی جیاواز، مانای چەند لایەنی وەرگرتووە، و ئەو تێکستانەی لەمبارەیەوە بەرهەمهاتوون، لەبری ئەوەی ماناکەی رونبکەنەوە، زیاتر ئاڵۆزیان کردووە. کێشەکەش لێرەدایە کە مانای شێمانەی پۆستمۆدێرنیزم لە بوارێکدا، هیچ لەو مانایە ناچێت کە لە بوارێکی دیدا هەیەتی.

لێرەوە پۆستمۆدێرنیزم ئەمڕۆ بووە بە رێنمایکەری ژیانێکی ئاڵۆز. ئەوەندە ئاڵۆز کە لەراستیدا چەندان پۆستمۆدێرنیزم یان لانیکەم زۆر جۆری جیاوازی هەیە. پۆستمۆدێرنیزم لەلایەکەوە بەشێوەیەکی تەنزئامێز بۆتە ویردی زمانی کلتوری خەڵکی ولەلایەکی دیشەوە بۆتە بابەتی چەندان کتێب و بڵاوکراوەی زانکۆیی. هەندێك بوار لەم زاراوەیە بێزاربوون و بەدوای ئەڵتەرناتیڤیدا دەگەڕێن، هەندێك بواری تریش تازە پێیراهاتوون. هەندێك پۆستمۆدێرنیزم بە زاراوەیەکی کورتوپوخت بۆ دەربڕینی کۆمەڵێك گۆڕانکاری کۆمەڵایەتی و کلتوری دەزانن، و هەندێکی دی لەبارەی سودمەندی ئەم زاروەیەوە، دوودڵن.

تەنانەت لە قسەی ڕۆژانەی کەسانێکدا کە بە "چینە زۆربلێکان" ناودەبرێن، پۆستمۆدێرنیزم بەکارهێنانی جیاوازی هەیە. بۆ نمونە دەکرێت بەزاراوەیەکی ئالۆز بزانرێت بۆ دەربڕینی هەر بابەتێکی هاوچەرخ کە بەشێوەیەکی تەمومژاویین. یان دەکرێت بەشێوەیەکی تەمومژاویتر و وەك ناوێکی باو بۆ دەربڕینی ساتەوەختێکی دیاریکراو لەمێژوودا، بەکار بهێنرێت. سەرەڕای ئەمانە بوارە جیاوازەکان، لەوانە ڕەخنەی ئەدەبی کە لانکەی پۆستمۆدێرنیزمە، سەبارەت بەماناکانی بانگەشەی تایبەتی خۆیان هەیە و پێدەچێت تەنیا شتێکی مسۆگەر کە دەکرێت لەبارەی پۆستمۆدێرنیزمەوە بیلێین ئەوەیە کە ڕونکردنەوەی کارێکی ئەستەمە.

## زاراوەیەکی نەرم و گۆڕاو

ڕەنگە کۆی ئەو قسانەی کردمان گریمانەی ئەوە دروستبکات کە پۆستمۆدێرنیزم هەرچیەکە کە بمانەوێت، و ڕەنگە هەقیقەتێکی کەمی تێدا هەبێت. ئەم کتێبە لەرووی جیاوازەوە پیشانیدەدات کە پۆستمۆدێرنیزم دەتوانێت:

هەلومەرجێکی واقعی بێت لەناو کۆمەڵگادا.

* کۆمەڵێك بیرۆکە بێت کە هەوڵدەدات پێناسی ئەم هەلومەرجە بکات یان ڕونبیکاتەوە.

شێوازێکی هونەری، یان میتۆدێك بێت بۆ دروستکردنی شتەکان

وشەیەك بێت کە لەبوارە جیاوازەکاندا و بۆباسکردنی زۆرێك لەو مەسەلانەی سەرەوە، سودی لێوەردەگیرێت

ئەمانە تەنها چوار شێوەی بیرکردنەوە لەبارەی چیەتی پۆستمۆدێرنیزمەوەن. ڕەنگە شێوەی دیش هەبێت. دیارە جیاکردنەوەی ئەم شێوانە لەکرداردا، هێندە کارێکی ئاسان نیە. بۆ نمونە ئەگەر شتێك بەناوی شێوازی هونەری پۆستمۆدێرنەوە هەبێت، ئەوا تیورەسازێك پۆستمۆدێرنیزم ڕەنگە بیر لەوەبکاتەوە کە چۆن ئەو شێوازە پەیوەندی بە هەلومەرجی پۆستمۆدێرن لە کۆمەڵگادا هەیە یان سەرچاوەی لێوە گرتووە.

گەرچی لەم کتێبەدا تاڕادەیەك سود لەهەموو شێوازەکانی سەرەوە وەرگیراوە، بەڵام شێوازی دوهەم نزیکترین شێوازە کە لەم کتێبەدا وەرگیراوە. لەبری ئەوەی





هەوڵبدەین پێناسێکی گشتگیر پێشکەشبکەین، پۆستمۆدێرنیزم وەك کۆمەڵێك دیدی هەمەڕەنگ لەبارەی هەلومەرجی هەنوکەمانەوە لەبەرچاوگیراوە. ئەمە بەمانای ئەوەیە کە ئێمە پۆستمۆدێرنیزم نەك وەك شتێك، بەڵکو وەك کۆمەڵێك چەمك و باس لەبەرچاودەگرین. تەنانەت ڕەنگە لەمە زیاتریش بڕۆین و بڵێین دەکرێ پێناسی پۆستمۆدێرنیزم، وەك کۆمەڵێك چەمك و باس لەباری خودی پۆستمۆدێرنیزمەوە بکەین.

## سەردەمی تازە

پۆستمۆدێرنیزم سەرەڕای نەرمی زۆر، بەڵام بێمانا نیە و تێگەیشتنیشی هێندە سەخت و دژوار نیە، دیارە ئەم چەمکە هەروا مانای تەمومژاوی و دەستەبژێرانەی هەیە کە دەبێت بەردەوام لەگەڵ ئەو وشانەدا کە ڕەگوریشەی بەمانا ڕۆشنبیرانەی هەیە، دەستوپەنجە نەرمبکەین ئەگەرچی ئەو تیورانەی پەیوەندیان بە پۆستمۆدێرنیزمەوە هەیە بەشێوەیەکی زۆر ئەبستراکت تاوتێدەکرێن، بەڵام دەکرێ بەهەمان ئەندازە باسی بابەتە دیاریکراوەکانیش بکات. چەندان بابەتی قابیلی ناسین هەن کە بەردەوام خوێندنەوە جیاوازەکانی پۆستمۆدێرنیزم لەسەر تەوەرەیان دەسوڕێنەوە و فەسڵەکانی ئەم کتێبەش بەشێوەیەکی گشتی لەسەر بناغەی ئەو تەوەرانە ڕێکخراوە. ئەم بابەتانە هێندە فراوان لەبەرچاو گیراون کە لەگەڵ مانای ژیان لەزەمەنی هەنوکە و باشترین شێوەی وەسفکردنی بگونجێن.

ئەوان گریمانەکەیان لەسەر ئەوە دادەمەزرێنن کە کۆمەڵگا، کلتور و شێوازی ژیانی ئەمڕۆ جیاوازیەکی بەرچاوی لەگەڵ سەد یان پەنجا یان تەنانەت سی ساڵی ڕابردودا هەیە.

ئەوانە گرنگی بەبابەتی دیاریکراوی وەك گۆڕانی دەزگاکانی ڕاگەیاندن، کۆمەڵگای مەسرەفکەر و تەکنیکبوونی زانیاریەکان دەدەن

ئەوان بڕوایانوایە ئەم گۆڕانانە کاریگەری لەسەر تێگەیشتنی ئێمە بۆ بابەتی ئەبستراکتر، وەك مانا، شوناس و تەنانەت واقع دادەنێت.

ئەوان بانگەشەی ئەوە دەکەن شێوازە کۆنەکانی شیکردنەوە چیدی سودیان نیە، و دەبێت بۆ تێگەیشتن لەسەردەمی تازە، شێواز و زمانێکی گفتوگۆی تازە دابهێنرێت.





## پێش مێژوو

ڕەنگە گەورەترین کێشەی پۆستمۆدێرنیزم، خودی ئەم وشەیە بێت. Post بەمانای "پاش"ە و دەکرێت مۆدێرنیش بەمانای هەنوکەیی وەربگرین. کەوابوو دەکرێت پاش مۆدیرن بین. چۆن دەتوانین دەستوپەنجە لەگەڵ چەمکێکی ئاوا ناکۆکئامێزدا نەرمبکەین؟ یەکێك لەو کارانەی دەتوانین بیکەین، ئەوەیە سەیری مێژووی ئەم زاراوەیە بکەین.

ئەگەرچی تەڤینەوەی پۆستمۆدێرنیزم بەدرێژای دەیەی رابردوو رویدا، بەڵام ئەم هەلومەرجە مۆدێرنە سەردەمێکی پێشوتریش لەئارادا بووە. ئەم زاراوەیە دەرکەوتنی سەرەتایی و تاکانەی هەبووە و ئەمەش خۆی بە " پێش مێژووی" پۆستمۆدێرنیزم دەژمێرێت. بەرلەوەی باسی هەندێك لەم شتانە بکەین، دەبێت ئەوەمان لەبیر بێت کە نابێت ئەم نمونانە "پێش مێژووییانە" بە بەشتێکی براوە بزانین. ئەنجامدانی ئەمکارە دەبێتە هۆی ئەوەی کوێرانە ڕێگەکە ببڕن. چونکە مانای پۆستمۆدێرنیزم لەو سەردەمەدا، هەمیشە لەمانای هەنوکەیی پۆستمۆدێرنیزم ناچێت. لەگەڵ ئەمەشدا ئەو شەش نمونەیەی لەخوارەوە هێنراونەتەوە بایەخی تاوتوێکردنیان هەیە، چونکە لەهەندێك روی سەرنجڕاکێشەوە ، لەگەڵ جۆرەکانی ئەمڕوی پۆستمۆدێرنیزمدا یەك چەتریان هەیە. وەك دواتر دەبینین ئەوانە تاڕادەیەك پێشەنگی زاراوەکان و ئەو باسانە بوون کە پەیوەندیان بە پۆستمۆدێرنیزمەکانی دواتر و پەرەسەنوترەوە هەیە. هەوڵەکانی مێژوونوسان بۆ دۆزینەوەی یەکەمین سودوەرگرتن لەم زاراوەیە، هێشتا بەری نەگرتووە، بەڵام دەرکەوتەکانی ئەم بابەتانەی خوارەوە دەگرێتەوە.

## دەیەی ١٨٧٠

یەکێك لە هونەرمەندە ئینگلیزیەکان بەناوی جۆن واتکینز جیمن ئەم زاراوەیەی بۆ وەسفکردنی وێنەکێشانێك بەکارهێنا کە بەبڕوای خۆی لەوێنەکێشانی ئەمپرسیۆنیست فەرەنسی وەك کلۆد مۆنە یا ئۆگۆست رتوا کە دیبونی،





پێشکەوتوترە. بەرهەمی هونەرمەندانی ئەمپرسۆنیست بەتازەترین دەرکەوتی سەردەمی مۆدێرن _بەدەربڕینێکی دی بەمۆدێرنترین هونەری مۆدێرن- دەزانران. پۆستمۆدێرنیزم لەسەردەمی جیمندا ئاماژەی بۆ هونەری تازەی (پاش ئەمپرسێۆنیستی) دەکرد کە پێ بۆ لەهەوڵدانی ئەمپرسێۆنیستی بۆ بەدەستهێنانی دەرکەوتە ساتەوەختیەکانی سروشت لە وێنەکیشاندا، زیاتر دەنێت.

### ١٩١٧

نوسەری ئەڵمانی رۆدۆڵف پانۆویتز باسی "مرۆڤە پۆستمۆدێرن"ە نەهلیستیەکان و نائەخلاقیەکانی دەکرد کە لەبەها سەقامگیریەکانی شارستانێتی ئەوروپا دورکەوتنەتەوە.

### ١٩٤٧

دی. سی. سامرۆل لەکورتکراوەیەکدا کە بۆ بەرگی شەشەمی کتێبی خوێندنەوەی مێژوو(١٩٤٧)ی ئارنۆڵد تۆین بی مێژوونوسی ئینگلیزی پێشکەشی دەکات، وا باسیدەکات کە دەکرێت شێوەی وردبونەوەی تۆین بی بۆ مێژوو بە "پۆستمۆدێرنانە" ناوبنرێت. پاشان توین بی ئەم زاراوەیەی لێوەرگرت، و لەبەرگەکانی تری بەرهەمەکەی خۆیدا، چەمکی "سەردەمی پۆستمۆدێرن"ی هێنایە ئاراوە. ئەم سەردەمە قۆناغێك بوو کەدوابەدوای سەردەمی تاریکی (١٠٠٠-٤٧٦) و سەردەمی ناوەڕاست (١٤٧٥-١٠٧٥) و سەردەمی مۆدێرن(١٧٨٥-١٤٧٥) دەهات. "مۆدێرن" لەڕوانگەی توینی بیەوە قۆناغی سەقامگیری و پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی بوو. بەڵام لەنزیکی ١٨٧٥دا شارستانێتی رۆژئاوا هاوکات لەگەڵ پەرەسەندنی شارە پیشەسازیەکاندا، روبەڕوی کێشەی ئاژاوە، ترس و تۆقاندن و شۆڕش بۆوە.

### ١٩٥٧

برنارد رۆزنبرگ مێژوونوسی کلتوری ئەمەریکایی هەلومەرجی تازەی ژیانی لەکۆمەڵگای ئەو کاتەدا ناونا "پۆستمۆدێرن". ئەو بڕوای وابوو گۆڕانی کۆمەڵایەتی و





کلتوری گرنگ لەحاڵەتی روداندایە. ئەم گۆڕانانە دەرکەوتنی دەسەلاتی تەکنیکیانە و دروستبوونی کلتوری جەماوەری یان "لێکچوو" دەگرێتەوە.

بەرهەمەکانی رۆزەنبرگ و توین بی و ئەوانی دی نمونەگەلێکی باشمان دەدەنێ بۆئەوەی تێبگەین چۆن شێوەی بەکارهێنانی سەرەتایی زاراوەی پۆستمۆدێرنیزم، هەمیشە لەگەڵ شێوەی بەکارهێنانی هەنوکەی ئەم زاراوەیەدا یەکسان نیەو ناگونجێت. لەبەرهەمەکانی ئەم نوسەرانەدا گۆڕانی بەهاکان و هەلومەرجی کۆمەڵگا، بەشێوەیەکی کاریگەر بەدەرئەنجامی پەرەسەندنی پیشەسازی دەزانرێت. سودوەرگرتنی ئەم نوسەرانە لەزاراوەی پۆستمۆدێرنی پسپۆڕیانە و بەزەبر ئالۆز و تێکەڵ و پێکەڵ بوو. لەو روەوە پسپۆڕیانە بوو کە هەوڵیدەدا جیاوازی جیهانی هاوچەرخ لەرەهەندە دیاریکراوە سیاسی، ئابوری و فەلسەفیەکانی سەردەمی "مۆدێرن"دا پیشانبدات. لەو روەشەوە بەزەبر ئالۆز و تێکەڵوپێکەڵ بوو کە قۆناغی تێپەڕ لەقۆناغێکەوە بۆ قۆناغێکی دی (لەکۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەوە تا سەرەتاکانی سەدەی بیستەم) زۆرتر بەقۆناغی مۆدێرنە بەناوبانگە.

**١٩٦٤**

لسلی فیدلەر دەست بەوەسفی "پاش" کلتوری دەکات کە بەها دەستەبژێریانەی هونەر و ئەدەبیات پڕ بەرهەمی مۆدێرن، ڕەددەکاتەوە.

**١٩٦٨**

رەخنەگری ئەمەریکی لیو شتاین برگ سەرنجی لەوەدا کە لەهونەری دیداری هاوچەرخدا (وەك هۆنەری پۆپ) ئارەزوی رەنگدانەوەی سروشت گۆڕاوە بە ئارەزوی رەنگدانەوەی "بێگیانی" پرۆژە دروستکراوەکانی دەستی مرۆڤ. شتاین برگ ئەم ئارەزووە بە پۆستمۆدێرن ناودەنێت، چونکە لەکاتێکدا جۆرە کۆنەکانی هونەری مۆدێرن (لە ئەمپرسیۆنیزم بەدواوە) گرنگیان بە بەچنگهێنانی هەقیقەتی دیداری یا هەستی دەدا، هونەری پۆپ ئارەزوی لە شتە دروستکراوەکان هەبوو.

دوو بواری گرنگ هەن کە تیایاندا پۆستمۆدێرنیزمە جیاوازەکانی (پێش مێژوو) لەگەڵ مانا هەنوکەییەکانی پۆستمۆدێرنیزمدا لەژێر چەترێکدا بوون. یەکەم بوار





پەیوەندی بەو ئایدیایەوە هەیە کە ئێمە چوینەتە ناو قۆناغێکی مێژووییەوە کە خاوەن خەسڵەتی تایبەت بەخۆیەتی. دوهەم بوار گرنگی بەدابەشکردنێکی گرنگ(بەهەمان ئەندازەش ئاویتەیەکی گرنگ) لەنێوان تیورەکانی پۆستمۆدێرنیزم لەکۆمەڵگاداو تیورەکانی پۆستمۆدێرنیزم لە هونەرەکاندا دەدات. لەکۆتایی ئەم بەشەدا تاوتوێی ئەم دوو لایەنە دەکەین.

## مۆدێرنە و رۆشنگەری

هەندێك لە پێشەنگانی پۆستمۆدێرن باسی چوونی کۆمەڵگا بۆ قۆناغێکی تازە دەکەن. ئەوان بڕوایانوایە لەقۆناغێکی مێژوویدا بەخەسڵەتی بێ وێنەوە دەژین کە لەهەموو لەهەر قۆناغێکی تری مێژوویی جیاوازە. بەتایبەتی دەبێت لەقۆناغی مۆدێرنی پێشوی جیابکرێتەوە. مێژوونوسان لەرووی جیاوازەوە وەسفی چیەتی وردو مێژووی وردی سەرەتا و کۆتایی ئەم سەردەمەیان کردووە. ئەم وەسفە هاوکاتە لەگەڵ بڕوابوون بەم شتانەی خوارەوە:

★پێشکەوتن

★خۆشبینی

★عەقلانیەت

★گەڕان بەدوای هوشیاری رەها لە زانست، تەکنیککاری، کۆمەڵگا و سیاسەتدا.

★بڕوابوون بەوەی بەدەستهێنانی هوشیاری لەبارەی خودی واقعیەوە، تەنها بناغەیەکی تری بەدەستهێنانی هوشیاریەکانی ترە.

لەباسەکانی پەیوەندیدار بەپۆستمۆدێرنیزمەوە، ئەمجۆرە بەهایانە زۆرجار بەدروشمەکانی رۆشنگەری ناودەبرێن. بەدەربڕینێکی تر ئەم بەهایانە هاوکاتە لەگەڵ سەردەمی عەقڵ (یان رۆشنگەری) کە رەگی لەئەوروپای سەدەی حەڤدەو هەژدەهەمدا هەیە، و بەخێرایش کاریگەری لەسەر سەرجەم بیرکردنەوەی رۆژئاوا دانا. وەك پێرستەکەی سەرەوە پیشانیدەدات، دروشمە سەرەتاییەکانی رۆشنگەری بە گوتارێکی عەقلانیەوە وەك بنەمای رێنماکەری سەرجەم زانین، و باوەڕ بەوەی تەنها پێشکەوتن لەشێوازی فکری دەتوانێت جیهانێکی پڕ لەرێکخستن، ئاسایش، تێگەیشتنی کۆمەڵایەتی و خۆشبەختی دەستەبەر بکات، دەستوپەنجەی نەرمدەکرد.





دیاره ئەم زاراوەیەی پرۆژەی رۆشنگەری یا پرۆژەی مۆدێرنە روبەروی چەندان نەیارێتی لەناوخۆدا بۆتەوە، ئەم قۆناغەش وەك هەر قۆناغێکی مێژوویی دی هەڵگری دودڵی و وتوێژگەلێك بوو. پێدەچێت باسکردنی سەردەمی مۆدێرن (بەو مانایەی مەبەستی توین بی بوو)کە هەڵگری یەك پرۆژە بووە یان خۆی یەك پرۆژەی یەکتا بێت، کارێکی زێدەڕەوانە بێت. لەگەڵ ئەمەشدا فەلسەفەی گشتی ئەم قۆناغە زۆرجار لەرووی باوەڕەوە بەو بابەتە پێناسەدەکرێت کە پێشکەوتنی کۆمەڵگا لەرێگەی کامڵبوونی لەسەرخۆی زانستە مرۆییەکانەوە (لەرێگەی زیادکردنی خودهوشیاری و شێوازی وردی عەقڵیەوە) بەدەست دێت. بیریارانی وەك کانت، هیگڵ و ڤۆڵتێر هاورێی ئەم نەریتە بوون. لەژێرخانی ئەم فەلسەفەیدا سەرمایەگوزاری لەسەر مافە گشتگیرەکانی مرۆڤ هەیە، کە دواجار بووە هۆی شۆرشی فەرەنسی و راگەیاندنی مافەکانی مرۆڤ لە ویلایەتە یەکگرتووەکاندا. لەژێرخانیدا بیریارانی رۆشنگەری هەن کە هاوکات لەگەڵ بروابونیاندا بەگشتگیری بەهاکانی خۆیان، خۆبەزل زانانە ئەوروپا بە روناکترین و پێشکەوتوترین بەشی دنیا دەزانن. ئەوروپا بە شارستانیتر لە شوێنەکانی دنیا دەزانرا، ئەمەش دەبووە هۆی هەستێکی ترسناك لەسەر بناغەی ئەوەی دەکرێت وڵاتەکانی دی و رەگەزەکانی دی کۆلۆنیال بکرێن و وەبەربهێنرێن، یان باشتر بکرێن. وەك لای ئارنۆلد توین بی تێبینیمان کرد، هەندێك لێکۆڵینەوەی سەرەتای لەبارەی پۆستمۆدێرنیزمەوە، وەسفی لەناوچوونی ئەم بەهایانە و دابڕانی بنەڕەتی لەم بەهایانە دەکات.

ئەم لەناوچون یان دابڕانە باسکراوە، تا ئەمرۆش بەشێکی گرنگی باسەکانی ئەمرۆیە لەبارەی پۆستمۆدێرنیزمەوە. زۆرجار بانگەشەی ئەوە دەکرێت کە کۆمەڵگاکانی ئەمرۆ توانای بینینی ئەم دروشمانەی لەدەستداوە. کۆمەڵگای پۆستمۆدێرن لە دژایەتی راستەوخۆدا لەگەڵ خەسڵەتەکانی سەردەمی مۆدێرن کە لەسەرەوە باسکرا، زۆرجار بەشێوەیکی نێگەتیڤ و هاوکاتە لەگەڵ ئەم تایبەتمەندیانەی خوارەوە:

★کۆتاییهاتن

★بەدبینی

★ناعەقلانیبوون







★رەخنەگرتن لەزانینی رەها.

رۆماننوسی ئیتاڵی و تیورەسازی کلتور ئەمبرتۆ ئیکۆ لەتایبەتمەندیە بەربڵاوەکانی ساتەوەختی مێژوویی هەنوکەدا، گەرانەویەك بۆ دیدی سەردەمی ناوەڕاست دەبینێت و بەمشێوەیەش بۆتە هۆکاری تێکئاڵانی هەرچی زیاتری مەسەلەکان. لەلایەکی دیەوە زۆرێك لەبیریارانی پۆستمۆدێرن لەبری حەسرەت خواردن بۆ رمانی رۆشنگەری، چالاکانە بەگژ ئەو پێشگریمانانەدا دەچنەوە کە لەرۆشنگەریەوە هاتوون، یان لەناوچونی وەك فاڵێکی باش تەماشادەکەن. وەك دواتر دەیبینین ئەم قسەیە لەبارەی زوربەی ئەو بیریارانەوە راستە کە لەم کتێبەدا باسیاندەکەین. هەرچی زیاتر بچینە پێشی، بەڵگەکانی ئەوان بۆ ئەنجامدانی ئەمکارە رونتر دەبێتەوە، بەڵام لە ئێستادا دەتوانین تێبینی ئەم بابەتە بەربڵاوانەی خوارەوە بکەین:

★لەناچوونی جیاوازی باوی نێوان کلتوری باڵا و نزم

★سەرنجدان لەو خاڵەی کە ژیانی ئێمە بەشێوەیەکی روو لەزیاد دەکەوێتە ژێر دەسەڵاتی دەزگا دیداریەکانەوە.

★ پرسیارکردن لەبارەی ئایدیاکانی پەیوەندیدار بەمانا و پەیوەندیەکانەوە، و لەبارەی ئەوەشەوە کە نیشانەکان چ ئاماژەیەك بۆ دنیا دەکەن.

★هەستێك لەسەر ئەو بناغەیەی پێناسەکانی شوناسی مرۆیی، لەگۆڕاندایە یان دەبێت بگۆڕێت.

★گۆمان لەو چیرۆکانەی کە بۆ رونکردنەوەی " رەگەزی مرۆیی" و لەبارەی ئایدیای پێشکەوتنەوە دەیڵێن.

## مۆدێرنەو نوێکردنەوە

ناوێکی دی سەردەمی مۆدێرن، مۆدێرنەیە. مۆدێرنە لەگەڵ بیرۆکەی

نوێکردنەوەدا پەیوەستبووە. نوێکردنەوە پیشاندەری رۆژانەکردنی شتێك، یان بەرێخستنی لەگەڵ شتێکدایە کە بە مۆدە و پێویستی ئەمرۆ دەزانرێت. بۆ نمونە ئەگەر باسی تازەکردنەوەی مەتبەخەکەی خۆمان بکەین، مەبەستمان ئەوەیە یەتازەترین ئامرازەکان و دیکۆرەکانی شێوازی "ئەمڕۆ" دەوڵەمەندی بکەین- دیارە ئەم رۆژانە رەنگە شێوازی "ئەمڕۆ" بەمانای خاوەنداریێتی شێوازی "بەیانی"(ئایندەگەرانە) یان "دوێنێ"(کۆن) بێت. تازەکردنەوەی شوێنی کار (دوکان، پۆلی وانەخوێندن، خەستەخانە یان بەڕێوبەرایەتی)یش بەگشتی بەمانای رۆژانەکردنێتی بە داهێنراوە تەکنینکیەکانی هەنوکە و جێبەجێکردنی دوا ئایدیا لەبارەی بەدەستهێنانی کارایی و زیادکردنی بەرهەمهێنان تادوا سنوری شیاو. دەکرێت ئەم پرۆسانەی تازەکردنەوە لەزوربەی بەشەکانی ژیاندا، لە پزیشکیەوە بیگرە تابەرنامەرێژی شار، لەپەروەردەوە تا پەیوەندیەکان رێگەی دوردا ببینین. دیارە ئەم پرۆسەیە کۆتایی نایەت. هێشتا هیچ بەسەر بەکارهێنانی شتێکی تازەدا نەڕۆیشتووە، کە لەگەڵ مۆدێلێکی تازەتر و باشتردا چاکیدەکەین یان دەیگۆڕین. لێرەوە شێوازەکانی جلوبەرگ و مەتبەخ بەردەوام لەمۆدە ئەکەون، تۆزەکانی جلشتن بەردەوام "نوی دەبنەوە" و "باشتر دەکرێن" و فەرمانبەرانیش بەردەوام رێگەی باشتر بۆ "باشترکردنی" هێزی کاری خۆیان پەیدا دەکەن. گۆڕانێکی ئاوەها دینامیکی بەردەوام و خێرا، بەتایبەتی لە کۆتای سەدەی نۆزدە و سەرەتای سەدەی بیستەمەوە، خێرایەکی زۆرتری وەرگرتووە.

## لە مۆدێرنەدا یان پاش ئەو؟

ئەم هۆکارانە و هۆکاری دیش هەرهەمویان پێکەوە بە بەشی دانەبڕاوی قۆناغێکی تایبەتی لەمێژووی کۆمەڵایەتیدا لەبەرچاو گیراون، قۆناغێك کە پیشاندەری جیاوازیگەلێکی زۆرە لەنێوان کۆمەڵگای کلاسیکی و کۆمەڵگای هاوچەرخدا. دەکرێت ئەو کۆمەڵگایەی ئەمرۆ ئێمە لەناویدا دەژین، بەهۆی بوون یان توندبوونی خەسڵەتە گرنگەکانی مۆدێرنە کە لەسەرەوە هێنامانەوە، تەفسیر بکرێت، بۆ نمونە روونە کە شێوە تازەکانی پەیوەندی هێشتا لەحاڵەتی گەشەکردن و پەرەسەندندان (ئەنتەرنێت و مۆبایل دوو نمونەی ئەم دواییانەن)، شارەکان درێژە بە





پەرەسەندی ئاسۆی و شاقوڵی خۆیان دەدەن، و ئەم پرۆسەیەی رۆژانەبوون (لانیکەم لەبوارەکانی وەك مۆدەدا) بەخێرایی لەئارادایە.

لەبەر ئەم هۆیانە هەندێك خوێندنەوەی پۆستمۆدێرنیزم (چ لایەنگران و چ نەیارانی)، پۆستمۆدێرنیزم نەك بە دابڕان لەمۆدێرنە، بەڵکو بەدەرئەنجامی گەشەکردنی دەزانن. لەم خوێندنەوەیەدا پۆستمۆدێرنیزمیش چارەنوسێکی وەك نوێکردنەوەی دەبێت، و لانیکەم بەدوا خاڵی پێشکەوتنی نوێکردنەوە دەناسرێت. بۆ نمونە لە فەسڵی شەشەمی ئەم کتێبەدا دەبینین چۆن دەکرێت گۆڕانەکانی ئەم دواییانە لە تەکنیکی سیبرنیتکدا، بە تیورەکانی پۆستمۆدێرنیزمەوە ببەستینەوە. لەگەڵ ئەمەشدا دەکرێت ئەم گۆڕانانە بە دوا بەرهەمی پرۆسەی نوێکردنەویەکی بێکۆتایی بزانرێت کە بەرلەوەی بەشێك لەقۆناغێکی مێژووی تایبەتی هاوچەرخ و دابڕاو لەرابردوو بێت، بە شۆڕشی پیشەسازی دەستی پێکردووە.

نمونەیەکی دی تەلەفیزێۆنە کە هەندێکجار وەك هێمای پۆستمۆدێرنیزم دەزانرێت. ئەمڕۆدەکرێت تەلەفیزێۆن بەتواناکانی پەخشی فەزایی، خاوەنداریێتی کەناڵە جیاوازەکان و راپۆرتە راستەخۆکان لەناوچەکانی جەنگەوە، بە تازەگەریەکی تایبەتی بزانرێت. بەڵام بەهەمانشێوە دەکرێت بە بەرهەمی دەرکەوتنی دەزگاکانی راگەیاندنی بزانین کە لە چارەکی دوایی سەدەی نۆزدەوە دەست پێکرد. بۆ نمونە لەو سەردەمەدا بوو کە مارکۆنی تلگرافی داهێنا و برایانی لۆمبر لەکۆمەڵێك ئەزمون و دۆزینەوەی وێنەگری، سینەماتۆگرافیان دروستکرد. بەمشێوەیە دەکرێ تەلەفیزێۆن بەهۆی سەرجەم تازەیی و ئاڵۆزی تەکنیکیانەی ئاشکرای، بەبەرهەمێکی تری مۆدێرنە بزانرێت.

ئەو پرسیارە کە ئایا پۆستمۆدێرنیزم دابڕانێکە لە قۆناغێکی کۆنتر، بەشێك لەسوڕانەوەی بێکۆتایی گۆڕان، یان رەهەندێکی تری سەردەمی مۆدێرنە (ورەنگە قۆناغی پەتی پۆستمۆدێرن هێشتا بەڕێوە بێت) بابەتی چەندان باسی جێی سەرنج بووە. بیروڕای جیاواز لەبارەی پۆستمۆدێرنیزمەوە بەشێوەیەکی سەرەکی پەیوەندی بە شێوەی وێنەکردنی جەدوەلی زەمەنی مێژووەوە هەیە. پەیوەندی بەوەوە هەیە خەڵکی هێڵەکانی نێوان قۆناغە مێژوویەکان لەکوێدا دەکێشن. وەك هەر تیورەسازێکی پۆستمۆدێرنیستی رەنگە بانگەشەی بۆ بکات، ئەم قۆناغانە بەرلەوەی





درێژکراوە واقعیەکانی زەمەن یان سەرەتا و کۆتاییە واقعی و گرنگەکان بن، شێوەی دروستکراوی مرۆڤن بۆ پێکەوەلکانی هەنوکە و رابردوو.

وەك چۆن ناکرێت هێڵێکی جیاکەرەوە لەنێوان سەردەمی ناوەڕاست و مۆدێرندا بکێشین، هیچ جیاکردنەوەیەکی رون و دیاریکراویش لەنێوان مۆدێرن و پۆستمۆدێرندا نیە. ناتوانین پەنجە بۆ یەك مێژوو درێژ بکەین و بڵێین کە ئەم مێژووە پیشاندەری دابڕان یان خاڵی تێپەڕینێکە لەنێوان ئەو دوو قۆناغەدا.

## جیاکاریەك

ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ دواوە و تەماشای شەش بەکارهێنانی سەرەتای پۆستمۆدێرنیزم بکەین، دەبینین کە دەکرێت هەموویان بەسەر دوو وتەزای سەرەکیدا دابەشبکەین: لەلایەکەوە پۆستمۆدێرنیزم بە روداوێکی کۆمەڵایەتی و ئابوری دەزانرا کە بەشێوەیەکی سەرەکی بەرهەمی گەشەکردنی پیشەسازی فرە بووە. لەلایەکی دیەوە پۆستمۆدێرنیزمێك هەبوو کە ئێمە بەئاسانگیریەوە، بەمەسەلەیەکی کلتوری، واتە بە مەسەلەیەکی پەیوەندیدار بەوگۆڕانانەی لەهونەرەکاندا رویداوە، ناوبنێن.

ئەم جیاکاریە لەنێوان مەسەلەی کۆمەڵایەتی و مەسەلەی کلتوریدا، لەهەندێك روەوە بەتەواوی دروستکراوە. ئەم دوانە تارادەیەك زانیاری بەیەك دەگەیەنن کە لەواقعدا ناکرێت لەیەك جیابکرێنەوە. بۆ نمونە ئایا ئێوە تەلەفیزێۆن بە وتەزایەکی کۆمەڵایەتی دادەنێن یان کلتوری؟ هەروەها بۆ دەبێت هونەرەکان بەجیا لەمەسەلە کۆمەڵایەتیەکان بزانرێت؟ لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا کاتێك باسی پۆستمۆدێرنیزم دەکەیت، سودمەند دەبێت گەر ئەم جیاکاریەت لەزیهندا هەبێت. بۆ نمونە رۆمانەکانی ئەم دواییانە کە بە پۆستمۆدێرنیزمی ناودەبرێن (وەك ئەو رۆمانانەی فۆلز، کۆرت ونگات یان دن دبلیو نوسیویانە) دەکرێ بەدروستی بەم ناوە ناوببرێن، چونکە ئەم رۆمانانە رەنگدانەوەی یان ئاشکراکەری هەلومەرجە کۆمەڵایەتیەکانی پۆستمۆدێرنن، یان لەبەرئەوەی کە لەگەڵ هەندێك رەگەزی پۆستمۆدێرن کە لەشێوەکانی تری هونەردا هەیە، لێکچونیان هەیە. بەڵام دەکرێت ئەوانە لەوروەوە بە پۆستمۆدێرنیستی ناوببرێت کە دەکرێ بگوترێت پاش مۆدێرنیزمی ئەدەبی رێگەیان بۆ شوێنێکی گرنگ کردۆتەوە. هەنوکە بێ ئەوەی بمانەوێت مۆدێرنیزمی ئەدەبی







پێناسبکەین (ئەمەش مەسەلەیەکی هەمیشەییە)، تێبینیکردنی ئەم خاڵە پێویستە کە مۆدێرنزیمی ئەدەبی بەناچار وەك مۆدێرنە نیە لەکۆمەڵگادا بەشێویەکی گشتی.

بەزمانێکی تەکنیکی مۆدێرنیزمی ئەدەبی ئاماژە بۆ گۆڕانە کلتوری و هونەریەکان (بۆ نمونە لە مۆسیقا، ئەدەبیات، هونەر، فیلم، تەلارسازیو لەم باباتە شتانە) دەکات، لەکاتێکدا مۆدێرنە ئاماژە بۆ هەلومەرجە کۆمەڵایەتیەکان و ئەو"فەزایەی لێی بەرهەمهاتووە" دەکات.

لەتیورەکانی پۆستمۆدێرندا هەندێکجار لایەنگری لەم جیاکاریە کراوە و هەندیکجاریش دژایەتیکراوە. بەڵام ئەمرۆ پۆستمۆدێرنیزم خزمەت بەهەردوکیان دەکات. من بۆ رەچاوکردنی هاوئاهەنگی لێرەدا، دەمەوێت پۆستمۆدێرنیزم بۆ وەسفکردنی هەر دوو ئەم شتە بەکاربهێنم.

## ئەنجامگیری

تائێرە پۆستمۆدێرنیزمان بەشێوەیەکی سەرەکی بەدیدێکی نێگەتیڤەوە تێبینیکردووە. تێبینی ئەو تێکەڵیانەی کە بەناچار یان بەهۆی بەناوبانگبوونی پۆستمۆدێرنیزمەوە لەناویدا هەیە کردووە. هەندێك هێڵی هەمەکی رەوتەکانی تیورەی پۆستمۆدێرنمان پیشاندا و گوتمان کە پۆستمۆدێرن چی نیە. ئەوەی کۆ خۆمان لێپاراستووە، پێشکەشکردنی پیناسێکی رون و یەکتایە لەبارەی چیەتی پۆستمۆدێرنیزمەوە.

کاتێك خەڵك دەپرسن پۆستمۆدێرنیزم چیە، پتر بەدوای شتێکی یەکتا و قابیلی بینینەوەن، بۆ ئەوەی ئەم ناوەی لێبنێن. ئەو شتە دەشێت شتێك، هەلومەرجێکی مرۆیی یان هەر شتێکی دی بێت. بەهەرحاڵ شتێکە کە گریمانە لەسەر بوونی دەکرێت. لێرەوە گریمانەکە بەوشێوەیە کە دەکرێت لەزگەی پۆستمۆدێرنیزم بێ چەند و چون پێوەی بلکێنرێت. دەکرێ ئەو شتە پێناسبکرێت و پاشان خۆشحاڵ و بەدڵنیاییەوە لەوەی هوشیاریمان بە چیەتی پۆستمۆدێرنیزم پەیداکردووە، بگەڕێینەوە ماڵێ. بەڵام زۆرێك لە تیورەسازانی پۆستمۆدێرنیزم بانگەشەی ئەوە دەکەن، کە روانی شتێکی وا لە جیهانی واقعدا مومکین نیە. ئەوان بڕوایانوایە کە شتەکانی بێ چەندوچون پۆستمۆدێرن، لەجیهاندا ناسورێنەوە تا چاوەڕێ بن کە من

و ئێوە بەشێوەیەکی بابەتی پێناسیان بکەین و بایەخی پۆستمۆدێرنیان پێببەخشین. ئەوەی شتێك (جا چ تیورەیەك، بەرهەمێکی هونەری یان ڕەهەندێکی کۆمەڵگا بێت) ناوبنێین پۆستمۆدێرن، تەنها لەرێگەی دۆزینەوەی هەقیقەتی بابەتی هەبوو لەچوار دەوریدا، مومکین نیە. هیچ شتێك نیە کە هەڵگری "رەگەزی پۆستمۆدێرنیزم" بێت و بیدۆزنەوە و بتوانن لەبەرامبەر روناکیدا رایگرن و بەدوای سەرە دەزوەکانی چیەتی سەرەکی یان نهێنی ژێنیکی پۆستمۆدێرنیزمدا بگەڕێن. بەڵکو کاتێك ئێوە شتێك ناودەنێن پۆستمۆدێرن، ئەوا ئەو شتە لەوتەزایەکی دیاریکراودا دادەنێن یان بەشێوەیەکی تایبەت قاڵبەندی دەکەن. لەبری ئەوەی چۆنایەتیەکی تیا بدۆزنەوە، بیرۆکەیەکی بەسەردا بار دەکەن و دواجار بەمکارە کۆمەڵێك بیرۆکە سەبارەت بەجیهان، و پەیوەندی ئێمە بەجیهانەوەی پێوە گرێدەدەن.

لێرەوە دەکرێت پۆستمۆدێرنیزم لەسودمەندترین شێوەدا، بەوتەزایەکی رەخنەی نەرم و بەدامێنێك بەکارهێنان و تێگەیشتنی بەزەبرەوە بزانرێت. پۆستمۆدێرنیزم زاراوەیەکی "قایبلی بارکردنە"، کە توانای ئەوەمان پێدەبەخشێت بچینە ناو زۆرێك لەو بیرۆکە گرنگانەی پەیوەندیان بەخەسڵەتە تایبەتیەکانی جیهانی ئەمرۆمانەوە هەیە.

شێوەی جیاواز بۆ دابەشکردنی ئەم بیرۆکانە هەیە. یەکێك لەم شێوانە پێناسی پۆستمۆدێرنیزمە وەك "مردنەکان" یا "کۆتاییەکان" کە دەگوترێت پیشاندەری ئەم بابەتانەی خوارەوەیە:

کۆتایی مێژوو: ئەم بابەتە دەرئەنجامی گۆمانی پۆستمۆدێرنیستەکانە سەبارەت بە بیرۆکەی پێشکەوتن و هەروەها دەرئەنجامی ئەو باسانەیە لەبارەی چۆنێتی مێژوونوسی و ئەو بیرکردنەوەیەی کە رووداوەکان خاوەن یەکێتی و ئاراستە نین.

کۆتای مرۆڤ: ئەم بابەتە بەرهەمی پرسیارکردنی پۆستمۆدێرنیزم لە "مرۆڤایەتی؟ وەك داهێنانێکی کۆمەڵایەتی و مێژوویی، و هەروەها پەیوەندی بەو بیرۆکەیەوە هەیە کە تەکنیکاری تازە، ئێمە بەرەو "پاش –مرۆڤی" پەرەسەندن دەبەن.

مردنی شتی واقعی: ئەم بیرۆکەیە دەرئەنجامی رو وەرگێڕانی پۆستمۆدێرنیزمە لەگەڕان بەدوای هەقیقەتی رەهادا و پێباشتربوونی مەسەلە کاتی، دروستکراو و





روکەشیەکانە لەلایەن پۆستمۆدێرنیستەکانەوە، و بەدواداچوونی فەلسەفی لەبارەی پەیوەندی واقع و رەنگدانەوە، پەیوەندی بەو دیدەوە هەیە کە واقع لە ئاماژەکانەوە دروستبووە.

وەرگێڕانی فەسڵی یەکەمی ئەم کتێبەی خوارەوەیە

گلن وارد: پستمدرنیسم. ت: علی مرشدی زاد. تهران قصیده سرا ١٣٨٤.

## سەرنجێك لەژیان و بیروباوەڕو بەرهەمەکانی ژان فرانسوا لیوتار





## حوسێن عەلی نەوزەری

یەکێك لەبەرجەستەترین کەسایەتیەکان لەبواری وتوێژی فەلسەفی "پۆستمۆدێرنە"دا، ژان فرانسوا لیوتارە. لیوتار لەساڵی ١٩٢٤ لەڤێرسای فەرەنسا لەدایکبوو. لای مۆریس میرلۆپۆنتی دەستی بە خوێندنی دیاردەناسیکردو یەکەم بەرهەمی فەلسەفیشی لەژێر ناونیشانی "دیاردەناسی"دا کە لەساڵی ١٩٥٤دا لەلایەن دەزگای بڵاوکردنەوەی زانکۆی پاریسەوە چاپو بڵاوکرایەوە، تەرخانکراوە بۆ لێکۆڵینەوەی بەرهەمو بیروڕاکانی مامۆستاو فێرکارەکەی، واتە بۆ "میرلۆپۆنتی". لەساڵی ١٩٥٢دا دەستیکرد بەوانە وتنەوەی فەلسەفە. سەرەتا لەجەزائیرو چەند ساڵێکیش لەزانکۆی پاریس. جگە لەمیرلۆپۆنتیش بیریارانی دیاردەناسی وەك هایدگەرو لیڤیناسیش کاریانکردۆتە سەر روکردنی رەخنەگرانەی لیوتار بەرەو شیکردنەوەی پەیوەندیە ئاڵۆزەکانی نێوان نمونە ئەبستمۆلۆژیەکانی زانستو ژینی جیهانی کلتورو سیاسەت. ئەو روکردنەی لیوتار بەرەو ئەو بوارە دینامیکیو ئافرێنەرانەی لەپرۆژەکانی خۆیدا سودیانی لێوەردەگرێ، نەك هەر کاریکردۆتە سەر بواری فەلسەفەو بیرکردنەوەی فەلسەفی، بەڵکو کاریکردۆتە سەر پانتاییەکی بەرفراوانی زانستە مرۆییەکانیش. لیوتار بۆ یەکەمجار لەوڵاتانی ئینگلیزی زماندا بە وەرگێڕانی کتێبە بەناو بانگەکەی "هەلومەرجی پۆستمۆدێرن.. راپۆرتێك لەبارەی زانینەوە" (١٩٧٩) بۆ زمانی ئینگلیزی لەساڵی ١٩٨٤دا ناوبانگی دەرکرد. (**Pane, 1997, 320**).

دەکرێ لیوتار بە بەرجەستەترین بونیادنەرو رونکەرەوەو تەفسیرکەری پۆستمۆدێرنە بزانرێ. فەیلەسوفێکی سیاسی، زمانناس، فەیلەسوفی زمان، جوانناسو تیوریستی کلتوری کە پانتایی راوبۆچونەکانی لەحەفتاکان بەدواوە بەخێرایی لەئاستێکی بەربڵاودا سنورەکانی ئەوروپای بەزاندووە. لیوتار لەژێر کاریگەری بیروڕاکانی مارکس، فرۆید، لاکان، نیتچە، کانت، هایدگەرو.. دایە. خوێندنی لەزانکۆی پاریس تەواوکردو لەساڵی ١٩٧١دا بەرگری لەدکتۆرانامەکەی خۆی کرد. لەساڵی ١٩٧٢دا کورسی مامۆستای فەلسەفەی زانکۆی پاریسی بەدەستهێنا. ماوەیەك لەزانکۆی







کالیفۆرنیا لەئێرڤین **Irvin** وانەی گوتەوە. یەکێکە لەبونیادنەرانی کۆلیژی نێونەتەوەی فەلسەفە لەپاریس کە ماوەیەکیش پۆستی سەرۆکایەتی ئەو کۆلیژەی گرتەدەست. پۆستی جۆراوجۆری لەزانکۆکانی وڵاتە یەکگرتووەکاندا گرتە ئەستۆ. وەك مامۆستایەکی بانگهێشتکراو لەزانکۆکانی ڤیسکانسین، کالیفۆرنیا، مینە سوتا، مۆنتریال، ساوپالۆو تۆرینۆدا، وانەی گوتۆتەوە. لەدوا ساڵەکانی ژیانیدا سودی لەو هەلانەی لێکۆڵینەوە وەرگرتووە کە خرابوونە بەردەستیو وانەو لێکۆڵینەوەی لەزانکۆی بیلو زانکۆی ئیموریدا، پێشکەشکردووە، لیوتار لە٢٢ ئاڤریلی ١٩٩٨دا کۆچی دواییکرد.

لیوتار لەساڵەکانی دەیەکانی ١٩٥٠ وە تا ساڵی ١٩٦٤ هاوکاری گروپێکی چەپی مارکسی دەکرد کە ناوی "سوشیالیزم یان بەربەریت" ( **Socialisme ou barbarie**) بوو. لەراستیدا گروپی ناوبراو هاوپەیمانیەتێکی ناسەقامگیر بوو لەنێوان کرێکاران، خوێندکارانی زانکۆ، لاوانی پڕ حەماسەتو شۆڕشگێڕ، رۆشنبیرانو بڕێك لەنوسەرانو تیوریزەنانی کۆمەڵایەتی. لیوتار جگە لەبەشداریکردنی لەچالاکیە سیاسیەکانی چەپەکان لەدەیەی ١٩٥٠و ١٩٦٠دا، پشتگیری جدیو حەماسی لەشۆڕشی جەزائیر دەکاتو لەهەمانکاتدا رەخنەی لەهەنگاوە سەربازیو سەرکوتکەرانەکەی فەرەنسا لەجەزائیردا دەگرت (**Pane, 1997, 320**). لیوتار لەپاش رووداوەکانی مانگی مەی ١٩٦٨ کە خودی خۆی بەشداربوو تیایدا، بەشێوەیەکی جدیو قوڵ دەستیکرد بە سەرلەنوێ بیرکردنەوە لەدەوری تیۆرە گەورەکانی مێژوو لەچالاکی سیاسیدا.. وەك تیۆرەی مارکسیزم. لیوتار بڕوایوابوو ئەو خوێندکارانەی زانکۆ کە بەشداریان لەرووداوو راپەڕینەکانی ساڵی ١٩٦٨دا کرد لەژێر کاریگەری هیچ یەك لەمچەشنە تیۆرە گەورانەدا نەبوون، بەڵکو لەسەر بناغەی دژایەتیکردنی روتی سیستەمی جێگیری باڵادەست، کاریاندەکرد. هەر ئەم هاوڕێیەتیو هاودەردیە روو لەزیادەی سەبارەت بە تێڕوانینیو دیدی خوێندکاران هەستی پێدەکرد، دواجار رایکێشا بۆ نەیارێتی [مخالف] لەگەڵ "مۆدێرنیزمدا"و رەخنەکردنیو شیکردنەوەی ئەو چوارچێوە فکریو کۆمەڵایەتیەی پێوەی بەستراوە ( **Matthewsm, 1996, 180**).

لیوتار لەنێوان ئەو رۆشنبیرو بیریارو فەیلەسوفە فەرەنسیانەی کە سەرقاڵی

ناساندنو بڵاوکردنەوەی چەمکی فەلسەفەی پۆستمۆدێرنیزم بوون، لەهەموان دیارترو بەرجەستەترە، و بەراستی دەکرێ بەیەکەم کەس دابنرێ کە چەمکەکانی "پۆستمۆدێرنیزم"و "پۆستمۆدێرن"ی هێناوەتە ناو بواری وتوێژی فەلسەفیەوە. ئەگەرچی نیگەرانیە فەلسەفیەکان لەبەرهەمەکانی لیوتاردا ئەوەندە جدیو قوڵ نیە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا چەند ئاماژەیەکی هەرچەند کورتیش بۆ شێوازی کاری لەبەکارهێنانی چەمکە فەلسەفیەکاندا بۆ بواری رەخنەی کۆمەڵایەتی، بێسود نیە.

دەکرێ بەدبینیو بەدگومانی لیوتار بەرامبەر بەناسین یان زانینی بەدەزگایکراوو چاودێریکردنو کۆنترۆڵی بیرۆکراسیەت بەسەر بواری ئەندێشەو بیرکردنەوەدا، لەو رەخنە توندانەدا ببینینەوە کە ئاراستەی "ملکەچی ناچارانەی ناوەرۆکە کلتوریەکانو پەیوەندی پەروەردەو فێرکاری بە وتەزا[مقولات] ئابوریە روتەکانەوە دەکرد: واتە بە بەرهەمهێنانو مەسرەفکردنەوە" (**Pane, 320**).

پۆستمۆدێرنیزم چەمکێکە کە درزی نێوان وەسفی ئەزمونگەرانەی سوسیولوجیانەو تەفسیری فەلسەفی فراوانتر دەکات. (لەراستیشدا رەنگە هەر ئەم خاڵە بەسەرچاوەی سەرەکی ئەو گرفتو مەسەلانەی دوای دابنرێ کە چەمکی پۆستمۆدێرنیزم لەئەنجامی لێشاوی گەورەی رەخنەو دژایەتیکردندا، رووبەڕووی بۆوە). بەهەرحاڵ پۆستمۆدێرنیزم ئاماژە بۆ "شتێك دەکات کەپاش مۆدێرنیزم دێت" (**Matthewa,1996,180**). لەروی سوسیولوجیەوە بڕوا لەسەر ئەوەیە کە گۆڕانکاریەکی گرنگ لەبواری بەهاکان، دەزگا کۆمەڵایەتیەکانو رووداوە تەکنەلۆژیەکان لەدەیەکانی دوایدا، روویداوە. فەلسەفە لەم نێوەدا چ لەیارمەتیدانی رونکردنەوەی گۆڕانە ناوبراوەکانو چ لەئامادەکردنی زەمینەو هەلومەرجی گونجاو بۆ بیرکردنەوە لەبارەی ئەوەی کە بەڵگەی گونجاو بۆ سەلماندنی نەتوانینو کەموکوڕی بیرکردنەوەی مۆدێرنیزم هەیە، دەورێکی گرنگی بینیوە. لیوتار لەکتێبی "هەلومەرجی پۆستمۆدێرن"دا بڕوایوایە چەمکی پۆستمۆدێرن دەتوانێ بە راشکاویو بە رۆشنیو توندیەکی تەواوەوە، هەم لەبواری فەلسەفەو هەم لەبواری سوسیولوجیادا، رۆشنگەرو کاریگەر بێت.

بەرلەوەی زیاتر بچینە ناو بواری تیۆرەکانی لیوتارەوە چاکترە کەمێك لەبارەی چەمکی مۆدێرنیزمەوە قسەبکەین. مۆدێرنیزم بە زەمانی فەلسەفی بریتیە لەو







کۆمەڵە بیروڕاو دیدگاو بەهاو خەسڵەتانەی کە لەلایەن فەیلەسوفانی سەردەمی رۆشنگەریەوە- لایبنیتس، هیوم، کانتو نوسەرانی ئەنسکلۆپیدیای "فەرەنسیی"، لەگەڵ پێشڕەوە سەدە هەڤدەهەمینەکانیان واتە: دیکارت، لۆكو نیوتنەوە نوسراو پێشکەشکرا. ئەم فەیلەسوفانە چ ئەوانەی بە فەیلەسوفانی "ئەزمونگەر" ناسراونو چ ئەوانەی بە فەیلەسوفانی "عەقڵانیەت" بەناوبانگن، تێڕوانینێکی تایبەتو بەرێژە چونیەکیان بۆ وتەزای "عەقڵ" هەبوو: عەقڵانیەت هێزو توانایەکە سەرجەم مرۆڤەکان لەبەر مرۆڤبونیان لەنعیمەتەکانی بەهرەمەندنو [ئەم نیعمەتەش] هیچ پەیوەندیەکی بەتایبەتمەندیو خەسڵەتە جیاوازە تاکە کەسیەکانو خەسڵەتە کلتوریو نەژادیو نەتەوەییو مێژوویەکانەوە نیە. دەکرێ دەرکەوتنی ئاشکرای بەهرەی عەقڵ لەتوانای مرۆڤدا ببینین بۆ بیرکردنەوەی لۆژیکیو ماتماتیکانە. لۆژیکانە بیرکردنەوەو ماتماتیکانە ئەندێشەکردن، تواناو هێزێکە کە مرۆڤەکان دەتوانن بە بەکارهێنانی "عەقڵی" خۆیان بەدەستیبهێنن. لەبەرئەوەی عەقڵ بەهرەیەکە —تایبەت بە مرۆڤ، ئەوا دەرکەوتەکانو نیشانەکانی ئەم عەقلەکورت ناکرێنەوە بۆ ئاشکراکردن یان پیشاندانەوەی شێوەو میتۆدە زیهنیە تایبەتەکان بۆ بیرکردنەوەو بینینی تاکەکان، بەڵکو عەقڵ ئاشکراکەری شێواز گەلێکە بۆ بیرکردنەوەو بینینی واقعیەتی بابەتی لەبارەی جیهانەوە. لێرەوە نمونەی باڵای عەقڵی چالاك هەمان ماتماتیکی روتو بەکارهێنانی ماتماتیکە لەزانستە مادیەکاندا. ئەم بوارانە بەتەواوی بابەتیبوونو زانستە سروشتیەکانیش کە لەسەر بناغەی ماتماتیك دامەزراون، جیهانیان بەو شێوەی هەبوو، وێنە دەکرد (یان بە دەربڕینی کانت: لایەنیکەم بەو شێوەیەی کاتێك لەروانگەی عەقڵی مرۆڤەوە سەیری دەکەین خۆیمان پیشاندەدات).

کاتێ زانستە سروشتیەکان، بەتایبەتی ئەو زانستە سروشتیانەی پەیوەندیان بەرەفتاری مرۆڤەوە هەیە، گەیشتنە قۆناغی پێگەیشتنو کاملی خۆیان، هێواش هێواش لەشکڵی تەکنەلۆژیادا سودیان لێوەرگیراوو ژیانی مرۆڤیان رۆژ لەدوای رۆژ ئاسودەترو خۆشبەختر کرد، و بەهۆی کاریگەرترین ئەو شێوانەی کە زانستەکان توانیبویان دروستیبکەن، سەرجەم پێداویستیەکانی مرۆڤیان جێبەجێکرد. لەبەرئەمە ئەوەی دەبوو ئەنجامیبدات بریتیبوو لەرێکخستنی پرۆتۆکۆلو دەزگا

کۆمەڵایەتیەکان بەشێوەیەك کە بکرێ زانستەکان لەسەر بناغەیان لەسەرجەم بوارەکانی ژیانی مرۆڤدا بەکاربهێنرێت، و دڵنیابوونیش لەوەی هەموو مرۆڤەکان دەتوانن بەشێوەیەکی یەکسانو بەرابەر سود لەو توانستو ئیمکاناتانە وەربگرن کە زانستە ئاڵۆزەکان پێشکەشیاندەکرد. هەر کۆمەڵگایەك کە خاوەن ڕێکخستنو ڕێکخراوێکی عەقلانیەو لەسەر بناغەی زانستەکان راوەستاوە، دەتوانێ زامنی ئەوە بکات هەموو تاکەکەسەکان بەشێوەیەکی عەقلانیو لۆژیکی رەفتار دەکەنو نابنە هۆی نارەحەتیو گرفت بۆ خۆیانو کەسانی دی. ئەمە لەراستیدا هەمان ئەو "زانستی کۆمەڵگا"یە بوو کە مارکسیزم بانگەشەی پێشکەشکردنی دەکرد (**Matthew**S.**182**).

بەمشێوەیە عەقڵ، زانست، بابەتیبوون، خۆشبەختی بەناوە رەمزیەکانی مۆدێرنیزم دەژمێران. لیوتار بڕوایوایە ئێمە لەروی سوسیۆلوجیەوە چوینەتە قۆناغێکەوە کە لەروانگەی [ئەو قۆناغەوە] مۆدێرنیزم بە مانای قەیرانێکی قوڵە: دەرکەوتنی جۆرێك لەدژایەتی عەقڵو ناباوەڕی بە عەقڵو زیهنیەتگەری، بەدگومانی خەڵك بەرامبەر بە زانستو بەرامبەر بەوەی کە هەوڵی خۆشبەختی رۆژبەرۆژ وەك خەونێکی رو لەناوچوی رابردوو، لەپاشەکشەدایە. بەگشتی هونەرو کلتور پیشاندەرەوەی ئەم خەسڵەتە یان هەلومەرجو حاڵەتەن. بەڵام ئەگەر ئەم دیاردەیە تەنها دیاردەیەکی سوسیولۆجی بوایە، ئەوا دەبوو لەروی بەهاو شێوازەوە بێلایەن بوایە، ئەم قۆناغە خۆی لەخۆیدا نە باشەو نەخراپ، بەڵکو تەنها بە قۆناغ یان ساتەوەختێکی تازە لەمێژودا دادەنرێ. لەلایەکیدیەوە ئەم گۆڕانی حاڵەت یان گۆڕانی خەسڵەتە، کاردانەوەیەکە لەبەرامبەر هەڵە یان کەموکوڕیە فەلسەفیەکانی مۆدێرنیزم. لەم حاڵەتەشدا دەکرێ بەجۆرێك لەپێشکەوتنو چاککردنی بارودۆخ دابنرێ: لەراستیدا ئەم هەلومەرجە تازەیە، هەلومەرجی "پاش" مۆدێرنیزمە، نەك هەر تەنها بەمانا کاتیو تێپەڕەکەی، بەڵکو بەمانای زیاتر رۆیشتن لێی و رۆیشتن بەرەو روی شتێك کە بناغەو بونیادێکی فکری قووڵترو گونجاوتری هەیە.

ئەم کەموکوڕە فەلسەفیانەی مۆدێرنیزم کامانەن؟ روناکترین پێگەیەك کە لێیەوە دەبێ مامەلەلەگەڵ ئەم پرسیارە بکەین، ئەو وتوێژو بەڵگاندنانەیە [استدلال] کە چەمکی رۆشنگەرانەی عەقڵی هەمەکی (کلی) خستۆتە ژێر گومانەوە. لیوتار تا





رادەیەك ئەو وتوێژو بەڵگاندنە گومانکارەیە، لەو روداوو تەوژمە بونیادگەرو پاش بونیادگەریەدا دەبینێتەوە کە لەسەر بناغەی میتۆدەکانی زمانناسی هەڵوێست لەرێژەگەری [نسبیت] کلتوری وەردەگرێت: ئاراستەگەلێك کە تا رادەیەك دەکرێ لەبەرهەمەکانی لۆدڤیك فینگشتاینو تیۆرەی "کرداره ئاخاوتنەکان"ی "جان لنگشاف ئاستین"دا ببینرێتەوە (**Matthews,182**). ئەم دوو روداوە فکریە یەکێکیان لەنەریتی فەلسەفی فەرەنساو ئەویدیان لەنەریتی فەلسەفی ئەنگلۆساکسۆندا، تارادەیەکی زۆر بەدوای یەك ئاراستەی هاوبەشەوەن. لەمڕووەوە زۆربەی بیریارانی هاوچەرخ بەشی زیاتریان بۆ نەریتی فەلسەفی فەرەنسا داناو لەبەرهەمو کارەکانیاندا باسو خواسێکی سەربەخۆو زۆریان لەبارەیەوە ئەنجامداو لەم ئاراستەیەشدا بەرهەمی زۆر مەزنیان بەرهەمهێنا. ئێمە لێرەدا تەنها ئاماژەیەکی کورت بۆ سود وەرگرتنەکانی لیوتار لەبیروبۆچونەکانی فنگشتاین دەکەین.

لیوتار سود لەتیۆرەی "گەمە زمانیەکان"ی فینگشتاین زیاد لەهەر بەشێکی تری فەلسەفەکەی وەردەگرێ. بەبڕوای فینگشتاین لەراستیدا فەیلەسوفان بە پرسیارکردن لە"مانای" دەربڕینە بێگومانەکان (**[given experessions**) توشی گومڕاییبوونو بەلاڕێدا چوون. چونکە دەربڕینە بێگومانەکان ئەوە ئاشکرادەکەن کە مانای خۆیان تەنهاو تەنها لەیەك رێگەوە دەدۆزنەوەو ئەو رێگەیەش رەنگە لەرێگای پەیوەستبوون یان پەیوەستکردنی خود بەو شتەوەی بێت کە ئاماژەی بۆ دەکەن، ئەوەی دەبێ بە دوایدا بگەڕێین "مانای" دەربڕینێك نیە، بەڵکو "سودو بەکارهێنانی" ئەو دەربڕینەیە لەچالاکیە مرۆییەکاندا. زمان شتێکە مرۆڤەکان لەچالاکیە تایبەتیەکانی خۆیاندا بەکاریدەهێنن (گەمەزمانیەکان)و دەربڕینەکانیش بەهۆی جۆری بەکارهێنانەوە لەناو "گەمە زمانیە" جیاوازەکاندا، "مانای" جیاواز وەردەگرن.

لیوتار بڕوایوایە مەبەستی فینگشتاین لەبەکارهێنانی زاراوەی "گەمەی زمانی" ئاماژەکردنە بۆ بەکارهێنانە جیاوازەکانی زمان: وەك رستەسازی، فەرمانکردن، پێشکەشکردنی بابەتە زمانی —کرداریەکان (بەچەمکە ئاستینیەکەی بە مانای "ئەنجامدانی شتێك یان وتنی شتێك" وەك بەڵێندان بە وتنی "من بەڵێندەدەم")،





پێشکەشکردنی وەسفێکی ئەدەبی، چیرۆکبێژی، وتنەوەی حیکایەت یان ریوایەتێك..و لەم بابەتانە. هەریەك لەم گەمە زمانیانە لەگەڵ ئەویدیدا جیاوازە. هەر گەمەیەکی زمانی لەژێر کۆنترۆڵی رێسای تایبەتی خۆیدایە، رێك وەك چۆن گەمەی شەترنج بە رێسایەکی جیاواز لەرێسای تۆپێن، ئەنجامدەدرێت. باشە! بەم وەسفەوە ئەگەر ئەم تێڕوانینە بۆ زمان قبوڵبکەین، ئەوا هیچ "گەمەیەکی زمانی" تایبەت ناتوانێ بانگەشەی گەورەتربونی خۆی بەسەر گەمە زمانیەکانی دیدابکات یان بانگەشەی ئەوەبکات "ئاشکراکەری شتێکە کە دیاردەو شتەکان بەکردەوە لەودەچن" یان بانگەشەی ئەوەبکات بە شێوەیەکی بابەتی توانای پێشکەشکردنی "گوزارەیەکی راستی (هەقیقی) هەیە". کەوابوو بە هیچ شێوەیەك بەکارهێنانی زمان لەزانستە سروشتیو ماتماتیکیەکاندا، ناتوانێ بانگەشەی گەورەتر بونێکی لەمچەشنە بکات. لێرەوە دیدو شێوەی تێگەیشتنی سەردەمی رۆشنگەری بۆ زانست وەك پارادیمێکی بابەتیو عەقڵانی، دەچێتە ژێر پرسیارەوە. زانست لەنێوان گەمە زمانیەکانی دیدا تەنها یەك "گەمەی زمانیە" کە مەبەستی دیاریکراوو تایبەتی لەبەردەم خۆی داناوە (**Matthews,183**).

ئەگەر بە ئاسانی نەتوانین بابەتیبوونو عەقڵانیبوونی تایبەتی زانست وەك عەقڵانیەتێکی بەدیهیو بێگومان قبوڵبکەین، ئەوا دەبێ لەجێگەیەکی دیدا بەدوای هۆی ئەو مەسەلەیەدا بگەڕێین کە بۆچی کۆمەڵگا مۆدێرنەکان بەگشتی ئەم تێگەیشتنەیان بۆ زانست قبوڵکردووە. خەسڵەتی تایبەتی گەمەی زمانی زانست کە لەگەمە زمانیەکانی دی جیای دەکاتەوە ئەوەیە کە ئامانجی بەتەواوی روو لە"راستیبوون" بە مانای ئەو گوزارانەی کە هەموو گەمەکەرانی لەبارەی دروستیو راستیەوە، کۆکن. ئەم گەمەکەرانە لەدەستنیشانکردنی ئەوەی چ شتێك "راست"و چ شتێك "درۆیە"، پەیڕەوی لەکۆمەڵێ رێسای تایبەتی دەکەن کە لەگەمەی زمانی زانستیدا بەکاردەهێنرێ. لیوتار لەبەرامبەر ئەمەدا بەشی زۆری گەمە زمانیەکانی دی بە "ریوایەت" ناو دەنێ: ریوایەتە ئیداریەکان پێوەری جیاوازی بۆ راستو هەڵە، لەپێوەرەکانی راستو هەڵەی لەزانستەکاندا هەیە. ریوایەتەکان بۆ هەڵسەنگاندنو تاوتوێکردن، سود لەپێوەری جیا لەهەقیقەت یان "راست" وەردەگرن. لەبەکارهێنانی ریوایی زماندا، پێوەرە ئەخلاقیو ستاتیکیەکانو هەروەها پێوەرەکانی ناسین،







لەیەککاتداو پێکەوە سودیان لێ وەردەگیرێ. هەر لەبەرئەمانەش لەکلتورێکدا کە لەژێر دەسەڵاتی زانستدایە یان لەکلتورێکی بالاّ دەستی زانستی وەك مۆدێرنیزمدا، ئەم بەکارهێنانە جیاوازانەی زمان، خاوەن بەهایەکی ئەوتۆ نین.

ئەفسانەو چیرۆکە جەماوەریەکان بە چەند نمونەیەکی بەرجەستەی بەکارهێنانی زمانی ریوایی دادەنرێن. ئێمە ئەم ئەفسانانە بەیارمەتی پێوەری جیا لەزانست بۆ راستو هەڵە هەڵدەسەنگێنین. هەروەها بەیارمەتی پێوەرەکانی دی وەك. لەزەتی ستاتیکی، پێشکەوتنی ئەخلاقیو پەیامی کۆمەڵایەتیو لەم بابەتانە، هەڵیان دەسەنگێنین. بەکارهێنانی کۆمەڵایەتی ئەم ئەفسانانە، رەوایەتی بەخشینە بەدەزگاو جۆرەکانی چالاکیو جێگەی تاکەکان لەکۆمەڵگاداو رێك وەك چۆن ئەفسانەی گەڕانەوەی نەژادی پاشا بۆ حەزرەتی ئادەم وەك باوکی مرۆڤەکان، بە مەبەستی رەوایەتی بەخشین بە دەوری پاشا لەپلەوپایەی "باوکی وڵاتی خۆیدا" سودی لێ وەردەگیرا. مۆدێرنیزم لەسەر بناغەی بابەتیبوونو عەقڵانیەت، دەورێکی رەوایەتی بەخشی بە زانستدەدا. بەڵام شیکردنەوەی مانا، شیکردنەوەی جۆرەکانی پەیوەندی هەبوو لەنێوان شتەکاندا کە بە زمان دەیلێینو ئەو دنیایەی کە لەبارەیەوە قسە دەکەین، [دەبێتە هۆی ئەوەی] هەوڵی ناوبراو بۆ رەوایەتی بەخشین رابوەستێت. بەشێوەیەکی خوازەیی دەبێ بگوترێ کە تەنانەت زانستیش پێویستی بە یارمەتی ئەفسانە هەیە، بۆئەوەی رەوایەتی ببەخشێ. لەم ئاراستەیەدا لیوتار پشت بە دوو ئەفسانەی بنەڕەتی دەبەستێ کە هەرکامێکیان شێوەی جیاواز بەخۆیانەوە دەگرن: ئەفسانەی زانست وەك رزگارکەری مرۆڤایەتیو ئەفسانەی هیگڵی زانست وەك سیستەمێکی هەمەکی زانینی مرۆیی (**Matthews.184**).

بەڵام ئەم ئەفسانانە لەکۆمەڵگای هاوچەرخدا بەکارهێنانو بایەخو بەهای خۆیان لەدەستداوە، بەشێوەیەك کە "زانست"یش "رەوایەتی" خۆی لەدەستداوە. لێرەوە مۆدێرنیزم بە پشتبەستن بەو گریمانەیەی تەنها بیرکردنەوەی زانستی رەوایە، بایەخو بەهای خۆی لەدەستدەدا. ناکرێ ئەفسانەکان بە بایەخدارو رەسەن دابنرێن، چونکە هەنوکە چیدی ناکرێ ئەمچەشنە لەچیرۆکە ئاراستەبەخشە گەورانە قبوڵبکرێ. لەبەرئەمە چیدی ئەو بیرۆکەیەی کە زانست لەروی بابەتیەوە هەقیقیە، ناتوانێ هۆیەکی بەهێز بێت بۆئەوەی دوای زانست بکەوین. کەوابوو دەبێ

مۆدێرنیزم جێگەی خۆی بە پۆستمۆدرنیزم بدات، چونکە چیدی ناکرێ ژیانی خۆمان بەیارمەتی پرۆژەی رۆشنگەری لەسەر بناغەی عەقلانیەتی زانستی دامەزرێنین. هەنوکە بەهای عەقلانیەتی زانستی لەژێر پرسیاردایە: ئێمە ناتوانین [عەقلانیەتی زانستی} بە نەیار یان بەرزترو گەورەتر لەشێوەکانی تری ریوایەتی سادەی بیرکردنەوەی بزانین. چونکە هەنوکە دەبینین رەوایەتی خودی عەقلانیەتی زانستی، پەیوەستە بەهەمان ئەو ریوایەتانەوە [واتە بە ریوایەتە سادەکانەوە]. لەهەمانکاتدا ناتوانین ریوایەتە گومانکارەکان قبوڵبکەین، چونکە پێوەرگەلێکی زۆر بەربلاوو کراوەو فراوانن‌و ناتوانین قبوڵیانبکەین یان بڕوایان پێبهێنین. کەوابوو دەبێ بگەڕێینەوە بۆ کلتورێکی پۆستمۆدێرن کە تیایدا ئەمجۆرە ئەفسانە گەورانەو ریوایەتە گشتگیرو ئەو مژدانەی باس لەگۆڕانی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی‌و بەختەوەرکردنی بەهۆی زانستەوە دەکەن، بوونی نیە..کلتورێك کە تیایدا زانست تەنها لەبەر ئامانجە دزێوەکانی خواستگەری پەیڕەو دەکرێ (**Matthews.184**).

بەمشێوەیە پۆستمۆدێرنیزم بەو شێوەیەی لەسەرەوە وێنەمان کێشا، بەراشکاوی کۆمەڵێك زەمانەت‌و بەرپرسیاری بۆ سیاسەت‌و کلتوری گشتی بەدوای خۆیدا دێنێ. پۆستمۆدێرنیزم لەسیاسەتدا ئاشکراکەری بەدبینی‌و بەدگومانیە بەرامبەر بەو ریوایەتانەی کە لیوتار ناوی "سیاسەتی رزگاریخواز"یان ( **Politics of reclemption**) لێدەنێت.. لەجۆری ئەو تیۆرە هەمەکیخوازو جیهانیانەی وەك مارکسیزم کە لەهەوڵی خوڵقاندنی کۆمەڵگایەکی مرۆیی کامڵدایە کە تیایدا دواجار مرۆڤایەتی بە کەماڵ‌و پێگەیشتنی خۆی دەگات. تەنانەت خوێندنەوە ئاڵۆزترەکانی ئەم تیۆرانە، وەك چەمکی هەلومەرج یان کۆمەڵگای ئاخاوتنی یۆرگن هابرمازیش، دەکەوێتە بەر رەخنەو سەرنجەکانی لیوتار. بەبڕوای لیوتار ئەم دیدە خەیاڵیانە، تەنها بەرهەمێکی تری ئەو وەهمە مۆدێرنیستەیە کە بڕوایوایە بەکارهێنانی عەقلانیەتی زانستی لەبواری ژیانی مرۆڤدا، دەتوانێت مرۆڤەکان بەختەوەرو خۆشبەختبکات. لەبری ئەمەش ئەوەی کۆمەڵگای پۆستمۆدێرن پێویستی پێیەتی، بریتیە لەهەنگاوو داهێنانە لۆکاڵی‌و ناوچەییەکان لەئاستێکی بچوکدا، [ئەمەش] بە سودوەرگرتن لەکلتورە خودیەکان‌و هەوڵدان بۆ نەهێشتنی نادادپەروەریە







بەرجەستەکان.

پۆستمۆدێرنیزم‌و هەروەها خودی لیوتار لەئاستی کلتوریدا لایەنگری فرەیی (پلۆرالیزم)و دەستێوەرنەدانی دەوڵەوتن لەبواری هونەردا. هەلومەرجێك کە تیایدا هونەرمەندان ئازادن کارەکانیان بەپێی خواستی خۆیان‌و بەوشێوەو سیاقەی دەیانەوێت، ئەنجامیبدەن، نەك ئەوەی خودو هونەرەکەیان لەخزمەتکردنی ئامانجە گەورەکان یان بەرژەوەندیە بازرگانیەکاندا بێت.

بێگومان ئەمجۆرە بەدبینی‌و بەدگومانیە بەرامبەر بە تیۆرە گەورەکان، رەواجێکی بەربلاوی لەکۆمەڵگای هاوچەرخدا پەیداکردووە. بەڵام ئەگەر بڕیارە باس لە"هەلومەرجی پۆستمۆدێرن" بکەین، ئەوا دەبێ لەکاردانەوەو وەڵامە ئیحساسیەکان لەبەرامبەر نادڵنیای ژیانی مۆدێرندا دەستهەڵگرین، و لەوە زیاتر بڕۆین. ئەوەی ئێمە پێویستمان پێیەتی —وەك خودی لیوتار بەدروستی دەرکیکردووە، شیکردنەوەیەکی فەلسەفیە کە دەریبخات شتێك بەناوی "مۆدێرنیزمە"وە هەبوو کە بەهۆی ناهاوڕێکی [نا منسجم] لۆژیکی خۆیەوە شایستەی رمان‌و لەناوچونە. دیارە بەداخەوە لیوتار تائێستا شیکردنەوەیەکی لەمچەشنەی پێشکەشنەکردووە. لەبری ئەمە تێکەڵەو پێکهاتەیەکی لەهەڵسەنگاندنە سۆسیۆلۆجی‌و مێژووییەکان لەبارەی رەوتی گۆڕانکاری‌و پەرەسەندنی مێژووی بیرکردنەوەی مرۆڤ لەسەدەی هەژدە بەدواوەی پێشکەشکردووە (کە لەراستیدا ئەوەندە کۆو وردبین نەبووەو مافی بابەتەکە لەبەرامبەر دەوڵەمەندی‌واقعیەتی مێژویدا، بەتەواوی نادات). هەروەها رەخنەیەکی فەلسەفی لەو شتە پێشکەشکردووە کە ناوی ناوە "ئامانجەکانی رۆشنگەری" (دیارە ئەم هەوڵدانەشی لەسەر بناغەی بەڵگاندنێکی [ئیستدلال} وردی فەلسەفی نیە).

بە یەکسانکردنی بیرکردنەوەی مۆدێرن لەگەڵ ئەو تێڕوانینەدا کە تەنها شێوەی عەقلانیبوون یان مەعقولبوون بریتیە لەعەقلانیەتی ماتماتیك ئاساو زانستی، لەروی مێژوییەوە ناڕاست‌و هەڵەیە. دیارە ئەم روداوە یەکێك بوو لەگرنگترین هێڵەکان لەرەوتی بیرکردنەوەی ئەوروپاو ئەمریکا لەسەدەی هەژدە بەدواوە. بەڵام ئەمە تەنها یەکێك لەو هێڵانەیەو فەیلەسوفانی دی لەبەرامبەر ئەمەدا بەرگریان لەدیدو تێڕوانینی جیاواز لەمەکردووە. ئەو دیدو تێڕوانینانەی بوون بە بەشێك لەهوشیاری‌و هەستی گشتی. تەنها ئەوەندە بەسە ئاماژە بۆ هیوم‌و رۆسۆ بکەین. هیوم

ئەوەی قبوڵنەدەکرد کە بیرکردنەوەی ئەخلاقیو پراکتیکی دەتوانرێ بەهۆی عەقڵی پشتبەستوو بە ماتماتیکەوە، رێگەی خۆی ببڕێ (عەقڵ کۆیلەی ئارەزووو شەهوەتەکانەو دەبێ واش بێ). رۆسۆش بەرگری لەژیانێکی گونجاو لەگەڵ سروشتو هەستە سادەکاندا دەکرد.

هەر بەمشێوەیەش نەفیو نکوڵی کردنە فەلسەفیەکانی لیوتار لەبارەی "ئامانجەکانی رۆشنگەری"ەوە (یان بەشێوەیەکی وردتر شێوازەکانی بیرکردنەوەی پۆزەتیڤزمی) لەسەر بناغەی کۆمەڵێ بەڵگاندنی وردو پتەو نیە، بەڵکو پشت بەهەندێك بانگەشەی نەسەلمێنراو دەبەستێ کە دەڵێ شێوەکانی بیرکردنەوەی زانستی رەوایەتی خۆیان لەیەك ئەفسانەوە وەردەگرنو ئەم ئەفسانەیەش هەنوکە بایەخی خۆی لەدەستداوە. تەنانەت ئەگەر ئەم بانگەشەیەی دوایش راستبوایە، ئەوا نەیدەتوانی بەم دەرئەنجامە بگات: لەبەرئەوەی خەڵکی لەئێستادا بە سەختی بڕوا بە چیرۆکە ئاراستەبەخشە گەورەکان دەکەن، کەوابوو هەقیانە سەرپێچی لەقبوڵکردنی بکەن. بەدەربڕینێکی دی کۆمەڵگا رەنگە بەسەختی باوەڕێکی بەزانست هەبێت، بەڵام بێئەوەی ئەو خاڵە راستبێت کە زانست جێی باوەڕو قبوڵکردن نیە.

دیارە دەشێ هەندێ لەپرۆژە خەیاڵیەکان لەبارەی پێشکەوتنی کۆمەڵایەتیەوە وەلاوە بنرێ، بێئەوەی باوەڕ بە زانست وەك گەڕانێك بە دوای هەقیقەتدا یان پەیمانبەستن لەگەڵ ئامانجەکانی مرۆڤایەتیو عەقلانیەت کە وەرگیراوە لەرۆشنگەریەوە، وەلاوەنێن. گەرچی رەنگە لەدیدی شیکردنەوەی سوسیۆلۆجی کۆمەڵگای هاوچەرخەوە، بونی چەمکی "هەلومەرجی پۆستمۆدێرن" سودبەخش بێت، بەڵام هیچ زەمینەیەکی فەلسەفی پێویست بۆ دۆزینەوەی جیاوازی نێوان "مۆدێرنیزم"و "پۆست مۆدێرنیزم" بونی نیە. لەراستیدا بڕوای لیوتار بەوەی زەمینەگەلێکی لەمچەشنە هەن، پشتئەستوورە بە جۆرێك تێکەڵکردن لەنێوان ئەوەی خەڵك وەك واقعیەت قبوڵیدەکەن، وئەوەی کە بەزەمینەگەلێکی گونجاو بۆ باوەڕبوون بە شتێك دەژمێرێن.

لەلایەکیدیەوە زۆر لەبیریاران پۆستمۆدێرنیزم بە شکڵێکی بەدبینانەی فەلسەفە دەزانن کە دۆگمایەتی گوتارەکانی دی دەخاتە ژێر گومانو پرسیارەوەو لیوتاریش بە یەکێك لەبەرجەستەترین تیوریزەنانی ئەم بزوتنەوەیە دادەنێن. گەرچی لیوتار







زۆرتر لەبەر ئەو بەرهەمانەی لەبارەی پۆست مۆدێرنیزمە نوسیویتی، بەناوبانگەو لەبوارە جیاوازەکانی فەلسەفەدا وەك فەلسەفەی زمان، فەلسەفەی سیاسیو ستاتیکاشدا بەرهەمی نوسیووە، بەڵام کارو بەرهەمە سەرەتاییەکانی دەچێتە ناو چوارچێوەی نەریتی مارکسیزمەوە. بەڵام ئەمیش وەك زۆربەی رۆشنبیرانی چەپی فەرەنسا دوابەدوای دەرئەنجامە وێرانکارەکانی رووداوەکانی (١٩٦٨) بە توندی کەوتە دژایەتیکردنی مارکسیزمو لەکتێبی "ئابوری لیبیدۆی"دا کە وتوێژێکی زۆری وروژاند، هەڵوێستێکی سەرلەبەر پاش مارکسیانەی وەرگرتو کەوتە نەفیکردنی گریمانە بنەڕەتیەکانی میتۆدی مارکسیزم. ئەم هێڵە فکریە لەکتێبی "هەلومەرجی پۆستمۆدێرن"دا گەیشتە لوتکەی خۆی. لیوتار لەم کتێبەدا لەگەڵ رەدکردنەوەی تیورە گشتیو جیهانیەکاندا، بەڵگە دەهێنێتەوە کە ئەمجۆرە "تیۆرە گەورانە" (بۆ نمونە مارکسیزم) بایەخو ئاراستەی خۆیان لەدەستداوە، لیوتار لەبەرامبەر "ریوایەتی گەورە"و مانا دەسەلاتاویەکانیدا، ئامانجی "ریوایەتی بچوك"ەکان بەتایبەتی ریوایەتی بونەوەرە مرۆییە تاکە کەسەکان، دەهێنێتە ئاراوە کە پێویستی بەهیچ جۆرە ئاراستەکردنێکی بونیادی نیە (لیوتار لەو بەرپرسیارانەیە (مولتەزم) کە دژی فەندەمینتالیزمن (**anti- foundaionalist**).

بەشی گەورەی بیرکردنەوەی سیاسی لیوتار لەساڵەکانی پاش ٦٨دا لەدەوری خەبات دژی خراپ سودوەرگرتن لەئازادیە فەردیەکان دەسوڕێتەوە. نیگەرانیو سەرقاڵی سەرەکی بەرهەمەکانی دوایی لیوتار لەبارەی ماهیەتی رێساکانی هەڵسەنگاندن یان داوەریەوەیە. لەم ئاراستەیەدا هێڵی بەڵگەکانی ئەوەیە کە لەبنەڕەتدا هەڵسەنگاندن روداوێکی پراگماتیکیەو پەیوەندی بە گوتارێکەوە، حاڵەتێکی تایبەتیە. یان بەدەربڕینێکی دی [هەڵسەنگاندن] خەسڵەتو تایبەتمەندی گوتارێکە. بەبڕوای لیوتار گوتارەکان ئاڵۆزو دژ بەیەکنو لەنێوان دو گوتاردا بوارێکی وتوێژی چارەسەر هەڵنەگر یان (جیابونەوە) هەیە. لیوتار لەم بەرهەمانەدا بەردەوام بۆ کانت دەگەڕێتەوەو بە رواڵەت بە شێوەیەکی هوشیارانە لەهەوڵی گەڕانەوەدایە بۆ چوارچێوەی مارکسیزمو هیگڵی بیرکردنەوەی دیالکتیکانە. ئەو ئارەزوە بت شکێنیەی لەکتێبی "هەلومەرجی پۆستمۆدێرن"دا باڵادەستە، کاریگەریەکی بەهێزی لەناو نێوەندە رۆشنبیریە هاوچەرخەکاندا بەجێهێشتووەو بۆتە ئیلهام بەخشی نەوەیەکی

کاملّی تیورەسازە کلتوریەکان. [بەلاّم] بیریارانی چەپی ئەرسۆزیکس کاردانەوەی توندیان دژی تێڕوانینو هەلّوێستە بەدبینە پۆستمۆدێرنیزمەکانی لیوتار، پیشانداوە (Brown, 1997. 40).

وەك پێشتر باسمانکرد لیوتاریش وەك زۆربەی رۆشنبیرانی دی فەرەنسا بەشداری لەراپەڕینو بزوتنەوە کرێکاری-خوێندکاریانەی سالّی ١٩٦٨دا کرد. بەلاّم پاش شکستی ئەم بزوتنەوەیە نەك هەر تەنها لەبزوتنەوەکە، بەلّکو لەهەرشێوە چالاکیەکی سیاسی رێکخراوو بەدەزگاکراو دورکەوتەوە. بەتایبەتی لەپەیوەندیکردن بە حیزبی کۆمۆنیستو مارکسیزمی بیرۆکراتی دەولّەتیەوە. لەوتارێکدا کە لەسالّی ١٩٨٩دا نوسی، چەند دەرئەنجامێکی لەبنەماو بناغەکانی گروپی "سوشیالیزم یان بەربەریەت" وەرگرت کە لەراستیدا پێشزەمینەو سەرەتای نیگەرانیە بنەڕەتیەکانی بەرهەمەکانی دوایی پێکدەهێنا، و بونە هۆی دورکەوتنەوەی لەو گروپە:

بیرۆکەی بالاّدەست بەسەر گروپی "سوشیالیزم یان بەربەریەت"دا دواجار ئەو بیرۆکەیە بوو کە لەناو هەر سیستمێکدا شتێك هەیە ناتوانێ لەروی ئسولّیەوە بەرەو روی بێیتەوە یان بەشێوەیەکی ئسولّی هەلّوێستی لێوەربگرێ. لەناو دلّی نهێنیئامێزی هەر شتێکدا کە لەگەلّ سیستمدا ناگونجێ، شتێکی سەرسەختو یاخیو شاراوە هەیە کە جێی خۆی خۆشدەکات.. شتێك کە ناتوانێ کەمتەرخەمی لەئەنجامدان یان بەڕێوەبردنی هەندێ کاروباردا کە لەسیستمەکەدا روودەدەن، بکات (لیوتار، نوسینە سیاسیەکان ١٩٣٣، ص ٧-١٦٦).

بەشی زۆربەی بەرهەمەکانی تری لیوتار بەشێوەیەکی سەرەکی سەرقالّی وەسفو شیکردنەوەی ئەوجۆرە "روداوە" قابیلی وەسفنەکردن و ناسیستماتیك، و بەلاّم لەرووی" سیاسیەوە" بەهێزانەن، کە لەناو دەروونی سیستمە سیاسیە فەرمی یان فەلسەفیەکاندا جێگیرن. لیوتار لەدوو بەرهەمی تری خۆیدا واتە (١٩٧١) Discoutse/ figur (گوتار فیگۆر)و Litidinal Economy (ئابوری لیبیدۆی) (١٩٧٤) وەرگێڕانی بۆ ئینگلیزی ١٩٩٣) هەولّدەدات بە پشتبەستن بە بنەماو رێساکانی دەرونشیکاریو لەسەر بناغەی هێزو توندی بروسکە دەرونیو ئەنگێزە جەستەییەکان، نەك لەسەر بنەمای پۆلێنکردنی رووکەشانەی ئەو ئەنگێزەو بروسکانە، سیاسەتێکی رادیکالّ دابڕێژێو پێشکەشبکات. بۆ نمونە بەهۆی زمانەوە کە







فرۆید ناوی دەنا پرۆسە لاوەکیەکان. لەکتێبی "گوتار/ فیگۆر"دا جیاوازی لەنێوان سنوری "فیگۆر" یان پرۆسەی دەرونی سەرەتاییو "گوتار"دا دەکات کە هۆکارو هەلّگری هێزی خرۆشێنەرو سەردەرهێنەری فیگۆرە. لەبەرهەمەکانی لیوتاردا چەشنی بەرهەمی بیریارە هاوچەرخەکانی وەك جیل دۆلۆز، فیلکس گاتاریو ژولیا کریستیڤا، ئەزمونی ستاتیکی بەتەوەرە سەرەکیەکانی "سیاسەتی توندی (شدّت)" دادەنرێن (Brown.1971, 321).

لیوتار لەکۆتاییەکانی دەیەی حەفتاو سەرەتاکانی دەیەی هەشتادا هەمووجۆرە تەوەهومێکی سەبارەت بە جیهانیبوون Universalism یان هەمەکیگەری مارکسیزمی فەرمی لەخۆی دورخستەوە. لەهەمان سەردەمداو لەبەرهەمەکانیدا نیگەرانیگەلێك لەبارەی مەسەلەی ئەخلاقو رەوایەتی (مشروعیت) دەبینین کە لەمەیلە پاش چەپیە نامەعقولو سەرسوڕهێنەرو (لەهەمانکاتدا) ناجێگیرەکانی بەرهەمەکانی دەیەی حەفتادا نەدەبینرا. بۆ نمونە ئەم تەوەهوم دامالّینە سەبارەت بە جیهانگیری مارکسیزمو نیگەرانی سەبارەت بە وتەزای وەك ئەخلاق، دادپەروەریو رەوایەتی لەکتێبی "هەلومەرجی پۆستمۆدێرن"ی (١٩٧٩/ وەرگێڕانی بۆ ئینگلیزی ١٩٨٤) لیوتاردا خۆی دەردەخات. لەم کتێبەدا لیوتار بەلّگە دێنێتەوە سەردەمی مۆدێرن لەکۆتاییەکانی سەدەی هەژدەوە لەژێر دەسەلاّتداریێتی هێزی کۆمەلّێك "ریوایەتی گەورە"ی جیهانیسازو هەمەکی بەخشی مانا لەفەلسەفەو سیاسەتدا بوە، بە تایبەتی ریوایەتە هیگلّیەکان بۆ چەمکی "پرۆسەی رزگاری رۆحی خودهوشیار لەمێژوداو بەهۆی مێژووەوە" لەگەلّ ئەو ریوایەتە مارکسیزمە بۆ چەمکی "پرۆسەی رو لەپێشکەوتنی رزگاری سیاسی گشتیو جیهانی". لیوتار بڕوایوایە ئەو دەسەلاّتەی ئەم ریوایەتانە خستیانەگەڕ، بەئامانجی راکێشان یان تواندنەوە یان بەمەبەستی وەلاوەنانی هەموو شوناسو مێژووو زەمانەکانی دی بوبێت، دەسەلاّتێکی تۆتالیتارانە بووەو دواجار لەهەنگاوە کارەساتاویو ترسناکەکانی وەك کوشتارە دەستە جەمعیەکانەوە، سەریدەرهێناوە.

هەلومەرجی پۆستمۆدێرنی جۆرێك هەلومەرجی بێبڕوایو ناباوەڕیە بەریوایەتە گەورەکان. لیوتار لەبری "ئێمەی" بالاّدەستو دەسەلاّتخوازو خۆ ڕەوایەتی بەخشی مرۆڤایەتی جیهانی کە بەگریمانە وەرگیڕاوەو جێی باوەڕی ئەمجۆرە ریوایەتە

گەورانەیە، لەبری ئەمە بە خۆشبینیەکی تەواوەوە دەستدەکات بە وێنەکردن و بەرجەستەکردنی زیهنیی دنیایەك کە لەکۆمەڵە فرەو بچوکەکان دروستبووە، و تیایدا هیچ گروپێك مافی دەسەڵاتگرتنی بەسەر ئەوانی دیدا نیە. چەمکی سەرەکی و بنەڕەتی شیکردنەوەکەی لیوتار، هەمان چەمکی "گەمە زمانیەکانە" کە لیوتار لەفینگشتاینەوە وەریگرتووەو پێشتریش قسەمان لەبارەیەوە کرد. بەڵام ئێستا لەدیدێکی دیەوە باسیدەکەین. دەکرێ گەمەی زمانی بە شکڵێکی یەکتاو هاوبەشی کرداری رەمزی (Symbolic action) دابنرێ کە لەکرداره پەیوەندیخوازە جۆراوجۆرەکانەوە دروستدەبێت. دەکرێ گەمە زمانیەکان کرداری وەك: وەسفکردن، رونکردنەوە، چیرۆکگوتن، خوتبە، وەعزدان، ئامۆژگاریکردن، هاندان، راوێژکردن و زۆربەی کرداره ئاسایی و رۆژانەکانی مرۆڤ بگرێتەوە.

لیوتار لەیەکێك لەدوا بەرهەمەکانی خۆی لەژێر ناونیشانی "جیاوازی"دا ٩٨٤ (the Differend) (وەرگێڕانی بۆ زمانی ئینگلیزی لە١٩٨٨دا) ئەم شیکردنەوەیەی گەورەو فراوانکردووە. باسی سەرەکی ئەم کتێبەو هەروەها کتێبێکی تری واتە "بەس یاری" (Just- Gaming) (کە بەرهەمی هاوبەشی ئەوو "ژان-لوپ"ە کەلەساڵی ١٩٨٥دا بۆ ئینگلیزی وەرگێڕرا، زنجیرە باسێکە سەبارەت بە ماهیەتی دادپەروەری (کە لەراستیدا بەپێشزەمینەی پێویست بۆ کتێبی جیاوازی دادەنرێ) بریتیە لەچەمکی نادادپەروەری بنەڕەتی کە ئەو دەمە دێتە دی کە گەمەیەکی زمانی ببێتەهۆی ملکەچی گەمەیەکی زمانی دی یان بەهۆی ئەو گەمەزمانیەوە تەفسیرو رونبکرێتەوە. یان بە دەربڕینێکی وردتر لیوتار {بڕوایوایە] بە درێژایی مێژوو هەموو نادادپەروەریەکان، ستەمو سەرکوتکردنەکان، چەوساندنەوەکان و بەیەك وشە سەرجەم کرداره نامرۆڤانەکان، تەنها کاتێك ئەگەری دەرکەوتن و روودانیان هەیە کە گەمەیەکی زمانی تایبەتی و دیاریکراو بەسەر جۆرەکانی تری گەمەی زمانیدا، دەسەڵاتدارو باڵادەست بێت یان خواست و نیەت و ئامانجی سەرجەم گەمەکانی دی تەنها بەهۆی ئەو گەمە زمانیە باڵادەستەوە تەفسیرو رونبکرێتەوە.

لیوتار بڕوایوایە بەردەوامی دادپەروەری بەستراوە بەوەوەی سەرنج لەهەلومەرجە "جیاوازەکان" یان هەلومەرجە نەگونجاوەکان و ناتەباییە رەهاکان بدات.. ئەو هەلومەرجانەی لەنێوان گەمە زمانیەکاندا هەیەو بێ بوونی گەمەیەکی







زمانی سێهەم وەك ناوبژیکەرێك، دژی یەکن. ئەرکی پارێزگاری و هێشتنەوەو هێنانەوەی بەڵگە بۆ ئەم نەگونجان و ناتەباییەی زمانەکان و فرەیی شێوەکانی بوون، بەر لەهەر شتێك لەئەستۆی هونەرە. بە تایبەتی هونەری پۆستمۆدێرنیستی کە لیوتار لەکۆتاییەکانی دەیەی ١٩٧٠دا بەهێزێکی تەواوەوە هێنایە ئاراوە.

رەگەزی سەرەکی ئەم نیگەرانە لەبارەی بەرپرسیارێتی ئەخلاقی هونەر، هەمان سەرلەنوێ خوێندنەوەی لیوتارە بۆ فەلسەفە ترانسندنتالی کانت لەکتێبی "رەخنە لەداوەری"دا. کانت ئەزمونی بابەتی باڵا (The Sublime) یان ترانستدنتالی بە چەمکێکی سەرسوڕهێنەری شکست و ناکامی لەدۆزینەوەی گونجان و وتوێژکردنی نێوان ئەزمون یا بیرۆکەیەك لەگەڵ بونیادە چەمکیەکاندا دەزانێت کە ئێمە بۆ تێگەیشتنی لەبەر دەستماندایە. بەبڕوای لیوتار بنەمای بابەتی باڵا خاوەن ئەو فراوانی و گشتبوونەو قابیلی دەرککردنە نیە کە فەلسەفەی ستاتیکای رومانسیەت بۆی دادەنێت. هەروەها لیوتار بابەتی باڵا بەخاوەنی هەمان ئاڵۆزی کۆنترۆڵنەکراوی پەیوەندیە مرۆڤایەتیەکان و رووداوەکان نازانێت. ئامانج و نیەتی سەرەکی لیوتار لەبڵاوکردنەوەی هونەرێکی باڵای پۆستمۆدێرنی بریتیە لەپاراستن و هێشتنەوەی ئەو دوبارە پیشاندانەوە دژایەتی ئاسایەی راستی نادوبارە پیشاندانەوە (نەتوانینی دوبارە پیشاندانەوە).

لیوتار لەیەکێك لەدوا بەرهەمەکانی خۆیدا کە کۆمەڵە وتارێکە لەژێر ناونیشانی "نامرۆڤانە-تێڕامانێك لەبارەی زەمەنەوە" کە لەساڵی ١٩٨٨دا چاپ و بڵاوکرایەوە لە١٩٩١دا بۆ ئینگلیزی وەرگێڕا". لەقاڵبی شێوەیەك دەربڕیندا کە ئاماژە بۆ ئەزموونە گۆڕاوەکانی زەمەن لەدنیای پۆستمۆدێرندا دەکات، سەرەڕای سەرنجدانی دوبارە لەهەندێك لەم مەسەلانە، دەستدەکات بەبەڵگەهێنانەوە بۆ هونەرو فەلسەفەیەك کە لەبەرامبەر ئارەزوکردنی دەسەڵاتی رەها بەسەر زەمەندا، بەرگریدەکات و رادەوەستێت.

لایەنێکی تری گرنگی بیرکردنەوەی لیوتار بەرەنگاریکردنە لەبەرامبەر چەند لایەنێکی دیاریکراوی پارادیمی بونیادگەریدا کە لەساڵەکانی دەیەی ١٩٥٠دا واتە لەکاتێکدا کە لیوتار چالاکیە فەلسەفیەکانی خۆی دەست پێدەکرد، لەلوتکەی دەسەڵات و درەوشانەوەی خۆیدا بوو. بەبڕوای لیوتار هەمیشە لەنێوان ئەزمونی ئێمە

لەجیهانی ژین و ئەو زمانەی بۆ قسەکردن لەبارەی ئەم ئەزمونانەوە بەکاریدەهێنین، "درزێك" هەیە. باسکردنی ئەم بابەتانە لەکتێبی "گوتار/ فیگۆر"دا، ناڕەحەتی و ناخۆشنودی لیوتار لەو هێڵە تیوریانە ئاشکرادەکات کە مێژوو لەپێناوی ئەو بونیادە هەمەکیانەدا کە زەمەنیان نیە، وەلاوە دەنێن.. ئەو بونیادانەی کە بێ گەڕانەوە بۆ تایبەتمەندیە بان زمانیەکانی جیهانی ژین، خۆ ڕێکخەر (**Self- regulating**) دەمێننەوە. هاوکاری و هاوڕێیەتی گروپی مارکسی "سوشیالیزم یان بەربەریەت" ئەم بێباوەڕی و بەدگومانیەی لیوتاری بەرامبەر بە هەر تیۆرەیەك کە ڕەخنەگرتن لەماتریالیزمی مێژووی و ئازادی کاری ئامانجخوازی سیاسی (ئازادی پراکتیکی سیاسی) فەرامۆشدەکات، پتەوو بەهێز ئەکرد. وەك پێشتر تێبینیمان کرد گەلێك روداوی فکری جیاواز دەوریان لەفۆرمەلەبوون و پێکهاتنی بیرکردنەوەکانی لیوتاردا هەبووە. ژمارەیەکی فراوان لەبیریارانی بەرجەستەی وەك: فرۆید، نیچە، کانت، هایدگەر، مارکس، لیڤیناس، فینگشتاین.. هتد کاریان کردۆتە سەر بیروڕا تیۆری و فەلسەفیەکانی لیوتار. دەکرێ کاریگەری فرۆید لەکتێبی "ئابووری لیبیدۆی"دا ببینین.. روداوێك کە لیوتاری پەیوەستکرد بە کەسانی وەك "دۆلۆزو گاتاری"وە. لەلایەکیدیەوە دەکرێ کاریگەری بەهێزی ڕەخنەی سێهەمی کانت واتە "ڕەخنە لەداوەری" لەبەرهەمێکی دی لیوتاردا واتە "چەند وانەیەك لەبارەی شیکردنەوەی بابەتی بالاوە" ببینرێ، کە لەراستیدا شیکردنەوەیەکی ڕەخنەگرانەیە لەهەڵوێست وەرگرتن لەبەرامبەر "بابەتی بالا"ی کانتدا. جێگەی خۆیەتی ئاماژە بەوە بکەین کە سەرەڕای ئەو ڕەخنانەی لەئاراستە تیۆری و هەڵوێستە فکری و فەلسەفیەکانی لیوتار گیراوە، بەڵام ئەو دەورێکی گرنگی لەوتوێژە هاوچەرخەکانی فەلسەفەو سیاسەت و هونەردا هەیە. لەکتێبی "جیاوازی"دا چەمکێك یان تێگەیشتنێکی تازە بۆ جیاوازی بنەڕەتی پێشکەش دەکات.. جیاوازیەکی بنەڕەتی و رادیکالانە کە ناکرێ بەهۆی کۆدەنگی گشتی (اجماع عام) و گشتیبوونی کرداری توندوتیژی و زۆرداری دژی بەرژەوەندیەکانی لایەنی لاوازتر، لەناو ببرێ. ئا لێرەدایە کە جیاوازی نێوان لیوتارو هابرماس ئاشکرا دەبێت و لەمڕووەوە بە ئاشکرا دژی هابرماس رادەوەستێت. چونکە بەقسەی لیوتار هابرماس بەهۆی بڕوابوون بە "هێزی بەڵگاندنی باشتر"، کەمترین گومان یان پرسیاری ڕەخنەگرانە لەبارەی "روبەرو ناوەرۆکی بەڵگاندنەوە" بەڕەوا







نازانێت.. ناوەرۆکێك کە نەك هەر هیچ کاتێك کامڵ و ئایدیاڵ نیە، بەڵکو بەردەوام لەژێر کاریگەری هۆکاری وەك هەلومەرج، پایە، پلە، هێز، دەسەلات، ڕێکخراو بایەخ [اعتبار] دایە. لیوتار لەو پێشگریمانەیەدا کە دەڵێ هەندێ "ریوایەتی گەورە" لەکلتوری رۆژئاودا، وەك ئاراستەوەرگرتنی عەقلانیانەی رۆشنگەری، ڕێگە چارەیەك پێشکەشدەکەن کە تێکەڵ بە بەرژەوەندیەکانی دەسەلات نابێت و لەبەرامبەریدا بێلایەن دەبێ، مەترسیەکی گەورە دەبینێ. لیوتار لەکتێبی "هەلومەرجی پۆستمۆدێرن"دا دەستیکردووە بە لێکۆڵینەوەی داڕمان و کەوتنی ئەو ریوایەتە گەورانەو دەڵێت پێویستە ریوایەتە گەورەکان ڕێگە بۆ "هەڵسەنگاندنە بچوکەکان" کە بەرز نافڕن و بۆ "ریوایەتە بچوکەکان" بکەنەوە. ئەو هەڵسەنگاندن و ریوایەتە بچوکانەی لەبەرامبەر بەسبوون و هەمەکیدا بەرگریدەکەن و جەخت لەتاکانەیی هەر، "روداو" یان "دیاردەیەك" جا چ ئەخلاقی یان سیاسی یان ستاتیکی بێت، دەکەن. دواجار دەبێ ریوایەتە گەورەکان جێی خۆیان بۆ ئەمجۆرە ریوایەتە بچوکانە بکەنەوە. بە بڕوای لیوتار چیدی جێگەیەك بۆ دەسەلات نواندنێك نیە کە بتوانێ لەدیدێکی هەمەکی و جیهانیەوەو بێ پشتبەستنی پێشینە بە هەندێك چوارچێوەی ئایدۆلۆژی، بۆ سەرجەم مرۆڤەکان قسەبکات. تەنها بەهۆی سەلماندنی دوپات بۆوە لەشێوەی هەڵسەنگاندنە بچوکەکاندایە کە دەتوانین قابیلی تەحویل نەکردن **irredvedvcibility**و وردەکاری **Particularity** "بەسەرهاتە" روداوەکان لەژیانماندا کە لەبەرامبەر پۆلێنکردنی جیهانیدا بەرگریدەکەن، بە بیربهێنینەوە.

لیوتار جەخت لەوە دەکات مەبەست لەسودوەرگرتن لەوشەی "پۆستمۆدێرن" جۆرێك بەدواهاتنی زەمەنی راستەهێڵی نیە، واتە "مۆدێرنەیەك" کە لەدوایەوە "پۆستمۆدێرنە" دێت یان بە دەربڕینێکی تر {مەبەست لەپۆستمۆدێرنە] جۆرێك "مۆدێرنەی بالا" **high modernity** نیە، بەڵکو بە پێچەوانەوە خودی چەمکی مۆدێرن، بەشێوەیەکی پێشینەیی هەڵگری چەمکی پۆستمۆدێرنەیە. پۆستمۆدێرن لەناو دەروونی چەمکی مۆدێرندا شاراوەو حەشاردراوە. چونکە مۆدێرنە بەشێوەیەکی بەردەوام لەحاڵەتی جوڵەو پێشکەوتندایە بەرەو سەرووخۆی بۆ ئەوەی بگۆڕێت بۆ شتێکی جیاواز لەخۆی. دەکرێ تێڕوانینە هاوشێوەکانی لیوتار لەپرۆژەکانی تری دەیەی دوایدا وەك "پاش بونیادگەری بونیادشکێنی" دا ببینین کە

بـەهۆی نوسـەران‌و بیریـارانی وەك میـشیل فۆكـۆ، رولان بـارت، ژولیـا كریـستیڤا، ژاك دێریداو جیل دۆلۆز" وە پێشكەشكراون.

## سەرچاوەکان:

Brown, stuart (et al) Bioyrahphicnl Dicitionary of Twentieth- centvry Phebsophers (London & N. Y: Rovte ledge 1997). P.P 484- 85.
Lyotard, teun- Francois, Phenomlogy, tr. Brain Beakly (Albuny: state University of New york Press 1991).
Lyotard…… Discourse/ Figurc, tr. Mary Lydon. (camberidge, MA: Harvurd Univarsity Press, 1996).







……………… , The Postmodern condition: A Report on Knowledge, tr. Geoff Benningtion & Brian massumi, (Minneu pois uviversty of minnesota press, 1984).
……………… , The Differend: phrases in Disputes, tr. Gorge Van Den Abbeele (Minneupolis: University of Minnesatu Press, 1988).
……………….. , The Inhuman: Reftections on time, tr. Geoff Bennington and Rachcl Bowlty. (London. Polity press, 1991)
……………….. , Toward the Postmoders, ed. By Rotert Harvey and Marks. Roberts (New Jersey and London: Humanities press- 1993).
Matthews, Eric, Twentieth- century French Philosphy (oxford: oxford Universtty Press, 1996).
Pane, Michail (ed), A Dictionary of cultural and Critical Theory, (oxford, UK and cumridge, USA. BlacKwell, 1997).

ئەم وتارە نوسینی: حسین علی نوزری"یە كە لەم كتێبەی خوارەوە هاتووە:
حسین علی نوزری: پست مدرنیتەویست مدرنیسم. انتـشارات نقـش جهـان/ چـاپ اول ١٣٧٩-ص ١٧٠-١٥٣

## لەگریمانەی سەركوتەوە بۆ دەسەڵاتی چاودێریكەر بەسەر ژیاندا

### هیوبرت دریفوس – بول رابینو

فۆكۆ جارێكی دی لەوانـەو چاوپێكەوتن و كتێبەكانی دەیـەكانی 1970ی خۆیـدا، دەسـتیكرد بەشـیكردنەوەی كـردارە كۆمەڵایەتیـەكان. لـە"چـاودێری و سـزا 1975" ومێـژووی سێكـسوالیتەدا 1977 بەشـێكی سـەرەكی لەتەفـسیر و راڤـەی خـۆی بـۆ مۆدێرنبوون بەدەستەوە دەدا. لـەم بەشـەی ئـەم كتێبـەدا كورتەیـەكی گشتی لـەبارەی تیورەی هەمەكی فۆكۆ بـەپێی هێڵە سـەرەكیەكانی بەلگاندنـە سـەرەكیەكانی خۆمـان لەم كتێبەدا دەهێنینەوە. دەبێ جەخت لەوە بكەین هیچ كاتێك فۆكۆ تێڕوانینـەكانی خـۆی بەمـشێوەیە نەخـستۆتە روو. بـیری فۆكـۆ تاهەنوكـەش لەحاڵـەتی گـۆڕان و

پیاچونەوەدایە.. هەندێك بواری ئاڵۆز و گشتگۆیی لەبەرهەمەکانی فۆکۆدا هەیە کە یان دەبێت بە پەشێوی و پەریشانی فکری دابنێین و یان بەهاودەردیەکی زیاترەوە بە بوارگەلێکی بزانین کە بۆ تاوتوێکردنی زیاتر لەبەرهەمەکانی دوایی خۆیدا یان کەسانی تردا، هێناویەتیە پێشێ.

نەگونجانی ئەو وردەکاریە مێژووییانەی فۆکۆ جەختی لەسەر دەکات، لەگەڵ مێژوونوسی باودا، هەم کێشەئامێز و هەم وتوێژئامێزە. لەبەرئەوە ئێمە لەهەلومەرجێکدا نین کە بتوانین وردەکاریە مێژوویەکانی تیورەی فۆکۆ هەڵسەنگێنین، لەبەرئەوە تەنها هەوڵدەدەین، بابەتە مێژووییەکانی تا ئەو شوێنەی کە پێویستە بەروونی دەربڕین. لێرەوە ژمارەیەکی زۆری ئەو باباتە ورد و بچوکانەی فۆکۆ وەك رەگەزناسێك بەهۆیانەوە خەسڵەتی تایبەت و هەمەڕەنگی لۆکاڵی و بونیادەکان روندەکاتەوە، فەرامۆشدەکرێت. هەروەها لێرەدا شێوەی پڕ پێچوپەنای لێکۆڵینەوەکانی فۆکۆ لەبواری مێژوودا فەرامۆشدەکرێت. ئامانجی ئێمە چارەسەری مەسەلەکانی واقع نیە، بەڵکو دەمانەوێت شێوەی روانینی فۆکو رونبکەینەوە ئەگەر تێگەیشتنێکی باشتر بۆ ئەم روانینە بەدەستبێت، ئەوسا دەشێت ئەو باسانەی پەیوەندیان بەشێوازی کاری تایبەتی فۆکۆوە لەبواری پێشکەشکردنی رووداوە مێژووییەکاندا هەیە ، لانیکەم لەچوارچێوەیکدا جێی بێتەوە کە سنورەکانی بۆ ئەو کەسانەی ئەم باسانە دەهێننە ئارا، لەهەموو رویەکەوە رون بێت.

بێگومان فۆکۆ دەبوو رونکردنەوەیەکی رونتری لەبارەی شێوەی کاری خۆیەوە لەزۆرێك لەبوارەکاندا، بەدەستەوە بدایە. پێوەرە پێویستەکان بۆ سەلماندن، نەفیکردن و تەفسیری شیکردنەوە تەعبیریەکانی یان روانینی ئەو بۆ مێژووی هەنوکە، بەروکەش لەبەرهەمەکانیدا دەدۆزرێتەوە، بەلام دەبێ ئەمشتانە مەزنە(حدس) بکرێن. مەبەست ئەوەنیە فۆکۆ قەرزێکی لەئەستۆیە کە تیورەیەك لەبارەی مێژوو یان کتێبێك لەبارەی میتۆدۆلۆجیەوە بە ئێمە بدات. بەلام هێواش هێواش کە تیورەکانی لایەنگری زیاتر بۆ خۆی پەیدا دەکات و ئەنگێزەگەلێك بۆ لێکۆڵینەوە دروستدەکات، دەبێت ئەم مەسەلانە بەروونی بخرێنە بەرباس، ئەگینا لەناو شێوازە مێژوویە ئەزمونگەریەکاندا، دەتوێنەوە. (بێگومان فۆکۆ ناتوانێ رێگری لەم ئاراستەیە بکات، بەلام لەهەمانکاتدا نایەوێت پشتیوانی لەم گۆڕانە بکات...





لەبەرئەوە بێدەنگی ئەو لەمبارەیەوە یارمەتی ئامانجەکانی نادات. ئەوەی مومکینە لەبواری رۆشنبیری پاریسدا تاکتیکێکی کاریگەر بێت، لەزانکۆکانی ئەمەریکادا، کردارێکی جیاواز دروستدەکات).

دوو چەمکی پێکەوە گرێدراو، بنایتنەری بەرهەمەکانی دەیەکانی **1970**ی فۆکۆیە: یەکێکیان چەمکی گریمانەی سەرکوتکردن و ئەویدیان چەمکی دەسەلات و تەکنیکی چاودێرکەرە بەسەر ژیاندا. فۆکۆ لەمێژووی سێکسوالیتەدا دژی گریمانەی سەرکوتکردن بەلگەی هێناوەتەوە.. بەپێی ئەم گریمانەیە هەقیقەت خۆ بەخۆ دژی دەسەلاتە و لێرەوە خۆ بەخۆ دەورێکی رزگاریخوازانە دەبینێ. ئەم تێڕوانینە راستەوخۆ ناگەڕێتەوە بۆ هیچ بیریار یان قوتابخانەیەکی فکری، بەڵکو وەك هەڵسەنگاندنێکی نیتچەیی تانەئامێز لەبیروڕای باو و لایەنیکەم لەبیروڕای ناوندە چەپەکانی فەڕەنسادا، پێشکەشدەکرێت (نەك تەنها لەتەفسیرە مێژوویەکاندا، بەڵکو لەبانگەشە تیوریەکانی فۆکۆشدا جۆرێك ئاراستەی نیشتمانی و سنوردراو دەبینرێ.. ئەگەرچی نمونە لەولاتانی تری وەك ئینگلتەرا و ئەمریکا دەهێنێتەوە، بەلام بەشی سەرەکی بابەتە مێژوویەکان، چوارچێوەی باس و ئەو نەیارانەی کە فۆکۆ لەزیهنی خۆیدا ململانێیان لەگەڵ دەکات، هەر هەموویان پەیوەندیان بەفەرەنساوە هەیە). بەلام دەبێ لەهەمانکاتدا ئەوەمان لەبەرچاو بێت کە مێژووی سێکسوالیتە کورتەی پرۆژەیەکی بەربلاوترە کە جێبەجێکردنی پێویستی بەچەندان ساڵ هەیە. لێرەوە دەبێ دیدی هەمەکی فۆکۆ وەك زێدەڕەوییەکی تیوری دابنێین کە ئامانجەکەی دیاریکردنی وێنەیەکی گشتی پانتایی باسەکە، وتوێژە شیمانەیەکانی و دوبارە پیاچونەوە بە بیروڕا و بابەتە باوەکانە.

فۆکۆ لەبەرامبەر گریمانەی سەرکوتکردندا، تەفسیرێکی زۆر جیاواز بۆ پەیوەندی نێوان سێکسوالیتە، هەقیقەت، دەسەلات ، جەستە و تاك پێشکەشدەکات. فۆکۆ دەرئەنجامی ئەم هۆکارانە بە دەسەلات و تەکنیکی چاودێرکەر بەسەر ژیاندا ناودەنێت. لێرەدا دانانی گریمانەی سەرکوت و دەسەلاتی چاودێریکەر بەسەر ژیاندا لەپاڵیەکدا، شێوەیەکی گونجاوە بۆ پێشکەشکردنی باسە سەرەکیەکانی بەرهەمەکانی فۆکۆ. ژیل دۆلۆز بەزمانێکی نهێنیئامێز گوتویەتی فۆکۆ دەبێ نەك وەك





مێژوونوسێك، بەڵکو وەك نەخشەکێشێکی تازە دابنێین، بەڵام ئەو نەخشانەی کە دەیکێشێت بۆ وێنەکیشانی سەرزەمینێك نیە.

## گریمانەی سەرکوتکردن

بەشێوەیەکی گشتی بەپێی گریمانەی سەرکوتکردن مێژووی ئەوروپا شایەتی گواستنەوە بووە لەسەردەمێکی ئازادی و راشکاوی رێژەییەوە سەبارەت بە جەستە و قسەی مرۆڤ، بۆ سەردەمێکی تر لەسەرکوتکردن و دووڕوویی روو لەزیاد. بەپێی ئەم ریوایەتە بەدرێژایی سەدەی حەڤدەهەم هێشتا جۆرێك راشکاوی ئاشکرا و زیندوو باڵادەست بوو. «ئەم سەردەمە سەردەمی جوڵەو ئاماژەی ئاشکرا و راستەوخۆ، و گوتاری خاڵی لەشەرم و گوناهکاری ئاشکرابوو، سەردەمانێك کە تیاییدا جەستەکان نمایشدەکران و ئازادانە تێکەڵ بەیەکدەبوون و منداڵانی هوشیار (لەمەسەلە جنسیەکان) لەنێوان پێکەنینی گەورەکاندا، دەتریقانەوە (مێژووی سیکسوالیتە. ل 3.) بەڵام تاپێش ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەم هەلومەرجەکە بەشێوەیەکی بەرچاو گۆڕا وبەرەو خراپی رۆیشت. ئەو پێکەنینانە جێگەی خۆی دا بە «شەوە بێ هەراوهوریاکانی بۆرژوازی سەردەمی ڤیکتوریا». سیکسوالیتە یان ئەوەی لێیمایەوە، هەنوکە لەماڵدا سنوردراو تەنانەت لەویش لەناو ژوری نوستنی دایك و باوکدا زیندانکرا. یاسایی بێدەنگی سەپێنرا و سانسۆر باڵادەستبوو. ئەو سێکسوالیتەی بەجێمابوو، خاڵی لەسۆز و لەزەت بوو، بوو بوو بەشتێکی بەرژەوەندیخوازانە. سێکسوالیتە لەخێزاندا تەنها هۆکارێکی لەدایکبوون بوو. هەموو ئەو کردار و خواست و گوتارانە کە هاوئاهەنگنەبوون لەگەڵ رێسا سەختگیر و سەرکوتکەر و ریاکارانەدا، بەناچار سڕانەوە و سەرکوتکران. لەبەرامبەر ئەمەدا یاسا، سەرکوت و دزێوترین لەزەتەکان، باڵادەستیان پەیدا کرد. هەر ئەم لۆژیکە تەنانەت بەناو دەوروبەری کۆمەڵگای سەردەمی ڤیکتوریاشدا بڵاوبۆوە، بەو مانایەی سەرسەرێتی و خۆشگوزەرانی هێواش هێواش و بەزۆر، چاوپۆشی لێکرا. تەنانەت لەمڕووەوە و بەتایبەت لەمڕووەوە رێگە بە بازرگانیەکی چاودێریکراو و سودهینەر درا، کەوەك ئاوارتنێك رێسای (ژیانی خێزانی) دەسەلماند. نەیارانی سەردەمی ڤیکتوریا بەنۆبەی خۆیان سەرکەوتنی ئەخلاقیاتێکی سەختگیرانە کە لەسیمای عەبووس و بێ







زەردەخەنەی مەلیکەدا دەردەکەوت، سەرلەنوێ دەسەلەماندەوە.

جازبیەتی ئەمجۆرە تێڕوانینە بۆ کەسانێك کە بڕوایان پێیبوو، ئەوەیە کە دەکرێت بەئاسانی ببەسترێتەوە بە پەیدابوونی سەرمایەداریەوە. «مێژوچکەی کورتی سیکسوالیتە و بەڵاکانی، چووە ناو مێژووی پڕ تەشریفاتی رەهەندەکانی بەرهەمهێنانەوە، رەهەندی سوکایەتیەتی ئامێزی لەچاو ون دەبێت" (هـ.س.پ. لا٥ ) لەوڕووە سێکسوالیتە سەرکوتکرا، چونکە لەگەڵ ئەخلاقی کارکردنی سەرمایەداریدا نەدەگونجا. دەبوو هەموو هێزەکان بۆ خزمەتی بەرهەمهێنان، کۆنتڕۆڵبکرێن. دیالەکتیکی مێژوو بەمشێوەیە مەسەلە لاوەکی و سەرپێیەکان، لەگەڵ مەسەلە قوڵ و گرنگەکاندا لەناو یەك پێکهاتەی هەمەکیدا پێکەوە گرێدەدات. لەم روانگەیەوە سێکسوالیتە تەنها پەراوێزێکە بەسەر چیرۆکی واقعی مێژووەوە.. واتە بەسەر پەیدابوونی سەرمایەداریەوە، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا پەراوێزێکی گرنگە، چونکە لەسیستەمی سەرمایەداریدا، سەرکوتکردن شێوەی گشتی دەسەڵاتە.

لەگەڵ ئەمەشدا دەکرێت بەئاسانی لێرەدا ئەم بەڵگەیە دژی خودی فۆکۆ بەکاربهێنین. .ئەگەر لەرستەکانی سەرەوەدا لەبری وشەی «بەرهەمهێنان» وشەی «دەسەڵات» دابنێین، وەسفێکی بێویژدانانەی بیری فۆکۆمان نەکردووە. ئەگەرچی فۆکۆ بەدوای دۆزینەوەی یاساکانی مێژوو یان نکوڵیکردن لەگرنگی سەرمایداری نیە، بەڵام خاڵی سەرەکی ئەوەیە فۆکۆ هەوڵدەدات گرنگیەك کە سێکسوالیتە بەم دواییانە لەشارستانێتی ئێمەدا بەدەستیهێناوە، پیشانبداتەوە و دەریبخات کە ئەم گرنگیە، پەیوەندی سێکسوالیتەیە بە دەسەڵاتەوە. لەوڕووەوە کە فۆکۆ وەك دواتر دەیبینین، بڕوای بە سێکسوالیتەیەکی بان مێژوو و نێو کلتوریی نیە، لەبەرئەوە بەهەموو هێزی خۆی هەوڵدەدات دەریبخات، سێکسوالیتەی ئێمە پەیوەندی بەشتێکی دیەوە هەیە. ئەم «شتە دی» لایەنیکەم تا سنورێك هەمان شێوە تایبەتیەکانی دەسەڵاتە. ئەوەی چۆن دیدێك بۆ دەسەڵات دەستەبەر بکەین کە نەبێت بەخودێکی بونیادی یان چەمکێکی میتافیزیکی و یان بەدەربڕینێکی تر پوچ و خاڵی، گرنگترین مەسەلەیەکە روبەرووی بەرهەمە کۆتاییەکانی فۆکۆ بۆتەوە.

یەکێك لەجازبیەتەکانی تری گریمانەی سەرکوتکردن ئەو ئەنجامگیریەیە کە

رزگاربوونی جنسی یان بەرەنگاری سەرکوتکردن، خەباتێکی گرنگ و پڕ بایەخە، هەرچەندە سەرکەوتن تیایدا ئەستەمە. (تەنانەت بیری فرۆیدیش دەستکەوتێکی کەمی لەم بوارەدا هەبوو، چونکە بەخێرایی لەناو دەزگای زانستی پزیشکی و دەروونناسیدا توایەوە و شێوەیەکی تازەی بەخۆیەوەگرت). بێگومان لەسەدەی نۆزدەهەم بەدواوە قسەکردن لەبارەی سیکسوالیەتەوە بەشێوەیەکی ئاشکرا و جەسورانەوە ، خۆ بەخۆ بە هێرشێك دژی سەرکوتکردن و بەکردارێکی خۆبەخۆ سیاسی دادەنرا. رزگاری سێکسی و روخانی سەرمایەداری هێشتا بە بەشەکانی یەك بەرنامەی سیاسی دادەنرێن. بەپێی ئەم بەڵگاندنە کاتێك ئێمە لەبارەی سێکسوالیتەوە قسەدەکەین، نەفی و نکوڵی لەدەسەڵاتی جێگیر دەکەین. ئێمە رێگە بەخۆمان دەدەین «تاکو دژی دەسەڵاتە باڵادەستەکان قسەبکەین، راستیەکان بڵێین و مژدەی خۆشبەختی و خۆشبدەین. رۆشنگەریو رزگاربوون و لەزەتە جیاوازەکان بەیەکەوە گرێبدەین (رێگە بەخۆمان دەدەین) گوتارێك دەربڕین کە سۆزی ناسین، ئیرادەی گۆڕینی یاساکان و هیوای بەهەشتێکی زەمینی، پێکەوە گرێدەدات" (هـ.س.پ. لا ٧) چ کەسێك دەتوانێ بەرگری لەبەرامبەر ئەم هەمووشتەدا بکات؟

گریمانەی سەرکوتکردن رەگی لەکلتورێکدایە کە دەسەڵات تەنها بەسنورداریتی، نەفیکردن و ناچارکردن دەزانێت. دەسەڵات وەك بەرگریەکی رێکخراو لەبەرامبەر واقعدا، وەك هۆکاری سەرکوتکردن و وەك رێگری هەقیقەت، رێگە لەزانین و ناسین دەگرێت، یان لایەنیکەم دەیشێوێنێت. دەسەڵات ئەمکارە لەرێگەی سەرکوتکردنی ئارەزووەکان، دروستکردنی هوشیاری درۆزنانە، بڵاوکردنەوەی نەزانین و ناهوشیاری و بەکارهێنانی گەلێك فێڵی دی، ئەنجامدەدات. دەسەڵات لەبەرئەوەی لەهەقیقەت دەترسێت، سەرکوتیدەکات.

لەم روانگەیەوە وادێتە پێشچاو کە دەسەڵات وەك سەرکوتکردن لەلایەن هەقیقەتی گوتارەوە بە باشترین شێوە بەرەنگاری و دژایەتی دەکرێت. کاتێك هەقیقەت دەگوترێت، کاتێك دەنگی نارەزایی رزگاربوون بڵند دەبێتەوە، بەروکەش هەڕەشە لەدەسەڵاتی سەرکوتکەر دەکرێت. هەقیقەت خۆشی بەتەواوی خاڵی لەدەسەڵات نیە، بەڵام دەسەڵاتەکەی لەخزمەتی راشکاوی و راستی و جۆرێك خێری







باڵادایە، هەرچەند ئەو خێری باڵایە شتێکی چۆنایەتیتر و هەقیقیتر لەراشکاوی و روونی نەبێت. هەرچەند فۆکۆ لێرەدا بە تانە و تەشەر قسەدەکات، بەڵام قسەکانی لەئامانجەکەیەوە دور نین. رەنگە ئەمڕۆ ئاڵۆزترین فکری نەیاری هەبوو لەبەرامبەر فکری فۆکۆدا، فکری یۆرگن هابرماس بێت کە لەتێڕوانینێکی ترانسندنتالیەوە بەرگری لەعەقڵ وەك هۆکارێکی رەخنەکردنی ئەو لاریانە دەکات کە دەرئەنجامی دەسەڵاتن و بەرگری لەبەرەنگاری لەبەرامبەریاندا دەکات.

فۆکۆ ئەم تێڕوانینە لەبارەی دەسەڵاتەوە بە «یاسایی- گوتاری» ناو دەبات (هـ.س.پ.لا ٨٤) ئەم دیدە سەرتاسەر نیگەتیڤە، دەسەڵات و هەقیەقەت بەتەواوی سەبارەت بە یەکدی دەرەکین. دەسەڵات جگە لە«سنورداریتی و کەمێتی» هیچی دی بەرهەمناهێنێت. دەسەڵات یاسا دادەنێت و پاشان گوتاری یاسایی (بابەتەکان) سنورداردەکات. سزادانی سەرپێچی، هەمیشە مومکینە. دەسەڵات لەهەموو شوێنێکدا یەکسانە: و بەپێی کارکردنی سادە و بێسنورە دوبارەبووەکانی یاساکان، تابۆکان وسانسۆر کاردەکات" (هـ.س.پ.لا ٨٤) دەسەڵات، دەسەڵاتە و کاری تەنها رێگرتن و فەرمانەکەی تەنها ملکەچییە. دەسەڵات دواجار سەرکوتە و سەرکوتیش دواجار سەپاندنی یاسایە و یاساش دواجار خوازیاری تەسلیمبون و ملکەچییە.

فۆکۆ دوو هۆی دی دەهێنێتەوە بۆ ئەوەی کە بۆچی ئەم تێڕوانینە بۆ دەسەڵات بەم ئاسانیە لەناوگوتاری سەردەمی ئێمەدا قبوڵکراوە. یەکەم فۆکۆ باسی شتێك دەکات کە ناوی دەنێ "بەرژەوەندی قسەکەر" (هـ.س.پ.لا ٦). قسەکەر لەهەلومەرجی رۆشنبیرێکی هەموو شتزاندا کە بۆ مرۆڤایەتی قسەدەکات، بەجدی ئاماژە بۆ ئایندەیەك دەکات کە بەبڕوای ئەو، بێگومان لەهەنوکە باشتر دەبێت. ئاوازی پێغەمبەرانە و لەزەتە چاوەروانکراوەکان بە باشی پێکەوە دەگونجێن. بێگومان دەربڕینی راستیەکان و مژدەی خۆشبەختی و شادی، بابەتێکی ناخۆش نیە بۆ قسەکردن. رۆشنبیر وەك قسەکەری ویژدان و هوشیاری، خۆی لەجێگەیەکی وا گرنگدا دەدۆزێتەوە. ئەو لەدەرەوەی دەسەڵات و لەناو هەقیقەتدایە. ئاموژگاری و پەندەکانی لەبارەی زوڵم و ستەمەوە و بەڵێنی رێکخستنێکی نوێ، بۆ ئەو شتیکی لەزەت بەخشەو بۆ کەسانی دیش قابیلی قبوڵکردنە. دیارە دەکرێت هەر ئەم وەسفە بۆ

خودی فۆکۆش بەکاربێنین، خودی ئەویش تارادەیەك لەم تۆمەتە بەدەر نیە. لەگەڵ ئەمەشدا فۆکۆ وەك جینالۆجیستێك بانگەشەی ئەوە ناکات کە لەدەرەوەی بواری دەسەڵاتە یان مژدەی دەستگەیشتن بە یۆتۆپیا و خوشبەختیدەدات.

هۆی دووهەم کە فۆکۆ دەیهێنیتەوە زۆرتر شیاوی قبوڵکردنە. ئەو بەڵگە دێنێتەوە کە دەسەڵاتی مۆدێرن شیاوی تەحەمولکردنە، بەمەرجێك سیمای خۆی بشارێتەوە و هەر ئەمکارەشی بەجۆرێکی کارا ئەنجامداوە. ئەگەر هەقیقەت لەدەرەوەی دەسەڵات بێت و دژی بێت، لەم حاڵەتەدا «بەرژەوەندی قسەکەر» تەنها بە ئیمتیازێکی شاراوە دادەنرێت. بەڵام ئەگەر هەقیقەت و دەسەڵات سەبارەت بەیەکتر دەرەکی نەبن، وەك فۆکۆ بەئاشکرا بڕوایوایە، لەم حاڵەتەدا «بەرژوەندی قسەکەر» و گەمەکانی تر، بەشێك دەبن لەشێوە سەرەکیەکانی کارکردنی دەسەڵات. دەسەڵاتی مۆدێرن خۆی بە بەرهەمهێنانی گوتارێك کە بەروکەش دژی دەسەڵاتە، بەڵام بە بەشێك لەبەکارهێنانی فراوانتری دەسەڵاتی مۆدێرن دەژمێرێت، خۆی دەشارێتەوە. وەك فۆکۆ دەڵێت: "دەسەڵات وەك سنورێکی پەتی کە لەسەر ئازادی دانراوە، لایەنیکەم لەکۆمەڵگای ئێمەدا، شێوەی هەمەکی شیاوی قبوڵکردنی ئازادیە" (هـ•س•پ •لا ٨٦)

رەگی ئەم مەسەلەیە، مێژووییە. بەبڕوای فۆکۆ دەسەڵات بەرلەوەی سێکسوالیتە بکاتە ئامانجی خۆی، لەراستیدا لەرێگەی دروستکردنی سنورداریێتی و قەدەغەکردنەوە کاریدەکرد. گرنگترین دەزگاکانی دەسەڵات، واتە پاشا و دەوڵەت لەناو دەرونی کۆمەڵێکی مەزن لەهێزە ئۆپۆزسیۆنەکان و ناوچەییەکان دروستبوون. بە پەیدابوونی پاشایەکی موتەمەرکز لەناو هەزاران سازش و ململانێی ناوچەییدا، ئەگەری دانانی رێسا داوەریکردن و دیاریکردنی سنور بەشێویەکی هەمەکی پەیدابوو. لەهەمانکاتدا پادشای موتەمەرکز دەستیکرد بە تێکشکانی دابونەریتە فیودالیەکان و هەوڵیدا بە کونترۆڵکردنی تیولدارە پەرشوبڵاوە ناوچەییەکان، سیستەمێکی موتەمەرکزتر بەرپابکات. ئەمجۆرە شکڵە مەزنانەی دەسەڵات کە روبەڕوی ژمارەیەکی زۆر لەهێزە جەنگیەکان دەبۆوە، وەك بنەما و بنەڕەتی مافێك کاریدەکرد کە لەهەموو بانگەشە جۆراوجۆرەکان زۆرتر دەڕۆیشت و خەسڵەتە سێ لایەنیەکانی رژێمێکی موتەمەرکز و







یەکگرتووی ئاشکردەکرد کە (بریتیبوون لە) بەیەکسان دانانی ئیرادەی خاوەن دەسەڵات و یاسا، هەنگاونان لەرێگەی رێبازی رێگەنەدان و دروستکردنی قەدەغەبوون، و بەکارهینانی سزادان" (ه.س.پ. لا٨٧) بەڵام ئەو دەسەڵاتەی پەیدابوو، بەهیچ شێوەیەك یەکپارچە نەبوو، و ئەگەرچی گەلێك چەکی بەکاردەهێنا، بەڵام زمانی زمانی یاسا بوو. یاسا پاشای هەم بۆ خۆی و هەم بۆ هاوڵاتیەکانی ئاراستەدەکرد و رەوایەتی پێدەبەخشی. دیارە راستیە مێژوویە وردەکان کە پەیوەندی بەمجۆرە رەوایەتبەخشینە یاسایەوە بە دەسەڵات هەیە ، زیاد لەسنور ئاڵۆزن. بەسەرنجدان لەبەرهەمەکانی ژۆرژ دوبی و قوتابیانی سەبارەت بە مێژووی ئەم سەردەمە و بەسەرنجدان لەگرنگی ئەم باسانەش، چاوەڕواندەکرێت لەئایندەدا لێکۆڵینەوەی زیاتر لەم بوارەدا بکرێت.

یەکێك لەخاڵە سەرەکیەکانی بەڵگاندنەکانی فۆکۆ ئەوەیە کە گوتاری یاسایی وەك سیستەمێکی رەوایەتیبەخش، شێوەیەکی پەیداکرد کە تا هەنوکەش باوە. فۆکۆ ئاماژە بەوە دەکات کە تەنانەت نەیارانی رژێمێکی یاسایی، بەهەمان گوتار لەبارەی یاساوە قسەدەکەن کە خودی رژێم قسەی پێدەکات. لەسەردەمی کلاسیکیدا رەخنەگرتن لەسیستەمی پاشایەتی، لەچوارچێوەی هێرشکردن بۆ خراپ بەکارهێنانی پاشا بۆ یاسا ئەنجامدەدرا. پاشان رەخنە بنەڕەتیەکانی تر لەدەوڵەت دەریخست رژێمە بۆرژوازیەکان چۆن بۆ بەرژەوەندی خۆیان دەستدەخەنە ناو یاساکانەوە. ئەمجۆرە دەستێوەردانە ناڕەوا بوو، لەبەرئەوەی دەسەڵاتی حکومەتی یاسای دەشێواند. بەمانایەك لەماناکان ئەم خاڵە لەبارەی خودی فۆکۆشەوە راستە، چونکە ئەویش دەزگاو گوتارەکانی دەسەڵاتی مۆدێرن بەو بەڵگاندنە رەخنە دەکات کە ئایدیالەکانی یاسا لەگەڵ ئەو رێکخستنە کۆمەڵایەتیەی دەرئەنجامی تەکنەلۆژیە سیاسیەکانن، لەناکۆکی و دژایەتیدان.

فۆکۆ بەئاشکرا گریمانەی سەرکوتکردن وەك گریمانەیەکی هەڵخەڵەتێنەر لەبەرچاو دەگرێت کە دەبێت ریسوا بکرێت. بەڵام ناتوانێت بە پێشنیارکردنی پێچەوانەی ئەم مەسەلەیە، واتە تەنها بە گۆڕینی شێوەی گوتار، لەهێرشەکەی خۆیدا سەرکەوتوو بێت، چونکە مەسەلەکە ئەوەنیە کام گوتارە راستە یان تەنانەت (کام

گوتار) بەراستی دەسەڵات رەخنەدەکات. سەرەڕای ئەوە فۆکۆ ناڵێت کە چەمکی گریمانەی سەرکوتکردن دوا پێشکەوتنەکانی لەبواری لیکۆڵینەوەی ئەزمونگەریدا، فەرامۆشکردووە و لێرەوە دەکرێت بە بەدەستهێنانی زانیاری، گریمانەکە چاکسازی بکرێت. بەڵکو فۆکۆ ئەو هەڵوێستانەی کە لەهەمانکاتدا بەهۆی لایەنگرانی ئەو هەڵوێستانەوە بەجدی وەردەگیران، بەجدی دەگرێت، ئامانجی فۆکۆ جینالۆجیای چۆنێتی دروستبوونی گریمانەی سەرکوتکردن و ئەو کارە تایبەتیانەیە کە ئەم گریمانەیە لەکۆمەڵگای ئێمەدا پێیهەڵدەستێ. فۆکۆ بەشە جیاوازەکانی گریمانەی سەرکوتکردن نەك وەك کۆمەڵێك فێل و تەڵە، بەڵکو وەك بەشە سەرەکیەکانی پەیوەندیەکانی نێوان هەقیقەت و دەسەڵات دەزانێت کە دەیەوێت شیبکاتەوە. بەمحاڵەوە رەهەندی شیکاری باسەکە هێشتا لەمێژووی سێکسوالیتەدا، کامڵنەبوو، بەڵکو سنورەکانی ئەم باسە لەپاش بڵاوبونەوەی بەرهەمەکانی دواییدا روون دەبێتەوە.

فۆکۆ خۆی بە روونی ناڵێت جێگەی خۆی لەم وەسفەدا بۆ گریمانەی سەرکوتکردن لەکوێدایە. ئەو لەو مەسەلەیە رادەکات کە ئایا خۆی لەو وەسفانەی بەدەستیەوە دەدات بەریە یان نا؟ بەئاشکرا دیارە کە ئەو شیکردنەوەکانی خۆی لەبارەی دەسەڵات و هەقیقەتەوە لەبەر ئەو هۆیە پێشکەشدەکات کە بەبڕوای ئەو کێشەگەلێك لەبواری پەیوەندی ئەو دوانەدا لەناو کۆمەڵگادا هەیە. ئەو بەشێوەیەکی جینالوجیانە ئەو شێوازەی کە بیریارانی دی ئەم وتەزایانەیان پێکەوە گرێدەدا بۆ ئەوەی دەریبخەن کە ئەم پەیوەندیانە بە هیچ شێوەیەك رەها نین، وەك کێشەیەك دەخاتە روو. ئەم وتەیە رەنگە بەو گریمانەیە بگات کە فۆکۆ خۆی لەدەرەوەی دەسەڵاتی ئەم وتەزایانە ببینێت. بەڵام وەك بەدرێژای ئەم باسە بەڵگەمان هێناوەتەوە، فۆکۆ وەك رۆشنبیرێك چیدی خۆی لەدەرەوەی ئەو شتە نابینێت کە خۆی شیدەکاتەوە. ئەو بە میتۆدی ئەرکۆلۆژیا دەتوانێت تا ئەندازەیەك خۆی دور بگرێت، بەڵام ئەم دور راگرتنە کامڵ نیە. سەرەڕای ئەمە میتۆدی جینالۆجیا خۆی دەبێتە هۆی دەرگیری و دەستێوەردان. بەڵام هەوڵدان بۆ سەلماندنی ئەو خاڵەی کە پەیوەندیەکانی دەسەڵات و هەقیقەت بەهۆی چەند هۆکارێکەوە، بەهەڵە







بەپەیوەندیەکی دژ بەیەك دانراون، هێشتا هەڵگری بەکارهێنانی شێوەیەکی تازە و چاککراوی عەقڵن، دژی تەفسیرێکی زۆر ئاڵۆز بۆ دەسەڵات (کە هەڵگری رەگەزێکی هەقیقەتە وەك یەکێك لەگرنگترین و بەرجەستەترین رەگەزەکانی خۆی). لەمبارەیەوە فۆکۆ هێندە لەئادرنۆ و تەنانەت لەفیبەر دوور نەکەوتۆتەوە.

بەڵام فۆکۆ کارەکەی خۆی لەروی میتودۆلۆجیەوە لەدیدی فیبەر بەجیاواز دەزانێت. بەبڕوای فۆکۆ نمونەی ئایدیالی فیبەر ئامێرێکە کە سەرنجە مێژوویە جیاوازەکان بەگەڕانەوە بۆ رابردوو ئامادەدەکات، بۆئەوەی جەوهەری ئەو بابەتە مێژووییەی لێکۆڵینەوەی لەسەردەکات (وەك کالڤینیزم، سەرمایەداری و گوشەگیری دنیایی) رونبکاتەوە. بەمشێویە نمونەی ئایدیالی دیاردەی پەرشوبڵاو لەنمونەیەکی مانادارردا جێدەکاتەوە، کە مێژونوس بەهۆیەوە دیاردە ناوبراوەکان روندەکاتەوە. فۆکۆ میتۆدی خۆی بەجیاواز دەزانێت، بەومانایەی مەیلی بۆ دەستنیشانکردنی «بەرنامە ئاشکراکانی» وەك پرۆژەی کۆمەڵگای سەرتاسەر بینراوی (بنتهامەوە) هەیە کە وەك بەرنامەیەکی پراکتیکی بۆ چاکسازی خراونەتە روو. ئەم بەرنامانە لەهیچ دیدێك شاراوە و ون نین و مێژونوسانیش دایاننەهێناوە بۆئەوەی رونیبکەنەوە. لەمڕووەوە فۆکۆ وەك بۆ کۆمەڵێك مێژونوسی فەرەنسی رونیکردەوە «دیسپلین، دەربڕینی "نمونەی ئایدیالی" (نمونەی ئایدیالی مرۆڤی ژێر دیسپلین) نیە، بەڵکو بریتیە لەگشتگیری و پەیوەندی تەکنیکە جۆراوجۆرەکان کە خۆیان کاردانەوەن لەبەرامبەر ئامانجی سنوردراو و لۆکاڵیدا (وەك خوێندکارێك لەقوتابخانە، راهێنانی سەربازگەلێك کە توانای هەڵگرتنی چەکیان هەبێت) (زیندان لا ٤٩). لەهەمانکاتدا ئەمجۆرە بەرنامانە هیچ کاتێك بەشێوەیەکی راشکاو و ئاشکرا لەناو دەزگاکاندا جێبەجێ نەبوون. هۆی ئەمە ئەوە نەبوو کە واقع هیچ کاتێك بەشێوەیەکی کامڵ پەیڕەوی لەئایدیال ناکات، بەڵکو بەرنامەی نەیار و ململانێی ناوچەیی و ستراتیژگەلێکی دی لەئارادا بوون کە بەتەواوی قابیلی شیکردنەوە بوون، هەرچەند دواجار لەگەڵ بەرنامەی سەرەتاییدا جیاواز بوون. فۆکۆ وەك جیانالۆجیەك هەوڵدەدات تائەو شوێنەی دەشێت لەئاستی روکەشی شتەکاندا بمێنیتەوە و خۆی لەماناکانی ئایدیالی، نمونە گشتیەکان و جەوهەری دیاردەکان

بەدور بگرێت. لەگەڵ ئەمەشدا ئەگەر لەو سەرنجە میتۆدیە کەمانە تیپەڕین کە فیبەر دەیدرکاند (ئەو چەند دێرە کەمەی فیبەر لەبارەی نمونەی ئایدیالیەوە داوێتی لەگەڵ ئەو گرنگیدانە زۆرەدا ناگونجێت کە بەم وتەزایە دراوە)و ڕوبکەینە شیکردنەوە مێژووییەکانی، دوری نێوان فۆکۆ و فیبەر بەشێوەیەکی بەرچاو کەمدەبێتەوە.

لەرووی چونایەتیشەوە ئەو قسەیەی فۆکۆ کە دەڵێت «دەبێ بەشێوەیەکی مێژووی بەرخورد لەگەڵ عەقڵدا بکەین، نەك بەشێوەیەکی میتافیزیکی»، بێگومان لەلایەن فیبەر و ئادرنۆوە دەسەلمێنرێت. فۆکۆ بە راشکاوی دەڵێت «بە بڕوای من دەبێ مانای وشەی «عەقلانیبوون» بەمانای ئامێری و ڕێژەیی سنوردار بکرێت...و ببینرێ کە چۆن شێوەکانی عەقلانیبوون لەناو دەرونی کردارەکان و سیستەمی کردارەکاندا، بەرجەستە دەبێت" (هـ.س.پ لا ٤٧) پیشکەوتنی فۆکۆ لەنیتچە و فیبەر و ئادرنۆ ئەوەیە کە ئەو ئەم وەسفەی بەجەدی گرت و شیکردنەوەی دیار و دەستنیشانکراوی لەکردارە مێژوویە تایبەتیەکان بەدەستەوەدا، کە تیایاندا هەقیقەت و دەسەلات مەسەلەی سەرەکی پێکدەهێنن. فۆکۆ بەشیکردنەوەیەکی وردتر لەشیکردنەوەی فیبەر میکانیزمەکانی دەسەلاتی عەقلانیبوونی دەستنیشانکرد و ناسی. بەلام ئەم قسەیە بە مانای نەفیکردنی فیبەر نیە، بەلکو بەمانای پێشکەوتنێتی.

دواجار فۆکۆ هێرشناکاتە سەر عەقڵ، بەڵکو دەریدەخات کە چۆن عەقلانیەت لەشکلە مێژوییەکەیدا کاریکردووە. وەك خۆی دەڵێت «ئەگەر لەم شیکردنەوەیەدا رەخنە لەعەقڵ بەمانا گشتیەکەی ببینین، بەمانای ئەوە دێت گریمانەی ئەوە بکەین کە عەقڵ تەنها دەتوانێت دروستکەری خێر بێت و خراپە لەنەفیکردنی عەقڵەوە بێت. بەلام ئەم قسەیە بێمانایە. عەقلانیەتی شتە خراپەکان، واقعێکی مێژووی هاوچەرخە. بەلام ئەم بابەتە هیچ مافێکی تایبەتی بەناعەقلانیەت نادات" (هـ.س.پ لا ٤١) بەلگاندنی ئێمە لەسەرتاسەری ئەم کتێبەدا ئەوەیە میتۆدی شیکرنەوەی فۆکۆ، هۆکارێکی بەهێز و پێویستە بۆ خۆ لادان لەهەندێك کێشە. لەم ناوەشدا مەسەلەی بێلایەنی بەهایی کە بەتوندی بیری فیبەری بەخۆیەوە خەریککردبوو..هەروەها





مەسەلەی وەسوەسەی دژایەتی عەقڵ و روکردنە نائومێدی (بە پەنابردن بۆ هونەر) کە بیریارانی قوتابخانەی فرانکفۆرتی بەلای خۆیدا راکێشابوو، شایەنی باسە. فۆکۆ بەشێوەیەکی زۆر ماقوڵ بەرخورد دەکات. هەر لەبەرئەمەش شیکردنەوەکانی خۆی لەسەر کارکردی هەقیقەت لەرژێمەکانی دەسەلاتی مۆدێرندا، چڕکردۆتەوە.

## دەسەلاتی باڵادەست بەسەر ژیاندا

فۆکۆ بەدیاریکردنی جێگەی مێژووی بەشەکانی گریمانەی سەرکوتکردن، سەرلەنوێ ئەو گریمانەیە بەشێوەیەکی جینالۆجی بونیاددەنێتەوە. ئەم بەشانە لەرووی مێژوییەوە دەگەڕێنەوە بۆ دەوڵەت شاری یۆنانی، لەشکری رۆم، کۆماری رۆم، ئیمپراتۆریەتی رۆم و بونیادە رۆژهەلاتیەکانی مەسیحیەت. لەگەڵ ئەمەشدا تەنها لەسەدەی حەڤدەهەمدا بوو، دەسەلاتی باڵادەست بەسەر ژیاندا وەك تەکنەلۆژیایەکی سیاسی هاوڕێك پەیدابوو. هەرچەندە تەنانەت لەوکاتەشدا، واتە لەسەردەمی کلاسیکدا هێشتا لەرووی پراکتیکیەوە بەتەکنیکی باڵادەست دانەدەنرا. لەگەڵ ئەمەشدا ئەمە ئەو سەردەمە بوو کە تیاییدا سەرپەرشتیکردنی ژیان و پەرەسەندنی سەرژمێری دانیشتوان و چاودێریکردنی، بوو بەیەکێك لەمەیلە سەرەکیەکانی دەوڵەت و جۆرێکی تازەی عەقلانیەت و کرداری سیاسی لەشکلێکی هاوڕێکدا دەرکەوت. فۆکۆ ناوەرۆکی شێوازی تازەی عەقلانیەتی سیاسی لەگەڵ ئەو شۆڕشەدا بەراوردەکات کە گالیلۆ لەزانستە سروشتیەکاندا ئەنجامیدا. لەزانستە سروشتیەکاندا ئازادکردنی مەسەلەو شتەکان لەدەست بونیادە تەقلیدیەکانی زانین، گۆڕانکاریەکی تیوری سەرکەوتوانە و زۆر گرنگی بەرهەمهێنا. بەلام لەبواری سیاسیدا فەیلەسوفەکان هەروا بڕوایان بە تیورە تەقلیدیەکانی دەسەلاتداریتی، مافە سروشتیەکان و پەیمانی کۆمەلایەتی هەبوو، و بەجەدی وەریاندەگرت. فۆکۆ بەلگە دێنێتەوە کە ئەمجۆرە گوتارە، ئەو گۆڕانکاریە بنەرەتیانەی کە لەرووی پراکتیکیەوە لەئاستی کردارە کلتوریەکاندا، لەئارادا بوو، دەشاردەوە. «دەسەلاتی (مۆدێرن) تەنها بەومەرجە شیاوی تەحەمولکردنە کە بەشێکی گرنگی خۆی بشارێتەوە. سەرکەوتووی (ئەمدەسەلاتە) پەیوەندیەکی راستەوخۆی بە توانای شاردنەوەی کارو





کردارەکانیەوە هەیە" (مێژووی سێکسوالیتە •لا ٨٦)

لەهەمانکاتدا کە تیورە سیاسیەکانی پێشوو بەردەوامدەبوون، سەردەمی کلاسیك عەقلانیەتێکی سیاسی و ئامێرێکی تازەی بەرهەمهێنا. لەناوەڕاستی سەدەی حەڤدەهەمدا لێکۆڵینەوەی ڕێکخراو و ئەزمونگەریانە لەبارەی هەلومەرجی مێژوویی، جوگرافی و ژمارەی دانیشتوان، بووە هۆی پەیدابوونی زانستە کۆمەڵایەتیە تازەکان. ئەم زانینە نوێیە پەیوەندی بەشێوە بیرکردنەوە ئەخلاقی و پراکتیکیی کۆن و تەنانەت بە شێوازی ئامۆژگاریکردنی مەکیاڤیلی بۆ دەسەڵاتدارانی سیاسیەوە نەبوو. لەبری ئەمە زانستە کۆمەڵایەتیە پسپۆرەکان، لەپەراوێزی سەرنجە ئیداریەکاندا دروستبوون. ئەم زانستانە بەپێچەوانەی زانستە سروشتیەکانەوە زانستگەلێکی گەردونی، سەربەخۆ لەزەمینەی کۆمەڵایەتی، هەمەکی و «ئامادەی قاڵببەندی وێنەیی» نەبوون، بەڵکو لەبری ئەمە بریتیبوون لەشێوە تێگەیشتنێك کە رووی لەوردەکاریەکان بوو.. زانستە کۆمەڵایەتیە تازەکان لەتیورەی سیاسی تەقلیدی حیکمەتی پراکتیکی و تیورەیەکی گشتی لەبارەی کۆمەڵگاوە دروستبوون کە هۆبز بە لاسایکردنەوەی زانستە سروشتیەکان پێشکەشیکردبوو. لەفەسڵی حەوتەمدا دەبینین کە ئەمجۆرە هاوپەیمانیە لەنێوان زانستە مرۆییەکان و بونیادەکانی دەسەڵاتدا چ دەرئەنجامێکی بۆ زانستە کۆمەڵایەتیە هاوچەرخەکان دەبێت. لێرەدا تەنها تاوتوێی ئەو شێوازەدەکەین کە هەندێك لەزانستە کۆمەڵایەتیەکان پەیوەندیان بە تەکنەلۆژیەکانی دەسەڵاتی باڵادەست بەسەر ژیانداکرد. "دەسەڵاتی باڵادەست بەسەر ژیاندا، ژیانو کارو کردارەکانی ژیانی هێنایە ناو بواری ئەژمارکرنی ئاشکرا، و زانین/ دەسەڵاتی کرد بەهۆکاری گۆڕانی شکڵی ژیانی سیاسی..مرۆڤی مۆدێرن ئاژەڵێکە کە سیاسەتەکەی، بوونی دەخاتە ژێر پرسیارەوە" (ه•س•پ لا ١٤٣).

لەگێرانەوەکەی فۆکۆدا دەسەڵاتی باڵادەست بەسەر ژیاندا لەسەردەمی کلاسیکیدا، لەدەوری دوو جەمسەر گەڵاڵەبوو. ئەم دوو جەمسەرە تا سەرەتای سەدەی نۆزدەهەم لەیەکجیابوون، بەڵام لەو سەدەیەدا تێکەڵبوون و تەکنەلۆژیاگەلێکی دەسەڵاتیان پێکهێنا کە تا هەنوکەش خەسڵەتی ئاشکرای هەلومەرجی هەنوکەیی ئێمە دەستنیشان دەکات.







یەکێك لەم دوو جەمسەرە تەرکیزکردن لەسەر رەگەزی مرۆڤ بوو. بۆ یەکەمجار لەمێژوودا وتەزای زانستیی وەك رەگەز، ژمارەی دانیشتوان و شتی دی لەبری وتەزا یاساییەکان، بەشێوەیەکی پێکەوە گرێدراو و بەردەوام، بوو بە جێی گرنگیپێدانی سیاسی. بەمشێوەیە هەوڵدان بۆ تێگەیشتنی پرۆسەکانی تازەکردنەوەی ژیانی مرۆڤ، لەنزیکەوە بە ئامانجە سیاسی ترەکانەوە گرێدرا. وا بڕیارە کونترۆل و ڕێکخستنی جوڵەی ژیان بەمشێوەیە ناوەڕۆکی بەشی شەشەمی مێژووی سێکسوالیتەی فۆکۆ بێت. ئێمەش شیکردنەوەکانی ئێستای فۆکۆ بۆ سێکسوالیتە لەفەسڵی هەشتەمی ئەم کتێبەدا دەخەینە روو.

جەمسەری دوهەمی دەسەڵاتی باڵادەست بەسەر ژیاندا، سەیری جەستە نەك وەك ئامێری دوبارە بەرهەمهێنانەوەی مرۆڤ، بەڵکو پتر وەك بابەتێك بۆ وەبەرهێنانکردووە. زانستی تازە یان بە وتەیەکی دروستتر تەکنەلۆژیای جەستە وەك بابەتی دەسەڵات، لەبوارێکی پەرشوبڵاو و پەراوێزیدا، دروستبوو. فۆکۆ ئەم زانستە تازەیە بە دەسەڵاتی کۆنترۆڵ ناو دەنێت و بەدرێژی لەکتێبی کونترۆڵ و سزادا شیدەکاتەوە (بگەڕێوە بۆ فەسڵی ٧) ئامانجی سەرەکی دەسەڵاتی کۆنترۆڵ بەرهەمهێنانی مرۆڤێك بوو کە بە «جەستەیەکی رامکراو و گوێڕایەڵ» دابنرێت. ئەم جەستە رامکراوە دەبوو لەهەمانکاتدا جەستەیەکی بەرهەمهێنیش بێت. تەکنەلۆژیای کۆنترۆڵ لەکارخانەکان، لەشکرگاکان و زیندان و خەستەخانەکاندا پەرەیسەند و کامڵ بوو، لەهەریەکێك لەم دەزگایانەدا ئامانجی گشتی «زیادبوونی سودمەندی و گوێڕایەڵی» تاکەکان و کۆمەڵەکان بوو لەهەمانکاتدا. تەکنیکە پێویستەکان بۆ کرداری کۆنترۆڵکردنی جەستەکان، بەتایبەتی بەسەر چینی کرێکار و چینەکانی خوارەوەدا جێبەجێکرا، گەرچی تەنها تایبەت نەبوو بەوان، بەڵکو لەزانکۆکان و قوتابخانەکانیشدا بەکارهێنرا.

بێگومان کونترۆڵی دیسپلینکردن و دروستکردنی جەستەی رامکراو و گوێڕایەڵ، پەیوەندی بە پەیدابوونی سەرمایەداریەوە هەیە. گۆڕانکاریە ئابوریەکان کە بوونە هۆی کەڵەکەبوونی سەرمایە و ئەو گۆڕانکاریە سیاسیانەی بوونە هۆی کەڵەکەبوونی دەسەڵات، بەتەواوی لەیەکجیا نین، بەڵکو لەپێشکەوتن و پەرەسەندنی خۆیاندا

پەیوەندیان بەیەکەوە هەیە. بۆ نمونە « داسەپاندنی شێوازە سەربازیەکان بەشێوەیەکی چڕ بەسەر ڕێکخستنی پیشەسازیدا، نمونەیەکە لەگونجاندنی دابەشکردنی کار لەسەربناغەی خەسڵەتە دەسەڵاتەویەکان. بەڵام ئەم شێوانەی دەسەڵات لەبەشە ئابوریەکاندا پەیدا نەبوون و تەنها تایبەت بەو بوارە نەبوون" (کۆنتڕۆڵ و سزا.لا ٢٢١) فۆکۆ ئەم دوو گۆڕانکاریە بەشێوەیەکی تەریب بەیەك، نەك بەشێوەی هۆ و دەرئەنجامەکەی لەپاڵیەکدا دادەنێت، بەڵام بەئاشکرا ئاماژە بەوە دەکات کە بەبڕوای ئەو تەکنەلۆژیە سیاسیەکان بەر لەتەکنەلۆژیە ئابوریەکان، پەیدابوون. فۆکۆ بەڵگە دێنێتەوە کە تەکنەلۆژیای کۆنتڕۆڵ بناغەی پەرەسەندن و گەشەکردن و سەرکەوتنی سەرمایەداری وەك بزوتنەوەیەکی ئابوری، پێکدەهێنێ. بێ ئامادەبوونی تاکە ڕێکخراو دیسپلینکراوەکان لەناو دەزگای بەرهەمهێناندا، پێداویستیە تازەکانی سەرمایەداری جێبەجێ نەدەبوون. بە هەمانشێوە سەرمایەداری بێ لەقاڵبدان، کونتڕۆڵ و دابەشکردنی عەقڵانی دانیشتوان لەئاستێکی بەربڵاودا، مومکین نەبوو. بەپێێ بەڵگاندنەکانی فۆکۆ ئەمجۆرە تەکنیکانەی کۆنتڕۆڵ، پشتیوانی لەگۆڕانکاریەکی مەزنتر و دیارتری لەبواری بەرهەمهێناندا دەکرد. لایەنیکەم لەفەرەنسادا پەرەسەندنی تەکنەلۆژیای کۆنتڕۆڵ هەم لەڕووی مێژووی و هەم لەرووی لۆژیکیەوە، بەر لەپەیدابوونی سەرمایەداری دەستی پێکرد. ئەم تەکنەلۆژیانە هۆی دروستبوونی سەرمایەداری نەبوون، بەڵکو بە زەمینەی تەکنەلۆژیەکانی سەرکەوتنی سەرمایەداری، دەژمێرران.

وەك پێشتر گوتمان فۆکۆ بڕوایوایە کە تەکنەلۆژیاکانی کۆنتڕۆڵ لەهەمانکاتدا کە بەرێژە بەشاراوەیی مانەوە، پەرەیانسەند. ئەم تەکنەلۆژیانە بەئاسانی گوتاری تیورەی سیاسی، یاسا و بەرپرسیارێتیەکان و نادادپەروەریان لەناو نەبرد. ئەو کەسانەی تەکنەلۆژیای دەسەڵاتیان جێبەجێکرد، لەراستیدا چەند تیورەیەکیان لەبارەی دەوڵەتەوە بەکارهێنا کە هەریەکێکیان لەکاتێکی تایبەتدا لەرابردودا پێشکەشکرابوون. ئەم تیورە جیاوازانە دەیانتوانی لەجێگە جیاوازەکانی دەرکەوتنی دەسەڵاتدا واتە لەکارخانە، قوتابخانە، زانکۆکان و بەڕیوبەرایەتیەکانی دەوڵەتدا، پێکەوە بژین. مەبەست ئەوە نیە کە ئەم تیورانە گرنگیان نەبوو، بەڵکو ئاڵۆزی و







تەنانەت ململانێ لەنێوان هەڵوێستە تیوریەکاندا، ئەو راستیەی دەشاردەوە کە کۆمەڵێك کرداری تەواو تازە لەبواری دەسەڵاتی باڵادەست بەسەر ژیاندا، بەشێوەیەکی بەربڵاو لەلایەن گشتەوە قبوڵکراوە. بۆ نمونە گوتاری هیومانیستی سەدەی هەژدەهەم لەبارەی یەکسانیەوە، بزوتنەوەیەکی سیاسی تەواو بێ وێنەی وروژاند. بەڵام لەهەمانکاتدا دیسپلینی توند لەکارخانە پیشەسازیەکان، ناوەندەکانی بێگاریکردن بە بێکاران چاودێریکردن و کونتڕۆڵی روو لەزیادی پۆلیس بەسەر تاکەکانی کۆمەڵگادا، پەرەسەندنی ئارام و بێ هەراو هوریای کۆمەڵێك پەیوەندی زامندەکرد کە دیارە نەیاندەتوانی پەیوەندی یەکسانی و برایەتی و ئازادی بن. لەو کاتەدا کە بێگومان پێشکەوتنێکی نکوڵی لێنەکراو لەبواری نوێنەرایەتی سیاسی و یەکسانیدا بەدەستدەهات، بەڵام تەکنیکەکانی کۆنتڕۆڵ پیشانیاندەدا کە ئەندامانی کۆمەڵگا نە یەکسان بوون و نە بەیەك ئەندازە دەسەڵاتیان هەبوو: "کۆنتڕۆڵە واقعی و جەستەییەکان، بناغەی ئازادیە روکەشی ویاساییەکانی پێکدەهێنا. رەنگە پەیمانی (کۆمەڵایەتی) بە بناغەی ئایدیالی یاسا دانرا بێت، بەڵام تەکنەلۆژیای کۆنتڕۆڵ، تەکنیکێکی ناچارکردن وملکەچکردنی لەئاستێکی بەربڵاودا پێکدەهێنا" (کۆنتڕۆڵ و سزا، لا ٢٢٤، بەهەندێك دەستکاریکردنی وەرگێڕان).

ئەگەرچی ئەم تەکنەلۆژیا سیاسیە لەناو تۆڕی ئاڵۆزی تیورەی سیاسی تەقلیدیدا جێی نەدەبۆوە، بەڵام ناعەقڵانی و بێ بابەت نەبوو، بەڵکو لەراستیدا عەقلانیەتی تایبەتی خۆی هەبوو. ڕێك ئەم عەقڵانیەتە لەگەڵ تەکنەلۆژیا تازەکانی دەسەڵاتی باڵادەست بەسەر ژیاندا، ئەو بابەتەیە کە فۆکۆ شیدەکاتەوە. بۆ تێگەیشتن لەخەسڵەتەکانی ئەم شێوازە فکریە سیاسیە تازەیە، دەبێ جیاوازی بکەین لەنێوان ئەو روانگەیەی لەسەردەمی کلاسیکیدا دەرکەوت، لەگەڵ ئەو تیورانەی رابردوو لەبارەی سیاسەت و زانینەوە.

بەشێوەیەکی تەقلیدی فکری سیاسی لەرۆژئاوادا گرنگی بە دادپەروەری و خۆشگوزەرانی هاوڵاتیان دەدا. عەقڵی پراکتیکی هەوڵیدەدا خەسڵەتی فەردی و ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسی لەسەر بناغەی تێگەیشتنێکی میتافیزیکی بۆ سیستەمی گەردوون ڕێکبخات. تێکستە مەسیحیەکان وەك تێکستەکانی سەن تۆماس لەهەمان هێڵی فکری ئەرستۆدا بوون. سەن تۆماس ئارەزووی سیستەمێکی چاکیدەکرد کە

رەگی لەجیهانبینیەکی تیوری بونگەریدا بوو. سیاسەت خزمەتی ئامانجیکی بالاتری دەکرد کە پشتی بەسیستەمێکی هەمەکیتر بەستبوو..و ئەم سیستەمەش شیاوی ناسین بوو. بیرکردنەوەی سیاسی، هونەرێك بوو کەلەجیهانێکی کەموکوڕدا، رێنمایی مرۆڤەکانی بۆ ژیانێکی خۆشبەختر دەکرد، هونەرێك لەسەر ئەو شێوازەی کە خوداوەند سروشتی پێ رێکدەخست.

جۆری دوهەمی عەقلانیەتی سیاسی لەسەردەمی رێنساسدا پەیدابوو، کە لەگەڵ ناوی مەکیاڤیلیدا دێت. مەکیاڤیلی ئامۆژگاری میری دەکرد کە چۆن دەوڵەتەکەی خۆی بپارێزێت. بەمشێوەیە پەیوەندی نێوان میر و ئەو جۆرە دەوڵەتەی کە حوکمیدەکات، بوو بە بابەتی بیرکردنەوەی سیاسی. ئەم گۆڕانە وەك مێژوونوسانی دیش ئاماژەیان بۆ کردووە، بەدابڕانیکی سەرەکی لەنەریتی بیرکردنەوەی سیاسی رابردووی رۆژئاوا دادەنرێت. لێرەدا چیدی هیچ سەرنجێکی میتافیزیکی لەئارادا نەبوو..وە هیچ شتێك جگە لەپاراستنی دەسەلاتی میر، جێگەی سەرنج نەبوو. ئامانجی سەرەکی نوسینەکانی ئەم سەردەمە زیادکردن و تەبایی دەسەلاتی سیاسی بوو، نەك ئازادی یان خۆشبەختی و یان تەنانەت ئارامی و ئاسایشی هاولاتیان. بەمشێوەیە زانینی پراکتیکی و هونەری بەسەر سەرنجە میتافیزیکیەکاندا سەرکەوت، بوو بە مەسەلە ستراتیژیە سەرەکیەکان.

گۆڕانیکی دی لەبیرکردنەوەی سیاسیدا رویدا کە بە پەیدابوونی تیورەی بەرژەوەندی بالای دەوڵەت دەناسرێت و لەدوو گۆڕانەکەی سەرەوە جیاوازە. گەرچی تیورەسازانی سەرەتایی بەرژەوەندی بالای دەوڵەت، لەهەمان سەردەمی مەکیاڤیلیدا پەیدابوون و بەشێوەیەکی ئاسایی ناویان لەگەڵ ئەودا دێت، بەلام فۆکۆ لەروانگەیەکی جیاوازەوە سەیریاندەکات و بەتایبەتی گرنگی بە نوسەرانی نامیلکە و دەستوری کاری پۆلیس لەو سەردەمەدا دەدات. ئامانجی فۆکۆ ئەوەیە دەریبخات ئەم نوسەرانە کە بەشێوەیەکی گشتی ناویان بۆ ئیمە نەناسراوە، سیاسەتگەلێکیان بۆ بەکارهێنانی پراکتیکی دانا و تەکنیکگەلێکی وردیان بۆ سەپاندنی رێکخستن و دیسپلینکردنی تاکەکان پێشکەشکرد و لەهەمانکاتدا نەریتی سەرەکی بیرکردنەوەی سیاسیان لەرۆژئاوادا بۆ شاردنەوەی شێوازە تایبەتیەکانی خۆیان بەکارهێنا. لەگەڵ







هەموو ئەمانەشدا ئەم نوسەرانە نوێنەری گۆڕانکاریەکن لەفەلسەفەی سیاسیدا. کەسانێك کە بۆ پاراستنی بەرژەوەندی بالای دەوڵەت چەند تەکبیرێکیان پێشکەشکرد، دەوڵەتیان بەئامانجێك لەخۆیدا دادەنا و چارەنوسی ئەم دەوڵەتەیان لەهەرجۆرە سیستمێکی ئەخلاقی فراوانتر و هەروەها چارەنوسی میرەکان، بەجیا دەزانی. بەپێی بەلگاندنەکانی فۆکۆ ئامانجی ئەوان مۆدێرنترین و بونیادیترین ئامانج بوو، چونکە لەدیدی ئەوانەوە عەقلانیەتی سیاسی رووی لەدەستگەیشتن بە ژیانی خۆشبەختانە یان تەنها پاراستنی میر نەبوو، بەلکو دەیویست لەرێگەی کردەی کۆنترۆلکردنی سەختری جەستەی هاولاتیان، پانتایی دەسەلات لەبەر خودی دەسەلات پەرەپێدا.

یەکەم بنەمای ئەم عەقلانیەتە سیاسیە تازەیە ئەوە بوو کە ئامانجەکەی خودی دەوڵەت بوو، نەك یاساکانی بالادەست بەسەر مرۆڤەکان و سروشتدا. بوونی دەوڵەت و دەسەلاتی دەوڵەت، بابەتی راستەقینەی زانینی تەکنیکی و بەڕێوبەرایەتی تازە بوو، لەبەرامبەر گۆتاری یاسایی کۆندا کە دەسەلاتی بە ئامانجیکی تری وەك دادپەروەری، خۆشبەختی و یان مافی سروشتیەوە گرێدەدا. مەبەست ئەوە نیە کە مافەکان بێسود یان لەناوچوون، بەلکو هێواش هێواش کارکردنی دی لەکۆمەلگای مۆدێرندا پەیداکرد.

هەنوکە ئیدی بابەتی تیگەیشتنی زانستی بەریوبەرایەتی، نە مافەکانی خەلك و نە ماهیەتی خودایی یا مرۆیی یاساکان، بەلکو خودی دەوڵەت بوو. لەگەڵ ئەمەشدا ئامانجی ئەم زانینە ئەوە نەبوو کە تیورەگەلێکی گشتی پەروەردە بکات، بەلکو مەبەست ئەوە بوو ماهیەتی تایبەتی هەر دەوڵەتێکی مێژوویی تایبەت پێناسبکات. ئەمەش خۆی پێویستی بەکۆکردەنەوەی زانیاری لەبارەی فەزای دەوروبەری دەوڵەت و ژمارەی دانیشتوان و سەرچاوەکان و ئەو مەسەلانەوە هەبوو کە پەیوەندیان پێیانەوە هەیە. وەك پێشتر بینیمان بۆ بەرهەمهێنانی زانینێکی لەمچەشنە، دەبوو کۆمەلێك شێوازی ئەزمونگەری لیکۆلینەوە و تاوتوێکردن، دروستبکرێت. بەمشێوەیە خوێندنەوە لەناو مێژوو، جوگرافیا، هەلومەرجی هەریمایەتی و ژمارەی دانیشتوانی هەر ولاتێك لەسنوری هەستی فزولیەتی تیوری ئاسایی تێپەڕی و بوو بە رەگەزێکی سەرەکی لەپێکهاتەی تازەی دەسەلات و زانیندا. حکومەت و بەتایبەتی دەزگای بەڕێوەبردنی، بەمەبەستی ئەوەی بەشێوەیەکی چالاك کاربکات، پێویستی بە

زانینێکی بابەتی، دیاریکراو و شیاوی ئەندازەگیری بوو. هەرئەم زانینەیە ئەو توانایەی بەحکومەت دەبەخشی تا بەوردی هەلومەرجی هێزەکانی خۆی بەوردی دیاریبکات و خاڵی لاواز و چۆنێتی لەناوبردنیان بزانێت. بەمشێوەیە عەقلانیەتی تازەی دەسەڵاتی بالادەست بەسەر ژیاندا، پەیوەندی بە زانستە کۆمەڵایەتی ئەزمونگەرەکان و تازە پێگەیشتوەکانەوە هەبوو. بۆ نمونە ئەوەی لەسەرەتادا خوێندنەوەی ژمارەی دانیشتوان بوو، بە زوویی بوو بەزانستی ژمێریاری سیاسی. لێرەدا بیری ئەو بەشە جیاوازانەی «رۆحی یاساکانی» مۆنتیسیکۆمان دەکەویتەوە کە لەبارەی ئاو و هەوا ، جوگرافیا، ژمارەی دانیشتوانی و شتی لەم بابەتەوەیە کە زۆرجار لەلایەن شیکەران و تەفسیرکارانی تازەوە کورت یان سڕاونەتەوە. لەدیدی فۆکۆدا ئەم بەشانە گرنگترین بەشەکانی وتارەکەی مۆنتیسیکۆن، نەك ئەو بەشانەی کە باسی چاکیەکان دەکات.

دەرئەنجام ئەوەیە کە بەڕیوبەرەکان و کارگوزارە دەوڵەتیەکان پێویستیان بە ناسینێکی ورد نەك تەنها لەبارەی دەوڵەتی خۆیان، بەڵکو لەبارەی وڵاتانی دیشەوە هەبوو. ئەگەر ئامانجی ئەم عەقلانیەتە سیاسیە دەسەڵاتی دەوڵەتی بوو، لەم حاڵەتەدا ئەم دەسەڵاتە دەبوو بەپێی هێز و توانا، ئەندازەگیری بکرێت. لەورووەوە کە هەموو دەوڵەتەکانی تریش هەمان گەمەی سیاسیان دەکرد، بەراوردکردن لەنێوانیاندا شتێکی بنەڕەتی و سەرەکی بوو. خۆشگوزەرانی و تەنانەت مانەوە نەك دەرئەنجامی فەزیلەت، بەڵکو بە بەرهەمی هێز و توانا دەژمێررا. لێرەشدا رەگەزی سەرەکی زانینی ئەزمونگەری بوو، نەك تیورەی ئەخلاقی.

بەمشێوەیە سیاسەت گۆڕا بۆ "سیاسەتی بالادەست بەسەر ژیاندا **(Bi0-Politics)**". هەرئەوەندەی کە دەسەڵاتی بالادەست بەسەر ژیاندا پەیدابوو، ژیانی دانیشتوان و لەناوچونیان، بووە پەیڕەوی هەڵبژاردنە سیاسیەکان. لەو رووەوە کە ئەم دانیشتوانە شتێك نەبوو جگە لەوەی «دەوڵەت لەبەرخاتری خۆی گرنگیان پێدەدا»، کەوابوو دەوڵەت دەیتوانی بەپێی بەرژەوەندیەکانی خۆی جێگۆڕکێیان پێبکات یان ملیان بپەڕێنێت. بەکورتی:

«دەکرێ دەستێوەردانی روو لەزیادی دەوڵەت لەژیانی تاکەکەسدا، لەگواستنەوە







لەم بیرەوە کە دەوڵەت خاوەن خەسڵەت و ئامانجێکی تایبەتی خۆیەتی، بۆ ئەو بیرەی تر کە مرۆڤ بابەتی راستی دەسەڵاتی دەوڵەتە ببینین. مرۆڤ تا ئەو شوێنەی بەرهەمهێنی دەسەڵاتە، تا ئەو شوێنەی بونەوەرێکی زیندووە و کرێکار و قسەکەرە، تا ئەو شوێنەی کۆمەڵگا پێکدەهێنێت، تا ئەو شوێنەی لەناو فەزایەکی سەر بە کۆمەڵدایە (بابەتی راستی دەسەڵاتی دەوڵەتە). گرنگی ژیان بەهۆی ئەم مەسەلە پەیوەندیدارانە بەدەسەڵاتی سیاسیەوە زیاددەکات، جۆرێك ئاژەڵسازی مرۆڤ لەرێگەی ئالۆزترین تەکنیکە سیاسیەکانەوە ئەنجامدەدرێ. هەم پەیدابوونی توانای زانستە کۆمەڵایەتیو مرۆڤایتیەکان و هەم پەیدابوونی توانای پاراستنی ژیان و توانای کوشتنی دەستەجەمعی لەهەمانکاتدا، لەشانۆی مێژوودا دەردەکەون" (وتارخوێندنەوەی زانکۆی ستانفۆرد تشرینی یەکەم / ئوکتۆبری ١٩٧٩).

فۆکۆ لەشیکردنەوەی ئەمجۆرە تازەیەی عەقلانیەتی سیاسیدا، پەیوەندیەکی تازە لەنێوان سیاسەت و مێژوودا دەستنیشاندەکات. داڕێژەری یاسای زانا و هوشیار چیدی ناتوانێ هەموو رەگەز و جەمسەرەکانی دەوڵەت جێبەجێبکات و هاوئاهەنگیەکی کامڵ و بێ کەموکوڕ دروستبکات. لەبری ئەمە دەبێ چاودێری کۆمەڵێك هێز لەحاڵەتی گۆڕاندا بکات کە بەنۆبەت بەهۆی بڕیاردانی سیاسی رژێمەوە، بەهێز یان لاواز دەبێت. لەو روەشەوە کە چیدی هیچ جۆرە بنەمایەکی یەکسانی یان سنورێك لەدەرەوە ناتوانێت داسەپێنێت، کەوابوو هیچ سنورێکی دەرونی بەسەر هێز و توانایدا کە دەشێت بەدەستی بێنێت، بوونی نیە. دەسەڵات کە لەسنورەکانی سروشت و ئاینزا بەتاڵ بۆتەوە، دەچێتە ناو جیهانێکەوە کە لایەنیکەم توانای پەرەسەندنی بێ سنوری هەیە. ئەم پەرەسەندنە (یان وێرانی) لەشانۆی مێژوودا روودەدات. دیارە هێزە مادیەکان هەن کە کار لەرەوتی مێژوو دەکەن. پەیدابوونی ئەم سەردەمە لەژیانی سیاسیدا پەیوەندی بە گۆڕانە سەرەکیە ئابوریەکان و ژمارەی دانیشتوان و بەتایبەتی بە پەیدابوونی سەرمایەداریەوە هەیە. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا پاش ئەوەی زیاد لەسەدەیەك بەسەر مێژوونوسی مارکسیانەدا تێدەپەڕێت، دیسان گرنگی تایبەتی ئەم عەقلانیەتە سیاسیە تایبەتە، بەپێی پێویست شینەکراوەتەوە. دیاریکردن و شیکردنەوەی ئەم کردارە سیاسیە

دیاریکراوەکانە، جەوهەری گرنگییێدانی فۆکۆ پێکدەهێنێت.

بۆ نموونە گەرچی سەرنجی ئەوەی تازەی بەڕێوبەران و کارگێڕانی دەوڵەتی لەسەر ژمارەی دانیشتوان بوو، بەڵام لەهەمانکاتدا لەروانگەی بەڕێوبەرایەتیەوە پێناسێکی تازە بۆ سیاسەت و تاك باو بوو. لەبواری روو لەپەرەسەندنی دەوڵەتی مۆدێرن ودەزگای بەڕێوبردنیدا، مرۆڤەکان لەهەر بوارێکدا وەك یەکێك لەسەرچاوەکان تەماشادەکران. تاکەکەس تا ئەو کاتە گرنگی پێدەدرا کە بەشداری هەبێت لەبەهێزکردنی دەوڵەتدا. ژیان، مردن، چالاکی، کار، بەدبەختی و خۆشی تاکەکەسەکان تا ئەوجێگەیە بەگرنگ دادەنران کە لەرووی سیاسیەوە سودمەند بن. هەندێکجار ئەوەی تاکەکەس دەبوو لەروانگەی دەوڵەتەوە ئەنجامیبدات، بریتیبوو لەوەی بەشێوەیەکی تایبەت بژی یان کاربکات یان بەرهەمبهێنێت، و هەندێکجاریش تاکەکەس دەبوو بۆ بەهێزکردنی دەسەڵاتی دەوڵەت بمرێت. پەیدابوونی تاکەکەسی مۆدێرن وەك بابەتی گرنگییێدانی سیاسی و زانستی و دەرئەنجامەکانی ئەم گۆڕانکاریانە بۆ ژیانی کۆمەڵایەتی، هەنوکە وەك مەسەلەی سەرەکی جێی شیکردنەوەی فۆکۆی لێهاتووە.

ئەرکی پۆلیس بریتیبوو لەرێکخستن و جێبەجێکردنی تەکنیکەکانی باڵادەست بەسەر ژیاندا، بە مەبەستی چاودێریکردنی دەوڵەت بەسەر ژمارەی دانیشتواندا. گەرچی پۆلیسی فەرەنسا لەسەدەکانی حەڤدە و هەژدەدا بەبەشێك لەدەزگای یاسایی دەژمێررا، بەڵام لەگەڵ تاکە کەسەکاندا نەك وەك خودێکی یاسایی، بەڵکو وەك بونەوەرێکی زیندوو کە خەریکی کار و بازرگانیە مامەڵەدەکات. (ئەم رەهەندەی باسەکە بەدورودرێژی لە«سیستەمی شتەکاندا» بەشێوازێکی جینالۆجیانە تاوتوێکراوە). فۆکۆ لەسەر بناغەی نامێلکە و دەستوری کاری بەڕێوبەرایەتیەکانی ئەو سەردەمە، دەریدەخات کە ئەرکی پۆلیس کە بەشێوەیەکی روو لەزیاد پلەی یەکەم داگیردەکات، چاودێریکردنی تاکە تایبەتیەکان و کۆی خەڵکی تا ئەو جێگەیەی بوو کە پەیوەندی بە بەرژەوەندی دەوڵەتەوە هەبوو. لێرەوە ئەرکەکانی پۆلیس زۆر گەورەتر و بەرفراوانتر بوو: "مرۆڤ و شتەکان لەو پەیوەندیانەدا کە بە موڵکایەتیەوە هەیانە، ئەوەی بەرهەمی دێنن، پێکەوە ژیانی مرۆڤەکان لەیەك سەرزەمیندا، ئەوەی





لەبازاردا ئاڵوگۆڕ دەکرێت (هەموو ئەمانە لەئەرکەکانی پۆلیسن). ئەم ئەرکانە هەروەها چاودێری پۆلیس بەسەر شێوەی ژیانی مرۆڤەکان، ئەو نەخۆشی و رووداوانەی توشیان دەبێت، دەگرێتەوە. بابەتی چاودێری پۆلیس، مرۆڤی زیندووی چالاك و بەرهەمهێنە. نامیلکەیەکی سەردەمی سەڵتەنەتی لوی چواردەهەم دەڵێت "بابەتی کاری راستی پۆلیس، مرۆڤە" (هـ.س.پ) پێشتر دەسەڵاتی دەوڵەت بەسەر مرۆڤەکاندا وەك کۆمەڵێك تاکەکەسی خاوەن ماف و ئەرك جێبەجێدەکرا. بەڵام لەم کاتەدا پۆلیس لەگەڵ مرۆڤەکاندا، لەچالاکیە رۆژانەیەکانیاندا وەك رەگەزی سەرەکی هێز و چالاکی دەوڵەت سەروکاری پەیداکرد. پۆلیس و بەڕێوبەرایەتیە هاوکارەکانی، هەنوکە بەرپرسیاری چاککردن و خوشگوزەرانی و لەهەمانکاتدا کونترۆڵی مرۆڤەکان لەئەستۆ دەگرێت.

دەزگای بەڕێوبردنی دەوڵەت مەسەلەی خوشگوزەرانی لەژێر ناونیشانی دابینکردنی پێداویستیەکان و خوشبەختی خەڵکیدا، دەخاتەڕوو. دیارە ئەمە هەمان ئەو ئامانجانە بوو کە حکومەتەکانی پێشووش خۆیان بۆ دابینکردنی تەرخانکردبوو، بەڵام پەیوەندیەکان هەنوکە هەڵگەڕاونەتەوە. هەنوکە پێداویستیە مرۆییەکان چیدی وەك ئامانجێك لەخۆیاندا یان وەك بابەتگەلێکی فەلسەفی کە بەدوای دۆزینەوەی ماهیەتی زاتی شتەکاندان، وێنا ناکرێن، بەڵکو لەدیدێکی ئامیرگەریانە و ئەزمونگەرانەوە بە هۆکاری زیادکردنی دەسەڵات دەژمێررێن. فۆکۆ بەمشێوەیە پەیوەندی نێوان تێروانینی بەڕێوبەرایەتی تازە بۆ خۆشگوزەرانی مرۆڤ و پەرەسەندنی دەسەڵاتی باڵادەست بەسەر ژیاندا، پیشاندەدات. بەڕێوبەران و کارگێرانی دەوڵەتی تێروانینی خۆیان بۆ خوشگوزرانی و دەستێوەردانی دەوڵەت، بەپێی وتەزا بایەلۆجیەکانی وەك بەرهەمهێنانی مرۆڤ، نەخۆشی، کار و یان ئازار و رەنج، ئاراستە دەکرد.

دوو جەمسەری دەسەڵاتی باڵادەست بەسەر ژیاندا واتە کرداری کونترۆڵکردنی جەستە و رەگەزی مرۆڤ کە لەسەدەی هەژدەدا بەجیا لەیەك پەرەیانسەند، لەسەدەی نۆزدەهەمدا لەچوارچێوەی گرنگیدانێکی روو لەزیاددا بە سێکسوالیتە پێکەوە گرێدران. سەرەڕای دەوڵەت هەندێك شکڵی تری دەسەڵاتیش هاتنە مەیدانەوە و ئەوانیش بە مەبەستی کونترڵکردنی کردارە جنسیەکان، شێوازگەلێکی تازە و هەروەها





گوتارێکیان لەبارەی سێکسوالیتەوە بەکارهێنا. سێکسوالیتە بوو بە بونیادێك کە لەرێگەیەوە دەسەڵات، چالاکی زیندووی جەستەی بە چالاکی زیندووی ڕەگەزی مرۆڤەوە گرێدەدا، سێکسوالیتە و ئەو مانایەی کەپێی بەخشرا، هەنوکە دەبوون بە ڕێرەوی سەرەکی پەرەسەندنی دەسەڵاتی باڵادەست بەسەر ژیاندا.

ئێمە باسە سەرەکیەکانی فۆکۆ لەبارەی سێکسوالیتەوە (یان بەوتەی خۆی "بڵاوبونەوەی سێکسوالیتە") لەفەسڵی هەشتەمی ئەم کتێبەدا دەهێنینەوە. لێرەدا تەنها جەخت لەوە دەکەین کە بابەتی سێکسوالیتە وەك بەشێك لەبواری ڕوو لەپەرەسەندنی دەسەڵاتی باڵادەست بەسەر ژیاندا دەرکەوت. ئەمجۆرە گوتارە لەبارەی سێکسوالیتەوە نابێت بەچەمکە فیبەریەکەی، واتە وەك پەیدابوونی جۆرێك تەسەوفی نادینی وەربگرین. لەناو تۆڕی تەفسیری دەسەڵاتی باڵادەست بەسەر ژیاندا، بڵاوبونەوەی سێکسوالیتە نەك بەکەمبونەوەی ئارەزوو بۆ سێکسوالیتە، بەڵکو بووە هۆی پەیدابوونی گوتار و ئارەزوو بۆ چالاکی زیندووی جەستە بەئەندازەیەکی زۆر گەورە. بەپێی بانگەشەی فۆکۆ ئامانج «قوڵکردنەوەی گرنگی جەستە و خستنەرووی تەندروستی و شێوەی دابینکردنی بوو وەك مەسەلەیەك کە شیاوی پێڕاگەیشتنە، مەبەست بریتیبوو لەتەکنیکگەلێکی تازە بۆ درێژکردنەوەی تەمەن.. بابەتی سەرەکی بریتیبوو لەجەستە، تەندروستی، درێژی تەمەن، زاد و وەلەد و ئەسڵ و فەسڵی چینایەتی" (مێژووی سێکسوالیتە. ل١٢٣) پێدەچێ هیچکات ئەوەندە گرنگی بە لایەنەکانی جەستە و ڕەهەندە جیاوازەکانی سێکسوالیتە نەدراوە. بەمشێوەیە لەناو دەرونی سێکسوالیتەدا، مانا و دەسەڵات و زانستێکی تازە بە وەدیعە دانرا.

تا پێش کۆتای سەدەی نۆزدە بەکارهێنانی گشتی سێکسوالیتە لەسەرتاسەری کۆمەڵگادا بڵاوبوبۆوە. چینەکانی ناوەڕاست کە لەسەرەتای سەدەی نۆزدەهەمدا خۆیان لەئەرستۆکراتەکان و ڕەمزەکانی ئەسڵ و فەسڵی ئەو چینە جیاکردبۆوە، هەنوکەش خۆی لەچینی کرێکاری کە بەرەو ناوەوەی تۆڕی سێکسوالیتە و دەسەڵاتی باڵادەست بەسەر ژیاندا، ڕادەکێشران، جیادەکردەوە. لەسەرەتای سەدەی نۆزدەدا ئەخلاقگەرەیانی بۆرژوازی ئامۆژگاری هاوچینەکانی خۆیان دەکرد، بەوردی گرنگی بەسێکسوالیتە و ژیانی شاراوەی سێکسوالیتە و مەترسیەکانی بدەن. تا پێش کۆتای





سەدەی نۆزدەهەم مەترسیەکانی سێکسوالیتە گرنگی زیاتری پێدرا و پێشنیاری سەرکوتکردن و شاردنەوە، لەرووی ئەخلاقیەوە دەکرا. فۆکۆ ئەم گوتارە تازەیە بەمشێوەیە وەسفدەکات: "سێکسوالیتە نەك وەك ڕێنماکەرانی وێژدان و ئەخلاقیەکان، پەروەردەکاران و پزیشکان بەردەوام بە نەوەکانی پێشویان دەگوت کە نهێنیەکی گەورەیە، نەك هەر دەبێت ئێمە ئەو هەقیقەتەی کە سێکسوالیتە دەشارێتەوە بدۆزینەوە، بەڵکو ئەگەر ئەم هەموو مەترسیەی لەخۆ گرتووە، لەبەرئەوەیە ئێمە ئەم هەمموو ماوەیە لەبارەیەوە بێدەنگ بووین جا یان لەبەر هۆی ئەخلاقی یان هەستی توندی گوناە یان دوڕوویی و یان هەر هۆیەکی تر" (ه.س.پ • ل ١٢٨ و ١٢٩) پاش ئەوەی کە سێکسیکردنی تاکەکان و کۆمەڵەکان لەسەرتاسەری کۆمەڵگادا بڵاوبۆوە، ئیدی خەریکبوونی خەیاڵی بۆرژوازی بە سێکسوالیتەوە نەیدەتوانی ئاماژەی جیاوازی چینایەتی بێت، هەنوکە سێکسوالیتە لەچالاکیەکی مانادارەوە بوو بەئامێرێکی کونترۆڵکردنی ئیداری.

هەر لەم قۆناغەی پەرەسەندن و بڵاوبونەوەی دەسەڵاتی باڵادەست بەسەر ژیاندا بوو کە بەرنامە کۆمەڵایەتیەکان، بەرەسمی دەرکەوتن. بۆرژوازی لەکاتێکدا قسەی لەبارەی خەیاڵکردنەوەکانی زیناکردن لەگەڵ مەحرەمەکاندا دەکردو شتی دەنوسی، بەرنامەگەلێکی خۆپارێزی کۆمەڵایەتی لەناوچە لادێیەکان و گەڕەکە پەراوێزیەکانی شاردا بەرێدەخست. ئەنجومەنە ئیسلاحیە جیاوازەکان هەوڵیاندەدا کردارە حەرامکراوەکان و خووە شازەکان لەناو چینی کرێکاردا لەناو بەرن. لەژمارەیەکی زۆری وتار و ڕاپۆرت و ڕۆژنامەکاندا، خەڵکیان لەم مەترسیانە ئاگادار دەکردەوە. سەرەڕای شارەوانیەکان، دەرمانخانەگەلێکیان بۆ ڕوبەڕوبونەی نەخۆشیە جنسیەکان دامەزراند و لەهەمانکاتدا لەرێگەی ئامادەکردنی کۆمەڵێك ڕاپۆرتی ئاڵۆزی پزیشکی و دروستکردنی سۆزانیخانە ڕێگەپێدراوەکان، هەوڵدانێك بۆ ڕێکخستن و چاودێریکردنی سۆزانیەت، ئەنجامدرا. بەمشێوەیە تۆڕێکی کونترۆڵکردن بەناوی تەندروستی گشتی و پاراستنی پاکی ڕەگەزەوە پەرەیسەند. پێدەچێت بانگەشە بۆ بەرگریکردن لەچارەنوسی ڕەگەز و نەتەوە، مەبەستی بەتایبەتی مومارەسە جنسیەکان بوو بێت.

پاش ماوەیەکی کەم دەرونشیکاریش بۆ مەسەرەفی بۆرژوازی هاتە ئاراوە.





دەرونـشیکاری لوتکـەی گریمانـەی سـەرکوتکردن، پەیوەنـدی نیـوان ئـارەزوو و یاسـا لەپەتیترین شکڵیدا، و تێکئـاڵانی مانـای شـاراوە و سەرسوڕهێنەر بـوو. دەرونـشیکاری لایەنیکەم بۆ هەندێك دەرمـانی سـەرکوتکردن بـوو. بـەپێی دەرونـشیکاری پەیوەنـدی نێـوان سێکـسوالیتە و یاسـا وەك سـەرکوتکردن، پەیوەندیـەکی تـەواو گـشتی و سەرتاسـەری بـوو، و هـەر ئـەم پەیوەندیـە بناغـەی شارسـتانیەتی پێکـدەهێنا. بـەڵام ئارەزوە زیناکاریەکان کە بونە هۆی بەرپابوونی سەرکوتکردن لەهەموو کۆمەڵگاکاندا، هەنوکـە بەشـێوەیەکی بـێ مەترسـی لەرێگـەی دەرونـشیکاریەوە، لـەگوتاردا شـیاوی خـستنە رووبـوون. بـۆرژوازی کـاتێکی دەسـەڵاتی پاوانکارانـەی خـۆی بەسـەر سێکسوالیتەدا لەدەستدا، ئیمتیازێکی تری بۆخۆی دەستەبەر کرد: هەنوکە بـۆرژوازی دەیتوانی لـەبارەی سێکسوالیتەی سـەرکوتکراو و قـوڵترین ئارەزووەکانـەوە قسە بکات. لایەنیکـەم بـۆ بـۆرژوازی "هەنوکـە ئـەرکی هەقیقـەت بەسـتڕایەوە بـەدۆزینـەوەی قەدەغەکراو و دانپێنانیش هەنوکە بەستڕایەوە بەقسەکردن لەبارەی ئـەو شـتەوە کە دەسەڵات قەدەغەی دەکات".

هەردوو بەشی دەسەڵاتی باڵادەست بەسەر ژیاندا، واتە کـونتڕۆڵکردن و دانپیانـان، هەرچـەند لـەرووی بـەکارهێنانی چـینایەتیەوە جیـاواز بـوون، بـەڵام لـەو گریمانـە هاوبەشانەی کە لەبارەی گرنگـی سێکسوالیتەوە هـەیانبوو، یەکسانبوون. یـەکێك لـەو نمونانـەی فۆکـۆ دەیهێنێتـەوە، ئـەم خاڵـە روندەکاتـەوە. لەسـەرەتای سـەدەی نـۆزدەدا لەرووی زانستیەوە راگەیەنرا کە تابۆی زیناکردن لەگەڵ مەحرەمەکاندا رێسای گـشتی هەموو کۆمەڵگاکانە، لەهەمانکاتدا دەزگاری بـەڕێوەبردنی دەوڵـەت هەوڵیـدا سـنورێك بۆ ئەم کرداره قەدەغەیە لەناو دیهاتیەکان و چینی کرێکاردا دابنێت، و رۆشنبیرانیش لەریگەی زانستی دەرونشیکاریەوە توانیان خۆیان قەناعـەت پێبکـەن کـە بەقـسەکردن لـەبارەی ئـەم تابۆیـەوە، لەبەرامبـەر سـەرکوتکردندا بەرگریدەکـەن. بەمـشێوەیە مەسـەلەکە کۆتـایی پێهـات و گریمانـەی سـەرکوتکردن بـوو بـە بناغـەی پێـشکەوتنی دەسەڵاتی باڵادەست بەسەر ژیاندا.

بەمشێوەیە گەر بگەڕێینـەوە بـۆ پرسـیارە بەدیهیەکـەی فۆکـۆ لەسـەرەتای کتـێبی مێژووی سێکسوالیتەدا کە ئایا گوتاری رەخنەگرانە لەبارەی سەرکوتکردنەوە رێگرێك







بوو بۆ دەسەڵات یان بەشێك بوو لەمیکانیزمی ئەو دەسەڵاتەی کە رەخنەی لێـدەگیرا، دەتـوانین هەنوکـە وەڵام بدەینـەوە کـە گوتـاری رەخنەگرانـە خـۆی بەشـێك بـوو لەدەسـەڵات. فۆکـۆ ئـەم خاڵـە بـەکورتی بەمـشێوەیە دەردەبـڕێ "بەمـشێوەیە یاسـا، تەنانـەت لەزانـستی میکـانیکی تـازەی دەسـەڵاتدا، لەئەمانـدا دەبێـت و بەسـەقامگیری دەمێنێتـەوە. چـونکە ئەمـە مەتـەڵی کۆمەڵگایەکـە کـە لەسـەدەی هەژدەهەمـەوە تـا هەنوکـە تەکنەلۆژیاگـەلێکی دەسـەڵاتی زۆری دروسـتکردووە کـە سـەبارەت بـە یاسـا نامۆن. (ئەم کۆمەڵگایە) لەدەرئەنجام و بڵاوبوونەوەی ئەو تەکنەلۆژیانـە دەترسێت و هەوڵـدەدات تـا ئـەم تەکنەلۆژیانـە لەشـکڵێکی یاسـاییدا دابرێـژی" (مێـژووی سێکسوالیتە.لا ١٠٩)

بەلگاندنەکانی فۆکۆ گەڕاوتەوە بـۆ خـاڵی دەسـت پێکردنـی. دەسـەڵاتی باڵادەست بەسەر ژیاندا، گریمانـەی سـەرکوتکردنی لەناوخۆیـدا جێکردۆتـەوە. هەلومەرجـەکانی پەیدابوونی گریمانەی سـەرکوتکردن، واتـە ئـەو کۆمەڵـە کـرداره کلتوریانـەی کـە ئـەم تیورەیـەیان لـەبارەی سێکـسوالیتەوە دروسـتکرد، هەنوکـە لەگـەڵ مەرجـەکانی قبـوڵکردنی ئـەو گریمانەیـەدا یـەکیگرتووە. بـەپێی رێـسا تەفـسیریە زۆر کۆنـەکان، هـەردوکیان کاتێـك شـیاوی تێگەیـشتنن کـە لـەناو« تـۆڕێکی مێـژووی فـراوانتردا بـۆ دۆزینەوەی رەمزەکان» دابنرێن. لەبەرئەوەش کە ئێمە هەنوکە ئەم تۆرەمـان هەیـە، هەنوکە دەتوانین بگەڕێینە دواوە بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی دورودرێـژتر تـاوتوێی ئـەو تەکنەلۆژیانەی دەسەڵات و ئەو عەقڵانیەتە بکەین کە پێوەی گرێدراوە.

سەرچاوە:

ئەم وتارە وەرگێرانی فەسڵی شەشەمی کتێبی

(هیوبر دریفۆس .پۆل رابینۆ :میشل فۆكۆ :فراسوی ساختگرایی و هێرمۆنیك .ت :حسین بشیریە . نشر نی .چاپ اول . تهران ١٣٧٦).

هەروەها سودیكی زۆرم لەوەرگیرانی عەرەبی ئەم وتارە وەرگرتووە:

میشيل فوكو مسيرة فلسفية، مركز الانهاء القومي، ص١١٦.

## میراتی نیتچە

## كیت ئانسل پیرسۆن

"گومانی تیا نیە ئێمە هێشتا گوێگری یەك "تۆدەبێ"یین، ئێمە هێشتا پەیرەوی كۆمەڵێ یاسای زبرو رەق دەكەین —ئەمەش دوا یاسایی ئەخلاقیە كە دەتوانێ خۆی بەگوێمان بگەیەنێت.. ئێمە پیاوانی ویژدان كە نامانەوێت بگەڕێینەوە بۆ ئەو شتەی تەمەنی بەسەرچووەو بۆگەنی كردووە [ئێمە كە نامانەوێت بگەڕێینەوە] بۆ شتێك كە "نرخی باوەڕپێكردنی" نیە، جا ئیدی ناوی هەرچیەك بێت: خودا، چاكە، هەقیقەت، دادپەروەری، رەگەزدۆستی، ئێمە كە ڕێگە نادەین پردێك لەدرۆ بەدروشمە كلاسیكیەكانەوە بمانبەستێتەوە، ئێمە كە دوژمنی هەموو جۆرە باوەڕ [ئیمان]، مەسیحیەتی ئەمرۆ و دوژمنی هەموو جۆرە رۆمانسیەتێك و وڵات پەرستیەكین"

نیتچە، بەرەبەیان، پێشەكی ١٨٨٦





## نیتچەو چارەنوسی سیاسەتی ئەڵمانیا

وەك "گۆلۆمانی" مێژوناسی ئەڵمانی گوتوێتی، ئەڵمانیای بیسمارك نەك لەسەر بناغەی ڕێسا بەرزەفڕەكانی فەلسەفەی سیاسی كە یەكێتی ئەمەریكای لەسەر دامەزرابوو، بەڵكو لەسەر بناغەی پراگماتیزمێكی شێرانە بنیاد نرا"[١] بنیادنانی رایشی ئەڵمانیا نەك لەسەر بناغەی تێڕوانینە فەلسەفیە قوڵەكان لەبارەی خەسڵەتی مرۆڤ و كۆمەڵگاوە، بەڵكو لەسەر بناغەی جەنگ و داگیركردن و هاوپەیمانی و پەرلەمانی گومرگی كە لەسەر بناغەی باجوەرگرتن بوو، دامەزرابوو. بسمارك بەراگەیاندنی ئەو خاڵە دەسەڵاتی گرتە دەست كە حكومەتی "ئاگرو ئاسن" دەكاتە جێگری سیاسەتی "گوتاربێژیو بەیاننامە".

نیتچە لەسەردەمی حكومەتی بیسماركدا كتێبەكانی خۆی نوسی و بەرگری لەفەلسەفە دیونیوسیسەكەی خۆیكرد. كاتێك بیسمارك دەسەڵاتی گرتەدەست، نیتچە تەمەنی ١٧ ساڵ بوو ٢ ساڵێكیش بەر لەلابردنی "سەرەك وەزیری ئاسنین" لەدەسەڵات، لەشێتیدا غەرقبوو. پەروەردەكردنی لەقوتابخانەی "پفورتا" پەروەردەكردنێكی لیبرالیزمی كلاسیكی بوو. بەڕێوەبەری قوتابخانەكە لایەنگری سەرسەختی ژیانەوەی لیبرالیزم بوو كە بەبڕوای ئەو بەهۆی ئاوێتەكردنی دروشمی كلتور [Bildung] (بەمانای هەوڵدانی تایبەتیكراو بۆ پەرەسەندنی دەرونی) لەگەڵ ئەو ناسیونالیزمە كلتوریەی لەلایەن یوهان گوتفرید هیردەرەوە (١٨٠٣-١٧٤٤) پێشكەشدەكرا، بەئەنجامدەگەیشت[٢]. فێركارانی نیتچە لەلیبراڵە كلاسیكیەكان بوون بەو مانایەی بەنەریتەكانی كلاسیزمی ڤایمارو ناسیونالیزمی پرۆسی ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەدا، دەناسرانەوە. هەروەها بیروباوەڕەكانی نیتچە بەیاخیبوون لەپەروەردە دینیەكەی فۆرمەلە دەبوو. نەوەی پێش خۆی دەیتوانی دابڕانی خۆی لەپاكژخوازی Pitism بەخەباتێكی دەرونی دلێرانە پێناسەبكات. بەڵام بەهۆی پاشەكشێی جیهانی پاكژخوازیەوە لەدیەكانی ١٨٥٠ و ١٨٦٠دا ئیدی ئەم پێناسەیە مومكین نەبوو. نیتچەش وەك یاخیبوانی ناوەڕاستی سەدەی نۆزدە كە لەناو نەریتی پاكژخوازیدا لەدایكبوو بوون، وەك ستریندبێرگ و ڤان كوخ، بەگران جێگەی خۆی لەخەبات دژی دیندا دۆزیەوە، ئەوانەی لە١٨٤٨دا شایەتی نەمانی دەسەڵاتی روحانیەت





بوون، لەسەردەمێکدا گەیشتنە تەمەنی کامڵی کە مەسیحیەت دامالْین لەنێوان پرۆتستانتەکاندا خێرا بووبوو. شکستی سیاسەتی دینی دەریخست، کێشەی چارەنوسسازی روبەڕوبوونەوەی نیتچەو هاوچەرخانی، نادینی بوونی هەلومەرجەکانە. یەکێك لەژیاننامەنوسانی نیتچە پاش تاوتوێکردنی نیگەرانی رۆحی نەوەی نیتچە، دەنوسێت: "نادینی بوونی هەلومەرج هەڕەشەی سەرگەردانی و نارەسەنی لێدەکردن، بەڵام لەهەمانکاتدا ئەوانی بەرەو ئەڵتەرناتیڤی شوناسێکی پاش دینی لەیەکەم "مرۆڤە تازەکان" دەبردە پێشێ"[٣]. لایەنی دیاری گۆڕانی فکری سەرەتایی نیتچە، گۆڕانی هەڵوێست وەرگرتنی بوو لەبەرە سیاسی و دینیەکان.

نیتچە لەناو رودانی دەسەڵاتگرتنی بیسمارك و رووداوە سەیرەکانی دەیەی ١٨٦٠دا بوو کە گەیشتە کامڵی سیاسی. هاوچەرخانی نیتچە خۆیان بەپێشڕەوانی بێقەیدوشەرتی سەردەمی سیاسی و کلتوریی تازە دەزانی. نیتچە لەسەرەتاکانی دەیەی ١٨٦٠دا لەرووی سیاسیەوە لایەنگری رەهای پاشایەتی بوو، پاشایەتیخوازی نیتچە کە ئاوێتەی پێشینەی لیبرالیزمی کلاسیکەکەی بوو بوو، رێزلێنان لەقارەمانانی مێژو، نەتەوە، رابەرانی مەزن و بیریارانی کلاسیکی بلاودەکردەوە. جەنگی پرۆس لەگەڵ نەمسا لەساڵی ١٨٦٦دا، دیدی سیاسی نیتچەی لەمەحەکدا. چەند هاوڕێیەکی بەشداریان لەخۆپیشاندان دژی جەنگ و دژی پرۆسدا کرد و یەکەم کاردانەوەی ئەویش لەبەرامبەر ئەم قەیرانەدا، پشتگیریکردنی بانگەشەی لیبرالانەی کرانەوەی پەرلەمانی ئەڵمانیا بوو بۆ رێگەگرتن لەمەترسی جەنگ. نیتچە ئەمکارەی بەنیشانەی "سەرەڕۆی بسمارك بۆ دروستکردنی ئەڵمانیایەکی یەکگرتوو بەو شێوەیە"[٤] دەزانی. بەڵام کاتێك جەنگ دەستی پێکرد نیتچە بەرگری لەماشێنی سەربازی پرۆس کرد. لەم سەردەمەدا نیتچە بەهۆی فەلسەفەی بەدبینانەی "شوپنهاوەر"وە تەفسیری ئەو پەشێویە گەورانەی دەکرد، کە بەچاوی خۆی دەیبینی. نیتچە لەگەڵ سەرکەوتنە یەك لەدوای یەکەکانی "پرۆس"دا بیریدەکردەوە "کە دەکرێ لەم کاتانەدا شتگەلێکی زۆر فێربین. زەوی کە ئەوەندە ئارام و سەقامگیر دەردەکەوت، دەلەرزێ. دەمامکەکان دەکەون، خۆپەرستی ئاشکرا دەبێت و لەهەمووی ئەمانەش گرنگتر بۆمان دەردەکەوێت کە هێزی بیرکردنەوە چەند لاوازە"[٥].

نیتچە ئارەزوی دەکرد لەریزی براوەکاندابێت. وەك پرۆسیەك لە"لایپزیگ"ی







داگیرکراو، چووە ناو گروپێکی بچوکی لیبرالیە بیسمارکیەکانەوە کە خوازیاری دەست بەسەراگرتنی "زاکسن" لەلایەن پرۆسەوەبوون. رابەری بزوتنەوەی لایەنگری دەست بەسەراگراتن هاینریش خون ترایچکە بوو کە ئافەرینی شۆڕشی بسمارکی کردبوو وەك "شۆڕشێك لەسەرەوە" کە دواجار بەدروستکردنی ئەڵمانیایەکی مەرکەزی تازە، دووپارچەیی پرۆس و نەمسای لەناوبردبوو. نیتچە لەدوایدا بەتوندی رەخنەی ترایچکەی کرد کە چارەنوسی وابوو، ببێ بەمێژوناسی ناسیونالیستی بەناوبانگی رایشی نوێ، بەڵام لەم وێستگەیەی ژیانیدا هەمان دیدی ترایچکەی بۆ دەوری پرۆس لەئەڵمانیادا هەبوو. نیتچە لەهاوینی ١٨٦٨دا راستەوخۆ لەگەڵ یەکەمین و دواهەمین خەباتی سیاسیدا دەستەویەخە بوو. نیتچە بۆ یارمەتیدانی دروشمی پرۆس بووە پشتگیریکەری پڕ حەماسەتی "ناسیونال- لیبرالەکانی زاکسن" و لایەنگری گەرم و گوڕی نوێنەرەکەیان، واتە شتیڤانی لەهەڵبژاردنی ناوچەیی "رایشتاگ" دامەزرێنەرانی کونفدراسیۆنی باکوری ئەڵمانیا.. هەڵبژاردنێك کە گۆڕا بۆ هەمەپرسیەك لەبارەی دەوڵەتی نوێی بیسمارکەوە. "حیزبی ناسیونال- لیبرال" بەو مانایە ناسیونال بوو کەبەرگری لەئیمپراتۆری ئەڵمانیا دەکردو بەو مانایەش "لیبرال" بوو کە بەرنامەکەی هەڵگری خواستە کلاسیکیەکانی لیبرالیزم بوو، وەك ئابوری ئازاد، بازرگانی ئازاد، دەوڵەتی مەشروتە. خەسڵەتی دیاری ئەم خەباتە تاوانبار کردنی دولایەنە بوو لەلایەن هەموو حیزبەکانەوە، چونکە وڵاتپەرستانی ناوچەیی چەپڕەو و راستڕەو دژی "خائینان"ی لایەنگری پرۆسی یەکگرتوو، یەکیان گرتبوو. ئەم هەڵبژاردنە کارەساتێك بوو بۆ دروشمەکانی لیبرالیزم، بەشێوەیەك ترایچکە رایگەیاند لەگەڵ ئەوەشدا کە لەئایندە نائومێد نیە، بەڵام هێشتا کاتی فەرمانڕەوای لیبرالیزم نەهاتووە. لەچەند ساڵی دواییدا بسمارکگەری نیتچە وەك دڵساردی و بێزاری لەسیاسەتی حیزبی خۆی پیشاندا. سەرقاڵی سەرەکی نیتچە لەدەیەی ١٨٧٠دا بریتیبوو لەسود وەرگرتن لەفەزای سیاسی تازە بۆ ژیانەوەی کلتوری تراژیدیاو بەدبینی کە لەفەلسەفەی شوپنهاوەرو موسیقای ڤاگنەرەوە وەری گرتبوو.. فەلسەفەو موسیقایەك کە بەبڕوای نیتچە قوڵاییەکی تازەیان بەئامانجە کلاسیکیەکانی پەروەردەو کلتوری ئەڵمانی دەبەخشی.

نیتچەی دەیەی ١٨٨٠ لەگەڵ نیتچەی لاوی ١٨٦٠ و ١٨٧٠ دا زۆر جیاوازە. لەم

قۆناغەدا نیتچە دەبێ بەرەخنەگرێکی توندی سیاسەتی مۆدێرنی ئەڵمانیا، بەوتەی یەکێك لەمێژونوسانی ئەڵمانیا، رەخنەگری وا وردبین لەهیچ جێگەو هیچ زەمەنێکدا هەرگیز بونی نەبووە"[٦]. هەنوکە نیتچە رایشی ئەڵمانیی بیسمارك وەك دەوڵەتێك دەبینێ کە شانازی بەبێکلتوری خۆیەوە دەکات و سیاسەتی دەسەڵاتی خۆی بەرەوتگەلێکی نەژادپەرستانە، دەوڵەتخوازیانەو ناسیونالیستانە دەباتە پێشێ. بەبڕوای نیتچە دروشمەکانی ناسیونالیزم بەها کلاسیکیەکانی لیبرالیزمی خراپکردووەو کلتوور چۆتە ژێر دەستی بێ کلتوریەکی ترسناکەوە.

هۆیەکانی گۆڕانی قوڵی هەڵوێستی نیتچە سەبارەت بەرایشی تازەی ئەڵمانیا بەئەندازەیەکی زۆر دەگەڕێتەوە بۆ پێگەیشتنی فکری و تێگەیشتن لەو خاڵەی کە هیواکانی سەرەتای بەتازەکردنەوەی ژیانی کلتوریی ئەڵمانیا، دروشمئامێز بون. ناڕازی بونی رووو لەزیادی نیتچە لەرایشی ئەڵمانیا، پەیوەندیشی بەپچڕانی پەیوەندی لەگەڵ ریچارد ڤاگنەردا هەیە. ڤاگنەر خۆی سیمایەکی زۆر ئاڵۆز بوو کە لاوێتی خۆی بە بەرگریکردنی شۆڕشگێڕانە لەمافی مرۆڤەکان بۆ ژیان بەپێی رێساکانی خۆیان دەستپێکرد. نیتچە لەساڵی ١٨٦٠ دا بووە دەست پەروەردەو نوری چاوی باڤاریا کە ڤاگنەر ئامۆژگاری دەکردو وتاری لەبارەی سیاسەتی ئەڵمانیاو مانای ئەڵمانی بۆ دەنوسی. ڤاگنەر دواجار لەگەڵ رایشی بیسماركدا ئاشتبۆوەو لەساڵی ١٨٧٢دا دەستیکرد بەدروستکردنی کۆشکی موسیقای خۆی لەبایرۆت. بڕیاربوو ئەم کۆشکە ببێ بەپەرەستگای هونەری ئەڵمانیاو ناوەندی یەکێتی نەتەوەیی. نیتچە لەسەرەتا تا ناوەڕاستی دەیەی ١٨٧٠ بەردەوام هاودەمی مامۆستاو ستایشکەری بوو، توانا فکریەکانی خۆشی بۆ پشتگیرکردن لەدروشمی ڤاگنەر بەکارهێنا. نیتچە ئومێدە سەرەتاییەکانی خۆی بۆ ژیانەوەی کلتوری تراژیدیا، بەکۆشکەکەی ڤاگنەرەوە بەستەوە. ئەم کۆشکە باڵکۆنێکی نەبوو کە نوێنەرایەتی جیاوازیە کۆمەڵایەتیەکان بکات، ئامانجیشی تەنها پێشکەشکردنی نمایشە بازرگانیە پەتیەکان نەبوو، بەڵکو هونەرەکانی بەشێوەی یەکێتیەکی نوێ کە شیعرو فەلسەفە، موسیقاو وێنەکێشان و پەرەستنی دینی دەگرتەوە، ئاوێتە دەکرد. هەر لەبەرئەمەش بوو نیتچە لەسەرەتادا بڕوایوابوو هونەری ڤاگنەرو ئەزمونی دیونیوسیس یەکپارچەیی و هاوئاهەنگی جیهان بۆ مرۆڤی مۆدێرن مومکیندەکات. بەڵام نیتچە هێواش هێواش لەو شتەی کە





بەبڕوای خۆی رۆمانسیەت وشێتیی خۆپەرستی ڤاگنەرە، رەنجاو لەدژ بەیەهودیبوونی ڤاگنەریش نیگەرانبوو. جیابونەوەی نیتچە لەڤاگنەر، لەهەمانکاتدا جیابونەوە بوو لەدروشمخوازی سیاسی و رۆمانسیانەی سەردەمی لاوی.

لەگەڵ ئەوەشدا کە نیتچە لەدەیەکانی ١٨٨٠دا گۆڕا بەرەخنەگری بێپەردەی رایشی بیسمارك، بەڵام هەر لەهەمان سەرەتاکانی دەیەکانی ١٨٧٠دا بێمتمانەیی خۆی سەبارەت بەحەساسیەتی ئەڵمانی ئاشکراکردبوو. نیتچە لێرە بەدواوە لایەنی دیاری ئەم حەساسیەتەی بەرەقی، بێگیانی و حەماقەت زانی. نیتچە لەنوسینە سەرەتاییەکانی خۆیدا بەوردی ئەو خاڵە دەڵێت کە مەسەلەی بنەڕەتی ئەو یەکپارچەیی بەمانای سنوردراوی سیاسی نیە، بەڵکو یەکێتی رۆح و ژیانی ئەڵمانیە بەمانای کلتوری. ئەو هەڵوێستی خۆی لەیەکەم لاپەڕەی یەکەم بیرکردنەوەی ناکاوی خۆیدا لەبارەی دێڤید شتراوسەوە بەرونی دەردەبڕێ، هەڵوێستێك کە تیایدا لەنێوان "رۆح" (Geist)ی ئەڵمانی و "رایشی" ئەڵمانیدا جیاوازی گەلێك هەیە کە دەبێتە هۆی روبەڕوبونەوەیان. نیتچە لەکاتێکدا تەنها چەند ساڵێك بەسەر جەنگی فەڕەنساو پرۆس و دامەزراندنی ئەڵمانیا وەك دەوڵەت و نەتەوەیەکی مۆدێرندا تێپەڕیوە، دەنوسێ رای گشتی ئەڵمانیا رێگە بەقوڵبونەوەی ورد لەبارەی مانای سەرکەوتن بۆ خەڵکی ئەڵمانیا نادات. بەبڕوای ئەو یەکێك لە"دەرئەنجامە خراپەکانی" جەنگ، ئەو هەڵە بەربڵاوەی رای گشتی ئەڵمانیایە کە پێیوایە گوایە لەجەنگی فەرەنسادا کلتور (Kultur)ی ئەڵمانی سەرکەوتوە. نیتچە دەنوسێ "ئەم خەیاڵە[توهم] لەهەمووشتێ وێرانکەرترە" نەك لەو روەوەی کە خەیاڵە-چونکە بەبڕوای نیتچە خەیاڵ و هەڵە دەتوانن بەرهەمهێنبن- بەڵکو لەبەرئەوەی سەرکەوتن دەکات بەشکست و "لەناوچونی رۆحی ئەڵمانی بەسودی رایشی ئەڵمانیا" دەگۆڕێت. (دێیڤید، ١، ص٣). لەئەڵمانیادا "چیدی هیچ تێڕوانینێکی رون بۆ ئەوەی کلتور چیە، بونی نیە" (ه.س پ. ص٥). نابێ ئەو شتانەی بوونە هۆی سەرکەوتنی ئەڵمانیا بەسەر فەرەنسادا وەك: لێهاتوی سەربازیانەی فەرمانده جەنگیەکان، دیسپلینی توندو یەکێتی و گوێڕایەڵی ریزەکانی سەربازان، لەگەڵ کلتوردا تێکەڵبکەین.

نیتچە لەبەرهەمەکانی سەردەمی پێگەیشتنی فکری خۆیدا خۆی بە"دوا ئەڵمانیەکی دژ بەسیاسەت" ناو دەهێنێت، بۆ ئەوەی خۆی نەك لەسیاسەت

بەشێوەیەکی گشتی، بەڵکو لەسیاسەتی دژێوی ناسیونالیزم و دەوڵەتخوازی کە بەبڕوای نیتچە بەسەر ئەڵمانیادا باڵادەستە، جیابکاتەوە. نیتچە لە"ئێوارەی بتەکان"دا لەوە دەترسێ کە هاواری "ئەڵمانیا، ئەڵمانیای بەرزتر لەهەموان "نیشانەی کۆتایی هاتنی بیرکردنەوەی جدی و کۆتایی هاتنی فەلسەفە لەئەڵمانیادا بێ. (ئێوارە، "ئەوەی ئەڵمانیەکان خاوەنی نین"). جگە لەمەش نیتچە لەژیاننامەی خۆنوسی خۆیدا [واتە] لە"هەنوکە مرۆڤ"دا کە لەساڵی ١٨٨٨ داو چەند مانگێك بەر لەکەوتنی نوسیوێتی و خوشکە دژ بەیەهودیەکەشی تا ١٩٠٨ شاردبۆیەوە، بەتوندی هێرشدەکاتە سەر ترایچکە. نیتچە دەنوسێ "ئەڵمانی" [بوون] بووە بەبەڵگەیەك و "ئەڵمانیا، ئەڵمانیای بەرزتر لەهەموان" بووە بەتێزێك و "توتن"*ەکان بون بەنوێنەری "سیستەمی جیهانی ئەخلاقی لەمێژودا.. ئێستا مێژونوسێك هەیە کە تایبەتی ئەڵمانیایە، تەنانەت بیردەکەمەوە مێژونوسێنێکی دژ بەیەهودیەتیش هەبێ، مێژونوسێنێکی دەربارەی هەیەو "ڤۆن ترایچکە"ش هیچ لێی تەریق نابێتەوە (هەنوکە "مەسەلەی ڤاگنەر"). بەبڕوای نتیچە "ناسیونالیزم" بەتەواوی مانا، دەربڕینی "نەخۆشیەکی دژ بەکلتور"ە.

نیتچە لە"لەسەرو چاك و خراپەوە" هەموان بۆ داڕشتنی "سیاسەتێکی مەزن" بانگهێشتدەکات کە تیایدا نوخبەیەکی فەیلەسوفی-یاسادانەر ئەوروپا، بۆ سەرو سیاسەتی دژێوی ناسیونالیزم رێنماییدەکەن و پەروەردەکردنی "ئەوروپاش باش" بڵاو دەکەنەوە. ئەم بەرهەمە سەرەڕای زیادەڕەویەکانی لەدەربڕینەدا، بەردەوام دژی سیاسەتێکە کە نەژادپەرستی هاندەدات و بەتایبەتی هێرشی توند دەکاتە سەر ئەو سیاسەتمەدارانەی ئەڵمانیا کە لەپێناوی بەرەوپێشخستنی سیاسەتی ناسیونالیزمدا، سود لەدژایەتی یەهودیەکان دەگرن (لەسەرو، ٥٢، ١٩٥، ٢٤٨، ٢٥٠، ٢٥). ئەم کتێبە لەکاتی بڵاوبونەوەیدا بەکتێبێك ناسرا کە سوکایەتی بەئەڵمانیەکان دەکات، چونکە لەسەر بناغەی "رێزلێینان لەیەهودیەکان" دامەزراوە[٧]. تەوەرەی سەرەکی بیرکردنەوەی نیتچە بریتیە لەپێداویستی "خۆباڵادەستی مرۆڤ" و لەگەڵ ئەوەشدا

* ناوی یەکێك لە تیرە دێرینەکانی نەژاد ژەرمەنە کە لە هەمان کاتدا بە هەموو ئەم نەژادەش دەوترێت. (و. ف).





کە رەنگە دژایەتی هیومانیزم لەلایەن نیتچەوە سوکایەتی پێکردن بێت بەحەساسیەتە ئەخلاقیەکانی لیبراڵەکان، سوشیالیزمەکان و مەسیحیە چاکەخوازەکان، بەڵام هەرگیز بەهۆی نەژادپەرستی یان ناسیونالیزمەوە خۆی ئاراستەناکات.

تێڕوانینی بەربڵاو بۆ نوسەرێك کە دروشمی ئەوروپا لەبەرامبەر دروشمی ئەڵمانیادا بەرز دەکاتەوەو هەموو شێوەکانی سیاسەتی نەژادپەرستی و بەتایبەتی دژایەتیکردنی یەهود رەخنەدەکات، وەك یەکێك لەبونیادنەرانی ئایدیۆلۆژیای نازیزم کەمتازۆر نەگونجاوە. سەرەڕای هەموو ئەو شتانەی لەپاش جەنگی جیهانی دوهەم بەدواوە لەبارەی نیتچەوە نوسراوە، بەردەوام بەرەو روی ئەو مەسەلەیە دەبینەوە کە هەر کەسێك بۆ یەکەمجار رودەکاتە بەرهەمەکانی بەتایبەتی لەبواری سیاسەتدا، هەر ئەم مانا شاراوانەی نازیستی لەنوسینەکانیەوە بەردەهێنێت. ئەم پێکەوەگرێدانە چارەنوسسازەی نیتچە لەگەڵ نازیزمدا چۆن دروستبووە؟

بڵاوبونەوەو وەرگرتنی فەلسەفەی نیتچە لەپاش تێکشانی دەرونیەوە لەساڵی ١٨٨٩دا زۆر جۆراوجۆر بوو. بەرهەمەکانی یەکسەر لەلایەن راستڕەوەکانەوە پێشوازی لێدەکرا، لەگەڵ ئەوەشدا کە بانگەشە ئەرستۆکراتیەکانی و بێزاری لەسوسیالیزم زەمینەیەکی یارمەتیدەر بوو بۆ ئەم پێشوازیە، بەپێچەوانەوە بەرهەمەکانی نیتچە تا دوو دەیەی پاش تێکشکانی دەرونی، جێی بایەخ و سەرنجی سوسیالیزمەکان، ئانارشیزمەکان و فەمەنیستەکان بوو کە هەموویان سەرڤاڵی سەرەکی نیتچەیان بەخواستی خۆدروستکردنی فەردی دەزانی. بەبڕوای سوسیالیزمەکان بیروباوەڕەکانی نیتچە لەبارەی کەسایەتی خولقێنەرەوە (Personlihkeit) دەیتوانی چەمکی زۆر پێویستی تاکەکەسی رەسەن بۆ تێزی سوسیالیزم زیادبکات[٨]. هەندێك لەهاوچەرخانی نیتچە ئەویان بەسیمایەکی چەند رەهەندی دادەنا کە بەینی لەگەڵ هەڵوێستەکانی لایەنگری ناسیونالیزم و دەوڵەتخوازی ئەڵمانیاش نیە. باوەڕ نەبونیشی بەخوا، لەپارێزگارانی ئەڵمانی نامۆ دەکرد. لێرەوە هەڵوێستی نیتچە ئاڵۆز بوو، هەر ئەم ئاڵۆزیەش دەریدەخات کە بۆچی نوسینەکانی دەیتوانی جێی سەرنج و بایەخی ژمارەیەکی زۆری خەڵك بێت. وەك ئەرنست نولتەی مێژوزانی ئەڵمانی دەڵێ، ناوی نیتچە لەم سەردەمەدا ئاشکراکەری "مەیدانی خەبات" (Schlachtfeld)





بوو. خوێندنەوەی بەرهەمەکانی بۆ هەموو خوێندکارێکی ئەوروپی پێویست بوو، زۆرێکیش لەگرنگترین پیاوانی ئەم قۆناغە (لەوانە گۆستاف لاندوێر، بنیتۆمۆسولونی، کلاگیز، تۆماس مان، شتیڤان، گتورگەو گابریل دانوتسیو) ئەو بەرهەمانەیان دەخوێندەوە[٩].

ناوبانگی نوسینەکانی نیتچە لەئەڵمانیای سەردەمی جەنگی جیهانی یەکەمدا بوو کە سودوەرگرتنی نازیەکان لەنیتچە ئەوی وەك لایەنگری ئایدیۆلۆژی نازیزم لەسەردەمی جەنگدا مومکینکرد (لەراپۆرتەکاندا هاتووە سەربازە ئەڵمانیەکان لەکاتێکدا بۆ بەرەکانی جەنگ دەچون لەگیرفانێکی پاڵتۆکانیاندا کتێبی پیرۆزو لەوی دیاندا "زەردەشت وای گوت" یان پێبوو). نیتچە بوو بە ئامانجی دروشمی نازیزم، بۆ ئەوەی رەوایەتی فەلسەفی بەم بزوتنەوەیە بدات. نیتچە هەنوکە لەئاستی جیهانیدا بوو بوو بەفەیلەسوفێکی بەناوبانگو وتوێژ وروژێنەر کە بیروباوەڕەکانی بایەخ و هێزی فکری بەبیروڕای نازیەکانی دەبەخشێ. ئەلیزابێتی خوشکی نیتچە رۆڵێکی چارەنوسسازی بینی لەسەرانەوەی بیروباوەڕی نیتچەو گۆڕینی بۆ فەیلەسوفی میلیتاریزم و ئیمپریالیزمی ئەڵمانی. ئەو کۆنترۆڵێکی تەواوی پاشماوەی بەرهەمەکانی براکەی کردبوو، هەنوکەش بەشێوەیەکی بڕاوە ئاشکرابووە کە ئەو نەك هەر رێگەی لەبڵاوبونەوەی دەستنوسە تایبەتیەکانی وەك "هەنوکە مرۆڤ" گرتووە، بەڵکو دەستی بۆ بابەتەکانی نیتچەش بردووەو نامەی بەناوی ئەوەوە نوسیوە[١٠]. ئەلیزابێت چەند جار هیتلەری بۆ ئەرشیفەکەی نیتچە بانگهێشتکردو لەجارێکدا گۆچانەکەی نیتچەی بەدیاری پێشکەشکرد (بەچ مەبەستێك؟ ئاشکرا نیە). پێدەچێ ویستبێتی بەپێشکەشکردنی نیتچە بەوشێوەیە، گرنگی و ناوداری خۆی زیادبکات.

نازیەکان بەهاوکاری ئیلیزابێت نیتچەیان کرد بەناودارترین و پڕخوێنەرترین فەیلەسوفانی ئەڵمانیاو جیهان. ئەوان نوسینەکانی نیتچەیان لەبەرنامەی پەروەردەی خۆیاندا گونجان و تەفسیرو کەشکۆڵ و گوڵبژێری هەرزانیان لەبەرهەمەکانی بڵاوکردەوە. ژمارەیەك فەیلەسوفی زانکۆیی و پسپۆڕی ئەڵمانی وەك ئالفرێد بویملەر و ئالفرێد رۆزنبێرگ کران بەلێپرسراوی پڕوپاگەندەکردن بۆ ئەندێشەکانی نیتچە، و ئامادەکردنی تەفسیرێکی نازیانەی دروست بۆ بەرهەمەکانی. بۆ نمونە بویملەر





یەکێك لەیەکەمین بەرهەمەکانی لەبارەی سیاسەتی نیتچەوە نوسی کە لەساڵی ١٩٣١دا بەناوی نیتچەی فەیلەسوف و سیاسەتمدار بڵاوبوەوە. ئامانجی ئەم کتێبە تەفسیرکردنی نیتچە بوو وەك فەیلەسوفی نەژادی نۆرد*. ئەمکارە بەهۆی کۆمەڵێ سادەکاری و شێوانی بیروباوەڕەکانی نیتچەوە ئەنجامدرا. هێرشی نیتچە بۆ سەر خەڵکی ئەڵمانیا کە لەسەرتاسەری نوسینەکانیدا بەرچاو دەکەوێت، وەك هێرشی بۆ سەر رەگەزی مەسیحی و نائەڵمانی خەسڵەتی ئەڵمانیا رونکرایەوە و هێرشی سەرزەنشت ئامێزی نیتچە بۆ سەر هونەرمەندی مەزنی ئەڵمانیا واتە ڤاگنەر، بەدەرئەنجامی حەسودی زانرا. فەیلەسوفانی دی تەفسیری ناشیانەتریان کردو یەکێکیان بەناوی "هایدنیش هێرتلە"وە کتێبێکی رێنمایکەری بەناوی "نیتچەو ناسیونال سوسیالیزم"ەوە نوسی کە تیایدا ستایشی بیروباوەڕەکانی نیتچە، وەك بناغەی فەلسەفەی نازی کرابوو.

نازیەکان بۆ سەرکەوتن لەبەنازیکردنی نیتچەدا، سودیان لەئامێری گومانلێکراو، بەڵام زۆر کاریگەر وەرگرت، کاریگەرترین فێڵیان چاپی کۆمەڵێك گوڵچنی بچوك بوو لە"وتە نازیەکانی نیتچە"[١١]. ئەمانە بەناوی نیتچەوە، بەڵام بێ ئاماژەکردن بەوەی رێکخراون، بڵاودەکرانەوە. لەئەنجامدا خەڵك وایاندەزانی بەراستی وتەکانی نیتچە دەخوێننەوە، نەك هەڵبژێراوو تەفسیری رێکخەر. بۆ نمونە یەکێك لەم گوڵبژێرانە بەناوی "یەهودیەت، مەسیحیەت، ئەڵمانیەت"ەوە چەند پارچەیەك لەیاداشتە بڵاوکراو و بڵاونەکراوەکانی نیتچە کە لەسەر بناغەی ناوەرۆك پۆلێنکراون، پێشکەشدەکات. ئەو پارچە دەقانەی پەیوەندی بەیەهودیەکانەوە هەیەو پارچە دەقی بەناوبانگی "ئاژەڵی موبور" لە"جینالۆجیای ئەخلاق"دا لەدەق هێنراونەتە دەرێ، بەشێوەیەك کە رێگە بۆ تەفسیری هەڵەی بەلگاندنەکانی نیتچە دەکاتەوە. نازیەکان ناچاربوون بۆ پیشاندانی نیتچە وەك فەیلەسوفی ئەڵمانیا، ژمارەیەکی زۆر لەنوسینەکانی وەك ستایشکردنی کلتوری لاتین و هێرشەکانی بۆ سەر ناسیونالیزمی ئەڵمانی سانسۆربکەن. بۆ نمونە چەمکی "ئاژەڵی موبور" چەمکێکی نازیانە نیە،

* نۆرد: نەژادی بڵند بالا و سپی پێست و چاوشینی باکوری ئەوروپاو ئەڵمانیا کە بە لقێکی نەژادی ئاریەکان دەژمێررێت (و. ف).





چونکە بەتایبەتی عەرەبەکان و ژاپۆنیەکانیش دەگرێتەوە. (جینالۆجیا، ١ و ٢). نیتچە هەرگیز بەهای تاکەکەس بەپێی بایەلۆژیا یان نەژاد پێناسەناکات، بەڵکو ئەو بەهایە هەمیشە لەگەڵ "کلتور"دا پێناسە دەکات.

نمونەیەك بۆ ئەوەی چۆن نازیەکان بیروباوەڕو تێڕوانینەکانی نیتچەیان بەنادروستی پیشاندەدا، لەلایەن "ژۆرژوباتای"ەوە کە بیریارو شاعیرێکی گەورەی فەڕەنسایە، ئاشکراکراوە. ئەو نمونەی ریچارد ئۆلیر دەهێنێتەوە کە کوڕی مام و هاوکاری خوشکە دژ بەیەهودەکەی نیتچە بوو لەئەرشیفدا. ئۆلیر لەکتێبەکەی خۆیدا بەناوی "نیتچەو ئایندەی ئەڵمانیا" هەوڵدەدات نزیکایەتی قوڵی تێزەکانی نیتچەو ئەو تێڕوانینانە پیشانبدات کە هیتلەر لە"خەباتی من"دا بەرگری لێدەکات.

باتای ئەم پەرەگرافە لەکتێبەکەی ئۆلیر دەهێنێتەوە:

"گرنگترین خاڵ بۆ ئێمە بریتیە لەم ئاگادارکردنەوەیەی خوارەوە "هیچ یەهودیەکی دی قبوڵمەکەن، بەتایبەتیش دەرگاکان لەسەر خۆرهەڵات دابخەن".. "ئەوەی لەئەڵمانیا بەئەندازەی خۆی یەهودی هەیەو ئەوەی کە تەنانەت گەدەی ئەڵمانی و خوێنی ئەڵمانی بۆ هەرسکردنی ئەم هێندە "یەهودی"ش کێشەی هەیە (تا ماوەیەکی زۆریش کێشەی دەبێت) ئەمە لەکاتێدا کە ئیتالی و فەرەنسی و ئینگلیزەکان کە دەزگایەکی هەرسکردنی بەهێزیتریان هەیە، توانیویانە ئەمکارە بکەن- هەر ئەم گەواه و زمانە رۆشنەی غەریزەی گشتیە کە دەبێ گوێی لێبگرین و بەپێی ئەویش کاربکەین"[١٢].

وەك باتای -کە بەناوبانگترین بەرگریکەرو تەفسیرکەری نیتچەی دژ بەفاشیستە- پیشانیدەدا، ئەوەی لێرەدا بەرەو روی دەبینەوە نەك تەنها ساختەکاریەکی بێشەرمانەیە، بەڵکو "درۆیەکی ناشیانەو هوشیارانەی دروستکراوە". ئەم رستانە لەپارچە دەقی "٢٥١"ی "لەسەرو چاکەو خراپ"ەوە هێنراونەتە دەرێ. کاتێك بۆ ئەم پارچە دەقە دەگەڕێینەوەو بەدروستی دەیخوێنینەوە سەرنجدەدەین کە ئەو بڕوایانەی راگەیاندراون، تێڕوانینەکانی نیتچە نین، بەڵکو بیروباوەڕی دژ بەیەهودین کە نیتچە هەڵیبژاردون بۆ ئەوەی گاڵتەیان پێبکات:

هێشتا هیچ ئەڵمانیەکم نەبینیوە کە دڵخۆشیەکی لەیەهودیەکان هەبێت، هەرچەند هەموو ئەو کەسانەی کە زیهنێکی ئارام و سیاسیان هەیە، دژایەتیکردنی





یەهودیان Antisemiterei بێ چەندو چون رەد کردۆتەوە، ئەگەرچی ئەم سیاسەت و ئارامیە لەگەڵ بونیادی ئەم هەستەدا جەنگ ناکات، بەڵکو لەگەڵ زیادەڕەوی ترسناکی ئەم هەستەدا نیە، بەتایبەتی لەگەڵ ئەو شێوە شەرمئامێزو توندەدا کە ئەم هەستە توندڕەوە خۆی تیا دەردەخات- لەمبارەیەوە ماقی ئەوەمان نیە خۆمان هەڵخەڵەتێنین. ئەوە کە ئەڵمانیا.. هتد*

پاشان ئەو وتانە دێت کە "ئۆلیر" دەیگەڕێنێتەوە بۆ نیتچە. ئەوەی لەهێنانەوە پاش و پێشخراوەکەی "ئۆلیر"دا پەرێندراوە، ئەم پێشنیارەی نیتچەیە "دەرکردنی هاوارکەرانی دژ بەیەهود لەوڵات، رەنگە سودمەند و بەویژدانانە بێت". ئەوەی نیتچە بەڵگەی بۆ دەهێنێتەوە راکێشان [یان تواندنەوەی] یەهودیەکانە، نەك "لەناوبردن"یان.

هەر ئەم رونکردنەوە کورتە دەبێ پیشانیدابێت کە دەستکاریکردنی نازیانەی بیروباوەڕەکانی نیتچە، ناشیانەو بەتەواوی هەڵبژێراوانە [انتقائی] بووە. ئایا دەکرێت نیتچە لەدەست ئەم خراپ سودوەرگرتنە بەربڵاوە رزگار بکرێت؟ یەکێك لەتەفسیرکەران پەنجە دەخاتە سەر خاڵێك کە بەبڕوای من وەڵامێکی شیاوە بۆ ئەم پرسیارە:

"بێگومان بەرهەمەکانی نیتچە من نیگەراندەکات، بەڵام ئەم نیگەرانیە بەهۆی خراپ سودوەرگرتنی نازیەکان لەنیتچە نیە. بەبڕوای من لەزگەی باوی نیتچەی نازی تەنها لەو روەوە مومکین بووە، کە ئێمە ئەم لەزگەیەی وەك ئامێرێکی بەرگری، وەك ستراتیژێك، وەك دەستگرەیەك بۆ سەروکارنەکردن لەگەڵ نیتچەدا بەکاریدەهێنین.. ئێمە ئەڵبەتە لەزگەیەکی دیش بۆ رێگەگرتن لەروبەڕوبونەوەی بەرهەمەکانی نیتچە بەکاردەهێنین: نیتچەی شێت"[١٣].

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا زۆرێك لەنوسەرانی بەناوبانگ نیتچە بەبەرپرسیاری نازیزم و پریشکەکانی دەزانن. ج.پ. سترن گوتوێتی ئادولف هیتلەر لەهەموو کەسێکی

* ئەم پەرەگرافەم لە دەقی کتێبەکەوە وەرگێڕاوە کە لەلایەن "داریوش ئاشوری"ەوە کراوەتە فارسی.. واتە لەم کتێبەوە: نیچە: فراسوی نیك و بد ت: داریوش اشوری، انتشارات خوارزمی. تهران چاپ سوم: ١٣٧٥. ص ٢٣٦.





دی زیاتر لەتێڕوانینی نیتچەوە بۆ ڕەسەنایەتی تاکەکەسی کە بەمانای دروستکردنی بەهاکانی خۆتە، نزیکترە[١٤]. بەڵام ئەوەی لەم وێنەیەی هیتلەردا وەك کەسێکی خۆ دروستکەر فەرامۆشکراوە، ئەوەیە کە بەبڕوای نیتچە گۆڕان بۆ ئەوەی کە هەین (بۆ نمونە بۆ ئەوەی کەسایەتی خۆمان خاوەن شێواز بکەین (زانین، ٢٩٠)، بۆ ڕزگارکردنی خۆمانە لەو بێزارییەی کە تیایدا مرۆڤ تەنها بەنەفیکردنی ئەوانی دی و ڕاگەیاندنی "بڵندێتی" خۆی بەسەریاندا، دەتوانێ نرخ بۆ خودێتی خۆی دابنێت. بەبڕوای نیتچە ئەمجۆرە لەخۆدروستکردن نەك بەرجەستە بوونی ڕەسەنایەتی کەسایەتی، بەڵکو بەرجەستەبوونی ئەوجۆرە ئەخلاقەیە کە نیتچە ناوی "ئەخلاقی کۆیلەیەتی" لێدەنێت. ئەخلاقێك کە تیایدا کەسێك یان گروپێکی کۆمەڵایەتی ئەوانی دی بە"خراپ" دەزانێت و تەنهاش پاش ئەم نەفیکردنەیە، کە خۆی بە"باش" دەزانێت. بەدەربڕینێکی دی کەسایەتی بەخشینی ئەوان بەشوناسی خۆیان نەك لەسەر بناغەی دانپیانان بەخوددا، بەڵکو لەسەر بناغەی نەفیکردنی کەسانی دیە. هیتلەر کەسێك بوو کە سەرتاپای بوونی پڕ بوو لەهەستی بێزاری و هەستی تۆڵەسەندنەوەی ژەهراوییانە، [لێرەوە ] ئەستەمە بەنمونەی وێنەی نیتچەی بزانین بۆ کەسی شەریف.

تەفسیرکەرێکی دی گوتوویێتی ئەو دەرئەنجامەی کە بڕوایوایە لەنێوان دیدگای نیتچەو فاشیزمدا نزیکایەتی هەیە، دور نیە لەڕاستیەوە[١٥]. ڕەنگە هۆی نزیکی بیروڕاکانی نیتچە لەشێوازی فاشیەتی سیاسەتەوە، ئەو باوەڕەی نیتچە بێت کە سیاسەت خۆبەخۆ "مەکیاڤیلیانەیە"، لەبەرئەوەی کە هەرجۆرە ئەخلاقێك لەسەر بناغەی دژ بەئەخلاقی، دامەزراوەو هەموو جۆرە خەباتێك بۆ دادپەروەری، لەڕێگەی نادادپەروەرانەوە ئەنجامدەدرێت (خواستن ٣٠٤)[١٦]. دەگوترێت بەرگری نیتچە لەنوخبەگەری و بێرەحمی وەك هۆکارێك بۆ دەستگەیشتن بەئامانجە سیاسیەکان و هەروەها دابڕانی لەرابردوو، و هێرشکردنی بۆ سەر ڕوحیەتی بەزەیی و بەزەیی مەسیحیانە، ڕێگەی بۆ فاشیزم خۆشکرد. بەڵام زۆر شت لەنیتچەدا هەیە کە نەفرەت لەسیاسەتی فاشیستی دەکات: لەوانە نەیارێتی لەگەڵ ناسیونالیزم، یان ئەورپیزمی نیتچە، و پەیمانبەستنی لەگەڵ کلتور لەبەرامبەر سیاسەتدا و هێرشی بۆ سەر دەوڵەتی بیرۆکراتی مۆدێرن، لەبەر خنکاندنی خوڵقاندن و فەردیەت. وەك "باتای" بەوردبینیەوە گوتوێتی:







"مارکسیزم، نیتچەیزم و ناسیونال سوسیالیزم هەرسێکیان ئەخلاقی کلاسیکی ڕەد دەکەنەوە. تەنها تێزی سەرەکی بۆ ئەوان بەهایەکە کە ژیان بەناویەوە مافێکی بالاتر داوا دەکات. هەر ئەوەندە ئەم بنەمای داوەریە ئاشکرا بێت، دەبینین کە لەزەمینەی گشتیدا بەها نیتچەییەکان لەبەرامبەر بەها نەژاد پەرستیەکاندا، ڕادەوەستێت، بەبڕوای نیتچە هەموو شتێك پەیڕەوی کلتورە، لەکاتێکدا لەرایشی سێهەمدا ئامانجی کلتورێکی دزێو، تەنها هێزی سەربازیە"[١٧].

مەسەلەی واقعی سەبارەت بەلێدانی لەزگەی فاشیست یان خراپتر لەو لەزگەی نازیەت بەنیتچەوە ئەوەیە، لەزگەلێدەران ئەو ڕاستیە لەبەرچاو ناگرن کە نیتچە دەیەوێت بەئەرستۆکراتیخوازی خۆی تێگەیشتنێکی دێرین بۆ سیاسەت زیندوبکاتەوە. تێگەیشتنێك کە لەسەر کێشی یونانیدا دەیدۆزیەوە، وەك دواتریش دەیبینین لێکچونی بەرچاوی لەگەڵ فەلسەفەی کاری "هانا ئارنت" لەسەردەمی ئێمەدا هەیە. هەر ئەوەندەی لێکچونێکی وا بدۆزێتەوە، ئیدی پووچی "فاشیست" یان "نازی" ناونانی بیروڕا سیاسیەکانی نیتچە بەئاسانی ڕوندەبێتەوە.

بێگومان نیتچە خۆی دڵەراوکێی ئەوەی هەبوو ڕۆژێك ناوی بەشتی ترسناکەوە بەبیر بهێنرێتەوە..شتێك کە ئەو بەمشێوەیە دەری بڕی "قەیرانێکی بێوێنە نە بەسەر گۆی زەویدا، سەنگین ترین ڕێکەوتی ویژدان" (هەنوکە، "بۆچی من یەك چارەنوسەم، ١). هەروەها دەیزانی کە چارەنوسی وایە "پاش مەرگ لەدایك بێت". کەوابوو نیتچە بەرپرسیاری ئەو خراپیانە نیە کە بۆ نوسینەکانیان گەڕانۆتەوە. بەممانایە هەمووومان پاش مردن لەدایك دەبین، چونکە هەرچیەك بەدرێژایی ژیانمان دەیڵێین یان دەینوسین، ڕەنگە پاش مەرگ بەهەڵە، دەرك و تەفسیربکرێ. بەڵام هەقیقەت ئەوەیە نیتچە بەدرێژایی ژیانی جگە لەماوەیەکی کورت لە١٨٦٦دا نەبێت، بەرگری لەحیزبی سیاسی نەکردو جگە لەمەش تەنانەت بۆ یەکجاریش سودوەرگرتنی لەنوسین و بیروباوەڕەکانی لەخزمەتی ناسیونالیزم و نەژادپەرستی ئەڵمانیادا نەسەلماند..بەپێچەوانەوە ئەو هەرچیەکی توانی کردی، بۆ ئەوەی هاوڕۆژگارانی لەمەترسیەکانی ڕایشی ئەڵمانیا ئاگادار بکاتەوە.

## پەراوێزەكان

١- Gold Mann, The History of Germany Since 1789 (Middlesex: Penguin 1985), PP. 328- 9.

ڕونكردنەوەكانی من لەسەر بناغەی ئەو لێكۆڵینەوە فێركەرانەیە كە پیتر برگمان لەم سەرچاوەیەی خوارەوەدا كردونی:

Nietzsche. The 'Last Anti- Political German' (Bloomington: Indina University press, 1987), especially pp. 19-59.

ی. گز هیردەر لەكوینگی بزگ و لەژێر چاودێری كانتدا خوێندنی تەواو كرد، بەڵام ئەندێشەی ئەو چەند لەژێر كاریگەری كانت و بزوتنەوەی رۆشنگەری ئەڵمانیدا بوو، هێندەش لەژێر كاریگەری ی. گ. هامانی پاكژخوازو دژ بەعەقڵدا بوو. هیردەر پاش دو ساڵ سەفەر كە تیایدا چەندجارێك چاوی بەگۆتە كەوت، بوو بە







بەڕێوەبەری كەنیسەی لوتەری لەڤایماردا. بەبڕوای ئەو حەقیقەت نەك بەرهەمێكی عەقڵ، بەڵكو بەرهەمی سەرجەم هێزی داهێنەری تاكەكەسەو كە لەزمان، ئەفسانە، و شیعردا دەردەبڕێ، بۆ وردەكاری زیاتر بڕوانە:

H. Holborn, A History of Modern Germany 1648- 1840 (London 1965). Pp 325-8.

٢- P. Bergmann, Nietzsche, 'The Last Anti- Political German' p. 29.

٣- Quoted in ibid, p. 64.

٤- Ibid, p. 47.

٥- G. Mann, The History of Germary Since 1789, p 396.

٦- On this point see R. Hinton- Thomas, Nietzsche in German politics and Sociery 1890- 1918 (Manchester: Manchester Universty press, 1983) , p.122.

بۆ شیكردنەوەی پەندئامێزی كاریگەری نیتچە لەسەر بزوتنەوەی چەپ پاش تیكشانی دەرونی نیتچە تەماشای بەرهەمی ناوبراوی ر. هینتون -توماس (ژمارە٧) بكەن.

٧- See Ernst Nolte, Nietzsche und der Nietzscheanismus (Frankfurt: Propylaen, 1990). P. 268. See also his study. Der Faschismus in seiner Epoche (Munich: R. Piper Verlag. 1979, fifth edition), PP. 529- 35.

بۆ وردەكاری زیاتر لەبارەی بێباكی خوشكەكەی نیتچە بەرامبەر بەرهەمەكانی بڕوانە:

Walter Kaufmann, Nietzsche, Philosopher, Psychogist, and Antichrist (New Jersey: Princeton University Press, 1974, fourth edition), PP. 4-8, 15- 18, 442-5; H. F. Peters, Zarathustra's Sister, The Case of Elisabeth Forster-Nietzsche )New York 1977); and the recent study by Ben Mac Intyre, Forgotten Fatherland: The Search for Elisabeth Forster- Nietzche (London: Macmillan, 1992).

تەماشای بەڵگەكراوەكان لەم بەرهەمەی خوارەوەدا بكەن:

R. E. Kuenzli. 'The Nazi Appropriation of Nietzsche', Nietzche- Studien, 12 (1983), 428- 35.

٨- See 'Nietzsche and Fascists' in G. Bataille, Visions of Excess: Selected Writings 1927- 1939 (Manchester: Manchester University Press, 1989), PP. 183-4.

٩- Kuenzli, 'The Nazi Appropriation of Nietzsche', P. 435.

١٠- See. J. P. Stern, Nietzsche (Glasgow: Collins, 1978), P. 79.

١١- See Howard Williams, 'Nietzsche and Fascism', History of European ldeas, 11 (1989), 897-8. See also Margaret Canovan, 'On Being Economical with the Truth: Some Liberal Reflections', Political Studies, 38 (March 1990), 520.

لەدوا بەرهەمدا نوسەر ئەوەی کە نیتچە زنجیرە سروشتی لەیەکسانی سروشتی پێ باشتر بووە بە"باوکی ڕۆحانی فاشیزم" و "سەرچاوەی پێش نمونە فراوانەکانی ئەندێشەی فاشیستی" ئەو دەزانێ.

فەرهەنگی ئینگلیزی ئوکسفۆرد "مەکیاڤیلیەت" بەکارێکی هەڵخەڵەتێنەرانە، خائنانە و فێڵبازانە پێناسدەکات. لەمێژووی ئەندێشەی ڕۆژاوادا "مەکیاڤیلیگەری" بەمانای باوەڕهێنانە بەبنەمای سیاسەتی واقع بینانە (reulpolitik) واتە ئەوەی لەسیاسەتدا دەبێ بەرژەوەندی بخرێتە پێش ئەخلاقەوە. بەشێك لەمۆدێرنەی مەکیاڤیلی بریتیە لەجیاکردنەوەی سیاسەت لەئەخلاق و دین.. بۆ ئاگاداری زیاتر بڕوانە:

Perspective, Political Theory, 12 (Novermber 1984). PP. 491- 506. See also Bernard Crick's introduction to N. Machiavelli, Discourses trans, L. Walker (Middlesex: Penguin, 1970).

١٢- See Georges Bataille, On Nietzsche, trans. B. Boone (London: Athlone Press, 1992), Appendix I. 'Nietzsche and National Socialism', P. 171.







ئەمە بەشێکە لەفەسڵی دوهەمی ئەم کتێبەی خوارەوە
کیت اسنل -پیرسون: هیچ انگار تمام عیار. ت: محسن حکیمی. انتشارات خجسته- چاپ اول : ١٣٧٥

## نیتچەو فەمەنیزم

**ن: کیت ئانسل –پیرسون**

**"هەڵەی بنەڕەتی و بونیادی کوێربوونی زیهنی مرۆڤ ڕێگەگرتن لە قبوڵکردنی مەرگ نیە، بەڵکو ڕێگەگرتنە لە یادەوەری لەدایکبون و هاتنە ناو دنیاوە"**

**پیتر سلاتریج "تا ئۆگەری ئەوروپی" (١٩٨٨)**

### پێشەکی

ئەگەر نیتچە بە سەرچاوەیەکی دور دابنێین بۆ لیبرالیزمی رادیکال بوو، ئەوا دەبێ بوونی بەسەرچاوەیەك بۆ فەمەنیزمی رادیکال چەندانجار بە دورتر بزانین. بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا لەساڵانی دوایدا و لە هەندێك جێگەدا بەرهەمەکانیان بەم ئاڕاستەیە (واتە وەك سەرچاوەیەك بۆ فەمەنیزم) تەفسیرکردووە. من پیشانیدەدەم کە چۆن هەندێك نووسەری فەمەنیست دەستو پەنجەیان لەگەڵ بەرهەمەکانی نیتچەدا نەرمکردووەو ڕووبەڕووی پێچوپەناکانی بونەتەوە. پێدەچێ ئەوتەباییەی خەریکە بەدەستدێت ئەوەبێت کە سود بەخشترین لایەنی نوسینەکانی

نیتچە بۆ پەیکەری فەلسەفی فەمەنیستی، لەو هەڵوێستە راشکاوانەدا نیە کە لە بارەی ژنەوە درکاندویێتی، بەڵکو دەبێ لە "شێواز" (کانی) نیتچەدا، لە هەوڵیدا بۆ راگەیاندنی فەلسەفەیەك لەبارەی جەستەوە، لە دەمامك لادانیدا لەسەر خوازەی گوتاری فەلسەفی و لە شێوەی نمونەی نیتچەدا بۆ بونیادشکێنی پێشداوەری "نێر سەنتەریانەی" (Phullogocentric) ئەندێشە و عەقڵی رۆژئاوادا بدۆزرێتەوە.(١) رەنگە رێکەوت نەبێ سودوەرگرتنی نوسەرانی فەمەنیست لە نیتچە، وەك "جیل دۆلۆز"ی فەیلەسوفی جیاوازی(٢) دەڵێ لە کاتێکدا ئەنجامدەدرێ، کە تیورەسازانی سیاسی رادیکاڵ لەوانە فەمەنیستەکان، هەوڵدەدەن فەلسەفەیەکی لەبارەی ئەویدیبوون و جیاوازیەوە پێشکەشبکەن. ژمارەیەك لە فەمەنیستەکان گوتویانە دەبێ بنبەستی یەکسانی کە تیایدا ژنان تەنها بە یەکسانبوون لەگەڵ پیاواندا و لێرەوە سڕینەوەی جیاوازی جنسی (نێوانیان) بەیەکسانی دەگەن، بەجێبهێڵین. بەبڕوای ئەوان شێوەیەکی تازەی بیرکردنەوە پێویستە، شێوەیەك کە بتوانێ جیاوازی بسەلمێنێ و نرخ بۆ ئەوی دیبوون دابنێ، و بێ ئەوەی یان بەرگری لە سیاسەتێکی تۆتالیتارانە بکات کە لەسەر بناغەی گشتیبوونی درۆزنانە دامەزراوە، یان بەرگری لە سیاسەتی زنجیرە پلەییانە بکات کە تیایدا بەهای پیاوانە و ژنانە لەیەکدی جیادەکرێنەوە و یەکێکیان بەسەر ئەوی دیدا زاڵدەکرێت. هەر ئەم گەڕانە بەدوای ئەخلاق و سیاسەتێکی نوێی فەمەنیستیدایە کە تێگەیشتن لە بیروباوەڕەکانی نیتچە بەزەبر (بالقوە) سودبەخش و خەباتگێڕانە دەکات. لێرەشدا هێرشەکانی نیتچە بۆ سەر هیومانیزمی لیبراڵی بە هەڵگری سودێکی پۆزەتیڤی شێمانەی (احتمالی) بۆ لیبرالیزمی رادیکاڵ بوو، دەزانن. فەمەنیزمی رادیکاڵ -وەك چۆن لە بیروباوەڕەکانی فۆکۆدا دەیبینین- سوبژێکتی مرۆیی عاقڵ و نامێژوویی بیروباوەڕی سیاسی لیبرالیزم رەخنە دەکات. ئامانج نەك وازهێنانە لە دروشمە لیبرالیەکانی خودسالاری و فەردیەت، بەڵکو دوبارە بیرلێکردنەوەو ژیاندنەوەی بناغەکانیانە.

دەبێت لەبارەی ئەمجۆرە بەکارهێنانەی نیتچەوە، پرسیارێکی زۆر بهێنرێتە ئاراوە: بەسەرنجدان لە پەیمانبەستنی نیتچە لەگەڵ حکومەتی ئەرستۆکراتی و لایەنگرێتی بۆ پیاوەتی ناپلیۆن، تا چ ئەندازەیەك بیروباوەڕەکانی دەتوانن بۆ پێشکەشکردنی سیاسەتی فەمەنیستی جیاوازیخوازی، سودمەند بن؟ ئایا







سەروکارکردن لەگەڵ نیتچەدا تەنها لە روانگەی شێوازەوە بۆ فەمەنیزم و بە شێوەیەکی گشتیش بۆ بیرکردنەوەی سیاسی رادیکال بەسە؟ یان دەبێ قسە لە ناوەڕۆکی وتەکانیشی بکەین؟ ئامانجی من لەم فەسڵەدا ئەوەیە نەسیتیماتیکانە کاربکەمو نە گشگیرانە، بەڵکو دەمەوێ تێگەیشتنێك بۆ وتوێژە سەرەکیەکان و مەسەلە کلیلیەکان، بەدەستەوەبدەم.

## نیتچە و فەمەنیزمی ئەوروپی

دیدگاکانی نیتچە لە بارەی ژنەوە هەم جۆراوجۆرن و هەم ئالۆز. ناکرێ "فەلسەفەیەکی ژنی" رێکوپێکی لێبەربهێنرێت. ئەم دیدگایانە کۆمەڵێك ئاڕاستەوەرگرتن و پێشداوەری دژ بەیەك دەردەخەن، کە تیایدا نیتچە هەم رەگەزی ژنانە وەك شتێکی بەهێزو سەرەو ژێرکەر ستایشدەکات، هەم کاتێك لە ئەرکە کۆمەڵایەتیەکانی منالداریو دایکایەتی جیا دەبێتەوە لێی دەترسێت.

نیتچە فەمەنیزمی "لیبراڵی" ئەوروپی رەخنەدەکات و دەکەوێتە دژایەتی ئەو شتەی ناوی دەنێت خەسانی ژیانی کۆمەڵایەتی و پەیدابوونی سیاسەتی ئیحساساتی لەسەر بناغەی بەها رەگەز دۆستیەکان. ئەو هێرشدەکاتە سەر ئەو بیروباوەڕانەی دەڵێن ژنان هەر ئەوەندەی خاوەن مافی یەکسان بن، ئیدی رزگار دەبن. هەندێك پارچە دەقی بەرهەمەکانی بەڕاشکاوانە دەریدەخات کە نیتچە سەرجەم مەسەلەی رزگاری ژنانی بەشتێکی گومڕاکەرانە زانیووە. بەبڕوای نیتچە بیروباوەڕە مودێرنەکان لەبارەی کۆمەڵگاو سیاسەتەوە، بونەتە هۆی دابەزینی ئاستی بیرکردنەوەی ئێمە لەبارەی دەورو ئەرکی ژن و پیاوانەوە. ژنانی مۆدێرن بۆ خەباتکردن لە پێناوی "مافی یەکسان"دا هاندەدرێن، بەڵام ئەم خەباتە گەر سەربگرێت دەبێتە هۆی لە ناوچوونی لەسەرخۆی دەسەڵات و هێزی ژنان. نیتچە لە پارچەیەکدا لەبارەی "ژنی یۆنانی"ەوە کە لەساڵەکانی ١-١٨٧٠ دا نوسراوە رووبەڕووی ئەو دیدگایەی ئەفلاتۆن دەبێتەوە کە پێیوایە ژنان دەبێت لە ڕووی "ماف و زانین و ئەرکەوە" خاوەن بەشێکی کامڵ و یەکسان بن (ژن، ص٢١، سەرجەمی بەرهەمەکان، ٧، ص١٧٠)(٣). نیتچە دەڵێت ئەفلاتۆن بە بەرگریکردن لە روخانی پەیوەندی زنجیرە

پلەیی ژنان و پیاوان کە تیایدا پیاوان لە بواری "کلتور"دا چالاکن و ژنانیش لە بواری "سروشت"دا، بە تەواوی فریوی بەهێزترین ژنانی سەردەمی کلاسیکی خواردووە...ژنانێك کە خۆیان نەیاندەزانی تەنها بەسنورداركردنی چالاکی خۆیان لە بواری دایکایەتیدا، بەهێز دەمێننەوە. نیتچە دەڵێت ژنان لە کۆمەڵگای یۆنانیدا لە پلەی دایك و خاوەن منالدا، خاوەن جێگەیەك بوون "کەبڵندترین ئیرادەی دەوڵەت (hochste stautswile) پێی بەخشیبوون" (هـ. س. پ ص٢٤، ص١٧٢)(٤) ژنان لە یۆنانی کلاسیکدا خاوەن ڕێزێکبوون کە ئیدی لەدوایەوە هەرگیز خاوەنی نەبوون. گرنگی ئەوان دەگەڕایەوە بۆ خۆفیداکردنیان لەبواری "گومناوی" ژیانی تایبەتیدا و تەرخانکردنی ژیانی خۆیان بۆ منالبون و پەروەردەکردنی کوڕانی مەزن. نیتچە دەنوسێ "ژنی یۆنانی وەك دایك دەبێ لە گومناویدا (Dunkel) بژی، چونکە غەریزەی سیاسی (Politische Trieb)و مەزنترین ئامانجەکانی ئەوەی دەویست" (هـ. س. پ ص٢٣، ص١٧٢).

ئەم دیدگایە چەند ساڵێك دوای ئەمە لە "مرۆیی، زیاد لە سنور مرۆیی"شدا، ڕاگەینرا. نیتچە لەپارچەی "٢٥٩"ی ئەم بەرهەمەدا کلتوری کلاسیکی یۆنان بە "کلتورێکی پیاوانە" (Cultor de manner) کە وەرگێڕانی وشە بە وشەی بریتیە لە "کلتوری پیاوان") ناودەنێت کە تیایدا گرنگترین پەیوەندی، پەیوەندی هاوجنسبازی پیاوانی بە تەمەن و کوڕانی لاوە. ئەوەی حوکمڕانی پەیوەندی ژن و پیاوی دەکرد "پەروەردەکردنی منالْ و لەزەتی جەستەیی بوو". "ئاڵوگۆڕی ڕۆحی" یان "عەشقی" ژنو پیاو هان نەدەدرا. چونکە بە بڕوای نیتچە ئەم مەسەلەیە ژێر پێی کلتوری یۆنانیەکانی خاڵیدەکرد. نیتچە لەسەری دەڕواو دەڵێت کردنی ژنانی وەك "ئەلەکترا" و "ئەنتیگۆنە" بە سیمای سەرەکی تراژیدیای یۆنانی تەنها "لە هونەردا تەحەمولدەکرا، لە ژیاندا کەس نەیدەویست". نیتچە ئەم پارچەیە بەمشێوەیە کۆتای پێدێنێت:

"ژنان ئەرکێکی دیان جگە لە بەدنیاهێنانی جەستەی جوان و بەهێز نەبوو، کە تا ئەو جێگایەی دەشێت خاوەن خەسڵەتەکانی باوك بن و هەر لێرەوە (ئەرکیان) ڕێگەگرتن لەو هەژانە نێوروتیکیە بوو، کە خەریکبوو لە کلتورێکی وا پێشکەوتودا بەهێز بێت. هەر ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کلتوری یۆنانی بۆ سەردەمێکی بەرێژە





درێژ بەلاوی بمێنێتەوە. چونکە مەزنیێتی یۆنانی لە بونی دایکانی یۆنانیدا بەردەوام بۆ سروشت دەگەڕایەوە" (مرۆیی، ٢٥٩).

نیتچە لەگەڵ بزوتنەوەی فەمەنیزمی ئەوروپیدا نیە، چونکە بەسەرەو ژێرکەری بەرهەمهێنانی کلتوری دەزانێت. بەمشێوەیە نیتچە ژنانی خوازیاری سەربەخۆی ئابوری و مافی سیاسی بە "مێینە نەزۆکەکان" ناودەبات کە بێزارن لەو ژنانەی باش دروستبوون (واتە ئەو ژنانەی توانای زاییینیان هەیە) (هەنوکە، "بۆچی ئەم کتێبە باشانە دەنوسم؟" ٥٠). مەسەلەی نیتچە ئەوەیە لەکاتێکدا هێزی جنسیانەی ژنان دەناسێتەوەو بە قازانجی لەزەتی جنسی ژنان و دژی پاکژی لەهاوسەریدا قسە دەکات، (بەڵام) ئاوسبونو منالداریش کە بەبڕوای ئەو سروشتی ژنان کامڵدەکات و بێ بوونیشی دەیانکات بە کەسانی ڤین لەدڵ، بە ئەرکە پێویستیەکانی ژنان دەزانێت.

بەبڕوای نیتچە یەکێك لە مەترسیە گەورەکانی بزوتنەوەی ژنان ئەوەیە کە لەهەوڵدانیاندا بۆ روناککردنەوەی ژنان سەبارەت بە ژنێتی خۆیان، فێریاندەکەن ترس لە پیاوان فەرامۆشبکەن. ئەو دەڵێت بەمکارە ژن واتە "ڕەگەزی لاواز" لە ژنانەترین غەریزەکانی خۆی دور دەکەوێتەوە. (لەسەرو، ٢٣٩). نیتچە دەپرسێت بۆچی ژنان دەبێ بیانەوێت وەك پیاوان بن لە کاتێکدا "وەزن و هونەر"ی ژنان لە دڵڕفێنی و شۆخ و شەنگی و ساویلکەییاندایە؟ بۆچی دەبێت ئەوان بەدوای دۆزینەوەی "هەقیقەت"ی ژندا بن لەکاتێکدا هونەری گەورەیان درۆزنی و گرنگترین مەسەلەی جێی سەرنجیشی "سەروسیما و جوانیە". (هـ. س. پ ٢٣٢). نیتچە دەڵێت بەپێچەوانەی "بیروباوەڕە مۆدێرنەکان" لەبارەی ژن و پیاوەوە، دەبێ پەروەردەی واقیعی سەبارەت بە پەیوەندی ڕەگەزەکان لە کلتوری ڕۆژهەڵاتدا بدۆزرێتەوە.(٥) بەبڕوای نیتچە پیاوی ئیدراك "لەوانە ئیدراکی کاری باشی سەختگیرانەو سەخت کۆشانە" دەبێ ژن بە "سامان (Besitz) یان دارایی (Eigenthum) بزانێ کە دەکرێ لە جێگەیەکی ئاسایشدا هەڵبگیرێ.. شتێك کە مەحکومە بە خزمەت و گەیشتن بە کەماڵ لەخزمەتکردندا" (هـ.س. پ، ٢٣٨). نیتچە لەبزوتنەوەی ژناندا "کەرێتیەکی پیاوانە" دەبینێت، کە تەنها دەتوانێ ببێتە هۆی فاسدبوونی ژن. هیچ شێوەیەکی "پەیمانی کۆمەڵایەتی" ناتوانێ نایەکسانی ژن و پیاو و نادادپەروەری نێوانیان لەناوببات. (زانین، ٣٦٣). نیتچە دەڵێت ئەم مەسەلەیەش وەك زۆر مەسەلەی





پەیوەندیدار بە "بیروباوەڕە مۆدێرنەکان"ەوە دەگەڕێتەوە بۆ شۆڕشی فەرەنسی و دروشمی یەکسانیەکەی. دەبێ بۆ راوەستان لەبەرامبەر ئەم فاسدبونەی ژندا، رەگەزەکان فێربن کە ئەوەی پیاو ناچار بە ئافەرین گوتن بە ژن دەکات "خەسڵەتی ژن.. واتە چنگاڵی پڵنگ لە دەستکێشدا، ساویلکەیی خوپەرستی ئەو، توانای پەروەردە نەبون و زاتی دڕندانەی ئەوە" (لەسەرو، ٢٣٩). نیتچە لەمڕووەوە ستایشی ناپلیۆن دەکات کە بەسەر دروشمە ساویلکەکانی شۆڕشدا سەرکەوت و جارێکی دی "سەروەری مرۆڤی بەسەر بازاڕیبوون، زۆرینەی بێ کلتورو "ژن"دا سەقامگیرکرد کە مەسیحیەت و روحیەتی سەدەی هەژدەهەمو لەمەش زیاتر "بیروباوەڕە مودێرنەکان" لوس و نازپەروەریان کردبوو" (زانین، ٣٦٢).

نیتچە شوناسەکانی ژن و پیاو بەدیدێکی واقیعیەوە تاوتوێدەکات، وەك ئەوکاتەی لەپارچە دەقی "١٣"ی "لەسەر و چاکەو خراپە"وە دەڵێت پیاو و ژن هەردوکیان خۆیان لەبارەی یەکدیەوە فریودەدەن، چونکە ئەوەی بۆ ئەوان پیرۆز و شایانی رێزە، تەنها ئارەزوەکانی خۆیانە. هەر لەمڕووەوەیە کە پیاو ئارام و گوێڕایەڵی دەوێت، ئەمەش لەکاتێکدا ژن "لە خۆیدا نائارام" و "دڕندەیە". نیتچە هەروەها بەشێوەیەکی پۆزەتیڤانە رووبەڕووی مەسیحیەت دەبێتەوە کە نەفرەت لە بنەماکانی ژیان دەکات و لێرەوە مەسەلە جنسیەکان بە پیس و ناپاك دەزانێت (خۆرئاوای، "ئەوەی من قەرزاری بیریارانی کلاسیکیم"،(٤). لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا و سەرەڕای هەندێك لایەنی پۆزەتیڤ لە بیروڕاکانی نیتچەدا لە بارەی ژنەوە، بەڵام ئاراستەی بالادەست بەسەر بیرکردنەوەیدا ئەوەیە کە ژیانی ژنان لە بنەڕەتدا کورتدەبێتەوە بۆ دایکایەتی و منالداری و ژنان سەبارەت بە ئەنجامی ئەرکە کۆمەلایەتیەکان ناچار بە بینینی "دەورێکی لاوەکین" (لەسەرو، ١٤٥). ئەو هەر ژنێك کە بیەوێت کارێکی جیاواز لەمنالداری بکات -وەك لێکۆڵینەوە- لە روی جنسیەوە بە "نەزۆك" ناودەبات. (لەسەرو، ١٤٤).

## نیتچە، خود، شێوازو ژن

ئەستەمە بڕوابکەین ئەو فەیلەسوفەی دەڵێت دۆستی واقیعی ژنان ئەو کەسەیە کە پێیان دەڵێت "ژن دەبێ لەبارەی ژنەوە خامۆشبێت" (لەسەرو، ٢٣٢) و وەك





بینیمان بەسوکایەتیەوە "ژنانی ئازاد بوو" ناو بنێت "مێینە نەزۆکەکان"، دەتوانێت سودێکی بۆ فەمەنیزم هەبێت. بەڵام تێڕوانینە تازەکانی ژمارەیەك لە ژنانی فەیلەسووف و چالاکی سیاسی بۆ بیروباوەڕەکانی نیتچە، هەڵگری خاڵی پۆزەتیڤ و بەهێزی ئەوتۆیە کە رێگە بۆ سودوەرگرتن لەدیدو دەقەکانی نیتچە بە ئاراستەی فەمەنیزم و پراکتیکی سیاسی دەکاتەوە. بۆ نمونە "رۆزالین دیپروز" گوتویێتی رەخنەی نیتچە لە خودی هیومانیزمی مەسیحیەتو لیبرالیزم، واتە رەخنەی نیتچە لەو بیروباوەڕەی (کە پێیوایە) لەپشت هەموو کارێکی مرۆڤەوە خودێکی نەگۆڕو جێگیر و سەقامگیر بوو هەیە، هەڵگری "شێوەیەکی پۆزەتیڤی بەرگریکردنە لەبەرامبەر دەسەڵاتی کۆمەلایەتی و پرۆسەی گونجانکاریدا" کە بەتایبەتی بۆ خاڵە جێی سەرنجەکانی فەمەنیستەکان و خەباتیان دژی "خودگەری" گونجاوە.(٦) بیروباوەڕی نیتچە لەبارەی "خود"ەوە هەڵگری جەختکردنە لە گومان، فرەشوناسی و سەلماندنی "خودی" خۆرسك وەك کارێکی هونەری کەتیایدا مرۆڤ ئازادانە کەسایەتی خۆی خاوەن "شێواز" دەکات، هەموو ئەمانەش یارمەتی پێشکەشکردنی شێوەیەکی بیرکردنەوەی فەمەنیستی دەدات، شێوەیەك کە هەوڵدەدات خودێتی کردنی شوناسی مرۆڤ، چ ژن و چ پیاو، کە "جیاوازی" سادەیان لەناو دەبات، بڕوخێنێت. ئەو سوبژێکتە ئەفسانەییەی کە دەبێت بەمشێوەیە بکەوێتە بەر هێرش و بونیادشکێنی، سۆبژێکتی پیاوی کۆمەڵگای بۆرجوازی و مێژوی بورجوازیە:

"بۆ نیتچە "ئەوی دی" کە زۆرجار بەهۆی ئەخلاقی یەکسانیەوە دەکەوێتە بەر مەترسی نەك ژن، بەڵکو رۆحی ئەرستۆکراتیە کە هەندێکجار ستەمکار، هەندێکجار نهێنیئامێز و هەمیشەش ئاوارتنە (استثناء). شێوەی نیتچە بۆ هەڵبژاردنی قوربانیەکی ئەرستۆکراتی، تەنها بۆ خوێنەری هاوچەرخ کەمێك سەرسوڕهێنەرەو هەندێك تەفسیرکەری ناچار بە رەخنەکردنی کردووە. بەڵام هەوڵی نیتچە بۆ رزگارکردنی سیمای نوخبە و کەمتازۆر بە هەیبەت، لەدەست کارەکانی دەوڵەتی دیموکراسی ئائەندازەیەك بەرهەمی زەرورەتی مێژوییە. نمونەی رزگاری لەسەردەمی دەرکەوتنی ئاکەکەسی لیبڕاڵی سەدەی نۆزدەدا بەر لە هەرکەسێکی دی، مرۆڤی شەریفی رازاوە بە بیرەوەری ئەرستۆکراتی یۆنان بوو. بەڵام ئێستا چیدی وانیە: سەدەیەك "یەکسانی"، زنجیرە بەهای خۆی دروستکردووە و لێرەوە سیستەمێکی





پێکهێناوە کە جیاوازیەکان پەراوێزدەکات و لەناویدەبات. لەمڕەووە هیچ بەهانەیك بۆ سڕینەوەی ئاشکرای ژنان بەهۆی نیتچەوە، نەماوە."(٧).

بڕێکی زۆر لە خەسڵەتی "کاردانەوەی" رادیکالیزمی ئەرستۆکراتیانەی نیتچە لە بێزاری (ressentiment) پیاوێکی شەریفەوە سەرچاوەدەگرێ کە هەستدەکات ئیمتیازەکانی لەمەترسیدایەو ئەو بەهایەش کە بۆ جیاوازی و ماوەی (فاصلە) دادەنێت، لە حاڵەتی لەناوچوندایە. دیپرۆز دەڵێ دژ بە فەمنیسمی نیتچە "ئەوەندە ناهاوئاهەنگ (نامنسجمە) نیە، بەڵام نیشانەی بێزاری خودی ئەوە"(٨). بەبڕوای دیپروز رەخنەی نیتچە لە یەکسانخوازی سەدەی نۆزدە بۆ بزوتنەوەی فەمەنیستی فێرکەرانەیەو ئەم لایەنەش رۆژ بەڕۆژ و لەگەڵ کامڵبونی بزوتنەوەی فەمەنیستیدا، زیاتر کەوتۆتە بەر سەرنجی فەمەنیستەکان. گروپە ستەملێکراوەکان لەهەوڵیاندا بۆ بەدەستهێنانو سەقامگیری یەکسانی —بەر لەهەموشتێك یەکسانی لەبەردەم یاسادا- زۆرجار توشی ئەو هەڵەیە دەبن کە دەیانەوێت جلوبەرگی ستەمکاران یان سەروەرانی خۆیان لەبەربکەن. ئەوان بەشێوەیەکی پاکی قابیلی تێگەیشتن، خوازیاری بەشێك لەدەسەڵاتی سەروەرەکانی خۆیانن. بەڵام ئەم گروپانە لەهەوڵیاندا بۆ بەدەستهێنانی ئەم خواستە زۆر مرۆڤانەیە، ناتوانن لەو خاڵە تێبگەن کە ئەو "یاسا"یەی ئەوان یەکساندەکات، یاسایەکە دەسەڵاتداران پێناسیانکردووەو دایانناوە: بۆ نمونە بۆ ژنانی سەردەمی پیاوسالاری، یاسا بریتیە لەیاسای "پیاوانە".

ژاك دێریدای فەیلەسوفی فەرەنسی لەوتارەکەی خۆیدا لەبارەی نیتچەو ژنەوە بەناوی "قامچیەکان"ەوە دەڵێ رادیکاڵبونی نیتچە دەگەڕێتەوە بۆ خودیی شێوازەکانی بیرکردنەوە و پراکتیکی نوسینی کە لەقبوڵکردنی شوناسگەلێکی نەگۆڕ یان پێشکەشکردنی خودە جێگیرەکان رادەکات. کاتێك نیتچە لەپێشەکی "لەسەرو چاکەو خراپیەوە" دەڵێ سەرجەم فەیلەسوفانی (پیاو) لە گریمانەیاندا بۆ هەقیقەت دۆگمابوون و ئەمەش بەراوردەکات بە هەڵسوکەوتی ناشیانەیان لەگەڵ ژناندا، ئەو خاڵە دوبارەدەکاتەوە کە وەك چۆن "هەقیقەت"ێکی یەکتاو یەکپارچە لەبارەی ژیانو واقیعەوە بوونی نیە کە بیدۆزینەوە، هەرواش "هەقیقەت"ێك لەبارەی ژنیشەوە نیە، چونکە ژنیش وەك "هەقیقەت" بوونی نیە. خاڵە وروژێنەرەکەی تێڕوانینی دێریدا بریتیە لەوەی رەخنەکانی نیتچە لە فەمەنیزمی کلاسیکی هەڵگری ئەم پەیامە





"پاش فەمەنیستیە"یە کە هەوڵی ژنان بۆ پێناسکردنی "ژن بەشێوەیەکی هەمەکی" دوبارەکردنەوەی هەمان هەڵەکانی خودگەری نەریتی پیاوانەی فەلسەفەی رۆژئاوایە. ئەو دەنوسێت "فەمەنیزم هیچ نیە جگە لە کاری ژنێك کە دەیەوێت وەکو پیاوبێت...ئەم بزوتنەوەیە ژن دەخەسێنێ و بێ شێواز (بێ ئسلوب)ی دەکات"(٩).

رەنگە گرنگترین تێڕوانینێك کە لە" قامچیەکان"دا دەربڕاوە ئەوەبێت کە هەوڵی فەلسەفی بۆ زاڵبون بەسەر واقعدا، ناتوانێت "حەقیقەت" وەك کارێکی "ژنانە" پێناسەبکات. نابێت "ژنانە" لەگەڵ ژنێتی ژن یان جنسیەتی ژن تێکەڵبکەین، واتە نابێت تێکەڵیبکەین لەگەڵ هیچ یەك لەو "بتە خودێتی کراوەنەی کە رەنگە هێشتا ئارەزووی فەیلەسوفی دۆگما و هونەرمەندێکی بێتوانا یان گومڕاکەرێکی بێئەزمون ببزوێنێت کە هێشتا لە چنگ هیوا ساویلکەکانی بۆ دەست بەسەراگرتنی سروشت، رزگارینەبووە"(١٠). بەبڕوای دێریدا دەکرێ لەبەرهەمەکانی نیتچەدا سێ سیمای ژن بناسینەوە. ئەو نەخشە سیانیەی کە بەسەر نوسینەکانی نیتچەدا باڵادەستە بەمشێوەیەی خوارەوەیە:

پیاو بوو، پیاو لەم ژنە خەسیوە دەترسا.

پیاو بوو، پیاو لەم ژنە خەسێنەرە دەترسا.

پیاو بوو، ئەو ئەم ژنە ئەئیدکەرەی خۆش دەویست.*

کیلی ئولیوار ئەمجۆر ناسینەی ژنی لە نیتچەدا بەهاوجوتی سێ خواست زانیووە: خواستی هەقیقەت، خواستی خەیاڵو خواستی دەسەڵات. مەبەست لەژنی خەسیو "فەمەنیستێکە کە ژن نەفیدەکات بۆ ئەوەی خۆی وەك پیاو بسەلمێنێ"(١٢). ژنی خەسیو لەبری خوڵقاندنی هەقیقەت و فرەشوناسی، بانگەشەی دۆزینەوەی هەقیقەت دۆزینەوەی ژن وەك بونەوەرێك "لەخۆیدا و بۆخۆی" دەکات. ئەو لە هەوڵدانیدا بۆ دۆزینەوەی "هەقیقەتی بابەتی" ژن، نەفی ئازادی سەلماندنی گومان و هەمەڕەنگی مانا دەکات. بەمشێوەیە ئەو فەمەنیستەی کە بەدوای بابەتیبوندا دەگەڕێ، دوژمنی شەپۆلی ژیان و ژیان وەك خواستی دەسەڵاتە(١٣) "ژنی خەسێنەر" هونەرمەندێکە کە گەمە بەهەقیقەت دەکات، بۆ ئەوەی سیمای خۆی بگۆڕێت و بەرگری لە بەرامبەر هەوڵی میتافیزیکزاندا بکات کە دەیەوێت لەخاکێکی دیاریکراودا دایبنێت و ماناکەی جێگیربکات. بەڵام ئەمجۆرە ژنە بە ئاسانی دەتوانێت فریوی خەیاڵەکەی بخوات کاتێك

به دەمارگیریەوە بە دروشمەکانی خۆیەوە دەنوسێت و فەرامۆشی ئەوەدەکات کە خۆی دروستیکردوون: "ئەو ئەکتەری دەوری ژنێکی گرگنی هیسترییە. ئەو هۆکاری خۆی، واتە خەیاڵەکەی خۆی لەگەڵ ئامانجدا لێتێکدەچێت. ژنی خەسێنەر ریوایەتێکی تری ژنی خەسیووە (١٤). "ژنی تەئیدکەر" دەلالەت لە خۆباڵادەستی خواستی هەقیقەتو خواستی تەوەهم دەکات. ئەو هێزێکی دیونیوزیسیە کە دەست لە هەموو بونیادەکان ودڵنیایەکان هەڵدەگرێ، "دایکێکی رەسەنە، واتە خواستی ماندو نەناسی لەدایکبونی ژیانە کە هەمان خواستی دەسەڵاتە"(١٥). سەرەڕای ئەمە:

"ئەو منداڵدانێکی خاڵیە، ئەو فەزاو منداڵدانێکە کە هەموو شتێك سەرچاوەی لێوە وەردەگرێت. ئەم فەزایە، ماوەیە (فاصلە)؛ ژنی تەئیدکەر ئوبژێکتێك نیە لەم ماوەیەدا، ئەو خۆی ماوەیە. ئەو بونی نیە وەك ماوە، وەك فەزا- منداڵدانێکی روت. ژن بوونی نیە وەك چۆن هەقیقەت بوونی نیە"(١٦).

دێریدا شێواز (ەکانی) نوسینی نیتچە (وەك دەرئەنجامی کاری ژنانە) بۆ پشتیوانیکردنی لە شێوازی دیستراکشن و رەخنەی ئەو شتە بەکاریدەهێنێت کە ناویدەنێت "میتافیزیکای ئامادەبوون" کە تیایدا بوون یان خودهوشیاری هەمیشە لەبەرامبەر خۆیدا "ئامادە"یە. دێریدا مەسەلەی شێواز دەکات بەمەسەلەیەکی ستراتیژی کە تیایدا "بۆ خۆلادان لە هەرجۆرە خودگەری و وتەزاگەلێکی نەگۆڕ" ئەگەری "شێوازێکی نوسین کە لە بنەڕەتدا دواخەر و دیارینەکراوە"، تاوتوێدەکرێت(١٧). دێریدا ئەم خاڵە بەمشێوەیە دەردەبڕێت:

"خوێندنەوە لە چنگی ئاسۆی مانا یان هەقیقەتی بوون ئازاد دەبێت، لەدەستی بەهاکانی بەرهەمهێنان یان ئامادەبوونی هەنوکە، رزگاری دەبێت. بەمشێوەیە مەسەلەی نوسین یەکسەر دەگۆڕێت بۆ مەسەلەی شێواز"(١٨).

تێڕوانینی دێریدا بۆ نیتچە سەرەڕای درەوشانەوەی ئاشکرای، (بەلام) تێڕوانینێکی گرفتئامێزە. بەبڕوای من ئەو خاڵە (بەشێوەیەکی سەرەکی لەبەر هۆو ئامانجی سیاسی و پراکتیکی) گرنگە کە مەسەلەی ژن کورتنەکەینەوە بۆ ئاستی وێنە یان خوازەیەکی روت کە تەنها خەسڵەتی مەجازێکی بەیانی هەیە. ئەو قسەیەی دێریدا کە نیتچە بەدەستی ژن دەنوسێت، لەگەڵ بەهێزبوونی خامۆشی زیانبەخشی فەلسەفە سەبارەت بە ژنان، ئەو مەترسیەی لەگەڵدایە کە سوکایەتی پێکردنی ژنان







دو چەندان بکات. ئەگەر فەیلەسوفانی پیاوی وەك نیتچە و دێریدا دەتوانن بەدەستی ژن بنوسن، ئەی فەیلەسوفانی ژن چ دەورو ئامانجێکیان هەیە؟(١٩) وەك "رۆزی برایدۆنی" نوسیوێتی: "ئایا سەیرنیە رێك لەسەردەمێکی مێژوویدا کە ژنان لە روی کۆمەلایەتی و سیاسی و تیۆریەوە، دەنگی خۆیان بە کەسانی دی دەگەیەنن، گوتاری فەلسەڤ واتە بواری بەتەواوی مانا (Parexcellence) پیاوانە، "مەسەلەی ژن" بۆ خۆیان پاوان دەکەن؟(٢٠). ئایا ئەوە خودی دێریدا نیە کە بە دورخستنەوەی مەسەلەی ژنان لە شانۆی سیاسەت (دەسەڵات) و گۆڕینی بەمەسەلەی شێواز، ژن دەخەسێنێ؟ دێریدا لە"قامچیەکاندا" بۆ جارێکیش ئاماژە بۆ خەباتی تیۆری و پراکتیکی بزوتنەوەی فەمەنیزم ناکات. درێدا ئەو راستیە بەجدی وەرناگرێت کە دیدی نیتچە هەر هەمان ئەوەیە کە وتویەتی و بەڕاستی بڕوایوایە ژنان دەبێت نە دەسەلاتی سیاسیان هەبێت و نە نفوزی کۆمەلایەتی. وەك یەکێك لە تەفسیرکەران ئاماژەی پێکردووە، تاوتوێکردنی دێریدا لەبارەی مەسەلەی ژن لای نیتچە وەك مەسەلەی شێوازی دەربڕین، "مەسەلەی کۆمەلایەتی ژن لە بواری کلتوریدا دەسڕێتەوە"(٢١). ئەم تاوتوێکردنە! ستراتیژێکە کە لەئەنجامدا دەگاتە پیاوێکی ئایدیالیکراو، ژنێکی ئایدیالیکراو وچەمکێکی ئایدیالیکراویش بۆ شێوازی دەربڕین. لەکاتێکدا خوێنەری بەرهەمەکانی نیتچە دەزانێت کە خەریکە چی دەخوێنێتەوە و دەتوانێت گەر بیەوێت هەلۆێستێکی رەخنەگرانە بەرامبەر بەو بەرهەمانە وەربگرێت، ئەوا خوێنەری بەرهەمەکەی دێریدا مەحرومە لەدەستگەیشتن بە مەسەلەی جنسیەت.. چ لە بەرهەمەکانی نیتچە و چ لە نەریتی فەلسەڤ رۆژئاوادا بەگشتی. خەسڵەتی دیاری هەلۆێستی دێریدا ئالۆزی و پەرشوبلاوی ڕوتە.(٢٢)

مەترسی قبولکردنی ئاڕاستە وەرگرتنی "گالتە جاڕانە"ی دێریدا لەوەدایە کە دەتوانێت جنسیەت واتە هەمان ئەو مەسەلەیەی کەدەیهێنێتە پێشێ، بگۆڕێ بە نامەسەلەیەك یان بیگۆڕێت بەمەسەلەیەك کە تەنها گرنگیەکی گومانلێکراوی بۆ ئەو فەیلەسوفە دۆگمایانە هەیە کە هیچ ناسین و ئاشنایەتیەکی واقیعیان لە جوانیەکان و دلڕفێنەکانی ژنان نیە.

## نیتچە و"ژن": کۆفمان و ئیریگاری

ڕەخنەی نیتچە لە فەمەنیزم ڕەخنەکردنی خەسڵەتی دوانەیی ئەم ڕەخنەیەیە. بۆ نمونە نیتچە تەحەدای شیوەی میتافیزیکی لە بە بەرزتردانانی عەقڵ بەسەر هەست یان سۆزدا دەکات. بەمشێویە دەکرێت ئەم ڕەخنەیە بەشێوەیەك یان شکڵێکی ڕەخنە بزانرێت کە دەیەوێت پلەی "ژن" لەفەلسفەدا بگەڕێنێتەوە بۆی. ئەمکارەش بەجۆرێك ئەنجامدەدات کەدواجار هەڕەشە لەهەمووجۆرە زنجیرە پلەیەکی نێوان "ژن"و"پیاو" دەکات. ئەگەر تێکستەکانی نیتچە بەوردی بخوێنینەوە، تەنیا قسە دژبە ژنەکانی نابینین، بەڵکو تێدەگەین کە ئەم قسانە بەشێوەیەکی سەرەکی بەستایشکردنی ژن وەك خوازەی هێزە داهێنەرەکانی ژیان (ژیانو ژن وەك هێزێکی دروستکەری جیاوازی)، بونیادی بانگەشە نێر سەنتەری خۆی، تێکدەشکێنێت.

ڕەخنەی نیتچە لەنەریتی فەلسەفە لە ئەفلاتۆنەوە تا کانت، لەسەر ئەو دیدە دامەزراوە کە ئەم نەریتە دەرکێکی دروستی بۆ جەستە نیە. فەیلەسوفان لەئەفلاتۆن بەدواوە پەیوەندی بیرکردنەوەی خۆیان لەبارەی ژیانەوە لەگەڵ جەستەی ئەزمونکەردا کە ژێرخانیان پێکدەهێنێت، بچڕاندووە. جیهانبینی بنەڕەتی ئەم فەیلەسوفانە لەسەر میتافیزکی بێزاری دامەزراوە: بێزاری لەژیانی هەستی، لە ئارەزوو، لەجەستە. بەبڕوای نیتچە فەلسەفە دەورێکی دایکانەی هەیە، چونکە لەسەر یەکێتی جەستەو گیان دامەزراوە. کاری فەیلەسوف ئەوەنیە وەك ئەفلاتۆن گیان لەزیندانی جەستە ئازادبکات، بەڵکو ناسینەوەی ئەو خاڵەیە "گیان تەنها وشەیەکە بۆ دەربڕینی شتێك لە جەستەدا" (زەردەشت، "لەبارەی سوکایەتی پێکەرانی جەستەوە"). فەیلەسوفی ڕاستەقینە کەسێکە دەزانێت بیرکردنەوەکانی لەناو دەرونی ئازاری ئەزمونەوە لە دایکدەبن، ئازارێك کە وەك ئەزمونی منداڵبون پێویستی بە "خوێن، دڵ، گەرما، لەزەت، سۆز، ڕەنج، ویژدان، چارەنوسو کارەسات" هەیە (زانین، پێشەکی، ٣). تەنها ئازاری گەورەیە کە بەقوڵترین تێڕوانینەکان لەبارەی چارەنوسی مرۆڤەوە، چەکدارماندەکات. نیتچە ئەو خاڵە گرنگە بەبیر دەهێنێتەوە کە ئەزمونکردنی ئازارێکی لەمچەشنە ئێمە ناکات بە مرۆڤێکی "باشتر"، بەڵکو تەنها دەمانگۆڕێ بۆ مرۆڤێکی "ئەندێشە قوڵتر". دەبێت ئامانجی ئەم "ڕاهێنانە مەترسیدارانە بۆ باڵادەستی بەسەر خوددا" نەك بۆ فەرامۆشکردنی خود، بەڵکو بۆ گۆڕانی مرۆڤ بێت بۆ مرۆڤێکی "گۆڕاو" و "جیاواز". نیتچە دەڵێت ئێمە هێشتا







دەتوانین عاشقی ژیان بین، بەڵام دەبێت ئەم عەشقە بەعەشقی ئێمە بۆ کەسێك (بۆ ئەو، عەشق بۆ ژنێك) بەراوردبکرێت کە هەنوکە گومان و دودڵی تیا دروستکردوین (ه. س. پ).

ساراکۆفمان ئاگادارماندەکات کە بەشێوەیەکی پەلەو هەڵنەسەنگێنراو نیتچە بەفەیلەسوفێکی ئاشکرا دژ بە ژن ناو نەنێین. سارا کۆفمان دەڵێت ئەوەی نیتچە لەپێشەکی چاپی دوهەمی "زانینی شاد"دا (١٨٨٧) باوبۆ، واتە دەڵەدێوی یۆنانی بە ڕەمزی "هەقیقەت" دەزانێت، زۆر پڕمانایە...چونکە لە ڕێگەی باوبۆوەیە کە چەمکەکانی بەرهەمهێنی و بەپێتی ژنانە دەهێنرێتە ئاراوە. سیمای باوبۆ لەرازەکانی ئولیسیسدا دەدرەکەوێت وەك پوری "دیمیتر"کە خوای بەپیتیەو وەك ژنێکی نەزۆك لەخەمی لەدەستدانی ("پرسە خونە"ی کچی)دا دانیشتووە. "باوبۆ" بە بردنە سەرەوەی کراسەکەی و پیشاندانی سکی خۆی کە وێنەیەکی تیا کێشراوە، دیمیتر دەهێنێتە پێکەنین. جوڵەی بردنە سەرەوەی کراسەکە بەمەبەستی بزواندنی "دیمیتر" و گێڕانەوەی بۆ دنیای بەپیتی ئەنجامدەدرێ. کۆفمان لە خوێندنەوە پڕ داهێنەرەکەی خۆیدا بۆ نیتچە، بەپیتی ژنانە دەبەستێتەوە بە ئەندێشەی بەرهەمهێنی هەقیقەتەوە. نیتچە لەو بەشەدا کە باسی ئەم دەڵەدێوە هەرزەیە دەکات، دەنوسێ ئازایانە لە ئاستی ڕوبەر، ڕوو و ڕووکەشو ستایشکردنی دیاردا ڕابوەستین★ و بەمشێوەیە لە "قوڵ ڕوانینەوە" بگەیەن بە "ڕوکەش بینی". کۆفمان ئەفسانەی "باوبۆ" گرێدەدا بە تێگەیشتنی نیتچەوە بۆ فەلسەفە و هەقیقەت؛ سیمای باوبۆ پیشانیدەدات کە لۆژیکی سادە هەرگیز ناتوانێت تێبگات، کە ژیان نەقوڵە و نە سادە و لەپشت هەر پەردەیەکەوە، پەردەیەکی دی هەیە. هەروەها ئەم سیمایە دەلالەت لەوە دەکات کە دەبێت دیار ئێمە نەك بۆ بەدبینی و گومانکاری، بەڵکو بۆ پێکەنینی سەلمێنەرانەی (ئەئیدکەری) بونەوەرێکی زیندوو ڕابکێشێت، کە دەزانێ ژیان سەرەڕای مەرگ بەشێوەیەکی نەبڕاوە دەگەڕێتەوە".(٢٣)

نیتچە بە پیشاندانی حیکمەتی ژیان لە باوبۆدا "هەقیقەت" لە ئەندامەکانی منداڵبونی ژندا پیشاندەدا کە نمونەی بە پیتی و خوڵقاندنی ژیانی نەمرانەو تایەی خوڵقاندن و پوکانەوەی خوڵقاندنە...تایەیەك کە بەمانای خواستی دەسەڵات، خواستی پاکێتی و خواستی خودباڵادەستیە لەڕێی بەرهەمهێنانی ڕەگەزەوە (تولید

میپل). کۆفمان ئاماژە بەوەدەکات کە "لەرازەکانی ئولیسیسدا ئەندامی جنسی ژن، وەك سیمای بەرهەمهێنان و زامنکەری تازەکردنەوەی ژیان و گەڕانەوەی نەمرانەی هەموو شتێك ستایشدەکرێت"(٢٤). بەڵام ئەوەی کۆفمان فەرامۆشیدەکات ئەوەیە کە گەرچی نیتچە چەمکی بەرهەمهێنی و بەپیتی ژنانە بەشێوەیەکی پۆزەتیف بەکاردەهێنێت، بەڵام ڕێگە بە خودی ژنان نادات ببن بە فەیلەسوف (ئەوان گەر ئارەزویەکی لەم چەشنەیان هەبێت، لەزگەی "لێکۆڵەرەوە نەزۆکەکان" یان پێوە دەلکێنرێ). کەوابوو دەبێت بەهای پۆزەتیف تێڕوانینەکانی نیتچە بۆ فەلسەفەو هەقیقەت، لەبارەی "نووسینی ژنانەوە" بەجدی بخەینە ژێر پرسیارەوە.

دواجار لەو بڕوایەدام پێویستە گومانێکی واقعی لەدڵی بیرکردنەوەکانی نیتچەدا پیشانبدەین، گومانێك کە زۆرجار ئەم بیرکردنەوەیە لەنێوان دوجۆری ئابوری لیبیدۆیی تەواو جیاوازدا دیلدەکات. بیرکردنەوەی نیتچە لەلایەکەوە پیشاندەری "ئابوری کۆکردنەوەیە" (کە دەلالەت لەچەمکی موڵکایەتی، خاوەنداریێتی و سودوەرگرتن و لەم بابەتە دەکات) و لە لایەکی دیەوە ئاشکراکەری "ئابوری بەخشینە" کە جەخت نەك لە "خاوەنداریێتی" یان "بەدەستهێنان"، بەڵکو جەخت لە"دەست بڵاوی"و "بەخشین" دەکات. بۆ نمونە ئەم خاڵە دەتوانێت رونیبکاتەوە بۆچی تێزی "خواستی دەسەڵات" لە نوسینەکانی نیتچەدا، دو شکڵی تەواو جیاوازو نەگونجاو بەخۆیەوە وەردەگرێ؛: خواستی زاڵبون و دەسەڵات و خواستی ئازاد هێشتن و وازلێهێنان (Gellassenheit). بەڵام سەرەڕای پیشاندانی ئەم جیاوازیەش لەبەرهەمەکانی نیتچەدا، تێگەیشتنی ئەم خاڵە پێویستە کە خواستی دەسەڵاتی نیتچە، تەنانەت لە شکڵی بەخشینیشدا هێشتا بەئاشکرا چەمکێکی "پیاوانە"یە.. چونکە خواستی هێزێکی پشتبەستو بەخود، سەربەخۆو خودسالارە کە لەسەر بناغەی نەفیکردنی هێزەکانی ئەوی دی سالار (بە دیاریکراوی ژن وەك "ئەوی دی") راوەستاوە. (بەتایبەتی تەماشای "زەردەشت" بکەن "لەبارەی چاکەی بەخشینەوەوە" پارچە دەقی(١)).

لوس ئیریگارای لەنێوان بیریارانی هاوچەرخی فەرەنسیدا زۆرترین هەوڵی بۆئاشکراکردنی "مەسەلەی ژن" لە فەلسەفەدا ئەنجامداوە. ئەگەرچی رەنگە ئەم هەوڵە گرفتئامێز بێت. لەگەڵ ئەوەشدا زۆرجار "ئیرگاری"یان بەخودگەریەکی







بایەلۆجیانەی خۆ —هەڵوەشێنەرەوە تاوانبارکردووە، بەڵام دەکرێت بۆ بەرگریکردن لێی بگوترێت کە کارە زۆر هەڵە دەرککراوەکەی ئیریگاری، بریتیە لە ئاشکراکردنی ئەزمونێکی ئاڵۆز و نازنجیرە پلەیی لەجیهان، کە تیایدا بۆ یەکەمجار دەنگی ژن کە لەگوتاری فەلسەفی وەلاوەنراوە، دەبیسترێت (٢٥) ئیریگارای بەشێوەیەکی فێرکەرانە سەرچاوەی گرفتەکانی خۆی و هەر هەوڵێك بۆ ئاشکراکردنی دەنگی ئەوی دی پیشاندەدات:

ژن هیچ دیدێکی کراوەو هیچ گوتارێکی نیە، شوناسی پێ ببەخشێت.. بەمشێوەیەیە ژن دەورێکی چالاکی لەگوڕانکاریەکانی مێژودا نیە، چونکە (ژن) هیچ نیە جگە لەسێبەرێکی هێشتا جیانەکراوە لەمادەیەکی بەهەست، زەخیرەیەك بۆ نەفیکردن و باڵابوونی "خود"، یان بونەوەرێکی دروستکراو بۆ هەنوکە.)(٢٦).

هەوڵی ئیریگارای بۆ "نووسین لە بارەی جەستەوە" بە ئاماژەکردن بۆ ئەندامە زاینیەکانی (تناسلی) ژن، بۆ وەسفکردنی ئابوری لیبیدۆی لەسەر بناغەی بەرکەوتن، هەست، جوڵە و گەمەی هەمیشیەی، تەحەدای پێشداوەری‌و گریمانە نێر سەنتەریەکانی عەقڵ و عەقلانیەتی پیاوانە دەکات کە هێشتا بەسەر گوتاری فەلسەفی‌و دەزگاکانی ژیانی سیاسی ئێمەدا زاڵە.

ئیریگارای لەمامەڵەی عاشقانەی خۆی لەگەڵ نیتچەدا، بانگەشەکانی نیتچە وەك فەیلەسوفی دایکانەو جەستە، دەخاتە ژێر پرسیارەوە. تێگەیشتنەکانی ئەو بۆ نیتچە تەحەدای تێگەیشتنەکانی کۆفمان دەکات. ئەو ترس و نیگەرانی وخەون و کابوسەکانی نیتچە لەبارەی ژنەوە، دەخاتە ژێر پرسیارەوەو "بێزاریە"کی بنەڕەتی لە بیروباوەڕەکانی نیتچەدا پیشاندەدات:

"تۆ دەڵێیت پیاوێك کە بەراستی عاشق بێت لە کەمتەرخەمیەکانی مەعشوقەکەی نابورێت. هەر ئەمەش دەریدەخات کە تۆ چەند تێگەیشتنێکی لاوازت بۆ ڕێگەگرتن لە شەڕکردن لەگەڵ ژنەکەتدا هەیە. تۆ حەسودی و نەفرەتی خۆت بۆ شەو هەڵدەگری.

بەڵام من دەمەوێ خەوەکانی نێوەشەوی تۆ تەفسیربکەم و دەمامك لەسەر ئەم دیاردەیە: واتە شەوی تۆ لابدەم. تۆش ناچار بەسەلماندنی ئەو خاڵە بکەم کە ئەوەی پەنجەی دەخەمەسەر، ترسناکترین وەسوەسەی تۆیە. بۆ ئەوەی دواجار تێبگەیت لە چ

شتێك له هەموو شتێك زیاتر، بێزاری. منیش بتوانم لەگەڵ تۆدا بجەنگم و زەوی بکەمە موڵکی خۆم و چیدی کۆیلەی سروشتی تۆ نەبم، تۆش دواجار نەتەوێت تەنها خودایەك بیت کە هەیە"(٢٧).

نیتچە تەنها بەنکوڵیکردن لە واقعیەت و ئەزمونی سەربەخۆی ژن لەبارەی جیهانەوە، ژن بە سەرچاوەی ژیان دەناسێت. دەستگەیشتنی ژن بە جیهان لە ڕێی پیاوەوە، هەمیشە شکڵی هەڵوێستێکی نزم بەخۆیەوە دەگرێ، هەڵوێستی کۆیلەیەتی و ناچاری. هەر لێرەوە تەئیدکردنی ژن لەلایەن نیتچەوە، هەڵگری نەفیکردنی بونی خود سالارانەی ژنە: ئەو واز لە ژن ناهێنێت و ڕێگەینادات بۆخۆی قسەبکات. ئیریگارای لەبارەی سڕینەوەی ژن لەلایەن نیتچەوە دەنوسێت:

"ئەگەر ژنت بۆ تەئیدکردنی بوونی خۆت دەوێت، ئەوا بۆچی ڕێگە نادەی کە پێچوپەناکانی ئەم بونە بپشکنێ؟ بۆچی ڕێگەی ئازادی قسەکردنی پێ نادەی؟ لێگەڕێ ژن لەو جێگەیەوە کە گۆرانی کۆتایی کاری تۆ دەخوێنێت، بەتۆ بڵێت؛ نا".(٢٨)

نیتچە بە هۆی خواستی خۆیەوە بۆ دەستگەیشتن بە مەحاڵ واتە (خواستی خۆی بۆ) لەدایکبونی خود وەك فەیلەسوفێکی خۆ دروستکەر، بێزاری بنەڕەتی خۆی لەو شتەی کە زۆرترین جێگەی شایەنی ڕێز و گرنگی پێدانێتی، واتە (بێزاری خۆی لە) خولْقاندنی دایکانە، ئاشکرا دەکات. ئەم بێزاریە دەکرێ بەو بێزاریە بەراوردبکرێت کە نیتچە لەخواستی ئیرادەی گەڕانەوە رابردوو، واتە خواستی رابردوو و هەموو ئەوانەی کە هەبووە، دەیدۆزێتەوە. ئیریگارای لەبارەی ئەم خاڵە ئاڵۆز، بەڵام چارەنوسسازەوە دەڵێت:

"بێگومان دوا خواستی تۆ ئەمەیە: کۆنترۆڵکردنی مەحاڵی خواستی خود. کورتەی مێژوی تۆ بریتیە لەدایکبونی فلان و فیسار بەرهەم، یان فلانو فیسار مناڵ. بەڵام دوا ئەندێشەی تۆ لەدایکبونی خودی خواستتە. گەورەترین بێزاری تۆش ئەوەیە کە ناتوانی وابکەی. چونکە تۆ یان کارێکدەکەیت بەکەڵکی خواستت بێت، یان خودی خواست بەکاردەهێنی. بەڵام کەرەسەی لەدایکبووی مناڵیەکی لەمچەشنە، چۆن دەدۆزیتەوە؟ "

ئیریگارای بەدیدێکی قوڵەوە ماهیەتی بێزاری پیاوانەی نیتچە لە ژیان و ژن





تاوتوێدەکات:

"تۆ بەگەڕانەوە بۆ سەرچاوەی سەرجەم مناڵەکانی خۆت، دەتەوێ سەرلەنوێ بێیتە دنیاوە؛ وەك باوك؟ یان وەك مناڵ؟ ئایا بونیشت بەشێوەی ئەم دوانەو لە هەمانکاتدا، هەمان ئەوشتە نیە کە ریسی خواستی تۆ دەکاتەوە بەخوری؟ چونکە تۆ بۆ باوکبوون دەبێ زاووزێبکەیت، دەبێ تۆوەکەت لە تۆ بچێتە دەرەوە و برژێتەدەرەوە. دەبێ بەرۆژ، بەیانیان و ئێواران ئەوانە دروستبکەیت کە نیتن.

بەڵام ئایا لەراستیدا خواستی تۆ ئەوە نیە خێرا هەموو شتێك راکێشیتە دەرونی خۆتەوەو یەك خۆر بیت و یەك خۆریشت هەبێت؟ زەمەنیش تەنها بۆ خۆت راوەستێنیت؟ و بزوتنەوەی سەرکەوتن و هاتنە خوارەوەی جینالۆجیاش دوابخەیت؟ و سەرەتاو کۆتایی هەموو شتێکیش لە سنورێکی کامڵ و بازنەیەکی کامڵدا، بەیەکەوە گرێبدەی؟"(٢٩).

نیتچە دەیەوێت دەستی بەمەحاڵبگات، و بەگەڕانەوە بۆ دواوە پێ بنێتە دنیاوە. بۆ بەدەستهێنانی ئەمەش ناچارە بە تەفسیرکردنی ژن، وەك بونەوەرێك کە کامڵبونی بەستراوە بە پیاوەوە بێ نرخبکات (ئەمەش لەکاتێکدا کە لەراستیدا هاتنە دنیای هەر پیاوێك و بوون بەخاوەن بەهرەی ژیانی، بەستراوە بە ژنەوە).

بێزاری نیتچە لەسەربەخۆی داهێنەرانەی ژنان لەو وەسفەدا دەردەکەوێت کە بۆ ژنی رزگار بوی دەکات: وەك مێینەیەکی نەزۆك، بەڵام سەرنجبدەن هیچ شتێکی تایبەتی و تاکانە لە بێزاری نیتچەدا نیە: نمونەیەکە لە هەمان بێزاری پیاوسالارانە. وەك "پیتر سلاتریج" گوتوێتی تێگەیشتنی نیتچە بۆ خودسالاریو خۆدروستکردن لەرێی خۆ بەرهەمهێنانەوە، تێگەیشتنێکی پیاوانەیە. بەو مانایەی کە ئەو سوبژێکتەی دەیهێنێتە پێشێ، سوبژێکتێکە کە دەبێ سەربەخۆ و مەغرور لەسەر پێی خۆی رابوەستێت و ئەوەش سەرکوتبکات، کە لە دیدی ئەوەوە لەدایکبونی دزێو و نەفرەت ئەنگێزکردووە (واتە ژن): لەدایکبونێك کە پەیوەستی دەکات بە ژنەوە. نیتچە باس لە پێویستی رزگاربوونی خود لەدیدی دڵ تێکهێنەری مرۆڤی لەبارچوو، گرگن و ژەهراوی دەکات.(٣٠) "سلاتریج" پرسیارێکی چارەنوسساز دەهێنێتە پێشێ، کاتێك دەپرسێت: ئایا "ئەم خۆ بەرهەمهێنانە..تەنها هەوڵێك بۆ راکردنێکی رەسەن لەخاڵی دەرچونێکی تەحەمولنەکراو نیە)(٣١). راکردنی نیتچە لەخاڵی دەرچونی





مرۆیی زیاد لەسنور مرۆیی خۆی —و ئێمە، دەبێتە هۆی نەفرەتی ئەو لە مرۆڤی میانڕەو، نەخۆش و سروشتی و ژن.

نیتچە لە "زەردەشت وای گوت"دا پەیوەندیەکانی ژن و پیاو بەپێی پێشداوەریە ئەرستۆکراتیەکانی خۆی تەفسیردەکات. بۆ نمونە لە گوتاری "لەبارەی ژنانی پیرولاوەوە" پیاو بە "قولایی" و ژن بە "روکەش" ناودەنێت. پەیوەندی نێوانیان لەسەر بناغەی بەرزونزمی یەکێکیانە. پیاو بۆ ژن تەنها یەك ئامێرە (ئامانج منالە:"هەموو مەسەلەکانی پەیوەندیدار بەژنەوە تەنها ڕێگە چارەیەکی هەیە کە ئەویش ئاوسبوونە"). بۆ پیاو، ژن هەم مەترسی و هەم یاریە "پیاو دەبێت بۆ جەنگ پەروەردە بکرێت و ژنیش بۆ بەرهەمهێنانەوەی جەنگاوەر: هەر شتێکی دی حەماقەتە". سەرەڕای ئەمە "خۆشبەختی پیاو لەوەدایە بڵێت: "من دەمەوێت"، خۆشبەختی ژن لەوەدایە کە بڵێت "پیاو دەیەوێت". پێشگریمانەکانی نیتچە لێرەدا لەسەر بناغەی چەوساندنەوەی جنسی راوەستاوە..چونکە "روکەشیبوونی" ژن لەو رووەوە نیە کە یەك نهێنیو یەك گومانە (وەك دێریدا دەڵێت)، بەڵکو لەو روەوەیە کە دەزانێت ئەو "هیچ"ە: ژن بۆ بەخشینی قولایی و مانا بەبونی خۆی، پێویستی بە پیاوە.

تێڕوانینی ئیریگارای دەریدەخات کە چەمکی خولْقاندنی ژنانەی نیتچە زۆر کێشەئامێزە. دەبێ بزانرێ کە پیرۆزکردنی دایکایەتی لە کلتوری پیاوسالاریدا وەك ئامێرێکی سودمەند بۆ هێشتنەوەی ژنان لەدیلێتی و "ژێردەستیدا" کاریکردووە (ئەهلی بەیت، مەحرەمەکان و هتد). بەڵام سەلماندنی بەرهەمهێنان وخولْقاندنی ژنانە، بەناچار مانای کورتکردنەوەی ژن نیە بۆ ئاستی دایك. مەسەلەی چەمکی خولْقاندنی "ژنانە" ئەوەیە کە کەوتۆتە دەست فەیلەسوفانێکی پیاوەوە کە ژنانیان بەدناو کردووەو بە شێوەیەکی گشتیش یارمەتی سڕینەوەی ژنانیان لە گوتاری فەلسەڤ و دەزگاکانی ژیانی گشتیداوە، گوتاری داهێنەرانەی ژنانیان نەفیکردووە و ئەوانیان بۆ بێدەنگی راکێشاوە؛ ئەگەریش لەهەندێك بابەتی ئاوارتەدا ڕێگەی بەشداریان پێدراوە، ئەوە ئەمە بەو مەرجەبووە کەوەك پیاوان قسەبکەن.

## ئەنجامگیری





دەکرێ بگوترێ نیتچە تەنها کاتێك بۆ بیرکردنەوەی رادیکال لەبارەی خەسڵەتی ژن و پیاوەوە گرنگی دەبێت کە مەسەلەی شێواز بگۆڕرێت بەمەسەلەی سیاسەت و مێژووی کاریگەر. دەبێ بەر لەهەموو شتێك مەسەلەی "ژن" و "پیاو" بەمێژووی ستەملێکراوی ژنان و پیاوسالاریەوە ببەسترێتەوە. ئەم دو مەسەلەیە لەیەك جیانین: وەلاوەنانی ژنان لەفەلسەفە، دەبێتە هۆی وەلاوەنانیان لەژیانی گشتی و زاڵبونی بەها "پیاوانە"کان بەسەر بەها "ژنانەکان" لەژیانی سیاسیدا. تەنانەت ئەو کاتانەی بۆ نمونە فەیلەسوفێکی وەك ئەفلاتۆن بەپێچەوانەی ئارەزوی خۆیەوە، یەکسانی ژنان بەفەرمی دەناسێت، (ئەوا) ژنان دەبێ تایبەتمەندی ژنانەی خۆیان (هەست، سۆز، شهود و لەم بابەتە) کۆنترۆڵبکەن و خاوەن تایبەتمەندیەکانی پیاوانە بن. وەك "دیاناکۆل" ئاماژەی پێکردووە "ژنانی رزگاربوو، ژنانێکن کە لەخەسڵەتی پیاوانەوە نزیکبن، واتە عەقلانی و لەسەرخۆ، ڕێکو پێك، خود سالار و ململانێخواز و لەم بابەتە بن"(٣٢)

گوتاری فەلسەفەی سیاسی لەسەر کۆمەڵێك دوالیزمی (پیاو/ ژن، عەقڵ/ ئارەزوو، گشتی/ تایبەتی) راوەستاوە کە بایەخی پێکهاتەی مێژویی خۆی وەك سوبژێکتێکی یاسایی بە بەڵگەنەویست، وەردەگرێت. ئەم خودە، (بێلایەن یان نێرەموك) نیە، بەڵکو "پیاو"ەکە پڕە لەفەزیلەت و بەهای "پیاوانە". وەك چەندانجار فەمەنیستەکان جەختیان لێکردووە: ئێمە نەك "سروشت" بەڵکو "مێژوین". ئەندێشەی فەمەنیزمی نوێ، تێڕوانینی لیبرالی و هیومانیستانە بۆ شوناسی مرۆڤ، بۆ ململانێیەکی زیندوو بانگدەکات. بیرکردنەوەی سیاسی لیبراڵیانە بونی سوبژێکتێکی مرۆیی بەشتێکی بەدیهی عەقلانیەت و خودسالاریش بە پێشگریمانە وەردەگرێ. بەڵام ئاشکرایە کە شوناسەکانی ئێمە وەك سوبژێکتێکی سیاسی و یاسایی لەسەر بناغەی نەفیکردنی "ژن" و "مێینە" واتە (نەفیکردنی) رەگەزەکەی دی دروستکراوە. کەوابوو سیاسەتی پاش مودێرن (وەك "پاش پیاو") دەبێ مەسەلەی جیاوازی جنسی لە پێشەوەی بەرنامەکانی خۆی دابنێت.

بێگومان ئەم مەسەلەیە زۆر ئاڵۆزترە لەوەی کورتیبکەینەوە بۆ سڕینەوەی ژن و سەلماندنی پیاو. بۆ نمونە دەکرێ بگوترێت مەسەلەی "ژن" لە فەلسەفەو هونەری رۆژئاوا نەسڕاوەتەوە بەڵکو تەنها کەوتۆتە دەست پیاوانەوە (بۆ نمونە نیتچە).





لەكاتێكیشدا ئەو فەیلەسوف‌و هونەرمەندە پیاوانە لەبەر پیشاندانی لایەنەکان وسیفەتەکانی "ژنانە" ستایشدەکرێن، (ئەوا) لەگەڵ هونەرمەندانی (هەر هونەرمەندان) ژندا کە بەهاو ڕەهەندە "پیاوانە"کان پیشاندەدەن، بە "ناژن"و لادەرانی نامەعقول لەسروشت تاوانباردەکرێن. لێرەوە پیاوان دەتوانن شوناسی خۆیان لەروانگەی سیفەتی پیاوانەو ژنانەوە پیشانبدەن، بەلاّم ژنان ئەم ئازادیەیان نیەو ئەرکی ئەوان بینینی ڕۆڵی نەگۆڕ و خاوەنداریێتی شوناسە سنوردارەکانی کلتوری پیاوسالارە. من لێرەدا شوناسی "ژن" بەخەسڵەتی بەرکاری (انفعالی) "کۆیلەئاسا" وەك دەستەمۆیی، کەوتویی و سەبرکەر و لەم بابەتە..،دیاریناکەم. وەك چیرۆکی باوبۆ پیشانیدەدات "ژن" ئەو دەسەڵاتەی هەیە کە بە پیشاندانی شەهوەتاوی و دزێوی ژێروژورکەرەوەی تێڕوانینە باوەکان بۆ ژنێتی، بلەرزێنێ و تێکیبدات.

یەکێك لەو نوسەرانەی تەحەدای لکاندنی شوناسە جنسیە نەگۆڕەکان بە ژن و پیاوەوە دەکات، "هیلنە سیکۆس"ە.

ئەویش وەك ئیریگارای لە هەوڵی خۆیدا بۆ ئاشکراکردنی "نوسینی ژنانە" ڕوبەڕوی تۆمەتی خودگەری بایەلۆجیانە بۆتەوە. یەکێك لەگرفتەکانی سیاسەتی رادیکاڵی جنسی لەو ڕاستیەوە سەرچاوەدەگرێت کە "ئەوی دیبوون" هەرگیز لەمێژودا تەحەمولنەکراوە، بەڵکو هەمیشە لەبەردەم هەڕەشەی دەست بەسەراگرتن و تواندنەوەدا بووە. سیکۆس سورە لەسەر ئەوەی داوامان لێبکات بەئاگاداریەوە قسە لەسەر مەسەلەی جیاوازی جنسی بکەین و دەڵێت دەبێ دوالیزمەکانی "پیاو – نێر" و "ژن – مێ" بە بەلاّم و ئەگەر بەکاربهێنین و تێبگەین کە هەموو پیاوان ژنێتی خۆیان سەرکوتناکەن، لە حاڵەتێکدا کە هەندێك لە ژنان تەنها پیاوەتی خۆیان پیشاندەدەن و (بەپێچەوانەوە). کەوابوو (جیاوازی.. لەسەر بناغەی ئەو "ڕەگەزانەی" لە ڕوی کۆمەڵایەتیەوە دیاریکراون، دابەشنابێت)(٣٣). سیکۆس ئەم خاڵە دروست لەبەر ئەوە دەهێنێتە پێشێ کە لەمەترسی کەوتنە ناو داوی تەفسیری خودگەرانەوە، ئاگادارمانبکاتەوە:

"پێشبینی ئەوەی کە جیاوازی جنسی لە زەمەنێکی دیدا (دوسەد یان سێ سەد ساڵی دی؟) بەچ شێوەیەك دەبێت مەحاڵە. بەلاّم نابێت هەڵە بکەین: پیاوان‌و ژنان لە تۆڕێك دەستنیشانکردنی کلتوری دێرینەدا، گرفتار بوون کە بەهۆی ئاڵۆزیانەوە





ڕەنگە لەناونەچن. ناتوانین باسی "ژن" لەبەرامبەر "پیاو"دا بکەین، بێ ئەوەی بکەوینە داوی شانۆگەریەکی ئایدۆلۆژیەوە کە تیایدا فرەیی مەزەنەکان، خەیاڵەکان، ئەندێشەکان، ئەفسانەکان و شوناس وەرگرتنەکان، خەیاڵی هەر کەسێك گۆڕاو و لادەر و بەردەوام دەگۆڕێت و هەر لەپێشەوە هەمووجۆرە چەمك سازیەك بێبایەخ دەکات."(٣٤)

مەبەست چیە؟ سیکۆس ئێمە بانگدەکات بۆ گۆڕانی بناغەیی ڕەفتار و ڕۆڵی و زهنیەت و سیاسەتەکان. گۆڕانێك کە ناتوانرێ کاریگەریەکانی لە ئاسۆی تەنگی ڕوانگەکانی هەنوکەوە ببینرێ. سیکۆس بۆ چاکسازی ڕیشەیی، پەنجە دەخاتە سەر سێ شت: یەکەم: گۆڕانێکی بنەڕەتی لەبونیادەکانی پەروەردەکردندا (گۆڕانێك کە کار دەکاتە سەر بەرهەمهێنان‌و دووبارە بەرهەمهێنانەوەی مانا، ئەفسانەو وێناکردن) دووهەم: ئازادی جنسی بە ئامانجی گۆڕانی پەیوەندی هەر کەسێك بە جەستەی خۆیەوە بە ئاڕاستەی سەلماندنی دوو جنسیەتی و نزیکبوونەوە لە "جیهانی فراوان، مادی، ئۆرگانیکی و هەست پێکراوی کە ئێمەین". و سێهەم: گۆڕانی سیاسی دەزگاو بونیادە کۆمەڵایەتیەکان، چونکە بێ گۆڕانی ئابوری سیاسی، هیچ گۆڕانێك لە ئابوری لیبیدۆیدا ناتوانێت دروست ببێت. بە بڕوای سیکۆس لەئەنجامی هەموو ئەمانەدا نە ئەو شتانە دەمێنێتەوە کە ئێمە ئەمڕۆ بە ناونیشانی "پیاوانە" و "ژنانە"وە دەیان ناسین، نە لۆژیکی جیاوازی لە سنووری دوالیزمی بالادەستی شێوەی نێر سەنتەریانەی بەلگاندن‌و شکڵی پیاوانەی سیاسەتدا، دەمێنێتەوە.

ئەوەی بۆ جێبەجێ بوونی ئەم شتە پێویستە هاتنە ناو دنیاو لەدایکبوونی ئەو شتەیە کە نیتچە ناوی نا سۆپەرمان، مرۆڤگەلێکی نوێ کە مرۆڤی هەنووکەیی ئەم ئاژەڵە نەخۆشەی بەجێهێشتووە. نیتچە فێریکردین "ئێمە دەبێ ببین بەکەسانێك کە هەین" بەوتەی سیکۆس: پیاوان و ژنانێك کە "ئاڵۆز، جوڵەکەرو کراوە"ن. سۆپەرمانەکان کە دەبن بەشتێك کە "هەن"، پیاوان و ژنانێك دەبن کە شوناسیان لە هەموو شتێك تەنانەت لەوەی کە نیتچە دەیتوانی لە تۆفانیترین خەونەکانی خۆیدا بەخەیاڵیدا تێپەڕێ، زیاتر دەڕوات.





## پەراوێزەکان:

*He was, He dreaded This castrated woman.
He was, He dreaded this castrating woman.
He was, he loved this affirming woman.

⋆دەقی نوسینەکەی نیتچە لەو پێشەکیەدا بەم شێوەیەیە "ئاه! ئەم یۆنانیانە چەند ژیانیان دەزانی! ئەم جۆرە ژیانە پێویستی بە ئیرادەی دلێرانەی لەروکەشدا مانەوە هەیە، (پێویستی) بە ئیکتیفاکردن بە پەردە و چارشیو و روکەش هەیە، (پێویستی بە) ستایشکردنی دیار هەیە.." (و. ك)

.١٣٧٥

***1-See James A. Winders. Gender, Theory, and the Canon (Madison:***
University of Wisconsin Press, 1991), PP. 120-3
2-Gilles Deleuze, Nietzche and Philosophy (1962), trans.
H. Tomlinson (London: Athlone Press, 1983).

٣-وەرگێڕانی ئینگلیزی ئەم پارچە دەقە لە بەرگی دوهەمی کۆی بەرهەمەکانی فردریك نیتچەدا، (لندن، ت. ن. فولیس، ١٩١١) دا نیە. دەقی تەواوی ئەم پارچە دەقە لە بەرگی حەوتەمی ئەم کۆمەڵەیەی خوارەوەدا دەتوانین بیبینین:

G. Colli’s and M. Montinar’s Kritische Studienausgabe
(Munich, Berlin/ New York, Deutscher Taschenbuch Verlag,
Walter de Gruyter, 1988), 7 (122), pp. 170-6.

ئەم پارچە دەقە لە بنەڕەتدا فەسڵی سیانزەهەمی ریوایەتی سەرەتای "زانینی تراژیدی" پێکهێناوە. بۆ خوێندنەوەی نەخشەی سەرەتای ئەم پارچە دەقە بڕوانە







کۆی بەرهەمەکان، ٢٧ ص١٣٥.

٤-تێگەیشتنی ئەو خاڵە گرنگە کە کاتێك نیتچە باسی "دەوڵەتی یۆنان" دەکات، مەبەستی "دەولەت"، "نەتەوە یان نەژاد" نیە.

لێرەوەیە کە بۆ نمونە لە یاداشتی ساڵی ١-١٨٧٠ کە لەبەرهەمە بڵاونەکراوەکانی پاش مردنیدا (Nochluss) هاتووە دەڵێت: "بنەمای نەتەوایەتی (Nationaliaenprincip) لە بەراوردکردن بە دەوڵەتشاردا (Studt–Stuat) "تفتیەکی بەربەریانەیە". بڕوانە کۆی بەرهەمەکانی، ٧، ٧ (٣٧)، ص ١٤٧. رەنگدانەوەی قسەکانی نیتچە دەتوانین لەو پارچەیەدا بدۆزینەوە کە نیل ئاشرسۆن لە بڵاوکراوەی Independent on Sunday ٣١ ژانویەی ١٩٩٣ دا لە بارەی نائارامی و ململانێکانی یۆگسلاڤ پێشوەوە نوسیویێتی: "ئێمە وشەیەکمان بۆ وەسفکردنی رەگ و ڕیشەکانی ئەم قەیرانە نیە، بەڵام ئەفسانەکانی ئیمپراتۆرە مردووەکان و ئەفسانە بێ بایەخبوەکانی نەتەوایەتی نەژادیانە دوبارە دەکەینەوە. ئاتنی سەدەی پێنجی میلادی (لە کاری ئێمە) سەری دەسوڕمێ. بۆ ئەو دەوڵەت شار یان پۆلیس بونیادێك بوو نەك پەیوەندیەکی خوێنی.. لەمەش گرنگتر.. ئاتن لە بێ توانایی ئێمە بۆ وەسفکردنی نەتەوەکان بە دەربڕینی مەعقول، و نەك بە دەربڕینێك کە بە خورافات و نیمچە زانست، تەمومژاوی بووە، سەری دەسوڕمێ. چونکە پەرێشانی دنیای نویش، بەر لە هەرشتێك، لەسەری ئێمەدایە".

٥-دوژمنایەتی نیتچە لەگەڵ تیڕوانینی ئەوروپای مۆدێرندا بۆ "ژن" تاڕادەیەك لە شوپنهاوەرەوە وەرگیراوە کە دەنوسێت: "ژنی رۆژئاوایی، واتە "خانم" لە پێگەیەکی درۆزنانەدا راوەستاوە، چونکە ژن بە هیچ شێوەیەك شایانی ئەوە نیە کە بابەتی رێزگرتنی ئێمە بێت و سەری خۆی لە پیاو بڵندتر رابگرێ یان خاوەن ماڤی یەکسان بەو بێت... خانمی ئەوروپی مەخلوقێکە کە لە بنەڕەتدا نابێ بونی هەبێت: ئەوەی دەبێ هەبێ ژنانی ماڵەوەو کچانێکن کە هیوادارن ببن بە ژنی ماڵەوە و هەرلێرەوە پەروەردەکراون نەك بە غرورێکی لوتبەرزانە، بەڵکو بەشێوەیەکی ماڵی و دەستەمۆ. هەر لەبەر بوونی خانمەکانە کە ژنانی ئەوروپی بێ پایەو پلە کەدەبێ بوترێ زۆرینەی ئەم رەگەزە پێکدەهێنن، زۆر نابەختەوەرترن لە ژنانی رۆژهەڵات" وەرگیراوە لە:

Essays and Aphorisms, trans. R. J. Hollingdale (Middlesex: Penguin, 1970), p. 87.
6-Rosalyn Diprose, 'Nietzsche, Ethics, and Sexual Difference' , Radical Philosophy, 52 (summer 1989), pp. 27-33, p.31.
7-Ibid.
8-Ibid., p. 32.
9-Jacques Derrida, Spurs. Nietzsche's Styles, trans . B. Harlow (Chicago: University of Chicago Press, 1979), p. 65.
10-Ibid., p. 55.
11- Ibid., p. 101.
12-Kelly Oliver. "Woman as Truth in Nietzsche's Writing", Social Theory and Practice, 10:2 (1984), 185-99, at 187.
13- Ibid., p. 188.
14- Ibid., p. 193.
15- Ibid., p. 195.
16- Ibid., p. 196.
17-Winders, Gender, Theory, and the Canon, p. 121.
18-Derrida. Spurs, p. 107.
19-Kelly Oliver. "Nietzsche's Woman: the Poststructuralist Attempt to do away with Women' , Radical philosophy, 48 (Spring 1988); 25-9.
20-Rosi Braidotti, "The Ethics of Sexual Difference: the Case of Foucault and Irigary' Australian Feminist Studies, 3 (1986), 1-13, at 2.
21-Adrian Del Caro, "the Pseudoman in Nietzsche, or the Threat of the Neuter', New Gennan Critique, 50 (Spring/ Summer 1990), 133-56, at 145.
22- Ibid., p. 156.
23-Sarah Kofman, "Baubo: Theological Perversion and Fetishism', trans. T. B. strong, in T. B. Strong and M. A. Gillespie (eds.), Nietzsche's New Seas (Chicago: University of Chicago Press, 1988), pp. 175-202. at p. 197.







24- Ibid.
25-See Toril Moi, Sexual / Textual Politics (London: Routledge, 1988), pp. 127-50 for such a critique of Irigaray.
26-Luce Irigaray, Speculun of the other Woman (1974), trans. G. C. Gill (New York: Columbia university Press, 1985), p. 224.
27-Luce Irigaray, Marine Lover of Friedrich Nietzsche, trans. G. C. Gill (New York: Columbia University Press, 1991), p. 25.
28- Ibid., p. 23.
29- Ibid., p. 34.
30-See Peter Sloterdijk, "Eurotaoism', in Tom Darby et at. (eds.), Nietzsche and the Rhetoric of Nihilism (Ottowa, Ontario: Carleton University Press, 1988), pp. 99-116, at 110-11.
31- Ibid., p. 110.
32-Diana Coole, Women and Political Theory (Brighton: Harvester Press, 1988), p. 3.
33-Helene Cixous and Catherine Clement, The Newly Born Woman, trans. B. Wing (Minneapolis: University of Minnesota Press, 1986), p. 81.
34- Ibid., p. 83.

*ئەم وتارە فەسڵی نۆهەمی ئەم کتێبەی خوارەوەیە:
کیت ئانسل پیرسون: هیچ انگار تمام عیار. ت: محسن حکیمی –انتشارات گجستە.
چاپ اول

## ئایا بیرکردنەوە بە ڕاستی گرنگە:

پاش هەڵبژاردنی فەرانسوا میتران بە سەرۆکایەتی کۆماری فەرەنسا لە ۱۹۸۱دا، دیدیە ئەریبۆن (Didier Eribon) کە پاشتر ژیاننامەی میشل فۆکۆی نوسی، لە

لایەن ڕۆژنامەی فەرەنسی لیبراسیۆنەوە، چاوپێکەوتنێکی لەبارەی دەرئەنجامی هەڵبژاردن و مەسەلەکانی کۆمەڵگای فەرەنسی و دەوری ڕۆشنبیران، لەگەڵدا سازکرد کە لەژمارەکانی ٣٠ و ٣١ی مەی ١٠٨١ی ئەو ڕۆژنامەیەدا بڵاوکرایەوە، وەرگێڕانی بەشێك لەو چاوپێکەوتنە دەخەینە بەرچاوی خوێنەر.

**عزت الله فولادوند**

ئەریبۆن: پێدەچێت شێوەیەکی تازە بۆ حکومەتکردن لە دوروستبووندا بێت؟

فۆکۆ: بەڵێ، ئەمە خاڵێکی گرنگە کە ئەمڕۆ یەکەمجارە بەهۆی هەڵبژاردنی میترانەوە دەردەکەوێت، بە بڕوای من زوربەی تاکەکان هەستدەکەن ئەم هەڵبژاردنە جۆرێك سەرکەوتنەو پەیوەندی نێوان حوکمڕان و حوکمکراوان دەگۆڕێت، نەك بەو مانایەی کە خەڵکی حوکمکراو جێگەی ئەو کەسانە بگرنەوە کە حوکمدەکەن، چونکە ئەوەی هاتۆتە پێشێ، جگە لەشێوەیەکی جێگۆڕکێی دەسەڵات هیچی دی نیە. بەڵام ئەمڕۆ ئێمە دەچینە قۆناغێکەوە کە تیایدا حیزب حوکمدەکات، بە هەموو ئەو مەترسیانەوە کە ئەمکارە لەخۆی گرتووەو هەرگیزیش نابێت ئەم مەترسیانە فەرامۆشبکەین.

بەڵام دواجار ئەو مەسەلەیەی ئەم گۆڕانکاریە تازەیە دەیهێنێتە پێشێ، ئەوەیە ئایا ئەگەری ئەوە هەیە پەیوەندیەکی تازە لە نێوان ئەو کەسانەی حوکمدەکەن و ئەو کەسانەی حوکمکراون دروستببێت. پەیوەندیەك کە بنەماکەی نەك فەرمان و ملکەچی، بەڵکو کارکردن بێت؟

ئەریبۆن: مەبەستان ئەوەیە ئایا ئەگەری کارکردن لەگەڵ ئەم حکومەتەدا بوونی دەبێت؟

فۆکۆ: ئێمە دەبێ خۆمان لەو دوڕیانە ڕزگار بکەین کە هەردوکیان بە بنبەستمان دەگەیەنن: یان لایەنگری کەسێك دەبین، یان دژی دەبین. نابێ لە بیرمان بچێت کە دەتوانین لە بەرامبەر حکومەتدا هەڵوێستێکمان هەبێت و هەڵوێستەکەشمان بپارێزین. کارکردن لەگەڵ حکومەتدا نە بەمانای ملکەچیەو نە بەمانای قبوڵکردنی کامڵ. کەسێك دەتوانێت لەگەڵ حکومەتدا کاربکات و لە هەمانکاتدا نائارام بێت و سەرسەختیش بکات، من تەنانەت بڕوامویە ئەم دوانە پێکەوەن.







ئەریبۆن: کەوابوو بەمشێوەیە پاش ئەوەی ماوەیەکی زۆر میشل فۆکۆمان وەك ڕەخنەگرێك بینیووە، ئایا ئێستا دەبێت لە جلوبەرگی ریفۆرمیستدا ببینین؟ ئەوەمان لەیاد بێت کە ئەو ڕەخنەیەی زوربەیجار دەگیرێت ئەوەیە کە ڕەخنەکانی ڕۆشنبیران بە هیچ ناگات؟

فۆکۆ: سەرەتا با وەڵامی ئەوە بدەمەوە کە "بە هیچ شوێنێك ناگات". بۆ ئاشکرا بوونی ئەو مەسەلانەی ئەمڕۆ لەدەستوری کاردایە، سەدان و بگرە هەزاران کەس زەحمەتیانکێشاوە. کەوابوو هەڵەیە گەر بڵێین ئەم هەموو کارو زەحمەتە، هیچ دەرئەنجامێکی نەبووە. ئایا پێتانوایە بیست ساڵ پێش ئێستا کەس بیری لە مەسەلەگەلێکی وەك پەیوەندی نەخۆشی دەرونی و بارودۆخی ئاسایی دەرونی، یان مەسەلەی زیندانەکان یان مەسەلەی ئەو دەسەڵاتەی پزیشك پراکتیکیدەکات، یان مەسەلەی پەیوەندی ژن و مێردو ئەم بابەتەشتانە دەکردەوە؟. لەمە تێپەڕێ، ریفۆرمی خۆبەخۆ بوونی نیە. ریفۆرم لە هەوادا و سەربەخۆ لەریفۆرمیستەکان بوونی نیە. ناکرێ حساب بۆ ئەو کەسانە نەکرێ کە ئەرکی ئەنجامدانی گۆڕانکاریەکانیان لە ئەستۆدایە. لەمانەش گرنگتر بەبڕوای من دەشێ لە نێوان ڕەخنەو گۆڕان و ڕەخنەی "ئومێداوی" و گۆڕانی "واقیعدا" بە یەکگەیشتنێك هەبێت.

ڕەخنە ئەوە نیە بڵێین هەلومەرج بەوشێوەیەی کە هەیە دروست نیە. ڕەخنە ئەوەیە کە بە بیربهێنینەوە ئەو شێوەو کارانەی کە قەبوڵمانە، لەسەر چ شتگەلێك دامەزراون کە بێ سێ و دوو بە بەڵگەنەویست وەرگیراون، لەسەر بناغەی چ شێوە بیرکردنەوەیەکی باو و هەڵنەسەنگێنراو دامەزراون کە هیچکەس گومانیان لێناکات.

ئێمە دەبێ خۆمان لەو کۆتە ڕزگاربکەین کە پیرۆزی بە کۆمەڵگا وەك تاکە واقعێکی هەبوو ببەخشین، و فکریش ئەوەندە لەژیانی مرۆیی و پەیوەندیە مرۆییەکاندا گرنگە، بەشتێکی زیادە بزانین. فکر بەدەر لە سیستەم و بونیادەکان بونێکی سەربەخۆی هەیە. فکر بە چاو نابینرێت و شاراوەیە، بەڵام ئەوەی دەبێتە هۆی ڕەفتاری ڕۆژانەمان، جگە لە فکر هیچیدی نیە. تەنانەت لە هەماقەتترین داب و نەریت و گەمژانەترین خەسڵەتەکان و بێدەنگترین عاداتەکانیشدا، هەمیشە کەمێك فکر هەیە. ڕەخنەگرتن بە مانای ئەوەیە هەمان ئەو فکرە لە کون بهێنینە دەرێو

هەوڵبدەین بیگۆڕین، بە مانای ئەوەیە کە پیشانیبدەین مەسەلەکان بەوشێوەی کە دەزانرا بەدیهی و بەڵگەنەویست نین، بەمانای ئەوەیە چاومان بکەینەوەو ببینین ئەوەی کە ئەمڕۆ قبوڵدەکرێ، لەبەر ئەوەی بەبەدیهی و بەڵگەنەویست دەزانرێ، چیدی قبوڵناکرێ لەبەرئەوەی چیدی بەبەدیهی و بەڵگەنەویست نازانرێ. ڕەخنەگرتن واتە ئەوەی کارێکبکەین کە ئەو بزاوتانەی ئەمڕۆ سادەو ئاسان ئەنجامدەدرێن، چیدی بە ئاسانی ئەنجامنەدرێن.

لەم هەلومەرجەدا ڕەخنەگرتن (ڕەخنەگرتنی توندو ریشەیی) لەڕووی هەر جۆرە گۆڕانکاریەکەوە زەرورەتێکی ڕەهای هەیە، گۆڕان کە لەسنوری شێوەی فکری پێشوو تێنەپەڕێت، گۆڕانێك کە تەنها وەك شێوازێك بۆ گونجاندنی زیاتری هەمان بیروڕای هەمیشەیی لەگەڵ واقعی هەبوودا بێت، جگە لە گۆڕانێکی روکەشی هیچیدی نیە.

لەلایەکی دیەوە هەر ئەوەندەی نەتوانیت بە هەمان شێوەی رابردووەوە بیر لە شتەکان بکەیتەوە، مەسەلەی گۆڕان دەبێ بە شتێکی هەنوکەیی و لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەستەمە، بەڵام قابیلی ئەنجامدانە.

کەوابوو راست نیە سەردەمێك کاتی ڕەخنەگرتن بێت و سەردەمێکێش کاتی گۆڕان. یان کەسانێك خۆیان بۆ ڕەخنەگرتن تەرخانبکەن و کەسانێکی دیش بۆ ئەنجامدانی گۆڕانکاری، یان کەسانێك هەڵوێستی توندو سەرسەختانە وەربگرن و هیچکەس لە نێوان خۆیاندا جێنەکەنەوەو کەسانێکیش ناچاری سازشکردنی ناچاری بن لەگەڵ واقعدا، لە راستیدا بەبڕوای من گۆڕانکاری قوڵ تەنها لە فەزای ئازادا مومکینە، فەزایەك کە ڕەخنەگرتنی بەردەوام پاڵی پێوەبنێت.

ئەریبۆن: بەڵام ئایا بڕواتانوایە روشنبیر دەبێ دەورێکی بەرنامەیی لەم گۆڕانکاریانەدا ببینێ؟

فۆکۆ: ریفۆرم هەرگیز تەنها دەرئەنجامی ناکۆکی و روبەڕوبونەوەو خەباتی و بەرگری نیە.. ئەوەی یەکێك سەرەتا لە خۆی بپرسێ: چ ریفۆرمێك بە من دەکرێ؟ ئەمە بە بڕوای من ئامانجێك نیە کە رۆشنبیر بە دوایدا بگەڕێ. رۆشنبیر بە تایبەتی لە بواری فکردا کاردەکات و لەبەر ئەوە دەبێ ببینێ کە ئازادکردنی بیرەکان تا کوێ دەتوانێت ئەوەندە مەسەلەی گۆڕان بکات بە شتێکی هەنوکەیی کە خەڵك بیانەوێت





ئەو گۆڕانکاریانە بکەن بەشتێکی فعلی و تا کوێ دەتوانێت ئەنجامدانی گۆڕانکاری بۆ خەڵك گرانبکات، بۆ ئەوەی گۆڕان ڕەگێ قوڵ لەواقعدا بۆ خۆی داکوتێت.

دەبێ ناکۆکیەکان بخرێنە بەرچاو، دەبێ سەرنج بۆ ئەوە راکێشرێ کە ئەم ناکۆکیانە بنەڕەتیترە لە پێکدادانی بەرژەوەندیە رووت یان بێ جوڵەی دەزگاکان. لە ناوجەرگەی ئەم ناکۆکی و پێکدادانەدا دەبێت پەیوەندیگەلێك لەبواری دەسەڵاتدا بێتە ئاراوە کە یەکەم دەرکەوتنی روکەشیی بریتە لە ریفۆرمەکان، ئەگەر لە بنەڕەتدا فکر لەسەرخۆی کاری نەکردبێت، گەر شێوەی بیرکردنەوەکان، واتە شێوەی ڕەفتارەکان بە راستی نەگۆڕابێت، ئەوا دەزانین کە بەرنامەی ریفۆرمەکان هەرچیەك بێت، غەرق دەبێت و هەمان ئەو ڕەفتارو خەسڵەتانەی کە هەمیشە هەبوون، ئەو بەرنامەیە قوتدەدەن و هەرسیدەکەن.

ئەریبۆن: ئێوە بەشداریتان لە چەند بزوتنەوەیەکدا کردووە، بەڵام لەم ماوەیەدا کشاونەتە دواوە، ئایا هەنوکە دەتانەوێت جارێکی دی لەمجۆرە بزوتنەوانەدا بەشداریبکەن؟

فۆکۆ: من هەر کاتێك ویستومە کارێك لە بواری تیوریدا بکەم، بناغەکەی ئەزمونی شەخسی خۆم بووە، ئەوکارە پەیوەندی هەبووە بەو روداوانەی لە دەوروبەمدا بینیومە. لەبەرئەوە سەرقاڵی فلان لێکۆڵینەوە بووم، چونکە بەمەزەنەی خۆم لەو شتنای کە بینیومە یان ئەو دەزگایانەی سەروکارم لە گەڵیاندا بووە یان لە پەیوەندیمدا بەکەسانی دیەوە، چەند درزو شکستگەلێك و کەموکوڕیەکم بەدیکردووە.. کارەکانم هەمیشە وەك پارچەکانی ژیاننامەی منن کە بە قەڵەمی خۆم نوسراون. من لەو چالاکانە نەبووم کە لە پێکدادان کشاومەتە دواوەو هەنوکە دەبێ بگەڕێمەوە بۆ خزمەتکردن، شێوەی کارکردنی من ئەوەندە نەگۆڕاوە، بەڵام چاوەڕێدەکەم کە بەردەوام خۆم بگۆڕێت.

ئەریبۆن: خەڵکی دەڵێن ئێوە بەدیبینن، بەڵام کە گوێ لە قسەکانتان دەگرم دەبینم کە تەنانەت تا ئەندازەیەکیش خۆشبینن.

فۆکۆ: جۆرێك خۆشبینی هەیە کە بریتیە لەوەی بڵێیت هەلومەرجی لەمە باشتر مومکین نیە. بەڵام خۆشبینی من لەوەدایە دەڵێم ئەم هەموو شتانەی کە هەیە گەرچی شکێنەرە، بەڵام زۆرتر ملکەچی هەلومەرج و بارودۆخە تاملکەچی شتێکی

جەبری، زۆرتر خوازراوە تا بەڵگەنەویست و بەدیهی بێت. زۆرتر لقی هەلومەرجی مێژوویی کاتیە، تا بەسترابێت بە مەسەلەی نەگۆڕو سەقامگیرەوە لە رووی ئەنسرۆپۆلۆجیەوە.. راستت بوێت وتنی ئەوەی ئێمە چەندانجار دواکەوتوترین لەوەی کە دەزانین، بە مانای ئەوە نیە هەموو باری مێژومان لە کۆڵ بگرین. بەو مانایەیە کە لەوەی پێشکەشمان دەکرێ و پێمان دەگوترێ کە لە دەرەوەی توانای تێگەیشتنمانە، زۆرترین بەش بۆ کارێك تەرخانبکەین کە بۆخۆمان لە دەستمان دێت.

ئەم چاوپێکەوتنە لەم سەرچاوەیە وەرگیراوە:

عزت الله فولادوند. خرد درسیاست. طرح نو، ص٧٠





## چەند تێکستێکی فکری







## قوتابخانەی فرانکفۆرت، دیدی ڕەخنەگرانە:

## ڕەخنە لەپۆزەتیڤزم و کۆمەڵگای نوێ







**نووسینی: د. حسين بشيريه**

قوتابخانـەی فرانکفـۆرت یـەکێ لـەڕووداوە گـرنگ و کاریگـەرەکانی فکـری سیاسـی ڕۆژئـاوا بـووە. ئـەم قوتابخانەیـە بـەهۆی "دەزگـای لێکۆڵینـەوەی کۆمەڵایەتیـەوە" پەرەیـسەند، کـە وەك دەزگایـەکی سـەربەخۆی زانکـۆی فرانکفـۆرت بـۆ خوێندنـەوەی فکری مارکسی دامـەزرا. دامەزرانـدنی دەزگـای نـاوبراو وەڵامێـك بـوو بـۆ پێداویـستی هەڵسەنگاندنی سـەرلەنوێی مارکـسیزم، بەتایبـەتی لـەبواری پەیوەنـدی نێـوان فکـرو کـاری سیاسـی لەهەلومـەرجی مێـژووی پـاش جـەنگی جیهـانی یەکەمـدا- و لەهەلومەرجێکـدا کـە شۆڕشـەکانی ناوەڕاسـتی ئـەوروپا بەتایبـەتی شۆڕشـی ١٩١٨ لەئەڵمانیا تێکشکابوون.

ئەگەرچی هەندێك لەبیریارانی ئەم قوتابخانەیە برێك لەچەمکە مارکسیەکانیان خستبووە ژێر گومان و پرسیارەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئـەم قوتابخانەیـە دەورێکـی کاریگەری لەبـەهێزکردنی بزوتنـەوەی فکـری مارکـسی ڕۆژئـاوادا بینیـووە، گـرنگترین ئامانجی بیریارە سەرەکیەکانی ئەم قوتابخانەیە، واتـە: مـاکس هۆرکهایمـەر (١٨٩٥-١٩٧١) تیـــودۆرو ئـــادۆرنۆ (١٩٦٩-١٩٣٠) و هربـــرت مـــارکیوز (١٨٩٥-١٩٧٩) بریتیبـــوو لەپێشکەشکردنی تیۆرەی ڕەخنەگرانەو ڕەخنەگرتن لەکلتوورو شـێوەی بیرکردنـەوەی بـۆرژوازی. لـەم ئاراسـتەیەداو بـەهۆی ڕەخنـەگرتنێکی ڕەشـبینانەوە لەپرۆسـەی عـەقلانیبوونی کۆمـەڵگای نـوێ، بـەخێرایی لـەفکری مێـژووی کۆمەڵایـەتی مـارکس دورکەوتنەوەو ڕوویانکردە ڕەخنەگرتن لەکلتوور و ئایدۆلۆژیا وەك هۆکـارێکی گـرنگ بۆ ڕزگاربوون لەدەسەڵات.

خەسڵەتی فەلسەفیانەی تیۆرەی ڕەخنەیی قوتابخانەی فرانکفـۆرت لـەدوو دەیـەی دواییداو بەهۆی بڵاوبوونـەوەی تەفـسیرە بونیادگـەرو مێژووییەکانـەوە بـۆ مارکـسیزم، زیاتر ئاشکرا بووە، "دەزگای لێکۆکڵینەوەی کۆمەڵایەتی" لەسەرەتای دامەزراندنیـەوە تـا سـاڵی ١٩٣٣ لـەژێر کاریگـەری تێڕوانینێکـی تایبەتـدا نـەبوو بـۆ مارکـسیزم و [کارەکـانی] زۆرتـر خەسـڵەتێکی ئەزموونگەریانـەی هـەبوو. لێکۆڵینـەوەکانی "کارویتفیگـل" لـەبارەی شـێوەی ئاسـیای بەرهەمهێنانـەوە کـە دواتـر لـەکتێبی

"دیسپۆتیزمی ڕۆژهەڵاتی"دا بڵاوکرایەوە، لەم ماوەیەی ژیانی دەزگای ناوبراودا ئەنجامدرا. پاش سەرکەوتنی نازیەکان، دەزگا گواستیەوە بۆ وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاو تا ساڵی ١٩٥٠ لەوێ مایەوە.

لەم قۆناغەدا بابەتی سەرەکی فکری فرانکفۆرت بریتیبوو لەرەخنەگرتنێکی فەلسەفی لەسەرمایەداری دوایی و بەها کلتووریەکانی. پاش گەڕانەوەی دەزگاکە بۆ فرانکفۆرت لەساڵی ١٩٥٠دا ئارەزووە فەلسەفی و ستاتیکیەکانی ئادۆرنۆ بەسەر قوتابخانەکەدا، باڵادەستبوو. لەدوای ئەمەوە بیری فرانکفۆرتیەکان لەهەموو جێیەکی ئەوروپاو ئەمەریکادا بڵاوبۆوە. ئەمڕۆ چیدی قوتابخانەی فۆانکفۆرت نەماوە، بەڵام هەندێك لەچەمکە بنەڕەتیەکانی بیرکردنەوەیان لەبەرهەمەکانی یۆرگن هابرماس (بیریاری هاوچەرخی ئەڵمانی) بەشێوەیەکی دی خراونەتەڕوو(١).

لەڕووی ئەبستمۆلۆژیەوە ڕەخنەگرتن و ڕەتکردنەوەی پۆزەتیڤزم و هەموو چەمکێك لە"زانستی کۆمەڵگا"، جێگەیەکی گرنگی لەبیرکردنەوەکانی قوتابخانەی فرانکفۆرتدا داگیرکردووە. بەبڕوای ئەم بیریارانە پۆزەتیڤزم بەشێوەیەکی گشتی بۆ ناسینی واقعی کۆمەڵایەتی نەگونجاو و گومڕاکەرە، و لەبەرئەوەش کە تەنها سەرنج لەوەدەدات کە هەیە، ئەوا بەرگری لەرێکخستنی کۆمەڵایەتی جێگیردەکات و دەبێتە بەربەست لەبەردەم گۆڕانکاریداو [هەروەها] هۆکارێکی گرنگ و کاریگەرە بۆ پاراستنی جۆرێکی تازە لەدەسەڵاتی کۆمەڵایەتی لەسەردەمی سەرمایەداری دوایدا.

بیریارانی ئەم قوتابخانەیە لەبەرامبەر ڕێبازی پۆزتڤیزمدا، بیری فەلسەفی عەقڵ دادەنێن. [عەقڵ بەمانای] توانای تێگەیشتن لەجەوهەری دیاردە کۆمەڵایەتیەکان. ئەم تێگەیشتنە بۆ عەقڵ بەمانا هیگڵیەکەی (کە مەبەستی بیریارانی ناوبراوە) پەیوەندیەکی دەروونی بەئازادیەوە هەیە. لێرەوە بەپێی ئەم تێڕوانینە ناسینی جیهانو دەستنیشانکردنی بەها ڕاستەقینەکان، لەیەك جیانابنەوە. بە دیاریکراوتر بڵێین تیۆرەی دیالەکتیکی لەبەرامبەر پۆزەتیڤزمدا دەهێنەپێشێ، کە بەپێچەوانەی پۆزەتیفزمەوە چەمکەکانی خۆی لەشیکردنەوەی پرۆسەی ئاڵۆزی کۆمەڵگای نوێوە بەبەردەهێنێت. لەکتێبی "دیالەکتیکی ڕۆشنگەری"دا کە لەنووسینی هۆرکهایمەرو ئادۆرنۆیە، ڕەخنە لەپۆزەتیڤزم لەگەڵ تاوتوێکردنی ڕەخنەگرانەی عەقڵانیەتی زانستیو تەکنەلۆژی وەك شێوەیەکی تازەی دەسەڵات لەکۆمەڵگای سەرمایەداری





دوایدا، لێك دەئاڵێن. لێرەوە [واتە لەدیالەکتیکی ڕۆشنگەریدا] بە بڕوای ئەوان هۆی سەرەکی پاراستنی دەسەڵات تەنها پۆزەتیڤزم نیە، وەك فەلسەفەی زانست و بەشێك لەبیرکردنەوەی بورژوازی، [بەڵکو هۆی ئەم دەسەڵاتە] خودی زانست و تەکنەلۆژیاو هۆشیاری تەکنەلۆژی یان "عەقڵئامێری"یە.

ئەمجۆرە تازەیەی دەسەڵات لەکۆمەڵگای سەرمایەداری پێشکەوتوودا چیدی دەسەڵاتی چینایەتی نیە، چونکە بەهۆی گۆڕانە مێژوویەکانەوە پێکهاتەی چینایەتی سەرەکی لەکۆمەڵگای سەرمایەداری پێشکەوتوودا، بەشێوەیەك گۆڕاوە کە چینەکان چیدی بەهۆکاری سەرەکی گۆڕانی سیستەمی کۆمەڵایەتی ناژمێرێن، و هەردوو چینە بنەڕەتیەکە بۆ پاراستنی هەلومەرجی باو یەکیانگرتووە. لەم ڕوانگەیەوە قوتابخانەی فرانکفۆرت لەبەردەم دوو تەفسیری سەرەکی ماتریالیزمی مێژوویدا واتە: مارکسیزمی ئەرسۆزکسیو مارکسیزمی هیگڵی ڕاوەستا. لێرەدا سەرەتا باسی ڕەخنەی ئەم قوتابخانەیە لەپۆزەتیڤزم دەکەین و پاشان تاوتوێی ئەو بیرکردنەوانە دەکەین کە لەمارکسیزمی ئەرسۆزکسیو هیگڵی جیایاندەکاتەوە.

## ڕەخنەگرتن لەتێڕوانینی پۆزەتیڤزم و پێشکەشکردنی دیدی ڕەخنەگرانە

پۆزەتیڤزم کە لەکۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەو سەرەتاکانی سەدەی بیستدا لەسەر بنەمای بیرکردنەوەکانی ئۆگۆست کۆنت وەك بزوتنەوەیەکی فەلسەفی بەهێز سەریهەڵدا، بڕوایوابوو زانست تەنیا زانینێکی جێی باوەڕە کە هەیە، و ڕووداو و دیاردەکانیش تەنها بابەتی شیاوی زانینن. پۆزەتیڤزم نکوڵی لەبوون یان قابیلی تێگەیشتنی ئەو هێزو جەوهەرانە دەکات کە دەکەونە میتازانستەوە، و لەبەرئەمەش دژی هەموو شێوەیەکی میتافیزیك‌وهەمووجۆرە میتۆدێکی لێکۆڵینەوەی دیە جگە لەمیتۆدی زانستی. وەك دەزانین ڕەگ و ڕیشەی ئەم بیرکردنەوەیە دەگەڕێتەوە بۆ فرانسیس بیکۆن و ئەزمونگەرە ئینگلیزیەکان.

کۆنت لەژێر کاریگەری ئەم نەریتە فکریەدا، بڕوایوابوو گۆڕان و پێشکەوتن بەسێ قۆناغدا تێدەپەڕێت: قۆناغی ئەفسانەیی، قۆناغی میتافیزیك و قۆناغی پۆزەتیڤزم. خەسڵەتی قۆناغی سێهەم وازهێنانە لەگەڕان بەدوای هۆی ئامانجی [علل





غائی] شتەکان و سەرنجدانە لەدۆزینەوەی یاسای دیاردەکان. بە بڕوای کۆنت ئەم سێ قۆناغە، قۆناغەکانی گۆڕانی مێژووی مرۆڤایەتیو پەرەسەندنی هزری تاکەکەسیو هەروەها قۆناغەکانی پەرەسەندنی هەر لقێکی زانستەکانن. بیرۆکەی یاسای پەرەسەندنی سێ قۆناغیو وێناکردنی زانست وەك وەسفکردن و پێشبینی، کاریگەریەکی سەرەکی کردە سەر فەلسەفەی زانست. پۆزەتیڤزم لەڕووی مێژوویەوە لەناو جەرگەی ئەو خۆشبینیەوە پەیدابوو، کە سەرکەوتنەکانی شۆڕشی پیشەسازی و متمانەکردن بە عەقڵی مرۆڤ هێنایە ئاراوە، و پرۆژەیەکی گشتی پێشکەش بەژیانی مرۆڤ کرد.

بە بڕوای پۆزەتیڤزمەکانی وەك کۆنت فەلسەفەی پۆزەتیڤزم دەتوانێ لەسەردەمی ڕمانی بنەما تەقلیدیەکانی کۆمەڵگادا، بنەمایەکی تازە بۆ دروستبوونی سیستەمێکی سیاسیو ئەخلاقی دەستەبەر بکا. زانست دەبێتە دەسەڵاتی "ڕۆحانی" کۆمەڵگای نوێو پیشەسازیش دەبێتە دەسەڵاتی "نارۆحانی" کۆمەڵگا. لەکۆتایی پرۆسەی ناچاری پێشکەوتندا "سۆسیۆکراسی" کە هەمان حکومەتی زانست و فەیلەسوفانی پۆزەتیڤزمە(٣)، پەیدادەبێت.

ڕێبازی پۆزەتیڤزم لەکۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەدا شێوەیەکی ڕەخنەگرانەی لەبیرکردنەوەکانی ئەرنست ماخدا بەخۆیەوە وەرگرت و ناونرا "ئیمپریوکریتیسیزم". بەبڕوای ماخ ڕووداو و شتەکان کۆمەڵێکی پێکەوە گرێدراوی ژیانن و لەبەرئەمەش لەنێوان حسیاتی فیزیای و دەروونناسیدا، جیاکردنەوەیەکی واقعی بوونی نیە. هەرشتێك کۆمەڵێکە لەژیان و زانست تەنها هۆکارێکە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی لەگەڵ زۆری ژیاندا. بەبڕوای ماخ حسیات کۆمەڵێك ڕەگەزی بێلایەنن کە هەموو هەقیقەت و ڕووداوەکانی جیهان دروستدەکەن.

بیرکردنەوەکانی ماخ سەرچاوەی ڕێبازی پۆزەتیڤزمی لۆژیکی یان بیرکردنەوەکانی ئەلقەی ڤێنا بوو کە کەوتە بەر هێرشی ڕاستەوخۆی قوتابخانەی فرانکفۆرت. ئەڵقەی ڤێنا لەدەیەی ١٩٢٠دا چالاکبوو. دەبێ بۆ بیریارە بەناوبانگەکانی ئەم ئەڵقەیە، ناوی مۆریتس شلیك وڕودلف کارناپ بهێنین. ئەڵقەی ڤێنا بەتایبەتی لەژێر کاریگەری بیرکردنەوە فەلسەفیەکەی لۆدڤیك فینگشتایندا بوو. بەبڕوای ئەڵقەی ڤێنا مانای حوکمێك کۆمەڵە ئەزموونێکە کە هەقیقەتی ئەو حوکمە







پێکدەهێنێت. بیریارانی ئەم قوتابخانەیە هەوڵیاندەدا زانست لەهەموو ڕەگەزە میتافیزیکیەکان جیابکەنەوەو بە نەفیکردنی هەموو پرسیارە فەلسەفیەکان جا چ میتافیزیکی یان ئەخلاقی یان ئەپستمۆلۆژی، بواری زانست وەك بواری سەرجەم هەقیقەت رابگەیەنن. لەتێڕوانینی ئەواندا میتافیزیك لەبەر ئەوە قبوڵناکرێت، چونکە حوکمەکانی لەسەرجەمدا بێمانایە، چونکە ئەگەری سەلماندنیان لەئەزموندا نیە. هەروەها ئەوان نکووڵیان لەبوونی ئەخلاقێکی باڵاو بان مێژوویی دەکرد. هەموو هەوڵێکیشیان بۆ ناسینی بواری بەهاکانی ئەودیو جیهانی ئەزمونیان، ڕەدئەکردەووە. بۆنموونە بەبڕوای کارناپ حوکم و مەسەلە ئەخلاقیەکان لەبنەڕەتدا حوکم نین، بەو مانایەی خاوەن مانای ئیدراکی نین و بە پێچەوانەی زانستەوە کە هوشیاری دەبەخشێ، زانیاری لەبارەی بوونی شتێکی تایبەتەوە پێشکەشناکەن. بەکورتی بیریارانی ئەڵقەی ڤێنا سەبارەت بەمەسەلەی جیاوازی زانست لەمیتافیزیك و ئەخلاق، مەسەلەی جیاوازی حوکمە مانادار و بێماناکانیان هێنایە پێشێو بڕوایانوابوو کە سەلماندنی ئەزموونیانە مەرجی پێویستە بۆ سەلماندنی مانادار یان زانستی بوونی حوکمێك. هەروەها بڕوایان بە یەکپارچەیی زانستی هەبوو. [لێرەوە] دوالیزمی "دەروونناسی" و فیزیایان ڕەددەکردەوە، بەو مانایەی یەکێکیان جیهانی دەروون و ئەوی دیان جیهانی دەرەوە ئاشکرادەکات و وایاندەزانی کە ئەو دوو زانستە هەردووکیان پێکەوە ئەزموونگەلێك وەسفدەکەن. بەم مانایەش بابەتی زانست لەناو ئەزمونداِیە(٤).

تێڕوانینی بیریارانی قوتابخانەی فرانکفۆرت بۆ ڕێبازی پۆزەتیڤزم وەك تیۆرەیەکی زانین و فەلسەفەی زانست، چوونیەك و یەکسان نەبووە. هربرت مارکیوز لەکتێبی "عەقڵ و شۆڕش"دا (ساڵی ١٩٤١) هێرشیکردە سەر ڕێبازی پۆزەتیڤزمی ئۆگست کۆنت و بەتیۆرەیەکی دژ بەشۆڕش و پەرچەکردارێکی دانا دژ بە عەقلانیەتی ڕەخنەگرانە. بەبڕوای مارکیوز فەلسەفەی پۆزەتیڤزم لایەنگری ئەوەیە خوێندنەوەی کۆمەڵگا یەکسانبکات بەخوێندنەوەی سروشت. بە پێی بنەمای دیدی پۆزەتیڤزم خوێندنەوەی کۆمەڵایەتی دەبێ یاساگەلێك بدۆزێتەوە، کە بایەخیان وەك بایەخی یاسا فیزیایەکان بێت. بە بڕوای مارکیوز زانستێك کە بە دوای دۆزینەوەی یاساکانی کۆمەڵگادا دەگەڕێ، ڕێگرێکی سەرەکی بۆ کارو گۆڕانکاری کۆمەڵایەتی

دروستدەکات. لەبەرامبەر ئەمەدا مارکیوز لەسەر بنەمای تیۆرەی کۆمەڵایەتی دیالەکتیکی خۆی، جیاکاری لەنێوان خواستە درۆزنەکان کە بابەتی زانستی پۆزەتیڤزمەو خواستە راستەقینەکان دەکات کە بابەتی ناسینی عەقڵانیە وەك دوو ڕووبەری بوونی کۆمەڵایەتی(٥).ماکس هورکهایمەر لەبەرهەمە سەرەتاییەکانی خۆیدا هێرشیکردە سەر ئەو مانایەی ڕێبازی پۆزەتڤیزم، کە لەئەڵقەی ڤێنادا پێشکەشکرابوو. وەك گوتمان بیریارانی ئەڵقەی ڤێنا بەهێنانە ئارای بیرکردنەوەی (زانستی یەکپارچە) لایەنگری میتۆدێکی زانستی هاوبەشبوون بۆ زانستە سروشتیەکان و زانستە کۆمەڵایەتیەکان. لەبەرامبەر ئەمەدا هۆرکهایمەر بیرکردنەوەی "فەلسەفەی کۆمەڵایەتی" هێنایە ئاراوە، وەك سەرچاوەی سەرەکی پرسیارگەلێك کە دەبێ بەهۆی زانستە کۆمەڵایەتیە جیاوازەکانەوە بهێنرێتەئاراوە. بەبڕوای هۆرکهایمەر "فەلسەفەی کۆمەڵایەتی" چوارچێوەیەکی ئەبستمۆلۆژی تەواو دروستدەکات، کە تیایدا سەرجەم واقعی کۆمەڵایەتی دەخرێتە ژێر سەرنجەوە.

بەبڕوای هۆرکهایمەر لەڕوانگەی کۆمەڵناسی زانینەوە، پەیوەندیەکی نزیك لەنێوان شێوەی بیرکردنەوەو هەلومەرجی گرووپە کۆمەڵایەتیەکاندا هەیە. بەم پێیە دەبێ بۆ رەگوریشەی ڕێبازی پۆزەتیفزم بەناو هەلومەرجی نالەباری کرداری [فعلی] چینی ناوەڕاستدا بگەڕێین. بەبڕوای هۆرکهایمەر سەرجەم سیستەمی ئەمپریسیزمی نوێ سەر بەجیهانی لیبرالیی لەحاڵەتی گواستنەوە (یان تێپەڕین)دایە. هۆرکهایمەر لەرەخنەگرتنی ڕێبازی پۆزەتیڤزمدا وەك تیۆرەیەکی زانین، بڕوایوابوو ئەم ڕێبازە مرۆڤ لەناو نموونەی ئامێرئاسای خۆیدا لەریزی روداوەو شتەکان دادەنێتو بەمشێوەیەش جیاوازی بنەڕەتی نێوان زانستە کۆمەڵایەتیو زانستە سروشتیەکان دەسڕێتەوە.

هەروەها ڤوتابخانەی پۆزەتیفزم جیهان وەك چۆن لەئەزموندا بێ هیچ ناوەندێك ئاشکرا دەبێت، وێنادەکات و خواست و نیازە واقعیو ڕۆژانەیەکان لەیەك جیاناکاتەوە. ڕێبازی پۆزەتیفزم دەبێتە هۆی کۆکردنەوەو ئەرشیفکردنی حەقیقەتە تاك و پەرشوبڵاوەکان لەناو دەریای روداوەکاندا، ئەمە لەکاتێکدا تێگەیشتنی دروستی کۆمەڵگا پێویستی بەبوونی تیۆرەیەکی دروست و دۆزینەوەی تیۆرەیەکی دروستیش پێویستی بەخواست و ئیرادەیەکی دروستە.





هەروەها ڕێبازی پۆزەتیفزم جیاکاریەکی رەها لەنێوان شتی واقعی و بەهاکاندا دەکات و بەمپێیەش زانست و ناسین لەخواست و پەیوەندیە مرۆییەکان جیادەکاتەوە. "دیدی دیالەکتیکی" لەبەرامبەر ڕێبازی پۆزەتیفزمدا بەدوای ناسینی واقعیەت لەهەمەکی خۆیدایە و بەشە پەرشوبڵاوەکانی ئەزموون لەناو بنەمای گشتی ئەزموونی مرۆڤدا دادەنێت. کاتێك ئێمە لەم دیدەوە وەك بوونەوەرێکی چالاك وێنای هەلومەرجی نالەباری جیهان دەکەین، ئەوا ئارەزووی گۆڕینی دەبێ بە بنەمایەکی رێنمایکەر کە بەهۆیەوە هەقیقەتە هەبووەکان رێکدەخەین و لەچوارچێوەی تیۆرەیەکیشدا فۆرمەلەی دەکەین(٦).

هۆرکهایمەر بەمشێوەیە جیاوازی دەکات لەنێوان "دیدی تەقلیدی" و "دیدی رەخنەگرانە"دا. دیدی تەقلیدی دیدی زانستە سروشتیەکانە کە لەفەلسەفەو زانستە کۆمەڵایەتیەکاندا لەشکڵی ڕێبازی پۆزەتیفزمدا دەرکەوتوە. بەهۆی بڵاوبوونەوەی ئەم دیدەوە، زانستە کلتووری و مرۆییەکان بووە بە پاشکۆی زانستە سروشتیەکان. لەبەرامبەر ئەمەدا دیدی رەخنەگرانە لەزانستە مرۆییەکاندا جەخت لەوە دەکات، کە هەقیقەت و مەسەلەکان "دەرەکی" نین و شێوازی دیاریکردنی هەقیقەتە بابەتیەکان لەڕوانگەیەکی دەرەکیەوە شتێکی راست نیە. هۆرکهایمەر لەڕووی دارشتنی چەمکەکانەوە جیاوازی لەنێوان دیدی تەقلیدیو دیدی رەخنەگرانەدا دەکات. بەو مانایەی دیدی تەقلیدی دەست بە پۆلێنی لۆژیکی چەمکەکان بە شێوەیەکی دژایەتی هەڵنەگرو وەستاو دەکات و چەمکەکانیش بەوشێوەیە بەبەردەهێنێت(ئیستنتاج دەکات). بەپێچەوانەوە دیدی رەخنەگرانە بۆ تێگەیشتن لەکۆمەڵگای نوێ، چەمکەکان لەشیکردنەوەی رەوتی ئاڵۆزی ئابووری ئاڵوگۆڕەوە بەردەهێنێت. کەوابوو چەمکەکانی دیدی رەخنەگرانە جگە لەکۆمەڵێك چەمکی کورتکراوەو سادە بۆ یاسارێژکردنی واقعیەتی ئاڵۆز هیچیدی نیە، ئەگەرچی هەردوو دیدی تەقلیدیو رەخنەگرانە بەشێوەیەکی ئەبستراکتانە چەمکەکانیان بەردەهێنن، بەڵام رەوتی ئەبستراکتو بەرهێنان لەتیۆرەی رەخنەگرانەدا خۆی رەوتی ئەبستراکتی کۆمەڵگایەك دووبارە بەرهەمدێنێتەوە کە لەسەر بناغەی بەرهەممهێنانی ئاڵوگۆڕ دامەزراوە(٧).

ئەو جیاوازیەی هۆرکهایمەر لەنێوان دیدی تەقلیدیو رەخنەگرانەدا دەیکات،





لەسەر بناغەی تێڕوانینێك بۆ زانست راوەستاوە، كە زانست وەك چالاكیەكی كۆمەڵایەتی سەیردەكات. لەتێڕوانینی هۆركهایمەردا دیدی تەقلیدی بناغەی چالاكی كۆمەڵایەتی زانایان و حەكیمە تەقلیدیەكان لەناو سیستەمی دابەشكردنی كاری كۆمەڵایەتیدا بووە، كە لەپاڵ چالاكیە كۆمەڵایەتیەكانی دیدا روویداوە، بەڵام پەیوەندیەكی ئاشكراو روونی لەگەڵیاندا نەبووە. كاری كۆمەڵایەتی فەیلەسوفی رەخنەگر بە پێچەوانەی زانای بۆرژوازیەوە ئەوەیە كارە فكریەكانی یەكێتیەكی دینامیكی لەگەڵ ئارەزووی چینە سەركوتكراوەكانی كۆمەڵگادا پەیدا دەكات، بەشێوەیەك كە پێشكەشكردنی دژایەتیە كۆمەڵایەتیەكان بەهۆی ئەوەوە نەك تەنها بۆ دەربڕینی هەلومەرجێكی بابەتی مێژووییە، بەڵكو وەك هێزێكە لەناو ئەو هەلومەرجەدا بۆ دروستكردنی گۆڕانكاری. بەمشێوەیە هۆركهایمەر هەوڵدەدات لەنێوان ناسین و ئامانج و نێوان عەقڵی تیۆری‌و عەقڵی پراكتیكیدا یەكێتیەك دروستبكات و هەر ئەم بیركردنەوەیەش خۆی یەكێكە لەخەسڵەتە سەرەكیەكان بیركردنەوەی فرانكفۆرتیەكان(٨).

تیۆدرۆ ئادۆرنۆ دیدی فەلسەفی سەرەتایی خۆی كە بەمانای رەخنەی هەموو تێڕوانینە فەلسەفی و تیۆرە كۆمەڵایەتیەكان بوو، ناوناوە "دیالەكتیكی نیگەتیف" و نكوولێیش لەئەگەری وەرگرتنی هەموو خاڵی دەرچوونێكی رەهاو بنەماو بناغەی ئامانجی (اساس غائی) بۆ بیركردنەوەی مرۆڤ دەكات. ئادرنۆ بەپێچەوانەی هۆركهایمەرەوە هیچ مەیلێكی بۆ شیكردنەوەی ئابووری‌و تیۆرەی چینایەتی ماركس پیشاننەداو نكوڵی لەئەگەری تیۆرەكانی زانستی مێژوودەكرد. لەبەرئەمەش سەرقاڵی رەخنەی هۆشیاری چینایەتی بۆرژوازی بوو.. بابەتی سەرەكی دیالەكتیكی رۆشنگەری" كە هۆركهایمەر و ئادۆرنۆ پێكەوە نووسیان، رەخنەی كلتووری بوو. لەو كتێبەدا كە دواتر زیاتر رونیدەكەینەوە، مێژووی شارستانی لەبنەڕەتدا بە شێوەیەكی فیبەریانە، وەك پێشكەوتنی دەسەڵاتی عەقڵئامێزی دەخوێنرێتەوە كە لەپرۆسەی بەرهەمهێنانی كۆمەڵایەتیدا، لەبواری رەفتارو كاری كۆمەڵایەتیدا رەنگدەداتەوە.

كۆمەڵگای نوێ بەهۆی ئەو روونیە درۆزنەی بەرهەمی بڵاوبوونەوەی فەلسەفەی پۆزەتیڤزمی زانستە، توشی دارمانێكی كلتووری بەربڵاوبووە. ئەگەرچی ئادۆرنۆ لەئەمەریكادا روویكردبووە بەكارهێنانی شێوازی ئەزموونگەری (بەرهەمی ئەمەش





كتێبی "كەسایەتی دەسەڵاتخواز"(٩) بوو كە پەیوەندیەكی بنەڕەتی بەتیۆرە رەخنەگرەكەیەوە نەبوو)، بەڵام دواتر پاش گەڕانەوە بۆ ئەڵمانیا دووبارە دەستیكردەوە بەرەخنەگرتن لەكۆمەڵناسی ناتیۆری‌و رەخنەكردنی رێبازی پۆزتفیزمی وەك دیدێك كە نەك تەنها رووئەكاتە ئەوەی كە هەیە، بەڵكو بەشێوەیەكی پۆزەتیفانەش سەیریدەكات.

ئادۆرنۆ لەتیۆرەی ئەبستمۆلۆژی خۆیدا پێشنیاری "رەخنەی دولایەنەی هەمەكی‌و هەندەكی" یان چەمك و راستمانا **denotation** [مصداق] دەكات. بەو مانایەی كە دەبێ ببینرێ ئایا چەمك ماڤی راستمانای خۆی پێشكەشدەكات و هەروەها ئایا راستماناش چەمكی خۆی بەكاردەهێنێ یان نا. بۆ نمونە ئادۆرنۆ لەچەمكی "كۆمەڵگا"دا كە لەوێنای پۆزەتفیسمەكاندا تێكشكێنراوەو دابەشدەبێت بۆ كۆمەڵێك بەش، جەخت لەوە دەكات كە ئەم چەمكە لەمێژووی ئەورووپادا رەگی لە "پلەی سیهەمی" كۆمەڵگای فەرەنسای پێش شۆڕشدایە. لەبەرئەوە خۆبەخۆ چەمكێكی رەخنەگرانەیە، چونكە بەڵێنی ئازادی‌وشادی‌و خۆشبەختی مرۆڤی لەخۆیدا هەڵگرتووە. بەڵام كۆمەڵگا هاوچەرخەكان ئەم بەڵێنەیان جێبەجێنەكردوە. لەدیدی رەخنەگرانەوە ناكرێ بە یەكسانی زانینی "چەمكی كۆمەڵگا" لەگەڵ هەلومەرجی جێگیرو باودا، فەزای مێژووی ئەم چەمكە وەلاوە بنێین، كەوابوو كۆمەڵگا بە پێچەوانەی تێروانینی پۆزەتڤیزمەكانەوە چەمكێكی مێژووییە كە هەم جێگەی لەواقعدایە و هەم رائەكات لەوەی لەگەڵیا ببێت بەیەكشت.

هەروەها دیاردە كلتووریەكان هەڵگری كۆمەڵێك چەمكن كە لەسنوری شكڵی كرداریان [شكلی فعلی] زیاتر دەڕۆن و هەڵگری رەخنەی واقعی ژیانی كۆمەڵایەتین، واقعیێك كە ئەو چەمكانە لەناویدا تواونەتەوە. بەرگری ئادۆرنۆش لە"چەمكی" پرۆلیتاریا هەر لەبەرئەمەیە، تەنانەت ئەگەر شیكردنەوەی واقعی پێكهاتەی كۆمەڵایەتی دەریخات كە چینی كرێكار چیدی بوونی نیە، یان كرێكاران خۆیان بە پرۆلیتار نازانن، یان وەك لەتیۆرەكانی هەندێك لەریفۆرمیستەكاندا دەگوترا، ئەم چینە توانای شۆڕگێڕانەی خۆی لەدەستداوە، هیچ یەك لەمانە نەبوونو گرنگی چەمكی پرۆلیتاریا وەك چەمكێكی ئازادیخواز ناسەلمێنن.

بەپێی ئەم تێڕوانینە راستمانا دەبێ بەرپرسیاری چەمك بێت، كۆمەڵگای هەبوو





دەبێت لەکەمووکوڕی خۆی لەبەرامبەر چەمکی بنەڕەتی کۆمەڵگادا بەرپرسیار بێت. بەمشێوەیە فەیلەسووفی رەخنەگر، واقع کە لەرێبازی پۆزتڤیزمدا بەشێوەیەکی نارەخنەگرانەو دژایەتی هەڵنەگر دەرکدەکرێ، دەخاتە ململانێووە لەگەڵ خودی چەمکدا. کەوابوو لەدیدی رەخنەگرانەدا خودی چەمك لەسنووری واقعی زەروری زیاتر دەڕوا، لەکاتێکدا مەرجی بەکارهێنانی سەرکەوتوانەی میتۆدی رێبازی پۆزەتیفیزم، قبووڵکردنی هەلومەرجی راوەستاوو بەستووە(١٠).

تیۆرەی رەخنەگرانەی ئادۆرنۆ بە تەواوی وەك تیۆرەیەکی رەخنەگرو خاڵی لەهەموو توانایەك بۆ دروستکردنی وێنەیەکی پۆزەتیف، واتە پێشنیاری ئەڵتەرناتیف بۆ هەلومەرجی باو، راگەیەنرا. چونکە بەپێی تێڕوانینی ئادۆرنۆ وێنەکێشانی هەلومەرجێکی داواکراو لەڕووی ئەبستمۆلۆژیەوە مومکین نەبوو. بەو مانایەی کە کارێکی لەمچەشنە پێویستی بە قبووڵکردنی خاڵی دەرچونێکی رەها بۆ فەلسەفە هەیەو هەروەها پێویستی بە وێناکردنی جیهان هەیە، وەك کۆمەڵێك مەسەلەو شتی ئەزموونی کە بەهۆی چەمکگەلێکی گونجاوەوە قابیلی دەرککردنن. دیارە بیرۆکەی نەبوونی ئەگەری پێشنیارکردنی ئەڵتەرناتیف بۆ هەلومەرجی باو، بیرکردنەوەی ئادۆرنۆی بە سەختی لەمارکسیزم دور دەخستەوە(١١).

## "کۆمەڵناسی" سەرمایەداری دوایی؟

سەرەتا وەك پێشتر گوتمان قوتابخانەی فرانکفۆرت رێبازی پۆزەتڤیزمی بەشێوەیەکی بیرکردنەوەی بورژوازی دادەنا، و بەها سوودخوازو پۆزەتیفزمەکانی کۆمەڵگای سەرمایەداری پێشکەوتویان بە یەکێك لەهێزە سەرەکیەکانی پارێزەری دەسەڵات دەزانی، وهەر لەبەرئەمەش رەخنەگرتن لەئایدۆلۆژیاو بەهاکان، بە هۆکارێکی گرنگ دەزانرا بۆ رزگاربوون لەدەسەڵات. بەڵام دواتر بەتایبەتی لەکتێبەکانی "دیالەکتیکی رۆشنگەری" و "مرۆڤی تاك رەهەند"ی (مارکیوز)دا هۆی سەرەکی دەسەڵات گەڕێنرایەوە بۆ زانست و تەکنەلۆژیاو عەقلانیەتئامێری. لەم ڕوانگەیەوە قوتابخانەی فرانکفۆرت بۆ شیکردنەوەی سەرمایەداری دوایی، تەفسیرێکی جیاوازی لەدەربڕینەکانی مارکسیزمی ئەرسۆزکس و مارکسیزمی هیگڵی پێشکەشکرد.

مارکسیزمی ئەرسۆزکس کە رەگی لەبیرکردنەوەکانی ئەنگلز و بە تایبەتی







لە"ئەنتی دۆرینگ"دا بووە، بڕوایوایە پرۆسەی مێژوویی پرۆسەیەکی ناچاریانەی پەرەسەندنی هێزەکانی بەرهەمهێنانە کە بەهۆی ناکۆکیەکانی کۆمەڵگای سەرمایەداریەوە، دەبێتە هۆی رزگاری و نەمانی لەخۆنامۆبوون. لەڕووی ئەبستمۆلۆژیەوە مارکسیزمە ئەرسۆزکسەکان بڕوایانوابوو هوشیاری و چەمکەکان، رەنگدانەوەی شتەکان‌و هەلومەرجە دیاریکراوەکانن. ئیکۆنمیزم (ئابووریگەری) و دترمینزم (جبریەت) بە دوو بنەمای سەرەکی ئەرسۆزکسی دەژمێرێن. گۆڕانی مادی بەهۆی جوڵەی شۆڕشگێڕانەو گۆڕانی لەناکاوی گۆڕانکاریە چەندایەتیەکان بۆ گۆڕانکاریە چۆنایەتیەکان، دروستدەبێت. کۆمەڵگا لەسەر بنەمای جوڵەی دیالەکتیکی کە هەم لەبواری سروشت و هەم لەبواری زیهن و کۆمەڵگادا یاسای سەرەکی گۆڕانە، ناکۆکیەکانی خۆی چارەسەر دەکات و بە ئازادی‌و رزگاربوون لەنامۆبوون دەگات. قوتابخانەی فرانکفۆرت لەبەرامبەر مارکسیزمی ئەرسۆزکسدا بەڵگەی دەهێنایەوە کە پێشکەوتنی بەردەوام لەبواری دەسەڵاتی عەقلانی بەسەر سروشتدا، لەهەمانکاتدا دەبێتە هۆی پەیدابوونی شێوەیەکی تازەی "بەشتبوون" **Refication** کە هەموو شێوە هوشیاریەکی شۆڕشگێڕانەو خەباتی چینایەتی لەناودەبات. لەم هەلومەرجەدا سیستەمی سیاسی سەربەخۆ لەچینەکان دەبێت و کۆمەڵگا دەچێتە ژێر دەسەڵاتی هێزێکی ناشەخسی‌و ناچینایەتیەوە. ئەم بەشتبوونە لێکچوونێکی ئاشکرای لەگەڵ بیرکردنەوەی ماکس فیبەر لەبارەی عەقلانیبوون و پەیدابوونی "قەفەسی ئاسنین"ی کۆمەڵگای نوێوە هەیە.

مارکسیزمی هیگڵی لەبیرکردنەوە جۆرج لۆکاشدا گەیشتە لوتکەی خۆی. لۆکاش لەکتێبی "مێژوو و هوشیاری چینایەتی"دا تێڕوانینی ئەنگلزو لینین بۆ دیالەکتیك وەك کۆمەڵێك یاسا کە بۆ سروشت بەکاردەهێنرێ، رەد کردەوە. لۆکاش هەروەها بیرکردنەوەی ئیکۆنۆمیستانەی بەرهێنانی سەرجەم ژیانی کۆمەڵایەتی‌و ئەخلاقی لەژێرخانی ئابووریەوە، خستە ژێر پرسیارەوە. پەیوەندی ناسین لەزانستە کۆمەڵایەتیەکاندا وەك پەیوەندی ناسین لەزانستە سروشتیەکاندا نیە، و خودو بابەت "چرکە گەلێك" و بەشەکانی کۆمەڵگان، و دەزگا کۆمەڵایەتیەکانی زیهن، لەخۆ نامۆن.

لەسەدەی نۆزدەدا هێزە مادیەکان بەهۆی گەشەکردنی پیشەسازیەوە پڕبوون

لەژیانی ڕۆحانی، لەکاتێکدا کە بوونی مرۆیی گۆڕا بۆ هێزێکی مادی. بەمشێوە ڕۆح بوو بە شت و شتەکانیش لەڕۆحدا غەرقبوون. پەیوەندی دیالەکتیکی خودو بابەت بەتایبەتی سەبارەت بە پرۆلیتاریا ئاشکرایە. چونکە پرۆلیتاریا بەهۆی سەرمایەدارییەوە، گۆڕاوە بۆ کار یان کاڵایەکی ئابوری، بەڵام دەتوانێت بەهۆی بەدەستهێنانی هوشیاری چینایەتیەوە، هوشیاربێت بە هەلومەرجی خۆی وەك کاڵایەك. بەمپێیە پرۆسەی مێژوو بریتیە لەدروستبوونی بزووتنەوەی کۆمەڵایەتی پرۆلیتاریا کە دەبێتە هۆی خودهوشیاری تیۆریانە. بەبڕوای لۆکاش کار پرۆسەیەکی هەمەکیەو وەك ئایدیا لەفەلسەفەی هیگڵدا ئەو دەزگایانەی کە بەرجەستەی [یان بابەتی] دەکەن، بەشێوەیەکی کاتی دەبنە بەربەست لەبەردەم پەرەسەندنیدا، بەڵام دواجار بەهۆی ئەوەوە، وەلاوە دەنرێن.

ئەم دەزگا یان ئەم بەشانە لەهەمەکی لەبەرامبەر گشتدا، بابەتی زانستە درۆزنانەکانن، لەکاتێکدا زانستی واقعی بیر لەپرۆسەی هەمەکی لەمێژوو یان لەپراکتیکدا دەکاتەوە. هەمەکی یان کاری مرۆڤ تا هەنووکە ناهوشیار بووە بە ماهیەتی خۆی، بەڵام ناهوشیارییەك کەوەك ناهوشیاری ڕۆحی هیگڵی لەکاری تێگەیشتندا تەواو دەبێت. بەدەستهێنانی خودهوشیاری چینایەتی بەهۆی پرۆلیتاریەوە، بەمانای پەیدابوونی هوشیاری مێژوویی‌و یەکێتی خودو بابەتە. کەوابوو کار وەك ڕۆحی هیگڵی بەتێپەڕین بەناو جیهانی لەخۆنامۆدا دەگەڕێتەوە بۆ خۆی‌و سەرجەم پرۆسەی مێژوویش، لەپرۆلیتاریادا بە ناسینی خۆیدەگات(١٢).

قوتابخانەی فرانکفۆرت لەبەرامبەر ئەم تەفسیرەدا بەڵگە دێنێتەوە کە لەخۆنامۆبوون و بەشتبوون لەکۆمەڵگای سەرمایەداری دوایدا سەرتاپاگیرە، وپرۆلیتاریاش ناتوانێ لێی دەربازبێت، و دەکرێ ڕەوتی گۆڕانی مێژوویی تەنها وەك پێکهاتنی عەقلانیەتی ئامێری تەفسیربکەین. بەمپێیە دیدی ڕەخنەگرانەی قوتابخانەی فرانکفۆرت لەم ڕوانگەیەوە لەدوو ئاراستە خەباتیدەکرد: یەکەم: دژی بەیانی میتافیزیکی هەمەکی وەك بوارێکی میتایی (ماوراوی) بەشێوەی مارکسیزمی هیگڵی. قوتابخانەی فۆانکفۆرت لەبەرامبەر ئەم تێڕوانینە میتافیزیکیەدا بۆ "هەمەکی،" تیۆرەیەکی کۆمەڵایەتی" گرتەبەر، بەو مانایەی هەمەکی تا ئەو شوێنە مانای هەیە کە ئاماژە بۆ کۆمەڵگا دەکات، دووهەم وەك ڕوونمانکردەوە دژی دیدی







پۆزەتیڤزم کە هیچ مانایەك بۆ هەمەکی ناهێڵێتەوە.

قوتابخانەی فرانکفۆرت بۆ شیکردنەوەی کۆمەڵناسانەی سەرمایەداری دوابی تێگەیشتنی ماکس فیبەری بۆ پرۆسەی عەقلانیەت وەك لەدەستدانیماناو ئازادی، لەگەڵ شیکردنەوەی مارکسدا بۆ بەکاڵاییبوون تێك دەئاڵێنێ. عەقلانیەت بەمانای لەدەستدانی ئازادی و مانا، دەبێتە هۆی پەیدابوونی بەشبوونی سەرتاپاگیرو باڵادەستی ڕوو لەزیادی بەهاکانی ئابووری کاڵایی، بۆ ناو کۆمەڵگاو کلتوور.

هۆرکهایمەر لەبەرهەمە سەرەتاییەکانیدا بڕوایوابوو دەبێ بۆ پێگەی واقعی خاڵی دەرچوونی ئازادیخوازانەی دیدی ڕەخنەگرانە، بەناو هەلومەرجی پرۆلیتاریا لەکۆمەڵگای نوێدا بگەڕێین. مارکسیش تیۆرەی ڕەخنەگرانەی خۆی لەسەر بناغەی هەلومەرجی پرۆلیتاریا دامەزراندبوو. بەڵام بەبڕوای هۆرکهایمەر هەلومەرجی فیعلی پرۆلیتاریا زامنی ناسینێکی دروست نیە، چونکە ڕەنگە جیهان لەڕوانگەی ئەم چینەوە جیاواز لەوەی کە هەیە دەرکەوێت (واتە ڕەنگە ئەو چینە خاوەن هوشیاری درۆزنانە بێت). لێرەدا بیریاری ڕەخنەگر ئەرکی ناسینی دروستی واقعیەتی دەکەوێتە ئەستۆ. بەڵام دواجار لەبیرکردنەوەی هۆرکهایمەردا پێگەی واقعی یان کۆمەڵایەتی بەدیهاتنی یەکێتی نێوان بیریاری ڕەخنەگرو چینە سەرکوتکراوەکان روون نیە، چونکە نائومێدی هۆرکهایمەر سەبارەت بە ڕۆڵی چینی کرێکار، هێواش هێواش بەرەو ڕەشبینیەکی قوڵی سەبارەت بە بوونی هەر جۆرە هێزێکی بەڕاستی ڕزگاریخوازو شۆڕشگێڕ لەکۆمەڵگای مۆدێرندا برد (١٣).

هۆرکهایمەر و ئادۆرنۆ لەیەکێك لەوتارە سەرەتاییەکانی خۆیاندا "پیشەسازی کلتوور" دەسەڵاتی عەقڵئامێریان بە یەکێ لەتایبەتمەندیە سەرەکیەکانی سەردەم دانا کە بەبڕوای ئەوان بۆتە هۆی لەناوبردنی سەربەخۆیی ڕێژەی تاکەکەس. لەسەردەمی سەرمایەداری دوایدا ئاوێتە بوونی کلتوورو سەرگەرمی بۆتە هۆی دروستبوونی کلتوورێکی مێگەلی دزێو. مەسرەفکەرانی پیشەسازی کلتوور ناچار بە کڕین و سوودوەرگرتن لەبەرهەمەکانی کردووە. دەکرێ ئاستی بەهێزی "پیشەسازی کلتوور" بەئاستی بوونی نەیارێتیکردن [مخالفت] لەکۆمەڵگادا بپێوین، تایبەتمەندی "پیشەسازی کلتوور" لەسەردەمی سەرمایەداری پێشکەوتودا ئەوەیە کە ئەگەری دژایەتی بنەڕەتی لەگەڵ پێکهاتەی جێگیرو باڵا دەستدا نادات(١٤).

بەمشێوەیە لەسەردەمی دەسەڵاتی عەقڵانیەتی ئامێریدا بەهای تاکەکەسی دەکەوێتە ژێر هەڕەشەوە. هۆرکهایمەریش رایگەیاند کە پاراستن و گەشەپێدانی بەهاو ئازادی سنووورداری مرۆڤ، تەنها بەهۆی گێڕانەوەی ئارەزووە مەزهەبیەکانەوە دێتە دی، هۆرکهایمەر بڕوایوابوو ئەوەی لەئیلاهیاتدا گرنگ دەردەکەوێت، ئەو هوشیاریەیە کە جیهان "دیاردەیە" و هەقیقەتی رەهاو ئامانجی غائی نیەو ئەمەش خۆی رێگەمان لێدەگرێت لەبەرامبەر واقعیەتی نالەباردا، خۆمان بەدەستەوە بدەین.(١٥).

ئادۆرنۆ و هۆرکهایمەر لە"دیالەکتیکی رۆشنگەری"دا فاشیزم کە زەمینە خۆشکەری ئەفسانەو بیرکردنەوەی دژ بە عەقڵانیە، بەدەرئەنجامی پرۆسەی عەقڵانیەت دەزانن. بەبڕوای ئەوان پەیدابوونی کۆمەڵگا سەرکوتکەرو وێرانکەرەکان کە سەربەخۆی‌و ئازادی تاکەکەس لەناودەبەن، دەرئەنجامی هەمان ئەو هێزانەیە کە کۆی هێزە پێشکەوتنخوازەکانی سەردەمی رۆشنگەری پێکدەهێنن. کەوابوو فاشیزم وەك لوتکەی  گەشەکردنی کۆمەڵگای نوێ، بە رێکەوتێکی مێژوویی یان بەدەرئەنجامی بەردەوامی پاشماوەکانی کۆمەڵگای ئەرستوکراتی لەناو دەروونی دەوڵەتی پیشەسازی نوێوە نازانرێت.

بزوتنەوەی رۆشنگەری کە بە پرۆسەی عەقڵانی دەسەڵات بەسەر سروشتدا دەست پێدەکات، بەهۆی پەرەسەندنی خودی ئەو پرۆسەیەوە توشی شکست دەبێت. رۆشنگەری وەك دیدێکی عەقڵانی بۆ جیهان و وەڵامدانەوەیەك بۆ پێداویستی پاراستنی ژیانی مرۆڤ، پەیدابوو. لەم پرۆسەیەدا زیهنی مرۆڤ خۆی لەسروشت جیا دەکاتەوە بۆ ئەوەی بتوانێت، وەك بابەتی دەسەڵات مامەڵەی لەگەڵبکات. بەڵام ئەم پەیوەندیە ژێرخانیە بەسروشتەوە، لەئاستی سەرخانی کلتووریدا کۆمەڵێك زیان دروستدەکات. لەم پرۆسەیەدا چەمك و وتەزا ئەبستراکتەکان دەبنە ئەڵتەرناتیڤی جیهانی بێ ناوەندی [بێ واسگە] ئەزموون. "بەهای سود" جێگای خۆی بە "بەهای ئاڵوگۆڕ" دەدات و مەسەلە بێوێنەو تایبەتەکان دەبنە کۆیلەی بڕیارو یاسا گشتیەکان. دەسەڵات بەسەر سروشتی دەرەکیدا، بە بەهای نکوڵیکردن لەسروشتی دەرونی مرۆڤ بەدەستدێت. دەسەڵاتگرتن بەسەر سروشتدا، پێبەپێی بەردەوامبوونی کۆیلەکردنی زهنیەتی مرۆڤ ئەنجامدەدرێت. رزگاربوون لەلۆژیکی دەسەڵات، پێویستی بە ناسینی







خودی زیهن هەیە وەك سروشت. بەڵام بەهۆی دەسەڵاتی پیشەسازی کلتوور، زهنیەت ناتوانێت بەرهەمی پێشکەوتنی تەکنیکی رکێفبکات. پرۆسەی مێژوویی مەیلێکی بەرجەستەی [یان دیاریکراوی] بۆ بەشتبوونی هەموو پەیوەندیەکان هەیە. دەسەڵاتی پەیوەندی ئاڵوگۆڕی کاڵا لەئاستی ژێرخاندا، هاوڕێیە لەگەڵ بەکاڵاییبوونی دیاردەکانی سەرخاندا(١٦).

سەرەکیترین بیرکردنەوەی کۆمەڵناسیانەی ئادۆرنۆ، تێزی سەرتاپا گیربوونی بەشتبوونە کە دواجار هەموو جووڵەیەکی پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی چ لەشکڵی هوشیاری چینایەتی و چ لەشێوەی دروستبوونی پێکهاتەی زیانبەخشی سەرمایەداریدا لەناودەبات. لەتێڕوانینی ئادۆرنۆدا فاشیزم لوتکەی پرۆسەی بەشتبوون بوو. بەڵام فاشیزم تەنها رەهەندی دەرونی هەلومەرجی هەنوکەیی [یان فیعلی] جیهانی سەرمایەداری دوایی، ئاشکراکردووە. پاش کۆتایی هاتنی فاشیزمیش ئادۆرنۆ جەختی لەبەهای دیدی مێژووی خۆیکردوە، بەو مانایەی پرۆسەی گۆڕانی مێژووی جگە لەدروستبوونی عەقڵانیەتی ئامێری هیچدی نیە. بەمشێوەیە دەبوو ئادۆرنۆ بیری ماتریالیزمی مێژووی کە لەسەر بنەمای ئەگەری کاری سیاسی دامەزراوە، رەدبکاتەوە، بەڵام وەك بینیمان بەرگری لەئەگەری بوونی چەمکە تیۆریەکان بە شێوەیەکی سەربەخۆ لەبەرژەوەندی‌و ئارەزووی کۆمەڵایەتی‌و سیاسیدەکرد و بەمپێیەش بەدوای پێشکەشکردنی شێوەگەلێکی تازەی هوشیاریدا دەگەڕا.

لەدیدی ئادۆرنۆوە پەیدابوونی هوشیاری ئازادیخوازانە بە مانا لۆکاشیەکەی، بەربەستی پرۆسەی هەمەکی عەقڵانیەت ئامێری کەوتووە. تەنها فۆرمە پەرشوبڵاوەکانی هوشیاری ستاتیکیانە دەتوانێت بەشێوەیەکی بنەڕەتی لەبەرامبەر ئەم پرۆسەیەدا راوەستێت. کەوابوو فەلسەفەی رەخنەگر بەسەرنجدان لەپرۆسەی گشتی بەشتبوون لەکۆمەڵگای نوێدا، تەنها ئومێدی بە ستاتیکایە. تەنها هونەرو فەلسەفەی رەخنەگر، واتە رەخنەگرتنی فەلسەفەی هەمەکی درۆزن، دەتوانێ فۆرمی تازە بۆ هوشیاری پێشکەشبکات. هونەری راستەقینە خاوەن توانای وێرانکردن و بناغە هەڵتەکاندنە. لەم ڕوانگەیەوە هونەر لەبەرامبەر زانستی پۆزەتیڤزمدا رادەوەستێت، چونکە سیمایەکی باڵاتری ناسینە کە بەدوای هەقیقەت لە ئایندەدا دەگەڕێت. شێوەی هەڵوەستەکردنی هونەرمەندان لەبەردەم واقعی کۆمەڵایەتیدا،

هاوڕێیە لەگەڵ تێڕوانین و پێشنیارگەلێك بۆ هەلومەرجی گونجاو [یان لەبار] بۆ ئایندە، لەکاتێکدا زانست تەنها واقعی هەبوو پیشاندەداتەوە.

دیدی ستاتیکانە هۆکارێکە کە بەهۆیەوە دیدی رەخنەگرانە دەتوانێت وێنەی سەرتاپاگیربوونی عەقلانیەتئامێری بکات کە لەسەر بنەمای ئابووری کالایی دامەزراوە. تەنها کاری هونەری تاکەکەس دەتوانێت، ئەگەری پەیدابوونی عەقلانیەتێك ئامادەبکات کە لەبەرامبەر بەشتبووندا رابوەستێت. بەمپێیەش هەلومەرجی رزگاری ئەوەندە باڵاو دورەدەستە کە لەبەر دەست خەڵکدا نیە. هونەرو دیدی ستاتیکانە بە بزوتنەوەیەکی کۆمەڵایەتی رزگاریخواز ناژمێریت و بەگشتیش تێزی پێشکەوتن لەپشت بەشتبوونی گشتی کۆمەڵگاوە، دواجار ناومکین دەبێ‌و بەسەرنجدان لەسروشتی کۆمەڵگای جێگیر، دیدی رەخنەگرانەی ئادۆرنۆ وەرگرێکی [مخاگب] واقعی نادۆزێتەوە. هونەر وەك فۆرمێکی یەکێتی خودو بابەت، دەکەوێتە دەرەوەی بواری زەرورەت و لەدیسپۆتیزمی سەرتاپاگیری رۆشنگەری‌و دەسەڵاتی عەقلانیەت رادەکات. هونەر بۆ ئەوەی نەفی هوشیاری بەشتبووی جیهانی ئەزموونی بکات، پەنا بۆ دەروونی خۆی دەبات. هونەر لەجیهانێکی لەمچەشنەدا خەسڵەتێکی پەروەردەیی [تعلیمی] نیە، بەڵکو نموونەی بونێکی دی پێشکەشدەکات. هونەر بۆ هونەر بەمانای هونەر دژی بازاڕە(١٧).

مارکیوز وەك گوتمان لەسەر بنەمای وێنای هیگڵی، جیاوازی لەنێوان خواستە راستەقینەو خواستە درۆزنەکاندا دەکرد. بە بڕوای مارکیوز تاخواستە راستەقینەکان لەبەرچاو نەگیرێن، ژیانی کۆمەڵایەتی تاك رەهەندانە دەبێت‌و تەنها خواستە رۆژانەی‌و درۆزنەکان لەخۆدەگرێت. بەڵام بەدەر لەوەی چینێك خواستە راستەقینەکانی مرۆڤ هەست پێبکات یان حیزبێك پروپاگەندەی بۆ بکات، پانتایی مێژوو هیچ کاتێك لەم خواستە راستەقینانەی مرۆڤ خاڵی نابێت. مارکیوز لەساڵی ١٩٣٤ دا بڕوایوابوو بزوتنەوەی کرێکاری وەك نوێنەری خواستە راستەقینەکان لەبەردەم مەترسیدایە، پاش ئەمەش لەساڵی ١٩٣٨دا رایگەیاند کە کرێکاران ناتوانن خواستی راستەقینە و درۆزنانە لەیەك جیابکەنەوە و دواجار لەساڵی ١٩٤١ بڕوایوابوو عەقڵ هەڵگری خواستە راستەقینەکانەو قوتابخانەی هیگڵی قوتابخانەیەکی







شۆڕشگێڕە، چونکە لەسەر ئەو بنەمایە دامەزراوە کە ئەوەی لەروانگەی مرۆڤەکانەوە هەقیقی‌و عەقلانیە، دەبێت بەهۆی رێکخستنی کۆمەڵایەتیەوە بێتەدی.

مارکیوز پاش کۆچکردنی بۆ ئەمریکا بە زمانێکی دی بیرکردنەوەکانی خۆی دەربڕی. نەبوونی بزوتنەوەی کرێکاری‌و بڵاوبوونەوەی دەروونشیکاری فرۆیدی لەو وڵاتەدا، مارکیوزی بەرەو ئەوە برد تا ئەمجارە خواستە راستەقینەکان بەهۆی چەمکی ئیروس و یۆتۆپیای ئیرۆسی ئازادکراوەوە دەربڕێ. مارکیوز بەزمانی فرۆید دەیگوت، خواستە راستەقینەکان خواستە ناهوشیاریەکانی پرۆلیتاریان و هەر لەبەر ئەم هۆیەش ئەم چینە شۆڕشناکات. ئەو بەربەستانەی لەبەردەم هوشیاری راستەقینەی کرێکاراندا هەیە، لەهەلومەرجی هەبووەوە سەرچاوە دەگرن. مارکیوز بە دورودرێژی ئەم هەلومەرجەی لەکتێبی "مرۆڤی تاك رەهەند"دا لەژێر ناونیشانی "دەسەڵاتی عەقلانیەتی ئامێری"دا روونکردۆتەوەو گوتی دەسەڵاتی مرۆڤ بەسەر سروشتدا بەهۆی زانست و تەکنەلۆژیاوە، بۆتە هۆی پەیدابوونی فۆرمێکی تازە لەدەسەڵات بەسەر مرۆڤدا.

لەم پرۆسەیەدا وەبەرهێنانی [اسپمار] مرۆڤ و سروشت بە شێوەیەکی روو لەزیاد زانستی‌و عەقلانی بووە، و مرۆڤ وەك ئامێرێك سوودی لێوەردەگیرێ. ئەو شتانەی مرۆڤ دروستیکردووە، بوون بە فەرمانڕەوای مرۆڤ. عەقلانیەتی ئامێری هێزێکە لەدەستێوەردان و کۆنترۆڵی مرۆڤ چۆتە دەرێ‌و رەوتی عەقلانیەتی ئامێری بەدەر لەوەی چ فۆرمێکی دیاری سیستەمی سیاسی یان ئابوری باڵادەستە، دەسەڵات پەیدادەکات. کەوابوو کۆمەڵگای نوێ خۆی لەخۆیدا کۆمەڵگایەکی ئامێریەو ماهیەتی بەهۆی سیستەمی سیاسی یان ئابووریەوە دیاری ناکرێت. بەمشێوەیە بەگشتی فرانکفۆرتیەکان لەچارەنووسی مرۆڤ لەسەردەمی دەسەڵاتی عەقلانیەت ئامێریدا، نیگەران بوون. بە بڕوای ئەوان ئەستەمە هێزێك بدۆزێتەوە کە توانای رووبەڕووبوونەوەی لەگەڵ ئەم دەسەڵاتەدا هەبێت(١٨).

وەك بینیمان عەقلانیەت (بەمانا فیبەریەکەی) هاوڕێ لەگەڵ رەوتی بەکاڵایبوون و بەشتبووندا (بەمانا مارکسیەکەی)بە تایبەتمەندیە سەرەکیەکانی بیرکردنەوەی رەخنەگرانەی قوتابخانەی فرانکفۆرت دەژمێرێت.

پەراوێزەکان:

١- T. Bottomore, The Frankfurt School (Laondon: Tavisttock 1984), PP. 15-27.

T. Adorno and M. Horkheimer, Dialectic of Enligtenment, (N.Y: Herder & Herder, 1972).

See R. Nisbet, The Sociolgical Tradition. Heineman, London, 1966.

A. Ayer (ed) Logical Rositivism, (Glenee: III, 1959), Introduction.

H. Marcuse, Reason and Revolution: Hegel and the Rise of Social theory, (oxford u.p,1941), PP.343-5.

M. Horkheimer, Critical (Theory: Selected Essays (N.y: Herder & Herder, 1927). PP. 160-92.

A. Honneth, "Communication and Reconeiliation: Habermas Critique of Adorno", Telos, spring 1927, No. 39. PP.45-61.

Horkheimer , op. Cit, PP. 208-210.

The Authortarin personality, (N. y: Harper& Row, 1950).

Honneth, op. Cit.

Bottommore, op. Cit, PP. 31-32.

"Lukacs" in Mclnnes, The western Marxists.

Bottomore, op. Cit, PP. 29-30.

Dilectic of Enligtenment. PP. 120-160.

Bottomore, op. Cit, PP. 41-42.

Dilectic of Enlightenment, Passim.







R. Berman, "Adorno, Marxism and Art", Telos, Winter 1977-78, No. 34. PP. 157-166.

"Marcuse" in Mclnnes, op. Cit.

سەرچاوە:

بەشێکە لەفەسڵی کتێبێکی دکتۆر حسین بشیریە بەم ناونیشانەی خوارەوە:

دولت عقل- ده گفتار در فلسفەو جامعە شناسی سیاسی –دکتور حسین بشیریە- مؤسسە نشر علوم نوین چاپ اول ١٣٧٤ فصل چهارم ص ٩٣-١١١.

## کتێبی ڕەشی کۆمۆنیزم*

## جورج تەرابیشی

ئەم کتێبە لەسەرەتای دەرچونیەوە لەکۆتایی ١٩٩٧دا، هەرایەکی ناوەتەوە: سەرەتا لەرۆژنامەو هەفتەنامەو رادیۆکانداو پاشانیش لەو گۆڤارانەدا کە سەنگینیان زیاترە.

واتە لە گۆڤارە مانگانەو وەرزیەکاندا.

من ئەوە لەخوێنەر ناشارمەوە کە زۆر دوو دڵ بووم بەرلەوەی لەسەر ئەم کتێبە بنوسم، چونکە ئەمە کتێبێکی دژەو لەبەرئەوەش حەزت ئەوروژێنێ، حەزیش هەڵبژاردنێکی پێشینەیەو کەمجار خوێندنەوەی کتێب دەیگۆڕێت. تەنانەت ئەگەر وەك (کتێبی رەش) ئەوەندە گەورەبێت کە ٨٥٠ پەڕەی گەورە داگیردەکات. پاشان مەبەستیش حوکمێکی پێشینەیە (مسبق) و دەشێ بابەتی ئەم حوکمە پێشینەیەش هەر خودی کتێبەکە نەبێت، بەڵکو خوێنەرو رەخنەگرەکەشی بێت. چونکە خوێندنەوەی وەك نەخوێندنەوەی هەڵوێستێکە. نوسین لەسەریشی هەڵوێستێکی دووچەندانە.. جا چ بەسلبی یان ئیجابی. یەکەم شت کە لەم کتێبەدا دەتوروژێنێ ناونیشانەکەیەتی: (چونکە) جگە لەوەی دەیەوێت کتێبێکی رەش بێت لەسەر کۆمنیزم، هەروەها لەناونیشانی دوهەمیدا بابەتی کتێبەکە بەمشێوەیە دەستنیشان دەکات (تاوان، تیرۆر، سەرکوتکردن).

بەمانایەکی دی کتێبەکە دەیەوێت، ئەمەش لەناونیشانەکەدا دەتوروژێنێ ـ باسی کۆمونیزم بکات وەك ئەوەی وەك تاوانی نازیەکان‌و کولونیالیزم، تاوانباربێت. بەڵام پرسیاری گەورە ئەوەیە ئایا دەکرێت قسە لەسەر تاوانی کۆمونیزم بەهەمان ئەو قسانە بکەین کە لەسەر تاوانی نازییەکان دەیکەین؟ ئەگەر تاوانەکانیش یەکسان بن، ئایا هەردوو ئایدۆلۆژیاکەش وەك یەکن؟

لێرەدا پارادۆکسێکی گەورە هەیە.. چونکە نازیزم وەك ئایدۆلۆژیایەکیش تاوانبارە، تەنانەت بەرلەوەی تاوانەکانیشی بکات، لەکاتێکدا کۆمنیزم لایەنیکەم لەئاستی تیوریدا بەڵێنی ئازادی‌و برایەتی جیهانیە. بەمانایەکی دی تاوان لەنمونەی نازیزمدا پتر وەرگێڕانێکی یەکسەریە، بەڵام لەنمونەی کۆمنیزمدا پتر لە وەرگێڕانێکی پێچەوانە دەچێت. چونکە واقعی پراکتیکی کۆمنیزم تائاستی خیانەت یان تائاستی هەڵگەڕانەوە بۆ دژی، لەجەمسەری دژ بەئایدیالەکەیدا بوو. هیچ تیورەیەك نیە هێندەی کۆمنیزم بەڵێنی دابێت و هیچ تیۆرەیەکیش نیە هێندەی کۆمنیزم بەڵێنەکانی لەپراکتیکدا بەدرۆ خستبێتەوە. کەوابوو لەحاڵەتی کۆمنیزمدا بەپێچەوانەی نازیزمەوە، ئەگەر باسی بێگوناهی ئایدۆلۆژیش نەکەین، لایەنیکەم دەتوانین باسی نیەتپاکی بکەین، ئەگەرچی راستە ئەم بێگوناهیە لەهەموو







حاڵەتەکاندا راست نیەو رەنگە هەندێك رەگی خراپە لەناو خودی تیۆرەدا هەبێت، بەڵام دەتوانین لەئاستی تیۆریدا بەدیاریکراوی باسی پاکێتی سەرەتایی بکەین. چونکە کۆمنیزم مژدەی بەرهەم بوو، نەك مژدەی ئەو کرمەی کە لەناو بەرهەمەکەدایە. هەر ئەم بەڵێنەشبوو وایکرد ملیۆنەها مرۆڤ لەپاکترین دەرونەکان‌و لەو کەسانەی زیاتر لەخەڵکی دی ئامادەیی گیانفیدایین، لەدەوری کۆببنەوە. هەزاران کەس لە پێناوی بەدیهاتنی ئەم بەڵێنەشدا کوژران‌و ئەشکەنجەدران‌و زیندانیکران. بێگومان باسکردنی (کتێبی رەشی کۆمنیزم) سوکایەتی بە شەهیدانی بەڵێنەکە دەکات‌و لەئازیزترین ئازیزەکانی بیرەوەریاندا، برینداریاندەکات. جگە لەمەش کارێکی وا جەلادەکانیان خۆشحاڵدەکات‌و بە بێگوناه دەریاندێنێ. بێگومان هەموو یەکسانکردنێکی شەهیدەکانی کۆمنیزم‌و جەلادەکانیشی ، یەکسانکردنێکی قبوڵنەکراوە. وەك چۆن یەکسانکردنی کۆمنیزم وەك جەستەیەکی تیوری بە نازیزم، قبوڵناکرێت.

لەبەرئەوەی ئەم تێکەڵکردنەش رونەدا واباشتر بوو ناوی کتێبەکە لەبری (کتێبی رەشی کۆمنیزم)، (کتێبی رەشی رژێمەکانی کۆمنیزم) بێت. چونکە ناونیشانێکی وا رەنگە ئەو تێکۆشەرە کۆمنیزمە تیۆریانە رازیبکات کە دەستیان نەبووە لەپراکتیکە دەسەڵاتاویەکاندا (الممارسة السلطوية) پتر خۆشیان بوونە قوربانی ئەو رژێمە دەسەڵاتاویانەی تێکۆشانی خۆیان بەرهەمیهێنا. ئەم حاڵەتە لە (کتێبی رەشی کۆمنیزم)دا رەنگیداوەتەوە: چونکە زۆربەی نوسەرانی کە شەش کەسن، لەکومنیستەکانن یان لە کومینیستە کۆنەکانن. لەپێش هەمویانەوە ستیفان کۆڕتوا کە سەرنوسەری گۆڤاری (کۆمنیزم) و نوسەری بەشدارە لە(مێژووی حیزبی کومینیستی فەرەنسی)دا، رەنگە هەر ئەمەش تۆنێکی راستگۆیانە بە (کتێبی رەش) بدات. واتە ئێمە لەبەردەم چاپێکی تازەی ئەدەبیاتی دژی کۆمنیزمدا نین کە کاتی بەسەرچووە، بەڵکو ئەو پێشەکی‌و پاشکۆیەی ستیفان کۆڕتوا بۆ ئەو مەلەفە مێژووی‌و مەلەڤی روداوەکان نوسیویێتی کە کتێبەکە پێك دەهێنن، پتر لەپیاچونەوەیەکی دیموکراتیانەی چەپ دەچێ بەتیورەی توندوتیژی مارکسدا. ئێمەش دەڵێین پیاچونەوە، نەك هەوڵدان بۆ بێگوناهکردنی مارکس. چونکە گەر بەرێکەوت نیە مژدەی بەهەشتی سەر زەوی کۆمنیزم لەپراکتیکدا گۆڕا بۆ دۆزەخ،

ڕەنگە کەموکڕی وەك میکرۆبێك لەناو جەرگەی خودی تیورەداو لەناو خودی چەمکە تیورەکاندا بێت، نەك تەنها بگەڕێتەوە بۆ خیانەتکردن لەتیۆرەو دورکەوتنەوەی واقع لەئایدیالەکەی.

ئاشکراشە بۆ ئەو کەسەی دەیەوێت زانیاریەك لەبارەی (تاوان، تیرۆرو سەرکوتکردنەکانەوە) بەدەستبهێنێ، ناچارە بگەڕێتەوە بۆ مەلەفەکانی کتێبەکە لەسەر؛ کۆلاگی سۆڤێتیو چینیو ئاسیایی (کۆریایی، ڤیتنامی، کەمبودیای، لاوسی) و ئەوروپای خۆرهەلاتی (بولندای، مەجەری، چیکۆسلوڤاکی، ئەلمانی، بولگاری، رۆمانی) و ئەمریکای لاتینی (کوبای، نیکاراگوای، پیرۆی) و جیهانی سێهەمیش (حەبەشی، ئەنگۆلی، موزانبیقی، ئەفغانساتانی). ئەم مەلەفانە پسپۆرە بەناوبانگەکان لەمێژووی کۆمنیزمدا، ئامادەیان کردووە. زۆربەشیان لەکۆمنیستەکانن یان سەر بەچەپی تازەی دیموکراتین. لەوانەش (نیکۆلای ورس) نوسەری (مێژووی یەکێتی سۆڤێت، لەئیمپراتۆری روسیاوە بۆ یەکێتی دەوڵەتە سەربەخۆکان) ١٩٢٢ و (ئەندرێ بازوفسکی) بریکاری بەڕێوەبەری پەیمانگای لێکۆڵینەوە سیاسیەکانی سەر بە ئەکادیمیای زانستەکانی پۆڵەندا، و (کارل بارتوسك) مێژوونوسی چیکی کە پسپۆرە لەمێژووی تازەی ئەوروپای خۆرهەلاتو ناوەڕاستداو سەرنوسەری گۆڤاری (ئەلتەرناتیڤی تازە) یە. ئامانجی ئەم کۆمەڵە مێژونوسو زانکۆییو لێکۆڵەرەوانەش ئەنجامدانی گەورەترین (سەرژمێری) ئابڕوچون و ستەمەکانە کەلەژێر دروشمی کۆمنیزمدا کران.. لەگەڵ دەستنیشانکردنی جێگاو کاتو ناوی جەلادو قوربانیەکان، تا ئەو جێگایەی دەستیان بەو ناوانە گەیشتووە. جەلادەکان پێکدێن لەدەیان هەزار کەسو قوربانیەکانیش لەولاتی بچوکی وەك کۆریاو کەمبودیادا، ملیونەها کەسنو لە ولاتی گەورەی وەك روسیاو چینیشدا دەیان ملیۆن کەسن. بەلام بەدەر لەم لایەنە بەلگەییە، ئەو وانەیەی (کتێبی رەشی کۆمنیزم) هەوڵدەدات دەریبهێنێ، کورتدەکرێتەوە بۆ سێ ئاست:

١)چەندایەتی توندوتیژی (عنف) کۆمنیزم.

٢)چۆنایەتی توندوتیژی کۆمنیزم.

٣) بۆچی توندوتیژی کۆمنیزم.؟







## چەندایەتی توندوتیژی کۆمنیزم:

بێگومان توندوتیژی کۆمنیزم-دیارە هەمیشە باسی توندوتیژی دەسەلاتاوی (العنف السلطوي) دەکەین- دەچێتە رەوتێکی گەورەترو بەرفراوانترەوە کە رەوتی سەدەی بیستەمە.. سەدەیەك کە دەتوانین لەمێژووی مرۆڤایەتیدا بەسەدەی توندوتیژی وەسفیبکەین. مێژوو لەم سەدەیەدا وا دەرکەوت وەك ئەوەی (زانستی ئازاری مرۆڤ)بێ، سەدەی بیستەم سەرەڕای دوو جەنگی جیهانی کە نزیکەی ٦٠ ملیۆن کەسی کردە قوربانی خۆی، چەندان کارەساتی گەورەی لەتوندوتیژی دەستە جەمعیەوە بەخۆیەوە بینی، کە لەهەندێك حالەتدا شێوەی جینۆسایدی بەخۆیەوە گرت. وەك کوشتاری ئەرمەنیەکان لەسەرەتای ئەم سەدەیەداو هۆلۆکۆست لەناوەڕاستەکانیداو دواجار کوشتارگای رەواندیەکان لەکوتاییەکانیدا.

بەلام ئەگەر توندوتیژی کۆمنیزم دەچێتە خانەی توندوتیژیەکی بەفراوانترەوە، ئەوا لەبەرامبەردا ئەمە یەکێکە لەگەورەترین گرفتو چڕترین دەلالەتەکانی. ئەمەش هەر بەبەراوردێکی چەندایەتی.(کتێبی رەش) ژمارەی قوربانیەکانی کۆمنیزمی دەسەلاتاوی بەسەد ملیۆن کوژراو دادەنێ کە لەڕووی جوگرافیو ئەزمونیەوە بەمشێوەیە دابەشدەبن:

- ٢٠ ملیۆن کوژراو لەیەکێتی سۆڤێت.
- ٦٥ ملیۆن کوژراو لە چین
- ٢ ملیۆن کوژراو لەکەمبۆدیا
- ٢ ملیۆن کوژراو لەکۆریا
- ١و٧ ملیۆن کوژراو لەئەزمونەکانی کۆمنیزم لەئەفریقادا،
- ١و٥ ملیۆن کوژراو لەئەوروپای خۆرهەلات
- ١و٥ ملیۆن کوژراو لەئەفغانستان
- ١و٥ ملیۆن کوژراو لەڤێتنام.
- ١٥٠٠٠٠ کوژراو لەکوباو ئەزمونەکانی تری کۆمنیزم لەئەمەریکای لاتیندا.

ئاشکرایە ئەم ژمارانە جیاوازی گەورە لەپراکتیکی توندوتیژیدا پیشاندەدەن. بۆ نمونە ئەزمونی روسی لینینیزم، ستالیزم پێکەوە ـ وەك (ستیفان کۆرتوا) دەلێت

بەسیمای (ئەزموونی) و عەقڵانیەتی ساردیەوە (مۆی مرۆڤ ڕاست دەکەنەوە). ئەزمونی مائویزم بەژمارەی بەرفراوانی قوربانیەکانیو بارستەی ئەو جەماوەرەی ئەشکەنجەیداو تا ئاستی مردن برسی کرد، دەمانحەپەسێنێ. بەڵام (لەهەمویان پێشتر) لەچڕی کوشتارەکاندا دەگەڕێتەوە بۆ (خەمیرە سورەکان) کە توانیان بەسەرۆکایەتی پۆڵ پۆت لەماوەی سێ ساڵو نیودا چوار یەکی گەلی کەمبودی لەڕەگەوە دەربهێنن.

بەبەراوردکردنی ئەمەش لەگەڵ توندوتیژی نازیزمدا کە ئیدی لەسەدەی بیستدا بەپێوەری ڕەهای توندوتیژی ئایدۆلۆژی دادەنرێت، ئەوا (بۆمان دەردەکەوێت) توندوتیژی کۆمنیزم چوار ئەوەندەی ئەو ژەهراویە. هەرچەندە بەراوردکردنی چەندایەتی خۆی لەخۆیدا (ناشرینە)، بەڵام تاڕادەیەکی زۆر ژمارەی ١٠٠ ملیۆن لەقوربانیەکانی کۆمنیزم بە متکراوی ((مسکوتاعنە)) هێڵرایەوە. لەکاتێکدا تاوانەکانی نازیزم لەپاش جەنگی جیهانی دووهەمەوە قۆزرایەوە بۆ ناو زڕاندنێکی جیهانی. پێدەچێ پێویستی ناو زڕاندنی نازیەکان بەتایبەتی ئەوەی پەیوەندی بەهۆلۆکۆستەوە هەیە، یەکێك بێت لەو هۆیانەی کە یارمەتی شاردنەوەی توندوتیژی کۆمنیزمی دەسەڵاتاویو ونکردنی ڕەهەندی تاوانە دەستە جەمعیەکانی دابێت. هۆیەکی دیش پەیوەندی بەوەوە هەبوو کە یەکێتی سۆڤێتو بەهۆیەوە تیپە (کتیبە) بەرگریەکانی کۆمنیستەکان بەشداریەکی ئەگەرچی درەنگ، بەڵام چالاکانەیان لەجەنگدا دژی نازیەکانو تێکشکانیاندا کرد. وەك ئەوەی بەمکارە یەکێتی سۆڤێت پاکانەیەکی پێشینەی وەرگرتبێو بە بیانووی پاراستنی کەرامەتی شەڕی جیهانی دژی نازیزم، ناکرێت بخرێتە ژێر گومانەوە.

دواجار هۆی سێهەمیش کە لەهۆکانی دی زیاتر بۆ پرۆسەی شاردنەوەی تاوانەکان چارەنوسسازە، بریتیە لە: (ئەفسانەی شۆڕشگێڕی). چونکە ئایدیای شۆڕش تا پێش ڕاپۆرتە نهێنیەکەی خرۆشۆف لەبەردەم کۆنگرەی بیستەمی حیزبی کۆمنیستی سۆڤێتیدا، ئایدیایەکی پیرۆزو لەسەرو هەموو ڕەخنەو هەڵسەنگاندنێکەوە بوو. تەنانەت پاش بڵابونەوەی ڕاپۆرتە نهێنیەکەی خرۆشۆفیش، هەر ڕەخنەگرتنێك لەبیرۆکەی شۆڕش لەرزۆكو دو دڵبوو لەوەی بگات بەڕەگی ئەفسانەکە. دەکرێت بڵێین ڕاپۆرتەکەی خرۆشۆف لەبری ئەوەی هەستی ڕەخنەگرانە بوروژێنێ، بەپێچەوانەوە پتر هەوەسی شۆڕشی بزواند. لەشەستەکان و حەفتاکاندا ئەدەبی پیاهەڵدان بەسەر







کۆمنیزمدا، زیاتر پەرەیسەند. تەنانەت لەناوەندی جیابوەکان (منشقین) و هەراتیقەشدا. لەوکاتەدا کە هەموو بەرپرسیاریەکانی (لادان) دەخرایە ئەستۆی ستالین، لەهەمانکاتدا پاکانە بۆ دەوری لینینو ماو کرا. واتە ئەگەرچی واقعی پراکتیکی کۆمنیزم تاوانبارکرا، بەڵام لەهەموو کاتێك زیاتر گۆرانی بەسەر ئایدیالەکەیدا وترا. بەمشێوەیە تاوانەکانی پراکتیك لەبەرامبەر ئایدیادا، وا دەردەکەوێت وەك ئەوەی شتێکی لاوەکی مێژوو بێت. نوسەرانی (کتێبی ڕەشی کۆمنیزم)یش دان بەوەدا دەنێن ـ ئەمەش خۆی ئازایەتیەکەو بۆیان دەژمێردرێت ـ کە ئەوان خۆشیان بەشداربوون لەو گەمەیەدا: تاوانبارکردنی واقع بەئامانجی پاکانەکردن بۆ ئایدیالو بەئامانجی پاراستنی بیرۆکەی (شۆڕش)، وەك چارەسەرێك بۆ ڕزگاری مرۆڤایەتی ـ ئەگەرچی لەسەر حسابی ئازارە ترسناکەکانیش بۆ مرۆڤایەتی بێت.

## چۆنایەتی توندوتیژی:

کاتێك باسی توندوتیژی کۆمنیزم وەك توندوتیژیەکی سیاسیدەکەین، یەکسەر خەیاڵمان بۆ: ئەشکەنجەدانو هێرشەکانی (پاکتاوکردن) و دادگایکردنە درۆزنەکان کە لەسەرەتاوە دەرئەنجامەکانی زانراوەو زیندانەکانو پۆلیسی نهێنی کە لەسەرو یاساوە ڕەفتار دەکەن، دەڕوا. بەڵام ڕژێمە کومونیستەکان لەهەمانکاتدا پەرەیان بەچەند شێوازێکی تایبەتیو جۆرێکی توندوتیژی سیاسی دەستەجەمعیدا کە بەشێوەیەکی تایبەتی لە ئۆردوگاکانی کارو برسیکردنی (بەرنامە بۆ داڕێژراودا) دەردەکەوێت.

(کتێبی ڕەشی کۆمنیزم) سەبارەت بەئۆردوگاکانی کار، دوودڵ نیە لەوەی باسی (ئیمپراتۆریەتی ئۆردوگاکان) بکات. ساڵانی سیەکان وەك چۆن سەرکەوتنی ستالینیزمی بینی، هەروەها شێوە گەلێکی توندڕەوانەو بێ پێشینەی لە دەستدرێژیکردنو سەرکوتکرندا دژی کۆمەڵگا بینی. لەپێش هەمووشیانەوە ئەو شێوە تازەیەی لەکاری کۆیلەیەتی کە کۆمنیزم دایهێنا: ئۆردوگاکانی کار. دادگاکانی پۆلیسی سیاسی ناسراو بە (غیبیهو) لەساڵی ١٩٢٩دا بە بەهانەی سەر لەنوێ ئاوەدانکردنەوەی (سوشیالیستی) بڕیاری کاری ناچارانەی بەسەر ٥٦٠٠٠ گیراودا دەرکردو لەساڵی ١٩٣٠دا بەسەر زیاد لە ٢٠٨٠٠٠ گیراودا. ئۆردوگاکانی کار لەساڵی ١٩٣٢دا ٣٠٠٠٠٠ دانیشتووی هەبوو. هەندێك لەو ئۆردوگایانە بەڕاستی ئۆردوگای مردن بوون، چونکە ڕێژەی ساڵانەی مردن تیایدا

هەندێك جار دەگەیشتە ١٠٪.. وەك لەئۆردوگای کاری (ناوچەی بەلتیق ـ دەریای سپی)دا. ئوردوگاکان لەساڵی ١٩٣٥داو پاش یەکێتی سیستمی کۆلاگ، کە ئەمە ناوی روسی بەرێوەبەرایەتی سەرەکی ئوردوگاکانەو سولوژنتسین لەرۆمانەکانیدا ناوبانگێکی جیهانی بۆ دروستکرد، ٧٢٥٠٠٠ دانیشتووی لەخۆ دەگرت. جگە لە (هیستۆکەکانی (مستوطنات) کار) کەپتر ئەو خەڵکانەی لەخۆدەگرت کە (کەمتر لەڕوی کۆمەڵایەتیەوە مەترسیداربوون) واتە ئەو کەسانەی حوکمەکەشیان لەسێ ساڵ تێپەڕی نەدەکرد.. ژمارەی ئەمانەش لەهەمان ساڵدا گەیشتە ٢٤٠٠٠٠ زیندانی. لەکۆتای سییەکاندا دانیشتوانی کولاگ بوو بەدوو ئەوەندەو لەسەرەتای ١٩٤١دا گەیشتە ١٩٣٠٠٠٠. ئەم ژمارە زۆرەی دانیشتوانی کولاگ زیانی لە (سیستمی کار)داو تا ئەو رادەیەی لەساڵی ١٩٣٧داو بەهۆی هێنانی ٧٠٠٠٠٠ دانیشتوی تازە لەدەرئەنجامی هێرشی گەورەی پاکتاوکردندا، بەرهەمەکانی لەچاو ساڵی رابردودا (١٩٣٦) بەڕێژەی ١٣٪ هاتە خوارەوە. هەر لەبەرئەمەش لافرنتی بیریا (نوێنەری گەل بۆ ناوخۆ (مفوض الشعب للداخلیه) بۆ دوبارە رێکخستنەوەی کۆلاگەکانو عەقلانیکردنی سیستمی کارو بەرهەمهێنان تیایدا، بەسیفەتی شەخسی دەستی خستە ئەمکارەوە. لەو راپۆرتە فەرمیەشدا کە لە ١٠ نیسانی ١٩٣٩دا بۆ مەکتەبی سیاسی نارد، هاتووە  بەرێوەبەری پێشوو (نیکۆلای ئیوف) (گەڕان بەدوای دوژمنە چینایەتیەکانی) خستۆتە پێش (بەرێوەبردنی کاروبار بەرێكوپێکی). لێرەوە بڕی خۆراکی رۆژانەی گیراوەکان، تەنها ١٤٠٠ حەریرەیە کە ئەم بڕە دانراوە بۆ (گیراوە دانیشتووەکان) نەك بۆ (گیراوە کرێکارەکان)، لەدەرئەنجامی ئەمەدا ٢٥٠٠٠٠ دانیشوو توانای کارکردنیان لەدەستداوەو رێژەی مردنیش لەریزەکانیاندا ساڵانە بۆ ٨٪بەرزبۆتەوە.

ئەگەرچی بیریا لەراپۆرتەکەیدا داوای بڕی خۆراکی زیادە دەکات، بەلام لەهەمانکاتدا پێشنیاری درێژکردنەوەی کار لەئوردوگاکاندا دەکات بۆ ١٠ کاتژمێرو کەمکردنەوەی رۆژانی پشوو لەچوار رۆژەوە بۆ سێ رۆژ لەمانگێکدا. بەگشتیش لەساڵی ١٩٣٤و ١٩٤٠دا ژمارەی حاڵەتی مردن لەئۆردوگاکاندا گەیشتە پتر لە ٣٠٠ هەزار، لەکاتێکدا ژمارەی دانیشتوان لەهەمان ماوەدا گەیشتە ٦ ملیۆن.

بەلام شێوەی دووهەمی توندوتیژی دەستە جەمعی کە کۆمنیزمی دەسەلاتاوی دایهێنا، برسیکردنی رێکخراو و بەپێی بەرنامەیەکی داڕێژراو بوو. دەتوانین بڵێین







چەکی برسیکردن بە رێکەوت دۆزرایەوە. مەرگەساتو قاتوقڕی ئەو شەڕی ناوخۆییەی لەساڵی ١٩١٩ ـ ١٩٢١دا لەنێوان (سپیەکان)و(سورەکان)دا بەتوندوتیژی رویداو تیایدا سپیەکان ئابلۆقەی سورەکانیان لەشارە سەرەکییەکاندا دابوو، لەلادێکانەوە دەستی پێنەکرد، ئەو کاتە نەبێت کە قاتوقڕی (المجاعە) ٣٠ ملیۆن کەسی گرتەوەو بەتایبەتی بووە هۆی مردنی ٥ ملیۆن کەس لەریزی (دوژمنانی شۆڕشدا). لینین پێشتر سەرنجی لەمەترسی (تیوری) ئەم چەکەدا بوو.. ئەوکاتانە کە هێشتا پارێزەرێکی لاو بوو لەشاری سمارە، پایتەختی یەکێك لەهەرێمەکانی روسیا کە لەساڵی ١٨٩١دا قاتوقڕیەکی ترسناك گرتیەوە. لەوکاتەدا لینین هەڵوێستێکی رەخنەگرانەو سوکایەتی پێکرانەی لەو چینە رۆشنبیرە ناوخۆیە گرت کەخۆی سازدابوو بۆ پێشکەشکردنی یارمەتی کۆمەڵایەتی بە برسیەکان. وەك بلیاکۆف (کە دانەری ژیاننامەی لینینی لاوە) دەڵێ ئەوەندە ئازایەتی تیابوو (بۆئەوەی بەڕاشکاوی رایگەیەنێ کە قاتوقڕی دەرئەنجامی پوزەتیفی جیاجیای هەیە. لەپێش هەموویانەوە دەرکەوتنی پرولیتاریای پیشەسازی.. (گۆڕهەڵکەنی سیستمی بورجوازی). قاتو قڕی بەوێرانکردنی ئابووری جوتیاری دواکەوتوو، لەڕوی بابەتیەوە نزیکمان دەخاتەوە لەدوا ئامانجمان: سوشیالیزم. چونکە قاتوقڕی نەك هەر بەتەنها باوەڕ بەقەیسەر لەناو دەبات، بەڵکو باوەڕ بەخوداش دەکوژێ). لینین جارێکی دی ئەم تێزەی لەقاتوقڕی ١٩٢١دا کە ترسناکترین قاتو قڕی بوو کە روسیا بەخۆیەوە بینی، خستەوەگەڕ. لینین ئەم قاتوقڕیەی قۆزتەوە بۆئەوەی دەست بەهێرشێکی دەستبەسەراگرتنی بەرفراوان بکات بۆ مۆڵکی کەنیسە ئەرسوزوکسیەکان، (دەماغی) دوژمنی چینایەتی. لێرەوە لە ١٩ ئازاری ١٩٢٢دا نامەیەکی ئاڕاستەی ئەندامانی مەکتەبی سیاسیکرد کە تیایدا بەئاشکرا هاتووە (ئێمە ئێستا ٩٩٪ بەختمان هەیە بۆئەوەی بەسەرکەتووی جەزرەبەیەکی کوشندە لەدەماغی دوژمن بدەین، چونکە ئێستاو تەنها ئێستا بەهۆی ئەو هەموو مرۆڤە برسیەوە کە گۆشتی مرۆڤ دەخۆنو بەهۆی ئەو رێگایانەوە کەپڕن لەهەزاران لاشە، دەتوانین (و پێویستە لەسەرمان) بەهیمەتێکی پۆلاینەوە کە بەزەیی نازانێت، دەست بەسەر مولکەکانی کەنیسەدا بگرین، ئێستاو تەنها ئێستا دەشێ زۆربەی زۆری جەماوەری جوتیاری پشتمان بگرێت یان بەدەربڕینێکی وردتر، واز لەپشتگیری کۆمەڵێك پیاوی دینی کۆنەپەرستو بورژوازی بچوك بهێنێت. بەمشێوەیە دەتوانین دەست بەسەر

خەزێنەیەکدا بگرین کە چەند ملیۆن رۆبلی ئاڵتونی تێدایە (بیر لەخەزێنەی هەندێك کەنیسە بکەنەوە!). بێ ئەم خەزێنەیەش ناتوانین وێنای هیچ چالاکیەك لەدەوڵەت بەشێوەیەکی گشتیو هیچ بونیادنانێکی ئابووری بەشێوەیەکی تایبەتیو هیچ بەرگریەك لەجێگاکانمان بکەین. پێویستە لەسەرمان چەند لەسەریشمان بکەوێت، ببینە خاوەنی ئەو خەزێنەیە کە چەندان ملیۆن رۆبلە (رەنگە چەندان ملیاردیش بێ!) هەموو ئەمەش ناکرێت بەسەرکەوتووی ئەنجامبدرێت، ئێستا نەبێت. هەموو شتێکیش ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن ئێمە هەرگیز لەکاتێکی تردا ناتوانین بەئامانجەکانمان بگەین. چونکە رەنگە تەنها ئەو نائومێدیەی بەهۆی قاتو قڕیەوە دروست دەبێ، هەڵوێستێکی لایەنگرانە یان لایەنیکەم بێلایەنمان لەجەماوەردا بۆ دروستبکات).

ئەم توندوتیژەیە (عنف) (تیۆریە) بێوێنەیە، لەسەر دەستی ستالین بوو بەتوندوتیژیەکی کرداری. لینین لەوە زیاتری نەکرد کە ئەو (هەلەی) قۆستەوە کە قاتوقڕی دروستیکردبوو، بەڵام ستالین لەهەل قۆستنەوە تێدەپەڕێو خۆی هەلەکە دروستدەکات، واتە چەکی برسێتی وەك خۆی بەکاردێنێ. بەمانایەکی دی لەو شوێنانەدا کە پێویستە دەستدەکات بەرێکخستنی برسێتی بۆئەوەی جەزرەبەیەکی کوشەندە نەك هەر لەدەماغ، بەڵکو لەسەرجەم جەستەش بدات.. واتە لەخودی جەماوەری جوتیاری. بۆ نمونە ئەمە لە(قاتوقڕی گەورەدا) لە ساڵانی ١٩٣٢ ـ ١٩٣٣دا رویدا کە شەش ملیۆن کەسی کردە قوربانی. ئەم قاتوقڕیە وەك ئەو قاتوقڕیانە نەبوو کە روسیای قەیسەری و بەلشەڤ بینیبویان، بەڵکو دەرئەنجامی راستەوخۆی سیستمی چەوساندنەوەی چینی جوتیار بوو کە بە(سروشت) دوژمنی شۆڕشەو هەروەها دەرئەنجامی جێبەجێکردنی کۆکردنەوەی زۆرەکیە، وەك دەروازەیەك بۆ بونیادنانی سوشیالیزم لە لادێکاندا. (ئامانجی قۆناغەکە) کە رەوتی (سیاق) قاتوقڕی دەستنیشاندەکات، دەستبەسەراگرتنی موڵکەکانی کەنیسە نەبوو، بەڵکو دەستبەسەراگرتنی گەنمی جوتیاران بوو. بەمشێوەیە بەتاوانی (دەستدرێژیکردنە سەر موڵکیەتی سوشیالیزمی) واتە شاردنەوەی گەنمو جۆ بەکرداری (عەمەلی)، لەماوەی ١٠ ساڵدا حوکمی زیندان لەگەڵ کارکردندا بەسەر زیاد لە ١٠٠٠٠ جوتیاردا دراو لەماوەی نێوان ئابی ١٩٣٢ و کانونی یەکەمی ١٩٣٣یشدا حوکمی لەسێدارەدان بەسەر ٥٤٠٠ جوتیاردا جێبەجێکرا، بەڵام لەبەرئەوەی هەموو ئەم کردارانە هیچ دەرئەنجامێکی







نەبوو، بڕیاریدا لەتۆڵەی (برسیکردنی شارەکاندا)، (لادێکان برسی) بکات. بەمشێوەیە لەکاتێکدا دەستبەسەر گەنمو مەڕو ماڵاتی جوتیاراندا گیرا، لەهەمانکاتدا رێگای چوون بۆ شاریان بەهۆی کونترۆڵکردنی هاتوچۆیانەوە لەڕێی وەرەقەیەکی رەسمیەوە، لێگیرا. ئیدی (دژە هێرش بۆ سەر تێکدەران) نەك هەر کۆلاگەکان، بەڵکو کۆنخوازەکانیشی گرتەوەو بگرە کۆمنیستەکانی ناوچەکانیش. وەك لەو بەیانەدا کە سەرۆکایەتی حیزب لەهەرێمی قەفقازی باکووردا دەریکردو داوای لە (رێکخراوە ناوچەییەکانی حیزب کرد، پاش شکستی شەرمەزارانەی نەخشەی کۆکردنەوەی گەنم، تێکدانی رێکخراو لەلایەن هەندێ ئەندامی کۆلاگەکانەوە کە دوژمنی شۆڕشن، تێكوپێك بشکێنن و هەروەها پاکتاوی بەرگری کومنیستە لادێیەکانو سەرۆکی کولخۆزەکان بکەن کە رابەرایەتی پرۆسەی تێکدانیان کرد).

لەماوەی مانگی تشرینی دووهەمی ١٩٣٢دا کە مانگی یەکەمە لە (خەبات دژی تێکدان)، ٥٠٠٠ کۆمنیستی لادێی بەتاوانی (دەستتێکەڵکردن) لەگەڵ (دەسیسەی تێکدان)دا رەوانەی زیندانکران، هەروەها ١٥٠٠٠ کۆلخۆزی گیران.. هەموو ئەمانەش تەنها لەناوچەی قەفقازی باکووردا کە گرنگیەکی ستراتیژی هەیە لەڕوی بەرهەمهێنانی خۆراکەوە. بەڵگە فەرمیەکانی بەرێوەبەرایەتی کۆلاگ ئاماژە بۆ ٢٣٦٧١ دانیشتووی تازە لە١٩٣٢داو ٢٦٨٠٩١ دانیشتووی تر لە١٩٣٣دا دەکەن کە زۆربەیان ئەو جوتیارانەن کە لەدێکانیان دورخراونەتەوە.

بەڵام پێدەچێ هەنگاوەکانی دژ بەتێکدان لەدێکانی ئۆکرانیادا کە تاوانبارکرابوون بەجێبەجێنەکردنی (پێویستیەکانی دەوڵەتی پرولیتاری) بۆگەنم، گەیشتبێتە لوتکەی خۆی. ئەگەر ملیۆنەها ئۆکرانی ناچارکران نەك هەر بەرهەمەکانیان، بەڵکو خەزێنەی تۆوی پێداویستیەکانیشیان تەسلیمبکەنو رێگەی چوون بۆ شاریان لێگرتنو تەنانەت سواربوونی شەمەنەفەریشیان لێقەدەغە کردن، ئەوا رێژەی مردن بەشێوەیەکی ترسناك لەناویاندا بەرزبۆوە. بەتایبەتی پاش ئەوەی برسێتیو وەبای تیفۆئید پێکەوە لەناویاندا بڵاوبۆوە. رێگاکان لەزستانی ١٩٣٣ی ترسناکدا بەهەزاران لاشە داپۆشرابوو، لەهەندێ شوێنیشدا حاڵەتی خواردنی گۆشتی مرۆڤ بینرابوو. نوسەری بەناوبانگ میخائیل شولوخۆف نوسەری رۆمانی (دونی ئارام) رووداوەکانی ئەم قاتوقڕیەی لە ناوچەی (کوبان)ی قەفقازیدا کە دەکەوێتە لای سنوری ئۆکرانیەوە، بینی بوو.

لەبەرئەوە نامەیەکی بۆ ستالین نوسیبوو کە تیایدا بە درێژی باسی ئەو شێوازی ئەشکەنجەدانی (سارد)و(گەرمەی) (وەك خوی ناوی ناوە) دەکات کە بۆ دەست بەسەراگرتنی خەزێنەی یەدەکی جوتیاران بەکارهاتووە (تەماشای دەقی نامەکەی شولوخوفو وەڵامەکەی ستالین، لەپاشکۆی ئەم وتارەدا بکەن). قاتوقڕی جگە لەسەرجەم ئوکرانیا، بیابانەکانی روباری دونو کوبان و قەفقازی باکوری کازاخستانیشی گرتەوەو ٤٠ ملیۆن کەس برسێتیان چەشت. قاتوقڕی لەناوچەی (خارکۆف)دا چەقیگرت کەپایتەختی ئوکرانیای کۆنە، بەشێوەیەك کە ژمارەی مردووەکان لەحوزەیرانی ١٩٣٣دا گەیشتە ١٠٠٠٠٠ کەس لەبەرامبەر ٩٠٠٠ کەس لە ساڵی ١٩٣٢دا. هەر بەتەنها لەشاری خارکۆفداو لەماوەی ساڵێکدا ١٢٠٠٠٠ کەس مردن. پێدەچێ جوتیارانی ئۆکرانیا لەهەموو کەسێك زیاتر زیانیان لێکەوتبێت، چونکە ژمارەی قوربانیەکان لەناویاندا گەیشتە چوار ملیۆن. لەبەرئەوە هەندێك مێژوونوسی ئۆکرانی باس لە پرۆسەی جینۆسایدێکی بەمەبەست دەکەن لەپێناوی (برسیکردندا)، بەڵام بەهەرحاڵ ئەوەی جێی گومان نیە ئەوەیە ستالین کە لەبنەڕەتدا جورجیاییە، رقێکی تایبەتی لەئۆکرانیەکان هەبوو. ساخارۆف باسی (فۆبیای ئۆکرانی لای ستالین دەکات).

بەڵام نابێ ئەوەمان لەیادبچێت کازاخستانیەکانیش کەزۆربەی دانیشتوانی لادێین، زیانی گەورەیان لێکەوت: یەك ملیۆن قوربانیانداو دوو ملیۆنیش ناچاربوون کۆچ بۆ چینو ئاسیای ناوەڕاست بکەن.

بەکورتی لەقۆناغی ستالینیزمو درێژکراوە مائویزمەکانیدا، (برسیکردن) بوو بەتەکنیکێکی جێگیر لەپراکتیکی کۆمنیزمی دەسەڵاتاوییدا. لەچینداو ساڵانی ١٩٥٨ ـ ١٩٦٠و لەئەنجامی هێرشی بازدانی گەورەدا بۆ پێشەوە، بەپێی تەقدیرە نیمچە فەرمیەکان ٢٠ ملیۆن کەس لەبرسا مردنو بەپێی تەقدیراتی تریش ٤٣ ملیۆن کەس. ئەمەش لەهەردوو حاڵەتەکەدا گەورەترین ژمارەی قوربانی برسێتیە لەمێژووی مرۆڤایەتیدا. هەروەها لەم ئاڕاستەیەدا (خەمیرە سورەکان) بەسەرۆکایەتی پۆل پۆت، کوشندەترین قاتوقڕیان لەلاپەڕەکانی مێژودا رێکخست، شارە کەمبودیەکان لەدانیشتوانی چۆڵکران، بۆئەوەی لەڕێی کارکردنەوە لەسەر زەوی، سەرلەنوێ بەشێوەیەکی (سوشیالیستی) ئاوادان بکرێنەوە، دەرئەنجامی ئەمەش ئەوەبوو رێژەی مردن لەساڵانی ٧٥ ـ ١٩٧٩دا لەریزی ژناندا بەرزبۆوە بۆ٧،١٥ ٪ و لەریزی پیاوانیشدا بۆ







٩،٣٣٪. بەپێی دانپیانانی پۆل پۆت خۆی ٥،١ ملیۆن کەس بەهۆی برسێتیو لەسێدارەدانو تیرۆرکردنەوە کوژراونو بەپێی تەقدیری ڤێتنامیەکانیش ٣ملیۆن کەس. لەکاتێکدا سەرچاوەکانی (CIA) باس لە زیانێکی دیمۆگرافی سەرتاسەری دەکەن کە ٨،٣ ملیۆن کەس کەمترنیە، بەمەرجێك تەنها بەرزبونەوەی رێژەی کوژراوەکان لەبەرچاو نەگرین، بەڵکو رێژەی دابەزینی ترسناکی لەدایکبونەکانیش کە لە (٣٪) وە لەساڵی ١٩٧٠دا، دابەزی بۆ رێژەی (١٪) لەساڵی ١٩٧٨دا. بەگشتی لەهەموو حاڵەتەکاندا لەساڵی ١٩٧٩دا ژمارەی گەلی کەمبۆدی دابەزی بۆ ٢،٥ ملیۆن کەس، لەکاتێکدا سەرژمێرەکەی بەر لەشەڕی ناوخۆ بەتەقدیر ٨ ملیۆن کەس بوو.

بۆچی توندوتیژی کۆمنیزم: وەك چۆن نازیەکان چەمکی (دوژمنی رەگەز) یان داهێنا، هەرواش کۆمنیزمەکان چەمکی (دوژمنی چینایەتیان) داهێنا. دیارە دیسان بەراوردەکە (ناشرینە)، بەڵام لێکچونی ئەو دەرئەنجامانەی پراکتیك کردنی ئەم دوو چەمکە لەواقیعدا خستیانەوە ناچار بەم بەراوردەمان دەکات. نازیەکان بە بەهانەی شوناسی رەگەزی چەندان ملیۆنیان لەناوبرد، وەك چۆن کۆمنیزمی دەسەڵاتاویش بەبیانووی شوناسی چینایەتیەوە دەیان ملیۆن کەسیان لەناوبرد. تاکە جیاوازیەك ئەوەیە یەهودی نازیەکان بوو بەبورجوازی کۆمنیزم. ئەوەشی لەقوربانیدا لەهەردوو حاڵەتەکەدا شایەنی سزادانە کرداری مرۆڤێك نیە، بەڵکو چۆنایەتی ((کیفیت)) رەگەزی یان چینایەتیە. بەڵام ئەگەر لە پراکتیکی نازیەکاندا ئەم چۆنایەتیە جێگیرە، ئەوا لەپراکتیکی کۆمنیزمی دەسەڵاتاویدا جێگیرنیە. لەئەزموونی نازیزمدا یەهودیەکان دەکوژرێن، لەبەرئەوەی یەهودین، بەڵام قوربانی کۆمنیزمی دەسەڵاتاوی دەشێ سەرەتا بکوژرێ پاشان چۆنایەتیەکی چینایەتی وەك (بورژوازی) یان تەنانەت (بورژوازی بچوك) و لەهەموو حاڵەتەکانیشدا وەك (ئەندامێکی دژی بەشۆڕش)ی بۆ دابهێنرێ. (سیرگی مولغونوف) مێژونوسی سوشیالیستی لەساڵی ١٩٢٤ لەکتێبێکدا لەبەرلین لەژێر ناوی (ئیرهابی سور لەروسیا) یەکێك لەئامۆژگاریەکان دەهێنێتەوە کە لاتزیس سەرۆکی پۆلیسی سیاسی بەلشەفیەکان کە ئەو دەمە بە (تشیکا) دەناسرا، لەتشرینی دووهەمی ١٩١٨دا بۆ دەستەو دایرەکەی ناردووە (ئێمە جەنگ دژی کۆمەڵێ کەسی دیاریکراو ناکەین.. بەڵکو بورژوازی وەك چینێك لەناودەبەین... لەبەرئەوە لەکاتی لێپرسینەوەدا بەدوای ئەو بەڵگەو شتانەدا مەگەڕێن کە تاوانبار بەقسە یان

کردار دژی دەسەڵاتی سۆڤێتی چیکردووە، پرسیاری یەکەم کەپێویستە لەسەرتان ئاراستەی بکەن ئەوەیە: سەر بە چ چینێکە، ئەسڵی چیەو پەروەردەکردن‌و خوێندن‌و پیشەی چیە؟)

ئەوەی لەئەزموونی بەلشەفیدا زۆر تایبەتیەو دواتر ڕیتمی ئەزموونی کۆمنیزمی دەسەڵاتاوی پاش خۆشی دەستنیشان دەکات، گواستنەوەیە لەتوندوتیژی ڕەمزیەوە بۆ توندوتیژی کرداری (عملی) و دامەزراندنی دەسەڵاتێکی چەوسێنەرانەی ڕەها کە بە (دیکتاتۆری پرۆلیتاریا) ناونرا.. چەمکێك کە لەدەربڕینێکەوە وەرگیراوە کە بەرێکەوت لەیەکێك لەنامەکانی مارکسدا هاتووە. لەڕاستیدا لینین بەتایبەتی لە کتێبی (شۆڕشی پرولیتاریاو کاوتسکی هەڵگەڕاوە)دا کە لەساڵی ١٩١٨دا دەرچوو، تیورەسازی گەورەی چەمکی (دیکتاتۆری پرۆلیتاریا) بوو.

لەو کتێبەدا کەناومان هێنا گوتی‌و چەندانجاریش دووپاتیکردەوە کە (دەوڵەت لەدەستی چینی باڵا دەستدا ئامێرێکە بۆ تێکوپێکدانی دوژمنە چینایەتیەکانی. لەم ڕوانگەیەوە دیکتاتۆری پرۆلیتاریا جیاوازی نیە لە دیکتاتۆری چینەکانی تر). چونکە دەوڵەتی پرۆلیتاریای ئامێرێکە بۆ تێکشکاندنی بورژوازیەت. ئاشکراشە دیکتاتۆری‌و توندوتیژی کرداری، هاوڕێی هەمیشەیی یەکن. لینین دەڵێت (دیکتاتۆریەت دەسەڵاتێکە، پشت بەتوندوتیژی دەبەستێت‌و هیچ یاسایەکیش کۆنترۆڵیناکات. دیکتاتۆری شۆڕشگێڕانەی پرۆلیتاریاش دەسەڵاتێکە بەتوندوتیژی دەگیرێت‌و بەتوندوتیژیش پارێزگاری لێدەکرێ. ئەو توندوتیژیەی پرۆلیتاریا لەسەر بورژوازی پراکتیکی دەکات.. بێئەوەی هیچ یاسایەك کۆنترۆڵیبکات).

ئەم توندوتیژیە کە بەهیچ یاسایەك ڕێی لێناگیرێ، جگە لە لەناوبردنی دوژمنی چینایەتی، تیورەسازی دووهەمی خۆی لەترۆتسکیدا دەدۆزرێتەوە کە لەشەڕی ناوخۆدا سەرۆکی لەشکری سوربوو. ترۆتسکی لەکاتی شەڕەکەداو بۆ بەرگریکردن لەئیرهاب نوسی (دەتوانین و لەسەرمانە لەخەڵك بگەیەنین ئێمە لەسەردەمی شەڕی ناوخۆدا (حەرەسی سپی) لەناو دەبەین بۆئەوەی کرێکاران لەناونەبەن، یەکەم شت پێویستە بیکەین ئەوەیە دوژمن بخەینە حاڵەتێکەوە کە توانای ئازاردانی نەمێنێ، ئەمەش تەرجومە ناکرێت بۆ واقع بەلەناوبردنی دوژمن نەبێت. لەشۆڕشدا وەك جەنگ ئەوەی پێویستە بکرێت، تێکشکانی ئیرادەی دوژمن‌و ناچارکردنی بەتەسلیمبوون‌و قبوڵکردنی





مەرجەکانی سەرکەوتووە. مەسەلەی ئەوەش ئایا دەسەڵات لەوڵاتدا بۆ کێ دەبێت، واتە مەسەلەی زانینی ئەوەی ئایا بورژوازیەت بەزیندوی دەمێنێتەوە یان دەمرێت، شتێك نیە کە بەگەڕانەوە بۆ مادەکانی دەستور چارەسەربکرێت، بەڵکو تەنها بەگەڕانەوە بۆ هەموو شێوەکانی توندوتیژی چارەسەر دەکرێ).

ئەم وێنایە بۆ نەیاری سیاسی وەك ئەوەی دوژمنەوەو دەبێ لەڕێی توندوتیژیەوە لەناوببرێ، دەبێتە هۆی ئەوەی شەڕی ناوخۆ ببێت بەشێوەی هەمیشەیی خەباتی سیاسی. بەهەرحاڵ هەمیشە شەڕی ناوخۆ پێویستی بەداهێنانی دوژمن هەیە. لێرەوە جەنگی سور دژی سپی لە ١٩١٨ ، ١٩٢١دا هەر لەسەرەتاوە لەناوخۆیدا کۆمەڵێك جەنگی تری حەشاردابوو: شەڕی بەلشەفیەکان دژی سوشیالیزمە شۆڕشگێڕەکان‌و مەنەشفیکە چەپەکان، جەنگی حیزب دژی جوتیارن لەسەردەمی قاتوقڕی گەورە لە ١٩٣٢،١٩٣٣داو دواجار جەنگی دەوڵەتی ستالینی دژی سەرجەم کۆمەڵگا.

لەو فەزا هیزائیەشدا کە بیرۆکەی جەنگی چینایەتی هەمیشەیی دروستیدەکات، بەوشێوەی لەپراکتیك‌و تیۆرەی بەلشەفیدا چووە جێی بیرۆکەی مارکسیزم بۆ ململانێی چینایەتی، دەکرێت خودی (هاوڕێکانی) دوێنێش ببن بە(دوژمنەکان)و هەموو ڕقێکی چینایەتی (پیرۆزیان) بەسەردا داباریێنێت‌و ڕاپێچکرێن بۆ پاکتاوکردن‌و لەناوبردن. بەمشێوە ستالین هەزاران لیستەی لەکاتی پاکتاوکردنی گەورە لە (١٩٣٦ ـ ١٩٣٨)دا بەئیمزای خۆی مۆرکرد، کە ناوی ئەو هاوڕێیانەی تیابوو کە دەبوو لەسێدارەبدرێن. دەرئەنجامی ئەمەش لەناوبردنی ٦٩٠٠٠٠ کەس‌و گرتنی ٨،١ ملیۆن کەسیتر بوو. لەو ڕۆژگارە ڕەشەدا وەك (یۆری مارتۆف) مەنشەفی پێشبینیکرد، ئیدی (جەلاد) بوو بە (سیمای ناوەندی ژیانی روسی). بەمشێوەیە بەپێی دەربڕینی نوسەری مارکسی (فاسیلی غروسمان) کە پۆلیسی نهێنی سۆڤێتی دەستنوسەکانی لەناوبرد، (چەقۆ) بوو بە (تیورەسازی گەورەی) ئەو کوشتارگا گەورەیەی کە (وڵاتی یەکەمی سوشیالیزم) لەسەردەمی ستالیندا بەسەریهات.

خاڵی ترسناك ئەوەیە تەنانەت (پارێزەرانی هوشیاری)ش کە ئەندامی ئەنتلجنسیای روسین، نەیانتوانی خۆیان لە وەبای ئەم جەنگە چینایەتی‌و ناوخۆییە هەمیشەییە بپارێزن. بەمشێوەیە نوسەرێکی (هیومانی) گەورەی وەك گۆرگی توانی بنوسێ (سەرجەم ئەو شتانەی کاتیان بەسەرچووە، دژمان رادەوەستن، لەبەرئەوە مافی





خۆمانە، خۆمان لەجەنگێکی ناوخۆی بەردەوامدا ببینین. لێرەوە ئەو دەرئەنجامەی بەشێوەیەکی سروشتی خۆیمان بەسەردا دەسەپێنێ ئەوەیە: ئەگەر دوژمن تەسلیم نەبێت، پێویستە لەڕەگەوە دەریبهێنین) هەر لەبەر ئەمەش گورگی لەنامەیەکی کراوەدا وڵامی لایەنگرانی مافی مرۆڤی دایەوە کە ناڕەزاینامەیەکیان بەئیمزای ئەلبێرت ئەنیشتاین و توماس مان و کەسانی دی، لەسەر حوکمی لەسێدارەدانەکانی مۆسکۆ بڵاوکردبۆوە، لەو نامەیەدا دەڵێ (من ئەم لەسێدارەدانانە تەواو بەڕەوا دەزانم، چونکە بۆ دەسەڵاتی کرێکاری و جوتیاری زۆر سروشتیە کە دوژمنەکانی وەك مێرولە قەڵاچۆ بکات). بگرە گورگی خۆی نامەیەکی بۆ (رومان رولانی) هاوڕێی کە یەکێکە لەو کەم نوسەرە گەورە فەرەنسیانەی کە هیومانی و پێشکەوتنخوازن، نوسیبوو کەتیایدا دەڵێ (هەستدەکەم رولان بەوریایی و ویژدانانەتر بڕیارت لەسەر ئەو روداوە ناوخۆیانە دەدا کە لەیەکێتی سۆڤێت روودەدەن، ئەگەر بڕوا بەم راستیە سادەیە بهێنی: رژێمی سوڤێتی و پێشەنگی چینی کرێکاران، خۆیان لەشەڕێکی ناوخۆ واتە لەشەڕی چینایەتیدا دەبینن. ئەو دوو دوژمنەی کەجەنگی لەگەڵدادەکەن، و دەشبێ بیکەن ـــ ئەنتلجنسیایەیە کە هەوڵدەدا رژێمی بورژوازی بژێنێتەوە.، و جوتیاری دەوڵەمەندە کە بەبەرگریکردن لەموڵکایەتی بچوکی خۆی دەبێتە بەربەستی رەوتی کۆکردنەوە)[1]

هەر لەو ساڵەشدا ئاراگۆن قەسیدەیەکی نووسی کە لەدیڕێکدا دەڵێ (چاوە شینەکانی شۆڕش لەتوندوتیژیەکی پێویستدا، دەدرۆشێتەوە)

کەوابوو توندو تیژی تەنها لەعەقڵ و دڵی ستالیندا نەبوو. بەڵکو هەروەها بەشێوەیەکی سەرەکی لەخودی عەقڵی شۆڕشدا بوو، واتە لەتیورەکەیدا.

ئەمەش ئەو شتەیە کە لەخوێندنەوەی ئەم کتێبە رەشەی کۆمنیزمدا کە شۆڕشگێڕە کۆنەکان نوسیویانە، ئازارتدەداو دەتتۆقێنێ.

لەبەرئەوە ستیفان کۆرتوا لەدەمی هەمویانەوە وانەکە بەمشێوەیە کۆتایی پێدێنێ:

هەرچیەك نامرۆڤانەیە، شێتیە

هەرچیەکیش توندوتیژی بەرهەم دێنێ، نامرۆڤانەیە

کەوابوو هەموو توندو تیژیەك، شێتیە.

لە نامەکەی شۆلۆخۆف نوسەری (دونی ئارام) بۆ ستالین لە ٤ ی نیسانی ١٩٣٣ دا







هاوڕێ ستالین:

پارێزگای فیشنسکی وەك زۆربەی پارێزگاکانی قەفقازی باکور، نەخشەی تەسلیمکردنی گەنمی جێبەجێ نەکرد، نەك لەبەر (تێکدانێکی کۆلاگیانە) بەڵکو بەهۆی خراپی سەرۆکایەتی ناوچەیی حیزبەوە..لەکانونی یەکەمی رابردوودا لیژنەی هەرێمی حیزب پەیامێکی بۆ (پەلەکردن) لە هێرشی کۆکردنەوە بەنوێنەرێکدا نارد کە هەموو دەسەڵاتێکی پێبەخشرابوو کە ئەویش هاوڕێ ئۆفتشنکۆفە، ناوبراو ئەم هەنگاوانەی خوارەوەی نا:

دەستبەسەراگرتنی سەرجەم گەنمەکان تەنانەت بەو (سلفە) یەشەوە کە بەڕێوەبەرایەتی کۆلخۆزەکان وەك تۆو بۆ بەرهەمی ساڵێکی دی، پێشکەش بە کۆلخۆزیەکانی کردووە.

دابەشکردنی ئەو بڕە داواکراوەی کە دەبێ کۆڵخۆزیەکان بیدەن بە دەوڵەت، بەسەر هەر خێزانێکی جێی مەبەستدا. دەرئەنجامی ئەمکارانە چیبوو؟ جوتیارەکان هەر کە دەسبەسەراگرتن دەستیپێکرد، هەڵسان بە شاردنەوەی گەنم و دفنکردنی. ئەمەش هەندێك ژمارە کە دەرئەنجامی ئەو هەموو دەستبەسەراگرتنەیە: ٥٩٣٠ قنتار گەنم کە (دۆزرایەوە) .. ئەمەش هەندێك لەو شێوازانەیە کە بۆ کۆکردنەوەی ئەو ٥٩٣ (تەنە) کە هەندێکی دفنکرابوو، بەکار هێنرا.. لە ١٩١٨ وە!

شێوازی سارد: کۆلخۆزی رووت دەکرێتەوە و (لە سەرمادا) دادەنرێت.. بە رووتی لە مەخزەندا. زۆرجاریش کولخۆزیەکان بەکۆمەڵ روت دەکرێنەوەو بە کۆمەڵیش لەسەرمادا دادەنرێن.

شێوازی گەرم: پێکانی کۆڵخۆزیەکان و دامێنی تەنورەکانیان بەگاز ئاورشێن دەکرێت و ئاگری تێبەردەدرێ، پاشان ئاگرەکە دەکوژێنەوەو جارێکی دی لەسەرەتاوە دەست پێدەکەنەوە. (بلۆتکین) لەکۆڵخۆزی (نابۆلۆفسکی)دا کە نوێنەری لیژنەی پارێزگایە و خاوەنی هەمو دەسەڵاتەکانە، کۆڵخۆزیەکان ناچاردەکات لەسەر زۆپایەك راکشێن کە تا ئاستی سوربوونەوە گەرمە، پاشان بە زیندانیکردنیان بە رووتی لەمەخزەندا، (ساردیان دەکەنەوە). لە کۆڵخۆزی لیبیانسکیدا کۆڵخۆزیەکان لەبەردەم دیوارێکدا ریز دەکرێن و حوکمی لەسێدارەدانی درۆزنانەیان بەسەردا جێبەجێدەکرێ.

دەتوانم ئەم نمونانە تا بێکۆتای درێژ بکەمەوە. ئەمە ناچێتە نـاو خانـەی خـراپ بەکارهێنانی دەسەڵاتەوە، بەڵکو ئەمە شێوازی باوە لەکۆکردنەوەی گەنمدا.

ئەگەر نامەکەمت بە شایەنی بایەخدانی لیژنەی ناوەندی زانی، ئەوا کۆمۆنیـستی حەقیقی بنێرە کە ئازایەتی ئەوەی تیابێت دەمامك لەسەر سیمای ئەو کەسانە لابدات کە لەم پارێزگایەدا جەزرەبەی کوشندەیان لە بینای کۆڵخۆزیدا.

تۆ تەنها هیوامانی.

دڵسۆزت: میخائیل شۆلۆخۆڤ.

وەڵامەکەی ستالین بۆ شۆلۆخۆڤ لە (٦ ی ئایاری ١٩٣٣) دا:

هاوڕێی ئازیز شۆلۆخۆڤ

نامـەکتم بەدەست گەیـشت. رازیبـووین بـەو یارمەتییـەی داوات کردبـوو. هـاوڕێ (شکر یـاتۆڤ) م نـاردووە بۆئـەوەی چارەسـەرێك بـۆ ئەوکێـشانە بدۆزێتـەوە کـە بـۆت باسکردوم. داوات لێدەکەم یارمەتیبدەی. بەڵام هاوڕێ شـۆلۆخۆڤ: ئەمـە هـەموو ئـەو شـتانە نیـە کـە دەمـەوێ پـێتی بڵـێم. چـونکە نامەکـەت وێنەیـەك دروسـتدەکات کـە ناتوانم بە بابەتی وەسفیبکەم. بەم بۆنەیەوە دەمەوێ چەند رستەیەکت بۆ بنووسم.

سـوپاسکردی بـۆ نامەکـەت کـە ئاشـکرای نەخۆشـیەکی بـچوك لـە دەزگاکەمانـدا دەکات و دەریدەخات کە هەندێ فەرمانبەری حیزب بەهۆی ئارەزووی پێشکەشکردنی کـاری باشـەوە، واتـە بـۆ چـەککردنی دوژمنـەکانمان، دەسـتدرێژی دەکەنـە سـەر هاورێکانمانو رەنگە تـا ئاسـتی سادیەت زیادەرەوییبکـەن. بـەڵام ئـەم سـەرنجانە مانـای ئەوە نیە بۆ هەموو شتەکان لەگەڵتام. تۆ تەنها لایەکی شـتەکان دەبـینیو بەوشـێوەیە نـایبینی کـە پێویـستە. بـەڵام ئـەوە تـەنها لایەنێکـە. بۆئـەوەی هەڵـەش لەسیاسـەتدا نەکەیت نامەکانیشت بابەتی ئەدەبی نین، سیاسی رووتن — دەبێ روەکـەی تـری واقـع ببـینی. روەکـەی تریـشی ئەوەیـە جوتیـارە بـەرێزەکانی پارێزگاکـەت — بەتـەنها هـەر پارزێزگاکـەی ئێـوە نـا — دەسـتیان بـە مـانگرتن و تێکـدانکردو بەمەبەسـت سـوپای سوریان بـەبێ نـان هێـشتەوە! ئەگـەر ئـەم تێکدانـەش لەروکەشـدا بەبێـدەنگی (و بـێ رژانـی خـوێن) بەرێوەچـوو، ئـەوا ئەمـە هـیچ لەجەوهـەری مەسـەلەکە ناگۆرێـت کـە ئەویش ئەوەیە جوتیارە بەرێزەکان جەنگێکی تێکدەرانـەیان دژی دەسـەڵاتی سـۆڤێتی بەرپاکردووە.







جەنگ تا مردن، ئەی هاوڕێ شۆلۆخۆڤی ئازیز!

بێگومان ئەم دیاریکردنانە رەوایەتی بـەو شـێوازە توندوتیژانـە نـادات کـە بـەپێی تەقدیری تۆ، فەرمانبەرەکانمان ئەنجامیانـداوە. لەبەرئـەوە لەسـەر ئـەو رەفتارانـە لـە تاوانبـاران دەپێـچێنەوە. بـەڵام ئـەوەی وەك رۆژی روون دیـارە ئەوەیـە جوتیـارە بەرێزەکانمان مەرِی مردوو نـین وەك ئـەوەی یـەکێ نامەکـەی تـۆ بخوێنێتـەوە، واتێـی دەگات.

داوای باشترین تەندروستیت بۆدەکەم. تەوقەت لەگەڵ دەکەم.

دڵسۆزت: ج. ستالین.

## پەراوێز:

بۆئـەوەی سـتەم لـەگورگی نەکـەین دەبـێ ئـەوەش بڵـێین کـە پـێش ١١ سـاڵ و بەدیاریکراوی لە ٦ ی ئەیلولی ١٩١٩ دا و لەسەر گرتنی دەیان زانا لەوکاتەدا، نامەیـەکی نارەزایی بۆ لینین نارد کە تیایدا هاتووە (بە بڕوای مـن سـامان و هێـزی هـەر گـەلێك بە چەندایەتیو چۆنایەتی وزەی فکری، دەپێورێ.

شۆڕشیش هیچ مانایەکی نیە ئەگەر هانی پێشکەوتن و پەرەسەندنی ئەم وزەیە نەدات. دەبێ پیاوانی زانست بەحورمەتو ڕێزێکی زۆرەوە مامەڵەیان لەگەڵبکرێ. ئێمە لەکاتێکدا وادەزانین خۆمان ڕزگاردەکەین، ئەوا سەری گەل دەبڕینو دەماغی لەناو دەبەین).

لینینیش بەهەمان توندڕەوی ناسراوی خۆیەوە لەسەر ڕۆشنبیران، وەڵامیدایەوە (هەڵەیە گەر هێزە فکرییەکانی گەلو هێزە ئەنتلجنسیای بورژوازی تێکەڵبکەین. هێزی فکری کرێکاران و جوتیاران لە تێکۆشاندا لەدایك و گەورە دەبێت بۆ ڕمانی بورژوازیو نوێنەرانی: ئەو ڕۆشنبیرە زەڕیانەی، خزمەکاری سەرمایەدارنو بەخەیاڵی خۆیان دەماغی گەلن.. بەڵام لەڕاستیدا ئەوانە دەماغی نین، بەڵکو گووەکانین).

تێبینی: ئەم وتارە لە گۆڤاری (ابواب – عدد ١٨ – ساڵی ١٩٩٨) دوە وەرگیراوە کە (دار الساقی) دەریدەکات.

Stephan courtois et Autres Lelivere Noir du commnisme *
Pages، 84، Paris – 1997،Edition Laffont،

## پەرەسەندنی تێڕوانینی فرۆید بۆ توندوتیژیو وێرانکاری

**ن. ئەریك فرۆم**

ڕەنگە بەرجەستەترین ڕەگەز لەلێکۆڵینەوەی فرۆیدا دەربارەی توندوتیژی







ئەوەبێت کە تا ساڵی ١٩٢٠ کەمتر سەرنجی لەتوندوتیژی و وێرانکاری مرۆیی داوە. خودی فرۆید چەند ساڵ دواتر لە"ژیارو خراپەکانیدا" ١٩٣٠ ئەم سەرگەردانیەی بەمشێوەیە دەربڕی "بەڵام چیدی ناتوانم تێبگەم چۆن توانیومانە ئامادەبوونی هەمەلایەنی وێرانکاریو توندوتیژی ناسێکسی لەبەرچاو نەگرین و نەمانتوانیوە لەتەفسیری خۆماندا بۆ ژیان جێگەی شایستەی خۆی پێبدەین"(١).

بۆ تێگەیشتن لەم کوێربوونە سەرسوڕهێنەرە، وا باشە خۆمان لەجێی چینە ناوەڕاستەکانی کۆمەڵگای ئەوروپی پێش یەکەمین جەنگی جیهانی دابنێین. لەساڵی ١٨٧١ وە هیچ جەنگێکی سەرەکی لەئارادا نەبوو. بورژوازی هەم لەرووی سیاسیو هەم لەڕووی کۆمەڵایەتیەوە بە شێوەیەکی بەردەوام پێشدەکەوت و بەهۆی باشبوونی بەردەوامی هەلومەرجی چینی کرێکاریشەوە، دوژمنایەتی نێوان چینەکان کەمتر دەبینرا. جیهان ئاشتیخوازانە دەردەکەوتو هەرچی زیاتر شارستانیتر دەبوو. بەتایبەتی کاتێك هیچ سەرنجێك لەبەشی گەورەتری نەژادی مرۆڤ نەدەدرا کە لەئاسیاو ئەفریقاو ئەمریکای باشوردا لەهەلومەرجێکی فەقیری ئاشکراو دزێودا دەژیان. وێرانکاری مرۆڤ وەك هۆکارێك دەردەکەوت کە لەسەدە تاریکەکان و پێش ئەواندا دەورێکی هەبوە، و بەڵام ئەم سەردەمە جێی خۆیداوە بە عەقڵ و خێرخوازی. ئەو گرفتە دەروونیانەی دەردەکەوتن ئەو گرفتانە بوون کە سەرچاوەکەیان دەگەڕایەوە بۆ بنەما ئەخلاقیە لەرادەبەدەر سەختگیرانەی چینی ناوەڕاست، و فرۆید ئەوەندە لەژێر کاریگەری ئەو بەڵگانەدا بوو کە پەیوەندی بە دەرئەنجامە خراپەکانی سەرکوتکردنی جنسیەوە بوو، کە نەیتوانی گرنگی مەسەلەی توندوتیژی بزانێت، تا ئەوکاتەی کە بەهۆی یەکەمین جەنگی جیهانیەوە چیدی نەیدەتوانی فەرامۆشیبکات، ئەم جەنگە هێڵێکی دابەشکەرە لەپەرەسەندنی تیۆرەی فرۆیدا دەربارەی توندوتیژی.

فرۆید لە"سێ وتار لەبارەی تیۆرەی جنسیەوە" (١٩٠٥) توندوتیژی بە یەکێك لە"غەریزە لاوەکیەکان"ی غەریزە جنسیەکان دادەنا. دەنوسێت "بەمشێوەیە سادیزم پەیوەستە بە بەشی توندوتیژی غەریزەی جنسیەوە کە سەربەخۆ بوەو زیادیکردوە و بە [هۆی میکانیزمی] جێگۆڕکێوە، جێگەیەکی بالادەستی داگیرکردووە"(٢).

بەهەرحاڵ وەك زۆربەی بابەتەکانی دی لەنووسینەکانی فرۆیددا بە پێچەوانەی

هێڵی سەرەکی تیۆری خۆیەوە، بیرۆکەیەکیش هەبوو کە دەبوو تا ماوەیەکی زۆر بەدەست لێنەدراوی بمێنێتەوە. لەبەشی چواری سێ وتاردا دەنوسێت "دەکرێ گریمانەی ئەوە بکەین ئەنگێزەکانی توندوتیژی لەو سەرچاوانەوە هەڵدەقوڵێن کە لەراستیدا لەئارەزووی جنسی سەربەخۆن، بەڵام لەقۆناغە سەرەتاییەکاندا لەگەڵیدا یەکدەگرن"(٣).

بەڵام لەگەڵ ئەم دەربڕینەشدا چوار ساڵ پاش ئەمە، فرۆید لەبەسەرهاتی هانزی بچوکدا زۆر راشکاوانە لەشیکردنەوەی ترس لەمناڵێکی پێنج ساڵەدا گوتی: "ناتوانم خۆم بەوە قایلبکەم کە لەبەرامبەر غەریزە ئاشناکانی پاراستنی خودو غەریزەی جنسیدا، بەهەمان گرنگیەوە بوونی غەریزەیەکی توندوتیژی بەگریمانە وەربگرم"(٤). لەم یاساڕێژکردنەدا دەکرێ بوونیی دوودڵییەکی دیاریکراو لەدەربڕینەکەی فرۆید دەستنیشان بکەین. "ناتوانم خۆم قایل بکەم" بەتەواوی و بە هێزەوە بەمانای نەفی سادەو کامڵ نیە، وەسفی زیادەی "بەهەمان گرنگیەوە" پێدەچێ کە ئەو ئەگەرە بهێڵێتەوە کە رەنگە توندوتیژیەکی سەربەخۆ هەبێت، ئەگەرچی هەمان ئەو گرنگیەی ئەو دوانەی دی نەبێت.

فرۆید لە"غەریزەکان و ئاڵوگۆڕەکانیدا" ١٩١٥ درێژەی بەهەردوو هێڵە فکریەکە دا [واتە] وێرانکاری وەك بەشێك لەغەریزەی جنسی و وەك هێزێکی سەربەخۆ لەئارەزووی جنسی.

" سەرەتاترین قۆناغەکانی عەشق وەك ئامانجە جنسیە تێپەڕەکان دەردەکەون، لەکاتێکدا کە غەریزە جنسیەکان بە پەرەسەندی ئاڵۆزی خۆیاندا تێدەپەڕەن. وەك سەرەتای ئەم ئامانجانە، دەستنیشانی قۆناغی خۆگونجاندن یان قوتدان دەکەین. نمونەیەك لەعەشق کە بە لەناوبردنی بوونی جیاوازی شتەکەوە خۆگونجێنەرەو لێرەوە دەکرێت وەك دوو هەستی دژبەیەك و هاوکات پێناسەی بکەین. لەقۆناغی بالاتردا دەزگای "پێش تەناسولی سادیستی- کۆمی"دا، هەوڵدان لەپێناوی شتدا وەك ئارەزوویەك بۆ دەسەڵاتداری دەردەکەوێت کە لەناوبردن یان زیانگەیاندن بەشت هیچ گرنگیەکی بۆی نیە. لەم قۆناغە سەرەتاییەدا جیاکردنەوەی ئەمشێوەیەی عەشق لەرق لەسەیرکردنیدا بۆ شت، ئەستەمە. تا کاتێك کە دەزگای تەناسولی دروست







نەبووبێ، عەشق لەبەرامبەر رقدا ناوەستێت" *(٥)*.

بەڵام فرۆید هەر لەم وتارەدا هەڵوسێتێکی دیش هەڵدەبژێرێ کە لەسێ وتاردا بەیانکراوە -ئەگەرچی تا ساڵی ١٩١٥ گۆڕانی بەسەردا هاتبوو- واتە قبوڵکردنی توندوتیژی سەربەخۆ لەغەریزەی جنسی. ئەم گریمانەیەی دی بڕوایوایە غەریزەکانی خود سەرچاوەی توندوتیژین. فرۆید دەنوسێت:

"رق وەك پەیوەندیەك بە شتەکانەوە دێرینترە لەعەشق. سەرچاوە لەنکوڵیکردن لەیەکەم جیهانی دەرەکی لەگەڵ لێشاوی بزوێنەرەکانیدا، بەهۆی خودێکی نەرجسیەوە دەگرێ. وەك دەربڕینێك لەکاردانەوەیەکی ناشاد کە بە هۆی شتەکانەوە وروژێنرابێ، هەمیشە لەپەیوەندیەکی نزیکدا دەبێت بە غەریزەکانی پاراستن لەخودەوە، بەشێوەیەك کە غەریزەکانی خودو غەریزە جنسیەکان دەتوانن ئانتی تزێك پێشکەشبکەن، کە ئانتی تزی عەشق و ڕق دووبارە دەکاتەوە. کاتێك غەریزەکانی خود بەسەرکرداری جنسیدا زاڵ دەبن، وەك لەقۆناغی رێکخراوی سادیستی کۆمیدا شتێکی وا دێتەپێشەوە، خەسڵەتەکانی رق بە ئامانجی غەریزی دەدات" (٦).

لێرەدا فرۆید گریمانەی ئەوە وەردەگرێ کە رق دێرینترە لەعەشق و رەگی لەغەریزەکانی خود یان غەریزەکانی پاراستن لەخود دایە، کە بەر لەهەر شتێك "پرۆسەی بزوێنەرە" هەبووەکانی جیهانی دەرەوە ئینکار دەکات و ئانتیتزی ئەنگێزە جنسیەکانە. لێرەدا باشتر وایە ئاماژە بەوە بدەین ئەم هەڵوێستە، گرنگیەکی زۆری بۆ سەرجەم نموونەی مرۆڤی فرۆیدی هەیە. منداڵ بە شێوەیەك دەرکدەکرێ کە بەر لەهەر شتێك نکوڵی لەبزوێنەرەکان دەکات و رقی لەجیهانە لەبەر دەستێوەردانەکانی. ئەم هەڵوێستە لەگەڵ هەڵوێستێکی دیدا کەبە بەڵگەی کلینیکی زۆر سەلمێنراوەو بەتازەیی پەیدابووە، جیاوازە. هەڵوێستەکەی دی پیشانیدەدات مرۆڤ و تەنانەت ئەو کۆرپەلەیەی کە چەند رۆژێك بەسەر لەدایکبوونیدا تێدەپەڕێ، ئارەزوومەندی بزوێنەرەکانەو پێویستی پێیانە، هەمیشە رقی لەجیهان لەبەر دەستێوەردانەکانی نیە.

فرۆید لەهەمان ئەو وتارەدا لەیاساڕێژی خۆیدا بۆ رق، هەنگاوێك لەمەش زیاتر دەنێت:

خود رقی لەهەموو ئەو شتانەیە کە سەرچاوەی هەستێکی ناخۆشن، لەو شتانە دەترسێتو بە مەبەستی لەناوبردنیان بەدویان دەکەوێت، بێئەوەی رەچاوی ئەوەبکات ئایا ئەوانە بە مەبەستی ناکامکردنی خۆشنوودی جنسی یان تێرکردنی پێداویستیەکانی پاراستن لەخود دەبن یان نا. لەراستیدا دەکرێ بگوترێت کە نموونەی سەرەتای و راستەقینەکانی پەیوەندی نەك لەژیانی جنسیەوە، بەڵکو لەململانێی خودەوە بۆ پارێزگاریو پاراستنی خۆی سەرچاوە دەگرێت"(٧)

یەکەم قۆناغی بیرکردنەوەی فرۆید لەبارەی وێرانکاریەوە، بە وتاری غەریزەو ئاڵوگۆڕەکانی تەواو دەبێت. بینیمان فرۆید هاوکات دوو تێڕوانینی بەیەکەوە دەبردە پێش: وێرانکاری وەك بەشێك لەئارەزووی جنسی (سادیسمی دەمی و کۆمی) و وێرانکاری کە سەربەخۆ لەغەریزەی جنسییە، وەك خەسڵەتێکی غەریزەکانی خود کە دژی دەستێوەردانی بزوێنەرە دەروونیەکانەو رقی لێیەتی و رێگرە لەتێرکردنی پێداویستیە جنسیو پێداویستیەکانی پارێزگاری خود.

لەساڵی ١٩٢٠دا بە میتابنەڕەتی لەزەت" **Beyond the Pleasure princip** فرۆید دووبارە پیاچوونەوەیەکی بنەڕەتی لەبارەی تیۆرەی غەریزەکانەوە دەستپێدەکات. لەم بەرهەمەدا فرۆید خەسڵەتەکانی غەریزە دەگەڕێنێتەوە بۆ "وەسواسی دووبارەکردنەوە" کە خەسڵەتەکەی بەشێوەیەکی درێژتر لە"من و ئەو"دا (١٩٢٣) و لەنووسینەکانی تریدا دەخاتە ژێر باسەوە. ئەم دوالیزمە تازەیەی غەریزەکانی ژیان (عەشق) و مەرگ دەبێتە جێنشینی دوالیزمی یەکەمی غەریزەکانی جنس و خود. گەرچی فرۆید هەوڵدەدات ئیرۆس لەگەڵ وزەی دەروونی جنسیدا بەیەك شت دابنێت، بەڵام دوو جەمسەریە تازەکەی بۆ ئارەزوو چەمکێکی یەکسەر جیاواز لەتێڕوانینی پێشوو دەخاتە ڕوو.

فرۆید لە**ژیارو ناخۆشیەکانی**دا (١٩٣٠) خۆی روونکردنەیەکی کورت لەبارەی پەرەسەندنی تیۆرە تازەکەیەوە پێشکەشدەکات. دەنوسێت:

لەسەرەتادا غەریزەکانی خودو غەریزەکانی بابەت لەبەرامبەر یەکدا راوەستان. وشەی لیبیدۆم بۆ ئاماژەکردن بە وزەی دووهەمیو تەنها بۆ غەریزەکانی دووهەم بوو کە بەکارمهێنا. بەمشێوەیە ئانتی تزی نێوان غەریزەکانی خودو غەریزەکانی "جنسی" عەشق (بە فراونترین مانای خۆی) کە رووی لەبابەتەکان کردووە.. بەڵام







[بە سەرنجدان لەسادیزم] توانرا بەسەر ئەم پەرش و بڵاویەدا زاڵبین. بەدەر لەهەر شتێك سادیزم بەئاشکرا بەشێکە لەژیانی جنسی کە لەچالاکیەکانیدا دلڕەقی دەتوانێت جێگەی سۆز بگرێتەوە.. هەنگاوی کاریگەر بۆ پێشەوە بە ناسینی چەمکی نەرجسی بوو.. واتە ئەو دۆزینەوەیە کە وزەی دەروونی دەتوانێت لەسەر **"خود"** چەقبگرێت کە لەراستیدا خۆی جێگەی سەرەکی وزەی دەروونیە و تارادەیەك وەك ناوەندی بەڕێوەبردنی وایە.. هەنگاوی دوای من لەکتێبی "میتابنەڕەتی لەزەتەوە" (١٩٢٠) نرا. کاتێك کە وەسوەسەی دووبارە بوونەوەو خەسڵەتی پارێزگارانەی ژیانی غەریزی بۆ یەکەمجار سەرنجی راکێشام. بە دەستپێکردن لەئەندێشە تیۆریەکانەوە لەبارەی سەرەتای ژیان و هاوکات [بە دەسپێکردن لە] سەرنجە بایەلۆجیەکانەوە بەو ئامانجە گەیشت کە سەرەڕای غەریزەی پارێزگاری ماوەی گیاندارو پەیوەستبوونی بە یەکە گەورەترەکانەوە، دەبێ غەریزەیەکی دی بوونی هەبێت کە لەهەوڵی دابڕانی ئەو یەکانەو گەڕانەوەیانە بۆ حاڵەتی سەرەتاییو نا ئۆرگانیمان. واتە سەرەڕای ئیرۆس، غەریزەی مەرگیش بوونی هەیە"(٨).

کاتێك فرۆید کتێبی **" میتا بنەڕەتی لەزەتی"** نووسی، بەهیچ شێوەیەك بڕوای بەوە نەبوو گریمانە تازەکەی بایەخێکی هەبێت. فرۆید دەنوسێ: "دەکرێ بپرسرێ ئایاو تا چ ئەندازەیەك خودی خۆم بڕوام بە حەقیقەتی ئەم گریمانانە هەیە کە لەم پەڕانەدا پێشکەشمکردوە. وەڵامی من ئەوەیە کە من خۆم قەناعەتم نەکردوە و بە دوای قەناعەت پێکردنی کەسیشدا نیم بۆ ئەوەی قبوڵیان بکات.؟ یان بەشێوەیەکی وردتر نازانم تا چ ئەندازەیەك بڕوام پێیانە"(٩).

پاش ئەوەی هەوڵیدا بینایەکی تیۆری تازە دابمەزرێنێ، بینایەك کە هەڕەشەی لەزۆربەی چەمکەکانی پێشوویدەکرد، و پاش ئەنجامدانی ئەمکارەش بەکۆششی بیرکردنەوەیەکی مەزن، ئەم راستگۆییەی فرۆید کە بەمشێوەیە لەسەرتاسەری نووسینەکانیدا دەدرەوشێتەوە، بەتایبەتی کار لەمرۆڤ دەکات. فرۆید هەژدە ساڵی دوایی تەرخانکرد بۆ ئەم تیۆرە تازەیەو هێواش هێواش بە چەمکێکی باوەڕ گەیشت کە لەسەرەتادا خاوەنی نەبوو. نەك بەو مانایەی هەندێك لایەنی تەواو تازەی بەم گریمانەیە بەخشی بێت، ئەوەی کردی پتر "تاو تویکردنی" بیرکردنەوە بوو کە

باوەڕی پێهێنا. ڕەنگە زۆر نائومێدکەرانەش بێ گەر بزانین، ئەو لایەنگرانەی بە راستی لەروانینەکانی تێگەیشتن و دەستیان تیایدا هەبوو، زۆر نەبوون.

تیۆرە تازەکە یەکەم دەربڕینی کامڵی خۆی لە"من و ئەو"دا (١٩٢٣) دۆزیەوە. ئەم گریمانەیە خاوەن گرنگیەکی تایبەتە کە:

"پرۆسەیەکی فیزیولۆژی تایبەت پەیوەندی بەهەر یەك لەدوو چینە غەریزەییەکانەوە دەکات، لەهەر ناوکێکی مادەیەکی گیانداردا هەردوو جۆری غەریزە هەرچەند بەڕێژەی نایەکسان، چالاکدەبن، بەشێوەیەك کە یەك مادە دەشێت نوێنەری بنەڕەتی ئیرۆس بێت. بەهەرحاڵ ئەم گریمانەیە هیچ تیشکێك ناخاتە سەر شێوەی پێکهاتن و تێکەڵاوبوون هەردوو چینی غەریزەکان. بەڵام ئەمە بەشێوەیەکی ڕێکخراو و زۆر فراوان بۆ ئەو گریمانەیەی کە بۆ تێڕوانینی ئێمە پێویستە. ڕوودەدات. پێدەچێ بەهۆی پێکهاتەی ئۆرگانیزمە یەك خانەیەکان لەشێوەی فرەخانەی ژیاندا، غەریزەی مەرگ [وەك] خانەیەکی جیابۆوە دەتوانێت بەشێوەیەکی سەرکەتووانە لەکار بخرێت و ئەنگێزە وێرانکەرەکان بەهۆی هاوکاری رەگەزێکی تایبەتەوە، بگەڕێنرێتەوە بۆ جیهانی دەرەوە. پێدەچێ ئەم ڕەگەزە تایبەتە دەزگای عەزەلات بێت و بەمشێوەیە غەریزەی مەرگ -ئەگەرچی ڕەنگە تەنها تا رادەیەك-وەك غەریزەی وێرانکردن دەردەکەوێت کە دژی دنیای دەرەوەو ئورگانیزمەکانی دی، ئاراستەی وەرگرتوە"(١٠).

فرۆید لەم یاسابەندیەدا لایەنی تازەی بیرکردنەوەی بەشێوەیەکی ئاشکراتر لە **میتابنەڕەتی لەزەتدا** ئاشکرا دەکات. لەجێی رەوتی فیزیۆلۆژی -میکانیکی تیۆرەی پێشوو کە لەسەر بناغەی نمونەی هەژان بەشێوەیەکی کیمیایی دروستکراوە و پێداویستی بە کەمکردنەوەی ئەم هەژانە بۆ ئاستی ئاسایی (بنەڕەتی شادی) خۆی هەیە، رەوتی تیۆرەی تازە رەوتێکی بایەلۆجیانەیە کە بە پێی ئەمە، هەر خانەیەکی زیندوو بە خاوەن دوو خەسڵەتی سەرەکی مادەی گیاندار دادەنرێ. ئیرۆس و ململانێ بۆ مەرگ. بەهەرحاڵ تێزی کەمکردنەوەی هەژان بە شێوەیەکی بونیادی تر پێشکەش دەکرێت: کەمکردنەوەی هەژان بۆ سفر (بنەڕەتی نێرڤانا).

فرۆید ساڵێك پاش ئەمە (١٩٢٤) لە"**مەسەلەی ئابوری مازوشیزم**"دا هەنگاوێکی دی بۆ روونکردنەوەی پەیوەندی نێوان دوو غەریزەکە دەنێت. دەنوسێ:







"ئەرکی وزەی دەروونی جنسی ئەوەیە کە غەریزەی وێرانکەری بێزیان بکات و ئەم ئەرکەش بەئاراستەکردنی ئەم غەریزەیە تا ئەندازەیەك بەرەو دەرەوە، بەرەو شتەکانی جیهانی دەرەوە -پاشان بەیارمەتی سیستەمێکی ئۆرگانیکی تایبەت بە ناوی دەزگای عەزەلاتەوە، ئەنجامدەدات. کەوابوو ئەم غەریزەیەیان بە غەریزەی وێرانکاری، غەریزەی پەیوەست بە دەسەڵاتداریەوە یان ئیرادەی روو لەهێز ناوناوە. بەشێك لەم غەریزەیە راستەوخۆ لەخزمەت کرداری جنسیدایە کە تیایدا کاریگەریەکی گرنگی دەبێت. ئەم سادیزمە کامڵە. بەشێکی دی لەجیگۆڕکێی روو لەدەرەوەدا بەشدار نیە، [بەڵکو] لەناو ئورگانیزمدا دەمێنێتەوەو بە یارمەتی ورژانی جنسی هاوڕێی، کە روونمانکردەوە، لەرووی جنسیەوە لەوێدا دەستبەسەر دەمێنێتەوە. لەم بەشەدایە کە دەبێ مازوشیزمی شەهوەتئامێزی بنەڕەتی بدۆزینەوە.(١١).

فرۆید لە"وتاربێژی پیشەکیە نوێکاندا" ١٩٣٣ هەڵوێستی پێشوو دەپارێزرێ، فرۆید باس لەغەریزەکانی عەشق دەکا کە "لەهەوڵی پێکەوەگرێدانی هەرچی زیاتری مادەی زیندوودایە بەشێوەی یەکەگەلێکی گەورەترو غەریزەی مەرگ کە رووبەڕووی ئەم هەوڵە دەوەستێتەوەو ئەوەی کە زیندووە دەگەڕێتەوە بۆ حاڵەتی نائۆرگانی"(١٢). فرۆید لەهەمان وتاربێژیدا لەبارەی غەریزەی وێرانکاری سەرەتاوە وای نووسی:

"تەنها لەدوو هەلومەرجدا دەتوانرێ دەرکبکرێ: ئەگەر لەگەڵ غەریزەکانی عەشقدا یەك بگرن بەشێوەی مازۆشیزم یان ئەگەر -بە بڕێك شەهوانیەتی زۆرتر یان کەمتر- دژی جیهانی دەرەوە ئاراستە وەربگرن، بەشێوەی توندوتیژی. ئەو کاتەش بەهۆی گەورەیی ئەم ئەگەرەوە هوشیاربووینەتەوە، کە ڕەنگە توندوتیژی بەهۆی رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ بەربەستە واقعیەکاندا، نەتوانێت لەرێی جیهانی دەرەوەوە تێر بکرێت، لەحاڵەتی ڕووداوێکی وادا ڕەنگە پاشگەز بێتەوە و ئاستی خۆ وێرانکاری کە بەردەوام لەدەروونیدا کاریگەرە، زیادبکات. دەبینین ئەمە لەراستیدا هەمان ئەو شتەیە کە روو دەدات و چ پرۆسەیەکی گرنگیشە. پێدەچێ تووندوتیژی راگیراو هەڵگری زیان پێگەیاندنێکی جدی بێت، لەراستیدا وا دێتە پێشچاو، وەك ئەوەی پێویست بێت، شتێکی دی یان کەسێکی دی لەناوبەرین بۆ ئەوەی خۆمان لەناو

نەبەین. **[دواجار]** بۆ ئەوەی خۆمان لەئەنگێزەی خۆ وێرانکاری بپارێزن. **[ئەمەش]** لەراستیدا پەردە هەڵماڵینێکی جێی داخە بۆ مامۆستایانی ئەخلاق!"(١٣)

فرۆید لەدوا دوو نوسیندا کە دوو ساڵێك پێش مردنی خۆی نووسی، گۆڕانکاریەکی گرنگی لەو چەمکانەدا نەکرد، کە لەو ساڵانەی پێشودا پێشکەشی کردبوو. له"**شیکردنەوەی کۆتادار و ناکۆتایدا**" ١٩٣٧ دیسان زیاتر جەختی لەهێزی غەریزەی مەرگ کرد. وەك چۆن "ستراچی" لەیاداشتەکانی ڕێکخەر [ویراستار] دا دەیهێنێتەوە "بەڵام بەهێزترین هۆکاری ڕێگر، هۆکارێك کە لەسەرو هەموو ئەگەرێکی کۆنترۆڵەوە دەبێت.. غەریزەی مەرگە"(١٤). فرۆید لە"نەخشەی دەروونشیکاری"دا لەساڵی ١٩٣٨دا نووسراوە، لەساڵی ١٩٤٠دا بڵاوبوەوە، بە شێوەیەکی ڕێکخراو گریمانەکانی پێشووی خۆی بێ هیچ گۆڕانکاریەك سەرلەنوێ دەسەلمێنێتەوە.

سەرچاوە:


١- Freud. S. (1930). Civilization and its Pisontents S. F. Vol. 21.

٢- Freud, S. (1905). Three Essays and the theory of sexuolity. S. E, Vol. 7.

٣- I bid.

٤- Freud. S. (1909). Abalysis of a Phobia in a Five- Year- old boy. S. E. Vol. 10.







٥- Freud. S. (1915) Instincts and Their vicissitvdes. S.E, Vol. 14.

٦- I bid.

٧- 7-I bid

٨- Freud. S. (1930) Civilization..

٩- Freud. S. (1920) Beyond the Pleusure Principle. S. E. Vol. 18.

١٠- Freud. S. (1923): the Eyo and thelld. S. E. Vol. 19.

١١- Freud. S. (1924). Economic Probem of Masochism. S. E. Vol. 19.

١٢- Freud. S. (1933). New Introductory Lectures S. E. Vol. 21.

١٣- I bid.

١٤- FrEUD. S. (1937). Analysis Terminable and Interminutle. S. E. Vol. 23.


ئەم وەرگێڕانە لەبەشی یەکەمی ئەو پاشکۆیەوە وەرگیراوە کە لەکۆتایی ئەم کتێبەدا هاتووە:

أناتومی ویرانسازی: ئەریك فرۆم-ت: ١. جبوری. نشر فرهنگ. چاپ دوم ١٣٦٤ ص. ٦٦٠-٦٧٠.

## ڕەخنە لەفاشیزم

## ستیوارت هیوز

"هیچ پێشبینیەك بەدرێژایی سەدەیەك پێشبینی، هەرگیزوێنای شتێکیوەك فاشیزمی نەدەکرد. لەدامێنی ئاسۆی داهاتوودا، کۆمنیزمو سەندیکالیزم هاوشێوەکانی هەبوون، جەنگو ئاشتیو تۆفانی نوحو پان ژێرمانیزمو پان سلاڤیزم هەبوو، فاشیزم نەبوو. فاشیزم هەمووانی حەپەسان" ئەمە قسەی جۆزێ ئانتۆنیۆ بۆرگسێیە کە بیری لەو جموجوڵە دەکردەوە کە لەوڵاتەکەی ڕاوی نابوو، (لەهەمانکاتدا) سەرلێشێواو سەرسوڕمانی ڕۆشنبیرانی لەبینینی دیاردەیەك دەردەبڕی کە هیچ





یەکێکیان پێشبینی نەکردبوو.. شتێکی ئەوتۆ نەمابوو کە هەموو ئەو ئایندەبینیە ئاڵتونیانە لەناوبەرێت کە لەسەدەی نۆزدەوە بە سەدەی بیست گەیشتبوو.

ڕۆشنبیرانی ئەوروپا حەپەسابوون، چونکە نەیاندەزانی بزوتنەوەکانی پەیڕەوی هیتلەرو مۆسۆلۆنی لەکوێوە بگرن‌و هەڵیسەنگێنن. نوسەران‌و مامۆستایانی زانکۆ ڕاهاتبوون بە قسە بچنە ناو هەر بگرەو بێنەیەکەوە، بەڵام لەبارەی فاشیزمەوە قسە کەسی ڕێنمایی نەدەکرد کە چ شتێك ڕوودەدات. زمان چوبووە دۆخی هەڵخەڵەتاندن‌و وروژاندن‌و خەوتنەوە، نەك ڕونکردنەوەو دەرخستن. درز لەنێوان ڕەفتارو گوتاردا، سنورە ئاساییەکانی ڕێورەسمی سیاسەتی بە چەندان فرسەخ بڕیبوو. بەتایبەتی ڕوون نەبووبۆوە ئایا فاشیزم بزوتنەوەیەکی کۆنەپەرستە یان شۆڕشگێر؟ ئایا ڕاستڕەوە یان چەپڕەو. زۆربەی ئەو کەسانەی دەستیاندەکرد بەشیکردنەوەی، دەیانبینی فاشیزم لەچ خاڵێکی ڕەوتی مێژووی هاوچەرخەوە سەرچاوەیگرتووە: دەیانبینی سەرچاوەکەی یەکێتی نەتەوەیی ناتەواوی ئیتاڵیاو ئەڵمانیاو شکست‌و نائومێدی خەڵکی ئەو دووولاتە لەجەنگی جیهانی یەکەم‌و لێکترازانە ئابوریەکانی دوابەدوای جەنگ‌و بێکاری گشتی لەسەرەتاکانی دەیەی ١٩٣٠دا. کەسانێك کە زۆرتر دەچونە قوڵای مەسەلەکانەوە باسی جۆرێك نەگونجانی کۆمەڵگاکانی ئیتاڵیاو ئەڵمانیایان دەکرد، جیاواز لەکۆمەڵگاکانی فەرەنساو ئینگلتەراو قبوڵکردنی سنوردارتری بەها دیموکراتیەکان لەلایەن چینی ناوەڕاستەوە. بەڵام ئاشکرا بوو ئەم هۆکارە پەرتوبڵاوو دابڕاوانە بەس نییە. فاشیزم خاوەن دینامیکیەت‌و هێزێك بوو کە لەهیچ پێوەرێکی سادەدا جێی نەبۆوە.

بەڵام شتێك هەبوو کە هەموان — چ کەسانێك کە لەئەوروپا مابونەوەو چ ئەوانەی کە کۆچیان بۆ ئەمەریکا کردبوو — لێی دڵنیابوون، ئەویش ئەوەبوو کە ئەو ڕژێمەی لە١٩٢٢ لەئیتاڵیاو یانزە ساڵ دوای ئەوە لەئەڵمانیادا هاتە سەر حوکم، ناوێك زیاتری نەبوو. دیارە بێ هۆ نەبوو مۆسۆلۆنی دەیەیەك پێش هیتلەر سەرکەوتبوو، هەروەها بێگومان هیتلەر رکێفی شتەکانی توندتر گرتبوو، چەندانجاریش لەمۆسۆلۆنی کە نمونەی هیتلەر بوو، زیاتر باوەڕی بە "ڕەگەز" هەبوو. بەڵام ئەمانە هەمووی مەسەلەی زەمانمەندی‌و توندی‌و لاوازی بوو.. هیچکەس لەو ڕۆژگارانەدا گومانی لەوە نەبوو ناسیۆنال سۆشیالیزمی ئەڵمانی شێوەیەکی تری -دیارە شێوەیەکی







توندڕەوانەتری- هەمانجۆر ئەو حکومەتەیە کە "دۆچە" لەئیتاڵیا دایهێنابوو. مۆسۆلۆنی ناوی حکومەتەکەی نابوو "فاشیزم"و دواجار ئەم ناوە بۆ هەموو لاسایکەرەوەکانی لەسەرتاسەری ئەوروپادا بەکاردەهێنرا. لەو سەردەمەدا کە فاشیزم لەسەر کار بوو، کەسانێك کە ئەزمونیان کردبوو، لەهەلومەرجێکدا نەبوون بەجۆرێك هەمەکیگۆیی ئاڵۆز وێنایبکەن. ئەو سەختیانەی دەرئەنجامی فاشیزم بوو، ئەوەندە واقعیبوون کە جێگەیەکی بۆ ئەمجۆرە وێنایانە نەدەهێشتەوە. بێگومان لەو کاتەدا هەرە ساوێلکانەو کۆمیدی دەهاتە پێشچاو، گەر کەسێك بیویستایە بچێتە ناووتوێژی لەفزی‌و شیکردنەوەی ئەو تاریکبیرانەی کە کەسانێك لەسەر بناغەی ئەو هەر هەڵێکیان بەمەبەستی بەراوردکردنی ڕژێمە فاشیستیەکان ڕەددەکردەوە، چونکە دەیانگوت مەسەلەکە ئەوەندە ئاڵۆزە کە ناکرێ گشتگیر (تەعمیم) بکرێت. ڕاستە لەم ناوەدا بە تایبەتی لەجەنگی جیهانی دوهەمدا سود لەزاراوەی "فاشیست"و "فاشیزم" بۆ ناوناتۆرەی هەڵنەسەنگێنراو وەردەگیرا، بەڵام ئەمکارە زۆرتر لەوتوێژە گروپبەندەیەکاندا ئەنجامدەدرا تا لەشیکردنەوەیەکی زانایانەدا. کەسانێك کە بەویژدانی زانستیەوە لەفاشیزم دەکۆڵینەوە، بەدوای وردبینی‌و پتەوی فکریەوە بوون،و لەگەڵ ئەوەشدا کە لەژێر دەسەڵاتی ڕژێمە فاشیەکاندا چەندان ڕەنجیان کێشابوو، بێزاری خۆشیان لەڕژێمی فاشیسم نەدەشاردەوە، تا دەیانتوانی هەوڵیاندەدا بەڵگەو سەنەد کۆبکەنەوە، وبەڵگە کۆکراوەکان بە پێوەری پسپۆریانەی قبوڵکراو هەڵسەنگێنن.

لەبەرئەوە ئەو بزوتنەوەو ڕژێمانەی کە سەردارانی مامۆستایانی هونەری گێژکردنی خەڵکی‌و ئاڵۆزکردنی مەسەلەکان بوون‌و ئایدۆلۆژیاکانیان پڕ لەناکۆکی بوو، بوون بە بوارێك بۆ تاقیکردنەوەی توانای کۆچبەران. فاشیزم نەك هەر ئەو کەسانەی دەستیان کردبوو بە لێکۆڵینەوەی لەناو زۆنی لەفزیدا غەرق نەکرد، بەڵکو ڕەخنەگرانی بۆ هەوڵی قارەمانە بۆ ڕوونکردنەوەو دەرخستنی‌وروژاندو تیورەسازی کۆمەڵایەتی بەرەو مەسەلە واقعیە پەلەکان ئاراستە کردو ئەو مەسەلەیەی بە توندی هێنایە پێشێ کە خەسڵەتە سەرەکیەکانی کۆمەڵگا پیشەسازیە ئەمڕۆییەکان چییەو تیورە مارکس‌و نیمچە مارکسیەکان تا چەند بەکەڵکی شیکردنەوەی کۆمەڵگاکانی ئەمڕۆ دێن. بەشێوەیەکی گشتی ڕژێمە فاشیەکان ئەو مەسەلەیەیان دەهێنایە پێشێ

کە کاتێك شیکردنەوەکانی پێشوو، چ ناچارانە بەهۆی هەلومەرجەوەو چ بە هۆی خەسڵەتی لێکۆڵەرەوە، خاڵی بەهادانان نەبێت، ئایا دەشێت هەڵسەنگاندنێك بکرێت کە بایەخێکی درێژخایەنی هەبێت؟

## ١)یەکەم تێڕوانینەکان: بۆرگێسیّو مانهایمو فرۆم

سێ کەس لەرەخنەگرانی فاشیزم لەهەمووان زیاتر کاریگەریان هەبوو، کاریشیان لەکەسانی دی کرد، بەڵام ئەوەی لەمبارەیەوە نوسیان بە پێی ئەو ماهیەتەی هەیبوو نەگرنگترین نوسینەکانیان بوو، نە تەوەرەی سەرەکی لەژیانی فکریاندا پێکدەهێنا.

ڕەهەندی هاوبەشی بۆرگێسیّو مانهایمو ئەریك فرۆم ئەوەبوو هەرسێکیان یان لەکۆتایی یان سەرەتای چالاکی ژیانیاندا دەستیانکرد بە تاوتوێکردنی فاشیزمو چالاکیان بە گشتی رووی لەشتی دی بوو. ئەوەی لەمبارەیەوە گوتیان بە ناچار کاتی بوو. هەرسێکیان تێڕوانینو بنەمایەکیان پێشکەشکرد، بەڵام هیچیان دەستیان بەشیکردنەوەیەکی تەواوو کامڵ نەکرد.

جۆزێپێ ئانتۆنیۆ بۆرگێسیّ هێشتا پەنجا ساڵ تەمەنی نەبوو کە لەساڵی ١٩٣١دا کاتێك سەفەری بۆ ئەمەریکا بە نیازی هەندێك سمینار کرد، لەسوێندی وەفاداری (بۆ ڕژێمی مۆسۆلۆنی) کە بەسەر هەموو مامۆستایانی زانکۆی ئیتاڵیادا سەپێنرابوو، سەرپێچیکردو بڕیاری مانەوەی لەئەمەریکا دا. بۆرگێسیّ لە١٨٨٢دا لەسیسیل لەدایکبوو. ڕەخنەگرو مامۆستای ستاتیکاو شاعیرو رۆمانوس بوو کە بە **enfant terrible** (منداڵی بزێوو عەجولی) ئەدەبیاتی ئیتاڵیا بەناوبانگ بوو. بۆرگێسیّ هەروەها پڕوپاگەندەکەرێکی خاوەن راو نهێنی ئاشکراکەر لەبواری مەسەلە کۆمەڵایەتیو سیاسیەکاندا بوو کەوازی لەبیرورا فەلسەفیەکەی مامۆستاکەی خۆی، واتە کرۆچە هێنابوو، رەوتی تایبەتیو نائاسایی خۆشی دژ بە فاشیزم گرتبوە بەر.

سەرەتا بۆرگێسیّ لەئەمەریکادا لەکۆلێجی سمیسو پاشان لەزانکۆی شیکاگۆ سەرقاڵی وانە گوتنەوە بوو، لەم زانکۆیەدا بوو لەگەڵ یەکێك لەکچەکانی تۆماس ماندا ئاشنایی پەیداکردو هێنای. تۆماس مان سەرەتا بەهۆی سیو شەش ساڵ جیاوازی تەمەنەوە، ئەم پەیوەندییەی پێخۆش نەبوو، بەڵام زۆری پێنەچوو کە لەم ناخۆشیە هاتە دەرێو بۆ براکەی هاینریش نوسی کە بۆرگێسیّ "پیاوێکی زۆر





هوشیارو رۆح سوکەو زۆر باش ماوەتەوە..و تا دوا پلەرقی لە"دۆچە"یە.

زەمینەو پێشەکی فکری بۆرگێسیّ زۆرتر ئەدەبی بوو، لێرەوە وەك لەکەسێکیوا پێشبینی دەکرێت، رەخنەی لەفاشیزم لەسەر بناغەی کاریگەری حسی دامەزرابوو. نوسینەکانی لەمبارەیەوە زۆر دڵرفێنو شیرین بوو. بۆرگێسیّ دەسەڵاتێکی بەسەر نوسینی ئینگلیزیدا پەیدا کردبوو کە بۆ کەسێك ئەوەندە درەنگ دەستی بەمکارە کردبێت، یەکجار سەرسوڕهێنەر بوو. نوسینەکانی تێکەڵەیەك لەحکایەتە شیرینو کاریگەرەکانو پەخشانەکەی پڕ بوو لەهونەری جوانی سەرسوڕهێنەر. هەر ئەم توانای نمایشە دەبووە هۆی ئەوەی زیاتر جەخت لەرەهەندە دیارەکانی فاشیزم بەشێوەیەکی هونەری —وەك هەورازو نشێوی ئاراستەی فاشیزم بەرەو دەسەڵاتو سەرچاوە کلتوریو مێژووییەکەی — بکات. بۆرگێسیّ لەئەزمونی حکومەتی مۆسۆلۆنیەوە بەو دەرئەنجامە گەیشتبوو کە قبوڵکردنی لەلایەن خەڵکی ئیتاڵیاوە، زۆرتر دەرئەنجامی لاوازی کەسایەتیو خەسڵەتە. ئەو بڕوایوابوو "پایە بەرجەستەکانی فاشیزم خاوەن ماهیەتێکی دەرونیو هەستیە"و فاشیزم شتێك بووە کە "سەرەتا لەدەرونەکاندا رویداوە (پاشان) رێگەی خۆی لەناو واقعیەتی مێژووی جەماوەردا کردۆتەوە".

ساڵێك پاش دەرکەوتنی هیتلەر بۆرگێسیّ لێکۆڵینەوەیەکی لەبارەی سەرچاوە فکریەکانی فاشیزمەوە بڵاوکردەوە کە ئەگەرچی بەشێوەیەکی سەرەکی پەیوەندی بە ئیتاڵیاوە هەبوو، بەڵام بەگشتی ئاماژەی بۆ ئەو شتانەش دەکرد کە لەئەڵمانیادا روودەدەنو ئەو بزوتنەوانەشی کە هیتلەرو مۆسۆلۆنی بونیادیان نابوو، دەگەڕانەوە بۆ یەك سەرچاوەی کلتوری. بۆرگێسیّ ئەم سەرچاوانەی لەو "پێشینانەدا" دەدۆزیەوە کە لەڕووی "ئایدیالیو سۆزداریەوە" لەنێوان ئەو تاکانەدا هاوبەشبوو کە خاوەن خوێندنێکی "مامناوەندی" بوون. ئەو دەیگووت فاشیزم شتێکی نییە تا لەلایەن دێهاتی یان لای کەسانێکی "بەڕاستی بیریار" کە "خۆراکێکی فکری پاکیان دەوێت"، قبوڵبکرێت. بەڵام بۆ کەسانێك کە تێشویەکی فکریان نییەو برسێتی دەچێژن، " خۆراکێکی ڕۆژانەی رۆحی" ئامادە دەکات. فاشیزم "لەچرکەی یەکەمدا چ لەڕووی کلتوریو چ لەڕووی سیاسیەوە، جۆرێکی رۆمانسیەتی پەستو دزێوو سوکە.. شۆڕش نییە.. خۆ خواردنەوەیە". فاشیزم دەیەوێت خەڵك فێربکات کە





"گۆڕان" "جەوهەری" شتەکانو "سۆزو گەرمی.. فەزیلەتە" چونکە لەسەر ئەو بڕوایە دامەزراوە کە زۆر، هەق دروستدەکاتو "دەسەلاَت لەبری دادپەروەری" دادەنێت، بووە بە "مەرامی چینی ناوەڕاستی خوارەوە".

بۆچی فاشیزم لەئیتالیادا سەرکەوت؟ بۆرگێسێ وەلاَمێکی سادەی نەدەدایەوە، بەڵکو زۆرتر بەلای ئەو بڕوایەدا دەچوو کە هۆی ئەمە تێکەڵبونێکی سەرسوڕهێنەری مەزنیو لاوازیە لەمێژووی ئیتالیادا. بۆرگیسێ دەنوسێت:

"ئیتالیەکان دوو هەزار ساڵ ئیمپراتۆریەتێکی جیهانیو مەزهەبێکی گەردونیان هەبوو.. خویان بە بەرزەفڕی خەیاڵی سیاسیو لەهەمانکاتدا وازهێنان لەکەسایەتی "خود" لەژیانی کۆمەلاَیەتیدا بە خەمناکترین شێوە گرتبوو..و لێرەوە ئامادەی قبوڵکردنی هەرشتێکی سەیرو تازەبوون. بەتایبەتی ئەگەر بکرێ ئومێد بەوە هەبێت کە ئەم نوێو تازەییە، گیانێکی تازە بە گرێی مەزنێتی کە لەرۆمانەکانەوە بە میرات ماوەتەوە، بکاتەوەو گرێی مەزنێتی سەرسەختی بەرهەمی سەردەمی تازە کۆنتڕۆڵ بکات."

هەڵسەنگاندنە دەرونیەکانی بۆرگێسێ لەسنوری گوتارە دوبارە کلێشەیەکانی خوێندەوارە ئاسایەکانی دەیەکانی ١٩٣٠ تێپەڕی نەدەکرد، بەلاَم باسی ئاگاداری بۆرگیسێیان لەسەرگەردانیو بێ شوناسیو پەرێشانی رابەرو پەیڕەوانی بزوتنەوەی فاشیزم دەکرد. بۆرگێسێ پاشان رایگەیاند کە دەبێ مۆسۆلۆنی لە"دەروازەی چاوی رۆماننوسێکی باشەوە" تاوتوێبکەین، و گوتی دورە شتێك هەبێت کە فرۆید بتوانێت لەبارەی "دۆچە"ی ئیتالیاوە پێمان بڵێت. "فرۆید بە ئیحتیمالێکی زۆر فایلی مۆسۆلۆنی بۆ یۆنگی هاوکاری دەنارد" (کە دیارە ئەگەری کارێکیوا پاش چارەکە سەدەیەك لەپچڕانی پەیوەندی ئەو دوانە(واتە پەیوەندی فرۆیدو یونگ)، شتێکی دوور بوو) چونکە بە بڕوای بۆرگێسێ رووبەڕووبونەوە لەگەڵ ئاوەها "کێشەی خۆپەرستی هەمەلایەنە"دا تەنها لەتوانای نهێنیبینو غەیبگۆیەکی (وەك یۆنگدا) بوو.

کتێبەکەی بۆرگێسێ جالوت، سێ ساڵ پاشوتارەکەی لەبارەی رەگوڕیشە فکریەکانی فاشیزمەوە بلاَوبۆوە. بۆرگیسێ لەم کتێبەدا زیاتر هەندێك بابەتی لێکۆڵینەوەکانی پێشووی پەرەپێدەدات، بەلاَم کەمتازۆر تەنها سەرنجی لەسەر







ئەزموونێك بوو کە لەئیتالیادا روویدابوو. بۆرگێسێ بەوردی هەوڵیدەدا تەفسیری مارکسیەکان بۆ فاشیزم کە لەو سەردەمەدا باو بوو، رەدبکاتەوە. دەیگوت: "چەند ئەو قارچکانەی لەژێر درەختدا دەڕوێن یان ئەو دڕكو داڵەی کە بە لقەکانیدا سەردەکەوێت، دەتوانێت بۆمان رونبکاتەوە کە خودی درەخت چییە، هەر هێندەش هۆکارە کۆمەلاَیەتیو ئابوریەکان دەتوانن فاشیزم رونبکەنەوە". پێشتر بۆرگێسێ گوتبووی فاشیزم "کەفوکوڵی هەژانو خۆ بەرۆشنبیر زانینە". لەجالوتدا هێشتا بڕوایوابوو ئەو پێناسەیە راستەو دەیگوت "گوناه لەزیهنو دەروندا بووە، رزگاریو ئازادبوونیش دەبێت لەزیهنو دەرونەوە بجۆشێت" لێرەوە بڕوایوابوو هۆکاری هەستیارو چارەنوسساز ئەوەبوو کە هاوکارە رۆشنبیرەکانی چۆن کاردانەوەیان بەرامبەر حکومەتی مۆسۆلۆنی پیشانداوە، و بە تالیەوە دەڵێت زۆربەی رۆشنبیران ترسنۆکانە کاریانکردووە. تەنانەت کرۆچێ کە جیهانی دەرەوە بە رەمزی بەرگری فکریان دادەنا، لەڕێنمایکردنێك کە کەسانی بچوکتر چاوەڕێیان لێیدەکرد، کورتی هێنا: سەرەتا لەوڕووەوە کە ماکیاڤیلیزمی ناو نوسینە پێش فاشیەکانی خۆی وەرنەگرتەوەو دووهەم لەوڕووەوە کە لاوانی لەو دڵنیا کردبوو "کە زەحمەتکێشان لەپێناوی کلتوردا" کاردانەوەیەکی بەسە لەبەرامبەر حکومەتی زۆرداریو ستەمداو بەمشێوەیە ویستبووی‌ویژدانیان ئارامبکات.

بۆرگێسێ ئەو دەرئەنجامەی وەردەگرت کە "هەموو پایەکانی هەستی ئیتالیایی رووخان، چونکە لەبنەڕەتەوە بەهیچ شێوەیەك پتەو نەبوون". ئەمڕۆ دەزانین ئەم بەدبینیە زیادەڕەوی تێدایە، بەلاَم لەوەش تێدەگەین کە بۆرگێسێ لەبەر چ هۆیەکی شەخسی ئەم قسانەیکردووە. ئەو پیاوێکی تەنیا بوو لەسەرزەمینێکی غەریبدا، بێ هیچ پەیوەندیەك لەگەڵ هیچ بزوتنەوەیەکی سیاسی کۆچکردوداو بێ بوونی پەروەردەیەکی پێویست بۆ شیکردنەوەی وردی ئایدۆلۆژی یان سیاسی. لێرەوە هیچ چارێکی نەبوو جگە لەپشتبەستن بەو تێشووە عەقڵیو فکریەی کە هەیبوو، واتە قەریحەی خۆیو ئەز زانینە زانکۆییەی لەمێژووی کلتوری ئەوروپاوە فێری بووبوو. کتێبەکەی جالوت ریوایەتێکی مێژووی شیرین بوو لەروداوە مرۆییەکانو بەرهەمی ئایدیالیزمێکی بالاَ، هەم بە مانای فەلسەفیو هەم بە مانای ئاسایی بوو کە راستەوخۆ لای هەموانەوە پێشوازی لێکرا. ئەگەریش لەسنوری دەربڕینی مەعنەوی فاشیزم

زیاتر نەدەڕۆیشت، لایەنیکەم پیشانیدەدا فاشیزم لای چ کەسانێك دڵنشینە، واتە هەمان ئەو کەسانەی کە بوونە جێی سەرنجی لێکۆڵەرەوانی دوایی.

کارل مانهایم لەدوو دەیەی دوایی تەمەنیدا، چیدی هەرگیز بە لوتکەی سەرکەوتن لەجیهانی ئەندێشەدا نەگەیشتە ئەو ئاستەی کە لە١٩٢٠دا بە هۆی کتێبی "ئایدۆلۆژیاو یۆتۆپیا"وە داگیریکردبوو. کۆچکردن بۆ ئینگلتەرا لە١٩٣٣دا بووە هۆی غافڵبوون لەچەند مەسەلەیەکی تیوری کە باسکردنی (کارل مانهایمی) لەپاش مردنی ماکس فیبەرەوە گەیاندبووە داهێنەرترین کۆمەڵناسی ئەڵمانی. مانهایم وازی لەکۆمەڵناسی زانین هێنا کە گەلێك حەزی لێدەکردو روویکردە شتە وەزیفیو تەنانەت پڕوپاگەندەکان، یەکێك لەپەخشکار(ناشر)ە لەندەنیەکانی رازیکرد، وەك بەڕێوەبەری کۆمەڵەیەك بەناوی "کتێبخانەی نێو نەتەوەیی کۆمەڵناسیو چاکسازی کۆمەڵایەتی" پشتیوانی لێبکات. ئەو بەرهەمانەی لەم کۆمەڵەیەدا بلاْوکرایەوە بریتیبوو لەزنجیرەیەك وتار کە بەشێوەیەکی سەرەکی قەڵەمی نوسەرانی ئەمریکیو ئەوروپاییو نا ئینگلیزی لەبوارەکانی سەرژمێریو پەروەردەو یاساکانو ئەنترۆپۆلۆجیاو دیندا دەیانوسی. خودی مانهایمیش سەرقاڵی پڕوپاگەندەکردن بوو بۆ "بەرنامەڕێژی دیموکراتیك" کە بڕوایوابوو تاکە رێگەی ڕزگاری رۆژئاوایە لەچنگی دیکتاتۆریو جەنگو لەم ئاستەشدا چەندان سمیناری گێڕاو چەندان شتی نوسی.

لەنوسینەکانی قۆناغی دوایی مانهایمدا هەم کاریگەری ئینگلتەرا بەسەریەوە دیاربوو، واتە دیاربوو کە ئاراستەی بیریارانی کۆمەڵایەتی ئینگلیز بەرەو بەرژەوەندی پراکتیکیو چاکسازی کۆمەڵگا، پاڵیان پێوەنا کە بیروڕاکانی خۆی بە شێوازێکی سەر ڕاستر و ئاسانتر بۆ تێگەیشتن دەربېڕێ — هەم دەبینرا کە ئەم هەستە تازەیەی پەیام بۆتە هۆی گەڕانەوە بۆ سەرچاوە سەرەکیەکانی بیری خۆی. مانهایم لەلاویدا پێش جەنگی جیهانی یەکەمو لەبۆدابێستدا ئەندامی کۆمەڵێك نوسەری لایەنگری چەپ بوو، کە زوربەیانوەك خۆی یەهودی بوونو بە پەیڕەوکردنی لۆکاش، ڕۆشنبیرانیان بە ڕزگارکەری ئایندەی کۆمەڵگا دەزانی. دیارە ئەم تێڕوانینە لەهەلومەرجێکی وەك ئەو ڕۆژەی مەجەرستاندا بە تەواوی دەرکدەکرا: چینی حوکمڕانی ئەرستۆکراتو بەڕێزەکان، سەرسەختانە دژی هەموو گۆڕانێك بوونو بۆرژوازیە خوێندەوارەکان نەك هەر ژمارەیان کەمبوو، بەڵکو خاوەن هیچ





دەستڕۆیشتنێکی ئەوتۆ نەبوون. ئەم هەلومەرجە بووە هۆی ئەوەی مانهایم لەسەرتاسەری تەمەنیدا پەیوەست بێت بە کۆمنیزمەوە، ئەگەرچی پەیوەندی بەمارکسیزمو باڵی چەپی سیاسیەوە ناسکترو پڕ لەسەروژێری زیاتر بوو لەکەسانی دی. مانهایم هەلومەرجی خۆی بەهەلومەرجی بیریارێکی "ئازاد لەلایەنگری" دەبینی. ئەم تێڕوانینە پاش کۆچکردنی بۆ ئەڵمانیا لەو چەمکەدا دەرکەوت کە رۆشنبیر زۆرتر ناوبژیوان یان هۆکارێکی نێوان چینو بەرژەوەندییە جیاوازەکانە لەکۆمەلگادا، تا ئەوەی یەکێك بێت لەنوێخوازە کۆمەلاْیەتییەکان. یەکێك لەپایەکانی بانگەشەکانی لە"ئایدۆلۆژیاو یۆتۆپیادا" هەر ئەم بیرۆکەیە بوو، بەلاْم پاش دووهەم کۆچکردنی بۆ ئینگلتەرا، هەستی کۆنی رزگارکەر دووبارە تیاییدا تازە بووەوە. مانهایم هەڵوێستی لێکۆڵەرەوانەو ئازاد لەلایەنگری ساڵەکانی ناوەڕاستی ژیانی لەئەڵمانیادا بە بازدانێکی گەورە بەجێهێشتو تێکەڵەیەکی سەرسوڕهێنەری لەسەلیقەی تایبەتی خۆی بۆ دەستەبژێرخوازی سالاْنی ژیانی لەمەجەرستانو ئەو باوەڕە ئەنگلۆساکسۆنەی کە بۆ هەر کێشەیەکی کۆمەلاْیەتی یان سیاسی، بێگومان دەبێت چارەیەکی گونجاو هەبێت، دروستکرد.

کتێبی "مرۆڤو کۆمەڵگا لەسەردەمی چاکسازیدا" دەریدەخست کە مانهایم لەبواری بیروڕاکاندا قۆناغی ئەڵمانیای بەجێهێشتووەو چۆتە قۆناغی ئینگلیزیەوە. ئەم کتێبە پاش دوو ساڵ کۆچکردنی نوسەر بۆ ئینگلتەرا، سەرەتا بە زمانی ئەڵمانی لەهۆڵەندا بلاْوکرایەوەو پاشان بە دەستکاریو خستنەسەری لە١٩٤٠دا بە ئینگلیزی بلاْوکرایەوە. لەسەرەتای کتێبەکەدا مانهایم ئەوە ڕووندەکاتەوە کە هەلومەرجی بالاْدەست لەکاتی نوسیندا، کاریکردۆتە سەر بابەتی کتێبەکە. دەیگوت من یەکێك بووم لەو کەسانەی دەستی چارەنوس ئەوەی "بۆ رەخساند لەزۆر ولاْتدا بژینو ببینن کە بیروبۆچونە جیاوازەکان لەگەڵ بیروبۆچوونی ئەواندا چونیەکە"و لەبەرئەوە بە ئەرکی خۆم زانیووە ئەم بۆچونانە لە"سەنتزێکی تازەدا" پێکەوە تێکەڵبکەمو، بە تایبەتی ئەو هەستەی کە سەرچاوەیەکی ئەڵمانی هەیە "لەسەر لوتکەی بورکانێك دانیشتووم" لەگەڵ ئەو خوشبینیەی کە دەرئەنجامی ژیانمە لەئینگلتەرەدا تێکەڵبکەم کە "لەولاْتێکدا دەژیم دیموکراسی لیبڕاڵ بە گشتی بێ هیچ کەموکوڕیەك کار دەکات".

مانهایم دەیگوت ئەگەرچی نیشتەجێبونم لەئینگلتەرا یارمەتیداوم "خۆم





لەکۆتوبەندی گومانی خۆم بەرامبەر بە چالاکیو هێزی زیندووی دیموکراسی رزگاربکەم"، بەلاّم بڕواکەی پێشووم هەروەك خۆیەتی کە گۆڕانکاریە قوڵە بونیادیەکان، دەبێتە هۆی داڕزانو خوسانی ئەو بناغانەی کە لایەنگرانو بەرگریکاران لەدیموکراسی بوونیان لەڕووی کۆمەلاّیەتییەوە بە بەلگەنەویست دەزانن.

مانهایم هەستیکرد بۆ پێناسەکردنی ئەم گۆڕانکاریانە "کوێرانە دەچێتە پێشێ"و ئەو کارەی قۆڵی بۆ لێهەڵماڵیووە، ناتەواوو دوورە لەهەموو جۆرە "وەهمێکی بڕانەوەو بەلگەی ڕەهاوە". لەگەڵ ئەمانەشدا مانهایم لەسەر ئەو بڕوایەبوو کە "دەیەکانی رابردوو" لەڕووی "ئەخلاقو عەقڵ"ەوە شایەتی جۆرێك پێشکەوتنی پێچەوانە بووە. وهاوڕا لەگەڵ هێگلّیەکانی قوتابخانەی فرانکفۆرت، ئادرنۆو هۆرکهایمەردا دەرکەوتنی حکومەتە دیسپۆتیزمەکانی بەجۆرێك لەدارمانی عەقڵەوە دەبەستەوەو مەترسی ئاوەها دارمانێکی دەگەڕانەوە بۆ خەسلەتی کۆمەلگا مەزنە پیشەسازیەکان. ماکس فیبەر پێشتر گوتبووی، ئەمجۆرە کۆمەلگایانە بوونەتە هۆی دروستکردنی "زنجیرەیەك کردار" کە "لەڕووی عەقڵەوە تا دوا پلە قابیلی حسابکردنو پێشبینیکردنن"و ئەمەش پەیوەستە بە "ڕێگەکانی بەرگرتن لەتێرکردنی خواستە هەنوکەییەکانو وازهێنان لەتێرکردنی یەکسەری خواستەکان"و "میکانیزمە کۆمەلاّیەتیان" بە ئاستێك لەناسکی گەیاندووە، کە "بچوکترین خەلەلی ناعەقلاّنی ڕەنگە فراوانترین کاریگەری لەسەر دابنێ"، و لەهەمانکاتدا کۆمەڵێك "وزەی دەرونی کۆنتڕۆڵنەکراوو کەڵەکەبویان" دروستکردووە کە ڕەنگە "یەکسەر دەزگای ناسکی ژیانی کۆمەلاّیەتی، تێکبشکێنێ". مانهایم ڕەهەندی دەرونی — کۆمەلاّیەتی بزوتنەوە فاشیستیەکانی لەم ململانێ چارەنوسسازەی نێوان عەقڵ پیشەیی تەکنیکیو بزواندنی جەماوەردا — یان بە دەربڕینێکی تر لەکارو کاردانەوەی دیالەکتیکی نێوان ئامێرە ناسکەکانو دڕندایەتی شاراوەو بەزەبردا، دەبینی.

مانهایم بڕوایوابوو "تا هەنوکە" خەڵکی بڕوایانوابووە کە "ململانێی بە ڕێژە ئازاد لەنێوان شێوازە جیاوازەکانی پەروەردەو ڕاگەیاندندا، لەڕێگەی هەڵبژاردنی سروشتیەوە، ئەگەری گەیشتن بە بەرزترین پلەی بۆ تاکە عەقلاّنیو خوێندەوارو شایستەتر لەکەسانی دی لەهەلومەرجی ئەمڕۆدا، ڕەخساندووە"، بەلاّم ئەزمونەکانی







دەیەکانی ١٩٢٠و ١٩٣٠ بێ بناغەیی ئەم باوەڕەی سەلماندووەو "میکانیزمە ئاساییەکانی" هەڵبژاردن نەیتوانیوە کاربکات. لەبری ئەمە جۆرێك "هەڵبژاردنی نێگەتیڤی دەستەبژێرەکان" پەیدابووە. بەو مانایەی "کەسانێك کە لەرابردوودا خاوەنو پارێزەری نەریتە کلتوریەکان بوون، هەنوکە هێواش هێواش شەرم لەبەهاکانی خۆیاندەکەنو ئەو بەهایانە بە نیشانەی لاوازی..و جۆرێك ترسنۆکی دەزانن"و لەهەمانکاتدا "نوێنەرانی کلتورە ناوچەییەکان" بە پشتبەستن بە ترسان لەبێگانە (xenophobia)و ئەوەی لەکۆمەلگا سەرەتاییەکاندا بە هونەر دادەنرێت، دەستیانکردووە بەبێ بایەخکردنی دروشمە گەردونیەکان.

مانهایم هەرگیز وازی لەو بڕوایەنەهێنا کە کلتوری مەزن پەیوەندی بە بەها ئەرستۆکراتیەکانەوە هەیە. لەئینگلتەرادا هێشتا ئەو ئەگەرەی دەبینی کە چینی سەرەوە لەگەڵ هەرسکردنو راکێشانی ئەو تاکانەی هێواش لەچینەکانی خوارەوە دێنە ناوی، توانای بەرگریکردن لەپلەو پایەی تەقلیدی خۆشی هەبێت، بەلاّم لەولاّتانی تری ئەوروپادا دەیبینی گروپە کۆنەکانو رۆشنبیران هێواش "توانای هەرسکردنو راکێشان" لەدەستدەدەنو بە بەرامبەرەکەیان دەدۆڕێننو ڕکێفی رابەرایەتی سیاسیو کلتوری بە تاکەکانی چینی ناوەڕاستی خوارەوە —واتە "کارمەندانی ئاستی خوارەوەی دەوڵەتو پیشەوەرانو بازرگانانو جوتیارانی بچوکو دەست کورتەکانی خاوەن دەرامەتی جێگیر" — تەسلیمدەکەن. مانهایم بڕوایوابوو ئەم گروپە تێکەڵە خۆبەخۆ کۆنەپەرستە: لەهەموو لایەکەوە لەژێر مەترسیدایەو هەوڵدەدات بە "پشتبەستن بە هەموو ئەو هونەرە سیاسیانەی لەبەردەستدانو بەمەبەستی سنوردارکردنی پەرەسەندنی شێوازە عەقڵ پەسەندو لۆژیکیەکان لەپیشەسازیداو ڕێگرتن لەدروستبوونو پەروەردەبوونی تاکە عەقڵ پیشەکانی ئەمڕۆییو چەکدار بە دروشمە مرۆڤ دۆستەکان، خۆی ڕزگار بکات".

بەمشێوەیە مانهایم لەڕێگەیەکی یەکجار جیاوازەوە بەهەمان ئەو دەرئەنجامە گەیشتبوو کە بۆرگێسێ پێی گەیشتبوو، دواجاریش چاوی بڕیبووە هەمان ئەو چینەی کۆمەلگا کە بۆرگێسێ چاوی تێبڕیبوو. نوسەری ئیتاڵیای (واتە بۆرگێسێ) بەدوای سەرچاوەکانی رۆمانسیزمی تازەی تاکەکەسە نیمچە خوێندەوارەکاندا گەڕابوو، گەیشتبووش بە سەدەی نۆزدەهەم، لێکۆڵەرەوە مەجەریو یەهودیو ئەڵمانیو نێشتەجێی ئینگلتەرا تێزەکانی ماکس فیبەری هەڵگرتو ڕەنگێکی فرۆیدی

پێبەخشی. بەمشێوەیە روونیکردەوە کە مەبەست لە"هەڵبژاردنی نێگەتیڤی دەستەبژێرەکان" چییە. مانهایمیش وەك بۆرگێسێ پەنجەی خستە سەر چینی ناوەڕاستی خوارەوەی کۆمەڵگا، بەڵام تەنها بە دەرککردنی ئەو ترس و پەشێویانە وازینەهێنا، کە تاکەکانی ئەم چینەی کردووە بە گروپی سەرەکی خزمەتکارانی بەزەبری فاشیزم. ئەو هەروەها پەردەکەی لابرد بۆ ئەوەی ببینێت لەپشت ئەو تاکە تۆقیوانەوە، چ کەسانێك ڕەنگە لەتاریکیدا کەمینیان دانابێت، و بەو تێڕوانینە گەیشت کە بێگومان لەکاتی شێتبوونی جەماوەردا، دەبێت کەسانێك هەبن هێمن بمێننەوەو هێزی خۆیان بۆ حسابکردنی عەقلانی بپارێزن. ئەمجۆرە کەسە بەهێزو خاوەن نیعمەتانە، هەمان سەرکردەکانی سوپاو بازرگانە سەرمایەدارو بەرپرسیارە گەورەکانی دەوڵەتن کە هەندێکجار هێشتا دەیانەوێت سود لەم نەبوونی زەمانەتی گشتیە بۆ خۆیانوەربگرن و رەنگە کەسانێك بدۆزنەوەو پشتیوانی لێبکەن کە باشتر لەخۆیان خاوەن توانای رابەریکردنی جەماوەر بن. مانهایم دەنوسێت:

"ناکرێ چاوەڕێبین هەمان ئەرستۆکراتە کۆنەکان..یان رکێفکەرانی پێشووی بازرگانیو پیشەسازی کە بە شێوازەکانی حسابکردنی عەقلانیانەوە بە بارهاتوون، نهێنی دەستکاری رەمزەکانیش بەدەستبێنن.. ئەوان پێویستیان بە یەکگرتنە لەگەڵ جۆرێکی تازەی رابەردا. ئەم رابەرو رابەرە تازانەش دەبێت لەهەمان کونجو کەلەبەری کۆمەڵگاوە بێنەدەرێ کە تەنانەت لەڕۆژگارە ئاساییەکانیشدا دیدی ناعەقلانی بەسەریاندا زاڵەوو وێنای ئاڵۆزو پەرشوبلاوی نەبوونی زەمانەت لەناویاندا لەهەموو شتێکی دی توندترو درێژخایەنترە. کەوابوو دەبێت خودی رابەریش هەمان ئەو هەڵچوونو داچونەی سۆزداریەی ئەزموون کردبێت کە ڕەهەندی هاوبەشی هەموو ئەو کەسانەیە کە کۆتو بەندەکانی دارمانی چەند بەشێکی کۆمەڵگایان هەست پێکردووە".

رابەرانی فاشیست بە ئەزمونێکی راستەوخۆ فێر بووبوون کە چۆن گەمە بە پەشێوی سەرتاپاگیری هاولاتیانیان بکەن. بەڵام لەهەمانکاتدا ناچاربوون هێزەکانی خۆیان بۆ حسابکردنی عەقلانیش پەروەردە بکەنو کەسانێك کە لەبەرزترین ئاستدا خاوەن توانایەکیوابوون، بۆ لای خۆیان راکێشن. مانهایم تەنها پڕۆژەی گشتی یەکگرتنی ئەم هاودەستە ناچونیەكو شاراوەیەی پشت دەمامکی فاشیزمیوێنەکردو شیکردنەوە دەرونیو کۆمەلایەتیەکەی خۆی کورتکردەوە بۆ هێڵە هەمەکیو







پەراوێزیەکانی ئایدیالی نمونەیی **ideal type**. وردەکاریەکانی ئەم پڕۆژە گشتیە دەبوو لەلایەن بیریارێکی ترەوە درێژەی پێبدرێتو وردەکاریەکان ببینێو باوەڕی بەوە بێت کە تەنها کاتێك شیکردنەوەی دیاردەی فاشیزم هەقی خۆیوەردەگرێت کە بە لێکۆڵینەوەی سەرتاپاگیری ئەزمونی دەوڵەمەند بکرێت.

مانهایم ١١ ساڵ لەبۆرگێسێ بچوکتر بوو، بەڵام لەڕووی ئەزمونی مێژووییەوە بەهاونەوەی ئەو دەژمێررا. هەردوکیان بەر لەجەنگی جیهانی یەکەم گەیشتبونە کەماڵی فکریو وەك پەروەردەکراوەکانی پێش جەنگ، سودیان لەهەستی زەمانەتی ئابوریو رێزی کۆمەلایەتی وەرگرتبوو. جیاوازی تەمەنی مانهایمو ئەریك فرۆم کەمتر بوو، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا لەڕووی دەرونیەوە ماوەی دەخستە نێوان ئەو دوانەوە. فرۆم لە١٩٠٠دا هاتبووە دنیاوەو سەر بە نەوەیەك بوو کە تاکەکانی لەسەردەمی جەنگدا، هەرزەکاریان بەسەر بردبوو، پاشانیش لەساڵە پڕ پێچوپەناکانی دەیەی ١٩٢٠دا بەرخوردی فکری چارەنوسسازیان توشبوو بوو.

فرۆم دەرونشیکاری خوێند، بەڵام کەمکەم بە جۆرێك گۆڕا کە لەفرۆید دورکەوتەوە. هەم پێش کۆچکردن بۆ ئەمەریکا لە١٩٣٤داو هەم پاش ئەو، هاوکاری لەگەڵ هیگڵیەکانی قوتابخانەی فرانکفۆرتدا هەبوو. بەڵام پاشان لەوانیش جیابۆوە لەبەرئەوە کاتێك دوای حەوت ساڵ دەستیکرد بە بڵاوکردنەوەی یەکەم کتێبی خۆی بە ئینگلیزی (بەناوی) "راکردن لەئازادی"، پێشتر بەسەلیقەی تایبەتی خۆی تێکەڵەیەکی لەفرۆیدیزمی چاکسازیکراوو مارکسیزمێکی تەنك دروستکردبوو، کە لەئەمەریکادا کە بووبوو بە  وڵاتە تازەکەی، زۆر جێیگرت. "ڕاکردن لەئازادی"وەك "جالوت"ی بۆرگێسێ ڕەوانو خۆشخوێنو گونجاوی سروشتی خوێندەوارە ناپسپۆرەکان بوو. ڕەهەندێکی هاوبەشیشی لەگەڵ کارەکانی مانهایمدا هەبوو کەوەك نوسەرە ئەڵمانیەکان خاوەن ژێر خانێکی تیورەی کۆمەلایەتیو دەروناسی بوو.

فرۆم بەتەنیا لەرونکردنەوە دەرونناسیەکان رازی نەبوو، هەروەها نەیدەویست هیچجۆرە نەخشەیەکی سەرەتایی مارکسیزم قبوڵبکاتو لێرەوە هەوڵیدا بناغەو رەگەزەکانی هەردووکیان لەهەڵسەنگاندنێکی مێژوویی درێژخایەندا، بۆ هۆکانی قبوڵکردنی فاشیزم کۆبکاتەوە، ئەو ئەزمونەی لەئیتاڵیای فاشیزمەوە بەدەستهاتبوو، خستیە لاوەو دەرکەوتە توندو تیژی نائارامیەکانی ئەمڕۆی لەقۆناغێکی مێژووی وڵاتەکەیدا (ئەڵمانیا) خستە بەرچاو. تازەترین خەسڵەتی کتێبەکەی فرۆم ئەو بڕوا

سادەو جیاوازە بوو لەگەڵ تەرتیبی زەمەنی روداوەکاندا کە سەردەمی چاکسازی دینی (ریفۆرم) لەئەڵمانیادا، هەر لەسەرەتاوە هەواڵی مێژووی کۆمەڵایەتی کۆماری ڤایمارو قۆناغی نازیزمی دابوو. بەڵگاندنەکەی فرۆم ئەوەبوو کە گۆڕانکاریە لەناکاوەکانی بواری ئابوری چ لەسەردەمی کۆن‌و چ لەسەدەی بیستدا، بونیادی تەقلیدی کۆمەڵگای سەروژێرکردووە. لەهەریەك لەم دوو سەردەمەدا "هەستی بێتوانایی‌و تەنیایی تاکی گۆشەگیر زیادیکرد، "ئازادی" تاك لەکۆت‌و بەندە کۆنەکان ئاشکراتربوو، تواناکانیشی بۆ خۆشنودی فەردی لەمەسەلە ئابورییەکاندا سنوردارتر بوو، خۆشی لەبەرامبەر هێزە دێوئاساکاندا هەستی بە مەترسیکرد". چ لەسەدەی شانزەهەم‌و چ لەسەدەی بیستدا، دەرئەنجامی ئەم شتە "داواکردنی‌وەسواس ئامێزی یەقین" بوو، "راکردنێك بوو لەپەشێوی" بۆ باوەشی رابەری مەزهەبی یان ئایدۆلۆژی، واتە لۆسەر یان هیتلەر.

فرۆم بڕوایوابوو ئەمجۆرە راکردنە لەئازادیە روکەش‌و درۆزنانەیە، لەخەسڵەتەکانی چینی ناوەڕاستی خوارەوە بوو. "تەنیایی تاك‌و سەرکوتکردنی زیندویتی‌و هەستی تێکەڵبوون لەتاکەکاندا.. لەبارەی ئەم چینەوە لەهەموو چینەکانی دی زیاتر راست بووە". نازیزم توانی بەهۆی هەوڵی وێرانکارانەی تاکەکانی ئەم چینەوە، لای ئەم چینە قبوڵبکرێت‌و سودییان بۆ دژایەتی دوژمنان لێوەربگرێت. چونکە تاکی ئاسایی چینی ناوەڕاستی خواروو، هەلومەرجی خۆی دەرکنەدەکردو بڕوایوابوو سەرچاوەی کێشەکانی دەگەڕێتەوە بۆ شکست‌و شەرمەزاری وڵاتەکەی، نەك بۆ ئەوەی خۆی لەبواری ئابوریدا لەسەردەم دواکەوتووەو بەجێماوەو تێنەدەگەیشت کە حکومەتەکەی هیتلەر چەند لەڕووی مانەوەی کۆمەڵایەتیەوە، زیانبەخشە. بە کورتی ئاوەها کەسێك دەرکەوتی کلاسیکی شتێك بوو کە مارکس ناوی نابوو "هوشیاری درۆزنانە".

بەمشێوەیە هۆکارو روونکردنەوەکانی فرۆمیش وەك مانهایم باسی ناکۆکی نێوان ئایدۆلۆژیاوواقعی ئابوری لەبزوتنەوە فاشیستیەکاندا دەکرد. دیارە فرۆم جیهانی سۆزداری چینی ناوەڕاستی خوارەوەی وردتر لەبۆرگێسیۆ مانهایم‌وێنە دەکێشا. وەك ئەو دوانە بڕوایوابوو نهێنی سەرکەوتنی فاشیزم دەگەڕێتەوە بۆ دنیایی ناسکی تاکی ئاسایی‌و بێ توانای کۆمەڵگاو لێرەوە دەیزانی مەسەلەکە هەر کورت نابێتەوە بۆ ئەمە. بەڵام نوسینەوەی درێژەی چیرۆکەکە پێویستی بە ئاگاداری لەوردەکاری







روداوەکان‌و پسپۆڕیەك لەئابوریدا هەبوو کە فرۆم خاوەنی نەبوو. بابەتەکانی "راکردن لەئازادی" پەرشوبڵاوو ئاوازەکەی ئامۆژگاریکارانە بوو. کتێبەکە پڕ بوو لەروونکردنەوەی سادەی دەرونشیکاریانەو پاش چەند ساڵ چیدی وەك سەرەتا کە سەرنجەکانی بەلای خۆیدا ڕاکێشا، کاری لەخوێنەران نەدەکرد. ئەندێشەکانی دوایی پیشانیاندا کە فرۆم بە بەراورد بە قۆناغە جیاوازەکانی مێژوودا، زیادەڕەوی کردووەو ئەو پێکهاتەیەی کە بە مەبەستی دەستنیشانکردنی هۆکارەکان دروستیکردووە، زۆر سادەیە.

سەرچاوە

بەشێکە لەفەسڵی سێهەمی کتێبی (ستیوارت هیوز: هجرت اندیشه اجتماعی. ت: عزت اللهفولادوند. چاپ اول.. تهران.. گرح نو ١٣٧٦).

## ناسیۆنالیزم چیە "١"

## ستانلی بن

دەکرێ لایەنیکەم وشەی ناسیۆنالیزم بە پێنج مانای جیاوزدا پێناسبکرێ :

1-جۆرێك هەستی وەفاداری بۆ نەتەوەیەکی تایبەت (واتە جۆرێك لە نیشتیمانپەروەری)

2-لەبارەی رێباز و سیاسەتێکەوە، مەیل بۆ رەچاوکردنی بەرژەوەندیەکانی نەتەوەی خۆ، بەتەنیایی، بەتایبەتی کاتێك پێی ململانێ لەگەڵ بەرژەوەندی نەتەوەکانی دیدا لەئارادا بێت.

٣_ گرنگیدانی سەرەکی بە خەسڵەتە تایبەتیەکانی هەر نەتەوەیەك و لێرەوە

٤- قسەکردن لە پێویستی پاراستنی کلتوری نەتەوەیی.

٥- بڕوابوون بەو تیورەیە لە سیاسەت و مرۆڤناسیدا کە رەگەزی مرۆڤ بەشێوەیەکی سروشتی دابەشبووە بۆ چەند نەتەوەیەك، هەندێك پێوەری دیاریکراو هەیە بۆ دیارکردنی نەتەوە و تاکەکانی و هەر نەتەوەیەك مافی خۆیەتی دەوڵەتی سەربەخۆی خۆی هەبێت و دەوڵەتەکانیش تەنها تا ئەوکاتە رەوایەتیان هەیە کە بەپێی ئەم بنەمایە دروستبووبن  و دواجار جیهان لەرووی سیاسیەوە تەنها ئەوکاتە دەتوانییێت بەشێوەیەکی دروست رێکبخرێ کە هەر نەتەوەیەك دەوڵەتێکی هەبێت و هەر دەوڵەتێك لە کۆی نەتەوەیەك پێکبێت.

## ماهیەت و پێوەرەکانی نەتەوە

بنەما و تیورەکانی سەر بە بەشی ٤ و ٥ لە کۆتاییەکانی سەدەی هەژدەوە رەواجیان پەیداکرد. ئەڵبەتە بێگومان پەیوەندی هەستی کەسێك بە نەتەوەکەی خۆیەوە و بڕوابوون بەوەی بۆ نمونە ئینگلیزەکان هەموویان نەتەوەی ئینگلیز پێکدەهێنن، رابوردویەکی زۆر لەمە دورتری هەیە. مرۆڤەکان هەمیشە هەستیان بە پەیوەندی لەگەڵ  جۆرێك "گروپی خودی"- چ عەشیرە یان خێڵ و شار و نەتەوە بێت- کردووە. هاوکات لەگەڵ ئەمەدا هەستیانکردووە بەوەی هەرکەسێك لەخۆیان نیە، بێگانەیە (هەندێکجار بەچاوی دوژمنیشەوە تەماشایاندەکرد). بەڵام دەبێت ببینین خەسڵەتی نەتەوەکان چیە و چ شتێك لە گروپەکانی دی جیایان دەکاتەوە.

## پێناسی نەتەوە بە پێی دەوڵەت:

ئایدیۆلۆژیستی شۆڕشی فەڕەنسی "ئابێ سێ یەس" لە ١٧٨٩دا نوسی نەتەوە"یەکێتی تاکەکەسانێکە کە یاسایەك فەرمانڕەوایان دەکات و یەك ئەنجومەنی یاسادانانیش نوێنەرایەتیان دەکات". کەوابوو بەپێی ئەم وێنایە یەکێتی و شوناسی نەتەوە لقی رێکخستنی سیاسیە و دەوڵەت پێشینەیەکی لۆژیکی بەسەر نەتەوەدا هەیە. تیورەکەی سێ یەس هاوجووت بوو لەگەڵ بنەمای دانانی تاك یان بەشی دابەشنەبوو لە تیگەیشتنی گروپدا و ئەم بڕوایە کە لۆك بەیەکێك لە تەفسیرکەران و بەرگریکەرانی سەرەکی دادەنرا، خەسڵەتی زۆربەی تیورە کۆمەڵایەتیەکان بوو لە







بزوتنەوەی رۆشنگەری سەدەی هەژدەدا. نوسەرانی وەك دیدرۆ و کۆندریسە لەو بڕوایەدابوون دەبێت گریمانەی ئەوە بکەین تاکەکان لەگەڵ دامەزراندنی سیستەمی سیاسیدان، لەبەرئەوەی (لەو روەوە) کە ئەمکارە لەبەرژەوەندی تاك و کۆیانە. بەرژەوەندی یان سودی گشتی کە بەمشێوەیە دروستدەبێت، بناغە و هۆی ئەرکی سەرشانە بۆ پاراستنی رژێمی ناوبراو و بەرگریکردن لێی. دەوڵەتیش بەتایبەتی وەك بابەتی ئەم بەرژەوەندیە، دەبێتە بابەتی وەفاداری. کەسانێك کە لەم بەرژەوەندیە گشتیەدا بەشدار دەبن، نەتەوە یان گەلێك پێکدەهێنن. سەلمێنەری ئەم تێڕوانینە بۆ نەتەوەوە، بەکارهێنانی هاومانای دوو وشەی "تەبعیەت" و "نەتەوەیە"ە لە زۆریك لە حاڵەتەکانی قسەی باوی رۆژانەدا. (رۆژگارێك ئەم حوکمە لەبارەی زاراوە یاساییەکانیشەوە راستبوو، بەڵام هەنوکە زۆرێك لە دەوڵەتەکانی جیاوازیدەکەن لەنێوان ئەو ئەرکانەی دەرئەنجامی تەبعیەت و نەتەوەن). ئەگەر بمانەوێت جیاوازیبکەین لە نێوان تەبعیەت و نەتەوەدا، ئەمکارە بەشێوەیەکی سەرەکی بەوشێوەیە ئەنجامدەدەین کە تەبعیەت سنوردار دەکەین بە مەسەلە سیاسی و هەلومەرجە یاساییەکانەوە و لە دیارکردنی نەتەوەشدا پێوەرگەلێك بەکاردێنین وەك شوێنی لەدایکبوون و دایك و باوك و زمان و نەریتی کلتوری.

## پێناسی نەتەوە بەپێی زمان و کلتور:

وێنای نەتەوە بەمانای زمان و کلتور لە کۆتاییەکانی سەدەی هەژدەدا و بەشێوەیەکی سەرەکی بەهۆی بەرهەمی هەندێك بیریار و نوسەری ئەڵمانی وەك هێردەر، نۆڤالیس و شلایر ماخەر وفیختە وەك جەمسەرێك لە جەمسەرەکانی ئایدۆلۆژیای ناسیۆنالیستی، دەربڕا و بڵاوبۆوە. شۆڕشگێڕانی فەرەنسی بڕوایانوابوو نەتەوە کۆمەڵێك کەسە کە هەر هەموویان سەر بە رژێمێکی سیاسین. بەڵام ئەڵمانیەکان لەسەر ئەو بڕوایەبوون کە خوداوەند و سروشت نەتەوەکانی لێکجیاکردۆتەوەو هەر نەتەوەیەك خاوەن خەسڵەتیکی تایبەتیە کە  پەیوەندیەکی نزیکی بە زمانی هاوبەشی ئەو نەتەوەیەوە هەیە. لەبەرئەوەش کە زمان هەڵگری نەریتەکان، هەستەکان و رەمزەکانە و پەیوەندیە سۆزداری و ئەفسانەیەکان دەگوێزێتەوە، کەوابوو بەشداربوون لەهەر زمانێکی خۆییدا، بەمانای بەشداربوونە

لەکلتورێکی هاوبەشدا. بە نوسینی شلایر ماخەر "هەر زمانێك یەکسانە بە شێوەیەك بیرکردنەوەی تایبەت، ئەوەی بەزمانێك بیری لێدەکرێتەوە، هەرگیز مومکین نیە بەوشێوەیە بەزمانێکی دی دوبارە بێتەوە". ئەم وێنایە بۆ نەتەوە کەم کەم لەگەڵ تیورەیەکی میتافیزیکیدا پەیوەست بوو کە پەیڕەوەکانی بڕوایانوابوو هەر نەتەوەیەك دەرکەوتی رۆح یان مانایەکی هەمەکی ترە کە ئەویش بە نۆبەتی خۆی دەرکەوتێکی جوانی راستیە. جیاوازی نەتەوەکانیش فرەیی بوون پیشان دەداتەوە و هەر نەتەوەیەك بەشی خۆی هاوکاری پێشکەوتنی رەگەزی مرۆڤ دەکات و لێرەوە تاکەکانی نەتەوە لەرووی ئەخلاقیەوە، پاراستن و پەروەردەکردنی نەتەوەیان لەئەستۆیە. لێرەوە بوو ناسیۆنالیستە کلتوریە ئەڵمانیەکان، لە کاردانەوە بەرامبەر بە جیهان نیشتیمانی **Aufklarung** (یان بزوتنەوەی رۆشنگەری لەو سەرزەمینەدا) کە مەیلی بەلای فەرەنسادا هەبوو، لەگەڵ رەهەندی ناسیۆنالیستی بیرکردنەوەیاندا، هەروا تەماشای نەتەوەکانیان لە دیمەنی گشتی مرۆڤایەتیدا دەکرد و بڕوایان وابوو هەر نەتەوەیەك دەبێت بەشی خۆی لە چارەنوسی پڕ هەوراز و نشێوی مرۆڤدا بدات.

ئەم دەستەیە لە بیریاران و نوسەران بڕوایانوابوو بوونی نەتەوە نەبەستراوە بە ویستی تاکەکانیەوە، تاکەکان ناتوانن بڕیاربدەن ئەندامی نەتەوەکەی خۆیان نەبن. چونکە بوونی نەتەوەیە کە فۆرمەلەی هوشیاریاندەکات. نەتەوەی ئەڵمانیا لەبەرئەوە بونێکی سروشتی هەیە کە کەسانێك بەپێی نەریتی ئەڵمانی لەدایکبوون، خۆبەخۆ لە ئینگلیز یان فەرەنسیەکان جیاوازن. کەوابوو ئەڵمانیەك گەر بیەوێت مەیمون ئاسا لاسایی فەرەنسیەکان بکاتەوە، دەبێتە رێگر لەبەردەم گەشانەوەی خود و سروشتی خۆی و دەبێت قەناعەت بەو شتە بکات کەلای ئەو لاوەکی و شتیکی دروستکراوە.

## پێناسی نەتەوە بەپێی میراتی هاوبەش:

وێنای نەتەوە بەمانای زمان و کلتور، لە ١٨٨٢دا لە وتاری بەناوبانگی"نەتەوە چیە"دا بەتوندی کەوتە بەر رەخنەی ئەرنست رینان. رینان دەیگوت هەڵەیە گەر کەسانێك نەتەوەکان لەگەڵ گروپە زمانیەکاندا تیکەڵبکات. بنەما و رەگی هاوبەشی نەژاد یا زمان یان دین یان بەرژەوەندی ئابوری هاوبەش یان راستیە جوگرافیەکان،







بۆ دروستبوونی نەتەویەك بەس نین. نەتەوەگەلێك هەن وەك سویسریەکان کە لەم خەسڵەتانەدا هاوبەش نین، و هەندێك گروپی زمانیش هەن وەك نەتەوە ئینگلیز زمانەکان کە خاوەن ئەم خەسڵەتانە هەن و بەڵام پێکەوە نەتەوەیەك پێکناهێنن. رینان بڕوایوابوو ئەوەی لەپلەی یەکەمدا دەبێتە هۆی دروستبوونی دەوڵەت، بوونی مێژووی هاوبەشە، بەتایبەت مێژووی رەنج و ئازارەکان، واتە گەنجینەیەکی هاوبەشی یادەوەری کە مایەی هاودەردی و شانازی بێت. بەڵام رینان لەهەمانکاتدا بڕوایوابوو گرنگە هەندێك شتەکان لەبیر بچنەوە، چونکە تا برینە دێرینەکان سارێژ نەبن، هەستی بەشداربوون لە نەریتێکی هاوبەشی قارەمانیدا، پەیدا نابێت. کەوابوو دوهەم مەرجی بوونی نەتەوە خواست و ئیرادەی پێکەوەژیانو بە زیندوو هێشتنەوەی میراتی هاوبەشە. بەوتەی رێنان ("دوو" مەرجی پێویستنی دروستبوونی نەتەوەیەك ئەوەیە کە "خەڵکی" بەرێکەوت کاری گەورەیان کردبێت و بیانەوێت دیسان لەو کارانە بکەن...بوونی نەتەوە...وەك "وەڵامێکی پۆزەتیڤە" بە راپرسیەکی رۆژانە).

بەڵام تەنانەت بەگریمانەی گرنگی ئەوەی کەسێك خۆی بە نەریتێکی هاوبەشەوە گرێبدات لە ژیانی نەتەوەیەکدا، دیسان جێی گومانە تەعبیری مەجازی یادەوەری هاوبەش، ئەوەندە کاریگەری لە رونکردنەوەی ئەو مەسەلەیەدا هەبێت کە ئەو شتەی یەکێتی و بەردەوامی بە نەریتی نەتەوەیی دەدات، چیە؟ یادەوەری لەرووی خودناسی و شوناسی فەردیەوە گرنگە، بەڵام تاکەکان ناتوانن بەم مانایە بیریان بێتەوە کە پێش لەدایکبوونی ئەوان چی رویداوە. هەروەها مەرج نیە پەیوەندیەکی فسیۆلۆجیان بە پێشینانی قارەمانەوە هەبێت. فەرەنسیەك تەنها بەمانایەکی مەجازی دەتوانێت بڵێت ژاندارك نەنکی ئەوە، تەنهاش لەبەرئەوە دەزانێت چ کەسێك بە باپیرانی خۆی بزانێت کە پێشتر لە نەریتی نەتەوەدا هاوبەشبووە. هەر هەلومەرجێك پێویستی بە جۆرێکی تری وەفاداری هەیە و رەنگە بەپێی هەلومەرج ئەو باوانەی تاکەکەس بەموڵکی خۆی دەزانێت، بگۆڕێت. ئەمەریکیەکی یەهودی بە رەگەز ئەڵمانی رەنگە هەندێکجار خۆی لەگەڵ جفرسن و هەندێکجار لەگەڵ یەهودای مەکابێدا و هەندێکجاری دی لەگەڵ فردریکی مەزندا، بەیەك رەگەز بزانێت. پاشان رەنگە تاکەکان تەنها لەبەرئەوەی لە فلان روداودا پێکەوە بوون، لە یادەوەریەکدا هاوبەش بن. بەڵام بوونی مێژووی هاوبەش تەنها بەوە نیە هەمووان هەمان روداوی مێژووی

بزانن، بەڵكو بەوەیە كە خۆیان لەگەڵ كۆمەڵەیەك ڕەمزی مێژووی هاوبەشدا بەگرێدراو ببینن و لەبەردەم خۆیاندا بەیەك هونەرنواندن بنازن و هەست بە توڕەیی لەبەرامبەر سوكایەتپێكردنێكدا بكەن.

فەڕەنسیەك ڕەنگە ئەوەندەی لەبارەی ژانداركەوە دەزانێت، هێندەش لەبارەی فردریكی گەورەوە بزانێت، بەڵام لەبەرئەوە فەڕەنسیە كە ژاندارك موڵكی ئەوە و فردریكیش موڵكی كەسانی دی. كەوابوو نەتەوە لەشوێنێكدا هەیە كە كۆمەڵێك كەس بەمشێوەیە مەیلیان بۆ كۆمەڵێ ڕەمزی هاوبەش هەبێت و خۆیان بە هاوگروپ و بەشدار لەتێڕوانینێكی هاوبەشدا بەرامبەر بەو ڕەمزانە بزانن و هەستێكی خەمخۆرییان بۆ یەك هەبێت كە نەیانەوێت كەسانی دی بەشدار تیا بكەن. دیارە ڕەنگە لەرووی زمان و دین و شكڵیشەوە هەندێك خەسڵەت هەبن كە دەستنیشانی بكات چ كەسانێك دەبێت بەم وەسفانە بناسرێنەوە و گرنگی هەر یەكێك لەم سیفەتانەش بەپێی گۆڕان هەلومەرج دەگۆڕێت.

## هەلومەرجی نەتەوە بەپێی سەرزەمین:

یەكێك لە خەسڵەتەكانی نەتەوە كە لەهەموو بەشەكانی تری پەیوەندی كۆمەڵیی گرنگترە، پەیوەندی نەتەوە و سەرزەمینە. ئەگەر كۆمەڵێك لەرووی سەرزەمینەوە پەیوەندییەكی تایبەتیان نەبێت، هۆیەك نیە لەپاش ئەمەوە بە دەستە یان خێزان یان چینێكی كۆمەڵایەتی دابنرێن. كەوابوو پێدەچێت وێنای وڵات یەكێك بێت لە خودێتی وێناكانی نەتەوە. كەسێك كە بەڕاستی جیهان نیشتیمانە، سەر بە هیچ شوێنێكی دیاریكراو نیە. ئەم مەسەلەیە ئەوە ڕووندەكاتەوە كە پەیوەندیەكی نزیك لەنێوان دوو چەمكی نەتەوە و دەوڵەتدا هەیە، چونكە بناغەی دەوڵەتیش سەرزەمینە و دەوڵەتیش كەسانێك سەر بەخۆی نەبن، تەنها لەژێر هەلومەرجێكدا قبوڵدەكات كە خۆی دیاریدەكات.

لە هەلومەرجێكدا كە مێژووی ناوچەیی باس لە ناكۆكی نێوان گروپە مەزهەبی یان زمانی یان ڕەگەزیە جیاوازەكان دەكات، هەر گروپێكیش لە سەرزەمینێكی دیاركراودا جێگیر بێت، تاكەكانی گروپ خۆیان بە گروپی جیاواز و خاوەن مێژووی





پەیوەندیدار بەو سەرزەمینەوە دەزانن و هەست بە بڵندی یان بەرگەگرتنی سەختیەكان دەكەن. خەسڵەتەكانی گروپێك لەگروپەكانی دەوروبەر جیادەكاتەوە، بەخەسڵەتی خەڵكی ئەو سەرزەمینە دەزانرێت، ئەگەرچی لەدەرەوەی ئەو ناوچەیەش خەڵكی وا پەیدا ببن. دەكرێ چاوەڕێی ئەوەبین هەر گروپێكی لەمچەشنە كە لەدەسەڵات مەحروم بێت، ئارەزووی سەربەخۆی بكات و بیەوێت خۆی ڕاستەوخۆ مەرجەكانی بەهرەمەندبوون لە دەسەڵات و بایەخ، لەسەرزەمینی خۆیدا دەستنیشانی بكات. هەر گروپێكی نەتەوەیی ڕەنگە شوناسی خۆی و تاكەكانی خۆی بە كۆمەڵێك خەسڵەتەوە گرێبدات. ئەوەی لەهەر حاڵەتێكدا كام خەسڵەت دەبێتە تەوەرەی سەرەكی نەتەوایەتی، پەیوەستە بەوەوە گروپەكە لەچ ڕێگەیەكەوە بە خودهوشیاری گەیشتووە. زۆرجار پێوەری گروپ بۆئەوەی بڵێت زوڵمی لێكراوە، هەمان ئەو خەسڵەتە دەبێت، هەروەها دەگوترێت وڵاتی گروپی ستەملێكراو هەمان ئەو سەرزەمینەیە كە گروپی ناوبراو تیایدا باڵادەستە یان تا ئەو جێگەیەی كە یادەوەری هاوبەش پیشانیدەدات، ڕۆژگارێك لە رابردوودا(لەو سەرزەمینەدا) باڵادەستبووە.

## پێناسی نەتەوە بەپێی ئامانجی هاوبەش:

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا لەبەرئەوەی زۆرجار ناسیۆنالیزم شێوەیەكی ناڕەزایی دەربڕینە، چەمكی نەتەوە كە پێوەی گرێدراوە، ڕەنگە تەنها نەك پەیوەندی بە ژماردنی خەسڵەتە پۆزەتیڤە هاوبەشەكانی گروپەوە هەبێت، بەڵكو بەهەمان ئەندازە پەیوەندی بە دەستنیشانكردنی "گروپی بێگانە"ی ئامانجی پیكدادانەوە هەبێت. بۆ نمونە لەسەدەی بیستەمدا ناسیۆنالیزمەكانی ئەفەریقا و ئاسیا بەتوندی پشتیان بەوە بەستبوو كە كۆلۆنیالیكردنی سپیپێستەكان ڕەدبكەنەوە و بیانەوێت لەگەڵ ئەواندا بەیەكسان دابنرێن. بەڵام ئەمە بەتەنها بۆ دروستبوونی نەتەوە بەس نیە، چونكە ئەگەرچی ئەم هەستانە لە زوربەی ئەفەریقای ڕەشدا دەبینرێت، بەڵام تەنها ژمارەیەكی ئەفەریقیەكان خۆیان بە یەك نەتەوە دەزانن و ئارەزوو دەكەن هەمویان پێكەوە لەیەك دەوڵەتدا یەكبگرن. لەڕاستیدا ڕەنگە ناسیۆنالیزم لەپێش نەتەوەوە بوونی هەبێت، ئەگەر بەمانای ئارەزووی گروپێكی دەستەبژێری خاوەن پەروەردەی ئەوروپی بۆ سەربەخۆی سەرزەمینێك بژمێرێت كە سنورەكانی یەكێك لە

ئیمپراتۆریەکان بە سەرنجدان لەرووی ئیداری و تەنفیزیەوە دەستنیشانی کردووە، نەك هیچ جۆرە نەریتێکی خۆیی یان ئارەزوییەکی رەمزی. ناسیۆنالیزمی ولاتانی وەك غینیا دەبێ پاش گۆڕانی کۆلۆنی پێشوو بۆ دەوڵەتێکی نوێ، تازە دەستبکەن بە دروستکردنی نەتەوە. بوونی دەوڵەت رەنگە هەرئەوەندە لەرووی دروستبوونی نەتەوەوە گرنگی هەبێت کە بوونی نەتەوە بۆ دروستبوونی دەوڵەت هەیەتی. بەڵگەی ئەم قسەیە سەرکەوتنی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا و یەکێتی سۆڤێتە. ئیمپراتۆری نەمسا، هەنگاریا لەبەرئەوە لێکهەڵوەشایەوە کە لە دروستکردنی نەتەوەیەکدا شکستیهێنا.

## مافی چارەی خۆنوسین

تیورەی ناسیۆنالیزمی هاوچەرخ لە دوو سەرچاوەی هاوتاوە دێتەدەرێ: یەکێکیان وێنای فەرەنسیەکان بۆ فەرمانڕەوایەتی خەڵکی و ئەویدیان ناسیۆنالیزمی رۆمانسی ئەڵمانیایە کە بناغەکەی ئەنترۆپۆلۆجی بوو. بیریارانی زانستی سیاسەت لە سەدەی هەژدەدا فەرمانڕەوایەتیان لەبری پاشا، بە مولکی خەڵك دادەنا و بەمشێوەیە مافیان بەخەڵکیدەدا کە راستەوخۆ جۆری حکومەتەکەی خۆیان دەستنیشان بکەن. ئەمکارە هەڵگری هیچ مەترسیەك بۆ رژێمی ئەو ولاتانە نەبوو، لە فەرانسا و ئینگلتەرەدا خەڵکی هوشیاربوون بە بوونی خۆیان و سنورەکانیان کەمتازۆر لەگەڵ سنورە جێگیرەکانی ولاتدا هاوڕێك بوو، دەوڵەتیش لەپێشەوە بوو بوو بە رەمزی نەتەوە، هیچ جۆرە یەکێتی خوازیەك لەئارادا نەبوو. بەڵام نەتەوایەتی لەئەڵمانیا و ئیتالیادا لەسنورەکان تێدپەڕی. قسە لەسەر ئەوە بوو گەر خەڵك فەرمانڕەواییان هەیە، کەوابوو دەتوانن رژێمی سیاسی ئارەزومەندانەی خۆیان هەڵبژێرن. جگە لەمەش دەبێ گەر "خەڵکی" بەدەر لە هەلومەرجی ولاتەکانو بەپێی نەتەوایەتی پێناسبکرێن، کەوابوو ئیرادەی نەتەوەیی بۆ بەدەستهێنانی یەکێتی و سەربەخۆی خۆبەخۆ رەوایە، ئەگەرچی ببێتە هۆی کەرتبوونی دەوڵەتە هەبووەکان و تێکچونی رەوایەتی خێزانە سەڵتەنەتیەکان و ببێت بە رێگەپێدەرێك بۆ دەستدرێژی ئازادیخوازانەی نەتەوەیی ولاتێك بۆسەر ولاتێکی دی. ناسیۆنالیستی ئیتالی جۆزێف ماتزینی لەم مەسەلەیەدا توندرەویکرد و گوتی بڕوایوایە خوداوەند وای ویستووە کە





هەر نەتەوەیەك لەناو سنوری سروشتی خۆیدا خاوەن یەکێتی و سەربەخۆی خۆی بێت. جۆن ستیوارت میل لە کتێبی "حکومەتی هەڵبژێراودا" بە پەیرەوکردن لەسروشتی میانرەوی خۆی، تێروانینێکی نەرمتری پێشکەشکرد و نوسی :

"لەهەر شوێنێك کەمتازۆر هەستی نەتەوایەتی بە توندی هەبێت، دەکرێ گریمانە لەسەر پێویستی یەکێتی کۆی تاکەکانی ئەو نەتەوەیە لەژێر حکومەتێکدا و دامەزراندنی حکومەتێکی جیا و تایبەت بە خۆیان بکرێت. مانای ئەم قسەیە لەوە زیاتر نیە کە بڵێین خەڵکی ژێر دەسەڵاتی حکومەتێك، شایستەی ئەوەن خۆیان مەسەلەی حکومەت بخەن بەلایەکدا. ئەگەر هەر بەشێك لە رەگەزی مرۆڤ لە دیاریکردنی ئەم مەسەلەیەدا ئازاد نەبێت کە دەیەوێت پەیوەندی بە کام کۆمەڵی مرۆڤەوە بکات، ئیدی دیاری نیە لە چ شتێکدا ئازاد دەبێت".

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا مافی چارەی خۆنوسینی فەردی و کۆیی هەڵگری گەلێك کێشەی گەورەیە. وێنای دەوڵەت وەك رێکخراوێکی بالادەست بەسەر هەموو تاکەکان لەناو سنوری ولاتدا، ناکۆکە لەگەڵ وێنای بەراست زانینی ئازادی هەرکەسێك لە وەفادار مانەوەدا بۆ ئەو ولاتە. ئەڵبەتە هەموو کەسێك مافی ئەوەی هەیە کاریگەری لەوەدا هەبێت کە دەیەوێت چ کەسێك و چۆن حکومەتی بەسەردا بکات، بەلام ئەمە بەمانای مافی بەشداریکردنە لە وەرگرتنی هەندێك بریاری یاساییدا کە تیایدا بوونی چوارچێوەی سیاسی بە بەڵگەنەویست دادەنرێ، نەك بە مانای ئەوەی هەر کەسێك چۆنی ویست رەفتاربکات. کێشەی مافی کۆیی لەمە کەمتر نیە. لە کرداردا هیچ سنورێك بۆ جیابونەوە و دابەشبوون مومکین نیە کە هەرکەسێك لە ناوچەیەکی وەك باڵقاندا، لە ولاتی ئارەزومەندانەی خۆیدا دابنێ.

بەلام مەسەلەی سەرەکی یەکلاکردنەوەی ئەو خاڵەیە کە لەرووی مافی چارەی خۆنوسینەوە گروپی نەتەوەیی بریتیە لەچی؟. وەك چۆن کۆنگۆیەکان مافی چارەی خۆنوسینیان لە کاتانگا مەحرومکرد، ئەمرۆش دیسان بە ناوی یەکێتی نەتەوەوە، ناسیۆنالیستەکانی غانا ئەم مافە لە ئاشانتیەکان زەوتدەکەن. ئەگەر ئەڵمانیەکان دەڵێن هەموو خەڵکی ئەڵمانی زمان، تاکەکانی نەتەوەی ئەڵمانن و لێرەوە دەبێ بەشێکی ئەڵمانیا بن، ئایا لەسەر بناغەی مافی چارەی خۆنوسینی نەتەوەیی بۆ کەسانی ئەڵمانی دەرەوەی ولات، هەڵبژاردنێك لەم زەمینەیەدا دەمێنێتەوە؟ ئەگەر

نکوڵیانکرد وەك تاکی ئەڵمانی نکوڵیانکردووە یان وەك نائەڵمانی؟ ئەگەر وەك ئەڵمانی، ئایا ئەمە ناکۆك نیە لەگەڵ مافی چارەی خۆنوسینی کۆی خەڵکی ئەڵمان؟ ئاشکرایە گەر بڕیار بێت بەپێی پێوەری بابەتی وەك زمان، لەبارەی نەتەوەوە داوەری بکرێت، بنەمای مافی چارەی خۆنوسین، بەدەر لە ئارەزوەکانی وردە گروپە **subgroup** پەیوەندیدارەکان، سەلمێنەری سیاسەتی پاوانخوازی دەبێت، چونکە گریمانەکە لەسەرئەوەیە بۆ دەربڕینی خواست و ئیرادە، بەشی گەورەتر بنەمایەکی پتەوترە لە بەشی بچوکتر. بەڵام ئەگەر بڕیار بێت نەتەوە لەسەر بناغەی پێوەرە زیهنیەکانی وەك ئیرادەی ژیان لەژێر سایەی حکومەتێکدا، هەڵسەنگێنرێ، ئەوەی کە وردە گروپی ناوبراو، بەشداری نەکردووە، بەروکەش بەڵگەیەك دەبێت بۆئەوەی بڵێین بەشێك نەبووە لەو نەتەوەیە. بەهەمان شێوە ڕەنگە کەمایەتیەکی نەیار لەناو ئەم گروپە بچوکەدا بانگەشەی شوناسێکی نەتەوەیی جیاوازبکات و بەمشێوەیە تادوایی..ئەگەر کەسێك پێوەرە زیهنیەکان بۆ مافی چارەی خۆ نوسینی کۆمەڵێك قبوڵبکات، ئیدی هیچ بەڵگەیەکی بۆ ڕێگەگرتن لە گشتگیریان بۆ مافی چارەی خۆ نوسینی فەردی نابێت.

پێوەرە بابەتیەکان زۆرجار لەهەندێك حاڵەتی واقعیدا قابیلی بەکارهێنان نین، بەڵام بنەمایەکی ڕوون بۆ دامەزراندنی دەوڵەت بەشێوەیەکی دروستدەدەن بەدەستەوە. لەگەڵ ئەمەشدا ئەو تیوریەی خاوەنەکانی تاك بە بنەما دادەنێن و بڕوایانوایە کە بنەمای ئەرکە سیاسیەکان ڕازیبوون و قبوڵکردنی تاکەکەسە، سەلمێنەری ئەو پێوەرانە نیە. بنەمای (ڕازیبوونی و قبوڵکردنی تاکەکەس)دەوری خۆی لە مێژووی ناسیۆنالیزمدا بینیوە. کانت بڕوایوابوو بنەمای هەڵبژاردن و ئۆتۆنۆمی"[٣]" ئەخلاقی پێویستی بەوەیە مرۆڤەکان لەڕووی پەیوەندیان بە مەلەکوتی غایات و لەو ڕووەوە کە خۆیان یاسا بۆ خۆیان دادەڕێژن، ئەرکی سیاسیش لە ئەستۆی خۆیان بنێن و دەبێت سەروەری و دەسەڵات بەجۆرێك کە لە یاساکاندا ڕەنگی داوەتەوە، سەرچاوە بگرێت و پێرەوی ئەو بێت. بەڵام ناسیۆنالیستانێکی وەك بیریاری ئابوری سیاسی ئەڵمانی، ئادەم مولەر دەستیان خستە ناو بەڵگاندنەکانی کانتەوە بەو شێوەیە کە گوتیان تاك لەگەڵ نەتەوەدا یەك شتە، و ڕۆحی نەتەوەیی **[Volksgeist]** دەرکەوتی ڕاستەقینەی ئیرادەی هەمیشەی تاکەکەسە، نەك







هەرجۆرە ئارەزویەکی فەردی. بەمشێوەیە ئیرادەی گشتی کە بەبڕوای ڕۆسۆ و کانت ئۆتۆنۆمی ئەخلاقی فەردی لەگەڵ دەسەڵات و سەروەری سیاسیدا دەگونجان، بوو بە ئامرازێك بۆ بانگەشەی ئەوەی بڕیاری تاکێك کاتێك نەیاری ڕۆحی نەتەوەیی بێت، بێ هودە و نابابەتیە.

لەگەڵ هەموو ئەمانەدا ناسیۆنالیزم لەسەرەتاکانی سەدەی نۆزدەهەمدا بەچەندان نیەتی مرۆڤانە و ئازادیخوازانە ئارایشتکرابوو. فیختە و ماتزینی بڕواینوابوو تا نەتەوەیەك بەشێوەی دەوڵەتێکی سەربەخۆ و خاوەن دەسەڵاتدارێتی و یەکێتی پەیدا نەبێت، تاکەکانی خاوەن بایەخی یەکسان و جێی ڕێز نابن. لەڕوانگەی خۆشیاندا خاوەن کەرامەت و عیزەتی نەفس نابن. جوانی قەناعەتپێکەری ناسیۆنالیزم لە ئەفەریقا و ئاسیادا بەشێوەیەکی سەرەکی لەم بیرەوە سەرچاوە دەگرێت. چارە ڕەشانێك کە ناچنە ژێر ڕکێفی سپی پێستەکانەوە، هەستدەکەن لەڕووی عیزەتی نەفسی خۆشیانەوە بووە، دەبێ خاوەن فەرمانڕەوایانێك بن لە پێست و ڕەنگی خۆیان کە پەیوەندیان پێیانەوە هەبێت و سەرانی دەوڵەتانی دی مافی حوکمڕانیان لەخۆیان نزمتر نەبینن ▪

بەڵام هەر کە یەکێتی و سەربەخۆی بەدەست دێت، هەمان دڵەڕاوکێی ئەخلاقی کە ناسیۆنالیزمی بەرهەمهێناوە و هەندێکجار گەورەترین هۆی ڕەوایەتی بووە، بە ئاسانی دەگۆڕێت بەشێوەیەکی جەسارەت و وێرانکاری و لەخۆ ڕازیبوونی نەتەوەیی. وەك ئەوەی شارل مۆرا لە فەرەنسادا ناوینا "ناسیۆنالیزمی تەواو" و لە وەسفیدا نوسی کە بریتیە لە "بەدواداچوونی پەتی سیاسەتە نەتەوەییەکان و پاراستنی ڕەهای سەرجەمێتی و زیادبوونی لەسەرخۆی دەسەڵاتی نەتەوەیی". دەوڵەتی تاك نەتەوەیی چیدی لە ئاسۆی فراوانی مرۆڤایەتیدا سەرنجانەدرێ و هەنوکە پێویستی بەهیچ ئاراستەکردنێك جگە لەبوونی خۆی نیە. بێگومان ناسیۆنالیزم بەم ڕەنگ و بۆنەوە دژی بنەما عەقڵیەکانە وبە وتاربێژی ڕەمزی وەك "خوێن و خاك" دەوروژێت و گەرچی لە ڕوانگەی مێژوونوس و کۆمەڵناسەوە گرنگیەکی زۆری هەیە، بەڵام هەڵەیە بەچاوێك تەماشابکرێت وەك ئەوەی شایستە ڕەخنە و هەڵسەنگاندنی جدی عەقڵی بێت ▪

پەراوێزەکان :

**1)Stanly i. Benn, Nationalism, Encyclopedia,ed.Paull Edwards, 1967.**

٢-بـە بـڕوای کانـت تـەنها ئـەو دەسـتور یـان ڕێـسایە بـەهای ئـەخلاقی هەیـە کـە سەرچاوەکەی ئـیرادەی ئـازادی مـرۆڤ بێـت و مـرۆڤ بـە پێـی فیـترەتـی دروسـتی خـۆی، بۆخـۆی هەڵبـژاردبێت. لێـرەوە ئۆتۆنـۆمی ئـیرادە تـەنها کاتێـك ڕوودەدات کـە ئـیرادە پـەیڕەوی یاسـای دانـراو لەلایـەن خـودەوە، واتـە بابـەتی ڕەهـا، بێـت، بـەجیا لـە پەیڕەویکردن لە یاسا و ڕێسای دانراو لەلایەن دەرەوە. (و.ف)

سەرچاوە

ئەم وتارە لەم سەرچاوەی خوارەوە کراوەتە کوردی :

عزت الله فولادوند. خرد در سیاست. گرح نو. ص٣٤٢